# پوختەی ئایینی ئیسلام

وەرگێڕان و بە کوردی کردن:

مەلا مەحمودی گەلالەیی

(مامۆستا نوری فارس پێیدا چووەتەوە)

# پوختەی
# ئایینی ئیسلام

وەرگێڕان و بەکوردی کردنی:

**مەلا مەحمودی گەلاڵەیی**

( مامۆستا نوری فارس پێیدا چووەتەوە )

چاپی دووەم



* * *
* * * * * * *
* * * * * * * * * * * * *
* * * * * * * * * * * * * * * * * * * * *


- ناوی کتێب: پوختەی ئاینی ئیسلام
- وەرگێڕانی: مەلا مەحمودی کەلالەیی
- پێداچونەوە: نوری فارس حمە خان
- چاپ: دووەم
- ساڵی چاپ : ٢٠٠٩
- تایپ: کەژاڵ حسین
- تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردن: (١٣٥٥)ی ساڵی ٢٠٠٩.





بسم الله الرحمن الرحيم

لـەپاش حەمــدو سوپاســی خــودای گــەورەو مــەزن عــەرزم ئەومیــە: زۆردەمێـك بـوو بـە تـەمابووەو ئـارەزوو مەنـدبووم، كـە كتێبـێ (روح الـدین الاسـلامي): دانـراوی مامۆسـتا عـەفیف طـەببـارە لـە زمـانی عەرەبیـەوە وەربگێڕمـە سـەر زمـانی كـوردی.. چـەند جـارێكیش لـە مامۆسـتاو بـرادەران ناوبـانگی باشـی ئـەم كتێبـەم بیـستبوو، ماوەیـەك بـە ئەمانـەت نوسخەیەكی چـاپی سـێهەمیم كەوتــەلا، بــڕێكم لێ خوێنــدەوە، ســاڵی (١٩٧٠)ی زاینــی دانەیــەكم كــڕی وابــزانم چـاپی حەوتــەمینی بــوو، بەتــەواوی هــەموویم خوێندەوە، بەمە زیاتر لە كتێبەكە شارەزا بـووم‌و چووە دڵمـەوە.. لەوساوە هەر بەینـەنا بـەینێك بـە گـوێرەی پێویـست باسـێك لاپـەڕێك یـان زیـاترم لێ دووبـارە كردۆتـەوە، هـەموو كـاتێكیش بەیـەكێ لـە كتێبـە خۆشەویـستەكانی كتێبخانـەم حـسێب كـردوە، بەڵامـەوە كتێبێكـی زانـست ئـامێزو دەق راسـتەو ئوسـلوبی رێـك‌و رەوانــە، كەرەسـتـەیەكی ئامۆژگـاری كردنـی رێـك‌و پێكـەو نووسینێكی رەوانی بەهێزو پێزە، رۆحێكـی دینـی خـاوێن‌و بـاس‌و خواسـێكی بە سوودی لەخۆ گرتـووە. پێویـستە هـەموو مـاڵێكی موسـوڵمان نوسـخەیەكی لــەم كتێبــە نــاوازە تێــدابی‌و هــەموو موســوڵمانێك بیخوێنێتــەوەو لێــی بەهرەوەربێ. دیارە ئەمە تەنها رای من نییە بەڵكوو زۆربـەی خوێنـدەوارانی موسوڵمان ئەم هەڵوێستەیان هەیـەو بـە لایانـەوە كتێبێكی بەنرخـەو سـوود بەخشە، بەڵگەشم لەسەر ئەمە ئەومیە، ئەم كتێبـە لـەماوەی كـەمتر لـە (٢٥) سـاڵدا هـەژدە جـار هـەر جـارەی بـە هـەزاران نوسـخە چـاپ كـراوەو هـەر جـارێكیش بـە ماوەیـەكی كـورت لــە كتێبخانەكانــدا نــەماوە، ئەمــە ئــەوە دەگەیـەنێ كـە كتێبەكـە جێگـای خـۆی لـە دڵـی خوێندەوارانـدا كردۆتـەوە، ئـەگینا ئـەم هـەموو جارەو بـەم حەمكـە نووسـخە چـاپ نـەدەكراو ئـاوا بـڵاو نەدەبووەوە.

بۆیە منیش هەر کەبیرم کردەوەو ویستم کتێبێکی ئایینی لە زمانی عەرەبیەوە وەرگێڕمە سەر زمانی کوردی، یەکسەر دڵم بۆ وەرگێڕانی کتێبی (روح الدين الإسلامي) چوو، ئەمم پەسەند کرد، لەپاش راوێژو پرس و را چەند مامۆستاو برادەرێکیش هەر ئەمیان بۆ دەست نیشان کردمو پیرۆزیی کارێکی وەهایان بۆ درکاندمو بەرامبەر بەم نیازەم خۆشحاڵی خۆیان دەربڕی.. ئیتر منیش بە پشتگیریو یاریدەی خودا قۆڵم لێ هەڵکردو دەستم کرد بە وەرگێڕانی، هیوام وایە جێگای رەزامەندیی خوێنەران بێ، جێی خۆی لە دڵی موسوڵمانانندا بکاتەوە. خوای گەورەو مەزنیش وەکوو ئەسڵەکەی بەرەکەتی تێ بخاو بڕەوی پێ بداو ئەمیش وەك ئەو سوود بەخش بێ....

ناشمەوێ سەری خوێنەر بهێشێنمو باسی وەرگێڕانو پرۆژەی وەرگێڕانەکە بکەم، ئەمە کارەکەی بەندەیە وا لەبەر دەستی ئێوەی خوێنەری ئازیزدا، ئومێدەوارم جێگەی رەزامەندیی ئێوە بێ، ئەگەر هەڵەیەکیش لە ئارادا بی چاوپۆشی لێ بکەن، چونکە لە کۆششی گەورەی وەهادا، نەك منی بێ ئایەو مایە بگرە کەڵە پیاوانیش نووچە دەدەن!! تەنیا ئەوەندە دەڵێم: تا بۆم کرابێ لە وەرگێڕانی وشە بە وشە خۆم پاراستووە هەمیشە هەوڵم داوە مەبەستەکە بکەم بە کوردی باسەکە تێ بگەمو بە کوردی دای رێژمەوە.

✍ محمود أحمد محمد

## بەشی یەکەم:

# مانای ئیسلام (معنى الإسلام)

**مانای ئیسلام لە زماندا - مانای ئیسلام لە شەرعدا - (ئەو ئایینانەی کە بانگەوازیان بۆ تاك و تەنهایی خوا هەڵداوە) دوو بەرەکی لە ئایینەدا بەهۆی زیادە رەوی و دوژمنایەتی و سەرپێچی کردنەوە.**

ئیسلام ناوە بۆ ئەو ئایینەی کە حەزرەتی محمد (درودی خودای لەسەر بێ) هێناویەتی و بەخش و بڵاوی کردۆتەوە، جا وەنەبێ ناونانی ئایینەکە بە ئیسلام لە پێغەمبەرەوە بووبێ، بەڵکوو ناونانی ئایینی ئێمە بە ئیسلام لەلایەن خواوە بووە.. خوا خۆی ئەم ناوە خۆشەی بۆ ئەم ئایینە پیرۆزە داناوەو فەرموویەتی:

{وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا... سورة المائدة/ ٣}:

واتە: من ئیسلامم بۆ ئێوە بەدیین رەوا بینیوەو تا کۆتایی دونیاش ئەم دینە بەردەوامە.

## مانای ئیسلام لە زمانی عەرەبیدا:

زۆر لە زمانەوانانی عەرەب و راڤەکەرانی قورئان و رۆژهەڵات ناسانی ئەوروپایی هەوڵیان داوە کە وشەی ئیسلام ببەنەوە سەر ریشەو رەچەڵەکێ کە لە زماندا مەعنای چییە؟ لەسەر ئەمە لێکۆڵینەوەو وتو وێژێکی زۆر وردو درێژیان هەیە، زۆر راوو بۆچونیان خستۆتەڕو، بەڵام ئەوەی کە ئێمە لێرەدا هەڵی دەبژێرین بریتییە لەو رایەی کە زۆربەی زانا موسوڵمانەکان بەلایانەوە پەسەندە، ئەویش مانای گوێڕادێری و ئاشتی و خاوێنی لە خەوش دەگرێتەوە. چونکە ئێمە کاتێك لە وشەی (سلم) ورد دەبینەوە دەبینین بەم مانایانە هاتووە:

أ/ پاڵفتەیی و خاوێنی لە خەوشی ئاشکراو نهێنی.

ب/ ئاشتی و ئەمن و ئاسایش.

ج/ گوێ رادێری و گەردن کەچی.

## مانای ئیسلام له شەرعدا (المعنى الشرعي):

ئیسلام له شەرعدا بریتییە لە خودا بەیەك ناسینو گەردن کەچیو گوێ راديری بۆ فرمانەکانیو پاڵفتەکردنی دەروون لەهەموو خەوشێكو ئامادەکردنی بۆ خۆشەویستی ئەو پەروەردگارەو بڕواکردن بەو بنەما ئاینیانەی کە حەزرەتی محمد (درودی خودای لەسەر بێ) لە خواوە هێناونیو بە ئوممەتی خۆی ڕاگەیاندوون، لەم ڕووەوە دەبینین قورئانی پیرۆز جارێك وشەی ئیسلامی بەکارهێناوە لە بەرامبەر هاوبەش پەیداکردن بۆ خودا دەفەرموێ:

{قُلْ أَغَيْرَ اللّهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَهُوَ يُطْعِمُ وَلاَ يُطْعَمُ قُلْ إِنِّيَ أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ وَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ} (سورة الأنعام/ ١٤)

واتە: ئەی موحەممەد بەو هاوبەش پەیداکەرانە بڵێ: ئەوە بەچ عەقڵێکەوە داوا لەمن دەکەن کە لە جیاتی ئەو خودا گەورەو مەزنە کە ئەم هەموو ئاسمانو زەوییانەی لە نەبوون دروست کردوە من بچم خودای تر بۆ خۆم دابنێم؟، نەخوازەڵڵا ئەو خودا هیچو پووچانەیش کە ئێوە کردوتانن بە خودا، من چۆن هەڵەی وا دەکەم، خوای من رزقو رۆژی هەموو زیندارێك دەداو بۆ خۆشی هیچ پێویستی بە خواردنو خواردنەوە نییە، ئەی پێغەمبەری من! بە ئەمری من پێیان بڵێ: من خودا فەرمانی پێ کردووم کە یەکەم کەس بم کە دینی ئیسلام قەبووڵ بکەمو ببم بە سەرمەشقو پێشەوایەکی جوان بۆ گەلی خۆم لەم ڕێگە پیرۆزەدا، وە من چۆن فەرمانی ئەم خودایەی خۆم بە قسەی ئێوە دەشکێنم کە فەرمویەتی پێم: {وَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ}: ئەی موحەممەد لە هیچ روویەکەوە مەبە بە بتپەرستو هاوبەش پەیداکەر!.

جارێکی تر قورئان وشەی ئیسلامی لە بەرامبەر کوفرەوە بەکارهێناوەو فەرموویەتی:

{وَلاَ يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُواْ الْمَلاَئِكَةَ وَالنِّبِيِّيْنَ أَرْبَابًا أَيَأْمُرُكُم بِالْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ} سورة آل عمران (٨٠).

واتە: ئایا عیسای پێغەمبەری من، یان پێغەمبەرێکی تر داواتان لێ دەکا کە فریشتەو پێغەمبەرەکانی بکەن بە خوای خۆتان!؟ چۆن شتی وا دەبێ، چۆن فەرمانتان پێ دەکا بە کافربوون پاش ئەوەی کە ئێوە موسوڵمان بوون؟. لە شوێنێکی تردا قورئان وشەی ئیسلامی بەمانای ئیخلاصو دڵ سۆزی بۆ خوا بەکارهێناوەو فەرموویەتی:

{وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لله وَهُوَ مُحْسِنٌ واتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَاتَّخَذَ اللَّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلاً} سورة النساء (١٢٥).

واتە: دەبێ کێ بێ کە ئایینێکی پاكو خاوێنو چاكو باشی وای هەبێ کە لە ئایینی جوانی ئەو کەسە جوانتر بێ، کە خۆی دابێتە دەست خودای خۆیو، بە ساغیو بە دڵ سۆزی گەردن کەچی دینی خودا بیو لەهەمان کاتا خێر خوا بێو چاکەش لەگەڵ مەردوم بکا؟

ئەوەتا لێرەدا خوای مەزن مەدحو سەنای کەسێك دەکا کە دڵ سۆزانە گەردن کەچی خوا بێو جگە لە پەروەردگار خوایەکی تر بە راست نەزانێ.

هەروەها وشەی ئیسلام لە قورئاندا بە مانای گەردن کەچیو گوێ رادێری هاتووە دەفەرموێ:

{وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ} سورة الزمر (٥٤).

واتە: بگەڕێنەوە بۆلای خواو گەردن کەچی فەرمانی بنو گوێ رادێری ئامۆژگاریەکانی بن.

جاری واش هەیە قورئان وشەی (أسلم)ەی بۆ کافرو موسوڵمان بەکارهێناوە لەم رووەوە کە هەموویان گەردن کەچی خودانو فەرمان بەرداری ویستی ئەون، پێیان خۆش بێ یان پێیان ناخۆش بێ واتە خۆشییان بێو ترشییان بێ، یاسای بونەوەریان بەسەردا تەنفیز دەکرێ وەك ئەمە کە دەفەرموێ:

{أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ} سورة آل عمران (٨٣).

ئەوەتا لەم ئایەتەدا وشەی (أسلم) مانای گەردن کەچیو فەرمان بەرداری ویستی پەروەردگارە، وەلێ لەئەنجام دا بەکارهێنانی ئەم وشەیە لەم زاراوەدا تەرخان کراوە بۆ ئەو خاوەن هەستانەی کە بە دڵو بە گیان، بە لێ وردبوونەوە گەردن کەچی فەرمانی خودان. چونکە موسوڵمان زیاد لە تاعەتە سروشتییەکەی کە یاسای بوونەوەرە بە نیازو رەزامەندیش بە ئیرادەو ویستی خۆشی تاعەتی خوا دەکاو ملکەچی فەرمانێتی لەم رووەوە وشەی (مسلم) بەکاردەهێنرێ بۆ هەر کەسێك کە بە دڵو لە ناخەوە فەرمان بەرداری فەرمانی خوا بێو بە حوسنو رەزای خۆی گەردن کەچی فەرمانی خواو گوێڕادێری پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکان بێ، شوێن ئاینێکی ئاسمانی کەوتبێ، رێبازی پێغەمبەرێکی گرتبێ. پێغەمبەرەکانیش بۆ خۆیان نازناوی موسوڵمانیان بۆخۆیان هەڵبژاردوە ئەوەتا حەزرەتی نوح پێغەمبەر (دروودو سەلامی خودای لەسەر بێ) وەکوو قورئان بۆمان دەگێڕێتەوە خۆی لە ریزی موسوڵمانان حسێب کردوەو فەرموویەتی:

{وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ} سورة يونس (٧٢).

حەزرەتی ئیبراهیمیش خوا لە قورئاندا باسی دەکاو وشەی ئیسلامی بە باڵا دەبڕێ، وەکوو ئەو زاتە مەزنە بۆ خۆی فەرموویەتی:

{وَلَقَدِ اصْطَفَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا وَإِنَّهُ فِي الآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ} سورة البقرة (١٣٠ – ١٣١).

واتە: ئێمە (ئیبراهیم)مان لە دونیادا هەڵبژاردووە بە چاکترین مرۆڤی سەردەمی خۆیمان حسێب کردوە، لە رۆژی ئاخیریشدا لە ریزی صاڵحانو پیاو چاکاندا دادەنرێ، چونکە زۆر گەردن کەچی فەرمانی خوای خۆی بووە. بە جۆرێك کە خوای خۆی پێی فەرموو ئیسلام بکە بە ئایینی خۆتو گەردن کەچی فەرمانم بە بەبێ سیو دوو فەرمووی: ئەوا گەردن کەچی فەرمانی بەدی هێنەری بونەوەر بوومو دینی ئیسلامم قبوڵ کرد.

حەزرەتی یوسفیش تاقە ئاواتی هەرە گەورەی ئەوە بوو کە بە موسوڵمانی بمرێ ئەوەتا دوو دەستی نزاو پاڕانەوە بۆلای خوا بەرز دەکاتەوەو دەڵێ:

**{أَنتَ وَلِيِّي فِي الدُّنُيَا وَالآخِرَةِ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ} سورة يوسف (١٠١).**

**واتە: پەروەردگارا! هەر تۆ خواو خاوەنو گەورەی منی لە دونیاو قیامەتدا، نزاو تکام ئەوەیە بە موسوڵمانی بممرێنە، بمخەرە ریزی پیاو چاکانەوە. حەزرەتی موساش روو دەکاتە هۆزەکەیو پێیان دەڵێ:**

**{يَا قَوْمِ إِن كُنتُمْ آمَنتُم بِاللّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُواْ إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ - سورة يونس/ ٨٤}:**

**واتە: ئەی نەوەی ئیسرائیل! ئەی گەلی خۆم! ئەگەر بەڕاستی ئیمانتان بە خودا هێناوە هەر پشت بە ئەو ببەستنو ئەو بکەن بە پشتیوانی خۆتان پاڵ بە هێزی ئەوەوە بدەنو خالیصانە بیپەرستن، ئەگەر راست دەکەن موسوڵمانو گەردن کەچی ئەون.**

**لە بارەی حەزرەتی (عیسا)شەوە قورئان دەفەرموێ:**

**{فَلَمَّا أَحَسَّ عِيسَى مِنْهُمُ الْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِي إِلَى اللّهِ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ اللّهِ آمَنَّا بِاللّهِ وَاشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ - سورة آل عمران/ ٥٢}:**

**واتە: کاتێك حەزرەتی عیسا هەستی کرد کە زوربەی قەومەکەی کافرنو خوا بەیەك ناناسن، وتی: کێ یارمەتیدەرو هاوڕێی منە بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینی خودا؟ حەوارییەکانی کە دوانزە قوتابی خۆی بونو زۆر لێیەوە نزیك بوون، هەموو بەیەك دەمو یەك زوبان وتیان: ئێمە یارمەتیدەری ئایینی خوداینو بۆ هەموو کارو بارێك لە گەڵتاینو ئیمانمان بە خوا هێناوەو باوەڕمان بە خوایەتی ئەو هەیە، رۆژی قیامەتیش تۆ شایەتیمان بۆ بدە، کە ئێمە موسوڵمانینو گەردن کەچو گوێ رادێری فەرمانی خواو پێغەمبەرین، کەوابوو هەر یەکێك لەو پێغەمبەرانە ئایینەکەی بریتی بووە لە جێبەجێ کردنی چەند رووپەڕێکی ئایینی ئیسلام. جا بۆ تەواوکردنی کاری ئەو هەموو پێغەمبەرانە (دروودی خودایان لەسەر بێ). خوای گەورە فرستادەی خۆی، هەڵبژێراوی هەردوو جیهان، حەزرەتی (محمد) (دروودی خودای لەسەر بێ) نارد تا ئایینەکەی ببێتە تەواوکەری ئایینی پێغەمبەرەکانی**

پێشوو.. لە شوێنێکی تردا خوای گەورە بەچەند ئایەتێك ئەوە دەچەسپێنێ کە هەموو پێغەمبەرەکان یەك ئامانجیان هەبووەو فرستادەی یەك مەبەست بوون.

{إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَى نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِن بَعْدِهِ وَأَوْحَيْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَعِيسَى وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُوراً وَرُسُلاً قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلاً لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ وَكَلَّمَ اللّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا رُّسُلاً مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللّهُ عَزِيزاً حَكِيمًا - سورة النساء/ ١٦٣ - ١٦٥}:

واتە: ئایینی حەزرەتی محمد (درودی خوای لەسەر بێ) وەکوو ئایینی پێغەمبەرەکانی پێشوو وایە ئێمە نیگامان بۆ ئەو ناردووە وەکوو چۆن نیگامان بۆ نوح[١]و پێغەمبەرەکانی دوا ئەو کردوە، هەروا نیگامان بۆ ئیبراهیمو ئیسماعیلو ئیسحاقو یەعقووبو کوڕەکانی یەعقووب کردوە هەروەك نیگامان بۆ ئەییوبو یونسو هارونو سولەیمان ناردووە (داود)یش زەبورمان بۆ ناردووە[٢] هەروا چەند پێغەمبەرێکی تریش کە بڕێکیان سەر گوزشتەکانیمان بۆ گێڕاویتەوەو هێندێکیشیان باسمان بۆ نەکردوی. خوای گەورە لەگەڵ موسادا هەر راستەوخۆ قسەو گفتو گۆی کردو نیگای بۆ نارد. ئەم پێغەمبەرانە هەموو مژدە دەرو ترسێنەری هۆزەکانیان بوونو بەتەواوی ئەرکی سەر شانی خۆیانیان ئەنجامداوە، تا ئەو هۆزانە ئەو گرۆهانە رۆژی رەستاخیز بەڵگەیان لە حوزور خوادا نەبێو بیانوو مەهانەیان بڕێو نەڵێن: ئەمان زانیوەو ئاگامان لەم چەندو چوونە نەبووە. خوای گەورە هەموو کارو بارێکی رێكو پێکەو بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵات دارەو ئیشی هەموو پڕ حیکمەتن.

---

[١] ناوهێنانی حەزرەتی نوح لێرەدا بە تایبەتی دەڵێن لەم رووەوەیە کە ئەم حەزرەتە یەکەم پێغەمبەر بووە کە یاساو قانوونی لەسەر دەست بڵاو بۆتەوە.

[٢] زەبوور دەڵێن سەدو پەنجا سورەت بووە هەمووی هەر پەندو ئامۆژگاری بووە هیچ باسی حەرامو حەڵاڵی تێدا نەبووە لای لە حوکمو قانوون نەکردۆتەوە.

جا ئەگەر یەکێکی دڵ ڕەشی بیانوو گری زۆر بڵێ، بڵێ: دەی باشە کە خوا بۆ هەموو پێغەمبەرەکان هەر یەك جۆرە نیگای ناردووە ئەی بۆچی ئەم هەموو جیاوازییە لە ئایینەکاندا بەرپا بووە؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: قورئانی پیرۆز بۆ خۆی وەڵامی ئەم جۆرە گێرە شێوێنانەی داوەتەوەو چەند بەڵگەیەکی زانستانەو ڕاست ئامێزی خستۆتە روو ڕاستو خراپی لێك جیا کردۆتەوەو حەقو بەتاڵی لێك هەڵاوێراوە.

## هەموو ئایینەکان بانگەوازییان بۆ تاكو تەنهایی خودا کردوە

هەموو ئایینی پێغەمبەرەکانی پێشوو بانگەوازی خوا بەیەك ناسینیان کردوە، قورئانی پیرۆز لە چەند ئایەتێکدا داکۆکی لەسەر ئەوە دەکا کە پەروەردگار هیچ پێغەمبەرێکی نە ناردووە ئیللا داوای خوا بە تاکو تەنیا ناسینیان کردوە هەموو بانگەوازی هۆزەکانیان کردوە کەخوا بەیەك بزانن‌و شەریکی بۆ ڕەوا نەبینن، لەم بارەوە چەند ئایەتێك لە قورئاندا هەیە:

خوا بە پێغەمبەر دەفەرموێ:

{وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَـٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ - سورة الأنبياء/ ٢٥}:

واتە: ئەی محمد! ئێمە لەپێش تۆوە هیچ پێغەمبەرو فرستادەیەکمان نەناردووە بە دینێکی جیاواز لە ئایینی تۆ، بەڵکوو بۆ هەموویان نیگامان کردوە کە هیچ خوایەك نیە مەگەر من نەبێ تاعەتو عیبادەت هەر بۆ من بکەن هەر لەسەر ئەم بنەمایەیە کە خوا ئەمر دەکا بە پێغەمبەر کە بانگەوازیی جولەکەکان‌و مەسیحییەکان بکاو پێیان بڵێ:

{قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ - سورة آل عمران/ ٦٤}:

واتە: ئەی محمد! بەو گەلانە بڵی کە کتێبی ئاسمانییان بۆ نێردراوەو فرستادەی خوایان چۆتە ناو، بانگی جولەکەو مەسیحییەکان بکەو بڵێ:

وەرن با هەمووومان بەیەکەوە لەسەر ئایینی ئیسلام کە ئایینێکی پڕ دادو ئینصافە خڕببینەوەو پەیمان بدەین: کە بەندایەتی غەیری خوا نەکەین و کەسی تر نەکەین بە خودای خۆمان وەك ئێوە ئەو مالووم و قەشەو راهیبانەی خۆتانتان کردوە بە جێنیشینی خوداو بە ئارەزووی خۆیان شتتان بۆ حەڵاڵ و حەرام دەکەن، جا ئەگەر ملیان نەداو پشتیان هەڵکرد پێیان بڵێ هەر کەسە کاری خۆی بۆ خۆی و بزانن و ئاگادار بن کە ئێمە موسوڵمانین و گەردن کەچی فەرمانی پەروەردگارین و دڵسۆزانە بەندایەتی دەکەین. پوختەی وتە ئەوەیە: کە قورئان لەم ئایەتانەدا داکۆکی لەسەر ئەوە دەکا کە خوای گەورە هەچ پێغەمبەرێکی ناردبێ فەرمانی پێ کردوە کە بۆ خوا بەیەك ناسین بانگەواز بکەن و خوا بە تاکوو تەنیا بناسن، کەوابوو جگە لە خوا بەیەك ناسین شتێکی تر کە بەدەم پێغەمبەرەکانەوە هەڵبەسترابی دوور لە ئایینەو هیچ پێغەمبەرێك بانگەوازی خوایی نەکردوە.

## جیاوازیی لە ئایینەکاندا بەهۆی سەرپێچی و زیادە ڕەوییەوە

ئایینی خوا یەکەو نابێ بە دوو، هەموو پێغەمبەرەکانیش بانگەوازیان بۆ یەك ئایین کردوە، ئەویش ئایینی ئیسلام بووە. ئەو جیاوازی و دوو بەرەکییەی کە بە درێژایی رۆژگار لە دیندا پەیدابووە بەهۆی سەرپێچی کردنی مەردوومەکەوە بووەو لە زییادەڕەوی ئەوانەوە رووی داوە، بە تایبەتی بەهۆی ئەوانەوە بووە کە خۆیان سەپاندووە بەسەر دینەکەداو خۆیان داناوە بەسەر کارو کاربەدەستی سەر ئایینەکە.. چونکە خۆیان بە ئارەزوو گۆڕانکارییان تێدا کردوە، چۆن لەگەڵ مەبەست و بەرژەوەندییان گونجابێ ئاوا، بە چ شێوەیێك دنیا

خواردنو بەرزبوونەوەو پەیداكردنی پلەوپایەی دنیاییيان بۆ ئاسان بووبێو بە ئامانجی گلاّوی خۆیان گەییشتبن بەو شێوە گۆڕانكارییان لە ئاییندا كردوە.

حەزرەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە ڕوونی ئەم لایەنەی ئاشكرا كردوە، هەموو نەخۆشیەكانی كۆمەلاّنی سەر زەوی دەرخستووە، بەگشتی بانگەوازی ئادەمیزاد دەكا بۆ ئەوەی هەموویان لەسەر یەك ئایین كۆببنەوەو یەك خوا بپەرستنو روو بكەنە یەك قیبلە، ئەوەتا قورئان بە ئاشكرا دەلێ:

{إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللّهِ الإِسْلاَمُ وَمَا اخْتَلَفَ الَّذِينَ أُوْتُواْ الْكِتَابَ إِلاَّ مِن بَعْدِ مَا جَاءهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ وَمَن يَكْفُرْ بِآيَاتِ اللّهِ فَإِنَّ اللّهِ سَرِيعُ الْحِسَابِ، فَإنْ حَآجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلّهِ وَمَنِ اتَّبَعَنِ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوْتُواْ الْكِتَابَ وَالأُمِّيِّينَ أَأَسْلَمْتُمْ فَإِنْ أَسْلَمُواْ فَقَدِ اهْتَدَواْ وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ وَاللّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ - سورة آل عمران/ ٢٠}:

واتە: لەلای خوا دینی بەڕاستی هەر ئیسلامەو خوا هەر ئەم ئایینەی بەلاوە پەسەندە، لە هیچ كەسێكی كە دینێكی تر وەرناگرێ.

ناكۆكیو دوو بەرەكی نەكەوتە نێوان جولەكەو فەلەكانەوە تا ئەو دەمەی فەرمانیان پێكرا كە خوا بەیەك بناسنو گەردن كەچی فەرمانی بن، كاتێ كە ئەمەیان پێ گوترا لەبەر لووت بەرزی خۆیان، پشتیان هەلّكردو ملیان نەداو لەناو خۆیاندا لێیان بووە دوو بەرەكیو جیاوازییان كەوتە ناوەوەو گومانیان لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرەكان پەیداكردو بڕوایان بە خوایەتی خوا نەكرد!! خۆ كەسێكیش بڕوای بە خوا نەبێ خوا تۆلّەی لێ دەستێنێو سزای دەداو هیچی لێ ون نابێ، خوا زۆر بەزوویی حیسابو كیتابیان بۆ دەكا.

جا ئەگەر ئەو كافرانە هەر لەسەر رای پووچی خۆیان سوور بوونو بەلّگەی لاوازی خۆیان دەهێنایەوەو ملیان نەداو نەهاتنە سەر رێبازی راستی ئیسلام، تۆ بلێ: ئێوە كەیفی خۆتانە، منو ئەوانەی لەگەلّ منیش دان گەردن كەچی پەروەردگارین شوێن فەرموودەكانی دەكەوینو هەمووومان موسولّمانین، یەك دلّو یەك باوەڕین.

ئـەی محمـد! دووبـارە جـارێكی تـریش بانگـەوازیی جولەكـەو نەصـرانییەكانو كافرەكـانی قـورەیش بكـەرەوە، داوایـان لێ بكـەو پێیـان بڵـێ: وەرنـە سـەر ئـایینی ئیسلامو باوەڕم پێ بهێنن، جا ئەگەر هاتن بـە دەنگتـەوەو موسـوڵمان بـوون ئـەوە باشەو جێی خۆیەتی، ئەگەر پشتیان هەڵكردو گوێیان پێ نەدای، ئەوە تۆ ئـەركی سەرشانی خۆت ئەنجام داوە، خواش بۆ خۆی ئاگای لەهەموو كردارێكی بەنـدەكانی هەیەو هەر كەسە بـە گوێرەی كـردەوەی خـۆی رۆژی رەسـتاخیز حیـسابی لەگـەڵ دەكاو سزای دەداتەوە، چاكە بە چاكەو خراپە بە خراپە!!

جا ئەگەر هەموو ئایینەكان لە بنەڕەتدا یەك بنو جیاوازیو دژایـەتییان تێـدا دروست نەبێ، كەوابوو ئەو دوو بەرەكیو نیزاعو جیاوازییەی پەیـدابووە لـەنێوان شوێن كەوتووانی ئـایینی مەسـیحیو یـەهودیو ئیـسلامیو پارچـە پارچـە بـوونی شوێن كەوتوانی هـەر یـەكێ لـەم ئایینانـەو دابـەش بوونیـان بـۆلای چـەند خـێڵو گرۆهـو پـارتو كۆمـەڵێكو پەیـدابوونی دوژمنایـەتی لـە نێوانیانـدا، هـەموو ئـەم كارانە دژی فەرمانەكانی خوایەو پەروەردگار پێیان رازی نییە.

چونكە خوا ئەم ئایینانەی ناردووە كە ببن بە مایەی ئاشتیو ئەمنو ئاسایش، بۆئـەوەی نـاردوون كـە لەسـەر رووی زەوی ببنـە هـۆی بڵاوبوونـەوەی برایـەتیو خۆشەویستی بۆ تاكو كۆمەڵ، نەك ببنە هۆی دووبـەرەكیو جیـاوازی، لـەم روەوە ئـایینی ئیـسلام بەسـەر رشـتەی پەیوەنـدی نێـوان گـەلان دەناسـرێ، دروشمـی برایەتیو خۆشەویستی بەرزكردۆتەوە، هەوڵ دەدا ئـەو حـەقو راسـتیەی كـە لێـی دوور كەوتونەتەوە بۆیانی بگێڕێتەوە، بانگەوازییان دەكا بـۆ ئـەوەی لەسـەر ئەمـە كۆببنەوەو بێنە ژێر ئالاكەیەوە، لەهەمان كاتدا قورئان موسوڵمانان ئەترسێنێ لـە ناكۆكیو دووبەرەكی، روویان تێ دەكاو دەفەرموێ:

{شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ اللَّهُ يَجْتَبِي إِلَيْهِ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ وَمَا تَفَرَّقُوا إِلَّا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى لَّقُضِيَ بَيْنَهُمْ وَإِنَّ الَّذِينَ أُورِثُوا الْكِتَابَ مِن بَعْدِهِمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ فَلِذَلِكَ فَادْعُ وَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَقُلْ آمَنتُ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِن كِتَابٍ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ اللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ لَنَا

أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ اللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ - سورة الشورى/ ١٣ - ١٥}:

ئائـەوە راسـتییەکەو قورئـان روونـی دەکاتـەوە، هـەموو ئـەو قـسەلۆك‌و پـڕو پاگەنـدەی ئـەو خـودا نەناسانە ئـەو جیـاوازی‌و دووبەرەکییـەی کـە لـە دینەکانـدا هەیەو پەیدا بووە دەکەن بە بەڵگە لەسەر پووچی‌و بـەتاڵی ئـایین‌و دەڵێن گوایـە چونکە لە ناوەڕۆك‌و بنەڕەتدا دژایەتییان تێدا دیارە مانای وایە دین راست نییە.

کەوابوو قسەی بۆش‌و پوچییان کـە دەڵێن: هـەموو پێغەمبـەرێك لـە گیرفـانی خۆیەوە ئاینێکی دژ بە ئاینێکی تری هێناوە، ئەم قسەیە لەگـەڵ راسـتی‌و واقیعـی ئاییندا کۆنابێتـەوە، لـە نـاوەڕۆکی ئایینـەوە دوورەو عـەقڵ وەری نـاگرێ، چـونکە وەکوو وتمان: دین لە بنەڕەتدا بە گوێرەی فەرموودەی قورئان هەر یەکەو ئەویش ئیسلامە. شـایانی باسـە کـە ئـەو جیاوازییـەی کـە بـە رواڵـەت لـەنێوان یاسـاو چۆنییەتی ئاینەکاندا هەیە، ئەوە بەهۆی جیاوازی باری کۆمەڵایەتی‌و رۆشـنبیری گەلەکان‌و رێژەی ئامادەیی عەقڵ‌و هۆش‌و بیریان بۆ وەرگرتنی فەرمانـەکانی خـوا بـووە. نـەك لـە خـوودی ئاینەکانـدا بـووە.. پوختـەی بـاس ئەوەیـە کـە خـودای پەروەردگار ئایینی ئیسلامی کردوە بە تەواوکەری ئایینی پێغەمبەرەکانی پێـشوو، کۆتایی هەموو دینەکانی بە ئیسلام هێنـاوە، بـە ئـایینی ئیـسلام ئایینـەکانی تـری سـڕیوەتەوە، ئیـسلام وەکـوو ئـایینێکی راسـت‌و دروسـت خـۆی چەسـپاندووە، چ دینێکـی تـر نیـە ئـەم نەسـخ بکاتـەوە، چـونکە ئیـسلام ئاینێکـە لەگـەڵ هـەموو پێشکەوتنێکی هۆش‌و بیری مرۆڤدا دەگونجێ، بەکاری هەموو رۆژگارێك‌و شوێنێك دێ، ئاینێکە لای خوا پەسەندەو جگە لەم دینە هیچ ئاینێکی تر پەسەند ناکا.

{وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ - سورة آل عمران/ ٨٥}:

واتە: هەر کەسێك لەدوای هاتنی پێغەمبەر حـەزرەتی موحەممـەد (درووودی خودای لەسەر بێ) ئاینێکی تر داوا بکاو یاساو قانوونێکی جیا لە ئیسلام پـەیڕەوی بکـا، خـوا لێـی وەرنـاگری‌و لـە رۆژی دوایـیدا بـە کـافرو خـوا نـەناس حـسێب دەکـرێ‌و خۆشـی بەهەشتی پێ ناگاو ماڵ وێران دەبێ!!

## بەشی دووەم:

# قورئانی پیرۆز (القرآن الكريم)

ئەم بەشە بریتییە لە شیکردنەوەی ئەم سەرە باسانە:

**مانای نیگاو دورخستنەوەی لەککە لێی – کۆکردنەوەی قورئان و نوسینەوەی – قورئان هیچی لێ نەگۆڕاوە – چۆن قورئان بۆ پێغەمبەر دەهات و مەبەست لەو شێوە هاتنە – قورئان بەرەنگاری ناکرێ – قورئان موجیزەیە – شێوەو وشە ئارایی قورئان – چەند لایەنێکی شێوازو وشە ئارایی و رەوانبێژی قورئان – چەند لایەنێك لە موجیزاتی قورئان – قورئان هەواڵی غەیبی تێدا هەیە – چیرۆك لە قورئاندا – ناوەرۆکی قورئان.**

قورئان نیگای خوایەو بۆ سەر فرستادەی خۆی کە حەزرەتی (محمد)ی کوڕی عەبدوڵلایەو پێغەمبەری ئاخر زەمانە نێردراوەتە خوارێ.

ئەم قورئانە (هەم شێوازی هەم مەبەستی، واتە بە لەفظو بە مەعناوە)بە شێوەی تەواتوور لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) بە ئێمە گەیشتووە، چۆن لە پێغەمبەرەوە بیستراوە ئاواش بە ئێمە گەیشتووە، زیادو کەمی تێدا نەکراوە.

قورئان دوا پەڕاوێکی ئاسمانییەو بەرنامەی ئایینەو سەرچاوەی ساف و بێ گەردی ئیسلامە.

جا پێش ئەوەی دەست بکەین بە شیکردنەوەی باسی قورئان پێویستە ئاوڕێکی خێرا لە مانای نیگا (وەحی) بدەینەوەو بزانین چۆن نیگا بۆ پێغەمبەر دەهات!!

## مانای نیگا (وەحی):

نیگا کردنی پەروەردگار بۆ پێغەمبەرو فرستادەکانی بریتییە لەوە پەروەردگار ئەو شتانەی کە دەیەوێ فێری ببن، بیخاتە دڵیانەوەو بەشێوەیەکی تایبەتی فێریان بکات.

**نیگا:** زانیارییەکە مرۆڤ لە دەروونی خۆیدا هەستی پێ دەکاو بڕواشی وایە کە ئەم زانستیە لە خواوە بۆی هاتووە جا یا بەهۆی فریشتەوە یا بەبێ فریشتە،

لە شێوەی دەنگێکدا یان بەبێ دەنگ، جیاوازیی نێوان ئیلهام و نیگا ئەوەیە هەرچی ئیلهامە بریتییە لە زانستییەك کە لە دەروونا پەیدا دەبیو جێگیر دەبێ، بەلاَم نازانێ لە کوێوە ئەم زانستییەی بۆ پەیدا بوو، واتە چۆن مرۆڤ هەست بە برسییایەتیو تینوایەتیو کەیف خۆشیو دڵ ناخۆشی دەکا بەو شێوەیەش هەست بە ئیلهام دەکا جا ئەم پێناسەیە هەر سێك شێوە نیگاکانی کە خوا لە ئایەتی (٥١)ی سورەتی شوڕادا باسی کردوە دەگرێتەوە، کە دەفەرموێ:

{وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَاء حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاء إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ - سورة الشورى/ ٥١}:

واتە: بۆ ئادەمیزاد نەهاتووە کە لەگەڵ خوادا گفتو گۆ بکا مەگەر بە یەکێ لەم سێ شێوەیە:

(١) لەسەر شێوەی نیگا بەم شێوە زانیارییەکەی بخرێتە دڵیەوە.

(٢) یان لە پاشی پەردەوە بەم شێوەیە قسەی خوا ببیستێ بەلاَم نەزانێ لە کوێوە دێ. وەکوو گفتوگۆی پەروەردگار لەگەڵ حەزرەتی موسادا.

(٣) بەم شێوە فریشتەی تایبەتی نیگا لە خواوە نیگاکە بێنێ بۆ پێغەمبەر ئەو کاتە فریشتەکە لە شێوەی پیاوێکا دێتە پێش چاوی پێغەمبەر یان هەر دەنگەکەی دەبیسرێو نابینری بەلاَم پێغەمبەر بە دڵ لە دەنگەکە تێ دەگا.

## جۆرەکانی نیگا (وەحی):

دەربارەی چۆنیەتی هاتنی نیگا بۆ پێغەمبەر کتێبەکانی حەدیثی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) شێوەو جۆری نیگایان بەتەواوی رون کردۆتەوە، پوختەی فەرموودەکان بریتین لە:-

١- نیگا لە شێوەی خەونی راستدا، ئیمامی بوخاری لە کتێبی صەحیحی خۆیدا حەدیسێك لە عائیشەوە لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ:

(أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَ الْوَحْيِ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ فِي النَّوْمِ ، فَكَانَ لاَ يَرَى رُؤْيَا إِلاَّ جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ):

واتە: سەرەتای دەست پێکردنی نیگا ناردنی پەروەردگار بۆ پێغەمبەر لە شێوەی خەون بینینی باش بوو، هەر خەونێکی بدیبایە وەك دوخ راست دەردەچوو بە رەنگی سپیایی بەیانی دەدرەوشایەوە.

٢- بەشێوەی ئەوە کە فریشتەی نیگا ماناو زانیاری پێویست بخاتە دڵی پێغەمبەرەوە بەبێ ئەوەی کە پێغەمبەر فریشتەکە ببینێ:

وەکوو پێغەمبەر بۆ خۆی فەرموویەتی:

(ان روح القدس نفث في روعي انه لن تموت انس حتى تستكمل رزقها فأتقوا الله واجملوا في الطلب ولا يحملنكم استبطاء الرزق على ان تطلبوه بمعصية الله فأن ما عند الله لا يطلب الا بطاعته):

واتە: گیانی پاك کە جوبرائیلە چپانی بە گوێی دڵماو بە نیگا پێی گوتم: کە هیچ گیانلەبەرێ نامرێ تا بە تەواوی رۆزیی خۆی نەخوا، کەواتە شەرمو شکۆ لە خودا بکەنو کە نیازو مرازتان عەرزی بارەگای حەق دەکەن بە جوانیو بەپێی شەرع عەرزی بکەن، ئەگەر هاتوو رزقو رۆزیتان کەمێ کووڕ بوو، درەنگ دەهات بۆتان، نەچن بە شێوەی ناڕەوا هەوڵی بۆ بدەنو بە گوناه پەیدای بکەن، چونکە رزقی باشی لای خودا تەنیا بە طاعەتی خودا دەردەست دەکرێ. (١)

٣- جۆرێکی تر لە (وەحی) لە شێوەی بیستنی دەنگێکدا بووە وەکوو دەنگی جەرەس پێغەمبەر بۆ خۆی تێی گەیشتووە.

٤- جۆرێکی تر لە نیگا ناردن بەم جۆرە بووە کە جوبرائیل لەشێوەی پیاوێکا هاتووەتە خزمەت حەزرەتو نیگای بۆ هێناوە، لە کتێبی صەحیحی

بوخاریداهاتووە دەفەرموێ: رۆژێك حاریثی کوڕی هیشام (رەزای خوای لێ بێ) پرسیاری لە پێغەمبەر کردو وتی: ئەی فرستادەی خوا! چۆن چۆناهی نیگات بۆ دێ؟ پێغەمبەر فەرمووی: جاری وا هەیە نیگام بۆ دێ وەکوو دەنگی زەنگ وایە، ئەم شێوە نیگایە زۆر لەسەر شانم قورسەو ماندووم دەکا، کە تەواو دەبێ دەبینم چی گوتووە هەمووم لەبەرە، جاری واش هەیە فریشتەی وەحی خۆی لەشێوەی پیاوێکدا نیگام بۆ دێنێ چی دەڵی هەمووی تێ دەگەم.

٥- جۆرێکی تر لە نیگاکردن ئەوە بووە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فریشتەی نیگا هێنەری لەسەر شێوەی خۆی بینیوەو نیگای لێ وەرگرتووە.

٦- جۆرێکی تر ئەوە بووە کە پەروەردگار راستەوخۆ (بەبێ ناوندیار) نیگای بۆ پێغەمبەر کردوە وەکوو ئەو نیگایەی کە پێغەمبەر شەوی میعراج لە ژوور ئاسمانەکانەوە دەربارەی فەرزکردنی نوێژو شتی تر لە یەزدان خۆیی بیست.

٧- جۆرێکی تر لە شێوەکانی نیگا گفتو گۆی خودا لەگەڵ پێغەمبەرە لە پشت پەردەوە بەبێ ئەوەی کەسێکی تر لە نێوانیاندا هەبێ، وەکوو چۆن لە پێش پێغەمبەری خۆمانا خودای مەزن بە نیگا گفتو گۆی لەگەڵ حەزرەتی موسادا کردوە.

## پووچەڵ کردنەوەی گومان دەربارەی نیگا (دحض شبهة عن الوحي)

لەمەوبەر پوختەیەك باسی نیگامان لە حەدیثی پێغەمبەر خۆیەوە راگوێزی ئێرە کردو جۆرەکانیمان نوسین، ئێستا پرسیارێك (کە لەدڵی زۆر کەسی بی بڕوادا چەکەرەی کردوە) دێتە پێشەوەو سەر هەڵدەدا، پرسیارەکەش ئەوەیە: ئایا ئەوەی کە بۆ پێغەمبەر دەهاتو هەستی پێ دەکردو مەشهوورە بە (وەحی) نیگا تارمایەکی خەیاڵی و دەروونی بووە؟ یان راستییەکی واقیعی بووە؟ لە ڕاستیدا بونێکی حەقیقی چەسپاوی هەبووە؟!!

بەڵێ راستە هەر کەسێ وردببێتەوەو تێ بفکرێ دەبینێ زۆر جۆرە نەخۆشی هەن بەتایبەت هەستیریا (فێ) کە تووشی مرۆڤ دەبێ چۆنیەتییەك بۆ مرۆڤەکە پەیدا دەبی بەهۆی ئەوەوە چەند شێوەو شکڵو سەرو سیمایێك دێتە پێش چاوی، لە تارمایی خەیاڵی بەولاوە هیچی تر نییە، کەچی لە نەخۆشەکەش وایە بونێکی واقیعییە: جا لەبەر ئەم بیانووە برێك لە نووسەرە رۆژ ئاواییەکان زۆر بێ شەرمانەو راشکاوانە بە ئەنقەست یان لەبەر نەزانی ئەو نیگایەی بۆ پێغەمبەر هاتووەو ئێمە بەلامانەوە نیگای خوایی بووە، ئەوان بە جۆرێك لە نەخۆشی هەستیریایان حسێب کردوە پێیان وایە پەرکەم بووە. بەبێ ئەوەی کە هیچ بەڵگەیەکی زانستییان بە دەستەوەبێ، وەڵێ وەك بە بەڵگە لە دواوە دەیسەلمێنین گێرانەوەی نیگا بۆ خانەی نەخۆشی هەستیریا جگە لە نەزانینو نەشارەزایی لە چۆنیەتی نیگای خوا بۆ پێغەمبەرو جگە لە سەرپێچی کردنی کوێرانە لە حەقو راستی جگە لەمانە بەولاوە هیچ لایەنێکی زانستیو زەمینەیەکی واقیعی پاڵپشتی ناکا بەڵگەشمان لەسەر ئەم بڕیارو رایەمان ئەمانەیە:-

أ/ بزرکاندنو هەستیریا کاتێك دەبێ کە کۆمەڵێك کردەوەی نابەجیو هەڵسو کەوتی شێتانە بە کردارو گوفتار لە نەخۆشەکە رووبداو دەرکەوێ، دەی قەت ئەم جۆرە شتانە لە پێغەمبەر رووی نەداوە.

ب/ ئەو کردەوە نابەجێیانەی کە بەهۆی نەخۆشی هەستیریاوە پەیدا دەبن هاوکاتن لەگەڵ پەیدابوونی نەخۆشییەکە، کە لە نەخۆشییەکە رزگاری بوو هیچ شتێکی لەو کردارو گوفتارانەی کە لەکاتی نەخۆشییەکە لێی روو داوە لەبیری نامێنێ، دەی باشە ئەمە لەگەڵ چۆنیەتی نیگا هاتن بۆ پێغەمبەردا ناگونجێو پێچەوانەیە، چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی وەحیدا بی دەنگو کشو مات بووە، کە نیگاکە تەواو بووە ئیتر بەرێكو پێکی چی بۆ هاتووە هەمووی بە رەوانی خوێندۆتەوەو بە هاورێکانی راگەیاندوەو ئەوانیش لەبەریان کردوەو نووسیویانەتەوە.

ج/ ئەو شتانەی کە لەسەر زوبانی خەستەیەکی هەستیریاوی دەربچێ بە رواڵەت لە زەین دۆزیەکی (تصورات) ئەندێشەیی تێپەڕ ناکا، بە زۆریش ئەو قسانە لەگەڵ ماندویەتی مێشکی نەخۆشەکە دەگونجێن و لە شەکەتی ئەوەوە هەڵدەستن، وەکوو ئەو نەخۆشە لە حەیبەت ئازارو کوشندەیی دەردەکەی چەند تارمایەکی شەیاتینی و دێوو درنج دەبینێ و دێنە پێش چاوی بە خەیاڵی خۆی هەڕەشەی کوشتنی لێ دەکەن و دەیترسێنن بەلێدان ئازاری دەدەن، یان بە گاڵتە پێکردن و گەمە ژیانی لێ تێك دەدەن، دەی تا ئێستا نەزانراوەو نە بینراوەو نەبیستراوەو رەچاونەکراوە کە کەسێك نەخۆشی هەستیریای هەبێ و لە هەمان کاتا ئەخلاق و رەوشتی جوان و یاسای رێك و پێك و رێنومایی بۆ چاکەکردن بلاو بکاتەوە. ئیتر چۆن دەبێ گومانی ئەوە ببرێ کە ئەو نیگایەی بۆ پێغەمبەر هاتووە جۆرێك بووە لە نیشانەو دیاردەی نەخۆشی هەستیریا؟!

## دەست پێکردنی هاتنە خوارەوەی قورئان:

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەتەنیا دەچوو بۆ ئەشکەوتی حەررا، توێشووی لەگەڵ خۆی دەبردو چەند شەوێك دەمایەوە، خوا پەرستی ئەکرد، کە توێشوەکەی تەواو دەبوو دەهاتەوە بۆ ماڵ و هەندێکی تری دەبردەوە، ئالەم کاتەدا بۆ یەکەم جار ئەم ئایەتانە:

{اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ، خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ، اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ، الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ، عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ}.

هێنراون بۆ پێغەمبەرو گوێچکەو دڵی ئەو فرستادە مەزنەیان پی ئاشنا بوو، ئیتر بە گوێرەی روداوو پێویستی رۆژ، پەیتا پەیتا قورئان بەش بەش بۆ پێغەمبەر دەهات، تا لەماوەی بیست و سی ساڵێکدا هاتنە خوارەوەی قورئان تەواو بوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەمووی وەرگرت و بەناو هاورێکانیدا بلاوی کردەوە..

قورئـانی پـیرۆز لەچـەند سـورەتێك پێـك هـاتووە سـورەتیش بـۆ خـۆی پارچەییکە لە قورئان‌و لەسێ ئایەت یان زیاتر پێك هاتووە.

ژمـارەی سـورەتەکانی قورئـان (١١٤) سـورەتن‌و هـەموو سـورەتێکیش نـاوی تایبـەتی خـۆی هەیـە، برێکیـشیان زیـاد لەیـەك نـاوی هەیـە، بـۆ نموونـە سـورەتی (فاتیحـة) پێـی دەگـوترێ (أم القـرآن) پێـشی دەگـوترێ (الـسبع المثـاني) ناونـانی سـورەتەکان جـاری وا هەیـە لـە یەکـەم وشـەو سـەرەتای سـورەتەکە خۆیـەوە وەرگـیراوە، جـاری واش هەیـە چـیرۆك‌و رووداوی تایبـەتی‌و ئـەحکامی شـەرعی دەورێکـی بالآیـان هـەبووە لـە ناونـانی سـورەتەکە بـە ناوەکەیـەوە.. سـورەتەکانی قورئـان تێکـڕا دەکـرێن بـە دوو بەشـی سـەرەکییەوە ئـەو سـورەتانەی کـە پـێش کۆچـکردنی پێغەمبـەر بـۆ مەدینـە هاتوونـە خـوارێ پێیـان دەگـوترێ (مـەککی) مەککەیی. ئەوانەیشیان کە لـە دوای کۆچـکردن هاتوونـە خـوارێ پێیـان دەگـوترێ (مەدەنی) مەدینەیی.

## نوسەرەکانی قورئان (كُتاب القرآن):

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ نوسینەوەی قورئان چەند نوسـەرەوەیەکی دەست نیـشان کردبـوو، چـی لـە قورئـان دەهاتـە خـوارێ پێغەمبـەر بـۆی دەخوێندنـەوەو ئـەوانیش دەیـان نوسـییەوە، بـەناوبانگترینی ئـەم نوسـەرەوانە جـێ نـشینەکانی پێغەمبەر: ئەبوبەکرو عومەرو عوثمان‌و عەلی بوون هەروا زەیـدی کـوڕی ثابیـت‌و ئوبـەی کـوڕی کـەعب‌و موعاوییـەی کـوڕی ئـەبو سـوفیان‌و یەزیـدی کـوڕی ئـەبو سوفیان‌و موغەیرەی کوڕی شوعبەو زوبەیری کوڕی عەوام‌و خالیدی کوڕی وەلیـد بوون.. ئەم زاتانە ئایەت‌و سورەتەکانی قورئانیان دەنووسیەوە، لەسەر هەر شـتێك کـە بـەکاری لەسـەر نووسـین بـێ: وەکـوو لقـە دار خورمـاو بـەردی پـان‌و تـەنك‌و ئێـسکی لاشـان‌و شـەپیلکی وشـترو بـزن‌و هـەر شـتێکی تـر لـەم جـۆرە بابەتانـە.. پێغەمبــەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بــۆ خــۆی نووســەرەوەکانی شــارەزا دەکــرد بــۆ شــوێنی نوســینەوەی هــەر ئایــەتێك لــە ســورەتەکەیداو چــاوەدێری ئیــشەکەیانی دەکــرد.

شایانی باسە بڕێك لە هاوڕێیانی پێغەمبەر لە سەردەمی ژیانی پێغەمبەردا هەموو قورئانی لەبەر بوو، واتە دەیتوانی لە سەرەتاوە بۆ کۆتایی (بەو تەرتیبەی کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ نوسینەوەکەی دانابوو) دەوری بکاتەوەو لەبەر بینووسێتەوە لەمانە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودو سالمی کوڕی مەعقیل (مولى ابي حذيفة)و مەعاذی کوڕی جەبەلو ئوبەییەی کوڕی کەعبو زەیدی کوڕی ثابیت بە ناوبانگنو مەشهورن.

## کۆکردنەوەی قورئانو نوسینەوەی لە پەڕاودا:

لە سەردەمی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) لەناو پەڕاوێکا قورئان کۆ نەکرایەوە، چونکە هێشتا حەزرەت لە ژیاندا بوو، تا ئەویش لە ژیاندا بوو هیوای زیاد بوونی نیگاو هاتنە خوارەوەی بەشێ تر لە قورئان چاوەڕوان دەکرا، پاشان کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وەفاتی کردو لە دونیا دەرچوو، ئەو هیوایە بڕا، قورئانیش پارچە پارچە لەسەر تەنکە بەردو لقی دارخورماو ئێسقانو شتی وا نوسرابووەوە، هەروەها لە سینگی قورئان لە بەرەکانیشدا پارێزرابوو، زیاد لەوە زوربەی هاوڕێکانی پێغەمبەر کەم تا زۆر قورئانیان لەبەر بوو. جا کە ئەبوبەکر کرا بە جێ نیشینو فەرمانڕەوای موسوڵمانان، لە سەردەمی جێ نشینی ئەمدا زۆر شەڕی پاشگەزبوەکان (حروب الردة) رویدا، یەکێك لەو شەڕە سامناکانە شەڕی (یەمامە) بوو: کە زۆر لە قورئان لەبەرەکانی تێدا کوژرانو گیانی خۆیانیان لە رێگای ئیسلامدا بەخت کرد. لەمەوە ئیمامی عومەر ترسی لێ نیشت کە بە کوژرانی قورئان لەبەرەکان قورئان بفەوتێ. بۆیە داوای لە حەزرەتی ئەبوبەکر (خودای لێ رازی بێ) کرد کە فەرمانبدا بە کۆکردنەوەی قورئانو لە کتێبێکی تایبەتیدا کۆی بکاتەوە بکرێتە کتێبێکی تایبەتی!!

حەزرەتی ئەبوبەکر لە سەرەتادا دوو دڵ بوو، بەلایەوە گران بوو ئیشێك بکا کە پێغەمبەر لە ژیانیدا نەی کردبێ، بەڵام دوایی رای گۆڕیو پێشنیارەکەی ئەوی پەسەند کردو بانگی زەیدی کوڕی ثابیتی کرد ئەم ئەرکە پیرۆزەی خستە

ئەستۆی ئەو، چونکە زەید لە هەموو هاورێکان زیاتر لە خزمەت پێغەمبەردا دانیشتووەو لە هەمووان زۆر تر ئامادەی کۆڕو مەجلیسی بووە، زیاتر ئاگای لە هەڵس‌و کەوتی حەزرەت بووە، زیاد لەمەش لە هەمووان زیاترو باشتر قورئانی لەبەر بوو، بۆیە ئەم کارە پیرۆزە روو بە رووی ئەو کرایەوە، ئیتر زەیدی کوڕی ثابیت زۆر چالاکانەو لێهاتوانە بە کارەکە هەڵساو هەموو قورئانی بە جوانی‌و رێك‌و پێکی کۆکردەوەو لە دەفتەرێکا نوسییەوەو سپاردی بە حەزرەتی ئەبوبەکر، ئەمیش ئەم نوسخە قورئانەی لای خۆی گل دایەوەو لەلای خۆی پاراستی، لەکاتی پێویستدا موسوڵمانان دەگەڕانەوە بۆ سەر دەقەکەی.

پاشان کە حەزرەتی ئەبوبەکر دنیای بەجێ هێشت‌و ئەو نوسخە قورئانە کەوتە لای حەزرەتی عومەر ئەویش دوایی لەلای خاتوو حەفسەی کچی داینا. لە سەردەمی حەزرەتی عوسماندا موسوڵمانان بەچوار دەوری دونیادا بڵاوبونەوە، زۆر لە گەل‌و هۆزەکانی سەر زەوی موسوڵمان بوون، ئیتر بەهۆی جیاوازیی زمان‌و زاراوەی ئەو گەل‌و هۆزانەوە جیاوازی کەوتە نێوان قورئان خوێنەکانەوە، هەریەکە بەجۆرێك قورئانی دەخوێندەوە. بۆ نمونە وشەی (تابوت) هەندێك بە (تابوت)یان دەخوێندەوەو بڕێکیش بە (تابوة)یان دەخوێندەوە. زۆر نمونەی ئاوا روویداو زۆر شت لەم بارەوە بەر گوێی حەزرەتی عوسمان کەوتەوە، تا بشهاتایە جیاوازییەکە زیاتر پەرەی دەستاندو تەشەنەی دەکرد، ئیتر حەزرەتی عوسمان بڕیاریدا ئەم جیاوازییە نەهێڵی‌و فەرمانیدا ئەو نوسخە قورئانەی کە لەلای حەفصە بوو هێنایان.. ئەمجار بانگی سێ پیاوی قوڕەیشی کرد کە بە قورئان لەبەرو قورئان زان‌و قورئان رەوان بەناوبانگ بوون سەر لەنوێ نوسینەوەی قورئانی بەو شێوەی کە لە دواجاردا پێغەمبەر بۆ جوبرائیلی خوێندبووەوە خستنە ئەستۆو داوای لێ کردن بەو شێوە بینووسنەوە. لەگەڵ ئەمەشدا زەیدی کوڕی ثابیت (کە یەکێك بوو لەو سێ کەسە) هیچ ئایەتێکی نە دەنووسییەوە تا دوو شایەتی تر شایەتییان بۆ نەدایە کە ئەو ئایەتەیان لە دەمی موبارەکی پێغەمبەرەوە بیستووە.. ئیتر ئەو سی پیاوە موسوڵمانە خواناسە قوڕەیشییانە

چوار (نوسخە) یان شەش (نوسخە)یان بە ڕێك و پێکی نوسییەوەو دایانن بە حەزرەتی عوسمان، ئەویش بە دنیادا بڵاوی کردنەوە نوسخەیەکی بۆ مەککەو یەکێکی بۆ کوفەو یەکێکی تری بۆ شام نارد، نوسخەیەکیشی لە مەدینە هێشتەوە، بۆ خۆیشی نوسخەیەکی نوسیەوە بڕێکیش لایان وایە شەش نووسخە بوون نوسخەیەکی تری لێ ناردووە بۆ یەمەن‌و نوسخەیەکی بۆ بەحرەین ناردووە.

ئینجا حەزرەتی عوسمان (خوای لێ ڕازی بێ) فەرمانیدا، جگە لەو چەند دانەیە کە بە فەرمانی خۆی دەسنووس کرابوون، چی شتی تر هەیە، کە قورئانیان لێ روو نووس کرابو، بیسووتێنن، یا بیفەوتێنن. ئەمجار ئەو حەوت نوسخە قورئانە کران بەسەر مەشق‌و بوون بە سەرچاوەیەکی بڕوا پێکراوو هەر کەسێ لەوەدوا بیویستایە قورئانێ بنووسێتەوە لەبەر یەکێ لەو نوسخانە یا لەبەر وێنەی ئەوان ڕوو نووسی دەکردەوە (١).

## قورئان گۆڕانکاری تێدا نەکراوەو دەستی لێ نەدراوە:

شتێکی رون‌و ئاشکرایە کە ئەو گرینگییەی موسوڵمانان بە قورئانیان داوە، تا ئێستا هیچ گەلێك لە جیهاندا بە هیچ کتێبێکی ئاسمانی یان ئەرزییان نەداوە، ئەو خزمەت‌و لێکۆڵینەوەو ڕافەو توێژینەوەی موسوڵمانان بۆ قورئانیان کردوە، تا ئێستا بۆ هیچ کتێبێکی ئایینی‌و نا ئایینی نەکراوە، ئەو چاوەدێری‌و ڕێزگرتنەی موسوڵمانان لە قورئانیان گرتووە هیچ کەس بۆ هیچ کتێبێکی تری نەکردوە! هەر لە ڕۆژی هاتنە خوارەوەی تا ئێستا چۆن بووەو چۆن هاتۆتە خوارێ ئاوا ماوەتەوەو نەگۆڕاوەو دەستکاری نەکراوە. هەموو کاتێ چاوەدێری خوای لە تەکا بووە، لە سەرەتادا هەر کە ئایەتێك یان چەند ئایەتێك دەهاتنە خوارێ، پێغەمبەر لەبەری دەکردن، پاشان بۆ هاوڕێکانی دەخوێندنەوە، ئەوانیش گەلێکیان لەبەریان دەکرد، ئەمجار فەرمانی دەکرد دەیەها قورئان خوێن دەیان نووسینەوە، نوسخەیان لێ دەگرتنەوە، بۆ خۆشی نوسخەیەکی لە ماڵی خۆیدا

گلدایەوە. لە لایەکی تـرەوە قورئـان وەکوو کتێبە پیرۆزە ئاسمانییەکانی پێش خۆیەوە نەبووە: کە هەر تایبەت بێ بە کۆمەڵێکەوە بە ئارەزووی خۆیان دەقەکانی بگۆڕن‌و بە گوێرەی بەرژەوەندی‌و مەبەستی شەخصی شەرح‌و راڤەی بکەن، هەرکاتێ ویستیان زیادو کەمی تێدا بکەن، بەڵکوو قورئان هەر لە یەکەم رۆژی هاتنە خوارەوەیەوە بە ناو موسوڵماناندا بڵاوکراوەتەوە، هەموو موسوڵمانێ توانیویەتی قورئـان لـە بـەربکاو بیخوێنێتـەوە، تەنانـەت موسـوڵمانان تێکـڕا فەرمانیان پێکراوە کە بیخوێننەوەو خوێندنەوەکەیشی بە تاعەت‌و عیبادەت حسێب کراوە، داوایان لێ کراوە بیکەن بە دەستورو یاسای ژیانیان هەموو کاتێك لەبەر دەستیاندا بێ‌و سەیری بکەن‌و لێی ورد ببنەوەو تێی بفکرن.. دەی کەوابێ چۆن گومان دەبرێ کە قورئـان گۆڕانکـاری تێدا کرابێ زیادو کەمی بەسەردا هێنرابێ‌و زوربەی موسوڵمانان لەهەموو کاروبارێکی ژیانیاندا قورئانیان کردبوو بە یاسای خۆیان‌و پەیڕەوی فەرموودەکانیان دەکردو بەموو لێیان لا نەدەدا..

لەسەرێکی ترەوە قورئـان پێش ئەوەی لە سەردەمی حەزرەتی ئەبوبەکردا کۆبکرێتەوە هەموو پارچە پارچە نوسراوەکانی لەلای پێغەمبەر هەڵگیرابوون، زوربەی هاوڕێیانیشی روو نووسیان لەلا هەبوو ئەمانە هەموویان رۆژانە لە ماڵی خۆیاندا دەوریان دەکردەوەو دەیانخوێندنەوە.. کاتێکیش حەزرەتی عوسمان کۆی کردەوە زوربەی ئەو قورئان لەبەرو قورئان نووسەرەوانە لە ژیاندا مابوون، دەی چۆن عەقڵ دەیگرێ‌و ڕێی تێدەچێ (لەگەڵ ئەم هەموو لایەنە ئیجابیانەی کە بۆ پاراستنی ئەم کتێبە پیرۆزە رەخساوە) گۆڕانکاری تێدا کرابێ‌و زیادو کەمی بەسەر دەقەکانیا هاتبێ؟! بە تایبەتی کە خوای پەروەردگار لە بارەی قورئانەوە دەفەرموێ:

{إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ}:

واتە: ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارێ بۆ پێغەمبەرو هەر خۆشمان چاوەدێری دەکەین‌و دەیپارێزین‌و ناهێڵین دەستکاری بکرێ.

چۆن قورئان هاتۆتە خواریّو مەبەست لەو شیّوە هاتنە خوارەوەدا چی بوو؟
قورئانی پیرۆز لەماوەی نزیکەی بیستو سیّ ساڵدا ئایەت ئایەتو سورەت سورەت بە گویّرەی پیّویست هاتۆتە خواریّ، جاری وا هەبووە ئایەتیّك یان چەند ئایەتیّك تا دە ئایەت بە گویّرەی روداوو پیّویستی هاتون بۆ پیّغەمبەر.. بۆیەش قورئان ئاواهی جویّ جویّو کەم کەم هاتۆتە خواریّ لەبەر ئەم هۆیانە:

أ/ تا باش بچیّتە دڵی عەرەبەکانی قورەیشەوەو وردە وردە سامیان لیّی بشکیّو پیّیەوە رابیّن.

ب/ بۆئەوەی بەتەواوی داماویّو دەست کورتی عەرەبەکان لەبارەی رەوانیو رەوان بیّژییەوە دەربکەویّ، چونکە ئەگەر بەوجۆرە جویّ جویّو کەم کەم نەهاتایە خواری، وا سەرکوت نەدەکرانو چاو بەرەوژیّر نەدەبوونو دەستەوسانیەکەیان بەو شیّوە ئاشکرا نەدەبوو، لەم روەوە ئەگەر قورئان هەموو بەیەك جار بهاتایە بۆ پیّغەمبەر ئەوکاتە عەرەبەکان لەوانەبوو سوکە عوزریّکیان بەدەستەوە بوبایەو بیان گوتایە ئەو کتیّبە دورودریّژە وا بەکوتوپڕی بەر هەڵستی ناکریّ، بەلاّم کە قورئان ئایەت ئایەتو کەم کەم دەهاتە خواریّو هەمووجاریّکیش ماوەیەك بەسەر دەچوو تا هەندیّکی تری لیّ دەهاتە خواریّو ئەو ماوەیەش بەشی ئەوەی دەکرد ئەگەر کەسیّك لە تواناى دا هەبیّ خۆ حازربکا بۆ بەرەنگاری سورەتەکە، جا کاتیّ لەگەڵ ئەم حاڵەشدا لەگەڵ هەبوونی ئەم ماوە زەمەنییەش دا، نەیان توانیبی بەرهەڵستی بکەن ئەوا زیاتر داماویّ دەستەوسانیان لە بەرامبەر شاکاری رەوانو رەوانبیّژی قورئاندا دەچەسپیّو دەردەکەویّ کە ئەو عەرەبانە هەرچەند بە زوبان دریّژو قسەزانو رەوانبیّژ بەناوبانگ بوون، هەتا بڵیّی لە گفتو گۆدا بە دەمو پل بوون، کەچی لە بەرامبەر بەلاغەتو فەصاحەتی قورئاندا لاڵو پاڵو بیّ برِشت بوون، بە تایبەتی سەرەتای نیگاو سورەتەکانی قورئان کە لە مەککەدا هاتوونە خواریّ، هەموویان سورەتی کورت کورت بوون.. هەشیانە تەنیا سی ئایەتی کورتیلە بوو، دەی کاتی ئەوان

نەتوانن بەرەنگاری سێ ئایەتی قورئان بکەن لەگەڵ ئەو هەموو قسە زانیو بە دەموو پلیو رەوان بێژییەدا کە هەیان بوو، دیارە کە قورئان موعجیزەیەو بەرەنگاری کردنی سەردان لەبەرد دانەو خۆماندوو کردنی بی هودەیە.

ج/ مەبەستێکی تر لە هاتنە خوارەوەی قورئان بەجیا جیاو لەوماوە دورو درێژەدا لەبەر ئەوە بووە تا عەرەبەکان وردە وردەو پلە پلە فێری یاساو ئەحکامی ئەو کتێبە پیرۆزە ببن. دڵو دەرونیان بە فەرمودەکانی رابێننو بە گوێرەی روداوو پێویستی لە گەڵیا رابێنو یاساکانی لە دڵیاندا بچەسپێ، بۆئەوەی بتوانرێ لە ناخەوە رەوشتو دابو نەریتی سەردەمی نەزانییان بە ئاسانی بگۆڕدرێ، چونکە عەرەبەکان پێش هاتنی ئیسلام لە بەرەڵلایەکی تەواو دابوونو بەبێ سنوور هەموو شتێکیان بەڕەوا دەزانی. ئەگەر بێتوو قورئان بە یەکجار بهاتایەتە خوارێ، فەرمان (حوکم)و ئەرکەکانی لەسەر شانیان زۆر قورس دەبوو، دڵو دەرونیان ئامادەی وەرگرتنی فەرموودەکانی نەدەبوون.

د/ هۆیەکی تر لەو هۆیانەی کەوای کردوە قورئان بەو شێوەیە بێ بۆ پێغەمبەر ئەوە بووە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بتوانێ بە باشی لە بەری بکاو لە مەبەستەکانی حاڵی ببێو تێیان بگاو لەسەر دڵی موبارەکی نەقش ببەستی، خوا بەوە دڵی ئەوی پی پتەو بکاو بتوانێ بەو دڵە بەهێزەوە بەرەنگاریی کافرو خوانەناسەکان بکا.. ئەوەتا خوای پەروەردگار لەم بارەوە بۆ خۆی دەفەرموێ:

**{وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً كَذَلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلًا - سورة الفرقان/ ٣٢}:**

واتە: بێ بڕواکان رەخنە دەگرنو دەڵێن: ئەم قورئانە ئەگەر راستە نامەی خودایە، ئەوە بۆچی وەك نامە ئاسمانیەکانی تر بەیەك جار بۆ موحەممەد نە نێردراوەتە خوارێ؟ ئەی خۆشەویست من خۆم وەڵامی ئەم پرسیارە غەرەزاوییەی ئەمانە دەدەمەوە، ئێمە بۆیە قورئانمان وا بە بەش بەشو جیا جیا بۆ ناردووی کە بە پێی پێداویستو سوودی هەموو لایێو لەکاتی پێویستدا،

سـورەتێ یـا چـەند ئایـەتێکمان لێ ناردۆتـە خـوارەوە بـۆ تـۆ، هـەتا سـەرەڕای بەهرەکانی تـری ئـەم کارە دڵو دەروونـی تۆشـی پـی پتـەو بکـەینو ئایـەت لـەدوا ئایـەت لـە دڵتـا بـچەسپێو نـەخش ببەستێ. بۆیـە هەمیـشە ئـەم قورئانـە بـە شێنەیی‌و لەسەرخۆ بەڕێك‌و پێکی بەسەر تـۆدا دەخوێنینـەوە، کـە وشـەو رسـتەو ئایەتـەکانی لـەناو سـورەتەکاندا وە هـەروەها لـەناو گـوێی بیـسەردا وەك دانـەی برنجی سەیری دانار دانار دەوەستێ.

ئەوەشمان لە یاد نەچێ کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەخوێندەوارو بێ سـەواد بووە، نوسین‌و خوێندنەوەی نـەزانیوە، لـە کاتێکـا پێغەمبـەرەکانی تـر خوێنـدەوار بوون‌و توانیویانە کە ئەو کتێبەی بۆیان نێـردراوە سـەر لەبـەر بەیـەکجار هـەزمی بکەن‌و وەری بگرن.

## قورئان داوای بەرامبەری دەکا (القرآن يتحدي):

ئەو نەحەددایەی قورئان بـە راشـکاوی‌و بـەبێ پـەروا لـە عـەرەب‌و ناعـەرەبی کرد ئەو دەستەی کە خستیە چاویانەوەو بە تەوسەوە پێی گوتن:

ئەگەر دەڵێن: ئەم قورئانە لـە خـواوە نـەهاتووە دەفـەرموو: ئێـوە ئـازابن بتـوانن نموونەیەکی ئەم دابنێن. یاخود بتـوانن سـورەتێکی وەکـوو سـورەتی ئـەم بخەنـە روو، کەچی نەیانتوانی‌و دۆش دامان.. ئـا ئـەم لـەخۆ رادیویـەی قورئـان‌و دەسـتە وەسـتانی ئەوان گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کـە قورئـان نیگـای خوایـەو دانـراوی مـرۆڤ نیە!! چـونکە عەرەبـەکان لـە خۆیانـەوە بـە شـێوەیەکی سروشـتی قـسە رەوان بـوون‌و رەوانبێـژییان خـۆش دەویـست‌و حـەزیان لـە هونـەری خـەبات‌و وتـاری هونـەری بـوو، ئەدەب دۆست‌و شیعر خۆشەویست بـوون. ساڵانەو وەرزانـە کـۆڕی رۆشـنبیری‌و شـیعر خوێندنەوەو پێشبڕکێی وتاردانیان دەبەست، ساڵی چـەند جارێـك لـە بـازاڕی عوکـازو شـوێنی تـر میهرەجـانی شـیعرو دەمـە دەمێیـان ئـەنجام دەدا، لـە هـەموو کـۆڕو کۆبونەوەیەکی جەماوەرییاندا شـاعیرەکانیان شـەڕە شـیعریان دەکـردو خەتیبـەکانیان لـە رەوان بێـژی‌و قـسە رەوانیـدا خۆیـان بـەتاقی دەکـردەوە، هەریەکـەیان بـە هـۆزی

خۆیدا هەڵ دەگوتو ڕێزی لە تیرەی خۆی دەنا. لەهەمان کاتدا چەند شاعیرێکی کارامەو لێهاتووی بێ لایەنیان دەست نیشان دەکرد بۆ هەڵسەنگاندنی شیعری شاعیرەکانو لە سەنگی مەحەکیان دەدانو پلەو پایەیان دادەنا بۆ ئەو شاعیرانەی کە لێهاتویی خۆیان دەچەسپاند. بە کورتی ئەم گرینگی پێدانەیان بە قسەی هونەری (شیعر یان پەخشان) دیاردەیەکی باوی ئەو سەردەمەیان بوو، کارێکی هەرە دیاری ئەو رۆژگارەیان بوو، لەبەر دوو شتی سەرەکی:-

أ/ ژیانی سارا نشینیو هاتووچۆیان لێرەو لەوێ بەدوا لەوەڕاندنی مەڕو ماڵاتیاندا هەلی دەنان بۆئەوەی زیاتر لە روبەری سروشت تی بفکرنو چاویان بە دیمەنی وڵات برێژن، تا کەفو کوڵی دەرونیان سەربکاو سۆزیان گەرم بێو هەستیان ناسك ببێ، بە ڕواڵەت ئەم شتانەش دەبنە هۆی شاعیریو هەڵ رشتنی قسەی ناسكو هەڵقوڵانی مانای ئەفسوناویو بزوتنی هەستی ناسکی وێژەوان.

ب/ ژیانی خێڵەکیو هۆز پەرستیو رەگەز پەرەستی هەلی دەنان بۆ خۆهەڵنانەوەو بەخۆوە نازینو لەخۆ رازی بوونو دەمەدەمێو مشتو مڕو کێشەو پێك هەڵپرژان.. هەروا بۆ تێك گیرانو بە گژیەکدا چوونو یەکتری کوشتن، ئەمەش وای لێ کردبوون کە زۆر پێویستیان بە شاعیری رەوانو قسەزانو زمان تیژو لێهاتوو ببێ، بۆئەوەی بەچەکی شیعر بە شمشێری زوبان داکۆکی لە بەرژەوەندی هۆزەکەی بکاو ستایشی جەنگاوەرانی خێڵو شکۆمەندیی شەهیدان دەربڕێ، لە پلەی خێڵەکەی بەرز بکاتەوەو ڕێز بۆ سەرۆکی هۆز بچەسپێنێ. لەم رووەوە ئەوپەڕی گرینگیان بە هونەری شیعرو خەتابە داوە، ڕێزی شاعیری رەوانبێژی بە بڕشتیان دەگرتو خەتیبی رەوانو قسەزانیان دەبردە کەشکەڵانی فەلەك.

ئا لەم کاتەدا قورئانی پیرۆز بەوپەڕی رەوانیو وشە ئارایىو مانا جوانیو وشەکاریو شێواز شیرینی هاتە خوارەوە تاوەکوو بچێتە دڵی دانیشتوانی دورگەی عەرەبییەوە کە ئەوکاتە کاتی پشێویو نەفامێتیو دوو بەرەکی بوو، چینایەتیو دەمار گیریو رەگەز پەرستی لەناویان رەگی داکوتا بوو... ئاشکراشە قورئان نەیدەتوانی سەرو دڵیان بگرێو زاڵ بێ بەسەریاناو کاریان تی بکاو بۆڕیان بدا،

ئەگەر لەرووی ماناو وشە ئاراییو رەوانیو گوزارە کارییەوە نەگەیشتایەتە ترۆپکی بەلاغەتو فەصاحەت بە جۆرێکی وا کە ئەو شاعیرو رەوانبێژانە هەست بە نەتواناییو دەستە وەستانی خۆیان بکەنو دەستەو ئەژنۆ دابنیشن لە بەرامبەریدا.. لە دابو نەریتی مرۆڤیشە هەرکاتێك لە بەرامبەریو زۆران بازیدا تێشکاو تێشکانەکەیشی لە شتێکدا بێو لە بارێکەوە بێ کە لەوە پێش خۆی پێوە بادابێو لافی کارامایی تێدا لێ دابی کەچی لەوەدا دەستە وەستان بوویو بڕشتی لێ برابێ، ئیتر وەکوو کەو دەچێو هیچ شتێکی تر ئەو تێشکانەی بۆ تێ هەڵ ناهێنێتەوە، ئەو کەلێنەی بۆ پڕ نابێتەوەو جارێکی تر ناتوانێ سەر بەرزبکاتەوەو گێژو وێژ دەبێو کەڕو لاڵ دەکەوێ هەر بۆیەشە کە عەرەبەکان دوای ئەوەی کە نەیان توانی لەڕووی رەوانبێژییەوە (کە چەکی هەرە گرینگی وان بوو) بەرەنگاریی قورئان بکەنو ململانێی لەگەڵدا سازدەن ملیان نایە خەتو بڕیاریاندا کە ئیتر ببڕای ببڕای جارێکی تر لەم بارەوە سەر هەڵ نەدەنەوەو لافی رەوانبێژی لێ نەدەن، بەڵکوو بە ناچاری پاش ماوەیێك گەردن کەچی ئیسلام بوون بەڵام لەگەڵ ئەوەشا لوت بەرزەکانی قوڕەیش لەبەر کەللە رەقی خۆیانو دەمار گیرییان نەدەهاتنە خەتەوەو بڕوایان بە پەیامەکەی (محمد) (درودی خودی لەسەر بێ) نەدەکرد، دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە لە دژی قورئان، جارێك دەیانگوت قورئان شیعرە، دەمێك دەیانگوت سیحرە چاخێك دەیانگوت ئەفسانەو چیرۆکە رزیوی کۆنەکانە پێغەبەریشیان بە شێتو فاڵ گرەوەو جادو باز حسێب دەکرد، بەڵام بەری رۆژ بە بێژینگ نەگیراو هەموو پەلەقاژەیەکیان بێهودە بوو هەموو هەوڵو تەقەلایەکیان دا بەفیڕۆ چوو.

## بۆچی قورئان داوای بەرامبەریی لە عەرەبەکان کرد؟

وەکوو ئاشکرایە دابو نەریتی عەرەبەکان لەو رۆژگارەدا وابوو کە بڕێکیان تەحەددای بڕێکیان بکەن، ئەم شاعیرە بەرامبەری ئەو شاعیرە بکا، ئەو خەتیبە قسەی ئەو خەتیب رەت بکاتەوە، کۆڕی شەڕە شیعرو شەڕە قسەیان هەردەم گەرم بێ.

لەبەرئەوە قورئان لەچەند ئایەتێکدا تەحەدداى جەماوەرى عەرەبى كردوەو بە ئاشكرا پێى گوتون ئەم قورئانە نیگاى خوایە، ئەگەر بڕوا ناكەن دەى ئێوە ئازابن قورئانێكى ئاوا بێنن، یان كە هەر هیچ نەبێ بەقەى سورەتێكى بخەنە روو مەبەستى سەرەكیش لەم تەحەددایە ئەوەیە كە مێژوو ببێتە شایەتو بزانرێ ئەو عەرەبە زمان درێژانە چەند داماوو دەست كورتو زمان كۆڵن لە بەرامبەرى قورئاندا لە كاتێكا كە ئەوان خەتیبى زمان لووسو بەدەمو پلو شارەزا لە هونەرى قسەكردنیان تێدا بووە، رەوان بێژو قسە حازر بەدەستیان لەناو دا بووە، هەروەها بۆئەوەى مەردوم دەم كوت بكاو رێگە لەوە ببەستێ كە لە داهاتوودا هەرزە گۆیەك یان نەزانێكو بێ ئاگاو دڵ كرمێیەك بێ بڵێ: بابە قورئان موعجیزە نیەو عەرەبەكان لەكاتى خۆیدا دەیانتوانى دەقى هاوتاى قورئان بێننو بەرامبەرى بكەن بەڵام نەخۆیان بیریان لەوە كردۆتەوەو نە كەسیش داواى ئەوەى لێ كردوە... جا لەبەر ئەو هۆیانەو شتانى تریش قورئان ئاوا پێش دەستى كردوەو تەحەدداى بەرامبەرى كردنى كردوون، تەحەددا كردنەكەشى لە سێ خاڵدا خۆ دەنوێنێ:

**یەكەم:** قورئان داوایان لێ دەكاو پێیان دەڵى ئەى گەلى عەرەب! ئەگەر بڕواتان نییە بەوە كە قورئان لە خواوە هاتووە، بەلاتانەوە كتێبێكى عەیبدارە، دەفەرموو ئێوە كتێبێكى باشتر لەوە لەخواوە بێنن تا منیش شوێن فەرمودەكانى بكەوم، ئەگەر راست دەكەن، جا ئەگەر ئەم ئەركەیان بۆ ئەنجام نەدرا (بێ گومان كە بۆشیان ئەنجام نادرێ) لەهەمان كاتدا ئیمانیشیان بەتۆ نەهێنا، ئەوە دیارە شوێن بڕواى پوچى خۆیان كەوتونو بە گوێرەى هەواو هەوەسى خۆیان دەجوڵێنەوە ئاشكراشە كەسێك شوێن هەواو ئارەزو بكەوێ هیچ بەڵگەى پتەویشى پێ نەبێ، ئەوە لە خواوە یارمەت نادرێو بە تەواوى گومڕایەو سەر لێ شێواوەو زۆرو ستەم لە خودى خۆى دەكاو دیارە كە خودا رێى راست نیشانى هۆزى بێ دینى ستەم پیشە ناداو رێنومایان ناكا.

{قُلْ فَأْتُوا بِكِتَابٍ مِّنْ عِندِ اللَّهِ هُوَ أَهْدَى مِنْهُمَا أَتَّبِعْهُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ، فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءهُمْ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ - سورة القصص/ ٤٩-٥٠}.

بەڵێ: لەم ئایەتەدا قورئان داوای لە عەرەبەکان کردوە کە کتێبێکی وەکوو قورئان دابنێن، لەو کاتەشدا تەنها چل‌و حەوت سورەتی لێ هاتبوو بۆ پێغەمبەر، ئیتر قورەیشیەکان سەریان تێك ناو هەرچەند سەریان دەهێناو دەبرد نەیان دەزانی چۆن بەرهەڵستی ئەم تەحەددایە بکەن. لە سەرەتاوە هەوڵیاندا بەڵام تێشکان‌و دۆش دامان. بۆیە دەبینین قورئان رویان تێ دەکا بەبی پەروا پێیان دەڵێ خۆماندوو کردنتان بی هودەیەو رەنج بەخەسارییە تەنانەت ئەگەر هەموو ئادەمیزادو ئەجندەکان یەك بگرن‌و بیانەوێ قورئانێکی ئاوا دابهێنن‌و لەناو خۆیاندا زۆر بەباشیو بە دڵسۆزی یارمەتی یەکتری بدەن‌و وێنەی قورئان بهێنن ئەوجاش هەر دەستە وەسان دەبن‌و بۆڕ دەدرێن.. چونکە قورئان ئاخاوتنی خوایە قەت ئاخاوتنی بەشەر ناگاتە ئاخاوتنی ئەو.

{قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَن يَأْتُواْ بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لاَ يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيراً - سورة الإسراء/ ٨٨}:

دوای ئەمە قورئان تۆزێك تەحەدداکەی توند کردۆتەوە داوای لێ کردون کە بتوانن (دە) سورەتی وەکوو هی قورئان بخەنە روو.

{أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُواْ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ وَادْعُواْ مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُواْ لَكُمْ فَاعْلَمُواْ أَنَّمَا أُنزِلِ بِعِلْمِ اللّهِ وَأَن لاَّ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ - سورة هود/ ١٣-١٤}:

واتە: ئایا عەرەبەکان دەڵێن: (محمد) بۆ خۆی قورئانی داناوە؟ دەفەرموو پێیان بڵێ: (ئەگەر راست دەکەن ئەمە عەرزو ئەمە گەز) فەرموون ئێوە بتوانن (دە) سورەتی ئاواهی بێنن‌و بیخەنە روو. داوای یارمەتی جگە لەخوا لە کێ دەکەن بێ منەت بن. جا ئەگەر نەیان توانی ئەوە ئەنجام بدەن‌و دەستەو ئەژنۆ دانیشتن ئەوە بەبێ شك بزانن کە ئەم قورئانە کەلامی خودایەو ئەو بۆ

پێغەبەری ناردوە ئەوەش بزانن کە هیچ خودایەکی راست نیە (جگە لەو پەروەردگارە) کەوابێ ئێوە موسولمان ببنو وەرنە سەر رێگای راستو دروست. قورئان بەمەشەوە نەوەستاوە بەڵکوو جارێکی تر پلەی تەحەددایەکەی هێندێ بەرزتر کردەوەو ئەمجارەیان داوای لێ کردن کە بتوانن تەنها یەك سورەتی وەکوو سورەتی قورئان دابنێن.

{وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُواْ شُهَدَاءكُم مِّن دُونِ اللّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ وَلَن تَفْعَلُواْ فَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ - سورة البقرة/ ٢٣}:

واتە: ئەی گرۆهی عەرەب! ئەگەر ئێوە شكو گومانتان هەیە لە راستی ئەو قورئانەی کە بۆ بەندەی خۆمانمان ناردۆتە خوارێو بە لاتانەوە درۆو دەست هەڵبەستە، دەفەرموو ئێوە بتوانن بەقەی سورەتێکی ئەو بخەنە روو بێ منەتیش بن (جگە لە خوا) داوای یارمەتی لەکێ دەکەن بیکەن، جا ئەگەر نەیانتوانی ئەم کارە ئەنجام بدەن (مسۆگەر) ناشتوانن ئەمجار بیان ترسێنەو پێیان بڵێ: خۆتان بپارێزن لە سزاو سوتان بە ئاگرێك کە سوتەمەنییەکەی ئادەمیزادو بەردەو ئامادەکراوە بۆ بی بروایان! جا هەرکاتێ ئێمە لەم لەخۆ رادیویەی قورئان تێ بفکرینو بزانین کە قورئان بەو شێوە سوورە لەسەر داماویی قورەیشو دڵنیایە کە ئەوانو هەموو دونیا ناتوانن بەربەرەکانی قورئان بکەن. دەبێ دان بەوەدا بنێین کە ئەم سوور بوونە هەڵوێستی مرۆڤ نییە، چونکە ناچێتە عەقڵەوە مرۆڤێك تۆزێ هۆشو گۆشی هەبێ، ئەم تەحەددایە بکاو ئاوا بەو جۆرە بچێتە ژێر ئەم رچەوەو لەوە نەترسێ کە رۆژێ لە رۆژان کەسێك هەبی بەرهەڵستی بکا!!! چونکە هیچ کاتێ سەر رووی زەوی خاڵی نییە لە خاوەنی هێزێك وەکوو هێزی یەکێکی تر، واتە هەر مرۆڤێك تۆزێ ئەقڵی هەبێ نابێ وابزانێ کەوا جیهان خاڵییەو کەس ناتوانێ بەرەنگاری ئەو بکا.

کەوابی بێگومان ئەم تەحەددایە کە لەسەر زمانی پێغەبەرەوە بیستراوە لە خواوەیەو سەرچاوەکەی ئەوە، هەموو عەرەبەکانیش ئەم تەحەددایەیان

بیــستووەو بــە ناویانــدا بڵاوبۆتــەوە، کەچــی نــەیانتوانیوە هــیچ بەرەنگاریــەکی عاقڵانە ئەنجام بدەن، بەڵکوو هەموو دەستە وەسانو کۆڵەوار بوونو بـە تـەواوی دەسـت کورتییـان دیارکـەوتو بـۆ خۆشـیان لێیـان عـەیان بـوو کـە ئـەم دەسـتە وەسانییەیان هەتا هەتایەو رۆژێك لە رۆژان ناتوانن لەم بارەوە نقەیەك بکەن.

جا ئەگەر ئەم قورئانە رەوان نەبوایەو رەوانـیو رەوانبێژیەکەیو ئوسلووبی وشـە ئـاراییو وشـەکارییەکەی مـوعجیزە نەبوایـە ئـەوە بێگومـان عەرەبــەکان بەدەردی چامەی شیعرو خـوطبـەو چیرۆکەکانیان دەبـرد. وشـە بـە وشـە هـەڵیان دەوەشاندەوەو ئەو سەر شۆڕییەیان قبوڵ نەدەکرد...

لەلایەکی ترەوە رەوانبێژانی عەرەب زۆرو زەبەنـدەبوون، تێیانـدا هـەبووە بـە دڵ دوژمنی ئایینی ئیسلام بووە، ئەگەر تۆزێك تروسـکایەکیان بـەدی بکردایـە بـۆ بەرپـەرچ دانــەوەی قورئـان دەیـان خـستە روو، زۆر دەقـی رەوانو رێـكو پێکیـان دادەرشت بۆ بەربەرەکانی قورئان دەیان هێنانە گۆڕێ.

جـاحیظ لـە باسـی قورئانــدا دەڵــێ: (ناچــێتە ئەقڵــەوە ئــەم هــەموو زانــاو رەوانبێژو لێهاتوانە لەسەر هەڵە کۆببنەوە ئەگـەر بیانزانیایـە بەرامبـەری کردنـی قورئانیان لە توانادایە چۆن بێ دەنگ دەبوون لەگـەڵ ئـەم هـەموو تـانوت لێـدانو سـەرکۆنە کردنـەی کـە قورئـان ئاڕاسـتەی ئـەوانی کـردوە، لـە کاتێکـا عەرەبـەکان خۆیان بە قسەزانو لێهاتوو دەزانیو خۆیان بە کارامایی لە قسەو ئاخاوتنـدا هـەڵ دەنایەوە، قسەزانیو رەوانبێژی کاری هەرە گرنگی ئەوان بووە، جا چۆن دەچێتە ئەقڵـەوە چـەکی هــەرە بــەهێزی ئــەوان قــسەو ئاخــاوتن بــێو کەچــی لــەکاتی پێویستیدا بەکاری نەهێنن، خۆ ناعیلاجیو پێویستی پیاو وا لێدەکا پەنا بۆ شتی پەنامەکی بەرێو خۆی پێ هەستێنێتەوە، چ جایی شـتێکی بـەڕوەو ئاشـکرا!! جا هەر وەکوو چۆن محاڵە بیستو سێ ساڵ ئەوان ئەم سەر شۆڕییە قبـوڵ بکـەن لـەم بارەوە نقەیەك نەکەن هەروا محاڵە کەوان بـێ دەنـگ بـن بەمـەرجێك بیانزانیایـە رێگایەکیان هەیە...

دوای ئەو رۆژگارەی کە قورئانی تێدا هاتە خوارەوە تا ئێستا چەند چین هاتوونو چەند سەدەو چەرخ تازە بوونەوە، ملیونەها زاناو رۆشنبیرو رەوانبێژو رەخنەگرو نوسەرو کتێب دانەر هاتوونو پێ گەییشتون هەموویان ئیعتیرافیان بەسەر ئاسایی قورئان کردوە، دانیان بە دەست کورتی خۆیاندا ناوەو ئەوەیان چەسپاندوە کە ناگەنە پلەی قورئان لە رەوانبێژیو رەوانیو گوزارەکاریدا).

خۆ لە مێژووی گەلی عەرەبدا زۆر لێهاتووی رەوانبێژی تیدا هەڵکەوتووە زۆریان لە پەخشاندا ناوبانگیان دەرکردوە زۆری وەکوو (عبدالله ابن المقفع) و(الجاحظ) و(ابن العميد) و(بديع الزمان الهمداني)و زۆری دیکەشیان تێدا پەیدا بووە.

لە شیعریشا شاعیری رەوانی وەکوو (جرير) و(فرزدق) و(بشار بن البرد) و(ابو نواس) و(ابو تمام) و(المتنبي) و(المعري) و(احمد شوقي)و صەدەهای دیکەی ئاواش هاتوونو رۆییشتوون، دەی باشە کوا رەوانیو رەوانبێژی ئەمان لە عاست رەوانیو گوزارەکاری قورئان!! ئایا کێ لەمانە گەردن کەچ نەبووە کێ لەمانە گوتوویەتی قورئان نیگای ئاسمانی نییە؟! کێ لەمانەو غەیری ئەمانە سەرسام نەبووەو بڕوای بە سەرئاسایی قورئان نەکردوە؟!!

## قورئان (موعجیزە)و سەر ئاسای (محمد)ە (د.خ)

ویستی پەروەردگار وابووە کە موعجیزەی پێغەمبەر لە شتێکدا بێ کە عەرەبەکان خۆیان تێیدا سوار چاك بوونو پێوەی ناسراون، چونکە بە درێژایی مێژوو هەموو پێغەمبەرێك موعجیزەی هەرە گەورەی لەسەر راستی پێغەمبەرایەتیەکەی لە شتێکدا بووە کە گەلەکەی تێیدا کاراماو شۆڕە سوار بووبێو تێیدا شارەزا بووبن، ئەوەتا چونکە گەلی قیبطی سەردەمی فیرعەون تا رادەیەك ئاشنایەتیان لەگەڵ زانستی ماتماتیكو سروشت ناسیدا هەبووە، چونکە خاوەنی زانینی جادو ئەفسانەو پیشەسازی بوون، بۆیە پەروەردگار

موعجیزەیەکی دا بە موسا پێغەمبەر، کە زاناو ساحیرەکانی فیرعەون لە هەموو کەس باشتر دەیانزانی کە لە خواوەیەو کاری موسا نییە. موعجیزەکەشی بریتی بوو لەوە کە کاتێ دەستی بخستایەتە باخەڵیەوەو دەری بێنایە، وەکوو رۆژ روناکی دەبەخشی، کاتێکیش لە رۆژی دیاری کراودا لەگەڵ ساحیرو جادو گەرەکاندا کەوتە رقەبەری‌و ساحیرەکان گوریسەکانی خۆیان بەرەڵڵا کرد وەکوو مار دەجولانەوەو خەڵکی وایان دەزانی گوریسەکان بوون بە ماری راستی، ئیتر کە حەزرەتی مووسا عەسایەکەی بۆ هەڵ دان عەساکە بوو بە ئەژدەهایەك‌و هەموو گوریسە ئەفسوناوییەکانی ئەوانی هەڵ لووشین، ساحیرەکان کەوایان زانی خێرا ئیمانیان بەخواو حەزرەتی موسا هێنا. هەروەها چونکە گەلی حەزرەتی عیسا لە نۆشداریدا پێش کەوتوو بوون، بڕوایان بە رۆح‌و زیندوبوونەوە نەبوو خوای گەورە موعجیزەیەکی دا بە حەزرەتی عیسا کە بتوانێ کوێرو بەڵەك چاك بکاتەوەو مردوو زیندو بکاتەوە.

جا لێرەدا راستییەك هەیە ئەویش ئەوەیە موعجیزەی هەموو پێغەمبەرەکانی پێشوو بریتی بوون لە چەند روداوێکی کاتی کە روویان داوە ئەوانەی هاوچەرخی پێغەمبەرەکان بوون‌و بینیویانەو بڕوایان پێ کردوون‌و دوا خۆیان هیچ ئاسارێکی ئەو روداوانە نەماوەو بۆ دوا خۆیان دەورێکی ئەوتۆیان نەبووە... هەروەها ئەو موعجیزانە لەگەڵ بیرو هۆشی سەرەتایی ئەو رۆژگارەدا گونجاون، بەڵام دوای ئەوەی ژیریی‌و خوێندن‌و خوێندەواری پێشکەوت بە درێژایی مێژوو خەڵکی گومانیان لە ئایینەکاندا پەیدا کردو ئایین کاریگەری نەماو موعجیزەکان وردە وردە پوکانەوە لە بیرو باوەڕی خەڵکیدا پلەیان نزم بووەوە تا هاتنە ریزی ئەفسانەو جادو، بەم جۆرە ئیمان‌و باوەڕ لە دڵی مەردومدا زەعیف بوو، بێ باوەڕی تەشەنەی کردوو وەکوو سەرەتان چووە کەڵکەڵەی ئادەمیزادەوە، بێ دینی باڵی شومی بەسەر جیهاندا کێشا.

ئیتر مرۆڤ بەگشتی پێویستی بە ئایینێك بوو کە موعجیزەو بەڵگەی راستیەتی لە بەڵگەو موعجیزەی ئایینەکانی پێشوو نەچێ.

جا ئەوەی کە زۆر کەس نایزانێ‌و پێویستە بیزانێ ئەوەیە کە ئیسلام لە بەرنامەیدا ڕێبازێکی گرتووە جیاوازە لە هەموو ئایینەکانی پێش خۆیەوە، ڕێبازێکی تازەی وای گرتۆتە بەر کە بە روونی ئەوە دەچەسپێنێ کە ئەم ئایینە لە خواوەیەو دەستکردی مرۆڤ نییە ئایینێك کە قورئان بەرنامەیەتی قورئانیش بۆ خۆی لە هەموو روویەکەوە سەر ئاسایەو مرۆڤ لە بەرامبەریدا دەستەوەستانو داماوە، چونکە قورئان لە رووی ڕێنوماکردنەوە، لە بارەی یاساو شێوەو شێوازەوە، لە بارەی ماناو ناوەڕۆکەوە، تا سەرنجی لێ بدەی ئەوە دەگەیەنێ کە ئایینی ئیسلام بەردەوامو خۆڕاگرەو هەتا دونیا دونیابێ پایەدارە.

بەڵێ دوای ئەوەی کە ئادەمیزاد بەرەو پێشکەوتن دەچوو پەروەردگار قورئانی پیرۆزی نارد بۆ پێغەمبەر تا لەگەڵ چۆنیەتی ئەو پێشکەوتنەدا بگونجێ‌و تا ئادەمیزادیش بەرەو پێشکەوتن بڕوا ئەمیش شان بەشانی ئەم پێشکەوتنە لە پێشبڕکێدا هەرگیز دوانەکەوی‌و بۆ هەموو شوێن‌و کاتێك بگونجێ. جا خوا یاربی لێرە بەولاوە لێکۆڵینەوەیەکی کورت ئەنجام دەدەین لەچەند لایەنێکەوە لە قورئان دەدوێین کە هەموویان پەیوەندییان بەسەر ئاسایی قورئانەوە هەیە هەموو شایەت‌و بەڵگەن لەسەر ئەوە کە ئەم قورئانە نیگای خوایەو ئاوەڵناوی زاتی بێچوونە، جگە لە بی دین‌و خوا نەناس کەسی تر رەتی ناکاتەوەو دژی ناوەستێ!.

## سەر ئاسایی قورئان (اعجاز القرآن):

سەر ئاسایی لە زماندا بریتییە لەوە ناتوانایی پاڵ خەڵك بدەی‌و داماوییان بۆ بچەسپێنی هەرکاتێ یەکێك یەکێکی داماو کرد دەگوترێ فلان فلانی داماو کردو لە پەل‌و پۆی خست کە دەڵێین قورئان ئادەمیزادی دەستەوەسان کرد واتە بۆڕی داو بەزاندی لەوەی کە بتوانێ کتێبێکی وەکوو قورئان دابڕێژن، کەوابوو کە دەڵێین قورئان موعجیزەیە مەبەستمان ئەوەیە قورئان لە پلەیەکدایە مرۆڤ هێزی ئەوەی نیەو نایبێ کە بتوانێ دەقێکی ئاوا داڕێژێ‌و کتێبێکی وا بخاتە روو

چونکە قورئان شێوە ئاخاوتنێکی پەروەردگارەو ئاوەڵ ناوێکی ئەو زاتەیەو تایبەتە بەو بێ هاوتایە، لێکدانو تەرتیبو وشەو رستەو دەنگو صەداو ئاوازو مۆسیقای شێوەیەکی تایبەتییەو لە ئاکارو کرداری مرۆڤ ناکا.. جا چونکە لایەنەکانی سەر ئاسایی قورئان زۆرو زەبەندەنو پێویستیان بە شیکردنەوەو درێژەپێدانو بەڵگە بە ئایەت هێنانەوە هەیە ئەمەش کارێکە ئەگەر ئەنجام بدرێ پێویستی بە نوسینی چەند بەرگێك هەیەو لەگەڵ ئەم باسە کورت ئامێزەی ئێمە ناگونجێ بۆیە ناچارین کە بە کورتی بەسەر باسەکەدا رابورینو بەسەر پێیەکەوە چەند نموونەیەك لە لایەنەکانی سەر ئاسایی قورئان بخەینە روو بەشی ئەوەندە بکا کە ببێتە بەڵگە لەسەر ئەوە کە قورئان نیگای خوایەو ئاکاری خۆیەتی، واتە هەر ئەوەندە دەچینە ناو باسەکەوە کە خوێنەر ئەزمونێکی لەلا پەیدا ببێ بتوانێ لە رێگەی ئەو ئەزمونەوە برێك شارەزایی لە سەر ئاسایی قورئاندا پەیدا بکاو بەس... لە سەرەتاشەوە لایەنی ئوسلوب لە قورئاندا دەکەین بەسەر مەشقو دەستە گوڵ.!!

## شێوەو شێوازی قورئان (أسلوب القرآن):

ئەگەر لە سەرانسەری قورئان وردبینەوە دەبینین دیاردەیەکی سەر سوڕهێنەری لە بارەی وێژەو شێوازەوە تێدایە، شێوازی قورئان لەرووی خۆش خوانیو جوانیو روناکی رەوانکاریو جوانی سەرەتادا جیاوازە لەگەڵ هەموو دەقی عەرەبیو رێبازی دانانو دارشتنی شیعرو پەخشان.

دکتۆر طاها حوسێن دەڵێ: (قورئان نە پەخشانەو نە شیعرە)، بەڵکوو قورئان قورئانەو بەس، واتە شێوازی قورئان نابێ جگە لە قورئانی پی بگوترێ.. قورئان شیعر نیە چونکە وەك شیعر ئایەتەکانی بەقەد یەك نینو کێشو سەرواى تێدا نیە، پەخشانیش نیە چونکە هەلەو گیری برێ مەرجی تایبەتی بووەو هەندێ شتی تیایە دەرمیان کراوە کە لە پەخشاندا نەکراوە هەندێ لایەنی

تایبەتیو شێوە دارشتنی هونەری پەیوەند بە کۆتایی ئایەتەکانو دەنگو صەداو مۆسیقا تایبەتییەکەیەوە هەیە لە پەخشانی ئاساییو ئیعتیادیدا بەرچاو ناکەوێ.

ئیمامی باقلانی دەفەرموێ: دارشتنی قورئان لەرووی بار گۆڕین لەشتو بۆچوون بۆی لە رێبازی جوێ جوێوە جیاوازی لەگەڵ هەموو شێوە دارشتنێکی دەقو ئاخاوتنە عەرەبیەکاندا هەیەو ئەم شێوە تایبەتییە قورئان جیا دەکاتەوە لە پەخشانو شیعر لەوەوە بۆمان روون دەبێتەوە کە قورئانی پیرۆز بەو وێژەو شێوازە تایبەتییە کە هەیەتی بە هیچ جۆرێك لە دارێژراوی ئادەمیزاد ناچیو ئاکاری ئەو نییە. خۆ ئەگەر قورئان ئاکارو دارشتنی مرۆڤ بوایە دەبوایە بچوویایەوە سەر شێوەو شێوازی ئاخاوتنی عەرەب، دەبوو لە شێوە دارشتنی نووسەرێكو سەردەمێك بچوویایە! کەوابوو لێ نەچوونی شێوازی قورئان لە شێوازی ئەو هەموو دەقە نوسراوانەی عەرەب بەڵگەیەکی زۆر بەهێزە لەسەر ئەوەی کە قورئان موعجیزەیەو سەر ئاسای هەموو گرۆهێکە، نە دانراوی ئادەمیزادە بە گشتیو نەهی (محمد)ە بە تایبەتی!! خۆ ئەگەر قورئان ئەم وێژەو شێوازە تایبەتیەی نەبوایە بەو جۆرە عەرەبەکانی بۆڕ نەدەداو وا بە ئاشکرا دەستە وەسانی نەدەکردن، بۆیە بۆڕیان خواردو مل کەچ بوونو زانییان کە ئەو دەقو ئاخاوتنە ئەزمونو قەریحەی ئەوان ناتوانی دەری ببڕی!

تەنانەت کاتێك کە برێ لە عەرەبەکان بۆ نموونە یەکێکی وەکوو (مسیلمە)ی درۆزن ویستی بەر پەرچی قورئان بداتەوە جڵەوی قسەی لە دەست دەرچوو ئاخاوتنێکی وای لێ دەرچوو نە لە وێژەو شێوازی قورئان دەچوو نە لە قسەو ئاخاوتنی خۆشی دەچوو، واتە لە هەموو روویێکەوە رەوانبێژی لە دەست داو هەربوو بە پەندو گاڵتەچی!!!

## جیاوازی شێوازی قورئان لەگەڵ فەرمودەکانی پێغەمبەردا (د.خ):

بۆئەوەی زیاتر بەڵگەی ئەوەمان دەست کەوێ کە قورئان سروشی خوایە ئاکاری ئادەمیزاد نیە، شتێکی گرینگ هەیە پێویستی بە لێ وردبونەوە هەیەو

گەرەکە بخرێتە بەرچاو، ئەویش ئەوەیە کە وێژەو شێوازی قورئان لە وێژەو شێوازی فەرمووده (حەدیثە)کانی پێغەمبەر ناچێ، هەرکاتێ بێنین بەرامبەری لە نێوان دەقی قورئانو دەقی فەرمودەکانی پێغەمبەردا بکەین دەبینین جیاوازییەکە لە هەموو رویەکەوە زۆر ئاشکراو بەڕووەوەیە، بۆ نموونە مرۆڤ لەکاتی خوێندنەوەی حەدیثدا هەست بە شێوە زمانو ئاخاوتنێك دەکا بریتییە لە تێگەیاندنو فێرکردنو وتاردانو پرسیارو وەڵامو شیکردنەوەیێك کە لە ئاخاوتنی ئادەمی دەچێو عەرەبەکان ئاشنایەتیان لەگەڵ ئەو شێوە ئاخاوتنە هەبووە، بەڵام ئاشنایەتییان لەگەڵ وێژەو شێوازی قورئان نەبوو، بەلایانەوە لە پلەیەکی بەرزدا دەنگی دەدایەوە، کە گوێیان بۆ ئاخاوتنەکە دەگرت بە بیستنی سەرسام دەبوون. جگە لەوەش لە خوێندنەوەی حەدیثدا هەست بەوە دەکرێ کە لەو دیو فەرموودەکانی پێغەمبەردا خۆیەتی زاتیەتو (شخص)یەتێکی ئادەمی هەیە هەست دەکرێ کە ئەو ئادەمیە برێ جار زەعیفیو زەبوونی رووی تێ دەکاتو شانازیش بەم زەبوونیەوە دەکا، چونکە لە عاستی خواوەیەو بەندایەتی خۆی تێدا دەنوێنێ کەچی لەو دیو دەقی قورئانو ناوەرۆکی ئایەتەکانیدا هەست بە خۆیەتیەکی بەهێزی دەسەڵاتداری بێ باکی دادپەروەری بە ئاگاو زاناو خاوەن روحمو شەفەقەت دەکرێ، بەڵام خۆیەتیەکە لە هیچ روویەکەوە زەبوونی تێدا هەست پێ ناکرێ، تەنانەت لەو شوێنانەشدا کە جێگای دڵ نەرمین... جا ئەگەر قورئان دانراوی (محمد) بوایە دەبوایە لەگەڵ وێژەو شێوازی فەرمودەکانی خۆیدا چ جیاوازییەکیان نەبوایە، چونکە ئاشکرایە هەموو نووسەرێك یەك جۆر وێژەو شێوازی لە نوسیندا هەیە تەنانەت کەس ناتوانێ بە دوو جۆری لێك جیاوازی تەواو بنووسێ، کەوابوو ئەم لێك نەچوونو جیاوازییە ئاشکرایە لە نێوان وێژەی قورئانو حەدیثدا بەهێزترین بەڵگەیە کە قورئان سروشی خوایەو شاکاری ئادەمی نیە.

## برێ دیاردەی پەیوەندی بە شێوازو رەوانبێژی قورئان:

تا ئێستا زۆر زانایانی رەوانبێژیو خۆشخوانی لە وێژەو شێوازی قورئانیان نوسیوە، لەو شتانەی کە تایبەتن بە جۆرەکانی رەوانبێژییەوە لێکۆڵینەوەیان

ئــەنجام داون: کــە لــەم نوســینە تەســکەدا ئامانجیــان بــۆ نــاکرێ بــەڵام پێویــستە هێندێك توێژینەوە لەسەر بـڕی لایـەنی تایبـەت مەنـد بـە شـێوازی قورئـانو ئـەو لێك چوون (تـشبیە)و خواسـتن (اسـتعارة)و کـورت بـڕیو پەنـدو ئامۆژگاریانـەی لەخۆی گرتوون ئەنجام بـدەین تـا بتـوانین (بـە کـورتی) خوێنـەر شـارەزای خـۆش خوانی قورئان بکەین لـەکاتی خوێندنەوەیـدا چـێژی ڕەوانکـاریو جـوانی شـێوازی ئەو کەلامە بکا. هەرچەندە گەورەییو جۆری هونەری قورئان کەسێك بە تـەواوی هەستی پێ دەکا کە زۆر تێـی بفکـرێو شـارەزایی تێـدا هـەبێو ڕێبازەکـانی زبـانی عەرەب شارەزابێو بەشێوە هونەرییەکانی ئەو زمانە ئاشنا بێ.

## کێشی قورئانو چێژی ئاهەنگو مۆسیقای:

وێژەو شێوازی قورئان شـێوەیەکی تایبەتییـەو چـێژێکی ئاهـەنگو مۆسـیقای سـەربەخۆی هەیـە، ئەمـەش بـەهۆی هەڵبـژاردنی وشـەی شـیرینو ڕازاوەو ڕێـك خستنیان لـە زنجیرەیـەکی تایبەتیـدا تـا گەیـشتۆتە سـەر تـۆپکی خـۆش خـوانیو ڕەوانی بۆ پەیدا بووە، جا هەرچەندە ئەم ئاوازی مۆسیقایەی قورئـان لـە هێنـدێ شوێندا وا ڕێ دەکەوێ لەگەڵ کێشی جۆر (بحر)یك لە جۆرەکانی شـیعری عـەرەبی یەك دەگرێتەوە بەڵام ئەمـە مانـای وانیـە کـە قورئـان شیعرە، هـەرگیز نـاگوترێ: قورئـان شـیعرە بەڵـکوو قورئـان لایەنـە جوانـەکانی شـیعرو پەخـشانی بەیەکـەوە لەخۆ گرتووە، بەوە دەقەکە تا بڵێی شەکر ئامێز بووەو ڕازاوەتەوەو گۆی هونەری جوانکـاری بردۆتـەوە، خۆشـی لـە تـاك سـەرەوایی پاراسـتووە، بڕگـەو تـەفعیلاتی تەواوی شیعری پـاش گـوێ خـستووە بەمـە خـۆی لـە کۆتو زنجیری شـیعر ڕزگـار کردوە، بۆ دەربڕینی مەبەستەکانی.. پەلی ئاوازو مۆسیقای ناسکی شـیعری چەشـە کردوە، جار جارە خۆی لە کێشی شیعر نزیك کردۆتـەوە، لـە بـڕی شـوێندا بڕگـەو سەروای بەکار هێناوە لە شێوەیەکی تایبەتیـدا. لـەم ڕووەوە جـاری وا هەیـە وێـژەو شـێوازی قورئـان لەگـەڵ شـێوازی دەقو ئاخـاوتنی سـەروادار (مەسـجووع)دا لێـك دەچنو لایەنی سەجعیشی پاش گوێ نەخستووە، هونەری (سەجع)یش شێوەیەکە

لە دارشتنو ئاخاوتنی هونەریو لە کۆنەوە لەلای عەرەبەکان باو بووەو پێی ئاشنا بوون، چونکە جەرەسو سۆزو ئاوازی مۆسیقاکەی کاریگەرەو گوێچکە چێژی لێ وەردەگرێو ئارامی دەداتە دڵو دەروون، خوتبە خوێنەکانی سەردەمی پێش ئیسلام هەروا پیاوە جادو بازو ئەستێرە شوناسەکان بەکاریان هێناوە، چونکە کار لە بیسەران دەکاو جێی خۆی لە دڵاندا دەکاتەوە!! بە کورتی قورئان بڕێکی سەروا دارەو مەسجووعە بڕێکیش شێوازی تایبەتی خۆی هەیەو ئاوازو مۆسیقایەکی سەربەخۆی لەخۆ گرتووە.

(ابن سنان) دەڵێ: قورئان بە زبانو دابو نەریتو شێوە ئاخاوتنی عەرەب نازڵ بووە، خۆ دەقی رەوانکارو رەوان لە ئاخاوتنی ئەواندا هەمووی سەروادار (مەسجووع) نەبووە چونکە دەقی درێژو سەروادار نیشانەی خۆ گوشینو نقەنقی لێ بەدی دەکرێ، رێ نەکەوتووە دەقێکی درێژی سەروادار هەمووی رەوان بووبێو شێرینو رازاوە بووبێ.

کەوابوو کێشی تایبەتی قورئانو ریزکردنی برگەکانی لەسەر شێوەیەکی تایبەت لە زوربەی ئایەتەکانیدا لە جۆری دەربڕینو کارتێکردندا هێزی سەرسام کەری پی بەخشیوە، ئاوازێکی ناسکی شیرینی ئاشنا بە گوێچکەی لە شێوەی مۆسیقایەکی نەرمی کاریگەردا وەکوو جۆگە ئاوێکی صافو بێگەرد دەکشێ، مرۆڤی موسوڵمانی بیسەر دەمار شێل دەکاو گومڕایان سەرسام دەکا.

## وەك یەكو لێك چوون لە قورئاندا (التشبیه في القرآن):

لێك چوون لە قورئاندا بریتییە لە لێك چواندنی شتێك بە شتێکی ترو هاوبەشییان لە کارێکدا، لە صیفەتێکدا، هێنانو بەکارهێنانی ئەو لێك چوونە بۆ زیادە روون کردنەوەو کارتێکردن بێ.

ئاشکراشە قورئانی پیرۆز چەند جۆرە لێك چوون (تشبیه)ی جوانو رەوانی لەخۆ گرتووە، هەموویان شیرینو دڵ گیرنو جوانی بە ماناکانی قورئان دەبەخشن، کارتێکردنیان زیادو بەهێز دەکەن.

هەنـدێ جـار قورئـان لێـك چـوونی هێنـاوە بـۆ روون كردنـەوەی كـاری مەعنەویو نادیار بە شتی بینـدراوو دیـارو هەسـتپێكراو، بـەوە شـتی پەنامـەكیو نادیـاری روون كردۆتـەوە ماناكـەی چەسـپاندووە... بـۆ نموونـە كاتێـك قورئـان دەیەوی زەبوونی بتە داتاشراوەكانی كافرەكان بچەسپێنێ باسی هیچو پوچی ئـەو خـوا درۆزنانـە دەكـا، دێنـێ هـەوڵو كۆشـشی ئـەو خـوا نەناسـانە دەشـوبهێنێ بـە هەوڵو كۆششی جاڵجاڵۆكە، لەم رووەوە كە ئەم زیندەوەرە بچكۆلە چەند خۆمانـدو دەكاو هەوڵو كۆشش دەكا تا خانوەكەی دەتـەنێ كەچـی لـە پڕێكا بـە فویـەك بـە كەمترین لێكەوتنی شتێكی بێ هێز خانوەكەی دەڕوخێو رەنـج بـە خەسـار دەبـێ، هەر بەو جۆرەش كافرو خوا نەناسەكان ئەو هەوڵو كۆششو بت پەرستیەیان بی سودەو رەنج بەخەسار دەبنو كارەكەیان زەرەر ئامێزە.

{مَثَلُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاء كَمَثَلِ الْعَنكَبُوتِ اتَّخَذَتْ بَيْتًا وَإِنَّ أَوْهَنَ الْبُيُوتِ لَبَيْتُ الْعَنكَبُوتِ}.

لەشوێنێكی تردا قورئان دەیەوێ تێمان بگەیەنێ، كە كـردەوەی كافرەكـان بـێ سـودەو بـەردار نابـێ، هـاتووە كردەوەكانیـانی شـوبهاندون بـە خۆڵـە مێـشێك كـە رەشەبایەكی بەهێزو تەوژم لێی هەڵكاو هیچی لێ نەهێڵێتەوەو بەربادی بكا.

{مَّثَلُ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمْ أَعْمَالُهُمْ كَرَمَادٍ اشْتَدَّتْ بِهِ الرِّيحُ فِي يَوْمٍ عَاصِفٍ لاَّ يَقْدِرُونَ مِمَّا كَسَبُواْ عَلَى شَيْءٍ ذَلِكَ هُوَ الضَّلاَلُ الْبَعِيدُ - سورة إبراهيم/ ١٨}:

واتە: وەكوو چۆن كەسێك خاوەنی خۆڵە مێش بێ، بێنـێ خۆڵە مێـشەكەی لـە جێگایەكی بەرەو بادا كۆبكاتەوە، لەناكاوێكا رەشەبایەكی بە تەوژم لێی بداو تۆزی بـەرێ بەهـەواداو هیـچی لێ نەمێنێتـەوە، ئـاوا بـەو جـۆرەش كافرەكـان رۆژی رەستاخیزو زینـدو بوونـەوە هـیچ سوودێكیان لـە كردەوەكانیـان دەسـت ناكـەوێو رەنج بەخەسار دەبن، چونكە هیچ ئاسەوارێك بۆ كردەوەكانیان نابینن. لە لایەكی ترەوە زوربەی لێك چواندنو تەشبیهاتی قورئان لە سروشت هەڵقولاون، لایەنێكی تەشبیهەكە شتێكی سروشت ئامێزەو هەست پێكـراوەو ئاشـنایە بەهەسـتی مـرۆڤ.

ئـەوەتا کـردەوەی کافرەکـان دەشـوبهێنی بـە سـەرابو رەنگدانـەوەی تیـشکی رۆژ کاتێك لە زیخو بەردە وردە دەدا، چۆن مرۆڤی تینوی صەحرا نـەوەرد، کاتـێ ئـەو سـەرابە دەبینـێ پێی وایـە ئـاوەو پەلـەی بـۆلا دەکـا بـە مەبەسـتی ئـەوە ئـاگری تینوایەتی بکوژێنێتەوە، کەچی کە دەگاتە نزیکی دەڕوانێ هیچ ئاوی لێ نیەو دڵـی پـڕ دەبـێ لـە ناهومێـدیو هیـچی دەسـت ناکـەوێ، ئابـەو جـۆرەش کافرەکـان بـە کــردەوەی خۆیــان دەنــازنو دڵیــان بــە کردەوەکانیــان خۆشــەو پێیــان وایــە کردارەکانیان سود بەخشەو پاداشی لێ وەردەگرن، کەچی رۆژی رەستاخیز کە دێـن دەبینن هیچ شتێك لەوەی کە بەتەمای بوون دیار نیەو رەنج بەخەسارن، بەڵـکوو لەجیاتی پاداشو قازانج سزاو ئـازارو ئەشکەنجەیان بـۆ ئامـادەکراوە پـەروەردگار هەڕەشەکانی کە لێی کردبوون بۆیان دێنێتە دی... سەیرکە چۆن خوا دەفەرموێ:

{وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَعْمَالُهُمْ كَسَرَابٍ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ الظَّمْآنُ مَاء حَتَّى إِذَا جَاءهُ لَمْ يَجِدْهُ شَيْئًا وَوَجَدَ اللَّهَ عِندَهُ فَوَفَّاهُ حِسَابَهُ - سورة النــور/ ٣٩}.

لەشـوێنێکی تـردا قورئـان حـاڵو چۆنیەتی دونیـاو ئەوانـەی بـەهێزو بـازوی خۆیان دەنازنو کەچۆن کۆتایی ژیانیان دێو چۆن تەمـەنیان هـەڵ دەوەرێو پـوچ دەبنەوە شوبهاندونی بـە گـژو گیـای بـەهارو سـەوزو شـین بـوونیو رازانـدنـەوەیو دوایی وشك بونو بەبادا چوونی.

{إِنَّمَا مَثَلُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاء أَنزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاء فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ النَّاسُ وَالأَنْعَامُ حَتَّىَ إِذَا أَخَذَتِ الأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَازَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَا أَنَّهُمْ قَادِرُونَ عَلَيْهَآ أَتَاهَا أَمْرُنَا لَيْلاً أَوْ نَهَارًا فَجَعَلْنَاهَا حَصِيدًا كَأَن لَّمْ تَغْنَ بِالأَمْسِ - سورة يونس/ ٢٤}:

واتە: ژیانی ئینـسان لـە جوانیو خۆشـیو رازاوەیـی دا وەکوو چۆنیەتی ئـەو ئاوە وایە کـە لـە ئاسمـان دێتـە خـوارێو تێکـەڵ بـە گڵو خـۆڵ دەبـێو گـژو گیـاو رووەکــی پــێ دەڕوێو بــە گــوڵو گــوڵزارو ســەوزاییو چــەمەن بــووکی زەوی دەڕازێتەوە، میوەو بەروبووم وەئەنجام دێنێو ئادەمیزادو ئـاژەڵ لێی دەخـوا، جـا

کاتێك ئەرز خۆی جوان کردو بەتەواوی خۆی ئارایشتدا، لەهەموو بەرو بوومێکی وە دەرخست، ئیتر خەڵکەکە وادەزانن ئەم نازو نیعمەتە بەردەوامەو هەتا هەتایە پایەدارە!! لەباتی شوکرو ستایش، هەریەکەیان دەست دەکا بە گومڕایی‌و روو لەخوا وەردەگێڕی‌و خۆی بە خوای سەر ئەرز دەزانێ!! لەناکاوێکا خوا ژیانی لێ تێك دەداو ئەم نازو نیعمەتە لە چاو تروکانێکا سەرنگون دەکاو چەرخی چەپگەردی لێ وەکار دەخا، بە بومە لەرزە یان بە لافاو یان بە شەڕو شۆڕی وێرانکەر، ئەو چونیەتە دڵگیرە دەکاتە سوتەمەڕۆو وەکوو زەوییەکی گژوگیای کڕوزاوی لێ دەکاو ئاداری بەسەر پاداریيەوە نامێنێ. جا تێفکرە لەم ئایەتەدا دە رستەی یەك بەدوا یەکی هێناون وای ریز کردون‌و لێکی داون دەڵێی یەك رستەیە تەشبیهەکەش لەشێوە گشتییەکە وەرگیراوە.

## خوازەو خواستن لە قورئاندا (الإستعارة في القرآن):

خواستن: وەرگرتنی وشەیە کە بخوازرێ لە مانای تایبەتی خۆیەوە بۆ مانایەکی تازەی پی نەزانراو کە لە بنەڕەتی زماندا ئەو مانایە نەبەخشێ بەلام مەرجە دەبی پەیوەندی نێوان مانای خوازراوو لێ خوازراو بەهێز بێ مەبەستیش دەرخستنی مانای پەنامەکی‌و نائاشکرا بە شێوەیەکی رون‌و ئاشکرا... لە راستیدا قورئانی پیرۆز جۆرەها خوازراو خواستنی لەخۆ گرتووەو دەقەکانی پێ رازاندۆتەوە، ئەم خواستن‌و خوازراوە بووەتە ئاوێنەیەکی بالا نومای صاف‌و بێگەرد بۆ دەرکەوتنی رەوانبێژی قورئان‌و پلەی بەرزی دەربڕین. لە تەك ئەمەشدا خواستن (الأستعارة) بە وشەی کەم مانای دورو درێژ دەگەیەنێ. بۆ نموونە قورئان دەفەرموێ: {وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْبًا} دەبینین وشەی (اشتعل) ئیستیعارەیەو خوازراوەو لەسەر مانای دروستی خۆی نیە، چونکە ئەم وشەیە لە ماکی زماندا بۆ هەڵایسانی ئاگر بەکار دەهێنرێ نەك بۆ سپی بوونی مووی سەرو سمێڵ. بەڵام چونکو سپی بوونی مووی سەری مرۆڤ وردە وردە پێوە دەچێ‌و

بەکاوەخۆ سپی دەبێ تا بە تەواوی هەموو سەری دادەگرێ. جا ئەم شێوە هەر دەڵێی گەش بوونەوەی ئاگرە لەناو خەڵوزدا کە ئەمیش وردە وردە پێوە دەچێو دەتەنێتەوە تا بەتەواوی هەموو خەڵوزەکە گەش دەبێتەوە بۆیە وشەی (اشتعل) لە مانای خۆیەوە کە هەڵایسانی ئاگرە خوازراوە بۆ سپی بوونی مووی سەر، پەیوەندی نێوان بڵێسەی ئاگرو سپیایەتی مووی سەریش ئاشکرایەو بەهێزە.

یان لە شوێنێکی تردا قورئان دەفەرموێ: {بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ - سورة الأنبياء/ ١٨}:

وشەی (نقذف) و (یدمغە) هەردوکیان خوازراونو خواستیان تێدایە ئەگەر بیگوتایە (بل نورد بالحق على الباطل فيذهبه) خواستنیان تێدا نەدەبوو، مانای (نورد) و (یذهبە) وە دەست ناکەوێ چونکە (نقذف) شێوەیەك دەگەیەنێ کە بەهێزو زەختێکە وە شتێکی قورسو رەق بەسەر شتێکدا بخرێو لێی بکەوێو پانی بکاتەوە. وشەی (یدمغە)ش ئاماژەیە بۆ ئەو جەنگە کە لەنێوان حەقو بەتاڵدا رودەداو لە ئاکامدا حەق سەری بەتاڵ پان دەکاتەوەو مۆخی دەپژێنێو گیانی لەبەر دەردەکا.

لە جێیەکی تر قورئان دەفەرموێ: {وَالصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ} لێرەدا وشەی (تنفس) خوازراوەو ئیستعارەیە ئەگەر لەجیاتی (تنفس) بیگوتایە (بدأ انتشاره) لەسەر مانای دروست (حقیقة)ی خۆی دەبوو خواستنی تێدا نەدەبوو بەڵام هەرگیز ئەو بەلاغەتو رەوانیو پاراوییەی کە لە وشەی (تنفس) وەردەگیرێ هەرگیز لە رستەی (بدأ انتشاره) دەست ناکەوێ چونکە (تنفس) ئەوە دەگەیەنێ کە سروشت هەمووی کشو ماتو بێدەنگو خەو لێ کەوتووە، نەجوڵەیەو نە سرتە، کاتێ بەیانی دێ سروشت بە خەبەر دێو ژیانی تێ دەگەڕێتەوە وەکوو چۆن هەناسە ژیان بۆ زیندەوەر تازە دەکاتەوە.

یان بە شێوەیەکی تر بڵێین هەڵاتنی خۆرو پێوە چوونیو تەقینەوەی روناکییەکەی دەشوبهێ بە دەرچوونی هەناسە کە وردە وردە دێو دەچێ، جارێکی تر دەفەرموێ:

{وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَجَمَعْنَاهُمْ جَمْعًا - سورة الكهف/ ٩٩}:

بڕوانە وشەی (يموج) لەم شوێنەدا بەوەندەوە ناوەستێ کە خوازراوە بۆ مانای پشێوی‌و تێکرو تێکوشیوی، بەڵکوو لەگەڵ ئەمەش ڕەسمێکی سەر سوڕهێنەر بۆ خەیاڵی مرۆڤ دەکێشێ کە بریتییە لە کۆبوونەوەی ئەو خەڵك‌و حەشاماتە بەجۆرێك چاو سەرەتاو کۆتایی‌و ئەم سەرو ئەوسەری نابینێ، هەتا بڕوانێ خەڵکەو دەجوڵێتەوە، بە شێوەیەك تابلۆکەمان پیشان دەدا هەر دەڵێی دەریایەو شەپۆل دەداو خۆی دەخواتەوە، ئەمە هەموو وشەی (يموج) دەی گەیەنێ چونکە لە بنەڕەتداو بە دروست‌و حەقیقەت ئەم وشەیە بۆ جوڵانەوەو شەپۆلی ئاو دێ.

لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: {وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى الْغَضَبُ}:

واتە: کاتێ موسا ڕقی نیشتەوەو ئارام بووەوە... لێرەدا وشەی (سكت) خوازراوە بۆ مانای (زال) بە مانا نیشتنەوەی ڕق‌و کینەیە. چونکە لە بنەڕەتدا (سكت) بەمانا وازهێنان لەقسەکردنە. بەڵام لێرەدا وا پیشان دراوە کە غەضەب وەکوو ئینسانێك موسا هەڵ دەنێ‌و دەنە دەنەی دەدا بۆ توڕە بوون‌و شەڕەنگێزی‌و دوایی وازی لە موسا هێناو چی دی پاڵی پێوە نەناوە، یان کە قورئان دەفەرموێ:

{أَوَ مَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا - سورة الأنعام/ ١٢٢}:

دەبینین لەم ئایەتەدا وشەی (نور) دەبینری‌و بەچاو هەستی پێ دەکرێ‌و ڕێبوار سودی لێ دەبینێ مرۆڤ بەهۆی ئەوەوە دەگاتە ئاواتی خۆی.

هەروەها وشەی (الظلمات) لە مانای خۆیەوە خوازراوەو هێنراوە لە جیاتی (الضلال) دانراوە چونکە کەسێك بە تاریکیدا بڕوا ڕێگای ڕاستی لێ ون دەبێ‌و ڕێبازی مەبەست‌و پێویست ناگری دوور نییە بکەوێتە چاڵ‌و چۆڵەوەو توشی هەڵدێرو شوێنی سەخت ببێ‌و تێدا بچی...

## کورتبڕی لە قورئاندا (الإیجاز في القرآن):

کورتبڕی: ئەنجامدانی مانایەکە بە کەمترین وشە، کەوابوو رستەو دێڕێکی کورت ئامێز کە مانای زۆر ببەخشێ خۆشخوان و رەوانە، هەتا وشەی کەم بێ و مانای زۆر بێ رێژەی خۆش خوانییەکەی بەرز دەبێتەوە تا دەگاتە پلەی ئیعجازو سەر ئاسا.

دیاردەی هەرە دیاری قورئان ئەوەیە کە بە وشەیەك یان چەند وشەیەکی کورت مانایەکی دورو درێژ دەگەیەنێ کە راڤەی و شەرحیان زۆری دەوێ. ئەگەر نوسەرێك رۆشنبیرێك بیەوێ لاسایی قورئان بکاتەوەو ئەو مانایەی ئەو بە وشەی کورت گەیاندویەتی بیگەیەنێ بۆی ئەنجام نادرێ مەگەر بە چەند وشەیەکی دورو درێژ. پوختەی قسە ئەمەیە وشەی کورت و رەوان و پڕ مانا و مانا زۆر هەر لە قورئان دێ و لە وزەی مرۆڤدا نییە.

بۆ نموونە سەیربکە لەو ئایەتەی لە قورئاندا دەربارەی بوون و تەنهایی خوایە کە دەفەرموێ:

**{مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَهٍ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَهٍ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ}.**

یان ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: **{لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا - سورة الأنبیاء/ ٢٢}:**

واتە: ئەگەر لەگەڵ خوای پەروەردگارو مەزندا خوای تر هەبوونایە ئەم بونەوەرەیان بەش بەش دەکردو دوایی تووشی کێشەو نیزاع دەبوون کێشەو نیزاعیشیان سەری دەکێشا بۆ وێران بوونی کەون بە ئەرزو ئاسمانیەوە جا خۆ ئەوە ملیۆنەها ساڵە ئەم ئەستێرەو مانگ و رۆژو زەوی و کەونە بەردەوام هەڵ دەخولێ و تێك نەچووە، کەوابوو ئەمە باشترین بەڵگەیە لەسەر بوون و تەنهایی و دەسەڵات و پایەداری و بێ وێنەیی خوا.

یان دەفەرموێ: **{خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْـرِضْ عَـنِ الْجَـاهِلِينَ — سورة الأعراف/ ١٩٩}:**

لێرەدا دەبینین قورئانی پیرۆز لەم چەند وشانەدا باسی هەموو ڕەوشتی جوانو ئەخلاقی بەرزی لەخۆ گرتووە، چونکە لە وشەی (عفو)دا پەیوەندی پتەوکردنی نێوان ناحەزانو یەکگرتنەوەی دڵ لێك هێشاوانو ئاشتبوونەوەی دڵ ڕەنجاوان دەگەیەنێ، ڕستەی {وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ} گەردن کەچیو فەرمان بەرداری بۆ خواو جێبەجێ کردنی پەیوەندی هەموو کارێکی باشی لەخۆ گرتووە، چونکە ناگونجێ مرۆڤ ڕێگای خزمایەتیو دوورکەوتنەوە لەهەموو کردەوەیەکی ناشیرینو کردنی چاکە پیشانی خەڵك بداو بۆ خۆشی کاری چەوت ئەنجام بدا.

لە ڕستەی {وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ}دا کە فەرمان بەوە دەکا کە موسوڵمان ڕو وەرگێڕێ لە نەزانانو گوێیان پێ نەدا، صەبرو ئارامو خۆشەویستی دابین کردنو گێڕانەوەی نەفس لە وەڵام دانەوەی بێ ئەقڵو نەزانان دەگەیەنێ.

یان کە دەفەرموێ: {إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاء ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ – سورة النحل/ ٩٠}:

لەم ئایەتەدا پەروەردگار فەرمانی فەرمووە بە کردنی هەموو کارێکی چاكو کردارو گوفتاری خێر ئامێز. (نەهی)یشی کردوە لە کردنی هەموو کردەوەیەکی خراپو زەرەر ئامێز، کۆتایی ئایەتەکەشی بە جوانترین ئامۆژگاری لە چەند وشەیەکی کورتدا هێناوە.

یان کە لە باسی نازو نیعمەتی بەهەشتدا دەفەرموێ:

{يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الْأَنفُسُ وَتَلَذُّ الْأَعْيُنُ – سورة الزخرف/ ٧١}:

دەبینین بەم چەند وشە کورتانە ئەم هەموو مانا جوانانەی کۆ کردۆتەوەو ئاماژەی بۆ ئەم حەمکە نازو نیعمەتەی بەهەشت کردوە کە لە ڕاستیدا لە ژمارە نایەن، ئەوەتا سەرەنجمان ڕادەکێشی بۆ هەرشتێك نەفسو ئارەزو پێیان خۆش بێ... یان کە دەفەرموێ:

{وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَاْ أُولِيْ الأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ – سورة البقرة/ ١٧٩}:

دەبینین ئەم ئایەتە کورتە هۆو حیکمەتی تۆڵە سەندن کوشتنەوەی بکوژی بە رەوانترین ماناو کورتترین وشە گەیاندووە.

جا وەکوو دەڵێن: پێش هاتنی ئەم ئایەتە عەرەبەکان دەیانگوت: (القتل انفي للقتل) خۆشیان بە رەوانیو بەلاغەتی ئەم رستەیە هەڵ دەکێشا پێیان وابوو زۆر رەوانو بەلیغە بەڵام کە قورئان هاتو ئەم ئایەتەی تێدا بوو رستەکەی خۆیان پاش گوێ خست چونکە رەوانیو بەلاغەتی ئەم لەگەڵ ئەودا وەك عاسمانو رێسمان وایە.

## کورتبڕی قورئان لە باسکردنی تۆفانی نوح دا:

یەکێك لەو شوێنانەی کە قورئانی پیرۆز ئەوپەڕی کورتبڕیو رەوان بێژیو سەر ئاسایی تێدا کردوە باسو خواسی تۆفانی حەزرەتی نووحە کە دەفەرموێ:

**{كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا عَبْدَنَا وَقَالُوا مَجْنُونٌ وَازْدُجِرَ فَدَعَا رَبَّهُ أَنِّي مَغْلُوبٌ فَانتَصِرْ فَفَتَحْنَا أَبْوَابَ السَّمَاء بِمَاء مُّنْهَمِرٍ وَفَجَّرْنَا الْأَرْضَ عُيُونًا فَالْتَقَى الْمَاء عَلَى أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ وَحَمَلْنَاهُ عَلَى ذَاتِ أَلْوَاحٍ وَدُسُرٍ تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا جَزَاء لِّمَن كَانَ كُفِرَ – سورة القمر/ ٩-١٤}:**

جا خوێنەری خۆشەویست چەند جارێك ئەم ئایەتانە بخوێنەرەوەو سەیری جوانی دارشتنو کێشو تابلۆی پێویستیان بکەو گوێ لە ئاوازو مۆسیقایان بگرە دەبینی بە کەمترین وشەو رستە جوانترینو رەوان ترین مانایان بەخشیوە. پاشان جارێکی تر تێفکرە قورئان چۆن باسی نیشتنەوەی تۆفانەکە دەکاو بە چ دارشتنێکی رەوانو رستەیەکی بەرز کۆتایی تابلۆکە دەکێشێ. کە دەفەرموێ:

**{وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءكِ وَيَا سَمَاء أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاء وَقُضِيَ الأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ وَقِيلَ بُعْداً لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ – سورة هود/ ٤٤}.**

واتە: گوترا زەمین ئاوت هەڵقوڕێنە بەرازیی بەس ببارێنە ئاو رۆچوو بەناخی ئاخاو کار سەری گرت، لەسەر جودی لەنگەری گرت، وترا تارن ئەوانەی ناهەقیکارن. هەژار.

لەم ئایەتەدا قورئان بە کورت ترین رستەو رەوانترین قسە وەسفی کۆتایی هاتنی تۆفانی حەزرەتی نوح دەکا، بە بیستنی مرۆ هەست دەکا بە رەوانی‌و بێ گرێ‌و گۆڵی‌و صافو لووسی رستەکە، هەر دەڵێی ئاوی صافو بێگەردە بە ئەسپایی دەکشی‌و بە ئاوازو مۆسیقای خۆشی مرۆ دەمار شێل دەکا، هێندە رەوان‌و شەکر ئامێزە مانا و ناوەڕۆکی پێش وشەو رستە لە دڵا جێگیر دەبێ‌و وشەو رستەی پێشبڕکێی ماناو ناوەڕۆك دەدەنەوەو جێی خۆیان لە میحرابی دڵا دەکەنەوە!!! چۆن دەبێ کەوانەبێ ئەمە دارشتنی پەروەردگارەو شاکاری زاتی بێچونە.

بڕوانە ریزبوونی رستەکانی ئەم ئایەتە چۆن بەهۆی پیتی واوی عەتفەوە بەسەر یەکدا هاتوونەتەوە، بەو شێوەیە کە رەوانبێژی داخوازیەتی ئاوا تەرتیب‌و ریزکردنی ئەنجام دراوە، هەر دەڵێی ملوانکەی مرواریییە بە رێك‌و پێکی هۆندراوەتەوە.

بڕوانە چۆن یەکەمجار دەست نیشانی لایەنی هەرە گرینگی باسەکە دەکاو لە رزگاربوونی کەشتییەکەوە دەست پێ دەکا لە کاتێکا کەشتییەکە لەناو گێژاوی ئاودا هەڵبەزو فەڵبەزیەتی، ئەمەش ئەنجام نادرێ مەگەر بە رۆچونی ئەو ئاوەی کە لە دەوری کەشتییەکەیە لەبەرئەوە پەروەردگار لە سەرەتاوە فەرمان دەکا بە زەویەکە ئاوەکەی لەسەریەتی بیخواتەوەو قوتی بدا، بەڵام ئەگەر بارانەکە بەردەوام بێ‌و بروکەی نەداتێ لەوانەیە ئەوانەی لە کەشتییەکە دادەبەزن بەتەواوی تووشی تەڕو توشی‌و نارەحەتی ببن، لەبەرئەوە خوای مەزن‌و بەتوانا فەرمانی کرد بە ئاسمان کە لەبارین بوەستێتەوەو چی تر نەبارێنێ.

جا کە ئەرز ئاوی خۆی خواردەوەو هەڵی چۆڕاندو ئاسمانیش لە باران بارین وەستایەوە، کارەسات تەواو بوو هەموو شتێك براپەوە (وقضی الأمر) واتە ئەوانەی لە عیلمی پەروەردگاردا بڕیار درابوو کە لەناو دەچن‌و ئەوانەی رزگار بونیان کاتی خۆی لە زانستی خوادا بڕیار درابوو ئەنجام دراو کار تەواو بوو!.

ئەم جار دێتە سەر باسی راوەستانو جێگیر بوونی کەشتییەکە لەسەر کێوی جودی ئەم جار دوعاو نزاکردن لە بەهیلاك چووەکان پاش ئەوەی کە بە زۆرو ستەمکاری تاوانباریان دەکا بۆ خاتری ئاماژەی ئەوە بکا کە لەناو چوونەکە بەس بۆ ئەوانەیە شایانی سزانو موستەحەقی ئەو رۆژە رەشەن جا چونکە فەرمانی ئیلاهی دەربارەی لەناو چوونی ستەمکاران بەشێوەیەك دەرچووە کەسی تر نەی بیستووە گوێیان لێ نەبووە بۆیە فیعلەکان هەموو بە شێوەی (مبني للمجهول) دەر براونو لە سەرەتاوە فەرموویەتی (وقیل یا ارض) ئەمجار دوا بەدوای ئەوە سەیری ئاوازو مۆسیقای دوو وشەی (ابلعي)، (اقلعي) بکە چەند گونجاو لەبارن لەگەڵ وشەی پێش خۆیانەوە ئەم دوو وشانە هەردووکیان خوازراوی زمانینو لە مانای خۆیانەوە گوێزراونەوە بۆ مانای تر، ئەمجار بڕوانە رستەی (ابلعي ماءك) وشەی (ابلعي) شێوەی ئەو کارەمان پیشان دەدا کە لە ئەرز داواکراوە، ئەویش ئەوەیە کە بە گورجی هەرچی زووە چی ئاو هەیە قوتی بداو هەڵی مژێ.

دیارە ئەم مانایەی کە (ابلعي) دەی گەیەنێ وشەی (امتصي) پەیی پێ نابا (ئەوەی ئەحمەد دەیزانێ محمد رێی پێ نابا) ئەوجا لەوەدا کە ئیزافەو نیسبەتی ئاوەکەی داوە بۆ ئەرز ئاماژەیە بۆ ئەوە کە زەوی پێویستەو لاییقە کە ئاوی خۆی هەڵ بمژێ چونکە ئاو ئاوی خۆیەتی لە وشەی (استوت) کە کرداری کەشتییەکەیە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە راوەستانی گەمێیەکە بە جۆرێك بووە جوڵانەوەو لەرینەوەی نەماوە لەنگەرێکی وای گرت ئارام ئامێز بوو تا دانیشتوانی ناوی بە ئاسانی لێی بێنە دەرێو ترسیان نەبێ.

لە رستەی ﴿وَقِيلَ بُعْداً لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ یشدا ئاماژە بۆئەوە کراوە کە لەناو چوونی ستەمکاران بەو مەبەستە بوو تا پشێوی سەر زەوی نەمێنێو ئەو ناپاکانە لە خراپەکاری سەر زەوی دوور بخرێنەوە.

## پەندو ئامۆژگاری لە قورئان دا (الأمثال في القرآن):

برێك لە دیاردەی شێوازو دارشتنی قورئان هێنانەوەی پەندو مەثەلە: دیارە مەبەستی سەرەکی قورئانیش لەم پەندانە یاد خستنەوەو ئامۆژگاریو پەند وەرگرتنو چەسپاندنو نزیك خستنەوەی مەبەستە بۆ عەقلّو بیرو هۆش، بە شێوە کێشانی ئەو بابەتانە لە شێوەی بیندراوو دیاریدا، چونکە شتی هەست پێکراو زوترو باشتر لە زەینی ئادەمیزادا جێگیر دەبیو زۆرتر ویژدانی پی دادەسکنیو ئارام دەگریّ.

{وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ – سورة الزمر/ ٢٧}:

واتە: ئێمە لەم قورئانەدا لە هەموو بابەتێك پەندو ئامۆژگاریمان بۆ ئادەمیزاد هێناوەتەوە، بەڵکوو یاد بکەنەوەو بیرێك لەخۆیانو دوا رۆژیان بکەنەوەو بەخۆیاندا بێنەوە.

پەندەکانی قورئان دوو جۆرن، جۆرێکیان بە ئاشکرا لە شێوەی پەنددا هاتووەو پەند ئامێزە. وەکوو ئەو پەندەی کە پەروەردگار حاڵو چۆنیەتی موناففقەکانی پی روون دەکاتەوە کە دەفەرموێ:

{مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً فَلَمَّا أَضَاءتْ مَا حَوْلَهُ ذَهَبَ اللّهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِي ظُلُمَاتٍ لاَّ يُبْصِرُونَ – سورة البقرة/ ١٧}:

واتە: نموونەو پەندی ئەو موناففقانە وەکوو ئیشی ئەو کەسە وایە ئاگرێك چرایەك لە شەوێکی تاریکدا هەڵایسێنیّ هەر کە دەوروبەری روناك بووەوە، خوای مەزن ئاگرەکەی بکوژێنێتەوە روناکی بۆ نەهێڵێ، ئیتر هیچ شتێك نابینیو چاوی لەبەر پێی خۆشی نییە.. هەر بەو جۆرەش خوای پەروەردگار نوری ئیمانی لە دڵو دەرونی موناففیقو دوو روەکان سریوەتەوەو لای بردووەو رێگای راستیان لێ گوم بووە.

جۆرێکی تر لە پەندەکانی قورئان شاردراوەنو ئاشکرا نین بەڵکوو کە لێی ورد دەبێتەوە لەگەڵ پەندێکدا یەك دەگرێتەوە پڕ بە پڕ ئەو مانایە دەبەخشیّ وەکوو ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ:

{بَلْ كَذَّبُواْ بِمَا لَمْ يُحِيطُواْ بِعِلْمِهِ – سورة يونس/ ٣٩}:

دەق وەكوو ئەم پەندە دەچێ كە دەڵێ: (من جهل شيئا عاداه) یان ئەم ئایەتە كە دەفەرموێ:

{وَمَا نَقَمُواْ إِلاَّ أَنْ أَغْنَاهُمُ اللّهُ وَرَسُولُهُ مِن فَضْلِهِ - سورة التوبة/ ٧٤}:

سەر بەسەر ماناكەی دەشوبهێ بە مانای ئەو پەندە عەرەبیە كە دەڵێ: (اتق شر من احسنت اليه) یان ئەو ئایەتە كە دەفەرموێ:

{أَوَلَمْ تُؤْمِن: قَالَ بَلَى وَلَـكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي - سورة البقرة/ ٢٦٠}:

وەكوو ئەم پەندە مەشهورە وایە كە دەڵێ: (ليس الخبر كالعيان).

ئایەتی {وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكَانَ بَيْنَ ذَلِكَ قَوَامًا – سورة الفرقان/ ٦٧}:

ڕێك مانای ئەم پەندەی لەخۆ گرتووە كە دەڵێ: (خير الامور أو ساطها).

ئایەتی: {مَن يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ - سورة النساء/ ١٢٢}: وەكوو ئەم پەندە دەچێ كە دەڵێ: (كما تدين تدان).

هەر بەو شێوە لە قورئانی پیرۆزدا چەند وشەیەك هەیە وەكوو پەند بەكار دەهێنرێن بە سەردەم و زوبانی خەڵكەوەیە وەكوو ئەم رستانە كە لە قورئاندا هەن:-

١. {لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ اللَّهِ كَاشِفَةٌ}: (هەر خوا خۆی سەری لێ دەركا).

٢. {وَلَا يَحِيقُ الْمَكْرُ السَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِ}: (چاڵ بۆ خەڵكی هەڵكەنی خۆت تێی دەكەوی).

٣. {مَّا عَلَى الرَّسُولِ إِلاَّ الْبَلاَغُ}.

٤. {هَلْ جَزَاء الْإِحْسَانِ إِلَّا الْإِحْسَانُ}: (چاكە چاكەی لێ دەبێتەوە).

٥. {قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَى شَاكِلَتِهِ}: (گیا لەسەر بنجی خۆی دەڕوێتەوە).

٦. {عَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ}.
٧. {لاَّ يَسْتَوِي الْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ}: (پاك پاكەو پیس پیسە).
٨. {لَوْ عَلِمَ اللّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأسْمَعَهُمْ}.
٩. {وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَى تَنفَعُ الْمُؤْمِنِينَ}.
١٠. {الطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَاتِ}: (پاك بۆ پاكەو پیس بۆ پیسە).
١١. {ذَلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ يَدَاكَ}: (كاری خۆتە دێتەوە ڕێت).
١٢. {أَلَيْسَ الصُّبْحُ بِقَرِيبٍ}.
١٣. {كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ}.
١٤. {لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا}.

## دووبارە كردنەوەی مانا لە قورئان دا (تكرار معاني القرآن):

لایەنێكی تر هەیە تایبەتە بە شێوازو داڕشتنی قورئانەوە، ئەویش دوبارە كردنەوەو سێ بارە كردنەوەی مەبەستێك لە بڕێ ئایەتو سورەتیدا بەدەقی جوێ جوێ، واتە زۆر جار بۆ یەك مەبەست لە سێ چوار لاوە بە سێ چوار شێوە باسی لێوە دەكات كە یەك لەیەك جوان تـرو ڕەوان تـرو بەهێز تـرن. وەكوو گوتنەوەو دووبارە كردنەوەی بڕێ چیرۆكو سەر گوزشتەی ڕابوردوەكان. بە مەبەستی هەڕەشەو دەربڕینی ناڕەزایی لە كردارو گوفتارێك یان درێژە دان بە ئامۆژگاریو چەسپاندنی بەڵگە لەسەر ڕاستی كردارو گوفتارو ڕێبازێك، یان باسكردنو ڕانواندنی نازو نیعمەتو لەبەر چاوی خێرو بێرو یاد كردنەوەی خاوەن نیعمەتو پێویستی سوپاسو ستایشو ئەم جۆرە بابەتانە، كەوابوو دووبارە كردنەوەی ڕستەیەك یان ئایەتێك یان چەند ئایەتێك بۆ ماناو مەبەستێكی تایبەتی كە ماناو وشەیان لێك دەچن، لەبارەی ڕەوانیو ڕەوانبێژی، نهێنییەكە لە نهێنییەكانی قورئانو جۆرێكە لە جۆرەكانی بەتواناییو دەسەڵاتداری لە داڕشتنو ئاخاوتنی بەهێزو پێز، كە ئەمەش لایەنێكە تایبەتە بە

قورئانــەوە.. لەهــەر شــوێنێكدا مەبەســتەكان پیرۆزبــن، لەهــەر جێیەكــدا ئــەو مەبەستانەی ئاخاوتنەكەی بۆ هێنراوە بگەنە سەر ترۆپكی بەرزیو لوتكەی باڵایی بە دووبارە كردنەوەو سێ بارە كردنەوە ئاخاوتنەكە شیرین دەبێ، دەقەكە دەرازێتەوە هۆی ئەم دووبارە كردنەوە دەگەڕێتەوە بۆئەوە كە قورئان تەحەددای عەرەبو ناعەرەبی كردوە لەوەدا كە ناتوانن لاسایی سورەتێكی لە سورەتەكانی بكەنەوە، كەچی بۆ خۆشی بەهەموو جۆرێك باری لێ دەگۆڕێو هەرجارە بە شێوەیەك ماناو مەبەستەكە دووبارە دەكاتەوە جارێك بە كورتیو جارێك بە درێژو فراوانی، لە هەموو رووییێكیشەوە شاكار دەردەچێو ئەوپەڕی بەلاغەتی تێدا رەنگ دەداتەوە، بۆ خاتری سەر ئاساییو ئیعجازی دەربكەوی، رەوانیو هێزو پێزی وشەو رستەكانی ئاشكرا ببێ، بزانرێ كە ئەم كەلامە پیرۆزە:

ئاخـــــاوتنی ئـــــادەمیزاد نیـــــــەو صـــــــیفەتی
پـــــــەروەردگارە، چـــــــونكە ئاشـــــــكراو رونـــــــە

كە شاعیر یان نووسەر هەركاتێ نووسینێكی دووبارە كردەوە بەبێ شك جیاوازییەكی زۆر لەنێوان دەقە كۆنەكەو دەقە تازەكەدا پەیدا دەبێو لەیەكێكیان دا رەوانیو صافو بێگەردی ئەوی تریان هەست پێ ناكرێ بەڵكوو زۆر جار رێ دەكەوێ نووسەرێك شتێكی جوان دەنووسێ كە جارێكی تر دووبارەی دەكاتەوە، نەفەس كورتیو خۆگوشینو نقە نقی پێوە دیارە، بە پێچەوانەی قورئانەوە كە لە هەموو جارێكدا بەلاغەتو رەوانییەكەی لەدەست نەداوە.

لەلایەكی ترەوە دووبارە كردنەوەو گوتنەوەی شت باشترین رێگەی تێگەیاندنو ئیقناعە، بەهێزترین ئامێرو هۆكارێكە بۆ چەسپاندنی بیرو راو بڕوا لە دەروونی ئادەمیزاددا هەر لەبەر ئەم هۆیەیە كە لەم رۆژگارەدا دەبینین كۆمپانیاكانی پڕوپاگەندە پەنا دەبەنە بەر دووبارە كردنەوەی پڕو پاگەندەكانیانو گۆڕانكاری لە وشەو رستەكانی پڕو پاگەندەكەدا دەكەن بۆئەوەی بگەنە ئامانجی تایبەتی خۆیان.

## برێ لایەنی ئیعجازو سەر ئاسای قورئان (من وجوه إعجاز القرآن):

قورئانی پیرۆز زۆر لایەنی ئیعجازو سەر ئاسایی تێدایە کە هەموویان چ بە جیا جیاو چ بە کۆمەڵ کۆمەڵ شایەتی ئەدەن کە ئەو کەلامە نیگاو سروشی پەروەردگارە نەك کرداری ئادەمیزاد، برِی لەو شایەتو لایەنانە:-

## رەوانی قورئان لەهەموو شوێنێکا(فصاحة القرآن في كل المواضيع):

بە راستی جێگای سەر سورِمانە کە ئەم قورئانە لەهەر مەبەستێك بدوێ، هەر باسێك لەخۆ بگرێ، چیرۆك بێ، یان ئامۆژگاری، پەند بێ یان دادپەروەریو پەیمانو مزگێنی بێ یان هەرِەشەو ترس بەرنان، باسی رەوشتێ جوان بکا یان شتی تر، هەرگیزاو هەرگیز جوانی هۆنینەوەو لێکدانی رێكو پێکی کەمو کورِی ناهێنێو هێزو پێزی کەم نابێتەوە.. لە کاتێکا ئێمە دەبینین نووسەرو خەتیبێکی رەوانبێژ، یان شاعیرێکی هەست ناسكو هونەرمەند، شێوازو ئاخاوتنەکەی بە گوێرەی مەبەستەکانی دەگۆرِێو بەرزو نزمی تێ دەکەوێ. شاعیری وا هەیە لە ستایشو پیاهەڵداندا شیعری بەهێزی هەیە، کەچی لە زەمو لە کەدار کردندا بێ هێزە، نوسەرو رۆشنبیری وا هەیە لە پەخشانی پیاهەڵدانو سەنادا قەڵەمی رەوانە، کەچی بۆ سەرە خۆشیو لاواندنەوە، قەڵەمی بێ برِشتە، نوسەرو شاعیری وا هەیە لە وەصفو سەنای باخو گوڵو گوڵزاردا یا لە باسی مەییو دڵداریو ئامۆژگاریدا نووسینو شیعری زۆر بەهێزو سەرنج راکێشی هەیە، کەچی لە لایەنی تردا کۆڵەوارە. بۆیە دەبینین مێژوو نووسانی ئەدەبی عەرەبی ووتویانە وەصفو سەنا لە (أمر أو القيس) جوانە کاتێ سواربێ یان (نابیغەی زوبیانی) کاتێ بترسێو دڵی خورپەی پێ بکەوێو عوزر بێنێتەوە، یان زوهەیری کورِی ئەبی سەلما کاتێ حەزی لێ بی هەربەم جۆرە دەبینین خەتیبو نووسەر لە شوێنێکا لە باسێکا سەرکەوتوون لە جێیەکی تر هەناسە برِکێیانە. دیوانی شاعیرێکی هونەرمەند بخوێنەوە، دەبینی جیاوازییەکی بەرچاو لە بەرزو نزمی

شـیعرەکانیا بـەدی دەکـرێ، بـەگوێرەی شـوێن‌و بـاس‌و مەبەسـت لـە برێکیانـدا سەرکەوتووەو شیعرەکانی هەسـت‌و خوسـتێکی ناسـك‌و قوڵیـان لـەخۆ گرتـووە، لـە بری شوێنیشا دەست کورت‌و لێ قەوماوەو دۆشداماوە.

بـەڵام کـە سـەیری شـێوازی قورئـان دەکـەین دەبیـنین لەگـەڵ ئـەم حەمکـە لایەنانەی کە باسی لێوە کردوون، لەگەڵ ئەو هەموو مەبەستە جیا جیایانـەی کۆی کردونـەوە، هـەرگیزاو هـەرگیز تۆزقاڵێـك لـە ترۆپکـی رەوانبێـژی دانەبـەزیوە، لـە شوێنێکدا کورتی نەهێناوە.. لەلایەکی ترەوە پێویستە بزانرێ کە هەڵبـژاردنی وشـە بۆ مانای باوو ئاشناو بەیدەست گەلێ ئاسانترو نزیـك تـرە لـە هەڵبـژاردنی وشـە بـۆ مانای داهێنراوی نەبیستراو چونکە ئاشکرایە کـە رەوانبێـژی عەرەبـەکان‌و هونـەری وشـە زانییـان‌و دەسـت رۆیـشتویی‌و زمـان پاراوییـان لەباسـی سروشـت‌و تەپولکـەو بیابـان‌و ئـاخ‌و ئـۆف کـردن بـۆ لای خۆشەویـست‌و باسـی وشـترو راوو راوە شـکارو دڵداری‌و پیا هەڵدان‌و خۆ هەڵنانەوەو جنێو دان‌و لەکـەدار کـردن بـووە، خـۆ دیـارە رەوانبێژی لە وەصف‌و سەنای ئەم جۆرە شتە هەست پێکراوانـەدا بـەر فـراوان بـووە بە زۆری خەڵکەکە پێی ئاشنا بوون‌و حـەزیان لێـی بـووە هـەروەکوو چۆن زوربـەی شـاعیرەکان ئـەم باسـانەیان لێـوە کـردون لەبەرئـەوە شـتێکی ئاسـاییە ئـەو شـاعیرەی سەردەمی دواتـر بـی شـوێن رێبـازی شـاعیرەکانی پـێش خـۆی کـەوتووەو سـوودی لـە رەوانبێژی‌و بەلاغەتی شاعیرەکەی پێش خۆی بینیـوە دەی قورئـان بـەهیچ جۆرێـك لـەم شـتانەی شـاعیرەکان دەمیـان لێـداوە نزیـك نەبۆتـەوە، ئەگـەر نزیـك بوایـەوە دەبوایـە بـرێ لـەو رسـتانەی کـە بـەلای عەرەبەکانـەوە رەوان بـووەو شـاعیرەکان بەکاریان هێناوەلە قورئاندا بەدی بکرایە.

بەڵام قورئـان چـەن لایـەنی تـری لـەخۆ گرتـووە کـە لـەلای عەرەبـەکان بـاوی نەبووە، پێی ئاشنا نـەبوون هـەموویان لـە عاسـت بـیرو هۆشـی ئـەوان تـازە بابـەت بوون، وەکوو باسـی خـواو تـاق‌و تـەنیایی‌و گـەورەیی‌و زانـایی‌و بـە توانـایی ئـەو.. هەروەها بانگ کردنی مەردوم بۆ بەحەق ناسینی‌و پەرستنی‌و بـە پـاك‌و بێگـەرد زانینی لەهەموو عەیب‌و خەوشێك، هەروەها باسی وەصف‌و سەنای نازو نیعمـەتی

بێ پایانو بەرفراوانی خودا بۆ ئەو کەسانەی تاعەتی دەکەنو گەردن کەچی فەرمانەکانی دەکەن! یا وەکوو باسی سزاو سەر زەنشتی بۆ ئەوانەی سەر پێچی دەکەنو لێی یاخی دەبن. هەروەها قورئان هەر بەینە نا بەینێ داستانو چیرۆکو سەر گوزشتەی پێغەمبەرەکانی رابوردو لەگەڵ گەلەکانیان چییان کردوەو چییان بەسەر هاتووە بۆمانی دەگێڕێتەوە، لەناو ئەم چیرۆکو سەر گوزشتانەدا پەندو ئامۆژگاریو عیبرەت لێ وەرگرتن هەیە، لە تەك ئەمەشا ئاماژە بۆ ئەم مەبەستانەی تریش کراوە عیبادەتو چەندو چونی، هەڵنانو دەم شیرین کردن بۆ کاری چاکەو رەوشتی بەرزو دوور کەوتنەوە لە ئەخلاقی بەدو ناشیرین چەسپاندنی یاسای دارایی سەروەتو سامان، چۆنیەتی هەڵسو کەوتی خێزانو کارو باری کۆمەڵایەتیو چەند جۆر لەم کارە گرینگانەی لەخۆ گرتووە کە هیچ رەوانبێژێك ناتوانێ بە توانای ئاسایی دەریان بڕێو بیانخاتە ناو دەقی ئەدەبی خۆیەوە لە هەموو شیانا سەرکەوتوو بێ.

هەر کاتێك ئێمە لە ئایەتەکانی قورئان وردبینەوەو تێی بفکرین دەبینین قورئان ئەو هەموو مەبەستانەی کە لەخۆی گرتوون بەو پەڕی رەوانییەوە ئەنجامی داون، چەند شێوە دووپات کردنەوەو چەند جۆرێك لێك چوونو خواستنو زاراوەی خۆش خوانی بەکار هێناوە کە بە تەواوی خوێنەری عەرەبی زانو شارەزای خستونە سەر سامییەوە لە عاستیدا گۆش بوونو دەستە وەسان وەستاون!!!.

## فرە رەوانبێژی قورئان (وفرة بلاغة القرآن):

لایەنێکی تر لە لایەنەکانی ئیعجازو سەر ئاسایی قورئانی پیرۆز ئەوەیە کە تا ئێستا گەلی عەرەب پەڕاوێکیان نیە بەو شێوە فراوان بێو ئەو هەموو رەوانیو رەوانبێژیەی تێدا کۆ بووبێتەوە، ئەم حەمکە وشە ئاراییو مانای جوانو پەندو ئامۆژگاریەی لەخۆ گرتبی ئەو هەموو لێك چوونو لێك هاتنو رێكو پێکییەی تێدا هاتبێتەوەو لە هیچ رویەکیەوە کورتی نەهێنابێ. بەڵکوو لە مێژووی

دێرینەی عەرەبی پێش ئیسلامدا چەند رستەو وشەیەکی کەم دەگێڕدرێتەوە، هەروا لە شاعیرانیانەوە چەند شیعرێکی رەوانو پەند ئامێز دوور لە کەفو کوڵی دەروونی گێڕدراوەتەوە، کەچی ئەم هەموو لایەنە بەلاغیانە لە قورئاندا کۆ بۆتەوە، دەی باشە چۆن نەخوێندەوارێکی وەکوو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) یان خوێندەوارێکیش با زۆری خوێندبێ دەتوانێ ئاوا بەو شێوە نزیکەی شەش هەزار ئایەت رێك بخاو خەڵکی سەر سام بکاو ئەو رەوانیو بەلاغەتەی تێدا بێ؟!
ئەڵبەتە ئەمە باشترین بەڵگەی بەردەوامە کە قورئان سروشی خوایەو نیگای زاتی بێچونە بۆ پێغەمبەر!!.

## ساغی قورئان لە دژایەتیو هەڵە(سلامة القرآن من التناقض والخطأ):

شتێکی تر هەیە پێویستە بزانرێ، ئەویش ئەوەیە، قورئان لەگەڵ زۆریو فراوانیدا، لەگەڵ لەخۆ گرتنی ئەم هەموو جۆرە بابەتانەیدا (بە پێچەوانەی ئاخاوتنو بەرهەمی ئادەمیزاد) لەهەموو دژایەتیو جیاوازیو هەڵەو ناکۆکیو ساتمەو پاشو پێشو عەیبو عاری چ هی شێوازو چ هی ناوەڕۆك پاكو بێگەردە هەرگیزاو هەرگیز خەوشێکی بچوك لە شکلو ناوەڕۆکی ناگیرێ، ئێمە دەبینین زاناو نووسەرە گەورەکانی جیهان لەهەموو چەرخو سەردەمێکا کە کتێبێك دادەنێن لەسەرەتاوە بیری لێ دەکەنەوە، ئەمجار دەینووسن، پاشان پاڵفتەی دەکەنو پیادەچنەوە، هی وا هەیە جارو دوو جارو سێ جار بژاری دەکاو پوختەی دەکاو هەڵەی لێ راست دەکاتەوە، کەچی کە بڵاوی دەکاتەوە، چەند هەڵەو دژایەتیو کەمو کوڕیو پاشو پێشی تێ دەکەوێو نەنگی بە کتێبەکە دەبەخشن، جاری واش هەیە کتێبێك لە سەردەمی نووسەرەکەی دا یان لە چەندساڵێکا بە باشترین کتێب دەناسرێو بێ خەوشو هەڵە حسێب دەکرێو جێگای متمانەی خەڵکەکەیە بەلام پاش چەند ساڵێك پاش پێشکەوتنی عیلمو زانست، دەبینین ئەو کتێبە چەند هەڵەی زلی لێ بەدی دەکرێ، لەچەند لایەکەوە کەمو کورتی تێدا پەیدا دەبێ.. دەی باشە قورئانی پیرۆز لەسەر زوبانی نەخوێندەوارێکی ئوممی

پەیدا بووە. نەخوێندەوارێك كە نەزانیویەتی بخوێنێتەوە نەزانیویەتی بنووسێ، خۆ ئەوە چواردە سەدەو چەند ساڵێك بەسەر هاتنیدا تێ پەڕیو پێش كەوتنی زانستو زانیاری لە برەودایەو بیرو هۆشی مەردوم بەردەوام لە گۆڕاندا بووە، كەچی دژایەتیو ناكۆكیو هەڵەی زانستی لە هیچ رویەكەوە تا ئێستا لێی بەدی نەكراوەو لە مەودوایش لێی بەدی ناكرێ، بەڵكوو ئەو بنەماو زانستیانەی قورئان هێناونی لەگەڵ هەموو شوێنو كاتو ساتێكا گونجاونو لەگەڵ هیچ زانستیەكی راستدا دژ نەوەستاون. بەڵكوو تا زانستو زانیاری پێش كەوێ مانای قورئان زیاتر ئاشكرا دەبێ.

## زۆریو قوڵی مانای قورئان (غزارة معاني القرآن):

دیاردەیەكی تر لە دیاردە تایبەتییەكانی سەر ئاسایی قورئان ئەوەیە كە دارشتنو شێوازی ئەوەندە نەرمو نیانی تێدایە، ئەوەندە مانا هەڵ دەگرێ بەجۆرێك كە لەگەڵ رای زۆرو جیاوازدا لەگەڵ یەك هەڵنابەزێتەوە لەگەڵ تەبیاتو گۆڕانكاری ئادەمیزادا لەهەموو سەردەمو چەرخێكدا گونجاوەو بە گوێرەی راڤەو شەرحی زانایانی جۆراو جۆرو رێژەی تێگەیشتنیان لێی بەكارهێنراوە.

دەی ئەوەتا عەرەبەكان نەزانو نەخوێندەوارەكانی سەردەمی نەزانی هەر بە سەلیقەی رووت لێی حاڵی بوونو تێی گەیشتوونو تامو چێژیان لێی وەرگرتووە، لە دوای ئەوانیش هەتا ئێستا بەردەوام فەیلەسووفو زاناو بیردۆزو خوێندەوار لێی حاڵی بوونو چەكی دەستیان بووە سەرۆك تایەفەو كۆمەڵو پارت هەریەكە بە گوێرەی بۆچوونی خۆی تێی گەیشتووەو سوودی لێ بینیوە. خۆ زانستو زانیاری تازە زۆر لە نهێنیەكانی ئەو قورئانە پیرۆزەی دەرخست كە لەوە پێش شاردراوەو نەزانرابوون، دەی كەی ئەمە هەمووی یان هەندێكی لە ئاخاوتنی ئادەمیزاددا بەدی دەكرێ؟! ئەوەش لەبیر نەكەین ئەو مانا زۆرانەی لە قورئاندا هەن ئەو مەبەستە جۆراو جۆرانەی قورئان لەخۆی گرتوون ئەگەر لە ئاخاوتنی ئادەمیزاددا بوونایە بەبی شك بەرگێكی ئادەمیانەیان لەبەر دەكرا كە وەك

ئاوێنەی هەزارو یەك روو لە هەزار رەنگ بینواندایەو شەقڵی چەندان نووسەرانی پێوە دیار بوایە کەچی شتی وا لە قورئاندا بەدی ناکرێ، لەهەموو قورئاندا شتێك نابینی لەوە بچێ کە هەڵقولاوی دەروونی رەوانبێـژێکی ناسـراو بـێ یـا شـتی وا لـە سروشتی ئادەمی بوەشێتەوە وەك قورئان خۆی دەفەرموێ:

{وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ اخْتِلاَفًا كَثِيرًا}. سورة النساء/٨٢}:

وەکوو ئەوان دەڵێن ئەگەر وابێ ئەم قورئانە هی خودا نەبێو هی یەکێکی تر بێ، واتە دەبو پڕی بوایە لە جیاوازیی و هەڵەو ناکۆکی.

## لەخۆ گرتنی قورئان بۆ هەواڵی غەیبی:

بەڵـگەیەکی تـر لەسـەر سـەر ئاسـایی قورئـانو چەسـپاندنی ئـەوە کـە نیگـاو سروشی خوایە، لەخۆ گرتنیەتی بۆ برێ هـەواڵی نهێنـی کـۆنو رابـوردوو، یـان بـۆ هەندێهەواڵی تـری وا کـە لـە داهـاتوودا، لـەپاش دابـەزینی قورئـان روو دەدەن وە گەردشی رۆژگاریش دروستی فەرمایـشتی قورئـانی سـەلماند، چـونکە بەهاتووچـۆی رۆژگـارو کارەسـاتی چـەرخو پێـشکەوتنی زانـستو زانیـاری رۆژ لـەدوای رۆژ ئـەو هەواڵانـەی قورئـان بـە راسـت گـەڕانو ئـەوەی قورئـان فـەرموو بـووی هاتنـە دی، هەنــدێ لــەو بەڵێنانــەی قورئــان لــەکاتی هاتنــە خوارەوەیانــدا ئەوەنــدە ســەر سوڕهێنەر بوون پاساو (تەعلیل) نەدەدرا لەبەرئـەوە گومـانی ئـەوەی لێـدەکرا کـە زیـادە رەوی تێـدابێ بـەڵام ئەوەنـدە بـە سـەیریو دەق بـە دەقـی هاتنـە دی، پیـاو ناچار دەکەن کە قورئان بە سروشی خوا بزانێ.

بـۆ نموونـە کاتێـك موسـوڵمانەکان تـازە مەککـەیان بـەجێ هێـشتبوو چـوونە مەدینە هێشتا زۆر بێ هێزبوونو بە رواڵەت پەنا هێندە بوون کەچـی لـەم کاتـەدا ئایەتێك هاتۆتە خوارێ دەفەرموێ:

{وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا – سورة النور/ ٥٥}:

واتە: خودا مزگێنی داوە بەوانەی باوەڕیان هێناوە لە ئێوەو کردەوەی باش دەکەن مزگێنییان دەداتێ.. کە جێگیریان دەکا لەسەر زەوی‌و پاشایەتی‌و فەرمانڕەوایی تێدا دەکەن، چۆن لە رابوردوودا مزگێنی داوە بە خوا پەرستانی پێشوو هەروەها ئایینەکەیان جێگیر دەبی‌و دەکرێ بە یاساو بەرنامەی ئادەمیزاد لە شوێنی ترس‌و بیمیش ئارامی‌و دڵنەواییان دەداتێ!!

دەی بڕوانە ئەم ئایەتە کاتێ هاتۆتە خوارێ کە هێشتا موسوڵمانان کەم بوون‌و ترسێکی زۆریان لە کافرەکان هەبوو شەوو رۆژ لەسەر هەست بوون‌و لە ترسی دوژمن شەو بەچەکەوە دەنوستن، جار ناجارێکیش بە ئاواتەوە دەیانگوت: دەبێ رۆژێك بێ ئێمە بتوانین بە دڵنیایی‌و بێ ترس کاروباری ئایینی خۆمان ئەنجام بدەین!؟ کەچی ئەوەندەی پێ نەچوو رۆژگارێك داهات مانای ئەم ئایەتە هاتە دی‌و موسوڵمانەکان دەستیان بەسەر زۆر شوێنی سەر زەویدا گرت‌و بوونە خاوەن‌و فەرمانڕەوای راستەقینە وەکوو بەڵێنەکەی قورئان.. یان ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ:

**{يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ – سورة المائدة/ ٦٧}:**

واتە: ئەی محمد! ئەی فروستادە! ئەو ئایین‌و شەریعەتەی بۆت نێردراوە لەلایەن خوای خۆتەوە بە ئادەمیزادی رابگەیەنەو بڵاوی بکەرەوە، ئەگەر رای نەگەیەنی ئەوە تۆ پەیام‌و ریسالەتی خودات نەگەیاندووەو کارو ئەرکی خۆت ئەنجام نەداوە، لەوەش دڵنیا بە کە لەم رێگە پیرۆزەدا خوا لە زیانی ئادەمیزادی بێ بڕوا دەتپارێزی‌و ناتوانن فرسەتت لێ بێنن. لە پێش هاتنی ئەم ئایەتەدا کۆمەڵێك لە یاران چاوەدێری پێغەمبەریان دەکردو ئێشکچی‌و نیگابانی بوون، لەوە دەترسان کافرەکان فرسەتی لێ بێنن‌و بیکوژن، کە ئەم ئایەتە نازڵ بوو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) سەری لە پەنجەرەی ژوورەکەیەوە دەرهێناو بە پاسەوانەکانی فەرموو: ئەی یاران! هەر کەسە بچێتە ماڵی خۆی‌و من لەمەو دوا پێویستم بە حەرەس نییەو خوا بۆخۆی دەم پارێزێ!!

بەڕاستی ئەمە باشترین بەڵگەیە کە قورئان سروشی پەروەردگارە ئەگینا کێ دەتوانێ گرێنتی بدا بە کەسێك کە بەربەرەکانی گەلێکی نەزانو سەر رەق بکاو تانوت لە ئاینو پەرستراویان بدا، کەچی دڵنیابێ لەوە کە ناتوانن بیکوژنو قەت فرسەتی لێ ناهێنن، بە دڵنیایی حەرەسو پارێزەری تایبەتی خۆی مەرەخەس بکاو لەخۆی ئەمین بێ!!.

یەکێکی تر لەو ئایەتانەی کە هەواڵی غەیبی تێدایەو زۆر دوای نازڵ بوونی قورئان پێشبینیەکە هاتۆتە جێ ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ:

**{قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعاً وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ – سورة الأنعام/ ٦٥}:**

واتە: ئەی فروستادە! تۆ بەو خەڵکە بڵێ هەر خوایە دەتوانێ کە عەزابو ئێشو ئازارتان بۆ بنێرێ، لە ژورتانەوە بەسەرتانا ببارێ، یا لە ژێر پێتانەوە هەڵبستێ، یاخود تێکەڵتان بکا بە یەکاو بتان کا بە چەند کۆمەڵو گرۆهێکی جیا جیا هەریەکە بە ئاوازێ لێ بداو هەر کام چەقۆ لەوی تر بسوێ، تاڵاوی دوو بەرەکی لە دەستی یەکتر بچێژن.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود کە یەکێ بوو لە یارانی پێغەمبەر لەبارەی ئەم ئایەتەوە فەرموویەتی: (انها نبأ غيبي عمن يأتي بعد):

واتە: ئەم ئایەتە هەواڵ لە رووداوێکی نهێنی دەدا کە لە داهاتوودا روو دەدا جا ئێستا هەر کەسێك لە مانای ئەم ئایەتە تی بفکرێ بۆی دەردەکەوێ تا چ ئەندازەیەك ئاوێنەیەکی باڵا نومایە بۆ شەڕی یەکەمو دووەمی جیهانی یان ئەو شەڕانەی کە لەم ساڵانەدا روویاندا چۆن لە هەموو لایەکەوە لە سەرو خوارو ئەم لاو ئەولاوە ئاگر باران بووە.

لەبەر دووکەلی باروت شەوانە

سەر زەوی دەتگوت ژووری دوخانە

هەوا وەك دەریا، دەریا چوون تەنوور

سینخناخ لەگوڵ و پارچە ئاوری سوور

بەڕاستی لەخۆ گرتنی ئەم هەواڵە غەیبییانە نیشانەی ئەوەیە کە قورئان سروشی خوایەو پێغەمبەرایەتی (محمد) ڕاستەو (محمد) فرەستادەی خودایە. چونکە هەر خوا خۆی غەیب زانە.

## چیرۆك لە قورئاندا (القصص في القرآن):

دەستەیەکی تر لەو هەواڵە غەیبییانەی کە قورئان باسیان لێوە دەکا ئەوانەن: کە باس‌و خواسی چیرۆکی پێغەمبەرەکانی ڕابوردوومان بۆ باس دەکەن، بە شێوەیەکی ڕەوان‌و لێکدان‌و دارشتنێکی بێ وێنەی وا کە تا ئێستا هیچ خوێنەرو چیرۆك نووسێك نەیتوانیوە بە تۆزی قولیا بگات، کەوابوو ئەمەش لایەنێکە لەو لایەنانەی کە سەر ئاسایی قورئان دەچەسپێنێ، چونکە حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) نە نووسەر بووەو نەخوێندەوار،! نەبیستراویشە ڕۆژێك لە ڕۆژان بچێتە لای مالێکی جولەکە، یان قەشەیەکی مەسیحی فێری چیرۆك خوێندن ببێ یا باسێکی ئەو ڕابوردوانە ببیسێ، لەگەڵ ئەوەشا داستانی بەسەرهاتی پێغەمبەرە پێشینەکان لە قورئاندا زۆر بە ڕێك‌و پێکی‌و ڕەوانی تۆمارکراوە وەك داستانی حەزرەتی ئیبراهیم‌و یوسف‌و موساو عیساو گەلێکی تر ئەمەش باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە قورئان سروشتی خوایە، جا قورئانی پیرۆز بۆ خۆی جاری وا هەیە لە سەرەتاوە یان لە کۆتایی چیرۆکەکەوە ڕاستەو خۆ ئەوە دەچەسپێنێ کە ئەم چیرۆکانە لە خواوەن‌و سروشی پەروەردگارن نێردراون بۆ پێغەمبەر. وەکوو لەسەرەتای سورەتی یوسفدا دەفەرموێ:

{نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ بِمَا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ هَذَا الْقُرْآنَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِ لَمِنَ الْغَافِلِينَ}:

واتە: ئێمە جوانترین چیرۆکت بۆ دەگێڕینەوە بەهۆی ئەوەوە کە بە نیگا ئەم قورئانەمان بۆ ناردووی هەرچەندە تۆ ئەی (موحەممەد) پێش هاتنی قورئان هیچ ئاگاداریەکت لەم چیرۆکەو لە چیرۆکەکانی تریش نەبووەو لێیان بێ ئاگا بووی...!

یان لە سورەتی (هود)دا دوای گێڕانەوەی چیرۆکی حەزرەتی نوح دەفەرموێ:
{تِلْكَ مِنْ أَنبَاء الْغَيْبِ نُوحِيهَا إِلَيْكَ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَا أَنتَ وَلاَ قَوْمُكَ مِن قَبْلِ}:

واتە: چیرۆکی نوح و بەسەرهاتی لەگەڵ قەومەکەیدا یەکێکە لەو هەواڵە غەیبییانەی کە بۆت دەگێڕینەوەو بۆمان ناردووی، پێش ئێستا نەخۆت و نەقەومەکەشت ئاگایان لەم رووداوانە نەبووە هیچیان لێ نەبیستوە.

بەڵگەیەکی تر لەسەر ئەوە کە قورئان نیگای خوایە ئەوەیە کە چیرۆکەکانی جیاوازییەکی زۆریان هەیە لەگەڵ چیرۆکی کتێبە ئایینە پیرۆزەکانی پێش خۆی، زۆر لەوان رەوانترو رێك و پێك ترە.. بۆ نموونە کاتێك سەیری تەورات دەکەین دەبینین برێ کردەوەی ناشیرین و گوفتاری نابەجێ دەداتە پاڵ پێغەمبەرەکان، بە جۆرێك کە عەقڵ نەیسەلمێنێ، بڕواش ناکری پێغەمبەرێك نێردرابێ بۆ رەهنومایی مەردووم و شتی ئاوەها ناشیرینی لێ بوەشێتەوە، بەڵام قورئان کە باسی ئەم پێغەمبەرانە دەکا هێندە بە جوانی وەسفیان دەکاو هەڵیان دەکێشێ ئەوەندە کردەوەی جوان و هەڵوێستی پیاوانەیان دەداتە پاڵ کە شیاوی ئەوەبن ببن بە پێشەواو رابەرو رەهنومای ئادەمیزاد، خوێنەر زیاتر ئیمان و باوەڕی بە رابەرایەتییان دەبێ.

ئەوەش لەیاد نەکەین کە مەبەست لە هێنانەوەی چیرۆك و گێڕانەوەی بەسەرهاتی پێغەمبەران لە قورئاندا مێژووی ژیانی خودی پێغەمبەرەکان یان مێژووی هۆزەکانیان نییە، بەڵکوو مەبەستی سەرەکی لەم چیرۆکانە پەند وەرگرتن و ئامۆژگاری و رەهنومایی و رێ پیشاندان و شارەزایی بوونە بۆ هەموو بانگەوازکەرێك و بانگ کراوێك بۆ سەر رێبازی راستی و حەقیقی!!

دکتۆر فیلیب حەتی لە کتێبی (تأريخ العرب)ە کەیدا دێتە سەر باس کردنی چیرکی قورئان دەڵێ: مەبەستی قورئان لە رانواندنی ئەم چیرۆکانە وەرگرتنو تێگەیشتنە لە پەندێکی رەوشت ئامێزو مەبەستی سەرەکی لە گێڕانەوەی ئەم چیرۆکانە هەر خودی چیرۆکەکە نییەو بەس! بەڵکوو دەیەوێ خوێنەرو بیسەر بەیەکەوە بگەیەنێتە مانایەکی بەرزو کاکڵەو پوختەی شتێکی باشیان تێ بگەیەنێ، یان ئامۆژگارییەکی رۆشنبیری ئامێزی باڵایان بەبن گوێدا بداو راستییەکی مێژوییان بخاتە پێش چاو وەکوو ئەوە بۆ ئادەمیزادی روون بکاتەوە کە پەروەردگار بە درێژایی مێژوو پاداشی پیاو چاكو کردار چاکی بەگوێرەی کردارو گوفتاریان داوەتەوە، هەروەها سەر زەنشتو سزاشی بۆ خراپو خرابکاران لەسەر کردەوەکانیان بووەو بە گوێرەی کرداری خۆیان سزایان دراوە!!

## جەوهەری قورئانو زیندوویی قورئان (روح القرآن):

بەڵگەیەکی تر لەسەر سەر ئاسایی قورئان لایەنی زیندوییو کاریگەرییەتی: ئەوەتا دەبینین خوای گەورە کاتێك روو لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەکا جارێك قورئان بە گیانو جارێك بە نورو رووناکی ناو دەبا دەفەرموێ:

{وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَـكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاء مِنْ عِبَادِنَا وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ — سورة الشوري/ ٥٢}:

بڕوانە پەروەردگار لەم ئایەتەدا جارێك قورئان بە گیانو روح ناو دەبا چونکە دەروونی ئادەمیزاد زیندو دەکاتەوە، گەشو نمای پێدەکا، گیان چ دەورێکی لە لاشەدا هەیە قورئانیش ئەو دەورەی هەیە، هەروەها قورئان بە نورو رووناکی ناودەبا چونکە وەکوو چۆن خۆر دونیا روناك دەکاتەوە بەو جۆرەش قورئان روناکی مەعنەوی بە دڵو دەروونی ئادەمیزاد دەبەخشێو دەبێتە مایەی خۆشبەختی هەردوو جیهان سەیرکە قورئان چ گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لەناو عەرەبەکاندا پەیدا کرد، پێش هاتنی قورئان هەموویان پچڕ پچڕ بوون، نە

پەیوەنـدی رامیـاری نـەهی خزمایـەتیو رەگەزایـەتی، نـەهی ئـایینی یـەکی نەدەخستنەوە چەند دابو نەریتی نالەبارو پڕوپوچ لەناویانـدا رەگـی داکوتـابوو.. بـەلام دوای هـاتنی قورئـانو بلاوبوونـەوەی ئیـسلام لەناخـەوە گۆڕانکاریـەکی سەرانسەرییان تێدا پەیدابوو، بەهۆی قورئانەوە بوونـە گـەلێکی یـەك هەلۆیـستو یەك دەنگو یەك مەبەست، توانییان بەچوار دەوری خۆیانـدا ئـەخلاقو رەوشـتی جوان بـلاو بکەنـەوە!! دەی باشـە چ بەڵـگەیەك لـە ئەمـە بـەهێزترە کـە قورئـان نیگـاو سروشـی خوایـەو گیانێکـە لـە خـواوە نێـردراوە! ئـەم زیندوویـەتیو گیـان بەخـشینەی قورئـان زۆر لایـەنی لـەخۆ گرتـووە، زوربـەی زانـستەکانی لاهـوتو خواناسیو بنەمای بڕوا ئایینیەکانو یاساو رەوشـتی بـەرزو دابو نـەریتی جوانو یاساو رێبازی رامیاریو شارستانیو کۆمەلایەتیو لایەنی دیکەشی تێدا کۆبۆتـەوە. ئەو بنەماو یاسایانەی قورئان هێنانی لـە باشـیدا پـێش هـەموو یاسـاو قـانوونێکی ئـادەمیزاد کـەوتووەو لەهـەموو رویەکـەوە گـۆی مـەیدانیان بردۆتـەوە بـە کـورتی قورئان تێکڕا شاکارێکی ئەدەبی پێك هێناوەو بووە بە بەرنامـەی شارسـتانیەتێکی تازە بابەتی پێشکەوتووی بێ وێنەی سەر رووی زەوی.

ئێمە ئـەم قـسانەمان هـەروا بـە هەوانتـە فـڕێ نـادەینو پڕوپاگەنـدەو کاوێـژ ناکەینو داکۆکی بێ بەڵـگە ئـەنجام نـادەین، بەڵـکوو چـی دەڵێین بـە بەڵـگە دەی چەسـپێنن بەڵگەکانیـشمان بـرێتین لـەم لێکۆڵینـەوەو توێژینەوانـەی کـە لـەم کتێبـەدا ئامارەمـان بـۆ کـردون، ئاشکراشـە کـە ئـەم لایەنانـە باشـترین بەڵـگەو بـەهێزترین دیـاردەن بـۆ سـەر ئاسـایی قورئـان چـونکە زانیـاری بـڕواو عەقیـدەو لاهـوتو خواناسـیو رەوشـتو دابو نـەریتی یاسـاو هـەڵسو کـەوتی ئـایینیو شارستانی ئەم زانیارییانە لە ژوور هەموو زانیارییەکەوەن، پلەی هـەرە بـەرزییان هەیـە، کـەم رێ دەکـەوێ ئەوانـەی کـە سـاڵەهای سـاڵە خـەریکی لێکۆڵینـەوەنو توێژینـەوەیان تێـدا دەکـەن تێیانـدا سـەرکەوتوو بـن! کـەوابوو چـۆن کابرایـەکی نەخوێندەوار، پیاوێ کە لـە ژیانیـدا هیـچی نەخوێنـدبێو هیـچی نەنووسـیبێ، لـە شـارو وڵاتێکـی خـاوەن خوێنـدنگاو زانـستو شـەرع زانـدا گـەورە نـەبووبێ، چـۆن

توانی ئەم قورئانە تێرو پڕە رێك‌و پێکە بێنێ!؟ چۆن توانی دوای تێپەڕبوونی چل ساڵ لە تەمەنی نەخوێندەواری دوای ئەوەی دوو بەش لە سێ بەشی تەمەنی بە نەخوێندەواری بردە سەرو رۆژێك لە رۆژان لەم ماوەدا شتێکی لەم بارەوە لێ نەبیسرابێ‌و یاساو بۆچوونێکی لەم بارەوە لێ دەرنەکەوتبێ، کەچی لەپڕ لە تەمەنی چل ساڵیدا ئەم قورئانە بەم شاکارو رێك‌و پێکییە بێنێتە پێشەوە؟! ئەم زانست‌و زانیارییە بڵاو بکاتەوە؟!.

هەر لەم رووەوەیە کە پەروەردگار فەرمان دەکا بە فروستادەی خۆی حەزرەتی (محمد) (درودی خوای لەسەر بێ) کە روو بکاتە ئەو عەرەبانەی کەوا دوودڵن لە پێغەمبەرایەتیەکەی، وە پێیان بڵێ ئەگەر خوای گەورە بیویستایە من ئەم قورئانەتان پێ رانەگەیەنم‌و بۆتانی نەخوێنمەوە پێم رانەدەگەیاندن‌و شارەزاییم نەدەکردن، خۆ من ماوەیەکی زۆر دورو درێژ پێش ئێستا لەناو ئێوەدا بووم‌و چل ساڵە دەمناسن‌و دەتان ناسم، بۆ تا ئێستا من ئەم قسانەم بۆ نەکردوون‌و ئەم هەڵوێستانەم نەبووە!؟

{قُل لَّوْ شَاء اللّهُ مَا تَلَوْتُهُ عَلَيْكُمْ وَلاَ أَدْرَاكُم بِهِ فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِّن قَبْلِهِ أَفَلاَ تَعْقِلُونَ – سورة يونس/ ١٦}:

بەیارمەتی خوا بەشی دووەم دەربارەی قورئانی پیرۆزو بڕێ لایەنی تەواو بوو ئێستا لێرە بەولاوە دەست دەکەین بە باسکردنی بڕێ موعجیزەو سەر ئاسایی زانستیی لە قورئاندا بە تایبەتی ئەو باسە عیلمییانەی کە لەسەردەمی هاتنی قورئاندا نەزانراو بوون‌و دوایی بەهۆی پێشکەوتنی زانست‌و زانیارییەوە دەرکەوتن‌و لێکۆڵەرەوەو توێژەرەوەکان خستیاننە روو.

**بەشی سێهەم:**

## موعجیزاتە زانستییەکانی قورئان

**یەك پارچەیی بونەوەرو نهێنی ژیان- دروست بوونی بونەوەر- لێك کشانەوەی بونەوەرو فراوان بوونی- جوڵەو هەڵسوڕانی مانگ و رۆژو کورەی زەوی- هەبوونی زیندەوەر لە ئاسمانەکان- کەم بوونی غازی ئۆکسجین لە بەرزاییدا- بەش بەش بوونی گەردیلەکان- نێرو مێی لەهەموو شتێکا- موتربە بوونی هەورەکان- فشەڵ بوونەوەی زەوی بەهۆی بارانەوە- بەرامبەری و یەکسانی پارچەکانی بونەوەر- شەپۆلی ناوەوەو سەرەوەی ناو- جیهانی زیندەوەرو باڵندەکان کوت و مت لە جیهانی مرۆڤ دەچێ- قۆناغەکانی گەشە کردنی گۆشپارە- پەردەی گۆشتپارە- سەرچاوەی دروست بوونی منداڵ- چۆنیەتی دروست بوونی نێرو مێ- تۆم و گەرای ئادەمیزاد لە خوێنپارە دەچێ- جیاوازی چاوە قامکی ئادەمیزاد.**

شتێکی ئاشکرایە کە کاری سەرەکی قورئان بریتی نییە لەوە عەقڵ بازی بکاو تەنگو چەڵەمەی کەون شی بکاتەوەو لە چۆنیەتی دروستبوونی بونەوەر (بەشێوەیەکی زانستی بکۆڵێتەوە)، بەڵکوو قورئان بریتییە لە پەڕاوێکی رێ پیشاندەرو شارەزا کەری کۆمەڵی ئادەمیزاد لە ژیانی ئایینی و دونیایی و بەختەوەر بوونیان لە هەردوو دنیادا، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئایەتەکانی خاڵی نیین لە بۆچوونی لایەنی زانستی و دەربڕینی شتی وردەکاری و وەستایانە لە تیلنیشانکردنی نهێنییەکانی زۆر لایەنی سروشتی و نوشداری و زەوی ناسی و جوگرافی... بە جۆرێك کەهەر یەکەیان بەڵگەیە لەسەر سەر ئاسایی قورئان و داکۆکی کردنە لەسەر ئەوە کە قورئان نیگاو سروشی پەروەردگارە. شتێکی مێژوویی چەسپاوە کە حەزرەتی (محمد) (درودی خوای لەسەر بێ) جگە لەوە خوێندەواری نەبووە، نوسین و خوێندنەوەشی نەزانیوە، لە مەککەو لادێیەکانی مەکەش پەروەردە بووە، ئەو رۆژگارەش مەککەو دەوروبەری هیچ زانست و زانیارییەکی تێدا نەبووە قوتابخانەو خوێندنگاو دانیشگای تایبەت بە زانیاری بونەوەری تێدا نەبووە، هەر وەکوو چۆن (محمد) دوور بووە لەو زانست و زانیارییەی کە لە شام و ئەسکەندەریەو ئەسیناو رۆما دەخوێندراو توێژینەوەی تێدا دەکرا، کەچی لەگەڵ ئەوەشا ئەو بۆچوون و نەزەرییە عیلمییانەی قورئان ئاماژەی بۆ کردوون لەو

رۆژگارەدا کەس پەی پێ نەبردوونو نەزانراو بوون (واتە لە سەدەی حەوتەمی زاییندا) زانستیش تا ئەم نزیکانە نەیتوانی نهێنی ئەم نەزمرییانەی قورئان دەربخاو بۆچوونەکانی روون بکاتەوە.

جا ئێمە لەم بەشەدا برێ لەو زانستییە راستەقینانەی قورئان رادەنوێنین تا خوێنەر بۆخۆی لێیان وردبێتەوەو هۆشو بیری خۆی بکا بە دادوەرو بڕیار بدا ئایا دەگونجێ ئەم زانستییانە هەڵبەستراوی پێغەمبەر بن یان نیگاو سروشی خودایە نێردراوە بۆ پێغەمبەر؟!

## یەك پارچەیی بونەوەرو نهێنی ژیان (وحدة الكون وسر الحياة):

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ:

{أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ – سورة الأنبياء/ ٣٠}:

واتە: ئایا ئەو خوا نەناسانە بیریان نەکردۆتەوەو نازانن کە لە سەرەتادا ئاسمانەکانو زەوی یەکپارچە بوونو ئێمە لێکمان جیاکردوونەوە، بەهۆی ئەو ئاوەشەوە کە لە ئاسمانەوە دەیبارێنین هەموو شتێکی زیندوومان دروست کردوە واتە ئاو هۆی ژیانە لەسەر زەوی دەی بۆچی بڕوا ناهێننو موسوڵمان نابن.

ئەم ئایەتە پیرۆزە خەبەرمان دەداتێ کە ئاسمانەکانو زەوی یەکپارچە بوون دوایی لێك جیابوونەوە.

بەڕاستی ئەمە موعجیزەیەکە لە موعجیزە عیلمییەکانی قورئانو زانستی تازە ئەم رایە دەچەسپێنێو زانایان گەیشتوونە ئەو ئەنجامە کە بۆشایی بونەوەر پێش هەزاران ملیون ساڵ لەمەوبەر پڕ بووە لە غاز ئەو غازە لێك پچڕاوەو بووەتە تەمو غارو ئەم ئەستێرە کاکەشانەی لێ پەیدا بووە، مەنزومەی خۆر ئەنجامی ئەو لێك جیابونەوەیە، ئەوەی پاڵپشتی ئەم بۆچوونو رایە دەکا ئەوەیە کە تا ئێستا زاناکان بە بەڵگە چەسپاندویانە کە لەناو عونصورەکانی خۆردا (٦٧) عونصووریان لە عونصورەکانی زەوین، زەویش بۆ خۆی لە (٩٢) عونصور

پێکهاتووە، بەردەوامیش زاناکان هەوڵی ئەوەیانە عونصوری تریش لە خۆردا بدۆزنەوەو گیرو گرفتەکانی ئەم ڕێبازە لابەرن. تا ئێستا ئەو عونصورانەی کە لە خۆردا دۆزراونەوە لەناو خۆماندا زۆر مەشهوورن بریتین لە هایدرۆجین‌و هەلیوم‌و کاربۆن‌و ئازوت‌و ئۆکسجین‌و فسفۆرو ئاسن‌و.... هتد.

زاناکان بۆ ئەم مەبەستە لێکۆڵینەوەی شەبەنگی (طەیفی)یان بەکار هێناوە، ئەم شێوە توێژینەوەش کیمیا زانەکان ئەمڕۆ لەکارگەو تاقیکردنەوەکانیاندا بەکاری دەهێنن بۆ دۆزینەوەی ئەصڵ‌و بنەماو هەیولای هەر پارچەیەکی زەوی‌و زانینی نەوع‌و ڕێژەو چەندیەتی...

زاناکان گەیشتوونەتە ئەو قەناعەتە کە ئەو توخمانەی خۆری لێ پێك هاتووە خۆریش بۆ خۆی ئەستێرەیەکەو نموونەی ئەستێرەکانی ترە بونەوەریش بریتییە لەو ئەستێرانە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو ئەصڵ‌و بنەماو عونصورانەی بونەوەری لێ پێك هاتووە لە بنەڕەتدا یەك عونصور بووەو لێك جیابوونەوە.. لە لایەکی ترەوە (نەیزەك) بلێسەو شوعلە یەکێکە لەو شتە هەست پێکراوانەی کە زانیاری‌و زانست لە فەزای خاریجیدا قۆزتویەتیەوەو بە دەستی هێناوە، زاناکان هەستیان بەوە کردوە کە زوربەی ئەو عونصورانەی لە زەویدا هەن هەمان عونصوریش لە نەیزەکە بەردییەکاندا هەیە، ئەمە پوختەیەکی بەشی یەکەمی ئایەتەکەیە بەشی دووەمی ئایەتەکە کە دەفەرموێ: {وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاء كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ}:

بە ڕەوانترو بەلیغ ترین شتێك دەزانرێ کە قورئان لە بارەی حەقیقەتێکی زانستییەوە باسی کردبێ‌و زانایان نهێنییەکەیان زانیبێ، چونکە زوربەی تێکەو لێکەی کیمیاوی پێویست بۆ ژیان‌و گەشە کردن پێویستی بە ئاو هەیەو ئاو عونصورێکی سەرەکییە بۆ بەردەوام بوونی ژیانی هەموو زیندەوەرو ڕووەکێك.

ئاو بۆخۆشی سێ بەش لە چوار بەشی زەوی دادەپۆشێ پلەی توانەوەشی بەرزە ماوەیەکی زۆریش بە شلی دەمێنێتەوە پلەی گەرمیشی زۆر بەرز دەبێتەوە،

لەبەر ئەم هۆیانە ئاو بە یارمەتی دەرێکی باش دەژمێررێ بۆ راوەستانی پلەی گەرمی لەسەر رووی زەوی لە موعەددەلێکی تایبەتیدا، لە لایەکی ترەوە سەر رووی زەوی دەپارێزێ لە سوڕانو گۆڕانی سامناکی سروشتو بەرزبوونەوەی گەرماو نزم بوونەوەی سەرما یان بە پێچەوانەوە، خۆ ئەگەر بەهۆی ئاوەوە نەبی سەر زەوی بۆ ژیان ناگونجێ، هیچ نەبێ ژیانی تێدا زەحمەت دەبوو، هەروەها، ئاو چەند دیاردەیەکی تریشی هەیە لێرە جێگایان نابێتەوە باسیان بکەین، هەمووشیان ئەوە دەگەیەنن کە بەدی هێنەری بونەوەر زۆر کارامەیەو بونەوەری وا تەرتیب داوە کە بگونجێ بۆ ژیانو بەرژەوەندی دروستکراوەکانی.

شایانی باسە کە بگوترێ ئاو تەنها ماددەیەکە لەکاتی بەستنو بوون بە سەهۆڵدا قەبارەی زیاد دەکاو چڕیی کەم دەبێ، ئەمەش گرینگییەکی گەورەی هەیە بۆ ژیانی زیندەوەرانی ناو ئاو، چونکە لەکاتی سەرمای زۆردا سەهۆڵ بەندانەکە سەر ئاو دەکەوێ نەك بن ئاو ببێ ئیتر ئەو سەهۆڵ بەندانە دەبێتە پەردەیەکی جیاکەرەوە ناهێڵێ ئەو ئاوەی لە ژێر سەهۆڵ بەندانەکەدایە سەرمای سەر رووی زەوی کاری تێبکا بەڵکوو ئاوەکە لە پلەیەکی زوور پلەی بەستندا دەهێڵێتەوە، کاتێك پلەی گەرمی نزم دەبێتەوە ئۆکسجین زۆر هەڵدەمژێ کە پلەی ساردیشی دەگاتە پلەی بەستن ئەندازەیەکی زۆری گەرمی لێ دەردەچێو دەبێتە یارمەتیدەر بۆ پاراستنی زیندەوەرانی ناو دەریاو چۆمەکان وەکوو ماسیو تیمساحو مارو شتی تریش. دەی بڕوانە حیکمەتی قورئان چۆن بە چەند وشەیەکی کەم نهێنی ژیانی لەسەر زەوی روون کردۆتەوە!! ئەم ئایەتە بەهێزترین بەڵگەیە لەسەر راستییەتی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی **(محمد)** (دروودی خوای لەسەر بێ)...

لێرەدا قورئان سەرەتای ئەم زانستییە راستەقینانەی دەربارەی یەکپارچەیی بونەوەرو نهێنی ژیان بەوە دەست پێکردوە کە روو دەکاتە خوانە ناسانو بە بەڵگەی زانستی بەهێز دەم کوتیان دەکا ئەو زانستییە راستەقینانەی کە عەرەبەکان لە رابوردوودا هیچیان لێ نەزانیوە، بەڵکوو تا ئەم نزیکانە دوای

هەزارو ئەوەندە ساڵە دوای ماندوبوون‌و لێکۆڵینەوەی چەندەها چین لە زانایان‌و توێژەرەوان‌و پێشکەوتنی عیلم‌و زانست ئەمجا شتێکی کەمی لێ زانراوە، تا عیلمیش پێش بکەوێ زیاتر نهێنی قورئان‌و بۆچوونەکانی دەربارەی عیلم‌و زانست ئاشکرا دەبێ.

ئەم راستییانە گەورەترین بەڵگەو هەڵنەرن لەسەر باوەڕ بە بوونی خواو دەسەڵاتی فراوانی‌و نهێنی دروست کراوەکانی، هەر بۆیەشە پەروەردگار لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ:

{أَفَلَا يُؤْمِنُونَ}

واتە: ئایا ئەم بەڵگانە بەس نین بۆ بڕواکردن بە بوونی خوای پەروەردگار دەی بۆچی باوەڕ ناهێنن‌و موسوڵمان نابن؟!!

## دروستبوونی بونەوەر (نشأة الكون):

خوای گەورە دەفەرموێ:

{قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَاداً ذَلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاء لِّلسَّائِلِينَ ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاء وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ اِئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ – سورة فصلت/ ٩-١١}:

واتە: ئەی موحەممەد! بە قورەیشییەکان بڵێ ئایا ئێوە بڕواناکەن‌و ئیمان ناهێنن بەو خوایەی ئەرزی لە ماوەی دوو رۆژدا دروست کردوە هاوڕێ‌و شەریکی بۆ دادەنێن؟ چۆن وا دەکەن! ئەوەی کە ئێوە بڕوای پێ ناکەن پەروەردگاری بونەوەرەو ئەرزی دروست کردوە کێوەکانی لەسەر کردوون بە لەنگەرو مێخ تا زۆر نەجوڵێتەوەئەمجار کردوویەتی بەکانگای خێرو بەرەکەت، وە رزق‌و رۆزیی زیندەوەرانی تێدا ئەنجام داوە، هەموو ئەم کارو بارانەی لەماوەی چوار رۆژدا رێک خستووە ئەمجار لای لە دروستکردنی ئاسمان کردەوە، ویستی دروستی بکا، ئەوکاتە ئاسمان بریتی بوو لە دووکەڵ ئیتر بەو شێوەی ویستی خۆی بوو

نەخشەی کێشا بوو فرمانی بە ئەرزو ئاسمان کردو فەرمووی وەرنە کایەوە، ئەوانیش هاتنە پێشەوەو وتیان پەروەردگارا! گەردن کەچین‌و هاتین.. لەم ئایەتە پیرۆزەدا قورئان بە ئاشکرا ئەوە دەدرکێنی کە ئاسمان لە سەرەتای دروست کردنی کەوندا بریتی بووە لە دووکەڵ.

زانایانیش لەم بارەیەوە چەند راوو بۆچونێکی جیا جیایان دەربارەی دروست بوونی ئەم بونەوەرە هەیە. زانای ئاسمان شوناس (سیر جیمس جینز) دەڵێ: رای پەسەند ئەوەیە کە مادەی کەون لە سەرەتادا غازێکی بلاوەبووە بەنێو بۆشایی فەزادا، دوایی لە زیادە پەستی‌و کەسافەتی ئەم غازە تەم (سەدیم) گەلەکان دروست بوون.

دکتۆر جامو (Dr. George Gamow) دەڵێ: کەون لە سەرەتای دروست بوونیدا پڕ بووە لە غازێکی دابەشکراوی رێك‌و پێك ئەو غازە لە کەسافەت‌و گەرمیدا گەیشتۆتە پلەیەکی هەرە بەرزی گەرما!!

جا لەو غازەدا چەند گۆڕانکاریەکی نەوەوی لە زوربەی توخمەکانیدا پەیدا بووە ئیتر لەژێر کاریگەری زیادە پەستانێکی بەهێز بۆ ئەو غازە گەرمە کەون لێك کشاو درێژو پان بوو.

ئەمجار کەسافەتی غازەکە وردە وردە فش بوەوە پلەی گەرمی دابەزی‌و سستی تێکەوت‌و لە سەردەمێکی دیاری کراوی ئەم لێك کشانەوەدا غازە بلاوەکە کۆپلە کۆپلە بوو چووە شێوەی هەوری ناڕێك‌و پێك‌و لێك نەچوو لە شکڵ‌و قەبارەدا ئەمجار گۆڕان‌و بوونە چەند ئەستێرەیەکی جیا جیا قورئانیش بۆیە بنیچەی کەونی بە دووکەڵ ناو بردووە چونکە عەرەبەکان دوکەڵیان ناسیوەو هەموو کات لە پێش چاو بووە.

ئەمڕۆ زانایان بناغەو سەرەتای کەون بە غاز دەزانن‌و پێیان وایە کەون‌و بونەوەر لەو غازە بلاوە بەدی هاتووە، دەی باشە کەی لە توانای نەخوێندەوارێکی وەکوو پێغەمبەردایە پێش هەزارو چوار صەد ساڵ ئەمە بزانێ بە تایبەت لەو رۆژگارەدا ئادەمیزاد هیچیان ئاگایان لە نهێنی کەون‌و شێر راوەکانی نەبووە.

## لێك کشانەوەو فراوان بوونی کەون (تمدد الکون وسعته):

خوای گەورە لە سورەتی (والذاريات)دا دەفەرموێ:

{وَالسَّمَاء بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ – سورة الذاريات/ ٤٧}:

واتە: ئێمە ئاسمانمان بە دەستی قودرەت دروست کردوە هەموو کاتێکیش فراوانی دەکەین‌و لێکی دەکشێنینەوە. ئەوەتا ئەم ئایەتە پیرۆزە بە ئاشکرا باسی لێك کشانەوەی کەون دەکاو لەگەڵ تیۆری فراوان بوونی کەون یەکیان گرتەوە.

لەبارێکەوە دەبینین ئەنیشتاین پێی وایە فراوانی کەون بە جۆرێکە کە بۆ حەوانەوەی بەلایین (سەدیم) بگونجێ، هەموو سەدیمێکیش سەدەها ملیون ئەستێرەی گڕدار لەخۆ بگرێ. لەبارەی تیۆری فراوان بوون‌و لێك کشانەوەی کەونیشەوە ئاسمان شوناسەکان زۆر لێکۆڵینەوەو توێژینەوەیان ئەنجامداوە بەهۆی پێشکەوتوترین ئامێری تەماشا کردن (دووربین)ەوە ئەوەیان لەلا ئاشکرا بووە، کە جوڵانەوەی سەدیمەکانی دەرەوە جوڵانەوەیەکی بە تەرتیب‌و مونتەزەمە لەمەوە بەڵگەیان هێناوەتەوەو رایان بۆ ئەوە چووە کە هەموو سەدیمەکانی دەرەوە، یان دورگەکانی کەون (الجزر الکونیة) رۆژ بە رۆژ لە کۆمەڵی رۆژ دوور دەکەونەوە بەڵکوو هەموو سەدیمەکان لەناو خۆیاندا لێك دوور دەکەونەوە. ئەمجار ئەوەیان چەسپاندوە کە کەون راوەستاو نیەو لەسەر یەك حەجم نامێنێتەوە، بەڵکوو وەکوو چۆن کەفی صابوون فش‌و فۆڵ دەبێ، یان چۆن باڵۆن فش دەبێتەوە، کەونیش بەو جۆرە لێك دەکشێتەوە، بەڵام جیسمە مادییەکانی لەسەر قەبارەی خۆیان دەمێننەوە!؟

شایانی باسە کۆمەڵێك زانای کەون ناس چەند تیۆرێکیان خستۆتە روو هەریەکەیان بۆ خۆی راڤەی نهێنی فراوان بوونی کەون دەکا:-

یەکێ لەوانە دکتۆر هابل (Habble) رابەری توێژەرەوەکانی سەدیم تێبینی ئەوەی کردوە کە دیاردەیەکی گشتی لەنێو ئەم کۆمەڵە ئەستێرە زۆرو زەبەندانەدا بەدی دەکرێ، دیاردەکەش ئەوەیە ئەم ئەستێرانە بۆ پشت لێك کردن‌و لێك دوورکەوتنەوە گونجاو ترن تا لێك دورکەوتنەوەی دوورگە کەونیەکان پەیدا دەبێ.

## هاتوچۆو هەڵسورانی مانگو رۆژ و زەوی

خوای گەورە دەفەرموێ:

**{وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ، وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّى عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ، لَا الشَّمْسُ يَنبَغِي لَهَا أَن تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ – سورة يونس/ ٣٨-٤٠}:**

واتە: نیشانەیەکی تر لەسەر گەورەییو بە دەسەڵاتی خوا ئەوەیە کە خۆر دەڕواو دەگەڕێ تا ئەو شوێنەی بۆی دیاری کراوە، ئەم بۆ دیاری کردنو ئەندازە دانانەش لەلایەن خوای بە تەواناو زاناوەیە، هەروەها بۆ مانگیش چەند مەنزڵو حەشارگەیەکمان بۆ داناوە: کە بریتییە لە بیستو هەشت (٢٨) پلەو مەنزڵ هەر شەوە مانگ لە یەکێکیاندایەو بە مەنزڵێکدا تێدەپەڕێ کە گەیشتە کۆتایی دەگەڕێتەوە بۆ سەر شێوەی کۆنیو بە باریکی دێتە پێش چاوو کەوانەیی خۆی دەنوێنێ وەك لاسکی بۆڵە خورمای کۆنی چەماوە کە هێشوەکەی لێ کرابێتەوە ئاوا، نە خۆر رایەی دەکەوێ بچێتە رێبازی مانگەوە یا مانگ بە رێبازی خۆردا بڕوا، هیچ کاتێکیش شەو پێش رۆژ ناکەوێ واتە هەریەکەیان لەکاتی دیاری کراوی خۆی پەیدا دەبێ.

هەریەکەش لە خۆرو مانگو زەویو ئەستێرەکان لە بۆشایی کەونداو بە رێبازی خۆیاندا دێنو دەچنو کاری پێ سپێرراوی خۆیان ئەنجام دەدەن. بە کورتی قورئان لەم ئایەتە پیرۆزەدا راستەوخۆ ئەوە دەچەسپێنی کە رۆیشتنو گەڕانی خۆر تا ئەندازەیەکی دیاری کراوە، ئەم زانستییەش لەگەڵ زانستی تازەدا یەك دەگرنەوە. خۆر لەگەڵ کۆمەڵەی خۆیدا لەهەر چرکەیەکدا نۆزدە کیلۆمەتر بەرەو شوێنێکی دیاری کراو دەبڕێ.

ئەگەر سەرنجی ئایەتی **{وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ}** بدەین راستەوخۆ ئەوە دەگەیەنێ کە خۆرو مانگو زەوی لە جمو جوڵدان بەڵام ئەم جمو جوڵە یان لە جمو جوڵەکەی پێشوو جیایە، بەڵکوو سوڕانو هاتوچۆکەیان تایبەتییەو

هەریەکەیان بە دەوری خۆیدا سوڕ دەخوا، دەربارەی سوڕانەوەی زەوی قورئان بە رستەی (وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ) ئیشارەی بۆ کردوە چونکە لە سوڕانەوەی زەوییەوە شەو رۆژ پەیدا دەبێ.

## هەبوونی زیندەوەر لە ئاسمانەکان (وجود أحياء في السموات):

هەندێ جار کە مرۆڤ بیر دەکاتەوە پرسیارێك دێتە پێشەوە پرسیارەکەش ئەوەیە ئایا (جگە لەسەر زەوی) دەگونجێ ژیان لەسەر ئەستێرەکانی تر هەبێ؟! ئایا وەکوو چۆن زیندەوەر لەسەر گۆرەی زەوی هەن لە ئاسمانەکانیشدا زیندەوەری تر هەن؟ ئا ئەم پرسیارە بیرو هۆشی زۆر لە ئاسمان شوناسەکانی داگرتووە زۆریانی هەڵەوگیر کردوە لەم ساڵانەی دوایی دا لە ئەنجامی بیرکردنەوەو لێکۆڵینەوەیەکی زانستانە زاناکان گەیشتوونە ئەو ئەنجامە کە دوور نییە زیندەوەر لەسەر ئەستێرەکان هەبن وەکوو چۆن لەسەر زەوی هەن!!

لەلایەکی ترەوە زانیاریو لێکۆڵینەوە تازەکان ئەوەیان چەسپاندوە: کە لەسەر روکاری ئەستێرەی مەریخو لە بۆشایی دەوروبەریدا گەرمایی و ئاوو ئۆکسجین هەیە، ئەم سێ شتەش مەرجی سەرەکین بۆ هەبوونی ژیان!

لەلایەکی ترەوە ئەو توێژینەوانەی کە بەهۆی وێنە گرتنی (ئەشیعەی ضەوئی) تیشکی هەتاوی یان بەهۆی بینینی خودی چاوەوە دەرکەوتووە ئەوەیان چەسپاندووە: کە لە نێوان سەر روی زەویو سەر روی مەریخدا جیاوازییەکی زۆرنییەو لە زۆر رووەوە لێك دەچن!. زاناکانی ئەمەریکاو روسیا سوورن لەسەر ئەوە کە لە مەریخ دا دیاردەی ژیانداری هەیەو زیندەوەر هەن! چەند ساڵێك لەمەوبەر رادیۆی مۆسکۆ ئەوەی بڵاوکردەوە: کە زاناکانی روسیا ئەوەیان چەسپاندووەو سورن لەسەر ئەوە کە زیندەوەر لەسەر روی مەریخ هەیە. هەروەها رادیۆی مۆسکۆ ئەوەشی بڵاوکردەوە: کە مەرصەدی (بولکۆفۆ)ی روسی لێکۆڵینەوەیەکی لە بابەت مەریخەوە ئەنجامدا لە توێژینەوەکەدا گەیشتبووە ئەو قەناعەتە کە چۆنیەتی سروشتی لەسەر پشتی مەریخ زۆر نزیکە لەو چۆنیەتە

سروشتییەی کە لەسەر زەوی هەیەو پێویستە بۆمانەوەی ژیان. جا ئەگەر زاناکان سووربن لەسەر ئەوەی کە ژیان لەسەر مەریخ بگونجێو زیندەوەری لێ هەبن! بەبێ شك راشیان بۆ ئەوە دەچێ کە لەنێو ئەم بەلایین ئەستێرانەدا کە بە بۆشایی کەوندا بلاوبونەوە چەند ئەستێرەیەکی تر هەبن ژیانیان لەسەر بگونجێ، وەکوو سەر زەوی زیندەوەری تێدا بژی!!؟ هەرکاتێکیش ئێمە سەیری قورئان بکەین دەبینین (بە ئاشکراو راستو رەوان) دەست نیشانی هەبوونی زیندەوەری تری زیاد لە زیندەوەرانی سەر زەوی دەکا.. بۆ نموونە لە سورەتی (الشوري)دا ئایەتی (٢٩) دەفەرموێ:

{وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَابَّةٍ}:

واتە: نیشانەیەك لە نیشانەکانی گەورەیی بە دەسەلاتی خوا دروست کردنی ئاسمانو زەویو ئەو زیندەوەرانەی کە لە نێوانیاندا بلاوبونەوە.

یان لە سورەتی (الإسراء)دا ئایەتی (٤٤) دەفەرموێ:

{تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ}:

واتە: پەروەردگار خوایەکی ئەو تۆیە هەر حەوت ئاسمانەکانو زەویو چی لە ناویاندا هەیە لە زیندەوەرو خاوەن هۆشو بیرو شتی تریش هەموویان سوپاسو ستایشی خوا دەکەن.

یان لە سورەتی (مریم)دا ئایەتی (٩٣) دەفەرموێ:

{إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَنِ عَبْدًا}:

واتە: هەریەکێك لەو مەخلوقاتەی کە لە ئاسمانو زەویدا هەن هەر هەموویان رۆژی رەستاخیز دێنو گەردن کەچیو بەندایەتی خۆیان دەنوێنن.

یان لە سورەتی (الإسراء) ئایەتی (٥٥)دا دەفەرموێ:

{وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ}:

واتە: خوای تۆ ئەی محمد! لەهەموو کەس زاناترە بەو خەڵكو زیندەوەرانەی کە لە نێوان ئاسمانەکانو زەویدا هەن. ئەمە پوختەی ئاماژە بۆکردنی قورئانو توێژینەوەی زانایان بوو دەربارەی هەبوونی ژیان لە

ئاسمانەکان جا ئیتر نازانین ئاخۆ لە داهاتوودا زانایان دەتوانن بگەنە پلەیەکی وا هەبونی ژیان لەسەر هەندێ لە ئەستێرەکان بچەسپێنن یان نا؟

خۆ ئەگەر بتوانن بگەنە ئەم ئەنجامە ئەوە بە راستی دەبێتە گەورەترین موعجیزەی قورئان!! بەلام هەر چۆنێك بێ تەنها بۆچوونی زانا گەورەکان بۆئەوەی کە ژیان (جگە لەسەر زەوی) لەسەر ئەستێرەکانی تریش هەیە، وە لەم بارەوە توێژینەوەی دورو درێژیان ئەنجام داوەو لێکۆلینەوەکانیشیان لەگەل بۆچوونەکانی قورئان یەکیان گرتۆتەوە بەبێ گومان ئەمە خۆی لە خۆیدا سەرکەوتنێکە بۆ قورئانو دەرخستنی نهێنیەکی ژیانو بونەوەرە، قورئان پێش چواردە سەدە پەنجەی بۆ راکێشاوەو پەردەی لەسەر لابردووە.

## کەم بوونی ئۆکسجین لە بەرزاییدا:

خوای گەورە دەفەرموێ:

**{فَمَن يُرِدِ اللّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلإِسْلاَمِ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاء – سورة الأنعام/ ١٢٥}:**

واتە: کەسێك خوا بیەوێ هیدایەتی بداو بیخاتە سەر رێی راست، دڵو دەرونی فراوانو نوورانی دەکاو ئامادەی دەکا بۆ وەرگرتنی بەرنامەی ئیسلام. کەسێکیش خوا بیەوێ رێگای لێ هون بکاو دڵو دەروونی تەنگ دەکاو تەنگو چەڵەمە دەخاتە دڵیەوەو تەنگە نەفەسی دەکاو هەناسە بڕکێی پێ دەکەوێ، وەکوو چۆن کەسێك بەرەو ئاسمان بەرزبێتەوە تەنگە نەفەس دەبێ. لەوکاتەشەوە کە مرۆڤ توانیویەتی بەهۆی باڵە فڕەو ئامێری بەرزبوونەوەو بەرزە فڕەوە پەردەکانی هەوای ژوورو تاقی بکاتەوە هەستی بە دیاردەیەکی سروشتی کردوە ئەویش کەم بوونی ئۆکسجینی هەوایە لە بەرزاییدا. خۆ هەرکەسێکیش بەرەو بەرزایی بڕواو بەرزبێتەوە هەست بە تەنگە نەفەسیو هەناسە بڕکێ دەکا. قورئانیش بە ئاشکرا ئەوە دەچەسپێنێو ئاماژە بۆ ئەم دیاردەیە دەکا، پێش ئەوەش مرۆڤ تەیارەو صاروخ دابهێنێ ئەوانەی شەیدای یاری تەسەللوق بوونو

هیوایەتی چوونە سەر کێوی بەرزییان هەبووە، هەستیان بەو دیاردەیە کردووەو زانیویانە کە لە بەرزاییدا ئۆکسجینی هەوا کەمە.

شایانی باسە کە قورئان تەعبیرەکەی بۆ بەرزبوونەوەی بەرەو ئاسمانە نەك بەرزبونەوە بۆ سەر کێو، زیاد لەوەش وڵاتی عەرەبوستان. کە لە سەرەتادا قورئان بۆ ئەوان نازڵ بووە، خاوەنی روبەرێکی پانو دەشتو بیابانێکی فراوانە دانیشتوانی هەرگیز بیری چوونە سەرکێوی بەرزیان نەکردوە کەسێکیش سەرکەوتبێتە سەر کێوەکانی هەستی بە تەنگە نەفەسی نەکردوە، ئەوەشمان لە یاد نەچێ کە یەك کەوتنی مانای ئەم ئایەتە لەگەڵ راستی زانستیدا بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر چەسپاندنی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی محمد (دروودی خوای لەسەر بێ).

## کەرتبوونی گەردیلە (تقسيم الذرة):

خوای گەورە دەفەرموێ:

{وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاء وَلاَ أَصْغَرَ مِن ذَلِكَ وَلا أَكْبَرَ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ – سورة يونس/ ٦١}:

واتە: هیچ شتێك لە خوا ون نابی چ لەسەر زەوی چ لەئاسمان تەنانەت ئەگەر ئەو شتە بە ئەندازەی گەردیلەیەکیش بێ، یان بچوکتر یان گەورەتربێ هەر لای خوا دیارییەو لە لەوحولمەحفوظدا چەسپێنراوە، جا وەکوو لە زانستی کۆنو نوێدا باوە گوایە بچوکترین قەبارە (جیسم) کە لە بونەوەردا هەبێ شتێکە پێی دەگوترێ (زەڕە) گەردیلە. هەتا سەدەی نۆزدەهەمیش زۆر لە زانایان بڕوایان وابوو کە گەردیلە بچوکترین مادەیە کە کەرت کردن هەڵناگرێو ناشێ کەرت بکرێ، بەڵامساڵەکانی دوای چەرخی نۆزدەیەم زۆر لە زانایان کەوتنە خولیای ئەوەوە بزانن ئاخۆ گەردیلە دەشێ بەش بەش بکرێ؟! لە ئاکاما گەیشتنە ئەو بڕوایە کە ئەویش کەرت بوون هەڵ ئەگرێ؟! چونکە ئەویش بۆ خۆی لە پرۆتۆنو نیوترۆنو ئەلەکترۆن پێکهاتووە.

قورئانی پیرۆزیش کە دەفەرموێ: {وَلاَ أَصْغَرَ} بە ئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ: کە لـە گەردیلـە بـچوکتر هەیـەو دەشـێ کـەرت بکـرێ؟! لـە لایـەکی تـرەوە قورئـان کـە دەفەرموێ: {وَلاَ فِي السَّمَاء} ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە ئەو دیاردەو تایبەتکاریانەی کە لە گەردیلەدا دەبینرێ لەسەر زەوی، هـەمان ئـەو دیـاردەو تایبەتکاریانـەش لـە ئاسمانو خۆرو مانـگو ئەستێرەکاندا هەن، هەموو کەونو بونەوەر ئـەو پرۆتـۆنو ئەلەکترۆنەو نیوترۆنەی تێدایە.

کەچی وا تازە بە تازە زانیاری سەدەی بیستەم گەیشتە ئەو ئەنجامەو بوو بـە حەقیقـەتێکی عیلمـی. دەی باشـە حـەزرەتی محمـد (درودی خوای لەسەر بێ) پـێش زیـاتر لـە (١٤٠٠) ساڵ لە چ جامیعەو دانشگایەك تایبەتکاریو دیاردەی زەڕڕەی خوێندو شـی کـردەوە؟ چـۆن ئـەوەی زانـی کـە لـە گەردیلـە بـچوکتر هەیـە؟ یـان چـۆنی زانـی خەواصی زەڕڕە لە زەوی چۆنە لە ئاسمـانیش هـەمان خەواصی هەیـە؟! بەڕاستی ئەم ئایەتە باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە قورئان نیگای خوایە.

## لەهەموو شتێکی بونەوەردا نێرو مێ هەیە:

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ:

{وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ – سورة الذاريات/ ٤٩}:

واتە: ئێمە لە هەموو شتێکدا نێرو مێمان دروست کردوە.

جا وەکوو ئاشکراو دیارەو لە کۆنەوە زانـراوە لـە ئـادەمیزادو ئـاژەڵو رووەکـدا نێرو مێی هەیەو حەقیقەتێکی عیلمییە، قورئـانیش لـە دوو ئایـەتـدا ئامـاژەی بـۆ ئەمە کردوەو ئـەم حەقیقـەتـەی چەسـپاندووە. دەربـارەی هـەبوونی نێـرو مـێ لـە رووەکدا دەفەرموێ:

{أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الْأَرْضِ كَمْ أَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ - سورة الشعراء/ ٧}:

واتە: ئایا ئێوە تەماشای زەوی ناکەن، نابینن چەند جووت نێـرو مێمـان تێـدا رواندوەو زەوییان ئارایش داوە؟! لە سورەتی (الشورى)شدا دەفەرموێ:

{فَاطِرُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا وَمِنَ الْأَنْعَامِ أَزْوَاجًا}:

واتە: پەروەردگار، بەدیهێنەری ئاسمان و زەوییەو لە نەبوونەوە هێناونییە وجوود، هەروا لە ئێوەشدا نێرو مێی دروست کردوە لە ئاژەڵیشدا نێرو مێی بەدی هێناوە.

جا وەنەبێ قورئانی پیرۆز بە مەندەوە وەستابێ بەڵکوو لە هەموو شتێکدا نێرو مێی دەچەسپێنێ بە ئاشکرا دەفەرموێ: {وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ}.

تەنانەت کارەبا کە پاش چەند سەدەیەك لەدوا هاتنی قورئانی پیرۆز دۆزراوەتەوە، پێك هاتووە لە (سالب) و (موجب) بە کۆبوونەوەی ئەم دووانەو بەیەك گەیشتنیان هێزی کارەبا پەیدا دەبێ، لەمەش گرینگتر ئەوەیە گەردیلە کە بچوکترین شتێکە لە بونەوەردا زانایان ئەوەیان تێدا دەرخستووە کە گەردیلە ناوکێکی بچکۆلەی هەیە پێی دەگوترێ (النواة الذرية) ژمارەیەك قەبارەی بچکۆلەی تر دەورەیان داوە، پێیان دەگوترێ (ئەلەکترۆنات) ئەمانە شوحنەی کارەبای (سالب) هەڵدەگرن ناوکەکەش شوحنەی کارەبای (موجب)ی پێیە، نەك هەر ئەمەندە بەڵکوو زانایانی سروشت زان لە ئاکامی لێکۆڵینەوەی خۆیان، بۆیان دەرکەوتووە کە ناوکی گەردیلە خۆشی پێك هاتووە، لە چەند پارچەیەکی بچکۆلەو دەکرێن بە دوو بەشی سەرەکی.. جا ئەو بەشانەی کە ناوکی گەردیلەی هایدرۆجینە زانایان پێی دەڵێن (البروتون) بەشەکەی تریشیان پێی دەگوترێ (النيوترون) ئەم بەشە ساڵی ١٩٣٢ز زانای بەناوبانگی ئینگلیزی (السير جيميس تشادويك) دۆزیویەتەوە.

## موتوربە کردنی هەور (تلقيح السحاب):

خوای گەورە دەفەرموێ:

{أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُزْجِي سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ ثُمَّ يَجْعَلُهُ رُكَامًا فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ – سورة النور/ ٤٣}:

واتـە: ئایـا تـۆ نـابینی خـوای پـەروەردگار هـەورو هـەڵم لێ دەخـورێو لـەکوێ بیەوێ لێکیان دەداو موتوربەیان دەکا. ئیتر ئەم هەڵمە توێ توێ دەکەوێتـە سـەر یەكو دەبینێ باران لەو هەورە دێتە خوارەوە؟!.

مەبەستی ئێمـە لـەم ئایەتـەدا رسـتەی (ثُمَّ يُؤَلِّـفُ بَيْنَـهُ)وە کـە رێـك مانـای موتوربەکردنی هەورەکان دەگەیەنێو ئاماژەیـە بـۆ لێك نزیـك بوونـەوەی پارچـە هـەورەکانو بەیـەك گەیـشتنی (سـالب)و موجـەبی کارەبـایی نێـو ئـەو پارچـە هەورانە، جا بە گوێرەی ئەو لێکۆڵینەوە کە (فرەنکلین) یەکەم جار ساڵی (١٩٧٢ز) ئەنجامی داوە وەکوو حەقیقەتێکی عیلمی دەرکەوتووە کـە هـەور کارەبـای تێدایـە، ئاشکراشە کە هـەردوو جۆرەکـانی کـەهرەبا بـۆ لای یـەکتری کێش دەکـەن چونکە یەکیان (سالب)ەو یەکیان (موجب)ئەگەر هەردووی (موجب) یان (سالب)بن دەشێ کۆببنـەوەو یـەکتر نەگرنـە خـۆو دژ بەیـەك بـن ئـەم دژ بەیەکتریيـە ئـەنجامی بڵاوبونــەوەی پارچـە هەورەکانــە بـەڵام پـەروەردگار بـەهۆی (بـا)وە پارچـەکان کۆدەکاتەوە جا ئەو (با)یەی لە زەوی بەرز دەبێتەوە شـوحنەی کارەبایی موجـەب هــەڵ دەگــرێ، ئــەمجار لەگــەڵ شــوحنەی کارەبــایی هــەوادا یــەکتر دەگــرێو زەمینەیـەکی کارەبایی دروست دەبێو دەبێتـە هـۆی گـۆڕانی بـە هـەڵمو بوخـارو بەوردە بارانو لە ئاکاما دەبنـە دڵۆپـە بـارانو هەڵدەڕژێ. کـەوابوو پێـك هێنـەری سەرەکی بۆ باران ئەو کارەبایەیـە کـە (بـا) کـۆی دەکاتـەوەو ئـەو سـالبو موجەبـە لەیەکتر موتوربە دەکا. بە رونیش پەروەردگار لە سورەتی (الحجر)دا ئایـەتی (٢٢) ئاماژەی بۆ ئەوە کردوەو دەفەرموێ:

{وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاء مَاء فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ وَمَـا أَنـتُمْ لَـهُ بِخَازِنِينَ}:

واتە: ئێمە (با)مان موسسەخەر کردوەو دەی نێرین هەورەکان لێك موتوربـە دەکـا لـە ئاکامـا لـە سـەروتانەوە ئـاو دەبـارێنینو ئێـوە لێـی دەخۆنـەوە دەی بـۆ سوپاسی خوا ناکەنو سەری بەندەگی بۆ ناخەنە سەر زەوی خۆ ئێوە ئەو ئاوەتـان خەزن نەکردوە ئێمە بۆمان پەزمەندە کردوون.

## جوڵانەوەی زەوی و فشەڵ بونەوەی (اهتزاز الأرض):

خوای گەورە دەفەرموێ: {وَتَرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاء اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ}:

واتە: تۆ دەبینی زەوی وشك و برینگەو مات و مەلوولە، كاتێك بارانی لێ دەبارێنین، لەپڕ نوێ دەبێتەوەو فشەڵۆك دەبێ، ئیتر لە هەموو رەنگێك جوت جوت رووەكی نێرو مێ دەروێ و زەمین ئارایشت دەدرێ.

لێرەدا قورئان بە ئاشكرا ئەوە دەچەسپێنێ كە زەوی كاتێك بارانی لێ دەبارێ نوێ دەبێتەوەو دەهاوسێ و فشەڵ دەبێتەوە... ئێستا ئەمە بوومتە حەقیقەتێكی زانستی و لەگەڵ قورئاندا یەكیان گرتۆتەوە، لە لایەكی ترەوە لێكۆڵینەوەی زاناكان ئەوەیان چەسپاندوە: كە زەوی بۆ خۆی كون و كەلەبەری تێدان، هەوایان تێ دەچێ، ئیتر گلەكە نوێ دەبێتەوە بەهۆی هێزی ئاوەكەوە فشەڵ دەبێتەوەو بەجوڵە دەكەوێ.. زانستی كیمیایش ئەوەی چەسپاندوە كە گڵ بەهۆی تەڕبوونەوە لێك دەكشێتەوە بە وشك بونەوەش وێك دێتەوە، هەروەها زەوی كاتێ بارانی لێ دەبارێ بارستایی زیاد دەبێ تەنانەت زەوی كاتێ بارانی لێ دەبارێ و تەڕ دەبێ دەتوانرێ ئەندازەی جوڵانەوەی دیاری بكرێ هەروەكوو چۆن بارستایشی زیاد دەبێ.

## هاوكێشەیی عونصورەكانی بونەوەر (توازن العناصر الكونية):

خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

{وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ عِندَنَا خَزَائِنُهُ وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلاَّ بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ – سورة الحجر/ ٢١}:

واتە: هەموو شتێك كە لە بونەوەردا هەیە یا دەبێ، گەنجینەی سەرەكی و ماكی لەلای ئێمەیەو لە ژێر چاودێری ئێمەدایە لە خەزینەی فراوانی خۆمانەوە بە گوێرەی پێویست بەو شێوەی ئارەزومانە بەدی دەهێنین و بە گوێرەی پێویستی مەخلووقات لە خێرو بەرەكەت دەخەینە سەر زەوی {وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُ بِمِقْدَارٍ – سورة الرعد/ ٨}:

واتە: هەموو شتێك لەلای پەروەردگار بە ڕێژەو ئەندازەیەو کاری بێ سوودی نیەو ئیشی بێ حیکمەت ناکا، بەڵێ هەموو شتێك لەم دونیایەدا خوا ئەندازەیەکی تایبەتی بۆ داناوە، بۆ نموونە ڕێژەی ئۆکسجین لە بەتاڵایی (فەضا)دا ئەندازەی (٢١٪) بیستو یەك لە سەدە، خۆ ئەگەر ئەندازەکەی بە ڕێژەی (٥٠٪) پەنجا لە سەد بێ، دەبینی هەر شتێك لە بونەوەردا بۆ سوتان بگونجێ ئامادە دەبێ بۆ گڕ گرتنو سوتان.. واتە دەشێ پڕیشکی بروسکەیێك ڕێی دارێك بکەوێو تەواوی دارستانەکە ئاگر بگرێ.؟!!

لەلایەکی ترەوە ئۆکسجین هەموو زیندەوەرێك هەڵی دەمژێ ئانی ئۆکسیدی کاربۆنیش دەبێتە خۆراکی ڕووەكو درەخت، واتە: زیندەوەر ئۆکسجین هەڵ دەمژنو ڕووەكو درەخت ئانی ئۆکسیدی کاربۆن هەڵ دەمژن، ئەگەر وانەبوایە تەمەنی زیندەوەرو (گیانلەبەر) یان ڕووەكو درەختەکان کۆتایی دەهات بە کۆتایی هاتنی ئۆکسجین یان ئانی ئۆکسیدی کاربۆن.

لەلایەکی ترەوە تیشکەکانی خۆریش هەر بە ڕێژەی ئەندازەیەکی تایبەتییە، ئەگەر خۆر نیوەی گەرمای ئێستای هەبوایە سەر زەوی بە جۆرێك ساردو سەرما دەبوو کەسی تێدا نەدەژیاو دەبوو دونیا بیبەستێ، خۆ ئەگەر زیاد لەو گەرمایەی کە هەیەتی بیبوایە هەموو دنیا گڕی دەگرتو ئێمەیش دەبوینە خۆڵەمێش، تەنانەت روناکی خۆریش بۆ خۆی ئەندازەیەکی دیاری کراوی هەیە ئەگەر زیادو کەمی تێدا هەبوایە، دەبووە هۆی شین نەبوونی گژوگیاو ڕووەكو درەخت، چونکە عیلمو زانست دەری خستووە کە روناکی خۆر پەیوەندییەکی سەرەکی هەیە بە پەروەردە بوونی گژوگیاو گوڵو ڕووەكو درەخت چونکە گەشو نمای ئەمانە پێویستی بە ئەندازەیەکی تایبەتی روناکی هەیە.

کەوابوو گێڕانەوەی ئەم هەموو وردەکاریو ڕێکیو ڕێکخستنو نیزامو یاسا جوانانە بۆ سودفەو ڕێکەوت رایەکی پڕو پوچو بێ بەڵگەو بی پێزە، لەگەڵ عیلمو زانستدا یەك ناگرنەوە.. کەوابوو هەر دەبی بڕوا بەوە بکەین کە ئەم هەموو وەستاییو وردەکارییە پیشەی دەستی قودرەتی کردگارە.

جـارێکی تـریش قورئـان هاوکێـشەی عونـصورەکان دووبـارە دەکاتـەوەو دەفەرموێ:

**{وَالأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْزُونٍ – سورة الحجر/ ١٩}:**

واتە: ئێمە زەویمان لێك کشاندۆتەوەو بەهەر چوار لادا بڵاومان کردۆتـەوەو سـەر رووی زەوی بـۆ هەڵسوکەوتی دانیـشتوەکانی دەڵێـی بـەڕەی راخـراوە، ئـەو هەموو کێوو چیاو گردەمان لێ چەسپ کـردوە دەڵێـی مـێخن‌و لەنگـەری دەواریـان گرتووە. جا لەم زەوییە رێك‌و پێکە نەخـشە کێـشراوەدا جۆرەهای جـۆر گیانـدارو بێ گیان‌و رووەك‌و شتی جیا جیامان دروست کردوە بە ئەنـدازەو رێژەیەکی وردی دیاری کراو وەهەر لەسەر زەوی خۆی دامان ناون‌و جێگەمان کردونەتەوە.

مەبەستی سەرەکی ئێمە لێرەدا لەم ئایەتە پیرۆزەدا وشەی (موزون)ە چـونکە زانایانی کەون‌و بونەوەر شارەزایانی زانـستی کیمیـاو رووەك ئـەوەیان چەسـپاندوە کە ئەو عونصورانەی رووەکیان لێ پێـك هـاتووە لـە هـەموو جـۆرێ لـە جۆرەکـانی رووەکـدا بـرێتین لـە چـەند تـوخم‌و عونـصورێك کـە لـەناو خۆیانـدا بـە پێـی ئەندازەیـەکی دیـاری کـراو زۆر ورد بەیەکـەوە جۆشـدراون بـە رێژەیـەکی سـەر سـوڕهێنەری وا کـە نـاتوانرێ دەرکـی بکـەی مەگـەر بـە تـەرازوو ئـامێری زۆر حەسـاس‌و وردەکـار یـا بـە ئـامێری تایبـەتی وا کـە بەموولـەرە نـەکا.. پێویـستە ئەوەش بزانین: کە رێژەی ئـەم عونـصورانە لـە رووەکێـك بـۆ رووەکێـك دەگـۆڕێ‌و جیاوازی هەیە ئەمەش مەسەلەیەکی وردەکاری زانـستییە پـێش ئـەم چـەرخە بـە دڵی ئادەمیزادا تێنەپەڕیوەو لێی بی خەبەر بووە، بەڵام قورئان بەو شـێوە پـڕ لـە بەلاغەتەو بە روونی ئاماژەی بۆ کردوە.؟!

## شەپۆلی ناوەوەی ئاوو سەر رووەکەی (الامواج الداخلية والسطحية):

خوای گەورە دەفەرموێ:

{أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُّجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ سَحَابٌ ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَا أَخْرَجَ يَدَهُ لَمْ يَكَدْ يَرَاهَا وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُورًا فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ – سورة النور/ ٤٠}:

واتە: ئەو گومڕایانەی بڕوایان بە خودا نیە، سود لە کردەوەی باشیان نابینن، کردەوەی خراپیشیان وەکوو تاریکایی ناو دەریایەکی قووڵی فرە ئاو وایە جا ئەگەر کابرایەك لەناو تاریکایی ئەو دەریایەدا شەپۆلاوی زۆری یەك لەسەر یەك لەنێو خۆی بگرن‌و سەرباری ئەو شەپۆلاوانەش پەڵە هەورێکی ڕەشی پڕو سامناك بەری ورشەی ئەستێرەو مانگ‌و رۆژی گرتبێ روناکی نەهێشتبێ لە هەموو رویەکەوەو بەهەموو جۆرێك تاریکی لەسەر تاریکی پەیدا بووبێ جا ئەگەر لەم کاتەدا کابرا دەستی ببا بۆ بەرچاوی خۆی نەك هەر نایبینێ‌و بەس بەڵکوو لەبارەشیا نیە کە بیبینێ ئا بەو جۆرە هەر کەسێك خوا نەیەوی نوری ئیمان‌و باوەڕ بچێتە دڵیەوە رێگای راست بدۆزێتەوە کەس ناتوانێ بیخاتە سەر رێبازی رزگاریی‌و خواناسی؟!.

مەبەستی ئێمە لێرەدا ئەوەیە کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئاماژەیەکی ئاشکرا هەیە بۆ هەبوونی شەپۆلی جۆراو جۆری دەریاکان هی ناوەو هی سەر روپاماکەی، تەنانەت گەورەترین شەپۆلی دەریاو سامناك ترینیان ئەو شەپۆلانەن کە لە قوڵایی دەریادا هەریەکە بە رێگاو هێڵی خۆیدا بە شێوەیەکی سەر سوڕهێنەر پەیدا دەبن‌و دەنیشنەوە؟!!.

شایانی باسە چەند ساڵێك لەمەوبەر واباو بوو کە گەمیکانی روو بە قوتبی شیمالی زۆر بە نارەحەتی دەتوانن رێگای خۆیان ببڕن، تەنانەت ئەو ناوچەیەی دەریایان ناو نابوو (الماء المیت) نەشیان دەزانی هۆی ئەم دیاردەیە چییە، بەڵام ئێستا وا بەهۆی پێشکەوتنی زانستەوە دەرکەوت کە ئەو تەنگ‌و چەڵەمەیەی ئەو شوێنانەی دەریا دەگەڕێتەوە بۆ هەستانی شەپۆلەکانی ژێر ئاو!! تەنانەت لە سەرەتای ساڵی (١٩٠٠ز) زۆر لە ئەسکندنافیە روو پێوەکانی دەریا. هەستیان بە هەبوونی شەپۆلەکانی نێو دەریا کرد بەڵام تا ئێستاش هۆیەکانی پەیدابوونی ئەو

شەپۆلە گەورانەی ژێر ئاو نەزانراوە هەروەکوو چۆن هۆی هەبوونی ئەم شەپۆلانە بە شێوەیەکی فراوان لە موحیتەکاندا نەزانراوە، زۆرجار وا بووەو وادەبی ئەم شەپۆلانە لە قولایی دەریادا (غەوواصە) فڕێ دەدەنە دەرەوەو لەسەر روبەری دەریاش شەپۆلە سەر ئاوەکان کەشتی فڕی دەدەن یان لە ڕێگای خۆی لادەدەن.

دیاردەیەکی تریش هەیە ئەویش ئەوەیە کە ئەو شەپۆلانە کاتێك روو بەڕوی تەوژمی کەنداو یان تەوژمی شەپۆلێکی تری قوڵایی دەریا دەبنەوە بەسەر یەکدا دەشکێنەوەو شەپۆل سواری شەپۆل دەبێ. ئایەتی قورئانیش کە دەفەرموێ: {يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ} ئاماژەیە بۆ هەبوونی شەپۆلی ناوەوەو دەرەوەی ناو دەریا بە تایبەتی کە وشەی (لجيّ) مانای قوڵی و فرە ئاوی دەگەیەنێ و لێرەدا بووەتە ئاوەڵناوی دەریا.

شایانی باسە کە دەست نیشانکردنی قورئان بۆ موحیطات لەم رووەوە کە موحیتەکان گەرمایی و روناکی خۆری کەمتر پێ دەگا جا ئەگەر تاریکایی هەورو تاریکایی شەپۆلەکان یەك بگرن دیارە کابراکە دەست بەرێ بۆ چاوی دەستی خۆی نابینێ، جا کاتێك ئێمە سەیری زێدو ژیان و بەسەرهاتی پێغەمبەری ئیسلام بکەین دەبینین کە ئایەتەکە چ پەیوەندییەکی بە سروشت و هەرێم و زەمین ناسی ئەو دەوروبەرەوە نییە کە (محمد)ی (درودی خوای لەسەر بێ) تیا ژیاوە خۆ ئەگەر بڵێین (محمد) بە گەنجی سەفەری کردوە بۆ شام شێوەی دەریای بینیوە بەبێ شك بینینەکەی لە بینینی کەناری بەحری سورو بەحری سپی ناوەڕاست تێپەڕ ناکا، کەوابوو دەبێ بەبێ سێ و دوو بڵێین ئەم قورئانە کەلامی خوایە سروش و نیگای پەروەردگارە بۆ رەوانەکراوی خۆی حەزرەتی (محمد) (درودی خوای لەسەر بێ) نازڵ کراوە!!

## جیهانی گیاندارو باڵندە دەق لە جیهانی ئادەمیزاد دەچێ

خوای گەورە دەفەرموێ:

{وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلاَّ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم – سورة الأنعام/ ٣٨}:

واتە: هەرچی پێرۆی سەر زەوی هەیە هەر باڵندەو باڵە فرێکی بەدوو باڵی خۆی بەحەوادا دەفرێ هەموویان وەکوو ئێوەی مرۆڤو، میللەتو نەتەوەنو دارای یاساو رژێمی تایبەتی خۆیانن بەرژەوەندی خۆیان دەزانن‌و بیرو هۆشی تایبەتی خۆیان هەیە خاوەنی عەقڵی مەداری خۆیانن.

قورئانی پیرۆز لەم ئایەتەدا کۆمەڵانی زیندەوەری سەر زەوی‌و باڵە فڕەی ئاسمانی شوبهاندووە بە کۆمەڵی ئادەمیزادو ئەوەی چەسپاندوە کە ئەم زیندەوەرانە هەریەکەیان عەقڵ‌و هۆشی تایبەتی خۆی هەیە کاروباری خۆیانی پێ ئەنجام دەدەن.. ئەمە راستییەکە زانستی تازە بڕوای پێ کردوەو چەسپاندویەتی ئەوەتا زانست دەری خستووە کە کۆمەڵێ زیندەوەر پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی بەیەکیانەوە دەبەستێ‌و لەسەر بناغەیەکی پتەو یەکتر دەگرن‌و هۆگری یەکتری دەبن زیندەوەری وا هەیە لەسەر داب‌و نەریت‌و یاسا نیزامی میرایەتی یەکتری دەگرن‌و کۆدەبنەوە بۆ نموونە میرایەتی هەنگ‌و مێرولە دەهێندرێتەوە؟! هەر کۆمەڵ‌و جۆرێکیش لە ئەم زیندەوەرانە شێوەی دەربڕین‌و زمانێکی تایبەتی خۆیان هەیە لەناو خۆیاندا ئاخاوتنی پێ دەکەن‌و لەیەکتر حاڵی دەبن!!

ئەمە لە کاتێکا زانایانی پێشوو بڕوایان وانەبووە کە ئاژەڵ‌و باڵندە عەقڵیان هەبێ یا خاوەنی بیرو هۆش بن، بەڵکوو پێیان وابوو (کە جگە لە مرۆڤ) هەموو ئەو زیندەوەرانە بریتین لە چەند ئامێرێکی زیندو هەستی خۆشی‌و ناخۆشی دەکەن بەڵام عەقڵیان نییە، پێشیان وابوو کە ئەو دیاردەیەی لێیان دەبینرێ کە بە ڕواڵەت لە بیرو هۆشەوە پەیدا دەبن دیاردەیەکە لە غەریزەو ئیلهامەوەیە نەك لە عەقڵەوە بێ.

ئیتر ئەم بیرو باوەڕە بەردەوام بوو تا ئەم دوایانە تەنانەت (دیکارت)ی فەیلەسووف بڕوای وابووە کە ئەم زیندەوەرانە هەموویان بریتین لە چەند

ئامێرێکی ئاڵۆزو روت لە ژیانی عەقڵ دارو خاوەن هۆش، رای وابووە کە ئەمانە وەکوومرۆڤ بیرناکەنەوەو نافامێنن بەڵکوو هەڵس و کەوتو جمو جوڵیان رەنگ دانەوەی هەستی غەریزییانە نەك رەهنومای عەقڵ. ئیتر ئەم رایەی دیکارت بووە راستییەکی چەسپاوو لێکۆڵەرەوەکان بە درێژایی ماوەیەکی زۆر لەسەری سوور بوون و هیچ کەسێك دانی بەوەدا نەناوە کە ئاژەڵ و باڵندە عەقڵ و بیری هەبێ هەتا کۆتایی سەدەی هەژدەهەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم زانایان هەر لەسەر ئەم باوەڕە بوون بەڵام لەم مێژووەوە بەملاوە رای زانایان گۆڕاو زانست بە جۆرێکی تر ئەم مەسەلەی خستە روو، یەکێ لە زانایان کە (داروون) بوو ئیعلانی کرد کە عەقڵ و بیرو هۆش لە زیندەوەراندا هەیەو بەڵام پلەیەکی کەمترە لەهی مرۆڤ. لەو کاتەشەوە لێکۆڵینەوەو تیۆری تایبەتی یەك لەدوای یەك پاڵپشتی ئەم رایە تازە دەکەن؟!!.

دەی باشە ئەوەتا پێش ئەمان قورئانی پیرۆز بە سەدان ساڵ پێش (داروون)و هاوەڵانی ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە کە زیندەوەر وەکوو مرۆڤ هەستی هەیەو بە گوێرەی عەقڵ و بیری خۆی بەرژەوەندی ژیانی خۆی ئەنجام دەدا کەوابوو بێگومان ئەمەش یەکێکە لە موعجیزەکانی قورئان و راستییەکی زانستییەو زانستو قورئان یەکاڵا هاتنەوە؟!.

## قۆناغەکانی گەشەی کۆرپەلە (مراحل نمو الجنین):

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ:

**{وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ، ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ - سورة المؤمنون/ ١٢-١٤}:**

واتە: بەراستی ئێمە لە سەرەتاوە مرۆڤمان لە قوڕێکی پاڵفتە دروست کردوە، دوایی جەستەی تاکە تاکەی ئێوەمان دروست کردوە لە دڵۆپە ئاوێکی پیاو کە دەکەوێتە رەحمی ئافرەتەوە کە قایم ترین شوێنە بۆ پەروەردەکردنی ئەو دڵۆپە

ئاوە تێکەڵاوەی ژن‌و پیاو، دوایی هەر لە وێدا ئەو دڵۆپە ئاوە تێکەڵاوەمان گێڕاوە بە خوێنێکی توند بوو (خوێنپارە) ئەمجار ئەو خوێنەمان کردوە بە پارچە گۆشتێکی بێ ئێسقان‌و بەقەد تیکەیێ لە دەما، هیچ سیماو دیاردەیەکی تایبەتی پێوە نیە، ئەمجار ئەم گۆشت پارەیەمان کردوە بە ئێسقان. ئەمجار ئەو ئێسقانەمان داپۆشیوە بە گۆشت‌و ماسولکەو دەماری پێویستمان بۆ ئەنجام داوە، ئەمجار حاڵەتێکی ترمان بەسەردا هێناوەو رۆحمان کردوە بە بەرداو شێوەو شێوازی تایبەتی خۆی وەرگرتووە، کەواتە ئەو خوایەی ئەم هەموو گۆڕانکارییەی بەسەر هەر مرۆڤێکدا هێناوەو دەهێنێ، دروست کارێکی بێ وێنەیەو جوانترین‌و لایەقترین دروست کەرە بەڵکوو هەر خۆی بەدیهێنەری بونەوەرەو کەسی تر حەددو رایەی ناکەوێ ئاوەڵناوی (خالق = دروستکار)ی بۆ خۆی دابنێ‌و خۆی بکا بە هاوتای ئەو خوایە..!!

جا هەر کاتێك ئێمە بە وردی لەم ئایەتە تێ بفکرین، دەبینین بە ئاشکرا مانایان لەگەڵ بۆچوونی زانستی تازەدا یەك دەگرنەوە، چونکە زانستیش ئێستا ئەوەی چەسپاندوە کە ئەو دڵۆپە ئاوە تێکەڵاوەی پیاوو ژن کە کۆرپەلەی لێ پەیدا دەبێ لە راستیدا لە خواردەمەنی پەیدا دەبی‌و خواردەمەنیش لە بنەڕەتدا لە گڵ پەیدا دەبێ.

مەبەستیش بە (نوطفە) لە ئایەتەکەدا ئەو کۆمەڵە خەلییە زیندوانەن کە لە پیاوەوە دەردەچن تێکەڵ بە ئاوی ئافرەت دەبن‌و هەریەکەیان پەلەقاژەی ئەوەیەتی کە لەپێش ئەوەکانی تریان خۆی بگەیەنێتە تاقە خەلییەکەی ژنەکە، ئیتر بە قودرەتی خودا یەکێ لەم کۆمەڵە خەلایانەی پیاوەکە تاقە خەلییەکەی ژنەکە (کە پێی دەگوترێ هێلکە یا گەرا یا تۆم) وەگیر دەهێنێ‌و خۆی لێ شەتڵ دەکاو تێکەڵاوی یەکتری دەبن.. ئیتر ئەمە سەرەتای دروست بوونی (جەنینە). واتە: کۆرپەڵە دوایی ئەم تۆمە تێکەڵاوە دەگۆڕێ‌و دەبێتە کۆمەڵە خەلییەك‌و لە شێوەی خوێنێکی خەست‌و خۆڵدا بە دیواری رەحمەوە دەنووسێ. ئەمجار پاش ماوەیەك دەگۆڕێ‌و دەبێتە پارچە گۆشتێك بەقەد تیکەیەکی جووراو بە عەرەبی

پێی دەگوترێ (مضغة) بەڵام بە گوێرەی زاراوەی نوشداری ئەم حاڵەتە بریتییە لە گەشە کردنی خوێنپارە (علقە)و دابەش بوونی خەلییەکانو لێك جیابوونەوەی ئەندامەکان لە یەکتری، ئیتر لەم کاتەوە دروست بوونی جەستە دەست پێ دەکاتو ئێسقانەکان پەیدا دەبن دوای دروست بوونی ئێسقان ئەمجار گۆشت دروست دەبێو ماسولکەکان سەر هەڵ دەدەن ئەمجار لەگەڵ گەشەکردنو دروست بوونی ئەمانە ئەندامەکانی دیکەی جەستە دێنەکایەوە.

کەوابوو پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: {ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ} دەبێ بە موعجیزەیەکی گەورەی قورئان دابندرێ، چونکە تازە وا زانستی تازە ئەوەی دۆزیوەتەوە کە (جنین) لە سەرەتای مانگی دووەمی دروست بونیا گۆڕانکاریەکی سەرەکی بەسەردا دێ کە لە کۆمەڵەی زیندەی ئاویەوە دەچێتە کۆمەڵەی زیندەی ئینسانییەوە، کەوابوو ئەم گۆڕانکارییە گۆڕانکارییەکی بنەڕەتییەو دەقاو دەق لەگەڵ زانستی تازە یەك دەگرنەوە.

دەی باشە ئایا لە توانای نەخوێندەوارێکی نێوە دورگەی عەرەبی پێش چواردە سەدەی پێش ئێستادا هەبووە ئەم باسە ئاڵۆزە ئاوا زانستانە بخاتە روو؟!

دیارە ئەم قورئانە سروشی خوایەو زانستی پەروەردگارە بۆیە وابێ خەوشو راستو دروستە.؟!

## پەردەکانی جەنین، کۆرپەلە، ئاولەمە (أغشية الجنين):

خوا دەفەرموێ:

{يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقًا مِن بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ – سورة الزمر/ ٦}:

واتە: خوای گەورە ئێوەی لە سکی دایکانتاندا دروست دەکاو گۆڕانکاریتان بەسەردا دێنێ؟ لە دڵۆپە ئاوەوە بۆ خوێنپارە، لە خوێنپارەوە بۆ گۆشتپارە لە گۆشتپارەوە بۆ ئێسقانو ئەمجار داپۆشینی ئەو ئێسقانانە بە ماسولکەو پێست هەموو ئەم گۆڕانکاریانە لەناو سێ پەردەی قایمدا ئەنجام دەدرێن؟! ئەم

دروستکارە بە دەسەڵاتە خوای ئێوەیە هەموو مڵك‌و ماڵی بونەوەر بۆ ئەوە لەم ئایەتە پیرۆزەدا موعجیزەیەکی زانستی قورئان هەیە ئەویش ئەوەیە کە قورئان پێش هەزارو چوار صەدو ئەوەندە ساڵ پێمان دەڵێ: کۆرپەڵە لە رەحمی دایکیا لە نێو سێ پەردەدایەو وەڵێ بەو پەردانە دەفەرموێ تاریکایی ئێستا زانستی نۆشداری پێیان دەڵێ پەردەی (المنباری) پەردەی (الخوربون) پەردەی (اللفائفي) شایانی باسە کە ئەم پەردانە بە ئامێری وردبین نەبێ نابینەدرێن‌و لێك جیا ناکرێنەوە، چونکە بە چاوی ئاسایی هەر بەیەك پەردە دێنە پێش چاو.

## سەرچاوەی پێکهاتنی مرۆڤ (مصدر تكون الانسان):

خوا دەفەرموێ:

{وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتَ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَى شَهِدْنَا – سورة الأعراف/ ١٧٢}:

واتە: ئەی پێغەمبەر ئەوکاتە بێنە یادی خۆت‌و بۆ مەردومی باس بکە کە خوای تۆ لە پشتی ئادەم زەروێتی مرۆڤی دەرهێناو دوایی لە پشتی ئەوانیش زەروێت‌و نەوەی تری لێ پەیدا کردون، جا لە رۆژی (قَالُواْ بَلَى)دا نوری خۆی بەسەر روحیانەتی ئەواندا رانواندوەو پێی گوتوون ئایا من خوای ئێوە نیم؟! ئیتر رۆحیانەتی هەموو مرۆڤێك بڕوایان بە خوایەتی خوا کردوەو بە یەك دەم وتویانە بەڵێ تۆ خوای ئێمەی!!

لێرەدا ئایەتەکە راستەو خۆ دان بەوەدا دەنێ کە خوای گەورە گەرای مرۆڤی لە پشتی خۆیان وەرگرتووە، ئاشکراشە کە هێلکە (گەرا) لە خوار پشتەوەیە نەك لە پشتدا بێ، بەڵام دیارە ئایەتەکە باسی دروست بوونی مرۆڤ دەکا لە سەرەتایدا باسی زانستی (Embryology)یان عیلمی جەنینەکان دەکا قسە لەو بەشە دەکا کە بریتییە لە (نوتفە).

ئەم بەشە رێك دەکەوێتە خوار گورچیلەوە. ئەو ئەندامانەی کە گەرایان لێ پەیدا دەبێ لەم بەشەوە سەر هەڵ دەدەن لە پشتدا لە خوار گورچیلەوە لە سکی

دایکیا دەمێنێتەوە، تا ماوەیەکی دیاری کراو ئەمجار دێتە خوار لە سەرەتای لەدایك بونیا دێتە شوێنی ئاسایی خۆی، کەوابوو ئایەتەکە ئاماژە دەکا بۆ نوختەی سەرەکی لە جیسمی کۆرپەلەدا ئەو نوختەیەی کە نوتفەی لێ وەردەگیرێ ئەویش بێگومان پشتە، جا لەم سەد ساڵەی دوایی پێش کەوتنێکی ئەو تۆی بە دەست نەهێناوە کەوابوو دەبێ ئەم ئایەتەش بە موعجیزەیەکی عیلمی بژمێررێ.

## چۆنیەتی دروست بوونی نێرو مێ (كيفية تكوّن الذكر والأنثى):

خوا دەفەرموێ: {أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَى، ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى، فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى – سورة القيامة/ ٣٧-٣٩}:

واتە ئایا ئادەمیزاد وا گومان دەبا کە هەروا بە هەوانتە وازی لێ بێنرێو پاش گوی بخرێو هیچ ئەرکێکی نەخرێتە سەر شانو هیچ پاداشیشی نەدرێتێ. دیارە شتی وا نەبوەو نابێ، ئایا هەر یەکێك لە ئێوە لە سەرەتادا بریتی نەبووە لە دڵۆپە ئاوێكو خراوەتە نێو رەحمی دایکییەوە؟ دوایی ئەو دڵۆپە ئاوە گۆڕاوەو بوەتە خوێنپارەو دوایی سیماو شکڵی لێ دروست کراوەو گیانی بەبەردا کراوە.. هەر لەو دڵۆپە ئاوەی پیاو، نێرو مێمان دروست کردوە، لەم ئایەتە پیرۆزەدا قورئان ئەوە دەچەسپێنێ کە کۆرپەلە نێر بێ یان مێ بێ کانی سەرەکی ئاوی پیاوەو لەو پەیدا دەبێ، ئەمەش راستییەکی زانستییەو قورئان ئاماژەی بۆ کردوەو ئەمرۆ عیلمی تازە دەی چەسپێنێو لەگەڵ قورئاندا یەك دەگرنەوە.

شتێکی چەسپاوو باوە کە هێلکەدانی مێینە (مبيض الأنثى) مانگی یەك جار گەرا دروست دەکا، بەڵام ئاوی پیاو هەموو جارێك ملیۆنەها خانەی سپێرمی (خلايا منوية) دەرێژێ، ئەم (خانە سپێرمی)یانە هەر کاتێ بگەنە هێلکەی مێینە لێی دەهاڵێو پێکەوە خانەیەکی سپێرمی دروست دەکەن دوایی ئەم خانە سپێرمییە بۆ خۆی دەبێتە ملیۆنەها خەلییە لەم خەلایانە کۆرپەلە دروست دەبێ، گونەزای پیاو (السائل المنوي) دیاردەو رەنگو سیمای نێرو مێی پێوەیە جا

هەر کاتێ گونەزا، (شەهوەت)ی پیاو تێکەڵ بە هێلکەی مێینە ببێ هی پیاوەکە دیاردەی مێینەی پێوە بێ کۆرپەکە مێ دەردەچێ ئەگەر هی پیاوەکە سیماو رەنگی نێرینەی پێوە بێ کۆرپەکە نێر دەردەچێ، کەوابو کانگای گەراکەو چۆنیەتی نێرو مێی کۆرپەکە هەر لەهی ئاوی پیاوەکەدایە، جا کە قورئان دەفەرموێ: { فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى} راناوی (منه) دەگەڕێتەوە بۆ وشەی (منی) شەهوەت ئەویش هی پیاوە نەك هی ژن کەوابوو دەبێ ئەم ئامـاژە کردنو بۆ چوونەی قورئانیش بە موعجیزەیەکی زانستی بژمێردرێ.

## گونەزای مرۆڤ لە زەروو دەچێ:

خوای گەورە دەفەرموێ:

{اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ، خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ}:

واتە: ئەی موحەممەد! بخوێنە بەناوی خوای خۆت، ئەو خوایەی تۆی لە نەبوونەوە دروست کردوە، مرۆڤی دروست کردوە لە گونەزایەك ئەمە بۆچوونی قورئانە پێش چوارده سەدە وا تازە ئەمڕۆ زانستی نوشداری چەسپاندویەتی کە گونەزای مرۆڤ مادەیەکی شلی فرە زیندەوەرە ئەم زیندەوەرانە لەبەر پچکۆلەییان بە چاوی عادەتی نابیندرێن، بەڵکوو بە ئامێری (میکرۆسکۆب) دەبینرێن. هەر زیندەوەرێکیش لەم زیندەوەرانە سەلك‌و مل‌و کلکی هەیە لە شێوەی سەرو سیمادا زۆر لە کرمی زاروو دەکا، کەوابوو کە خوای گەورە دەفەرموێ: {خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ} مانای ئەوەیە کە مرۆڤی دروست کردوە لەم گیاندارانەی کە لەم کرمە دەچن بەم لێك چواندنەش زیاتر ماناکەی لە عەقڵ‌و بیری مەردومەکە نزیکتر کردۆتەوە.

شایانی باسە کە ئەم ئایەتەش موعجیزەیەکی تری ئاشکرایە لە موعجیزەکانی قورئان‌و کاتی خۆی‌و سەردەمی نازڵ بوونی‌و دوای نازڵ بونیشی بە سەدان ساڵ ماناکەی نەزاندراوە تا لەم سەدەیەدا بەهۆی ئامێری میکرۆسکۆب چۆنیەتی دروست بوونی مرۆڤ لەم گونەزایانە زاندراوە.

## جیاوازی نێوان چاوە قامکی مرۆڤ (اختلاف بصمات الإنسان):

خوای گەورە دەفەرموێ: {لَا أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَلَا أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ، أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَلَّن نَجْمَعَ عِظَامَهُ؟ بَلَى قَادِرِينَ عَلَى أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُ – سورةالقيامة}:

واتە: سوێند دەخۆم بە رۆژی رەستاخیز سوێندم بە دەرونێکی خاوەن بیرو هۆش، نەفسێك کە هەمیشە خاوەنەکەی هەڵنێ بۆ کردنی چاکە، ئێوە زیندو دەکرێنەوە. ئایا مرۆڤ وا گومان دەبا کە ئێمە جارێکی تر ناتوانین ئێسكو پروسکی رزیویان کۆبکەینەوەو رێکیان بخەینەوەو سەر لەنوێ دروستیان بکەینەوە؟! با وانەزانێ، ئێمە توانامان هەیە جارێکی تر (تەنانەت سەرە پەنجەکانیشی رێك بخەینەوە وەکوو خۆیان وەکوو جاری پێشو دروستیان بکەینەوە).

دەی باشە با ئێمە سەرنج بدەینو پرسیار بکەین بۆچی پەروەردگار بە تایبەتی باسی سەرە پەنجەی مرۆڤی کردوە دیارە ئەمە هۆیەکی هەیە بەڵێ؛ ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ (چاو، لووت، گوێچکە، رومەتن ....هتد) جاری وا هەیە هی ئەم مرۆڤ لەهی ئەو مرۆڤ دەچێ بەڵام سەرە پەنجەی هیچ مرۆڤێك لە سەرەپەنجەی مرۆڤێکی تر ناچێ ئەمەش راستییەکی زانستییەو لەوەپێش نەزاندراوە (تەنانەت تا ئەم سەدەیەی رابوردوش) واتە دوای نازڵ بوونی قورئان بە دوانزە چەرخو نیو ئەمجار هەست بەم حەقیقەتە عیلمییە کراوە، ئەوەبوو ساڵی (١٨٨٤ز) بە شێوەیەکی رەسمی لە ئینگلتەرە هەست بە گرینگی سەرەپەنجە کراو بۆ رێبازی دۆزینەوەو ناسینەوە بەکارهێنرا مۆرکردنی پەنجە لەسەر بەڵگە نامەو نامەو پەیمان ...هتد، هاتەکایەوە چونکە پێستی سەرەپەنجەی هەر کەسێك داپۆشراوە بەچەند هێڵێك ئەم هێڵانە سێ جۆرن کەوانەیی، تێکچڕژاو، بازنەیی جۆرێکی تریش هەیە پێك هاتووە لە تێکەڵی ئەم سێ جۆرە هێڵە، ئەم هێڵانەی چاوەی قامك بە درێژایی تەمەنی مرۆڤ ناگۆڕێن سەرە پەنجەی هەر یەکێکیش جیاوازی هەیە لەگەڵ سەرەپەنجەی یەکێکی تر.

کەوابوو قورئانی پیرۆز تەنها بریتی نییە لە وشە ریزکردن بەڵکوو هەر وشەیەکی مانای خۆی هەیەو هەر ئایەتێك بۆنو بەرامی تایبەتی خۆی هەیە.

خوێنەری ئازیز ئەمانە چەند نموونەیەکی کەم بوون لە موعجیزە زانستیەکانی قورئان لەم بەشەدا رامانەواندن، خوا یاربێ برێکی تریشیان لە باسی تەندروستیدا دێنین.. با جارێ لێرەدا وازیان لێ بێنینو بۆ شوێنی خۆیانیان هەڵگرین، بەڵام ئێستا لەم بەشەی داهاتوودا باسی موعجیزاتی قورئان دەربارەی کۆمەڵایەتیو گونجاندنی بۆ هەموو کاتو شوێنێك دەکەین؟!.

شایانی باسە کە زانستو بەرنامەو یاسای کۆمەڵگاکانی سەر زەوی دانی بە کۆڵیو لێ قەوماویو داماویی و دەستە وەستانی زانیاریدا ناوە لە ئاست زوربەی لایەنەکانی کۆمەڵایەتی واتە چەندە زانست لەبارەی تەکنۆلۆژیو نۆشداریو ئاسمان شوناسی... هتد دا پێشکەوتووە ئەوەندە لەبارەی کۆمەڵایەتییەوە دواکەوتووە، ئەمەش راستییەکە زاناکانی بێگانە پێش زانا موسوڵمانەکان دانیان بەم دیاردەدا ناوە.

(دکتۆر جون کوینسی ستیوارت) مامۆستاو پرۆفیسۆری سروشت زان لە دانیشگای برینستون باسی کردوەو دەڵێ: لەکاتێکدا زانستی سروشت ناسی سەرکەوتنێکی ئەفسووناوی وەدەست هێناوە پێشکەوتنێکی بەخۆوە بینیوە، کەچی لەبارەی کۆمەڵایەتیەوە بە پێچەوانەوەیەو تا ئێستا چ پێشکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێناوە. دەبینین مرۆڤ لە سروشت ناسیدا، زیندەوەرزانی دا، هەندەسەو نۆشداریدا زنجیرە سەرکەوتنێکی باشی بەدەست هێناوەو جێگای باسکردنە، کەچی لە بواری رامیاریو تیووری بوژانەوەو باری بەڕێوەبردنی فەرمانڕەواییو نەخشەی کۆمەڵایەتی زۆر لە دوایە مامۆستاو لێکۆڵەرەوەکانی بواری کۆمەڵایەتی خۆیان بڕوایان بەم دیاردەیە هەیە!!!.

## بەشی چوارەم:

# بڕوا بە خوداو چەند بەڵگەیەکی

سەرە باسەکانی ئەم بەشە:

**بەڵگە لەسەر هەبوونی خودا- ئەم بونەوەرە بەڵگەیە لەسەر هەبوونی خودا - ( شەوو رۆژ خۆرو مانگ بەڵگەن لەسەر هەبوونی خودا ) - رێك و پێکی سروشت و خانە زیندوەکان ( الخلايا الحية ) بەڵگەن لەسەر هەبوونی خودا- دروست کردنی رووەك بەڵگەیە لەسەر هەبوونی خودا- خانە خانەکانی رەچەڵەك ( وحدات الوراثة ) بەڵگەن لەسەر هەبوونی خودا- دروستکردنی مرۆڤ بەڵگەی هەبوونی خوان ( زاوزێی مرۆڤو ئاژەڵ بەو جۆرەی کە هەیە بەڵگەیە لەسەر هەبوونی خوا ) بڕوا بە خوا شتێکی دەروونییەو لە دەرووندا پەیدایە.**

## زانست بانگەوازی خەڵك دەکا بۆ بڕوا بەخوا:
## مشتو مڕ لەگەڵ ماددییەکاندا:

بـڕوا بـە هـەبوونی خـوا شـتێکی خـوایی زکمـاکی سـەرەتایی و داخوازییـەکی دەروونییەو مـرۆڤ نازانـێ سـەرەتا چۆن بـۆی پەیـدا دەبـێ، بـاوەڕ بـەخوا کـارێکی زەروورییەو بەرو بەرهەمی هۆش و بیرەو عەقڵ خۆی پەی پێ دەباو چەکەرەی لـە دڵدا شین دەبێ.

شـتێکی بـڕوا پێکـراوو بەڵـگە نەویستیـشە کـە هـەموو شـتێك بەدیهێنـەرێکی هەیە دەیهێنێتە کۆڕی بونەوە، یان بڵێین وەسـتایەك هەیـە دروسـتی دەکـاو رێکـی دەخا، کەوابوو ئەگەر مرۆڤ سەیری بونەوەر بکاو چی تێدایـە لـە جـڕو جانـەوەر بە پێش چاوی خۆیدا رای نوێنێ، زانیارییەکی زەروریی بۆ پەیـدا دەبـێ بـەوە کـە ئـەم مـەخلوقات و بونـەوەرە سـودفە نەیهێناوەتـە کـۆڕی ژیانـەوە بەڵـکوو دەبـێ دروستکەرێك بەدی هێنابێ.

## بەڵـگە لەسەر هەبوونی خوا (البرهان على وجود الله):

بیروبـاوەڕی تـاك تاکـەی کۆمـەڵ و مـرۆڤ بەگشتی دەربـارەی خـوا بڕوایـەکی زەرووری و خوا دادە بۆ خاوەن عەقڵ و بیر پەیدا بووە، پێش سەرهەڵدانی رێبـازی

بەڵگەو لێکۆڵینەوە پەیدا بووە، هەر مرۆڤێك هەستی بە چاکەو خراپە کردبێ لەخۆوە بیرو باوەڕێکی تایبەتیش لە ناخیدا سەری هەڵداوە، بەلام مرۆڤ هەرچۆنێك بیر لە مێژووی منداڵی خۆی بکاتەوە، ناتوانێ ئەوساتە دەستنیشان بکا کە تێیدا بڕوای بەخوا بۆ پەیدا بووە! بڕوایەك کە بەبێ دەنگو لە خشکەوە چۆتە دەروونیەوەو گەورەترین کاریشی کردۆتە سەر ژیانی، ئاشکراشە کە ئەم بڕوایە وەکوو هەموو هەست پێکراوێکی سەرەکی لە دەروونی هەریەکێ لە ئێمەدا پەیدا بووە، گومانیش لەوەدا نیە ئەم بڕوا سەرەتاییە یا بڵێین ئەم بڕوا دەرونییە لەپاش چەکەرە کردنی بە سروشت لەژێر کارتێکردنی گۆڕانیو لاواندنەوەی دایكو ئامۆژگاری باوكو کەسو کاریشا گەشەی کردوە، دوایی لە قۆناغەکانی ژیاندا بەهۆی لێکۆڵینەوەو تێفکرینەوە تەواو چەسپیوەتە دڵی ئێمەوە، شایانی باسە کە هەر قۆناخو بارو دۆخێك بۆ ژیانی مرۆڤ دابنرێ دەتوانرێ بۆ ژیانی گەلو هۆزیش بگوترێ، چونکە مێژوو بۆمانی دەگێڕێتەوە کە هەر لە کۆنەوە کەسانێك هەبوون لە خودی خۆیانەوە بڕوایەکی فیتری (فطري)یان بە هەبوونی دەسەلاتێکی بەهێزو راگرو رێخەری بونەوەر هەبووە، بڕوایان وابووە کە خوایەك هەیە دادپەروەرو خاوەن دەسەلاتە، پاداشی چاکە بە چاکە دەداتەوەو سزای خراپەش بە خراپە.. جا یا لە جیهاندا دەبێ یا لە رۆژی رەستاخیزدا. مرۆڤی کۆن لە بواری بڕوا بە خوادا گۆڕانکاری بەسەردا هاتو گومانی جۆێ جۆێی دەربارەی دروستکەری بونەوەر بۆ پەیدا بوو، ئەوجا پەروەردگار یەك لەدوای یەك پێغەمبەرەکانی نارد بۆ شارەزاکردنی مەردومو هاوردنیان بۆ سەر رێبازی راست، پێغەمبەرەکانیشی پاڵپشت کردوە بەوە کە موعجیزەی لەسەر دەستیان دەرخستووە، موعجیزەش بۆ خۆی برێتییە لە کردەوەیەك کە لە ژوور توانای مرۆڤەوە بێ پەروەردگار بۆیە موعجیزەی داوە بەم پێغەمبەرانە (دروودی خوایان لەسەر بێ) تاوەکوو مەردومەکە بە پیر بانگەوازەکەیانەوە بچنو بڕوا بە پێغەمبەرایەتیەکەیان بکەنو بزانن کە ئەمانە رەوانە کراوی خودانو لە گومڕایی دەربچنو بێنە سەر رێبازی خوا پەرستی، بەلام ئەمڕۆ بیرو هۆشی مرۆڤ

پێـشکەوتووەو وەکـوو رۆژگـاری کـۆن مـوعجیزە کـاری تێناکـاو ئـەو دەورەی رابـوردووی نـەماوە، بەڵـکوو عـەقڵو لێکۆڵینـەوەی زانـستی بوونەتـە رێبـازی سـەرەکی فیکـری مرۆڤـی هاوچـەرخ.. لەبەرئـەوە پێویـستە ئـەمرۆ ئـایینو پێشەوایانی ئـایین بەڵـگەی تـازەی زانـستیی بێننـەوەو رێبـازی بانگـەوازی بـۆ ئیسلامو هەبوونی خوا زانستانەو کارامانە بێ، سەیر لەوەدایـە کـە تـەنها ئـایینی ئیسلام مرۆڤ هەڵ دەنێ بۆ ئەوەی کە عـەقڵو بـیرو هـۆش بخەنـە کـار لـە رێگـەی عەقڵەوە خوا بدۆزنەوە!! چەندەها ئایـەتی قورئـان هەیـە بـە ئاشـکراو بـە نهێنـی داوا لە موسـوڵمانان دەکـا کـە لـە بونـەوەر وردببنـەوەو عـەقڵ بـەکاربێنن، کەچـی لەگەڵ ئەوەشدا دوژمنانی ئیسلام هاتوون تانەو تەشەر لە ئیسلام دەدەنو دەڵێن: (گوایە محمد بە ئاشکرا داکۆکی لەسەر ئـەوە کـردوە کـە نـابی لـە بـارەی ئایینـەوە عەقڵ بەکار بهێنـرێ چونکە بوونی خوا بە بەڵـگەی عـەقڵی ناچەسپێنـرێ) دیـارە ئەم بۆچوونە لەگەڵ راستیدا یەك ناگرنەوە، ئەمە خەیاڵ پڵاوێکە (الأب تيري) لە دەروونی پیسی خۆی هەڵی هێنجاوەو بوختـان بـەدەم پێغەمبـەرەوە دەکـا، ئـەگینا شتی وا لـە ئایینـدا نیـەو نـەبووە بەڵـکوو وەکـوو گوتمـان ئایەتـەکانی قورئـان کـە باسـی بـڕوا بـەخوا دەکـەن، هـەموویان داوای بـەکارهێنانی عـەقڵ دەکـەنو قـسە لەگەڵ عەقڵ دەکەن ئێمەش لێرە بەولاوە بە گوێرەی پێویـست چـەند بەڵـگەیەك رادەنوێنین داوا دەکەین خوێنەر بۆ خۆی رای خۆی لەم بـارەوە دەربـبڕێ، تێبینـی ئەوە بکا چۆن ئیسلام لایەنی عەقڵی مرۆڤی گرتووەو دەیـەوێ رادەی بـیرو هۆشـی بەرەو پێش برواو هەوڵ بدا لە نهێنی بونەوەر تێبگاو تا لە ئاکاما لـەناخی دڵەوە بڕوا بەبوونی خوایەکی دروستکەرو بەتواناو دەسەڵات بهێنێو هەست بکا کە ئـەم بونەوەرە بەم شێوە رێكو پێکە خاوەنێکی هەیەو لەخۆیەوە بەدی نەهاتووە.

## ئەم بونەوەرە بەڵـگەیە لەسەر هەبوونی خوا:

بەڵگە لەسـەر هـەبوونی خـوا زۆرن، گـەورەترین بەڵـگە لەسـەر هـەبوونی ئـەو زاتـە دروسـت کردنـی ئـەم بونەوەرەیـە، راگرتنـی ئـەم کەونەیـە، ئـەو زەوییـەی کـە

لەسەری دەژین ئەو کۆمەڵە سامناکە زۆرو بێ شمارەی ئەستێرەکان؛ کە هەتا مرۆڤ تێیان بفکرێ زیاتر لێیان سەر سام دەبیو ناچار دەبێ بروا بە دەسەلاتو هێزێك بکا کە ئەو بونەوەرەی بەدی هێناوەو رایگرتووە.. قورئانی پیرۆز زۆر ئایەتی تێدان کە داوا دەکا لە مرۆڤ بە چاوێکی وردبینییەوە سەیری بونەوەر بکەنو بێ پەردە لە ئاسمانو زەوی بروانو سەرنج بدەن. زوربەی ئایەتەکانی قورئان بانگەوازی مرۆڤ دەکەن کە لە نهێنییەکانی کەونو کائینات تێ بفکرن. تا لە روانگەی ئەمەوە بروا بە خوایەتی خوا بەهێزبێو شكو گومانی لە دڵ دەرچێ؟

{قُلِ انظُرُواْ مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لاَّ يُؤْمِنُونَ} (١٠١) سورة يونس:

واتە: ئەی پێغەمبەر! بەو مەردومە رابگەیەنەو پێیان بڵێ: سەرنج لە ئاسمانەکانو زەوی بدەنو بزانن چییان تێدایە! دەبینن هەموو شتێکی ناو ئاسمانو زەوی خوایەتیو تاکو تەنیاییو بەدەسەلاتی خوا دەگەیەنن!! بەلام هەر کەسێك لە عیلمی خوادا بە گومڕاو سەر رەق نوسرابێ هەرگیز نیشانەکانی خوایەتی خواو ناردنی پێغەمبەرانو ئامۆژگارییان بۆ ئەو سوودی نیەو کەڵکی لێ وەرناگرێ!!.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ:

{أَوَلَمْ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللّهُ مِن شَيْءٍ وَأَنْ عَسَى أَن يَكُونَ قَدِ اقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ} (١٨٥) سورة الأعراف:

واتە: ئایا بۆچی ئەم خەڵقە لە بونەوەر تێ نافکرنو سەرنج لە مەخلووقاتی خوا نادەن؟! بۆ تێ نافکرن لەو شتانەی خوا دروستی کردوون هەتا ئەگەر شتێکی بەدیمەن بچوكو بێ وەج بێ لە حەقیقەتدا چەند سوودی تێدایە. بەڕاستی واقیعو حاڵ ئەوەیە کە نزیکە ئاکامو ئەجەل داوێنگیریان ببێو مەیدانی کردەوەی باشیان نەمێنێ؟! دەی باشە کە بروا بەم قورئانە بەهێزو بەرزو شیرین تەرزە ناکەن ئەی بەچی دی بروا دەکەنو ئیمان دەهێنن؟!

لێرەدا قورئانی پیرۆز بە ئاشکرا ئەوە دەچەسپێنێ بیرو باوەڕی گومڕاییو ئیلحاد ئەگەر بە تێفکرینو تێڕوانینی ئەرزو ئاسمانو ڕێكو پێكی سروشتو بونەوەر لە دڵی مرۆڤ دەرنەچن ئیتر چ بەڵگەیەکی تری بەهێز نییە کار بکاتە دڵی گومڕاو بێ باوەڕان؟! کەوابوو تەنها موسوڵمانانن کە بەڵگە لەسەر هەبونی خوا بە دروست کردنی بونەوەر دێننەوەو بەلایانەوە ڕێكو پێکی بونەوەر بەڵگەیە لەسەر هەبوونی خوا {خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ} (٤٤) سورة العنكبوت:

واتە: خودا زەویو ئاسمانەکانی بە ڕێكو پێکی دروست کردون، لەم دروستکردنەدا بەڵگەی خوایەتی خوا هەن بۆ کۆمەڵی موسوڵمانان.

یان دەفەرموێ: {إِنَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِّلْمُؤْمِنِينَ} (٣)سورة الجاثية:

واتە: بە ڕاستی لە ئاسمانو زەویدا زۆر بەڵگە لەسەر خوایەتی خوا هەنو موسوڵمانان بڕوایان پێ پتەو دەبێ.

لێرانەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە پرسیارەکەش ئەوەیە: ئایا ئەم کەونە چەندەو چۆنەو چییە؟! لە وەڵامدا دەڵێین زانایانی ئاسمانناسی دەڵێن: زەوی بریتییە لە بەشێك لەبەشەکانی کۆمەڵەی خۆریی (المجموعة الشمسية) کۆمەڵەی خۆریش بەشێکە لە بەشەکانی کۆمەڵەی مەجەڕە وەکاشەکان کۆمەڵە مەجەرەکانیش بەشێکن لە بەشەکانی شارە ئەستێرەکانی بۆشایی فراوان. زیاد لەمانەش چەند نەیزەكو ئەستێرەی ئاگراویو کلك دارو مانگی تر هەن.

دەی کەوابوو ژمارەی ئەو ئەستێرانەی کە لە مەجەڕەی خۆماندا هەنو سەر بە کۆمەڵەی خۆرنو پێیان دەگوترێ کاکێشان (درب التبانة) چەندن؟! لە وەڵامدا دەڵێین: ئەگەر بە چاوی ئاساییو عادەتی سەیرییان بکەین دەبینین ژمارەی تێکڕای ئەم ئەستێرانەی کە لە دوو نیوە کورەی باشوورو باکوردا دەبینرێن لە شەش هەزار ئەستێرە تێپەڕ ناکەن بەڵام ئەگەر بە ئامێری دوربینو پێشکەوتوو سەیریان بکەین ژمارەیان زۆر زیاتر دەبێ؟ زانای ئاسمان ناس (کابتین) دەڵێ:

ژمارەیان بە (٤٠,٠٠٠) ملیۆن دادەنرێ. مامۆستا (شابیلی) کە زانایەکی فەلەکی دووربینی هارڤەردە دەڵێ: ژمارەیان دەگاتە (١٠,٠٠٠) ملیون ئەستێرە ژمارەی مەجەرەکانیش دەگاتە (١٠٠) ملیۆن مەجەرە هەر مەجەرەیەکیش چەند ملیون ئەستێرەی هەڵگیرساوو ئاگراوی تێدایە. دەی باشە قەبارەی ئەم ئەستێرانە دەبێ لەبەرامبەر قەبارەی خۆردا چەند بێ؟!

لە وەڵامدا دەگوترێ: خۆر بۆ خۆی ئەستێرەیەکە وەکوو ئەو ئەستێرانەی کە بە ئاسمانەوە دەبینرێن، وەلێ کە بە گەورەتر لەوانی تر دێتە بەرچاومان لەبەرئەوەیە کە لە ئێمەوە نزیکترە، دەنا خۆی ئەستێرەیەکی مامناوەندییە، بچوکترین ئەستێرەیەك کە تا ئێستا دزراوەتەوە ئەستێرەی (فان کاتن)ە، کە رەنگ بێ کەمێ لە گۆی زەوی گەورەتر بێ لەگەڵ ئەوەیشا ملیۆنێ ئەستێرەی ئاوا لەناو قەبارەی گۆی خۆردا بەهاسانی جێی دەبێتەوە. بگرە پتریش، لەلایەکی تریشەوە ئەستێرەی وا زەبەللاح هەیە خۆر لە چاویا هیچە، تەنانەت ئەستێرەی (منكب الجوزاء) ئەوەندە گەورەو زەبەللاحە جێگای ملیونەها ئەستێرەی وەکوو خۆری تێدا دەبێتەوە، دەی باشە ئەم ئەستێرانە چەند لە ئێمەوە دوورن؟! لە وەڵامدا دەڵێین: کۆمەڵەی خۆر کە زەویش لەوانە ئەوەندە لە ئەستێرەکانی ترەوە دوورن دەتوانرێ بە گۆشە گیرێکی تەواو حسێب بکرێن لە فەزادا، چونکە دووری خۆر لە ئێمەوە کەمتر لە (٩٣) ملیۆن میلە واتە زیاتر لە چوار صەد جار بەقەی دووری مانگ لە ئێمەوە دوورترە، خۆ کاتێك بمانەوێ رێژەی دووری ئەستێرەکانی تر بزانرێ هەزار ملیۆنیش بەش ناکاو باس ناکرێ، بەڵکوو پێویستە ئەوکاتە قسە لە ملیۆن ملیۆن بکەین، بۆیە زانایانی ئاسمان ناس هاتوون خێرایی روناکییان کردوە بە ئامێری رونکردنەوەو زانینی ئەندازەی دووری نێوان ئەستێرەکان، واشیان تەخمین کردوە کە خێرایی‌و تیژرۆیی روناکی لە چرکەیەکدا (١٨٦,٠٠٠) میلە، دورترین ئەستێرەی گەرۆك کە ناوی بلۆتۆنەو سەر بە کۆمەڵەی خۆرە روناکی ئەومان بە چوار پێنج سەعات دەگاتی لە کاتێکا گەیشتنی روناکی لە نزیکترین ئەستێرەی کۆمەڵە ئەستێرەی ترەوە چوار پێنج ساڵ دەخایەنێ.

پێشکەوتوترین ئامێری دووربینو وێنە گرتن تا ئەمڕۆ هەر دەتوانێ ئەو ئەستێرانە ببینێ کە دوو هەزار ملیۆن ساڵی روناکی لە ئێمەوە دوورن. ئەوەش زانراوە کە کۆمەڵە ئەستێرەی سەر بە خۆر بە هێواشی بە دەوری تەوەرە (میحوەری) خۆیاندا دەسوڕێنەوە هەروەها کۆمەڵە ئەستێرەی تریش هەمان سوڕانەوەو جوڵانەوەیان هەیە.

کەوابوو هەبوونی ئەم هەموو بلوێنە ئەستێرەیەو دابەش کردنیان بەو شێوە رێكو پێکەو هەڵسوڕانو هاتوو چۆیان بە گوێرەی نیزامو یاسایەکی دیاری کراوی وا کە بەهیچ جۆرێك لێك نەخشێنو دەعم نەکەنو بەری رێگا بە یەکتری نەگرن ئائەمانە هەمووی گەورەترین بەڵگەیە لەسەر هەبوونی خوایەکی خاوەن دەسەڵاتی بێ هاوبەشو بێ هاوتا کە هیچ بەڵگەیەکی تر نایگاتێ هەر بۆیەشە قورئان دەفەرموێ:

{فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ} (٧٥) سورة الواقعة:

واتە: سوێند دەخۆم بە روانگەو بەجێی هەڵاتنو شوێنی هاتوچۆی ئەستێرەکان، کە گەورەترین نیشانەن لەسەر دەسەڵاتی خوا، ئەم سوێندە ئەگەر بزانن و تێ بفکرن سوێندێکی زۆر گەورەیە، دیارە گەورەیی سوێندەکە لەبەر گەورەیی سوێن پی خوراوەکەیە کە مەنزڵو بورجی بلیۆنەها ئەستێرەیە جا ئەگەر تۆزێك بە وردی سەیری رستەی (لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ) بکەین دەبینین کە ئەم رستەیە باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە قورئان نیگای خوایە چونکە مانای تەواوی ئەم رستەیەی قورئان تەنها زانایانی ئاسمان ناسی دەیزانن و تێی گەیشتونو لە نهێنیو ئاماژە کردنی قورئان بۆ ئەم لایەنە حاڵی بوون، ئەویش دوای پەیدابوونی دووربینی پێشکەوتوو کە بەهۆی ئەوەوە زۆر نهێنی بونەوەر دۆزراوەتەوەو زانراوە..!!

ئەنشتاین دەڵێ: (لەگەڵ هەست بە هیچو پووچی خۆما)، ئەو گیانە هەرە بەرزە بی سنوورو بی پایانەم گەڵێ بەدڵە کە گەڵێ جار لە پشت پەردەی غەیبەوە

شەوقیَ دەداو هەندیَ جار درێژە پێدانی کەم وەدەردەخا کەبیرو هۆشی کۆڵی ئێمە دەتوانیَ پەی پیَ ببا، ئیتر ئەم بڕوایە کە لە قووڵایی دڵو دەروونما ڕەگو ڕیشەی داکوتاوە لەگەڵ باوەڕ بە هەبوونی هێزێکی زاناو دانای باڵادا کە دەتوانین لەناو ئاوێنەی ئەم بونەوەرە ئەفسووناوییەدا هەستی پی بکەین.. ئائەمە بوو بە دەستە چرای من بۆ بیرو باوەڕم لە بارەی خودا وەندەوە!.

دوکتۆر (ماریت ستانلی کونجدن) دەڵیَ: هەرچی لە بونەوەردا هەیە شایەتی دەدا لەسەر هەبوونی خواو بەڵگەیە لەسەر دەسەڵاتو گەورەیی ئەو زاتە کاتێکیش ئێمەی پسپۆرو شیکەرەوەی دیاردەکانی سروشت لێکۆڵینەوە لە بونەوەردا ئەنجام دەدەین لە هەموو شتێکدا هەست بە شاکاری دەسەڵاتو قودرەتی خوا دەکەینو گەورەیی ئەو زاتەمان بۆ دەردەکەویَ...

دەی باشە بۆ پێویست نییە لەسەر ئێمە لە کاتێکا بیر لە چەندو چۆنی ئەم کەونە دەکەینەوە، بڕوایەکی قایمو پتەو بە خوایەکی دروستکەری بەهێزو توانا بهێنین، کە لە قەناعەتی عەقڵو بەڵگەی زانستییەوە بنەوانی هەڵگرتبیَ وە هەردەمو هەرکات ئەم ئایەتە پیرۆزە بکەین بە دروشمی سەر زارمان.

{إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُوْلِي الألْبَابِ، الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىَ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً} (١٩٠) سورة آل عمران:

واتە: بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکانو زەویدا لە هاتوچۆو پەیدابوونی شەوو ڕۆژدا چەند بەڵگەی بەهێزو پێز هەن لەسەر خوایەتی خوا، ئەوانەی خاوەن عەقڵو فامن هەستی پیَ دەکەن، ئەوانەی هەردەم یادی خوا دەکەنو خوایان لەبیر ناچێتەوە، بە ڕاوەستانەوە بە دانیشتنەوە بە ڕاکشانەوە لەسەر تەنیشت لەسەر هەموو حاڵیَ، هەردەم سەرنج لە دروستکردنی ئاسمانەکانو زەوی دەدەنو بیر لە دیاردەکانیان دەکەنەوە دەڵێن: پەروەردگارا! تۆ ئەمەت بەبی هودە دروست نەکردووە!؟!.

## شەوو رۆژ، خۆرو مانگ، بەڵـگەن لەسەر هەبوونی خوا:

قورئان دەفەرموێ:

**{وَمِنْ آيَاتِهِ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ لَا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ} (٣٧) سورة فصلت:**

واتـە: برێـك لـە بەڵـگەو نیـشانەی خوایـەتی خـوا پەیـدابوونی شـەوو رۆژە، هاتوو چۆی خـۆرو مانگە، سوڕانەوەی ئەسـتێرەکانە کەوابوو ئێـوە خـۆرو مـانگ مەپەرستن‌و سەری بەندەگییان بۆ مەخەنە سـەر عـەرز بەڵـکوو سـوجدە بـۆ ئـەو خوایە بەرن کە دروستی کردوون ئەگەر ئێوە لە راستیدا خوا دەپەرستن.

جـا وەکـوو ئاشـکرایە گـۆڕانی شـەوو رۆژ بـەهۆی سـوڕانەوەی زەوییـەوە بـە دەوری خۆیدا پەیدا دەبێ دیارە سورانەوەی زەویش خـۆی لـە خۆیـدا بەڵـگەیەکی بەهێزە لەسەر هەبوونی خوا لـەم روەوە کـە ئەوەنـدە سـوڕانەوەکەی رێـك‌و پێکـە ساڵەهای ساڵ چرکەیەك زیادو کەم ناکاو تۆزقاڵێك پـاش‌و پـێش ناکـا، لـە کاتێکـدا سەعاتێکی دروستکراو لە مەعدەنێك کە سەنگی چەند غرامێك دەبێ شەوو رۆژی چەند چرکەیەك پاش‌و پێش دەکاو کەچی لەگەڵ ئەوەشدا پێی دەڵێن سـەعاتێکی مەزبووتـە! دەی باشـە کـورەی زەوی کـە ئـەو قـەبارە گەورەیـەی هەیـەو سـەنگی ملیۆنـەها بلیۆنـەها تەنـەو مـەلایین سـاڵە دەسـوڕێتەوە کەچـی هێـشتا هـیچ رۆژێ چرکەیەکی پاش‌و پێش نەکردوە، تەنانەت ئەو جیاوازییە کەمەی کە دەشیبێ بـۆ مەبەستێکەو حیسابێکی تایبەتی تێدایە بە هەڵەو پاش‌و پێش ناژمێررێ.

لەلایەکی ترەوە سوڕانەوەی زەوی دەورێکی گەورەی هەیە بۆ بەردەوامی ژیان لەسەر روبەری زەوی، چونکە ئەگەر ئـەم سـوڕانەوەی زەوییـە بـەم رێـك‌و پێکییـە نەبوایە دەریاکان ئاویان تێدا نەدەما یان ئەگەر زەوی خێراتر بسوڕایەوە کۆشـك‌و تەلاری سەر زەوی لێك هەڵدەوەشان‌و تێك دەروخان، ئەگەر هێـدی تـر بـسوڕایەوە ئەوکاتە چی لەسەر زەوی هەیە یان لە سەرمان یان لە گەرما دەفەوتا، یـا هـەر لـە بنەڕەتا نەدەبوون.

قورئـانی پـیرۆز بـە ئایـەتێك ئامـاژە بـۆ ئـەو سـوڕانەوە رێـكو پێكـە دەكـاو دەفەرموێ:

**{وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ} (٨٨) سورة النمل:**

واتە: تۆ كێوان دەبینی پێت وایە راوەستاون بەلام لە راستیدا وەكوو هەور لـە گـەڕدانو دێـنو دەچـن، ئەمـە شـاكاری خوایـەكی وایـە كـە هـەموو كـارێكی رێـكو پێكو بێ خەوشـە.. پـەروەردگار لێـرەدا سوڕانەوەی زەوی بـە رۆیـشتنی كێوەكـان دەردەخا لەم رووەوە كە كێوەكان دیاری ترین نیشانەی سـەر زەویـنو وەكـوو بزمـار لە زەوی چەقیون خۆریش بۆ خۆی نیشانەیەكی هەرە گەورەیـە لەسـەر هـەبوونی خوا، دەبینین پەروەردگار رامی كردوە بۆ بـەردەوام بـوونی ژیـانی هـەموو شـتێكی سەر زەوی لە ئاژەڵو مرۆڤو رووەكو دارو درەخت؟

جـا لێـرەدا پرسـیارێك دێتـە پێـشەوەو دەگـوترێ: خـۆر ئـەم هـەموو وزەیـەی خۆی لە كوێ دێنێ؟! خۆ ئەگەر لە گەنجینەی خۆیەوە بیـدا دەبوایـە بـە درێـژایی ئەم ملیۆنەها ساڵە ساڵ لەدوای ساڵ پلەی گەرمای نزم ببوایەتـەوە وزەی بـێ هێـز ببوایە، ئیتر ئەوكاتە تەمەنی خۆر كورت دەبوو زوو لـە ئـیش دەكـەوت: لەلایـەكی تـرەوە دەبیـنین لـە دێـر زەمانـەوە خـۆر وزەی خـۆی بـە زەوی دەبەخـشێو بـەو دەستوورو یاساو نیزامەی بۆی دانراوە نە زیاد دەكا نە كەم بـە شـێوەیەك ئـاژەڵو رووەكو مرۆڤ پێی گەشو نما دەكەنو پێـی دەژیـنو هیچیـشی لێ كـەم نابێتـەوە، كەوابوو دەبێ شتێك هەبێ تەزویدی خـۆر بكـا بـەو وزەی كـە لێـی كـەم دەبێتـەوە هـەتا بتوانـێ بـەردەوام بـە ئەنـدازەی پێویـست وزەی خـۆی بـداو لـەو ئەنـدازەی پێویستە زیادو كەم نەبێ، چونكە ئەگەر گەرمییەكەی زیـاد بـێ شـت دەسـوتێنێ كەم بـێ شـت دەیبەسـتێ!! پـەروەردگار مانگیـشی بـۆ ئێمـە رام كـردوە بـۆ خـاتری حیـسابی خۆمـانی پـێ بكـەینو بـە شـەویش چـرای ڕوناكمانـەو هـۆی پـەروەردە بوونی روەكو دارو درەختەو پێویستی ژیانی مرۆڤو ئاژەڵە، دەی باشە چۆن ئـەم

کرداره ئەم نەخش و نیگاره ئەم هێزو دەسەلاتە بەبێ هوودە دروستکراوە؟!!.
دیاره ئەمەش باشترین بەڵگەیە لەسەر خوایەتی خواو دەسەلاتو هێزو تواناى:

نەخش و نیگاری فەرشی کاشانی
گەرچی بە راستی تۆ گەلی جوانی
لە چاورەنگامەی نەخشی یەزدانی
حەسیرە شڕی گوێی ئاگردانی
هەردوو دیویی بوون دەرەوەو ناوی
نەخشاوی بەتابلۆی پڕ ئەفسوناوی
ئاشکرا دەلێی خەتی نووسراوی:
خواوەندی هەیە یەزدانە ناوی

## ڕێك و پێكی و هەبوونی نەخشە لە سروشت دا:

زاناى بەناوبانگ (کریسی موریسون) دەڵێ سەیرکردنی شتە عەجائیبەکانی سروشتو ڕانواندنیان ئەوە دەگەیەنن کە لە سروشتدا نەخشەو بەرنامەیەکی ڕێكو پێك هەیەو ڕۆژانە تەنفیز دەکریو بە گوێرەی ویستی خوا ئەنجام دەدرێ.؟! ناوبراو درێژە بە باسەکە دەداو دەڵێ: قەبارەی زەویو ئەندازەی دووری لە خۆرو پلەی گەرمایی زەوی یان ئەستورایی توێکڵی زەویو چەندییەتی ئاو تێیدا هەروەها ئەندازەی دووەم ئۆکسیدی کاربۆنیو قەبارەی نیترۆجینی، یان پەیدابوونی مرۆڤ لەسەر زەویو بەردەوامی ژیانو درێژە پێدانی هەموو ئەمانە ئەوە دەگەیەنن کە یاسای بونەوەر گەڕە لاوژێ نیەو هەرەمەکی دروست نەبووە، بەڵکوو بە گوێرەی نەخشەو پڕۆژە وەدی هاتووەو دروستکەرێك بەدی هێناوە!!!؟

شایانی باسە قورئانی پیرۆز لەچەند شوێنێکا ئاماژەی بۆ ئەم نەخشەو پڕۆژەیە کردووەو دەفەرموێ:

{إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنزَلَ اللّهُ مِنَ السَّمَاء مِن مَّاء فَأَحْيَا بِهِ الأرْضَ بَعْدَ

**مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخِّرِ بَيْنَ السَّمَاء وَالأَرْضِ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ} (١٦٤) سورة البقرة:**

**واتە: بە راستی لە دروستکردنی ئاسمانو زەویدا لە گۆڕانی شەوو رۆژدا لە هاتوچۆی گەمیو کەشتیدا بەناو دەریادا کە چۆنو بەهاسانی مەردووم خۆیانو تفاقیان هەڵدەگریو لە شوێنێکەوە دەیان گوێزێتەوە بۆ شوێنێکی ترو دەبێ بە مایەی سودو قازانج، هەروەها لە باراندنی باراندا کە لەلای ئاسمانەوە دەباریٚ دارو درەختو رووەکی پێ زیندو دەبێتەوە کە لەوە پێش وشك بوو بوونو زەوی دەتوت لاشەی مردووە، هەروەها لە بڵاوکردنەوەی ئەو هەموو زیندەوەرەدا کە پەخشو پرشن لەناو زەویدا هەروەها لە هەڵسوڕانو گۆڕانی بادا، کە جاریٚ لە باشورەوە دەوەزیٚو جاریٚ لە باکورەوە، یا جاریٚ گەرمە، جاریٚ ساردە، دەمیٚ نەرمە بایە، سروەیە، شەماڵە، دەمیٚ رەشەبایە، گەردەلوولە، هەروەها لە راگرتنی هەور لە نێوان ئاسمانو زەویدا، ئەمانە هەموو بەڵگەن لەسەر هەبوونی خوایەکی زاناو دانا، کار دروستو کار ساز.**

**بڕوانە زەویو شێوەی هێلکەیی چۆن لە فەزادا بە دەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە بەو هۆیەوە شەوو رۆژ پەیدا دەبن زیاد لەمەش ئەم سوڕانەوەی زەوییە دەبێتە هۆی هەڵستانی (با) بایش بە دەوری خۆی هەڵمی ئاو لە دەریاکانەوە دەبا بۆ ناو کیشوەرەکان ئەمجار ئەم هەڵمە بەرزە پەست دەبیٚو دەبێتە باران بارانیش بۆ خۆی سەرچاوەی ئاوی شیرینە ئەگەر ئەم ئاوە نەبوایە زەوی روتەنێکی کاکی بە کاکی دەبوو شوێنەواری ژیانی لێ نەدەبینرا. ئەوەش لەیاد نەکەین کە پەروەردگار چەند عونسورێکی تەرخان کردوە رووەكو دارو درەخت هەڵی دەمژیٚو بە گۆڕانکاری کیمیاوی دەگۆڕێن بە چەند شێوە خۆراكو خۆرشت کە هەموو کات زیندەوەر پێویستی پێیانە تا ئەمانە چەند راستییەکی زانستین دەربارەی نهێنی ژیان لەسەر ئەم زەوییە..**

دەی باشە ئەوە قورئـانی پـیرۆز پـێش چوارده سـەدە روونـی کردۆتـەوەو رای گەیانــدووە کــە لــەم بونــەوەرەدا نەخــشەو پــرۆژە هەیــەو پەیوەنــدی نێــوان عونصورەکانی زەوی زۆر بەهێزە هەموویان دەبنە بەڵگە لەسەر خوایەتی خوا بە تایبەتی بۆ کەسانێك کە عاقڵ مەندو خاوەن بیرو هۆش بن..

لە شوێنێکی تردا قورئان باسی دەسەڵاتی خوای گەورە دەکاو دەفەرموێ:

{وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْهَاراً وَمِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ} (٣) سـورة الرعد:

واتە: پەروەردگار خوایەکی ئـەو تۆیـە زەوی راخـستووە هەرچـەندە خـۆی لـە خۆیدا هێلکەییـە...، ئـەمجارە کێوەکـانی تێـدا کـردوون بـە لەنگـەرو نـاهێڵن زەوی زیاتر لـە ئەنـدازەی پێویـستی خـۆی بجوڵێتـەوە، هـەروەها چۆمو جۆگـەو دەریـای تێدا بەدی هێناون، لە هەموو بەروبوومو میوەیەکیش دوو جۆرو زیاتری دروست کردوە، بۆنموونە ترشو شیرین رەشو سپی نێرو مێ...تاد. شـایانی باسـە زانـستی تازە دەری خستووە کە هەموو گوڵو رووەکێك نێرومێیان هەیە. لەلایـەکی تـرەوە شـەو ئـەهێنێ بەسـەر رۆژداو دای دەپۆشـێو لـە جیـاتی رونـاکی تـاریکی دەسـت پێدەکا بەراستی لەم گۆڕانکاریو دیـاردە سـەیرانەدا بەڵـگەی بـەهێز هـەن لەسـەر خوایەتی خوا بە تایبەت بۆ کەسانێك کە تێفکرنو بیر بکەنەوە. وشـەی (رَوَاسِـيَ) لە ئایەتەکەدا بە مانای کێوەکانە وا دەبێ مرۆی بێ هۆشو بـیر دەڵـێ ئـەم کێوانـە زیادەنو زەوی پێویستی پێیان نییە، بەڵام ئەگـەر ئێمـە بـە چاوێکی وردبینیـەوە سەیر بکەین دەبینین ئەم کێوانە زیاد لە راگرتنی ئـەرز چـەند سـوودو قازانجیـان بۆ ژیانی مـرۆڤ هەیـە بـۆ نموونـە بـەفر دەبـارێو دەکەوێتـە سـەریانو وردە وردە دەتوێتەوەو لە کێوەکاندا دەبێتـە عـەمباراوو لـە خـوارەوە هـەڵ دەقوڵـێو دەبێتـە جۆگەو روبار، مرۆڤ سوودی لێ دەبینێ هەر بەهۆی ئاوەوە چـەندەها جـۆر میـوەو خۆراك پەیدا دەبێ.

وەکوو ئاشکرایە پەیدا بوونی دارو درەختو بەروو بوومی خۆراکیو گەشو نماکردنیان پێویستی بەگۆڕانی شەوو ڕۆژ هەیە، لە هەمان کاتدا دەبێ ماوەی هەریەکێ لە شەوو ڕۆژ بە ئەندازەیەکی تایبەتی بێ، کەوابوو ئەگەر ڕۆژ درێژتر بوایە یان شەو درێژتر بوایە ئەوکاتە یان خۆر دنیای دەسوتاند یان سەرما هەموو شتێکی دەبەستو هیچ ڕووەکێك نەشو نمای نەدەکرد، سەر زەوی یان دەبوو بە بیابانێکی وشكو برینگ یان دەبوو بە زوقمو سەهۆڵ بەندان، ئەمەش ڕاستییەکی عیلمییەو قورئانی پیرۆز چەند جار ئاماژەی بۆ کردووەو ئەوە دەگەیەنێ کە ڕێخستنی ئەم بونەوەرە دەسەڵاتێك ڕێکی خستووەو ئاڵو گۆڕی تێدا دەکا.

یەکێکی تر لە بەڵگەی خوایەتی خوا ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە دەفەرموێ:

{وَمِنْ آيَاتِهِ يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاء مَاء فَيُحْيِي بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ} (٢٤) سورة الروم:

واتە: بەڵگەیەکی تر لەسەر خوایەتی خوا ئەوەیە کە بروسکەتان پیشان دەداو هیوای بارانتان پێیەتیو لێشی دەترسن، بارانتان لە ئاسمانەوە بۆ دەبارێنێو زەوی پێ زیندو دەکاتەوە لە دوای پوشپەڕو گەڵا ڕێزانو ڕوتبوونی زەوی سەر لەنوێ دار چرۆ دەکاتەوەو گەڵای شین دەبێتەوە ڕووەك شین دەبێتەوە دونیا بە گوڵو گوڵزار دەڕازێتەوە، بەڕاستی ئەمانە هەموو بەڵگەو نیشانەن بۆ کەسانێك عەقڵو بیرو هۆشیان هەبێ. جا لێرەدا پرسیارێك سەر هەڵ دەداو دەگوترێ: چ پەیوەندییەك لە نێوان هەورە بروسکەو باران بارینو زیندو کردنەوەی زەویدا هەیە؟! ئایا ژیانی زەوی تەنها پێویستی بە ئاو هەیەو بەس؟! نەخەیر بەڵکوو لێرەدا عونصورێکی سەرەکی هەیە بۆ گەشەو نماکردنی ڕووەك ئەویش گازی نیترۆجینە کە بەبێ ئەندازەیەك لەو گازە مومکین نیە هیچ ڕووەکێك گەشو نما بکا.

جا لێرەدا دوو ڕێگا هەیە کە گازی نیترۆجین بچێتە نێو زەویو کشتو کاڵییەوە.

رێگەی یەکەمیان هەورە بروسکەیە هەر کاتێك هەورە بروسکە لێ بدا کەمێك نیترۆجین‌و ئۆکسجین یەك دەکەون‌و دەبنە نیترۆجینی تێکەڵاو لەگەڵ بارینی باراندا دەکەونە سەر زەوی.

رێگەی دووەمیان بەهۆی بەکتریای تایبەتی کە لە رەگ‌و ریشاڵی رووەکدا هەیە، ئەم جرثومە بەکتریایانە غازی نیترۆجینی هەوا هەڵدەمژن‌و دەیگۆڕن بە نیترۆجینی تێکەڵاو کاتێ ئەم رووەکە وشك دەبێ دەرزێ بڕێ لەم گازی نیترۆجینە تێکەڵاوە تێکەڵاو بە زەوی دەبێ‌و هێزو پێزی گەشەکردنی رووەك دەدا بە زەوی.

کەوابوو باسکردنی بروسکە لە ئایەتەکەداو هێنانی باسی باران بە شوێنیداو باسی زیندوکردنەوەی زەوی پەیوەندییەکی زۆر بەهێزیان هەیەو راستییەکی زانستین‌و قورئان پێش چواردە سەدە ئاماژەی بۆ کردوون کەوابوو هەر بروسکە خۆی لە خۆیدا بەڵگەیەکی هەرە گەورەیە لەسەر هەبوونی تەصمیم‌و نەخشەو پرۆژەی رێك‌و پێك لە بونەوەردا هەمووشیان شاکاری دەستی قودرەتی پەروەردگارن.

## خانە زیندووەکان بەڵگەن لەسەر هەبوونی خوا:

قورئانی پیرۆز دەفەرموێ:

{إِنَّ اللّهَ فَالِقُ الْحَبِّ وَالنَّوَى يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ الْمَيِّتِ مِنَ الْحَيِّ ذَلِكُمُ اللّهُ فَأَنَّى تُؤْفَكُونَ} (٩٥) سورة الأنعام.

واتە: خوای گەورە دانەوێڵەو ناوك لەژێر زەویدا دەقڵیشێنێ‌و چەکەرەی پێدەکا، زیندو لە مردوو دەردەهێنێ‌و مردوو لە زیندو ئیجاد دەکا، ئەوەی ئەو کردارانە ئەنجام دەدا خوای پەروەردگارە کەوابوو ئێوە چۆن لە حەق‌و راستی لادەدەن‌و چاوێ خۆتانی لێ دەنوقێنن.

یان دەفەرموێ:

{إِنَّ اللّهَ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ يُحْيِي وَيُمِيتُ} (١١٦) سورة التوبة:

واتە: پەروەردگار خوایەکی وایە هەرچی ملّك و سەلّتەنەتی ئاسمان و زەوی هەیە هەمووی هی خۆیەتی کەس رادەی ناکەوێ ببێتە هاوبەشی، مردن و ژیان بە دەستی خۆیەتی، جا ئەگەر هەموو ماددەیەك پارچەیەکی سەرەکی هەبیو بریتیبێ لەو بەشانەی لێی پێك هاتووە، ئەوا مادە زیندوەکان لە سادەترین شێوەو، تا وردەکاری ترین شێوە هەموویان پێك هاتوون لە خانەی زیندو (الخلايا الحية) خانەی زیندوش بۆ خۆی بریتییە لە پارچەیەکی هەرە بچکۆلە کە ماددەی ژیانی تێدا بێ هەر بەهۆی ئەو خانە زیندوانەوەیە: کە ژیان لە زیندەوەری بچوك و گەورەدا بەدی دێ شایانی باسە کە هەموو خانەیەکی زیندو ئەرکی جۆراو جۆری خۆی بەو پەڕی رێك و پێکی ئەنجام دەدا تەنانەت پێشکەوتو ترین سەعات و کۆمپیوتەرو ئامێری ژماردن ناتوانن ئاوا ئەرکی سەر شانی خۆیان ئەنجام بدەن، ئەم پارچە بچکۆلە (خانە زیندووە) پێی دەگوترێ (پرۆتۆپلازم).

دکتۆر ولیەم سینرتیز لە پێناسەی ئەم پارچەیەدا دەڵێ: ئەو پارچە بچکۆلە زیندووە کە پێی دەگوترێ پرۆتۆپلازم تێکەلّاو کراوێکی سەیرەو پێك هاتووە لە ئاوو خوێ و شەکرو رۆن و پرۆتین لەم پارچە زیندووە تێکەلّاوە ژیان دروست دەبێ، هەموو رووەك و زیندەوەرێك لە (پرۆتۆپلازم) پێك هاتووە (پرۆتۆپلازم)ی رووەك و زیندەوەر هەمووی لێك دەچن، بەلّام سەد دەر سەد لێك ناچن جیاوازییەکی کەم تا کورتیان لە نێواندا هەیە، ئەم جیاوازییانەش جیاوازییەکی سەرەکین لەم رووەوە کە هێلکەی مراویی دەبێتە مراوی و ناوکی هەرمێ دەبێتە هەرمێ دەنکە شووتی دەبێتە شووتی جا ئەم جیاوازییانە هەرچەندە لە راستیدا زۆرن و سەرەکین بەلّام لە ئێمە نادیارن و هەستیان پێ ناکەین، چونکە یەکێ لە هەرە یاسا سەرەکیەکانی زانستی ژیانداری ئەوەیە کە هەموو جۆرەکانی (پرۆتۆپلازم) هەر چۆنێك بن کانزاکەیان لە ئێمە نادیارە بەلّام بەرواڵەت لە

یەکتر دەچن‌و لە شێوەی سپێنی هێلکەدا خۆیان دەنوێنن نوختەی ورد وردی تێدا دەبینرێن.

دکتۆر (رسل تشارلز آرنست) دەڵێ: من بڕوام وایە هەموو خانەیەك لە خانە زیندوەکان ئەوەندە وردەکاری تێدایە ئێمە ناتوانین تێیان بگەین وە ئەم هەموو مەلایین مەلایین خانە زیندوانەی سەر زەوی شایەتی لەسەر بە دەسەڵاتی خوا دەدەن، شایەتیەك کە پشت بە فکرو مەنتیقەوە ببەستێ لەبەر ئەوە من بڕوایەکی پتەوم بە هەبوونی خوا هەیە.

## دروستبوونی رووەك بەڵگەیە لەسەر هەبوونی خوا:

بڕێ لەو بەڵگانەی هەبوونی خوا دەچەسپێنن ئەو گیاوو گژە جۆراو جۆرەیە کە عەرد دەیڕوێنێ‌و جۆرەها دانەوێڵەو میوەجاتی لێ پەیدا دەبێ.

خوا دەفەرموێ:

{وَهُوَ الَّذِيَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَأَخْرَجْنَا بِهِ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا وَمِنَ النَّخْلِ مِن طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّاتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ وَالزَّيْتُونَ وَالرُّمَّانَ مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَابِهٍ انظُرُواْ إِلِى ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ وَيَنْعِهِ إِنَّ فِي ذَلِكُمْ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ} (٩٩) سورة الأنعام:

واتە: خوا ئەو خوایەیە کە باران لە ئاسمانەوە دەبارێنێ‌و زەوی پێ زیندو دەکاتەوە، ئەمجار بەو بارانە هەموو جۆرە گیاو رووەکێکمان بۆ رواندون، جۆرە گیاو رووەکێکی سەوزمان بۆ رواندون کە لە کاتی پێگەیشتنا چەند دانەوێڵەیەکی چین لەسەر چینی بە سوودی لێ دەردەکەین‌و دەیکەین بە ژێواری ئادەمیزاد. هەروەها لە دارخورما هێشوو دەردەکەین‌و خورمای لێ پەیدا دەبێ‌و هێشوەکانیشی یەکە یەکە شۆڕ دەبنەوە هەروەها چەند باخێکمان دروست کردوە کە بە داری مێوو دار زەیتوون‌و دار هەنار رازاوەتەوە ئەم دارانە بازێکیان لە

قەبارەو رەنگدا لێك دەچن بەڵام لە تامو بەرامدا لێك ناچن دەی ئێوە بە چاوێکی وردبینەوە سەیری میوەو بەروبومیان بکەن بڕوانن چۆن هێندێکیان لە بارنو بەرێکی باش دەگرن بەڵام لە سەرەتاوە بەرەکەیان کاڵو کرچو تورتو تاڵەو خەریکە بە کەڵکی هیچ نەیە، کەچی لەپاشا خۆشو باش باش دەبیٚو دەبیٚ بە سەرچاوەی خێرو خۆشی. سەیر لەوەدایە کە ئەم هەموو دارو درەختە جیا جیایە کە هەریەکەی لە رەنگێکەو هەریەکەی تامیٚ دەداو خاوەنی بۆنێکی تایبەتییە لە یەك ئاو دەخۆنەوەو لە یەك خاك دەڕوێن.

خوێنەری بەڕێز سەیری ئەم رستەی ئایەتە بکە: کە دەفەرمویٚ: (**فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا**) کە راستەوخۆ ئەوە دەچەسپێنیٚ کە پەروەردگار دانەوێڵەو ناوكو بەری درەختی لە پەلکی سەوز دەرهێناوە ئەمەش راستییەکی زانستییە دوای چواردە سەدە زانست دەری خست کە رووەكو دارو درەخت بەهۆی خانەی پەلکە گەڵا سەوزەکانیانەوە خۆراك وەردەگرن تەنانەت پێشکەوتوترین کارگەی سەردەمی ئەمڕۆ ناتوانیٚ ئەو ئاڵو گۆڕو تاو تویٚیەی پەلکە گەڵا داریٚ دەیکا بە رێكو پێکی خۆراك بۆ دارەکەو بەروبومەکەی دەبا ئەم لەباتی ئەو گەڵایە ئەو ئەرکە ئەنجام بدا! ئەمجار قورئان دێتە سەر بەیانکردنی جیاوازی تامو بۆنو بەرامی میوەکانو دەفەرمویٚ:

**{وَفِي الأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجَاوِرَاتٌ وَجَنَّاتٌ مِّنْ أَعْنَابٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَى بِمَاء وَاحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ فِي الأُكُلِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ} (٤) سورة الرعد:**

واتە: بڕوانن چۆن چۆنی پارچە زەوی جیا جیا لە پاڵ یەکدان پارچەییٚ بە پێزە، پارچەییٚ شۆڕەکاتە، پارچەییٚ دەشتە، یەکی تر شاخە، هەروەها دێبەرو باخو رەزەتریٚو باخە خورماو سەوزاییو شینایی جیا جیا لەسەر ئەم عەردە رووانو لە ئاوێك ئاو دەدرێن کەچی تامو بەرامی هێندێکیانمان لەهی هێندێکیان

خۆشتر کردوە ئەمەش بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر خوایەتی خوا بە تایبەتی بۆ کەسانێك خاوەن هەست بن.

جارێکی تر قورئان سەرنجی مرۆڤ رادەکێشێ بۆ ئەوەی تێ بفکرن لە رەنگی گوڵو گوڵزاری سەر زەویو دەفەرموێ:

{أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَسَلَكَهُ يَنَابِيعَ فِي الْأَرْضِ ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا مُّخْتَلِفًا أَلْوَانُهُ} (٢١) سورة الزمر:

واتە: ئایا نابینی خوای گەورە چۆن لە ئاسمانەوە ئاو دەڕژێنێتە سەر زەویو ئەمجار بەناو درزو بۆشایی دا رۆدەچێو لە دەشتو دۆڵو شاخەکان دەبێتە کانیاوو جۆگەو جۆبار ئەمجار بەهۆی ئەم ئاوەوە کشتو کاڵ دەڕوێنێو جیهان بە شینایيو سەوزایی گوڵو گوڵزاری جیا جیا هەرداری بە شێوەیێ هەر گوڵێ رەنگێ هەر میوەیێ تامێ بۆنێ، گشت شتێکیان جودایە بەس خودایان یەکە!! لە شوێنێکی تردا قورئان هەبوونی نێرو مێی لەناو رووەكو گوڵو گوڵزارو دارو درەختدا دەکاتە بەڵگە لەسەر هەبوونی خوا چونکە برێ گیاو گژ هەیە بۆ خۆی خۆی موتوربە دەکاو برێکی تریان تۆوەکەی بەهۆی هەواوە یان باڵندەوە لە رووەکێکی ترەوە بۆ دێ. قورئان دەفەرموێ:

{أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الْأَرْضِ كَمْ أَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ} (٧ - ٨) سورة الشعراء:

واتە: ئەوە ئەو بێ بڕوایانە بۆ سەیری سەر زەوی ناکەن کە ئێمە بە قودرەتی خۆمان چەندەها جووت رووەکمان تێدا رواندوە هەموویان بەڵگەن لەسەر زانایيو دانایيو بە دەسەڵاتی پەروەردگار بە راستی لەم رواندنو پەروەردەکردنەدا بەڵگەی بەهێز هەن بۆئەوەی ئیمان بێننو روبکەنە خوا کەچی زۆر لەو خوا نەناسانە بڕوا ناهێننو نایەنە سەر رێگای راست...

دکتۆر (لستر جون زمرمان) دەڵێ: گەشەکردنی رووەك وەنەبێ هەر بەهۆی روناکيو شتە کیمیاویەکانو ئاوو هەواوەبێ بەڵکوو پێویستە بۆئەوەی رووەکە

چەکەرەو گەشە بکا دەبێ هێزێك هەبێ لەناو تۆمەکە لەکاتی لەبارداو وەختی تاوتوێکەو گۆڕانکاری کیمیاویدا پاڵ بە عونصورەکانەوە بنێ تا بە شێوەیەکی رێك و پێك کاری خۆیان ئەنجام بدەن.

شایانی باسە کە تۆم (البذرة) لە دوو شانەی زەرەبین (میجهەری) پەیدا دەبێ هەریەکێ لەم خانانە بەهۆی عەمەلییاتی کیمیاوییەوە لەچەند عونسورێك پەیدا دەبن جا ئەم تۆمەیە چەکەرە دەکاو شین دەبێ. چەند دانەوێڵەیەك لە چەشنی تۆمەکە بەدی دێ. ئەوەش لەیاد نەکەین کە هەرچەند رووەکەکان یان دانەوێڵەکان بە رواڵەت لێك بچن بەلام لە راستیدا هەریەکەیان جیاوازی لەگەڵ ئەوی تردا هەیە.

جا لە کاتێکدا رووەکە رەسەنەکان جیاوازیو کەسایەتی خۆیان هەیە دەبینین لە برێ ئاکارو صیفاتدا هەموویان هاوبەشن، بۆ نموونە هەموویان بەهۆی رووناکی لە سیانە ئۆکسیدی کاربۆنو ئاوەوە مەوادای غیزائی دروست دەکەن زوربەیان لە تۆمو رەگو ریشاڵو پەلکە گەلاو لقو پۆپو گوڵو چرۆدا تا ئەندازەیەك لێك دەچن هەموویان حەزیان لە رووناکییەو بە نەبوونی رووناکی دەمرن هەموویان پێویستیان بە ئۆکسجین هەیە ئەگەر نەبوو ناژیەن... هتد.

دەی باشە ئەم رووەکانە کێ دروستی کردوونو ئەم یاسایانەی بۆ داناون کە هەریەکێ لەم یاسایانە دەوری خۆی هەیە لە دروست بوونو گەشەکردنی رووەکەکاندا بەڵکوو ئەم پرسیارە رامان دەکێشێ بۆ پرسیارێکی سەیر ترو وردتر، ئەویش ئەوەیە ئایا لە سەرەتادا رووەکەکان چۆن پەیدا بوونو لە کوێوە هاتوون؟! بە راستی ئێمە ناتوانین بڵێین ئەم رووەکانە خۆیان خۆیانیان دروست کردوە، یان بە سودفە پەیدا بوون بەڵکوو پێویستە دان بەوەدا بنێین کە خالقێك دروستکەرێك ئەم یاسایانەی بۆ داناون کەوابوو بروا بە هەبوونی خوا شتێکی زانستییەو عەقڵمان لەسەرمان فەرز دەکا.

## خانەکانی رەچەڵەك بەڵــگەن لەسەر هەبوونی خوا:

شتێکی ئاشکرایە کە بۆئـەوەی ژیـانێکی تـازە بـۆ مرۆڤێـك بێتـەدی پێویـستە دوو خانــە تــۆمی جیــاوازی خــاوەن دیــاردەی تایبــەتی تێکــەڵ بــە یــەکتری بــبن یەکێکیان هی نێرینەیەو یەکێکیان هی مێینەیە.

قورئانی پیرۆزیش پێش هەزارو چوارسەدو ئەوەندە ساڵ سەرنجی مرۆڤی بۆ لای ئەم دیاردەیە راکێشاوەو فەرموویەتی:

**{قتل الإنسان ما أكفره، مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ} (١٩) سورة عبس:**

واتە: یا خوا مرۆڤی بـێ بـاوەڕ عـەمری نـەمێنێو داوەشـێ! بـۆ خـوا ناناسـێو نـای پەرسـتێ؟! نازانـێ خـوا لەچـی دروسـتی کـردوە؟! لـە دڵۆپـە ئاوێـك دروسـتی کردوەو ئەندامەکانی لەشی رێك خستوونو ئەمجار عەقڵو هۆشی داوەتێو رێگای چاكو خراپی پێ نیشان داوە؟!!.

پرۆفیـسۆری بـەناوبانگ أ- کریـسی موریـسون دەڵـێ: تاڵتاڵـەکانی رەچـەڵەك (وحدات الوراثة) کە لەناو هـەموو خانەیـەکی نێـرو مێـدا هـەنو بەڵـگەن لەسـەر هەبونی خوا، دەڵـێ ئـەم تاڵتاڵانـەی رەچـەڵەك ئەوەنـدە وردن ئەگـەر هـی هـەموو مرۆڤی سەر زەوی کۆبکەیتـەوەو لـە شـوێنێك دایـان بنێـیو قـەبارەیان لـە کوسـتە بانێـك ئەمووسـتیلەیەکی دورومـان بـچوکتر دەبـێ واتـە ئـەم تاڵتاڵانـە (جیناتانـە) ئەوەنـدە وردن تەنانـەت جینـاتی دووە بلیـۆن مـرۆڤ لـە کوسـتە بانێکـدا جێگایـان دەبێتەوە کەچی ئـەم جیناتانـەی دەبـن بـەهۆی دەیـەها جیـاوازی سـەرەکی نێـوان رەوشتو ئاکارو سەرو سیمای ئـەم مـرۆڤ تـا ئـەو مـرۆڤ، هـەر ئـەم جیناتانـەن کـە سیفەتەکان لەخۆ دەگرنو دەبنە هۆی گواستنەوەی رەنـگو روخسارو رەچـەڵەك (جنس) شتێکی ئاشکرایەو پێویست بە لێکۆڵینـەوە ناکـا، قورئـانی پـیرۆز ئامـاژەی بۆ کردوەو دەفەرموێ:

**{وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِينَ} (٢٢) سورة الروم:**

واتە: بڕێك لەو بەڵگانەی تاكو تەنهایی خودا دەچەسپێنێ دروستکردنی ئاسمانەکانو زەوییە، هەروەها جیاوازی رەچەڵەكو زمانو رەنگتان، هەر کۆمەڵە کەسێکە بە زمانێك ئاخاوتن دەکاو هەتانە رەشو هەتانە سورو هەتانە سپیو هەتانە گەنم رەنگ... هتد لە کاتێکا هەمووتان لە سەرەتادا وەچەی باوكو دایکێکن بە راستی لەم جیاوازییە زۆرانەدا بەڵگەی بەهێز هەیە بۆ خوایەتی خوا، گەرەکە عالەم تێیان بفکرێ.

## دروستکردنی مرۆڤ بەڵگەیە لەسەر هەبوونی خوا:

یەکێك لە نیشانەکانی هەبوونی خوا دروستکردنی مرۆڤە بەو شێوە رێكو پێکە، خوا دەفەرموێ:

{وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَا أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ} (٢٠) سورة الروم:

واتە: بڕێك لە بەڵگەی بەهێز لەسەر خوایەتی خوا ئەوەیە کە باوکی ئێوەی لە گڵ دروست کردوە دوایی لەویش دایکە حەوای ئێوەی بەدی هێناوە، ئەمجار ئێوەی لێ پەیدا کردوونو بە زەویدا بڵاوی کردونەتەوە جارێکی تر لە سورەتی (المؤمنون)دا دەفەرموێ:

{وَهُوَ الَّذِي أَنشَأَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ} (٧٨) سورة المؤمنون:

واتە: پەروەردگار خوایەکی وەهایە چاوی بۆ دروست کردوون تا پێی ببینن گوێچکەی داونێ تا پێی ببیسن، دڵی بۆ دروست کردوون تا لەشت حاڵی ببنو شت لێك بدەنەوە کەچی ئەو خوا نەناسانە هەرگیز ستایشی خوا ناکەنو سەری بەندەگی بۆ نزم ناکەن؟!!!.

خۆ ئەگەر بمانەوێ لە لاشەی خۆماندا بەڵگە لەسەر خوایەتی خوا بێنینەوە ئەوە بەڵگەکان زۆر لەوە زۆرترن کە بژمێردرێن!! هەتا ئاسۆی زانستو زانین

فراوان تـر بـێ بەڵـگە لەسـەر خوایـەتی ئـەو زاتـە زیـاتر دەبـن‌و هـەموویان ئـەوە دەچەسپێنن كـە ئـەم مرۆڤـە دروسـتكەرێكی زانـاو دانـای هەیـە.. چونكە سـەیری هـەر لایـەنێكی مـرۆڤ بكـەی سـەرت سـوڕ دەمێنـێ‌و ئامـان‌و رامانـت بەسـەردا دێ. چـۆن وانیـە؟! ئایـا چ لایـەنێكی لەشـی مـرۆڤ شـوێنی سـەر سـوڕمان نیـە؟! ئایـا پەروەردە بوونی سەرەتای لەناو مندالْداناو ئالْو گۆڕبوونی بە خوێن‌و ئێسقان‌و گۆشت‌و پێست‌و گۆڕانكاری یەك لەدوای یەكی نیشانەی هەبوونی خوا نیـە؟!! ئایـا یاسـای خـواردنی مـرۆڤ‌و شـێوەی خـواردنی‌و هـەزمكردنی خواردەمـەنی‌و دابـەش كردنی ئەو خۆراكە بەچەند بەشێكی جیـا جیـاو بـەڕێ كردنـی هـەر بەشـێك لـەو خواردنە بۆ شوێنی خۆی‌و سوود لێ بینینـی ئەوەشـی بەكەڵـك نایـە فڕێـی بداتـە دەرەوە ئایا ئـەم چۆنیەتە خوایـەتی خـوا ناچەسـپێنێ؟! ئایـا یاسـای دابەشـكردنی خوێن لە كانی سەرەكییەوە كە دڵە بۆ هەموو دەمارو بۆریەكانی لەش كەهەر خوا دەزانـێ چـەند زۆرن دوایـی هێنانـەوەی ئـەو خوێنـە بـەهۆی گورچـو سورچـكەوە هەروەها بردنی هەوای تازە بەهۆی هەناسـە دانـەوە تـا خوێنەكـە چـاك بكاتـەوەو لەش سود لەو هەڵسوڕانی خوێنـە وەربگـری نیـشانەی خوایـەتی خـوا ناگەیـەنن؟؟ واز لەوە بێنەو سەیری ئامێری بیستن (گوێچكە) بكە سـەیری چـاوو زمـان‌و دەم‌و لێـوی ئـادەمیزاد بكـە لـە چۆنیـەتی هەسـت شعووری تـێ بفكـرە، ئەمانـەش هـەر نەیـسە، سـەیری چـۆنیتی بیركردنـەوەو لـەبیر چـونەوەی مـرۆڤ بكـە لـە شـێوەی پێكەنین‌و گریانی تێ بفكرە یان سەیری چۆنیەتی زانین‌و نەزانینی خۆشویـستی‌و دوژمنایەتی بكەو بزانە ئایا ئەمانە هەموویان نیشانەی هەبوونی خوا نین؟!

## دروستكردنی نێرو مێ نیشانەی خوایەتی خوان:

نیشانەیەكی تر لە نیشانەكانی هەبوونی خـوا دروسـت كردنـی مێینـە لەتـەك نێرینــەدا، بــە راســتی ئەمــەش نهێنییــەكی كەونــەو دەســەڵاتو توانــای خــوا دەچەسپێنێ، خوا دەفەرموێ:

{وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ} (٢١) سورة الروم:

واتە: لە نیشانەکانی خوایەتی خوا کە لە جینسی خۆتان ئافرەتی بۆ دروست کردون و دەبنە خێزانتان و لەگەڵیان ئارام دەگرن و وەگری یەکتری دەبن خۆشەویستی خستۆتە نێوانتانەوە بێ یەکتری هەڵ ناکەن بە راستی لەم دیاردەیەدا زۆر بەڵگەی گەورە هەن لەسەر خوایەتی خوا.

کەوابوو هەبوونی مێینە لەتەك نێرینەدا بە مەبەستی زاوو زێ و ئاوەدان کردنەوەی زەوی و بەردەوامی ژیان و مانەوەی مرۆڤ لەسەر ئەرز بەم شێوەی کە دەی بینین! بەڵگەیە لەسەر هەبوونی خوای پەروەردگارو لەسەر ئەوەش کە ئەم مرۆڤە هەروا بە هەوانتە دروست نەکراوە بەڵکوو مەبەست لە دروست کردنیدا هەیە لەهەمان کاتدا رای ئەوانەش دەپوچێنێتەوە کە دەڵێن: بونەوەر (کەون) لەسەر مادده راوەستاوە خۆی خۆی هێناوەتە دی و هەوەجیی بە کەسی تر نیە.

پرۆفیسۆر (مومینە) باسێکی لە گۆڤاری (کۆسمۆسی) فەرەنسیدا بڵاو کردۆتەوە تێیدا داکۆکی لەسەر ئەوە کردوە کە ئەم کەونە بەدیهێنەرێکی هەیە دروستی کردوەو ئێستاش رای گرتووە، دەڵێ ئەگەر ئێمە عەقڵ و هۆشمان بخەینە لاوەو کوێرانە بڵێین ئەم کەونە بە سودفە هاتۆتە دی و رێکەوتێك دەستی لە بوونی بونەوەردا هەیە دوایی بە چەند رێکەوتێکی تواندراو پیاوێك دروست بکرێ بەڵام ئایا عەقڵ دەیگرێ ئەگەر بگوترێ چەند رێکەوتی ترو سودفەی تر توانیویانە مرۆڤێکی تر لە شێوەی پیاو دروست بکەن بەڵام مێینە بێ و لە تەرکیبی ئەندامی داخلی و دەرەوەیدا چەند جیاوازی فیسیولۆجی و نەفسی لەگەڵ پیاودا هەبێ، کەچی پیاو لە گەڵیا هەڵ بکاو وەگری یەکتری ببن و بتوانن و هەردوکیان زەوی ئاوەدان بکەنەوەو زاوو زێیان بەردەوام بێ؟؟ دیارەئەمە عەقڵ نایگرێ و سودفەو رێکەوت شتی وایان لە دەست نایە، کەوابوو هەبوونی مێینەو نێرینە لەتەك یەکدا بەڵگەیەکی هەرە بەهێزە لەسەر ئەوە کە ئەم کەون و کائیناتە دروستکەرێکی زاناو داناو تواناى هەیە ئەو بەدەستی قودرەتی خۆی

بونــەوەری بــەدی هێنــاوە، لــە هــەموو جیــنس و نــەژادێك لــەناو تــاك و کۆمــەڵی زیندەوەریـدا غـەریزەی جۆراو جۆری تێـدا دروسـت کـردوون و هەریـەکێ لەمانـە بەپێی داخوازی غەریزەکەی کاری خۆی ئەنجام دەدا.

## زاووزێی مرۆڤو ئاژەڵ بەڵــگەیە لەسەر هەبوونی خوا:

بەڵگەیەکی تر لەسەر هەبوونی خـوا ئـەو زاوو زێیـە بەردەوامەیـە کـە لـەناو مرۆڤو زیندەوەری تردا هەیە: خوای گەورە دەفەرموێ:

**{وَاللّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَاجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً وَرَزَقَكُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ أَفَبِالْبَاطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَتِ اللّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ} (٧٢) سورة النحل:**

واتە: خوای گەورەو پەروەردگار لە جینـسی خۆتـان ژنـی بـۆ دروسـت کـردون لەو ژنانە کوڕو کوڕەزاو کچ و کچەزای پێ بەخشیون رزق و رۆزی پاك و خاوێنیشی پێ داون خۆشیو لەززەتی لێ دەچێژن دەی کەوابێ بۆچی بڕوا بە خوا درۆزنەکان دەکەن و دان بە نازو نیعمەتی خوادا نانێنو خوای گەورە ناناسن؟!!.

جارێکی تر قورئانی پیرۆز سەرنجی مرۆڤ رادەکێشێ بـۆ چۆنیەتی زاوو زێـی وشترو دەفەرموێ:

**{أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ} (١٧) سورة الغاشية:**

واتـە: عەرەبـە قوڕیـشییەکان بـۆ سـەیری حوشـتر ناکـەن چۆن دروسـتکراوە؟ لــەش و قەبارەیــەکی زل و زەلام، هێــزو توانایــەکی زۆرو زەبەنــدە، گــوێڕادێری و هێمنیو لەسەرەخۆیی و رام بوونی... هتد.

زانای بەناوبانگ پرۆفیسۆر أ- کریسی موریسون دەڵێ: ژیان خۆی هانـدەرە بـۆ زاووزێ و دەیەوێ چینی زیندەوەر بمێنێتـەوە، ئـەم هانـدەرە زۆرە ملێیـە ئەوەنـدە بەهێزە تەنانەت هەموو زیندەوەرێك ئەو پەڕی خۆ بەخت کـردن ئـەنجام دەدا تـا ئەم زاوو زێیە بێنێتە دی، لەهەر شوێنێك ژیان نەبێ ئـەو هێـزە هانـدەرەش نیـە،

دەی باشە ئەم هێزە هاندەرانە لە کوێوە پەیدا بوون یان بۆچی دوای ئەوەی کە پەیدا بوون ئەوە ملیۆنەها ساڵە هەر بەردەوامەو ساڵ دوا ساڵ ئەم هەوڵدانە لە برەودایەو کزنابێ، دیارە ئەمە یاسای سروشتی زیندووە خوا پێی بەخشیوە.

زانای بەناوبانگ (بالی) دیاردەی زاوو زێی شوبهاندووە بە کاژێرێکی دەستیو دوایی دەڵێ دیارە کاژێر بە کردەوەیەکی زیهنی بەکارهێنراو بەسەر میکانیکا هاتۆتە دی. جا ئەگەر ئێمە بێنین بڵێین! ئەم کاژێرە هێزێکی پێدراوە دەتوانێ خۆی سەعاتی تر دروست بکا هێشتا بە ئەندازەی زاوو زێی مرۆڤو ئاژەڵ جێگای سەر سورمان نیە...

## دروستکردنی ئاژەڵو خشۆك و باڵندە بەڵـگەن لەسەر هەبوونی خوا:

یەکێك لە بەڵگەکانی هەبوونی خوا دروستکردنی ئاژەڵو خشۆکە بەو شێوە سەرنج راکێشەی کە دەبینرێ!!

قورئان دەفەرموێ:

**{وَاللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَابَّةٍ مِن مَّاء فَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى بَطْنِهِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى رِجْلَيْنِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى أَرْبَعٍ يَخْلُقُ اللَّهُ مَا يَشَاء إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ} (٤٥) سورة النـور:**

واتە: پەروەردگار هەموو زیندەوەرێکی سەر زەوی لە ئاو دروست کردوە جا هی وایان هەیە خشۆکەو لەسەر سك دەڕوا وەکوو مارو کرمو خشۆکەکانی تر، هی وایان هەیە لەسەر دوو قاچ دەڕوا وەکوو مرۆڤو باڵندە هی وایان هەیە لەسەر چوار قاچ دەڕوا وەکوو ئاژەڵە چوار پەلەکان بە راستی پەروەردگار چی بوێو چۆنی گەرەك بێ ئاوا شت دروست دەکا، خوا دەسەڵاتو توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیەو هیچی لێ عاسی نابێ.

باڵندەکانیش بەڵگەن لەسەر خوایەتی خوا:

{أَلَمْ يَرَوْاْ إِلَى الطَّيْرِ مُسَخَّرَاتٍ فِي جَوِّ السَّمَاء مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلاَّ اللّهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ} (٧٩) سورة النمل:

واتە: ئایا ئێوە سەیری باڵندەكان ناكەن چۆن بە گەردن كەچی لە بەرزاییدا لەناو هەوادا دێن و دەچن چۆنیان بۆ دانراوە كاری خۆیان ئەنجام دەدەن تەنیا پەروەردگار بەو حەوایەوە رای گرتوون و ناهێڵێ بكەونە خوارێ ئەگینا قورسایی لاشەیان و سووكی هەواو بێ پێزی پەڕو باڵیان ئەوە دەگەیەنی كە بەر ببنەوە!!!.

بەڵێ بەڵگەی خوایەتی پەروەردگار لە چۆنیەتی ئاكارو دروستكردنی ئاژەڵ و باڵندەدا زۆرن و ناژمێردرێن. درێژە پێدان و باسكردنیان پێویستی بە نووسینی چەند بەرگێك هەیە، زانستی ژیانداریش برێكی لەم باسە روون كردۆتەوە دەتوانرێ بۆی بگەرێیەوە..

فەیلەسووفی بەناوبانگ نیوتن باسێكی لەسەر هەبوونی خوای مەزن نوسیوەو تێیدا دەڵێ: (ئەندامی زیندەوەرەكان چۆن ئاوا بەو شێوە رێك و پێكە دروست كراوە؟! بە چ مەبەستێك ئەم ئەندامانە رێك خراون؟!! ئایا دەگونجێ چاو دروستكرابێ بێ ئەوەی یاسای بینینی تێدا رەچاو كرابێ؟ یان گوێچكە دروستكرابێ بێ ئەوەی یاساو نیزامی دەنگ و بیستنی زانیبێ؟ یان چۆن ئەم زیندەوەرانە دەتوانن و دەزانن بە پێی ویستی خۆیان ئەندامەكانیان بجوڵێنن؟! لە كوێوە ئەم سروشتەیان بۆ هات و چۆنیان زانی ئەم ئەندامە بۆ فلان كار باشەو ئەو ئەندامە بۆ فیسارە ئیش باشە؟!).

دوایی ناوبراو دەڵێ: ئەم زیندەوەرانە هەموویان بە هەڵس و كەوت و ئاكارو رەفتاریان بەو شێوە رێك و پێكە، ئایا بەڵگە نین لەسەر وجوودی خوایەكی تاك و تەنیاو بە دەسەڵات و زاناو داناو بێبەری لە هەموو عەیبێك و هەبوو لە هەموو شوێنێك و زانا بە هەموو شتێك؟!؟؟.

## بڕوا به خوا فیترەتەو شتێـکی ئاساییه له دەروونی مرۆڤا:

لێکۆڵینەوە ئایینیـه تازەکـان زۆر شـتیان دەرخـستووە کـه پێویـسته بـه وردی سەیریان بکرێو سەرنجیان بدرێ برِی لەو لێکۆڵینەوانـه ئـەوەیان دەرخـستوە کـه دینداریـسیفەتێکی گـشتییه بـۆ هـەموو مرۆڤێکـی کـۆنو تـازە چـونکه تـا ئێـستا نەزانراوە گەلێك هەبوو بێ بڕواو هیچ ئایینێکی نەبوبێ! تەنانەت زۆر له زاناکان رایـان وایـه: کـه فیکـرەی خواپەرسـتیو ئـایین پـەروەری بـه گـشتی فیکرەیـەکی سروشتییەو له بیری مرۆڤدا دروست بوەو خۆڕسکی دەرونیـەتی، بـەڵام خـوا ئـەم فیکرەیەی پەیدا کردوەو خستویەتیه بیری مـرۆڤەوە..

پـرۆفیسۆری ئوسکتلەندی (ئەندریه لنج) یەکێکه لەو زانـا بەناوبانگانـەی کـه بڕوای بەم فیکرەیه هەبوەو لەم بارەوە زۆر لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی ئەنجام داوە کورتەی راوو بۆچونەکانی ئەمانەن!

یەکـەم: هـەموو مرۆڤێـك لـه دەروونـی خۆیـدا فکـرەی بـەهۆی بـوونی شـتی یەکسان (فکره العلیه)ی هەیه هەر ئەم فکرەیەش بەسه بۆ دروست بـوونی بـڕوای هـەبوونی خوایـەکی دروسـتکەرو بەدیهێنـەری بونـەوەر...! هـەروەها هـەموو مرۆڤێکیش فکرەی دروستبوونی شتی لا هەیه، واته بڕوای وایه کـه بەدیهێنـەرێك هەیه فلان شت دروست دەکا یا دروستی کـردوەو ئـەم خـۆی ناتوانـێ خـۆی بـەدی بهێنێ.

دووەم: ئێمـه دەبینـین مرۆڤـه کۆنـەکانو مرۆڤـه سـەرەتاییەکان بڕوایـان بـه هەبوونی هێزێك هەبووە باوەڕیان وابووە که کەسێك هەیه بەدیهێنـەر بـێ پێیـان گوتووە: باوك، گەورە، دروستکەر.

سێیەم: هەر له سەرەتاوە لایەنێکی ئـایینی لای مرۆڤـه سـەرەتاییەکان هـەبوە زۆر خاوێنو بێگەرد بووە، دوایی شتی پڕوپوچو ئەفسانەیی تێکـەڵاو بـووە، ئەمـه بـه کـورتی بـیروڕای (ئەندریـه لـنج) بـوو بـەڵام ئـەم تیـۆرەی (لـنج)ە وەك خـۆی مایـەوەو پـاش گـوێ خـراو بـڕوای پێنـەکرا هـەتا زانـست پـەرەی سـاندو ڕێبـازی

مێژووی رەگەز ناسی (المنهج التاريخي في علم الأجناس) پەیدا بوو ئەم توێژینەوە تازەیە لەگەڵ زۆر لە ئاکامو نەتیجەکانی (لنج)دا یەکیان گرتەوەو پاڵپشتی یەکتریان کرد لەم روەوە تیۆرەکەی لنج کەوتە بەردەم لێکۆڵینەوەو توێژینەوە.

گرنگترین باسێك کە فکرەی (لنج) بچەسپێنیو پاڵپشتی بکا توێژینەوەکەی ماموٚستا (لیوبولدفون شرودر) ماموٚستای دانشگای ڤینا بوو کە دەربارەی هیندە سورەکانی ئەوروپا نوسیبووی، ئەم زانایە لە ئاکامی توێژینەوەدا گەیشتبوە ئەو راستییە کە کاتی خۆی ئارییەکان فکرەی هەبوونی خوایەکی خاوەن دەسەڵاتو باڵا دەستیان هەبووە ئەم فکرەش خۆی لە خۆیدا کراوەتە بناغەی ئایین لایانو لە سێ بنەما پێك هاتووە.

یەکەم/ پەرستنی سروشت.

دووەم/ پەرستنی مردوو.

سێیەم/ بڕوا بە هەبوونی خوایەکی باڵاو چاكو بەدیهێنەر بەڵام ئەم زانایە روونی نەکردۆتەوە ئاخۆ کام لەم سێیانە کۆنترە لایان تەنانەت لە شوێنێکی باسەکەیدا دەڵێ ئەم باسە پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیاتر هەیەو هێشتا تەواو نەکراوە.

هەر لەو کاتەدا دکتۆر (کرۆپر) چەند باسێکی دەربارەی هیندییە کالیفۆرنیایەکان بڵاو کردەوە ئەوەی روون کردبوەوە کە ئەم هۆزو تیرانە کۆنترین هۆزو تیرەی ئەمریکای باکورن بە ئاشکراش لە باسەکەی دەردەکەوێ کە گەیشتۆتە ئەو قەناعەتە کە خوای خێرو چاکەی دۆزیوەتەوە بەڵکوو ئەوەشی چەسپاندووە کە ئەم هیندییانە بڕوایان بە خوایەك هەبووە هەموو هێزو توانایەکی لێ وەشاوەتەوەو هەموو روداوێکیشیان روو بە رووی ئەو کردۆتەوە.

زانای رەگەز ناس (شمت) دەڵێ کوڵە بنەکانی ئەفەریقا (أقزام أفريقا) کە کۆنترین رەگەزی مرۆڤن، بڕوایان بە خوایەکی چاكو باڵا دەست هەبووە هەر ئەم زانایە لە توێژینەوەکانیدا گەیشتۆتە ئەو راستییە کە زۆر لە هۆزە زنجە

ڕەشەکانو زۆر لە هۆزە ئوستورالیایەکان بڕوایان بـە تـاكو تـەنیای خـوا هـەبووە، تەنانەت لەلای هۆزەکانی تریش بڕوا بە هەبوونی خوایەکی بـاڵا هـەبووە!!! بـەڵام دوایی باری ژیانی ئەو هۆزانە پێش کەوتو گۆڕانکاری هات بە سـەریانداو لایـەنی ڕۆشنبیریو کۆمەڵایەتیان گۆڕاو فکـرەی ئایینیـان چەواشـە بـوو، گـرێ کوێرەکـەی تێدا پەیدا بوو بیروباوەڕی فرە خوایی هاتە کایەوەو لەمەشەوە بڕوا بە هـەبوونی چەند شتێکی باڵا لە تەك خوایەکی تەنیاو باڵا دەستدا سەری هەڵدا.

مامۆسـتا رینـان (کـە زانایـەکی بەناوبانگـە) دەڵـێ: سـامییەکان هـەموویان بـە تەبیعەت بڕوایان بە خوایەتی یەك خوا هەبووە. ناوبراو ئەم تیۆرەی لـەو باسـانە دەرهێناوە کە دەربارەی خواکانی سامییەکان نوسیبووی، هەروەها لە خودی وشەی (ایـل)یـش سـوودی وەرگرتـووە چـونکە ئـەم وشـەیە لـە زاراوەی سـامییەکاندا زۆر باوبووەو بۆ زۆر شت بە کاریان هێناوە ئەم سـامییانە تاعـەتی خوایـەکیان کـردوە پێیان گوتوە (ایل)= ئیل دوایی ئەم وشەیە گۆڕانی بەسەردا هاتووەو بومتـە (یهـو) (یهوە) دوای بووە بە (ألوهیم)ی عیبرییەکان ئەمجار لای عەرەبەکان بوومتە (اله)، (اللات)، (الله) بنەمای هەمووشیان وشەی (ایل)ە.

دوکتـۆر (بـول کلیرانـس آیوسـولد) مامۆسـتای شـتە سروشـتییە زینـدووەکان دەڵێ: گومان لەمەدا نییە کە مرۆڤ هەردەم عەودالی دۆزینەوەی عەقڵێکی گەورەو داناتر لەهی خۆیو نەخشەو پیلانێکی ڕێكو پێك ترو فراوانتر لەهی خۆیەتی، تا بـە کۆمـەکی ئـەو عـەقڵو نەخـشەو تـەگبیرەوە بتوانـێ لـە بونـەوەر حـاڵی ببـیو لاپەڕەکانی شی بکاتەوە!! دەی هەر ئـەم عـەودالیو توێژینـەوەیـە خـۆی لـە خۆیـدا بەڵگەیە لەسەر هەبوونی هێزێکی گەورەترو بە تواناتر لـە هێـزی خـۆی، ئـەویش هێـزو توانـای خـوای پـەروەردگارە هێـزی دروسـتکەری بونـەوەرە.. شـایانی باسـە جـاری وا هەیـە مـرۆڤ ناتوانـێ تـەنیا بـەهۆی بەڵـگەی زانـستیو ماددییـەوە خـوا بدۆزێتـەوەو بـڕوا بـە وجـودی خـوا بکـا ئالـەم کاتـەدا پێویـستە ئێمـە بەڵـگەی زانستیو ماددی تێکەڵاو بـە بەڵـگەی ڕۆحـیو ئـایینی بکـەین.. واتـە: بێـنین چـی

زانیاریو زانستمان دەربارەی بونەوەر هەیە تێکەڵاوی بکەین بە هەستو سۆزو عاتیفەی قوڵایی دەرونمان چی کەلەبەرو کونو قوژبن هەن لەناو بەڵگە مادییەکاندا بە هەستە ئایینیەکە پڕی بکەینەوە بە هەردوولا (بەڵگەی زانستیو بەڵگەی ئایینی) ڕێبازێکی ڕاست دروست بکەین بۆ دۆزینەوەی خواو بڕوا پێ هێنانی!!

جا ئەگەر ئێمە بێنین هۆو هاندەرەکانی ناوەوەی دەروون (الدوافع الداخلية) بژمێرین دەبینین ئەم هاندەرانە زۆرنو جوێ جوێنو ژمارە نایان گرێتەوە، ملیونەها مرۆڤی زیرەك هەڵدەنێن بۆ باوەڕ هێنانو هەمووشیان کاریگەرنو دەوری خۆیان هەیە لە پتەوکردنی بڕواو یەکالا کردنەوەی هەستو شعورو باوەڕ هێنان بە هەبوونی خوا.

ئەمەی گوترا ڕاو بۆچوونی بڕێ زانا بوو دەربارەی ئەوەی کە ئایین فیطریو رواوی ناو دەروونە هەموو مرۆڤێك لە ناخەوە خاوەن بڕوایەو ئەگەر خۆ گێل نەکا ئیمان دارە، کاتێکیش سەیری قورئان دەکەین دەبینین پێش چواردە سەدە ئەم ڕاستییەی درکاندوەو پەنجەی بۆ ئەم حەقیقەتە ڕاکێشاوە ئەوەتا دەفەرموێ:

**{فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ، مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَاتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ} (٣٠ - ٣١) سورة الروم:**

واتە: ڕوبکەرە ئایینی ڕاستو دروستو لێی لامەدە، لێ ببڕێ بۆ یو خوی بدەرێ، چونکە ئەو ئایینە فیطرەتی خوایەو خوا خستویەتیە دەروونی مرۆڤەوەو هەموو ئینسانێك کە لە دایك دەبێ لەسەر ئەو ئایینە فیطرییە لە دایك دەبێ! دەی کەوایە ئێوە دەست لە کاری خوا مەدەنو لەسەر ئایینە فیترییەکە بمێننەوە، ئەوە ئەو پەڕی ئایینی ڕاستەقینەو پەسەندە لەلای خوا، بەلام زۆر کەس نازانێو کردەوەی پێ ناکا!! هەمووتان بگەڕێنەوە بۆ لای خواو

خۆتان لە سزای ناهەمواری بپارێزن بەوە سەرپێچی فرمانەکانی مەکەنو نوێژی بۆ بکەنو هاوبەشی بۆ دامەنێن...

ئێمە کە سەرنجی ئەم دوو ئایەتە دەدەین دەبینین قورئانی پیرۆز ئەوە دەچەسپێنێ کە ئایین شتێکی فیتریو سروشتییە، هەر لە سەرەتاوە لە دەروونی مرۆڤدا پەیدا دەبێ خوای گەورە مرۆڤی لەسەر ئەو ئایینە دروست کردوە بنەمای ئەو ئایینەش بڕوا هێنانە بە دروستکەری بونەوەرو بەوە کە تاکو تەنیاو بێ شەریك پاکو بێ خەوشە، خۆ ئەگەر مرۆڤ لەگەڵ دەروونی خۆیدا بیربکاتەوە دەست بەجێ رای دێتە سەر ئەوە کە خۆی دروستکراوی خوایەکی بە دەسەلاتی دانای زانایە ئەو خوایە دروستی کردوەو نیعمەتی دونیاشی بەسەردا رشتووە!!

سەیری وشەی (حنيفا) بکە کە راستەوخۆ مانای خوا بە یەك ناسین دەبەخشی ئەمجار سەیری رستەی (وَلَـكِنَّ أَكْثَـرَ النَّـاسِ لَـا يَعْلَمُـونَ) بکە بزانە چەند سەرنج راکێشەو تا چ رادەیەك لەگەڵ زانستی ئەمڕۆدا گونجاوە!! چونکە کەس نازانێ کە ئایین فیترییەو خۆڕسکی دەرونە مەگەر ئەوانەی خۆیان خەریکی لێکۆڵینەوەی زانستین، دەربارەی سەرەتای پەیدابوونی ئایینو کاریگەری لە دەروونی مرڤدا تەنها ئەوانە دەزانن کە ئایین شتێکی فیترییەو ئەوانەش کەمێکن لە زۆر، کەوابوو ئاماژە کردنی قورئان بۆ ئەم لایەنە بە موعجیزەیەکی زانستی قورئان دەژمێردرێو تازە بە تازە پەی پێبراوە.. پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێ) ئەم مانایەی دووپات کردۆتەوەو لە حەدیسێکی قودسیدا دەفەرموێ: (کل عبادي خلقت حنفاء فاجتالتهم الشياطين عن دينهم وامروهم ان يشركوا بي غيري).

واتە: هەموو بەندەکانم بە خوا پەرستی دروست کراونو لەسەر یەك خوا ناسین لە دایك بوون بەلاّم شەیاتینی لەسەر دین لایان دەدەن فرمانیان پێ کردوون کە هاوبەش بۆ من دابنێن.!!

هەروەها پێغەمبەر لە حەدیسێکی تردا دەفەرموێ: (کل مولود يولد على الفطرة وأنما أبواه يهودانه أو ينصرانه أو يمجسانه):

واتە: هەموو منداڵێك كە لە دایك دەبی لەسەر ئایینی فیترىو خوا بەیەك ناسین دێتە سەر زەوی، بەڵام دەوروبەرو خێزانو باوكو دایك ئایینەكە دەگۆڕنو لە راستەرێ لای دەدەنو دەیبەنە سەر ئایینی جولەكەیی یان گاوری یان ئاگر پەرستی...هتد.

كاتێكیش مرۆڤ تووشی تەنگو چەڵەمەیەك دەبی یەكسەر نزاو هاوار دەكاتە خواو پەنای پێدەبا، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ كە بڕوا بە خوا شتێكی فیترییەو لە دەروونی مرۆڤدا چەكەرەی كردوە.

مامۆستا (كریسی موریسون) دەڵێ: تەنها ئەوە كە مرۆڤ هەر لە كۆنەوە لە هەموو شوێنێك تا ئێستا هەستی بەوە كردوە كە كەسێك هەیە لەخۆی بەهێزتر پەنای پێ دەبرێو لەكاتی تەنگانەدا هاواری دەكرێتێ، بەڵگەیەكی بەهێزە لەسەر ئەوە كە دین زكماكیو فیترییەو پێویستە زانست بڕوا بەم حەقیقەتە بێنێ.

قورئانی پیرۆز لەچەند ئایەتێكدا ئەم حەقیقەتەی ئاشكرا كردوە دەفەرموێ:

{وَإِذَا مَسَّ النَّاسَ ضُرٌّ دَعَوْا رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيْهِ} (٣٣) سورة الروم:

واتە: هەركاتێك زەرەرو زیانو تەنگانەیەك تووشی مرۆڤەكان دەبێ هاوار دەكەنە خوای خۆیانو بەندایەتی خۆیان دەردەخەنو بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە.

یان دەفەرموێ:

{وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَالظُّلَلِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ} (٣٢) سورة لقمان:

واتە: كاتێك لە دەریادا شەپۆلی ئاو گەمی كەیان دادەپۆشیو ترسی مردنیان دەگاتێ هاوار دەكەنە خواو بە دڵسۆزیو ئیخلاصەوە باوەڕی پێ دێنن.

كەوابوو دەروونی مرۆڤ بە فیترەتو سروشتی خۆی هەست بە وجوودی خوا دەكاو لە تەنگو چەڵەمەدا هاواری تێ دەبەستێو داوای یارمەتی لێ دەكا!! لەم باسەی رابورد ئەوەمان بۆ دەركەوت كە توێژینەوە ئایینیەكانی تازە ئەوە دەچەسپێنێ كە قورئان ئاماژەی بۆ كردوە دەربارەی ئەوە كە بڕوا بە بوونی خوا شتێكی فیترییەو لە دەروونی مرۆڤا رسكاوە جا ئەگەر سەیری رۆژگارو سەردەمی هاتنە خوارەوەی قورئان بكەین دەبینین خەڵك لەوكاتەدا هیچیان لە

نهێنییەکانی فیترەتی دینی نەزانیوە، کەوابوو ئەمە باشترین بەڵگەیە کە قورئان لە خواوەیەو (محمد) (درودی خوای لەسەر بێ) راستی کردوە.

## زانستو زانیاری بانگەوازی مرۆڤ دەکا بۆ باوەڕهێنان بە خوا:

بڕێ نیمچە خوێندەوارو زڕە زانا هەن پێیان وایە بێ دینی نیشانەی زانستو زانینەو مرۆڤ تا زاناتر بێت بێدین تر دەبێ!!.

لە راستیدا ئەمە هەڵەیەو وانیە هەرگیز لە هیچ رۆژگارو سەردەمێکدا عیلم نەبۆتە هۆی بێدینی، چونکە زاناو لێکۆڵەرەوە هەمیشە عەودالە بەدوای حەقائیقو مەبەستدا، هەردەم خۆی لەناو بونەوەرێکی فراوانو سەر سوڕهێنەردا دەبینێتەوە، باش دەزانێ کە ئەم کەونە فراوانە یاساو نیزامێکی رێكو پێك هەڵی دەسوڕێنێو دەیگێڕێ نەك گەڕەلاوژەو خۆ بەسەری. ئیتر کاتێ توێژەرەوە هەست بەو حەقیقەتە دەکا ناچاردەبێ سەری بەندەگی بۆ دەسەڵاتو توانای ئەو خوایەی کە ئەم کەونە فراوانەی هێناوەتە وجودو هەڵی دەسوڕێنێ دابنەوێنێو بڕوا بە خوایەتی خوا بێنێ نەك بێدین ببێو روو لە خوا وەرگێڕێ!!.

دکتۆر (دینرت)ی ئەڵمانی باسێکی بڵاو کردۆتەوە لەو باسەیدا راوو فەلسەفەی زانا گەورەکانی شیتەڵ کردۆتەوە بە تایبەتی هی ئەو زانایانەی کە چراو پێشەوای زانستی ئەم چار چەرخەی دوایی بوون لەو باسەدا هەوڵی داوە بیرو باوەڕیان دەربخا لە ئەنجاما گەیشتۆتە ئەو نەتیجەیە کە لە (٢٩٠) زانا:

١. (٢٨)یان هیچ بڕوایەکیان نەبووە.
٢. (٢٤٢)یان بە ئاشکرا بڕوایان بەخوا هەبوەو خاوەن باوەڕ بوون!!.
٣. (٢٠)یان هیچ گرینگیان بە باری ئایینی نەداوە.

جا ئەگەر ئێمە ئەو (٢٠) یان کە گرینگیان بە باری ئایینی نەداوە هەموویان بەخوا نەناس دابنێین هێشتا (٩٢٪) لەو زانا گەورانە بڕوایان بە خوا هەبووە دەی ئەم رێژەیە (٩٢٪) بە ئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ کە دژایەتی لەنێوان عیلمو ئاییندا نیە، ئەو رایەی مادییەکان دەهۆڵی بۆ لێ دەدەن کە گوایە بێدینی ئاوەڵناوو

دیاردەی زاناکانە ئەسڵو ئەساسی نیە نەك هەر ئەوە بەڵکوو ئەوە دەگەیەنی کە عیلمو ئایین تەواوکەری یەکترن نەك دژی یەك بن.

دکتۆر (لیون) وتی: کە ئەو سەر ژمێرییەی ئەنجام داوە دەڵێ: بڕوا بەخوا هیچ کاتێك بەرگری لە پێشکەوتن ناکات، چونکە هەموو پێشکەوتنێك رێكو پێکی دروستکراوەکانی خوا دەگەیەنێ، خۆ ئەگەر ئەمڕۆ زیاتر لەم زانینەی ئێستام بزانیایە بێگومان بڕوام بە خوا بەهێزتر دەبوو، واتە تا زاناتربم بە دین تر دەبم. دوایی دەڵێ زانستی راست (العلم الحقيقي) هەرگیز سەر ناکێشێ بە مادییەت! بەڵکوو سەر دەکێشێ بە خوا ناسین، چونکە بەهۆی شیتەڵ کردنەوەی لایەنێکی بونەوەرو توێژینەوە تێیدا زیاتر لێهاتوییو زاناییو توانایی ئەو کەسە دەردەکەوێ کە بونەوەری بەدی هێناوە.

دکتۆر (وتر) کیمیاگەری بەناوبانگو ئەندامی کارای ئەکادیمیەی زانستو عەمیدی کۆلیجی پزیشکی (باریز) دەڵێ هەر کاتێ هەست بکەم کە بڕوام بەخوا زەعیفە خێرا روو دەکەمە ئەکادیمیای علوم بۆئەوەی بیرو باوەڕم بەهێز بکەمەوە.

زانای بەناوبانگ (فای) گەردوون ناسو ئەندامی ئەکادیمیەی علوم لە کتێبەکەیدا (أصل العوالم) دەڵێ: زۆر هەڵەیە کە بگوترێ: زانست خاوەنەکەی هان دەدا بۆئەوەی ئینکاری خوا بکا!!!.

مامۆستا (ئەدمون هەربرت) زەوی ناسی بەناوبانگو مامۆستای دانیشگای سۆربۆن دەڵێ: قەت ناگونجێ عیلمو زانست سەر بکێشن بۆ بێ بڕوایی یان بۆ مادییەت یان بۆ گومان پەیدا کردن.

پرۆفیسۆرو مێژوو زانی سروشتی مامۆستا (فابر) دەڵێ: هەموو سەردەمێك هەوای شێتی تێدایە لەبەرئەوە من بەلامەوە بێ بڕوایی بەشێکە لەو هەوای شێتییەو بە نەخۆشی سەردەمی ئێستای حسێب دەکەم وەمن بەلامەوە پێستم لێ دارنن ئاسانترە نەك بیرو باوەڕم بەخوا لێ دارنن!!

ئەمە بە کورتی برێ بیرو باوەڕی زانا گەورەکانی زانستی تەبیعەت بوو لە باسە گرینگەکەی (لیون ووتي)مان هەڵبژارد مشتێکیش نموونەی خەرواریێکە!!.

لە دکتۆر (أندرو کو نوای ایفی) یان پرسیار کرد وتیان راستە کە دەڵێن زوربەی ئەوانەی خەریکی توێژینەوەی زانستین بێ بڕوانو خوا ناناسن؟

لە وەڵامدا ووتی: بڕوا ناکەم ئەمە راست بێ، بەڵکوو من پێم وایە شتەکە بەرەو ئاوازوە، چونکە لە ئاکامی توێژینەوەو موناقەشە بۆم دەرکەوتووە زوربەی ئەوانەی خەریکی لێکۆڵینەوەی زانستین بە تایبەتی زیرەكو لێهاتووەکانیان بێ بڕوا نەبوونو خوایان ناسیوە، بەڵام خەڵکی قسەو راکانی ئەوانیان بە هەڵە گێڕاوەتەوە... ئەمجار دەڵێ: بێ باوەڕی یان بی بڕوایی ماددی هەرگیز ناگونجێن لەگەڵ ئەو رێبازەی کە زاناکان گرتوویانە، نە لەگەڵ بیرکردنەوەیان دەگونجێ نە لەگەڵ کردەوەو ژیانیان!! چونکە زاناکان شوێن یاسایەك کەوتوون کە دەڵێ: مومکین نییە ئامێرێك بێ وەستا دروستکرابێ، واتە ئەوان عەقڵو بیری خۆیان بەکار دێنن لەسەر بناغەی راستو زانست ئامێز بە نیشاتو ئەمەلو هیواوە دەچنە کارگەو تاقیگاو شوێن ئیشی خۆیانو هەموو کاتێ دڵیان پڕە لە بڕوا، تەنانەت زوربەی زاناو زانست دۆستەکان کە کارێك ئەنجام دەدەن هاندەریان بۆ کردنی ئەو کارە خۆشەویستی زانینو خۆشەویستی مرۆڤو خۆشەویستی خوایە.

دکتۆر (البرت ماکوب ونشتر) مامۆستای ژیانداری لە دانیشگای بایلور دەڵێ: خەریکبونم بە زانستەوە باوەڕمی بە خوا بەهێز کردووم رۆژ بە رۆژ بڕوام لە بەهێز بووندا بووە چونکە هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە زانیارییەکان هەردەم بە توانایی خوداو دانایی باڵای ئەو زاتە بێچوونە ئاشکرادەکەنو هەتا مرۆڤ لە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەیدا شتێکی تازە بە دەست بهێنێ باوەڕی بە خوا پتەو تر دەبی بڕوای زیاد دەکا..

مامۆستا (اللورد کلیفن) یەکێکە لە زانا مەشهورەکانی تەبیعەت دەڵێ: هەر کاتێ بە وردی بیر بکەیتەوەو زیاتر لە زانستەکاندا قووڵ ببیەوە ئەو زانستانە ناچارت دەکەن بڕوا بە خوا بکەیتو ئیمان بە خوایەتی ئەو زاتە بهێنی.

زانـای بـەناوبانـگ (ئێنـشتین) دەڵێ: بـڕوا بـە خـودا باشـترین و بـەهێز تـرین دەسکەوتی باس و توێژینەوە زانستییەکانە، ئەمجا باسەکە بـە ووتـە بەنـرخـەکانی فەیلەسووفی ئینگلیزی (فرانس بیکۆ) کۆتایی دێنێ کە دەڵێ: کـەمێ لـە فەلـسەفە مـرۆڤ لـە ئیلحـادو بـێ بڕوایـی نزیـك دەخاتـەوە بـەڵام ڕۆچـوون بـەناخی قـوڵی فەلسەفەدا بڕواو ئایینی تازە دەکاتەوە.

کەوابوو لە وتەو ڕاوو بۆچوونی ئەو زانایانە ئەوەمان زانی کـە زانـستەکان دەبـن بەهۆی بڕوا هێنان بە خوداو پتەوبوونی باوەڕ، مرۆڤ تا زاناتر بێ خواناس تر دەبێ.

دەی ئـەوە قورئـانی پـیرۆز پـێش چـواردە سـەدە ئـەم ڕاسـتییەی درکانـدووەو فەرموویەتی:

**{ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاء} (٢٨) سورة فاطر:**

واتـە: ئەوانـەی کـە بەباشـی لـە خـودا دەترسـن تـەنهاو تـەنها زاناکـانن کـە دەیناسن چونکە هەر کەسێك زیاتر خودا بناسێ زیاتر لێی دەترسێ لەم ڕووەوە کـە زاناکان بیر تیـژن و بـە وردەکاریی و لێکۆڵینـەوەی زانـست ئامێزیـان گـەلێ نهێنـی و دەست ڕەنگینی خودایان لـە بونـەوەردا بـۆ دەردەکـەوێ بـە لایەنـە سـەر ئاسـاکانی بونەوەر دەزانن و تێی دەگەن و لەهـەر ڕووپـەڕێکی سروشـت خوایـەتی خوایـان بـۆ ئاشکراتر دەبێ لە کاتێکا ئەم حاڵەتە بۆ نەزان و نەخوێندەوار پەیدا نابێ.

لە دیباچەی کیتابی حوسنی عالەم هەر وەرەق لادەم

دەبینم مەجمەسی وەصفت لەهەر فەسڵێ لەهەر بابێ

(بێتوشی)

لەلایـەکی تـرەوە قورئـان زیـادە ئیعتبـارو ڕێزێکـی بـە شـایەتی زاناکـان داوەو شایەتی ئەوانی خستۆتە ڕیزی شایەتی خوداو فریشتەوەو دەفەرموێ:

**{شَهِدَ اللّهُ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ وَالْمَلاَئِكَةُ وَأُوْلُواْ الْعِلْمِ قَآئِمَاً بِالْقِسْطِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ} (١٨) سورة آل عمران:**

واتە: پەروەردگار خۆی شایەتی داوە کە جگە لە خۆی هیچ خودایەکی تر نیە شایانی پەرستن بێ، هەروا فریشتەو زاناکانیش ئەم شایەتیەیان داوە هەموو شایەتن لەسەر عەدالەتو دادپەروەری باری تەعالا.

ئەوەتا شایەتی زاناکانی خستۆتە ئاستی شایەتی فریشتەکانەوە جا خۆ زانینی فریشتەکان شكو گوومان رووی تێ ناکەن دیارە لەم خستنە ریزەوە زیادە ئیعتیبارێکی تەواو بەڕای زاناکان دەچەسپێنێ.

بەکورتی زانست لە رووپەڕی بونەوەردا بەڵگەی لەسەر بوونی خوداو توانایی‌و دانایی هێناوەتەوە قورئانیش پێش پێشکەوتنی عیلم‌و زانست هەمان بەڵگەی خستۆتە روو هەردوو بەڵگەکان: بەڵگەی قورئان‌و بەڵگەی عیلم لە بونەوەردا یەکیان گرتووە، پاڵپشتی یەکتری دەکەن.

## بەرپەرچ دانەوەی مادییەکان (مناقشة الماديين):

مادییەکان بڕوایان نیە کە بۆ بونەوەر بەدیهێنەرێك هەبێ، بەڵکوو پێیان وایە هەرچی لە بونەوەردا هەیە ئەزەلییەو لە ماددە بەدی هاتووە، مادەش خۆی هەر بووەو هەر دەبێ یاساو نیزامە سروشتییەکانیش بە رێکەوتو سودفە پەیدا بوون بەهۆی گۆڕانکاری پەیتا پەیتایانەوە تەطەوریان کردوە گەیشتونە ئەم پلە رێك‌و پێکە گونجاوەی کە ئێستا دەبینرێ ئیتر ئەم قسە بۆشانەی مادییەکان بڵاوبوونەوەو کاریان کردە سەر بیری برێ ئادەمیزادو سەریان لێ تێك دان‌و رێگای بێ بڕوایی (الحاد)یان گرت‌و بوونە خودا نەناس، لەهەمان کاتدا زۆر لە زاناو عالمەکان بەرەنگاری فیکرەی ئەم مادییانەیان کردوو بۆچوون‌و رایەکانیان پوچ کردنەوە نیزاعێکی کوشندە لە نێوان خاوەن باوەڕو زاناکان لەلایەك‌و مادییەکان لەلایەکی تردا سەری هەڵدا ئەمەش برێ لە راوو بۆچوونی زاناکانە کە بەر پەرچی مادییەکانیان داوەتەوە.

## پوچ کردنەوەی تیۆری ڕێکەوت و سودفە:

دکتۆر (ایرفنج ولیام) مامۆستای زانستی تەبیعی دانشگای میشیجان دەڵێ: من بڕوام بە هەبوونی خودای گەورەو مەزن هەیە چونکە ناتوانم و عەقڵم ڕێگام نادا کە بڵێم ڕێکەوت بەتەنیا دەتوانێ چۆنیەتی پەیدابوونی ئەلەکترۆنەکانی سەرەتایی یان گەردیلە هەوەڵییەکان یان ترشە ئەمینەکان (الأحماض الأمينية)ی یەکەم یان پرۆتۆپلازمی یەکەم یان یەکەم تۆم و مادەی ژیان یان عەقڵی یەکەمم بۆ شی بکاتەوە!! کە وابوو من بڕوام بە هەبوونی خودا هەیە چونکە هەر لە بوونی ئەوەوە دەتوانین دیاردەکانی بونەوەر شی بکەینەوەو پەیدابوونی ئەمانەو شتەکانی تریش پاڵ ئەوبدەین دکتۆر (واین أولت) ئەندامی کۆمەڵەی جیۆلۆجی ئەمریکی دەڵێ: ئەو تیۆرانەی دیانەوێ بونەوەر لە بیرو باوەڕی مادییەوە بخەنە بەر لێکۆڵینەوە بە عەقڵێکی مادی سیرف قسەی لێ بکەن هەر زوو تیۆرەکانیان لە پەل و پۆ دەکەون و ناتوانن ڕاڤەی چۆنیەتی پەیدابوونی بونەوەر بکەن!!!

ئەمجار چی گۆڕانکاریی و گەش و نما ڕوویداوە دوای پەیدا بوونی یەکەمی بونەوەر هەمووی دەگەڕێنینەوە بۆ ڕێکەوت و سودفە، ڕێکەوتیش بۆ خۆی فیکرەیەکە مادییەکان بۆ بەرهەڵستی فیکرەی هەبوونی خوا دەیخەنە ڕوو، ئەگینا ڕێکەوت بۆ خۆی هیچە و هیچی پێ ناکرێ!! تەنانەت ئەگەر ئێمە چاومان لە ئاستی لایەنە ئایینیەکانیش بنوقێنین دەبینین تا فکرەی هەبوونی خوا زۆر بە ئەقڵ ئاشناترەو نزیکترە لە مەنتیقەوە تا فکرەی ڕێکەوت و سودفە!! بەڵکوو ئەم یاسا ڕێك و پێکەی کە کەون و بونەوەر هەڵدەسوڕێنێ بە ئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ کە خوایەکی دانای زانای ڕێکخەرو بەتوانا بەدی هێناوە نەك ڕێکەوت و سودفەیەکی هیچی لە هیچ بوو!!.

زانای بەناوبانگ (أ. کریسی موریسون) سەرۆکی ئەکادیمیای زانست لە نیۆرك پرسیار دەکا دەربارەی نهێنی ژیان: ئایا ژیان مادده دروستی کردووە!!؟ دەڵێ: ئەوەی کەبەگشتی ڕای زانایانی لەسەرە ئەوەیە کە نە بیئەو دەوروبەر بە تەنها نە مادە بە تەنها هەرچەندە گونجاو بێ بۆ ژیان هەروەها نە هیچ ڕێکەوت و

هەڵێك لەکاری کیمیاویو سروشتیدا کە بگوترێ سودفە دروستی کردوون هیچ یەکێك لەمانە ناتوانن ژیان دروست بکەنو بیهێننە گۆڕەپانی بونەوەرەوە.

ئەمجار دەڵێ: ژیان تاکە سەرچاوەیە بۆ هەستو شعوور، هەر ژیانە کەوامان لێدەکا هەست بە دروستکراوانی پەروەردگار بکەینو بەجوانی سروشتی رەنگاو رەنگ سەرسام ببین خۆ ئەگەر چاویش بنوقێنین هەر ناتوانین خۆ لەوشاکاری خوایە گێل بکەین هەرچەندە تا ئێستا پەردەی تاریکی بەسەر چاومانەوەیە!!!.

کەوابوو تیۆری رێکەوت (نظرية المصادفة) لەسەر هیچ بەڵگەیەکی زانستی وەرگیراو هەڵنەستاوە، هیچ عەقڵێکی ساغیش وەری ناگرێ، هەر بۆیە دەبینین قورئانی پیرۆز روو دەکاتە ئەو بێ بروا رارایانەو بە شێوازێکی دڵ ئارام بۆیان روون دەکاتەوە کە بونەوەر دەبێ کەسێك بەدی هێنابێ ئەو کەسەش خوای پەروەردگارە... ئەوەتا لە سورەتی ئیبراهیمدا دەفەرموێ: {أَفِي اللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ}:

واتە: ئایا ئێوە ئەوەندە گەوجو نەزانن گومانتان لە هەبوونی خواو خوایەتیو تەنهایی ئەو زاتەدا هەیە!

لەکاتێکا ئەو خۆی بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوییە، ئەمجار قورئان سەرنجی بەندەکانی رادەکێشێ بۆئەوە لە بونەوەر وردببنەوە سەیری سروشت بکەنو تێی بفکرن تا بۆیان دەربکەوێ کە رووپەڕەکانی بونەوەر هەریەکەیان ئەوە دەگەیەنێ کە پەروەردگار دروستکەرو بەدیهێنەرێکی زاناو داناو کار سازە. قورئان دەڵێ: {صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ}:

واتە: ئەم بونەوەرە دروستکراوی خوایەکی وایە کە هەموو شتێکی بەرێو جێیە، هەموو شتێکی لە شوێنی خۆی دایە یان دەڵێ: {الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ}:

واتە: پەروەردگار خوایەکی وەهایە بەدیهێنەرێکی ئەو تۆیە هەر شتێکی دروستی کردوە رێكو پێکەو گونجاوو لەبارە!!!.

## کەون سەرەتای هەیە، کاتێك بووە نەبووە (للكون بداية):

دوکتۆر (ادوارد لوثرکیل) مامۆستای ژیانداری سەرۆکی بەشێکی دانشگای (سان فرانسیسکۆ) بەر پەرچی ئەو مادییانە دەداتەوە کە گوتویانە کەون ئەزەلییە، دەڵێ: زانستەکان بە ئاشکرا ئەوە دەگەیەنن کە ئەم کەونە ناگونجێ ئەزەلی بێ‌و هەر بووبێ چونکە گواستنەوەی گەرمای لە قەبارە گەرمەکانەوە بۆ قەبارە ساردەکان بەردەوامە خۆ ناشگونجێ پێچەوانەیەك رووبداو بەهێزێکی خۆیی گەرماییەکە لە قەبارە ساردەکانەوە بارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ قەبارە گەرمەکان، کەوابێ گواستنەوەکە هەر لە قەبارە گەرمەکانەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ساردەکان ئەمەش مانای وایە کە کەون لە رۆژگارێکا وای لێ دێ‌و دەگاتە پلەیەك گەرمایی هەموو شتێکی یەکسان دەبێ کانی وزەی تێدا رۆدەچێ ئیتر تێکەو لێکەی کیمیاوی‌و سروشتی نامێنێ‌و شوێن‌و ئاسەواری ژیانیش نابیندرێ!!

جا چونکە ئێستا ئێمە بەچاوی خۆمان دەبینین ژیان بەردەوامەو تێکەو لێکەی کیمیاوی (عمليات كيمياوية) بە رێك‌و پێکی دەڕوا سروشت کاری خۆی ئەنجام دەدا کەوابێ دەتوانین بڵێین ئەم کەونە ئەزەلی نیە چونکە ئەگەر ئەزەلی بوایە زۆر دەمێك بوو وزەی نەدەماو هەموو کردو کۆیەکی بونەوەر دەوەستاو خپ دەبوو؟!! ئابەو شێوەیە زانست دەری دەخا کە بونەوەر سەرەتای هەیەو لە نەبونەوە بەدی هاتووە ئەمەش خۆی لە خۆیدا هەبوونی خوا دەچەسپێنێ، چونکە هەرشتێك سەرەتای هەبێ ناگونجێ خۆی خۆی بەدی هێنابێ، بەڵکوو دەبێ بەدیهێنەرێك، دروستکەرێك بەدی هێنابێ ئەو بەدیهێنەرە خوای پەروەردگارە!!

کە سەیری قورئانیش دەکەین دەبینین بە ئاشکرا ئەوە دەچەسپێنێ کە بونەوەر سەرەتای هەیەو شاکاری کەریمی کارسازە، ئەوەتا دەفەرموێ:

{أَوَلَمْ يَرَوْا كَيْفَ يُبْدِئُ اللَّهُ الْخَلْقَ} (١٩) سورة العنكبوت:

واتــە: ئایــا ئێــوە نــابینن خــوا چــۆن شــت دروســت دەکــاو مــەخلوقات بــەدی دەهێنێ؟! ئابەو جۆرە جارێکی تریش رۆژی رەستاخیز دروستیان دەکاتەوە!

لە شوێنێکی تردا قورئان ئەوە دەدرکێنێ کە کەون بەرەو رۆژی نەمانی دەڕوا ئــەو رۆژەش رۆژی دواییــە رۆژی قیامەتــە لــەو رۆژەدا هــیچ وزەیــەکی بونــەوەر نامێنێ خۆریش هیچ نورێکی نابێ‌و ئەستێرەکان لێڵ‌و تاریك دادێن.

{إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ، وَإِذَا النُّجُومُ انكَدَرَتْ} (١ - ٢) سورة التكوير:

واتە: ئەی محمد! پێیان بڵێ: بـا یـادی ئـەو رۆژە بکەنـەوەو لـەو رۆژە بترسـن کەخۆر روناکی نامێنێ‌و تاریك دادێ!! کاتێـك ئەسـتێرەکان هەڵـدەوەرن‌و رەنگیـان دەگۆڕێ‌و نوریان نامێنێ ئیتر دوای ئەوە سەر لەنوێ باری تـەعالا بـە شـێوەیەکی تر خەڵك دروست دەکاتەوە.

## گۆڕانکاری‌و بەرەو پێش چوونی کەون یەکێکە لە نیشانەکانی خوایەتی خوا (التطور من آيات الله)

دوکتۆر (جۆرج ایرل دافیز) پسپۆڕ لە تیشکی خۆردا دەڵێ: ئـەو گۆڕانکـاری‌و پێـشکەوتنەی زانـست لـە کەونـدا دەری خـست خـۆی لـە خۆیـدا بەڵـگەیە لەسـەر هـەبوونی خـوا چونکە هـەر لـەو وردیلـە گەردیلانـەی کـە ئەوەنـدە وردن لەبـەر وردییـان نـابینرێن‌و بۆشـاییان نییـە ملیۆنـەها ئەسـتێرەو مـانگ‌و خـۆرو زەوی دروست بووە هەریەکەیان شێوەو روخسارێکی تایبـەتی هەیـەو تەمـەنێکی دیـاری کراوی هەیە، بە گوێرەی قانون‌و یاسایەکی دامەزراو دێن‌و دەچن، بـە جۆرێـك کـە عەقڵ‌و هۆشی ئادەمیزاد ناتوانـێ ئەنـدازەی ئـەو رێـك‌و پێکییـە بزانـێ!! تەنانـەت هەموو گەردیلەیەکی ئەم بونەوەرە بەڵـکوو لـە گەردیلـەش بـچوکتر.. واتـە شـتێك ئەوەنـدە بـچوك بـێ نـە هەسـت پێـی بزانـێ‌و نـە بەخەیاڵـدا رابـرێ لەبـەر وردی. هەریەکە یاساو نیزامی خۆی هەیە پێویستە بەو پێ‌و دانە بگەڕێ!!!.

ئەمانـەی وتـران چـەند بەڵـگەیەکی زانـستی بـوون لەسـەر هـەبوونی خـواو بەسیشن بۆ ئەو مەبەستە بە تایبەتی کە هەموویان بەڵگەی زانست ئامێز بوون؛ بەڵام لێرەدا بەڵگەی بەهێزتر هەیە کە باشتر هەبوونی خوا دەچەسپێنێ، چونکە لەو گەردیلەو وردیلە بچکۆلانە نەك هەر تەنها ئەستێرەو خۆرو مـانگو زەوی لێ پێکهاتووەو بەس؛ بەڵکوو هەر لەو گەردیلانە جۆرەها زیندەوەرو خاوەن عـەقڵو هۆشی پێشکەوتوو داهێنەرو بیرکەرەوەو سەیرو سەمەرەی دروست کردوە مرۆڤـی لێ پێهاتووە کە دەتوانێ فکر بکاتەوەو داهێنان بەدی بهێنێو شـتی جـوان دروسـت بکا بەڵکوو بەوەش قاییل نابێ توێژینەوە لە نهێنییـەکانی ژیـانو بوونـدا ئـەنجام بدا، بەڵێ هەموو گەردیلەو وردیلەیەکی ئەم کەونە شایەتی لەسەر هـەبوونی خـوا دەدەن وە ئەوانە هەبوونی خوا دەگەیەنن بەبێ ئەوەی پێویستمان بەوە هەبێ کـە بەڵگە بۆ ئەوە بێنینەوە کە مادە خۆی خۆی دروست ناکا.

دوکتۆر (ادوارد لوثرکیل) دەڵێ: هەڵبژاردنی سروشتی بۆ خۆی یەکێکە لـەهۆ میکانیکیەکانی تەطەوور، کەوابوو تەطەوور بۆ خۆی یەکێکە لە یاساکانی کـەونو قانوونی سروشتیەتی، ئەویش وەکوو باقی قانوونە زانستییەکانی تر دەوری خـۆی دەبینێ، بەڵام دەورێکی سەرەکی نا چونکە ئەو خۆی پێویـستی بـە کەسـێك هەیـە کـە بیخاتـە روو بـەدی بهێنـێ گومـانیش نیـە کـە ئـەو دەرخـستنو دیـاری کردنـە کـرداری پـەروەردگارەو ئـەو ئـەنجامی داوە، ئـەو شـتانەی بـەهۆی گـردو کـۆی هەڵبـژاردنی سروشـتییەوە پەیـدا دەبـن هـەر خـوا دروسـتی کـردوون، چـونکە قانوونەکەی کە ئەو شتە گەردن کەچیەتی خوا دروستی کردوە چونکە ئاشکرایە هەڵبژاردنی سروشتی بۆ خۆی هیچی پێ دروست ناکرێ، ئەوەی کە ئـەنجامی دەدا تەنها بریتییە لەوە کە بڕێ شـتی بونـەوەر بـە مەبەسـتی مانـەوە یـان فـەوتان لـە نێوان چەند جۆر ڕێبازدا ڕێبازێکی تایبـەتی دەگـرنو پێیـدا دەڕۆن. ئـەو شـتانەی کە هەڵبژاردنەکەیان تێدا ئەنجام دەدرێ بۆ خۆیان گـەردن کەچـی یاسـای ڕەگـەزو ڕەچـەڵەکایەتیە ئـەم قـانونو یاسـایەش بـەبێ شـارەزاو ڕەهنومـا نـاڕۆنو هـەرگیز

گەردن کەچی رێکەوتی کوێر نابن، قەت سودفە لە بوونو نەبونیاندا دەورێکی نە کەم نە زۆری نیەو ناشێ بێ جا با مادییەکانو رێکەوت پەرستەکان هەر بۆ خۆیان بلێن... تیووری پێش کەوتنیش ئەوە قورئان بۆ خۆی دەستنیشانی کردوەو دەڵێ: {وَيَخْلُقُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ}:

واتە: پەروەردگار شتی واتان بۆ دروست دەکا کە هێشتا نەتان زانیوەو رەنگە بە خەیاڵیشتاندا رانەبوریبێ!!! ئەمەش ئەوپەری فراوانیی گۆڕەپانی پێشکەوتن دەگەیەنێو پێمان دەڵێ کە هەردەم کەون لە پێشکەوتندایەو گۆڕانکاریو تەطەوراتی بەسەردا دێ!!.

(هەڵبژاردنی سروشتی)ش کە رووبدا بە گوێرەی ئەو یاساو دابو نەریتانەوە پەیدا دەبن کە خوا دایناوەو دەیەوێ بەو جۆرە ژیان بڕوا بە رێوە، دەفەرموێ:

{فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاء وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ} (١٧) سورة الرعد:

واتە: پەروەردگار کاتێ لە ئاسمانەوە باران دەبارێنێ هەر دۆڵو شیوێك بە ئەندازەی خۆی لافاوی پێدا دەڕوا... ئەو لافاوە لەگەڵ خۆیا خشتو خۆڵو کەفو زبڵو زاڵ هەڵدەگرێ، جا هەرچی کەفو خشتو خۆڵەکەیە بە خۆڕاییو بەبێ سوود دەڕوا ئاوە سافەکەش لە زەویدا دەمێنێتەوە بۆ سوودو قازانجی ئادەمیزاد بەکار دەبرێ!.

## بەشی پێنجەم:

# یەکتایی خودا (وحدانیة الله)

بیروباوەڕی عەرەبەکان پێش هاتنی ئیسلام - ئیسلام بانگەوازی خوا بەیەك ناسینی کردوە - پوختەی خوا بەیەك ناسین لە ئیسلامدا - بەڵگەی عەقلی لەسەر تاكو تەنهایی خودا - یەکیەتی یاسا کەونیەکان نیشانەی یەکتایی خودان - هێرشی ئیسلام بۆ سەر فرە خواییەکان - مرۆڤ پەرستی - بت پەرستی – شەفاعەت - بڕێ سیفەتی خودا لە قورئاندا - پوکاندنەوەی شوبهەو نەنگ گرتن لە سیفەتەکانی خودا.

## بیرو باوەڕی عەرەبەکان لە پێش ئیسلام (عقائد العرب قبل الإسلام):

لە پێش هاتنی ئیسلامدا بت پەرستی بە تەواوی لە نیوە دوورگەی عەرەبی دا بڵاو بوبوەوە، لەشاری مەککەدا هەموو خێزانێك بتێکی هەبوو دەیپەرست. تەنانەت ئەگەر یەکێکیان سەفەری بکردایە دواکاری ئەوەبوو بتەکەی ماچ دەکردو کڕنووشی بۆ دەبردو خودا حافیزی لێدەکرد، کەلە سەفەرەکەشی دەگەڕایەوە یەکەم کرداری ئەوەبوو دەبوایە ماچو موچێکی بتەکەی بکردایە. جا وەکوو مێژوو نووسان نووسیویانەو قورئانیش باسی کردوە چەند بتێك لەنێو بتەکانی تردا مەشهوورو بەناوبانگ بوون، هەرە مەشهووریان (سواع ویغوث ونسر ومناة وود واللات والعزی) بوو!!

هەندێ لە عەرەبەکان ئەستێرەیان دەپەرست، بە تایبەتی زۆریان مانگو خۆریان دەپەرست، هەندێکی تریان فریشتەیان دەپەرست، هەندێکی تریان جنۆکەیان دەپەرست، هەروەها پەرستنی گیانی مردووی کۆنیان لەناودا باو بوو، هەر بۆیەش پێغەمبەری ئیسلام (درودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بە هاوڕێکانی کە تا دەتوانن گۆڕستانیان سادەبێو گومبەزو خانوویان لەسەر نەبێ، هەوەها نەچن گۆڕستانەکانیان بکەن بە شوێنی نوێژو مزگەوت. تەنانەت بڕێ عەرەبی پێش ئیسلام بڕوایان بە پەرستنی گیانی مردووان هەبووە بەلایانەوە ئەو گیانانە کاریگەریی تەواویان لە ژیانی زیندواندا هەبووە.

هەقایت خوانو بەیت بێژیان زۆریان لە باسی کاریگەریی ئەو گیانانە گوتووە، زۆر بە دوورو درێژی باسی ئەوەیان کردوە کە پاش مردن چۆن ئەو گیانە لە لاشە جیا دەبێتەوە، چۆن بە دەوری گۆڕدا دەسوڕێتەوە، چۆن بەسەر گۆڕەکەدا دەشنێتەوەو باڵە تەپێ دەکا، خۆی دەکا بە باڵندە بە دەوریدا باڵە فرتێ دەکا. بەتایبەتی ئەگەر مردووەکە کوژرابێ‌و تۆڵەی نەسێندرابێ!!

بەلایانەوە گیانەکان توانیویانە بە زۆر شێوە خۆیان بۆ مرۆڤە زیندووەکان بە دەرخەن، یان ئەو گیانانە چونەتە بەر ئاژەڵ‌و باڵندەو خشۆکەوە، لەم رووەوە بیرو باوەڕی رەشبینی‌و گەشبینییان تێدا بڵاوبۆتەوە، لە بڕێ حەیوان ترساون‌و بینینی بڕێ زیندەدریان بەلاوە سامناك بووە. هەروەها دابو نەریتی ئاژەڵ پەرستن‌و رووەك پەرستنیان بە زۆری لەناودا بڵاو بوبووەوە، تەنانەت لەبەر پیرۆزیچەند تیرەو بەرە بابو هۆزو خێڵیان بە ناوی ئاژەڵەوە ناو نابوون، لەمانە وەکوو هۆزی (کەلب= سەگ) تیرەی (ذئب= گورگ) بەرەی (دوبب= ورچ) خێڵی (نەسر= هەڵۆ) و (ثەعلەب= رێوی) و (هِرَە= پشیلە)، (بەططە= قاز)، (ثەور= کەڵەگا).... هتد. هەروا بڕێ تیرەشیان بەناوی رووەك‌و درەختەوە ناو نابوون!

بەشێکی تری عەرەبەکان لە پێش ئیسلامدا گەردون پەرست بوون، بڕوایان بە خودا نەبوو، زیندوو بوونەوەیان بەلاوە درۆ بووە، ئەمانە پێیان دەگوترا: (دەهرییە) گەردون پەرست، قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ کردوون‌و دەفەرموێ:

{وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ}:

واتە: ئەو بێ ئەقڵانە دەڵێن: ژیان هەر ئەم ژیانی دونیایەو زیندو بوونەوەی قییامەت درۆیە، ئاوا وەك هەیە دەژین‌و دەمرین، ئەوی دەشمان فەوتێنێ گەردوونەو چەرخی چەپگەردەو بەس!

کۆمەڵێکی تری عەرەبەکان گەرچی نە لەسەر ئایینی جوولەکە بوون‌و نە لەسەر ئایینی مەسیحی بوون، کەچی بڕوایان بە هەبوونی یەك خوا هەبوو یەك خوایان دەپەرست، راڤەکەرانی قورئان‌و مێژوو نووس‌و چیرۆك خوانان ناوی کۆمەڵێك لەمانەیان باس کردوە، بەڵام باسکردنەکەیان چەواشەو تێکەڵ‌و پێکەڵ،

بــە وردی لــە بــیرو باوەڕیــان نەکۆڵیونــەوە، ئەمانــە پێیــان دەگــوترێ: (الحنفــاء) دەشــڵێن لەســەر ئــایینی حــەزرەتی ئیــبراهیم بــوون (درودی خوای لەسەر بێ). لــە هەنــدێ ریوایــەتو ســەر گوزەشــتەدا وا دەردەکــەوێ کــە ئەوانــە نامــەی ئاسمانیــان خوێندۆتەوەو بە وردی تێی فکریون. خۆیان لە خواردنەوەی شەرابو بادەو مەی پاراستووە، کاری نابەجێیان هەرگیز نەکردوە، ئامۆژگاری خەڵکیان کردوە کە خۆیان لە بت پەرستی دوور بخەنەوەو وازیان لێ بێنن!! ئەو ئایینانەی پێش هاتنی ئیسلام لە دوورگەی عەرەبدا باوبوون برێتی بوون لە ئاگر پەرستی (المجوسية) صابیئەیی (الصابئه) جولەکەیی (اليهودية) فەلەو دیان (المسيحية).

ئاگر پەرستی: وەکوو مێژوو نووسان دەڵێن لە فارسەکانەوە وەریان گرتووە...[1]

سوببەکان دوو تاقمن، تاقمێکیان پێیان دەگوترێ: (صابئة حنفاء) سوببە خوا پەرستەکان. بەشێکیشیان کافرنو هاوبەش بۆ خودا دادەنێن، ئەمانە یان ئەستێرە پەرستن. هەندێ لایان وایە ئەمانە بۆیە پێیان دەگوتێ (صابئة- لەرێ دەرچووەکان) چونکە لە فەرمانی سەرەکی ئایینەکەی خۆیان دەرچوونو بە کەیفی خۆیان لە هەموو ئایینێ هەرچییان بەدڵ بێ وەری دەگرن!.

---

[1] لە کۆندا فارسەکان خودا پەرست بوون، دوایی رێزی خۆرو مانگو ئەستێرەکانیان گرتووە. کە زەردەشت پێغەمبەر هات داوای لێ کردن کە خودای تاکو تەنیا بپەرستنو بت پەرستی لابردو ووتی: نوری خودا ئەدرەوشێتەوە لە هەموو شتێکی رۆشنو خاوەنی گڕو بڵێسەدا، وە داوای لێ کردن کە ئاگرو هەواو خۆڵو ئاو پیس نەکەن، لە دوای خۆی زانایانی ئایینەکەی هاتن ئایینەکەیان گۆڕیو شەریعەتو ئایینێکی جیاوازیان بۆ زەردەشتییەکان دانان هەر شتێك ئاگری بوێ لێیان قەدەغە کردن تەنیا رێگای ئەوەیان دان کە خەریك بن بە کشتو کاڵو بازرگانییەوە، ئەمە وردە وردە سەری کێشا بۆ ئاگر پەرستیو هاتن ئاتەشگەدەیان داناو پەیکەریان بۆ ئاگر داناوهەموو ئایینو باوەڕەکەیان لەسەر پەرستنی ئاگر کورت کردەوە ئایینە راستییەکە لەبیر چووەوەو خرایە ژێر لێوەوە. سەیری کتێبی: ژیانی پێغەمبەری مەزن (محمد) دروودی خودای لەسەر بێ (١٢٠) بکە.

دانیشتوانی مەککەش (وەکوو قورئان ئاماژەی بۆ دەکاو شیعری سەردەمی پێش ئیسلام دەی گەیەنێ) هەیان بووە بڕوای بە هەبوونی خودایەکی بەدیهێنەری ئاسمانو زەوی هەبووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا هاوبەش پەیداکەر بوونو بڕوایان وابووە کە خودا ئەم هەڵوێستەی ئەوانی لا خۆشە، بەلای خۆیانەوە بت پەرستییەکەیان دەبێتە هۆی نزیك بوونەوەیان لە خوداو ئەم بتانە لای خودا شەفاعەتیان بۆ دەکەن.

ئەوەتا خودای مەزن لەسەر زمانی ئەوان دەفەرموێ: { مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى} ئێمە بۆیە تاعەتی ئەم بتانە دەکەینو دەیانپەرستین هەتا لە خودامان نزیك بخەنەوە!! بە کورتی خودا بە یەکناسین لای عەرەبەکانی پێش ئیسلام تێکەڵاو بە باوەڕی فرە خودایی بوو بوو، لەگەڵ بڕوا بە خودا بڕوایان بە چەند خودایەکی تر هەبوو، بۆیە بتەکانیان دەپەرستن هەتا لە خودای مەزن نزیك ببنەوە، هەبوونی کوڕو کچیان بۆ خودا بە ڕەوا دەبینی، پێیان وابوو فریشتە کچی خودان، باوەڕیان وابوو کە قوربانی کردن بۆ بتەکانیان لە خودایان نزیك دەکاتەوە، بە دڵی خۆیان ئەو بتانە ڕۆژی قیامەت لای پەروەردگار شەفاعەتیان بۆ دەکەن! ئیتر کە ئایینی ئیسلام هات ئەم بیرو باوەڕە پوچانەی هەموو لێك هەڵتەکاندنو لە بێخی دەرهێنان، ڕێبازی خودا بە یەکناسینی لە خەوشی شیركو هاوبەش پەیداکردن بۆ زاتی بێچوون پاك کردەوە!!

## ئایینی ئیسلام بانگەوازی خوا بەیەکناسینی کردوە:

پێش هاتنی ئیسلام عەرەبەکان جۆرەها ئایینو بیرو باوەڕیان لە نێودا بڵاو بوبوەوە هەریەکە بۆ خۆی ئاینێکی پەیڕەوی دەکرد، کە ئیسلام هات هەموو ئایینەکانی بە بەتاڵو پوچ دانا، ئایینی خودا پەرستی ڕاستی بە ڕەوابینی، خودا بە یەکناسینی (بەزاتو سیفاتەوە) چەسپاندو داکۆکی لەسەر خودا پەرستی کرد، خەڵکی هەڵنا بۆ ئەوەی گەردن کەچی تەنیا هەر بۆ خودا بکەنو بەس!!

قورئان دەفەرموێ:

{وَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ لاَّ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ} (١٦٣) سورة البقرة:

واتە: خودای بە راستو حەق خودایەکی تاکو تەنیایە هیچ خودایەك نیە شایانی پەرستنو گەردن کەچی بۆ کردن بێ جگە لە خودای گەورەو بەخشندەو میهرەبان خودایەك کە بەخشندەو میهرەبانە لە جیهاندا بۆ هەموو زیندەوەرێك لە قیامەتیشدا بۆ موسوڵمانان!!

بەڵێ: خودا بەیەك ناسین بەردی بناغەی ئایینی ئیسلامە پێویستە هەموو موسوڵمانێك بە دڵ بڕوای هەبیو بە زوبانیش بیڵێو بە کردەوەش رەفتاری پێبکا، هەموو موسوڵمانێك دەبێ شایەتمان بهێنێو بڵێ: (أشهد أن لا الـه لا الله) واتە بە دڵ بڕوام هەیەو بە زوبان دەیڵێم کە هیچ خودایەك نیە شیاوی پەرستن بێ جگە لە (الله) وشەی (الله) ناوێکە تەنیا بۆ خودای پەروەردگارو بەدیهێنەر بەکار دەهێنرێ وشەی (الا له) بۆ هەموو پەرستراوێك بەکار دەهێنرێ راست بێ یان درۆ، کەوابوو رستەی (لا اله) سڕینەوەو نەهێشتنو بەتاڵ کردنەوەی هەموو خودایەکە وشەی (الا الله) چەسپاندنە بۆ هەبوونی خودایەکی زانای بە تواناو حەقو راست، ئەویش خودای پەروەردگارە!!

کەوابوو موسوڵمان کە شایەتمان دێنێو دەڵێ: (لا إلـه إلا الله) ئیعترافە بە زوبانو بڕوایە بە دڵ بە یەقینو زانینەوە کە هیچ شتێك شیاوی پەرستن نیە جگە لە خودای پەروەردگار، هەر شایەتمانێکی بەم شێوە بێ شایەتمانە بە هەبوونی خوداو تاکو تەنهایی!!

## پوختەی خودا بەیەك ناسین لە ئیسلامدا (روح التوحيد في الإسلام):

پەروەردگار وای داناوە کە هەموو کات بیرو باوەڕی دڵو دەروون ئاوێنەی باڵا نومابن بۆ کردارەکانی جەستە، هەر کردەوەیەك (چاك یان خراپ) لە مرۆڤەوە پەیدا ببێ ئەوە بەبێ شك کانی سەرەکیو هۆی راستەقینەی چۆنیەتی ئەو بیرو

باوەڕەیە کە لە دڵیدا هەیە. کەوابوو هەرکەسێك بە چاکی خودا بەیەك بناسێ و هیچ شك و گومانی لە خودایەتی ئەودا نەبێ و لە دڵێکی پاکی بێ خەوشدا ئەم باوەڕە جێگیر بووبێ بێگومان چی کاری باشە لێیەوە دەردەچێ، چونکە بڕوای بە راست و خودا بەیەك ناسینی تەواو ئەوە لە دڵی مرۆڤەکەدا دەچەسپێنێ کە هیچ خودایەك نیە شیاوی پەرستن بێ، هیچ کەس نیە زیندو کردنەوەی بەدەست بێ و خۆی گیان وەرگرەوە بێ، هیچ کەس نیە رزق و رۆژی دەربێ و سوود بەخش بێ جگە لە خودای پەروەردگار.. بۆیە موسوڵمان هەرکاتێ بە تەواوی خودای بە تاك و تەنیا ناسی، سوودی سەربەخۆیی و ئازادیی وەردەگرێ، هەست بە رێزو شانی مرۆڤی خۆی دەکاو سەری بەندەگی هەر بۆ خودا دادەنەوێنێ گەردن کەچی کەسی تر نابێ، بەڵێ هەرکاتێ مرۆڤ بڕوای بە تاك و تەنیایی خودا بەهێز بوو بۆی دەردەکەوێ کە ئەو بەلاو مۆتەکەیەی ئەمڕۆ سواری شانی کۆمەڵ بووەو زوربەی خەڵك گەردن کەچ و دەست بەسینگەوەیە بۆ پاشاکان و سەرۆکەکان و بۆ زاڵم و بەرژەوەند پەرستەکان، بۆ شێخە دەست برەکان، بۆ پیاوە بەناو ئاینییەکان، ئەمانە هەموو هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی باوەڕیان و هەست نەکردنیان بە هێزی کاریگەری خودای هەموو خودایان و کەسی بێ کەسان! ئەگینا ئەگەر بە تەواوی بڕوایان بە خودایەتی خودا هەبێ، چۆن دەچن گەردن کەچی دەنوێنن بۆ بەندەیەکی قنگ هەڵپچراوی بی وەج و توانا کە لە راستیدا چی لەو مرۆڤ گەلە زیاتر نیە، ئەویش وەکوو ئەوان گۆشت و خوێن و ئێسقان و پێستەو خاوەنی ورگ و ریخۆڵەیە!! هەر بۆیەشە قورئان بەرگریی دەکا لە پەرستنی کەسێ جگە لە خودای گەورەو میهرەبان و دەفەرموێ:

{إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللّهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ فَادْعُوهُمْ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ} (١٩٤) سورة الأعراف:

واتە: بەڕاستی ئەو بتانەی ئێوە جگە لە خودای گەورە دەیان پەرستن و گەردن کەچیانن ئەوانیش وەکوو ئێوە بەندەی خودان، دروستکراوی خۆنی،

بەڵکوو ئێوە باشترن و تەواوترن چونکە ئێوە دەبیسن ئەوان نابیسن ئێوە دەڕۆن ئەوان ناتوانن بڕۆن. ئێوە قسە دەکەن ئەوان ناتوانن نقەیان لێ بێ، تەنانەت ئەوان هەر زیندو نین دەبانگیان بکەن بزانن ئاخۆ وەڵامتان دەدەنەوە؟ دەی با وەڵامتان بدەنەوە ئەگەر ئێوە راست دەکەن ئەمانە سودو زەرەریان بە دەستە؟!

لە شوێنێکی تردا خودای مەزن فەرمان دەکا بە پێغەمبەر کە رووبکاتە گەلەکەی و پێیان بڵێ: ئایا ئەو بتانەی کە ئێوە بە خوداتان داناون و (جگە لە خودا) دەیان پەرستن، ئەگەر خودای مەزنی من، تووشی زیانێکی کردم و بەڵایەکی بەسەر شاندا هێنام، ئایا ئەو بتانە دەتوانن ئەو زیانەم لێ دوور بخەنەوە؟ یان ئەگەر خودا ویستی میهرەبانی و رەحمەتێکم بەسەردا بڕێژێ ئایا ئەوان دەتوانن نەهێڵن ئەو سوودەم بۆ بێ؟!

هەروەها خاوەن بڕواو موسوڵمانی باش لە بڕوای خودا یەکناسیندا دوو رەوشتی بەرزی دەسکەوت دەبێ ئەو دوو رەوشتەش رێز گرتنی خۆیەتی و داوێن پاکی و دەست پاکییە، واتە چاو چنۆك و دەست پانکەرەوە نابێ بۆ ماڵی دونیا چونکە بڕوای بەوە هەیە کە هیچ کەس رۆژی دەر نیە جگە لە خودای مەزن {اللَّهُ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاء مِنْ عِبَادِهِ وَيَقْدِرُ لَهُ} (٦٢) سورة العنكبوت:

واتە: خودای گەورە رزق و رۆژی فرە دەدا بەو بەندانەی خۆی کە خۆی ئارەزووی لێبێ بە ئارەزووی خۆی رزقی هەندێکی تریشیان سوار دەکاو بە فەقیری دەژی و دەوڵەمەند نابێ. کەوابوو رزق و رۆژی زۆرو کەمی بە دەست خودایە، ئیتر پێویست ناکا مرۆڤ بۆ ماڵی دونیا لە رێزو شان و شکۆی خۆی کەم بکاتەوە!

هەروەها موسوڵمان هەرکاتێ بەباشی خودای بە تاك و تەنیا ناسی سیفەتی ئازایەتی و پیاوەتی و چاو نەترسانی تێدا گەشە دەکاو لە خودا نەبێ لە کەس ناترسێ، چونکە بڕوای وای لێ دێ کە هەر خودا خاوەنی ئەوە بەمەش بە تەواوی عیززەتی نەفسی بۆ پەیدا دەبێ و تێکۆشان و داکۆکی کردنی لەسەر ئایین و وڵات و ناموس و خوێن و خۆبەخت کردن لە پێناویانا بەلاوە ئاسایی دەبێ و لەسەر حەق و

راستی خۆ بەخت دەکاو جگە لە خودا لە کەسی تر ناترسێ. چونکە بڕوای وایە کە هەموو گیانێك بە دەست خودایەو هەموو تەمەنێك ماوەیەکی دیاری کراوی هەیەو ئەجەل پێش‌و پاش ناکا.

{وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَنْ تَمُوتَ إِلاَّ بِإِذْنِ الله كِتَابًا مُّؤَجَّلاً} (١٤٥) سورة آل عمران:

واتە: هیچ نەفسێك بۆی نیە کە بمرێ مەگەر بە ئیزن‌و رەزای خودا نەبێ، پەروەردگار مردنی لەسەر هەموو زیندویەك نوسیوەو مردنی هیچ کەسێك لەکاتی خۆی پاش‌و پێش ناکا.

## بەڵگەی ئەقڵی لەسەر تاك‌و تەنیایی خودا :

ئیسلام ئایینی عەقڵ‌و بیرو هۆش‌و مەنتیقە، هەرگیز فەرمان بە پەیڕەوی کەرانی ناکا بۆ بڕوایەك یان بۆ وەرگرتنی رایەك هەتا چەند بەڵگەیەکی عەقڵی نەهێنێتەوە!!.

بۆ نموونە فرە خوایی (تعدد الآلهة) ئەگەر بگونجێ دەبێ ئادەمیزاد بەندەی ئەو خوایانە بێ، ئیتر ئەرکی سەرشانی هەر مرۆڤێك (بە هۆی زۆری خواکانەوە) زۆر گران دەبێ، چونکە هەموو خودایەك بەشی خۆی تاعەت‌و خێرو خێرات‌و قوربانی گەرەکە، زۆر زەحمەتە مرۆڤ بتوانێ هەموو خوداکان رازی بکا، بۆیە قورئانی پیرۆز لەسەر زمانی حەزرەتی یوسف (دروودی خوای لەسەر بێ) روو دەکاتە هاوبەش پەیداکەرەکان‌و پێیان دەڵێ:

{يَا صَاحِبَيِ السِّجْنِ أَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِ إِلاَّ أَسْمَاء سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَآؤُكُم مَّا أَنزَلَ اللّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ} (٤٠) سورة يوسف:

واتە: ئایا مرۆڤ چەند خودایەکی جیا جیا بپەرستێ باشترە یان خودایەکی تەنهاو بە دەسەڵات‌و شایانی پەرستن. بە راستی ئەو خودا درۆزنانەی ئێوە دەیان

ڕاستی خۆ بەخت دەکاو جگە لە خودا لە کەسی تر ناترسێ. چونکە بڕوای وایە کە هەموو گیانێك بە دەست خودایەو هەموو تەمەنێك ماوەیەکی دیاری کراوی هەیەو ئەجەل پێش و پاش ناکا.

{وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَنْ تَمُوتَ إِلاَّ بِإِذْنِ اللهِ كِتَابًا مُّؤَجَّلاً} (١٤٥) سورة آل عمران:

واتە: هیچ نەفسێك بۆی نیە کە بمرێ مەگەر بە ئیزن و ڕەزای خودا نەبێ، پەروەردگار مردنی لەسەر هەموو زیندویەك نوسیوەو مردنی هیچ کەسێك لەکاتی خۆی پاش و پێش ناکا.

## بەڵگەی ئەقڵی لەسەر تاك و تەنیایی خودا :

ئیسلام ئایینی عەقڵ و بیرو هۆش و مەنتیقە، هەرگیز فەرمان بە پەیڕەوی کەرانی ناکا بۆ بڕوایەك یان بۆ وەرگرتنی رایەك هەتا چەند بەڵگەیەکی عەقڵی نەهێنێتەوە!!.

بۆ نموونە فرە خوایی (تعدد الآلهة) ئەگەر بگونجێ دەبێ ئادەمیزاد بەندەی ئەو خوایانە بێ، ئیتر ئەرکی سەرشانی هەر مرۆڤێك (بە هۆی زۆری خواکانەوە) زۆر گران دەبێ، چونکە هەموو خودایەك بەشی خۆی تاعەت و خێرو خێرات و قوربانی گەرەکە، زۆر زەحمەتە مرۆڤ بتوانێ هەموو خوداکان ڕازی بکا، بۆیە قورئانی پیرۆز لەسەر زمانی حەزرەتی یوسف (دروودی خوای لەسەر بێ) ڕوو دەکاتە هاوبەش پەیداکەرەکان و پێیان دەڵێ:

{يَا صَاحِبَيِ السِّجْنِ أَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِ إِلاَّ أَسْمَاء سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَآؤُكُم مَّا أَنزَلَ اللّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ} (٤٠) سورة يوسف:

واتە: ئایا مرۆڤ چەند خودایەکی جیا جیا بپەرستێ باشترە یان خودایەکی تەنهاو بە دەسەڵات و شایانی پەرستن. بە ڕاستی ئەو خودا درۆزنانەی ئێوە دەیان

پەرستن (جگە لە خودا) خودانین‌و ناوتان ناون خودا، ئێوەو باوك‌و باپیرتان بە خوداتان داناون، ئەگینا خودای پەروەردگار هیچ بەڵگەیەکی لەسەر خودایەتی ئەوان نەناردووە، فەرمانڕەوایی‌و دەسەلاتتداری‌و خودایەتی هەر بۆ ئەو خوایەیە کە ناوی (الله)یە، فەرمانیشی فەرمووە بە بەندەکانی کە تاعەت‌و بەندایەتی هەر بۆ ئەو بکەن‌و کەسی تر بە خودا نەزانن.

ئێمە کە سەیری ئایەتەکە دەکەین دەبینین قورئان هەر لە سەرەتاوە جیاوازی نێوان ئەم دوو هەڵوێستەی دەرخستووە جیاوازی لە نێوان ئەوەدا مرۆڤ بەندایەتی خودایەکی تاك‌و تەنیا بکاو هەموو ئادەمیزاد گەردن کەچی فەرمانی بن چەند ئەرکی سەر شانیان سووك دەبێ‌و چۆن یەکیەتی لەنێو مرۆڤدا دەچەسپێ، تا چ ئەندازەیەك هۆیەکانی ناکۆکی لەناو دەچن. بە تایبەتی ئەو ناکۆکیانەی کە بە هۆی بیرو باوەڕی جیاوازەوە سەریان هەڵداوە! ئەمجار قورئان بارەکە دەگۆڕێ‌و دەست دەکا بە سەر کۆنەی موشریکەکان‌و موناقەشەیان لەگەڵ دەکاو دەڵێ: ئەوە بە چ عەقڵێك گەردن کەچی ئەو خودا درۆزنانەن‌و تاعەتیان بۆ دەکەن، چۆن عیبادەت بۆ خودایەك دەکەن کە خۆتان تاشیوتانەو دروستتان کردوە، ئێوەو باوك‌و باپیرتان ناوی جوێ جوێ‌و گەورە گەورەتان بۆ دۆزیونەوە، ئەگینا خوا بەڵگەیەکی لەسەر خودایەتی ئەوانە بۆ ئێوە نەناردووە هەتا ئێوە لە جیاتی خودای مەزن ئەوان بپەرستن!!!

کەوابوو مرۆڤ دوای ئەم وردەکارییە لە نهێنیەکانی کەون‌و ئەو شتانەی لە خۆی گرتووە، ئەو دەست ڕەنگینییەی لە دروست کردنەکەیدا بەکارهاتووە، ئەو یەکیەتی ئامانجەی گونجانی لە نێو ئەندامەکاندا پەیدا کردوە، دوای لێ وردبوونەوە لە ئەمانە ناچار دەبێ بڕوا بهێنێ بە تاك‌و تەنیایی خوداو بە ئاشکرایی خودایەتی ئەو لە هەموو ڕوویەکەوە، هەر ئەوکاتەش جوانی‌و ڕەوانی ئەم دەقە قورئانیەی بۆ دەردەکەوێ کە دەفەرموێ:

{أَمِ اتَّخَذُوا آلِهَةً مِّنَ الْأَرْضِ هُمْ يُنشِرُونَ، لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا} (٢١ - ٢٢) سورة الأنبياء:

واتە: ئایا ئەو کافرانە بۆ خۆیان لەسەر زەوی چەند خودایەکیان دیاری کردووەو دەیان پەرستن هیوایان پێیانە مردوو زیندوو بکەنەوە؟! با وا نەزانن‌و واز لەو باوەڕە پڕوپوچانە بێنن، چونکە ئەو خودا درۆزنانە زۆر لەوە کەمترن بتوانن مردوو زیندو بکەنەوە، خۆ ئەگەر لە ئاسمان‌و زەویدا چەند خودایەکی تر (جگە لە خودای گەورەو مەزن) هەبوونایە ئەوە زۆر زوو ئاسمان‌و زەوی تێك دەچوون‌و دەڕوخان.

مامۆستا شێخ (محمد عبده) لە راڤەی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ئەگەر چەند خودایەك هەبوونایە بەبێ گومان کێشەیان تێ دەکەوت، لە زانین‌و ویست‌و ئیرادەدا، هەریەکەیان شێوەیەکی پەسەند دەکرد ئیتر کردەوەکانیشیان بە گوێرەی ویستەمەنی‌و زانینەکەیان جیاوازی دەبوو بەوەش نیزام‌و یاسای گەون تێك دەچوو، بەڵکوو هەر نیزامی نەدەبوو بەڵکوو هەر هیچ شتێك لە بونەوەردا نەدەبوو چونکە بوونی هەرشتێك پێویستی بە جۆرە ویستەمەنی‌و زانینێکی تایبەتی هەیە، جا کە خوداکان زۆر بوون دیارە هەریەکەیان جۆرە عیلم‌و ئیرادەیەکی هەیە جیا لەهی ئەوانی تر، کە بوون‌و پەیدا بوونی شت پەیوەندە بەم دوو شتەوە: ئەوکاتە وای لێ دێ پەیدا بوونی شت دەبێ بە چەند پەیدا بوونێکی جوێ جوێ رووبدات، بە گوێرەی زانست‌و خواستی خوداکان ئەمەش مەحاڵەو ئەقڵ‌و هۆش نای گری‌و لە راستیدا ناگونجێ!!

دەی باشە ئەوە ئێمە بە چاوی خۆمان دەی بینین کە گەون بە رێك‌و پێکی دەڕوا بە ڕێوەو هەموو شتێکی بونەوەر بە ئەندازەو رێژەی تایبەتی خۆی لە هاتوو چودایەو کاری خۆی ئەنجام دەدا کەوابوو دیارە یەك خودا هەیەو کەس رادەی ناگەوێ هاوبەشی بکا. خودای خاوەن شان‌و شکۆ چ زاتی چ صیفاتی بێ چوون‌و بێ هاوتایە، لە بوونیا بێ چوونەو لە کارەکانیدا بێ هاوەڵ‌و بێ چەندو چوونە.

جا وەنەبێ قورئانی پیرۆز بەمەندە وازی هێنابێ واتە کە باسی تێکچوونی گەونی کرد بە هۆی فرە خودابیەوە ئیتر بیبڕێتەوە، بەڵکوو بە بەڵگەوە بڕێ دیاردەی تێکچوونەکەش روون دەکاتەوە سەری سەرپێچیکەر دەکوتێتەوەو بەڵگەی بەهێزی تر دەخاتە روو دەفەرموێ:

{مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَهٍ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَهٍ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ} (٩١) سورة المؤمنون:

واتە: خودای پەروەردگار هەرگیز منداڵی بۆ خۆی رەوا نەبینیوە، خودای تری لەگەڵدا نیە، ئەگەر وەها بوایە خودای تری لەگەڵدا هەبوایە بە گوێرەی خۆی بەشی خۆی جیا دەکردەوەو سنووری بۆ مەملەکەتی خۆی دادەناو کەناری لە خوداکەی تر ئەگرتو، بازێکیان بەسەر بازێکیاندا زاڵ دەبوون، ئیتر ئەوکاتە دەردەکەوت کە ئەمانە هیچ کامێکیان خودا نین کەوابێ ئێمەی موسوڵمان خودا بە دوور دەگرین لەو سیفەتانەی ئەوان بۆیان داناوە خودای ئێمە زاناو ئاگادارە بە هەموو شتێکی پەنهانو ئاشکرا، زۆر دوورە لەوەی کە هاوبەشو شەریکی هەبێ.

## یەکیەتی یاسا گەونیەکان نیشانەی تەنهایی خودان:

یەکێك لەو بەڵگانەی سەر سوڕهێنەرەو تەنها قورئان بە بەڵگە لە لەسەر تاكو تەنیایی خودا هێناویەتی: سەلماندنی یەکیەتی یاسا گەونیەکانە، ئەو یاسایانەی کە بە تاكو بە کۆمەڵ بەڵگەن لەسەر هەبوونی خودایەکی بەدیهێنەری تاكو تەنیا، ئەوەتا لە قورئاندا هاتووە دەفەرموێ:

{قُل لَّوْ كَانَ مَعَهُ آلِهَةٌ كَمَا يَقُولُونَ إِذًا لاَّبْتَغَوْاْ إِلَى ذِي الْعَرْشِ سَبِيلاً سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوًّا كَبِيرًا تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَـكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا} (٤٢ - ٤٤) سورة الإسراء:

واتــە: ئــەی محمــد! بــەو کافرانــە بڵــێ: ئەگــەر لەگــەڵ خــودادا خــودای تــر هەبوونایــە (وەکــوو ئــەوان دەڵــێن) ئــیتر ئــەو خودایانــە هەریەکــەیان ڕێبــازێکی دەگــرت‌و دەچــوون بــۆ لای خــودای خــاوەن عــەرش‌و کورســی لــە گــەڵی دەکەوتنــە کێشەو نیزاعــەوە تــاوەکوو فــەرمانڕەوایی لــە دەســت دەربهێــنن!! خــودا زۆر دوورو پــاك‌و خاوێنــە لــەوەی کــە خــودای تــری لەگــەڵ بــێ: چــۆن دەشــێ ئــەو هاوبەشــی هەبێ؟؟ خۆ ئاسمانەکان‌و زەوی‌و چی لەوان دایە، هەموویان بــە تــاك‌و بــە کۆمــەڵ شایەتی تاك‌و تەنهایی ئەون‌و تەقدیسی ئەو دەکەن سوپاس‌و ستایشی ئــەو بــەجێ دەهێنن بــەڵام ئێــوە تێیــان ناگــەن‌و نــازانن ئــەوان چــۆن حەمــدو تەقدیــسی خــودا دەکەن!!؟

ئەمە ڕاستییەکە قورئان پێش چوارده سەده دەری خستووەو ئیعلانی کـردوە لە کاتێکا عیلم‌و زانین هیچی لە نهێنییەکانی کەون نەزانیوە! بــەڵام لــەم چــەرخی بیستەمەدا عــەقڵ‌و هۆشــی مــرۆڤ گەیــشتۆتە ئــەوە کــە بتوانــێ بــڕێ نهێنــی کــەون دەربخا لەم ڕووەوە زانایان بۆیان دەرکەوت کە لە هەموو گەردیلەیەکدا جم‌و جوڵی بەردەوام هەیە، لە هەموو جیرمێکی ئاسمانیدا لە زیندەوەران‌و بەردو داردا. بــەڵێ ئێستا عیلم دەری خستووە کە هەموو مادەیەکی ئەم کەونــە لــە گەردیلــەکان پێــك هــاتووە، هــەموو گەردیلەیــەکیش لــە دوو عونــصور پێــك هــاتووە کــە (نیــوترۆن)و (پرۆتــۆن)ن ئــەم دوو عونــصورە پێیــان دەگــوترێ: نــاوك‌و بناغــەی زەڕڕە، پێــك هێنــەری گەردیلــە، لەگــەڵ ئــەم دووە عونــصورێکی تــر هەیــە پێــی دەگــوترێ (ئەلەکترۆن) بە دەوری ناووکی گەردیلەدا دەسوڕێتەوە، ئــەم تەرتیبــە بــە تــەواوی لــە تــەرتیب‌و نیزامــی کۆمەڵــەی خــۆر دەچــێ، واتــە ئــەمیش بــە کۆمەڵەیــەکی پــــچکۆلەی خـــۆریی دەژمێـــردرێ، نـــاوکی گەردیلەکـــە وەکـــوو خـــۆر وایـــە ئەلەکترۆنـــەکانیش کـــە بـــە دەوری ناوکەکـــەدا دەســـوڕێنەوە وەکـــوو ئەســـتێرە گەڕۆکــەکانی دەوری خــۆر دەچــن کــە لــە خولگــەو چــەمەرەی خۆیانــدا بــە دەوری خۆردا دەسوڕێنەوە!!

هەروەها لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی زانستی دەری خستووە کە کۆمەڵەی ئەستێرەی خۆمان زۆر بە هێدی بە دەوری چەقی تەوەرەی خۆیدا خول دەخوا، ئەوەش دەرکەوتووە کە هەموو کۆمەڵە ئەستێرەکان سوڕانەوەیان لە یەکتر دەچێ!

ئاکامو ئەنجامی تێفکرینو وردبونەوەمان لە نهێنییەکانی بونەوەر بریتییە لەوە کە کەون بە هەموو یەکیەتی یاساکانیەوە بەڵگەیە لەسەر تاكو تەنهایی خودا، ئەم جمو جوڵە بەردەوامەی ناو ئەستێرەکانو گەردیلەی هەموو قەبارەکانی بونەوەر (نابێتە زیادە رەوی ئەگەر بڵێین) دیاردەیەکە لە تەسبیحاتو گەردن کەچییان بۆ خوداو شێوەی تاعەتو خودا پەرستییانە. قورئانی پیرۆزیش ئاماژە بۆ ئەم لایەنە دەکاو دەفەرموێ:

{وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَـكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ}:

واتە: هەموو شتێك لە بونەوەردا هەردەم خەریکی تەسبیحاتی خودانو فەرمانبەرداری ئەون بەڵام ئێوە ئەی دەستەی هاوبەش پەیداکەران! چونکە بە دروستی سەرنج لە شت نادەن، لە تەسبیحاتەکەیان حاڵی نابنو تێیان ناگەن!!

## شەریك بۆ خودا پەیداکردنو دیاردەکانی (الأشراك بالله ومظاهره):

شەریك بۆ خودا قەراردان بریتییە لەوە کە لەگەڵ خودای گەورەدا شتی تریش بە خودا بزانی، واتە پەرستنی بتو دارو بەردو ئاژەڵو قسنو گۆڕو خۆرو مانگو باوو بارانو گێژەڵوکە تێکەڵاو بە پەرستنی خودا بکا یان لەگەڵ خودادا بیانکا بە شەریكو بیان پەرستێ، یان بڕوای وابێ کە خودا کورو کچی هەن!!

بە راستی ئایینی ئیسلام زۆر بە ئاشکرایی زەرەرو زیانی هاوبەش پەیداکردنی بۆ خودا روون کردۆتەوەو پوچیو بە تاڵی دەرخستووەو دەفەرموێ:

{إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء وَمَن يُشْرِكْ بِاللّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلاَلاً بَعِيدًا } (١١٦) سورة النساء:

واتە: پەروەردگار لە هاوبەش پەیداکردن بۆ خودا خۆش نابێ، مەگەر تەوبەی لێبکا، چونکە ئەوە لوتکەی گوناهانەو هیچ تاوانێکی تری پێ ناگا، وەڵێ تاوانی شیرکی لێ دەرچێ (دوور نیە کە خودا بە مەرحەمەتی خۆی ئەگەر ئارەزووی هەبێ لە هەموو جۆرە گوناهێکی تر خۆش ببێ).

جا چونکە شەریك بۆ خودا پەیداکردن لە نەزانیو سەر لێ شێوانەوە پەیدا دەبێ، زۆر زەرەرو زیانی سامناك بۆ کۆمەڵ دەهێنێ، نەخۆشی وا بۆ ئادەمیزاد دەخاتەوە کە هەرگیز لە بیرو بڕوایەکی تر رەچاو ناکرێ. سەرەڕای ئەوە کە هاوبەش پەیداکردن بۆ خودا لەگەڵ مەنتیقدا ناگونجێو یەك ناگرنەوە!.

لە لایەکی ترەوە شەریك بۆ خودا قەراردان زەینی مرۆڤ واڵێ دەکا کە ئامادەبێ بۆ وەرگرتنی هەموو بیرو بڕوایەکی پوچو بەتاڵو بڕواکردن بە هەموو جۆرە ئەفسانەو خەرافاتێك، دیارە ئەمەش شیرازەی کۆمەڵ دەپچڕێنێو لاوازی دەکاو دەبێتە بەر پەرچ لە رووی هەموو پێشکەوتنو گەشە کردنێکدا.

سەد داخو مخابن! زۆر جار شەریك بۆ خودا قەراردان تێکەڵاوی جوانترینو بەرزترین دەستورو سەرە مەشقە جوێ جوێیەکانی خودایی بووە، خەڵکەکەی لە راستی لاداوەو شوێن گومڕایی کەوتوون، ئەوەش بە هۆی پڕوپاگەندەی کۆلکە مەلاو زڕە شێخو خوێندەواری هەل پەرستو یارمەتی دانی دوژمنانی ئایینەوە ئەنجام دراوە، رەشە خەڵکەکە لە جیاتی کاکڵەو ناوەڕۆك بە توێکڵی بێ سودە وە دەسخەڕۆ بوونو بە کردەوەی بەناو ئایینیان جوانی شاکارەکانی دینیان داپۆشیوەو رێیان بۆ ئیلحاد گەراکانو بۆ بێدینی خۆش کردوە هەتا لە هەلو کاتی لەباردا هەڵمەت بێننە سەر قەڵای ئیمانو باوەڕو ئایین!!

## هێرش بردنی ئیسلام بۆ سەر هاوبەش رەوابینین بۆ خودا:

ئیسلام ئەم رێبازەی رەچاو کرد چونکە مەبەستێکی بەرزی بە ئادەمیزاد هەبوو ویستی تاعەتو بەندایەتی بۆ غەیری خودا نەبێ، کەسێك بە خودا

نەزانێ کە گۆڕان و نەمانی بەسەردا بێ، هەر کەسێك بگۆڕێ و نەمانی بەسەردا بێ مانای وایە فەردێکە لەم عالەمە، ئیسلام ئەم ڕێبازەی بۆ مرۆڤ ڕەچاو کرد چونکە بەندایەتی کردن بۆ مرۆڤێك کە گۆڕانی بەسەردا بێ و نەمان ڕووی تێ بکا وا دەکا کابرا هەر ڕۆژەی بۆ کەسێك گەردن کەچ بێ و هەر ڕۆژەی بە ڕبەی یەکێك بپێوێ، ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێ مرۆڤ چەواشەبێ لە ژیاندا، چەواشە بێ لە ئامانجدا چەواشە بێ لەو شتانەدا کە هاندەرن بۆ کردنی کارو باری ڕۆژانەی و وەکوو گوڵەبەڕۆژە هەرساتەی ڕوو بکاتە شوێنێك.

کەوابوو شەڕی ئیسلام لەگەڵ شیرك و بێدینیدا لەبەر خاتری بەرزکردنەوەی شانی مرۆڤە، بۆئەوەی مرۆڤ ڕزگار بکا لە تاعەت کردن بۆ شەخسێکی هیچ و پوچی وا کە ئەمڕۆ گەنجەو سبەینێ پیرە، یان ئەمڕۆ زیندووەو سبەینێ مردووە!!
هەروا بۆ ئەوەی تاعەت و پەرستش بۆ خودایێ بکرێ کە بەردەوام بێ، دیارە کە گۆڕانی بەسەردا نەیەو بەردەوام بێ تەواوی کەماڵی هەیە، ئەگەر کەماڵی بەردەوامی هەبوو ئەوکاتە مرۆڤ بە گەردن کەچی و تاعەت کردن بۆ خودایەکی وەها دیارە ڕێزی زیاد دەکاو لە پلەی بەرز دەبێتەوە، چونکە ئەوەی کە تاعەتی بۆ دەکاو بە خودای خۆی داناوە لەو بەرزترەو کەماڵی بێ سنووری هەیە، ئیتر ئەوکاتە مرۆڤی خوا پەرست بەرنامەی ژیانی یەك شێوە دەبی و گۆڕانی بەسەردا نایە چونکە دەستی بە ئەڵقەی کەشتی نەجاتەوە گرتووەو لە ژیانیدا ڕووی لە کەماڵی موتلەقە، هەر بۆیە خودا دەفەرموێ:

{ وَلِلّهِ الْمَثَلُ الأَعْلَىَ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ } (٦٠) سورة النحل:

واتە: سیفەتی بەرزو کەماڵی موتلەق و دووریی لە خەوش هەر بۆ خودایە، کەسی تر ئەو کەماڵەی نیە، هەر خۆی بێ نیازە لە عالەم و خاوەن حیکمەتە لە مۆڵەتدانی خوا نەناساندا؟!

جا وەنەبێ ئیسلام بەم هێرش بردنە وازی هێنابێ؟ یان بە هاوردنی بەڵگەیەکی عەقڵی لەسەر تاك و تەنیایی خودا کارەکە تەواو ببێ، بەڵکوو

پێویستە چی بەڵگەی خوا نەناسانە هەمووی پووچ بکرێتەوە چی بەڵگەی عەقڵیو زانستی جوێ جوێ هەیە بە گوێرەی پێویست بهێندرێنو بخرێنە روو، بۆیە قورئانی پیرۆز لەچەند شوێندا ئەم لایەنەی رەچاو کردوە.

{قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ اللَّهُ الصَّمَدُ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ}:

واتە: ئەی پێغەمبەر بڵێ شتێکی گرنگ هەیە گوێتان لێ بێ ئەویش ئەوەیە کە ئەو زاتەی ناوی (الله)یە تاقو تەنیایە بێ شەریکە، هەر ئەو بۆ جێ بەجێ کردنی ئیحتیاجیو پێویستی پەنای بۆ دەبرێ ئەو پێویستی بە هیچ نیە کەسی لێ نەبووەو کەسی لێ نەکەوتۆتەوە لە کەسیش نەبووە، لە بونەوەردا کەس نیە هاوپایەو هاوتای بێ، زاتێکی داناو زاناو بە کەماڵە، مادده نیە، زەمانی بۆ نیە، مەکانی بۆ نیە، هەر بووەو هەر دەبێ (واجب الوجود).

دووبارە قورئان دەفەرموێ: {الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا، وَاتَّخَذُوا مِن دُونِهِ آلِهَةً لَّا يَخْلُقُونَ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ وَلَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا وَلَا يَمْلِكُونَ مَوْتًا وَلَا حَيَاةً وَلَا نُشُورًا} (٢ - ٤) سورة الفرقان:

واتە: پەروەردگار خودایەکی وەهایە خاوەنی ئاسمانەکانو زەوییە مڵکو داراییان هەر بۆ ئەوە، هەرگیز فرزەندەو وەچەی بۆ خۆی رەوا نەبینیوە، هاوڕێو شەریکی نەبووە، هەموو شتێکی بونەوەر دەستکردی ئەوزاتەیەو بە ئەندازەو نەخشە رێكو پێکی کردوە!!؟ کەچی لەگەڵ ئەوەدا ئەو کافرو خوا نەناسانە چەند خودا درۆزنەیەکی نابوودی هیچ لە بارا نەبووی نارەسای بێ دەسەڵاتیان کردوە بە خودای خۆیان دەیانپەرستن کە ئەمانە ناتوانن هیچ شتێ دروست بکەن، بەڵکوو بۆ خۆیان دوستکراون.!! هیچ دەسەڵاتو هێزو توانایەکیان نیە، دەستیان بەسەر هیچ سوودو زیانێکدا ناڕوا، دەسەڵاتی مراندنو زیندویەتیو زیندو کردنەوەی پاش مردنیان نیە!! ئەوەتا خودای پەروەردگار لەم ئایەتەدا ئەوەی چەسپاندووە کە بونەوەر هەمووی مڵکی خۆیەتی، نە منداڵی هەیەو نە

هاوبەش‌و نە شەریك، هەموو شتێكی لەسەر یاساو قانوونێكی تایبەت مەند دروست كردوە، ئەمجار بە تەوسەوە گاڵتە بە موشریكەكان دەكا بەوانەی تاعەت‌و عیبادەتی چەند خودایەكی دروستكراوی بێ دەسەڵات دەكەن: كە ناتوانن نە زەرەر نە قازانج بە كەس بگەیەنن، بەڵكوو لەمە گرنگتر ئەوەیە كە ئەو خودا درۆزنانە دەسەڵاتی زیندوو كردنەوەی هیچ مردوویەكیان نیە!!

بە راستی مەسەلەی ژیان‌و گیان‌و هێزی مردن تا ئەمڕۆش (لەمەو دواش) گرێ كوێرەكەی بونەوەرن، شتێكن مرۆڤ لە ئاستیان دۆش دادەمێنێ‌و هیچ راڤەو تەفسیرێكی دەست ناكەوێ جگە لە هەبوونی دەسەڵاتێك لە ژوور دەسەڵاتی خۆیەوە!!

بە كورتی هاوبەش بۆ خودا پەیدا كردن لەچەند شێوەو دیاردەیەكدا رەنگ دەداتەوە.. قورئانی پیرۆز چەند جارێك رەخنەی لێ گرتووەو زەممی كردوە هێرشی هێناوەتە سەری، بە شێوەیەكی زانست ئامێز زیانەكانی خستوونە روو وا ئێمەش لێرە بەولاوە بە درێژی جۆرەكانی فرە خوایی (شیرك) باس دەكەین‌و شییان دەكەینەوە!!

## پەرستنی مرۆڤ بە خودا زانین (عبادة الشخصية الإنسانية):

یەكێك لە جۆرەكانی شەریك بۆ خودا قەراردان پەرستنی شەخسییەتی مرۆڤە، زۆرجار وا رێ دەكەوێ هەندێ مرۆڤ مرۆڤێك یا برە مرۆڤێك بە خودا دەزانن چونكە بڕوای وایە ئەو مرۆڤە پەرستراوانە هەندێ سیفاتی وایان تێدایە لە مرۆڤی ئاسایی جیایان دەكاتەوە لەبەرئەوە شایانی پەرستن‌و تاعەت بۆ كردنن‌و تایبەتییان هەیە مرۆڤی ئاسایی نین!!

ئەو مرۆڤە بەخودا دانراوانە چەند رێبازو فێڵ‌و فرتێكیان بەكار هێناوەو بەكاری دەهێنن تا بگەنە ئامانجی گڵاوی خۆیان، وەكوو بە هەڵە بردنی ئینسانی بێ عەقڵ‌و ساویلكە، چاوو راوو چاو بەست لێكردنیان، بەكارهێنانی هەڕەشەو

ترساندنی ئەو ساویلکانە، رام کردنی دەسگاکانی پڕو پاگەنـدە بـۆ پیاهەڵدانیانو ریز لێ گرتنیانو ریزکردنـی سوپاسـی نابـەجێو ستایـشی رێ لێ تێکـدەر بۆئـەوەی بتـوانن گـەلو کۆمـەڵ بـە خـراپترین شـێوە ئیـستغلال بکـەن بـۆ بـەجێ هێنـانی مـەرامو بەرژەوەنـدی تایبـەتی خۆیـان تـا لـە ئاکامـدا بـەرەو هەڵـدێرو لارێ رەهەنـدەیان کـردوونو لـە خلیـسکیان بـردونو خـستوویاننە چـاڵی خەسـارەت مەندییـەوە!! بـەڵێ زۆر کۆمەڵـگای مـرۆڤ تووشـی زەرەرو زیـانی زۆرو زەبەنـدەو سامناکی ئەم جۆرە مرۆڤە خۆ بە خودا زانانە بـوون، کـە بوونـە باڵنـدەی شـوومو گێژەڵوکەی نەدامەت، وەك مۆتەکە باڵی شـوومو لەعنـەتیان بەسـەر دڵـی کۆمەڵـدا کێشاوەو تەنگیان پێ هەڵچنیوە، کونە مشکیان لێ کردوونە قەیـسەری!! جـا کاتێـك دەسـتی قـودرەت چـەپۆکێکی پێـدا داونو شۆڕشـێك سـەر نگـوومی کـردون ئـیتر کۆمەڵـگاکە رزگـاری بـووەو کۆمـەڵ ئـاهێکی هاتۆتـەوە بـەرو هەوایـەکی ئازادییـان هەڵمـژیوەو بـە برینـی خۆیـان زانیـوەو لـەو گـەردن کەچیو بـەخوا زانینـی ئـەو دڕندانـە پەشـیمان بوونـەوەو شـایەتمانێکی بەحـەقیان هێنـاوە ئـیتر شـنەی بـای ئازادیی دڵو دەروونی فێنك کردونەتەوە!!

نموونەی ئەم دیاردانەو وێنەی ئەو ملۆزمانـەش لـە کۆنو نوێـدا لـەلای گـەلێ گەلو هۆز زۆرو زەبەندەن، ئەوەتا ستالینی گوڕ بە گوڕ کە سەردەمێك لەناو گەلی خۆیدا بتێ بوو بۆ خـۆیو نیمـچە پەرسـتنێکی بـۆ ئـەنجام دەدرا، کەچی هـەر کـە گوڕ بە گۆڕ بوو گەلی روسیا لەو بەڕێز گرتنە ژێوان بوونەوە، وێنـەکانیان دڕانـدو پەیکـەرە کانیـان روخانـدنو دەنگـی نـاڕەزاییو دژ بـە سـتالین لـە هـەموو کـونو قوژبنێکی ئەو وڵاتە بەرز بووەوە!؟!

یەکێك لەو بیرو باوەڕە سەرەکیانەی قورئان هێناویەتیو بانگـەوازی بـۆ دەکـا عیبادەت کردنی خودایە بە تەنهاو وازهێنان لە عیبـادەت کردنـی مرۆڤـە (بەهـەر جۆرێـك بـێ؟!) بڕوانـە چـۆن ئیـسلام روو دەکاتـە جوولەکـەو فەلـەو بناغەیـەکی قایمو قوڵ دادەڕێژێ بۆ یاساو نیزامێك کە دەشێ هەرسێ ئایینەکە (ئیسلام، جو،

نەصرانی) لەسەری كۆببنەوە تا لەم ڕێبازەوە مرۆڤ بگاتە ژیانێكی ئاسوودەو زۆرو ستەمو چەوساندنەوە نەمێنێ، چونكە ئەمانە سەر دەكێشن بە مرۆڤ پەرستن‌و بە خودا زانینی.

{قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ} (٦٤) سورة آل عمران:

واتە: ئەی پێغەمبەر! بە خاوەن نامەكان (جولەكەو نەصرانیەكان) بڵێ: وەرن با هەموومان لەسەر فەرماییشتێك كۆ ببینەوە بیكەین بە بەرنامەو پەیڕەوو لێی لا نەدەین ئەویش بریتیە لەوە كە جگە لە خوای گەورە عیبادەتی كەسی تر نەكەین‌و كەس نەكەین بە هاوبەشی، هەروەها لەناو خۆمانا بە هەق‌و ناهەق دوای قسەی مەلاو قەشەو زاناكانمان نەكەوین چونكە ئەوانیش وەك ئێمە بەندەی خودان‌و مافی تەحلیل‌و تەحریمیان نیە!!

لەلایەكی ترەوە برێ لە پێغەمبەران‌و پیاو چاكان دوای لە دونیا دەرچونیان گەل‌و شوێن كەوتوانیان بە خوداو نیمچە خودایان داناون‌و تاعەت‌و قوربانییان بۆ كردوون ئەم دیاردەیە بووەتە بیرو باوەڕیان لێیان بە ڕاست گەڕاوە! ئیتر قورئان پڕو پووچی ئەم جۆرە عەقیدە بەتاڵانەی ئاشكرا كردوەو فەرموویەتی:

{مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ اللّهُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُواْ عِبَادًا لِّي مِن دُونِ اللّهِ وَلَـكِن كُونُواْ رَبَّانِيِّينَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ الْكِتَابَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ، {وَلاَ يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُواْ الْمَلاَئِكَةَ وَالنِّبِيِّيْنَ أَرْبَابًا أَيَأْمُرُكُم بِالْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ} (٧٩ - ٨٠) سورة آل عمران :

واتە: هەرگیز نەبووە ئادەمیزادێ خودای پەروەردگار كردبێتی بە پێغەمبەرو فروستادەی خۆی‌و نامەی ئاسمانی بۆ ناردبێ، فێری فام‌و زانستی كردبێ‌و پایەی نبووەت‌و پێغەمبەرایەتی پێ بەخشیبێ، كەچی ئەم پێغەمبەرە لە جیاتی ئەوەی خەڵك بانگ بكا بۆ خودا پەرستیی با نگیان بكا بۆئەوەی خودی

پێغەمبەرەکە بپەرستن پێیان بڵێ: وەرن ببن بە بەندەی گوێ لە مستی منو عیبادەت بۆ من بکەن تاعەتی خودا مەکەن. هەرگیز ئەو پێغەمبەرانە قسەی وەهایان نەگوتوە؟! بەڵکوو وتویانە: ئەی گرۆهی ئادەمیزاد ئەی زانایان بە کیتابو نامە ئاسمانییەکان! هەمووتان ببن بە مرۆڤی خودا ناسی پاکی بێ خەوشی خاوەن پەیمان، چونکە دەرسی کیتابی ئاسمانیتان خوێندوەو تێگەیشتونو دەزانن دەبی ئینسانی وەها بکرێن بە پێغەمبەرو بەو جۆرە تەربیەتی گەلو ئومەتەکەیان دابدەن!! ئەی گرۆهی ئادەمیزاد هەرگیز پێغەمبەران فەرمانتان پێ ناکەن کە فریشتەکان یان پێغەمبەرەکان بکەن بە خودای خۆتان، ئایا پێغەمبەران فەرمانتان پێ دەکەن کافرببنو تووشی سەر لێ شێواوی بێن، پاش ئەوەی موسوڵمان بوونو باوەڕتان دامەزراوە؟! هەرگیزاو هەرگیز شتی وانەبووەو نابێ! عیبادەت کردن بۆ پیاو چاکانو پێغەمبەرانو پەرستنیان لە نێو زۆر گەلو هۆزدا کارێکی باو بووە، بۆ نموونە (بوذا) لە ژیانی خۆیدا لافی خوایەتی لێ نەداوە بەڵکوو شوێن کەتووەکانی دوای مردنی بە خودایان زانیو پەیکەریان بۆ تاشیو دەستیان کرد بە پەرستنی! جا بۆئەوەی ئەم تێڕوانینە گومڕایی ئامێزە بۆ پیاو چاکانو پێغەمبەران جارێکی تر دووبارە نەبێتەوە ئیسلام زوو پێش دەستی خۆی کردوەو چارەسەری دۆزیوەتەوە، بە ئاشکراو عەلەنی موسوڵمانانی لەم بارەوە هۆشیار کردۆتەوە داوای لێکردوون کە نەچن پێغەمبەری ئیسلام بە خودا بزانن‌و بیپەرستن.. بۆیەو لە ترسی ئەوە لە بیرو باوەڕی ئیسلامیدا لایەنی ئەوە کە حەزرەتی محمد (دروودی خوای لەسەر بێ) بەشەرەو سیفاتی ئادەمیزادی (وەکوو باقی ئادەمیزادی تر وایە) زۆر گرنگی پێدراوە، لە قورئانو حەدیثدا پوختەو مانای ئەوە کە محمد (دروودی خوای لەسەر بێ) بەشەرەو رەوانەکراوی خودایە دووبارەو سێ بارە بۆتەوە!!! ئەوەتا پەروەردگار فەرمان دەکا بە پێغەمبەر کە بە موسوڵمانان بڵێ: منیش وەکوو ئێوە بەندەیەکی خودامو هیچم بە دەست نیە.

{قُل لاَّ أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلاَ ضَرًّا إِلاَّ مَا شَاء اللّهُ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لاَسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ إِنْ أَنَاْ إِلاَّ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ} (١٨٨) سورة الأعراف:

واتە: ئەی محمد! تۆ بەو کافرانە بڵێ من نازانم قیامەت کەی دەقەومێ! بەڵکوو (بەبێ ئیزنو رەزامەندی خوا) ناتوانم بزانم سوودو قازانجم لە چ کارێکدا دێتە رێ! چونکە من زاهیر بینمو ئاگام لە نهێنی نیە! خۆ ئەگەر من غەیب زان بومایە هەرچی خێرو بێری تێدا بوویایە لە مامەڵەو کاری دونیایی بۆلای خۆم دەهێناو هەرگیز تووشی زەرەرو ناخۆشی نەدەبووم، من تەنیا ئەوەندەم بە دەستە خەڵکی بترسێنم لە سزای خوداو مژدەیان بدەمێ بە بەهەشتو نیعمەتەکانی خودا، ئەمە ئەرکی سەر شانی منەو بە موسوڵمانانی رادەگەیەنم...

لە نموونەی ئەم مانایە جارێکی تر قورئان دەفەرموێ:

{قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا} (١١٠) سورة الكهف:

واتە: ئەی پێغەمبەر! بەو خەڵکە بڵێ: منیش وەك ئێوە بەشەرم لافی بێ هەوەجێی لێ نادەم فەرقمان ئەوەندەیە کە من سروشم بۆدێو پێغەمبەرم، سروشم بۆ دێ بەوەی کە خودای منو ئێوە خودایەکی تاكو تەنیایە، جا هەر کەسێك هیوای هەیە بگا بە خودای خۆیو رەزامەندی ئەوی بە نسیب ببێ، با هەمیشە کردەوەی چاك بکا هەرگیز لە عیبادەت کردنی خودای خۆیدا کەس نەکا بە شەریكو هاوبەشی ئەو زاتە بێچوونە!!

دەی خوێنەری بەڕێز جوان لە مانای ئەم ئایەتە تێ بفکرە بزانە چۆن بەچەند وشەیەکی کەم مانایاکی زۆری گەیاندووە، چۆن بەم چەند وشانە ئەو هەموو ئامۆژگارییە بەرزانەی بە گوێدا چپاندوین، کە بە تەواوی خۆش بەختیو ئازادیی کۆمەڵی لەخۆ گرتووە، پوختەی فکرەی ئیسلامی کە بریتیە لە کردەوەی چاكو تاعەت کردن بۆ خوداو بە تاكو تەنیا ناسینی لە ئامێز گرتووە!!.

## پەرستش بۆ بتگەل (عبادة الأصنام والأوثان):

جۆرێکی تر لە شەریك بۆ خودا قەرارداان عیبادەت کردنە بۆ بتو دارو بەرد. بت (صەنەم) برێتییە لە پەیکەرێکی دروستکراوی داتاشراو لە بەرد یان لە دار یان لە هەر کانێکی تر لە شێوەی زیندەوەرێکدا وەکوو مرۆڤ، ئاژەڵ، باڵندە یان شێوەیەکی تێکەڵاو لەمانە.

وەثەن: بریتییە لە بەردێك یان گردێك یان کێوێك واتە شتێك کە لە شێوەی مرۆو ئاژەڵو باڵندە نەبێ.

بت لە بیرو باوەڕی بت پەرستەکاندا بریتییە لە هێزێکی باڵا کە لە ژوور هێزی سروشتە، یان بڕوایان وایە کە ئەو هێزە سامناکە لە بتەکاندا هەیە. لەلای بت پەرستەکان ئەم بتانە چەند سەر گوزشتەو ئەفسانەیەکیان هەیە، بە بڕوای ئەوان ئەم بتانە هەندێکیان خواوەندی نیزاعو شەڕنو بڕێکیان خواوەندی خراپەو ناخۆشیو بەڵاو موصیبەتن.... هتد.

جا وەکوو لە قسەی مێژوو نووسان دەردەکەوێ پێش هاتنی ئیسلام بت پەرستی لە نیوە دوورگەی عەرەبیدا بە تەواوی بڵاو بۆتەوە، تەنانەت دەڵێن: کاتێ پێغەمبەر شاری مەککەی گرتو چووە ناو کەعبەوە وێنەی چەند پێغەمبەرێکی تێدا بینی فەرمانی کرد کوژاندیاننەوە، سێ صەدو شەست بتیشی تێدا ژمارد فەرمانیدا هەموویان شکاندن.

بەڵێ بت پەرستی کارێکی ناشیرینی وابوو ماوەیەکی زۆر دوورو درێژ مێشکی مرۆڤی تێك دابوو، شێوەی ژیانو ڕەوشتی مرڤی چێواشە کردبوو. دوایی لەسەر دەستی پێغەمبەرانو بەهۆی ئایینەوە (ئایینە گەورەکان، یەهودی مەسیحی، ئیسلام) کۆتایی هاتو بنە بڕ کرا.

بەڵام ئەوەندە ماوە بزانین ئەو هۆیانە چ بوون کە پاڵی بە عەرەبەکانەوە ناوە بەردو دار چ جایێ زیندو نین زەرەرو قازانجیشیان لێوە ڕەچاو ناکرێ بیان پەرستنو بە خودایان بزانن!!؟ قورئانی پیرۆز ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە کافرەکان بۆیە ئەو بەردو دارەیان دەپەرست (بە خەیاڵی خۆیان) لە خودایان نزیك بکەنەوە.

{ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى } (٣) سورة الزمر:

ئێستاش هەر ئەو بەڵگە پڕو پوچانەن کە بڕێ بت پەرستی تازە دەیان هێننەوە دەڵێن هەبوونی بت یا روو تێکردن لە بت لەکاتی تاعەتدا وا لە عابیدەکە دەکا کە بە تەواوی سەرنجی کورت هەڵبێنێ بۆ بە قوڵدا چوونەوەو نزیکبونەوە لە خودا بەڵام پێویستە ئەوە بزانین کە کڕنووش بردن بۆ بت بەو مەبەستە کە ئەو بتە رەمزو نیشانەی خودایە یان لە خودای نزیك دەکاتەوە قسەیەکی بەتاڵو بێ بایەخە، چونکە نوێژ کەر ئەگەر کاتی نوێژکردن روو بکاتە بتەکەو سەیری بکا بێگومان بیرو هۆشی لە خودا لادەداو خودای لە بیر دەباتەوە، جگە لەوەش ئاشکرایە کە نزیك بوونەوە لە خودا بە فیکرو بیرو سەرنج دەبێو پێویست بە واستەو ماسیتە ناکا بە تایبەتی کە واسیتەکە بەردو دار بێ، چونکە روو تێکردنی فیکرو سەرنج راستەوخۆ بۆ لای خودا هیچ بەر هەڵستێکی لەبەردا نیە، بەڵکوو ئەم جۆرە پەیوەندییە راستەوخۆیە بە خوداوە زۆر گونجاوە لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا نرخی مەعنەوی مرۆڤ بەرز دەکاتەوە، ئەوەش لە یاد نەکەین کە زۆر جار ئینسان تووشی بەڵاو تەنگو چەڵەمەی وا دەبێ کە واسیتەو ماسیتەی بۆ ئەنجام نادرێ لە کاتێکا ئەم واسیتانە نە دەتوانن سود بگەیەنن نە دەتوانن زەرەرو زیان پەیدا بکەن!!

## ئارەزوو پەرستن (عبادة الاهواء):

جۆرێکی تر لە شەریك بۆ خودا پەیدا کردن ئارەزوو پەرستییە. بڕێ مرۆڤ هەیە هەرشتێکی حەز لێ بوو دەیپەرستێو شوێنی دەکەوێ، وەکوو قورئانی پیرۆز بۆمانی باس دەکاو دەفەرموێ:

{أَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا} (٤٣) سورة الفرقان:

واتە: چەند سەیرە دەبینی هەندێ هەن هەواو هەوەسی خۆیان دەپەرستن، بە کەیفی خۆیان شت دەکەن بە خوداو بە خودای دەزانن! دیارە ئەوەی کە

جڵەوی هۆشی لە دەستی هەوەسیدابێ بە تۆنایەتەوە سەر ڕێی ڕاست، خۆ تۆ پاسەوانی ئەونیت لە شتی وا قەدەغەی بکەی.

ئاشکراترین هەواو هەوەسێك کە مرۆڤ کردوویەتی بە خودای خۆی‌و بەندایەتی دەکا (سامان‌و پلەو پایەو خۆشەویستییە) سامان‌و ماڵ پەرستراوێکی وەهایە سواری عەقڵ‌و هۆشی زۆر کەس بووەو جڵەوی لە دەستیان ستاندووە، وای لێکردوون ژیانیان (بەڵێ هەموو ژیانیان) تەرخان بکەن بۆ کۆکردنەوەی‌و لە ڕێگەی ئەوەوە نەبێ لە خۆش گوزەرانی ناگەڕێن، زۆر جاریش لە پێناوی کۆکردنەوەی ریتەو پیتەدا تووشی بگرەو بەردەو بکوژو ببڕو شەڕو هەرا دەبن! تا بە تەواوی خەڵکی لە ڕێبازی ڕاستەقینەی خودا لاداوەو شوکرو سوپاسی پێویستی خودای لەبیر بردونەوە، لە بەجێ هێنانی فەرمانی خودای وەرگێڕاون، بۆیە قورئانی پیرۆز ئەم لایەنەی پاش گوێ نەخستوەو مرۆڤی ترساندوە لە زاڵبوونی ماڵ‌و دارایی بەسەر کۆمەڵی مرۆڤداو دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ} (٩) سورة المنافقون:

واتە: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هەیەو موسوڵمانانن! با ماڵ‌و منداڵتان لە یادی خوداتان غافڵ نەکەن‌و خوداتان لەبیر نەبەنەوە! هەرکەسێ خوو بداتە ماڵی دونیا تا خودای لەبیر دەچێتەوە بە ڕاستی ئەوانە خەسارەتمەندن‌و ڕەنج بە خەسارن!!

بەڵێ ماڵ‌و دارایی هەر کاتێ زاڵ بوو بەسەر هەست‌و هۆشی مرڤدا دەبێتە دوژمنی‌و وازی پێ لە تاعەتی خودا دێنێ‌و ناهێڵێ کردەوەیەك بکا کە جێگای ڕەزامەندیی خودا بێ. هەر بۆیەشە پێغەمبەران بە تێکڕا کۆمەڵی مرۆڤیان لە زاڵبوونی ماددە بەسەریاندا ترساندووە، بۆ نموونە حەزرەتی عیسا لە وەعظو ئامۆژگاریدا ئەم ڕستە جوانەی فەرموە: (لا تعبدوا ربين الله والمال) نەکەن ماڵیش وەك خودا بکەن بە خوداو بیپەرستن!!؟.

## مردوو پەرستن‌و عیبادەتی پێشینان (عبادة الأسلاف):

هیچ بیرو باوەڕێك (له كۆن‌و نوێدا) وەكوو بیرو باوەڕی مردوو پەرستی بڵاو نەبۆتەوە، دەبینین خەڵكی چی سیفاتی جوان‌و بەرزو باڵا هەیە لەبەر مردوانی دەكەن، چی بشێ بۆ خودا بۆ وانیشی دەچەسپێنن ئابەم جۆرە مردوو پەرستن بووەتە باوو رێز لێگرتنیان لە باری ئاسایی دەرچووە گەیشتۆتە پلەی تەقدیس‌و پەرستن. زانای بەناوبانگ (تایللوور) دەڵێ: عیبادەتی باوك‌و باپیرو پەرستنیان لە بڕوا كردن بە دەسەڵاتی رەوانەكان (الأرواح) پەیدا بووە. لەم رووەوە كە باوك‌و باپیر لە كۆنەوە لەناو هۆزو خێڵەكاندا سەرۆك هۆزو سەرەك خێزان‌و ریش سپی تیرە بوون‌و كار بەدەست بوون. چونكە لە كارو باری ژیان شارەزا بوون، جا پێیان وابووە ئەگەر ئەم ریش سپی‌و سەرۆك هۆزانە مردن ئیتر گیانەكانیان لە ئاسمانی ئەو خێزان‌و خێڵەدا دەسوڕێتەوەو دێوو دەچێ پارێزگاری خێزانەكە دەكاو لە شەڕو بەڵا دەیپارێزێ شەڕی دوژمنیان لێ دوور دەخاتەوە، كەوابوو رێزگرتن لە باڵەوانان‌و ریش سپی هۆزو خێزان‌و ترسان لێیان مرۆڤی هەڵناوە بۆ مردوو پەرستن‌و تاعەت بۆ كردنیان!!

دەی باشە هەر عاقڵ مەندێ خاوەن بیرو هۆشێ ئەگەر لە ئەم شێوە پەرستنەو جۆرە تاعەتە بیر بكاتەوە بەلایەوە شتێكی غەریب‌و دوور لە راستییەو ناتوانێ خۆی ئیقناع بكا!! چونكە هەر كەسێ تۆزێ هۆشی هەبێ دەبێ بزانێ‌و وردبێتەوە ئەو مردووە كێن‌و چن؟! با ئێمە بیرێك لە ئەصڵ‌و كۆتایی ئەو مردووانە بكەینەوە، ئەوانیش بە شەربوون‌و وەكوو ئێمە خواردن‌و خواردنەوەیان هەبووە، ساغی‌و نەخۆشییان بەسەردا هاتووە، دوایی مردوون‌و ئەمجار پۆڵگاون‌و كرمێ بوون‌و رزیون‌و بوونەوە بە گڵ‌و خۆڵەمێش! جا كەسێك ئەمە چۆنیەتی سەرەتاو كۆتایی بێ ئایا چۆن دەگونجێ پەنای بۆ ببرێ‌و داوای یارمەتی لێ بكرێ!!

لەوانەیە بگوترێ گیانی ئەو رابووردوانە كە لەلاشەكانیان جیابۆتەوە ئێستا ئەو گیانانە لەگەڵ خێزانەكان لەگەڵ زیندووەكان دایەو دیفاعیان لێ دەكەن!!؟

وەلامی ئێمە بۆ ئەم جۆرە بۆچوونانە ئەومیە دەڵێین: ئەو گیانانە چین و لە کوێن؟ حەقیقەتیان چیەو چۆن دیفاع دەکەن؟ لە راستیدا گیان کە لەلاشە جیابوەوە زۆر بێ هێزتر دەبێ لەوەی کە کاریکاتە سەر دەوروبەری، هیچ دەورێکی لە بونەوەرداناەێنێ! چونکە کاتێ گیان هێزو توانای هەیە کە بە لاشەوەبێ! دەی خۆ مرۆڤی زیندوو بە ئەوپەڕی هێزو توانایەوە جاری وا هەیە عاجزە لەوەی کە کاریکاتە سەر سروشت، زۆر جار ناتوانێ گەلێ شتی پێویست بۆ ژیانی خۆی فەراهەم بێنێ، بەڵکوو ناتوانێ هیچ تەئسیرێك لە دیاردەکانی سروشت بکا، ناتوانێ مردن لە خۆی بڕەوێنێتەوە، هەرکاتێ ئەجەلی تەواو بوو دەبێ بمرێ، جا ئەگەر حاڵی مرۆڤ ئەمە بێ لەکاتی ژیانیدا دەبێ دوا مردنی چی بەدەست بێ و چی لە دەست بێ؟!!

مردوو پەرستی و تاعەت کردن بۆ پێشینان زۆر خەرافات و ئەفسانەی تێدایە، ئەو شێوە ئاکارو کردارەی کە بەو بوونەوە ئەنجام دەدرێ دەتوانین بڵێین جۆرە بەنج کردنێکەو گەل و هۆزی پێ بێ هۆش دەکەن و ڕێگای راستی لێ بزر دەکەن. هەموو کاتێکیش ئەم داب و نەریتە نا ئیسلامیانە بوونەتە کۆسپ لە بەردەم پێشکەوتنی گەل و هۆزدا!!

کەی زانایانی ئیسلام ئەمەیان داناوە؟ بۆ نموونە کەی لە ئیسلامدا ئاهەنگ دەگێڕدرێ بۆ مردوو؟ ئەگەر مەبەست پرسەو تەعزییە بێ ئەوە کەی مردوو پەرستیەو شەریك بۆ خودا قەراردانە؟ نوێژکردن لەسەر مردوو فەرزێکی ئیسلامییە بەرگی (حداد)ی ژنی مێرد مردوو دەستورێکی ئیسلامییە بەڵام لەبەر کردنی جۆرە لیباسێك، یان رازاندنەوەی گۆڕو گومبەزو نوێژکردن لەسەر قەبرەسان یان ئاهەنگ گێرانی ئایینی لەناو گۆڕستاندا ئەمانەو زۆر شتی تری ئاوا جۆرێك لە مردوو پەرستن و کردارێکی دژ بە ئیسلامە. بۆیە قورئان لەمەش بێئاگا نەبووەو ئەم جۆرە بیرو باوەڕە پڕو پوچانەی (کە وەکوو خۆرکە کەوتوونەتە ناو کۆمەڵی ئادەمیزادەوە) ڕەت کردوونەوە، هەموو کات تەعالیم و

ئامۆژگارییەکانی قورئان هەوڵی ئەوەی داوە مرۆڤ لە گیروداوی ئەم جۆرە بیرو باوەڕانە رزگار بکا.

{لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ يُحْيِي وَيُمِيتُ رَبُّكُمْ وَرَبُّ آبَائِكُمُ الْأَوَّلِينَ} (٨) سورة الدخان:

هەر خودا خودایەو بەس، ژیانو مردن بە دەست خۆیەتی، خودا پەروەردگاری خۆتانو بابو باپیرتانە، چ پێشینانتان چ پاشینانتان. سەیرکە قورئان چۆن وەسفی دەسەڵاتو توانای خودا دەکا دەربارەی مراندنو ژیاندن، لە کاتێکا پێشینان ئەم سیفەتانەیان نەبووە، بەڵکوو بی گیانو مردوون. دەی کەی مردوو دەتوانێ سوودو قازانج بە زیندوو بگەیەنێ؟!

ئەمجار سەرنج بدە چۆن ئایەتەکە ئیعلانی ئەوە دەکا کە خودا خودای ئەوانیشو باوكو باپیریشیانە جا کە خودا خودای هەموو کەس بێ مردوو پەرستنو تاعەت بۆ کردنیان بەتاڵەو رەنجی بێ هودەیە!!!

## پەرستنی دیاردە سروشتییەکان (عبادة المظاهر الطبيعية):

ئاشکرایە کە سروشت بە هەموو نهێنیەکانیەوە، بە رازاوەیی‌و جوانی‌و عەنتیکەکانیەوە، بە سوودو قازانجی زۆرو زەبەندەی بۆ ئادەمیزاد، بە دیمەنی رەنگاو رەنگی گوڵو گوڵزاری بەهارە خوڕەی کانیاوو جۆگەو جۆباری... هەموو ئەمانە هاندەرن بۆ لێکۆڵینەوە لە دروستکراوانی خوداو چەقاندنی داری ئایین‌و گەشە کردنی فیکرەی ئایین پەروەریی لە دەروونی مرۆڤدا!!

لەلایەکی ترەوە سروشت بەهۆی دیاردە سامناکەکانیەوە (هەورە تریشقە، لافاو، بوومەلەرزە، گێژەڵوکە... هتد) هێزو سامناکی ئەم دیاردانە مرۆڤی هانداوە بگەرێ بۆ پەنایەك‌و خۆی لە رقی بێ مەجازی سروشت بپارێزێ، هەر ئەم لێ ترسانەش وای لە مرۆڤ کردوە کە سروشت بپەرستی‌و بە خودای بزانێ. زانای بەناوبانگ (ماکس موللر) دەڵێ: دیاردە سروشتییەکان یەکەم شت بوون کە

هەوەڵجار سەرنجی مرۆڤی کۆنی راکێشاوەو ئێستی سەرسامی پێکردوە، کاتێك سەیری بونەوەری کردوە ترسی لێ نیشتووە، جا لەبەر کاریگەری‌و بەهێزی نفوزی سروشت لە دەروونی مرۆڤدا فیکرەی ئایینی تێدا رسکاوەو سروشتی بە خودا زانیوەو تاعەتی بۆ کردوە!!

جا ئەگەر دیاردە سروشتییەکان لە تێروانینی زۆر لە کۆمەڵانی مرۆڤی کۆندا خودا بووبن‌و گەردن کەچی بۆیان پێویست بووبێ! ئەوە برێ لەو گەل‌و کۆمەڵانەی مرۆڤی کۆن لە سروشتدا چەند خودایەکیان قەرارداوە! هەندێ مرۆڤ بۆ ئاسمان خوایەکیان داناوەو بۆ زەوی‌و هەوا خوایەکی ترو بۆ دەریا خوایەکی کە. برێ مرۆڤیش بۆ هەرکام لە هەورو ئاگرو رووناکی خودایەکی تایبەتیان قەرارداوە.... هتد.

بۆیە قورئانی پیرۆز هاتووە دەرمانی دەردی سروشت پەرستیی کردوەو هیچ‌و پووچی ئەم بیرو باوەڕە بێ بایەخانەی دەرخستووە، ئاگر برێ لەم ئاگرە سوتمانە کردوە! ئەوەشی چەسپاندووە کە پەرستراوی راست‌و حەق تەنیا خودایەو چی لە سروشتدا بێ هی ئەوەو خۆی خاوەنی کەون‌و کائیناتە!!

{إن الهكم لواحد رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَرَبُّ الْمَشَارِقِ} (٥) سورة الصافات:

واتە: خودای ئێوە خودایەکی تاك‌و تەنیایە، خاوەنی ئاسمان‌و زەوییەو خاوەنی هەرچی لە نێوانی ئەم دووانەدا هەیەو خاوەنی هەموو خۆرهەڵاتەکانە!!

لە شوێنێکی تردا قورئان وەسفی تاك‌و تەنهایی خودا دەکا یەکە یەکە دیاردە سروشتییەکانی دروستکراوی ئەو دەژمێرێ‌و دەفەرموێ:

{إِنَّ رَبَّكُمُ اللّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ تَبَارَكَ اللّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ} (٥٤) سورة الأعراف:

واتە: خودای ئێوە دروستکەری ئاسمانەکان‌و زەوییە (بەدیهێنەری هەموو کەونە) ئەم ئاسمان‌و زەوییەی لە ماوەی شەش رۆژدا دروست کردوون، ئەمجار

دەسەڵاتی تەواوی بونەوەری بە دەستی قودرەتی گرتووەو بەیدەستی کردوە، خودایەکی وەهایە بە هێنانی شەو، رووناکی خۆر دادەپۆشیٚو، هەردەم شەو بەدوا رووناکیدا دیٚو بە رێكو پێكی شەوو رۆژ دروست دەبن، خۆرو مانگو گشت ئەستێرەكان گەردن کەچی فەرمانی خودانو بە ویستی ئەو دێنو دەچن (ألا له الأمر والخلق) بونەوەر هەمووی دروستکراوی خۆیەتی، دەسەڵاتو فەرمانیش تێیدا هەر بۆ خۆیەتی!! ئائەم تەعبیرە رەوانە کورتە هەموو شتێکی پەیوەند بە سیفاتی خودای لەخۆ گرتووە!!

## شەفاعەتو تکاکردن (الشفاعة):

پێش هاتنی ئیسلام عەرەبەکان بۆیە بتەکانیان دەپەرست بە خەیاڵی خۆیان شەفاعەتیان بۆ بکەن!

شەفاعەت چەند جۆرێکی هەیە: شەفاعەت بە وەسیطو ناوەند، شەفاعەت بە نوێژ، شەفاعەت بە دوعاو نزا، شەفاعەت بە رووتێکردن بۆلای پیاو چاکانو پێغەمبەران، بە قوربانی کردنو فتۆ کردن بۆ پەیکەرو مزگەوتو گومبەزو قسن (ضريح)، بە مەبەستی ئەوە ببنە واسیتەو ناوەند بۆ خوداکانو شەفاعەت بۆ خاوەن خێرەکانیان بکەن لەلای خوداکانیان تا دوعاو نزایان گیرا بیٚو بەهرەوەر ببن! بەڵام قورئانی پیرۆز بە روونیو ئاشکرا دەفەرمویٚ: شەفاعەت لە سیفەتە تایبەت مەندەکانی خودایە.

{قُل لِّلَّهِ الشَّفَاعَةُ جَمِيعًا لَّهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ} (٤٤) سورة الزمر:

واتە: ئەی محمد! بەو خەڵکە بڵیٚ: شەفاعەت وەرگرتن هەمووی هەر بۆ خودایە، موڵکی ئاسمانەکانو زەوی هەر بۆ ئەوزاتە بیٚ چوونەیە، هەر خۆی خاوەنیەتیو دروستکردنو گۆڕانکاری تێیدا هەر عائید بە خۆیەتی شەفاعەتو قبووڵ کردنی شەفاعەت لەو شتانەن کە تایبەت مەندن بە خوداوە.

قورئان هەمیشە داکۆکی لەسەر ئەوە دەکا کە شەفاعەت بۆ کەس نیە مەگەر خودا بۆ خۆی ئیزن بدا.

{ وما مِن شَفِيعٍ إلاَّ مِن بَعْدِ إذْنِهِ } (۳) سورة يونس.

قورئان بە ئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ کە پێغەمبەرەکان رۆژی قیامەت شەفاعەت دەکەن بۆ کەسانێك خودا خۆی بیەوێ شەفاعەتیان بۆ بکرێ.

{ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَى وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ } (۲۸) سورة الأنبياء:

هەروەکوو چۆن قورئان رەخنە دەگری لە موشریكو بێ دینەکان چونکە پشتیان بە شەفاعەت بەستووە، باوەڕی پوچو بەتاڵیان بەدەر دەخاو دەفەرموێ: {وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللّهِ مَا لاَ يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَؤُلاء شُفَعَاؤُنَا عِندَ اللّهِ } (۱۸) سورة يونس:

واتە: نەفامی ئەو موشریکانە لەوەدایە کە خوداناپەرستنو تاعەت بۆ ئەو بتە بێ گیانانە دەکەن: کە هیچیان لە دەست نایە نە زەرەریان هەس نە قازانج! کەچی دەیان پەرستنو دڵی خۆیان بەوە خۆش دەکەن دەڵێن: ئەم بتانە لای خودا شەفاعەتمان بۆ دەکەن!!.

پێویستە ئەوە دووبارە بکەینەوە: کە قورئان دەفەرموێ شەفاعەت تایبەتمەندە بە خودای مەزن خۆیەوە، ئەو خۆی بۆ کەسێك بیەوێ شەفاعەتی بۆ بکرێ ئیزن دەداو شەفاعەتی بۆ دەکرێ. لەمەشدا مەبەستێکی ئیصلاحی گەورە هەیە هەموو هیواو ئەمەلی سەرپێچی کەرانو ئەوانەی پشت بە شەفاعەت دەبەستن دەبڕێ تا ئومێدیان دەکا! هەروەکوو چۆن دەبێتە بەر پەرچو ئاگر بڕ لە ئەو کەسانەی ئیدیعای دووعا گۆییو خودا پەرستی دەکەن، ناهێڵێ ئەم جۆرە دەستبڕانە ئیستغلالی خەڵك بکەن بەوە کە دەبن بە شەفاعەت خواز لەلای خودا بۆیانو لێ خۆشبوونی گوناهیان لەلای خودا بۆ فەراهەم دەکەن، چونکە ئیزنی خودا بۆ کەس ئاشکرا نیە شەفاعەتیش بێ ئیزنی خودا سوودی نیە، کەوابوو ئینسان پێویستە پشت بە کردەوەکانی خۆی ببەستێو نییەتی خۆی حلێبە، رزگار

بوونی یا بە هیلاك چوونی پەیوەندی بە کرداری خۆیەوە هەیە! کەوابوو تیووری ئیسلامی لەسەر بنەمای خوا بە یەکناسین هەڵساوە، یەکتایی لەزاتو لە سیفاتدا. پەروەردگار هەمیشە ویستوویەتی مرۆڤ لە بەندایەتی بۆ بەندە رزگار بکاو رێزی ئینسانی پێ ببەخشێو دڵی قایم بکا بۆ خۆ راگرتن لە بەرامبەر تەنگو چەڵەمەی ژیان، تا ببێتە مرۆڤێکی صاڵحو گونجاو بۆ کۆمەڵی ئادەمیزاد؟!.

## بڕێ سیفاتی خودا کە لە قورئان دا باس کراون:

نابینین هیچ ئایینێك وەکوو ئایینی ئیسلام شانو پایەی خودایەتی هەڵێنێو پێیدا هەڵبڵێو چی شایستەی ئەو زاتەیە لە تەواوی زانایی‌و دانایی.... هتد، بۆی بچەسپێنێو وەپاڵی بدا، هەر کەسێ توێژینەوە لە قورئاندا بکا، بە جوانی تێبفکرێ لەو ئایەتانەی وەسفی خودا دەکەن هەستو شعوورێکی تێکەڵاو بە ترسو خۆ بەکەم زانینو سەر سوڕمان لەو زاتە بێچوونە (کە نە فکرو نە خەیاڵ دەرکی دەکاو نە عەقڵو فام دەورەی دەدا) دای دەگرێو راچەنینێکی وای تێدا پەیدا دەکا هەست بە لەززەتو خۆشییەکی تەواو بکا!!

ئەوەی کە مرۆڤ دوور دەخاتەوە لە شیركو هاوبەش بۆ خودا پەیداکردن بریتییە لە بڕوا بە هەبوونی پەیوەندییەکی وا کە مرۆڤ بە دەسەڵاتو توانای خوداوە ببەستێتەوە، هەردەم وابزانێ کە هیچ پەردەیەك نیە ببێتە ناوکۆ لە نێوان مرۆڤو زاتی خودادا، بە هیچ کلۆجێك لایەنی شەریك بۆ خودا قەراردان رەچاو نەکا! هەر لەبەر ئەمەشە ئیسلام لە نێوان خوداو خەڵکدا پەیوەندییەکی وا پتەو دادەنێ کە مرۆڤەکان پەنا نەبەن بۆ غەیری خوداو داوای یارمەتی جگە لە ئەو لە کەسی تر نەکەن!! لێرەش بەولاوە خودا یار بێ بە کورتی باسی بڕێ لەو سیفاتانەی خوداو ئەو پەیوەندییەی کە دایناوە لە نێوان خۆیو بەندەکانیدا دەخەینە روو.

١- توانایی خودای گەورە (قدرة الله تعالی):

چـی لـە کەونـدایـە بـە زینـدوو مردوویـەوە نیـشانەیەکە لـە نیـشانەکانی بـە توانایی خودا، پەروەردگار ئـەم حەشـاماتەی لـە نەبوونـەوە هێناوەتـە وجـوود بـە گوێرەی ویستی خۆی رێکی خستوون! ئەم دەسەڵاتو توانایەی خودا توانایەکی بێ پایانو بێ سنوورە، هیـچ شـتێك بـەرەنگاری نابـێو شـت نیـە لـە بونـەوەردا لـەژێر دەسەڵاتی خودا دەربچێ؟!! قورئانی پیرۆز ئەمەی ئاشکرا کردوەو دەفەرموێ:

{تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ} (١) سورة الملك:

واتە: پاکیو بـەرزیی بـۆ ئـەو خودایـە موڵـكو فـەرمانڕەوایی بونـەوەر بـە دەست خۆیەتیو بەسەر هەموو شتێکدا بە تواناو بە دەسەڵاتە.

{ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّهُ يُحْيِي الْمَوْتَى وَأَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ } (٦) سورة الحج:

واتـە: دروسـتکردنی ئـادەمیزاد لـە نەبوونـەوە وەهـەروا ئـەو هـەموو ئـاڵو گۆڕیـەی بـە سـەریدا هـاتووە، هـەروا ژیانـەوەی رووەك بـەهۆی بارانـەوە، ئەمانـە هەموو بەڵگەی ئەوەن کە خودا خودایـەکی حـەقو راسـتو بـێ وێنەیـە، دەتوانـێ مـردوو زینـدو بکاتـەوە، بەسـەر هـەموو شـتێکدا بـە دەسـەڵاتو خـاوەن توانایـە، قودرەتی خودا بەرهەم دارەو ئینتاجی هەیە، بەڵام زۆر لە تواناو دەسەڵاتی مـرۆڤ بەرز ترو بەهێز ترو فراوان تـرە، چونکە عـەقڵو هێـزی ئـادەمیزاد مەیـدانی لـە دروستکردنو زانینی شتدا سنوورێکی دیاری کراوی هەیـە، بـەڵام دەسـەڵاتی خـودا هـیچ سـنوورێکی نیـە!! ئـەوەتا پێڕۆکەیـەك کـە هـیچو پـوچ تـرین دروسـتکراوی خودایــە ئەگــەر هــەموو کۆمــەڵی ئــادەمیزاد کۆببنــەوە نــاتوانن ئــەو پێرۆکــە بەسیتەیان بۆ دروست بکرێ؟! ئائـەم جیاوازییـە فراوانـە کـە لـەنێوان دەسـەڵاتی خوداو دەسەڵاتی بەندەدا هەیە قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ کردوەو فەرموویەتی:

{يَا أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَـن يَخْلُقُوا ذُبَابًا وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ } (٧٣) سورة الحج:

واتە: ئەی کۆمەڵی ئادەمیزاد! ئەی خەڵکی مەککە! ئەی ئەوانەی کافرو بت پەرستن پەندێکی پڕ حیکمەتمان بۆ لێ داون گوێی لێ بگرن پەندەکەش ئەوەیە: ئەو بتانەی ئێوە لە جیاتی خودا دەیان پەرستن ناتوانن مێشك دروست بکەن، تەنانەت ئەگەر هەمووشیان کۆببنەوە هەر بۆیان دروست ناکرێ!!

بەڵێ نیشانەی بە دەسەڵاتی‌و بە توانایی خودا کە ئێمە لەم بونەوەرەدا هەستی پێ دەکەین ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو دەسەڵات‌و هێزە زۆر فراوانەو سنوورێکی نیە!! چونکە ئاشکرایە هەرچی لەسەر زەویدا هێزێکی هەبێ لە نوورو هێزی خۆری وەرگرتووە، دەی خۆ خۆر بۆ خۆی ئەستێرەیەکە لەو هەموو ئەستێرانەی ئاسمان کە ژمارەیان (خوا نەبێ) کەس نایزانێ!! کەوابوو دەبێ ئەندازەو چەندییەتی ئەو وزە بەهێزە گەورەیەی کە ئەم هەموو ئەستێرە کاکەشانەی بونەوەر وزەو روناکی لێ وەردەگرن چەند بێ‌و چۆن بێ؟؟!!

ئەمە نموونەیەکە لە بەتوانایی خودا وا دەیخەینە پێش چاوی خوێنەر، جا با بۆ خۆی ئەندازەی گەورەیی‌و بە توانایی خودا بخاتە بەر بڕستی خەیاڵی خۆی، ئەو وزەو توانایە تەصەوور بکا کە قورئانی پیرۆز لە ئایەتێکی کورتیلەدا وێنەی کێشاوەو دەفەرموێ: {الله نور السموات والأرض}:

واتە: پەروەردگار روناککەری ئاسمانەکان‌و عەردە، هەموو شتێکی خاوەن پرشنگ‌و وزە روناکی لەو وەردەگرێ!!

هێزو توانای خودا تێکەڵاوی ژیانی ئادەمیزادە، لە هەموو لایەکەوە ئاوێتەی بووە، کەوابوو هیچ پێویست ناکا مرۆڤ بە مەبەستی گەیشتن بە ئاوات یان خۆ پاراستن لە ناخۆشییەك پەنا بۆ غەیری خودا بەرێ، چونکە گەیاندن بە هیواو دوور خستنەوە لە بەلا، هەر بەدەست خودا خۆیەتی.

{وَإِن يَمْسَسْكَ اللّهُ بِضُرٍّ فَلاَ كَاشِفَ لَهُ إِلاَّ هُوَ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدُيرٌ، وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ} (١٧ - ١٨) سورة الأنعام:

واتە: ئەگەر خودا بیەوێ تۆ تووشی زەرەرو زیانێك بکا، کەس نیە بتوانێ ئەو بەلایە بگێڕێتەوە، مەگەر خودا خۆی بتوانێ، ئەگەر بیشیەوێ تۆ تووشی خێرو سوودێك ببی ئەوە هەر بۆ خۆی دەسەلاتی بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێ‌و کەس نیە بەری ئەو خێرو بێرە بگرێ، ئەو زاتە بێچوونە بەهێزو توانایە بەسەر بەندەکانی خۆیدا حەکیم‌و زانایە ئیش‌و کاری هەموو ڕێك‌و پێکەو بەرێ‌و جێیە!

تواناو دەسەلاتی خودا کاریگەرە لە هەموو شتێکدا؟ کاریگەرە لە دروستکردنی نێرو مێدا، کەوابوو چ حەوێجە دەکا لە جیاتی خودا پەنا بۆ بت‌و شەخص‌و قسن‌و گۆڕ بەرن یان خۆ بخەنە باوەشی نوشتە نووس‌و جادوگەرو دەست بڕەوە بۆئەوەی ژنەکەی کوڕێکی ببێ یان فلان شتی بۆ جێ بەجێ ببێ!! قورئان دەفەرموێ: {يَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ الذُّكُورَ وَيَجْعَلُ مَن يَشَاءُ عَقِيمًا} (٥٠) سورة الشورى:

واتە: خودا بە دەست خۆیەتی کەسێك مەیلی لێ بێ کچی ئەداتێ کەسێك مەیلی لێبێ کوڕی ئەداتێ، کەسێکیش مەیلی لێبێ نەزۆك‌و قسری دەکاو وەجاخ کوێر دەبێ.

هەروەها تواناو دەسەلاتی خودا کاریگەرە لە بەهێز کردن‌و بەرز کردنەوەی گەل‌و هۆز، یان ریسوا کردن‌و نزم کردنەوەیان خودا بۆ خۆی دەفەرموێ: {قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاءُ وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَاءُ بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَىَ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ} (٢٦) سورة آل عمران:

واتە: ئەی محمد! بلێ ئەی پەروەردگارم! پاشای پاشایان هەر تۆی، خاوەنی ملك‌و دارایی هەر تۆی، هەموو شتێك بەدەستی تۆیە کەسی تر شتی بە دەست نیە، هەر کەسێك ئارەزووت بێ ملك‌و سەڵتەنەتی پێ دەبەخشی! هەر کەسێك حەز بکەی نگین‌و دارایی لێ دادەڕنی! کەسێك بتەوێ ڕێزی دەدەیەو سەر بەرزی دەکەی، هی واش هەیە ژێر دەستەو ریسوای دەکەی...! خێرو فەڕ بە دەست خۆتەو بەسەر هەموو شتێکدا دەسەلاتت هەیە.

بە ڕاستی ئەمە وایەو ڕەوایە، ئەوەتا مێژوو پڕیەتی‌و بە چاوی خۆشمان دیومانە چەند گەل‌و کۆمەڵ‌و هۆز بەرز بونەوەو دەست ڕۆیشتو خاوەن حەشەم‌و

ناوبانگ بوون! کەچی لە پڕ چەرخ لێیان وەرسوڕاو نگین‌و داراییان نەماو ژێر دەستەو زەلیل‌و داماو بوون! چەندەها پاشاو سەرۆك لە رۆژگارێکا گەیشتوونە ئەو پەڕی هێزو نگین‌و سەر فرازیی، کەچی لە ناکاوێکا سەرەنگریّ بوون‌و کەوتوونە گێژاوی گەردوونەوە، یان کوژراون یان خراونە بەندیخانەوە یان شار بەدەر کراون‌و لە وڵات دوور خراونەوە!!

بەڵی لە راستیدا کاریگەرو کار ساز لە چۆنیەتی پێشکەوتن‌و دواکەوتنی گەل‌و هۆزو تاکتاکی کۆمەڵ تەنها خودایەو بەس!! ئیتر هیچ پێویست ناکا پەنا بردن بۆ غەیری خودا!! ئەوەندە هەیە پێویستە مرۆڤ دوای پشت بە خودا بەستن تا دەتوانیّ تێکۆشیّ‌و رەنج بداو رێگەی هەوڵ‌و تەقەللا بگریّ‌و رێبازی گەیشتن بە ژیانی کامەرانی‌و خۆش بەختی بدۆزێتەوەو بزانیّ رێگای چاك‌و خراپ کامەیەو لە کوێیە، چونکە مرۆڤ بۆ خۆی دەورێکی گرینگی هەیە لە ژیانی خۆیدا، هەر وەك هۆو سەبەب رۆڵێکی گرینگی هەیە لە ژیندا، خودا دەفەرمویّ: { إِنَّ اللّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ } (١١) سورة الرعد:

واتە: خودای پەروەردگار ژیان‌و شێوەی ژیانی هیچ کۆمەڵێك ناگۆڕی تا ئەو گەلە خۆیان رەوشتی خۆیان نەگۆڕن‌و زەمینەی ئەو گۆڕانە دروست نەکەن. سەیرکە ئەم ئایەتە پیرۆزە چۆن بە ئاشکرا ئەوەمان تیّ دەگەیەنیّ کە دەستووری خودا وایەو وا هاتووە: کە حاڵ‌و ژیانی هیچ گەلێك لە خۆشییەوە بۆ ناخۆشی یان لە ناخۆشییەوە بۆ خۆشی نەگۆڕیّ مەگەر ئەو کۆمەڵ‌و هۆزانە زەمینەی ئەو گۆڕانە دروست بکەن‌و شایستەی ئەو گۆڕانە بن، هەر گەلێك هەوڵ بدا کارو باری خۆی رێك‌و پێك بیّ‌و هەوڵی پێشکەوتن بداو سەر پێچی فەرمانی خودا نەکاو، ئەوە ئەو کۆمەڵە شایانی ئەوەن خودا یارمەتییان بدا. بەڵام هۆزێك رەوشت‌و رەفتاری بەرز ژێرپیّ بخاو ستەم‌و زۆرداریی بەلاوە پەسەند بیّ ئەوە بەبیّ شك‌و گومان شایانی ئەوەیە سەر شۆڕیی بە سەردا بیّ‌و ببێتە ژێر دەستەی بەرو جیرانی؟!!!

## زانستی خودا (علم الله):

پەروەردگار زانایەو زانینەکەی نەزانینی لە پێشدا نەبووە وەکوو زانینی ئێمە، هەروەکوو چۆن سڕینەوەی بەسەردا نایە زانینەکەشی بۆ هەموو شتێکە دوێنێو ئەمڕۆو سبەینێو ئاشکراو نهێنی بەلاوە یەکسانە، ئاگادارە بە هەموو کونو قوژبنێك لە ئاسمانو زەویدا، زانایە بە هەموو شتێکی دونیاو قیامەت!!

ئەم بونەوەرە چی تێدایە (لەگەڵ رێكو پێکی شتەکانی) هەموویان بەڵگەن لەسەر فراوانیو گشتییەتی زانستی خوداو کارسازیو دانایی ئەو زاتە بێچوونە. بڕێ لەو بەڵگانەی کە لە قورئانا هەنو فراوانی زانستی خودا دەچەسپێنن ئەوەیە کە پەروەردگار بەدیهێنەری هەموو شتێکە، دیارە کەسێکیش بەدیهێنەری کەونو کائینات بێ هەموو شتێك ئەو دروستی کردبێ، پێویستە زانابێ بە هەموو کونو قوژبنی ئەو بونەوەرە!

{وَأَسِرُّوا قَوْلَكُمْ أَوِ اجْهَرُوا بِهِ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ، {أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ} (١٣ - ١٤) سورة الملك.

واتە: قسەو گفتوگۆتان بشارنەوە یان ئاشکرای بکەن خودا ئاگای لێیەتیو دەیبیسێ، سەرەڕای ئەوەیشە زاناو ئاگادارە بە ئەندێشەو خەیاڵو چەکەرەو خەتەرەی دڵو هەرچی لەناو دڵدایە لای ئەو وەك یەك نمایانە، چۆن خودا بۆ خۆی نازانێ چی دروست کردوە؟ گوایە دروستکراوی خۆی ناناسێ؟!؟ خودایەکە زانینی وەهایە دەزانێ ناو دڵ چی تێدایە، خەبیرو ئاگادارە بەو شتانەی کە لە دڵدا شاردراوەن. جا لە کاتێکا ئەوەمان زانی قورئان ئەوە دەچەسپێنێ کە خودا نهێنیو ئاشکرای هەموو مرۆڤێك دەزانێ، زیاد لەوە ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکی بونەوەردا، سەرنجێکیش لەم ئایەتە پیرۆزە بدە کە بە راستی مرۆڤ تێیدا هەست بە گەورەییو زانایی خودا دەکا کە دەفەرموێ:

{اللّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَى وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُ بِمِقْدَارٍ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْكَبِيرُ الْمُتَعَالِ، {سَوَاء مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ الْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍ بِاللَّيْلِ وَسَارِبٌ بِالنَّهَارِ} (٩ - ١٠) سورة الرعد:

ئایەتەکە بە ئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ کە پەروەردگار دەزانێ ئەو کۆرپەڵەی لە سکی مێینەدایە نێرە یان مێیە، تاکە یا دوانە یا پترە! هەروەها دەزانی منداڵدان چۆن دوای منداڵبوون وێک دێتەوە پچووك دەبێتەوە یان چۆن بەهۆی نەش‌و نمای کۆرپەلەوە منداڵدان رۆژ لەدوای رۆژ لێك دەکشێتەوەو زیاد دەبێ، بە راستی هەموو شتێك لای خودا ئەندازەو شوێن‌و کات‌و زەمانی ئاشکرایەو زانراوە، نەك هەر ئەوە بەڵکوو پەروەردگار زانایە بەو شتانەی کە نهێنین لە هەستی ئێمەو هەستیان پێ ناکەین یان ئەو شتانەی کە دەیانبینین‌و هەست پێکراون، بە کورتی خودای گەورە زانایە بەهەر شتێك لە بونەوەردایە زیاد لەوە نهێنی‌و ئاشکرای دڵ‌و دەروونی هەموو مرۆڤێك دەزانێ چ کردار بێ چ گوفتار بێ هەروەها زانایە بەو شتانەی لە تاریکی شەودا ون‌ن‌و نابینرێن یان ئەوانەی ئاشکراو نمایانن لە رووناکی رۆژدا.

بەڵی پەروەردگار زانایەو ئاگادارە بە وردیات‌و نهێنی ئەم بونەوەرە.

**{وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلاَّ يَعْلَمُهَا وَلاَ حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الأَرْضِ وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ} (٥٩) سورة الأنعام:**

واتە: کلیلی گەنجینەی نهێنی گشتی هەر لای خودایەو ئەو نهێنی بونەوەر دەزانی‌و ئاگادارە بەسەر رابردوو داهاتوودا، چ ئەوی بووە چ ئەوی دەبێ، دەزانێ چی لە وشکانیدا هەیە چی لە دەریادا هەیە، هەر پەڵکە گەڵایێ هەڵوەرێ دەزانێ لە کوێ دەکەوێتە خوارێ‌و چۆن دەکەوێ، دوایی چی بەسەر دێ، هەر دەنکە دانەوێڵەیەك لەناو جەرگی زەویداو لە شوێنی تاریك‌و حەشارگەدا هەبێ، ئاگای لێیەتی‌و پێی زانایە بە کورتی هەموو شتێك تەڕبێ یان وشك لەم بونەوەرەدا هەبووبێ یان لەمەودوا ببێ، هەموو لە عیلمی خودا لە (لەوحولمەحفوظ)دا نوسراوەو ئاشکراو نمایانە!!

لەم دەقە پیرۆزەی قورئانەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە تیۆری ئیسلامی دەربارەی خودا برێتی نیە لە تیۆرێکی فەلسەفی میتافیزیقی رووت، وەکوو

زوربەی رۆژئاواییەکان بڕوایان وایە کە خودای گەورە بونەوەری بەدی هێناوە، دوایی خۆی بەرز بۆتەوە بۆ ئاسمانو چ پەیوەندییەکی بە مەخلووقاتی خۆیەوە نەماوە!! بەڵکوو موسوڵمانان پێیان وایە کە کردگار هەموو کات دەستی قودرەتی لەتەك زانستی فراوانیدا بونەوەر هەڵ دەسوڕێنن، هەرچی بووە یان دەبێ لەهەر شوێنو کاتێکدا بێ ئیشی کەریمی کارسازە خۆی دەی خوڵقێنێ!!

## بێ مانەندی خودا (ليس كمثله شيء):

جیاوازی خودا خۆی لەگەڵ دروستکراوانیدا روونو ئاشکرایە چونکە هەموو کات پلەی بەدیهێنەر زۆر لە ژوور پلەی بەدیهێنراوەوەیە، ئاشکراو نمایانە کە بەدیهێنەر نابێ (نە لە زاتدا نە لە صیفاتدا) لە بەدیهێنراوی خۆی بچێ. کەوابوو کە دەگوترێ خودا شت دەبیسێ مانای وانیە وەکوو ئێمە گوێچکەی هەیە! یان کە دەڵێن: خودا دەبینێ مانای وانیە وەکوو ئێمە بە چاوی سەر شت دەبینێ! ئەو زاتێکە جودایە لە مەخلووقاتی، شانو شکۆی خوایەتی ئەو زۆر لەوە بەرزترە عەقڵی کولی ئێمە دەرکی بکا...

مامۆستا شێخ (محمد عبده) دەفەرموێ: بیرکردنەوە لە خودی زاتی پەروەردگار هەوڵدانە بۆ زانینی کەونو چۆنیەتی ئەو زاتە بە شێوەیەکی تایبەتی لە روویەکەوە، لە روویەکی ترەوە دەرك کردنی کەونو چۆنیەتی خودا بۆ عەقڵی ئێمە پەی پێ نەبراوەو عەقڵی مرۆڤ وزەی پێ ناشکێو لە سنوور بەدەرە چونکە رێژەی بوونی خوداو بوونی ئادەمیزاد زۆر لێك دوورنو یەك ناگرنەوە. هەروەها چونکە خودا جیسمێکی لێك دراو نیە، زاتێکە بیرو هێزی مرۆڤ نایگاتێو کۆڵ دەبیو کول دەوەستێ! کەوابوو هەوڵدان بۆ زانینی کونهو زاتی خودا کات بە فیڕۆدانەو خۆ خستنە ناو گێژاوەوەیەو سەر بە فەتارە چوونە، کات بە فیڕۆدانە چونکە هەوڵو کۆشش کردنە بۆ شتێك کە نایگاتێ! سەر بە فتارە چوونە، چونکە ئەو هەوڵدانە سەر دەکێشێ بۆ چەواشە کردنی بیرو باوەڕ

لەم رووەوە هەوڵدەر دەیەوێ شتێك بپێوێ کە ناپێورێ، شتێك بژمێرێ کە ناژمێردرێ!

دوکتۆر (ماریت ستانلی کودج) هەمان رای شێخ (محمد عبده)ەی دووبارە کردۆتەوەو دەڵێ گومان لەوەدا نیە کە ئێمە کاتێك بمانەوێو هەوڵ بدەین بۆ زانینی کونهو زاتی خودا پێویستمان بە چەند زاراوەو مانایەکی وا هەیە کەبە تەواوی جیاوازن لەو زاراوەو مانایانەی بۆ باسکردنی شتی ماددی بەکاریان دەهێنن. بە تایبەتی دوای ئەوەی کە زانیمان ئەم بونەوەرەی ئێمە تێیدا دەژین مومکین نیە هەر بریتی بێ لە ماددەیەکی روتو قوت!! بەڵکوو پێك هاتووە لە ماددەو رۆح یان لە ماددەو شتی تریش، خۆ ناشتوانین شتە نا مادییەکان وەصفو دیاردەی مادییان بۆ بچەسپێنین!!

سەد مخابن برێ ئادەمیزاد رێگایان لێ هونبووەو کەوتوونە کێشەو نیزاعەوە دەربارەی زاتی خودا، برێ (وەثەنی) بەردو دار پەرست پێیان وایە خودا برێتییە لە چەند روحێك کە لە بەردو داردا دەنگ دەدەنەوە!! هێندێ پێیان وایە خودا لەناو لاشەی هەندێ مرۆڤدا حەل بووەو تواوەتەوە!!؟! بەڵام ئایینی ئیسلام هاتووە هەموو شتێکی خستۆتە شوێنی گونجاوی خۆیەوە، بۆ هەموو شتێك چونیەتێکی لەباری داناوە، دەربارەی حەقیقەتی خودی زاتی خودا بناغەیەکی پتەوی داناوە تیۆرێکی هێناوە دەم کووتی تاوانباری کردوە، عەقڵو هۆشی لە ژنگی نەزانیو دڵە راوکێ پاك کردۆتەوە، عەقیدەو بیرو باوەڕی خەڵکی دەربارەی خودا پاڵفتە کردوە:

تیۆری ئیسلامی بەلایەوە وایە کە بونەوەر یەك بەدیهێنەری هەیە کە هەرچی سیفاتی جوانو بەرزو کەماڵو جەلال هەیە تێیدایەتی!!

هەروەها داوامان لێ دەکا کە پەروەردگار بە دوور بگرین لە هەموو دیاردەیەکی ماددی، تەشبیهی بە هیچ شتێك نەکەینو لاشەو ئەندازەی جیسمی بۆ رەوا نەبینین، بە دووری بگرین لە هەموو سیفاتو رەوشتی مەخلووق. ئەوەتا

ئایەتەکانی قورئانی سەر بەم باسە هەموویان داکۆکی لەوە دەکەن کە مرۆڤ نابێ بیر لە چۆنیەتی خودی زاتی خودا بکاتەوە چونکە کارێکی بێ هودەیەو نەجات بوونی تیا زەحمەتە.

{لاَّ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ} (١٠٣) سورة الأنعام:

واتە: چاوو حەواسەکانی تر ناتوانن کەونو حەقیقەتی خودا دەرک بکەن بەڵام خودا کونهو حەقیقەتی چاوو حەواسی ئێمە دەزانێ یان ئەم ئایەتە کە دەڵێ: { لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ } (١١) سورة الشورى:

واتە: خودا خودایەکی بێ چوونو بێ مانەندە، هیچ شتێك لە مەخلووقاتی خودا ناتوانن وەکوو زاتی ئەو بن لە زانستو کارامایی‌و دەسەڵاتو توانادا.

یان ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: {يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِ عِلْمًا} (١١٠) سورة طـه:

واتە: خودا هەموو شتێکی ئەوان زۆر باش دەزانێ، چ ئەوەی لەمەو پێش روویداوەو چ ئەوەی لەمەودوا روو دەدات، وەلێ ئەوان سەر لە زاتی دەرناکەنو پەی بە چۆنیەتی‌و حەقیقەتی نابەن.

یان ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: {سُبْحَانَ رَبِّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ} (٨٢) سورة الزخرف:

واتە: پاكو بێ عەیبی بۆ خودایە کە بەدیهێنەری ئاسمانو زەوییە خودای عەرش‌و کورسییە، زۆر دوورە لەو سیفەتانەی وەپاڵی دەدەنو لەوەی کە منداڵی هەبێ!!

پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێ) بۆ بەرگری لەم چەواشە بوونە فەرمانی کردوە بەوە کە موسوڵمان بیر لە مەخلووقاتی خودا بکاتەوە بەڵام بیر کردنەوەی لە خودی زاتی خودای بە یاساغ داناوەو فەرموویەتی: {تفكروا في كل شيئ ولا تفكروا في ذات الله}:

واتە: بیر لە نازو نیعمەتی خودا بکەنەوە، سەیری مەخلووقاتی بکەن‌و تێیان بفکرن، بەڵام بیر لە چۆنیەتی خودی خوا خۆی مەکەنەوە.

ئائەم تیۆرەی ئیسلام دایناوە بۆ بە دوور گرتنی پەروەردگار لە هەموو خەوشێك، بەرزترین‌و قوڵترین فەلسەفەی جیهانی (تا دوای هاتنی ئیسلامیش بە چەند سەدەیەك) پەییان پێ نەبردووە، کە وابوو پەیدابوونی ئەم تیۆرە لە دوورگەی عەرەبیدا لەو رۆژگارەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە قورئانی پیرۆز سروشی خودایە.

## سیفەتی ژیان بۆ خودای مەزن (حیاة الله تعالى):

خودای پەروەردگار مەصدەرو کانی ژیانە، هەر ئەوە ژیان بە هەموو زیندوویەك دەبەخشی، کەوابوو پێویستە خۆی سیفەتی ژیانی هەبێ‌و زیندویەتی ئەو لە بەرزترین شێوەدا خۆی بنوێنێ، ژیانی خودای گەورە هەتا هەتاییەو بڕانەوەی نیە، وەنەوزو نووستنی بەسەردا نایە.

قورئان دەفەرموێ: {اللّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ {اللّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لاَ تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ }:

واتە: بەس یەزدان خودای راست‌و دروستە شایستەی پەرستن‌و عیبادەتە، خودای تر نیە جگە لە خۆی، زیندوەو هەرگیز نامرێ، بۆ خۆی پایەداەو راگرەو لەنگەری بونەوەری راگرتووەو پارێزگاری هەموو شتێکەو هەمیشە ورياو ئاگادارە بە هەناسە بێ ئاگایی‌و فەرامۆشی‌و وەنەوزو خەو رووی تێناکا!!

قورئانی پیرۆز لە دوو ئایەتی کورتیلەدا باسی ئەو دیاردەو گۆڕانکارییەی کە تووشی زیندەوەر دەبێ لە تەك باسی سیفەتی ژیان‌و زیندویی بۆ خودا بە رەوانی‌و پاراوی رادەگەیەنێ‌و دەفەرموێ:

{كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ، وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ}:

واتە: هەرچی لەسەر زەوی هەیە دەمرێ‌و دەفەوتێ، زیندەوەرلە بونەوەردا نامێنێ، تەنها زاتی بێچوونی خودای تۆ دەمێنێتەوە، چونکە ئەو خاوەن شکۆیەو

دووره له هه‌موو کەمو کورتییەك. ژیانی خودا پێویستی بە خواردەمەنی نیە وەکوو زیندەوەرانی تر پێویستیان پێیه. خودا دەفەرموێ:

{قُلْ أَغَيْرَ اللّهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَهُوَ يُطْعِمُ وَلاَ يُطْعَمُ قُلْ إِنِّيَ أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ وَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكَينَ...} (١٤) سورة الأنعام:

واته: ئەی پێغەمبەر! بەو خوا نەناسانه بڵێ: ئایا چۆن ڕەوایە لە کاتێکا خودای من دروستکەری ئاسمانو زەوییە لە نەبوو هێناونیە بوون، خۆراكو ڕۆژی دەدا بە زیندەوەرانو خۆی هیچ هەوەجی بە خۆراكو ڕۆژیی نیە، لە هەموو خواردەمەنییەك بێنیازه، ئەمجار بڵێ: ئێوە کەیفی خۆتانە من فەرمانم پێکراوە کە یەکەم کەس بم بۆ خودا پەرستیو گەردن کەچی لەم ئۆمەتی ئیسلامە، هەروەها پێم گوتراوە کە بە تەواوی قەطعی عەلاقە بکەم لەگەڵ فرە خودا کاناو هاوڕێیان نەکەم!

ئایینی ئیسلام بەم ئایەتە ڕێگای لە هەموو کاهینو مالەو بت پەرستو دەست بڕەکان بەست، ئەوانەی فەرمانیان دەکرد بە شوێن کەوتووانی خۆیان کە قوربانیو کوشتی سەر ببڕن بۆ خودا درۆزنەکانیان، بە ئاشکرا بانگی هەڵدا کە قوربانیو فووتو بۆ قەبرو قسنو عیبادەتگا سەر نابڕدرێ، چونکە خودا پێویستی بە خۆراك نیەو شت ناخوا ئەو قوربانیانە تەنها کاهینەکان سوودی لێ وەردەگرنو خۆیان لرفی لێ دەدەن!!

بە ڕاستی قورئانی پیرۆز بە ئاشکرا کردنی ئەم ڕاستییە مرۆڤی ڕزگار کرد لەو بیرە پڕو پووچە، لەو فیکرە شێواوەی کە لەناو زۆر لە گەلاندا بلاو بوبوەوەو خەڵکی بە خۆڕایی ماڵو دارایی خۆیان بە فیڕۆ دەدا تەنانەت ئێستاش بڕێ نەزانو نەفام ئەم جۆرە کردەوانە ڕەچاو دەکەنو هەر بەینە نا بەینێك حەیوانێك بۆ گۆڕی شێخ فلان یان بۆ مزگەوتی فلان شوێن سەر دەبڕن، بەمە ماڵی خۆیان بە فیڕۆ دەدەنو کردەوەکانیان بێ هودە دەبن.. ئیتر بەم ڕوون کردنەوەیە قورئان دەرگای لەسەر ئەو بێدینانە داخست کە بتوانن لە ڕێگای ئەم

کـردەوە نـا ئیـسلامیانەوە هێـرش بێننـە سـەر دیـن بـە گـشتی‌و دەنـدوکی پیـسی خۆیانی پێ دادەن!

(بـەڵام قوربـانی شـەرعی لـە ئیـسلامدا ڕەوایـەو ئـەوە لـەم جۆرە بیدعەتانـە جیایەو مەبەسـت لێـی ڕەزای خـوداو سـوودی هـەژارو گەدایـە، نـەك بەرژەوەنـدی مشە خۆرە لە چەرەکانە)...

لە شوێنێکی تردا قورئانی پـیرۆز ئـەوە دەردەخـا کـە ژیـانی خـودا (حيـاة الله) زیندویی هەمیشەیی‌و نەبڕاوەیە، دوورە لە دیاردەی ژن‌و منداڵ، نە ژنی هەیە نـە منداڵ. بەمەش ئیسلام کەلەبەرێکی گەورەی بەست (کە لەو کەلەبەرەوە) هێنـدی لەوانەی کە خۆیان بە خودا دەزانی گەڵ‌و ژێر دەستەی خۆیـان بـچەوسێننەوە بـە بەڵگەی ئەوە کە خۆیان کوڕو کوڕەزای خواکـانن پێویـستە تاعـەتیان بـۆ بکـرێ‌و خەڵکی بۆیان گەردن کەچ بن. لەم ڕووەوە قورئان دەفەرموێ:

{بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ أَنَّى يَكُونُ لَهُ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُ صَاحِبَةٌ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ وهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ، ذَلِكُمُ اللّهُ رَبُّكُمْ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ خَالِقُ كُلِّ شَـيْءٍ فَاعْبُـدُوهُ } (١٠١ - ١٠٢) سورة الأنعام:

واتــە: خـودای گـەورە خودایـەکی ئـەو تۆیـە ئاسمانـەکان‌و زەوی لـە نـەبوون دروست کـردوون، خـاوەنی بونـەوەرە، لـە هـەموو شـتێك بـێ نیـازە، دەی کـە وابـێ چۆن منداڵی دەبێ، چۆن منداڵ بۆ خـۆی ڕەوا دەبینـێ! نـە منـداڵی هەیـە نـە ژن. هـەموو شـتێك خـۆی دروسـتی کـردوە، ئاگـاداری هـەموو شـتێکە!! ئائـەو خودایـە پەروەردەکەری ئێوەیە، جگە لە ئەو هیچ خودایەك نیە! هەرچی بـووەو هەرچـی دەبێ ئـەو بـەدی هێنـاوەو بـەدی دەهێنـێ هـەر ئـەو شایـستەی تاعـەت‌و پەرسـتنە تەنها ئەو بپەرستن‌و بەس!!

## صیفەتی بیستن‌و دیتن بۆ خودا (سمع الله وبصره):

صیفەتی بیستن‌و دیتن لـەو صـیفەتانەن کـە بـۆ خـودا شاییـستەن‌و پێویـستە هەی بن، چونکە ناگونجێ خودا هەبێ‌و ئەم صیفەتانەی نـەبن، ئەمـەش ڕاسـتییە

کە قورئان بە ئاشکرا ئاماژەی بۆ کردوە، ئەوەی چەسپاندووە کە بوونی صیفەتی بیستن و دیتن نیشانەی خودایەتییەو نەبوونیان نیشانەی نا خوداییە!

ئەوەتا حەزرەتی ئیبراهیم کاتێ داوا لە باوکی دەکا کە واز لە پەرستنی بتەکانیان بێنن بەڵگەیەکی لەسەر ناخودایی بتەکان ئەوەیە کە نابیستن و نابینن.

{ يَا أَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِي عَنكَ شَيْئًا} (٤٢) سورة مريم:

واتە: باوکە بۆچی تۆ شتێك دەپەرستی کە نابیسێ و نابینێ و لە هیچ شتێکیش بێ ئیحتیاجت ناکا!! مانای ئەم ئایەتە ئەوەیە کە خودای حەق و راست و دروست پێویستە بیسەرو بینابێ، ئەم راستییەش قورئان لە زۆر شوێندا دووپاتی کردۆتەوە، یەکێ لەم شوێنانە ئەو رووداوەیە کە (خەولە) هات بۆلای پێغەمبەرو شکاتی لە مێردەکەی کرد ئەم ئایەتە نازڵ بوو کە دەفەرموێ: {قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ} (١) سورة المجادلة:

واتە: بە راستی خودا قسەی ئەو ژنەی بیست کە دەربارەی مێردەکەی دەمە دەمێت لەگەڵ دەکات و سکاڵای دەباتە لای خودا، خودا گوفتووگۆی ئێوەی دەبیست و ئاگای لێ بوو بە راستی خودا ژنەواو بینایەو ئاگاداری هەموو شتێکە.

## گفتوو گۆی پەروەردگار، فەرمایشتی خودا (کلام الله تعالی):

رەوشتی فەرمایشت (صیفەتی کەلام) یەکێکە لە صیفەتەکانی خودا بەڵام پێویستە ئەوە بزانین: کە جیاوازیی هەیە لە نێوان گفت و گۆی خوداو گفت و گۆی ئادەمیزاددا، گفت و گۆ لای ئادەمیزاد بە وشەی گوتراو یان نووسراو ئەنجام دەدرێ، بەڵام پەروەردگار گفت و گۆی خۆی بە سروش و نیگا ئەنجام دەدا... بەم جۆرە سروش و نیگا بخاتە دڵی ئەوانەی هەڵیان دەبژێرێ بۆ بڵاوکردنەوەی پەیامی خۆی، یان وشەکە لە دڵ و دەروونی قسە لەگەڵ کراویدا دەخولقێنێ یان

بە هۆی فریشتەوە کە بیکاتە پەیامنێر بۆ لای پێغەمبەرەکان، قورئانی پیرۆز دەربارەی ئەم شێوە گفتو گۆیانە ئاماژەی کردوەو فەرموویەتی:

{وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَاء حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاء إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ} (٥١) سورة الشورى[1]:

له ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: {تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ اللَّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَاتٍ} (٢٥٣) سورة البقرة:

ئەو پێغەمبەرانە هەموویان بە ڕێزو نازدارن، دەنا نەدەبوون بە پێغەمبەر! وەلێ حیکمەتی خودا وایە ئەوانیش بە ڕێزو بەڕێز تریان تیایە، هەیانە خودا بۆ خۆی قسەی لەگەڵدا کردوە، هەیانە خودا لە زۆر ڕووەوە پایەو پلەی بەرزەوە کردوە!

کەلامی خودا کۆتایی نیەو نابڕێتەوە هەروەکوو چۆن لە ژمارەش نایە.

{وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِن بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ} (٢٧) سورة لقمان:

واتە: ئەگەر هەرچی دارو درەختی سەر زەوی ببنە پێنووسو دەریا ببێتە مەرەکەبو حەوت بەحری تریش بخرێنە پاڵیو کەلیماتو گفتو گۆی خودای پێ بنووسرێ هێشتا کەلامی خودا کۆتایی نایەو قەڵەمو مەرەکەب تەواو دەبن!! چونکە کەلامی خودا بێ ژمارەو ئەندازەیەو بڕانەوەی نیە!

## صیفەتی قیدەمو هەوەڵی خوداو پایەداریی (قدم الله وبقاؤه):

خودای مەزن دەفەرموێ:

{هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ} (٣) سورة الحديد:

واتە: پەروەردگار خودایەکی بێ وێنەی بێ نیازە، پێش هەموو شتێك هەبووەو سەرەتای بوونیشی نیە پاش هەموو شتێك دەبێو کۆتایی هەبوونیشی

---

[1] تەفسیرو ڕاڤەی ئەم ئایەتە لەسەرە باسی (وحی)دا ڕابوورد.

نابێ، ئاشکرایەو بەڵگە لەسەر خوایەتی ئەو دیارو لەبەر چاوون، نهێنییەو هەستی مرۆڤ دەرکی ناکا، ئەو خودایە ئاگاداری هەموو شتێکەو هیچی لێ هون نابێ!

لە شوێنێکی تردا خودای مەزن دەفەرموێ: {وَلَا تَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ لَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ} (٨٨) سورة القصص:

واتە: ئەی موحەممەد نەکەی بچی لەگەڵ پەرستنی خودای گەورە خوایەکی تر بپەرسێو شەریکی بۆ رەوا بینێ! هیچ خودای راستو دروستو حەق نین جگە لە ئەو، هەموو شتێك بە فەنا دەچێو هیچ کامێك لەم خودا درۆزنانە نامێننو تەنها زاتی حەق پایەدارو بەرقەرار دەمێنێ، حوکمو فەرمانڕەوایی هەر بۆ خودایەو هەمووتان رۆژی رەستاخیز بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە!

## پوچاندنەوەی شوبهەو رەت کردنەوەی لکەدارکردنی صیفەتەکانی خودا:

وەکوو ئاشکرایە ناوی پیرۆزی خودای مەزن لە قورئاندا زۆر جار هێندراوە لە تەك صیفەتێك یا زیاتر لە صیفەتەکانی کەماڵو جەلالی دا وەکوو (قاهر)، (جبار)، (المهيمن)، (العزيز)…. هتد. ئیتر برێ لێکۆڵەرەوەی دەروون پیس ئەوەیان کردوە بە بیانوو برێ شوبهەو لکەیان لە زاتو صیفاتی خودا خڕ کرۆتەوە، یەکێ لەو لێکۆڵەرەوانە دکتۆر (فیلیب حتی)یە کە لە کتێبی (تاریخ العرب ج/١ ل/١٧٧ چاپی/٢)دا دەڵێ: باسی صیفەتی خۆشەویستیو سۆزو دڵنەرمی لە قورئاندا لە بەرامبەر صیفەتی هێزو تواناو بەدەسەڵاتو تۆڵە سێنو دەست رۆییشتودا زۆر خۆ بەکەم دەنوێنن، واتە صیفەتی خۆشەویستیو سۆزو… تاد لە بەرامبەر صیفەتی هێزو توانادا زۆر کەمن!!

جا بۆ رەتکردنەوەی ئەم بۆ چوونە پوچەی دکتۆری ناوبراو دەڵێین: شتەکە بە پێچەوانەوەیە چونکە صیفاتی هێزو تواناو دەسەڵات لە قورئاندا زۆر کەمترن لە صیفاتی سۆزو خۆشەویستی! ئەگەر بێین سەر ژمێری صیفاتەکانی خودا بکەین کە لە قورئاندا باس کراون دەبینن رێژەی صیفەتی حوبو خۆشەویستی

زۆر ترن لە صیفەتی جەلال‌و عیززەت. لە لایەکی ترەوە صیفەتی هێزو توانا پێویستیاتی خودایەتی راستین، چونکە بەم صیفەتانە زۆر داران لە سەر کێشی‌و ناهەمواریيان دەگێڕێتەوە!! هیچ پێویست ناکا کە ئێمە پێمان وابێ دەبێ هەموو کاتێ خودا بە روحم‌و هێدی‌و هێمن‌و بەزەیی بێ. نابێ ئەوە لە بیر بکەین کە رق‌و خەشمی خودا بۆ شەقاوەو سەرپێچی کەران‌و زۆر داران لایەنێکی دادوەری‌و داد پەروەرییەتییە.

## صیفەتی هێزو شکۆمەندی‌و سەرکوت کردن (صفات القوة والقهر):

ئەگەر ئێمە بمانەوێ هەرچی صیفاتی قەهرو خەشم‌و هێزو توانایە کە لە قورئاندا بۆ خودا رەوا بینراون رایان نوێنین‌و بیانخەینە بەر لێکۆڵینەوە دەبینین هیچیان مانای زوڵم‌و زۆر هەڵناگرن‌و نابنە جێگای شوبهەو گومان (وەکوو لەمەدوا رونیان دەکەینەوە) بۆ نموونە یەکێك لە صیفاتی شکۆمەندی‌و جەلال صیفەتی:

١- (الجبار) سەرچاوەکەی وشەی (جبر یجبر)ە کە بە مانای چاك کردنەوەو پرکردنەوەی کەلەبەرو راست کردنەوەی خواری‌و لارییە. بڕێك دەڵێن وشەی (الجبار) بە مانا رام کردنی بەندەگانە بۆ ویستی خۆی. بڕێك دەڵێن: (الجبار) بە کەسێك دەگوترێ: کە هیچ شتێ نەتوانێ کاری تێبکا، نە پەلاماری هێرش بەران‌و نە فێڵی فێڵبازان ناتوانن زەبری پێ بگەیەنن، یان کەسێك نەبێ دەستی بە سەریدا بڕوا.

٢- (المهيمن) واتە: ئاگادارو دەست رۆیشتوو بەسەر دروستکراوانیدا.

٣- (العزيز) واتە: خاوەن هێزو توانایەکی ئەوتۆ هیچ کەس نەیگاتێ هیچ کەس بە سەریدا زاڵ نەبێ، هیچیشی لێ عاسی نەبێ لە هیچ شتێکیش نەترسێ!!

٤- (المتكبر) واتە: خۆ بە گەورە گرو شکۆمەندو خاوەن دەعیەو عینوان.

٥- (القهار) واتە: خاوەن هێزو تواناو دەست رۆیشتوو بەسەر هەموو بونەوەردا.

٦- (العظيم) واتە: مەزنێکی وا سنوورو ئەندازە نەبێ بۆ گەورەی‌و شکۆمەندی.

٧- (المنتقم) واتە: تۆڵە سێن و سزادەر بۆ سەرپێچی کەران و خوا نەناسان.
٨- (مالك الملك) واتە: کەسێك کە شایانی ئەوەبێ لە مڵکی خۆیدا کە بونەوەرە (چی خواست و ویستی بێ بیکا)، کەس دەست بەر دەستی نەهێنێ.

## صیفەتی خۆشەویستی و بەزەیی و دڵ نەرمی بۆ خودا :

صیفەتی خۆشەویستی و بە بەزەیی و دڵ نەرمی بۆ خودای پەروەردگار لە قورئاندا زۆر باس کراون و زۆرو زەبەندەن. لەم جۆرە صیفەتانە صیفەتی (الرحمن)ە کە بە مانا بەخشندەیە بە نازو نیعمەتێکی زۆرو زەبەندە بۆ هەموو زیندەوەرو مرۆڤێك. صیفەتی (الرحیم) بە مانا ئاشتی بەخشەو خولقێنەری ئارامییە.

صیفەتی (الغفار) بە مانا خاوەنی لێخۆشبوونی زۆرە. صیفەتی (الرزاق) واتە رزق رۆژیی زیندەوەرانی لە ئەستۆ گرتووە. صیفەتی (اللطیف) واتە: هێدیەتی و هێمنی لە کارو کردەوەیدا کۆبونەتەوە.

صیفەتی (الشکور) واتە سوپاسی فەرمانبەردارانی دەکا. صیفەتی (الکریم) واتە: جوامێرێکی وایە هەرچەندێ خەڵاتی گەورە ببەخشێ بایستی نیەو هەرچی ببەخشێ لەبەر چاوی نیەو چاوی لە دووی نیە.

صیفەتی (المجیب) واتە: کەسێك داوای داواکاران جێ بەجێ دەکاو دڵ نیگەران نابێ لە داوا کردنی زۆرو لە پێداگرتن و پێ کێشی کردن.

صیفەتی (التواب) واتە: تەوبە قبووڵ دەکاو پێداویستی تۆبە دەخولقێنێ بۆ بەندەکانی.

صیفەتی (الودود) واتە: زۆر بەندەکانی خۆی خۆش دەوێ هەر کەسێك لێی نزیك ببێتەوە دەیخاتە ژێر باڵی رەحمەتی خۆیەوە.

تەنانەت بڕێ لەو ئایەتانەی قورئان کە وەصفی خودایان بە بەهێزو شکۆمەندی کردوە راستەوخۆ یان لە پێشەوە یان لەدواوە صیفەتی رەحمەت و نەرم و نیانیانی لەتەکدا هێناوە وەکوو ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ:

{نَبِّئْ عِبَادِي أَنِّي أَنَا الْغَفُورُ الرَّحِيمُ، وَ أَنَّ عَذَابِي هُوَ الْعَذَابُ الأَلِيمَ} (٤٩ - ٥٠) سورة الحجر:

واتە: ئەی پێغەمبەرو فروستادەی خۆم بە بەندەکانم رابگەیەنە کە من زۆر لە هەڵەو تاوانیان خۆش دەبم‌و بە روحم‌و دڵ نەرم‌و بە بەزەییم بۆیان. لە هەمان کاتیشدا پێیان بڵێ کە سزاو تۆڵەم زۆر بە ئێش‌و کوشندەیە سوێ دەباتە ناو دڵی تاوانبارانەوە. ئەوەتا دەبینین پەروەردگار لەم ئایەتەداو لە ئایەتی تریشدا وەصفی خۆی بە بەزەیی‌و رەحم‌و شەفەقەت کردوە { رَّبُّكُمْ ذُو رَحْمَةٍ وَاسِعَةٍ } (١٤٧) سورة الأنعام:

واتە: رەحمەتی پەروەردگارتان دەریایەکی بی پەیەو ئەوەندە بەرواڵاو فراوانە ئەم پەڕەو پەڕو سنووری بۆ نیە. یان دەفەرموێ: { كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ } (٥٤) سورة الأنعام:

واتە: ئەی فروستادە! بەو خەڵکە بڵێ: خودای ئێوە صیفەتی رەحمەت‌و بە بەزەیی لەسەر خۆی نوسیوەو لەگەڵ ئێوەدا رەفتاری دەکا تەنانەت موسوڵمانان هەر کاتێ بیانەوێ قورئان بخوێنن بە رستەی (بسم الله الرحمن الرحيم) بە ناوی خودای بەخشندەو میهرەبان دەست پێدەکەن، کەوابوو راوو بۆچوونی ئەوانەی کە دەڵێن لە قورئاندا خۆشەویستی‌و میهرەبانی کەم باسکراوە صیفەتی بەهێزو توانای زۆر هێنراوە بی بناغەو بی بنەمایە هەر لە خۆیەوە دەیوو چێتەوە!!.

## خودا لە زوڵم‌و زۆر، گەلێ بە دوورە (انتفاء الظلم عن الله):

لە قورئاندا زۆر جار وەصف‌و سەنای خودا بەوە کراوە کە زوڵم‌و زۆردار نیەو ستەم لە کەس ناکا، بۆ نموونە لە سورەتی (الكهف/٤٩)دا دەفەرموێ: {وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا}:

واتە: خودایێ کە خودای تۆ بێ، کە ئەوەندە هەقانی‌و دوور لە زوڵم‌و زۆر بێ، هەرگیزاو هەرگیز زۆرو ستەم لە کەس ناکا.

لە سورەتی (آل عمران/١٠٨)دا دەفەرموێ: {وَمَا اللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعَالَمِينَ}:

واتە: هەرگیز خودا نایەوێ زوڵم و زۆر بۆ بەندەکانی و مەخلووقاتی ئەنجام بدا.

لە سورەتی (النساء/٤٠)دا دەفەرموێ: {إِنَّ اللّهَ لاَ يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ}:

واتە: بێگومان خودای گەورە بە ئەندازەی گەردیلەیەك زوڵم و زۆرداری لە هیچ کەس ناکا! جا ئەگەر سیفاتی خودا سیمای زوڵم و ستەمیان پێوە دیار نەبوو، یان بڵێین هەر تێیاندا نەبوو، ئیتر بە تەواوی پڕو پووچی گومانی ئەوانەی کە دەڵێن: سیفەتەکانی خودا لایەنی (قارو زۆرو تواناو هێزو جەبەڕوتی) لە لایەنی (میهرەبانی و خۆشەویستی و دڵنەرمی زۆرترە) دەردەکەوێ و ئاشکرا دەبی و بۆمان روون دەبێتەوە کە سەرجەمی سیفەتەکانی خودا کە لە قورئاندا باسکراون هەموویان سیفاتی کەماڵ و شکۆمەندی و بەرزین و لایەنی میهرەبانی و بە بەزەیی و عەطفیان زۆرترە.

## گومانێکی ڕەت کراوە (شبهة مردودة):

یەکێك لەو گومانە سەیرانەی کە بێ دین و خوا نەناسەکان لە وڵاتی ئیسلامدا پڕو پاگەندەی بۆ دەکەن، ئەوەیە کە دەڵێن: (ئەگەر راست بێ خوا هەیە چۆن رێگا دەدا مرۆڤ هەڵبەزێتە ناو مەلەکوت و کیشومریەوەو هەوڵ بدا سەرمانگ داگیر بکا بە کەشتی ئاسمانی سەر ئەستێرەکانی تر بپشکنێ؟!) ئێمە بەوانە دەڵێین: ئێوە بە چ ئەقڵێك دەڵێن کە مەلەکووتی خودا بریتیە لە مانگ و مریخ و زوهرە؟! بەڵکوو مەلەکووتی خودا (بە گوێرەی قورئان) بریتییە لە هەموو کەون و بونەوەر! خودا دەفەرموێ: {اللّهِ الَّذِي لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ}:

واتە: خودای گەورە خودایەکی وایە چی لە ئاسمان و زەویدا هەیە هەموو موڵك و مەلەکووتی خۆیەتی! نەك هەر ئەوەندە بەڵکوو ئایەتی قورئانی وا هەیە راستەوخۆ بۆ چوونی ئەو نەفامانە رەت دەکاتەوەو بەڵگەو دەلیلیان پوچ دەکاتەوە! بۆ نموونە دەفەرموێ:

**{أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ} (٢٠) سورة لقمان:**

**واتە: ئایا ئێوە نابینن کە خودای مەزن بۆ خۆش گوزەرانی ئێوە چی لە ئاسمان‌و زەویدا هەیە مەرەخەسی کردووەو دەتوانن سوودی لێ وەرگرن نازو نیعمەتی بە ئاشکراو نهێنی بە سەردا رشتوون، کەچی هێشتا مرۆڤی وا هەیە کێشەو دەمە دەمێ لە کاری خودادا دەکاو رەخنە لە نەخشەو ئیشەکانی دەگرێ، بەبێ ئەوەی زانستییەك، بەڵگەیەك، نووسراوێکی رۆشن کەرەوەی بە دەستەوە بێ!!! دەی ئەم ئایەتە دەقێکی ئاشکراو نمایانە بەوەی کە خودای گەورە چی لە بونەوەردا هەیە بە ئەستێرەو جیرمو مانگ‌و خۆریەوە بە وشکانی‌و زەوی‌و ئاوو هەواو دارو درەخت‌و روەکیەوە رام کراوە بۆ سوودی ئادەمیزاد، هەر کاتێك مرۆڤ توانی بەسەر سروشتدا زاڵ ببێ‌و پێویستی خۆی لێ وەدەست بخا مانای وایە بە گوێرەی ویستی خودای کردووەو فەرمانی ئەوی بەجێ هێناوە! تۆ سەیری کۆتایی ئایەتەکە بکەو بروانە چۆن بە کورت‌و پوختی بە رەوانی‌و بە ئاشکرا پرو پاگەندەی ئەو باشقە پرۆفیسۆرانە رەت دەکاتەوە کە هەردەم خەریکن گومان بخەنە ناو دڵی عەوام‌و رەشە خەڵکەکە، بەبێ ئەوەی بەڵگەیەکی زانستییان لا هەبێ‌و بتوانن بۆچوون‌و رایەکانیان بچەسپێنن بە راستی ئەم رستەو کۆتایی ئایەتە کە دەفەرموێ: {وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ}..هتدهەر دەڵێی ئەمرۆ هاتۆتە خوارێ بۆ دەم کوتکردنی ئەو مولحیدو بێ دینانە!!؟**

## بەشی شەشەم:

# بڕوا بە ڕۆژی ڕەستاخیز (الإيمان باليوم الآخر)

**بەڵگە لەسەر هەبوونی ڕۆژی ڕەستاخیز - ڕێبازی ماددیو کاریگەریی لە کۆمەڵدا - کێشە لەگەڵ مادییەکانو بەگژدا چوونەوەیان - حەقیقەتو چۆنیەتی گیان لە ڕوانگەی قورئانەوە - زیندو بوونەوەی دوایی تەنگو چەڵمەی ڕۆژی قیامەت - حیسابو لێکۆڵینەوە - خۆشییە هەستییە ( حسّی یە )کانی بەهەشت - خۆشییە گیانیەکانی بەهەشت - سزا لەسەر کردەوەی خراپ.**

## بەڵگە لەسەر هەبوونی ڕۆژی ڕەستاخیز:

ئێمە دوو جۆر بەڵگەمان هەیە بۆ چەسپاندنی ڕۆژی ڕەستاخیزو زیندو بوونەوە، جۆرێکیان نەقلیو گوفتار ئامێزە، جۆرێکیشیان لە ڕووی عەقڵو ئاوەزەوە ئەنجام دەدرێ! بەڵگە نەقلییەکان بریتین لەوە کە هەموو ئایینەکان (ئایینە ئاسمانییەکان) سوورن لەسەر ئەوە کە دوای مردن ژیانێکی تر هەیە مرۆڤ تێیدا سزاو پاداشی کردەوەکانی دونیای وەردەگرێتەوە!!

بەڵگەی ئەقڵیش بریتییە لەوە کە هەر لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ لە نێو ئادەمیزادا لە شارو لە لادێ لە هەموو کونو قوژبنێکدا لە دەروونی ئادەمیزادی خوێندەوارو زانادا، یان مرۆڤی نەزانو نەفامدا هەستێکی نیگا ئاسای خەفۆك هەیە، ئەوە دەخاتە دڵی مرۆڤەوە: کە لە دوای ژیانی دونیا ژیانێکی تر هەیە، ئەو دادپەروەرییەی کە لە جیهاندا بە ئاواتیەوەین لەوێدا دێتە کایەوە هەموو مرۆڤێك سزاو پاداشی خۆی بەچاك یا خراپ وەردەگرێتەوە:

هەستی شارەزا لە هات و چوونا
کەرووێشکە دەکا بەناو دەروونا
دەڵێی گوم بووە لەناو بۆ چوونا
تۆ بە تەنیا نیی لەناو گەردوونا

زانای بەناوبانگ نورمان فیست بیل دەڵێ: لە راستیدا هەستی دەروونی (عەریزی) بە هەبوونی ژیانێکی تری دوای مردن بە بەهێزترین بەڵگە دەژمێردرێ لەسەر ئەو ژیانە رەستاخیزییە، چونکە پەروەردگار هەرکاتێ ویستی ئادەمیزاد ئیقناع بکا بە شتێك تۆوی ئەو بڕوا هێنانە لە دەروونی دادەچێنێ، هەروەکوو چۆن ئارەزووی ژیانی هەتا هەتایی (با لەو دنیاش بێ) هەستێکی هەبووی بڵاوە بووە لەناو دەروونی ئادەمیزادا بە جۆرێك کە نابێ و ناگونجێ ئێمە بە شێوەیەکی گشتی بە هەوانتە سەیری بکەین! ئاشکراشە ئەوەی کە ئێمە خۆی بۆ دەکوتین و لە قوڵایی دەروونەوە هەستی پێ دەکەین ئەوە دەقی دەنگدانەوەی ئەو یاسا سەرەکییەیە کەوا لە وجوودی ئادەمیزاددا!!

بە بێگومان نموونەی ئەم راستییانە، ئەو هەستە دەرونیانەیە کە هەستیان پێ دەکەین و بڕوا بە هەبوونیان دەکەین، ئەو بڕوایەمان لە رێگەی بەڵگەی گوفتار ئامێزەوە سەری هەڵ نەداوە، بەڵکوو لە رێگەی بڕواو نیگاو هەستی دەروونیەوە پەیدا بووە، ئەوەش لە یاد نەکەین کە نیگا (ئیلهام) خۆی لە خۆیدا هۆکارێکی گرنگە بۆ تێگەیشتنی زانستانە لە حەقیقەت و راستی!!

برجسون: دەڵێ: زانایان کاتێ دەگەنە ئاکامێکی زانستی وا کە پێویستی بە چەسپاندن هەبێ لە ناکاوێکا دەکەونە تروسکایی (وەمضە)ی نیگاو ئیلهامەوەو ئیتر دەگەنە حەقیقەت و راستییان بۆ دەردەکەوێ. شایانی باسە کە توێژینەوە زانستییەکان پاڵپشتی ئەوەمان بۆ دەکەن کە باوەڕمان بە هەبوونی نیگاو (إلهام)و عەقیدە بێ، لە کاتێکا کە راوو بۆچوونی مادییەکان لەناو عالەمدا بەرەو نەمان دەڕواو دەپوچێتەوە.

ئەو خودایەی ئادەمیزادی دروستکردوە بەو شێوە کە هەردەم ئامادەو لەسەر پێیە بۆ بەرەو پێش چوون و پێش کەوتن بەهۆی ئەو ئاوەزەی کە پێی بەخشراوەو هەرگیز لە سنوورێکی تایبەتی زانیندا ناوەستێ و دەیەوێ بونەوەر بپشکنێ و نهێنیەکانی دەربخا، دەڵێین: ئەو خودایە قەت ناگونجێ کە ئامانجی لە

دروستکردنی مرۆڤ وەکوو هەمان ئامانجی وابێ کەلە دروستکردنی ئاژەڵدا هەیەتی! بەڵکوو حیکمەتی خودا لە بەدیهێنانی ئادەمیزاد ئەوەیە کە دەبێ ژیانێکی تری هەبێو تێیدا سزاو پاداشی خراپەو چاکەی خۆی وەربگرێتەوە!!؟!

خۆ ئەگەر ئەو هەموو هێزو توانا بەدەنیو ئەقڵییەی کە داویەتی بە ئادەمیزاد هەروا بە خۆڕایی دابیەتیو هیچ لێ پرسینەوەی نەبێ دیارە کارێکی بێ هودەیەو دوورە لە عەدالەتو دادپەروەری! ئەمەش لە کاری خودا دوورەو لەگەڵ حیکمەتو زاناییو دانایی زاتی حەقدا ناگونجێ!!

## ڕێبازی ماددیو کارتێکردنی لە کۆمەڵ:

مادیەکان دەڵێن: دوای ژیانی جیهان ژیانێکی تر نیە ئادەمیزاد کە مرد ئیتر جارێکی تر زیندو نابێتەوە!! دەڵێن: فکرو هەستو شعوور، سۆزو عاتیفە دیاردەیەکی ئاکامی مادەنو لەوەوە سەرچاوە دەگرن، هەروەکوو چۆن جەرگ سەفرا دەخاتەوە گورچیلە میز جیادەکاتەوە، فکرو ویستو سۆزو عاتیفەش کار گوزاری مێشکن، ئەندازەو چۆنیەتی ئەم دیاردانە پەیوەندی بە ئەندازەو چۆنیەتی مێشکەوە هەیە، هەموو شتێکیش لە ژیان یان ماددەیە یان دیاردەی ماددەیەو هیچ شتێك نیە ناوی گیان بێ، ئەو وتەیەی کە دەگوترێ: ڕۆح ئەبەدییە ئەوە قسەیەکی خەیاڵ ئامێزەو حەقیقەتێکی نیە، ماددیەکان لە چەرخی ڕابوردوودا (چەرخی نۆزدەهەم) هەوڵو کۆششێکی زۆریان کرد بۆ بڵاوکردنەوەی ڕێبازو پرۆگرامەکانیان پشتیشیان بەوە ئەستوور بوو کە زانستی سروشتیو کیشوەر ناسیو زەمین شوناسی بەرەو پێش دەچێ، بە بۆچوونی خۆشیان ڕوتکردنی عەقڵ لە هەموو پەیوەندییەکی ئەودیو سروشت سەر دەکێشێ بۆ مشتو ماڵ کردنی عەقڵو گەشە کردنی هێزو توانای، ئیتر کاریگەری لەسەر ڕەوشتو مامەڵەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان بەهێز دەبێو مرۆڤ دەگەیەنێتە ئەوپەڕی کەماڵی زانستو کردار، ئەمەش ڕەوڕەوەی کۆمەڵایەتی

بەرەو پێش دەبـاو ئـادەمیزاد دەگەیەنێتـە ڕۆژگـاری زێڕینـی چـاوەڕوان کـراوی. بەبێ ئەوەی کە کەندەڵانو کۆسپی بڕوا بەودیو سروشت ببنـە پـەردەو مـرۆڤ لـە حەقائیقی بونەوەر دوور بخەنەوە.

بەڕاستی ماددیـەکان کۆشـشی کـەم وێنـەیان کـرد بـۆ بڵاوکردنـەوەی ڕێبـازو پرۆگرامــەکانیان، بــۆ پاڵپــشتی ڕێبازەکــەیان زۆر موحازەریــان دانو وتــارو لێکۆڵینەوەو دەمە دەمێیـان ئەنجامـدا چـەندەها کتێـبو پـەڕاوی سـەر بـە ڕێبـازو بۆچوونەکانی خۆیان بە ژمارەیەکی زۆر لە چاپ داو بـە نرخێکـی هـەرزان لـەناو کۆمەڵاندا بڵاویان کردەوەو چییان لـە دەسـت هـات لـە پـڕو پاگەنـدەو دیعایـە بـۆ مەزهەبەکـەیان کردیـان بـە مەبەسـتی ئـەوە بـیرو بـاوەڕی دینـدارەکان دەربـارەی ئەودیوی سروشت (وراء الطبيعة) بکوژێننەوە! لە ڕاستیدا توانیان تا ئەندازەیـەك ویـستەمەنی خۆیـان لـەو بارەیـەوە ئـەنجام بـدەن، ئـەوەبوو لـە بـەروبوومی ئـەو هەوڵو تەقەلاڵایەی مادییەکان ئادابو ڕەوشتی کۆمـەڵان بـە تێکـڕا چەواشـە بـوو، پەیوەندییە گشتیەکانی ئادەمیزادان لەناو خۆیانـدا لـە گرێژەنـە چـوون، ئاداریـان بەسەر پادارەوە نەما، هیچ ڕەوشتێکی باشـی ئینـسانی کـاری پـێ نـەدەکرا! چـونکە وەکـوو دکتـۆر (لیـون ووتـی) دەڵـێ: ڕێبـازی مـاددیو مـاددە پەرسـتی هـەر کاتـێ تێورەکانی چوونە ناو دەرونی مرۆڤەوەو جێگیر بـوونو باویـشکیاندا، وا لـە مـرۆڤ دەکەن کە نەفسو ئارەزووی خـۆی بـەرەڵڵا بکـا، چـونکە پێـی وا دەبـێ ژیـان هـەر ژیانی دونیایەو ژیانێکی تر لەو دنیا نیە. ئائەم نەخۆشییە کۆمەڵایەتیە سامناکە کـە پێکهـاتووە لـە هەسـتریاو بـێ ئاگایـیو بـێ ویـژدانی کۆمـەڵی ئـادەمیزاد بـەرەو نــەمانو پــەرتو بــڵاوی دەبــاو لــە ئاکامــا هــیچ چــاری نەخۆشــیەکانی نــاکرێ. ئاشکراشـە مـرۆڤ هـەرکاتێ کەوتـە نـاو زەلکـاوی مادییەتـەوەو بـڕوای بـە ژیـانی ئەودنیا نەبوو، هەست دەکا بە لێڵایی ژیانی دونیاییو هـەردەم هـەوڵی ئـەوە دەدا ژیانێکی باشتر بە دەست بێنێ، پەلـە قاژەیـەتی بـۆ گەیـشتن بـە ژیـانێکی خۆشـترو باشتر، بەڵام پارمەتیدەری پێویستی دەست ناکـەوێ تـا لـەو زەلکـاوە رزگـاری بکـا..

بەراستی ئەو عەقڵییەتە ماددییەتەی کە ئەمڕۆ هێرشمان بۆ دێنێ، ژەهرێکی کوشندەیە مرۆڤایەتیمان لە بێخ هەڵ دەکەنێ! خۆ ئەگەر ئەو ژەهرە زیاتر بلاوبێتەوە، هەرچی ڕەوشتی جوانو بەرزو پاكو خاوێن هەیە لە دەرونمانا هەمووی رادەماڵێو لەناوی دەبا. خۆ قانونو یاسایەکیش کە دانراوی مرۆڤ خۆی بێ دەسە وەسان دەبێ لە عاستی ئارەزووە سەر کەشەکانی ئینسان، مادام رەوشتو ئەخلاق دەست ڕۆییشتویی خۆیان لەسەر دڵو دەروون لە دەست دابێ ئەوە ئێمەی ئادەمیزاد لە نێو قوڕەلیتەو زەلکاوی ماددییەتدا نوغرۆ دەبین! خۆ ئەگەر ئێمە هەوڵو تەقلالایەك نەدەین بۆ ژیانەوەی مرۆڤایەتیو گەڕانەوەی تەواومان بۆ کۆشی هەبوونی راستەکی خۆمان ئەوە بەبێ گومان بە خێرایی بەرەو فەوتان بە رەشەبای فەنا شەقاو هەڵ دەنێین چونکە شەڕو خراپە لە ئاکاما سەر دەکێشێ بۆ سزاو تۆڵەی سەختی خودا!

ئەدیبو نووسەری بەناوبانگی فەرەنسی (فیکتور هیجۆ) کە باسی کاریگەری ڕێبازی ماددی لە دەروونی مرۆڤدا دەکا دەڵێ: لە ڕۆژگاری ئێمەدا بەلاو ئافاتێکی سامناك پەیدابووە ئەویش بریتییە لەوە کە کۆمەڵ هەموو ئیعتبارێکی کورت هەڵیناوە لەم ژیانە کورتەی جیهاندا، شتێکی راستو بەڵگە نەویستە مرۆڤ هەرکاتێ قەناعەتی وابوو کە ئەم ژیانە کورتەی سەر زەوی هەموو ئامانجو ئاکامی بونەوەرەو ژیانێکی تر لە گۆڕێ نیە، ئیتر ئەوکاتە ناڕەحەتی وەدەست هێنانی گوزەرانو ژیانی لێ دوو چەندانە دەبێتەوە، ئەرکی ئەوەی لەسەر شان گەڵێ قورستر دەبێو فیکرەیەکی بەرچاو تەنگی رەشبینی پڕ لە تارمایی نەمانو نەبوونی تاریك سەرو دڵی دەگرێو پردی صەبرو ئارامی دەڕوخێو بەرگەی زەبری ئەوە ناگرێو ئێشو ئازارو ماندوبوونێك کە بە ڕواڵەت پلیکانەیە بۆ گەییشتن بە کەماڵو ژیانی خۆشبەختی لێی هەڵدەگەڕێتەوەو دەبێ بە یاسایەکی دژوارو پەردەیەکی رەش دەخاتە بەر ئاسۆی روناکیو کوێرانە بەرەو ئاگری دۆزەخ دەی ڕەتێنێ! هەر بەو جۆرە هەموو لایەنی کۆمەلایەتیو کاروباری لێ بە

پێچەوانە دەگێڕێ! دونیای روناکی لێ دەکاتە تاریکستان! چونکە لایەنی رۆحی پاش گوێ خستووەو بە تەواوی تێکەڵاوی جیهانی ماددە بووە.

خۆ ئاشکراو نمایانە ئەوەی جیهاد لەسەر شانی مرۆڤ سووك دەکاو خۆ بەخت کردنی لە دڵدا شیرین دەکاو کارکردنو هەوڵ دان بە شەرەفو رێز دادەنێو هەوڵ دەدا ئینسان بە ورە بێو هێزی دەروونی گەشە بکاو لێبووردو بێو هۆشمەندو بە صەبرو ئارام بێو ئازاو نەترسو نەبەرد بێ، لە هەمان کاتدا خۆبەکەم بزانێو جڵەوی نەفسی سەر کەشی بگرێو خۆی بە شایستەی ئازادی بزانێ، ئەوەی کە ئەمانە گشت دەکا ئەوە ئەو روناکییەیە کە لە ژیانی هەتا هەتایی ئەو دونیاوە دێت بەناو تاریکی ژیانی دونیادا سەرچاوە هەڵ دەبەستێو مرۆڤ بە دوور بینی رۆحی پڕتەو پەخشی بەرزە فڕی بەدی دەکاو بە هۆی ئەو روناکییەوە ژیانی ئەو دونیای دەبینێ. کەوابوو ئەرکی پیرۆزی سەر شانی هەموومانە سەر بەرز بکەینەوە بۆ لای ئاسمانو سەرنج بدەین لە ژیانێکی تری پڕ کامەرانی کە لەو دونیا بەدی دەکرێو بەدی دێو هەموو لایەنێکی دادپەروەری تێدا ئەنجام دەدرێو هەرکەسە بە گوێرەی کردەوەی خۆی حیسابی لەگەڵ دەکرێو سزاو پاداشی خۆی وەردەگرێتەوە!

## بەر پەرچدانەوەی مادییەکان (مناقشة الماديين):

ئەو قسەیەی کە مادییەکان دەڵێن: گوایە بونەوەر بریتییە لە مادەی رووتو بەس قسەیەکی بێ جێو رێیە عەقڵ وەری ناگرێت، چۆن فیکرو ئەندێشەو ویستو ئیرادەو سۆزو عاتیفە بە ئاکامی مادەی رەقو تەقی کەرۆ کویر دادەنرێن! چۆن ئەو فیکرەی کە مرۆڤ بە هۆی ئەوەوە هەست بە کەسایەتی خۆی دەکا ئاکامی ماددەیەکە کە ئەو خۆی هەست بە کەسایەتی خۆی ناکا؟! چۆن ماددە دەبێتە هۆ (علة)ی پەیدابوونی فیکرو ئەندێشەو عەقڵ کە ئەمانە خۆیان ماددە

نین؟! دەی کەوابوو دەبێ لێرەدا شتێك لە ئەودیوی مادده (ماوراء المادة)وە هەبێ ئەویش گیانو (روح)ە.

زانای بەناوبانگ (کریسی موریسون) لە بارەی چەسپاندنی ئەم راستییەدا دەڵێ: هیچ گەردیلەیەك یان پارچەیەك هەرگیز فکری نەبووە هیچ کاتێکیش یەك کەوتنی توخمەکان (العناصر)ی ماددەی رووت نەبۆتە بەدیهێنەر بۆ رایەکی تر، هیچ یاسایەکی سروشتی نەی توانیوە (کاتدرائیە) یان کۆشكو تەلارێکی وەك کاتدرائییەکان بەو نەخشاوییە دروست بکا! بەڵام چەند زیندەوەرێکی دیاری، کە بە پێی چەند هاندەرێکی دیاری، دروستکراون بۆ زیندەگانی، کە ئەم زیندەوەرانە شتێکیان لەخۆ گرتووە، کە پاژو پارچەکانی ماددەش بە سەرەی خۆیان لە فەرمانی ئەو شتە سەیرو عەنتیکەیە سەرپێچی ناکەنو بە گوێی دەکەن، دەی باشە ئەو زیندەوەرە چییە؟! ئایا بریتییە لە گەردیلەو پارچەو پاژی زۆر؟ بەڵێ، بەڵام لە شتی تریش، دەی ئەو شتەی تر چییە؟ شتێکی بێ قەوارەیە، بە دەستو هەست ناگیرێ، لە مادده گەڵێ باڵا ترە، بە رادەیەکی وا زاڵو باڵا دەستە بەسەر هەموو شتێکی تردا، زۆر جیایە لە هەموو شتێ کە مادده داربێ، لەوانەی کە ئەم جیهانەیان لێ دروستکراوە، بۆیە بە هەستەکانی ئێمە هەستی پێ ناکرێ، نە دەبینرێ، نە دەکێشرێ نە دەپێورێ، تەنانەت (بە پێی زانینی ئێمە) یاساو قانوونی وا نیە کە لە ژێر رکێفی ئەواندا بێ... جا ئەم جیهانە سەیرە، بە زۆری بەری بە یەك گەییشتنی ئەم دوو شتەیە بەڵێ بێگومان گیانی مرۆڤ خاوەنی چارەنووسیەتی، گیانی ئینسان گەورەو رابەریەتی! ئەگەر روح نەبێ مرۆڤ ماددەیەکی کەڕو کوێرە هەر بەهۆی رۆحەوەیە کە مرۆڤ هەست دەکا بەوە کە پەیوەندی بە خوداوە هەیە، هەر رۆحە کە بۆ ئادەمیزاد یاسایەکی ئەخلاقی داناوە، کە بۆ هیچ ئاژەڵێکی تری رەچاو نەکردوەو پێویستیشی پێی نیە، جا ئەگەر یەکێك هات گوتی: روحیش کە ئەم گیانەی بۆ خۆی پێك هێناوە، ئەویش هەر برێكو پاشخوانی ماددەیەو پاشەڕۆکی ئەوە، قسەی نابەجێ دەکاو بۆ خۆی

دەڵێ: دیارە بۆیەش وا دەڵێ: چونکە ناتوانێ لە جەوهەری روح تێبگا، لەبەرئەوە گیان لە بۆتە نادرێ‌و بە لوولەی تاقیکردنەوە پەی پێ نابرێ!!؟ بەڵێ دەبێ بڵێین راوو بۆچوونی ئەو کابرایە هەڵەیەو بێ بەڵگەیە، بەڵکوو رۆح شتێکی هەبووە دیاردەکانی لە کردەوەکانیا، لە خۆبەخت کردنیا دەردەکەوێ هەروەها بە دەست رۆیشتنی بەسەر ماددەدا بە تایبەتی بەوە کە دەسەڵاتی هەیە مرۆڤ بەو هەموو زەبوونی‌و هەڵەیەوە لایەنی ماددی ئەو وا بەرز بکاتەوە کە بگونجێ لەگەڵ ویستی خودادا؟! ئەمە بە کورتی پوختەی مەبەستی خودایە لە دروستکردنی گیاندا، لەم پوختەدا هۆی ئەو حەزە شێردراوەی کە لە دەروونی مرۆڤدا هەیەو ئارەزوی گەیشتنی بە لە خۆی بەرزتری هەیە، هەروەها پەردەی هەڵمالی لە رووی ئەو هاندەرەی کەوا لە ناخی دەرونی مرۆڤداو هانی دەدا لەسەر دینداری کە ئاینیش دەق هەمان شتە!

بێگومان زانستی تازە ئەوەی چەسپاند کە مادە نافەوتێ هەرچی گەدیلەی ئەم بونەوەرە هەیە نافەوتێ بەڵکوو دەگۆڕێ مۆم دەسووتێ بەڵام کیمیا گەر دەتوانێ کە بیچەسپێنێ کە توخمەکانی نەفەوتان بەڵکوو لێك جیابونەوەو پەرت‌و بڵاو بوونەوەو لە هەوادان بەڵام لە شێوەو شێوازێکی تردا، شێوەی گۆڕاوە بەڵام جەوهەرەکەی هەر ماوە!! ئەمە پوختەی سەلمێندراوی زانستی تازەیەو دوا ئاکامی عیلمییە، بەم پێیە مردنی لاشەی زیندوو بریتییە لە گۆڕانکارییەکی تایبەتی بۆ لاشەکە نەك فەوتانی بەڵکوو لاشەکە لە کەوندا دەمێنێتەوە بەڵام بە شێوەیەکی ترو لە بەرگێکی دیکەدا!!

جا ئەگەر عالەم بریتی بێ لە (رۆح)و زانیشمان کە مادە نافەوتێ دەبێ چۆن بیسەلمێنین کە رۆح دەفەوتێ بە تایبەتی کە رۆح لە ماددە گونجاوترە بۆ مانەوەو نەفەوتان، تەکوین‌و سیفاتی ئەم زۆر لە بارترن بۆمانەوەو بەردەوامی! بێگومان رۆح بە ماددە دەگا ژیانی تێدا دروست دەکا، رۆح دەچێتە ناو مادەوە عەقڵ‌و هۆشی تێدا پەیدا دەکا، هەرکاتێ رۆح لاشە بەجێ بهێڵێ لاشەکە دەبێتە

ماددەیەکی کەرو کوێر، بەڵێ نیگای ئینسان و ئیلهامی بە هەبوونی ژیانێکی تر لەو دونیا بەوەهم و خەیاڵ ناژمێردرێ، بەڵکوو سروشێکی راستگۆی هەڵقوڵاوە لە سروشتی خۆیەوەیە، هەستێکی زیندوی خۆیەتیو رۆچووە بەناو غەریزەیدا!!؟

## حەقیقەت و چۆنیەتی رۆح لە روانگەی قورئانەوە (حقيقة الروح في القرآن):

لەوکاتەوە مرۆڤ بیری لە حەقیقەتی شتەکان (الأشياء) و چۆنیەتییان کردۆتەوە، مەسەلەی رۆح و چۆنیەتی بە چێواشە ترین مەسەلەی زانست و فەلسەفە دانراوە، هەر کەسێك باسی لێوە کردوە تێیدا سەر گەردان بووە، بۆیە یەکێك لە موعجیزەکانی قورئان ئەوەیە کە مەسەلەی رۆحی لە شوێنی خۆیدا لە نێو زانست و فەلسەفەدا داناوە.

قورئان دەفەرموێ: {وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً} (٨٥) سورة الإسراء:

واتە: پرسیارت لێ دەکەن رۆح چیەو چۆنەو لەچی پێك هاتووە؟ لە وەڵامدا بڵێ: رۆح سرێکە لە سرەکانی خودا، بە فەرمانی خودا خۆی دروست دەبێ، سرەکانی خودا زۆر زۆرن زانستی ئێوەیش زۆر کەمە، ناتوانن ئەو مەسەلەیە هەزم بکەن!! ئەم رستەی ئایەتە کە دەفەرموێ: { وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً}، وتەکەی زانای بەناوبانگ (شارل ریشیە) ئەندامی کۆڕی زانیاری و مامۆستای فیزیۆلۆجی لە دانیشگای نوژداری فەرەنسا، ئەوەمان وەبیر دەهێنێتەوە کە لە پێشەکی کتێبی (الظواهر النفسية)دا نووسیبوی دەڵێ: بۆچی بە دەنگێکی بەرز هاوار نەکەین و نەڵێین ئەو زانینەی کە ئێمە خۆی پێوە بادەدەین و خۆمانی پێ هەڵدەنێینەوە، لە راستیدا لە دەرك کردن و زانینی رووکەشی شتەکان دەرناچی، چونکە حەقیقەتی شتەکان و زانینی ناوەڕۆکیان نایەتە ژێر رکێفی ئێمەوەو لە ئێمە عاسییەو بەیدەستی هەستی ئێمەی ئادەمیزاد نابن، چۆنیەتی و حەقیقەتی ئەو یاساو نیظامەی کە مادەی زیندو یا مردوی پێ دەگۆڕدرێ

لەحاڵێکەوە بۆ حاڵێکی تر لەوە بەرزترە کە ژیریو فامی ئێمە بیقۆزێتەوە پەی پێبەرێ... تا دەڵێ: کەوابوو باشتر وایە بۆ زانای راستو تەواو کە موتەوازیعو خۆ بەکەم زان بێو لە هەمان کاتیشا ئازاو لێهاتووبێ، خۆ بەکەم بزانێ چونکە زانستی ئێمە زۆر کەمو بێ بایەخە، ئازاو لێهاتووبی چونکە ئاسۆی بونەوەر لە بەردەمیا کراوەیە!!

## زیندوو بونەوەی ڕۆژی قیامەت (البعث):

حیکمەتو ویستی خودای گەورەو میهرەبان وای داناوە کە لە دوای ئەم ژیانی جیهانە ژیانێکی تر هەبێ، ئادەمیزاد تێیدا پاداشی کردەوەی خۆی وەربگرێتەوە، چاکە بە چاکەو خراپە بە خراپە. قورئانی پیرۆز لە لایەن خۆیەوە دەیەوێ بە ئادەمیزادی بسەلمێنێ: کە ئەو ژیانەوە راستەو حەقە بۆئەوەی مرۆڤ چی بکاو چی نەکا لە جیهاندا مەبەستی پاداشی ئەو دنیابێ، بێگومان قورئانی پیرۆز زۆر گرینگی داوە بە کارو باری ژینەوەو هاتنی ڕۆژی رەستاخیز، تەنانەت کەم وا هەیە سورەتێکی قورئان هەبێو باسی زیندوبوونەوەی ئەو دونیای تێدا نەبێ! زۆر جار دەبینین سورەتێك سەراپا باسی قەبرو قیامەتو چۆنیەتی زیندوبوونەوەو حەقو حیسابو سزاو پاداشو پەند هێنانەوەو ترساندنو تەماع بەرنانو خۆشیو ناخۆشی ئەو ڕۆژە دەکا. دەی باشە بۆچی قورئان ئەوەندە گرنگی داوە بە پتەوکردنی بڕوا بە ڕۆژی قیامەتو چەسپاندنی لە دڵی مرۆڤدا؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: چونکە بڕوا بەهەبوونی ڕۆژی قیامەت بناغەیەکی پتەوی سەرەکییە بۆ کار دروستی بونەوەرو کەونو کائینات، خۆ ئەگەر مرۆڤ هەموویان ئەم بڕوایە لە دڵیاندا بچەسپێو ئێمان بە ڕووداوەکانی ڕۆژی قیامەت بێنن‌و گومانیان لێی نەبێ، هەموو کارو بارێکیان راستو دروست دەردەچێ، خێرو چاکەیان لەناودا زۆرو زەبەندە دەبێ، شەڕو ئاژاوەیان لە ناودا کەم دەبێتەوە! بەڵام بە داخەوە ئادەمیزاد لە هەموو سەردەمو چاخێکا ژیانی دونیای فانی بەری چاوی گرتوونو بە جوانیو ئارایشی خۆی کێشی کردوونو خستونیە باوەشی

خۆیەوەو ئەو دونیای لە بیر بردونەوە، تەنانەت زۆر لە گرۆهانی ئادەمیزاد شكو گومان پەردەی بەسەر دڵیاندا هێناوە، ژینەوەو رۆژی قیامەتیان لەلا بووەتە ئەفسانە، لە گوێی گادا نوستوونو هەرگیز بڕوا ناكەن كە دوای مردن جارێكی تر زیندوو دەكرێنەوەو حیسابو كیتابیان لەگەڵ دەكرێ! بڕوا نەكردنیان بە زیندوبوونەوەیان، گومان پەیدا بوونیان تێیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هۆیانە:-

یەكەم: بە ڕواڵەت زیندوبونەوەی رۆژی رەستاخیز شتێك نیە خەڵكی پێویستی پێی بێ! یان مەسڵەحەتێكی مادی دونیای لە دواوە هەبێ.

دووەم: دووری هاتنیو سامناكیو گەورەیی كارەكە وای كردوە لە عاستی دا چاوی خۆیان بنووقێننو پاش گوێی بخەن، چونكە زیندوەكان بە چاوی خۆیان دەبینن كە لاشەی مردووان پەرتو پلاو دەبێتەوەو بۆگەن دەكاو دەرزێو دەفەوتێ! ئیتر عەقڵیان نای بڕێ جارێكی تر هەروا بە ئاسانی ئەم لاشە یەك بگرێتەوە بێتەوە بە جیسمێكی زیندوی خاوەن ئیرادەو هەستو هۆش.

سێیەم: ناگونجێ لەگەڵ ئەو یاساو دەستورانەی سروشت كەوان بە بەرچاوەوە، گوایە چینی زیندوو بە چاوی خۆی نەیدیوە كە مردوویێ لەناو گۆڕەكەیەوە كفن بگرێ بە كۆڵیەوەو بێتە دەرێو ژیانی بۆ دووبارە بوبێتەوە؟! بۆیە قورئانی پیرۆز بەر پەرچی ئەوانەی داوەتەوە كە بڕوایان نیە بە زیندوبونەوە، هەرجارە بە شێوەیەك بۆ چوونەكانی ئەوانی رەت كردۆتەوە. بۆ نموونە قسەی ئەوانەی كە گوتوویانە زیندوبوونەوەهیچ پێویست ناكاو بونەكەی هیچ حیكمەتێكی تێدا نیە بەوە رەت كردۆتەوە كە دەفەرموێ:

**{ لِيَجْزِيَ الَّذِينَ أَسَاؤُوا بِمَا عَمِلُوا وَيَجْزِيَ الَّذِينَ أَحْسَنُوا بِالْحُسْنَى- سورة النجم/٣١}:**

واتە: بۆیە زیندوبونەوەی رۆژی قیامەت دانراوە تا سەرپێچی كەران سزای كردەوەی خراپی خۆیان وەربگرن هەروەها فەرمان بەردارانیش پاداشی كردەوەی چاكی خۆیان بە چاكە بدرێتەوە! یان دەفەرموێ:

{أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ- سورة المؤمنون/١١٥}:

واتە: ئایا پێتان وایە ئێمە ئێوەمان هەروا بەبێ هوودە دروست کردوەو ئیتر بۆ لای ئێمە ناگەڕێنەوەو ڕۆژی قیامەت حیسابو کیتابتان لەگەڵ ناکرێ!!

بۆ ڕەت کردنەوەی قسەی ئەوانەش کە لایان وایە ژینەوە کارێکی ئەستەمەو ناگونجێ ئەم هەموو خەڵکە دوای مردنو ڕزینو بونەوە بە گڵ، جارێکی تر زیندو ببنەوە دەفەرموێ:

{وَهُوَ الَّذِي يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ- سورة الروم/٢٧}:

واتە: خودایەکی ئەو تۆیە ئادەمیزادی لە نەبوونەوە بەدی هێناوە دوای مردنیش ڕۆژی ڕەستاخیز جارێکی تر زیندوویان دەکاتەوە، ئەم زیندوو کردنەوەشی بەلاوە ئاسانترە لە دروستکردنی سەرەتا، هەرچەندە بە نیسبەت خوداوە شتێك نیە سوك بێو شتێك گران بێ هەمووی لەلا یەکسانە!!

دووبارە دەفەرموێ: {وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ، قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ، الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ، أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يَخْلُقَ مِثْلَهُم بَلَى وَهُوَ الْخَلَّاقُ الْعَلِيمُ- سورة يس/٨١}:

واتە: مرۆڤ گوێ بەوە نادا کە ئێمە لە دڵۆپە ئاوێك دروستمان کردوە، گەردن کەچ نابێو لەجیاتی ئەوە فەرمانبەردار بێو گوێ ڕادێربێ! دێ چیرۆکو پەندمان بۆ لێ دەدا، سەرەتاو قۆناغەکانی دروستبوونی خۆی لە یاد چۆتەوەو ئینکاری زیندوبوونەوە دەکاو دەڵێ: کێ دەتوانێ ئێسقانی ڕزیو جارێکی تر بژێنێتەوەو زیندویان بکاتەوە!؟ ئەی پێغەمبەر بڵێ، ئەو کەسەی یەکەم جار لە نەبوونەوە دروستی کردوون هەر ئەویش زیندوویان دەکاتەوە، ئەو خودایەی کە یەکەم جار دروستی کردوون ئاگاداری هەموو دروستکراوێکە، هیچی لێ عاسی نابێ، کەسی لێ هون نابێ، خودایەکی وایە لە داری تەڕو بڕو سەوز ئاگری حەشارداوە، ئێوە لەو

داره تەڕە سەوزە ئاوداره ئاگری سوتێنەر دەردێنن، شایانی باسە دارێك هەیە پێی دەڵێن (مەرخ) دارێکی تریش هەیە پێی دەڵێن: (غەفار) ئەگەر چیلکەیەك لەم دارو چیلکەیەك لەوداره لێ بکەیەوە لە یەکیان بدەی ئاگریان لێ دەبێتەوە!!

ئایا ئەو خودایەی ئاسمانو زەوی بەو هەموو عەظەمەتەوە دروست کردوە، ناتوانێ جارێکی تر ئێوە دروست بکاتەوە؟ بەڵێ بێگومان بە توانایە بۆ دروستکردنەوەی ئادەمیزاد سەر لەنوێ بەلایەوە زۆر ئاسانە چونکە ئەو بە دروستکردن ماندوو نابێ، چی بوێ‌و چەندی بوێ دروستی دەکا زۆر زانایە بە هەموو شتێك. لە وەڵامی ئەوانەی کە بەلایانەوە زیندو بوونەوە شتێکی دژ بە یاسای ئولفەت پێو گیراوە دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّى وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِن بَعْدِ عِلْمٍ شَيْئًا وَتَرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّهُ يُحْيِي الْمَوْتَى وَأَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ مَن فِي الْقُبُورِ- سورة الحج/ ٥-٧}:

واتە: ئەی کۆمەڵی ئادەمیزاد ئەگەر ئێوە لە شكو گوماندان لە زیندوبونەوەو زینەوەی رۆژی رەستاخیز، ئەوە پێویستە ئەو گومانەتان نەمێنێ چونکو ئێمە ئادەمی باوکی ئێوەمان لە سەرەتاوە لە گڵ دروست کردوە، دوایی ئێوەمان لە دڵۆپە ئاوێك (تۆماو - سپێرم)ێك بەدی هێناوە ئەمجار ئەو دڵۆپە ئاوەمان کردوە بە گیاندارێك لە شێوەی (زالو)دا ئەمجار ئەو زالۆیەمان کردوە بە پارچە گۆشتێکی وا کە لە پارووە گۆشتی جۆراو دەچێ. جاری وا هەیە پارچە گۆشتەکە شێوەکەی رێكو پێکە، کاتی واش هەیە نارێكو پێکە؟! ئەوە بۆ خاتری توانای خۆمانتان بۆ ئاشکرا بکەین، ئیتر ئەم کۆرپەلە لە مندالانی ئافرەتدا جێگیر

دەکەین تا کاتی لەدایك بوونی، ئەمجار لە سکی دایکانتاندا دەرتان دەهێنین وەکوو منـدالّ دەتانخەینـە سـەر زەوی، ئـەوجا گەشـەو نوماتـان پـێ دەکـەین تـا دەگەنـە حالّەتی کەمالّو هێـزو قـووەت، هـی واتـان هەیـە پـێش ئـەوەی بگاتـە تـافی هێـزو بازوی خۆی دەی مرێنین، هی واشتان هەیە دەی هێڵینەوەو تەمەنی درێژ دەبێ تا دەگاتە عومری پیریو پۆڵتك دەبێو دەخەرەفیو چاكو خراپ لێك ناکاتەوە، ئـەو کارو بارەی لەوە پێش فێری بووە هەمووی لـە بـیر دەچێتەوە هـەر دەڵێـی هیـچی نەزانیوەو هیچ فێر نەبووە.

بەڵگەیەکی تـر لەسـەر زینـدو بوونـەوەی ڕۆژی ڕەسـتاخیز ئەوەیـە کـە ئێـوە زەوی دەبینن وشکو برینگە هەر دەڵێی ئاگری کوژاوەیە، جاکاتـێ بـارانی بەسـەردا دەبارێنین، لەخۆ دەکەوێو جمو جوڵ پەیـدا دەکـا بـەهۆی ئـاوو دانەوێڵەو ڕەگو ریـشاڵی ڕووەکەکانــەوە زەوییەکــە فــشەڵ دەبێــتو لــە هــەموو جۆرێــك ڕووەك دەروێنێو بە گوڵو گوڵزار خۆی ئارایشت دەدا، ئەمانە هەمووی هـۆی ئەوەیـە کـە پـەروەردگار خودایـەکی حـەقو راسـتەو دەتوانـێ مـردوو زینـدوو بکاتـەوە، هـەر وەکوو چۆن دەسەڵاتو توانای بەسەر هەموو شـتێکدا هەیـە، ڕۆژی ڕەسـتاخیزیش هەردێو شكو گومان لە هاتنەکەیدا نیە، لەو ڕۆژەدا خودای مەزنو بـە دەسـەڵات چی مردوو هەیە لە گۆڕەکانیان دەریان دێنێو زیندوویان دەکاتەوە!!

خوێنەری ئازیز لە مانای ئەم ئایەتانەی رابورد ئێمە دوو بەڵگەی بـەهێزمان لەسەر هاتنی ڕۆژی قیامەت بەرچاو کەوت:

یەکـەمیان: دروسـتکردنی ئـادەمیزادو قۆناغـەکانی پـەروەردە بـوونیو ئـەو گۆڕانکارییەی تێیدا روو دەدا لە دڵۆپە ئاوێکـەوە بـۆ خوێنپـارە ئـەمجار گۆشـتپارە هەروا تا کاتی لە دایکبوونیو پەروەردە بوونیو بوونی بە پیاوو لە ئاکاما مردنی.

بەڵـگەی دووەمیــان: زەوی مــردووی وشــكو برینگــە کــە بــەهۆی بــارانو بارانبارینەوە دەژێتەوەو ڕووەك دەروێنێ.

خودای مەزن دەفەرموێ: {وَنَزَّلْنَا مِنَ السَّمَاء مَاء مُّبَارَكًا فَأَنبَتْنَا بِهِ جَنَّاتٍ وَحَبَّ الْحَصِيدِ{وَالنَّخْلَ بَاسِقَاتٍ لَّهَا طَلْعٌ نَّضِيدٌ رِزْقًا لِّلْعِبَادِ وَأَحْيَيْنَا بِهِ بَلْدَةً مَّيْتًا كَذَلِكَ الْخُرُوجُ – سورة ق/ ٩-١٠}:

واتە: ئێمە لە ئاسمانەوە؟ لە ژورتانەوە بارانمان باراندووە بارانێکی بە فەڕو بەرەکەت بەهۆی ئەوەوە چەند باخو باخاتمان رواندووە، چەند دانەوێڵەمان شین کردووەو بووەتە رووەك، دارخورمای بەرزو بڵندیش نۆبەرەی میوەی بەدەر دەکەوێو هێشووی سواری هێشووی دەبێ! ئەمە هەموو بۆئەوەی ببنە بژێوو خۆراکی بەندەکانی خۆم، هەر بەو بارانە چەند کیشوەرو وڵاتی وشكو برینگو مردوو زیندوو دەکەینەوە سەر لەنوێ دانەوێڵەو رووەکی دەژێنینەوە، هیچ گومانتان نەبێ زیندوو بوونەوەتانو هاتنە دەرتان لەناو گۆڕ، هەروا بەو جۆرە دەبێو لای خودا ئاسانە!!؟ بە کورتی پەروەردگار بەم ئایەتانە بەڵگەی هێنایەوە لەسەر دروستی زیندوو بوونەوەو ژینەوەی ئەو دونیا، لەم رووەوە کە رووەكو دارو درەخت دەڕوێنو گەشە دەکەن، کاتێك باران دەبارێو زەوی تەڕ دەبێ ئیتر ئەم رووەكو دارو درەختە خۆراکی خۆیان لە زەوی وەردەگرنو نەشو نوما دەکەن. هەر بەو جۆرەش زیندەوەران ئادەمیزادان دوای ئەوەی هێزی نەشو نمایان پێ درایەوە لە گۆڕ دێنە دەرێو زیندو دەبنەوە.

## تەنگو چەڵەمەو بەڵا سامناکەکانی رۆژی قیامەت:

قورئانی پیرۆز زۆر گرینگی داوە بە لایەنی وێنە کێشانی تەنگو چەڵەمەی رۆژی قیامەت، ئەو تەنگو چەڵەمەو بەڵا سامناکانەی کە هەموو سروشت دادەگرێو هەموو ئادەمیزادێك دەتۆقێنێو لە ناخەوە دەروونی دەبزوێنێو هەناوی بەردەداتەوە!!

خودا دەفەرموێ: {إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ وَإِذَا النُّجُومُ انكَدَرَتْ وَإِذَا الْجِبَالُ سُيِّرَتْ وَإِذَا الْعِشَارُ عُطِّلَتْ وَإِذَا الْوُحُوشُ حُشِرَتْ وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ وَإِذَا النُّفُوسُ زُوِّجَتْ

وَإِذَا الْمَوْؤُودَةُ سُئِلَتْ بِأَيِّ ذَنبٍ قُتِلَتْ وَإِذَا الصُّحُفُ نُشِرَتْ وَإِذَا السَّمَاء كُشِطَتْ وَإِذَا الْجَحِيمُ سُعِّرَتْ وَإِذَا الْجَنَّةُ أُزْلِفَتْ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا أَحْضَرَتْ - سورة التكوير/ ١-١٤}:

قورئانی پیرۆز لەم ئایەتانەدا وێنەی کودەتایەکی تەواوی بونەوەر دەکێشێ، ئەوەمان پیشان دەدا کە هەرچی دەی بینین لە بونەوەردا لەسەر حاڵی خۆی نامێنێ‌و هەموو شتێك بەرەو ئاوازوو هەڵدەگەڕێتەوە، خۆر لە شوێنی خۆی نامێنێ‌و ڕووناکی دەکوژێتەوە، نە وزەی دەمێنێ‌و نە ڕووناکی!! ئەم هەموو ئەستێرە روناك‌و ڕێك‌و پێکانە هەڵ دەوەرن‌و ڕوناکیان کپ دەبێتەوە، کێوەکان کە وەکوو مێخ داکوتراون‌و ناهێڵن زەوی جوڵە جووڵ بکا هەموویان هەڵدەکەندرێن‌و بە حەواوە وەکوو قانگەلاشك دەخولێنەوە وشتری ئاوسی لەسەر گووان بەرەڵڵا دەکرێ‌و کەس لای لێ ناکاتەوە، لەبەر سامناکی ڕۆژە کە کەس نایپرژێتە سەری، ئاژەڵ‌و حەیوانە کێویەکان لە ترساناکۆدەبنەوەو تیکەوە دەهاون. دەریاکان سەردەکەن‌و هەڵدەچن‌و هەموو دەبن بە دەریایەکی سامناکی فراوانی بێ سەرو بن، ئەو گیانانەی لە لاشە جیابوونەوە دەگەڕێنەوە بۆ لاشەکان، ئەو کچە زیندە بەچاڵ کراوانەی کە بەبێ ئەوەی هیچی نا بەجێیان کردبێ زیندە بەچاڵ کراون زیندوو دەکرێنەوە بۆئەوەی پرسیاریان لێ بکرێ‌و لێیان بکۆڵدرێتەوە لەبەر چی‌و لەسەر چی زیندە بە چاڵ کراون، نامەی کردەوەو کرداری ئادەمیزاد بڵاو دەکرێنەوە بۆ حیساب‌و کیتاب، ئاسمان لەسەر شێوەی خۆی نامێنێ‌و وەکوو پێستێك دادەڕنرێ هیچ یاساو نیزامێکی نامێنێ، دۆزەخ ئاگری خۆشتر دەکرێ‌و دەکەوێتە گڕوگڤ‌و نێڵە نێڵ، بەهەشت جوان دەکرێ‌و دەڕازێندرێتەوەو ئامادە دەکرێ بۆ خودا پەرستان.. ئالەم ڕۆژەدا هەموو شتێك هەڵەو گێر خۆی دەنوێنێ‌و بەرەو ئاوازوو دەبێ، هەموو دەروون‌و نەفسێك دەزانێ چی کردوەو چی نەکردوە، ئەگەر چاکەی کردبوو نامەی عەمەلی درایە دەستی ڕاستی بەرەو بەهەشتی دەبەن! ئەگەر خراپەی کردبوو بۆ لای دۆزەخ ڕای

دەپێچن‌و تلۆری دەکەنەوە بۆ ناو دۆزەخ! جاری واش هەیە قورئان وێنەکە وا دەکێشی وەکوو ئەوە بڵێی بەڵاکە سروشتەکە رادەتلەقێنیّ‌و بونەوەر دەکەوێتە لەرزە.

{إِذَا وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ خَافِضَةٌ رَّافِعَةٌ إِذَا رُجَّتِ الْأَرْضُ رَجًّا وَبُسَّتِ الْجِبَالُ بَسًّا فَكَانَتْ هَبَاء مُّنبَثًّا – سورة الواقعة/ ١-٦}:

واتە: ئەی فروستادە! ئەوەیان بۆ باس بکە کە رۆژی قیامەت پەیدا دەبیّ‌و خەڵکی بە چاوی خۆیان دەیبینن، ئیتر کەس نیە بە درۆی بزانیّ‌و هەموو پێی بڕوا دەکەن، بەڵام تازە چ سوود!! رۆژی قیامەت رۆژێکی وایە سەرپێچی کەرانی جیهان نزم دەکاتەوە بۆ قوڵایی دۆزەخ‌و فەرمانبەردارانی خوداش بەرز دەکاتەوە بۆ هەرە پلە بەرزەکانی بەهەشت.

ئەو بەڵا سامناکە (رۆژی رەستاخیز) زەوی رادەتەکێنیّ‌و کێوەکان وردو هاڕ دەکاو قورساییان تێدا ناهێڵی‌و وەکوو قانگلاشك بە حەواوە دەخولێنەوە.

جاری واش هەیە، وا وێنەی بەڵاکە دەکێشیّ کە دڵ‌و دەروونی مرۆڤ دابگریّ‌و کاس‌و هۆڕی بکا هەست‌و شعووری نەمێنیّ.

خودا دەفەرمویّ: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ، يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُم بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ – سورة الحج/١-٢}.

واتە: ئەی خەڵکینە! خۆ بپارێزن لە سزاو تۆڵەی خودا، گەردن کەچی فەرمانەکانی بن، بە راستی بومەلەرزەی هاتنی رۆژی قیامەت شتێکی سامناك‌و گەورەیە!!؟ ئەو رۆژەی کە ئێوە ئەو راتلەقاندنە دەبینن ئەوەندە بە سام‌و جەرگ بڕە ژنی شیردەر ئاگای لە کۆرپە شیر خۆرەکەی نامێنیّ‌و نای پڕژێتە سەری. هەموو سك پڕو دووگیانێك منداڵی بە نەکامی‌و پێش وەخت لەبار دەچیّ، سەرنج دەدەیە خەڵکی مەحشەر وا دەزانی هەموویان سەرخۆشن‌و مەستی شەرابن وا لە گل‌و گۆ کەوتوون! لە راستیدا سەر خۆشی عەرەق‌و شەراب نین

بەڵکوو سزای خودا بەشیددەتەو لە ترسی سزای ئەو چاویان پێ ئەبڵەق بووەو لە گل‌و گۆ کەوتوون!!

جارێکی تر قورئانی پیرۆز وێنەکە بە شێوەیەکی تر دەکێشێ‌و دەفەرموێ:

**{فَإِذَا جَاءَتِ الصَّاخَّةُ يَوْمَ يَفِرُّ الْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ وأمه وأبيه وَصَاحِبَتِهِ وَبَنِيهِ لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ – سورة عبس/ ٣٣-٣٧}:**

واتە: کاتێك گرمەی سامناکی ڕۆژی قیامەت دێ‌و دەی بیسن کەس بەسەر کەس ناپرژێ‌و ڕۆژی نەفسی نەفسییە؟! ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە ئینسان دەیەوێ لە خۆشەویسترین کەس‌و کاری خۆی دوورکەوێتەوە! ڕۆژێکە پیاو لەبەر براو دایك‌و باوك‌و خێزان‌و کوڕو کچی خۆی هەڵدێ خوا خوایەتی هیچیان خۆی پێوە هەڵنەواسن‌و دڕو داوێنی نەگرن‌و خۆی تێ هەڵنەخوشێنن‌و پاگیری نەبن، هەموو ئادەمیزادێك ئەو ڕۆژە ئیشێکی وای هەیە نای پرژێتە سەر کارو باری خەڵکی دیکە، هەر کەسە بیر لە داهاتووی خۆی دەکاتەوەو خەریکی کاری خۆیەتی!!

## حیساب‌و لیکۆڵینەوەی ڕۆژی ڕەستاخیز (الحساب في الآخرة):

مرۆڤ سەیری دەوروبەری خۆی دەکا دەبینێ خێرو شەڕ لە ململانێدان، هەمیشە جەنگ‌و هەرا لەنێوان خێرو شەڕدا بەرپایە، چاکەو خراپە یەخەی یەکتریان گرتووە، زۆر جار شەڕ بەسەر خێردا زاڵ دەبێ‌و پەستی (ڕەذیلە) بەرزیی (فضیلة) دادەپۆشێ! مرۆڤیش لە تەمەنی کورتی خۆیدا زۆرجار وا دەبێ مەرگ ماوەی نادا بە چاوی خۆی ئاکامی خێرو شەڕ ببینێ، هەموو ئینسانێکیش بەلایەوە قورسەو لەسەر شانی گرانە کە خێرخوا پاداشی خێر وەرنەگرێتەوەو شەڕ خواز سزای شەڕی خۆی وەرنەگرێتەوە! هەبوونی بیرو باوەڕ بە وجوودی خودایەکی دادپەروەر سەر بۆ ئەوە دەکێشێ کە هەموو کەسێك پاداشی کردەوەی خۆی بێتەوە ڕێ، جا ئەگەر ئەم دادپەروەرییە لە جیهاندا ئەنجام نەدرا ئەوە بەبێ شك لەو دونیادا ئەنجام دەدرێ!! قورئانی پیرۆز لە زۆر شوێنیدا ئەوە

دەچەسپێنێ کە مرۆڤ لەسەر کردەوەی جیهانی، لەو دونیا حیساب‌و کیتابی لەگەڵ دەکرێ!! بڕێ لەئایەتەکانی قورئان گرینگیان داوە بە وێنە کێشانی راوەستان‌و هەڵوەستانی لێ پرسینەوەی رۆژی قیامەت لەگەڵ بەلای سامناکی رۆژی رەستاخیزدا.

خودا دەفەرموێ: {يَسْأَلُ أَيَّانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ؟ فَإِذَا بَرِقَ الْبَصَرُ وَخَسَفَ الْقَمَرُ وَجُمِعَ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ يَقُولُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ الْمَفَرُّ كَلَّا لَا وَزَرَ إِلَى رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمُسْتَقَرُّ يُنَبَّأُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ بَلِ الْإِنسَانُ عَلَى نَفْسِهِ بَصِيرَةٌ ولو ألقيَّ معاذيرة – القيامة/ ٦-١٥}:

واتە: بە تەوسەوە پرسیار دەکەن‌و دەڵێن: ئەرێ کەی قیامەت هەڵدەستێ؟ ئەوکاتەی چاو بە ملۆق دەوەستێ‌و لە ترسی مردن‌و حیساب‌و کیتاب سەر گەردان دەبێ، ئەوکاتەی مانگ روناکی نامێنێ‌و تاریك دەبێ خۆرو مانگ کۆدەکرێنەوە دەخرێنە ناو یەکترەوەو هاتوو چۆو روناکیان نامێنێ، نیزامی کەون تێك دەچێ جا لەناو ئەم گێژاوو ترس‌و تەنگ‌و چەڵەمەیەدا ئینسان بە ترس‌و لەرزەوە دەڵێ: پەنا بۆ کوێ بەرم، روو لە کوێ بکەم؟!! خەیر هیچ پەنایەك نیە، گەڕانەوە هەر بۆلای خودایە، تازە کار لەکار ترازاوە، ئیتر هەموو مرۆڤێك هەواڵی پێ دەدرێ چی کردوەو چی نەکردوە! عوزرو پاڕانەوە دەوری نامێنێ، {يُنَبَّأُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ} جارێکی تر دەبینن قورئان مەوقیفی لێکۆڵینەوەو حیساب بە جۆرێکی تر وێنە دەکێشێ‌و دەفەرموێ:

{إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا وقال الإنسان مالها يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَى لَهَا يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا أَعْمَالَهُمْ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ – سورة الزلزلة}.

سەیری ئەم وێنە فۆتۆغرافیە بکە قورئان کێشاویەتی: زەوی شەق شەقەی پێ دەکەوێ‌و رادەتڵەقێ، چی لەناو خۆگرتووە لە گەنج‌و خەزێنەو مردوو فڕێی دەداتە دەرەوە، مرۆڤ چاوی پێ ئەبڵەق دەبن لە ترسی ئەو روانگە سامناکەی کە

هەرگیز لەوە پێش نەی بینیوە، چاوەکانی بەملۆق دەوەستن و ئەبلەق دەبن و پرسیار دەکا چی قەوماوەو چی رووی داوە، زەوی ئاوا ناوسکی خۆی خاڵی دەکاو کەوتۆتە جم و جووڵ دەڵێی جیوەی تێکراوە هەدادانی نیەو لە لەرزەو جوڵە ناکەوێ؟ ئیتر زەوی (وەکوو مرۆڤێکی خاوەن هەست) دێتە جواب و دەڵێ فەرمانی خودای گەورەم بۆ دەرچووە کە ئیتر چی دی ئاوەدان نەبم و کوێر ببمەوەو کاتی خەرابوونم هاتووە نابێ ئادارم بەسەر پادارەوە بمێنێ! ئیتر ئەو کاتە ئادەمیزاد هەموویان وەکوو گەلە ئاژەڵی بێ شوانی گورك نێو کەوتوو، هەریەکە بە لایەکدا دەڕوا بۆئەوەی پاداش و سزای کردەوەکانی دونیای خۆی ببینێ، چاکە هەر چەندێك پچکۆلە بێ پاداشی لەسەر وەردەگرێتەوە خراپەش چەندێك کەم بێ سزای خۆی دەدرێتەوە!!

لە بڕێ شوێنی تردا قورئان بەوەندە کیفایەت دەکا کە مەوقیفی حیساب و لێکۆڵینەوەکە رادەنوێنێ بەبێ ئەوەی کە باسی قیامەتی لەگەڵدا باس بکا دەفەرموێ:

{حَتَّى إِذَا جَاء أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ كَلَّا إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ فَلَا أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَاءلُونَ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُوْلَئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ فِي جَهَنَّمَ خَالِدُونَ - سورة المؤمنون/ ٩٩-١٠٣ }:

ئەم ئایەتانە وێنەیەکی تری رۆژی رەستاخیز دەکێشن و بە شێوەیەکی تر تابلۆکە ئەنجام دەدەن، سەرەتا مەشهەدی سەرە مەرگ و کاتی لە دونیا دەرچوون و درکاندنی تۆبەو ژیوان بوونەوە لە گوناهو هاتنی دێوەزمەی مەرگ دەخاتە سەر شانۆو پاڕانەوەو تکاو رەجای ئەوە کە جارێکی تر کابرای گوناهبار بگەڕێتەوە بۆ سەر دونیاو کردەوەی باش بکاو فەرمانبەردار بێ و سەرپێچی نەکا، دەخاتە سەر مەشهەدەکە! کەچی لەپڕ وەڵامێکی جەرگ بڕو نائومێد ئامێز (نەك هەر بۆ کابرای گوناهبارو تکا کار) بەڵکوو بۆ هەموو مرۆڤێك دەدرێتەوە.

**(كلا انها كلمة هو قائلها)** واتە: ئەمە قسەیەكەو كابرا دەیكا تازە كێ گوێ بۆ وتەی وا رادەگرێو كەی ئەوە قسەی كردنە!؟!

خۆ ئەگەر بشگێڕدرێتەوە ئاشكرایە وەفا بە وەعدو پەیمانی خۆی ناكاتو هەر وەكوو جاری پێشوو پشت هەڵ دەكاتەوە! چۆن ئەوانە جارێكی تر دەبرێنەوە بۆ دونیا؟ چۆن شتی وا دەبێ؟ تازە دیوارو پەردەیەكی بەهێز كەوتۆتە نێوان ئەوانو دونیاوە، ئەویش مردنە، تازە ئەوان هەتا رۆژی زیندوو بوونەوەی قیامەت لە مانەوەی بەرزەخیدانو دەمێننەوە، هەر كاتێكیش (فوو) بە كەڕەنای صوردا كرا، ئیعلانی زیندوو بوونەوە هەڵدرا ئیتر بە گورجی هەموو مردوویەك هەریەكە لە گۆڕی خۆیەوە دێتە دەرێو پەلە پڕوزە بە ترسو خۆفێكی بێ وێنەو نەبیسراو بەرەو دەشتی مەحشەرو كۆبوونەوە دەجمن، بەڵام چۆن جمانێ؟! كەس ئاگای لە كەس نیە هەركەسە خەمی خۆیەتیو رۆژی نەفسی نەفسییە، كەس وەسەر كەس نایپەرژێ!!

ئەمجار تەرازوو شایانی حەقو حیساب دادەنرێنو چاكەو خراپە دەكێشرێن، هەر كەسێ لای خێرو چاكەی قورسو گران نەبێ ریسواو فەوتاوە. پەروەردگاریش هەموو حیسابو كیتابێك دەپرسێتەوە تەنانەت نییەتو خەتەرەی دڵو دەرونیش حسێب دەكاو ئیعتیبار دەكرێ.

**{لِّلَّهِ ما فِي السَّمَاواتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللّهُ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاء وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاء وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ — سورة البقرة/ ٢٨٤}:**

واتە: هەرچی لە ئاسمانەكانو زەویدا هەیە هەمووی هی خودایە، تەنانەت ئەوەی لە دەرونتانا هەیە، وەكوو شكو گومان، نیفاق شاردنەوەی شایەتی حەقو شتی ئاوا بیشارنەوە یان دەری ببڕن خودای گەورە موحاسەبەتان دەكا لە سەری، جا ئەگەر بیەوێو ئیرادە بكا لە هەندێ گوناهبار خۆش دەبێو هێندێكیش سزا دەدا، ئارەزووی خۆیەتیو كەس ناتوانێ بڵێ بۆ؟! خودا بۆ خۆی بەسەر هەموو شتێكدا بە تواناو بە دەسەڵاتە!! خوێنەری ئازیز ئەوەی كە تێپەڕ بوو چەپكێكە

لەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆز کە ئەوە دەچەسپێنن مرۆڤ بـە خـۆڕاییو بێ هـودە دروسـت نـەکراوەو هـەروا بەهەوانتـە نەهاتۆتـە ئـەم دونیایـەوە؟ بەڵـکوو لەسـەر هەموو شتێك لێ پرسینەوەی لەگەڵ ئەنجام دەدرێ.

{أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ – سـورة المؤمنـون/ ١١٥}:

واتە: ئایا ئێوە وا گومان دەبەنو وا دەزانن کە ئێمە ئێوەمان وا بـە بـی هـودە دروسـت کـردوەو هـیچ مەبەسـتو قەصـدو حیکمـەتو تێبینیـەکمان لـە دروسـت کردنـی ئێـوەدا نـەبووە؟ وا دەزانـن ئێـوە ناگەڕێنـەوە بـۆلای ئێمـە سـزاو پاداشـی کردەوەکانتان وەرناگرنەوە؟ نەخەیر وا نیەو وا مەزانن، ئێمە ئێوەمـان هـەروا بـە خۆڕایی دروست نەکردوە، بەڵکوو ئێوەمان دروست کردوە بۆ خـاتری بـە تاقیتـان بکەینەوە دوایـی پاداشـی چاکە بـە چاکە بدەینـەوە سزای خراپەکـەر بـە خراپـە بدەینەوە؟!

## خۆشییە حیسیەکانی بەهەشت (نعیم الجنة الحسي):

ئەو شوێنە کە لەدوا رۆژدا شـوێنی رابواردنو خۆشـیو سـەیرو سـەفایە، خـوا پەرستان تێیدا بـە مـراز دەگـەن، لـە قورئانـدا بـە چـەند نـاوێ هـاتووە، هـەرە بـە ناوبانگیان وشەی (الجنة)یە. ئەم وشەیە لە زماندا بە مانـا باخـە خورمایـەك یـان باخە دارێکی بەرداری چڕو پڕی وایە کە لقە دارەکانی لەبەر زۆری خۆیانو چڕی گـەڵاکانیان بـە جـۆرێکی وا تێـك چـڕژاونو سـەریان کـردوە بـە یـەکا خـۆی تێـدا حەشـار دەدرێ. ناوەکـانی دیکـە کـە قورئـان بـۆ بەهەشـتی دانـاون ئەمانـەن (دار الـسلام): خـانووی ئاشـتی، (دار الخلـود): سـەرای نـەمری، (دار المقامـة): خـانووی مانـەوە، (جنـة المـأوی): بـاخی حەوانـەوە، (جنـات عـدن): باخـچەکانی مانـەوەی بەردەوام. (الحیـوان): ژینگـە، خـانووی ژیـان، (الفـردوس): بـاخی جوانی خۆشـیو لەززەت، (المقام الامین): شوێنی ئارامو ئاسایش.

بەهەشت خانووی ئەوانەیە بڕوایان بە خوا هەیەو کردەوەی چاکیان کردوە، خانووی ئەوانەیە خوایان پەرستووەو تەقوای زاتی بێچوونیان ئەنجام داوە. خانووی بەندە موخلیسەکانی خودایە، خانووی ئەوانەیە لە خوا ترساون‌و لە خوا دەترسن. خانووی ئەوانەیە وەفایان بەعەهدو پەیمان کردوە! خانووی ئەوانەیە لە ڕێگای خودادا بە گیان تێکۆشاون‌و هەوڵی سەرکەوتنی وشەی (لا اله الا الله)یان داوە، خانووی تۆبە کارانە، خانووی عیبادەت کارانە هی سوپاس کارو ڕۆژووەوان‌و نوێژ کەرو کڕنوش بۆ خودا بەرانە، خانووی ئەوانەیە فەرمان دەکەن بە چاکەو نەهی دەکەن لە خراپە. خودای گەورەو میهرەبان وەسفی بەهەشتی بۆ ئەو خاوەن ڕەوشتانە کردوە بۆئەوەی ئەو خودا پێداوانە دڵیان ئارام بگرێ‌و عەزیمەتیان بەهێز ببێ بۆ کردنی تاعەت توێژەرەوەو لێکۆڵەرەوەکان کەوتوونە نیزاع‌و کێشەی ئەوەوە کە ئایا لەززەت‌و خۆشی ئەو دونیا بەچی دەبێ، کۆمەڵێك ڕایان وایە کە خۆشی‌و لەززەتەکە حیسسی‌و مادە ئامێزە. کۆمەڵێکیش لەوانەی صوفی مەشرەب‌و فەیلەسوفن زۆر بە ڕەمزو ئیشارە حسێب دەکەن پێیان وایە کە خۆشی‌و لەززەتی بەهەشت گیانییە نەك جیسمانی!!

ئێمە رامان وایە کە خۆشی‌و لەززەتی بەهەشت دوو جۆرە هێندێکی حیسسییەو مادییە بڕێکی گیانییەو ڕۆح هەستی پێدەکا، ئەمەش ڕایەکە زاهیری ئایەتەکانی قورئان پاڵپشتی دەکاو دەی چەسپێنێ!! لێرە بەولاوە بە گوێرەی پێویست بڕێ لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دەربارەی لەززەت‌و خۆشی بەهەشت، هی جیسمانی‌و هی ڕۆحانی دەخەینە ڕوو.

## جۆگاو چۆمەکانی بەهەشت (انهار الجنة):

خودای گەورە دەفەرموێ: {مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ فِيهَا أَنْهَارٌ مِّن مَّاء غَيْرِ آسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ وَأَنْهَارٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ وَأَنْهَارٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ – سورة محمد/ ١٥}:

ئەم ئایەتە پیرۆزە وەصفـو سەنای جۆگەو جۆبـاری بەھەشـت دەكـا ئـەوەمان بۆ روون دەكاتـەوە كە لەوێدا جۆگای ئـاوی روونو جـوان، جۆگـای شـیری صـافی وا كە ھەرگیز تامی نەگۆڕی، جۆگای شەرابو جۆگای ھەنگوینی پاڵفتە كراوی جوان ھەیە، ھـەروەكوو چـۆن چ میوەیـەك بـە دڵ دابـێو خـەیاڵ پـەی پـێ بـەرێ بـەبێ ئەندازەو چەندو چوون ھەموو كاتێ بەیدەستە. خۆشترین خۆراكو خواردەمەنی، پاك ترین میوەھاتی جوانو نایاب ھەرچی مرۆڤ بـە خـەیاڵ حـەزی لێ بكـا، بـەبێ رەنجو ماندوو بوون ئامادەو بەردەستە!!

ئـەم جۆگایانـە باشـترین نـەوعی خـواردنو خواردنـەوەیان تێدایـە لـەززەتو خۆش تامییـان ھـەر حیسـاب نـاكرێ، زیـاد لـەوەش ھـەموو جـۆرە میوەیـەكیان لـە دەوروبەرە. بەھرەی ھـەرە بـەرزی لەمانـەیش خۆشـترو نایـابتر نیعمـەتی لێخۆش بوونو لێ رازی بوونی خودای گەورەو میھرەبانە.

خودای گەورە دەفەرموێ: {قَالَ اللّهُ هَذَا يَوْمُ يَنفَعُ الصَّادِقِينَ صِدْقُهُمْ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا رَّضِيَ اللّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ – سورة المائدة/ ١١٩}:

واتـە: رۆژی قیامـەت خـودای گـەورەو میھرەبـان دەفـەرموێ: ئـەمڕۆ رۆژێكـە راستگۆیان پاداشی راستگۆیی خۆیان وەردەگرنەوە، پاداشـتەكە بریتییـە لـە چـەند باخچەو باخو باخاتێك كە دارەكانی تێك چـڕژاونو شـینو زەنـوێرن بـە ژێـر ئـەو دارانـەدا جۆگـەو جۆبـار دەكـشێنو خۆشـترین شـوێنو جـوانترین دیمـەنی رەنگـین دەخولقێنن، چونكە جوانترین مەنزەر ئەوەیە كە باخەكە دارەكانی پڕبنو بـەژێر دارەكانـدا جۆگای ئاو جاری ببن. ئـەم ژیانـە ژیـانێكی ھـەتا ھەتاییـەو بـە ئەبـەدی تێیدا دەمێننەوە، خوا لـەوان رازییـەو ئـەوانیش لـە خـودا رازیـن، بـە راسـتی ئـەو پاداشــەی وەریــان گرتــووە بــە مــراد گەیــشتنێكی گەورەیــەو خــوا بــە نــسیبی ھەموومانی بكا!!

## دارو درەختی بەهەشتو میوەو بەروبوومیان:

خودای گەورەو میهرەبان دەفەرموێ: {وَبَشِّرِ الَّذِين آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقاً قَالُواْ هَذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِن قَبْلُ وَأُتُواْ بِهِ مُتَشَابِهاً وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ – سورة البقرة/ ٢٥}:

لەم ئایەتە پیرۆزەدا خودای گەورەو مەزن فەرمان دەکا بە محمدی پێغەمبەری (درودی خودای لەسەر بێ) کە مزگێنی بدا بە موسوڵمانان خەبەرێکی کەیف خۆشکەریان بداتێ خەبەرەکەش ئەوەیە خودای مەزن ئامادەی کردوە بۆ موسوڵمانان چەند باخو باخاتێکی خاوەن بەرو بوومو زەنوێر کەوان لە بەهەشتا، لە ژێر ئەو دارانەوە بەناو تەلارو کۆشکی بەهەشتییەکاندا، لەبن خانەو باڵە خانەکانیانەوە جۆگەو جۆباری زۆر لە هەمە جۆر دەکشێنو دەروونو چاوو دڵو دەروون رۆشن دەکەنەوە. هەرکاتێ لە میوەیەکی ئەم باخانە بخۆن دەڵێن: ئەوە ئەمە ئەو میوە خۆشەیە کە لەمەوبەر لە دونیا حەزمان لێی بوو لێمان دەخوارد قسەکەیان راستە چونکە بە شێوەو بیچمو رەنگو شێواز لە میوە جاتی دنیا دەچێ بەلام تامو بۆنو بەرامەی گەلێ گەلێ لەو خۆشترە. هەروا بۆ ئەو موسوڵمانە خودا پێداوانە چەند خێزانێکی پاکو خاوێنو بێ خەوشو عەیب ئامادە کراوە پێکەوە لەگەڵ خێزانەکانیاندا لە ژیانێکی خۆشی بەرێزی بەرزی هەتا هەتایدا رادەبوێرن!!

لە شوێنێکی تردا خودای میهرەبان وەسفی بەهەشت دەکاو دەفەرموێ: {وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَالُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا - سورة الإنسان/ ١٤}:

واتە: سێبەری دارو درەختەکانی بەهەشت (بۆ زیادە خۆش بەختی ئەوان) لێیان نزیك دەبێتەوە، هەروەها میوەو بەرەکانیشیان خۆشە چینو بەیدەست دەبن بۆیان بە ئاسانی دەستیان دەی گاتێو دەیان رنن.

## خواردن‌و خواردنەوەی بەهەشت (طعام الجنة وشرابها):

خودای گەورەو میهرەبان لە وەسف‌و سەنای ئەو خۆشی‌و لەزەتەی بۆ بەندە موسوڵمانەکانی ئامادە کردوە دەفەرموێ:

{يَا عِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ وَلَا أَنتُمْ تَحْزَنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا مُسْلِمِينَ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ أَنتُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ تُحْبَرُونَ يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الْأَنفُسُ وَتَلَذُّ الْأَعْيُنُ وَأَنتُمْ فِيهَا خَالِدُونَ وَتِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ لَكُمْ فِيهَا فَاكِهَةٌ كَثِيرَةٌ مِنْهَا تَأْكُلُونَ - سورة الزخرف/ ٦٨-٧٣}:

لەم ئایەتە پیرۆزانەدا ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێ کە خودای مەزن ڕۆژی ڕەستاخیز ڕووی ڕەحمەتی دەکاتە بەندە موسوڵمانەکانی‌و پێیان دەفەرموێ: ئەی بەندەکانم ئەمڕۆ ئێوە سەر فرازان‌و ترس‌و بیمی سزاو عەزابی جەهەننەمتان نەبێ! هیچ دڵتەنگ‌و غەمباریش مەبن لەسەر لە دونیا دەرچوونتان. بێگومان چەند باخ‌و باخاتێکی خۆش‌و قەسرو باڵە خانەی دڵگیری بۆ ئامادە کردوون، بۆ خۆتان‌و بۆ خێزانەکانتان لە پاداشی کرداری باشی دونیاتان. ئەمجار پەروەردگار لە ئایەتەکەدا ناوی هەندێ لەو شتانەی لەززەتی لێ دەبینن ریز دەکا! لە لایەکەوە دەفرو پیاڵەی زێڕو زیوی پڕ لە خۆراکی خۆش‌و نایاب! لە لایەکی ترەوە سوراحی‌و کوپ‌و پەرداخ‌و حاجەتی ڕەنگاو ڕەنگی پڕ لە شەرابی بە تام‌و مزری جۆراو جۆر! هەروەها لە بەهەشتدا زیاد لەو شتانەی کە باس کران هەرچی دڵ ئارەزووی بکاو چاو خۆشی لێ ببینێ هەیەو بە ئاسانی دەست دەکەوێ، ئەم نازو نیعمەتە وەکوو نیعمەتی دونیا نیە بڕانەوەی هەبێ، بەڵکوو هەرگیز بڕانەوەی نابێ.... دوای ئەمە پەروەردگار مزگێنی ئەوەی داوە کە ئەو موسوڵمانانە زیاد لەم نیعمەتە باسکراوانە چ میوەیەکی تر حەز بکەن بۆیان ئامادەو بەیدەستە!

خودای گەورەو مەزن لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: {إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ أُوْلَئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَّعْلُومٌ فَوَاكِهُ وَهُم مُّكْرَمُونَ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ عَلَى سُرُرٍ مُّتَقَابِلِينَ

يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِن مَّعِينٍ بَيْضَاء لَذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ - سورة الصافات/ ٤٧}:

واتــە: بەنــدە موخلیــصەكانی خــودا ڕۆژی قیامــەت بــە پێــچەوانەی خــوا نەناسەكانن! بەندە ڕاستاڵەكانی خودا چەند باخو باخاتێكیان هەیە هەر خۆراكو خواردەمەنییەك خۆشو بەتام بێ تێیایدا هەیەو لەززەتیان لێ وەردەگرن! ئەم خواردنو خواردنەوەیان پێشكەش دەكرێو بە ڕێزەوە بۆیان دادەنرێ هەروەكوو پاشاو پیاو ماقوڵان لەسەر مێزو سینی ڕەنگاو ڕەنگو نایاب خواردنیان بۆ دادەنرێ، هەموویان ڕوو دەكەنە یەكتری بەرامبەری یەك خواردنو خواردنەوەیان نۆش دەكەن چی خۆشەو بەتامو لەززەتە دەرخواردیان دەدرێ جۆرەها شەرابی ڕەنگ سپیو تام خۆشیان پێشكەش دەكرێ، ئەوەش لە یاد نەكەین ئەم شەرابە كارناكاتە سەر مێشكو ئینسان سەرخۆش ناكا، نابێتە هۆی سەر ئێشە بۆ ئەو كەسەی دەیخواتەوە، عەقڵو هۆشی ناباو سەرخۆشی ناكا!

## بەرگو كاڵای بەهەشتو خشڵو ئارایشتی ڕازاندنەوە:

خودای گەورە دەفەرموێ: {إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا أُوْلَئِكَ لَهُمْ جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ الْأَنْهَارُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَيَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا مِّن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَّكِئِينَ فِيهَا عَلَى الْأَرَائِكِ نِعْمَ الثَّوَابُ وَحَسُنَتْ مُرْتَفَقًا - سورة الكهف/ ٣٠-٣١}:

واتــە: ئەوانــەی بڕوایــان بــە خــودا هــەبووەو كــردەوەی باشــیان ئــەنجام داوە پاداشی كردەوەی خۆیـان وەردەگرنـەوە.. بێگومـان ئێمـە بـە فـیڕۆ نـادەین پاداشـی هەركەسێك كرداری چاك بێ ئەوانە لە بەهشتدا لە ژیانێكی خۆشـدا دەگـوزەرێنن، هەروەكوو چۆن بەهەشت باشترین خانووی مانەوەو ئیسراحەتە!

## خانوو باڵە خانەی بەهەشتو هۆدەکانی (مساكن الجنة وغرفها):

خودای گەورە دەفەرموێ: {وَعَدَ اللّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللّهِ أَكْبَرُ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ – سورة التوبة/ ٧٢}:

واتە: پەروەردگار پەیمانی بە موسوڵمانان داوە چ پیاو چ ژن، کە بیان خاتە ناو بەهەشتەوە کە بە باخو باخاتی نازداری وا رازاوەتەوە کە جۆگەو جۆباری زۆری لەهەمە جۆر بەبن دارو درەختو گوڵو گوڵزارەکانیا رەها دەبن، جارێ بە خوڕیو جارێ بە مەنگی دێنو دەڕۆن، بە ئەبەدی تیایاندا دەمێننەوە لەتەك ئەمانەشدا چەند جێگەو شوێنی رابواردن لەناو باخەکانی بەهەشتدا بۆ ئەوان ئامادە کراوە زیاد لەمانە بەهرەی هەرە بەرزی لەمانەیش خۆشترو دڵگیر تر خۆشنوود بوونو لێ رازی بوونی خودای گەورەو میهرەبانە، کە هەر لە ئێستاوە بەڵێنی ئەوەیشی پێ داون. چونکە ئارامیو ئەمینی دەداتە دڵیانو لەوە دڵنیا دەبن کە خودا لێیان رازییە، ئائەو بەهەشتو رەزامەندییەی خودایە، بە مراز گەییشتنێکی گەلێك گەورەو مەزنە.

لە سورەتی (الزمر/٢٠)دا جارێکی تر خودای گەورە دەربارەی خانوو بەرەی بەهەشت دەفەرموێ:

{لَكِنِ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ لَهُمْ غُرَفٌ مِّن فَوْقِهَا غُرَفٌ مَّبْنِيَّةٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَعْدَ اللَّهِ لَا يُخْلِفُ اللَّهُ الْمِيعَادَ - سورة الزمر/ ٢٠}:

واتە: بەڵام ئەوانەی لە دونیادا تەقوای خودایان کردووەو فەرمانبەرداری بوون چەند هۆدەو باڵە خانەیەکیان بۆ ئامادە کراوە قات لە بان قات دروست کراون بۆ زیدە جوانیو خۆش گوزەرانیو تەواو بەناو ژێر خانو باڵە خانەکاندا جۆگەو جۆبارو حەوزو فیچقەو فوارە هەڵدەقوڵێن. ئەوە وەعدەو مزگێنی خودایەو خوداش هەرگیز وەعدە بە خیلاف دەرناچێ.

## ژن‌و پەریی بەهەشت (نساء وحور الجنة):

پەروەردگار بۆیە لە قورئاندا باسی ئافرەتانی کردوە بۆئەوەی روونی بکاتەوە کە پیاوو ئافرەت لە تەرازووی خودادا یەکسانن چی بۆ پیاو هەبێ بۆ ژنانیش مەیسەر دەبێ، ئافرەتانیش وەکوو پیاوان لەو دونیادا لەززەت‌و خۆشییان دەست دەکەوێ.

خودای گەورە دەفەرموێ: {وَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتَ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَـئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلاَ يُظْلَمُونَ نَقِيرًا - سورة النساء/ ١٢٤}:

واتە: هەر کەسێك کردەوەی چاك بکا ژن بێ یان پیاو بێ بڕوای بە ئایینی ئیسلام هەبێ ئەوە ئەوانە ژن‌و پیاو بە یەکەوە دەچنە بەهەشت‌و بە مرازی خۆیان دەگەن!!

{هُمْ وَأَزْوَاجُهُمْ فِي ظِلَالٍ عَلَى الْأَرَائِكِ مُتَّكِئُونَ - سورة يس/ ٥٦}:

واتە: پیاوان لەگەڵ خێزانەکانیاندا لە ژێر سێبەری دارو درەخت لەسەر کورسی‌و قەنەفە پاڵ دەدەنەوەو ئیستیراحەت دەکەن! لە شوێنێکی تردا قورئان ئەوە دەگەیەنێ کە خودای مەزن رۆژی ڕەستاخیز روو دەکاتە خودا پەرستان‌و دەفەرموێ:

{ادْخُلُوا الْجَنَّةَ أَنتُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ تُحْبَرُونَ – سورة الزخرف/ ٧٠}:

واتە: ئەی خودا ناسانی دونیا! خۆتان‌و خێزانەکانتان بچنە بەهەشتەوە لەززەت‌و خۆشی وەرگرن‌و رابوێرن.

{كَذَلِكَ وَزَوَّجْنَاهُم بِحُورٍ عِينٍ - سورة الدخان/ ٥٤}:

بەو جۆرە ئەو موسوڵمانانە ژنی جوانیان لێ مارە دەکەین (حور) وشەیەکی عەرەبییە کۆی (حوراء)ە بەمانا ئافرەتی گەنجی جوانی سپی پێستی چاو رەش‌و نازدار هاتووە کە بە کوردی پێیان دەگوترێ (پەری)!!.

{حُورٌ مَّقْصُورَاتٌ فِي الْخِيَامِ - سورة الرحمن/ ٧٢}:

واتە: بریتین لە پۆل پۆل پەری چاو رەشی سپی لەشی بۆن خۆش پێست گەشی جوانی بێ خەوشی وا کە پەروەردەی نازو نیعمەتی ناو کۆشك‌و تەلارو رەشماڵ‌و دەوارن، چاویان لە مێردی خۆیانەو چاو نابڕنە پیاوی بێگانە!!

لێـرەدا تێبینییـەك هەیـە ئـەویش ئەوەیـە مەبەسـت لـە حۆریـانی بەهەشـت چییە؟ ئایا هەر ژنەکانی دونیان یان جیاوازن؟!!

ئێمە کە سەیری قورئان دەکەین دەبینین دەفەرموێ: **{إِنَّـا أَنـشَأْنَاهُنَّ إِنـشَاء فَجَعَلْنَاهُنَّ أَبْكَارًا عُرُبًا أَتْرَابًا – سورة الواقعة/ ٣٥-٣٧}:**

واتـە: ئێمـە ئـەو پەرییانـەمان یانـەمان دروسـت کـردون بـە دروسـت کـردن، هەمووومان کردوون بە کچۆڵەی ناسكو نازدار هەموویان مێرد خۆشەویستو قسە خۆشو سروشت پاكو ڕوو گوشادو گەشـن، هـەموویان لـە یـەك تەمەنـدانو هـاو عومرن.

دەگێڕنـەوە دەڵێن: پیرە ژنێك هاتە خزمەت حـەزرەتو عـەرزی کـرد قوربـان! ئەی ڕەوانە کراوی خودا! نزام بۆ بکە بچمە بەهەشـت پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسەر بێ) فەرمووی: **{ان الجنة لايدخلها عجوز}:**

واتە: ئاخر پیرێژن ناچێتە بەهەشت. ئیتر پیرێژنەکە هاتە ئەم لاوەو دەسـتی کرد بە گریان ئەمجار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فـەرمووی: **{اخبروهـا انها لا تدخلها وهي عجوز}:** پێی بڵێین ئەو پیرێژنە بە شێوەی پیرێژنی ناچـێتە بەهەشتەوە پێغەمبەر ئەم ئایەتەی خوێنـدەوە **{ إِنَّا أَنشَأْنَاهُنَّ إِنشَاء فَجَعَلْنَـاهُنَّ أَبْكَارًا}:**

لەمەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە هەر ژنەکانی دونیا جارێکی تـر ڕۆژی قیامەت دروست دەکرێنەوەو گەنج دەبنەوە!!

ئەوەی ڕابوورد بریتی بوو لە برێ بـاسو خواسـی لـەززەتو خۆشـی حیسـی کە لە قورئاندا باس کراوە! جا هەندێ لە دوژمنـانی ئیـسلام ئـەم باسـی لـەززەتو خۆشیانەی بەهەشـتیان کـردوە بـە ڕێ خۆشـکەرێك بۆئـەوەی تـانووت لـە ئـایینی ئیسلام بـدەنو بـە خـەیاڵی خۆیـان ڕەخنـەی بـەوە لێ بگـرن کـە ئـایینێکی مـاددی شەهوانییەو هیچ گرینگی نەداوە بە لایەنی ڕۆحی!

بۆ وەڵامی ئەوانە دەڵێین: خۆ ئایینی (مەسیحی)یش ئاماژەی بۆ ئەم جۆرە نیعمەتە حیسسیانە کردوەو پێغەمبەرو قەدیسەکانیان هەر بەو شێوە باسی لەززەتە حیسسیەکانی بەهەشتیان کردوە! ئەوەش لەیاد نەکەین بڕێ لە توێژەرەوە موسوڵمانەکان رایان وایە کە ئەو لەززەتو نیعمەتە حیسیانەی کە لە قورئاندا باس کراون مەبەست لێیان تێگەیشتن لە لەززەتی رۆحییە، چونکە ناگونجێ بە تێکڕایی کۆمەڵی ئادەمیزاد بە لەززەتی روحی ئاشنا بکرێ بەبێ ئەوەی باسی لەزەتی حیسسی بۆ بکرێ چونکە فکرو بیریان هەرگیز ئامادە نەبووەو رام نەکراوە بۆ تێگەیشتنو حاڵی بونیان لە چۆنیەتی لەززەتی رۆحی.

زیاد لەوەش خۆ حەزرەتی محمد (دروودی خوای لەسەر بێ) ئایینی ئیسلامی (هەر بە عاقڵ مەندو موفەکیرە میسالییە ناوازەکان رانەگەیاندوەو بەس) بەڵکوو ئایینی تازە داهاتووی خۆی بە هەموو ئادەمیزاد رادەگەیاندو عالەمێك کە ماددە بەرچاوی گرتبوون بەلایانەوە ماددە هەموو شتێك بوو پێویست بوو بە گوێرەی عەقڵی خۆیان ئاخاوتنیان لەگەڵدا بکا! عەرەبە پێ پەتیەکی برسی دەبێ چ شتێك هەبێ لەگەڵ بیرو هۆشیدا زیاتر بگونجێو لەلای خۆشترو شیرین تر بێ لە باسی بەهەشت!! ئەی چ شتێك هەبێ لەلای دڵگیر تر بێ لە جۆگای ئاوو جۆگای شیرو جۆگای هەنگوین!؟ ئایا پێی خۆش نیە هەردەم باسی میوەو سەوزایو بەردەوام هەرزانی بەرو بووم ببیستێ؟! بەڵێ کابرای عەرەبی نەخوێندەوار یان هەر کەسێکی تری نەخوێندەوار ناتوانێ لە دڵو مێشکی خۆیدا لەززەتێك بڕیاربدا کە لەززەتی حیسسییەوە هەڵنەستابێ؟!!

## لەززەتە گیانییەکانی بەهەشت (نعیم الجنة الروحي):

ئەو لەززەتو خۆشیانەی بەهەشت کە لە قورئاندا باس کراون تەنها بریتی نین لە لەززەتی ماددیو بەس! بەڵکوو لە بەهەشتدا لەززەتی گیانیش هەیە، قورئانی پیرۆز چەند جارێك ئاماژەی بۆ کردوەو لەسەری دواوە.

بۆ وەڵامی ئەوانە دەڵێین: خۆ ئایینی (مەسیحی)یش ئاماژەی بۆ ئەم جۆرە نیعمەتە حیسسیانە کردوەو پێغەمبەرو قەدیسەکانیان هەر بەو شێوە باسی لەززەتە حیسسیەکانی بەهەشتیان کردوە! ئەوەش لەیاد نەکەین بڕێ لە توێژەرەوە موسوڵمانەکان رایان وایە کە ئەو لەززەتو نیعمەتە حیسیانەی کە لە قورئاندا باس کراون مەبەست لێیان تێگەیشتن لە لەززەتی رۆحییە، چونکە ناگونجێ بە تێکرایی کۆمەڵی ئادەمیزاد بە لەززەتی روحی ئاشنا بکرێ بەبێ ئەوەی باسی لەزەتی حیسسی بۆ بکرێ چونکە فکرو بیریان هەرگیز ئامادە نەبووەو رام نەکراوە بۆ تێگەیشتنو حاڵی بونیان لە چۆنیەتی لەززەتی رۆحی.

زیاد لەوەش خۆ حەزرەتی محمد (درودی خوای لەسەر بێ) ئایینی ئیسلامی (هەر بە عاقڵ مەندو موفەکیرە میسالییە ناوازەکان رانەگەیاندوەو بەس) بەڵکوو ئایینی تازە داهاتووی خۆی بە هەموو ئادەمیزاد رادەگەیاندو عالەمێك کە مادده بەرچاوی گرتبوون بەلایانەوە مادده هەموو شتێك بوو پێویست بوو بە گوێرەی عەقڵی خۆیان ئاخاوتنیان لەگەڵدا بکا! عەرەبە پێ پەتیەکی برسی دەبێ چ شتێك هەبێ لەگەڵ بیرو هۆشیدا زیاتر بگونجێو لەلای خۆشترو شیرین تر بێ لە باسی بەهەشت!! ئەی چ شتێك هەبێ لەلای دڵگیر تر بێ لە جۆگای ئاوو جۆگای شیرو جۆگای هەنگوین!؟ ئایا پێی خۆش نیە هەردەم باسی میوەو سەوزایو بەردەوام هەرزانی بەرو بووم ببیستێ؟! بەڵێ کابرای عەرەبی نەخوێندەوار یان هەر کەسێکی تری نەخوێندەوار ناتوانێ لە دڵو مێشکی خۆیدا لەززەتێك بڕیاربدا کە لەززەتی حیسسییەوە هەڵنەستابێ؟!!

## لەززەتە گیانییەکانی بەهەشت (نعیم الجنة الروحي):

ئەو لەززەتو خۆشیانەی بەهەشت کە لە قورئاندا باس کراون تەنها بریتی نین لە لەززەتی ماددیو بەس! بەڵکوو لە بەهەشتدا لەززەتی گیانیش هەیە، قورئانی پیرۆز چەند جارێك ئاماژەی بۆ کردوەو لەسەری دواوە.

## لەززەت و خۆشی بەهەشت لە خۆشی دونیا ناچێ:

مامۆستا شێخ محمد عەبدە لە تەفسیری سورەتی غاشییەدا دەفەرموێ عالەمی ئەو دنیا واتە: قیامەت، لاشەو قەبارەیان زیادو کەم ناکا، وەکوو لە دونیادا بە مادەو خۆراك دەگۆڕێ لە شتێکەوە بۆ شتێك، لەوێدا وا نابێ، چونکە لەو دونیا عالەمەکە ئەبەدی و بەردەوامە لەززەت و خۆشی لەوێ لەززەت و خۆشی خۆش بەختییە، ئێش و ئازاریش ئێش و ئازاری شەقاو ناخۆشییە، هەرچی لەو دونیا هەیە لەگەڵ ئەوەی لەم دونیایەدا هەیە لێك چونێکیان لە نێواندا هەیەو نەك یەکیەتی جینس و ماك، ئەو وەسف و سەنایەی کە لەم سورەتانەی قورئاندا کراوە وەکوو پیاڵەو دەفری ریزکراو دانراو دۆشەك و پشتی سەفتە، فەرش و راخەری بڵاوکراوە... هتد لەو جۆرە شتانەی کە دەیانبینن لە ماڵ و باڵە خانەی خودا پێداواندا، ئەوە قورئان بەس بۆ نزیك خستنەوەی ئەو نازو نیعمەتەی لە زەمینی ئادەمیزاد هێناونی ئەگینا لەززەت و نیعمەتی ئەو دونیا ئەوەندە خۆش و بە تام و جوان و دڵ ئاوێزە هیچ لەززەت و خۆشی ئەم دونیای ناگاتێ.

ئەم راوو بۆ چونەی شێخ محمد عەبدە هەڵقووڵاوو وەرگیراوە لە فەرمودەیەکی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کە حەدیثێکی قودسییەو پێغەمبەر لە خوداوە دەیگێڕێتەوە دەفەرموێ:

**(قال عزوجل: اعددت لعبادي الصالحين ما لا عين رأت ولا أذن سمعت ولا خطر على قلب بشر):**

واتە: پەروەردگار فەرموویەتی من بۆ بەندە موخلیسە راستاڵەکانی خۆم نازو نیعمەتێکم بۆ ئامادە کردوون، نەچاو بینیویەتی نە گوێچکە بیستوویەتی بە خەیاڵیش بەسەر دڵی کەسدا رانەبوردوە!!

حەزرەتی ئەبو هورەیرە کە خۆی ئەم حەدیثەی گێڕاوەتەوە دەفەرموێ: ئەگەر حەز دەکەن زیاتر بۆتان روون بێتەوە ئەو ئایەتەی سورەتی (السجدە/ ١٧) بخوێننەوە کە دەفەرموێ:

**{فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاء بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ – سورة السجدة/ ١٧}:**

**واتە: هیچ دەرونێك، هیچ نەفسێك ناتوانێ تێ بگاو بزانێ ئەو نازو نیعمەتانە چین‌و چۆنن کە بۆی ئامادەکراون لە بەهەشتدا لە پاداشی ئەو کردەوە چاکانەی کە لە دونیادا ئەنجامی داون.**

## شادبوون بە دیداری خودا (لقاء الله تعالى):

**بڕێ لەو بەڵگانەی ئەوە دەچەسپێنن کە لەززەتی ئەو دونیا لەززەتێکی ماددی روت نیەو بەس ئەومیە کە پەروەردگار روونی کردۆتەوە کە مەبەستی سەرەکی لە ژیانی دونیایی مرۆڤ گەییشتنیەتی بە خوداو شادبوونیەتی بە دیداری ئەو زاتە بێچوونە لە پاشە رۆژدا.**

**{يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَى رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَاقِيهِ - سورة الإنشقاق/ ٦}:**

**واتە: ئەی ئادەمیزاد تۆ لەم ژیانەدا کار دەکەی‌و بە دڵ تێدەکۆشی دڵ سۆزی لە کارو فەرمانتا تا کاتی کۆتایی ژیانت دێ‌و ئەمجار بە پەروەردگاری خۆت شاد دەبیت. لە ئایەتێکی تردا خودا نارەزامەندی خۆی دەربڕیوە دەرحەق ئەوانەی چاویان بڕیوەتە ژیانی دونیایان‌و پێی دڵ خۆشن‌و بە لایانەوە ژیانێکی تری باشتر لەم ژیانە نیەو تازە کە مردی زیندو بوونەوەو ژیانی ئەو دونیا نیە.**

**خودای گەورە دەفەرموێ: {إِنَّ الَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ لِقَاءنَا وَرَضُواْ بِالْحَياةِ الدُّنْيَا وَاطْمَأَنُّواْ بِهَا وَالَّذِينَ هُمْ عَنْ آيَاتِنَا غَافِلُونَ أُوْلَئِكَ مَأْوَاهُمُ النُّارُ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ – سورة يونس/ ٧-٨}:**

**واتە: بێگومان ئەوانەی هیوایان نیە بە ئێمە بگەن‌و زیندو بوونەوەیان بەلاوە درۆیەو بە ژیانی پەست‌و نزمی دونیا رازی بوون‌و دڵیان پێی داسەکناوەو پێیان وایە ئیتر ژیانێکی تر نیە، هەروەها ئەوانیش کە لە نیشانەکانی خودایەتی ئێمە بێئاگان‌و تێفکرینیان نیە، شوێن‌و جێگای حەوانەوەیان رۆژی قیامەت ئاگری دۆزەخەو سزای کردەوەکانیان دەبێ!!**

لە شوێنێکی تردا سزای ئەوانەی بڕوایان بە لیقای خودا نیە روون دەکاتەوەو دەفەرموێ:

{فَنَذَرُ الَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ لِقَاءنَا فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ -سورة يونس/ ١١}:

واتە: ئەوانەی هیوای لیقای ئێمەیان نیەو بڕوایان بە زیندو بوونەوەو ژیانی ئەو دونیا نیە، ئەوانە لێیان دەگەڕێین با لە گومڕاییو سەر کەشی خۆیان نقوم بنو سەر گەردانو سەراسیمە بژین... لە ئایەتێکی تردا پەروەردگار موسوڵمانان شارەزا دەکا بۆ ڕێبازێك کە بیان گەیەنێ بە خوداو لێی نزیك ببنەوە، ئەویش بریتییە لە کردنی کرداری چاكو بەیەك ناسینی خوداو شەریك بۆ پەیدا نەکردنی.

{ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا – سورة الكهف/ ١١٠}:

واتە: هەرکەسێك ئارەزوی لیقای پەروەردگاری هەیە دەیەوێ رۆژی قیامەت لە بەهەشتدا بە خودای بگا، با لە دونیادا کردەوەی چاك بکاو هەرگیز شەریك بۆ خودا بە رەوا نەبینێو رەچاوی نەکا. ئەم دەقە قورئانیانەی باسمان لێوە کردن ئەوە دەگەیەنن کە گەیشتن بە خوداو شادبوون بە دیداری، بەرزترین مەبەستێکە کە پێویستە ئینسان هەوڵو کۆششی بۆ بدا، چونکە لیقای خوداو شادبوون بە دیداری لەززەتێکە هیچ لەززەتێکی تری ناگاتێ!

## بینینی خودای مەزن بە چاوی سەر (رؤية الله تعالى):

قورئانی پیرۆز بە ئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ کە لەو دونیا لەززەتێکی گیانی جگە لەو لەززەتە حیسسییەی کە بۆ بەهەشت باس کراوەو هەیە ئەم لەززەتە بریتییە لە روانین بۆ خودای میهرەبانو شکۆمەند.

خودا دەفەرموێ: {وَاللّهُ يَدْعُو إِلَى دَارِ السَّلاَمِ وَيَهْدِي مَن يَشَاء إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ وَلاَ يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلاَ ذِلَّةٌ أُوْلَـئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ – سورة يونس/ ٢٦}:

واتە: پەروەردگار كۆمەڵی ئادەمیزاد بانگ دەكا بۆ لای بەهەشتی بەرینو سەرای رابواردنی هەرگیز نەبڕاوە، هەركەسێك ئارەزوو بكا شارەزای دەكا بۆ سەر رێگای راست، بۆ ئەوانەی كرداریان چاكە بووە پاداشی چاكیان دەدرێتەوە جگە لەوەش بە بینینی خودا شەرەفیاب دەبنو زیادە لەززەتو خۆشی وەردەگرن كە ئەم لەززەتو بینینە هیچ لەززەتێكی ناگاتێ. هەرگیز (وەك دۆزەخیەكان) لەبەر داخو خەفەت روویان رەش داناگیرسێو هەرگیز كەساسو داماو نابن وەك ئەوان، ئەوانە كۆمەڵی بەهەشتینو هەتا هەتا تێیدا دەمێننەوە!!؟

كەوابوو كە لە ئایەتەكەدا دەفەرموێ: (الحسنى) واتە بەهەشت (وزیادە) واتە: روانین بۆ رووی خوداوەند. (صوهەیب) كە یەكێكە لە یارانی پێغەمبەر دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: كە پێغەمبەر ئەم ئایەتەی خوێندەوە {لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ...} (٢٦) سورەتی یونس تادوایی دەفەرموێ:

**{اذا دخل اهل الجنة الجنة واهل النار النار نادى يا اهل الجنة ان لكم عند الله موعدا يريد ان ينجزكموه فيقولون ما هو؟! ألم تثقل موازيننا وتبيض وجوهنا وتدخلنا الجنة وتزحزحنا عن النار؟! قال فيكشف لهم الحجاب فينظرون اليه فوالله ما اعطاهم الله شيئا احب اليهم من النظر اليه ولا أقر لاعينهم} رواه مسلم.**

واتە: كاتێ ئەهلی بەهەشت دەچنە بەهەشتەوە، ئەهلی جەهەننەم دەچنە جەهەننەم بانگ بێژێك بانگ هەڵدەداو دەڵێ: ئەی دانیشتوانی بەهەشت! ئێوە لای خودای میهرەبان پەیمانێكتان هەیە دەیەوی بۆتانی جێ بەجێ بكا، دەڵێن ئەو پەیمانە چیە؟! ئەی ئەوە نەبوو تەرازووی چاكەمان قورس كراو دەمو چاومان شوعلەوەرو روناك بووەو چوینە ناو بەهەشتەوەو لە دۆزەخ دوور خراینەوە، لە سزای ئاگر رزگارمان بوو؟! پێغەمبەر فەرمووی ئیتر پەردە لە نێوان پەروەردگارو دانیشتوانی بەهەشتدا لادەدرێ بە چاوی خۆیان زاتی حەق دەبینن، بە خودا قەسەم هیچ شتێكیان لەم بینینە بەلاوە خۆشتر نیە هیچ شتێك ئاوا چاویان فێنێك ناكاتەوەو دڵیان خۆش ناكا!

بینینی خودا لە بەهەشتدا قورئان چەسپاندویەتی: {كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ الْعَاجِلَةَ وَتَذَرُونَ الْآخِرَةَ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ - سورة القيامة/ ٢٠٢٣}:

واتە: باوانەبن باشە!! بەڵكوو ئەوان دونیایان خۆش دەوێ‌و وازیان لە ژیانی قیامەت هێناوە لەو دونیا هەندێك دەم‌و چاو گەش‌و تەڕو تازەو جوان‌و درەوشاوەن، دەڕواننە خودای خۆیان سەیری بەدیهێنەری خۆیان دەکەن! پەروەردگار ڕۆژی قیامەت پەردە لە نێوان خۆی‌و بەندە راستاڵە خودا پێداوەکانی لادەباو بە راستی دەی بینن ئەم بینینە لەززەتێکی گیانی وایە هیچ خۆشی‌و لەززەتێکی حیسسی ناگاتێ!

## ڕەزامەندی خودای شکۆمەند (رضوان الله تعالی):

بەڵگەیەکی تر لەسەر ئەوەی کە خۆشی‌و لەززەتی ئەو دونیا دوو جۆرە:

(هەیە گیانی هەیە جیسمانی) ئەوەیە کە قورئان روونی کردۆتەوە، ڕەزامەندی خودا لەو لەززەت‌و نیعمەتانەیە کە تایبەتە بە بڕواداران‌و موسوڵمانانەوەو جیاوازە لە لەززەتی حیسسی (واتە: خۆشی هەستی).

خودا دەفەرموێ: {وَعَدَ اللّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللّهِ أَكْبَرُ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ - سورة التوبة/ ٧٢}:

واتە: یەزدانی مەزن وەعدەی داوە بە پیاوانی موسوڵمان‌و ژنانی موسوڵمان: وەعدەی باخ‌و باخاتێکی داونێ کە بە ژێردارو درەختەکانیاندا جۆگاو جۆبار دەکشێن‌و جاری دەبن‌و هەتا هەتایە تێیاندا دەمێننەوە، هەروا چەند خان‌و بەرەیەکی پاك‌و خاوێن‌و رازاوەیان لە بەهەشتی بەریندا بۆ ئامادە کراوە کەمترین ڕەزامەندی خودا (چ جایی ڕەزامەندییەکی زۆر) بۆ ئەو بەهەشتییانە لە هەموو نازو نیعمەتە حیسسیەکانی تر خۆشترو چاکترە، کەواتە شاد بوون بە ڕەزامەندی خودا گەییشتنە بە گەورەترین ئاوات!!

لەم ئایەتەدا یەکەمجار قورئان نیعمەتە حیسسیەکان باس دەکا ئەمجار دێتە سەر ئەوە کە رازی بوونی خودا لە هەموو نیعمەتە هەست پێکراوەکان بەرزترە، بە تایبەتی کە خودا بۆ خۆی فەرمویەتی (فوز عظیم) ئیتر ئەم رستەیە ئەوە دەگەیەنێ کە مەبەست لە هەموو جۆرە خۆشییەکی حیسسیو ئامانج لە نازدار ترین شتی حیسسی بەهەشت بەهرەی گیانییەو خۆشی رۆحییە!

شیرینتر ئایەتو رستەیەك کە لە قورئاندا باسی لەززەتی گیانی بکا ئەو ئایەتەیە کە خودای مەزن رۆژی قیامەت بانگی بەندە راستاڵەکانی خۆی پێ دەکاو دەفەرموێ:

{يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً فَادْخُلِي فِي عِبَادِي - سورة الفجر/ ٢٧-٣٠}:

واتە: ئەی نەفسی بە ئارام! ئەی خاوەن بیرو باوەڕی ساخی دەروون هێمنو پڕ لە ئاسایش! ئەوا (بە روو سووری) هاتیتەوە دیوانی خودا، دەفەرموو بچۆرەوە کۆشی رەحمەتی خوداو لە پەنای خودای خۆتا بحەوێرەوە، لە خودا رازیو خودا لە تۆ رازی دەی بفەرموو بچۆرە ریزی بەندە باشەکانی خۆمەوەو لەگەڵ ئەوانا بڕۆرە ناو بەهەشتی بەرینی منەوە.

## بەهەشت خانووی ئاسایشە (الجنة دار السلام):

بەڵگەیەکی تر لەسەر ئەوەی کە لەززەتی رۆحی لە بەهەشتدا هەیە ئەوەیە: کە پەروەردگار وەسفی بەهەشتی بە (دار السلام) کردوە، واتە خانەی ئارامیو ئاسایشە، هەروا دەفەرموێ: دانیشتوانی هەموو لە خۆشیو ئارامیدان قسەو گفتو گۆیان لەگەڵ دەکەن. خودا بۆ خۆی لە وەسفو سەنای بەهەشتدا دەفەرموێ:

{لَهُمْ دَارُ السَّلاَمِ عِندَ رَبِّهِمْ وَهُوَ وَلِيُّهُمْ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ - سورة الأنعام/ ١٢٧}:

واتە: پاداشێکی هەرە باشی تری موسوڵمانی خودا پەرست ئەوەیە کە لە خزمەتی خودای خۆیان خانووی پڕ لە ئاسایشو ئارامیان بۆ رازاوەتەوە، کە هەرچی هۆی ناخۆشیو نارەحەتی بی تیایاندا نیە!

لە شوێنێکی تردا پەروەردگار وەسفی ژیانی ئارامو پڕ کامەرانی موسوڵمانانی بەهەشت دەکاو دەفەرموێ:

{إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُمْ بِإِيمَانِهِمْ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ الأَنْهَارُ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ دَعْوَاهُمْ فِيهَا سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلاَمٌ وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنِ الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ – سورة يونس/ ٩-١٠}:

واتە: ئەوانەی بڕوایان هەبوەو کردەوەی چاکیان کردوە، ئەوە خودای گەورە بە هۆی پیرۆزی بیرو باوەڕیانەوە شارەزایان دەکا بۆ ڕێگەی بەختەوەری‌و لەو دونیا دەیانخاتە بەهەشتەوە لەو بەهەشتە خۆشە بەرینەدا بە ژێر دارو درەختی باخ‌و بوڵاخی بەناو هەموو کون‌و قوژبنی کۆشک‌و تەلارەکانیاندا جۆگەو جۆبارو چۆم‌و روبار دەکشێن. دوعاو نزای ئەو بەهەشتیانە بریتییە لەوە کە دەڵێن (سبحانك اللهم) پەروەردگارا! پاک‌و خاوێنی لە هەموو خەوشێك شایانی زاتی تۆیە!!

سەلام کردن‌و چاك‌و چۆنیان بە سەلامی ئیسلامانەیە هەموو جارێ ئاخر قسەیان رستەی (الحمد لله رب العالمين)ە.

بە کورتی چی لە بەهەشتدا هەیە بریتییە لە ئارامی‌و سەلام‌و دڵنەوایی!

لە شوێنێکی تردا قورئان باسی سەلام کردنی فریشتە لە موسوڵمانەکان دەکاو دەفەرموێ:

{جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا وَمَنْ صَلَحَ مِنْ آبَائِهِمْ وَأَزْوَاجِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ وَالمَلاَئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ سَلاَمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ – سورة الرعد/ ٢٣-٢٤}:

واتە: پاداشی موسوڵمانان باخەکانی بەهەشتە رۆژی قیامەت داخڵی دەبن خۆیان‌و باوك‌و باپیری خودا ناسیان‌و ژن‌و خێزانی موسوڵمانیان‌و کوڕو کچ‌و نەوەی راستاڵیان، فریشتە لە هەموو دەرگاییێکەوە دەچن بۆ لایان‌و پیرۆز باییان لێ دەکەن‌و پێیان دەڵێن سەلامی خوداتان لێبێ ئەمە پاداشی کرداری چاکتانە وا پێی

شادو کامەران بوون، بەهۆی ئارام گرتنتانەوە لەسەر کردنی تاعەتو بەجێ هێنانی فەرمانی پەروەردگارتان، بێگومان خۆشترین جێگەی حەوانەوە کە لە ئەنجامی کاری باشا کەسێ وەری بگرێ ئەم خانەی بەهەشتەیە کە دراوە بە ئێوە.

لە مانای ئەم ئایەتانەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە ژیانی ئەو دونیا ژیانی کامەرانیو ئارامیو ئەمنو ئاساییشە کە خۆشیو لەززەتێکە بە گیان هەستی پێ دەکرێو جیاواز لە لەززەتی حیسسی.

ئەمە بوو بە کورتی باسی لەززەتە گیانییەکانی ناو بەهەشت کە لە قورئاندا باس کراون هەر ئەوەندەش بەسە بۆ پوچاندنەوەی راوو بۆچوونی ئەوانەی رەخنە لە ئایینی ئیسلام دەگرنو گوایە دەڵێن: لەززەتەکانی قورئان باسیان دەکا لەززەتی ماددیو جیسمانینو لەززەتی گیانی نین!!

## سزای کردەوەی خراپ (الجزاء على العمل السيء):

قورئانی پیرۆز ئەوە دەچەسپێنێ کە سزای سەرپێچی کەران لەسەر کردنی گوناهەکانیان ئاگری دۆزەخە، ئەو ئاگرە قورئان حەوت ناوی بۆ داناوە (جهنم، الهاوية، الجحيم، سعير، سقر، لظى، الحطمة).

لەناو ئەم ناوانەدا جەهەننەم لە هەموویان زیاتر مەشهوورە، پەروەردگار لە دەیەها ئایەتی قورئاندا باسی دۆزەخی (جەهەننەم)ی هاوردوە، باسی بلێسەو سوتەمەنیو گڕو گفی کردوە، وەسفی خۆراكو خواردنەوەو سزای بە ئێشی کردوە بە جۆرێك کە ترس بخاتە ناو دڵی گوناهکارانو ستەمکاران بۆئەوەی هەموو زۆردارێك لە جەورو ستەمی ناڕەوای خۆی بکشێتەوە!!

پەروەردگار لە وەسفی سوتەمەنی دۆزەخدا فەرموویەتی:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ – سورة التحريم/ ٦}:

واتە: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هەیە بە خودا خۆتانوماڵو منداڵتان بپارێزن لە ئاگرێك کە سوتەمەنیەکەی ئادەمیزادو بەردە، ئاگر خۆشکەرو لێپرسراوانی سەری چەند فریشتەیەکی دڵ ڕەقو بێ بەزەیین. ئەم ئایەتە پیرۆزە وێنەیەکی راستەقینەمان دەداتێ لەو جەهەننەمەی کە سوتەمەنیەکەی ئادەمیزادو بەردە، هەر بەمەشەوە ناوەستێ بەڵکوو ئەوەشمان پێ دەڵێ: کە فەمانبەرانی سەر ئاگرەکەو کاربەدەستانی دۆزەخ چەند فریشتەیەکی بە سامو دڵ ڕەقو بێ بەزەیین کە بە دیمەنی سامناکیان ئێشو ئازاری سزاکە ئەوەندەی تر زیاد دەکەن!!

لە شوێنێکی تردا باسی نێڵە نێڵەی گڕەکەی دەکا دەفەرموێ: {يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ امْتَلَأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ - سورة ق/ ٣٠}:

واتە: بیر لەو ڕۆژە بکەرەوە کە بە دۆزەخ دەڵێین: ئایا پڕ بوویو تێرت خوارد لە لاشەی دۆزەخیان؟ ئەویش وەڵام دەداتەوە دەڵێ: ئەگەر ماوە بابێ هێشتا ماومە!

لە شوێنێکی تردا پەروەردگار باسی ئەوە دەکا کە لە دوورەوە دۆزەخ گوناهبارەکان دەبینێ ئەوانیش دۆزەخ دەبینن چاویان بە گڕو هەڵچوونی دەکەوێو گوێیان لە لرفە لرفی دەبێ کە دەفەرموێ:

{إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍ بَعِيدٍ سَمِعُوا لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا - سورة الفرقان/ ١٢}:

واتە: هەر لە دوورەوە کە چاو فەرقی دۆزەخ دەکاو لە یەکتری ئاشکرا دەبن بە گوێی خۆیان گوێیان لە لرفە لرفو قرخە قرخو لوورە لوورو پیش خواردنەوەیەتی کە لە رقانا لێوە کرۆژمیەتیو فیشکە فیشکیەتی!

لە شوێنێکی تردا قورئان باسی پۆشاكو بەرگی دۆزەخیان دەکاو دەفەرموێ: {هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ فَالَّذِينَ كَفَرُوا قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُؤُوسِهِمُ الْحَمِيمُ يُصْهَرُ بِهِ مَا فِي بُطُونِهِمْ وَالْجُلُودُ وَلَهُم مَّقَامِعُ مِنْ حَدِيدٍ كُلَّمَا أَرَادُوا أَن يَخْرُجُوا مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا فِيهَا وَذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ – سورة الحج/ ١٩-٢٢}:

واتە: ئەوانەی کافرو خوا نەناسن ڕۆژی ڕەستاخیز دەخرێنە ناو دۆزەخەوە پۆشاکیان لە ئاگر بۆ دەبڕدرێ‌و لەبەریان دەکرێ لە ژوور سەریانەوە ئاوی کوڵاوویان بەسەردا دەکرێ ناوسك‌و پێشییان هەمووی دادەپلۆخێ‌و دەتوێتەوە، گورزی ئاگرینیان بۆ ئامادەکراوە هەردەم بەو گورزانە دارکاری دەکرێن، هەرکاتێ هەوڵی ئەوە بدەن لەو تەنگ‌و چەڵەمەیە ڕزگاریان ببێ بێنە دەرەوە لە لوتیان دەدرێ‌و نائومێد دەکرێنەوە، بە تەوسەوە پێیان دەگوترێ دەی بچێژن تامی ئاگری سووری پڕ ئێش‌و ئازاری دۆزەخ. ئەوەتا لە شوێنێکی تردا قورئان ئاوا باسی خواردەمەنی دۆزەخ دەکاو دەفەرموێ:

**{إِنَّ شَجَرَةَ الزَّقُّومِ طعام الأثيم كَالْمُهْلِ يَغْلِي فِي الْبُطُونِ كَغَلْيِ الْحَمِيمِ خُذُوهُ فَاعْتِلُوهُ إِلَى سَوَاء الْجَحِيمِ ثُمَّ صُبُّوا فَوْقَ رَأْسِهِ مِنْ عَذَابِ الْحَمِيمِ ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْكَرِيمُ – سورة الدخان/ ٤٣}:**

واتە: داری بەرتاڵی نەفرەت لێکراو خۆراکی گوناهبارانە لە دۆزەخدا، وەك خڵتەی زەیت یا مسی تواوە لەناو سکیانا دەکوڵێ، وەکوو چۆن ئاوی داخ لەسەر ئاگری بەتین دەکوڵێ ئاوا، بەم شێوە سزا دەدرێن ئەمجار فەرمان دەکرێ بە زەبانیەو کاربەدەستانی دۆزەخ پێیان دەگوترێ: دەیبگرن کێشی کەنێ‌و بیبەن بۆ ناوەڕاستی دۆزەخ با بڕێکیش لە سزای ئەوێی بەرکەوێ! دوایی بۆ زیادە ئێش‌و ئازار پێ گەیاندن، لە تەوقی سەریەوە ئاوی کوڵاتوی پیاکەن، ئەمجار بە تەوس‌و توانجەوە پێی دەڵێن: دەفەرموو بچێژە ئەم سزا پڕ ئێشە، تۆ بە قسەی خۆت گوایە عەزیزو بەرزیت‌و لەکنە خۆت شایانی نازو نەوازشی!!

لە شوێنێکی تردا پەروەردگار وەسفی سزای دۆزەخ بەم جۆرە باس دەکا:

**{وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ مِّن وَرَآئِهِ جَهَنَّمُ وَيُسْقَى مِن مَّاء صَدِيدٍ يَتَجَرَّعُهُ وَلاَ يَكَادُ يُسِيغُهُ وَيَأْتِيهِ الْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ وَمِن وَرَآئِهِ عَذَابٌ غَلِيظٌ – سورة ابراهيم/ ١٥-١٧}:**

واتە: هەموو خۆ بە زلزانێکی سەر ڕەقی لووت بەرز بە هیلاك چوون، هەموو سەر شۆڕو داماو بوون ئەوسا بەرەو دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێن‌و لەوێ پەچەی

لێ دەگرن، کە لەوێ کێم‌و زوخاویان دەرخوارد دەدرێ، کە دۆزەخی بە نابەدڵی قومی لێ دەدا لە بینی دەگیرێ، کە مژی لێ دەگرێتەوە دیسان بۆی قوت ناچێ ئەومندە بۆگەن‌و ناخۆشە هەرساتێکی بە مردنێکەو مردن لەچاو ئەو ژیانە پڕ مەینەتەدا زۆر خۆشە، بەلام بۆ نەگبەتی نامرێ!. سەرەڕای ئەم هەموو ئێش‌و ئازەرەیش جار لەگەڵ جارا ئازاری گرانتر دەبێ!

## سزاو ئێش‌و ئازاری توندی ئەو دونیا (شدة عذاب الآخرة):

خودای گەورە کە وێنەی سزای رۆژی رەستاخیز دەکێشێ وای باس دەکا پێستی مرۆڤ هەر بە بیستنی گرژ دەبێ‌و مچوڕکەی بە لەشدا دێ، سزای رۆژی قیامەت‌و ئێش‌و ئازاری دۆزەخ بە جۆرێکە کە مرۆڤ ناتوانێ خۆی بۆ رابگرێ! کەوایە باشتر وایە بۆ موسوڵمان کە هەوڵ بدا خۆی لەئەو ئێش‌و ئازارە قوتار بکا هەردەم فەرمانبەرداری پەروەردگاربێ‌و خۆی لە نارەزایی ئەو بپارێزێ، ئەو سزایەی خودا وێنەی کێشاوە ئادەمیزادی پێ ترساندووە جۆرە سزایەکە ئەمڕۆ زانستی تازە لایەنێکی نهێنییەکەی بەدەر خستووە خودا دەفەرموێ:

{إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُواْ الْعَذَابَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا - سورة النساء/ ٥٦}:

ئەمە ماناکەی ئەوە دەگەیەنێ کە هەرکاتێ ئاگری دۆزەخ پێستی ئەو گوناهبارانە بخواو لەناوی بەرێ خودای پەروەردگارو بە توانا پێستێکی تریان بۆ دروست دەکاتەوە تا زیاتر ئێش‌و ئازاریان پێ بگا. هۆیەکەشی ئەوەیە ئەو رەگانەی ئێش‌و ئازار دەگوێزنەوە هەموویان لە توێی پێستدان‌و ماسولکەو ئەندامەکانی تری ناوەوە هەست کردنیان زەعیفە، هەر بۆیەشە نۆژدار دەزانێ کە هەڵپروکان لە سووتان بە سوێ ترە واتە سوتاوییەك لە پێست تێ نەپەرێ ئازارەکەی زۆرترە لە سوتاوییەك کە دەگاتە ئەنسیجەو ماسولکەکان، هەرچەندە سوتاوییەکی وا قووڵ سامناکترە بەلام ئازاری کەمترە. جا لەبەر ئەوە خودای

پەروەردگار پێمان دەفەرموێ: هەرکاتێ پێستی ئەو دۆزەخیانە بە ئاگر سووتا بۆئەوەی ئازارەکەیان هەر بەشیدەت و بەردەوام بێ، خێرا پێستێکی تریان بۆ دروست دەکەینەوە! ئا لێرەدا حیکمەتی پەروەردگار دەردەکەوێ! کاتێکیش قورئان ئەم زانستییەی وتووە مرۆڤ هیچی لەم بارەوە نەزانیوە، بە راستی خودای پەروەردگار زاناو بە تواناو کار دروستە!!

ئا ئەوەیە سزای سەختی جەهەننەم کە کافرەکان دەیچێژن وەها بە ئێشە بۆیە هەوڵ دەدەن بە هەر شێوەیەك بێ خۆیانی لێ قوتار بکەن.

{إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُ مَعَهُ لِيَفْتَدُواْ بِهِ مِنْ عَذَابِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ-سورة المائدة/ ٣٦}:

واتە: ئەوانەی کافرو خوا نەناسن ڕۆژی قیامەت تووشی سزاو ئێش و ئازارێکی وا دەبن ئەگەر چی لە زەویدا هەیە بارمتەی ئەوان بێ و ئەوەندەی تریشی لەگەڵ بێ دەیدەن بە فیدیەو بارمتە ئەوەی لەو سزایەی ڕۆژی قیامەت دوور بخرێنەوە، بەڵام لێیان وەرناگیرێ و هیچیان بۆ مەیسەر نابێ هەموو هەوڵ و تەقەلایەکیان بێ سوودو ئەنجامە بەشی ئەوان هەر ئازارو ئێشی توندو کوشندەیە...

## ئایا مانەوە لە دۆزەخدا ئێجگارییە (هل هناك خلود في النار):

مانەوە لە دۆزەخدا پەیوەستە بە ویستی خوداوە، ئارەزۆی چۆن بێ وا دەبێ، چونکە مەرج نیە هەرکەسێك چووە ناو دۆزەخەوە هەتا هەتایێ تێیدا بمێنێتەوە!

خودا دەفەرموێ: { النَّارُ مَثْوَاكُمْ خَالِدِينَ فِيهَا إِلاَّ مَا شَاء اللّهُ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ – سورة الأنعام/ ١٢٨}:

واتە: ئەی سەرپێچی کەران! دۆزەخ شوێنی مانەوەتانە بۆ هەتا هەتایە مەگەر ویستی خودا وابی لە کاتێکی دیاری کراودا بێنە دەرەوە.

له شوێنێکی تردا دەفەرموێ: {فَأَمَّا الَّذِينَ شَقُواْ فَفِي النَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ خَالِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ إِلاَّ مَا شَاء رَبُّكَ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ - سورة هود/ ١٦-١٧}:

واتە: ئەوانەی کە تووشی شەقاوەتو گومڕاهی بوون لە کافرو ستەمکاران دەخرێنە ناو دۆزەخەوە، لەوێدا تووشی تەنگە نەفەسیو نالە نالو ئازارێکی هەمە جۆر دەبن، هەتا هەتایە ئەو سزایەیان بەردەوامە تا ئاسمانو زەوی تایبەتی ئەو دونیایە بەردەوام بن سزاو ئازاری ئەمانیش بەردەوامە مەگەر ویستی خودای تۆ وابێ کە برێك لەو دۆزەخیانە رزگار بکا چونکە خودا بۆخۆی چی بوێو ویستی چۆن بێ ئەوە دەکا!

بەکورتی هەرکەسێك سەرنج بداتە باسی رۆژی رەستاخیز لەقورئان داو ئەو نهێنیو شتە پەنامەکیانە کە لە خۆی گرتون. دەربارەی ئەو دیوی سروشت هەرگیز بڕوا ناکاو بە خەیاڵیا نایێ کە ئەو قورئانە زادەی عەقڵی ئادەمیزاد بێ، چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) چەندێك خەیاڵ فراوان بێو زانابێ ناتوانێ کە ئەم سەر گوزشتەو خەبەرە چەسپێنراوانە بێنێ کە هەموویان بەڵگەی عەقڵیو بەهێز پاڵپشتیان دەکا، ئەو روداوو سەر گوزەشتانەی کە دەیان گێڕێتەوە هەر کە دەیان بیسین هەست بەوە دەکەین کە قسەی ئادەمیزاد نین، بەڵکوو سروشو نیگای خودایەو ناردویەتی بۆ حەزرەتی محمد (درودی خوای لەسەر بێ). تابڕێ نهێنی ئەو دونیای بۆ روون بێتەوە بۆ ئەوەی بە کردەوەی چاكو باش خۆی بۆ حازر بکا.

## بەشی حەوتەم:

# بڕوا بە فریشتە (الإيمان بالملائكة)

**مەبەست لە هەبوونی بڕوا بە فریشتە - راستیو چۆنیەتی فریشتە - سروشتی فریشتە - کردەوەی فریشتە - فریشتەکان تکاو شەفاعەت دەکەن بۆ موسوڵمانانو داوای لێ خۆش بوونیان بۆ دەکەن - فریشتەکان کردەوەی ئادەمیزاد دەنووسن.**

## مەبەست لە هەبوونی بڕوا بە فریشتە:

بڕوا بە فریشتە سەردەکێشێ بۆ ئەوەی بڕوا بکەی بەوەی کە ئادەمیزاد ژیانێکی گیانیشی هەیە پێویستە ئەم ژیانە گەشەی پێ بدرێو ویستەمەنیەکانی دابین بکرێ، تا مرۆڤ لە خێرو بێری ئەو ژیانە کەڵك وەرگرێ، مەبەستو غەرەزیش لێرەدا بەرزکردنەوەی مرۆڤە کە ئایینی ئیسلام بڕوای فریشتەی کردوە بە کۆمەڵێك لە بناخەی ئایینی ئیسلام.

**{آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ – سورة البقرة/ ٢٨٥}:**

واتە: پێغەمبەر بڕوای تەواوی بەو پەیامە مەزنە هەیە کە لە خودای خۆیەوەو بۆی هاتووە، بۆیە تێکەڵاوی خوێنو مۆخی بووە، هەروا موسوڵمانانیش لە سایەی خوداوە گشت لایەکیان باوەڕی ساغیان بە خوداو بە فریشتەی خوداو کتێبی خوداو پێغەمبەرانی خودا هەیە.

## راستیی چۆنیەتی فریشتەکان (حقيقة الملائكة):

قورئانی پیرۆز چەند جارێك ئەوەی روون کردۆتەوە کە ئادەمیزاد لە گڵ دروست کراوە هەروەها جندۆکە لە ئاگر دروست کراون کەچی هیچ باسی دروست کردنی فریشتەی نەکردوە، بەڵام لە پێغەمبەرەوە بیستراوە فەرموویەتی: **{خلقت الملائكة من نور وخلق الجن من مارج من نار – رواه مسلم}.**

واتە: فریشتە لە نورو روناکی دروست کراون (جان)ی باوکی نەوعی جنۆکەی لە بلێسەی ئاگری سووری بێ دوکەڵ دروست کردوە لەمەوە بۆمان روون دەبێتەوە کە فریشتە عالەمێکی ناسكو نادیارن بە هەستە ئاساییەکان هەستیان پێ نـاکرێ. فریشتەکان هەرچەندە بەچاوی ئاسایی ئێمە نایان بینین بەڵام عـەقڵ نـەبوونیان ناسەلمێنێو دان بە هەبوونیاندا دەنێ زانایانیش ئەمڕۆ ئیددیعای ئەوە ناکەن کە ئادەمیزاد هەموو شتێکی کەشف کردوەو هەموو شتێك دەزانێ چونکە لـە هـەموو رۆژێکا زانیـاری شـتێکی نـەزانراوی تـازە دەخاتـە روو کـە لـەوەپێش ئێمـە نـەمان زانیوە، دەی باشە دەتوانین بڵێین ئەم شتانە پێش پێ زانینیان نـەبوو بـوون دوای کەشف کردنیان پەیدا بوون؟! دیارە شتی وا وەڵامەکەی هەر (نەء)ە.

## سروشتو کردەوەی فریشتەکان (طبیعة الملائكة وأعمالها):

سروشـتی فریـشتە جیـاوازە لـە سروشـتی ئـادەمیزاد لـەم رووەوە کـە فریـشتە هێزی ئیختیاری نیە، بەڵکوو شێوەیەکی تایبەتی پـێ سـپێرراوە نابـێ لـەو رێبـازە بــە مــوو لابــدا، سروشتیــشی وا دروســت کــراوە کــە هــەردەم گــەردن کــەچو فەرمانبەردار بێ نەك سەرپێچیکەرو گوێ پێ نەدەربێ.

پەروەردگار دەربارەی فریشتە فەرموویەتی: {وَلِلّهِ يَسْجُدُ مَا فِـي الـسَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مِن دَآبَّةٍ وَالْمَلآئِكَةُ وَهُمْ لاَ يَسْتَكْبِرُونَ يَخَافُونَ رَبَّهُـم مِّـن فَـوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ — سورة النحل/ ٤٩-٥٠}:

واتە: چی لە ئاسماندایە هەر هەموویانو چی لە زەویدا لە پێڕۆکەو خشۆكو باڵندە هەموویان سوجدە دەبەن بۆ خوداو گەردن کەچی دەنوێنن فریـشتەکانیش هـەر هـەموویان فەرمانبـەردارنو گـەردن کـەچو لـە ئـەمرو ئیطاعـەی خـودادانو هەرگیز تەکببوروخۆ بە زل زانییان لێ رەچاو ناکرێ دەترسـن لـە خـودای گـەورەو بە دەسەڵاتی باڵا دەسـتیانو هەرچـی پێیـان بگـوترێ تـەنفیزی دەکـەنو بـە جێـی دەهێنن!!

دیــاری تــرین‌و گــرینگترین ئــیش‌و کــاری فریــشتە بریتییــە لــە هێنــان‌و ڕاگەیاندنی سروش لە خوداوە بۆ پێغەمبەران.

قورئان دەفەرموێ: {الْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ جَاعِلِ الْمَلَائِكَةِ رُسُلًا أُولِي أَجْنِحَةٍ مَّثْنَى وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ يَزِيدُ فِي الْخَلْقِ مَا يَشَاء إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ - سورة فاطر/ ١}:

واتە: هەرچی سوپاس هەیە بۆ یەزدانی پاکە، کە لە نەبوون ئەم بونەوەرە سەیرو بێ مانەندەی بە ئاسمان‌و بە زەوییەوە دروست کردوەو فریشتەیشی کردوە بە پەیام بەرانی خۆی بۆ لای پێغەمبەرانی، کە حاڵیان وایە باڵیان دوو دوو، یا سێ سێ، یا چوار یان زیاترە، هەمیشە خودا لە دروست کراوانی خۆی هی نوێ دروست دەکا چونکە خودا تەوانای هەموو شتێکی هەیەو هیچی لە دەست دەرناچێ.

پەروەردگار بەم ئایەتە ئەوەمان پێ ڕادەگەیەنێ کە فریشتەکانی کردوون بە ناوبەندو واسیتە لە بەینی زاتی خۆی‌و پێغەمبەرەکانیدا سروشی خودا دەهێنن‌و پێیان ڕادەگەیەنین. پێویستە ئەوەش بزانین کە باڵ لە عالەمی ماددەدا ئامێری هەڵفڕین‌و بە حەوادا ڕۆیشتنە، زۆری باڵ ئاماژەیە بۆ تیژ ڕەوی. بەڵام لە عالەمی ئەرواحدا نیشانەیە بۆ بەهێزی‌و گورج‌و گۆڵی‌و جێ بەجێ کردنی فەرمانی خودا بە زووی.

قورئان دەفەرموێ: {يُنَزِّلُ الْمَلآئِكَةَ بِالْرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِ عَلَى مَن يَشَاء مِنْ عِبَادِهِ أَنْ أَنذِرُواْ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنَاْ فَاتَّقُونِ – سورة النحل/ ٢}:

واتــە: پــەروەردگار فریــشتە دەنێرێتــە خــوارێ بــە سروشــی تایبــەتی خــۆی فەرمان‌و ویستی خۆی تیا ڕوون دەکاتەوە بۆ کەسێك کە خۆی بە شایانی سروشی بزانــێ... پوختــەو پاڵفتــەی سروشــەکەش برێتییــە لــەوە ئــەو پێغەمبەرانــە گەلەکانیان بترسێنن لە سزای خوداو پێیان ڕابگەیەنن کە هیچ خودایەکی ڕاست‌و

حەق نیە جگە لە خۆم بەولاوە! دەی کەوابوو با خەڵك خۆ لە سزای بە ئێشم بپارێزن‌و تاعەت‌و گەردن کەچی تەواوم بۆ بکەن!

شایەنی باسە کە لێرەدا وشەی (روح) بە مانا سروشە بۆیەش پەروەردگار سروشی بە (روح) شوبهاندووە چونکە سروش ویجدان بە ئاگا دێنێتەوە، گەل‌و هۆزو کۆمەڵ لە خەوی بێ هۆشی بێدار دەکاتەوە! هەروەکوو چۆن (روح) لاشە زیندوو دەکاتەوە. ئەوەش لە یاد نەکەین کە لە قورئاندا هاتووە ئەو فریشتەیەی هاتووە بۆ لای حەزرەتی محمد (دروودی خوای لەسەر بێ)و قورئانی بە سروش بۆ هێناوە ناوی جیبریلە.

{قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللّهِ – سورة البقرة/ ٩٧}:

واتە: ئەی پێغەمبەر بەو کافرانە بڵێ: هەر کەسێك دوژمنی جوبرائیلە با لە ورگی خۆی بداو چی لە دەست دێ با بیکا، چونکە بە راستی جوبرائیل بوو لە خوداوە سروشی هێناو خستیە دڵی تۆوە! جوبرائیل لە قورئاندا بەناوی (الروح الأمین) گیانی هێمن‌و بە ناوی (روح القدس) واتە گیانی پاك، هاتووە پەروەردگار بە حەزرەتی محمد (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ:

{وَإِنَّهُ لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ – سورة الشعراء/ ١٩٢-١٩٤}:

واتە: قورئان نێردراوی پەروەردگاری بونەوەرە (روح الأمین) هێناوییەتە خوارێ بۆ سەر دڵی تۆ تا ببیتە ترسێنەری خەڵك. یان دەفەرموێ:

{قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ الْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِالْحَقِّ – سورة النحل/ ١٠٢}:

واتە: بڵێ قورئان روحولقودس لە خوداوە هێناویەتی، راست‌و دروست‌و بێ غەل‌و غەشە.

برێ لە ئەرکی سەر شانی فریشتە دڵنەوایی کردنی پێغەمبەرانە هەروەها یارمەتی دانیان‌و بەهانا چونیانەوەیە لە کاتی تەنگانەو سەخڵەتیدا بۆ دڵ

دانەوەیان، وەك ئەوە پەروەردگار جوبرائیلی نارد بۆ بەهانا چوونی حەزرەتی عیساو پالپشت کردنی.

خودا دەفەرموێ: {آتَيْنَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ الْبَيِّنَاتِ وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ – سورة البقرة/ ٨٧}:

واتە: عیسای کوڕی مەریەم موعجیزەو بەڵگەی ئاشکرامان دایە لەسەر راستی پێغەمبەرایەتیەکەی، بەهۆی روحولقودسەوە یارمەتیمان داو پشتگیریمان کرد.

فریشتە دێنە خوارێ بۆ سەر دڵی موسوڵمانانو دڵنەواییان دەکەنو موژدەیان بەسەر کەوتنی دونیاو خەنی بوونیان بەهەشت دەدەنێ.

{إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ - سورة فصلت/ ٣٠-٣١ }:

واتە: ئەو خودا پێداوانەی دەڵێن: خودای ئێمە یەزدانی پاکەو ئەمجار بەردەوام دەبن لەسەر عەقیدەو بیرو باوەڕی راستی خۆیان، فریشتەی رەحمەت دادەبارێن بە سەریاندا، لە کاتی سەرە مەرگاو لە کاتی خستنە ناو گۆڕداو لە کاتی زیندوو بوونەوەدا پێیان دەفەرمون: ترستان نەبێ، نەترسی لەمەو دواتان هەبێ نەخەمی ماڵو منداڵتان هەبێو موژدەی چوونە بەهەشتتان لێ بێ لەگەڵ ئەو هەموو نازو بەهرەیەی کە باس کراوە بۆتان، لە هەردوو جیهاندا، خۆمان خاوەنتانینو کەسێکیش خودا خاوەنی بێ هەوەجێی بە کەسی تر نابێ.

ئەرکێکی تری فریشتەکان ئەوەیە کە خودای پەروەردگار دەیانکاتە یارمەتیدەری موسوڵمانان لە کاتی شەڕ لەگەڵ دوژمنیان تا موسوڵمانان بتوانن بەسەر دوژمنیاندا زاڵ بین.

{إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُرْدِفِينَ وَمَا جَعَلَهُ اللّهُ إِلاَّ بُشْرَى وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِ قُلُوبُكُمْ وَمَا النَّصْرُ إِلاَّ مِنْ عِندِ اللّهِ - سورة الأنفال/ ٩-١٠}:

واتە: بیری ئەو ڕۆژە بکەنەوە کە ئێوە هاوارتان لە خودا دەکردو دەپاڕانەوە کە یارمەتیتان بداو کۆمەکیتان پێبکا، پەروەردگاریش داواکەی پەسەند کردن‌و وەڵامی دانەوە فەرمووی: یارمەتیتان دەدەم بە هەزار فریشتە یەك بە دوای یەکدا دێنە فریاتان! ئەمەش بۆ مزگێنی‌و دڵنەوایی ئێوە بوو، تا دڵتان ئارام بگرێ‌و دڵنیابن، ئەگینا یارمەتی لە ڕاستیدا هەر لای خودا خۆیەتی‌و حەوێجە بە کەسی تر ناکا.

فریشتە گیانی موسوڵمانان وەردەگرنەوەو دەیان مرێنن، {الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلآئِكَةُ طَيِّبِينَ يَقُولُونَ سَلامٌ عَلَيْكُمُ ادْخُلُواْ الْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ - سورة النحل/ ٣٢}:

واتە: ئەو کەسانەی فریشتە گیانیان دەکێشێ‌و ئیمان‌و باوەڕێکی ڕێك‌و پێکیان هەبووەو خودا پەرستی بە ڕاستی بوون پێیان دەڵێن: سڵاوی خوداتان لێ بێ، فەرموون بچنە بەهەشتەوە لە پاداشی کردەوەی چاك‌و ئیشی باشتاندا. هەروەها ئەوانەی کە ستەمیان لە خودی خۆیان کردوە سەر پێچی فەمانی خودایان کردوە هەر فریشتە گیانیان دەکێشن‌و دەیان مرێنن.

{الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ - سور النحل/ ٢٨}:

پێغەمبەرەکان‌و زاناکان، کە خودا زانستی بە سوودی پێ بەخشیون دەفەرموون: بە ڕاستی ئەمڕۆ تەریقی‌و ڕوو ڕەشی بۆ ئەو کافرانەیە کە کاتێ فریشتەکان گیانیان کێشان زوڵم‌و زۆرو ستەمەکی ئەوتۆیان لە خۆیان کردبوو بە هۆی مانەوەی ئێجگارییان لە دۆزەخا.

## فریشتەکان شەفاعەت خوازن‌و داوای لێخۆش بوون بۆ موسوڵمانان دەکەن (الملائكة تشفع وتستغفر للمؤمنين)

قورئانی پیرۆز ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە فریشتەکان شەفاعەت خوازن بۆ موسوڵمانان‌و شەفاعەتەکەشیان پێویستی بە ئیزن‌و رەزامەندی پەروەردگار هەیە.

{وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ لَا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا إِلَّا مِن بَعْدِ أَن يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَن يَشَاءُ وَيَرْضَى - سورة النجم/ ٢٦}:

واتە: چەند لەو فریشتانە لە ئاسمانەکاندا هەن لەگەڵ ئەو هەموو رێزو نرخەی لای خودا هەیانە هێشتا شەفاعەتیان سوودی نیەو هیچ نرخێکی نیە مەگەر خودا بۆ خۆی ئیزن بداو رازی بێ بەو شەفاعەتە.

هەروەها فریشتە داوای لێخۆش بوون دەکەن بۆ موسوڵمانان‌و لە خودا دەپارێنەوە کە ئەوان شارەزا بکا بۆ رێگای سەر فرازی‌و خۆش بەختی.

{الَّذِينَ يَحْمِلُونَ الْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا فَاغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا وَاتَّبَعُوا سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّاتِ عَدْنٍ الَّتِي وَعَدتَّهُم وَمَن صَلَحَ مِنْ آبَائِهِمْ وَأَزْوَاجِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ وَقِهِمُ السَّيِّئَاتِ وَمَن تَقِ السَّيِّئَاتِ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمْتَهُ وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ - سورة غافر/ ٧-٩} :

واتە: ئەو فریشتانەی عەرشیان وا بەشانەوەو هەڵگری عەرشن‌و ئەوانەی وان لە دەوروبەری، هەردەم خەریکی تاعەت‌و خودا پەرستین، بڕوایان بە خودا هەیەو داوای لێ خۆش بوون لە خودا دەکەن بۆ ئەوانەی موسوڵمانن، دەڵێن: پەروەردگارا! رەحمەت‌و بەزەیی‌و عیلم‌و زانست‌و زانینی تۆ هەموو شتێك دادەگرێ‌و بەشی هەموو شتێك دەکا، کەوابوو نزامان ئەوەیە کە خۆش بێ لەوانەی تۆبەیان لە گوناح کردوە، شوێن رێبازی راستاڵ‌و پیاو چاکانی تر کەوتوون، لە سزای دۆزەخ بیانپارێزە!! پەروەردگارا! بیانخەرە نێو باخی بەهەشت

ئەو بەهەشتەی خۆت پەیمانت داونێ پەیمانت داوە بە خۆیان بەوانەش کە راستاڵن لە باوکو باپیریان لە ژنو منداڵیان بە راستی زاتی تۆ زاتێکی بە تواناو کارامەیە، پەروەردگارا! هەموو ئەوانە بپارێزە لە تەنگو چەڵەمەو ناخۆشیی ئەو رۆژە سەختە جا خۆ کەسێك تۆ لە ناخۆشی ئەو رۆژە بیپارێزی ئەوە بێگومان رەحمت پێ کردوەو بە مراد گەییشتنێکی گەلێ مەزنە. تکاکاری فریشتەو داوای لێ خۆشبوونی پەروەردگار بۆ موسوڵمانانو دوعاو نزاکردنیان لە خودا بۆیان ئەمانە هەموو ئاماژەیە بۆ ئەوە کە موسوڵمانان بۆ خۆیان رێگای راست بگرنو بەرەو پێشکەوتنو سەرکەوتن هەنگاو بنێنو ئەو رێگا راستە بگرن کە لە تاریکیو نەزانی کوفرەوە دەریان دەهێنیو دەیانخاتە ناو نورو روناکی باوەڕەوە.

## فریشتەکان کردەوەی ئادەمیزاد دەنووسن:

قورئانی پیرۆز پێمان رادەگەیەنێ کە پەروەردگار بۆ هەموو ئادەمیزادێك چەند فریشتەیەکی تەرخان کردوە کە سات بە سات کرداری ئادەمیزاد دەنووسن بۆ ئەوەی رۆژی رەستاخیز حیسابو کیتابی لەگەڵدا بکرێ.

**{وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ كِرَامًا كَاتِبِينَ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ – سورة الإنفطار/ ١٠-١٢}:**

ئەی کۆمەڵی ئادەمیزاد! خۆتان دەستە خەڕۆ مەکەنو دوای ئاواتی هیچو پووچ مەکەون، سەرمەکەنە تاوانو بڵێن: خودا کەریمەو پەنا بە کەرەمی خودا، بزانن هەمیشە فریشتەی هۆشیارو وریاو ئاگاداری ئێمە چاو دێرن بەسەرتانەوە، ئاگایان لە وردو درشتی کارتانە، ئەو فریشتە بەرێزانە نووسەری چاكو چاپووکن، چی لە دەمتان دەرچێو هەرچی دەکەن گورج دەینووسن.

**{وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ إِذْ يَتَلَقَّى الْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ - سورة ق/ ١٦-١٨}:**

واتــە: بــە راســتی ئێمــە ئادەمیزادمــان دروســت کــردوە، چــی خەتــەرەو ختووکەیەك بە دەروونیدا بێ ئێمە دەیزانین‌و ئاگامان لێیەتی، ئێمە لە رەگی لاملی ئەو مرۆڤە نزیکترین بە خۆی ئەو کاتەی کە هەردوو فریشتەی لای راستو چەپی حازرو ئامادەن بۆ ئەوەی هەرشتێکی کردوو گوت خێرا بینووسن‌و بیخەنە لاپــەڕەی کردەوەیــەوە، هــەر قــسەیەکی کــرد یــان کردارێکــی لێ رودرا خێــرا دەیقۆزنەوەو بەبێ زیادو کەم دەخرێتە نامەی ئەعمالییەوە وشەی (المتلقیان) لە دەقە قورئانییەکەدا بە مانا ئەو دوو فریشتەیەیە کە لە راستو چەپی مرۆڤدا دانیشتوون کردارو گوفتاری سەر ژمێر دەکەن. جا کاتێك مرۆڤ بزانێ کە کردارو گوفتاری ئاوا موراقەبە دەکرێو سەر ژمێر دەکرێ، بەبێ شك خۆ لە گوناح دەپارێزێ!!.

ئەمە بڕێك بوو لەو باس‌و خواسەی کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون دەربارەی جیهانی فریشتە سروشتو فەرمان‌و کرداریان لە پاڵ ئەوەش بۆمان دەردەکەوێ کە ئایینی ئیسلام هەمیشە هەوڵی ئەوەیەتی ئادەمیزاد لە چڵکی مادییەت رزگار بکا بیگەیەنێتە بەرزایی روح‌و گیان‌و جیهانی ئەو دیوی مادده کە بە ئاشکرا ئەوە دەچەسپێنێ کەئەم ئایینە لە خواوەیەو پێغەمبەر بۆ ئێمەی هێناوە.

## بەشی هەشتەم:
## بڕوا بە نامە ئاسمانییەکان (الإيمان بكتب الله)

**پێویستی بڕوا بە نامە ئاسمانییەکان کە خودا ناردوونی - قورئانی پیرۆز ناوەڕۆکی کتێبە ئاسمانییەکانی پێشوو دەچەسپێنێ - قورئـان ئـەو راستییەیە کە خەڵـك لێی هەڵـە بـوون - تێڕوانین بۆ تەورات لە نیگای قورئانەوە - تێڕوانین بۆ ئینجیلەکان لە نیگای قورئانەوە.**

### پێویستی بڕوا بە نامە خوداییەکان:

بڕوا هێنان بە نامە ئاسمانیەکان پایەیەکە لە پایەکانی موسوڵمان، لەم ڕوەوە کە هەرچی فەرمانی خودا هەیە بە هۆی پێغەمبەرانەوە نێردراوە بۆ گەلانی سەر زەوی، ئەم نامانـە لـە خۆیـان گرتـووە، هـەروەها بـڕوای بـە کتێبـە ئاسمانییـەکانی تریش هەبێ کە نێردراون بۆ پێغەمبەرەکانی گەلانی رابوردو، بڕێ لە ئایەتەکانی قورئــانی پــیرۆز ئــەوەی چەســپاندووە کــە پێویــستی ســەر شــانی پێغەمبــەرو گەلەکەیەتی کەئیمان بێنو بڕوایان هەبێ بەهەموو کتێبە نێردراوەکانی خودایی بۆسەر پێغەمبەرانی ڕابوردو {آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ} سورة البقرة (٢٨٥)[١].

ئەمجار پەروەردگار لەچەند شوێنی تـری قورئـانی پـیرۆزدا، نـاوی ئـەم نامـە نێردراوانە (تەورات کە بۆ حەزرەتی موسا هاتووە ئینجیل کە بۆ حـەزرەتی عیـسا نێـردراوە زەبـوور کـە بـۆ حـەزرەتی داوود نێـردراوە صـوحوف کـە بـۆ حـەزرەتی ئیبراهیم نێردراوە) هێناوەو باسیان دەکا!.

### قورئانی پیرۆز ددان بەناوەڕۆکی نامە ئاسمانییەکانی پێش خـۆی دا دەنێ (القرآن مصدق لما سبقه من الكتب الإلهية):

ئەو پەیوەندییەی کە ئایینی ئیسلام دەبەستێتەوە بـە ئایینـە ئاسمانییـەکانی ترەوە لە بنەڕەتو شێوە سەرەتاییەکەی دا پەیوەندی تەصدیق پاڵپشت کردنێکی

---

[١] تەرجەماکەی لەباسی بڕوا بە فریشتەدا رابوورد.

سەرومرە لە شێوە ئێستاییەکەی دا تەصدیقە بۆ ئەو بەشە بنەڕەتیانەی کە خێرو بێری ئادەمیزادی تێدایەو پوختەکردنی ئەو ئایینانەیە لەهەموو بیدعەتو شتە نامۆییەکانی کە بەناحەق پاڵ ئەو ئایینانە دراون... خودا بەپێغەمبەری خۆی دەفەرموێ:

**{وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ عَمَّا جَاءكَ مِنَ الْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا} سورة المائدة (٤٨).**

واتە ئەی پێغەمبەر ئێمە پەراوێکمان بۆ ناردووی کە قورئانە تەصدیقی هەموو نامە ئاسمانییە کانی پێش خۆی دەکا وەکوو تەوراتو ئینجیلو زەبوورو صوحوف، سوارە بەسەر هەموان داو چاودێریانە بەسەریانەوە، شایەتە بەڕاستیو دروستییان، کەوابوو ئەی پێغەمبەر تۆ حوکم بکە لەنێوان جولەکەو گاورەکان دابەپێی ئەو کتێبەی بۆت نێردراوە، شوێن هەواو هەوەسی ئەوان مەکەوە، ئێمە بۆ هەموو گەلو هۆزێك شەریعەتو یاسایەکمان داناوە، فەرمانمان پێ کردوون بە پەیڕەوی کردنی، وەلێ جیاوازی نێوان ڕێبازو دەستوورەکانی نێوان ئەو ئایینانە کە هەبێ تەنیا لەبڕی کردارو گوفتاری تایبەتی داو لەبەجێ هێنانی بڕێ فرمانو ئەنجام دانی پێداویستییە ئایینەکان دابووەو بەس، ئەوەش بەمەبەستی تایبەتیو بەگوێرەی پێداویستی دەروونو ڕامکردنیان بۆ خودا پەرستی بووە، چونکە پرۆگرامی کردار ئامێزو ڕێبازەکانی پاڵفتەکردنی دەروون لەڕەگو ڕیشەی کوفر هەمەچەشنو جۆراوجۆرنو بەگوێرەی گۆڕانو جیایی کۆمەڵو دەورو بەرو ڕێژەی ئامادەبوونی دەروونی تاکەکانی کۆمەڵ دەگۆڕێنو ئەم دیوو ئەو دیو دەکرێن، ئەو ڕێبازەی بۆ کۆمەڵی فلان سەردەم باش بێ بەکەڵکی کۆمەڵێکی تری سەردەمێکی تر نایە! بۆیە دەبینن بڕی ئایین شێوەی ڕێبازی کڕینو فرۆشتنی جیاوازە لەگەڵ شێوەی ڕێبازی کڕینو فرۆشتنی ئاینێکی تر، هەروەها چونیەتیو ڕێبازی ژنو ژن خوازی ئەم ئایین لەگەڵ هی ئەو ئایین لەبڕێ وردەبابەت دا جیاوازی لەگەڵ هی ئاینێکی تر هەیە، هەروەها لەشێوەی کەفارەتو پاساو دانەوەی گوناح دا.

بەلام ئەوەی کەهەموو ئایینەکان لەسەری کۆبوونەوەو بڕوایان پێیەتیو داکۆکی لەسەر دەکەن خودا بەیەك ناسینەو ئیخلاصی تەواو بۆیو یاسا ڕەوشتییە بەرزەکان وەکوو ڕاستگۆییو وەفاو بەبەزەیی... هتد. ئەم شتانە هەموو ئایینەکان لەسەری یەکنو یەکدیگرنو بڕوایان پێ یەتی.

## قورئان ئەو ڕاستییەیە خەلك لێی هەلەبوون :

ڕۆژگارێکی دورو درێژ بەسەر هاتنە خوارەوەی نامە ئاسمانییەکان دا تێپەڕ بوو بوو، زوربەی ئایەتەکانیان دەستییان تێومردرابوو، زۆر گۆڕانکارییان تێدا ئەنجام درابوو، زۆر شوێنیان بەهەلە ڕاڤە کرابونو خرابوونە مێشکی خەلکییەوە، جیاوازی نێوان ئەو ئایینانە گەیشتبووە ئەوپەڕی شێوانو تێکدان، ئادەمیزاد کەوتبووە تەنگو چەلەمەیەکی دژوارەوە کەنزیك بوو بەتەواوی لەدینی خودا دەرچنو سەرجەم بکەونە ناو ئیلحادو بێ ئایینیو بتپەرستییەوە. عالەم وای لێ هاتبوو کەزۆر پێویستیان بەوە هەبوو سروشێکی خودایی بێو ببێتە ڕەهنومایانو لەسەر شێواویو گومڕایی ڕزگاریان بکاو ڕێگای ڕاستییان پێ نیشان بدا، ئەوانەی خاوەن نامە بوون (ئەهلی کیتاب بوون) هەریەکەیان لایەکەی تریانی بەکافر دەزانی خۆیان نەبێ، لەبارەی ناسینی خوداو چونیەتی ئایینەوە کەوتبوونە ناکۆکییەکی ئەستەمەوە! ئالەم کاتەدا قورئان هات حەقو ناحەقی لێك جیا کردەوە، زۆر گرێ کوێرکەی بۆ کردنەوە ڕێبازی ژیانی بۆ ڕون کردنەوە لەم بارەوە خودا دەفەرموێ:

{تَاللّهِ لَقَدْ أَرْسَلْنَا إِلَى أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ الْيَوْمَ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ، وَمَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ إِلاَّ لِتُبَيِّنَ لَهُمُ الَّذِي اخْتَلَفُواْ فِيهِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ} سورة النحل (٦٣-٦٤).

واتە سوێند بەخودا ئێمە لەپێش تۆدا ئەی پێغەمبەر زۆر فورستادەو پێغەمبەری ترمان بۆلای گەلان ناردوون، ڕێگای ڕاستو دروستیان بۆ ڕون

کردونەوە، بەلاّم مرۆکان پاش ماوەیێ ئایینی خودایان لەبیر چۆتەوە، شەیتان کردەوەی ناشیرینی خۆیانی لەپێش چاو جوان کردوون، ئەمڕۆش هەر ئەو ڕابەرو پێشەوایانە بەم بۆنەوە سزایەکی بەئێشیان بۆ ئامادە کراوە! ئێستاش کە تۆمان کردوە بە پێغەمبەرو قورئانمان بۆ ناردووی، هەر بۆیەمان بۆ ناردوی کە کێشەو نیزاعی نێوان ئەو خەڵکەی پێ حەل بکەی‌و ڕێگای ڕاستییان پێ نیشان بدەی، زیاد لەوەش قورئان چرای ڕوناکییە بۆ نەشارەزایان ڕەحمەتە بۆ کەسانێك کە ئیمانی پێ بهێنن!!.

## تەورات لەنیگای قورئانەوە (نظرة القرآن للتوراة):

وشەی تەورات وشەیەکی عیبرییەو کراوە بەعەرەبی ماناکەشی بەزمانی عیبری واتە ڕێبازو شەریعەت، جا هەر چەندە لەقورئاندا ئەسفار (پەڕاوەکانی) تەورات دەست نیشان نەکراون‌و بەتەواوی شی نەکراونەتەوە، بەلاّم لەزۆر شوێن دا لەقورئان دا کە ناوی دێ لەگەڵ موسادا ناوی دێ لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین مەبەست لەتەورات ئەو پێنج پەراو (سفر)انە یە کە نێردراوە بۆ موسا ئەو پێنجانەش بەگوێرەی ڕای زانا کۆنەکانی عیبری بریتین لە (سفر التكوين) و (الخروج) و(اللاويين) و(العدد) و(التثنية) دوایی عیبرانییەکان وایان لێ هات وشەی تەورات بەکاربێنن بۆ هەموو ئەو ئەسفارانەی کە پێیان دەگوترێ (العهد القديم)..

قورئانی پیرۆز شایەتی ئەوەدەدا کە خودای پەروەردگار (پێش نازڵ بوونی قورئان) تەورات‌و ئینجیلی بەمەبەستی ڕزگار کردنی مەردوم لەگومرایی ناردوونە خوارێ، ئەوەتا لەسورەتی (آل عمران)دا ئایەتی سێیەم دەفەرموێ:

{اللّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ، نَزَّلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنزَلَ التَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ، مِن قَبْلُ هُدًى لِّلنَّاسِ}.

واتـە پـەروەردگار خودایـەکی وەهایـە هەرچـی سـیفاتی چاکەو کـار دروسـتی هەیە تێیدایـە، هـیچ خـودای ڕاسـتو دروسـت نـین (جگـە لـەو) زینـدوەو هـەرگیز نامرێ.

ڕاگری بوونەوەرە بەئارەزوی خـۆی هـەڵی دەسـووڕێنێ! ئـەی پێغەمبـەر! ئـەو خودا بەتوانایە قورئانی بۆ ناردووی قورئانێکی حەق ئامێزی واڕاستی ئایینەکانی پـێش خـۆی دەردەخـا، هـەروەکوو چـۆن لـەوەپێش (بەمەبەسـتی ڕەهنومـاکردنی مەردوم) تەوراتو ئینجیلی ناردونە خوارێ.

قورئـانی پـیرۆز گەلـێ جـار ئـەرکی ڕەخنـەگرتنی لەتـەورات لـەخۆ گرتـووە، ئـەوەی چەسـپاندوە کـە شـوێن کـەوتوانی تـەورات زۆریـان لەدەقـە ئەصـڵییەکە گۆڕیـوەو حـوکمو فەرمانـەکانی گۆڕانکارییـان تێـداکراوە، ماڵـەکانیان بـەئارەزووی خۆیان دەستکارییان کردوە خودا دەفەرموێ:

**{مِّنَ الَّذِينَ هَادُواْ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ} سورة النساء (٤٦).**

واتە: بڕێ لەو جولەکانە فەرمایشتی تەورات دەگۆڕنو لەمەبەستی خـۆی لای دەدەنو بەهەڵـەو گـەڕاوی و تـاقۆڵایی دەیخەنـە ڕوو!! لەمـەوە ئـەوەمان بـۆ ڕون دەبێـەوە کە جولەکـە گـەلێك بـوون فەرمایـشتی تـەوراتیان گۆڕیـوە، وەکـوو خـۆی نەیان خستۆتە ڕوو، ئەمەش بەچەند شێوەیەك بووە:

١. فەرمایـشتێك ڕاڤـە بکـرێ بـەواتاو مانایـەك کەلـە بنـەڕەت دا ئـەو مانایـە نەگرێتەوە.

٢. بڕێ وشەو ڕستەی لێ هۆن بکرێو ژێر لێو بخرێ.

٣. هێندێ وشەو ڕستەی لێ زیاد بکرێ.

٤. بـڕێ فـەرمانو ئـەحکامی لـەبیر چـوبێتەوە بـەهۆی کـۆنیو درێـژەوە بـوونی ڕۆژگارو ئەوچەوسانەوەی کەلەمێژوودا توشیان بووە.

لەم بارەوە قورئان دەفەرموێ: **{يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ وَنَسُواْ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِ} سورة المائدة (١٣).**

واتە: بەشێکی زۆریان لەتەورات لەبیر چۆتەوە!

یان دەفەرموێ: {أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُدْعَوْنَ إِلَى كِتَابِ اللّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ} سورة آل عمران (٢٣).

خۆزگە بەچاوێکی هوشیارانە سەرنجێکی وردی ئەو خاوەن بەش و بارانەت لەنامەی خودا، دەدا کە چۆن کاتێ پێغەمبەری ئێمە بانگیان دەکا بۆ سەر حوکم و فەرمان کردن بەنامەی خودا کە قورئان و تەوراتە، ئەوان دەستە دەستە هەڵ دەتیزێنن و لەهەق لووتەلا دەبن! لەمە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کەئەو حوکم و فەرمایشتە ئاسمانییەیانەی لای جولەکەکان هەیە بەشێکە لە فەرمایشتەکانی خودا نەك هەمووی.. هەروا جارێکی تر قورئان ئەوە ئاشکرا دەکا کە جولەکەکان زۆر بەندو بنەماو ئەصڵ و فەصڵی ئایینی خۆیان شاردۆتەوە {يَا أَهْلَ الْكِتَابِ قَدْ جَاءكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيرًا مِّمَّا كُنتُمْ تُخْفُونَ مِنَ الْكِتَابِ وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ} سورة المائدة (١٥).

ئەو مەسئەلەو باس و خواسانەی دەیان شاردەوەو گۆڕانکارییان تێدا دەکرد ناونیشان و ڕەوشتی پێغەمبەر (حەزرەتی موحەممەد) و مژدەو بەڵێنی هاتنی بوون، هەروەها باس و خواسی حیساب و سزاو قەبرو قیامەت و خۆشی و ناخۆشی ئەو دونیا بوو! تەنانەت هەموو تەوراتی ئەمڕۆ بگەڕێی باسی لێپرسینەوەو حیساب و کیتابی ڕۆژی ژینەوە نابینی! ئاشکراشە کە بڕوا بەڕۆژی ڕەستاخیزو حیساب و کیتابی ئەو دونیا لایەنێکی گرنگی باوەڕو ئیمانە!!

## ئینجیلەکان لەنیگای قورئانەوە (نظرة القرآن للإنجيل):

لەدوای حەزرەتی مەسیح چەند جۆرە ئینجیلێك هاتە کایەوە هەرچی ڕاست دەبووەوە ئینجیلێکی دەهێنایە کایەوە، مێژوو نووسەکانی ئایینی مەسیحی ئەم ڕاستییەیان چەسپاندوە، دوایی کەنیسە لەسەرەتای سەدەی چوارەمی زایینی دا ویستی بژارێکی ئینجیلەکان بکاو چەند ئینجیلێکی بڕوا پێ کراو بخاتە بەردەست، لەئاکاما ئەم چوار ئینجیلەی هەڵبژارد ئینجیلی مەتێ، ئینجیلی مەرقس، ئینجیلی لوقا، ئینجیلی یوحەننا.

قورئانی پیرۆز ئیعتراف بە برێ سەر گوزەشتەو ڕەستەو باس‌و خواسی ناو ئەو ئینجیلانە ناکاو دان بەوەدا نانێ کەئەمانە لەلایەن خوداوە نێردرابن. چونکە پەروەردگار تاقە ئینجیلێکی یەك شێوەی ناردووە بۆ حەزرەتی عیسا، ئەو ئینجیلانەی لەدوایی دا نووسراوەنەوە جیاوازن‌و لەگەڵ ناوەرۆکی ئینجیلەکەی بۆ عیسا هاتووە یەك ناگرنەوە خودای مەزن دەفەرموێ:

{وَقَفَّيْنَا عَلَى آثَارِهِم بِعَيسَى ابْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَاةِ وَآتَيْنَاهُ الإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ} سورة المائدة (٤٦).

دوا بەدوای ئەو پێغەمبەرە نازدارانە، هەر لەسەر هێڵی ڕێبازی شیرینی ئەوان عیسای کوڕی مەریەممان ناردو کردمان بە پێغەمبەر بۆسەر نەوەی ئیسرائیل باوەڕی تەواوی بە تەورات هەبوو کەلە پێش ئەوەوە خودا ناردبووی بۆ مووسا، خەڵاتی ئینجیلیشمان بەعیسا بەخشی کە چرایەکی رۆشنکەرەوەی ڕێگەی هەردوو ژینی هەردوو جیهان بوو، مایەی شارەزا بوونی ڕێگەی ڕاست بوو.

لەلایەکی ترەوە قورئانی پیرۆز ئەوە دەچەسپێنێ کە مەسیحییەکان بەشێکی زۆریان لەناوەرۆکی ئینجیل لەبیرچۆتەوە، خودا دەفەرموێ:

{وَمِنَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّا نَصَارَى أَخَذْنَا مِيثَاقَهُمْ فَنَسُواْ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِ فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَسَوْفَ يُنَبِّئُهُمُ اللّهُ بِمَا كَانُواْ يَصْنَعُونَ} سورة المائدة (١٤).

واتە بەشێك لەوانەی کەخۆیان بەمەسیحی دادەنا عەهدو پەیمانمان لێ وەرگرتن کە بڕوایان بەخودا هەبێ‌و ئیمان بەفریشتەو پێغەمبەرەکانی تر بێنن‌و کردارو ڕەفتاریان باش بێ‌و کەچی بەشێکی زۆریان ئەو عەهدو پەیمانانەیان لەبیر خۆبردەوە، یاسای ئینجیلیان ژێر لێوداو ئێمەیش لەسزای ئەوەدا بەش بەش‌و گرۆ گرۆمان کردن‌و دوژمنایەتیمان خستە ناویانەوەو هەر تاقمەی چەقۆ لەتاقمەکەی تریان دەسون‌و تارۆژی ڕەستاخیز خێرو خۆشی‌و ئەمن‌و ئاسایش ناچێژن ئەو کاتەش پەروەردگار ئەنجامی کردارو ڕەفتارەکانیان پێ ڕادەگەیەنێ‌و چییان کردوە دەیخاتە پێش چاویان.

بەڵگە لەسەر ئەوە کەمەسیحی ئایینی خۆیان دەست لێ داوە ئەو ڕەخنە بەهێزەیە کە قورئان ئاراستەی ئایینی مەسیحی کردوە ئەو ئایینەی کەدەستی تێ وەردراوەو لەسەر ساف و بێگەردی خۆی نەماوە کە دەفەرموێ:

**{لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ وَقَالَ الْمَسِيحُ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اعْبُدُواْ اللّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ إِنَّهُ مَن يُشْرِكْ بِاللّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللّهُ عَلَيهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ، لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللّهَ ثَالِثُ ثَلاَثَةٍ وَمَا مِنْ إِلَهٍ إِلاَّ إِلَهٌ وَاحِدٌ وَإِن لَّمْ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ} سورة المائدة (٧٢-٧٣).**

واتە: بەڕاستی سەر لێ شێواو بوون و گومڕا بوون ئەوانەی پێیان وایە کەخوداو عیسای کوڕی مەریەم بوون بەیەك و بەهەردوکیان یەك خودایان لێ دروست بووە، کەئەمە باوەڕی یەعقوبییەکانە لەکاتێك دا عیسا بۆخۆی بەدەمی خۆی ڕای گەیاندووە بانگی لەهۆزی ئیسرائیل کردوەو فەرمانی پێ کردون کە عیبادەتی خودا بکەن، پێی گوتون خودا خودای من و ئێوەشە، لەڕاستی دا هەرکەسێك هاوبەش بۆ خودا پەیدا بکا خودا بەهەشتی لێ مەنع دەکاو شوێنی دۆزەخە چونکە زاڵم و زۆرداره زاڵم و زۆرداریش یارمەتدەری نییە. بەڕاستی ئەو دەستەیەش لە نەصرانییەکان کەبیرو باوەڕیان وایە گوایە خودا سێ ئەقنومی هەیە یەکێکیان خودایەو یەکێکیان عیسایەو یەکێکیان روحولقودسە. ئەم دەستەیەش لەڕەوشی ئایینی خودا دەرچوون و سەر لێ شێواوو گومڕا بوون! هیچ خودایەکی ڕاست و دروست نییە جگە لەخودای پەروەردگار خۆی! جا ئەگەر واز نەهێنن لەوبیرە پوچەڵانە، لەو کردارو گوفتارەیان ژیوان نەبنەوە ئەوە بەبێ شك ئازارێکی بەئێش توشی ئەو گومڕایانە دەبێ و لەناویان دەبا!.

## بەشی نۆیەم:

## بڕوا بەپێغەمبەران (الإيمان بالرسل)

**مەبەست لەڕەوانەکردنی پێغەمبەران - بڕواکردن بە پێغەمبەران واجبە - پێغەمبەران لەهەڵەکردن دوورن - هەموو گەلێك پێغەمبەری بۆ نێردراوە - حەزرەتی ( محمد ) (درودی خودی لەسەر بێ) نێردراوە بۆسەر هەموو عالەم - حەزرەتی موحەممەد (درودی خودی لەسەر بێ) دوا پێغەمبەرە.**

### مەبەست لە ڕەوانەکردنی پێغەمبەران (الحكمة من إرسال الرسل):

بڕواکردن بەناردنی پێغەمبەران لەلایەن پەروەردگارەوە کۆڵەکەو پایەیەکی هەرە پتەوی ئیمانو باوەڕە، کەوا بوو پێویستە لەسەر هەموو پیاوو ژنێکی موسوڵمان بڕوای هەبێ کەخودای تەعالا چەند فروستادەیەکی لەئادەمیزادکردوون بەپێغەمبەرو ناردوونی بۆ سەر مەردوم، مزگێنییان داوە بە پاداشی چاکەو خەڵکیان ترساندوە لە سزای خراپە، ئەو پێغەمبەرانە هەریەکە لەعاست خۆیەوە پێویستی سەرشانی خۆی ئەنجام داوە ڕاسپاردەی خۆیان بەگەلو هۆزی خۆیان ڕاگەیاندووە، چییان پێ گوتراوە لەتاكو تەنیایی خوداو دووری لەعەیبو خەوشو شکۆمەندی رایان گەیاندوە، هەروا دەسەڵاتی بێ پایانی بەسەر بەندەکانی دا شێکردنەوەی حوکمو فەرمانی پەروەردگار، کردنی کرداری باشو ڕام بوون لەسەر ڕەوشتی چاكو وازهێنان لەکردەوەی خراپ، باوەڕهێنان بەوە کە ئەم پێغەمبەرانە لەلایەن خوداوە نێردراون پێویستە شوێنیان بکەونو چییان گوت ئەنجام بدرێو لەهەر شتێك نەیان لێ کرد وازی لێ بهێنرێ، بڕوای تەواومان هەبێ کەئەو پێغەمبەرانە بەو پەڕی دڵسۆزییەوە کاری خۆیان ئەنجام داوە، هەروا بڕوا بەوە بکەن کە ئەم پێغەمبەرانە یارمەتدراوی خودانو لە پەروەردگارەوە کۆمەکییان پێ دەکرێ بەشێوەیەکی وا کە عەقڵی ئادەمیزاد لەوە پێش پێی ئاشنا نەبووبێ ئەم جۆرە یارمەتی دانەی خودا بۆ پێغەمبەران یان ئاشکرابوونی دیاردەی وا لەسەر دەستی ئەوان کە عەقڵی مەردووم لەوە پێش پێی ئاشنا نەبووبێ بریتییە لە موعجیزەو دەبێتە شایەد لەسەر ڕاستگۆیی پێغەمبەرەکە.

بەڵێ ڕاستەو گومانی تێدا نییە کە خودای پەروەردگار پێغەمبەرانی ناردوون هەمیشە مزگێنی دەرو ترسێنەر بوون {كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ} سورة البقرة (٢١٣).

واتە: لەسەرەتادا ئادەمیزاد هەموویان لەسەر ئاینێك بوون کە ئیسلام بوو دوایی بە درێژایی ڕۆژگارو سوڕانی چەرخ بتپەرستیو بێدینی پەیدا بوو، لەناو خەڵکا کوفرو بیرو باوەڕی جیاجیا بڵاو بوونەوە، هەبوو بڕوادار هەبوو بێ بڕواو سەر لێ شێواو ئەمجار پەروەردگار پێغەمبەرانی ناردن بۆناو کۆمەڵانی خەڵك تاموژدە بدەن بەوانەی خاوەنی باوەڕی ڕاستو کرداری باشن، بێ دینو گومڕایانیش بترسێنن لەسزای بەئێشی پەروەردگار. هەر پێغەمبەرێکیش کتێبێکی ئاسمانی تایبەتی خۆی یان هی پێغەمبەرێکی پێش خۆی پێ بووە، تا ئەو کتێبە ئاسمانییە ببێتە یاساو دەستوور بۆیانو کێشەو نیزاعی خۆیان لەرێگەی ئەو نامە ئاسمانییەوە حەل بکەن، چاکەو خراپەی کۆمەڵو ڕاستیو دروستی بیرو باوەڕیان بەتەرازووی خودا بکێشنو بۆ هەموو شتێ: بیکەن بە سەرچاوە، ئیتر ئەو پێغەمبەرانە بە درێژایی تەمەنیان ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام داوەو مژدەی خێرو خۆشی دونیاو قیامەتیان داوە بەوانەی شوێن ئایینی خودا کەوتونو دەستووری خودایان کردوە بە پرۆگرامو دەستووری ژیانی خۆیان هەروا خەڵکیان ترساندوە بەسزای بەئێشو خەسارەت مەندی دونیاو قیامەت ئەگەر شوێن هەواو هەوەسی خۆیان بکەونو پشت لە فرمانی خودا هەڵکەن!.

## بڕوا بە پێغەمبەران پێویستە (وجوب الإيمان بالرسل):

قورئانی پیرۆز بانگەوازی مەردوم دەکا کە تێکڕا باوەڕیان بە پەیامی پێغەمبەران هەبێو بەڕاستیان بزانن.

{قُولُواْ آمَنَّا بِاللّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ وَالأسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ} سورة البقرة (١٣٦).

واتە: ئەی گرۆهی موسوڵمانان هەمووتان بڵێن: ئیمانمان بەخودا هەیە هەروا باوەڕمان بەو یاساو دەستوورەی قورئان هەیەو بەڕاستی دەزانین، بڕوامان بەو نامەو پەڕاوانەش هەیە کە نێردراوەتە خوارێ بۆ ئیبراهیم‌و ئیسماعیل‌و ئیسحاق‌و یاقووب‌و کوڕانی یاقووب، هەروەها بڕوامان هەیە بەونامە ئاسمانییانەی هاتوون بۆ موساو بۆ عیساو بۆ پێغەمبەرەکانی تریش، ئێمە هیچ جیاوازییەك ناکەین لەنێوانیان دا، بڕوامان بەڕاستی‌و دروستی هەموویان هەیە.

قورئانی پیرۆز بەئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ: ئەگەر کەسێك بڕوای بەهەندێ پێغەمبەر ببێ‌و بڕوای بە بڕێکیان نەبێ خودای گەورەو مەزن ئەو بڕواو ئیمانەی لێ وەرناگرێ‌و بەخاوەن بڕوای ڕاستی حلێب ناکاو بەکافری تەواوی دادەنێ.

{إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللّهِ وَرُسُلِهِ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيْنَ اللّهِ وَرُسُلِهِ وَيقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً، أُوْلَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقًّا وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا} سورة النساء (١٥٠-١٥١).

واتە: ئەوانەی کافرن بەخوداو بە پێغەمبەرانی خودا بڕوایان بەهەندێ پێغەمبەر هەیە بڕوایان بەهەندێکیان نییە دەیانەوێ لەبەینی کوفرو ئیماندا پلەیێ تر دروست بکەن‌و بیکەن بە ڕێبازی خۆیان‌و کێیان بەدڵ بێ بڕوای پێ بکەن‌و کێیان بەدڵ نەبێ بڕوای پێ نەکەن گەرەکیانە لەنێوانی کوفرو ئیمان دا ئایینێکی مام ناوەندی پەیدا بکەن بیکەن بە بەهانە بۆ ڕۆچون لە گومڕاهی دا.. بەڕاستی ئەوانە کافری تەواون‌و گومڕاو سەر لێ شێواون. ئێمەش بۆ ئەو جۆرە کەسانە سزایەکی بەئێشی کوشندەی ڕیسوا کەرمان بۆ داناون.

لەڕوانگەی ئەم ئایەتە پیرۆزەو چەند ئایەتێکی تریش ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە ئیسلام بەم ئایەتانە بناغەیەکی قایم‌و قوڵی داناوە بۆ تەعاروف‌و یەکتر ناسین‌و برایەتی‌و یەکیەتی لەناو کۆمەڵانی سەرزەوی دا چونکە ئادەمیزاد هەرکاتێ ئیمان‌و باوەڕیان بەهەموو پێغەمبەران هێناو یەك کەوتن، تێك گەیشتنیان لەسەر باقی مەندەی خیلافەکانی تریان ئاسان دەبێ!

ئەمە دیاردەیەکە تایبەتە بەئایینی ئیسلامەوە وای لەشوێن کەوتوانی خۆی کردوە کە بڕوایان بەهەموو پێغەمبەران هەبێ ڕێزی هەموویان بگرێ، بێگومان شوێن کەوتووی هەر ئایینێك ڕێزو نرخی پێغەمبەری خۆی لەقورئان دا دەدۆزرێتەوە، کەچی لەبەرنامەی ئایینەکانی تردا بەپێچەوانەوەیە!

زۆر لەمێژە زۆر لەنووسەران‌و زانایان هەوڵیان داوە یەکیەتی بخەنە نێوانی ئایینی ئیسلام‌و مەسیحی‌و جولەکەوە، بەلام سەرکەوتوو نەبوون، هۆی سەرنەکەوتنەکەشیان دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە بڕێ عیبارەت‌و ڕستە کەلەبەرنامەی ئایینەکان دا هاتووە ڕاڤەیەکی وایان کردون بەخەیاڵی خۆیان ڕێ خۆشکەرە دەبن بۆ یەکیەتیەکەو کۆسپەکانی دووبەرەکی ناهێڵن. لەکاتێکا ئەم عیبارەت‌و ڕستانە لەنیگای شوێن کەوتوانی ئایینەکەوە بناغەو کۆڵەکەی دینەکەن، دەست لێ‌دانیان یا ڕاڤە کردنیان بەو شێوە ڕەوانییە، جالەم ڕووەوە ئەم نووسەرانە لەجیاتی ئەوەی یەکیەتی بخەنە نێو ئایینەکانەوە بەو ڕاڤە کردنەیان دینێکی جیاواز لەو ئایینانەیان بەرپا کردوە لەئاکاما بوون بەدوژمنی بابە کوشتەی شوێن کەوتوانی ئەو ئایینانەی کەئەو نووسەرانە ویستویانە یەکیەتی بخەنە نێوانیانەوە!!

شایانی باسە کە ڕەخنەگری شارەزاو نووسەری زاناو دانا ئەگەر تێ بفکرێ بۆی دەردەکەوێ کە ئایینی ئیسلام باشترین ئایینە بۆ یەکخستنەوەی ئایینەکان‌و توانەوەیان لەناو بۆتەقەی ئایینی حەزرەتی موحەممەددا (درووودی خودای لەسەر بێ) چونکە ئایینی ئیسلام دوای ئەوەی کە ئیقرار دەکا بەوە کە ئایینەکان هەموویان سروشی خودان‌و پێغەمبەرەکان هەموویان فروستادەی ئەون، لەپاڵ ئەمەدا ڕاستییەك دەچەسپێ، ڕاستییەکەش ئەوەیە کە بەهۆی ڕۆژگاری درێژو کۆن بوونی ئەو ئایینانە ئادەمیزاد لەڕاستە ڕێی ئەو دینانە لایان داوەو تووشی گومڕایی بوون، دوای چەسپاندنی ئەم ڕاستییە، ئایینی ئیسلام هاتووە بانگەوازی ئادەمیزاد دەکا بە تێکڕایی کە پەیڕەوی قورئان بکەن‌و بیکەنە پێشەواو بەرنامەی خۆیان ئەو قورئانەی کە پاڵفتەو خولاسەی هەموو کتێبە ئاسمانییەکانی پێشووی لەخۆ

گرتووەو بەگوێرەی پێشکەوتنی زانستو شارەستانی ئادەمیزاد گونجاوە، لەهەموو رووێکەوە سیمای بەرنامەیەتی هەمیشەیی بۆ مرۆڤ لەخۆ گرتووەو یاساو قانوونێکی هەمیشە زیندوو لەبارە بۆ ئادەمیزاد هەتا دونیا دونیابێ!!

## پاكو بێ خەوشی پێغەمبەران (عصمة الرُسل):

ئەو پێغەمبەرانەی خودای پەروەردگار ناردونی بۆ ڕزگار کردنی مرۆڤ لەبەندایەتی هەواو هەوەسو جڵەو گرتنەوەیان لەکردنی گوناهو کرداری بەد، پێویستە خۆیان نموونەی ڕەوشتی بەرزو چاکە بن، چونکە ئەو فرستادانە پێشەوانو ڕێ نیشاندەرن، ئەگەر ڕەوشت خراپ بن دەبنە پێشەوای خراپەکردن، ئەوکاتە تەجیهاتو تەعلیماتی خودا بۆیان بێ هودەو مایە پوچ دەبێ. بۆیە دەبینین قورئان زۆرجار ئاماژە بەڕەوشتی پێغەمبەران دەکاو بەنموونەی چاکیان حلێب دەکاو دەفەرموێ:

{وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِمْ فِعْلَ الْخَيْرَاتِ وَإِقَامَ الصَّلَاةِ وَإِيتَاء الزَّكَاةِ وَكَانُوا لَنَا عَابِدِينَ} سورة الأنبياء (٧٣).

واتە: ئێمە ئەو پێغەمبەرانەمان کردوون بە پێشەواو فروستادە، بەگوێرەی فەرمانی ئێمە ئادەمیزاد شارەزای ڕێگای ڕاست دەکەن، سروشمان بەوە بۆ کردون کەهەمووکاتو ساتێك کردەوەیان باش بێو نوێژ بکەنو زەکات بدەن خێرو خێرات بکەن، ئەوانیش بەوپەڕی لێ بوردووییەوە فەرمانی ئێمەیان بەجێ هێناوەو گەردن کەچی ئێمە بوون.

جارێکی تر پەروەردگار بەشانو باڵیان دا هەڵ دەداو دەفەرموێ: {أُوْلَئِكَ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَؤُلاء فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُواْ بِهَا بِكَافِرِينَ، أُوْلَئِكَ الَّذِينَ هَدَى اللّهُ فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ} سورة الأنعام (٨٩-٩٠).

واتە: ئەو پێغەمبەرانەی کەباسمان کردن نامەی ئاسمانیمان داونێو فێری زانستمان کردونو کردومانن بە پێغەمبەرو فروستادەی خۆمان. جائەگەر

ناحەزانی ئیسلامو کافرانی قوڕەیش بڕوا بـەوە نەکـەنو دژی پێغەمبـەر بوەسـتن ئـەوە ئێمـە کۆمـەڵێکمان پەیـدا کـردون (کـە مهـاجرو ئەنـصارن) ئـەوان بڕوایـان بەبەرنامـەی خـودا هەیـەو پـەیڕەوی پێغەمبەرەکـەی دەکـەنو فەرمانبـەردارن، ئەوانـە خـودا هیدایـەتی داونو هەریـەکێ لـەو پێغەمبەرانـە پێـشەوایەك بـووە! تۆیش ئەی پێغەمبەری ئاخر زەمان پەیڕەوی پێغەمبەرەکانی پێش خۆتەوە بکە. هـەروا لـە شـوێنێکی تـردا قورئـان پـەرژینی پێغەمبـەران دەکـا لـە خیانـەتو خیانەتکاریو دەفەرموێ: {وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ} سورة آل عمران (١٦١).

واتە: ناگونجێ بۆهیچ پێغەمبەرێك خیانـەتکاری بکـاو بەناحـەق دەسـتدرێژی بکا بۆ ماڵی خەڵکی!!

قورئانی پیرۆز ئەوە دەچەسپێنێ کە هەریـەکێك لـە پێغەمبـەران رەوشـتێکی تایبـەتی بـەرزی هەیـەو بـەتێکڕا هـەموویان رەوشـت جـوانو دڵپـاكو بـەرزن، دەربارەی حەزرەتی (ئیبراهیم) دەفەرموێ: {إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا} بەڕاستی ئـەو ڕاسـتگۆو ڕسـتال بـوو. دەربـارەی حـەزرەتی (موسـا)ش دەفـەرموێ: {إِنَّـهُ كَـانَ مُخْلَصًا} بەڕاستی ئەو لەخۆبوردوو فەرمانبەردار بوو لەڕێگەی خوادا. دەربـارەی (ئیسماعیل) دەفەرموێ: {إِنَّهُ كَانَ صَادِقَ الْوَعْدِ} بەڕاستی ئەو پەیمان ڕاست بوو هـەرگیز بـێ وادەیـی بەسـەردا نـەهاتووە، دەربـارەی حـەزرەتی (هـود)و (صـالح)و (لـووط) بـۆ هەریەکـەیان دەفـەرموێ: {رَسُـولٌ أَمِـينٌ} واتـە: فرسـتادەی ئـەمینو دەستو دەروون پاك. دەربارەی حەزرەتی (عیسا) دەفەرموێ: {وَجِيهًا فِـي الـدُّنْيَا وَالآخِرَةِ} واتە: بەڕێزە لەدونیاو قیامەتا. دەربارەی حەزرەتی (یەحیا) دەفەرموێ: {كَانَ تَقِيًّا} واتە: خۆپارێز بوو هەرگیز بێ ئەمری خودای نەکردوە.

## هەموو گەلو هۆزێك پێغەمبەری هەبووە (لكل أمة رسول):

پەروەردگار وای داناوە کـە بـۆ هـەموو گـەلو هۆزێـك پێغەمبـەرێك لـەخۆیان بنێـرێ تـا شـارەزاییان بکـا بـۆ ڕێگـای ڕاسـتو دروسـتو بیانخاتـە سـەر ڕێبـازی نەجاتو سەرفرازی. خودا خۆی دەفەرموێ:

**{وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ} سورة النحل (٣٦).**

**واتە: ئێمە بۆهەر گەلو هۆزێك پێغەمبەرێكمان ناردووە، ئامۆژگاری كردون كەبەندایەتی خودا بكەنو خۆشەویستی بپارێزن لەپەرستنی تاغوتو بتو لە بت پەرستی دوور بكەونەوە، یان دەفەرموێ:**

**{وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خلَا فِيهَا نَذِيرٌ} سورة فاطر (٢٤).**

**واتە: هیچ هۆزێك یا كۆمەڵێك نییە پێغەمبەری بۆ نەنێردرابێ.**

**قورئانی پیرۆز ناوی بیستو پێنج پێغەمبەرو فروستادەی هێناوە، ئاماژەشی بۆ ئەوەكردوە كە پێغەمبەرو فروستادەی تریش هەبوون باسیان نەكراوە، ئەوەتا پەروەردگار بە پێغەمبەر دەفەرموێ:**

**{وَرُسُلاً قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلاً لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ} سورة النساء (١٦٤).**

**واتە: پێغەمبەران زۆرن هێندێكیان ناومان هێناونو سەرگوزەشتەو بەسەر هاتیانمان بۆ گێڕاویتەوە سەرگوزشتەی هێندێكیشیانمان بۆ نەگێڕاویتەوە.**

## حەزرەتی موحەممەد (د.خ) پێغەمبەری هەموو عالەمە:

**فرستادەیی حەزرەتی موحەممەد (درودی خوای لەسەر بێ) بۆ هەموو كەسێكە بەپێچەوانەی پێغەمبەرەكانی پێشوو كە هەریەكەیان نێردراوە بۆلای هۆزی خۆی. پەروەردگار بە فرستادەی خۆی حەزرەتی موحەممەد دەفەرموی:**

**{وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَـكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ} سورة سبأ (٢٨).**

**ئەی موحەممەد! ئێمە تۆمان كردوە بەپێغەمبەرو ڕەوانەمان كردوی بۆسەر هەموو ئادەم، كەڕێگەی ڕاستیان حاڵی بكەی بۆ خاسیان مژدەدەر بێو بۆ بەدیان ترسێنەر بێ، بەڵام زوربەی ئەو خەڵكە لەبەر بێ مێشكی خۆیانو نەفامییان لەحاڵی تۆ بێ ئاگان.**

جارێکی تر پەروەردگار فەرمان بە فرستادەی خۆی حەزرەتی (محمد) (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکا کە ئەم ڕاستییە بدرکێنێو پێغەمبەرایەتی خۆی بەهەموو عالەم ڕابگەیەنێ:

**{قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ لا إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ} سورة الأعراف (١٥٨).**

ئەی فروستادە! تۆ بەو خەڵکە بڵێ: من فرستادەی خودام بۆ لای ئێوە بەگشتی فرستادەی خودایەکم هەرچی مڵکو سامانی ئاسمانەکانو زەوی هەیە هەمووی هی ئەوەو هیچ خودانین جگە لەئەو.

## حەزرەتی موحەممەد دوا پێغەمبەرە (محمد خاتم الرسل):

پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد کراوە بە کۆتاییو تەواوکەری ڕشتەی پێغەمبەرایەتی هەموو پێغەمبەران. خودا بۆ خۆی دەفەرموێ:

**{مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَـكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ} سورة الأحزاب (٤٠).**

موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) باوکی نەسەبیی ئێوە نییە کە پیاوانی گەلی ئیسلامن، هەتا تانەی ئەوەی لێ بدەن کە ژنی پیاوێ لەئێوەی مارە کردۆتەوە بۆخۆیو ئەو پیاوەش زەیدی کوڕی حاریثەیە. بەڵکوو ئەوانە پایەی بەرزی محمد نازانن کە دوورە لەشتی وا نابەجاوە، موحەممەد پێغەمبەری خودایەو دوا پێغەمبەرەو دەرگای پێغەمبەرایەتی مۆر کردوە ئیتر چۆن بووکی خۆی مارە دەکاتەوە!؟

ئەمە لەکاتێك دا کەپێش ئەو هەزاران ساڵ تێپەڕبوونو پێغەمبەران یەك لەدوای یەك هاتوونو ڕۆیشتوونو لەنامەو پەڕاوی ئەو پێغەمبەرانەدا چەند جار ئاماژە کراوەو مزگێنی دراوە بەوە کە پێغەمبەری تر دێن، دەی ئەم دیاردەیە دەبوایە حەزرەتی موحەممەدی وا لێ بکردایە کە هەرگیز دان بەوەدا نەنێ کەخۆی دوا پێغەمبەرە، بەڵکوو دەبوایە ئەویش وەکوو پێغەمبەرانی پێش خۆی

مزگێنی بەپێغەمبەری دواخۆی بدایە. جا ئەگەر قورئان لەلایەن حەزرەتی موحەممەد (درودی خودای لەسەر بێ) خۆیەوە بوایە دەبوایە ئەویش وەکوو پێغەمبەرانی پێش خۆی بڕی لەو شێوە مژدەو مزگێنیانەی ڕابگەیاندایە بەمەبەستی ڕەواج دانو برەو پێدان بە بانگەوازییەکەی، بەتایبەتی کە ئادەمیزاد ئارەزۆمەندی ئەو جۆرە مژدانەنو مەیلی وەرگرتنی ئەم جۆرە دەعوایانەیان هەیە. دەی ئەوا بەسەر نازڵبوونی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا زیاد لەچوارده سەدە تێپەڕ بوو، تا ئێستا پێغەمبەرێکی ڕاستی تر سەری هەڵنەداوە ئەم ماوە درێژەش بەشی ئەوەی دەکرد کە چەند پێغەمبەرێکی تێدا ڕەوانە بکرێو بڕێکیان یەك بەدوای یەك دا بێنو هێندێکیان هاوچەرخ بن!! دەی بۆچی وشکاییان هاتووە؟!

جا ئەگەر بڕێ کۆمەڵو هۆز ئیعتیراف ناکەن بەوە کەحەزرەتی موحەممەد ئەو پێغەمبەرە مژدە پێ دراوەیە کە پێغەمبەرانی پێشوو مژدەیان پێ داوە بەڵکوو چاوەڕوانی پێغەمبەرێکی تر دەکەن ئەوە بە تێپەڕبوونی ئەم ماوە درێژەو نەهاتنی پێغەمبەرێکی تر دەبێ نائومێدببنو بگەڕێنەوە بۆلای ڕاستیو بڕوا بەئایینی حەزرەتی موحەممەد بکەن.

ئاشکراشە کەئەم جۆرە بڕیارانەی کە لەئایەتەکەدا هەیە لەو بەڵێنانەنیە ئادەمیزاد دەسەڵاتی بەسەردا هەبێ بەڵکوو ئەوە کاری پەروەردگارە، موعجیزەیەکە لە موعجیزەکانی قورئانو ئەوە دەچەسپێنێ کە قورئان سروشی خودایە!!

## بەشی دەیەم:

# قەزاو قەدەر (القـــدر)

**قەدەر لەقورئان دا ( خود موختاری مرۆڤ لەکاروەباری دا - سەرفێرازیو گومڕایی ئینسان - ویستی ئادەمیزاد بەشێکە لەویستی خودا - تەمەنو ڕۆژی ئادەمیزاد ئەندازە ئامێزن - پوختەی باوەڕ بە قەزاو قەدەر.**

برێك لەو ڕەخنانەی دوژمنانی ئیسلام ئاراستەی ئایینی ئیسلامی دەكەن باوەڕهێنانە بەقەزاوقەدەر لەم ڕووەوە گوایە ئەوجۆرە بڕوایە سەبەبێكی هەرە گرینگی دواكەوتوویی موسوڵمانانەو ناهێڵێ وەكوو ڕۆژئاواییەكان پێش كەون! چ لە بارەی زانستو چ لەبارەی فەنو فەرمانڕەوایی، چونكە بەلای ئەو دوژمنانەوە باوەڕ بەقەزاو قەدەر هەستەكانی ئینسان لەكار دەكەنو هێزو توانای لێ دەستێننو ڕوی پێ لەتەمەڵی دەكەن بەمەبەستی چاوەڕوانی بۆ ئەو ڕوداوانەی كە غەیب بۆی دێنێ.

شایانی باسە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) كاتێ پرسیاری لێ كرا دەربارەی ئیمانو باوەڕ، برێك لە وەڵامەكەی بریتی بوو لەڕستەی (**وان تؤمن بالقدر خيره وشره من الله**) دەبێ بڕوات وابێ كەخێرو شەڕ هەردوكیان لەخوداوەن، باوەڕت هەبێ كە خێرو شەڕ لەبوونەوەردا بەئەندازەو دەسەندەو یاسایەكن كە حیكمەتی خودا داخوازیان بووە، وە خودا هیچ شتێك بێ ویستی خۆی دروست ناكاو دروستی نەكردوە. وەهەرچی لەبونەوەردا هەیە بەگوێرەی زانستی خودایە ئەو زانستەی كەپێش پەیدابوونی شتەكە هەبووە!!

بەڵام كاتێك ئێمە لەقورئان تێ دەفكرین دەبینین قەزاو قەدەر واناخاتە بەرچاو كە بەیەكێك لەپایەكانی ئیمانو باوەڕ بژمێردرێ وەكوو باوەڕ بەخوداو فریشتەو كتێبە ئاسمانییەكانو پێغەمبەرانو ڕۆژی قیامەت حلێب ناكرێ، بەڵكوو قورئان هەرئەوەندە دەگەیەنێ كەقەزاو قەدەر یاساو نیزامێكی ئاسمانیە وەكوو باقی یاساو نیزامە ئاسمانییەكانی تر، ئیتر قورئان ئەوەی دەست نیشان نەكردوە كە بڕوا بەقەدەر پێویست بێ.

## قەزاو قەدەر لەنیگای قورئانەوە (القـــدر في القرآن):

ئەگەر سەیری وشەی (قەدەر) بکەین کەلەچەند شوێنی قورئان دا هاتووە دەبینین وشەی (قەدەر) یان (مقدار) یان (تقدیر) یەك واتا دەبەخشن: کە بریتییە لە خستنە ڕێی شتێك بەئەندازەیەکی تایبەتی یان کێشێکی سنووردار یان شێوەیەکی زانراو کە بەپاسایەکی مەعلووم ڕەدام بهێنرێ، خودا دەفەرموێ:

{وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّاهُ فِي الْأَرْضِ} سورة المؤمنون (١٨).

واتە: ئێمە بەئەندازیەکی پێویست باران لەئاسمانەوە دەبارێنین ئەمجار لەناو سکی زەوی دا پەزمەندەی دەکەین: یان دەفەرموێ:

{اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَى وَمَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُ بِمِقْدَارٍ} سورة الرعد (٨).

واتە: هەموو شتێك لەبونەوەردا لەمەخلوقاتی خودا، یاساو نیزامی ئەندازەیەکی تایبەتی هەیە ڕێكو پێكو مونتەظەمن دابو نەریتی تایبەتی هەیە وەکوو سكو زای مێینەو نەزۆکیو زیادە زڕوێتیو کەم زڕوێتی.

ئادەمیزاد بەشێکە لەبوونەوەر، فەرمانبەرداری ئەو یاساو نیزامەیە کەویستەمەنی پەروەردگارە.

{مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ، مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ} سورة عبس (١٨-١٩).

واتە: پەروەردگار ئادەمیزادی لەچی دروست کردوە؟! لە دلۆپە ئاوێك دروستی کردوە ئەمجار نەخشەی (جەستە)لاشەی کێشاوە یان دەفەرموێ: {وَاللَّهُ يُقَدِّرُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ} سورة المزمل (٢٠).

واتە: خودا شەوو ڕۆژ ئەندازەدار دەکا لە ئەم دەخاتە سەر ئەو لەو دێنێتە سەر ئەم. یان دەفەرموێ: {وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيراً} سورة الفرقان (٢).

واتە: پەروەردگار هەموو شتێکی دروست کردوەو لەهەموو رویەکەوە ئەندازەی گرتووە! لە تێفکرینی ئەم دەقە قورئانیانە کە وشەی (قدر)یان لەخۆ

گرتووە بۆمان دەردەکەوێ کەبیرو باوەڕی قەزاو قەدەر لەقورئان دا بەموسولمانان دەزانێنێ کەئەم بوونەوەرە یاساو نیزامێکی قایم‌و قولی هەیە هەرشتە سەبەبی خۆی هەیەو هیچ شتێکی بێ حیکمەت نییە لەدروستکراوانی خودادا تێکرو تێکوشیوی نییە سودفەو ڕێکەوت دەوری نییە، هەندێکیش لەسودو فائیدەی ئەم بیرو باوەڕە ئەوەیە کە موسولمانان دەبێ لەهەمووکەس زیاترو باشتر بەلێهاتوییەوە لێکۆلینەوە لەیاساو نیزامی بوونەوەردا ئەنجام بدەن‌و زانابن بەیاسای پەروەردگار دەربارەی مەخلووقاتی خۆی بۆهەر شتێك لەڕێگای خۆیەوە بچن بۆهەر کارێك کارسازی خۆی بدۆزنەوە!!.

## سەربەخۆیی مرۆڤ لەکرداری خۆی دا (إختیار الإنسان):

پێویستە لێرەدا چاوێك بگێڕین بەو ئایەتە قورئانییانەی کەباسی ئیختیارو سەربەخۆیی ئینسان دەکەن لەکردارو گوفتاری دا تابزانرێ تا چ ئەندازەیەك ئەو ڕەخنانەی لەم بارەوە لەئیسلام گیراون لاوازن‌و چ بوختانێکە بە ئیسلام کراوەو چ درۆیەکە هەلّ بەستراوە، بەلّگە لەسەر ڕاستی ئەوە فەرمودەی پەروەردگارە کە وەلامی کافرەکان دەداتەوە دەربارەی ئەو هەلّوێستەیان کە دەیانگوت: ئێمە کردەوە خراپەکانمان بەویستی خودایەو خەتای ئێمە نییە!

{سَيَقُولُ الَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَاء اللّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلاَ آبَاؤُنَا وَلاَ حَرَّمْنَا مِن شَيْءٍ كَذَلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِم حَتَّى ذَاقُواْ بَأْسَنَا قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَا إِن تَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إَلاَّ تَخْرُصُونَ، قُلْ فَلِلّهِ الْحُجَّةُ الْبَالِغَةُ فَلَوْ شَاء لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِينَ} سورة الأنعام (١٤٨-١٤٩).

هاوبەش پەیداکەرەکان‌و هاومەشرەبەکانیان هاکا گوتیان ئەگەر خودا ویستی لەسەربوایە ئێمە خودامان بەیەك دەزانی هاوڕێمان بۆ بڕیار نەدەدا، هەروەها بەکەیفی خۆمان شتمان حەرام نەدەکرد، کەواتە خودا خۆی دەیەوێ ئێمە شەریکی بۆ قەرار بدەین‌و خۆی ڕەزای لەسەرە، وەلێ ئەگەر ئەم گوتەیە ڕاست

بێ دەبێ گوتەی پێشینانە کافرەکانیشیان ڕاست بوایە کەهەمان قسەی پووچیان دەکرد کەچی ئەوە بوو ئەوان لەسزای ئەو بیرو باوەڕە چەوتەیان دا تۆڵەی سەختی خودایان چەشت! پێیان بفەرموو ئەگەر بەڵگەیەکی زانستیان بەدەستەوەیە لەسەر ئەم داوایەتان ئادەی بیهێنن، وەلێ نە بەڵگەتان هەیەو نەهیچ، هەرئەوەندەیە دوای خەیاڵ پڵاو کەوتوونو درۆی رووت دەکەن! بفەرموو دەلیلو بەڵگەی رۆشنو تەواو ئەوەیە کەلای خودایە، ئارەزووی ببێ هەموتان هیدایەت دەدا، بەڵام یاسای خودا وابووەو هەروا دەبێ هەرگیز زۆرە ملێ لەخەڵك ناکا بۆ گرتنی ڕێبازێکی تایبەتی، بەڵکوو ئادەمیزاد بۆخۆی ئازادو سەربەستە لەڕێگای چاکەو خراپە کامیانی ئارەزۆ لێ بێ هەڵی دەبژێرێ. هەر لەسەر ئەم بنەڕەتەیە کە خودای پەروەردگار پێغەمبەرانی ناردون بۆلای گرۆهانو کۆمەڵان تا بۆ خەڵکەکە ڕێگای حەقو ڕاست لەڕێبازی چەوتو خوار جیابکەنەوە، باشو خراپیان بۆ ڕوون بکەنەوە واتە هەڵبژاردنی ڕێبازێك لەم ڕێبازانەی خستۆتە ئەستۆی مرۆڤەکە خۆی! بەئیختیاری خۆی لایەك هەڵدەبژێرێ {إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا} سورة الإنسان (٣).

ئێمە ڕێبازی خێرو ڕێبازی شەڕمان پێنیشانی مرۆڤ داوە چونیەتی هەردوو ڕێبازەکانمان بۆ ڕوون کردۆتەوە.. ئیتر خۆی بە ئارەزوی خۆی کامیان پەسەند دەکاو کامیان پاش گوێ دەخا ئەوە کەیفی خۆیەتی وەك لەم ئایەتەش دا ئەمە دەچەسپێنێ: {وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ} سورة الكهف (٢٩).

واتە: بڵێ، هەق ئاشکرایەو ئەوەیە کەلەلای خوداوە بێو پێغەمبەرەکانی پێتانی ڕادەگەیەنن.. پاش ئەم بەیانکردنەی حەق کێ حەز دەکا موسوڵمان ببێ، کێش ئارەزوو دەکا کافر ببێ. کەوا بوو ویستی خودا لەوەدایە پێغەمبەران بنێرێ بۆ ئەوەی ڕەهنومای ئادەمیزاد بکەنو ڕێگای چاکەیان پیشان بدەنو بیان ترسێنن لەئاکامی رۆیشتن بە ڕێبازە چەوتەکان دا، خواستو ئیرادەی

ئـادەمیزادیش لـەوەدا ڕەنـگ دەداتـەوە کەبـەئارەزووی خـۆی دەتوانـێ ڕێبازێـك هەڵبژێرێو لەسەری بڕوا، بەکورتی قورئـانی پـیرۆز لـەزۆر لەئایەتـەکانی دا ئـەوە دەچەسـپێنێ کـە ئینـسان بۆخـۆی ئیختیـاری هەیـەو بەرپرسـیارە لـەکردارەکانی.. هەروەها ئەوەش ڕون دەکاتـەوە کەهـەر ناسازیو خـواریو تـەنگو چـەڵەمەیەکی کۆمەڵایەتی کە مرۆڤ هاواریەتی بەدەستیەوە، هەر تەنگانـەو ناخۆشییەکی ژیـانی کە تووشـی دەبـێ هـەمووی نەتیجـەو ئاکامی کـردەوەی خۆیـەتی، سووچ سووچی مرۆڤەو پاداشـی کـردەوەی خراپـی خۆیـەتی وەری دەگرێتـەوە! خـودا دەفـەرموێ: {ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ} سورة الروم (٤١).

واتـە: گرانـیو کـەم بـوونی ڕزقو ڕۆژی، بـڵاو بوونـەوەی تـرسو نائاسایـشی، زۆربـوونی زوڵـمو زۆر، کـەم بـوونی بـەرو بـووم، لەشـارو لادێ لـەکونو قـوژبنو هـەموو شـوێنێکی سـەرزەوی دا هـەمووی بـەهۆی کـرداری مەردومەکەیـەوە یـەو سووچـی خۆیانـە، بۆیـەش ئەمـە دێتـە ڕێیـان هـەتاکوو بەشـێك لەسـزای کـردەوە خراپـەکانی خۆیـان لـەدونیادا وەربگرنـەوە، بەشـکوو واز لەخراپـەکاری خۆیـان بێنو تۆبە بکـەنو بگەڕێنـەوە بـۆلای خـودای خۆیانو ببنـە ئادەمیزادی چاكو ڕاستاڵ. لەسورەتی (شوری)یش دا دەفـەرموێ: {وَمَا أَصَابَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ} هەرچی بەڵاو تەنگو چەڵەمەیەك دێتە ڕێگەتان هـەمووی سـزای کـردەوە خراپـەکانی خۆتانـە هەرچـەندە چاوپۆشـی لـەزۆر گوناهیشتان دەکاو سزاتان نادا لەسەری جارێکی تر دەفەرموێ: {مَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أَسَاء فَعَلَيْهَا وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ} سورة فصلت (٤٦).

کەسێك کردەوەی چاك بکا سوودی قازانجی بۆخودی خۆیەتی هەرکەسێکیش خراپە بکا زیانی بۆخۆیەتی! هەرگیز خودای تۆ بەخۆڕایی کەس سزا ناداو زوڵمو زۆری لەبەندەکانی خۆی ناکا.

هەردەم قورئانی پیرۆز بانگەوازی مەردوم دەکا بۆ ئەوەی لەهەموو کارو بارێك دا، لەهەموو گۆڕانکاریو پێشکەوتنو دابین کردنی پێداویستی ژیان ئەمنو ئاسایشو خۆشگوزەرانی یەك داهەر خۆیان بەر پرسیار بزانن و بەئاکامی کردەوەی خۆیانی حلێب بکەن {إِنَّ اللّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ} سورة الرعد (١١).

واتە: پەروەردگار هەرگیز نیعمەتو خێرو خۆشی خۆی لە هۆزێك وەرناگرێتەوە مادام ئەوان چۆنیەتی هەڵسو کەوتی خۆیان نەگۆڕن، هەتا ئەوان بەردەوام بن لەسەر کرداری چاکەو خواپەرستی پەروەردگاریش نیعمەتو خێرو خۆشی خۆی دەڕژێنێ بەسەریان دا.

ئەمە پوختەی لێدوانی قورئانی پیرۆز بوو دەربارەی دەوری ئادەمیزاد لەکردرای خۆی داو ڕێژەی ئیختیارو بەرپرسیاری لەئاکامی کردەوکانی دا. ئایەتەکانی قورئان صەریحن لەوەدا کەویست (إرادە)و کردەوەی ئادەمیزاد هۆی سەرەکین بۆ سزاو پاداشی. دەی خۆ ئەمەش هەرگیز لەگەڵ بۆچونی دوژمنانی ئیسلامو ئەو بوختانەی بۆ ئیسلامی دەکەن یەك ناگرنەوە! ئەو بوختانەی کە دەڵێن ئایینی ئیسلام ئایینی تەواکولو تەمبەڵییەو ناهێڵێ شوێن کەوتوانی لەژیانی دنیاییان دا پێشکەون!!

## ڕەهنومایی کردنو گومڕایی کردن (الهداية والاضلال):

خستنە سەر ڕێگای ڕاستو گومڕایی کردن هەردوکیان بەدەست خودا خۆیەتی!! ئەمە یاسایەكو بیرو باوەڕێکی سەرەکی ئیسلامییە، جا لەمەوە برێك تێنەگەیشتوو وایان داوەتە قەڵەم کە ئادەمیزاد هیچ شتێکی بەدەست خۆی نییەو موجبەرەو ناچارە، بۆرە سەربەستی خۆی نییە، ئەم ئایەتانەشیان کردوون بەبەڵگە کە پەروەردگار بە فرستادەی خۆی، حەزرەتی موحەممەد (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ:

{أَفَمَنْ حَقَّ عَلَيْهِ كَلِمَةُ الْعَذَابِ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِي النَّارِ} سورة الزمر (١٩).

واتە: ئایا کەسێ: لەعیلمی خودادا بەجەهەننەمی نوسرابێو مۆری کافریەتی لەناوچاوان درابێو کرداری کافرانەبێ، ئایا تۆ ئەی موحەممەد! دەتوانی ئەو حوکمە بگۆڕیو ئەو مەردومە موسوڵمان بکەی؟ واتە هەرگیز ناتوانێ.

{إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَـكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ} سورة القصص (٥٦).

ئەی موحەممەد! ئیشی تۆ رەهنوومایی کردنەو بەس!! کەوابوو تۆ ناتوانی خۆشەویستێکی خۆت بەزۆرە ملێ بخەیە سەر رێگای راست. ئەوە هەر لەدەست خودا دێو بەس، هەرئەو دەتوانێ تۆوی ئیمانو باوەڕ بخاتە دڵی ئەوانەی کە خۆی دەیەوێ موسوڵمان بن.. قەزاو قەدەرو چارەنووس، لە ئایینی ئیسلام دا بەپێی دەقی قورئانو صەریحی حەدیسی صەحیحی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر فەرمایشتی زاناکانی ئوصولو کەلامو موفەسیرەکانو شەریعەت زانەکان بەمە دەڵێن: خودا لەهەوەڵ دا چارەنووسی هەموو شتێکی نووسیوەو بەتەفصیل هەموو شتێکی شی کردۆتەوەو نووسیویەتی ئەمەی ئێستا ڕوو دەدەات لەعالەمی واقیع دا دەق نوسخەیەکی ڕونووسی ئەوەیە کەلەمەو پێش لەعالەمی میسال ڕووی داوە دەقبە پێچەوانەی فلیمی سینەماو تەلەفیزیوونەوە کەلەسەر شاشەی سینەماو تەلەفزیۆن ڕادەنوێنرێ چونکە فلیم لەپێش دا تەمسیل دەکرێو وێنەی دەگیرێو لەپاشا پیشان دەدرێ.

خودا دەفەرموێ: {إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ} سورة المائدة (٥١).

پەروەردگار هەرگیز ئەوانەی کەستەمیان لەخودی خۆیان کردوە بەوە کە بەئارەزووی خۆیان لایەنی کوفریان گرتووەو سورن لەسەر کوفر نایان خاتە سەر رێگای ڕاست.

{إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ} سورة الزمر (٣).

واتە: هەرگیز خودای مەزن کەسێك ناخاتە سەر ڕێگای ڕاستو هیدایەتی نادا کە ئەو کەسە درۆزن بێو پێی وابێ خودا درۆزنەکان لەخودای گەورەی نزیك

دەکەنـەوە، لەهـەمان کاتـا کـافریش بـێ لـەم ڕووەوە ئـەو بتانـە بـەخودا بزانـێو بەشەریکیان بزانێ،،

{فَلَمَّا زَاغُوا أَزَاغَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ} سورة الصف(٥).

واتە: کاتێك دەست بەرداری حەق بـوونو دەسـتیان کـرد بەناڕەحـەت کردنـی پێغەمبەرەکانیان خوداش لەسزای ئەوەدا دڵی لەسەر حەق لادان.

{كَذَلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَى كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ} سورة غافر (٣٥).

وەکوو چۆن خودا دڵی سەرپێچی کـەرانو کێشەکەرانی مـۆر کـردوە، هەربـەو شێوەیە خودا دەڵێ هەموو لووتبەرزێکی خۆ بەزلزانی ستەمکار مۆردەکاو نـووری ئیمانی تێ ناچێ!!

{وَمَا يُضِلُّ بِهِ إِلاَّ الْفَاسِقِينَ} سورة البقرة (٢٦).

واتـە: پـەروەردگار بەهـەموو شـێوەیەك پەنـدو ئامۆژگـاری خەڵـکی دەکـا تەنانـەت باڵـە مێشوولەیەکیش دەکاتـە نموونـەو پەنـد بۆیـان، جا هەیـە پەنـدی لێوەردەگرێو دێتە سەر ڕێگای ڕاستو هی واش هەیە پێی گومڕا دەبـێ هەڵبەتـە ئەوانەی ڕێبازی فیسقو فوجووریـان گرتـووەو گاڵـە بـە پەنـدەکانی خـودا دەکـەن ڕێگای ڕاستییان لـێ گۆم بووە زیاتر سەر لـێ شێواو بوون.

{وَيُضِلُّ اللّهُ الظَّالِمِينَ} سورة إبراهيم (٢٧).

پەروەردگار لەگۆڕدا سەر لـەظلمو سـتەمکاران تێـك دەدا هـیچ بەڵـگەیەکیان وەبیر نایەتەوەو کەڕو لاڵ دەبن!! کەوابوو خاوەنی ئەم ڕەوشـتە خراپانـە هـەرگیز لایـەقی ئـەوەنین کـەخودا بیانخاتـە سـەر ڕێگـای ڕاسـتو ڕەحمـەتی خـۆی بڕێـژێ بەسـەریان دا توشـی خۆشـبەختی دونیـاو قیامـەتیان بکـا بـەڵام ئەوانـەی لایـەقی هیدایـەتو ڕەحمـەتی خـودان ئەوانـەن کـەخاوەنی ڕەوشـتی بـەرزو پـاکن، ئـەو ڕەوشـتانەی کـە بـریتین لـەباوەڕی ڕەواو گەڕانـەوە بـۆ ژێـر فـەرمانی خـوداو شوێنکەوتنی ڕێگای ئاشتیو ڕەزامەندی پەوەردگار.

{قُلْ إِنَّ اللّهَ يُضِلُّ مَن يَشَاء وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ} سورة الرعد (٢٧).

{يَهْدِي بِهِ اللّهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلاَمِ} سورة المائدة (١٦).

## ویستو ئیرادەی مرۆڤ لەزیمنی ویستو ئیرادەی خودا دایە:

ئایینی ئیسلام ئایینێکی واقیعییە، لەم ڕووەوە ئیختیارو کردەوە بۆ ئینسان دەچەسپێنێو بۆرە سەربەستییەکی دەداتێ، بەڵام لەهەمان کات دا ئەوە ڕون دەکاتەوە کەهەردەم ئادەمیزاد ئەوەی کە بەئیختیاری خۆیان ئەنجامی دەدەن ئەو کردارەیە کە ویستی خودای لەسەرە ئەویش ئیرادەی پێیەتی!!

{إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ، لِمَن شَاء مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ، وَمَا تَشَاؤُونَ إِلَّا أَن يَشَاء اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ} سورة التكوير (٢٧-٢٩).

واتە: ئەو قورئانە پیرۆزە لەسەر شێوەیەکی شیرین ئامۆژگاری مەردوم دەکا، بیرخەرەوەیەکی خوداییە بۆ ئەوکەسانەی کەلە ئێوە شارێگەی حەقو ڕاستیان گرتووە، ئەمەیش هەر لەکەرەمی خوداوەیە کەئێوە لەسەرەتاوە ڕێگەی ڕاستتان گرتووەو ئەوەیش بەویستو خواستی خودایە!! هەر لەم واتاو مانایەدا چەند ئایەتێکی تری قورئان هەیە وەکوو ئەم ئایەتانە:

{وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَاء وَيَخْتَارُ مَا كَانَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ} سورة القصص (٦٨).

خودای تۆ هەر شتێك ئارەزۆ بکا بەدی دەهێنێ چی ئارەزۆی لێ بێ هەڵی دەبژێرێ، ئەو مەردوم گەلە مافی هەڵبژاردنیان نییە. {قُل لَّن يُصِيبَنَا إِلاَّ مَا كَتَبَ اللّهُ لَنَا} سورة التوبة (٥١).

ئەی موحەممەد! بڵێ بەهاوڕێیانت هەرشتێك خودا لای خۆی لە لەوحولەحفوظ دا نەی نووسیبێ نایەتە ڕێمانو بەرەو ڕوی نابینەوە.

{وَإِن يَمْسَسْكَ اللّهُ بِضُرٍّ فَلاَ كَاشِفَ لَهُ إِلاَّ هُوَ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدُيرٌ، وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ} سورة الأنعام (١٧-١٨).

واتە: ئەگەر خودا بیەوێ زەرەرو زیانێکت پێ بگا خۆی نەبێ کەسی تر ناتوانێ ئەو زیانەت لێ دوور بخاتەوە، ئەگەر ویستیشی سودو قازانجێکت پێ بگا

ئەوە كاری خۆیەتی، ئەو بەسەر هەموو شتێك دا بەتوانایە هەر ئەوە خاوەن دەسەڵاتو بەهێز لەژور بەندەكانیەوە. بێگومان ئەم ئایەتانەو ئەو ئایەتانەش كەئەم جۆرە مانایە دەگەیەنن وێنەی ڕاستییەكی زانستی دەكێشن و حەقیقەتێك دەگەیەنن كەزۆر فەیلەسووفو زانا ڕۆژئاواییەكان دانیان پیادا ناوەو ناویان لێ ناوە ڕێبازی زۆرە ملێ (مذهب الجبرية) بەڵام ئەوان زۆرە ملێیەكەیان پاڵ دابو نەریتی كەون و چونیەتی ژیان تێیدا داوە لەجیاتی ئەوەی هۆیەكانی بگێڕنەوە بۆ پەروەردگارو ئاكارو ویستو زانستی ئەو! ئەم كۆمەڵە، شوێن كەوتوانی ئەم ڕێبازە تایبەتییە جەبرییە بڕوایان وایە كەمرۆڤ لەژیان دا ئەو ئیختیارەی كەهەیەتی بریتییە لە ئیختیارێكی بێ وەجی زەبوون و بێ هێز، دان پێدانان بەم ئیختیارە زەبوونەش زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ پێداویستی ژیانی كۆمەڵایەتی لەبارەی كردەوەی ڕۆژانەوە نەك بۆ حەقیقەتێكی زانستی فەلسەفی، ئەگەر ددان بەم ئیختیارەدا نەنرێ زۆر زەحمەتە یان بڵێین مەحاڵە كە كۆمەڵ بتوانێ بناغەیەكی پتەو دابنێ بۆ یاساو سنوورێكی وا ژیانی خۆی پێ تەنظیم بكا.

## تەمەن و رزق و ڕۆژی بڕاونەتەوە (الاجل والرزق محدودان):

خودای گەورەو مەزن دەفەرموێ: {وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَنْ تَمُوتَ إِلاَّ بِإِذْنِ اللهِ كِتَابًا مُّؤَجَّلاً} سورة آل عمران (١٤٥).

واتە: هیچ خاوەن گیانێك نامرێ و بۆی نییە بمرێ مەگەر بەئیزن و ڕەزاو قەزاو قەدەری خودا نەبێ، ئەمە فەرمانی خودایە بۆ هەموو گیاندارێك تەمەنێكی دیاری كراوی داناوە هەرگیز پاش و پێش ناكا.

دەفەرموێ: {أَيْنَمَا تَكُونُواْ يُدْرِككُّمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ} سورة النساء (٧٨).

واتە: لەهەرشوێنێك بن مردن یەخەتان دەگرێ و تێكتانەوە دەپێچێ تەنانەت ئەگەر لەناو قەڵای قایم و قوڵیش دابن هەر دەتانگرێتەوە، یان دەفەرموێ: {وَمَا

يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِ إِلَّا فِي كِتَابٍ إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ} سورة فاطر (١١).

واتە: تەمەنی هەریەکێ لەئێوە درێژبێ یان کورت بێ لە لەوحولمەحفوظ دا نوسراوەو هەمووی بەقەزاو قەدەری خودا خۆیەتی.

بەڕاستی مانای ئەم ئایەتانە ڕاسترین وەسفە بۆ واقیعی ئەم ژیانە، ئاوێنەیەکی بالانومایە بۆ چونیەتی مردنو ژیان، سات لەدوا ساتو ڕۆژ لەدوا ڕۆژ بەڵگەمان دەست دەکەوێ لەسەر ئەوە کەمردن (ئەجەل) فەرمانێکی خودایەو هەلاتن لەدەستی ناکرێ، هی واهەیە مەرگی موفاجات (موجافات) یەخەی دەگرێو کەس لەوەپێش نەخۆشی لێ هەست نەکردوە!! تەنانەت بڕێ پزیشك دەڵێن: ئادەمیزاد کە لەدایك دەبێ لەلەشیا ماکی مردن هەیە تێکەلاوی ئەصڵی تەکوینی بووە. جائەگەر ئادەمیزاد تەمەنی ئەندازەیەکی دیاری کراوی هەبێ دیارە ڕزقو ڕۆژیشی هەر بەئەندازەیەو دیاری کراوە.

{إِنَّ اللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ} سورة آل عمران (٣٧).

واتە: پەروەردگار ڕزقو ڕۆژی دەدا بە کەسێك خۆی ئارەزوی لێ بێ بەبێ حیسابو ڕێژە.

ئەمە بەکورتی ئەو باسەیە کە قورئان دەربارەی قەزاو قەدەرو ڕزقو ڕۆژیو ماوەی تەمەن لێی دواوەو باسی کردوە، بەلام ئەگەر کەسێك بیەوێ زیاد لەمە لەمەوزوعەکە قووڵ ببێتەوە هەوڵ بدا گونجانێك بەدی بێنێ لەنێوان ئەو بەڵگانەی کەفراوانیی زانستی خوداو بێ مەودایی‌و ویستو خواستی دەچەسپێنن لەنێوان ئەو کردەوانەدا کەهەموو ڕۆژێ مەردووم بەئارەزووی خۆیان ئەنجامی دەدەن ئەوە هەر ئەوەندە دەتوانین بڵێین کە ئەم هەڵبژاردنەی مرۆڤ بۆ کارێكو وازهێنانی لەکارێکی تر هۆیەکەی نهێنی قەدەرە (سر القدر) قووڵ بوونەوەو پێداگرتن تێیدا کارێکی باش نییە، خۆ پێوەماندو کردنی بێ هودەیەو ئایینی ئیسلام نەهی کردوە لەخۆ پێوە خەریك کردنی.

## پوختەی باوەڕ بەقەزاو قەدەر (روح الإيمان بالقـــدر):

بیرو باوەڕ بەقەزاو قەدەر خاوەنەکەی هەڵ دەنێ بۆ کردەوەو کۆشش، هەردەم سوودو قازانجی خۆی لەکردەوەو کۆشش دا دەبینێ، پێی وایە ئەگەر لەم ئیشەدا سەرکەوتوو نەبوو لەئیشێکی تردا سەرکەوتوو دەبێ، هەرگیز نائومێد نابێ‌و هیوای بەنهێنی قەدەر دەبێ، چونکە ئەو بەشەی بۆی بڕواتەوە لێی دیارنیەو جگە لە کردەوەو کۆششی خۆشی چ نیشانەیەکی تری بەدەستەوە نییە کە بیگەیەنێ بەئاوات، کەوابێ دەبێ هەرگیز سڵ نەکاتەوە لەکارو پیشەو دەست‌و شانی خۆی بوەشێنێ: بەشێك لە حیکمەتی پەروەردگارە کە داوای لەئادەمیزاد کردوە باوەڕ بەقەزاو قەدەر بهێنن، هەتا کاتی تووش بوونیان بەبەڵاو موسیبەت خۆ راگربن‌و تەحەمووڵی ناڕەحەتی بکەن، هەرکاتێ نائومێدی لەشتێك دا سواری دڵ‌و دەروونی ئادەمیزاد بوو هێرشی بۆهێنا، یان کۆسپ‌و تەگەرەیەك هاتە سەر ڕێگای‌و نەی هێشت بە مەرام بگا ئالەم کاتەدا گرینگی بڕوا بەقەدەر دەردەکەوێ، لەم حاڵەدا پشت بەستن بەخوداو بەقەدەر ئاهێکی دێنێتەوە بەرو دەرگای داخراوی بۆ ئاوەڵا دەکاو دڵنەوایی دەکاو تەم‌و مژی نائومێدی دەڕەوێنێتەوەو کۆسپ‌و تەگەرەی لەڕێگا ڕادەماڵێ‌و سەر لەنوێ دەست دەکاتەوە بەکارو باری خۆی.

هەمیشە هەوڵی مەردانەم داوە
ورەم بەگلان قەت نەڕووخاوە
دوایش هەرچی هات لەلای خوداوە
خەڵاتی خودایە جێگەی سەرچاوە

خۆ ئەگەر خوا کردی لەکارێکا سەرکەوتوو ناجح دەرچوو دووبارە ئیمان بەقەزاو قەدەر دەوری گرینگی خۆی هەیەو ناهێڵێ خاوەنەکەی لەخۆی بگۆڕێ‌و بیرو هۆشی خۆی لەدەست بدا، لە خۆشیاناقاچی لەعەرد ببڕێ‌و هەوا پەروازبێ!! پەروەردگار کە دەفەرموێ:

{مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَا إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ، لِكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ} سورة الحديد (٢٢-٢٣).

ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە هەرچی بەڵاو موصیبەتێك تووشی زەوی‌و زارو باخ‌و ڕەزتان دەبێ یا یەخەی خۆتان دەگرێ، هەمووی لە لەوحولمەحفوظ دا نووسراوە، لەزانستی خودادا چەسپاوە، پێش ئەوەی دروستی بکا ئەمەش لەکن خودا زۆر ئاسانە.. ئەمجار داوا لەئادەمیزاد دەکا کە هەرکاتێ بەڵاو ناخۆشیەکی تووش بوو غەم‌و پەژارە دای نەگرێ خۆی نەفەوتێنێ. بەڵکوو دەبێ بڕوای وابێ کەئەوە قەزاو قەدەرە لەئەزەل دا بۆی نووسراوە لێ لادانی نەدەکراو خۆی لێ نەدەشێردرایەوە، پێویستە ڕازی بێ بەقەزا، هەروەها ئەگەر خوا کردی تووشی خێرو خۆشییەك بوو پێویستە خۆی لێی بایی نەبێ، بەڵکوو وابزانێ ئەمە خەڵاتی خودایەو لەئەزەل دا بۆی نووسراوەو بەئازایەتی خۆی وەری نەگرتووە تاپێی بایی ببێ بەڵکوو دەبێ شوکری لەسەر بکا.

بڕوا بەقەزاو قەدەر چەند سیفاتێکی بەرزو جوان لە ئادەمیزاددا دروست دەکاو گەشەیان پێدەکا وەکوو ئازایی‌و نەترسان‌و دەست بە خێری‌و سەخی تەبیعەتی، چونکە ئەوکەسەی کە بڕوای وابێ تەمەن دیاری کراوەو زیادو کەم ناکا، ئەوکەسەی پێی وابێ کە ڕزق‌و ڕۆژی دیاری کراوەو هەموو شتێك بەدەست خودایە چۆنی بوێ ئاوا هەڵیان دەسوڕێنێ! ئیتر چۆن لەمردن دەترسێ یان چۆن داکۆکی لەوڵات‌و ئایین‌و ناموس‌وگەل‌و هۆزی خۆی ناکا! یا چۆن لە فەقیری دەترسێ!! چۆن کردارو گوفتاری چاك‌و باش نابێ!

## لایەنی گیانپەوەریی لەئایینی ئیسلام دا:

دوژمنانی ئیسلام زۆر پڕو پاگەندەیان لەدژی ئیسلام ئەنجام داوەو زۆر شوبهەو فێڵ‌و تەڵەکەیان ئاراستە کردوە، یەکێك لەو شوبهانە ئەوەیە گوایە

ئایینی ئیسلام لایەنی گیانی تێدا نییەو ئاینێکی ماددی سیرفە! یان دەڵێن: ئایینی ئیسلام زیاتر یاسایەکی شەرعییە تا نیزامێکی ئەخلاقیو رۆحی!.

لەڕاستی دا ئەمە هەڵەیەکی زۆر گەورەیەو بوختانێکی زلە دوژمنان بەئیسلامی دەکەن، چونکە ئەو لایەنە ڕۆحیانەی ئایینی ئیسلام لەخۆی گرتوون هەرگیز هیچ ئایینێك نیەو نەبووە ئابەو شێوە مەبادیئی ڕۆحی گونجاوو بەرزی لەخۆ گرتبێ، بۆ زیادە ڕون کردنەوە لەم چەند سەرەباسانەی داهاتوودا ئەم لایەنە شی دەکەینەوە، سەرە باسەکانیش ئەمانەن:

١. پەیوەندی ئادەمیزاد بەجیهانەوە (صلة الإنسان بالدنيا).

٢. پەیوەندی ئادەمیزاد بە پەروەردگارەوە (صلة الإنسان بالله).

٣. ڕەوشت لەئیسلام دا (الأخلاق في الإسلام).

٤. خودا پەرستیی (عیبادەت).

پێش ئەوەی بچینە ناو درێژە باسەکانەوە پێویستە ئەم خاڵانە شی بکەینەوە..

## ئادەمیزاد لەڕۆحو ماددە پێکهاتووە:

ئادەمیزاد لەدوو عونصوور پێکهاتووە، عونصورێك ماددەیەو گەشو نمای هەیەو جمو جوڵ، عونصورەکەی تر جەوهەرێکی ڕوتی لەماددە پاڵفتەیەو چەند دیاردەیەکی تایبەتی هەیە وەکوو فکرو ئەندێشە، وەکوو زانینو ویستو ئیرادە، وەکوو خۆشەویستیو ڕق لێبوونەوە، یا ڕەوشتی جوانو ناشیرین. بۆ هەریەکێ لەم دوو عونصوورە ئارەزوی تایبەتی هەیەو هەریەکەیان دەیەوێ ئارەزووەکەی خۆی بەتەواوی بەدەست بێنێ، لاشە ماددەیەکە پێداویستی خۆی هەیەو ئارەزۆی دابین کردنی دەکا، حەزی لە خواردەمەنیو خواردنەوەو ڕابواردنی جینسی هەیەو پێویستی بە خەوو ئیستیراحەتو شتی تر دەبێ! ڕۆحو گیان پلەو پایەی

بەرزو نزمی هەیە، بەگوێرەی سەعیو کۆششی تایبەتی خۆی دەتوانێ بڕێ یا زۆربەی پێداویستییەکانی خۆی دابین بکا.

وەکوو گوترا ئادەمیزاد پێکهاتووە لەتێکەڵبوونی لاشەو ڕۆح ئەم تێکەڵاو بوونە بوومتە کانی بەڵاو موسیبەت لەم ڕووەوە کە زۆربەی ئادەمیزاد بوونە بەندەی ئالقە لەگوێی ئارەزووەکانی خۆیان مرۆڤایەتییان دابەزیوە بۆ پلەی ئاژەڵی، تەنانەت لەژیان دا حەزیان لەهیچ نییە جگە لەڕازاندنەوەی سفرەو خوانی ڕەنگاو ڕەنگ هەموو هیواو ئارەزۆیەکیان دابین کردنی پێداویستییەکانی هەواو هەوەسەو بەس! بەڵکوو جاری واهەیە لەپلەی (ئاژەڵی)ش دابەزیون بەتەواوی نقوومی هەواو هەوەس بوونو هیچ لایەنێکی ڕۆحیان تێدا نەماوە! لەبەر ئەمە قورئانی پیرۆز یاساو نیزامێکی گیانی داناوە بناغەکەی بڕوا بەخودایەو باش ناسینییەتی، ناسینێکی ڕاستی بێ گومان کە مرۆڤ بەرز بکاتەوەو بیکاتە مرۆڤێکی صالحو بەسوود لە کۆمەڵگای ئینسانی دا لەو گرێ کوێرکە دروونیەی کەسەری لێ دەرناکاو بەهۆی دووری لەخوداوە هاکا لێی بوو بە مۆتەکەو مڵۆزمو هەڕەشەی فەوتانی لێ بکاو بەرەو هەڵەتی نەمان ڕای ماڵێو ڕای پێچێ.

دوای ئەوەش قورئان ئادەمیزادی بانگ کردوە بۆئەوەی جیهاد لەگەڵ نەفسی خۆی دا بکا کۆڵەکەی لەگەڵ دا بدا، لەسەر کردەوەی باش ڕای بێنێ، دڵو دەروونی خۆی پاك بکاتەوە لەچڵکی هەواو هەوەسو شەهوەتی نەفسانیو ئارزۆ پەرستی، لەکینەو حەسوودیو باقی نەخۆشییە دەروونییەکانی تر، تا هەموو خەڵکی لە سەرخۆشەویستیو برایەتیو ئەمنو ئاسایش کۆ ببنەوەو یەکتری بگرنو کۆمەڵێکی ئاسودەو خۆشبەختی پێك بێنن.

## ئادەمیزاد بەگشتی پێویستی بەڕۆشنبیری ڕۆحی هەیە:

کۆمەڵی ئادەمیزاد ئەمڕۆ زۆر پێویستیان بەڕۆشنبیری گیانی هەیە، ئەو کۆمەڵە مادده پەرستەی کەلەژێر کاریگەریی بڕوایەکی پتەو بەوە کەبەپێش

کەوتنی لایەنی ماددی ئادەمیزاد دەگاتە لوتکەی خۆشبەختیو کەمال! بەلام ڕوداوەکانی ئەم سی چل ساڵەی ناوەڕاستی ئەم سەدەیە سەر لەبەر ئەم بڕوایەی هەڵوەشاندەوە ئاکامەکەی بەرەو ئاوەژوو هاتەوە، چونکە ئەو پێشکەوتنە مادییەی لەم چەرخەدا ئادەمیزاد پێی گەیی نەیتوانی ئەو بەروبوومەی لێی چاوە ڕوان دەکرا پێشکەشی ئادەمیزادی بکا! نەیتوانی خۆشبەختی بخاتە ناو کۆمەڵی مرۆڤەوە! بەڵکوو بەپێچەوانەوە چی وێرانکاریو ماڵوێرانی هەیە لەڕێگەی شەڕو شۆڕەوە کەوتە ناو کۆمەڵەوە، تا ئێستاش بەهێز بێهێز نێچیر دەکاو داگیرکەر دەمی ژنیوەتە لاکی کۆمەڵە ژێر دەستەکانو بێ وەجەکان، ئەم کۆمەڵ ئەو کۆمەڵ دەبوغزێنێ، سپی پێست، پێست ڕەشی ناوێو ڕەش بەخوێنی سەری سپی تینووە، ئەمە هەموو بەڵگەی ئەوەیە کە حەضارەتی ماددیو شۆڕشی پیشەسازی موفلیسنو ناتوانن ئادەمیزاد بەختەوەر بکەن چونکە هیچ ڕەوشتێکی ڕۆحییان تێدا نییە بۆیە دەبینین شاعیری هیندوستانی (تاغور) ڕەخنە لە شارستانییەتی دروستکراوی ئێستا دەگرێ، ئەو شارستانییەتەی کەلەسەر بناغەی عیلمو ماددە وەدی هێنراوەو هیچ لایەنێکی ڕۆحی تێدا نییە. شاعیری ناوبراو پێش مردنی بەچەند سەعاتێ: ئەم وتانەی بەیەکێ لە قوتابییەکانی گوتووەو دەڵێ: (ڕێکخستنی باری کۆمەلایەتی ئابووری ..... هتد. لەوانەیە بتوانێ سروشت ڕام بکا بۆ مرۆڤ، تا بتوانێ سوودی لێوەربگرێ، بەلام هەرگیز کاریگەری لەخودی مرۆڤەکەدا لەوە تێ ناپەڕێ کە دەیکاتە ئاژەڵێکی نایابو مومتازو بەس! هیچ کاتێك ڕێگایەك بۆ ئینسان ناکێشێ.. کەبەرەو ئاسۆی کەماڵی ڕۆحی ببیا، چونکە کەماڵی گیانی لەبڕوای من دا پەیوەندی نییە بە پێشکەوتنی ماددیو ڕاددەی پیشەسازییەوە، بەڵکوو کەماڵی ڕۆحی بریتییە لە جەوهەرێکی ئەبەدی جێگرتوو لەدەروونی ئێمەی مرۆڤ دا، جالە گەشەکردنی ماددیدا پێشکەوتوو بین یان دواکەوتوو بین هیچ لە مەوزوعەکە ناگۆڕێ.

جـا کـەوابوو پێویـستی سـەر شـانمانە کەلـەگیانی خۆمـان دابگـەڕێین بـۆ دۆزینـــەوەی ئـــەو جەوهـــەرە ئەبەدییـــە، لـــەدیاردەکانی بگـــەڕێین لـــەوهێزە هاوبەشـییەی نێـوان خۆمـانو خەڵـکی تـردا بگـەڕێین جـا چـەند هەسـت بەوهاوبـەشو ناکۆکییـە بکـەین، مانـای وایـە ئەومنـدە هـەنگاومان بـەرەو کـەماڵی ڕۆحی هەڵێناوە.

لەڕاستی دا زۆرکەس لەپێش ئێمـەوە دەرکـی ئـەم ڕاسـتییەیان کـردوە، بوونـە نموونـەی کـەماڵی ڕۆحـیو ڕەوشـت بـەرزی بـەبێ ئـەوەی شارسـتانییەتی وەکـوو شارسـتانییەتی ئێمـەیان هـەبوو بـێ یـان زانـستو پێـشکەوتووی ماددییـان وەکـوو ئێمـە بووبـێ. بێگومـان ئـەوان گرنگییـان داوە بەلایـەنی بـەخێوکردنی هێـزە ئەبەدییەکانو لەم بارەوە باخو نەمامیان ناشتوونو بەراویان ئاودێر کردون. ئیتر باخیـان خـەملێوەو گـوڵی کـردوەو بـەرو بـوومی بـووە کەوتوونـە خۆشـبەختی ژیانـەوە، دەی بـابزانین ئـەو هێـزە ئەبەدییانـە چـین؟ بێگومـان ئـەو هێزانـە خۆشەویستیو گیان بـەخت کـردنو لـەخۆبووردونو هـەموو ئەوشتە پیرۆزانەیـە کـەدەبن بـەهۆو هـەوێنی چەسـپاندنی ئـارامیو ئاشـتیو دادپـەروەریو برایـەتی لەنێوانی ئێمەی مرۆڤ دا.. سەیر ئەوەیە شارسـتانییەتی ئێمـە لەکنـە خـۆی پـشت بەڕێکخـستنی یاسـاو نیظـام دەبەسـتێ بـۆ پێـشکەوتنمان کەچـی نـابینین ئـەم ڕێکخستنە یاساییە بخاتە پاڵ بانگەوازییەکی گەرمو دڵ سـۆزانەی دوور لـە ڕەگـەز پەرستی بۆ ئـەو هێـزە ڕۆحیانـەی کـە پێویـستە ئێمـە کەڵـکیان لـێ وەربگـرینو پێیـان سـوود مەنـدبین وەکـوو چـۆن سـوود لەخـەڵوزو ئاسـنو بوخـارو کارەبـا وەردەگرین.

بەلای منەوە پێویستە سودو قازانجی خۆشەویـستیو برایـەتی لەتـەك سـوودو قـازانجی کارەبـادا بـەدەرس بـەمناڵان بخوێنـدرێ، قـازانجو مەنفەعـەتی دڵنـەرمی لەگەڵ خوێندنی قازانجی خـەڵوزو ئاسـن دا یـەك بخـرێ، واتـە پێویـستە سـۆزو دڵ نەرمیو خۆشەویستی ئەبەدی پەیوەندبکرێ بەزانستەکانو تەتبیقاتی عیلمییەوە

بەیەکەوە بەکاربهێنرێن، ئەگینا زانستەکانو تەتبیقاتەکەش بێهودە دەبنو بە پێچەوانەوە ئاکامیان دەبیو سۆزو عاتیفەکان ڕادەماڵیو ئادەمیزاد دەگێڕێتەوە بۆ نەفامیو نەزانی سەردەمی کۆنی..).

ئەمە پوختەی وتەکەی تاغووری شاعیر بوو، هەر لەم بارەوە زانای بەناوبانگو شارەزای ئەمریکی (أندروکونوای ایفی) دەڵێ: (لایەنە ڕۆحیو ئەخلاقییەکان دەورێکی گرینگیان هەیە لەژیانی ئادەمیزادداو ئامێرێکی گرینگن بۆ خۆشبەختی ئادەمیزادو ساغو سەلامەتی بەڵکوو ئەم لایەنانەو زانینیان زۆر گرنگترە لەزانینی ڕامکردنی سروشتو دەستگرتن بەسەری دا. بەڵێ ئاشکرایە قووڵبوونەوەو فێربوونی زانستە سروشتییەکان وامان لێ دەکەن ئەم جیهانەی تێیدا دەژین شارەزای ببین، جوان کشتوکاڵو پیشەسازیی بەرهەم بێننو بۆ خۆشبەختی خۆمان بەکاریان بهێنن، قەڵاچۆی میکرۆبو نەخۆشییە کوشندەکان بکەین. بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا موشکیلەی هەرەگەورە لەعالەمی ئەمڕۆمان دا موشکیلەی نەبوون (یاکەم)ی ئەخلاقی جوانو ئایینە، چونکە کەمتەرخەمی لەئاستی ئایینو ئەخلاقەوە نەخۆشییەکی کوشندەی ئەمڕۆمانە! موشکیلەی ئەمڕۆ ئەوەیە بزانینو فێربین کەوزەی (زەڕە) بەکار بهێندرێ بۆ خۆشبەختی ئادەمیزاد نەك بۆ وێرانکاریو دوا بڕینەوەو تارو مارکردن.

وا بزانین گەورەترین چێواشەیەك کەتوشی ئادەمیزادو کۆمەڵگای ئادەمی بووە، موشکیلەی دابەزینی ئەخلاقو ڕەوشتە، موشکیلەی دۆزینەوەی ڕێگای ڕاست بۆ دەربڕینی بڕیاری لەبارو گونجاوە!!.

## کۆمەڵەی چەك ڕەوشتییەکان (جمعية التسلح الخلقي):

هەر بۆ بەرگری لە دابەزینی ڕەوشتو ئەخلاق ئەمڕۆ چەند جەمعییەتێکی ئینسانی لە سویسراو شوێنی تریش دامەزرێنراون، یەکێك لەم جەمعییەتانە جەمعییەتی چەك ڕەوشتییەکانە کە پرۆفیسۆر (فرانك بکمان) دایمەزراند، بەو

هیوایە بتوانێ لەرێی ڕەوێتی تاکەکانەوە کۆمەڵگاکەی بگۆڕێ. بەرنامەی کارکردنی ئەم کۆمەڵە بریتییە لەوە کە هەریەکێك لەتاکەکانی کۆمەڵ خۆی برازێنێتەوە بەمەبدەئو ڕەوشتێکی بەرزو بێ خەوشەوە. هەوڵ بدا هەردەم بەتەواوی ئەنجامیان بدا، لایەنی سەرەکیو گرینگیش لەم مەبدەئە رەوشت پەروەرەدا ڕووتێکردن لەخودایەو گوێ ڕاگرتنو فەرمانبەرداری تەواو بۆ فەرمانو ئامۆژگارییەکانییەتی، بەجۆرێك حاڵەتێکی وا لە خۆی دا دروست بکا کە موحاسەبەی خۆی بکا هەر کە گوناهێکی لێ ڕوودا خێرا ژێوان ببێتەوەو سور بێ لەسەر ئەوە جارێکی تر شتی وای لێ ڕونەداتەوە، هاریکاری لەگەڵ دەوروبەری خۆی دا بکا بۆ وەدی هێنانی ئەو مەبدەئە بەرزانەو بڵاوبوونەوەیان لەناو کۆمەڵ دا.

زۆر سەیرە ئەمرۆ کۆمەڵی ئادەمیزادمان وای لێ هاتووە بەکردەوە پچڕ پچڕیو جیابوونەوە نیشانەی هەرە ئاشکرامانە بەقسەش یەکیەتی داوای هەرەزومانە. لێك دابڕانو لێك جیابوونەوەو دووبەرەکی ئاکامی تەکەببورو دڵ پیسیو ئارەزو بازیو تەماعکارین ئەمانەش دروستکراوی ماددە پەرستیو نیشانەی هەرە ئاشکرای ئەو ڕێبازەن.

قورئانی پیرۆز بۆ بەربەرەکانی ئەو ڕێبازەو بۆ دابین کردنی خۆشبەختیو ئەمنو ئاسایش باشترین بناغەو پایەی رۆحیو ئەخلاقی لەخۆ گرتوونو چاکترین ئامێرو وەسیلەی ئاسایشو ئارامیو برایەتیو خۆشبەختی بۆ دانیشتوانی سەر زەوی هێناوە، بەڵام سەد مخابن تا دەرحاڵ ئەم مەبادیئانەی قورئانی پیرۆز بۆ زۆربەی گەلانی سەرزەوی نەزانراون تەنانەت ئەو موفەککیرو هۆشمەندانەی کە عەودالن بەشوێن هۆو وەسیلەی کاریگەر بۆ بڵاوکردنەوەی ئارامیو خۆشەویستی لەناو خەڵکا ئەوانیش بەچاوێکی وردینی یەوە لەم مەبادیئانە وردنە بوونەتەوە وەکوو دوڕڕێکی ناو صەدەف لەبنکی دەریادا پەی پێ نەبراوە.

بـەکورتی ئـەم دیاردانـە بوونـە پاڵپێوەنـەرمان بـۆ نووسـینی ئـەم باسـانەی کەلەمەولا دەخرێنە پێش چاو، بەڵکوو لەسۆنگەی ئـەو باسانەوە بتـوانین چـەند بەڵگەیەك بخەینە ڕوو لەسەر ئەوەی کە ئایینی ئیسلام داهاتووی نزیکی مرۆیە.

## یاسای ڕۆحی لەنیگای زوربەی ئایینەکانەوە:

یاسای ڕۆحـی لـە ئـایینی ئیـسلام دا چـییەو چۆنـە؟! ئـەم مەسـەلەیە شـتێکی گرینگـە، زۆر پێویـستە بـچینە بـنجو بنـاوانیو لـێی حـاڵی ببینو تێـی بگـەین، بۆئــەوە بتــوانین جیــاوازیی نێــوان ئــایینی ئیــسلامو ئاییــنــەکانو ڕێبــازە فەلسەفییەکانی تر دەربخەین. ئـەوەی کـە بـاوەو لـەناوەو لـەگۆڕەپانی ئایینـەکانو ڕێبـازە فەلـسەفییەکان دایـە، ئەوەیـە کـە بەرژەوەنـدی ڕۆحو لاشـە دژ بەیـەکنو هەرگیز مەحاڵە ڕۆحو لاشە لە تەك یەك نەشو نما بکـەنو پێکـەوە بـەرەو پـێش بـچن.. چـونکە بـە بۆچـونی ئـەوان لاشـەو عالـەمی مـاددە بەندینخانـەی گیـانن، پەیوەندییــە دنیاییــەکانو نقــوم بــوون لــەڕابواردنی دونــاییو ئارەزوکــاری دا زنجیرێکن گیانی ئادەمیزاد پێوەند دەکەنو هەستو خوستی لـێ دەبڕن!.

لەئاکامو بەرهەمی ئەم فیکرەدا جیاوازییـەکی سـەد دەرسـەد کەتوۆتـە نێـوان مـاددەو ڕۆحــەوە، جـا ئەوانــەی ڕێبــازی ماددیــان هەڵبــژاردووە هــەر لەهــەوەڵ هەنگاوەوە نائومێـد بـوون لـەوەی کـەبتوانن گەشـە بـە لایەنـە ڕۆحییەکـە بـدەنو لەهـەمان کـات دا لەگـەڵ لایەنـە ماددیەکـەدا بـڕۆن!! ئـیتر نـوقمی عالـەمی مـاددە بونو لەلایەنە ڕۆحییەکە دوور کەوتونەوە.

ئەوانەیش لایەنە ڕۆحییەکەیان پەسـەند کـرد بـۆ مـشتو مـاڵ کردنـی ڕۆحو پـەروەردەکردنی چـەند ڕێبـازو بەرنامەیـەکیان هێنایـە کایـەوە بەتـەواوی لـەکارو باری دونیایی دووری خستنەوە چـونکە لـەنیگای ئەمانـەوەو بـە بۆچـونی خۆیـان پێیان مەحاڵ بوو کەڕێبازێك هەبێ بۆ گەشەکردنی ڕۆح کەئـەو ڕێبـازە تێکـەڵاوی ژیانی ئـەم جیهانـەو کـارو بـاری ببـێ؟! گوایـە بەقـسەی ئـەوان بـێ، ئـاوو ئـاگر بـە

یەکەوە ناگونجێن لەبەر ئەوە دەبینین لەپێناوی ڕۆح دا هەموو کارو پێویستیەکی لاشەیان پاش گوێ خستووە، لەم ڕووەوە دەبینن وەرزش و خۆماندووکردنی وایان داهێناوە بەتەواوی ئارەزۆی نەفس قەلاچۆ دەکا. بە نموونە بەراهیمەو بوذی لەهیندستان دا بڕی ڕێبازو دیانەتی تریش لەم بارەوە زیادە ڕەوییان کردوە، هیوایان هەیە زیاد لەمەش خۆیان دەپێچن و کۆڵی خۆیان قورس دەکەن، یان لەسەر نووکە بزمار دادەنیشن و دەنوون، کاتێکیش سەیری ئایینی مەسیحی دەکەین دەبینین ئایینێکی دنیا نەویستی هەڵەوگێڕ بەکارو باری گیانەوەیەو بەس. ئەمە بەپێی قسەو دەقی نامە ئایینیەکانیان، بەلام بەپێی کردەوەو ڕەفتاریان کەوان لەبەرچاومان دوور ترین میللەتن لەگیان ویستی و نزیکترین کەسن بەدنیا پەرستی، ئەمڕۆ ئەوروپاو ئەمریکاو دەوڵەتە مەسیحییەکان پێشەواو پێشەنگی ئەم هەموو هەوەس و ئارەزوو پەرستییە کە بەچاوی خۆمان دەیبینین، نە شەرم ما نەقییەم ما، نەترسی خودا ما نەدین و دیانەت ما، بەڕاستی ئێستا لەباتی ئەقانیمی (ثلاثة) کەی جاران ئەم (ثالوثة) دەپەرستن (ورگ و ناوگەڵ و پارەو پوول).

## بەشی یازدەهەم:

# پەیوەندی ئادەمیزاد بەدنیاو لەنیگای ئیسلامەوە

**میانڕەوی لەنێوان ڕۆح و لاشەدا - هەڵبژاردنی قیامەت و باوادانی بەسەر دونیادا - هەرەشە کردن و لە لەخۆبایی بوون و دەستەخەرو بوون بەخۆشی ژیانەوە - دونیا تاقیگای مرۆڤە - قورئانی پیرۆز لەزەحمەتی ماڵ کەم دەکاتەوەو دەبێ بەهۆی ئەوە ماڵ ماڵی ڕەحمەت بێ.**

## میانڕەوی لەنێوان داخوازی ڕۆح و لاشەدا:

ئایینی ئیسلامی پیرۆز جیاوازیی لەگەڵ ئایینە ناسراوەکانی تردا لەوەدایە کە ددان بەگرنگی ڕۆح و لەش دادەنێ و داوا دەکا کە داخوازییەکانی هەردوو لا (ڕۆح و لەش) دابین بکرێن، هەرگیز ئیسلام فەرمان ناکا بەموسوڵمان کە نەفسی خۆی لەخۆشییە مادییەکان بگرێتەوە بەمەرجێك ئەو نازو نیعمەتانە حەڵاڵ بن و لە ڕێگای مەشروعەوە بۆیان بچێ و لەئەندازەی عادەتی تێپەڕ نەکەن، تەنانەت ئێمە دەبینین زوربەی ئایەتەکانی قورئان خەڵك هەڵ دەنێن کە هەردوو لایەنەکە (ڕۆح و مادده) بەیەکەوە پەروەردە بکەن و داخوازی هەردوو لا دابین بکەن.

قورئان دەفەرموێ: {وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا وَأَحْسِن كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ} سورة القصص (٧٧).

واتە: ئەی گرۆهی ئادەمیزاد ئەو ماڵ و داراییەی خودا بەتۆی داوە هەوڵ بدە لەوشتانەدا سەرفی بکە کە خودا پێی خۆشەو بۆ ئەو دونیا سوودی لێ دەبینی و فریات دەکەوێ، بەڵام هەرگیز نەچی لەم ئاکارەدا زیادە ڕەوی بکەی و هەر لایەنی قیامەتی بگری و دنیا پاش گوێ بخەی! نەکەی بەشی خۆت و پێویستی ژیانت لەدنیا واز لێ بێنی و لەلەززەتی حەڵاڵ و زوڵاڵ دەست بەرداربی! بەڵکوو پێویستە لەنیعمەتەکانی خودا کەڵك وەربگرێ و داخوازی جیسمت بەحەڵاڵی دابین بکەی، ئەوەشت لەبیر نەچێ یارمەتی فەقیرو هەژاران بدە چاکەیان لەگەڵ دا بکە، هەروەکوو چۆن خودا چاکەی لەگەڵ تۆ کردوە، ئەو هەموو نازو نیعمەتەی بەسەردا ڕشتوی. هەروەها ئیسلام بۆ شوێن کەوتوانی ڕەوای بینیوە کە خۆیان

بڕازێننــەوە جلو بــەرگی جـوان لەبـەر بکـەنو خـواردنی خـۆشو بـەتام بخـۆنو خواردنــەوەی خـۆش نـۆش بکـەن، بەمــەرجێك لەئەنـدازەی خـۆی دەرنەچـێو زیادەڕەوی نەکا.

خودا دەفەرموێ: {يَا بَنِي آدَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وكُلُواْ وَاشْرَبُواْ وَلاَ تُسْرِفُواْ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ، قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللّهِ الَّتِيَ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالْطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ قُلْ هِي لِلَّذِينَ آمَنُواْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ} سورة الأعراف (٣١-٣٢).

لـەم ئایەتـەدا پـەروەردگار فـەرمان بـە بەنـدەکانی خـۆی دەکـا کـەجلی جـوانو نایاب لەبەر بکەن، کاتێ دەچن بۆ مزگەوت بۆ نوێژ یان خـەریکی تـەوافی کەعبـە دەبن، شەرمگای خۆیان داپۆشـنو حیـشمەت ئـامێزبن، ئـەمجار فـەرمانیان پێدەکـا کە بخۆنو بخۆنەوە، بەڵام زیادە ڕۆیی نەکەن چونکە زیـادەڕۆیی لەهـەموو شـتێك دا موخالیفو پێچەوانەی فەرمانی خودایە!

ئەی موحەممەد! بەو مەردوومە بڵێ: کێحەرامی کردوە کە بەندەکانی خـودا خۆیــان بڕازێننــەوەو جــلو پۆشــاکی بــاش بپۆشــنو ئەنــدامی خۆیــان ڕێـكو پێکبخـەن؟ یـان کـێ لـێی مـەنع کـردون کـەخواردنو خواردنـەوەی خـۆش نـۆش بکەن؟! خودا شتی وای حەرام نەکردوە، کەواتە پێیان بفەرموو: ئەم بەهرەو نازو نیعمەتانە لەژیانی جیهان دا خودالەبـەر خـاتری بـڕوادارو ئیمانـدارەکان دروسـتی کردوون بەهۆی ئەوانەوەیە کە بێبڕواکان لێی دەخۆن بەڵام لـەژیانی قیامـەت دا ئــەو لیبــاسو خــواردنو خواردنەوەیــە ئــەو ئەســبابی تــەدارەكو ڕازاندنەوەیــە تایبـەتە بە ئیمانداران‌و هەر ئەوان سوودی لێ وەردەگرن، ئاوا بـەو شـێوەیە ئێمـە نیـشانەی گـەورەیی خۆمـان ڕون دەکەینـەوە بـۆ کەسـانێك هۆشمەنـدبنو زانـابنو هەست بەچاکەو خراپە بکەن!!

لەلایەکی ترەوە پـەروەردگار موسـوڵمانان شـارەزا دەکـا بۆئـەوەی بـزانن چـۆن لەخودا دەپاڕێنەوە،پێیان دەفەرموێ: کە پێویستە نزاو پاڕانەوەیان بەجۆرێك بـێ داخوازی قیامەتی تێدا بێ.

{فَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا وَمَا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ خَلاَقٍ، وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ، أُولَئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُواْ وَاللّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ} سورة البقرة (٢٠٠-٢٠٢).

واتە:هەندێك ئادەمیزاد هەن هەر هەڵپەی دونیایانەو داوا لە خوا دەكەن كەماڵو دارایییان بداتێ ئەوانە لەڕۆژی دوایی دا هیچ بەشو بارێكیان نییە تاقمێكی تر هەن دوعاو نزایان ئەوەیە لەخودای خۆیانو دەڵێن: خودایە لەجیهان دا چاكەمان پێ ببەخشەو لەڕۆژی قیامەتیشا هەر چاكەمان بدەرێ، لەنیعمەتی خۆت بێبەشمان مەكەو لەسزای ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە، ئەم تاقمە بەشێكی گەورەیان هەیە لەبەر خاتری كردەوە باشەكانیانو دوعاكانیشیان وەردەگیرێنو پاداشی خۆیان وەردەگرن. پەروەردگار حیسابو لێپرسینەوەی سزاو پاداشی ئەو عالەمە زۆر زوو بەئەنجام دەگەیەنێ.

لەشوێنێكی تردا قورئان دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُحَرِّمُواْ طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللّهُ لَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ، وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ اللّهُ حَلاَلاً طَيِّبًا وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِيَ أَنتُم بِهِ مُؤْمِنُونَ} سورة المائدة (٨٧-٨٨).

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان بەخوداو ئایینی خودا هەیە نەچن ئەو ڕزقو ڕۆزیو نیعمەتانەی خودا بۆی حەڵاڵ كردوونو ڕێگای داون لەززەتیان لێوەرگرن هەروا بەهەوانتە لەخۆتانی حەرام بكەنو پارێزی لێ بكەن نەكەن شتی وابكەن تەعەدداو زیادەڕەوی‌مەكەنو لەسنووری فەرمانی خودا دەرمەچن، چونكەخودا سەرپێچی كەرانو لەسنوور دەرچوانی خۆش ناوێ، بخۆنو بخۆنەوە لەو ڕزقو ڕۆزییەی خودا بۆی ڕەخساندون ئەوە حەڵاڵو پاكو خاوێنە، خۆتان بپارێزن لەسزای ئەو خودایەی‌ئێوە بڕواتان پێیەتی.

ئەوەی لەم ئایەتەدا سەرنجی ئینسان ڕادەكێشێ ئەوەیە كە پەروەردگار حەرام كردنی شتی حەڵاڵو گرتنەوەی نەفسی لێ‌ی، داناوە بەئیعتداو دەرچوون لەڕێبازی‌ئاسایی نێوان ڕۆحو جەستە. وا بەبەرچاوی هەموو مانەوەیەو دەبینن كە ئیسلام چەند بەكوڵو بەدڵ گرینگی دەدا بەهەردو لایەنەكەو دەفەرموێ:

{هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً} سورة البقرة (٢٩).

یان دەفەرموێ: {وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ} سورة الجاثية (١٣).

واتە: پەروەردگار چی لەئاسمانەکانو زەوی دا هەیە لەخۆرو مانگو ئەستێرەو بارانو هەورو با ...تاد. هەمووی (بە مەحضی رەحمەتی خۆی) بۆ سودوقازانجی ئێوەی تەسخیروڕام کردوە! بەڕاستی لەم تەسخیرکرنەدا نیشانەی خودایەتی خودا زۆرنو بەتایبەتی بۆ کەسانێك بیر لە بوونەوەر بکەنەوە.

بەڵێ: ئەو دوو ئایەتە ئاماژە دەکەن بۆ ئەندازەی دەسەڵاتی ئادەمیزاد بەسەر سروشت دا، ئاشکراشە ئەم جۆرە ئاماژە بۆکردنە بە موعجیزەیەکی فەلسەفی قورئان دەژمێردرێ.. پێش سەدەی نۆزدە کەس ئاماژەی بۆنەکردوە، ئەوکاتەی قورئان ئاماژەی بۆ ئەم لایەنە کردوە ئەم گەردوونە هەمیشە بەدەرپایەکی بێ سەروبنی سامناکی نەزانراو لەقەڵەم دراوە! بەڵام ئەمڕۆ دوای ئەوەی ئادەمیزاد توانی سروشت بۆ قازانجی خۆی تەسخیر بکا دەتوانین بەدڵنیاییەوە بڵێین ئیسلام کەشفی ئەم لایەنە زانستییەی کردوە پێش ئەوەی بۆ ئەمە تروسکایی بەدی بکرێ!.

بەڵکوو پێش ئەوەی ئادەمیزاد لەبەردەوامی ژیانی خۆی دڵنیا بێ لەسەر زەوی ئەو ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە کە ڕۆژێك دێ ئادەمیزاد سروشت تەسخیر دەکا بۆ سوودو قازانجی خۆی.

هەر لەم ڕوانگەیەوە کە پێغەمبەر دەفەرموێ: (لا رهبانية في الإسلام).

واتە: ڕەبەنی لەئایینی ئیسلام دا نییە، چونکە ڕێبازی ڕەبەنیەتی وادەکا بەندە چاکەکانی خودا هەر بەخۆیانەوە خەریك بنو گرینگی هەر بەڕزگاربوونی خۆیان بدەنو گۆشەگیری کەنیشتەو مزگەوتو عیبادەتگای خۆیان ببنو جڵەوی کارو باری مەردووم بکەوێتە دەست کەسانێك کەئامانجیان خراپەکاریو وێرانکارییە لەسەر زەوی. قورئانی پیرۆزیش دەربارەی ئەو ڕەبەنیەتەی کەلای مەسیحییەکان هەیە، دەفەرموێ:

{ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَى آثَارِهِم بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَآتَيْنَاهُ الْإِنجِيلَ وَجَعَلْنَا فِي قُلُوبِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ابْتِغَاء رِضْوَانِ اللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا فَآتَيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ} سورة الحديد (٢٧).

واتە:ئەو رەبەنیەتەی کە گاورەکان خۆیان دایان هێناو بۆ خۆیان لەسەر خۆیان فەرز کرد.. ئیتر خودای پەروەردگاریش لەم ڕووەوە لەسەری واجب کردن چونکە تاعەتو فوتۆ (نذر)کردن کاتێ بەندە لەسەر خۆی بەلازم بگێڕێ خوداش لەسەری فەرز دەکا، بۆیەش پەروەردگار ئەو رەبەنیەتەی لەسەر گاورەکان واجب کردتالەم ڕێگایەوە ڕەزامەندی خودا بەدەست بێنن، چونکە ڕەبەنیەتیش خۆی لەخۆی دا بریتییە لە خواپەرستیو لەخودا ترسان ئەمەش شتێکی پیرۆزە، هەرچەندە هەندێ رەبەن (راهب) دابو نەریتەکەیان تێك داو {فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا} وەکوو پێویست پارێزگارییان نەکرد، بەڵام ئەوانەی لەبەرخاتری خودا خۆیان کردوە بەرەبەنو بەبیرو بڕوا لەخودا نزیکبوونەوە گۆشە گیربوون ئەوانە پاداشیان لای خودایەو ئەو چاکەیان دەداتەوە، ئەوانەیش کە خراپەیان لەگەڵ ڕێبازی ڕەبەنی دا کرد، وەکوو پێویست مافی خۆیان نەدایە، ئەوانە سەرپێچی کەرو لەڕێ دەرچووی فەرمانی خودان، کەوابوو ڕێگای ڕاستو حەق ئەوەیە کە ئیسلام ڕەچاوی کردوە، کۆبوونەوەی رۆحو ماددەی بەڕەوا بینیوە، ئیعتیرافی بە گرینگی هەردوو لا کردوە، ئەمەش فیترەتی ئادەمیزاد وەری دەگرێو هەزمی دەکا، کەوابوو پەروەردگار بەبێ هودەو بێ سەبەب ئارەزوو شەهوەتی لەئادەمیزاد دادروست نەکردوە، یان بۆیە دروستی نەکردون بەریازەو چلەکیشی سەرکوت بکرێن بەڵکوو بۆیە لەئادەمیزاد دا ئارەزوو شەهوەتی دروست کردوە تاوەکوو بتوانێ جڵەویان بگرێو بەرەو ئاسۆی خۆشبەختی رەهایان بکا. کەوابوو حاڵەتێکی مام ناوەندی لەنێوان ڕۆح پەروەردە کردنێکی موتە تەریفو ماددە پەرستییەکی زیادەڕەودا حاڵەتێکە ژیانی کۆمەڵایەتی داواکاریەتیو گونجاوو

لەبارە بۆ کۆمەڵی ئادەمیزاد، ئاشکراشە هیچ ئایینو یاساو نیزامو تەعلیماتێك نییە بەم جۆرە وەکوو ئیسلام ئەوحاڵەتە ناوەندییەی لەخۆ گرتبێ.

## بەگەنکردنی قیامەتو هەڵبژاردنی بەسەر جیهان دا:

ئایینی ئیسلام کەئەو رێبازە مام ناوەندییەی لەنێوان ڕۆحو جەستەدا گرتووەو پەسەندی کردوە مانای ئەوە نییە ڕۆحو بەدەن پلەیان یەکسانەو وەکوو یەك وان، نەخەیر ئەوە مەبەست نییە، بەڵکوو حیکمەتی خوداوای ویستووە کە ئایینی ئیسلام لەسەر بناغەی زانستو یاساکانی سروشت هەڵبچنرێ، زانستی تازەش ئەوەی چەسپاندووە کە عەقڵی تەواو کامڵ لەلەشی ساغو سەلیم دایە، لەشی ساغو هۆشی ساخیان وتووە. هەروەها مشتو ماڵبوونی ڕۆح بەوە پەیدا نابێ لەپێداویستییەکانی جەستە بگریەوە، بەڵکوو مشتو ماڵکردنی ڕۆح بەوە دەبێ دەخوازییەکانی جەستە بەشێوەیەکی مام ناوەندی دابین بکرێن، بەڵام ئەوەمان لەیاد نەچێ کە قورئانی پیرۆز لەگەڵ ئەوەشدا هەردەم ئەوە دەچەسپێنێ کە ژیانی قیامەت چاکترە لەژیانی دونیا، وەکە ماڵی ڕۆحی ئاکامو غایەو مەبەستێکە پێویستە هەموو موسوڵمانێك خۆی بۆ بکوتێ، هەڵپەی بۆبکا، هەر لەبەر ئەمەیە کە پەروەردگار خەڵکی هۆشیار دەکاتەوە کە کردەوەی چاکی خۆیان بکەن بە تێشوو لەپێش خۆیانەوە ڕەوانەی بکەنو دەیانترسێنێ لەوەی کە بەتەواوی بەدنیاوە بلکێنو قیامەت فەرامۆش بکەن.

**{مَن كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لاَ يُبْخَسُونَ، {أُوْلَئِكَ الَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ إِلاَّ النَّارُ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَاطِلٌ مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ} سورة هود (١٥-١٦).**

واتە: کەسێك هەر هەوڵی دونیای بێو کردەوەکانی مەبەستی بەشی دونیایی بێ، لەدنیادا پاداشی بەوە دەدرێتەوە لەشی ساغو دڵی ئارامو دەوڵەمەندیو پلەو پایەی بەرزی دەبێو لەدونیادا بەتەواوی پاداشی خۆی وەردەگرێتەوە. بەڵام ئەوانە چونکە بەکردەوەکانیان مەبەستی قیامەتیان نەبووە، ئەوان لەوێ دا هیچ

پاداش و بەش و باریکیان نییە جگە لە ئاگری دۆزەخ، کردەوەکانی دونیایان بەبێ هودە دەڕواو هیچ سوودی لێ نابینن، چییان کردوە پوچ و بەتاڵ و بێ سوود دەبێ. لەشوێنێکی تردا کە پەروەردگار وەسفی بەندە نزیکەکانی خۆی دەکا سەلاوی ترازوی قیامەت بەسەر جیهان دا دەداتەوەو دەفەرموێ:

**{وَقِيلَ لِلَّذِينَ اتَّقَوْاْ مَاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ قَالُواْ خَيْرًا لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ فِي هَذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ وَلَدَارُ الآخِرَةِ خَيْرٌ وَلَنِعْمَ دَارُ الْمُتَّقِينَ} سورة النحل (٣٠).**

فەرموویان بەخاوەن تەقواو لەخودا ترسەکان ئەرێ خەڵاتی پەروەردگاری ئێوە کە ناردوویەتی بۆتان چی بوو؟ دەرحاڵ فەرموویان: خەڵاتێ خەڵاتی خودا بێ و بۆ بەندە نزیکەکانی بارەگای خۆی بێ دیارە خێرێکی گەلێ گەورەیە. بەڵێ قسەکەیان ڕاستەو دروستە، ئەوانەی چاکەیان کردوە بەپیشەی خۆیان لەهەردوو جیهان داپاداشێ کە لەقیامەت دا وەری دەگرن گەلێ باشترە لەهی دونیا، بەڕاستی جێگای حەوانەوەو موسوڵمانی خوداپەرستی ڕاستاڵ لەقیامەت دا شوێنێکی فرەباش و خاسە.

بەکورتی: لە قورئانی پیرۆزدا چەند جار سەلاوی ترازوی قیامەت بەسەر جیهان دا دەداتەوە، لەزۆر ئایەت دا تەفضیلی قیامەت دراوە، وەکوو ئەم ئایەتانە: **{وَمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ وَإِنَّ الدَّارَ الْآخِرَةَ لَهِيَ الْحَيَوَانُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ} سورة العنكبوت (٦٤).**

واتە: ئەم ژیانی دونیایە تەنها بریتییە لە گاڵتەو گەپ و منداڵ بازاڕی، هەرگیز بەقای پێ ناکرێ، بەڕاستی ژیان ژیانی قیامەتە نەمان و فەوتانی بەدوودا نایە، ئەگەر ئێوە تۆزێك زانا بونایە هەرگیز تەفضیلی ئەم دنیا بێ بەقایەتان نەدەدا بەسەر ژیانی قیامەت دا کە هەرگیز نابڕێتەوە.

یان دەفەرموێ: **{بَلْ تُؤْثِرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا، وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَى} سورة الأعلى (١٦-١٧).**

واتـە: ئێـوە هەڵـەن کـە هـەوڵ بـۆ دنیـا دەدەن ئـەوتا ئێـوە ژیـانی خۆشـیو ڕابواردنی دنیای بێ بەقاتان پەسەند کـردوە، خـۆ ژیـانی دوا ڕۆژ باشـترو پایـەدارە هەق وایە ئێوە هەوڵ بۆ ئەو بدەن.

بڕواش بەهەبوونی ژیانێکی تری باشتر لەژیانی دونیا صـەبرو ئـارام دەخاتـە دڵی زامدارو بریندار بەجەخارو بەلای دونیاییـەوە، لەهـەمان کـات دا ئـەم بڕوایـە هێزێکی گیـانی بەموسـوڵمانان دەبەخـشێ بـەجۆرێك کە گـوێ نـەدەن بەتێـشکانو فاشیل بوونیان لەژیانی دنیادا ئەگەر سووچی خۆیانی تیا نەبێ.

## هەڕەشە کردن لەدەسخەڕۆ بوون بەخۆشیو لەززەتی دنیاوە:

قورئــانی پــیرۆز وەســفی دونیــای کــردوەو زەمیــشی کــردوە خەڵکیــشی ترساندووەو هەڕەشەی لێ کردون کە بەدنیا هەڵنەخەڵەتێن.

{اعْلَمُوا أَنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِي الْأَمْوَالِ وَالْأَوْلَادِ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ الْكُفَّارَ نَبَاتُهُ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَاهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَامًا وَفِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانٌ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا مَتَاعُ الْغُرُورِ} سورة الحديد (٢٠).

لەم ئایەتەدا پەروەردگار وەسفی ئەم ژیانەی کردوە بەوە کە بریتییە لەگاڵتەو گەمەو خۆڕازاندنەوەو خۆ هەڵنانەوە لەناو یەکتری دا بەپلەو پایـەو جێگـاو ڕێگـاو باوكو باپیر، یان بە زۆری مـاڵو دارایـیو منـداڵو وەچە، ئـەم ڕواڵـەتو دیاردانـە وەکوو بارانێکی بەخێرو بێـری واوایـە کـە وەرزێـرو فـەلاحو سـەپان سەرسـام بکـا، بۆیـە دەفـەرموێ: ئـەوەی کـە ئێـوە بەلاتانـەوە عەجایبـە لەڕاسـتی دا لـەززەتێکی ناپایەدارە، هەر زوو سەرنگوون دەبێ کوتو مت لەوبارانە دەچێ کەڕووەكو گوڵو گـوڵزارێکی زۆرو ڕازاوە دەڕوێنــێ بــەڕەنگێکی وا فــەلاحووەرزێرەکان لەخۆشــیانا سەرسام دەبنو گەشکە دەگـرن بـەڵام زۆری پـێ ناچـێ زەرد هەڵدەگـەڕێو دەبێتـە پۆشو پەلاش.

لەسورەتی (کەهف)یش دا بەم شێوەیە وەسفی دونیا دەکا:

{وَاضْرِبْ لَهُم مَّثَلَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاء أَنزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاء فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الْأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ الرِّيَاحُ وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ مُّقْتَدِرًا، الْمَالُ وَالْبَنُونَ زِينَةُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا} سورة الكهف (٤٥-٤٦).

واتەی ئەی موحەممەد! بۆ ئەو مەردومە (بەپەندو ئامۆژگاری) وێنەی ژیانی دونیایان بۆ بێنەوە بڵێ: ژیانی دونیا لەجوانیو ڕازاوەییو زوو بەسەرچوونی دا وەکوو بارانێك وایە کە ئێمە لەلای ئاسمانەوەدەیبارێنین بەهۆی ئەو بارانەوە دانەوێڵەو شینایيو ڕووەکی هەمە جۆر لەسەر ڕووی عەرد دەڕوێنو لەیەك دەئاڵێنو سەر بە سەری یەکترەوە دەنێن وەك دوو خۆشەویست دەستەملانی یەکدی دەبن، لەسەرەتاوە چەکەرەو چووزەرە دەکەنو بەربەرە ڕووی زەوی بەتارای سەوزو سوورو زەردی خۆیان دەڕازێننەوە، دوایی ئەوەندەی پێناچێ زەرد هەڵدەگەڕێو وشك دەبێ با پەرتوو بڵاویان دەکاتەوە، ژیانی دونیاش هەر بەو شێوەیەو پایەدار نییەو زوو بەسەر دەچێ! ئەمانە هەموویان بەدەست خودای گەورەنو ئەویش بەسەر هەموو شتێك دا خاوەن دەسەڵاتو بەتوانایە. ماڵو دارایيو کوڕوکچ، ئامێری ڕازاندنەوەی ڕواڵەتی ژیانی دونیان، لەقیامەت دا سودو بایەخیان نابێ ئەگەر لەڕێگەی ڕەزامەندی خودادا سەرف نەکرێن، کردەوەی چاكو تاعەتو خوداپەرستی لای خودا دەمێننەوەو زۆر باشترن لەو ماڵو دارایيەی کە لەڕێگای خودادا سەرف نەکرێن.

بەکورتی پەروەردگار لەم ئایەتەدا تەشبیهی خۆشيو زوو بە سەرچوونی ژیانی دونیای کردوە بەچۆنیەتی ڕوەکێك کە پەروەردە دەبێ سەوزو تەڕو تازە ماوەیەك خۆ دەنوێنێ، دوایی دەبێتە پوشو پەڵاشو باوو بۆران تەفرو تونای دەکا، جا لەبەر ئەوە پێویستە ئادەمیزاد بەماڵو دارایی، بەزۆری کوڕو کچ لەخۆبایی نەبێ بەڵکوو کردەوەی چاك لای خودا پاداشی بەردەوامی هەیەو هۆی خێرو خۆشی ئەو دونیایە.

لەئایەتێکی تردا پەروەردگار بانگەوازی دەکاتە هەموو ئادەمیزادو دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِاللَّهِ الْغَرُورُ} سورة فاطر (٥).

واتە: ئەی خەڵکینە وەعدو پەیمانێك کە خودا پێی داون بە زیندوو بونەوەو پاداش دانەوەتان لەسەر کردەوەکانتان لەڕۆژی قیامەت دا حەقو ڕاستە، کەوایە باخۆشی دونیا ئێوە غافڵ نەکا لەنازو نیعمەتی بەهەشت باشەیتان زەفەرتان لێ نەبینێو هەڵتان نەخەڵەتێنێ! نەچێتە بن کلێشەتانەوەو پێتان بڵێ: خودا غەفورو ڕەحیمەو لێتان خۆش دەبێ بەم هیوایەوە ئێوە لەسەر گوناهکردن بەردەوام بن.

## جیهان تاقیکردنەوەی ئادەمیزادە (الدنيا إمتحان للبشر):

قورئانی پیرۆز دونیای داناوە بەشوێنی تاقیکردنەوەی ئادەمیزاد، وای داناوە کە جیهان هۆو وەسیلەیە بۆ بەمراد گەییشتن لەو دونیادا، هەموو کاتو ساتێکی ژیان لەماڵەوە لەبازاڕ لەکارگە لەدائیرەو مەطعەمو ئەنجومەنو یانەو .....تاد. ئەم کاتانە هەموویان کاتی تاقیکردنەوەن بۆ ئادەمیزاد.

خودا دەفەرموێ: {أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ، وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ} سورة العنكبوت (٢-٣).

واتە: ئایا ئەو خەڵکە پێیان وایە هەر بەوەندە بەدەمو بەڕواڵەت بڵێن: بڕوامان هەیە وازیان لێ دەهێنرێ؟ هەر بەوەندە بڵێن: ئیمانمان هێنا (بەو هیوایەی لەکۆمەڵی بڕوادار بژمێردرێن) ئیتر بەسیانەو بەبێ تاقیکردنەوەیەکی وا دەربکەوێ ئایا ڕاست دەکەن یان درۆ وازیان لێدەهێنرێ؟ هەرگیز شتی وا نەبوەو نابێ، پەروەردگار زۆر گەلو هۆزی پێشینانی تاقیکردۆتەوە،جۆرەها تەنگو چەڵەمەی پێبینیون هەتا ڕاستگۆو درۆزن لێك جیاببنەوە، بێگومان بۆگرۆهی موسوڵمانیش هەمان تاقیکردنەوە ئەنجام دەدا، چونکە ڕێبازی نەجاتو

سەرفرازی لەئیسلام دا بریتی نییە لەخۆ بەئایین هەڵواسین و بەقسە بڵێی موسوڵمانم و بەس، بەڵكوو دەبێ كاریگەری ئەو ئایینە لەسەر پەیڕەوكەرەكەی لەناسكترین سات و كات دا دیاریی بدا، لەخۆشی و ناخۆشی دا نیشانەی پەیڕەوی كردنی ئەو باوەڕەی پێوە دیار بێ. خێرو شەڕ چاكەو خراپە تاقیكردنەوەیە بۆ ناوەرۆكی ئایینەكەی و ئەندازەی پەیڕەوی كردنی، لەبەر ئەوەیە خودا دەفەرموێ:

{وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّى نَعْلَمَ الْمُجَاهِدِينَ مِنكُمْ وَالصَّابِرِينَ وَنَبْلُوَ أَخْبَارَكُمْ} سورة محمد (٣١).

ئێمە ئێوە بەجۆرەها تاقیكردنەوەو ئیمتیحان لەبۆتە دەدەین، هەتا كۆششكەران لەئێوە بەدەربخەین، خاوەن صەبرو ئارامان جیابكەینەوە، بۆ خەڵكی بەدەر بخەین كێ فەرمانبەرداری فەرمانی خودایەو كێ سەرپێچی و بێ ئەمری خودا دەكا.

{وَنَبْلُوكُم بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ} سورة الأنبياء (٣٥).

ئێمە ئێوە تاقی دەكەینەوە (بەگرانی و هەرزانی بەخۆشی و ناخۆشی بەساغی و ناساغی بەفەقیری و دەوڵەمەندی) بۆئەوەی دەربكەوێ: شوكرو سوپاستان، صەبرو ئارامتان تا چ ئەندازەیەكە، هەر بۆلای ئێمە دەگەڕێنەوە سزاو پاداشی كردەوەكانتان بەتەواوی دەدەینەوە.

{تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا} سورة الملك (١-٢).

واتە: پاك و بەرزو گەورەیە ئەو خودایەی كەهەرچی دەسەڵات و پاشایی هەیە بەدەست خۆیەتی، ئەو خودایە خاوەن تواناو دەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێك دا، ئەو خودایەی كە مردن و ژیانی داناوە، لەنەبونەوە ئێوە دێنێتە كۆڕی ژیانەوە، سەربەخۆی و ئیرادەتان دەداتێ، تا تاقیتان بكاتەوە ئاخۆ كردەوەی كامتان باشترە، بۆیەتان تاقی دەكاتەوە تا بۆخۆتان دەربكەوێ تا چ ئەندازەیەك ئارەزووی چاكە یا خراپەتان تێدا هەیە، تا بەپێی كردەوەی خۆتان پاداش و سزاتان بداتەوە، ئەم تێڕوانینەی ئیسلام بۆ ژیان، باشترین داڵدەیە بۆ مرۆڤ بۆ مشت وماڵكردنی

زیهن، بۆ بەرزکردنەوەی ڕادەی رۆشنبیری، باشترین دالدەیە بۆ لغاوکردنی هەواو ئارەزۆ، بۆ زالبوونی بەسەر ئەو شەڕو خراپەکاریانەی کە نەفس داخوازیەتی. ئەم تێڕوانینە جیاوازە لەگەڵ برێ تیۆری ئایینەکانی تردا کە پێیان وایە خودا مرۆڤ عەفو دەکا لەجیهادی نەفسو کۆششی دەروون.

## دەست بڵاوی کارێکی باش نییە (ذم الترف):

## پەروەردەکردنی داخوازییە گیانییەکان (المبادئ الروحیة):

گەرەکیانە قوربانی بەزۆر لەداخوازییە جەستەییەکان بداو لەزۆر خۆشیی کاتیی جەستەیی واز بێنێ، ئەمەش لەنەفسو ئارەزۆی دەرونێکی نەوسنی خۆپەرست ڕەچاو ناکرێ، چونکە لەززەتو خۆشی، ویستو ئیرادەی زەعیف کردووەو وای لێکردوە بەئاسانی واز لەو خۆشیو لەززەتە نەهێنێو سوور بێ لەسەر لەدەست نەدانی ئەوحاڵەتە تەرەف ئامێزەو بەچاوێکی دووربینەوە نەڕوانێ بۆ ئاسۆیەکی تری خێرئاوەر بۆخۆیو گەلو کۆمەڵ، هەرگیز نەفسی خۆی هەڵ نەنێ بۆ پێشکەوتنو خۆشبەختی دونیاو قیامەت، لەبەر ئەمە قورئانی پیرۆز وەسفی خۆپەرستو تەمبەڵو جەستە پەرستی کردوە بەدوژمنی ئیصلاحو دژی هەموو پێشکەوتنێکی کۆمەڵایەتی. هەروەها بەبەرهەڵستی دژواری حەقو ڕاستی حسێب کردون لەهەموو شوێنوساتێکدا بەگوێی پێغەمبەرانیان نەکردووەو باوەڕیان پێ نەهێناون.

{وَمَا أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُم بِهِ كَافِرُونَ، وَقَالُوا نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَالًا وَأَوْلَادًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ} سورة سبأ (٣٥).

واتە: هەرکاتێ پێغەمبەرێکی فروستادەی خۆمان دەنارد بۆ ناو ولاتێ بۆ هۆزێ کە لەنافەرمانی خودا بیان ترسێنێ، دەرحاڵ ئارەزۆ پەرستە دەوڵەمەندەکان (کە هەر خەریکی ڕابواردنی جیهانو خۆشگوزەرانین) دەیانگوت: ئەی موسوڵمانەکان! ئەی باوەڕدارەکان! ئێمە بڕوامان بەم دینەی ئێوە نییە کەئەم ترسێنەرە بۆ ئێوەی هێناوە، دیسان دەیانگوت: خودا ئەو هەموو ماڵو داراییو منداڵەی داوینێ، مانای

وایە خودا بەو حاڵەی ئێمە ڕازییە، بۆیە ئاوا ئێمەی خستۆتە خۆشییەوە.. کەوابوو خودا ڕۆژی قیامەت ئێمە سزا نادا، دوای ئەوەی لەجیهان دا ئەم هەموو خێرو خۆشییەی داوینێ و لێمان ڕازی بووە! جارێکی تر قورئان وەسفی ئەو خۆپەرستانەی کردوە بە تەبیات وشکیو شوێن کەوتنی کوێرانەی باب و باپیرانیان، هەرگیز گوێی ڕادێری هیچ بانگەوازییەکی ئیصلاحی نەبوون، ئەوەتا ڕوو دەکاتە حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ:

{وَكَذَلِكَ مَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِم مُّقْتَدُونَ، قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكُم بِأَهْدَى مِمَّا وَجَدتُّمْ عَلَيْهِ آبَاءكُمْ قَالُوا إِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُم بِهِ كَافِرُونَ} سورة الزخرف (٢٤).

واتە: هەروا بەدرێژایی مێژوو هەر پێغەمبەرێکمان پێش تۆ ناردبێ بۆ ناوهۆزێک، بۆ سەر شارێک، کاتێک پێغەمبەرەکە بانگەوازی خەڵکەکەی کردوە دەوڵەمەندە ئارەزۆ پەرستەکانو دەرەبەگو خۆش ڕابوێرەکان بەرهەڵستی بانگەوازییەکەیان کردوەو وتویانە ئێمە نایەینە سەر ئایینی ئێوەو شوێن ئێوە ناکەوین، باوك و باپیرانی خۆمان دیوە هەر بەم شێوەڕایان بواردو ئێمەش هەر شوێن ئەوان دەکەوین و ڕێبازی ئەوان بەرنادەین. کاتێکیش پێغەمبەرەکەیان پێی گووتون ئەی ئەگەر ئایینێکی باشترم بۆهێنابن هەر ئیمان ناهێنن. گووتویانە نەخەیر ئێمە بەهیچ جۆرێك بڕوامان بەو ئایینەی ئێوە نییەو ئیمانتان پێ ناهێنین.

بەڵێ، خۆپەرستو خۆش ڕابوێرەکان لەهەمووو کەس ئامادەترن بۆ هەڵخلیسکانو کەوتنە نێو شێوی خراپەکارییەوە، چونکە تێرکردنی ورگیانو دابین کردنی داخوازییەکانی نەفسیانو پڕکردنی گیرفانیان هەرە ئامانجی سەرەکیانەو ژیانیان لەبەر خاتری ورگیان پێ خۆشە.

نووسەری ڕۆشنبیری بەناوبانگی فەرەنسی (مونتسکیو) دەڵێ: شوێن کەوتنی لەززەتو ڕابواردن هۆی هێنانی فەسادە بۆ کۆمار (بەهەردوو شێوەکانیەوە) چونکە ئەگەر یاسای کۆمار دیموقراطی بێ تەرەفو ڕابواردن خەڵکی لەخۆشەویستی وڵات لادەدا، ئەگەر یاساکە ئەرستۆقراطی بێ دەرەبەگو

دەوڵەمەندەکان والێ دەکا هەر تەماعی خۆیانیان مەبەست بێ هەوڵی هاوسانی گیرفانی خۆیان بدەن لەهەردوو حاڵەتەکەدا بەڵاو موصیبەتەکە گشتی دەبێ‌و هەموو کەس دەگرێتەوە.

قورئانی پیرۆزیش ئەوە دەچەسپێنێ کە تەرەفو ڕابواردن‌و بەرەڵڵایی وێرانکارەو کۆمەڵ بەفەرِ دەرە، پێویستە بەرهەڵستی دەستەی خۆپەرست‌و خۆش ڕابوێری لەسنوور بەدەر بکرێ‌و نەهێڵدرێ لەسنووری شەرعی دەرچن‌و پێی لێ هەڵبڕن، چونکە ڕابواردن‌و بەرەڵڵایی لەسنوور بەدەر دەبێتە هۆی وێرانکاری وڵات‌و بەفەرِدانی کۆمەڵ، فەوتان‌و لەناو چوونەکەش تەنها بۆ خۆش ڕابوێرەکان نییەو بەس بەڵکوو موسیبەتەکە بۆ هەموو ئەو کۆمەڵەیە کەرێگا دەدەن ئەو دەستەیە ئاوا پێی لێ هەڵبڕن‌و لەسنوور دەربچن.

{وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا} سورة الإسراء (١٦).

واتە: کاتێ خراپەکاری‌و تاوان‌و گوناە لەوڵاتێکا پەرەی سەند ئەوە کاتی وێرانبوونیەتی، جا ئەو حەلە ویستی لەناوبردنی دانیشتووەکانی دەکەین بەڵام نایەین ڕاستەوخۆ سزایان بدەین بەڵکوو لەپێشا زەمینەی ئەوەیان بۆ دەسازێنین، بەم ڕەنگە فەرمان دەکەین بەخۆپەرست‌و خۆش ڕابوێرەکانیان کەلەفەرمانی خودا دەرنەچن‌و بەگوێی ئەو پێغەمبەرە بکەن کە ناردوویەتی بۆیان، ئەوانیش ئەوەندەی تر لەڕێ دەردەچن ئیتر ئەو وڵاتە تێك‌و پێك دەدەین‌و بەسەریەك دا دەیڕوخێنن لەبەر بڵاوبوونەوەی گوناهو سەرپێچی کردنی فەرمانی خودا لەناویان دا.

لەلایەکی ترەوە تەرەف‌و خۆپەرستی لەناو هەموو گەل‌و کۆمەڵێکا دەبێتە هۆی هەژاری‌و نابوودی ژمارەیەکی زۆر لەڕۆڵەکانی ئەو گەلە، ئەو کەم‌و کوڕیەی کۆمەڵ هەستی پێ دەکا لەخواردەمەنی‌و پۆشاك‌و پێویستی تر هۆیەکەی تەرەف‌و زیادە ڕابواردنی کۆمەڵێك خۆپەرستی دڵ مردون، ئەمەش دەبێتە هۆی تەقینەوەی ڕق‌و کینەو دوژمنایەتی لەنێوان هەژاران‌و دەوڵەمەندان دا، بەجۆرێك سەردەکێشێ بۆ پەیدابوونی شەڕو هەراو نائارامی‌و ترس‌و لەرزو پشێوی‌و

سەرەنجام روخانی وڵاتو لەناوچوونی کۆمەڵ، هەربۆیەشە خودای مەزن وەسفی تەرەف خوازانی بەدوو سیفەت کردوە: سیفەتی ستەمکاریو سیفەتی تاوانباری چونکە دەبنە هۆی پەیدابوونی بەلاو موسیبەت بۆ کۆمەڵ.

**{وَاتَّبَعَ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مَا أُتْرِفُواْ فِيهِ وَكَانُواْ مُجْرِمِينَ} سورة هود (١١٦).**

واتە: ستەمکاران شوێن هەواو هەوەسی خۆیان کەوتوونو گوێ بەفەرمانی خودا نادەنو سەرەڕای ئەوەیش تاوانبارنو موجریمن.

## قورئانی پیرۆز نرخی ڕاستەقینە بۆماڵو سامان دادەنێو زیانی کەم دەکاتەوە (القرآن يخفف من شرور المال)

لەم چەرخەی ئێستامان کەدەبینین کێشەو نیزاع لەسەر سامانو دارایی، وەدەست هێنانی گەیشتۆتە ئەوپەڕی، بەتەواوی ئادەمیزادی لەڕێ لاداوەو ناهێڵێ ئەخلاقو ڕەوشتی جوانو بەرز لەناو کۆمەڵدا بڵاو ببنەوە، تەنانەت بۆتە هۆی پەیدابوونی زۆربەی تەنگوچەڵەمەکانی کۆمەڵ ئەو تەنگوچەڵەمانەی کە جیهان بەگشتی لەژێر باری دا دەناڵێنێو گیرۆدەیان بووە، جا لەبەر ئەم هۆیانە بۆ بەرگریی لەم تەنگوچەڵەمەو کێشەو نیزاعە تەعالیمی قورئانی پیرۆز هەردەم بریتی بوون لەڕونکردنەوەی نرخی ماڵو داراییو کەم کردنەوەی زەرەرو زیانو ترساندنی خەڵکی لەگەردن کەچیو هەڵەو گیربوونی تەواو پێیەوە، بۆ ئەوەی ماڵو دارایی نەبێتە هۆی بەفەرتارەچوونی ئادەمیزادو لەئاییینو باوەڕ خافڵیان بکا، ذیکرو یادی خودایان لەبیربباتەوە. پەروەردگار کەوەسفی موسوڵمانان دەکا بەوە پێیان داهەڵدەڵێ کە زۆر گوێ نادەنە ماڵو دارایی، ماڵو سامان نابێتە هۆی ئەوەخودایان لەبیر بچێتەوە، دەفەرموێ:

**{رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَإِقَامِ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ الْقُلُوبُ وَالْأَبْصَارُ} سورة النور (٣٧).**

واتە: ئەوانەی لەخانەی خودادا بەیانیو ئێواری یادی خودا دەکەنەوە کۆمەڵە پیاوێکن کەهەرگیز بازرگانیو مامەڵەو کڕینو فرۆشتنو بازاڕو دوکان

ذیکرو یادی خودایان لەبیر ناباتەوەو بەری نوێژو رۆژوو زەکاتی رێك و پێکیان لێ ناگرێ، چونکە مەترسی ئەو رۆژە پڕ لەسامو ترسەیان هەیە کەدڵ لەسامی دەکەوێتە لەرزە، گەرچی ئومێدی ڕزگار بوونیان قەوییە، بەڵام لەمەکری خودا ئەمین نین و نازانن چارەنووسیان بەچی دەگا.

پەروەردگار موسوڵمانان ئاگادار دەکاتەوە بەوە کە ڕەزامەندی خوداو ڕەحمەت و سۆزی باشترە لەکۆکردنەوەی ماڵ و دارایی، دەفەرموێ: {وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ} سورة الزخرف (٣٢). ئەمجار قورئان حەقیقەتی ماڵ دەردەخاو زەرەرو زیانی ڕوون دەکاتەوە وا ئێمە ئەو رونکردنەوەی قورئان بەم خاڵانەی داهاتوو شی دەکەینەوە.

## أ- دەوڵەمەندی نیشانەی ڕەزامەندی خودا نییە:

قورئانی پیرۆز ئەوە ڕەت دەکاتەوە کە دەوڵەمەندی نیشانەی ڕەزامەندی خودا بێ، بەڵکوو ئەوە دەچەسپێنێ کە ئیمان و باوەڕی تەواوو کردەوەی باش ئەمانە دەبنە هۆی نزیکبوونەوە لەخودا نەك دەوڵەمەندی.

{وَقَالُوا نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَالًا وَأَوْلَادًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ، قُلْ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ وَيَقْدِرُ وَلَـكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ، وَمَا أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُم بِالَّتِي تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَى إِلَّا مَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَأُوْلَئِكَ لَهُمْ جَزَاءُ الضِّعْفِ بِمَا عَمِلُوا} سورة سبأ (٣٥-٣٧).

واتە: دەرەبەگ و خۆپەرست و دەوڵەمەندەکان دەیانگوت: ئێمە ماڵ و سامان و داراییمان زۆرترەو خاوەنی منداڵی زۆرین و ئەمانەش نیشانەی ئەوەیە کە خودا لێمان ڕازییە، کەوابوو ئێمە سزا نادرێین.

ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ، خوای من ڕزق و رۆزیی گوشاد دەکا بۆکەسانێك ئارەزووی لێبێ بۆ هەندێکیش دەرگای ڕزق و رۆزیی تەنگ دەکا نەدارا دەبێ، بەڵام زوربەی ئادەمیزاد ئەم حەقیقەتە نازانن و پێیان وایە ماڵ و دارایی نیشانەی نزیکبوونەوەیە لەخودا. نەزۆری ماڵ و سامانتان نەزۆری منداڵ و وەچەتان لەوانە

نــین لــەخوداتان نزیــك بكەنــەوە، بەڵــكوو مــاڵو منــداڵتان بــۆ ئیمتحــانو تاقیكردنەوەیە، تا دەربكەوێ كێتـان لەشوێنی خۆیـان دا بـەكاریان دێنـێو كێتـان خۆی لەخۆی دەگۆڕێو ماڵو سامانەكەی لەڕێبازی نامە شروع دا سەرف دەكا، بەڵام كەسێك بڕوای قایم بێو كردەوەی باش بكا ئەو جۆرە كەسانە پاداشی دوو چەندانەیان هەیە بەهۆی كردەوەی باشیانەوە نەك لەبەر زۆری ماڵو منداڵو سامانو دارایی.

## ب- ماڵو دارایی تاقیكردنەوەیە بۆئادەمیزادو كاڵایەكی نا پایەدارە:

ماڵو سامان تاقیكردنەوەیەكە بۆ ئادەمیزاد لەژیانی دونیایان دا ئاخۆ چۆنو لەچی دا سەرفی دەكەن؟ لەڕاستی دا سامان وەسیلەو ئامێرە بۆ خێریشو بۆشەڕیش، كەوابوو پێویستە لەسەر ئادەمیزاد كە ماڵو سامان سەرف بكەن لەڕێگەی خێرو خۆشی دا بیكەن بە ئامێرو وەسیلەی گەیشتن بەڕەزامەندیی خوای مەزن.

{وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلاَدُكُمْ فِتْنَةٌ وَأَنَّ اللّهَ عِندَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ} سورة الأنفال (٢٨).

واتە: بزانن كەماڵو سامانو منداڵتان وەسیلەو ئامێری تاقیكردنەوەتانن‌و بەس، خودای پەروەردگار پاداشی گەورەو فراوانی لایە هەوڵ بدەن ئەو لەخۆتان ڕازی بكەن.

قورئانی پیرۆز ئەوە دەچەسپێنێ كەماڵو دارایی بەشێكە لەكاڵای دنیا زۆر زوو بەرەو نەمان دەڕوا (كورد وتەنی ماڵ چڵكی دەستتانە) لەكاتێكا خێرو چاكە ئەبەدییەو خودا پاداشی خاوەنەكانیان دەداتەوە لەقیامەتا.

خودا دەفەرموێ: {زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاء وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ ذَلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَاللّهُ عِندَهُ حُسْنُ الْمَآبِ، قُلْ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيْرٍ مِّن ذَلِكُمْ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ} سورة آل عمران (١٥).

واتە خۆشەویستیو بەجێ هێنانی داخوازییەکانی شەهوەتو ئارەزوی جۆراو جۆر لەدڵی ئادەمیزاد شیرینو جوانکراوە، خۆشەویستی ژنو کورو سەفتەی پارەو پولو ڕستەی زێڕو زیو، ئەسپی ڕەسەنی دیاری کراوی ڕامکراوو ڕانە مەڕو ڕانە وشترو گارانی گاوگۆلو باخو باخاتو زەویو زارو کێڵگە ئەمانە هەموویان هۆی خۆشیەکی کاتینو هاکا نەمانو بەسەر چوونو فەوتان.

ئایا دەتانەوێ شارەزاتان بکەم بەخەڵاتێك لەو شتانەی گوتران لەهەموان باشتر بێ، ئەوخەڵاتەیش ئەوەیە، کە هەیەبۆ ئەوانەیتەقوای خودای خۆیان دەکەن چەند خێرو بێرێکی بەردەوامو نەبڕاوە کە بریتییە لەچەند باخو باخاتێك کەلەژێریانەوە جۆگەو جۆبار دەکشێن، بەئەبەدی لەناو ئەو باخانەدا دەمێننەوە شوێنو جێگای هەتا هەتایی ئەوانە، هەروەها ژنی جوانی پاكو خاوێنی بێعەیبو نەنگی وا چاو لەتەماشاکردنیان تێرنابێ، لەزوور هەموو ئەم نیعمەتو خۆشییانەوە ڕەزامەندی خودایە لەو بەندە ڕاستاڵانە. پەروەردگار بینایە بەکردەوەی بەندەکانی هەر کەسێ بەگوێرەی کرداری پاداشی دەداتەوە.

## ج- خراپی سەرکەشیو هەڵچونیماڵو سامان (ذم طغيان المال):

قورئانی پیرۆز لەچەند ئایەتێك دا ڕەخنە لەحاڵەتی هەڵچونی ماڵو دارایی دەگرێ، ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە نەفسی ئادەمیزاد هەرکاتێ هەستی بەتێرو تەسەلی کرد سەرکەش دەبێو هەڵدەچێ کە ئینسان دەوڵەمەند بوو خۆی لەخۆی دەگۆڕێو لەخۆی بایی دەبێ.

{كَلَّا إِنَّ الْإِنسَانَ لَيَطْغَى، أَن رَّآهُ اسْتَغْنَى، إِنَّ إِلَى رَبِّكَ الرُّجْعَى}سورة العلق (٦-٨)

ئادەمیزاد هەرکاتێ هەستی بەتێرو تەسەلی کرد، هەر کەخۆی بە دەوڵەمەند بینی، خۆی لەخۆی دەگۆڕێو زیادە ڕەوی دەست پێ دەکا، لەحاڵەتی مام ناوەندی دا نامێنێ، ئەمجار پەروەردگار دەیەوێ ئەو نەفسو دەروونانە لەوسەر کەشییە بگێڕێتەوە، فیزو دەعیە زلیو لوت بەرزی نەهێڵێ، بۆیە ئەوە دەهێنێتەوە یاد کە مرۆڤ بۆ خۆی زەبوونو لاوازە، چەند بەهێز بێو دەوڵەمەند بێ زیاتر پێویستی

بەکەرەمو ڕەحمەتی خودا دەبێ، گەڕانەوە هەر بۆلای خودایە هەر ئەو پەناو مەلجەئە. پەروەردگار لەئایەتێکی تردا ئەوە ڕون دەکاتەوە کە زۆری رزقو ڕۆژیی خەڵك هەڵدەنێ بۆ سەرپێچی کردنو سەر کەشی کردن لەبەر ئەوە خودا بەگوێرەی ویستو ئیرادەی خۆی رزقو ڕۆژییان دەداتێ دیارە خوداش لەخودی خۆیان باشتر ئاگاداری حاڵو چۆنیەتییانە.

{وَلَوْ بَسَطَ اللَّهُ الرِّزْقَ لِعِبَادِهِ لَبَغَوْا فِي الْأَرْضِ وَلَـكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَاء إِنَّهُ بِعِبَادِهِ خَبِيرٌ بَصِيرٌ} سورة الشورى (٢٧).

واتە: ئەگەر خودای پەروەردگار ڕزقو ڕۆژی بۆ بەندەکانی فراوان بکا ئەو بەندانە لەجیاتی ئەوە زیاتر بەندایەتی خودا بکەن سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەن خۆیان لەخۆ دەگۆڕێ، باغر دەبنو لەسەر زەوی خراپەکاریی دەست پێ دەکەن! بەڵام پەروەردگار ڕزقو ڕۆژیی بەو ئەندازەی خۆی دەیەوێ دەیانداتێ، بەڕاستی خودا ئاگای تەواوی لەبەندەکانی خۆی هەیە دەزانێ چی باشەو چی خراپە بۆ ئەوان. خەبیرو زانایە بەکارو باریان بینایە بەکردارو ڕەفتاریان.

## شاگەشکە بوون بە ماڵی دونیا پەسەند نییە:

قورئانی پیرۆز نەهی کردوە ئادەمیزاد بەماڵی دونیا کەیف خۆشبێ کاتێك تووشی خێرو خۆشییەك بوو لە سنوور تێپەڕیو ئاگای لەخۆی نەمێنێو شاگەشکە ببێ! بەڵکوو هەردەم هەڵیناوە کەلەجیاتی ئەو شاگەشکە بوونە سوپاسی خودا بکا، دوو دەستی شوکر بەرز بکاتەوە. چونکە کەیف خۆشی بەو جۆرە ئازاری فەقیرو هەژاران دەدا، دڵی لێ قەوماوان دەشکێنێ، سەر دەکێشێ بەوە مرۆڤ گاڵتە بەنیعمەتی خودا بکا، خۆی لەخۆ بگۆڕێ، لەڕۆژگار ئەمین بێ، هەروەکوو چۆن سەردەکێشێ بۆ دەعیەو فیزو لەخۆڕازی بوون، لەبەر ئەم هۆیانە شاگەشکە بوونو کەیف خۆشی زیاد لەئەندازە لای خودا پەسەند نییە:

{إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْفَرِحِينَ } سورة القصص (٧٦).

پێویستە ئادەمیزاد بەماڵو دارایی بەنازو نیعمەتی بێ بەقای دونیا کەیف خۆش نەبێ بەڵکوو پێویستە ئینسان ئامانجێکی بەرز تری هەبێ لەو، ئەویش کەیف خۆشبوونە بە فەضلو نیعمەتی خودا.

**{قُلْ بِفَضْلِ اللّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْيَفْرَحُواْ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ} سورة يونس (٥٨).**

ئەی موحەممەد! بەو خەڵکە بڵێ، با بەماڵی دونیا شاگەشکە نەبنو خۆیان لەخۆنەگۆڕێ بەڵکوو بەفەضلو نازو نیعمەتی خودا بەکەرەمو ڕەحمەتی خودا کەیف خۆش بنو دڵ خۆش بکەن ئەوە زۆر باشترە لەپڕو پێتاڵی دونیای بێ بەقا.

## ڕژدیو بەخیلی پەسەند نییە (النهي عن البخل):

قورئانی پیرۆز نەهی کردوە لەڕەوشتی ڕژدیو بەخیلی چونکە هەبوونی ئەم سیفەتە ناشیرینە شیرازەی کۆمەڵ تێك دەدا خۆشەویستی لەناو خەڵك دا ناهێڵێ، ڕێگا نادا خەڵك لەناو خۆیان دا کۆمەکی بەلێقەوماوان بکەنو یارمەتی یەکتری بدەن، مرۆڤی ڕژد دژی کۆمەك کردنە بەخەڵکی، ڕێگا بەخۆی نادا شتێکی لەدەست هەڵوەرێو یارمەتی فەقیرو هەژاران بداو دەستی لێقەوماوان بگرێ جا لەبەر ئەوە هەژارانو موحتاجان هەموو دەم بەخوێنی سەری تینوونو پڕ بەدڵ ناخۆشییان دەدوێو دووچاوی سەریان پێ هەڵنایە. ڕەوشتی ڕژدی لەناو هەرکۆمەڵێك دا بڵاو ببێتەوە سەر دەکێشێ بەڕوخانی ڕۆحی کۆمەکیو یارمەتی دان لەناو ئەو کۆمەڵەدا، بۆیە پەروەردگار لەچەند ئایەتێکی قورئان دا نەفرەتی لەڕەوشتی ڕژدی کردوە سیفەتی بوخلی بەلاوە پەسەند نییە.

**{وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ هُوَ خَيْرًا لَّهُمْ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلِلّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ} سورة آل عمران (١٨٠).**

با وا گومان نەبەن ئەو کەسانەی ڕژدنو بەخیلی دەکەن لەو ماڵو داراییەی خودا بەفەضلو کەرەمی خۆی داویەتی پێیان با وا نەزانن کەئەو ڕژدییە باشە بۆیانو کارێکی چاك دەکەن بەڵکوو ئەو ڕژدیو چروکییە شەڕە بۆ دوا ڕۆژیان

زەرەریان لێ دەدا، ئەوماڵو داراییەی کە حەقی فەقیرو هەژارانی تێدایەو وەکوو پێویست مافی ئەوانی لێ دەرناکەن ئەو ماڵو سامانە ڕۆژی قیامەت دەبێتە ماری ئاگرینو لە ئەستۆیان دەئاڵێ، هەروەکوو چۆن لەئایەتێکی تردا پەروەردگار وەسفی ئەوانە دەکا کەخۆیان لەڕژدی دەپارێزنو بەخیلی لەدڵو دەرونی خۆیان دەردەکەن:

{وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ} سورة الحشر (٩).

بەڕاستی هەرکەسێك خودا تەوفیقی بداو بیپارێزێ لەخووی ڕژدی نەفسی خۆی ئەوانە لەڕزگاربوانو سەربەستی دینو دونیایان بەدەست هێناوە.

سەیر ئەوەیە مرۆڤی بەخیل لەگەڵ ئەوەدا کەماڵ خۆشەویستەو دونیا بڕوخێ فلسێکی لەدەست نابێتەوە کەچی دایم موحتاجەو بێ ماڵو سامان دێتە بەرچاو، چونکە کۆکردنەوەی ماڵ بەبێ سوود لێ بینین جۆرێکە لەهەژاریی، زۆر لەهەژاریی نەبووان کاریگەرترە، هەردەم ئەوخاوەن ماڵە لەبەر چرۆکیو ڕژدی زەلیلو چاو چنۆكو ڕیسوایە. بۆیە خودا دەفەرموێ:

{وَمَن يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِ وَاللَّهُ الْغَنِيُّ وَأَنتُمُ الْفُقَرَاء} سورة محمد (٣٨).

واتە: هەرکەسێك ڕژد بێو گیرفانی قووڵ بێ ئەوە ڕژدی لەخودی خۆی دەکاو خۆی خەسارەتمەندە، خودا خۆی دەوڵەمەندەو پێویستی بەئێوە نییە، ئێوە فەقیرو هەژارنو هەمووکاتێ موحتاجی خودان.

جا ئەگەر دەتانەوێ دڵ ئارام بنو خۆشی ڕاستیتان دەست بکەوێ چەندێکی بۆتان دەکرێ دڵ فراوان بنو لەڕەوشتی ڕژدی دوور بکەونەوە بەڵام نەچن لەوەش دا زیادە ڕەوی بکەنو دەستبلاوی دەست بدەنێ بەجۆرێك لەڕژدییەکە خراپتر بێ، چونکە ئەو جۆرەش هەر خراپەو ئایینی ئیسلام دەستبلاوی زیاد لەحەدی بەبرای شەیتان حسێب کردوە، بەڵکوو لەهەموو شتێك دا میانەڕەو بنو بەرزو نزمی مەکەن بەگوێرەی ڕێبازی قورئان بجوڵێنەوە وەکوو دەفەرموێ:

{وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكَانَ بَيْنَ ذَلِكَ قَوَامًا} سورة الفرقان (٦٧).

واتە: موسوڵمانی ساغی ڕاستاڵ ئەوانەن کاتێك ماڵو سامان دەبەخشن دەستبلاویو ڕژدی ناکەن بەڵکوو میانەڕەوی بەکاردەهێننو ڕێبازێکی مام ناوەندی دەگرن.

## بەشی دوازدەهەم:

# پەیوەندی ئادەمیزاد بە پەروەردگار لە نیگای ئیسلامەوە، کاریگەری ئەو پەیوەندییە لە نۆژداری دەروونیدا

**مەبەست لە پەیوەندی ئادەمیزاد بە خوداوە - باوەڕ بە خودا - یادی خودا – خۆشەویستی نێوان خوداو بەندە – ترس لەخودا – دوای لێخۆشبوون – تۆبەو گەڕانەوە بۆ لای خودا – داواکردنی ڕەحمەتی خودا – تاعەتکردن بۆ خودا – سوپاسکردن بۆ خودا – پشت بەستن بە خودا – دڵسۆزی بۆ خودا – نزاو پاڕانەوە.**

## مەبەست لە پەیوەندی ئادەمیزاد بەخوداوە

ئاشکرایە پەیوەندیی سەرەکی نێوان خوداو بەندە – بەگوێرەی قورئان - لەسەر باوەڕ بەخوداو خۆشویستنی دادەمەزرێ، بە سوپاس‌و نیعمەتی ئەو پەروەردگارە سەرچاوە هەڵدەبەستێ! قورئانی پیرۆز لەم پەیوەندییەدا سێ مەبەستی سەرەکی ڕەچاو دەکات. گەرەکیەتی ئەنجام بدرێن. ئەو سێ مەبەستەش ئەمانەن:-

أ) پەروەردەکردنی زەمیرو ویژدان: ویژدانی ئینسانی بریتییە لە هێزێکی بەرگریکەری دەروونی کە نەفسی سەرکەشی ئینسان لە زۆر شت دەگێڕێتەوە، هەموو کات وەکوو ئامۆژگاریکەرێکی دڵسۆز وایە بۆ ڕێڕەوی مرۆڤ ئاکام‌و ئەنجامی کردارو گوفتاری بۆ رون دەکاتەوە!

جا وەکوو چۆن ئەم ویژدانە، ئەم مەبەستە داخلییەی ئادەمیزاد جار جار زەبوون‌و بێ هێز دەبێ! هەر بەو جۆرە جار جار گەش‌و نمادەکاو دەبێتە ڕێ پیشاندەر، دیارە ئەو گەشەکردنە بەهۆی پەروەردەی باش‌و چاك ئەنجام دەدرێ، پەروەردەیەکە زەمیرو مشت‌و ماڵ دەکاو بۆ کاری باش ڕامی دەکا. هەروەکوو چۆن بەگوێرەی کوشش‌و باری کۆمەڵ‌و شوێن‌و کات‌و دەورو بەر گۆڕانکاری بەسەردا دێ!! بێگومان گەورەترین هێزو ڕاگری ویژدان‌و زەمیر بریتییە لە بڕوایەکی پتەو بەخودایەکی بەدەسەڵاتی خاوەن هێزو توانا، خودایەك کە لەسەر هەموو

کردەومیەکی گەورە یان بچووك موحاسەبەی خەڵك دەکا، پاداش‌و سزایان دەداتەوە، سەرەڕای ئەوە ئاگاداری هەموو نهێنییەکی ناو دڵ‌و دەروونە.

بەڕاستی وتەی ئەو فەیلەسووفە زۆر جوانە کە دەڵێ (ویژدان‌و زەمیری بێ بڕوا بەخودای گەورە وەکوو دادگای بێ دادوەر وایە).

قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ ویژادنی مرۆڤ و ئاگاداریی خودا بە خەتەری دڵ‌و دەروونی ئەو مرۆڤە کردوە دەفەرموێ:

**{وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ - سورة ق – ١٦}.**

بەڕاستی ئێمە مرۆڤمان دروست کردوەو دەزانین نهێنی‌و خەتەری دڵی چۆنەو چۆن نیە، ئێمە لە رەگی لا ملی زیاتر لێیەوە نزیکین. دەی ئەم وەسوەسەیەی کە خودا لەم ئایەتەدا باسی دەکا بریتییە لەو ئاوازە وێژدانییەی کە هەرگیز لێی هون نابێ‌و ئاگاداریەتی!!

ب) ئارامیی دڵ‌و دەروون: ئارامیی دڵ‌و دەرونیش – بەگوێرەی قورئان– دووبارە بەرو بومی پەیوەندی نێوان خوداو بەندەیە، بە داخەوە ئەمڕۆ مرۆڤ پێی وایە ئەو رێگەیەی دەیگەیەنێ بەم خۆشییە نەفسییە بریتییە لە دابینکردنی داخوازییە ماددییە شەهوانییەکان!

بەڵام لە ڕاستیدا دڵ ئارامی‌و خۆشی نەفسی لە تیرکردنی ئەو ئارەزووە ماددییانەدا نییە، چونکە هەموویان بێ بەقان‌و روو لە بڕوانەوەو نەمانن: ماڵ‌و دارایی دەفەوتێ، جەوان پیر دەبێ‌و لەش ساغی دەبێتە نەخۆشی، شتومەك‌و کەل‌و پەلی ناو ماڵ خانوو بەرەو زەوی‌و زار بەردەوام نابن‌و پایەدار نین، زیاد لەوە روداوە سامناکەکانی سروشت وەکوو بومەلەرزەو لافاوو گێژلۆکە زۆر جار موصیبەت‌و بەڵای سامناك بەسەر ژیاندا دەهێنن دڵ‌و دەروون تەنگ دەکەن‌و خۆشی ژیان لێڵ دەکەن! بۆیە پێویستە واخۆمان ڕابێنین ئەم روداوانە نەتوانن خۆشی نەفسیمان بڕوخێنن، چونکە هۆی سەرەکی بۆ خۆشبەختیمان، بۆ دڵ ئارامی بەردەوامان ئەو پەیوەندییەیە کە بە خوداوە هەمانە، ئەو هەستەیە کە

پێمان وایە بەردەوام خودا لەگەڵمانە، ئەو بڕوایەیە کە لامان وایە ئێمە لەم سەر زەمینە بە تەنهانین‌و خودا چاودێریمان دەکا، بە ڕەحم‌و کەرەمی خۆی یارمەتدەرمانەو لەگەڵمانە!

ج) نۆژداریی نەفسیی (الطب النفاساني) چارەسەرکردنی نەخۆشییە دەروونییەکان کەپێیان دەگوترێ: نۆژداریی نەفسانی... زانایان‌و دەروونناسان بۆیان دەرکەوتووە کە غەم‌و ناڕەحەتی، دڵەخورپێ‌و ڕاڕایی، تەنگ‌و چەڵەمەو ناڕەحەتی‌و شەو بێداری، زۆر کاریگەریان هەیە لەسەر چۆنیەتی کردەوەی ئەندامەکانی لەشی ئینسان.

لە دانیشتگاو تاقیگەکانی ڕۆژ ئاوادا لەم بارەوە چەند لێکۆڵینەوە ئەنجام دراون، چەند قوتابخانەو نەخۆشخانەی تایبەتی بۆ نۆژداریی دەروونی کراونەتەوە.. زانای بەناوبانگ دکتور (بۆڵ ارنست أدولف) دەڵێ بۆم دەرکەوتووە کە چارەسەرکردنی تەواو بۆ نەخۆشی دەبێ چارە سەرکردنەکە ڕۆحی‌و ماددی بێ، نەفسی‌و جەستەیی بێ بەیەکەوە... هەروەها دەڵێ: بۆم ڕون بۆتەوە کە ڕێگای ڕاست ئەوەیە کە تەتبیقاتی زانستی نۆژداری‌و جەراحی لەتەك ئیمان بەخودادا ئەنجام بدەم! زانینە ماددی یەکەم تێکەڵ ناسینی خودا بکەم. من خۆم لەژیانم دا هەردوو لایەنەکە (ماددی‌و ڕۆحی) لەسەر بناغەیەکی قایم‌و قوڵ بەیەکەوە بەستووە، کاری ڕۆژانەی خۆمم لەبەر ڕۆشنایی ئەو بەرنامەیە ئەنجام داوە، تەنها لەم ڕێگەوە توانیومە چارەسەری تەواوو پێویست بۆ نەخۆشەکانم بدۆزمەوە! دوای تێفیکرین‌و لێوردبوونەوە ئەوەشم زانیوە کە زانستی نۆژداریی‌و بڕوا بەخودا هەدوکیان بەیەکەوە پێویستە ببنە بناغەی فەلسەفەی نۆژداریی تازە. لە ئەنجام‌و ئاکامی کارکردنم لەبواری نۆژداریی دا ئەوەم بۆ روون بۆتەوە: کە باوەڕ بە لایەنی ڕۆحی لەتەك زانینم بە زانستە ماددیەکە وای لێ کردووم کە بتوانم هەموو نەخۆشێك چارەسەر بکەم، بەشێوەیەکی بەرەکەت ئامێز. خۆ هەر کاتێ ئادەمیزاد لایەنی خودای لەم گۆڕەپانە دوورخستەوە، بێگومان هەموو چارەسەرکردنێکی نیوە چڵە بەڵکوو کەمتریش.

دەی با بزانین هۆی سەرەکی بۆ ئەو نەخۆشییانەی پێیان دەگوترێت نەخۆشی دەمارگیری (**الأمراض العصبية**) چونن و چین؟!

ئاشکرایە برێ هۆی سەرەکیی ئەو نەخۆشییانە بریتییە لە هەستکردن بە گوناح، بەخەتاو تاوان، بە رقو قین، بەترس و ڕاڕایی، بەچاوچنۆکی و بەگومان پەیداکردن بە... هتد.

بەڵام سەد مخابن ئەوانەی خەریکی چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشییە دەروونییانەن، لە کاتێك دا دەتوانن هۆی ئەو نەخۆشییانە بدۆزنەوە بەڵام لە چارەسەرکردن و بنبڕکردنیدا سەرکەوتونابن، چونکە ئەوان بۆ چارەسەرکردنەکە پەنا نابەنە بەر لایەنە ڕۆحییەکەو ناچن بڕوا بەخودا بخەنە ناو دڵی نەخۆشەکانیانەوە، ناچن لەتەك بارە ماددیەکەدا لایەنە ڕۆحییەکەش بخەنە کار!!

دەمانەوێ زیاد لەمەش پرسیار بکەین و بڵێین: ئەم ئیضطراباتە هەڵچوناویانە کە دەبنە هۆی نەخۆشییە نەفسییەکان چین! لەڕاستیدا ئەم دیاردەیە هەڵچوناوییە دەروونیانە کە دەبن بەهۆی نەخۆشییە نەفسییەکان هەمان شتن کە ئایینییەکان هاتوون ئێمەیان لەدەست ڕزگار بکەن!!

چونکە پەروەردگار بە قودرەت و زانست و لێزانیی خۆی زانیویەتی پێویستمان بەو چارەسەرکردنە سەرەکییە هەیە!

شایانی باسە: کە قورئانی پیرۆز زۆر باش چارەسەری نەخۆشی نەفسی دۆزیوەتەوەو دەرمانی بۆ داناوە. دەفەرموێ:

**{وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاء وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلاَ يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إَلاَّ خَسَارًا - سورة الإسراء – ٨٢}.**

واتە: ئێمە لە قورئان شتێك دەنێرینە خوارێ کە شیفاو ڕەحمەتە بۆ موسوڵمانان نەخۆشی دڵ و دەروونیان قەڵاچۆ دەکا.

لێرە بەولاوە چەند باسێك دەخەینە پێش چاوتان کە ئەوە بچەسپێنێ کە قورئان شیفای نەخۆشی نەفسییەو باشترین چارەسەرکردنە بۆ ئەو جۆرە نەخۆشییانە.

## بڕوا بەخوداو کاریگەری ئەو بڕوایە لەڕێڕەوی ئادەمیزادا

بڕوا بەخودا کۆڵەکەی ژیانی رۆحییە، سەرچاوەی هەموو ئارامییەکی دڵو دەروونەکانو هەموو بەختەوەریو خۆشییەکە، جا وەنەبێ ئەم ئیمانە هەر بەوەندە پەیدا ببێ کە باوەڕت هەبێ خودایەك هەیەو زاڵە بەسەر بونەوەردا! بەس ئەوەندە کیفایەت ناکا، بەڵکوو دەبێ ئەو خودایە وا بناسی ناسینەکە بگەیەنیە حەددی تەقدیسو پیرۆزی بزانی چەند گەورەو بەتوانایە ئەم جۆرە ناسینە لەدڵو دەروونی ئادەمیزاد جێگیر ببێو ئاسارو دیاردەی چەسپانو جێگیربوونیو ئەو ئایینە لە کردەوەکانی دیاری بدا!

بڕوا بەخودا نەفسی ئادەمیزاد لە کۆتی ماددییەت قوتار دەکا، وا لە مرۆڤەکە دەکات خۆی لەئاستی شەهوەتو ئارەزوی دنیایی دا بەرزبگرێ، موبالات بە زەرەرو قازانجی تایبەتی دنیایی نەکا، هەوڵو کۆشش بکات بۆ خۆیو بۆ کۆمەڵەکەی بەگوێرەی یاسای گشتی کۆمەلایەتیو ئایینی، بە گوێرەی رێبازو دابو نەریتی تەواو سود بەخش بەڵێ: هەرچی رەوشتی ئادەمیزاد هەیە لەپیاوەتیو چاکە فیداکاری خۆنەویستی... هتد. لە پێناو کۆمەڵدا هەموویان لە باوەڕ بەخوداوە سەرچاوە هەڵدەبەستن ئەمە راستییەکەو چەسپاوە، تاقیکردنەوەی ئادەمیزاد بە درێژایی مێژوو سەلماندوویەتیو دەیسەلمێنێ!

لە هەموو وڵاتێکو هەموو رۆژگارێکدا چەند کەسێك هەبوونو هەن کە بەهۆی باوەڕیان بە خودا – هەستو شعوریان بە چاکەو پیاوەتی سەرریژی کردوە وەکوو ئەستێرە بەئاسمانی گەلەکەیانەوە درەوشاونەوە! ئیتر هەموو ژیانی خۆیان تەرخان کردوە بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵی ئینسانییەتو خۆشبەختی ئادەمیزاد! ئەمەیە حەقیقەتی ئەو ئیمانەی کە قورئان بانگەوازی بۆ دەکاو داوا لە خەڵك دەکات کە هەرگیز دەستی لێ بەرنەدەن؟ هەر لەبەر ئەمەیە ئێمە دەبینین کە هەموو ئایەتێکی قورئان (**الذين آمنوا**)ی تێدابێ دوابەدوای ئەو رستەیە (**وعملوا الصالحات**)یشی هێناوە! ئەمە مانای ئەوەیە کە ئیمانو باوەڕ

هەر بەقسە نابێ؟ بەڵكوو دەبێ كردەوە بیسەلمێنێو تەئیدی راستی ئەو ئیمانە بكا چونكە كردار دیاردەو بەرووبومی باوەڕە.

بڕوا بەخوداو كردەوەی باش رەزامەندی خودا بەدەست دێنن، پاداشی باشی قیامەت پەزمەندە دەكەن! خودا دەفەرموێ:

{إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُوْلَئِكَ هُمْ خَيْرُ الْبَرِيَّةِ -سورة البينة ٧}.

ئەوانەی بڕوایان هەیە بە خوداو كردەوەی چاك دەكەن ئەوانە باشترین گرۆهی ئادەمیزادن!

{وَبَشِّرِ الَّذِين آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ - سورة البقرة – ٢٥}.

ئەی پێغەمبەر مزگێنی بەهەشت بدە بەو كەسانەی باوەڕیان بە خودا هەیەو كردەوەی چاك دەكەن.

{إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا- سورة الكهف – ٣٠).

ئەوانەی باوەڕیان بە خودا هەیەو كردەوەی چاكو باش دەكەن ئێمە هەرگیز پاداشییان زایە ناكەینو هەر كەسێك كردەوەی باش بێ پاداشی خۆی دەدەینەوە.

باوەڕ بە خودا مرۆڤ وا لێ دەكا لە گوناه هەڵسڵەمێتەوە، چونكە ئادەمیزاد لە كردارو گوفتاری دا گەردن كەچی بیرو باوەڕیەتیو بەگوێرەی ئەوان بەرێگادا دەڕوا! بۆیە پێغەمبەر دەفەرموێ:

« لاَ يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهْوَ مُؤْمِنٌ ، وَلاَ يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُهَا وَهْوَ مُؤْمِنٌ ، وَلاَ يَسْرِقُ السَّارِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهْوَ مُؤْمِنٌ. رواه البخاري ومسلم .

واتە: ئەو كاتەی موسوڵمان داوێن پیسی دەكا موسوڵمان نامێنێ ئەوكاتەی موسوڵمان دزی دەكا موسوڵمان نییەو ئەو كاتەی شەراب دەخواتەوە موسوڵمان نامێنێ، چونكە ئیمانی تەواو ناهێڵێ خاوەنەكەی شتێك بكا لەگەڵ باوەڕەكەدا نەگونجێ هەروەكوو چۆن ناهێڵی شتێك واز لێ بێنێ كە بە گوێرەی رێڕەوی ئەو نەبێ.

بەڵێ بڕوا بە خودا تاریکایی ئەم ژیانەمان بۆ روناك دەکاتەوە لەکاتی ناهومێدیو لێقەوماندا موسوڵمان وەبیری دێتەوە کە پەنایەکی قایمی هەیە پەنای بداو هاواری بکاتێ!

پێی وایە پەروەردگاری دەتوانێ یارمەتی بداو دەستی بگرێ، ئیتر کە ئەمەی زانی ناهومێدی لەدڵو دەروونی دەڕەوێ، ئاخو ئۆف واز لێ دێنێو پشت بە خودای خۆی دەبەستێو دڵو دەروونی ئارام دەبن، بەڵاو موصیبەتی دنیایی بێ نموود دێنە پێش چاوی، تەنگو چەڵەمەی ژیانی لا ئاسان دەبێ، خوداش بۆ خۆی خەبەری داوە بە موسوڵمانان کە هەموو کات دەستی یارمەتی بۆ درێژکردونو پشتیوانییانە:

{وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُ - سورة التغابن – ١١}.

هەر کەسێك بڕوای بە خودابێ بزانێ هەموو دەردو رەنجێك بە فەرمانی خودایە خودا دڵو دەروونی شارەزا دەکاو ئەیخاتە سەر رێگای راست. یان دەفەرموێ:

{وَإِنَّ اللَّهَ لَهَادِ الَّذِينَ آمَنُوا إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ - سورة الحج – ٥٤}.

واتە: بێگومان پەروەردگار رەهنوماکونندەی موسوڵمانانە بۆ رێگای راستو سەربەستیو خۆشی. یان دەفەرموێ:

{اللّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُواْ يُخْرِجُهُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّوُرِ - سورة البقرة – ٢٥٧}.

واتە: خودا خاوەنو گەورەو یارمەتدەری ئەوانەیە کە ئیماندارن، لە نەفامیو نەزانی رزگاریان دەکاو دەیانخاتە سەر رێگای زانستو شارەزایی باوەڕ.

لەلایەکی ترەوە ئیمانی کامڵو تەواو لە تەك کردەوەی باشدا وەسیلەو ئامێرە بۆ لەززەتو خۆشی هەردو دنیا خودا خۆی دەفەرموێ:

{مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ - سورة النحل – ٩٧}.

واتە: هەر کەسێك کردەوەی باش بێ چ پیاو چ ژن بە مەرجێك موسوڵمان بی‌و باوەڕی هەبێ ئێمە لە ژیانی دونیادا بەخۆشی دەیژێنین لە رۆژی قیامەتیشا زۆر باشتر پاداشیان دەدەینەوە!!!

بەراستی ئینسان لەم ژیانەدا لەناو کۆمەڵێك کۆسپ‌و تەنگ‌و چەڵەمەدا دەژی، کۆسپ‌و تەگەرەی ژیان کێژەڵۆکەی رۆژگار ئەوەندە زۆرو زەبەندەن هەرکەسێك بڕوای بەخودا نەبێ‌و خودا نەکا بە پەناگا بۆ خۆی‌و پشتی پێ نەبەستێ‌و نەیکاتە یارمەتیدەرو چاودێری خۆی بەدبەخت ترین ئادەمیزاد دەبێ لە ژیانا!!؟ بەپێچەوانەی ئادەمیزادی موسوڵمانەوە کە بەهۆی ئەو بیرو باوەڕەی کە هەیەتی هەموو کاتێ ئاسۆی داهاتووی خۆی رۆشن دەبینێ‌و ژیانێکی خۆش‌و کامەران بەسەر دەباو لەخودا نەبێ لەکەس ناترسێ!!

## یادی خوداو کاریگەری ئەو یادە لە دەروونی ئادەمیزاددا

بەشێك لە ئاکام‌و ئامانجی ژیانی رۆحی بڵاوکردنەوەی ئارامی‌و هێدیەتییە لەناو دڵ‌و دەرونی ئادەمیزاددا قەڵاچۆکردن‌و خستنە دەرەوەی غەم‌و قەلەق‌و ناخۆشییە لە دەروونا: کە ئەمانە دوژمنی هەرە گەورەی ئادەمیزادن. ئاشکراشە زیکرو یادی خودا ئامێرێکی هەرە کاریگەرن بۆ پەیدابوونی ئارامی دڵ‌و دەروون، وەکوو لەمەدوا رونی دەکەینەوە!

ئاشکراشە کە هەڵەو گیربوونی بیرو هۆش بەغەم‌و نارەحەتی مادی یان مەعنەوییەوە بەشبەشبوونی عەقڵ بەهۆی قەلەق‌و بیرکردنەوە لە داهاتوو هەروا پەرت‌و بڵاو بوونەوەی عەقڵ لە ئاستی روداوی رۆژانەی ژیان هەموو ئەم خەتەرەو ڕاڕایی‌و بیرو هۆش جۆراو جۆرانە مەعنەوییاتی ئادەمیزاد دەروخێنن‌و وای لێ دەکەن داماوبێ‌و نەتوانێ ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام بدا.

هەندێ کەس لایان وایە کە رۆچوون لە غەم‌و قەلەقدا حاڵەتێکی نەفسییە هیچ پەیوەندی بە جەستەوە نییە!! بەڵام ئەم بۆچوونە هەڵەیە، چونکە تاقیکردنەوەی زانستیی ئەوەی سەلماندووە کە رۆچون لە غەم‌و نارەحەتییدا خۆ

بەدەستەوەدان بۆ قەلەق حالەتێکی فیزیولوجییەو کار دەکاتە سەر جەستەو زەبوونی دەکاو جۆرەها نەخۆشی بۆ دەهێنێو سەرچاوەی هەموو غەمو نارەحەتییەکە، کانی قەلەقو دلەڕاوکێو رارایی بریتییە لە هەستکردنی ئادەمیزاد بە زەبوونی خۆی لە بەرامبەر رووداوی ژیاندا! بەلام بیرو باوەڕی پتەو بە هەبوونی خودایەك کە هەموو تەصەروفێکی گەونی بەدەست بێو بۆ هەموو کارێك پشتێ پێ دەبەستێو ئارامی هێزی مەعنەوی دەخاتە دڵو دەروونی مرۆڤەوە، هەموو غەمو نارەحەتییەکی ژیانیان لەلا سووكو ئاسان دەبێ.

دوکتۆر بریل ئیعتیرافی بەم ڕاستییە کردووەو وتوویەتی (مرۆڤی موسوڵمانو خاوەن باوەڕی پتەو هەرگیز تووشی نەخۆشی نەفسی نابێ!).

زانای بەناوبانگ (دیل کانێجی) دەڵێ: (نۆژدارانی دەروونناس بۆیان دەرکەوتووە کە بیرو باوەڕی قایمو دەست گرتن بە ئایینەوە بەرپرسیارن لەوە کە غەمو نارەحەتیو قەلەقو نەخۆشی دەمارگیری نەهێڵنو چارەسەری بکەن).

بەڵێ یادی خودا دیاردەیەکە لە دیاردەکانی ئیمانو باوەڕ، یادی خودا خۆراکی ڕۆحەو نەفسی ئادەمیزاد تەزوید دەکا بە ئارامیو هێدی بوون، هێزو قووەتی مەعنەوی دەداتێ: قورئان دەفەرموێ:

{الَّذِينَ آمَنُواْ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ اللّهِ أَلاَ بِذِكْرِ اللّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ - سورة الرعد – ٢٨}.

واتە: ئەوانەی موسوڵمانن و دڵیان بەیادی خودا داسەکناوەو هەردەم خودایان لەبیرەو تەسبیحاتو زیکری ئەو دەکەن کارێکی پیرۆز ئەنجام دەدەن، ئاگاداربن! دڵو دەروون هەر بەیادی خودا ئارام دەگرنو دادەسەکنێن!! یادی خودا دیاردەیەکە بۆ ئەوەی دەربکەوێ ئەو مرۆڤە خودای خۆی دەناسێو سوپاسی دەکا یان نا! بۆیە قورئان ئەوە دەچەسپێنێ: کە یادی خودا دەبێتە هۆی نزیك بوونەوە لە خودا، ئەوانەی لە یادی خودادان پاداشی باشیان دەدرێتەوە خۆشەویستی خوداو رەحمەتی بێ پایانیان دەستگیر دەبێ.

وابـزانم هێنـانی ئـەم چـەند ئایەتـەی دوایـی کیفایەتـە بـۆ وەدەرخـستنی گەورەییو باشی زیکرو یادی خودا، کە دەفەرموێ:

{فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُواْ لِي وَلاَ تَكْفُرُونِ - سورة البقرة – ١٥٢}.

واتە: ئـەی گرۆهـی ئـادەمیزاد یـادم بکـەن بـە تاعـەتکردن منـیش یـادی ئێـوە دەکـەم بـە پاداشـی بـاشو لێخۆشـبوون لـە گوناهتـان، شـوکرو سوپاسـی نـازو نیعمەتەکانم بکەنو مەیان شارنەوە کوفرانی نیعمەتم مەکەن!! یان دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا، وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا، هُوَ الَّذِي يُصَلِّي عَلَيْكُمْ وَمَلَائِكَتُهُ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَكَانَ بِالْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا - سورة الأحزاب – ٤١-٤٣}.

واتـە: ئـەی گرۆهـی موسـوڵمانان! زۆر یـادی خـودا بکەنـەوە، بـەیانیو ئێـوارە هەموو کـاتو سـاتێك بـە گـوێرەی توانـا لـە خـودا غـافڵ مـەبن! خـودا خودایـەکی وەهایە رەحمـەتو بەرەکـەتی خـۆی بەسـەر ئێـوەدا دەرژێنـێو فریـشتەکانی داوای لێخۆشـبوونی گوناهتـان بـۆ دەکـەن، تـا ئێـوە رزگـار بکـەن لـە تاریکایی گونـاه بـۆ رۆشنایی تاعەت لە گومراییەوە بۆ شارازایی! یان دەفەرموێ:

{وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا - سورة الأحزاب – ٣٥}.

واتـە: ئـەو پیاوانـەی یـادی خـودا دەکـەن ئـەو ژنانـەی یـادی خـودا دەکـەن پەروەردگار لێخۆشبوونی خۆیو پاداشی گەورەی بۆ ئامادەکردون!

جـا لـە کاتێکـدا قورئـان بەوچـەند ئایەتـە فـەزڵو گـەورەیی یـادی خـودای رونکردەوە، دەبینین لە ئایەتێکی تردا هەرەشە لەوانە دەکا کە یادی خودا ناکەنو لێی غافڵن، ئەوە رون دەکاتەوە کە رووەرگێڕان لە یادی خوداو پشت هەڵکردن لە تەسبیحاتو زیکری ئەو سەردەکێشی بۆئەوە ئینسان رێگای لێ هـون ببـێو تووشی بەدبەختی دنیاو قیامەت بێ! خودا دەفەرموێ:

{وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ الرَّحْمَنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ، وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ - سورة الزخرف – ٣٦-٣٧}.

واتە: کەسێك چاو بنوقێنێ لە عاست یادی خوداو زیکری پەروەردگار پشت گوێ بخا، ئێمە شەیتانێکی بۆ ئامادە دەکەین لە گەڵیدابێ‌و لەکۆڵی نەبێتەوە هەموو شتێکیش بە گوێی ئەو شەیتانە دەکا! جا ئەو شەیتانانە دەبنە بەرگری کەر لێیان‌و ناهێڵن ئەو خەڵکە رێبازی هەق بگرن، وەسوەسەو خەتەرە دەخەنە دڵیانەوە بەوە کەوان لەسەر هەقن رێبازی راستیان گرتووە، ئەو کافرو خوانەناسانەش پێیان وایە ئەو خەتەرەی بەدڵیاندا هاتووە شتێکی حەقیقەت‌و راستەو ئەوان لەسەر هەقن! دوو بارە جارێکی تر قورئان هەڕەشە دەکا لەو کەسانەی واز لە یادو زیکرەی خودا دێنن‌و دەفەرموێ:

{وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللَّهَ فَأَنسَاهُمْ أَنفُسَهُمْ أُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ - سورة الحشر - ١٩}.

واتە: ئەی موسوڵمانینە! نەچن وەك ئەو کەسانە بن کە خودایان فەرامۆش کردوەو بەدەگمەنیش خودایان وەبیر نایەتەوە، بێگومان کەسێك خودای بیرچووە سەرگەردان دەبێ لە ژیاندا، هیچ هەدەفێکی بەرزی نابێ‌و پاشە رۆژی لە بیردەچێتەوەو ئادەمێتی نامێنی خوداش خۆیانیانی لەبیر خۆیان بردۆتەوە بە جۆرێك کە ئینسانییەتی خۆیان فەرامۆش بکەن‌و هەوڵێك بۆ دوا رۆژ نەدەن ئەوانە بەدکارانی جیهانن.

یادی خودا دەورێکی گرنگی هەیە بۆ پەروەردەکردنی دڵ‌و دەرون، ئەو کەسەی یادی خودای خۆی دەکاتەوەو گەورەیی‌و عەزەمەتی ئەو دێنێتە پێش چاوی خۆی، دڵی نەرم دەبێ، عەتفو سۆزو بەزەیی تێدا پەیدا دەبێ، جگە لە کردەوەی چاکە شتی تری لێ بەدەر ناکەوێ! چونکە پێی وایە خودا ئاگادارە بەسەریداو چی بکا خودا چاوی لێیەتی. لە کاتێکدا ئەوانەی پشت هەڵدەکەن لە خودا هەڵدەخلیسکێن بۆ ناو زلکاوی بێدینی‌و خودایان لەبیر دەچێتەوە دڵ رەق دەبن‌و عەتفو بەزەییان تێدا نامێنێ‌و چی خراپەو شەڕە لێیان دەوەشێتەوە.

لەبەر ئەوە خودا هەڕەشەی لە خەڵکی کردوە کەوا نەکەن بگەنە ئەم حاڵەتە ناپەسەندە:

{أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا كَالَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ - سورة الحديد – ١٦}.

واتە: ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە کە موسوڵمانان دڵو دەرونیان بەیادی خودا سەررێژبکاو ترسو خۆفی خودا بچێتە دڵیانەوەو قورئان کاریان تێ بکاو پەیرەوی فەرمانەکانی بکەن! نەچن وەکوو گاورو جولەکەکان بن کە ئینجیلو تەوراتیان پێش قورئان دراوەتێ، جا رۆژگارێکی زۆریان بەسەردا تێپەڕیو ماوەی هاتنی پێغەمبەرەکانیان زۆر کۆن بوو دڵ رەق بوونو وایان لێ هاتووە کەلامی خودا کاریان تێ ناکاو گوێی پێ نادەن زۆریان بەدکارو بەد رەوشتو سەرپێچی کەرن!

هەر لەبەر گرنگی دان بە یادی خودایە کە ئایینی ئیسلام هاتووە ئەو نوێژەی کە ئادەمیزاد لەخودا نزیك دەکاتەوە لە شەو رۆژدا پێنج کەرەت فەرزی کردوە، داوای زیادکردنی نوێژی تریشی کردوەو ناوی ناوە (صلاة التهجد) شەو نوێژ چونکە لەشەودا دڵو دەروون صاف دەبێو توانای رۆحی زیاترە بۆ پاڕانەوە. خودا دەفەرموێ:

{أَقِمِ الصَّلَاةَ لِدُلُوكِ الشَّمْسِ إِلَى غَسَقِ اللَّيْلِ وَقُرْآنَ الْفَجْرِ إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ۝ وَمِنَ اللَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِ نَافِلَةً لَّكَ عَسَى أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ، وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَاجْعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلْطَانًا نَّصِيرًا - سورة الإسراء – ٧٨-٨٠}.

واتە: ئەی پێغەمبەر! کاتێك خۆر لە نێوە ڕاستی ئاسمان لایدا نوێژی نێوەڕۆ (ظهر) ئەنجام بدەن، کاتێك شەو داهات نوێژی بکەن – لێرەدا مەبەست نوێژی (شێوانو خەوتانە) – نوێژی بەیانی کاتێ ئەنجام بدەن ئاسۆی ئاسمان روناك دەبێو فەجری صادق بە کەناری ئاسماندا بڵاو بووبێتەوە، بێگومان نوێژی بەیانی فریشتەی شەویشو فریشتەی رۆژیش حازری دەبنو ئاگایان لێیەتی، ئەی پێغەمبەر، شەو نوێژیش بکە، چونکە شەو نوێژ (صلاة التهجد) لەسەر تۆ فەرزەو لەسەر ئومەتت سوننەتە، سا بەڵکوو خودای خۆت کە زیندووی کردیەوە مەقامی

مەحمووودت پێ ببەخشێو ئالآی حەمدو سوپاست پێ عەتا بکا، بلێ: خودایە لە شاری مەککە بمخەرە دەرێو بەسەلامەتی دەرچم بچمە ناو شاری مەدینەی پیرۆزەوە، لەلایەن خۆتەوە بەڵگەی ئاشکراو بەهێزم بدەرێ بتوانم بەربەرەکانی ئەو خەڵکە نەزانو سەر ڕەقەی پێ بکەم!!

دەی بڕوانە ئەم دەقە قورئانییە چەند جوان ئارامی دەخاتە ناو دڵو دەروونەوە، کاتێك ئایەتەکان دەخوێنیتەوە بەچاوی دڵ تێیان دەفکرێ، هەست بە چ خۆشییەك دەکەی، چۆن لە زلکاوی ئەم ژیانە مادییە دەستت دەگرێو قورتارت دەکاو دەتخاتە ناو ژیانێکی روحیو بەرزو خۆشەوە؟ بەراستی ئەمە هەر لەدەست قورئان دێ کە ئاوا بەو شێوە ئەم لاواندنەوە بخاتە دڵو مێشکەوەو غەمو ناڕەحەتی رامالێ!!

## خۆشەویستی نێوان ئادەمیزادو خودا(الحب بين العباد والرب):

دوژمنانی ئیسلام نازانن چۆن داخی دڵی خۆیان بە ئایینی ئیسلام بڕێژن، هەر دەمە رەخنەیەکی لێ دەگرن رۆژێك دەڵێن، ئایینی ئیسلام ئایینێکی مادی صیرفە دەمێکیش دەڵێن: ئایینێکی رۆحی صیرفە!

یەکێك لەو تیرە ژەهراوییانەی ئاڕاستەی جەستەی ئایینی ئیسلام کراوە ئەوەیە کە دەڵێن: ئیسلام ئایینێکی وشكو برینگەو خاڵییە لە خۆشەویستی نێوان خوداو خەڵك، ئەوەتا (ئەدوا روس) لە کتێبی بەناو (فلسفة الدين) کە بە ئینگلیزی دایناوە دەڵێ: (وشەی ئیسلام مانای گەردنکەچی بۆ ویستی خودا دەگەیەنێ، ئەمەش دەشێ سەربکێشێ بۆ ئەوە خودا حسێب بکرێ بە هێزێکی خاوەن دەسەڵاتو زەبر بەدەستی نەزانراو کەسەر پێچیکردنی بیهۆدەبێ، هیچ لە صیفەتەکانیشی پیرۆزیو خۆشەویستی تێدا نییە زیاد لەئەوەش بڕێ موسوڵمان هەن ئەم ئایینە وشکەیان بەدڵ نییەو لێی مورتاح نین، بێگومان پەیدابوونی ئەو کۆمەڵە صوفیانە لەناو موسوڵماناندا بڵاو بوونەوە شایەتیەکی تەواوە لەسەر ئەوە

کە ئەو خەڵکە حەزیان لەوە هەیە پەیوەندی بە خودایەکەوە بکەن زیندو بیٚو خاوەن خۆشەویستی بیٚ عەطفو سۆزی هەبیٚ).

سەیر ئەوەیە نییەت خراپیو نەزانی دروشمی ئەم نووسەرەیە کە لە راستیدا هیچ شتێك بەقەد رەتکردنەوەی بۆچوونەکەی ئاسان نییە، بە تایبەتی لە کارێکدا کە ئەو نەزانتر کەسە تێیدا! چونکە خۆشەویستی نێوان خوداو بەندە لە قورئاندا تا بڵێی زۆرو زەبەندەیە چەند جار دوو بارەو سیٚ بارەو دەبارە کراوەتەوە! هەر جارەی بە ئوسلوبو شێوازێك ئەم خۆشەویستییەی گەیاندووە.. کە بەتێکڕا دەتوانین ئەم خۆشەویستییە بکەین بەدوو بەشەوە.

أ) خۆشەویستی بەندە بۆ خودا.

ب) خۆشەویستی خودا بۆ بەندە.

## خۆشەویستی ئادەمیزاد بۆ خودا:

موسوڵمانی راستو راستاڵ ئەو کەسەیە هەست بە صیفەتی جەمالو جەلالی خودا بکا، شعوور بە لوتفو چاکەی ئەو بکاو بزانیٚو لێی بەقین بیٚ کە خودا خێرو بەخشش بەسەر ئەودا دەڕێژیٚ، ئەمجار لەم هەستو شعوورەوە حاڵەتێکی خۆشەویستی بۆ پەیدا ببیٚ، خودای لە هەموو شتێك خۆشتربویو دڵو دەروونی بەوەوە مەشغول بیٚو هەموو کردەوەیەکی لەبەرخاتری ئەوبیٚ، لەززەتو خۆشی لە تاعەتکردنو گەردنکەچی بۆ فەرمانەکانی ئەودا دەست بکەویٚ، ئەوکاتەی لاخۆش بیٚ کە بیٚ ئەمری ئەو ناکا، بەم شێوە باربگریٚو دڵرازی ئاوات خوازبیٚ بۆ زیادە قوڵبوونەوەو رووچوون لەم خۆشەویستییەدا، دڵنیابیٚ لە راستی رێبازیو چاکیی ئامانجی! خۆشەویستی ئادەمیزاد بۆ خودا برێتییە لە باوەڕی راستو دروست بە خودا، باوەڕێکی وا لە ناخەوە هەستی ببزوێنیٚ، نەك ناسینی خوداو ملکەچی نەفسی رواڵەتی! بەڵکوو ئیمانی ڕاست برێتییە لە خۆشەویستی خودا بە جۆرێك ئەو کەسە بەسەر خۆیدا سلاّوی بداتەوە، دیاردەی خۆشەویستییەکەی لە کردارو گوفتاردا دیاری بدا! کەوابوو بیرو باوەڕی رواڵەتی کە لە ئیزعانی

نەفسی تێپەڕ نەکاو دیاردەکانی لە بەندەکەدا دەرنەکەون بێشك ئەو باوەڕە ئەو باوەڕە نییە کە خودا لەبەندەکانی خۆی دەیەوێ. خودا دەفەرموێ:

{قُلْ إِن كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُواْ حَتَّى يَأْتِيَ اللّهُ بِأَمْرِهِ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ - سورة التوبة – ٢٤}.

واتە: ئەی پێغەمبەر! بەو مەردوومە بڵێ: ئەگەر باوكو باپیرتان یان كوڕو نەوەو وەچەتان یان خوشكو براتان، یان ژنو خێزانتان، یان هۆزو گەڵو تیرەتان، یان ئەوماڵو داراییەی كۆتان كردۆتەوە یان شتوومەكو كاڵایەك كە كڕیوتانەو دەترسن رائیج بێ‌و نەفرۆشێ، بەهۆی غەزاو جیهادەوە كاتی فرۆشتنی تێپەڕێ، یان خانوو باڵەخانەتان خۆشەویستترە لاتان لە خوداو پێغەمبەری خوداو كۆشش لە پێناوی ئایینی خودادا، ئەوە چاوەڕوانی سزای خودابن‌و بزانن چیتان بەسەر دێنێ! لەم ئایەتەدا هەڕەشەیەكی زۆر گەورە هەیە بۆ ئەوانەی كە لە كۆشش كردن‌و هەوڵدان لە ڕێگای خودادا پشت هەڵدەكەن‌و خۆی لێ دەشارنەوە!

پەروەردگار لەم ئایەتەدا هەموو حەزو ئارەزۆو پێویستی ماددی دونیایی مرۆڤی كۆ كردۆتەوەو خستویەتیە تایەكی تەرازووەوە، خۆشەویستی خوداو پێغەمبەرو خۆشەویستی جیهادو هەوڵدان لە ڕێگەی ئایینی خودادا ئەمەشی خستۆتە تایەكەی تریەوە! جا ئەو دڵو دەروونەی بتوانێ خۆی لەو حەزو ئارەزووە دنیاییانە قوتار بكاو خوداو پێغەمبەریان بەسەردا هەڵبژێرێ ئەوە دڵو دەروونێكە خودا گەرەكییەتی‌و ئیسلام دەیەوێ.

خودای گەورەو میهرەبان لە ئایەتێكدا باسی ڕەوشتی موسوڵمانانی ڕاستاڵو ڕاستگۆ دەكا، ئەو موسوڵمانانەی خودایان خۆش ویستووە خوداش ئەوانی خۆش ویستووە ڕویان تێ دەكاو دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ

**يَخَافُونَ لَوْمَةَ لآئِمٍ ذَلِكَ فَضْلُ اللّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاء وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ - سورة المائدة - ٥٤}.**

**واتە: ئەی کەسانێك کە بڕواتان هێناوەو موسوڵمان بوون!**

**هەر کەسێك لە ئێوە لە ئاینی هەڵگەڕێتەوە، ئاینی خودا پشت گوێ بخا لەوە بەولاوە خودای گەورە گەلو هۆزێکی تر دێنیو دەسەڵاتو فەرمان ڕەواییان دەداتیو ئەوان دەخاتە شوێنی ئێوەو ئاوەدانی جیهان دەخاتە ئەستۆی ئەوانو ئەوانیش فەرمانەکانی خودا بەباشی ئەنجام دەدەن، خودا خۆشی دەوێنو ئەوانیش خودایان خۆش دەوێ، دەرهەق موسوڵمانان دڵ نەرمو بە بەزەیین، دەرهەق بە کافرو گومڕایان توندو تۆڵو بەهێزن، لە ڕێگای خوادا، لە پێناوی ئاینی خوادا تێ دەکۆشنو هەوڵ دەدەن لە لۆمەو تانووتی لۆمەکاران ناترسن!**

**ئەم ڕەوشتە بەرزە ئەم ئاکارو پیاوەتییە فەزڵو کەرەمی خودایە دەیدا بە کەسانێك خۆی مەیلی لێبێ، کەرەمو ڕەحمەتی خودا فراوانە بەشی هەموو کەسێك دەکاو خۆشی ئاگاداری هەموو شتێکە!**

**خۆشەویستی خودا نیشانەی موسوڵمانێتی ڕاستییە، ئەو موسوڵمانانەی شیرینی بیرو باوەڕیان چەشکەکردوە هیچ شتێك بە ئیمان ناگوڕنەوە، ئیمانیان بەلاوە لە هەموو شتێك باشترە بۆیە پێغەمبەر دەفەرموێ:**

**« ثَلاَثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلاَوَةَ الإِيمَانِ: أَنْ يَكُونَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا ، وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لاَ يُحِبُّهُ إِلاَّ لِلَّهِ ، وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ. رواه البخاري .**

**واتە: سێ ڕەوشت هەن کەسێك ئەو سێ ڕەوشتەی تێدابن، ئەوە شیرینی ئیمانو باوەڕی چەشتووە:**

**یەکەم: ئەوەیە خوداو پێغەمبەری خودای لە هەموو شتێك بەلاوە خۆشەویستتر بن!**

**دووەم: ئەگەر یەکێکی خۆش ویست هە لەبەر خاتری خودا خۆشی بوێ.**

سێیەم: چەندی پێ ناخۆشە فڕێی دەنە ناو ئاگرەوە ئەوەندەی پێ ناخۆش بێ بگەڕێتەوە بۆ کوفر.

خۆشەویستی خودا گرنگترین بناغەیە بۆ دروستکردنی بینای ئەخلاق‌و ڕەوشت، خۆشەویستی خودا وامان لێ دەکا ببینە گیانێکی لەتیف‌و شەڕو بەدکاریمان لێ روو نەدا، دەمانگەیەنێتە ئەو حاڵەتەی هەموو شتێکی بوونەوەرمان خۆش بوێ، چونکە دەستکردی خودایە، ئەم حاڵەتە کاتێك پەیدا دەبێ صەفای نەفسی زاڵبێ بەسەرماندا، هەرچی رق‌و کینەیە، لە دەروونماندا نەمێنێ، فێڵ‌و تەڵەکەو جامبازی‌و چاووڕاو لەخۆمان دوور بخەینەوە.

## خۆشەویستی خودا بۆ ئادەمیزاد:

ئەگەر سەیری قورئان بکەین دەبینین پەروەردگاری خۆشەویستی خۆی داوە بەو کەسانەی خاوەنی کرداری گەورەو ڕەوشتی بەرزن ئەوانەی کردەوەکانیان خێرو بێری گشتییان تێدایەو بۆ کۆمەڵ‌و ئادەمیزاد سود بەخشە، ئەم خۆشەویستییەی لەکەس نەبڕیوە، مەگەر لە کەسانێك کە خاوەنی رەوشتی خراپ بن‌و لە خراپەکاریدا رۆچووبن خەریکی بڵاوکردنەوەی خراپەو خراپەکاریی بن‌و رەواج بە رەوشتی بەد بدەن، ئاژاوەگێر بن...

ئایەتەکانی قورئان کەباسی خۆشەویستی خودا دەکەن بۆ بەندەکان‌و وەسفی ئەو بەندانە بەچەند رەوشتێك دەکەن کە کاکڵەی ئەخلاق‌و سەرچاوەی نەفس بەرزی‌و مرۆڤایەتییە... وەکوو خودای گەورە دەفەرموێ:

{وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُم بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ - سورة المائدة – ٤٢}.

واتە: هەرکاتێ فەرمانڕەواییت کرد لەناو موسوڵمانانندا حوکم بە عەداڵەت‌و داد پەروەری بکە، چونکە خودا داد پەروەرانی خۆش دەوێ! یان دەفەرموێ:

{بَلَى مَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ وَاتَّقَى فَإِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ - سورة آل عمران – ٧٦}.

کەسێك وەفا بە ئەهدو پەیمان بکاو تەقواو تاعەتی خودا بکا مالّی کەس بە زۆرو ستەم نەخوا، ئەوە ئەوکەسە لە خۆشەویستانی خودایە چونکە خودا تەقواکەرو خۆ پارێزانی خۆش دەوێت.

{فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ - سورة آل عمران – ١٥٩}.

واتە: هەرکاتێك دوای موشاوەرەو لێوردبوونەوە هاتیتە سەر ئەوەی کردەوەیەك ئەنجام بدەی، تەوەککولت بەخودابێ پشت بەو ببەستە، چونکە خودا خاوەن تەوەککولی خۆشدەوێت.

{فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاصْفَحْ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ - سورة المائدة – ١٣}.

ئەی پێغەمبەر چاو لە هەڵسوکەوتی هەڵەی هاورێکانت بپۆشەو سەرفی نەزەرییان لێ بکە بێگومان خودا مرۆڤی چاکە کارو دڵ سافو لێبوردووی خۆش دەویٚ!

{وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا اسْتَكَانُواْ وَاللّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ - سورة آل عمران – ١٤٦}.

واتە: پێغەمبەرانو شوێنکەوتووانی هەرگیز لە جیهادو هەوڵدان لە رێگای خودادا ماندوو نەبوونو زەبوونیان بەسەردا نەهاتووە، لەئاستی بەلاو موسیبەتی رۆژگاردا خۆ راگربوون! لەپێناو ئایینی خودادا صەبرو سەباتیان هەبووەو خوداش خاوەنی سەبرو ئارامی خۆش دەوێن.

{إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ - سورة البقرة – ٢٢٢}.

پەروەردگار تۆبەکاری خۆشدەوێت، هەروەها ئەوانەیشی خوش دەوێت کە هەردەم پاكو خاوێنو دەست بە دەسنوێژن.. پەروەردگار خۆشەویستی خۆی لەوانە بڕیوە کە خاوەنی ئەو رەوشتانەن: کە کانی بەدبەختین بۆ گرۆهی ئادەمیزادو ئەمنو ئاسایش لەسەر رووی زەوی‌و قەلاچۆدەکەن، دەفەرمویٚ:

{وَلَا تَبْغِ الْفَسَادَ فِي الْأَرْضِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ -سورة القصص/٧٧}.

واتە: هەرگیز لەسەر زەوی هەوڵی فەسادو گێرە شێوێنی مەدە، بێگومان خودا موفسیدو خراپەکارانی خۆش ناوێن!

{وَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ وَاللّهُ لاَ يُحِبُّ الظَّالِمِينَ - سورة آل عمران – ٥٧}.

بەلام ئەوانەی ئیمانو باوەڕیان هەیەو کردەوەی باش دەکەن پەروەردگار پاداشی خۆیان دەداتەوە، ستەم لەکەس ناکا! هەرگیز خودا زالمو ستەمکاری خۆش ناوێن!

{لِيَجْزِيَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِن فَضْلِهِ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ - سورة الروم – ٤٥}.

هەر کەسێك کافر بێ، سزای کوفرەکەی لەخۆی دەسێنرێ. کەسێ کردەوەی چاك بێ پاداشەکەی بۆ خودی خۆیەتی، ئەمە بۆ ئەوەیە هەتا خودای گەورە –بە فەزڵو کەرەمی خۆی– پاداشی کردەوەی چاکی موسوڵمانانو ئیمانداران بداتەوە! بێگومان خودا کافرو بێدینانی خۆش ناوێن.

{لاَ جَرَمَ أَنَّ اللّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْتَكْبِرِينَ - سورة النحل – ٢٣}.

واتە: بێگومان خودای گەورە نهێنیو ئاشکراتان دەزانێ، ئاگاداری هەموو کردارو گوفتارتانە. کەوابێ نە بەنهێنی نە بە ئاشکرا دەعیەو تەکەبوور مەکەن، چونکە خودا هیچ خۆبەزلزانو لووتبەرزێکی خۆش ناوێ!

{إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالاً فَخُورًا - سورة النساء – ٣٦}.

واتە: بێگومان خودای مەزن کەسێکی خۆش ناوێ کە لووت بەرزبێو خۆ بەزل بزانێو ستایشی خۆی بکا.

{وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَانبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاء إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الخَائِنِينَ - سورة الأنفال – ٥٨}.

واتە: ئەگەر ترسان هۆزێك غەشو خیانەتتان لێ بکەن، عەهدو پەیمانێك کە لە نێوانتانا هەیە بیخەنە بەرچاویان رێكو پێك پێیان رابگەیەنن کە ئێمە شەڕتان لەگەڵ دەکەین، هەرگیز لە سەرەتاوە بەناگەهانی بەسەر دوژمندا مەدەن، چونکە خودا هەرگیز خائینو فێڵبازی خۆش ناوێن.

{وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبِّ الْمُعْتَدِينَ - سورة البقرة – ١٩٠}.

واتە: ئەی گرۆهی موسوڵمانان! لە ڕێگەی خودادا کۆشش، نیزال بکەن دژی ئەوانەی شەڕتان لەگەڵ دەکەن بجەنگێن‌و دیفاع لە ئایین‌و ماڵ‌و ناموستان بکەن، بەڵام ئێوە زیادەڕەوی مەکەن، چونکە خودا قەت تەجاوەزکارانی خۆش ناوێن! خۆشەویستی خودا بۆ هەر ئینسانێك بێ دەبێتە کانی خۆشبەختی بۆی، چونکە لەتەك خۆشەویستییەکەدا چاوە دێری خودای لەگەڵدایە، یارمەتی ئەوی بۆ دێ، خودا بەهێزو توانای خۆی لەسەری دەکاتەوەو دوژمنانی بۆ دەشکێنێ! بە پێچەوانەشەوە ڕق‌و کینەی خودا بۆ ئادەمیزاد دەبێتە هۆی شەقاوەت‌و نەگبەتی. پێغەمبەری مەزن (دروودی خودای لەسەربێ) لە حەدیسێکدا ئەمەی بەجوانی ڕون کردۆتەوەو دەفەرموێ:

« إِذَا أَحَبَّ اللَّهُ عَبْدًا نَادَى جِبْرِيلَ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ فُلاَنًا ، فَأَحِبَّهُ . فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ ، فَيُنَادِي جِبْرِيلُ فِى أَهْلِ السَّمَاءِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ فُلاَنًا ، فَأَحِبُّوهُ . فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ ، ثُمَّ يُوضَعُ لَهُ الْقَبُولُ فِى أَهْلِ الأَرْضِ. رواه مسلم .

واتە: کاتێك خودا بەندەیەکی خۆشویست بانگی جوبرائیل دەکاو دەفەرموێ: من فلانە بەندەم خۆشدەوێ تۆش خۆشتبوێ، ئەویش خۆشی دەوێ. ئەمجار جوبرائیل بە ئاسماناندا بانگ هەڵدەداو دەفەرموێ خودا فلانەکەسی خۆش دەوێ ئێوەش خۆشتان بوێ، ئیتر ئەهلی ئاسمانەکان هەموویان خۆشیان دەوێ‌و ئەمجار لەسەر زەوی ڕێزو قبوولی دەچەسپێ!

هەر کاتێکیش بەندەیەکی ناخۆش ویست بانگی جوبرائیل دەکا پێی دەفەرموێ: من فلان بەندەم ناخۆش دەوێ تۆش ناخۆشت بوێ ئیتر جوبرائیل ناخۆشی دەوێ، ئەمجار بەناو ئەهلی ئاسمانەکاندا بانگ هەڵدەداو دەفەرموێ: خودا فلان بەندەی ناخۆش دەوێ، ئێوەش ناخۆشتان بوێ، ئیتر ڕق‌و کینەی خەڵکی بۆ دەچەسپێ...

## ترسی خوداو بە بڕشتی ئەو ترسە لە بەرامبەر شەڕدا

ئەوەی کە ئەمڕۆ ئادەمیزادی بەگیر هێناوەو جیهان لە ژێر قورساییدا دەنالێنێ، بریتییە لە نزم بوونەوەی رەوشتی جوانو مرۆڤایەتی! پێ داگرتن لەسەر رەوشتی ناشیرینو هەوڵدان بۆ فێر بوونو وەرگرتنی رەوشتی بەدو بڵاوبونەوەی تاوانو تاوانکاری! ئەمانە هەموویان بەهۆی غافڵ بوونی ئادەمیزاد لە خودا هاتوونە کایەوە گشتیان بەهۆی هەستکردن بە عەزەمەتی خودا پەیدابوون ئەو عەزەمەتو گەورەییەی کە لە دەروندا ترسێك پەیدا بکاو ببێتە پەردەیەکی پتەو لە بەردەم ئادەمیزادداو بەربەرستی خراپەو خراپەکاری لێ بکا! بەڵێ ترسی خودا پایەیەکە ژیانی روحی لەسەر هەڵدەچنرێ، چونکە ئەو ترسە ئادەمیزاد هەڵدەنێ بۆ هەموو خێرو بێرێكو دەرگای خۆشی ژیانی لێ دەکاتەوە، هەر لەبەر ئەوەیە کە ئایینەکان یەك بە دوای یەکدا هەوڵیان داوە ئەم هەستە لە دڵو دەروونی خەڵکیدا بڕوێنن، هەروەها هەوڵبدەن ئەوشتانەی کە دەبنە هۆی رقو غەزەبی خودا لە دونیاو قیامەتدا بۆیان رون بکەنەوە!

خۆ ئەگەر ترسی خودا نەبوایە ئادەمیزاد بە تەواوی ملی لە شەڕو خراپەکاری دەناو باوەشی بە حەزو ئارەزووە دونیاییەکانی دا دەکردو هیچ یاساو قانوونێك نەدەبوو بتوانێ بەر هەڵستی ئادەمیزاد بکاو لە خراپەکاری بیگێڕێتەوە، هیچ هێزێکی بە توانا نەدەبوو دەستی زۆردار بگرێو نەهێڵێ چەپۆکی چەپەڵی بەبێ نەوایان دادا. ئاشکراشە تا زیاتر ترسی خودا لەدڵی مرۆڤدا کز ببێ زیاتر جیهان پڕ دەبێ لە ئاژاوەو ناکۆکی.

ئایینی ئیسلام لە تەك ئەو داکۆکی کردنەو سزادانانەی کە بۆ خراپەکارانو شەڕخوازانی داناوە ئەوەشی لە یاد نەچووە کە هەردەم ئادەمیزاد هۆشیار بکاتەوەو ترسی خوای بخاتە دڵو دەرونییەوە، تۆڵەو سزای سەختی دۆزەخیان بخاتە پێش چاو، بۆ ئەوەی لە سەرکەشی بێگێڕێتەوەو بیخاتە سەر رێبازێك کە دەیگەیەنێ بە رەزامەندیی خوداو گەیشتن بە مرادی بۆ ئاسان دەکا. خودا دەفەرموێ:

{وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَخْشَ اللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ- سورة النـور- ٥٢}.

واتـە: کەسـێك ئیتاعـەی خـوداو پێغەمبـەری خـودا بکـاو گـەردن کەچـی فەرمانـەکانیان بیّو لـە خـودا بترسیّو خـۆ لـە سزای بەئێشی بپارێزیّ بێگومـان ئەوانە بە مراد گەیشتونو سەرفرازن! یان دەفەرمویّ:

{إِنَّ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِالْغَيْبِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ - سورة الملك/١٢}.

واتە: ئەوانەی ترسی سزای خودایـان هەیـەو بـەبیّ ئـەوەی بیبیـنن لـە ترسـی سـزاو تۆڵـەی ئیمـانی پـیّ دێـنن بـە نهێنـیو ئاشـکرا لێـی دەترسـن، ئەوانـە لێخۆشبوونی خوداو پاداشی گەورەیان دەدرێتیّ!

ترسی خودا، ئازایەتی رۆشنبیری (الشجاعة الأدبيـة) بـە ئـادەمیزاد دەبەخشیّ ترسـی خـودا جـوانترین رەوشـتە: کـە ئـادەمیزاد دەرازێنێتـەوەو مرۆڤایـەتی تێـدا دەروێنیّ! ئازایەتی رۆشنبیری بریتییە لەوە کە مـرۆڤ راوبۆچـوونو بـیرو بـاوەڕی خـۆی دەربـبڕیّ گـویّ نەداتـە ئـەوە چـی پـیّ دەگـوتریّو گومـانی چـی لیّ دەکـریّ، تەنانـەت ئەگـەر ئـەم رادەربڕینـە سەربکێـشیّ بـۆ رق هەسـتانی کاربەدەسـتانو فـەرمان رەوایـانیش، هـەر شـتێك خـۆی بەلایـەوە راسـت نـەبیّ ئـەنجامی نـەدا بـا ئەنجام نەدانەکەش بەدڵی کۆمەڵ نەبیّو خەڵك لێی بڕەنجێن! خودا دەفەرمویّ:

{إِنَّمَا ذَلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ فَلاَ تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ - سورة آل عمران – ١٧٥}.

واتـە: - ئەگـەر ئێـوە راسـت دەکـەن موسـوڵمانن – لـەو کـافرو گومڕایانـە مەترسنو ئەمێتیان پیّ مـەدەن، لـەمن بترسـن چیتان پـیّ دەڵـێم ئـەنجامی بـدەن چونکە خێرو شەڕ بەدەست منە. یان دەفەرمویّ:

{أَتَخْشَوْنَهُمْ فَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَوْهُ إِن كُنتُم مُّؤُمِنِينَ - سورة التوبة/١٣}.

واتە: ئایا ئێوە لـەوە دەترسـن کـە لـەو کـافرو بێدینانـە زەرەو زیانێکتـان پـیّ بگا!؟؟ لەوان مەترسن چونکە ئەوان شایانی لیّ ترسان نـین خـودا شایانی ئەوەیـە لێی بترسن ئەگەر ئێوە بەراستی موسوڵمانن.

هەروا لە چەند شوێنێکی تری قورئاندا پەروەردگار وەسفی موسوڵمانان دەکاو دەفەرموێ:

{يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ يَخَافُونَ لَوْمَةَ لآئِمٍ ذَلِكَ فَضْلُ اللّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاء وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ - سورة المائدة – ٥٤}.

واتە: ئەو موسوڵمانانە رەوشتیان وایە لە رێگای خودادا غەزا دەکەنو هەوڵ دەدەن بۆ پێشکەوتنی ئایینو بڵاوبونەوەی بەناو ئادەمیزاددا، هەرگیز لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسنو گوێ بە تانەو تەشەریان نادەن.

کاتێکیش سەیری مێژوو دەکەین دەبینین پڕیەتی لە ژینامەی ئەو پاڵەوانانەی کە هەموو شتێکیان لە پێناوی گوتنی قسەی حەقو یارمەتدانی حەقو راستیدا بەخت کردوە، لە سۆنگەی حەق خۆشەویستییەوە صەبریان لەسەر ئازارو ئەشکەنجە گرتووە، چونکە هەمووکات حەقو راستییان لەخۆیان خۆشتر ویستووە، پێغەمبەرانو زانایان باشترین بەڵگەی ئەم راستییەن! بۆیە دەبینین قورئانی پیرۆز کە باسی پێغەمبەران دەکا ئەوە دەگەیەنێ کە رەوشتێك لە رەوشتە بەرزەکانیان ئازایەتیو نەترسان لە خەڵك بووە:

{الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالَاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا اللَّهَ وَكَفَى بِاللَّهِ حَسِيبًا - سورة الأحزاب – ٣٩}.

واتە: ئەو پێغەمبەرانەی پەیامی خودایان گەیاندووە لە خودا ترساونو بەس لە کەسی تر – جگە لە خودا – نەترساون.

## ئومێد بەرەحمەت لەتەك ترسان لە سزا (الرجاء مع الخشية):

قورئانی پیرۆز لە زۆر شوێندا ترسی سزای خودا لە تەك ئومێدی رەحمەتی دا باس دەکا، چونکە گوناهکار کە بگاتە حاڵەتێك ئومێدی رەحمەتی خودای نەمێنێو پێی وابێ تۆبەی لێ وەرناگیرێ دەبێتە هێزێکی نائومێدکراوی خەتەرناك، کە هەرگیز چاوەروانی باشی لێ ناکرێو سوودی لێ وەرناگیرێ، چونکە

پچڕانی پەیوەندی نێوان خوداو بەندە ئەوپەڕی سەر لێ شێواوی لێ پەیدا دەبێ، بۆیە دەڵێن ترساندنی بەندە لە خودا ئەندازەیەکی هەیە نابێ ترس و خۆفەکە بگاتە پلەی مەئیووسی و نائومێدبوون!

چونکە پەروەردەکرن بە ترساندنی روت پەروەردەکردنێکی پووچەڵ و بێ سوودە، لەم رووەوە کە ئەو جۆرە ترسانە روناکیی لە دەرونی مرۆڤدا دەکوژێنێتەوەو خپی دەکا! هەموو ئادەمیزادێك حەزو سۆزی تایبەتی هەیە پێویستە گەشەی پێ بکرێ، بە پاداشی چاك و دەسکەوتی باش تەشجیع بکرێ. قورئان لەم بارەوە دەفەرموێ:

{وَلاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاَحِهَا وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا إِنَّ رَحْمَتَ اللّهِ قَرِيبٌ مِّنَ الْمُحْسِنِينَ - سورة الأعراف – ٥٦}.

واتە: هەرگیز لە زەویدا فەسادو خراپەکاری و وێرانکاریی بلاو مەکەنەوە، دوای ئەوەی پەروەردگار زەوی ئاوەدان کردۆتەوە بەهۆی ناردنی پێغەمبەران و ناردنی نامە ئاسمانییەکان و دانانی یاساو نیزام، ئیتر ئێوە نەچن دەست بکەن بەکوشتنی خەڵك و خانوو روخاندن و باخ وێرانکردن کانی و ئاو پڕکردنەوە، ئەمانە خراپەکاری و فەساد بلاو کردنەوەن خۆتانی لێ بپارێزن. هاوار بکەنە خودا ترسی ئەوەتان هەبێ دوعاکەتان نەبیسترێ، ئومێدی ئەوەشتان ببێ نزاکەتان وەردەگیرێ. بێگومان رەحمەتی خودا لە چاکەکاران نزیکە. یان دەفەرموێ:

{تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ - سورة السجدة – ١٦}.

واتە: ئەو موسوڵمانانە رەوشتیان وایە شەو نوێژ دەکەن و هاواری خودای خۆیان دەکەن و لێی دەپارێنەوە ترسی سزاو هومێدی رەحمەتیان هەیە!

لەباسی پێغەمبەرانیش دا دەفەرموێ:

{إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ - سورة الأنبياء – ٩٠}.

واتە: ئەو پێغەمبەرانە رەوشتیان وابوو پێشبڕکێیان دەکرد بۆ چاکەو چاکەکردن لە ئێمە دەپاڕانەوە، بەڵام بە هیوای رەحمەتو ترسی سزاشیان هەبوو ئەوان لە ئێمە دەترسانو هەموو کاتێ ئێمەیان لەیادبوو.

بێگومان ترسی خودا لە تەك ئومێد بە رەحمەتی بێ پایانی رۆڵێکی گرنگی هەیە لە کردارو گوفتاری مرۆڤدا چونکە ئەو شێوە ترسو هیوایە ویژدانی مرۆڤایەتی پەروەردە دەکەن ئینسان دەکەن بە ئەندامێکی گونجاوو لەبار لە کۆمەڵی ئادەمیزاددا!!

## داواکردنی لێخۆشبوونو شوێن دەستی لەچارەسەرکردنی نەخۆشی نەفسی

موسوڵمانی روو لە خودا لە هەموو کردارێکی دا خۆ لە هەڵەو گوناهو تاوان دەپارێزێو بە دەگمەن تاوانی لێ روودەدا!

بەڵام جاری وا هەیە قاچی هەڵدەخلیسکێو کردارێك دەکا کە لەو نەوەشێتەوە، بەڵام زوو ژیوان دەبێتەوەو خێرا یادی خودا دەکاتەوەو هەست بە تاوانەکەی دەکاو واز لەو گوناهە دێنێو پەشێمان دەبێتەوەو داوای لێ خۆشبوون دەکا.

بەڵێ موسوڵمان هەڵە دەکا بەڵام پێویستی سەرشانییەتی هەر کاتێ هەڵەی کرد خێرا لێی بگەرێتەوە، کە قاچی هەڵخلیسکاو کەوت خێرا راست بێتەوە چڵكو تەپو تۆزی گوناه لەخۆی بتەکێنێو بەرەو ئامانجی خواپەرستی هەنگاو هەڵێنێو لەرەحمەتی خودا ناهومێد نەبێ! بۆیە پەروەردگار عوزر بۆ گوناهکاران دەهێنێتەوە، هەڵیان دەنێ بۆ داواکردنی لێخۆشبوونو چاوپۆشییەك کە سەربکێشێ بۆ سەرزنشتکردنی نەفسو رووتێکردن لە خودا بەجۆرێك کەویژدانی ببزوێنێو دڵی زیندوو بکاتەوەو لەخودا دوور نەکەوێتەوە..

لە ئایینی ئیسلامدا کەفارەتی گوناهو پاکبوونەوە لە گوناه پێویستی بە پەسەندکردنی پیاوانی ئایینی نییە! هەروەها گوناه نابێتە شتێك رزگابوون لەدەستی نەگونجێ!

بەڵکوو هەموو موسوڵمانێك دەتوانێ راستەو خۆ روبکاتە خوداو داوای لێخۆشبوونی لێ بکا، لێی بپاڕێتەوە تا دەرگای رەحمەتی خۆی لێ بکاتەوە رەحمو بەزەیی خۆی بداتێ. خودا دەفەرموێ:

{وَمَن يَعْمَلْ سُوءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللّهَ يَجِدِ اللّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا -سورة النساء – ١١٠}.

واتە: کەسێك گوناهێك بکا زەرەری بۆ خۆیو خەڵکی تریش بێ، یان هەر زەرەری بۆ خۆی هەبێ دوایی داوای لێخۆشبوونی گوناهەکانی بکاو لەخودا بپاڕێتەوە ئەوە پەروەردگار لە گوناهەکانی خۆش دەبێو بەزەیی پێدا دێتەوە.

لە شوێنێکی تردا پەروەردگار رەوشتی ئەو موسوڵمانانەی کە شایانی لێخۆشبوونن ئاوا باس دەکاو دەفەرموێ:

{وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُواْ أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُواْ اللّهَ فَاسْتَغْفَرُواْ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ اللّهُ وَلَمْ يُصِرُّواْ عَلَى مَا فَعَلُواْ وَهُمْ يَعْلَمُونَ، أُوْلَئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ - سورة آل عمران – ١٣٥-١٣٦}.

واتە: ئەو موسوڵمانانەی کە گوناهێکی گەورەیان لێ روودەدا یان تاوانێکی پچووك دەکەن خێرا خودایان بیر دەێتەوەو داوای لێخۆشبوونی لێ دەکەن دەپاڕێنەوە کە گوناهەکانیان رەش بکرێتەوە، جا کێ هەیە وەکوو خودا لە گوناه خۆش ببێو ئاوا بە تەواوی چاوپۆشی لە گوناهان بکا!

ئەو موسوڵمانە زیاد لە پاڕانەوەو لالانە سوریش نەبوون لەسەر کردنی ئەو گوناهانە، دەشزانن کردەوەکەیان خراپ بووەو خودا پێی ناخۆش بووە پێویستە تۆبەی لێ بکەن، ئەوانە پاداشیان لێخۆشبوونی خودایە.

لێخۆشبوونی خودا بەردەوامە بۆ هەر کەسێك تۆبە بکاو بگەڕێتەوە، با زۆریش گوناهی کردبێ خودا دەفەرموێ:

{قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ - سورة الزمر – ٥٣}.

واتە: ئەی فروستادە! ئەی پێغەمبەر! بە ئەو بەندانەی زیادە ڕەویان کردوە، گوناهیان لێ ڕودراوە ستەمیان لە نەفسی خۆیان کردوە، پێیان بڵێ! هەرگیز لە ڕەحمەتو بەزەیی خودا نائومێد مەبن، چونکە خودا – ئەگەر حەز بکا – جگە لە گوناهی شیرك لە هەموو گوناهێك خۆش دەبێ، بێگومان خودا لێخۆشبوونی لە گوناه زۆرەو تا بڵێی بە بەزەییو بەڕەحمە!

دەڵێن: ئەم ئایەتە گەورەترین موژدەیە بۆ دەروونی موسوڵمان چونکە دەرگای هومێدی خستۆتە سەر پشتو ئاسۆی هیوای ڕوونکردۆتەوە، ئایینی ئیسلام فرسەتو هەلو هەڵکەوتی ڕزگاربوون لە گوناهو پاکبوونەوە لە تاوان تێکەڵاو دەکا بە خێرو چاکە! ئەوەتا کرداری چاکەی کردوە بە کەفارەتو قەڵەمی ڕەشکردنەوەی گوناه، دیارە ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئامێرێکی بەهێزی مەردوم هەڵنانە بۆ کرداری چاکە:

{إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ذَلِكَ ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ-سورة هود/١١٤}.

واتە: بێگومان کرداری چاكو پیرۆز گوناهو تاوان رادەماڵێو قەڵاچوویان دەکا. لە شوێنێکی تردا خودا دەفەرموێ: چاکەو کرداری باش سەردەکێشن بۆ لێخۆشبونی خودا!:

{وَآخَرُونَ اعْتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُواْ عَمَلاً صَالِحًا وَآخَرَ سَيِّئًا عَسَى اللّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ - سورة التوبة – ١٠٢}.

واتە: برێکی تر لە دانیشتوانی مەدینە کە لە چون بۆ غەزا پاشکەوتن، دانیان بە گوناهو تاوانی خۆیاندا ناو عوزری درۆو دەلەسەیان نەهێنایەوە، کرداری چاكو باشی پیشوویان تێکەڵاو بەم تاوانە (نەچوونیان بۆ غەزا) کردوە ئەوانە ئومێد وایە خودا عوزریان قبووڵ بکاو تاوانیان بپۆشێو تۆبەیان لێ وەرگرێ بە ڕاستی خودا لێخۆشبوونی زۆرەو بەڕەحمە.

هەر لەم مەعنایەدا پێغەمبەر دەفەرموێ: (وأتبع السَّيِّئَةِ الْحَسَنَةَ تمحها– رواه أحمد والترمذي).

واتە: هەرکاتێ تاونێکت لێ رودرا، خێرا چاکەیەکی بەشوێندا بکە بۆ خاتری تاوانەکە رەش بکاتەوە.

بڕوای مرۆڤ بەوە کە خودا لە هەموو گوناهێك خۆش دەبێ وە هەرکاتێ داوای لێخۆشبوونی لێ بکا نزاکەی گیرا دەبێ، ئا ئەم بڕوایە وەسیلەو ئامێرێکی نەفسی تازە هەست پێکراوە، زانستی نۆژداری نەفسانی تا ئەم چەرخە بەکاری نەهێناوە، ئەوەتا زانایانی دەروونناسی لەسەرو هەموشیانەوە (فروید) دانەری قوتابخانەی شیکردنەوەی دەرونیی دانیان بەوە داناوە کە هەموو نەخۆشییەکی دەرونیی دەگەڕێتەوە بۆ سەرکوت کردنو بەر بەستکردنی هەستو شعور، ئەمەش ئەو گرێ دەرونیانەی لێ پەیدا دەبن، کە هەر چارەسەریان نییە مەگەر بەشیکردنەوەی دەرونی تایبەتی، ئەویش بەو جۆرە مرۆڤ بچێتە عیبادەی پزیشکێکی دەروونناسو ددان بە تاوانەکانیدا بنێو ناو دەرونی خۆی بخاتە بەردەستی، ئەم ددان بە تاوان دانانە پزیشکەکان دەڵێن: سیفەتێکی دەروونیو ڕەوشتییە، تاوانی نەخۆشەکە دەردەخاتو دەیان بینێو هەستیان پێ دەکا، ئیتر گونجانێك یان بڵێن ڕێك کەتنێك لە نێوان دەروونو ویژدان پەیدا دەبێ ویژدان چاوپۆشی لە دەروونی دەکا ئەوکاتە مرۆڤ هەست بە لێبوردنو لێخۆشبوون دەکا، روناکییەك دەکەوێتە نێوان خۆیو دەرونیەوە، گرێ کوێرکە نەفسییەکە نامێنێ.

ئاشکراشە گرێ کوێرکەی دەروونی وەهمو خەیاڵ نییە ئەصڵو فەسڵێکی هەیە چونکە زۆرجار ئەم گرێ کوێرکە نەفسییانە دەبنە هۆی سەرئێشەو دڵ بەیەکا هاتنو پەستاوتنی خوێنو بەرزبوونەوەیو چەند نەخۆشی ترا

جا ئەگەر چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشییە بەوە بکرێ کە لەبەردەم پزیشکەکەدا ددان بە تاوانەکاندا بنێی تا ویژدانی خۆت دڵنیا بکەیو ویژدان لەخۆت رازی بکەی!؟! ئەی دەبێ چ جیاوازییەك هەبێ لە نێوان ددان بە تاوانانا

لەبەردەم خوداو لەبەردەم پزیشك؟ چونكە جیاوازییەك هەیە لە نێوان لێبوردنی خوداو لێبوردنی ویژداندا.؟!

تیۆری ددان نان بە تاوان لەبەردەم خودادا تیۆرێكی قورئانییەو سوودی تایبەتی خۆی بە دەروونی ئینسان دەبەخشێ. قورئانی پیرۆز نموونەیەكی ددان بە تاوان دانانی هێناوەتەوە بەو كردەوەی لە حەزرەتی (یونس = ذی النون) رویدا، سوودی ئەم ددان پێدانانەش ئەوە بوو كە خودا رزگاری كردو لە سكی ماسیو لەغەمو نارەحەتی قوتاری بوو.

{وَذَا النُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَاضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ أَن لَّا إِلَهَ إِلَّا أَنتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ الظَّالِمِينَ، فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ الْغَمِّ وَكَذَلِكَ نُنجِي الْمُؤْمِنِينَ - سورة الأنبياء ٨٧ – ٨٨}.

واتە: حەزرەتی یونس (خاوەنی ماسی) كاتێك كرایە پێغەمبەر رەوانەكرا بۆ سەر دانیشتوانی موصڵ ئەوانیش سەرپێچییان كردو بەدرۆیان خستەوە، جا یونس رقی لە قەومەكەی هەڵساو بەبێ پرسی ئێمە ئەوانی بەجێ هێشتو هەڵات! پێی وابوو ئێمە ناتوانین سزای بدەین، ئەوە بوو رووی لە كەناری دەریا كردو سواری كەشتییەك بوو، دوایی دانیشتوانی سەر كەشتییەكە لەبەر چەند هۆیەكی تایبەتی فڕێیان دایە ناو دەریاكەوە، هەر خێرا ماسییەك (نەهەنگێك) قوتی دا، ئەمجار هەستی بە تاوانی خۆی كرد، ئیتر لەناو تاریكایی شەوو دەریاو سكی نەهەنگەكەدا دەستی كرد بە پاڕانەوە پاڕانەوەكەشی بریتی بوو لەم دوعایە دەیگوت:

(لا إله إلا أنت سُبحانك إني كُنتُ مِنَ الظالمين)

واتە: ئەی پەروەردگار! هیچ خودای راستو دروست نین تۆ نەبێ، خودایەكی پاكو خاوێنو بێ خەوشی، ئەمن تاوانبارمو ستەمم لەخۆم كردو بێ ئەمری تۆم كرد، ئەمجار ئێمە وەڵامی پاڕانەوەكەیمان دایەوەو نزاكەمان لێ وەرگرت لە غەمو نارەحەتی لە ناوسكی نەهەنگەكە ڕزگارمان كرد، هەر بەو شێوەیەش فریای موسوڵمانان دەكەوینو لە ناخۆشی ڕزگاریان دەكەین.

سەیری ڕستەی (وَكَذَلِكَ نُنجِي الْمُؤْمِنِينَ) بکە سروش‌و ئاماژەیەکی بەهێزی تێدا هەیە بۆ موسوڵمانان بۆ ئەوەی پەیڕەوی ئەم بەرنامە رۆشنە بکەن کە هۆی رزگاربوون‌و قورتاربوونە لەو تەنگ‌و چەڵەمەیەی کە هەستی پێ دەکەن لە ئەنجامی وێکهێنانەوەی ویژدان‌و زەمیری لەکاتی کردنی تاوانێکی گەورە یان بچووك.

هەروەها قورئان نمونەیەکی دان پێدانان بە تاوانی هێناوەتەوە بەو تاوانەی کە لەحەزرەتی ئادەم‌و دایکە حەوا رووی دا، کاتێك بێ گوێیی فەرمانی خودایان کردو لە داری گەنمیان خواردو لە بەهەشت دەرکران‌و دوایی دانیان بە تاوانەکەیان دا ناو هاواریان لێ بەرز بووەوەو گوتیان:

{قَالاَ رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ - سورة الأعراف ٢٣}.

پەروەردگار! ئێمە زوڵممان لە خۆمان کردو بێ ئەمری تۆمان کردو تاوانمان کرد ئەگەر لێمان خۆش نەبی‌و چاوپۆشیمان لێ نەکەی‌و بەزەییت پێماندا نەیەتەوە بێگومان ماڵ وێران‌و خەسارەتمەندی هەردوو دنیا دەبین.

## سوودی نزاو پاڕانەوە (فائدة الإستغفار):

قورئانی پیرۆز پاڕانەوەو داوای لێخۆشبوون لە گوناهو وازهێنان لە کرداری خراپ دەکاتە هۆو وەسیلەی گەیشتن بە رەحمەتی خوداو دەسکەوتنی خێرو بێرو بەخشش لە ژیانی دونیادا، خودا دەفەرموێ:

{وأن استغفروا ربكم ثم توبوا اليه يمتعكم متاعا حسنا الى أجل مسمى ويؤت كل ذي فضل فضله} (هود/٣).

واتە: داوای لێخۆشبوون لە خودا بکەن‌و لە تاوانەکانتان پەشیمان ببنەوەو تۆبە بکەن‌و بۆ لای خودا بگەڕێنەوە، ئەگەر وا بکەن خودا ژیانێکی خۆش‌و رزق‌و رۆژییەکی باشتان دەداتێ تا لە ژیانی دنیادان‌و کاتی مردنتان دێ بەخۆش‌و دڵئارامیی دەی گوزەرێنن. خودای پەروەردگار هەر کەسێ چاکە بکاو تاعەت‌و

خێرەومەنـد بـێ پاداشـی خـوای دەداتـەوە چ لـە دونیـا چ لـە قیامـەت چ لـە هەردوکیاندا.

لەم ئایەتەدا ئەوەمان بۆ رون دەبێتـەوە کـە هـەر کەسێك بـە راسـتی روو لـە خودابێ، گەردن کەچی فەرمانی خودابێ، ژیانی دونیا بەرێكو پێکی بەسەر دەباو سەر رەحەتو دڵ ئارام، ژیان دەگوزەرێنێ!!

پەروەردگار لەسەر زوبانی فروستادەی خوای، حەزرەتی (هود) دەفەرموێ:

{وَيَا قَوْمِ اسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُواْ إِلَيْهِ يُرْسِلِ السَّمَاء عَلَيْكُم مِّدْرَارًا وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَى قُوَّتِكُمْ وَلاَ تَتَوَلَّوْاْ مُجْرِمِينَ - سورة هود ٥٢}.

ئەی هۆزو گەلو خـزمو کـەسو کـارم: داوای لێخۆشـبوون لـە خـودای خۆتـان بکەن بەدڵ تۆبە لە گوناەو تاوانتان بکەنو بگەرێنەوە بۆلای قاپی رەحمەتی ئـەو، ئەگەر وابکەن ئاسمان خێرو بێری زۆر دەبێ بۆتان هەرزانی دەکەوێتە ولاتتانەوە، هێزو قووەتتان زیاد دەکا!

لەسەر زوبانی فرستادەی خۆشی، حەزرەتی (نووح) دەفەرموێ:

{فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا، يُرْسِلِ السَّمَاء عَلَيْكُم مِّدْرَارًا، وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَارًا - سورة نوح – ١٠-١٢}.

واتـە: داوای لێخۆشـبوونی تاوانتـان لـە خـودای خۆتـان بکـەن، بێگومـان خـودا دەرگای لێخۆشبوونی فراوانەو لە زۆر تاوان خۆش دەبێ، ئاسمانتان بۆ رام دەکا کە خێرو بێرتان بۆ ببارێنێو رزقو رۆزیتان زۆر ببێ، مـاڵو منـداڵتان بـۆ زۆر دەکـا، باخو بێستانتان ئـاوەدانو بـە بـەروبووم دەرازێنێتـەوە، جۆگـاو کـانیو ئاوتـان بـۆ دەخولقێنێ.

هەروا رودەکاتە فروستادەی خوای حەزرەتی محمد (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ:

{وَمَا كَانَ اللّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ - سورة الأنفال – ٣٣}.

واتە: هەتاکو تۆ لەناو ئەو هۆزەدابی، خودا سزایان نادا، وە هەتاکو ئەوان داوای لێخۆشبوون‌و چاوپۆشی لە گوناه بکەن خودا سزایان ناداو توشی تەنگ‌و چەڵمەی سەختیان ناکا.

برێ لە هاورێیانی پێغەمبەر کاتێ کە پێغەمبەر لە دنیا دەرچوو دەیانگوت ئێمە دوو سوپەرو پەناگامان هەبوو، یەکیان وجودی پێغەمبەر بوو، وا وەغری خێری کرد، ئەویکەیان داوای لێخۆشبوون‌و پاڕانەوەمیە (الاسغفار)ە ئەگەر ئەمیشیان نەمینێ بەفەتارە دەچین‌و ماڵ وێران دەبین.

## گەڕانەوە بۆ لای خوداو کاریگەریی لە ڕێکوپێکی ڕەوشتدا

وێ دەچێ یەکێك وا بزانێ‌و لە دەقەکانی سەرەباسی پێشوو دەربارەی (الإستغفار) واتێ بگا لێخۆشبوونی خودا هەروا بە هەوانتە دەستگیر دەبێ‌و تاوانبار هەروا بە ئاسانی هەرچەند زۆر گوناهیشی کردبێ لێبوردنی خودا وە دەست دێنێ!! بەڵام با وا نەزانێ‌و وا بیر نەکاتەوە، کە ئەو مەسەلەیە بریتییە لە چەند وشەیەك توتی ئاسا بیانڵێتەوە، بەبێ پەشێمان بوونەوەی بنەڕەتی‌و وازهێنان لە تاوان‌و سوور بوون لەسەر نەگەڕانەوە بۆ ئەو گوناهانە لێخۆشبوون وەدەست دەهێندرێ. چونکە گەڕانەوەی بەدڵ لەگوناه مەرجێکی سەرەکییە بۆ وەدەست هێنانی مەغفیرەتی خودا – کوردی وتەنی خودا هەڵناخەڵەتێ -.

تۆبە لە بنەڕەتی زماندا واتە: گەڕانەوە: جا کە وەپاڵ مرۆڤ دراو وترا: تۆبەی مرۆڤ، مەبەست پەشێمان بوونەوە لە گوناهی رابوردوو وازهێنان لە گوناهی ئێستاو لەمەدوایە.

خاوەنی کتێبی (قوت القلوب) دەفەرموێ: مەرجێ تۆبە ئەوەیە کە تۆبەکار پێش هەموو شتێك خۆ لە کۆمەڵی گوناهکاران هەڵهاوێرێ، دوایی جڵەوی نەفسی خۆی بگرێتەوەو نەهێڵێ سەرپێچی فەرمانی خودا بکا، بەشتی پێویست نەبێ هەڵەوگیری نەکا. سووریش بێ لەسەر ئەوە کە هەرگیز جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆ گوناهکردن هەر شتێکیش سەربکێشێ بۆ گوناهکردن وازی لێ بێنێ.

قورئانی پیرۆز زۆر گرنگی داوە بە توبەکردنو وازهێنـان لـە تـاوان. لەچـەند ئایەتێکیدا باسی کردوە یەکێ لەو ئایەتانە ئەوەیە کە دەفەرموێ:

{فَمَن تَابَ مِن بَعْدِ ظُلْمِهِ وَأَصْلَحَ فَإِنَّ اللّهَ يَتُوبُ عَلَيْهِ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ - سورة المائدة -٣٩}.

واتە: کەسێك دوای گوناهکردن ژێوان ببێتەوەو تۆبە بکاو کرداری چاك بێ، خۆی صالح بکا، ئەوە بێگومان پەروەردگار تۆبەی لێ وەردەگرێ، سەرفرازای دەکا، بەڕاستی خودا تـا بلێـی خـاوەن لێ خۆشـبوونە، تـا خـۆی حـەزکا عـەتفو سۆزی هەیە. یان دەفەرموێ:

{كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ أَنَّهُ مَن عَمِلَ مِنكُمْ سُوءًا بِجَهَالَةٍ ثُمَّ تَابَ مِن بَعْدِهِ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ - سورة الأنعام – ٥٤}.

واتە: پەروەردگاری ئێوە ڕەحمەتی لەسەر خۆی پێویست کردوەو نوسـیویەتی کە هەریـەکێ لـە ئێـوە ئەگـەر خودانەخواسـتە بـە نـەزانی تـاوانێکی کـردو دوایـی تۆبـەی کـردو صـالح بـوو، ئـەوە خـودا بـۆ وەرگرتنـی تۆبـەی ئـەو دەرگاکراوەیـەو لێخۆشـبوو بـە ڕوحـمو شـەفەقەتە. قورئـانی پـیرۆز زۆجـار (اسـتغفار) و (تۆبـە) بەیەکەوە دەهێنێ، وەکوو لەم ئایەتەدا کردویەتیو فەرموویەتی:

{وَاسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُواْ إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٌ وَدُودٌ - سورة هود -٩٠}.

واتە: داوای لێخۆشبوون بکـەن ئـەمجار تۆبـەو ژێـوان بوونـەوە ئـەنجام بـدەن. چـونکە داوای لێخۆشـیوونەکە تۆبــە ڕەهــا دەکــاو دەیڕەخــسێنێ، ئەمــەش ئــەوە دەگەیەنێ کە بەبێ تۆبەکردن ڕێگای داواکاری لێخۆشبوون پەی پێ نابڕێ.

چـونکە گوناهکــار لــە ڕێبــازی حــەق لای داوە تــا لــە گونــاهو تاوانــەکانی نەگەڕێتــەوە ناگونجـێ داوای لێبـوردن بکـا. کـەوابوو داوای لێخۆشـبوون شـتێکی سەرەکییەو تۆبە تەواوکەریەتی.

ئەو تۆبـەو ژێوانبوونەوەیـەی قورئـان گەرمکیـەتی بریتییـە لـە تۆبەیـەك کـە لەپاش کردنی گوناە بێو گوناهکارەکە نەهێڵێ زۆری بەسەردا تێپەڕێو تاوانەکە تەشەنە بکاو چار نەکرێ. خودا دەفەرموێ:

{إِنَّمَا التَّوْبَةُ عَلَى اللّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السُّوَءَ بِجَهَالَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ فَأُوْلَئِكَ يَتُوبُ اللّهُ عَلَيْهِمْ وَكَانَ اللّهُ عَلِيماً حَكِيماً - سورة النساء – ١٧}.

ئەوەتا پەروەردگار بۆ قوبوولبوونی تۆبە دوو مەرجی داناوە:-

یەکەمیان: کە کابرا تاوانەکە بە نەزانی ئەنجام بدا، واتە: لە ژێر کاریگەری ئیندیفاعو سەرکەشی ئارەزوودا تاوانەکەی لێ روو بدرێ.

دووەمیان: ئەوەیە کە دوا بە دوای گوناهەکە بە ماوەیەکی کەم زێوان بێتەوەو تۆبە بکا. بەڵام ئەگەر تۆبەکەی وەغراندو لەسەر ئەو تاوانە بەردەوام بوو، تا نزیك مردن بووەوە ئەوە تۆبەکەی لێ وەرناگیرێ، وەکوو لەو ئایەتەدا کە دوا بەدوا ئایەتی پێشوو هاتووەو دەفەرموێ:

{وَلَيْسَتِ التَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ حَتَّى إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ إِنِّي تُبْتُ الآنَ وَلاَ الَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمْ كُفَّارٌ أُوْلَئِكَ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا - سورة النساء – ١٨}.

واتە: تۆبە بۆ ئەوانە نییە کە خراپە دەکەنو بەردەوامن لە سەری، هەتا کاتێ یەکێکیان مردن یەخەی دەگرێ ئەمجار دەڵێ: خودایە وا من تۆبە دەکەم لە کردەوەی خۆم پەشیمانم.

هەروەها تۆبە بۆ ئەوانەش نییە کە بە کافری دەمرن، بۆ ئەوانە هەموویان سزایەکی کوشندەمان ئامادە کردوە..

قورئانی پیرۆز کرداری چاکو تۆبە دەخاتە تەك یەكو دەیانکاتە پێشنیار بۆ وەدەست هێنانی لێخۆشبوونی خودا، ئەوەتا دەفەرموێ:

{وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا ثُمَّ اهْتَدَى-سورة طـه/٨٢}.

خودا خۆی دەفەرموێ: من لێخۆشوونم زۆرە بۆ کەسێك تۆبە بکاو ئیمانی پتەوبێو بڕوای بە خوداو فریشتەی خوداو نامەو پێغەمبەرەکانیو رۆژی قیامەت هەبێ، کردەوەی چاك بکا، ئەمجار بەردەوام لەسەر ئەم بیرو باوەڕە بێ تا مردن. یان دەفەرموێ:

{إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُوْلَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا - سورة الفرقان – ٧٠}.

پەروەردگار لە ئایەتەکەی پێش ئەم ئایەتەدا حاڵو چۆنیەتی سزاو ئەندێشەی بیدینانی رونکردەوە لەم ئایەتەشدا چەند جۆرە ئادەمیزادێك لەو چۆنیەتە چەرت دەکاو دەفەرموێ: (مەگەر کەسێك تۆبە بکاو بڕواپتەو بێو کردەوەی چاك ئەنجام بدا، ئەوانە پەروەردگار خراپەیان بە چاکە بۆ دەگۆڕێتەوەو لە جیاتی خراپە چاکەیان دەداتێ، لەباتی شیرك‌و شك‌و گومان ئیمان‌و یەقین‌و خودا بە یەکناسینیان پێ دەبەخشێ. خودا لێخۆشبوونی زۆرەو رەحم‌و شەفەقەتی زۆرە.

کەوابوو تۆبە پایەیەکی گەڵی گرنگی ئەخلاق‌و رەوشتە، هەر دواکەوتنێك لە تۆبەکردن دەبێتە هۆی تێك روخانی بینای کەسایەتی مرۆڤ! بە پێچەوانەشەوە هەر پەلەکردنێك بۆ تۆبەکردن‌و راستگۆیی لە تۆبەکەدا دەبێتە هۆی صەلاحی دەرون‌و هۆیەکی فرە گرنگە بۆ قەلاچۆکردنی شەڕو ئاژاوە.

نووسەری هوڵندی، (فرانر ستاڵ) بەراوردییەکی کردوە لە نێوان مەبدەئە رەوشتییە ئیسلامییەکان، مەبدەئەکانی بزوتنەوەی ئەخلاقیی ئەوروپا لە بلاوکراوەی بەناو. (المجله الإسلاميه)دا بە زوبانی ئینگلیزی بلاوی کردۆتەوە لەوێدا دەڵێ تۆبە لە ئیسلامدا وەسیلەو ئامێرە بۆ گۆڕانی ئادەمیزادەکان خۆیان‌و لە ناخەوە خۆیان دەگۆڕن!! تۆبە چەکێکی بەکاری رەوشتیی گەورەو کاریگەرە ژێوان بوونەوەو گۆڕان‌و گەڕانەوەی تێدایە.

ئەمجار ئەم نووسەرە بەرێزە هاتووە مانای تۆبەو گرنگی‌و کاریگەریی لەسەر چەند کەسانێکی موسوڵمانی وەکوو حەسەنی بەصری‌و موحاسیبی‌و مەنصووری هەلاج‌و غەزالی رانواندوەو بەراوردی کردوە لە نێوان ئەم لایەنەی ئیسلام‌و ئەو راوو بۆچونەی دکتۆر (فرانك بکمان)ی بنیات نەری (جمعيه التسلح الخلقى) داو روونی کردۆتەوە کە ئیسلام لەم مەیدانەشدا دەسپێشکەری کردوە؟!

## داواکردنی ڕەحمەتی خوداو شوێن دەستی لەقەڵاچۆکردنی ڕەشبینیدا:

ئاشکرایە هیچ شتێك وەکوو رەشبینی زەرەرو زیان بە مرۆڤ ناگەیەنێ‌و شەخصیەتی لێك هەڵناتەکێنێ، بەڵێ رەشبینی کوشندەترین نەخۆشییەکە کە توشی دەروونی ئادەمیزاد دەبێ‌و هێزو هەناوی لێ دەبرێ، لە کاری دەخاو شلەپەتەی دەکا، زۆر جاری وا هەیە رەشبینی خاوەنەکەی رادەکێشێ بۆ هیلاك‌و تێداچوون‌و وای لی دەکا بچێتە باوەشی مەرگەوە، چونکە ژیانی لا دەبێتە دۆزەخێکی بێ وێنەو ناتوانێ خۆی بۆ سوتمانی رابگرێ!!

باوای دابنێین کە لێرەدا مرۆڤێکی رەشبین هەیە دەڕوانێتە ئەم بوونەوەرە، دەبینێ پڕە لە تەنگ‌و چەڵەمەو ئازاوەو ناخۆشی‌و نەبوونی‌و نەخۆشی تاوان‌و گوناهو ئازارو ئەشکەنجە، بەهیچ جۆرێك لە هیچ قوژبنێکدا ئەمن‌و ئاسایش بەدی ناکا هیوای بەداهاتوو نییەو بتمانەی، پێ ناکاو گەردن کەچی ئەم رێبازە رەش بینیانە بووەو وازی لە کۆشش‌و هەوڵدان هێناوە دەستی لەخۆی بەرداوە.

لە ئاکاما ویستی خۆی لەم ژیانە رزگار بکا هات خۆی کوشت ئایا ئەم کابرایە جگە لە خەسارەتمەندی چی پێ برا!؟

بێگومان لە ژیانی مرۆڤدا بەڵاو موصیبەتی وا هەیە کە قورسایی تەواو دەخاتە سەر دەرونی مرۆڤو وای لێ دەکا سەیری ژیان بکا بە روانینێکی رەش بینی‌و مەئیووسی!! بەڵام دڵ‌و دەرونی خاوەن باوەڕ بە خوداو چاوەڕوانکەری رەحمەت‌و بەخششی خودایی هەرگیز لەو رەحمەتە بێ هیوا نابێ‌و هەمیشە لە ئاسۆی ئەو رەحمەتەوە چاوەڕوانی فریاڕەسە. جا بەم بڕواو هیوایەوە دەتوانی گرێ کوێرکەی ژیانی بکاتەوە، چارەسەری تەنگ‌و چەڵەمەی خۆی بکا، بۆ هەموو کارێك حیکمەت‌و صەبرو ئارامی بەکاردێنێ، چاوەڕوانی لاچونی تەم‌و مژو تاریکاییە هیوای بەداهاتوو بەهێزە.

بۆیە دەبینین قورئانی پیرۆز بانگەوازی خەڵکی کردوە بەگشتی کەداوای ڕەحمەتی خودا بکەن هەموو ئاوات‌و هیوایەکیان لەم ژیانەدا ڕەحمەتی خودا بێ،

قورئانی پیرۆز دەفەرموێ: {قُلْ بِفَضْلِ اللّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْيَفْرَحُواْ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ} (٥٨) سورة يونس.

ئەی پێغەمبەر! بەوخەڵکە بڵێ! بە بەفەزڵو رەحمەتی خودا – کە بریتییە لە قورئان – دڵ خۆش بنو تەسکینییان بێ، خۆیان بەوە دڵخۆش کەن کە پەیرەوی کەری قورئاننو فەرمانبەرداری خودان با بەو شتانە کەیف خۆش بن چونکە ئەو تانە زۆر چاکترە لەپڕو پیتاڵی دونیایی.

لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: {وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ - سورة الزخرف – ٣٢}.

واتە: ئەی محمد! رەحمەتو بەرەکەتی خودای تۆ زۆر باشترە لەو ماڵو دارایییەی ئەو خەڵکە کۆی دەکاتەوە.

بێگومان ئەوەی قورئانی پیرۆز بانگەوازی بۆ کردوە لێی دەوەشێتەوە ببێتە شیفابەخشی ملیونەها نەخۆشو داماوو بێ بەش لە خۆشیو لەزەتی ژیان، چونکە داواکردنی رەحمەتی خودا هەرکاتێ بەسەر بیرو هۆش دا زاڵ بوو، کاری لە دڵو دەرونیان کرد، وایان لێ دێ ناڕوانن ژوور خۆیانەوە، بەم جۆرە ئاواتەخوازی ژیانی کامەرانی خەڵکی ژوور خۆیان بنو حەز بکەن ژیانیان وەکوو ئەوانی لێ بێ.

چونکە مەبەستی سەرەکیی ئەوان لە ژیانیدا زۆر بەرزترە لەم رەونەقە بازاڕییەی ژیانی دونیا. کە هەرزوو گوڵەکانی سیس دەبنو دەپوکێنەوە، قورئانی پیرۆز زۆر جار ئاماژە بەم مەبەستە دەکاو کەسانێك دائەنێ بە شیاوی رەحمەتی خۆی کە خاوەنی رەوشتی بەرزبنو ئەرکی سەرشانی خۆیانیان بەرامبەر بەخوداو ئادەمیزاد بە باشی ئەنجام دابێ. خودا دەفەرموێ:

{وَلاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاَحِهَا وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا إِنَّ رَحْمَتَ اللّهِ قَرِيبٌ مِّنَ الْمُحْسِنِينَ - سورة الأعراف – ٥٦}.

واتە: بێگومان ڕەحمەتی خودا نزیکە لەوانەی کردار چاكو ڕەوشت بەرزن. یان دەفەرموێ:

{وَلَئِن قُتِلْتُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَوْ مُتُّمْ لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ اللّهِ وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ - سورة آل عمران – ١٥٧}.

واتە: ئەگەر ئێوە لە ڕێگەی خودادا شەهید بکرێن یان لە سەفەرو هاتووچۆدا بمرن، بێگومان ئەو ڕێزو نرخەی لە شەهیدبوونو مردن لە ڕێگەی خودادا دەستگیر دەبێ، زۆر چاکترە لەو ماڵو دارابیەی کۆی دەکەنەوە... یان دەفەرموێ:

{وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ - سورة الأعراف – ١٥٦}.

واتە: ڕەحمەتو بەرەکەتی من ئەوەندە زۆرو فراوانە بەشی هەموو شتێك دەكا، ڕەحمەتی خۆم تەرخان دەکەم بۆ ئەوانەی خودا دەناسنو تەقوا دەکەنو خوا دەپەرستنو زەکات دەدەنو بڕوایان بە نیشانەکانی خودایەتی ئێمە هەیەو خاوەنی بڕوای پتەون. لە شوێنێکی تردا. پەروەردگار دەربارەی پێغەمبەرانو فروستادەکانی دەفەرموێ:

{وَأَدْخَلْنَاهُمْ فِي رَحْمَتِنَا إِنَّهُم مِّنَ الصَّالِحِينَ - سورة الأنبياء – ٨٦}.

واتە: ئەو فروستادانەمان خستنە ژێر ڕەحمەتو شەفەقەتی خۆمانەوە، بێگومان ئەوان صالحو ڕاستاڵ بوون.

ئاشکرایە ئەوانەی هەوڵو کۆششیان بەردەوام بۆ گەیشتنی ڕەحمەتی خودایە هەرگیز نائومێدی رویان تێ ناکاو هیوا بڕاو نابن، هیچ تاوانو گوناهێکیش شالاویان بۆ ناهێنێ، چونکە هێزێکی ڕۆحییان تێدایە دڵنەواییان دەکا بۆ ئەو ئازارو ئێشەی دەینۆشنو صەبرو ئارامیان دەداتێ! بە پێچەوانەشەوە ئەوانەی غافڵ دەبن لەو مەبەستە یان نائومێد دەبن لە ڕەحمەتی خودا شیاوی ئەوەن ڕێبازی ژیانیان لێ تێك بچێ، ڕێگەی سەرفرازی نەدۆزنەوەو بکەونە نێو چاڵی خەتەرو سامناکەوە، دەسخەڕۆی دونیاو قیامەت بن. چەندە ڕاستو بەجێیە کە خودا دەفەرموێ:

{قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِ إِلاَّ الضَّآلُّونَ - سورة الحجر – ٥٦}.

واتە: کێ لە رەحمەتی خودای خۆی نائومێد دەبێ جگە لە گومرایان؟؟ کەوابوو ئەبێ ئەو نەفسو دەروونانەی لە بۆتەی سزادا دەتلێنەوەو هەمیشە رەشبینو لە ئازاردانو کەوتوونە نێو شەپۆلی سامناکی ژیانەوە! هۆشێك بێننەوە بەر خۆیانو روبکەنە خوداو داوای رەحمەتی لێ بکەن، تا خودا بە رەحمەتی خۆی لەو ناخۆشیو رەشنبینییە رزگاریان بکاو بیانخاتە کەناری دەریاوە، لە شەپۆلی نەمان قوتاریان بکا!! بێگومان رەحمەتی خودا هیچی لێ عاسێ نابێ لە بونەوەردا. چونکە رەحمەتی خودا نزیکە لە ئێوە هەرکاتێ داوای لێ بکەنو شیاوی ئەوەبن بەر ئەو رەحمەتە بکەون، دەتانگرێتەوە.

## کاریگەریی خوداپەرستی لەڕزگارکردنی ئادەمیزادو قورتاکردنی لەدەستی ملهوڕی – دیکتاتۆرو ملهوڕان

لەکاتی صافبوونی زیهنو بیر لە خۆکردنەوەدا زۆر جار پرسیارێك سەر هەڵدەداو رومان تێ دەکاو دەڵێ: من بۆچیو لەبەر چی دەروستکراوم؟ مەبەست لە دروستکردنی من چییە!؟

هەر لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ ئەم پرسیارە تەوەرەی لێکۆڵینەوەو بیرکردنەوەی فەیلەسوفەکان بووە، هەریەکە لە عاست خۆیەوە کنەی لێ کردوە، بەڵام کەسیان نەیان توانیوە بگەنە ڕایەکی چەسپاوو نهێنییەکانی ژیان بکەنەوەو وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە؟!

فەیلەسوفی ئەڵمانی (کانت) پێی وابوو گەورەترین مەسەلەی فەلسەفەو گرنگتریان بریتییە لە سێ مەسەلە.

یەکەمیان: چ شتێکە ئێمە بتوانینو بیزانین؟

دووەمیان: چ شتێکە کە پێویست بێ بیکەین؟

سێیەمیان: چ شتێکە ئومێدەوارینو هیوای خۆمانی پێوە دەبەستین!؟

قورئانی پیرۆز وەڵامی ئەم سێ مەسەلەیە دەداتەوە روونی دەکاتەوە کە مەبەست لە دروستکردنی ئادەمیزاد بریتییە لە خودا پەرستیو فەرمانبەرداری خودا! خودا بۆ خۆی دەفەرموێ:

{وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ - سورة الذاريات – ٥٦}.

واتە: ئێمە کە جنۆکەو ئادەمیزادمان درستکردون بۆیەمان درستکردوون کە تەقواو پەرستشی ئێمە ئەنجام بدەنو خودا پەرست بن.

عیبادەتکردنی خوداو فەرمانبەرداری ئەو زاتە بێچوونە دوا پلەی گەردن کەچییە، ئەمەش سەردەکێشێ بۆ ئەوەی کە هیچ ئادەمیزادێك لەسەر ئەم زەوییە گەردن کەچی هیچ شتێك نەبێ جگە لەخودا، سوژدەو کڕنووش –جگە لە خودا– بۆ کەس نەبەن. چونکە ئادەمیزاد هەموویان دروستکراوو بەخێوکراوی خودان هەر ئەو خوداو بەخێوکەریانە.

{إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ - سورة يوسف – ٤٠}.

واتە: حوکمو فەرمانڕەوایی هەر بۆ خودایەو کەسی تر مافی خودایەتی نییە، فەرمانی کردوە کە –جگە لە ئەوزاتە بێچوونە کە خۆیەتی– عیبادەتی کەسی تر نەکرێ.

{ذَلِكُمُ اللّهُ رَبُّكُمْ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ-سورة الأنعام/٤٠}.

کەوابوو ناگونجێو نابێو بۆ هیچ کەس رەوا نییە: کە خۆ بکاتە ملهوڕی سەر زەوی، لافی ئاغایەتیو زۆرداری لێ بدا، ئادەمیزادی دەوروبەری خۆی بچەوسێنێتەوەو بەزەبرو زەنگ بیانخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە، ملهوڕانە رفتار بکاو چی بۆێ پێیان بکاو چی نەوێ لێیان قەدەغە بکا، وەکوو کردارو رەفتاری پاشاو قەشەو دەرەبەگە زۆردارەکانی مێژووی کۆن بکاو بېڕو بکوژ خۆی بێ! ئەوانەش کە گەردن کەچی ئەو جۆرە ملهوڕانە دەبن لە راستیدا دەبنە موشریكو هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن، هاوبەشی بڵاوکردنەوەی فەسادو شەڕو ئەنگێزە دەکەنو لە رەحمەتی خودا بێ بەرین. ئایینی پیرۆزی ئیسلام کاتێك فەرمانی کردوە بە عیبادەتکردنی خودا مەبەستی ئەوە بووە ئادەمیزاد لە تۆقی بەندایەتیو ژێر

دەستەیی زگار بکا! ئەو بەندایەتییەی کە ساڵەهای ساڵ بوو لە ژێری دا دەیاننالاندو لەلایەن پاشاو دەرەبەگو ملهوڕو پیاوە ئاینییە خۆ بە خوازانەکانەوە دەچەوسانەوە، هەروەها ویستی ئەو خەیاڵە پووچەش لە زیهنی ئەو چەوسێنەرانە دەربهاوێ کە پێیان وابوو ئەوان لە توخمێکی جیاواز دروست بوون‌و خێرو شەڕو چاکەو خراپەیان بەدەستە.

{قُلْ أَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللّهِ مَا لاَ يَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلاَ نَفْعًا-سورة المائدة/٧٦}.

واتە: ئەو خودا درۆزنانەی ئێوە دەیانپەرستن‌و -جگە لە خودای پەروەردگار- تاعەتیان بۆ دەکەن ناتوانن رزق‌و رۆژی ئێوە دابین بکەن هیچیان بەدەست نییە! هەر لە خودا داوای رزق‌و بژێو بکەن بۆیە پەروەردگار لە هەموو چەرخ‌و زەمانێکا پێغەمبەرانی خۆی ناردوە بۆ ناو خەڵك تا بانگەوازی ئادەمیزاد بکەن بۆ عیبادەتکردنی خوداو بەیەك ناسینی، داوایان لێ کردون گەردن کەچی هەر بۆ ئەو بکەن‌و بەندایەتی کەسی تر نەکەن. خودا دەفەرموێ:

{وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ - سورة النحل - ٣٦}.

واتە: ئێمە لەناو هەموو هۆزو کۆمەڵێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە کە بەمەردوومەکە بڵێ: تەنها عیبادەت بۆ خودا بکەن‌و خۆ بپارێزن لە عیبادەتکردنی غەیری خودا.

بێگومان ئەو دەردەسەری‌و نارەحەتییەی توشی ئادەمیزاد بووە، هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ تێنەگەیشتنی ئەم راستییەو نەناسینی خودا بەو جۆرەی کە پێویستە!! بۆیە دەبینین‌و بینراوە هەر کۆمەڵێك لە عاست خۆیەوە هاتوون یەکێکیان لە خۆیان دەستنیشان کردوەو کردوویانە بە خودای خۆیان‌و ئەوانەش کە کراون بە خوداو بینیویانە خەڵك گەردن کەچیانە بە تەواوی سەرکەش بوون‌و لەرێ دەرچوون‌و دەستیان کردوە بە چەوساندنەوەی ئادەمیزادو بە کێشیان کردوون بۆ دووبەرەکی‌و تەفرەقە نانەوە، کۆمەڵی ئادەمیزادیان کردوە بە چەند گرۆو تاقم‌و کەرت‌و بەشبەش هەر بەشێکیان دژایەتی بەشەکەی تریان

دەکاو سەرزەوی بووەتە گێژی ئەسکەندەر، بۆیە خودای پەروەردگار بانگەوازی هەموو ئادەمیزاد دەکا –بەبێ تێبینیکردن لە رەنگو زمانو توخمو بنیچە –کە روو بکەنە عیبادەتکردنی خوداو پەرستش هەر بۆ ئەو بکەنو دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ، الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ فِرَاشاً وَالسَّمَاء بِنَاء وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقاً لَّكُمْ فَلاَ تَجْعَلُواْ لِلّهِ أَندَاداً وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ - سورة البقرة – ٢١-٢٢}.

واتە: ئەی گرۆهی ئادەمیزاد! پەرستشی خودای خۆتان بکەن ئەو خودایەی زەوی بۆ کردون بە راخەرو بەسەریدا دەڕونو ئاسمانی بۆ کردون بە سەقفو هەلاش ئەمجار لەسەرتانەوە بارانی بۆ بارانـدون رزقو رۆژیو میوەجاتی لەبەر خاتری ئێوە دەرهێناوە!

کەوابوو هاوبەش بۆ خودا قەرار مەدەن، خۆ ئێوە دەزانن کە ئەوشتانەی بە خودایان دەزانـنو کردوتـانن بـە شـەریکی خـودا هیـچیان لەدەسـت نایـەو لـەم بونەوەرەدا دەسەلاتێکییان نییە. بە کورتی دەڵێ: پـەروەردگار خـۆی ئـەم هـەموو نیشانە کەونیانەی بـۆ دانـاون ئـەم حەمکە بەڵـگە بەهێزانـەی لەسـەر خودایـەتی خـۆی هێناوەتـەوە کـەوابوو ئێـوە گـەردن کەچـی فـەمانی بـنو شـەڕێکی بـۆ ڕەوا مەبینن!!

ئەمجار پێویستە پێویستیاتی عیبادەت بزانین رەدامیان بێنین! خـۆ ئاشـکرایە عیبادەت بریتی نییە لە گەردن کەچـی بـۆ خـوداو بـەس، بەڵـکوو قورئـانی پـیرۆز چەند پێویستیاتی تری بۆ ڕوون کردوینەوە: کەبریتین لە شوکرو سوپاسی خوداو پشت بەستن بە خـودا، دڵـسۆزی بـۆ خـوداو پاڕانـەوە لـە خـودا، بێگومـان قورئـانی پیرۆز کە ئەم شتانەی بەیان کردوونو وتویـەتی دەبـێ ئـادەمیزاد ئـەنجامیان بـدا، دەچـنە رێـزی عیبادەتـەوە کـەوابوو لێـرە بـەدواوەوە بـرێ بـاسو لێکۆڵینـەوە بـۆ هەریەکێ لەو شتانە لەژێر رۆشنایی قورئاندا ئەنجام دەدەین!

## شوكرو سوپاس بۆ خوداو كاریگەری لە خۆشبەختی گەلاندا

زانایان پێناسەی شوكریان كردوەو وتوویانە شوكر بریتییە لەوە ئادەمیزاد بە زوبان سوپاسو منەتباری ئەو نیعمەتانە بێ كە خودا بەخشیونیو بە ئاشكرا ددانیان پیابنێ بەدڵ پەیوەندیو خۆشەویستی خودای هەبێ لە ئەندامەكانیشی نیشانەی گەردن كەچیو فەرمانبەرداری بۆ خودا دیاردەی هەمیشەیی بێ. كەوابوو سوپاسكار ئەو كەسەیە زوبانی خەریكی حەمدو سەنای خودایەو ددان بە نیعمەتەكانی دا دەنێ، دڵیش پڕە لە نووری خوداو پەیوەندە بە خۆشەویستی خوداوە لەسۆنگەی نیعمەتەكانی گەواهی ئەوە دەدا كە ئەو نیعمەتانە چاكەو بەخششی خودان، ئەندامەكانیش سەرگەرمی تاعەتی خودانو گەردن كەچی فەرمانو گوێ رادیری فەرموودەكانن؟!

لەم روەوە شوكر بریتییە لەو دیاردەی عیبادەتەی قورئانی پیرۆز بانگەوازی بۆ كردوە كە دەفەرموێ:

**{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَاشْكُرُواْ لِلّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ - سورة البقرة – ١٧٢}.**

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هەیەو ئیماندارن بخۆنو بخۆنەوە لەو رزقو رۆژیو بژێوە حەڵاڵەی پێم بەخشیون، شتێك خودا حەرامی نەكردبێ ئێوە لە خۆتانەوە حەرامی مەكەن، ئەگەر راست دەكەن خوداپەرستی تەواون شوكرو سوپاسی خودا بكەنو منەتباری بەخششو عەتای بن.

وشەی شوكر لەو وشە پڕمانایانە دەژمێردرێ كە مانای هەموو خێرو چاكەیەكی لەخۆ گرتووە، هەرشتێك دڵو ئەندامی ئادەمیزادی پێ راستاڵ بكرێ دەیگرێتەوەو لەمانای ئەم وشەیەدا خۆی دەنوێنێ. كەوابوو كەسێك خودای خۆش ویستو بەدڵ بڕوای وانەبوو كە ئەو نیعمەتە هەمەجۆرانەی خۆشییان لێ دەبینێ لە فەزڵو كەرەمی خوداوەن بە سوپاسكارو شوكر نەژمێر ناژمێردرێ. ئەوەی سوپاسی خودا نەكاو بە زوبان ددان بە فەزڵو بەخششی خودا دا نەنێ، خەریكی

کرداری پڕو پووچی بێ بایەخ بێ زوبانی بە گوفتاری نابەجا رەها بکا، بەسوپاسکار ناژمێردرێ! کەسێك خودا عیلمو زانستی بداتێو کردەوەی پێ نەکاو لە خەڵکی بشارێتەوەو بەکەسی تری نەڵێ شوکر گۆنیە. کەسێك خودا ماڵو دارایی بداتێ بۆ ئەوەی سەرفی بکا لەرێگەی خێرو چاکەداو دەستی فەقیرو بێ نەوایانی پێ بگرێ! بەڵام ئەو بەخیلی بکاو دەستی بقوچێنێ، یان سەرفی بکا لە گوناهو تاوانکاریدا بەشوکرگۆ ناژمێردرێ.

بۆیە قورئانی پیرۆز لەزۆر لە ئایەتەکانی دا بانگەوازی ئادەمیزاد دەکا کە شوکرگوێیو سوپاسکاریی بکەن بە رەوشتی هەمیشەییانو دەفەرموێ:

{بَلِ اللَّهَ فَاعْبُدْ وَكُن مِّنْ الشَّاكِرِينَ - سورة الزمر – ٦٦}.

واتە: تۆ تەنیا عیبادەتی خودا بکەو ئەو بپەرستە لە هەمانکاتدا شوکر گۆو سوپاسکار لە ریزی سوپاسکاراندا بە.

پەروەردگار مەدحی حەزرەتی ئیبراهیمی بەوە کردوە کە سوپاسو شوکری سەرشانی خۆی ئەنجام داوە:

{إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ اجْتَبَاهُ وَهَدَاهُ إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ، وَآتَيْنَاهُ فِي الْدُّنْيَا حَسَنَةً وَإِنَّهُ فِي الآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ - سورة النحل – ١٢٠-١٢٢}.

واتە خودا چ کاری بە سزادانی ئێوە نییە بە مەرجێك ئێوە سوپاس گوزارو ئیماندار بن!؟.

هەروەها پەروەردگار بەڵێنی داوە بە سوپاسگوزاران کە لە ژیانی دنیادا نیعمەتو بەخششیان بۆ زیاد بکاو بەردەوام بێ:

{وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ - سورة إبراهيم – ٧}.

واتە: خودای گەورەو بەخێوکەری ئێوە ئیعلانی کردوەو بڵاوی کردۆتەوە، هەمووتان گوێتان لێبێ‌و بیزانن! هەتا ئێوە شوکرو سوپاسی نیعمەت‌و بەخششی خودا بکەن بۆتان زیاد دەکەم دەرگای رەحمەت‌و بەخشش‌و عەتام زیاتر دەکرێتەوە! خۆ ئەگەر سپڵەو پێ نەزان بن‌و سوپاسگوزار نەبن بێگومان سزاو عەزابی من زۆر بەئێشە.

شوکرکردن‌و سوپاسگوزاریی خودای بەدیهێنەر پێویستە لەسەر ئادەمیزاد ئەگەر نەیکا گەورەترین تاوان ئەنجام دەداو ئەوپەڕی سەرپێچیکردن‌و ناکەس بەچەیی رەچاو دەکا!!

ئەی ئەوە نییە ئێمە هەرکاتێ ببینین یەکێك پیاوەتی چاکەکارانی لەبەرچاو نەبێ سەرکۆنەو لۆمەی دەکەین، ئەی دەبێ چ بڵێین: بەرامبەر کەسێك کە شوکری بەدیهێنەرو سەرچاوەی هەموو نیعمەت‌و بەخششێکی خۆی نەکا؟! مومکین نییە ئێمەی ئادەمیزاد بەبێ شوکرو سوپاسی خودا لەزاتی بێچوونی نزیك ببینەوە، بۆیە دەبینین لەچەند ئایەتێکدا خودای پەروەردگار فەرمانی پێمان کردوە کە هەردەم لێی نەبڕێێن شوکر گۆو سوپاسگوزاربین! دەفەرموێ:

{وَاللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّن بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لاَ تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ الْسَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ - سورة النحل – ٧٨}.

واتە: پەروەردگار ئێوەی لەسکی دایکتانەوە دەرهێناوە مندالێکی هیچ نەزان بون‌و ئاگاداری هیچ شتێك نەبوون، ئامێری بیستنو دیتن‌و بیرو هۆشی داونێ تا بەکاریان بهێنن لە شوێنی خۆیانداو زانیاریتان بۆ پەیدا ببێ‌و بزانن نیعمەت‌و بەخششی خودا چەند زۆرە ئەمجار سوپاس‌و شوکری پەروەردگارتان بکەن. یان دەفەرموێ:

{وَآيَةٌ لَّهُمُ الْأَرْضُ الْمَيْتَةُ أَحْيَيْنَاهَا وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ، وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّاتٍ مِن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنْ الْعُيُونِ، لِيَأْكُلُوا مِن ثَمَرِهِ وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ أَفَلَا يَشْكُرُونَ - سورة يس – ٣٣-٣٥}.

واتە نیشانەو گەواهی خوایەتی ئێمەیە کە زەوی مردوو رەقو تەق بەهۆی بارانەوە زیندوی دەکەینەوە سەر لەنوێ شینو زەنوێر دەبێتەوە دانەوێڵەی لێ دەروێنینو دەبێتە بژێوی ئێوەو لێی دەخۆن باخو باخاتی خورماو ترێو شتی ترمان تێدا رواندووە کانیاومان تێدا تەقاندۆتەوە تا لەبەرو بوومی ئەوداره بەردارانە بخۆن هیچیشیان بەدەستو مەچەکی ئێوە نەهاتوونەکایەوە، ئێمە بۆمان دروستکردون، دەی کەوابوو بۆ سوپاسی خودا ناکەنو شوکری ئەو ئەنجام نادەن!؟ یان دەفەرموێ:

{اللَّهُ الَّذِي سخَّرَ لَكمُ الْبَحْرَ لِتَجْرِيَ الْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكمْ تَشْكُرُونَ - سورة الجاثية – ١٢}.

واتە: پەروەردگار خودایەکی وەهایە دەریای بۆ ئێوە رام کردوە، تا بتوانن بەکەشتیو گەمیو شتی تر پێیدا برۆنو بۆ دەریا دۆزیو بازرگانیو نێچیریەتیو شتی تر بەکاریان بهێنن ئەمجار بیر لە نیعمەتی خودا بکەنەوەشوکرو سوپاسی خودا بکەن. یان دەفەرموێ:

{قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ اللَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَاء أَفَلَا تَسْمَعُونَ، قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ النَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ أَفَلَا تُبْصِرُونَ، وَمِن رَّحْمَتِهِ جَعَلَ لَكمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكمْ تَشْكُرُونَ - سورة القصص – ٧١-٧٣}.

ئەی محمد! ئەی فروستادەی خۆمان بەو خەڵکە بڵێ: ئادەی پێم بڵێنو تێم گەیەنن، ئەگەر خودا شەوتان بەسەرا راکێشیو تا رۆژی رەستاخیر شەوەزەنگ بێ —جگە لە خودا خۆی— چ خودایەکی تر هەیە بتوانێ روناکی خۆرتان بۆ بێنێو تاریکایی شەوتان لەسەر لابەرێ، دەی بۆچی وتەی حەقو راست نابیستنو کرداری پێ ناکەن؟!

پێیان بڵێ: ئەگەر خودا وا بکا هەموو رۆژگاری ژیانتان بکاتە خۆرەتاوو روناکی تا رۆژی قیامەت درێژە بکێشێ – جگە لە خودا خۆی – کێ هەیە؟ چ خودایەك هەیە بتوانێ شەوتان بۆ بێنێو ئارامی تێدا بگرن؟!

ئەو رەحمەتی خودایە کە شەوو رۆژی بۆ دروست کردوون ئەویان بۆ نوستنو ئارام گرتنو ئەمیان بۆ هەوڵدانو کۆششکردن بۆ رزقو رۆژیی. بەڵکوو لە بەرامبەر ئەم نیعمەتانەدا ئێوەش شوکرو سوپاسی خودا بکەن. بەلاّم سەد مخابن ئادەمیزاد لە بەرامبەر ئەو هەموو نیعمەتو بەخششانەی خودادا کەمیان شوکر گۆو سوپاسگوزارن.

{إِنَّ اللّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَـكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَشْكُرُونَ-سورة يونس/٦٠}.

بێگومان پەروەردگار خاوەن فەزڵو نیعمەتو بەخششە، بەلاّم زوربەی ئەو ئادەمیزادانە شوکری خودا ناکەن.

ئاشکراشە سوودو قازانجی شوکر بۆ خودا نییەو خودا نە بە شوکری شوکرگۆیان بەهرەمەند دەبێو نە بەکوفرو بێدینی گومرایان زەرەرمەند دەبێ، بەڵکوو سودی شوکر بۆ شوکر گۆیە چونکە شوکرو سوپاس دڵو دەرون پاك دەکاتەوەو بەندە لە پەروەردگار نزیك دەخاتەوەو بەرەو رێبازی راستو دروست رەهای دەکا، ماڵو دارایيەك کە خودا پێی داوە لە شوێنی خۆیدا سەرفی دەکا.

{وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ-سورة لقمان – ١٢}.

واتە: کەسێك شوکری خودا بکا سوودو قازانجی شوکرەکەی بۆ خۆیەتی، کەسێکیش کافرو گومرابێ بێگومان خودا پێویستی بە شوکری ئەوان نییە، خودا شایانو لایەقی حەمدو سوپاسی دروستکراوانیەتی:

بە پێچەوانەی سوپاسو شوکرەوە سپلەیيو پێ نەزانیی بە نیعمەتەکانی خودا دەبێتە هۆی لەناوچوونی ئەو نیعمەتانە چونکە کوفرانی نیعمەت وا لە مرۆڤەکە دەکا گرنگی نەدا بەو نیعمەتانە بەبێ هوودە سەرفیان بکا، ئەوەی کە خودا داویەتی لە لەش ساغیو ماڵو دارایی لەشتی پڕو پوچدا بەفیڕۆی بدا، ئەو

ڕێازەی خودا بۆی داناوە لێی لابدا سەر دەكێشێ بۆ بزاواندنی خەشمو غەزەبی خوداو دوور لە رەحمەت دەبێ.. قورئانی پیرۆز بۆمان دەگێڕێتەوە كە خرابوونی ولاتانو فەوتانی گەلو هۆزەكانی پێشوو هۆیە سەرەكییەكەی كوفرانی نیعمەتو سوپاس نەكردنیان بوو بۆ خودا.

{وَضَرَبَ اللّهُ مَثَلاً قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللّهِ فَأَذَاقَهَا اللّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُواْ يَصْنَعُونَ - سورة النحل – ١١٢}.

پەروەردگار لەم ئایەتە پیرۆزەدا بە – پەندو ئامۆژگاری – نموونەی گوندێكی پڕ ئارامو ئاسایشو رزقو رۆزی هێناوەتەوە، گوندەكە بێ هەراو هۆریاو ئاژاوە بوو، لە هەموو لایەكەوە رزقو رۆزی هەمە جۆری بۆ دەهات شوێنی كۆبونەوەو كڕینو فرۆشتنو خۆشگوزەرانی بوو، كەچی لەجیاتی سوپاسگوزاری خودا كوفرانی نیعمەتو بەخششی خودایان كردوو سەرپێچیكەر بوون لەبەر ئەو كردارە ناشیرینانەیان پەروەردگار خۆشیو رابواردنی لێ كردن بە زەقنەموتو بەرگی برسیایەتیو ترسو بیمی لەبەركردنو كردنی بە پەندی زەمانە، لە ئایەتێكی تردا قورئانی پیرۆز چیرۆكی هۆزی (سەبەء) دەگێڕێتەوەو باسی ئەو تەنگوچەڵەمەیەی كە توشیان هات بەهۆی كوفرانی نیعمەتەكانی خوداوە دەكاتە پەندو ئامۆژگاریو بە كوێچكەی ئادەمیزادی دادەدا دەفەرموێ:

{لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ آيَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ، وَاللَّذَانَ يَأْتِيَانِهَا مِنكُمْ فَآذُوهُمَا فَإِن تَابَا وَأَصْلَحَا فَأَعْرِضُواْ عَنْهُمَا إِنَّ اللّهَ كَانَ تَوَّابًا رَّحِيمًا، ذَلِكَ جَزَيْنَاهُم بِمَا كَفَرُوا وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الْكَفُورَ - سورة سبأ – ١٥-١٧}.

بێگومان بۆ هۆزی (سەبەء)ی یەمەنی لە ولاتی خۆیانا كە پێی دەگوترا (مأرب) چەند نیشانەی گەورەیی خودا هەبوو، چونكە لە راستو چەپیانەوە باخو بێستانی پڕ میوەجاتو هەمە جۆری بەروبووم هەبوو، بە ئارەزووی خۆیان

هۆشەچنیان تێدا دەکرد رزق‌و رۆژی خۆیانیان لێ مەیسەر دەکرد، پێیان گوترا دە لەبەرو بومی ئەم باخانە بخۆن‌و سوپاسی خودای خۆتان بکەن‌و نیعمەت‌و بەخششی ئەوتان لەبەرچاو بێ‌و سەرپێچی فەرمانەکانی نەکەن ئەم وڵاتە وڵاتێکی خاوێن‌و دڵخۆشکەرو زەنوێرو دڵنەوایە پەروەردگاریشتان خودایەکی عەفورو لێبوردووە!!

کەچی ئەو خوا نەناسانە گوێ بیس نەبوون‌و پشتیان لە فەرمانی خودا هەڵکردو یاخی بوون، ئەوجار خودا بەربەستی دەریاچەی لە سەر تەقاندن‌و لافاوێکی گەورەی لێ پەیدا بوو کە پێی دەگوترێ: لافاوی عەریم، رەزو باخ‌و باخاتی رامالێن‌و لەشوێن ئەو هەموو میوەو بەرو بوومە چەند روەکی بەرو بووم تاڵ‌و درکاوی‌و چەند درەختێکی بێ بەری وەك (طەرفا)و دارە نەبق سەریان هەڵداو مانەوە بۆیان... ئایا ئێمە جگە لە سەرپێچی کەران‌و بێ بڕوایان زیاتر کەسی تر ئا بەو شێوە سزادەدەین بێگومان نەء!!

کەوابوو شوکر گوێی‌و سوپاسگوزاریی کۆڵەکەو بناغەی راگرتنی خۆش بەختی گەل‌و هۆزە پشت هەڵکردن لێی جگە لە ماڵوێرانی‌و خاپورکردنی وڵات هیچ شتێکی تر ناهێنێتە ئاراوە.

بۆیە دەڵێین: خۆزگە گەلانی سەرزەوی تێکڕا لە سوودو قازانجی سوپاسگوزاری‌و شوکرگوێی بگەیشتنایەو کرداریان پێ بکردایە تا لە سونگەی ئەوەوە خۆشبەختی هەردو جیهان روی تێ بکردایە.

## پشت بەخودا بەستن و کاریگەریی لە بڵاوکردنەوەی ئارامیی لە دەرووندا:

ئاشکرایە شارەستانیەت توانیویەتی ژیان بۆ ئادەمیزاد خۆش بکا گوزەرانیان بۆ دابین بکا بەڵام نەیتوانیوە دڵ ئارامی بەناو خەڵکدا بڵاو بکاتەوە، ترس‌و دڵەڕاوکێ بە هەموو جۆرەکانیانەوە لە ئارادایە، ترسی داهاتی ژیان‌و کۆمەڵ‌و، ترس لە تیشکان، ترس لە تەندروستی... هتد. کاریگەریی سامناکیان کردۆتە سەر دەرونی ئادەمیزاد!.

زانیاری نۆژداری دەروونیی تازە ئەوەی رون کردۆتەوە کە زنجیرەیەکی دورو درێژ لە نەخۆشییەکان ھەر لەسەرماو لەرزی ئاساییەوە تا نەخۆشی (نەقرس) لە زۆرکاتدا ھۆیەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ شێوانی دەروونیی نەك تێکچوونی جەستەیی لە راستیش دا زوربەی ئەو نەخۆشییە جەستەییانەی توشی زۆر کەس دەبن ھۆیەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ترسێکی قوڵ...!!

شایانی باسە لە ئایینی ئیسلامدا ھۆیەکی گەڵێ گرینگ ھەیە! بۆ قەلاچۆکردنی ترس لە دەروونـدا. ئەویش پشت بەخودا بەستنە سپاردنی کارەکانە بە ئەوو تاعەتکردنیەتی. خودا بۆ خۆی دەفەرموێ:

{وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ الأَمْرُ كُلُّهُ فَاعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ - سورة هود – ١٢٣}.

واتە: ھەموو شتێك ھەر بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە بە ویستو ئیرادەی ئەوە دەی تۆش ئەی ئادەمیزاد تاعەتی خودا بکەو پشت بەئەو ببەستە پشت بەخودا بەستن، دیاردەیەکە لە رەنگدانەوەی بڕوا بە خودا، ئەو کەسەی بڕوای ببێ کە ھەڵسوڕانی کارو بار بەدەست پەروەردگارەو سودو زەرەر لەلای ئەوەوە دێ، جڵەوی ئیرادەی خۆی بەرەڵا دەکاو خۆی تەسلیمی ئەو دەکا رازی دەبێ بە ویستی خوداو ھەرگیزو لە داھاتوو نھێنی داھاتوو ناترسێ بەڵکوو لە شوێن ترس‌وبیم دڵئارامیو پشت بەستن بە دادوەریی خودا بەدەست دێنێ ھیوای رەحمەتی خودای دەبێ لەبەر ئەوە ئایینی ئیسلام ئەوە دەچەسپێنێ کە بڕوا بە خودا دەبێ (تەوەککولی) لەتەکدا بێ.

{وَعَلَى اللّهِ فَتَوَكَّلُواْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ - سورة المائدة – ٢٣}.

واتە: ئەگەر ئێوە راست دەکەن موسڵمانن، پشت ھەر بە خودا ببەستنو بەس.

{اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ-سورة التغابن/١٣}.

ھەر خودا شایانی پەرستنەو ھیچ خودای تر نین جگە لە ئەو زاتە.. کەوایە با موسوڵمانان پشت ھەر بە ئەو ببەستن.

ئایینی ئیسلام موژدە دەدا بە موسوڵمانانو پەیمانی خێرو بێریان لە خوداوە بۆ دەبەستێ، بەرکەتو فەرپان بۆ پەزمەندە دەکا.

سەیری ئەو ئایەتە پیرۆزە بکە چۆن دەروونی موسوڵمانان لە ژەنگی ترس سپی دەکاتەوەو هێزێکی نهێنی روحییان دەداتێ، تا بەهۆی ئەو هێزەوە بتوانن دڵەڕاوکێو ترسو رارایی خۆیان قەڵاچۆ بکەنو دەفەرموێ:

{فَمَا أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَى لِلَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ - سورة الشورى – ٣٦}.

واتە: ئەو نازو نیعمەتەی دراوە بە ئێوە لە ژیاندا بەشێکی کەمی خۆشی ژیانی دنیایە، ئەو نازو نیعمەتانەی لای خودا هەن بۆ ژیانی ئەودنیا زۆر باشترن بەردەوام ترن بۆ ئەوانەی بڕوایان بە خودا هەیەو پشتیان بە خودا بەستووە.

پەروەردگار پەیمانی کۆمەکیکردنی خۆی دەدا بەو کەسانەی کە پشتی پی دەبەستن دەفەرموێ:

{وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ - سورة الطلاق- ٣}.

واتە: هەر کەسێك پشت بە خودا ببەستێو خۆ بە ئەو بسپێرێ، خودا پشتی دەگرێو لەهانای دێ.

شایانی باسە بگوترێ: کە کۆمەڵێك ئادەمیزاد هەن زیاتر پێویستییان بە تەوەککول هەیە لە ئادەمیزادی تر ئەو کۆمەڵەش کەسانێکن کە موصلیحو دوعاگۆو خێر خوان، هەموو دەم ڕێگای ژیانیان پڕ لە درِكو داڵەو کۆسپو تەگەرەیان دێتە ڕێ، ئەوانە خودا وایان دەسازێنێ کە ئیشو کاری خۆیان بە خودا بسپێرنو پشت بە ئەو ببەستن. پەروەردگار فەرمانیان پێ دەکا کە شوێنی شوعەیب پێغەمبەر بکەون رەوشتی ئەو پەیڕەوی بکەن کە دەفەرموێ:

{إِنْ أُرِيدُ إِلاَّ الإِصْلاَحَ مَا اسْتَطَعْتُ وَمَا تَوْفِيقِي إِلاَّ بِاللَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ - سورة هود – ٨٨}.

واتە: من کە فرستادەی خودام ئامانجم هەر ئیصلاحی ئەو خەڵکەیەو بەس، تا بتوانم درێغی لەو ئەرکە ناکەم یارمەتیشم هەر لە خوداوە بۆ دێو پشتو پەنا هەر بە ئەو دەبەستم.!!

جا لێرەدا خاڵێك هەیە پێویستە رونبکرێتەوە ئەویش ئەوەیە زۆر پرسیار لە دەروندا ختوکەی ئینسان دەداو ئەوە دەخاتە بەرچاو کە تەوەککول‌و پشت بە خودا بەستن ورەی ئادەمیزاد نزم دەکاو سیپاڵی تەمبەڵی بەسەردا دەدا قورئانی پیرۆز بۆ بەر هەڵستی ئەم شوبهەیەو بۆ پوچانەوەی ئەو رایە دەفەرموێ:

{وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ - سورة آل عمران – ١٥٩}.

واتە: ئەی پێغەمبەر! لەئیش‌و کاروباری دونیاییدا مەشوۆرەت بە هاورێکانت بکەو لەزۆر لاوە لێی بکۆڵەرەوە کاتێك هاتیە سەر ئەنجامدانی ئیشێك تەوەککولت بە خودابێ‌و پشت بەو ئەو ببەستە چونکە پەروەردگار ئەو کەسانەی خۆش دەوێن کە تەوەککولیان هەیە.

جا کاتێك ئێمە لەم ئایەتە ورد دەبینەوە دەبینین ئایەتەکە پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە دەبێ پێش پشت بەخودا بەستن‌و دەست درێژکردن بۆ ئیشەکە، گەرەکە مەشوۆرەت بە پیاو ماقوڵان بکرێ ئەمجار عەزم جەزم بکە بۆ ئەنجامدانی ئەو کاتەی لە گژکارەکە رادەچی پێویستە پشت بە خودا ببەستی‌و هیوای سەرکەوتنت ببێ!!

کەوابوو تەوەککول بە خودا لە ئایینی ئیسلامدا تێشووی روحییە بۆ سەرکەوتن بەسەر ترس‌و قەلەقدا چونکە تەوەککول لە سامناکترین ساتی ناخۆشدا ئارامی‌و هێدیەتی بەدڵ‌و دەرونی مرۆڤ دەبەخشێ سەکینەو گەشبینی دەخاتە دڵ‌و دەرونەوە کە بەداخەوە زۆربەی دانیشتوانی سەر ئەرز لێی بێ بەرین.

## راستاڵی بۆ خودا کردەوەی مرۆڤ بەرزدەکاتەوە

ئـیخلاص‌و گـەردن کەچـی بـۆ خـودا بریتییـە لـە ئەنجامـدانی کـرداری بـێ خەوش، کردارەکە تاعەت‌و خودا پەرستی بێ یان ئیشی دونیایی بێ، ئـەو لـەکاتی ئەنجامدانیدا مەبەستی رەزامەندی خودابی‌و بەس!!

ئیخلاص‌و گەردن کەچی بۆ خـودا بریتییـە لـە ئەنجامـدانی کـردارو ڕەوشـتی ئینـسانی. ئـارەزۆی نـەفس‌و ریاکـاری‌و ئامـانجی شەخـصی دژی پـەیڕەوی ئـایینی ئیسلامن، ئیسلام ژیان دۆستەو هەردەم دەیەوێ لەشوێنی ئەوان ئیخلاص دابنێ.

بۆیە دەبینین ئیسلام ئەو پەڕی گرینگی داوە بە ئیخلاص‌و لەتـەك عیبـادەت بۆ خودادا ناوی هێناوەو دەفەرموێ:

{وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ - سورة البينة – ٥}.

واتە: ئەوەی فرمان کراوە بەو خەڵکە ئەوە بـووە کـە عیبـادەتی خـودا بکـەن بە ئیخلاصەوە ئایینەکەی بۆ ئەنجام بدەن. یان دەفەرموێ:

{فَاعْبُدِ اللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ الدِّينَ - سورة الزمر – ٢}.

واتـە: عیبـادەتی خـودا بکـەو بـە ئـیخلاص پـەیڕەوی ئایینەکـەی بکـە... پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ:

(أول من يسأل يوم القيامة ثلاثة: رجل آتاه الله العلم فيقول الله لـه: مـا صـنعت فيما علمت؟ فيقول: يا رب كنت أقوم به آناء الليل وأطراف النهار، فيقول الله: كذبت، وتقول الملائكة: كذبت بل أردت أن يقال فلان عالم، ألا فقد قيل ذلك، ورجـل آتـاه الله مالا فيقول الله له: لقد أنعمت عليك فماذا صنعت؟ فيقول: يا رب كنـت أتـصدق بـه آناء الليل وأطراف النهار، فيقول الله له: كذبت، وتقول الملائكة كـذبت، بـل أردت أن يقال فلان جواد الا فقد قيل ذلك، والثالث رجل جاهد في سبيل الله فقتـل فيقـول الله له: لاقد جاهدت ليقال لك فلان شجاع ألا فقد قيل ذلك، ثم قال الرسول (ص) لأبـى هريرة يا أبا هريرة أولئك أول خلق تسعر بهم جهنم يوم القيامة)[1].

---

[1] رواه أهل السنن.

واتە: یەکەم کەس کە راپێچ دەکرێ بۆ پرسیار لێکردن‌و موحاسەبە سێ جۆرە کەسن  یەکێکیان مرۆڤێکە خودا لە دونیادا عیلم‌و زانستی داوەتێ خودا پێی دەفەرموێ: بەو زانیارییەی من پێم دای چیت پێکرد؟! ئەویش دەڵێ: ئەی خودایە هەموو کاتێك بەشەو بە رۆژ من خەریکی بڵاوکردنەوەو پەیڕەوی کردنی ئەو زانیارییە بووم. پەروەردگار دەفەرموێ: درۆت کرد فریشتەکانیش دەڵێن: درۆت کرد بەڵکوو مەبەستت ئەوە بووە پێت بڵێن: زاناو عالمە ئەوەشیان پێ گوتووی پاداشتی خۆت وەگرتووە!!.

یەکێکی تر لەو جۆرە پیاوانە کەسێکە خودا ماڵ‌و دارایی داوەتێ خودا پێی دەفەرموێ: من ماڵ‌و داراییم دابوویێ چیت لێکرد. دەڵێ پەروەردگار!! شەو رۆژ خەریکی بەخشینی بووم یارمەتی فەقیرو هەژارانم پێ داوە خودا دەفەرموێ: درۆت کرد فریشتەش دەڵێن: درۆت کرد، بەڵکوو مەبەستت ئەوە بوو پێت بڵێن: فلان کەس سەخییە، ئەوەشیان پێ گوتوی.

سێیەم: کەسێکە لە رێگای خوادا غەزای کردوە خۆی بەخت کردوەو کوژراوە پەروەردگار پێی دەفەرموێ: تۆ بۆیەت شەڕکردوە تا پێت بڵێن: ئازاو نەبەردی ئەوەشیان پێ گوتوی‌و پاداشی خۆت وەرگرتووە، ئەمجار پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بە ئەبو هورەیرەی فەرموو ئەی ئەبو هورەیرە ئەو جۆرە کەسانە ئەو کەسانەن کە دەبنە بڵێسەی دۆزەخ.

جا لەکاتێکدا کرداری خالیص بۆ خودا پێویستی بە پێشدەستی نیەت هەیەو دەبێ کابرا پێش دەست پێکردنەکەی عەزم‌و جەزمی کردارەکەی هەبێ، دەبینین ئایینی ئیسلام ئەو پەڕی گرنگی داوە بە نییەت‌و کردویەتی بە تەوەرەیەکی سەرەکی بۆ کرداری موسوڵمانان‌و رای گەیاندووە کە کردار بێ نییەت بایەخی نییە ئەوەتا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ:

« إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى ، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا أَوْ إِلَى امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ » .

واتە: هەموو کردەوەیەك پێویستی بە نیەت هەیە، هەموو مرۆڤێکیش بە گوێرەی نیەتی خۆی پاداشتی دەدرێتەوە، جا ئەگەر کەسێك هیجرەتی کردو نیشتمانی خۆی بەجێ هێشتو مەبەستی رەزامەندی خوداو پێغەمبەر بوو، ئەوە پاداشتی ماندو بوونەکەی لەلای خوداو پێغەمبەرە، بەلاّم ئەگەر کەسێك هیجرەتی کرد بۆ ئەوەی ژنێکی دەست کەوێ یان ماڵو داراییەکی دەستگیر ببێ، ئەوە پاداشتی هیجرەتو رەوکردنەکەی ئەوەیە کە مەبەستی بووە.

کەوابوو نیەتی باش پایەیەکی گەلێ گرنگە لە پایەکانی پەروەردەو رەوشتی ئینسانی کە بەهۆی ئەوانەوە مرۆڤ دەبێتە ئەندامێکی برنجی لەناو کۆمەڵی ئادەمیزاددا... ئایینی ئیسلام زۆردەمێکە ئەوەی چەسپاندووە کە کردەوە لای خودا بە مەرجێك وەردەگیرێ کە خالیص بۆ خودا بێ، بەمەش زۆر پێش عمانویل کانت (فەیلەسوفی ئەڵمانی) کەوتووە کە گوتوویەتی! نییەتپاکی هەموو شتێکە لە رەوشتدا.

کەوابوو خێرو چاکە لە نیگای ئایینی ئیسلامەوە کاتێك خێرو چاکەیە کە لەنیەتی پاکەوە هەڵقوڵێو بە خالیص مەبەستی خودا بێ، کرداری چاك بە چاك ناژمێردرێ مەگەر لەژێر رۆشنایی فەرمانی خودادا ئەنجام بدرێ. هیچ گومانیش نییە کە ئەمە بۆچونێکی گەلێك مەزنەو مەزهەبێکی فرە باشە بۆ دانانی ئەندازەی رێز بۆ ئادەمیزادو کرداری زۆر خوارو خێچی کۆمەڵ راست دەکاتەوە، موجتەمەع دەگەیەنێتە سەر ترۆپکی کەمال، چونکە کردارو گوفتار دەبەستێتەوە بە تاقە مەبەستێکەوە سەقامگیری دەکا بە نمونەیەکی هەرە بەرزەوە، ئەویش رەزامەندی خودایە خۆشەویستیو دژایەتیکردنو نەکردن، ویستو نەویستی هەر لەبەر خودا دەبێ، ئاشکراشە خودا فەرمان دەکا بە کۆمەڵی بەشەر بەخێرو چاکە نەك بە خراپەکاری.

## نزای پاڕانەوە لە خوداو خاسییەتە رۆحییەکانی

پاڕانەوە لە خودا بەشێکە لە پێویستییەکانی خودا پەرستی، چونکە پاڕانەوە ئەڵقەی پەیوەندی نێوان ئادەمیزادو پەروەردگاریەتی، پاڕانەوە لە خودا شتێکی سروشتییە لە ئادەمیزاددا لەکاتی تەنگانەدا بەبێ ئەوەی بەخۆی بزانێ لا شعوری پەنای پێ دەباو هاواری دەکاتیو دەپاڕێتەوەو دڵانێتەوە کە ناخۆشی لەسەر لابەرێ، چونکە ئینسان زەعیفە لەبەرامبەر روداوی جیهانیدا، کاتێك روداوێکی سامناك روی تێ دەکا جگە لەدوعاو پاڕانەوە لەخودا پشتیوانێکی تری دەست ناکەوێ، لەبەرئەوە پەروەردگار فەرمانی بە موسوڵمانان کردوە کە هەمووکات خودایان لەبیر بێو لێی بپاڕێنەوە.

{وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ - سورة غافر – ٦٠}.

واتە: ئەی کۆمەڵی ئادەمیزاد! پەروەردگارتان فەرمانتان پێ دەکاو پێتان دەفەرموێ: لێم بپاڕێنەوەو هاوارم بکەنێ، منیش بە هاناتانەوە دێم، بێگومان ئەوانەی لووت بەرزیی دەکەن لە پەرستنی منو تاعەتم بۆ ناکەنو لێم ناپاڕێنەوەو هاوارم ناکەنێ، دەچنە ناو دۆزەخەوەو هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە. لێرەدا بە ئاشکرا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە پەروەردگار دوعاو پاڕانەوەی بە عیبادەتو خودا پەرستی حلێب کردوەو، کەسێك ئەنجامی نەدا شایانی رقو کینەی خودا دەبێ!!

نزاو پاڕانەوە چارەسەری زۆربەی نەخۆشییە دەروونیەکانە، ئادەمیزاد خۆی لەخۆیدا بە گوێرەی سروشتو تەبیعەتی بۆ حەلکردنی موشکیلەو تەنگو چەڵەمەی ژیانی، پێویستی بە دۆستێکی راستاڵ هەیە کەمێك ئازاری ژیانی لێ سووك بکاو برێ غەمو نارەحەتیی لەسەر لابەرێ، نوژدارانی دەروونیش هەموو سوورن لەسەر ئەوە کە چارەسەرکردنی تەوەتوری عەصەبیو ئازارە دەروونییەکان تا ئەندازەیەکی زۆر پەیوەندن بە دەرکاندنی ئەو نەخۆشییانە لای دۆستێکی راستاڵ چونکە شاردنەوەیان نەخۆشییەکە زیاد دەکا.

جا کاتێك ئینسانی غەمناكو لێقەوماو هانای برد بۆ لای خوداو نارەحەتیی خۆی درکاندو نزای خۆی بۆ کرد هەست دەکا بەدڵ ئارامیو کزە بایەکی فێنك دڵو دەرونی دەگەشێنێتەوە لەناو چاڵی غەمو نارەحەتی دەری دێنیو غەمو نارەحەتی لێ دەرەوێنێتەوە، چونکە بڕوای تەواو ئەوە دەچەسپێنێ کە خودا نزیكو بە ئاگایە لە ئادەمیزاد هەر کاتێ هاواری کاتێ بە هانایەوە دێو فریای دەکەوێ، قورئان دەفەرموێ:

{وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ - سورة البقرة – ١٨٦}.

واتە: هەرکاتێك بەندەکانم هاوارم لێ بکەن بێگومان من لێیان نزیکم بە هانای لێقەوماوەوە دێمو وەڵامی بانگەوازییەکەی دەدەمەوە با ئەوان هاوارم بکەنو ئیمانم پێ بێنن بەڵکوو منیش بە هانایانەوە بچمو بیان خەمە سەر ڕێبازی ڕاست.

## نزاو پاڕانەوە لە خۆشی و ناخۆشیدا:

ئایینی ئیسلام دەیەوێ دوعاو پاڕانەوە لە خودا لە ناخەوە هەڵقوڵێو لە کاتی خۆشیدا وەکوو کاتی ناخۆشی پاڕانەوەکە بەدڵ بێ. بۆ ئەوەی ئینسان هەمیشە پەروەردگاری خۆی لە یاد بێو فەرمان بەرداری فەرمانەکانی بێ مانای بەندایەتی ڕاستەقینە لە خۆیدا بینێتەدی. چونکە ئادەمیزاد بەشێوەیەکی سروشتی لەکاتی تەنگانەدا پەنادەیا بۆ پەروەردگاری خۆی، بەڵام هەر لەگەڵ لەناخۆشییەکە دەرچوو خودای خۆی لەبیر دەکاو ڕو لە فەرمانو بەجێهێنانی ئەمرەکانی وەردەگێڕێو دەست دەکا بە خراپەکاریی لەسەر زەوی... خودای گەورە ئەم دیاردەی ئادەمیزادی باس کردوەو هەڕەشەی لەو جۆرە کەسانە کردوە کە خراپەکاری ئاکاریانەو دەفەرموێ:

{وَإِذَا أَنْعَمْنَا عَلَى الْإِنسَانِ أَعْرَضَ وَنَأَى بِجَانِبِهِ وَإِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ فَذُو دُعَاء عَرِيضٍ - سورة فصلت – ٥١}.

واتە: هەر كاتێ نازو نیعمەتی خۆمان برێژین بەسەر ئادەمیزاددا لەجیاتی ئەوەی بەندایەتیمان بكا لەخۆی بایی دەبێو پشت هەڵدەكاو لەخودا عاسی دەبێ، خودایەتی خودای وەبیرنایەتەوە كاتێكیش توشی ناخۆشی دەبێ بەلایەكی بەسەردا دێ دەست پان دەكاتەوە نزاو لالانەوە دەست پێ دەكاوز هاوار دەكاتە خوداو هانای بۆ دێنێ.

لە شوێنێكی تردا پەروەردگار دەفەرموێ:

**{وَإِذَا مَسَّ الإِنسَانَ الضُّرُّ دَعَانَا لِجَنبِهِ أَوْ قَاعِداً أَوْ قَآئِمًا فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُ ضُرَّهُ مَرَّ كَأَن لَّمْ يَدْعُنَا إِلَى ضُرٍّ مَّسَّهُ كَذَلِكَ زُيِّنَ لِلْمُسْرِفِينَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ - سورة يونس - ١٢}.**

واتەك هەر كاتێ بەلاو تەنگانە یەخەی ئادەمیزادی گرت دەست دەكا بە پاڕانەوەو نوزانەوە لەسەر تەنیشتو بە دانیشتنەوە بە راوەستانەوە لە هەموو هەڵسو كەوتێكیدا لەخودا دەپاڕێتەوە: كەچی هەر لەگەڵ ناخۆشییەكەمان لەسەر لابرد خێرا هەڵدەگەڕێتەوەو پشت هەڵدەكاو هەر دەڵێی قەت لە ئێمە نەپاڕاوەتەوەو هانای بۆ نەهێناوێنو داوای لێ نەكردوین بەلاو ناخۆشی لەسەر لابەرین. بەڵێ، ئەوان بەو جۆرە لایەنی پشت هەڵكردنیان بۆ دەرازێندرێتەوەو لەپێش چاویان جوان دەكرێ، ڕو وەرگێڕانیان لە خودا لە دڵدا شیرین دەبێ.

لە شوێنێكی تردا پەروەردگار منەتی خۆی دەخاتە سەر كەسانێك لە مەخلوقاتی خۆی كە توشی خەتەری خنكان بوون خودا رزگاری كردون دەفەرموێ:

**{هُوَ الَّذِي يُسَيِّرُكُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ حَتَّى إِذَا كُنتُمْ فِي الْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِم بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ وَفَرِحُواْ بِهَا جَاءتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَاءهُمُ الْمَوْجُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَظَنُّواْ أَنَّهُمْ أُحِيطَ بِهِمْ دَعَوُاْ اللّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ لَئِنْ أَنجَيْتَنَا مِنْ هَذِهِ لَنَكُونَنِّ مِنَ الشَّاكِرِينَ، فَلَمَّا أَنجَاهُمْ إِذَا هُمْ يَبْغُونَ فِي الأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا بَغْيُكُمْ عَلَى أَنفُسِكُم - سورة يونس - ٢٢-٢٣}.**

واتە: پەروەردگارتان خودایەکی وەهایە ئێوە دەڕۆیەنێ لەسەر وشکانی بە قاچی خۆتان یا بە سواری لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەچن، لە دەریاشدا بەهۆی کەشتیو گەمێوە هاتوو چۆ دەکەن بیرو هۆشی دروستکردنی ئەو ئامێرانەی پێ بەخشیون.

جا کاتێ کە ئێوە لە دەریادا لەناو کەشتیدا بەشێوەیەکی ئاسایی دەڕۆن بای بەحرو شەپۆلەکانی لە صالیحی ئێوەن. وەکوو دەتانەوێ بەدڵی خۆتان کەشتی دەریا دەبڕێ لە نکاوێك گێژەڵۆکەیەك هەڵدەکاو لە هەموو لایەکەوە شەپۆلی سامناك دەوریان دەدا، لە هەموو لایەکەوە تارمایی مەرگ لێیان نزیك دەبێتەوەو گومان دەکەن کە تازە رزگاربونیان نابێ، ئەو کاتە بەدڵو بەگیان هانا بۆ خودا دەبەنو لێی دەپاڕێنەوە هاواری دەکەنێو دەڵێن: خودایە! ئەگەر ئەمجارە لەم بەڵایە رزگارمان بکەیت ئیتر هەرگیز لە شوکرو سوپاس واز ناهێنینو هەردەم سوپاسگوزار دەبین کەچی کاتێك خودا بە هانایانەوە هاتوو لە تەنگانەکە رزگاری کردن –هەروەك نەبایان دیبێو نە باران– خێرا هەڵگەڕانەوەو دەستییان کردەوە بە سەرپێچی کردنو خوارو خێچی! ئەی کۆمەڵی ئادەمیزاد بەغیو خراپەکاریتان دەگەڕێتەوە بۆ سەر خۆتان زەرەرو زیانی لێ دەبینن پاداشی خراپەکاری هەر خراپەیە کەوایە خۆتان تووشی ئەو سزایە مەکەن!

کەوابوو پێویستی سەرشانی ئادەمیزادە کە دوای ئەوە خودا لە تەنگانەو هیلاکی رزگاریکرد، سەرپێچی خودا نەکاو لێی یاخی نەبێ بەڵکوو پێویستە ئەو دیمەنە سامناکەی کە تووشی بووە ببێتە سیاجو شورایەك، هەڵنەری بێ بۆ خودا پەرستیو فەرمانبەرداری.

## پاڕانەوە لە خودا دەبێتە هۆی پاڵفتەکردنی لایەنی رۆحی لە ماددە:

ئایینی ئیسلام دوعاو پاڕانەوەی داناوە بۆ پاکبوونەوەی لایەنی رۆحی لە ماددەو خۆپاراستن لە ئارەزووە زیانبەخشە جەستییەکانو بەرز بوونەوەی رۆح

لە قوناغەکانی خودا پەرستی تەواودا. لەگەڵ ئەمانەشدا جێبەجێکردنی داخوازییەکانی نزاکەر کە برێتین لە نازو نیعمەتو کار بۆ ئاسانکردنو زیان لێ دوورخستنەوە..تاد.

لەبەر ئەوە دەبینین خودای پەروەردگار لەسەر زوبانی فورستادەو پیاوچاکانی خۆی موسوڵمانان فێری پاڕانەوەو دوعاکردن دەکاو دەفەرموێ:

{رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلاَةِ وَمِن ذُرِّيَّتِي رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاء - سورة إبراهيم – ٤٠}.

خودایە وام لێ بکە هەموو کاتێ بەرێكو پێکی نوێژەکانم بەجێ بێنمو بەندایەتی تۆ بکەم، وەچەو نەوەی داهاتووشم هەر وارام بێنە خوادیە نزاکەم لێ گیرا بکەیو ئەو پاڕانەوەم لێ وەربگری.

{رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِي - سورة الأحقاف – ١٥}.

واتە: پەروەردگار! دڵم وارام بکە کە هەموو کاتێ سوپاسگوزاری نازو نیعمەتی تۆ بێ، هەردەم شوکری ئەوەم لەبیر نەچێ کە ڕانمایی ئایینی ئیسلامت کردومو ئەم ئایینەت لەلا شیرین کردوم، هەروەها شوکری ئەوەشم لەیاد نەچێ کە سۆزو عەتفت خستۆتە دڵی باوکمو دایکمەوە تا بەهۆی ئەو خۆشەویستییەوە منیان بە منداڵی بەخێو کردوە ئازاری شەو بەخەبەرییان لەپێناو بەخێوکردنمدا چەشتووە، خودایە! وام رام کە کردەوەکانم چاكو باش بنو تۆ لێیان رازی بی خودایە! وەچەو نەوەی داهاتووم صاڵحو خواپەرست بن.

{رَبَّنَا لاَ تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ - سورة آل عمران – ٨}.

واتە: پەروەردگارا! نزاو پاڕانەوەمان ئەوەیە کە دوای ئەوەی شارەزای رێگای خودا پەرستیت کردوینو نوری ئیمانت خستۆتە دڵمانەوە ئیتر جارێکی تر دڵمان لەسەر ئەم ئایینە لانەیو لەخودا پەرستی هەڵنەگەڕێنەوە، لە خەزێنەی

رەحمەتی خۆت پێداویستی ژیانمان بۆ مەیسەر بکە... بێگومان تۆ بەخشندەو میهرەبانیو بەخشش‌و عەتات بێ ئەندازەو سنوورە.

{لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَآ أَنتَ مَوْلاَنَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ - سورة البقرة – ٢٨٦}.

واتە: ئەی پەروەردگارمان! نزاو پاڕانەوەمان ئەوەیە کە باری قورسمان لەسەر دامەنێو شتی وامان داوا لێ مەکە بە نارەحەتی بۆمان جێبەجێ بکرێ وەك ئەو بارانەی لەسەر کۆمەڵانی پێشوو داتان ناوە وەك جولەکە. کە ئەگەر شوێنێکی پۆشاکیان پیس بوایە دەبوو بی بڕن‌و فڕێی دەن نەك وەکوو ئێستای ئێمە بیشۆن، هەروەها دەبوو چواریەکی سامانیان هەموو ساڵێك بدەن بە زەکات، خودایە بەڵای وامان بەسەردامەدە کە بۆمان هەڵنەگیرێ‌و خۆی بۆ رانەگرین گوناهەکانمان بسڕەوەو لەسەر گوناهمان سزامان مەدەو لێمان خۆشبەو نەنگی‌و عەیبەمان بەسەردا مەهێنە میهرەبانیمان لەگەڵدا بکە، بەزەییت پێدا بێینەوە تۆ سەردارو بەخێوکەری ئێمەی، زاڵمان بکە بەسەر کۆمەڵی کافراندا:

{قَالاَ رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ - سورة الأعراف – ٢٣}.

واتە: خودایە ئێمە ستەممان لە خۆمان کردوە ئەگەر بێتو لێمان خۆش نەبێ رەحممان پێ نەکەی ئێمە خەسارەتمەند دەبین.

{رَبِّ فَلَا تَجْعَلْنِي فِي الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ - سورة المؤمنون -٩٤}.

خودایا لە کۆمەڵی زاڵم‌و ستەمکاران حسێبمان مەکە.

{رَبَّنَا لاَ تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ - سورة يونس – ٥٨}.

پەروەردگارا زاڵم‌و ستەمکارمان بەسەردا زاڵ مەکە، چونکە ئەوان ئازارو سزامان دەدەن، ئێمەش لەوانەیە بەم بۆنەوە واز لەدین بێنین‌و بچینە سەر

بیروباوەڕی ئەوان، یان ئەوان بڵێن: ئەگەر ئەم کۆمەڵە راستیان بکردایە ئێمە ئاوا بەسەریاندا زاڵ نەدەبووین!!.

{رَبَّنَا آتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا-سورة الكهف/١٠}.

پەروەردگارا! لەلایەن خۆتەوە بە کەرەمی خۆت رەحمەتو بەخششێکی تایبەتیمان بدەرێ، ئیشو کارمان بۆ سازبدە لە کۆمەڵی بێدینان جیامان کەرەوە.

{قَالَ رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي - سورة طـه – ٢٥-٢٦}.

پەروەردگارا! سینگم فراوان بکەی صەبرو ئارامم بدەیە تا بتوانم ئازارو نارەحەتی پێغەمبەرایەتی هەڵبگرم لە بەرامبەر قسەو تانەو لۆمەی خەڵکیدا بار قوڵ بم، ئیشو کارم بۆ ئاسان بکەی!!

{وِمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً - سورة البقرة – ٢٠١}.

خودایا! نزات لێ دەکەینو هاوارت دەکەینێ کە لە دونیادا چاکەمان بدەرێ لە قیامەتیشدا هەر چاکەمان بدەرێ.

ئەو دەقانەی نووسران بەشێکن لەو پاڕانەوەو دوعایانەی قورئان بۆی گێڕاوینەوە بۆ ئەوەی ئێمەش لەکاتی تەنگانەدا بەو جۆرە دوعایانە بپاڕێینەوە!!

## گەورەیی دوعاو پاڕانەوە:

بەڵگە لەسەر گەورەییو بەفەڕی دووعا زۆرو زەبەندەن، جا لێرەدا بۆ پاڵپشتی ئەوە روداوێك تێهەڵکێشی ئێرە دەکەین کە گۆڤاری (ریدرزدایجستدا) لەژێر سەرەباسی (ئایا بڕوا بەنوێژو دوعاو پاڕانەوە ناکەی؟؟) بڵاوکراوەتەوە. دوایی گۆڤاری (المختار) لە ئوکتوبەری ساڵی (١٩٤٤)دا بلاوی کردەوە دەڵێ: یەکێك لە زانا دەروونناسەکان لە بارەی موعجیزاتی شەڕەوە کە زۆری لە بارەوە نووسراوە وتبووی! دەتوانرێ رەحمەتی خودا بشوبهێنرێ بە مووەلیدەیەکی کارەبایی دەتوانین هەموو کات لەم مووەلیدەوە هێزو قووەت وەربگرین. بە مەرجێك بەهۆی دوعاو پاڕانەوە پەیوەندی بەو خاوەن رەحمەتەوە بکەینو لێی دانەبڕێین.

وا ئێستاش رۆژ لە دوایی رۆژ بەڵگەی یەك بە دوایەك لەسەر كاریگەری دوعاو پاڕانەوە سەر هەڵدەدەن بۆ نموونە دەڵێن كاتێك فڕۆكەوان (الماجور السن لندبرج) خۆیو نۆ هاوڕێی دەچوون بۆ ئوستورالیا لە رێگا ناچار بوون لە دەریادا خۆ فڕێ بدەن، چونكە فڕۆكەكەیان خەلەلی تێكەوت.. دوایی هەواڵ وا بڵاوبووەوە كە هەموویان سەریان تێداچووە.

لەم بارەوە فڕۆكەوان (المجور لندبرج) دەڵێ: توانیمان بەهۆی دوو تەختەوە (دوو پارچە مطاطەوە) توانیمان لە دەریا بێینە دەرەوە بۆ وشكانی بەلام نە پارچە نانێكمان پێیە نە دڵۆپە ئاوێكیشمان دەست دەكەوێ، هاوڕێكانم هەموو سەرسامو لە دڵەڕاوكێ دا بوون، تەنها (البرت هرناندز) نەبێ كە تۆپچی دواوەبوو ئەو خێرا دەستیكرد بە دوعاو پاڕانەوەو لالانەوە، لە نكاوێك سەرنجی بۆ ئەوە راكێشاین كە نزاكەی گیرابووەو خودا بەهانامانەوە دێو لەم میحنەتە رزگارمان دەكا.

بەڵێ: (المأجور لندبرج)و هاوڕێكانی بەو شێوەمانەوە لەبەر خورەتاوی گەرمی بێ دەرتان، چاونواڕی فریاڕەسێك بوون هەموو دەمو لێویان قەڵشابوو، زوبانیان لەدەمدا هاوسابوو، نەیان دەتوانی هاوكاری (هرناندز) بكەن لە تەلیلەو تەسبیحاتا بەلام هەر چۆنێك بوو تاو تاوە هاریكاریان دەكرد، دوای سێ رۆژ ئێوارەیەك پێش ئەوەی شەودابێ تارماییێكیان لە شێوەی دوورگەیەكی بچكۆلانەدا بەدی كرد، ئەوەندەی پێ نەچوو شتێكیان بینی كە بە خەیاڵیاندا نەدەهات هەروەندەیان، زانی سێ بەلەم دەپیاوی روتیان تێدابوو رویان تێكردن دوایی دەركەوت كە ئەمانە رزگاركەریانن و خەڵكی ئوستورالیانو ماسی گرو نێچرەوانن پێست رەشو سەربژن.

سەدەها كیلومەتریان بریوە تا گەیشتوونە ئەوێ دوایی كەوتنە قسەو گفتو گۆ بە (لندبرج)یان وت ئێمە رۆژێك پێشتر ویستمان بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆمان بەلام لەنكاوێك پالپێوەنەرێكی سەیرمان هەست پێ كرد. نەخشەی

سەفەرەکەمانی گۆڕیو هاتین بۆ ئەم کەنارە دەریا چۆڵو هۆڵە کە بەنیسبەت ئێمەوە هیچ نرخێکی نییە کەچی هاتین ئێوەمان بەدی کرد.

ئا ئەمەیە فائیدەو سوودی دوعا کە لەکاتی تەنگانەدا بەندە ئازاد دەکاو لەجیاتی ترسو بیم ئارامیو صەبر دەخاتە دەروونتانەوە، بۆیە دەڵێن وتە بە نرخەکەی کاریل چەند جوانو بەنرخە کە دەڵێ:

نوێژو پاڕانەوە لە خودا قوڵترینو بەهێزترین کانی هێزی ئادەمیزادە بەڵام بەداخەوە بەتەواوی پاش گوێ خراون...

## بەشی سیانزەهەم:

# ڕەوشت لە ئیسلام دا (الأخلاق في الإسلام)

**ڕەوشتە بەرزەکان بریتین لە:**

**بەردەوام بوون لەسەر کاری چاك و پاڵفتەکردنی دەروون – کردار چاکیی – خودا پەرستی – خۆ ڕاگریی – لێبوردن – ڕاستگۆیی و دیاردەکانی – ڕێکخستنەوەو صوڵحکردنی نێوان ئادەمیزاد – هاریکاریی – خۆشەویستی – قسەی باش – هاوڕێی کردنی باشان – پرسکردن و سڵاوکردن.**

**ڕەوشتە نزمەکان بریتین لە:-**

**گەردن کەچی بۆ هەواو هەوەس – لوتبەرزی و خۆبەزلزانی – عەرەقخواردنەوەو قورماکردن – داوێنپیسی – درۆکردن و دیاردەکانی – ڕێزنەگرتنی خەڵك – گومان بردنی خراپ – جاسووسی کردن – غەیبەتکردن – ڕق هەڵسان و حەسوودی – چەنەبازی و چەواشەکردن – چڵێسی.**

## ئامانجی ڕەوشت:

زانستی ڕەوشتناسیی باسی مانای خێرو شەڕ دەکاو ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە پێویستە خەڵکی بە گوێرەی ئەخلاقی بەرز هەڵس و کەوت لەگەڵ یەکتری بکەن، ئەو مەبەستە ڕوون دەکاتەوە کە پێویستە ئادەمیزاد کردارەکانیانی بۆ ئاڕاستە بکەن، ڕێگەیان بۆ ڕوون دەکاتەوەو پێیان دەڵێ چ پێویستە بیکەن چ پێویستە نەیکەن.

گومانی تێدا نییە کە ئەخلاق و ڕەوشت کۆڵەکەو پایەی سەرەکین بۆ ڕاگرتنی کیانی گەلان، بۆیە دەبینین: لێکۆڵەرەوە فەیلەسووفەکان هەموویان ڕایان لەسەر ئەوەیە کە ڕەوشتی بەرز پێویستە بۆ خودی مرۆڤەکە بە تایبەتی و بۆ کۆمەڵگاکەشی بە گشتی. هەر وەکوو چۆن تاکی کۆمەڵ ئەگەر ڕەوشت نزم بێ زیان بەخۆی و کۆمەڵ دەگەیەنێ، بۆ نموونە ئەگەر یەکێك لە کۆمەڵدا درۆزن بێ، مەراییکەر بێ، حەسوودو بەخیل بێ، شەڕانی بێ، وێڕای زیانی ئەم ڕەوشتانە بۆ

خودی خۆی، کۆمەڵگاش بە بڵاوبوونەوەی ئەم جۆرە ڕەوشتانە زیانبەخش دەبێ. هەربۆیە هەمیشە هەڵوێستو هەوڵدانی فەیلەسووفو شەرع زانو کۆمەڵناسەکان بۆ بڵاوکردنەوەو چەسپاندنی ئەخلاقی بەرزە لەناو کۆمەڵدا، چونکە رەوشتی بەرز کۆڵەکەو پایەی یەکەمی دامەزراندنی کۆمەڵی ساغو پتەوە!.

کەوابو (شاتوبریان) زیادەڕەوی نەکردوە کە دەڵێ: (رەوشت بناغەی هەموو کۆمەڵێکە) هەر بۆیەشە پەیامی پێغەمبەران هەمیشە خەڵکیان هەڵناوە بۆ رەوشت بەرزیی‌و بڵاوبوونەوەی لەناو کۆمەڵدا، قورئانی پیرۆزیش لەچەند ئایەتێکدا جەختی لەسەر پابەندبوون بە ئەخلاقەوە کردوە، چونکە رەوشتی بەرز ئادەمیزاد دەگەیەنێ بە لەززەتو خۆشی رۆژی قیامەتو لە بەهەشتدا خۆشنوود دەبێ.

## هێرشکردن بۆ سەر ئیسلام:

شتێکی سەیرو سەمەرەیە کە بڕێ لە دوژمنانی ئیسلام ویستوویانە خەنجەری ژەهراوی لە قەبرغەی ئیسلام بدەن لە ناخەوە راستییەکان چەواشە بکەن‌و بە ناڕەوا ئیسلام لەکەدار بکەن‌و پڕوپاگەندەی لەدژ هەڵبەستن!!

بۆ نموونە: (المنسیوکۆڵی) لە کتێبێکیدا بەناو (البحث عن الدين الحقيقى) کە بریتییە لە چەند (محاضره)یەك دەربارەی فێرکردنی ئایین – باسی ئیسلامی بە ناشرین ترین شێوە کردوەو جەخت لەسەر ئەوە دەکا کە ئایینی ئیسلام هیچ رەوشتێکی جوانی لەخۆ نەگرتووە!!

بەراستی دزێوی ئەو هێرشە نامەردانەیە کاتێك پۆخڵاوییەکەی بۆ خەڵك دەردەکەوێ کە ئاگاداری ئایەتەکانی قورئان بن کە دەربارەی ئەخلاق دەدوێن! بێگومان هەر ئایەتێك لە ئایەتەکانی قورئان رەتکردنەوەیەکی بەهێزە بۆ ئەم بوختانە بەڵام بەپێویستی دەزانین پێش ئەوەی مەبادیئەکانی قورئان لەبارەی ئەخلاقەوە رابنوێنین بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو دەستدرێژیکارانە وتە بەنرخەکەی دکتۆر جوستاف لۆبۆنی فەڕەنسی بخەینە پێش چاو، ناوبراو لە

کتێبی (حضارة العرب)دا دەڵێ: بنەمای ئەخلاق لە قورئانـدا ئەوەنـدە بـەرزە کـە بەو شێوە لە هیچ ئایینێکی تردا نابینریێ!!

بێگومان شایەتێدانی دکتۆر جۆستاف دەربارەی رەوشت لە قورئانـدا نـرخێکـی زانستی گەورەی هەیە، چونکە ئەو، خۆشەویستی ئایینی پاڵی پێوە نەناوە کە ئەو هەڵوێـستە بنوێنـێ، بەڵـکوو ئـەوەی هـەڵیناوە شـایەتیدانی حـەق ویـژیو بـەجێهێنانی ئـەرکی زانـستییە کـە ئـەو هـەڵی گرتـووە، بێگومـان شـایەتیدانەکەی دکتـۆر جۆسـتاف هـەروا بەهەوانتـە نـەبووە، بەڵـکوو لـە ئاکـامی تێفکـرینو لێکۆڵینــەوە دەربـارەی ئایەتــە ئەخلاقییــەکانی قورئــان ســەری هەڵـداوە لــە زانیارەیەوە سەرچاوەی هەڵگرتووە! چونکە گومانی تێدا نییە کە دکتۆری ناوبراو ئایینــەکانی هــەموو ســەرو بــەرکردونو توێژینــەوەی تێــدا ئــەنجام داونو بــە پسپۆڕێکی زانستی کۆمەڵایەتی دەژمێردرێو شایەتیدانەکەی نرخی زانستی خۆی هەیە!!

جا وا ئێمە لێرە بـەولاوە هەنـدێ مەبـدەئی رەوشـتیی لـە قورئانـدا دەخەینـە روو، لـە پێـشەوە ئـەو رەوشـتە بەرزانـە بـاس دەکـەین کـە قورئـان خەڵـکی بـۆ هەڵناون. ئەمجار ئەو رەوشتە نزمانـە دەخەینـە روو کـە قورئـان نـەی لێ کـردون، مەبەستیشمان خزمەتکردنی راستییەو کاردانەوەی سۆزو عاتیفـە نییـە. هـەروەها مەبەستمان شارەزایی کردنی ئادەمیزادە بـۆ ئـەو تەعالیمـە گونجاوە صاڵحانە کـە بەختەوەری هەردوو جیهانیان بۆ دەستەبەر دەکا...

ئەو رەوشتانەی قورئان فەرمانی پێ کردون هەموویان رەوشتی بەرزو شایانی مرۆڤن، ئەو رەوشتانەی کە فەیلەسووفو رۆشـنبیرەکانی جیهـان بانگـەوازییان بـۆ کـردوە، ئـەو رەوشـتانەی کـە ئەگـەر ئـادەمیزاد کاریـان پـێ بکردنایـە گـەورەترین خێـرو بێریـان بـۆ جیهـانی شـێواویان دەهێنـا! بـە پێـچەوانەشەوە ئـەو رەوشـتە نزمانەی قورئان نـەهی لێ کـردوون هـەر هـەموویان هۆکـاری کێـشەو دوژمنایـەتی نێـوان کۆمــەڵو هــیچ دڵـسۆزێك بـۆ گـەلو نیـشتمانو مرۆڤایـەتی گومـانی لـە زیانیاندا نییە.

## بەردەوامیی لەسەر کاری چاك و پاڵفتەکردنی دەروون:

ئادەمیزاد لە ژیاندا دوو هۆکارو عامیلی خێرو شەڕ کێشەی لەگەڵدا دەکەن، زۆر جار وا دەبێ بەهۆی هەڵنەرێکی ناوەکی یان کاریگەریەکی دەرەکی بەلای یەکێ لەم دوو عامیلە – خێر یان شەڕ – لا سەنگ دەبێ‌و مەیلی لایەکیان زیاتر دەکا، ئاینیش مەبەستی سەرەکی پاراستنی ئادەمیزادە لە هۆکاری شەڕو هەردەم خەریکی رونکردنەوەی لایەنەکانی شەڕو ترساندنی ئادەمیزاد لێی‌و بانگی ئەوانە دەکا کە گیرۆدەی شەڕ بوون بۆ وازهێنان، لە خراپەکاری‌و دەستکردن بە کردەوەی چاك‌و بەردەوام بوون لەسەری بەو شێوەی کە پەروەردگار بۆ بەندەکانی داناوە.

بەردەوام بوون لەسەر کاری چاك بەهێزترین هۆکارە بۆ گەشەی ئەدەب‌و ئەخلاق، هەر کاتێکیش ئەم حەزە لەناو گەل‌و هۆزێکدا گەشەی سەند حاڵیان باش دەبێ‌و ئاشتی‌و تەبایی لە ناویاندا بڵاو دەبێتەوە، مرۆڤ ئەگەر ئەم حەزی بەردەوام بوون لەسەر چاکەیەی نەبوو، روکردنە خێرو کرداری چاکی کەم دەبێتەوەو دەبێتە کەسایەتیەکی زەبوون‌و بە ئاسانی هەڵدەخەڵەتێ‌و لەگوناهەوە دەگلێ. بۆیە دەبینین ئایینی ئیسلام گرنگی تایبەتی داوە بە بەردەوام بوون لەسەر کرداری چاك‌و بە ئوسلوبێکی وا بانگەوازی بۆ کردوە کە حەزو ئارەزۆ لە دەروونـدا دروێنێ‌و کار لە ناخی دڵ دەکا بەهۆی ئەو وادەو بەڵێنەی داویەتی بەوانەی لەسەر کرداری چاك بەردەوامن کە بریتییە لە پاداشت‌و خێرو چاکەی دونیاو قیامەت، خودا دەفەرموێ:

{إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ، نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ - سورة فصلت – ٣٠-٣١}.

واتە: ئەو بەندە راستاڵانەی کە دەڵێن پەروەردگاری ئێمە (الله)یە ئەمجار وێڕای ئەم بڕوایەیان بەردەوامن لەسەر کردار چاکیی، ئەوانە خۆشەویستی خودان‌و کاتێك کە دەمرن فریشتەی رەحمەت دێنە سەریان پێیان دەڵێن: مەترسن‌و خەم مەخۆن مژدەتان لێبێ بەو بەهەشتەی کە بەڵێنتان پێدراوە،

ئێمە خۆشەویستی ئێومین لە دنیاو قیامەتدا... بۆ ئێوە هەیە لە بەهەشتدا چی حەزتان لێبێ‌و ئارەزووی بکەن، ئێوە میوانی پەروەردگاری لێبوردوو بە بەزەیین.

لە ئایەتێکی تردا پەروەردگار ئەوانە دڵنیا دەکاو دەفەرموێ:

{إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ - سورة الأحقاف -١٣}.

واتە: ئەوانەی دەڵێن: پەروەردگاری ئێمە (الله)یە ئەمجار بەردەوامن لەسەر کرداری چاك، هیچ ترسی سزای قیامەتیان نیەو پەرۆشی ماڵ‌و دارایی‌و جێگەو مەکان‌و ژن‌و منداڵی بەجێ هێڵراویان نییەو دڵخۆشن بەو بەش‌و بارەی پێیان دراوە.

پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەرو عەرزیکرد ئەی پێغەمبەری خودا! ئامۆژگاریم بکە، لە وەڵامدا پێغەمبەر بەرستەیەکی کورت وەڵامی دایەوە پێی فەرموو: (قل آمنت بالله ثم استقم) بڵێ بڕوام بە خوداو هێناوەو ئەمجار بەردەوام بە لەسەر ئەو بیرو باوەڕەو هەرشتێکی لەسەرەنجامی ئەو بیرو باوەڕە سەر هەڵدەدا.

## پاڵفتەکردنی دەروون:

بڕێ لەو شتانەی کە لەگەڵ مانای ئیستیقامەو یەك لاییدا دەگونجێ پاڵفتەکردنی نەفس‌و دەروونە، چونکە روچوون‌و پێداگرتن لەسەر شەڕ سەردەکێشێ بۆ خراپترین ئاکام، کاریگەری خراپ لەسەر نەفسی ئادەمیزادو لەسەر کۆمەڵ دروست دەکا. بۆیە پەروەردگار بەڵێنی لێخۆشبوون‌و رەزامەندی خۆی بەو کەسانە داوە کە دەروونی خۆیان پاڵفتە دەکەن‌و دەفەرموێ:

{فَمَن تَابَ مِن بَعْدِ ظُلْمِهِ وَأَصْلَحَ فَإِنَّ اللَّهَ يَتُوبُ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ - سورة المائدة – ٣٩}.

کەسێك دوای ئەنجامدانی تاوانو ستەمکاریی تۆبەی کردو خۆی راستاڵو باش رەفتارکرد ئەوە بابزانێ خودا تۆبەکەی لێ وەردەگرێ، بێگومان پەروەردگار لێخۆشبوو خاوەن بەزەییە.

لە ئایەتێکی تردا پەروەردگار بانگەوازی کۆمەڵی ئادەمیزادی کردوە دەفەرموێ:

{يَا بَنِي آدَمَ إِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِي فَمَنِ اتَّقَى وَأَصْلَحَ فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ - سورة الأعراف – ٣٥}.

ئەی ئادەمیزاد! هەرکاتێ پێغەمبەرێك هاتە سەرتانو ئایەتی ئێمەیان بۆ خوێندنەوە، بڕوای پێ بکەنو شوێنی بکەون! ئەوە بزانن هەر کەسێ لەئێوە تەقوای خودای کردو ڕاستاڵو صالح بوو، ئەوە هیچ ترسیان لەسەر نییەو لە ترسو بیمی رۆژی قیامەت دڵنیانو پەرۆشی دوا خۆیان نییە، پەرۆشی ماڵو دارایی و کوڕو کچو خێزانیان نییە.

شتێکی تر کە لەگەڵ ئیستیقامەدا دەگونجێ پاڵفتەکردنی دەروونە، پاککردنەوەی دڵو دەروون لە چڵكو پۆخەڵی ماددەو بەرزکردنەوەی نەفس لە رەوشتە نزمەکانو دانانی لە شوێنێك کە شیاوی بێو ڕێزی زیاد بکا رەزامەندی خودای تێدا دەستەبەر ببێ وێڕای دەستەبەرکردنی ڕێزی لەناو خەڵکدا!!

بێگومان قورئانی پیرۆز خەڵکی هەڵناوە بۆ پاڵفتەکردنی نەفسو بەڵێنی داوە بە ڕزگاربونیانو دەفەرموێ:

{قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّى - سورة الأعلى – ١٤}.

رزگاری بووە ئەو کەسەی دەروونی خۆی مشتو ماڵ کردبێ لە گوناه پاڵفتەی کردبێ، یان دەفەرموێ:

{قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا، وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا - سورة الشمس – ٩-١٠}.

پەروەردگار ئەوەشی رون کردۆتەوە کە سوودی پاڵفتەکردنی نەفس بۆ خاوەنەکەی دەگەڕێتەوە بۆیە پێویستە هەمیشە هەوڵی پاککردنەوەی نەفس بدەین.

{وَمَن تَزَكَّى فَإِنَّمَا يَتَزَكَّى لِنَفْسِهِ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ - سورة فاطر – ١٨}.

واتە: کەسێك نەفسی پاك بکاتەوە سوودو قازانجی بۆ خودی خۆیەتیو بۆ خۆی لێی بەهرەمەند دەبێ، گەڕانەوە هەر بۆلای خودایە.

بێگومان ئیستیقامەتو پاڵفتەکردنی دەروون دوو رەوشتی وەهان کە دەرگای هومێد لەسەر ئەوانە دەکەنەوە کە گیرۆدەی گوناه بوون، بۆ ئەوەی سیستەمی ژیانی خۆیان بگۆڕن بۆ شێوەیەکی باشترو ناهومێدیو رەشبینی لە دەروونی خۆیان دەربهاون، چونکە نائومێدیو رەشبینی ئەگەر لە دەروونی هەر کەسێکدا جێگیر بوون دەیکەنە بورکانێکی شەڕو شیرازەو شێوازی کۆمەڵ تێك دەدەن.

ئەم تەعلیماتانەی باسکران هەموو زانیاری زانراوی دەروونناسی تازەبابەت کورتو کۆ دەکاتەوە کە دەڵێ: هەرگیز ناگونجێ کەسی سەرکەتوو یان رەوشتی بەرز لە رێگەی تێفکرینی رووتەوە سەرهەڵدا، بەڵکوو لە رێگەی راهێنانو رامکردنی نەفسو پاڵفتەکردنو سەیتەرەکردن بەسەریدا دەستەبەر دەبێ.

## کردار چاکی (الإحسان):

ئیحسان کە بەمانا کردار چاکییە بەخششو یارمەتی دەگەیەنێ بەلام لە راستیدا زیاتر لە مانایەك هەڵدەگرێ چونکە ئێمە کە سەیری فەرهەنگی زمانی عەرەبی دەکەین دەبینین (أحسن) کە وشەی ئیحاسن لەو وەرگیراوە بەمانا (کردەوەی چاکی کرد) نە بە پێچەوانەی (أساء) کە بەمانا خراپەکردنە وشەی (الحسنة)ش بریتییە لە کردەوەی چاك.

کردەوەی چاك هەموو ئیشێکی باش دەگرێتەوە، هەر کردارێك شانی مرۆڤ بەرزبکاتەوە دەروونی ئادەمیزاد مشتو ماڵ بکاو لە خودای خۆی نزیکی بکاتەوە بە کردەوەی چاك دەژمێردرێ، لەبەر ئەوەیە دەبینن قورئانی پیرۆز زوربەی ئامۆژگارییەکانی بریتییە لە بانگەوازی کردن بۆ کردەوەی چاكو کردار چاکیی، بێگومان تەعلیماتی قورئانی پیرۆز دەربارەی ئیحسان گەواهی ئەوەیە کە ئەو قورئانە کتێبێکی روحییەو ئەو پەڕی پلەی بەرزی گرتووەو بەسەر هەموو

ڕێبازێکی ئەخلاقیو ئایینیدا زیادەی هەیە. زۆر بە باشی مەسەلەی ئیحسانی چارەسەرکردوە، بە جۆرێك کە کاربکاتە سەر کەسایەتی ئینسان خۆیەوەو هەڵنەری بێ بۆ ئیشکردن، زۆر بە باشی نیشانەی چاکەکارانی شی کردۆتەوە، دەستنیشانی ئەو کۆمەڵانەی کردوە کە شایانی ئیحسانن‌و زیاتر پێویستیان بە ئیحسان هەیە.

بانگەوازی کردوە بۆ بڵاوبوونەوەی ڕەوشتی ئیحسان چونکە ئەو صیفەتە بۆ مرۆڤایەتی خۆشبەختی دێنێتە کایەوە، بەرز ڕەوشتی دەست دەخا، هەر بۆیەشە کە لە کۆنەوە هەتا ئێستا فەیلەسووف‌و زانایانی ئاشتیخواز بانگەوازییان بۆ کردوەو لە پێناویا کۆشش دەکەن.

## پلەی ئیحسان لە ئیسلامدا:

قورئانی پیرۆز ئەوەی رون کردۆتەوە کە چاکەکاری پێویستییەکی سروشتییە بۆ کۆمەڵ، ئادەمیزاد بەبێ ئیحسان ناژی، هەروەها ئەوەشی گەیاندووە کە پێویستە ئادەمیزاد چاکە لەگەڵ خەڵکدا بکا وەکوو چۆن خودا چاکەی لەگەڵ ئەودا کردوە کە لەفەزلی خۆیەوە ئەو هەموو نازو نیعمەتەی بەسەردا ڕشتووە:

{وَأَحْسِن كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ - سورة القصص – ٧٧}.

قورئان ئەوەشی چەسپاندووە کە چاکەکردن خێرو بێرەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مرۆڤەکە خۆی‌و ئەو سوودی لێ دەبینێ. خودا بۆ خۆی دەفەرموێ:

{إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا - سورة الإسراء – ٧}.

واتە: ئەی گرۆهی ئادەمیزاد ئەگەر چاکە بکەن، پاداشی چاکەکە بۆ خۆتان دەگەڕێتەوە ئەگەر خراپەش بکەن خۆتان سزادەدرێن، ئەمەش ڕاستییەکی بەڵگە نەویستە چونکە چاك کرداران هەست بە ئارامییەکی دەروونی دەکەن‌و ئارامییەکی وا ڕویان تێ دەکا کە جگە لە خۆیان کەسی تر ئەو هەستە ناکا. هەر ئەندە بەڵگەیە کە چاکە لەگەڵ کراوان لە بەرامبەر چاکەکەیاندا خۆشەویستییان بۆ لەدڵ دەگرن‌و بەچاوی ڕێزەوە سەیریان دەکەن ئەمەش خۆشی‌و ئارامی

دەخاتــە دڵیانــەوە، کەچــی بــە پێــچەوانەوە خراپــەکاریی خاوەنەکــەی واڵێ دەکـا بەچاوی سووك سـەیری بکـرێو خۆشـی لـە ژیـانی نـەبینێ، هـەر لەبـەر ئەوەشـە خـودای گـەورە فـەرمان دەکـا بەخەڵـك کـە چـاکە بکـەنو چـەند جـارێکیش فەرمانەکەی دووپات دەکاتەوەو دەفەرموێ:

{إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاء ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ - سورة النحل – ٩٠}.

واتـە: خـودا فـەرمانتان پـێ دەکـا بـە عەداڵـەت خـوازیو دادپـەروەریو چـاکە کردنو بەجێهێنانی پەیوەنـدی خزمایـەتیو هـاتوو چـۆی یـەکتری کـردن، هـەموو کـاتێکیش بـەرگری دەکـا لـە خراپـەکاریو داوێنپیـسیو زیـادەڕەویو سـتەمکاری، هــەروەکوو چــۆن قورئــانی پــیرۆز مــەنزڵی ئیحــسانی بەرزکردۆتــەوەو لەتــەك ئیخلاصدا کردوونی بە بەرزترین ڕەوشتی مرۆڤی موسوڵمانو دەفەرموێ:

{وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لله وَهُوَ مُحْسِنٌ - سورة النساء – ١٢٥}.

واتە: کێ لەو کەسـە موسوڵمانترەو موخلیـصترە کـە گـەردن کەچـی خودایـەو کرداری چاکیش دەکا، واتە: هیچ کەسێك نییە هێندەی ئەو کەسە موسـوڵمان بـێ، بە دڵسۆزیی خۆتەسلیمی خودا بکاو هیچ خودای تر بەراسـت نـەزانێو لـە هـەمان کاتیشا کرداری چاك بکاو خۆی لە خراپە کاری رزگار بکا.

لــە شــوێنێکی تــردا پــەروەردگار پــاداشو ئاکــامی چـاکەکردن بــەیان دەکـاو دەفەرموێ:

{وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى -سورة لقمان – ٢٢}.

واتە: کەسێك خۆی تەسلیمی خـودای خـۆی بکـاو چاکە کـاریش بـێ بەراسـتی دەسـتی بـە باشـترین ئەڵقـەو قـایم تـرین قوڵفـە گرتـووەو چاکترین هۆیەکـە بـۆ وەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودا.

لە شـوێنێکی تـردا پـەروەردگار خەڵـکی هـەڵناوە بـۆ چـاکە کـردنو تـەماعی بەرناونو دەفەرموێ:

{مَن جَاء بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا - سورة الأنعام – ١٠٨}.

واتــە: هــەر کەســێك چــاکەیەك بکــا دە چــەندانە پاداشــی هەیــە هــەروەها پەروەردگار بەڵێنی داوە بە چاکە کاران بەوە کە لە ڕۆژی قیامەتا شوێنی خۆش‌و ئاسایش‌و گونجاویان بۆ دابین دەکا:

{وَمَن جَاء بِالسَّيِّئَةِ فَكُبَّتْ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ - سورة النمل – ٨٩}.

## ڕەوشتی باش کرداران:

بەشێك لە ڕەوشتی باش کرداران کە لە قورئاندا پیاندا هەڵدراوە ئەوەیە کە زوربەی شەو بێدارن‌و خەریکی شەو نوێژن، ئەمجار لە ئاخرو ئۆخری شەودا دەست دەکەن بە پاڕانەوەو لالانەوەو داوای لێخۆشبوون دەکەن لە خودای خۆیان. بەشێکی تر لە ڕەوشتی باشیان یارمەتیدانی فەقیرو بێ نەوایانە بە گوێرەی توانا یارمەتیان دەدەن خودا دەفەرموێ:

{إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ، آخِذِينَ مَا آتَاهُمْ رَبُّهُمْ إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ مُحْسِنِينَ، كَانُوا قَلِيلًا مِّنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ، وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ، {وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ - سورة الذاريات – ١٥-١٩}.

بێگومان خودا پەرستان لە بەهەشتا لەنێو باغ‌و سەرچاوەی ئاوی کانیاودا کات بەسەر دەبەن، بەخشش‌و عەتای خودای خۆیان وەردەگرن، ئەو خودا پێداوانە لەوەپێش چاکە کاربوون، شەوانە کەم دەنووستن، هەر خەریکی شەو نوێژ بوون پێش بەیانی‌و ئاخری شەو داوای لێخۆشبوونیان لە خودا دەکرد، بەشێکی دیاریکراویان لە ماڵ‌و دارایی خۆیان دادەنا بۆ فەقیرو هەژاران.

کۆشش کردن لە ڕێگای خودادا بە گیان‌و ماڵ بەشێکە لە ئیحسان خودا دەفەرموێ:

{وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ - سورة العنكبوت – ٦٩}.

واتــە: ئەوانــەی کۆششیان کـردوە لـە پێنـاو ئـایینی ئێمـە بـەبێ شـكو گومـان شارەزای رێبازی ڕاستیان دەکەین بێگومـان خـودا لەگـەڵ چاكە کاراندایـە. شـوێن کـەوتنی ئـایینی پێغەمبـەر حـەزرەتی (محمـد) (درودی خـودای لەسـەربێ) دەچـێتە خانـەی ئیحسانەوە خودا دەفەرموێ:

{وَالَّذِي جَاء بِالصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِ أُوْلَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ، لَهُم مَّا يَشَاءونَ عِندَ رَبِّهِمْ ذَلِكَ جَزَاء الْمُحْسِنِينَ - سورة الزمر – ٣٣-٣٤}.

واتـە: ئـەو کەسـەی کـە ئـایینی راسـتی هێنـاوە کـە حـەزرەتی (محمـد)ە ئـەو کەسـەش کـە بـڕوای پێکـرد – مەبەسـت ئـەو کەسـانەیە ئیمانیـان پـێ هێنـاوە – ئەوانە هەموویان تەقوا کارو خودا پەرستن چییان بوێ لای خودای خۆیـان بۆیـان دابین دەکرێ ئەو جۆرە پاداشانە پاداشتی خێر خواهو چاكە کارانە.

لێبوردن لە هەڵەی خەڵك بە ئیحسان دەژمێردرێ خودا دەفەرموێ:

{فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاصْفَحْ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ - سورة المائدة – ١٣}.

ئەی محمد! لە هەڵەی هاوەڵانت ببورەو لێیان خۆشبە چونكە لێبـوردن خێـر خوابیەو خوداش خێر خوای خۆش دەوێن... صـەبرو ئـارام بەشـێكە لـە ئیحـسان:

{وَاصْبِرْ فَإِنَّ اللّهَ لاَ يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ - سورة هود – ١١٥}.

واتـە: لـە تەنگانـەدا بـە صـەبرو ئـارام بـە، بێگومـان پـەروەردگارتان هـەرگیز پاداشتی خێر خواهان بە فیڕۆنادا سەیرکە چۆن قورئان خەڵك هەڵدەنێ بۆ خێر خواهیو بەڵێنیان دەداتێ بـە باشـترین پاداشـێك کـە نەفـسی ئـادەمیزاد ئـارەزۆری دەکـا. ئـەم دڵخۆشـی دانەوەشـی لـەم روەومیـە کـە خێـر خواهـان خـاوەنی هەسـتی ناسكو وێژدانی زیندون، دەشێ لە پێناوی بانگـەوازیو کۆشـشی خێـر خواهییانـدا توشی دەها تەنگو چەڵەمە ببنو گەلەکەیان سەرپێچییان بکـەن یـان رۆژگـار بـە پێچەوانەی ویـستی ئەوانـەوە بـسورێتەوە، بۆیـە دەبیـنین. قورئـان پـێش دەسـتی دەکاو ئامۆژگاریی خۆی ئاراستەی ئادەمیزاد دەکا، بۆ ئەوەی دڵنەواییان بكاو بـاری خەفـەتیان لەسـەر سـووك بكـاو مزگێنییـان بـداتێ بـە رەزامەنـدی خـوداو

خێرخواهان بەهێزێکی مەعنەوی بەهێز بکا، دڵیان داسەکنێ قاچیان لە گۆرەپانی کۆشش دا پێ بچەقێنێ.!!

هەروەکوو چۆن ئیسحان پێویستی بە قوربانیدانو بەر بەرەکانی نەفس هەیەو دەبێ هەرگیز نەهێڵی بکەویە داوی نەفسەوە، چونکە نەفس هەر فەرمان بە خراپەکاریی دەکا جا بۆیە دەبینین پەروەردگار ئادەمیزاد تەرغیب دەکا بۆ چاکەکردنو هەڵیان دەنێ بۆ خێرخواهی لەو رووەوە کە چاکەو پاداشتی ئیحسان رێز دەکاو دەیەوێ نەفس رام بکا بۆ کردنیو خۆ پێوە خەریککردنی.

## شایانترین کەسانێك کە پێویستە چاکەیان لەگەڵدا بکرێ:

قورئانی پیرۆز کۆمەڵێکی ئادەمیزاد دەست نیشان کردوە بەوە کە شایانی چاکە لەگەڵدا کردنو لەکەسانی دیکە شیاوترو شایانترن بۆ چاکە لەگەڵدا کردن، ئەوان پێش هەموو کەسێك دەخرێن پێش هەموو ئەوانەش باوكو دایکن، چونکە باوكو دایك لە هەموو کەس زیاتر فەزڵو پیاوەتی بەسەر مرۆڤەوە هەیە، جا قورئان هەر بەوەندە کە داوای چاکەکردنی لەگەڵ باوكو دایکا کردوە وازی نەهێناوە بەڵکوو چۆنییەتیو شێوەی رفتار لەگەڵ داکردنیانو هەستانو دانیشتنو تێکەڵاوییانی رونکردۆتەوەو سنوورێکی تایبەتی بۆ داناون، بە جۆرێك کە ئەو پەڕی پلەی رەوشت بەرزیمان نیشان دەدا باشترین شێوەی ئاکارو رفتاری رۆژانەمان لەگەڵ باوكو دایکدا بۆ دیاری دەکاو دەفەرموێ:

{وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيمًا، وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا - سورة الإسراء – ٢٣-٢٤}.

واتە: یەکەم شتێك کە ئێمە لەم دەقە قورئانییە دەرکی دەکەین ئەوەیە: کە پەروەردگار چاکەکردنی لەگەڵ باوكو دایکا کردوە بەهاوشانی عیبادەتو خودا پەرستی، ئەمجار هاتووە جۆری ئەو چاکەکردنەی دەسنیشان کردوە بە تایبەتی

کە دایكو باوك هەردوكیان یان یەكێكیان دەگەنە حاڵی پیریو زەبوونی زیاتر پێویستیان بە پارمەتی دانو دڵنەوایی هەیە.

پەروەردگار فەرمانی بە ئادەمیزاد كردوە كە بەگوێرەی ئەم پێنج خاڵانەی خوارەوە رفتار لەگەڵ دایكو باوكدا بكا.

أ) ئۆفكردنو ڕوگرژی لە ئاستیان نەكاو دادو بێدادی خۆی بەرامبەریان دەرنەبڕێ.

ب) نابێ لە رویانا بەتوندی بجووڵێتەوەو قسە رەق بێ بە جۆرێك دڵیان گەرد بگرێ.

ج) دەبێ ئاخاوتنی لەگەڵیاندا نەرمو نیان بێ قسەخۆش بێ لە خزمەتیانداو رێزیان لێ بگرێ.

د) دەبێ لە خزمەت باوكو دایكا ئینسان گەردن كەچیو سۆزی فرزەند نیشان بدا، پەروەردگار بۆ ئەمە نموونەی باڵندەیەكی هێناوەتەوە كەهەر كاتێ ئەو باڵندە ویستی بێچوەكانی كۆ بكاتەوەخێرا باڵیان بۆ بڵاو دەكاتەوەو بە سۆزەوە دەیانخاتە ژێر باڵی خۆیەوە.

هەروەها هەموو كات نزا بكا لە خودا كە رەحمیان پێ بكاو بەزەیی پێدا بێنەوە وەكوو چۆن ئەوان كاتی خۆی ئەمیان بەمنداڵی بەخێو كردوە باڵی سۆزو عەتفیان بۆ بڵاو كردۆتەوە.!؟

قورئانی پیرۆز بری خەڵكی تریشی تایبەت كردوە بۆ چاكە لەگەڵكردن لەم روەوە كە لە نێوان چاكەكەرانو چاكە لەگەڵكراواندا پەیوەندییەكی تایبەتی هەیە وەكوو پەیوەندی هاوسێیو پەیوەندی خزمایەتی، یان چاكەكردن لەگەڵ كەسانێك كە پارمەتدەرو پاڵپشتو بەخێوكەریان لەكیس چووبێ، یان هەر لەسەرتاوە بێ كەسو كارنو بێ نەواو پارمەتیدەرن، ئەو جۆرە كەسانە زیاتر پێویستە چاكەیان لەگەڵدا بكرێ. خودا دەفەرموێ:

{وَاعْبُدُواْ اللّهَ وَلاَ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَبِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَالْجَارِ ذِي الْقُرْبَى وَالْجَارِ الْجُنُبِ وَالصَّاحِبِ بِالجَنبِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالاً فَخُورًا - سورة النساء - ٣٦}.

واتە: ئەی گروهی ئادەمیزاد! عیبادەتی خودا بکەن‌و سەری بەندایەتی بۆ بخەنە سەر زەوی هاوەڵو شەریکی بۆ بڕیار مەدەن‌و کەس مەکەن بە هاوشانی لەگەڵ باوك‌و دایکتانا چاکەو ئیحسان بکەن، هەروا چاکەو پیاوەتی لەگەڵ خزم‌و هەتیوو فەقیرو هەژاراو هاوسێی خزم‌و هاوسێی بێگانەو هاوڕێی سەفەرو خوێندن‌و فێربوونی پیشەسازی‌و هاوسەری ژیان (ژن‌و مێرد)و ڕێبوارو بەندەو نۆکەرو خزمەتچی خۆتان بکەن‌و دەستی یارمەتییان بۆ درێژ بکەن.

بێگومان ئەم ئایەتە پیرۆزە هەموو جۆرەکانی چاکەو ئیحسانی کۆکردۆتەوە، بە شێوەیەك ئەگەر ئادەمیزاد پەیڕەوی ئەم فەرموودەیە بکەن خێرو خۆشی دەکەوێتە ناویان‌و هەموو تاکەکانی کۆمەڵ وەگری یەکتر دەبن‌و یەکیەتی‌و یەکسانی‌و خۆشەویستی دەکەوێتە ئاراوە. سەیر بکە چۆن قورئان بناغەی کۆمەڵی بەختەوەر دادەڕێژێ‌و شیرازەی لێ دەنێ! سەرەتا فەرمانیان پێ دەکا کە خودا بە تاك‌و تەنها بزانن‌و هاوبەشی بۆ دانەنێن، ئەمجار چاکە لەگەڵ باوك‌و دایکیان‌و خزم‌و کەس‌و کاریان بکەن. بەم جۆرە کۆمەڵ صالح دەبێ‌و خۆشەویستی لە نێویان دا بڵاو دەبێتەوە. چونکە کۆمەڵ پێکهاتووە لە چەند خێزانێك، ئەمجار پەروەردگار فەرمان دەکا بە چاکەکردن لەگەڵ هەتیوان چونکە ئەوان باوکیان لەکیس چووەو بەرێکەوت نەبێ دایکیان ناتوانێ بەخێویان بکا.

خۆ ئەگەر هەتیوی بێ باوك پاش گوێ بخرێ خوێڕی دەردەچێ‌و بوونی دەبێتە زەرەو زیان بۆ کۆمەڵ.

هەروەها پەروەردگار فەرمانی کردوە بە چاکەکردن لەگەڵ هاوسێی خزم‌و هاوسێی بێگانە، بەوەش خۆشەویستی لە گەڕەك‌و گوزەرا بڵاو دەبێتەوە هەمیشە پاڵپشتی یەکتری دەبن لەسەر کاری خێر، ئەمجار پەروەردگار داوای کردوە کە چاکە لەگەڵ هاوڕێدا بکرێ جا چ هاوڕێی سەفەرو گەشت‌و گوزاربێ. یان هاوڕێی

خوێنــدنو فێربــوونو ئــیشو کــارو بازرگــانی بــێ، چــونکە چــاکەکردن لەگــەڵ ئەمانــەش ســەر دەکێــشێ بــۆ صــەداقەتی پتــەوو بــەرو بــوومی بــاش بەرهــەم دەهێندرێ.

ئەمجار پەروەردگار وەسیەتی کردوە بە چاکەکردن لەگەڵ رێبوارێك کە ماڵو دارایی فەوتابێو هێشتا نەگەیشتبێتەوە وڵاتــی خــۆی هــەروەها داوای چاکەکردنی کردوە لەگەڵ ژێر دەستەی خۆیدا وەکوو بەندەو خزمەت کارو کارەکەر...تاد.

ســەیرکە چ خێــرو خۆشــییەك بــاڵ دەکێــشێ بەســەر ئــادەمیزددا هــەرکاتێ رەوشــتی چــاکەکاریو خێرخــوایی رەچــاو بکــەن، بێگومــان موســوڵمان هــەرکاتێ پــەیڕەوی ئــەم فەرموودەیــە بکــەن دەتــوانن ئــەو شارســتانییەتە خەیاڵییــەی فەیلەسوفەکان بە خەیاڵ دروستیان کــردوە بیهێننــە کایــەوە ئــەو شارەستانیەتەی کە ئیسلام لە سەرەتای پەیدابوونیا تەتبیقی کردوو لەژیانی کۆمەڵی ئسلامدا لەمەدینە پراوەی پێکردو — بەکردەوە — نەك بە قسە — بەکاری هێناوە.

## خودا پەرستیی (التقوی)و خۆپاراستن لە گوناه:

تەقواو خۆپاراستن لە گوناه رەوشتێکی بەرزی موسوڵمانییە، قورئانی پیرۆز کردوویەتی بە جەمسەری بەیەکەوە لکانی نێوان ئادەمیزادو مەخلووقاتی ترو پتەوکردنی نێوان ئادەمیزادو پەروەردگار! بۆیە دەبینین ئەم وشەی (تەقوایە) بەشێوەی چاوگ یان بەشێوەی تر، لە زۆر لە ئایەتەکانی قورئان کە لە بارەی ئەخلاقو رەوشتەوە، یان لە بارەی کۆمەڵایەتییەوە، دەدوێن تێکەڵکیش کراوە، مەبەستی سەرەکی لە تەقوا ئەوەیە کە ئادەمیزاد خۆ بپارێزێ لە شتێك کە پەروەردگاری عاجز بکا یان شتێك زەرەرو زیانی بۆ خۆی ببێ یان بۆ غەیری خۆی.

تەقوا لە بنەمادا بەمانای ئەوەیە خۆت بخەیە پەناگاوە، ئاشکراشە نەفس ناخەیە پەناگاوە تاترسی شتێکت نەبێ کەوابوو ترسی خودا بناغەیە بۆ تەقوا، ترسی خودا سەر دەکێشێ بۆ ناسینی خودا خۆشی.

خودا پەرستان (تەقواکاران) ئەو کەسانەن کە نەفسی خۆیان لە سزای خودا دەپارێزن لە دونیاو قیامەتدا، هەرگیز لە سنوری فەرمانەکانی تێپەڕ ناکەن گوێ رایەڵی ئەمرو ویستی ئەون‌و خۆیان دەپارێزن لەو شتانەی نەهی لێ کردوون‌و تاوان‌و هەڵەیان بە ئەنقەست لێ رونادا. ئاشکراشە خودای مەزن فەرمان ناکا بەشتێك خێری تێدا نەبێ‌و (نەهی)یش لەشتێك ناکا زەرەری نەبێ.

شایانی باسە قورئان ئەو پەڕی گرنگی داوە بە خودا پەرستی‌و تەقواکاری، لە زۆر شوێندا فەرمانی بە تەقواکردن کردوە رێبازی بۆ خۆش کردوە، بەچەند شێوازێکی جوێ جوێ مەردومی بۆ تەقواکاری هەڵناوە.

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ - سورة آل عمران – ١٠٢}.

واتە: ئەی خاوەن باوەڕان! تا دەتوانن تەقوای خودا بکەن‌و بەردەوام لەسەر ئایینی ئیسلام بن‌و لە رێبازی ئەو ئایینە لا مەدەن بۆ خاتری ئەوەی هەرکاتێ مردن گەییە سەرتان بە موسوڵمانی بمرن.

لەشوێنێکی تردا قورئان تەقوای داناوە بە پارێزەری نەفس لە هەرشتێك زەرەرو زیانی بۆی هەبێ. هەروەها دووری دەخاتەوە لەو شتانەی کە دەبنە بەرهەڵستی ئادەمیزادو ناهێڵن بگاتە ئامانجی بەرزو پیرۆزی ئەوتۆ کە لاشەو گیانی ئارایشت دەدەن. بۆیەکا پەروەردگار وەسفی تەقواکارانی کردوە بەوە کە ئەوان رازاونەوە بەرەوشتی بەرزی ئینسانی.

{لَّيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَـكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْمَلآئِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّآئِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُواْ وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاء والضَّرَّاء وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَـئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَـئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ-سورة البقرة – ١٧٧}.

واتە: چاکە بریتی نییە لەوە کە ئێوە روبکەنە رۆژهەلات یان رۆژ ئاوا، بەڵکوو چاکە چاکەی کەسێکە بڕوای بە خودا هەبێ، بڕوای بە رۆژی دوایی‌و فریشتەو نامە ئاسمانییەکان‌و پێغەمبەران هەبێ! هەروەها ماڵ‌و دارایی خۆی ببەخشێ – لەگەڵ ئەوەی کە خۆشی ئەوێ –و پێویستی پێیەتی بە خزم‌و کەس‌و کارو هەتیوان‌و بێ نەوایان‌و رێبواران‌و سواڵکەران، هەروەها داڵدەی بەندەکان بدا بۆ ئازادییان‌و رزگاربونیان لە کۆیلایەتی! هەروەها نوێژ بکات‌و زەکات بدا.

هەروەها ئەوانەی کە پەیمان دەدەن‌و پابەندی پەیمانەکەیان دەبن. ئەوانەش کە خۆڕاگرن لەکاتی تەنگ‌و چەڵەمەو نەخۆشی‌و دەمی جەنگ‌و هەرا لەگەڵ دوژمنی ئایینـدا، جا ئەوانەی کە ئەمە خوو رەووشتیان بێ ئەوانە مرۆڤی راستاڵ‌و خوا پەرستن راست گۆبوون لەبیرو باوەڕیاندا هەر ئەوانیش پارێزگارو تەقواکارن پەروەردگار وەسفی بە تەقواکار کردوون.

جا وەنەبێ تەقوا لە قورئاندا بریتی بێ لەو رەوشتانەی باس، کران‌و بەس بەڵکوو چەند رەوشتێکی تریش هەن کە تەقوا دەیانگرێتەوە. وەکوو دادپەروەری (عەدالەت) خودای پەروەردگار دەفەرموێ:

{اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى - سورة المائدة – ٨}.

واتە: دادپەروەرو عەدالەت کردار بن چونکە دادپەروەری نزیکترین رەوشتە لە تەقواکاری.

رەوشتێکی تری تەقواکردن لێبوردن‌و عەفوکردنە، خودا دەفەرموێ:

{وَأَن تَعْفُواْ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى - سورة البقرة – ٢٣٧}.

واتە: واز لە مافی خۆت بێنی‌و بەرامبەرەکەت عەفو بکەی ئەم هەڵوێستە رەوشتێکی بەرزەو داخڵی تەقوا دەبێ نزیکترە بۆ پارێزگاری ئەو سنوورەی خودا داناوە.

ڕەوشتێکی تر لە تەقواکاری بەردەوام بونە لەسەر کاری خێرو خۆڕاگرییە لەسەر وەعدو پەیمان‌و ڕێککەوتننامە لەگەڵ دوژمندا خودا دەفەرموێ:

{فَمَا اسْتَقَامُواْ لَكُمْ فَاسْتَقِيمُواْ لَهُمْ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ-سورة التوبة/٧}.

واتە: هەتا ئەوان –دوژمنانتان– وەفا بەعەهدو پەیمانی خۆیان بکەن‌و ڕێککەوتننامەکە پێشێل نەکەن ئێوەش وەفا بە عەهدەکە بکەن، چونکە ڕاگرتنی عەهدو پەیمان بەشێکە لە تەقواکاری، خوداش تەقواکارانی خۆش دەوێن.

## بەروبوومی تەقواو خودا پەرستی:

قورئانی پیرۆز ئەوە دەگەیەنێ کە تەقوا مرۆڤ دەخاتە ناو قەڵای ئەمن‌و ئاسایشی ڕۆژی قیامەتەوە لە ژیانی دونیاشدا یارمەتدەرو بەهانا هاتووی دەبێ.

{أَلا إِنَّ أَوْلِيَاء اللّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ، لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَياةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ لاَ تَبْدِيلَ لِكَلِمَاتِ اللّهِ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ - سورة يونس – ٦٣-٦٤}.

واتە: هۆشیاروەبن موسوڵمانان‌و خوا پەرستان ئەوانەی بەرگرییان لە ئایینی خودا کردوە لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ ترس‌و بیمێکیان نییەو غەم‌و نارەحەتی ڕوویان تێ ناکا... ئەو موسوڵمانانەی ئەوتۆ کە ئیمانیان بەخوداو پێغەمبەر هێناوەو تەقواو خۆ پارێزییان لە عەزابی خودا کردوە ئەوانە لە ژیانی دونیاو قیامەتدا مزگێنی ئەمن‌و ئاساییشیان پی دەدرێ‌و دڵنیا دەکرێن.

بەشێکی تر لە بەروبوومی تەقواکاری پاداشی هەرە گەورەی بەهەشتەو گەیشتنی بە ئارەزوو نیعمەتی ئەو دونیایە.!

{لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ-سورة آل عمران/١٥}.

واتە: هەیە بۆ ئەوانەی تەقوای خودایان کردوەو خودا پەرست بوون، چەند باخ‌و باخاتێك کە لە ژێریانەوە جۆگەو جۆبار دەکشێن.

بەشێکی تر لە بەرو بوومی تەقوا وەدەسهێنانی ڕەحمەتی خودایە.

{وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ - سورة الأعراف – ١٥٦}.

واتە: ڕەحمەتو سۆزم بەشی هەموو کەس دەکا، ئەم ڕەحمەتە فراوانە تەرخان دەکەم بۆ ئەوانەی تەقوای خودا دەکەن زەکاتیماڵو دارایی خۆیان بەرێكو پێکی دەردەکەن، ئەوانەی کە بڕوایان بە نیشانەکانی خودایەتی ئێمە هێناوەو گەردنکەچی فەرمانمانن.

لە شوێنێکی تردا قورئان تەقوا دەکاتە هۆی لاچوونی غەمو نارەحەتیو شی کردنەوەی گرێ کوێرکەی ژیانو حەلکردنی موشکیلەو دەفەرموێ:

{وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا، وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ - سورة الطلاق – ٢-٣}.

واتە: کەسێك تەقوای خودا بکا خودا لە زۆر موشکیلەو تەنگو چەڵەمە ڕەهای دەکاو رزقو ڕۆزیشی دەداتێ بە جۆرێك کە ئەوشتە دەبێتە هۆی بژێوی ئەو. یان دەفەرموێ:

{وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مِنْ أَمْرِهِ يُسْرًا - سورة الطلاق – ٤}.

کەسێك تەقوای خودا بکا خودا بە لوتفی خۆی ئیشو کاری بۆ دەسازێنێ.

لە شوێنێکی تردا خودای مەزن لە سۆنگەی ڕانواندنی یارمەتیو کۆمەگ پێکردنی خۆی بۆ خودا پەرستان دەفەرموێ:

{إِنَّ الأَرْضَ لِلّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ - سورة الأعراف – ١٢٨}.

واتە: زەوی هەمووی هی خودایەو موڵکی خۆیەتی بە ئارەزۆی خۆی دەیدا بەو بەندانەی شیاوی بن سەرەنجامی خۆشیو خۆشبەختیش بۆ تەقواکارانە. لە شوێنێکی تردا بە مەبەستی هۆشیار کردنەوەی دڵو دەروون دەفەرموێ:

{يِا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إَن تَتَّقُواْ اللّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَاناً-سورة الأنفال/٢٩}.

ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هەیە! ئەگەر تەقوای خودا بکەنو پارێزگاری سنورەکانی بکەن خودا لە پاداشی ئەو هەڵوێستەتاندا چاوی دڵتان ڕۆشن دەکاتەوە

چاکەو خراپە لێك جیا دەکەنەوە زەرەرو زیانی خۆتان دەزانن‌و دڵ هۆشیارو چاو کراوە دەبن. کەوابوو بەرو بوومی تەقوا بریتییە لە بینایی چاوی دڵ‌و هۆشمەندی بەجۆرێك کە بە تەواوی حەق‌و ناحەق لێك جیابکاتەوە، راست‌و چەوت دەستنیشان بکاو رێگای رزگاری‌و سەرفرازی هەڵبژێرێ ئا ئەوەیە تەقواو، ئەوانەیە رەوشتی تەقواکاران‌و بەرو بوومی لەناو کۆمەڵدا سودو خێرو بێری بۆ تاك‌و کۆمەڵ.

کەوابوو سەیر نییە کە قورئانی پیرۆز ئەو هەموو گرنگییە بدا بە تەقواو تەقواکاری ئەو هەموو بانگەوازییە جۆراو جۆرەو بەڵێنانەی بۆ هەڵدا.

{وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى - سورة البقرة – ١٩٧}.

واتە: تێشوو هەڵگرن بۆ دواڕۆژتان چونکە بەراستی باشترین تێشوو پاشەکەوت تەقواو تەقواکاریە.

خۆ ئەگەر ئادەمیزادی ئەمڕۆ تەقواناس بونایەو بیانزانیایە سوودی تەقوا چییەو چی نیەو پێویستی سەرشانی خۆیان بەرامبەر بە تەقوا ئەنجام بدایە بێگومان ئاگری شەڕو ئاژاوە دەکوژایەوەو سەلام‌و ئەمن‌و ئاسایش باڵی پیرۆزی بەسەر زەویدا دەکێشا.

## صەبرو خۆڕاگری (الصبر):

صەبرو دان بەخۆدا گرتن بەشێکە لە رەوشتی بەرزو هەناسەیەکی گیانییەو کزەبایەکی فێنکی بەرەبەیانە، موسوڵمان خۆی بەردەداو لێی هەڵدەمژێ تا ئازاری ناخۆشی لێ سووك بکاو ئارامی‌و دڵنیایی بخاتە دڵیەوەو ببێتە مەرهەمی سەربڕینی، ئێش‌و ئازاری لێ دووربخاتەوە.

مرۆڤی خاوەن صەبرو ئارام بە دڵنیاییەوە بەرەنگاری تەنگ‌و چەڵەمەی ژیان دەبێتەوەو بە دڵێکی فراوانەوە وەریان دەگرێ‌و پێی وایە ئەم ناخۆشییانەی ژیانی ئامێری تاقیکردنەوەن‌و لە خواوەیەو ویستی ئەوی لەسەرە!

هـەر کـاتێکیش ئێمــە بــە وردی سـەیری بــەلاو موصـیبەت بکـەین بۆمـان دەردەکەوێ کە حیکمەتێکی یەزدانییە، ئەم ناخۆشیانەی ئاراستەی ئێمـەیان دەکا مەبەستێکی خودایيە. جا مرۆڤی نەزانو نەفام خۆی بۆ راناگیرێو دەست دەکا بە ئاخو ئۆفو سکالاو ناشوکری، بەلام ئینسانی عـاقڵو هۆشـیارو خـۆڕاگرو بەصـەبر چاوەڕوانی خێرو خۆشییەو پێی وایە ئەوە تاقیکردنەوەیەو خودا خۆشی دەوێ!!

ئەگـەر صـەبرو ئـارامی نەبوایـە هـەرگیز دڵـی ئـادەمیزاد خـۆی بـۆ بـەلاو موصـیبەت رانـەدەگرتو لـە بەرامبـەر روداوی رۆژگـاردا کۆڵـەوار دەبـوو، جـۆش دادەماو نەیدەتوانی لەگەڵ ژیانا رێڕەو بکاو دەبووە ئەنـدامێکی خراپو بێ سوودو هـەموو رەوشـتێکی جـوانو بـەرزی پێشێل دەکـرد ژیـانی لـەخۆیو کۆمـەڵی تـاڵ دەکرد!!

بەڵێ دەتوانین بڵێین صەبر پـەردەو جیاکەرەوەیـە لـە نێـوان ژیـانی مـاددیو ژیانی رۆحـی، بۆیـە قورئـانی پـیرۆز گرینگـی بەصـەبر داوەو مـەدحی کـردوەو لـە پلەی بەرز کردۆتەوەو رێزی لە ئارامگران ناوە؟! تەنانەت نزیکەی حەفتا جار لـە قورئاندا باسی صەبرو پلەی صابیران کـراوە، ئـەو گرنگیـەی بـە رەوشـتی صـەبری داوە بەهیچ رەوشتێکی تری نەداوە، ئەمەش ئەوە دەگەیـەنێ کە صیفەتی صـەبر زۆر گرنگـەو بناغـەی زۆر رەوشـتی تـرەو بەڵـکوو کـانو مـاکی هـەموو ڕەوشـتە بەرزەکانــە، چـونکە مەلەکـەی خێـرو باشـی لـە دەروونـدا دەخولقێنــێو هـەموو ڕەوشتێکی تر پێویستی پێیەتی، بۆ نموونە شەجاعەتو ئازایی برێتییە لە صـەبر گرتن لەسەر ناخۆشی ترسو بیمی شەڕو پێکادان. داوێنپـاکی بریتییـە لـە صـەبر گرتن لە بەرامبەر ئەو شتانەی دەبنـە هـۆی هەڵچوون. شـاردنەوەی قسـەو بـاسو پارێزگـاری نهـێنی بریتییــە لــە صــەبر گــرتن لەســەر بڵاونەکردنــەوەی ئــەو نهێنییانەی کە پێویسـتە نهێنـی بـن!! لەبـەر ئـەوە خـودای مـەزن خـاوەن صـەبرو ئارامەکانی خۆش دەوێنو لە قورئاندا بەڵێنی پێ داونو بەیانی کردوە کـە ئـەوان لە دونیاو قیامەتدا بەهرەمەند دەبنو رەحمەتی خودایان بەسەردا دەڕژێ!!

{إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ - سورة الزمر – ١٠}.

واتە: خاوەن صەبرو ئارامگرەکان پاداشی باشی تەواوی خۆیان بەبێ شومار دەدرێ پێیان.

{وَلَنَجْزِيَنَّ الَّذِينَ صَبَرُواْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ-سورة النحل/٩٦}.

واتە: هەر کردەوەیەکی خاوەن صەبرەکان گەورە بێ یان بچووك، وەکوو باشترین کردەوەیان پاداشی چاکیان دەدەینەوە.

{وَجَزَاهُم بِمَا صَبَرُوا جَنَّةً وَحَرِيرًا - سورة الإنسان -١٢}.

واتە: خودای گەورە پاداشی گەورەیان دەداتەوە لەسەر ئەو صەبرو خۆگریەیان‌و بەهەشتی بەرینیان دەداتێ‌و لەو بەهەشتەدا بەرگی نەرم‌و نۆڵ‌و ئاورێشم دەپۆشن. زیاد لەوەش خۆڕاگرو خاوەن صەبرەکان هەمیشە لە خوداوە یارمەتی دەدرێن، قورئان دەفەرموێ:

{وَاصْبِرُواْ إِنَّ اللّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ - سورة الأنفال — ٤٦}.

واتە: بەصەبرو ئارام‌و خۆڕاگرو لەخۆبردوو بن چونکە خودا هەمیشە لەگەڵ خۆڕاگرانە، نەك هەر ئەوەندەو بەس!! بەڵکوو پەروەردگار خاوەن صەبرو خۆڕاگرانی تەخویل کردوە کە ببنە پیشەوای ئادەمیزادو بەرەو ڕێگای نەجات ڕاکێشیان بکەن، ئەوەتا پەروەردگار دەربارەی نەوەی ئیسرائیل دەفەرموێ:

{وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ سورة السجدة — ٢٤}.

واتە: ئێمە لەو خودا ناسانەی بەنی ئیسرائیل برێکمان کردون بە پێشەواو ڕێ پێشاندەری خەڵك بەپێی فەرمان‌و ویستی ئێمە خەڵك شارەزا دەکەن، چونکە خۆڕاگرو بەصەبر بوون بڕوایان بە نیشانەکانی خودایەتی ئێمە هەبووە لە شوێنێکی تردا پەروەردگار ئەوەمان پێ دەفەرموێ: کە صەبر ڕەوشتێکی بەرزو گرنگی وەهایە پێویستە هەموو موسوڵمانێك خۆی پێی بڕازێنێتەوەو بیکاتە ڕەوشتی هەمیشەیی بۆ خۆی:

{وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الأُمُورِ - سورة آل عمران — ١٨٦}.

لە ئایەتێکی تردا پەروەردگار مەدحی ئەییوب پێغەمبەری کردوەو بە بەندەی باشی خۆی حسێب کرووە چونکە صیفەتی صەبری تێدا بووەو فەرموویەتی:

{إِنَّا وَجَدْنَاهُ صَابِرًا نِعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ - سورة ص – ٤٤}.

ئەییوب پێغەمبەر دەری خست کە خۆڕاگرو بەصەبرو ئارامەو بەندەو خوداپەرستێکی باشە.

شایانی باسە ئەو صەبرە کە قورئان بانگەوازی بۆ کردوەو خەڵك هەڵدەنێ بۆی، بریتییە لە خوپێوەگرتنی خۆڕاگری لە بەرامبەر ئێشو ئازارو ئەشکەنجەو ناخۆشیدا، لە پێناو پاڵپشتی کردنی حەقو راستیدا یان لابردنی رەوێتی پڕو پوچو دابو نەریتی بەتاڵدا، تەحەمولکردنی ئەزییەتی هاوڕێو جیرانو کەسو کار یان ئەرکی هەڵگرتنی ناخۆشی ژیان بەهۆی هەژاریو نەخۆشیو کۆست کەوتوویی‌و خۆشەویست لە دەستدان.

خودا بانگەوازی موسوڵمانانی کردوە بۆ خۆڕاگری لە مەیدانی جەنگو جیهانداو دەفەرموێ:

{فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالْجُنُودِ قَالَ إِنَّ اللّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ فَمَن شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُ مِنِّي إِلاَّ مَنِ اغْتَرَفَ غُرْفَةً بِيَدِهِ فَشَرِبُواْ مِنْهُ إِلاَّ قَلِيلاً مِّنْهُمْ فَلَمَّا جَاوَزَهُ هُوَ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ قَالُواْ لاَ طَاقَةَ لَنَا الْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنودِهِ قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلاَقُو اللّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللّهِ وَاللّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ - سورة البقرة – ٢٤٩}.

واتە: پیاو خاسە سەر دەستەکانیان کە باوەڕی تەواویان وابوو: زوو یا درەنگ دەچنەوە بەر دیوانی خودا فەرموویانە: سەرکەوتن بەخودایە، بە زۆریو کەمی نییە ئای چەندین کۆمەڵەی کەم، بە فەرمانی خودا سەکەوتوون بەسەر کۆمەڵەی زۆردا، خودایش هەمیشە لەگەڵ کۆمەڵەی خاوەن صەبرە.

لە شوێنێکی تردا دەربارەی تەحەممولکردنی ئەزییەتی خەڵکی دەفەرموێ:

{وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُواْ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّابِرِينَ - سورة النحل – ١٢٦}.

واتە: ئەگەر دنیا بوو تۆڵەی تاوانێکتان لە تاوانکارێ سەند، ئەوە دەبێ بەقەدەر تاوانەکەی تۆڵەی لێ بسەنن‌و بەس، خۆ ئەگەر چاوپۆشی لێ بکەن‌و لەبەر باری خودادا صەبر بگرن ئەوە چاکەیەکی گەورەیەو دەبێ بە ماڵی خاوەن صەبرەکان‌و شایانی پلەی صابیران.

دەربارەی بەردەوام بوون لەسەر عیبادەتکردن دەفەرموێ:

{فَاعْبُدْهُ وَاصْطَبِرْ لِعِبَادَتِهِ - سورة مريم – ٦٥}.

واتە: ئەی خۆشەویست! ئەی موحەممەد! سەرگەرمی پەرستنی خودای خۆتبە، خۆت رابگرە لەبەر ئەرکی بەندەیی خودادا.

{وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا - سورة طـه – ١٣٢}.

ئەی موحەممەد ئامۆژگاری کەسوکاری خۆت بکە کە ئاگاداری نوێژ بکەن‌و بەجوانی جێبەجێی بکەن‌و لەسەر ئەرکی بەردەوامی کردنی ئارام بگرە!!

دەربارەی خۆڕاگرتن لە کاتی بەڵاو موسیبەتدا دەفەرموێ:

{وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوفْ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الأَمَوَالِ وَالأنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ، الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُواْ إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعونَ، أُولَئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ - سورة البقرة – ١٥٥-١٥٧}.

واتە: بێگومان تاقیتان دەکەینەوە بە کەمێك ترس‌و برسێتی‌و کەم بوونەوەی سەرو ماڵ‌و بەروبوم کە بەهۆی دەربەدەری‌و بێ بارانی‌و ماڵوێرانی‌و جەنگ‌و شەڕو شۆڕەوە دێتەڕێتان، جا موژدە بدە بەو کەسانەی خۆڕاگرن‌و لەبەرامبەر تەنگانەی رۆژگاردا بە پشوون، ئەو خۆڕاگرانەی ئەوتۆ کە توشی سەختی‌و ناخۆشییەك دەبن خێرا خودایان وەبیر دێتەوەو پڕ بەدەم هاوار

دەکەن‌و دەڵێن: (إنا لله وإنا إليه راجعون) ئێمە هەموومان بە ویستی خودا هاتووینە کۆڕی ژیانەوەو هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە. ئەوانە دروردو بەخشش‌و رەحمەتی خودای خۆیانیان لەسەرە هەرگیز بەخەم‌و خەفەتی زۆر دڵ تەنگ نابن‌و هەر ئەوانن کە رێگای راستی ژیانیان دۆزیوەتەوە، تێگەیشتوون کە هەموو شتێك بەگوێرەی ویست‌و یاسایەکی تایبەتی دێتە کایەوە!!

لەم ئایەتە پیرۆزەدا پەروەردگار خۆڕاگرانی تایبەت کردوە بەسێ جائیزە کە هەر بۆ ئەوان دانراوەو نادرێ بە کەسی تر:

١- بەخششی خودا بۆیان لە دونیاو قیامەتدا.

٢- رەحمەتی تایبەتی خودایی کە پاڵپشتیان دەکا لەکاتی تێوەگلانی ناخۆشییەکەدا.

٣- صیفەتی هیدایەت‌و شارەزایی کە لەکاتی موصیبەت‌و ناخۆشییەکەدا چۆن رەفتار بکەن‌و چ بکەن‌و چ نەکەن! بۆ ئەوەی ئاخ‌و ئۆف زاڵ نەبێ بەسەر دڵ‌و دەروونیانداو بەڵاکە ئومێد بڕاویان نەکا!!.

## لێبوردن و چاوپۆشی (العفو):

لێبوردن رەوشتێکی پەسەندکراوی ئەوتۆیە کە دەبێتە هۆی رازاندنەوەی ئادەمیزاد، چونکە ئەم رەوشتە هەر لە دڵ‌و دەروونی گەورەدا جێگای دەبێتەوەو هەر لای هۆشمەندان دەست دەکەوێ، رەوشتی کەسێك کە خۆشەویست راگربێ بەرامبەر ئازاری خەڵك. بێگومان دەست درێژیکردنی خەڵك بۆ سەر یەکێکی وەك مەمانان هەر لەلایەن دەروون ناساغێکەوە دەبێ کە شەڕو دژ بە مرۆڤی لێی بووبێتە ژەنگێك‌و دڵ‌و دەروونی داپۆشیبێ‌و چاوی بینینی راستەڕێی لێ گوێر کردبێ، کەوابوو شایانی شانی ئێمەیە بەرامبەر بەم دڵ نەخۆشە رەوشتی لێبوردن بەکار بێنین‌و بەدڵێکی فراوانەوە بەرەنگاری سەرچڵی‌و بێ عەقڵی ئەو ببینەوە.

ئێمە زۆر جار هەڵە دەکەین‌و پێویستیمان بە لێبوردن‌و چاوپۆشی لێکردن هەیە، جا ئەگەر ئێمە لێخۆشبوونمان نەبێ بەرامبەر ئەوانەی خراپەمان لەگەڵ دەکەن هەڵبەتە کەسانی دیکەش لە ئێمە خۆش نابن. ئەگەر ویستمان تۆڵە لە دەستدرێژیکەر بستێنن با چاکەکردن لەگەڵیا بکەین بەتۆڵەستاندن بێگومان هەموو کاتێ ئەم هەڵوێستە پەسەند نییە چونکە زۆر جار چاکەکردن لە بەرامبەر خراپەی خراپەکاردا دەبێتە هۆی ئەوە کە رق‌و کینە لە دڵی دەستدرێژیکەر دەربێنێ‌و سەرسامی بکاو لە گومڕایی خۆی بگەڕێتەوە، بوغزو کینەی بێتە خۆشەویستی‌و واز لە دەستدرێژی کردن بێنێ.. هەر لەبەر ئەمەشە پەروەردگار لە زۆر شوێنی قورئاندا مەدح‌و سەنای عەفوولێبوردنی کردوەو دەفەرموێ:

{وَإِن تَعْفُوا وَتَصْفَحُوا وَتَغْفِرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ - سورة التغابن – ١٤}.

واتە: ئەگەر ئێوە لە هەڵەی خراپەکاران ببورن‌و چاوپۆشییان لێ بکەن‌و لێیان خۆش ببن ئەوە کارێکی گەلێك باشەو خودا زۆری پێ خۆشە، بێگومان پەروەردگار بۆ خۆشی لێخۆشبوو میهرەبانەو لێبوردنی زۆر زۆرترە لە تۆڵەستاندنی!!

لە شوێنێکی تردا قورئان وەصفی موسوڵمانانی راستگۆو راستاڵی بەوە کردوە کە بەچاکە کردن وەڵامی خراپەکاران دەدەنەوەو دەفەرموێ:

{وَيَدْرَؤُونَ بِالْحَسَنَةِ السَّيِّئَةَ أُوْلَئِكَ لَهُمْ عُقْبَى الدَّارِ - سورة الرعد – ٢٢}.

واتە: سەرەڕای ئەوانەیش ڕەوشتێکی بەرزی تریان هەیە کە ئەمەیە پاداشی خراپە بە چاکە دەدەنەوەو لەجێی خار گوڵ دەنێژن. هەروا پەروەردگار بانگەوازی ئادەمیزادی کردوە کە لە بەرامبەر خراپەو خراپەکاریی کەسانێکدا کە شەڕخوازن چاکەو بارقوڵی بەکار بێنن، چونکە ئەو جۆرە هەڵوێستە دەبێتە هۆی ریشەکێشکردنی دژایەتی‌و چاندنی تۆوی خۆشەویستی لە شوێنیدا.

{وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ - سورة فصلت – ٣٤}.

واتە: هەرگیز چاکەو خراپە وەکوو یەك نینو نابێ بەیەك چاو سەیریان بکرێ چۆن گوڵو گول یەکسان دەبن!!. تا بۆشتدەکرێ بە کرداری چاکە بەرامبەری خراپەکاریی بکە، کاتێ واتکرد ئەو کەسەی کە لە نێوان ئەتۆو ئەودا دژایەتیو ناحەزی هەیە دەبێتە دۆستی گیانی بەگیانی تۆ.

جا لەبەر ئەوەی کەسانێکی دەروون نەخۆش هەنو بەسروشت خراپەکارییان تێدا ڕواوە، ئایینی ئیسلام بۆ بنەبڕکردنی خراپەکردنی ئەو جۆرە کەسانە یاسای تۆڵەساندنی بە ئەندازەی داناوەو داوای کردوە کە لە قاڵبێکی وێ چوی مەعقوولدا تۆڵە بەقەدەر گوناە بستێندرێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لایەنی عەفوو سەرفەنەزەری پارسەنگ داوەتەوەو ئەمەیانی بەلاوە پەسەندە، وەکوو قورئان دەفەرموێ:

{وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُواْ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّابِرينَ - سورة النحل – ١٢٦}.

واتە: ئەگەر سزای خراپەکارانتان دایەوە بە ئەندازەی تاوانو خراپەکارییەکەیان سزایان بدەنەوە نەچن زیادە ڕەوی بکەن، خۆئەگەر صەبرو ببێو ددان بە خۆتانا بگرنو تۆڵەکە نەسێننەوە ئەوە ئەو هەڵوێستە زۆر باشە بۆ خاوەن صەبرو خۆڕاگرەکان!! لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ:

{وَجَزَاء سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ، وَلَمَنِ انتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِ فَأُوْلَئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ، إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى الَّذِينَ يَظْلِمُونَ النَّاسَ وَيَبْغُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ أُوْلَئِكَ لَهُم عَذَابٌ أَلِيمٌ، وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ-سورة الشورى – ٤٠-٤٣}.

واتە: پاداشی خراپە خراپەیەکە وەك خۆی، وەلێ ئەگەر کەسێ پیاوەتی بکاو برای ئاشتی بێو تۆڵەی نەستاندەوەو لە دەستدرێژیکەر خۆش بوو، ئەوە پاداشی

باشی ئەو هەڵوێستە مەردانەی دەکەوێتە سەر خودا، بێگومان خودا رووی رەحمەتی لە زاڵم‌و ستەمکاران نییەو خۆشی ناوێن‌و رقی لە کردارو رفتاریانە، ئیتر چ ئەوانەیان کە لەسەرەتاوە دەستدرێژی دەکەن‌و چ ئەوانەی کە لەکاتی هەفکردنەوەو تۆڵەکردنەوە زیادەڕەوی دەکەن.

بێگومان کەسێکیش کەستەمکار زۆرو ستەمی لێکردو دوایی توانی حەقی خۆی بستێنێ ئەوە گلەیی لێ ناکرێ‌و لەبەر ئەوە سزای نادرێ چونکە تۆڵەی خۆی کردۆتەوە، چونکە تۆڵە لە کەسانێ دەستێنرێ کە بە ناڕەوا زوڵم‌و ستەم لە خەڵکی بێ تاوان دەکەن. بە ناحەق دەستدرێژی بۆ سەر ماڵ‌و نامووسی خەڵکی ئەنجام دەدەن، ئەم تاوانبارانە لە هەردوو جیهاندا سزایەکی سەختیان بۆ هەیە. وەکوو تیۆرێکی گشتیش ئەگەر کەسێ صەبر بکا لەسەر ئێش‌و ئازارو لێبوردن‌و چاوپۆشی هەبێ‌و چاوی لەتۆڵەسەندن نەبێ‌و بۆ رەزای خوداو بۆ بەرژەوەندی گشتی (نەك لەبەر بێ دەسەلاتی) واز لە تۆڵە سەندن بێنێ، بێگومان کاری وا پەسەند لەو کەسانەوە لەو کارە گرنگانەیە کە خودا گرنگی داوە بە کردنیان!!

خوێنەری خۆشەویست! ئەوەی کە گوترا داب‌و رەسمی ئایینی ئیسلامە، دەربارەی عەفوو لێبوردن‌و سەرفەنەزەرکردن‌و میانەڕەوی بەکاری هێناوە. بەڵام ئایینی مەسیحی هەر بەتەواوی عەفوی پەسەندکردوەو لە هەموو بارو دۆخێکدا بەجوان‌و مەعقوولی زانیوەو بەبێ قەیدو شەرت بانگەوازی خەڵکی بۆ کردوە.

لە ئیصحاحی پێنجەمی ئینجیلی مەتێ ژمارە (٣٨)دا هاتووە دەڵێ: (بێگومان بیستوتانە کە گوتراوە چاو لە جیاتی چاو هەڵدەکۆڵەرێ ددان لەباتی ددان دەدردێندرێ! (٣٩) بەڵام من پێتان دەڵێم هەرگیز دەست مەهێنە بەردەستی خراپەکار بەڵکوو ئەگەر کەسێك شەپلاغەی لە رومەتی راستت دا خێرا رومەتی چەپی بۆ ئامادە بکە، ئەگەر کەسێك ویستی کێشەو نیزاعت لەگەڵ بکاو کراسی بەرت لێ بستێنێ تۆ سەرباری کراس کەواکەشی بدەرێ، بیستووتانە کە گوتراوە: دۆستت خۆش بوێ‌و دوژمنت بدزێ، بەڵام من پێتان دەڵێم دوژمنتان خۆش بوێ‌و چاکە بکەن لەگەڵ کەسێك کە ئێوەی ناخۆش دەوێ، هەر کەسێك ئازارتان بداو

بتانچەوسێنێتەوە ئێوە پاداشی باشی بدەنەوە نوێژی ئاشتی لەبەر خاتری بکەن.
جارێك لێکۆڵەرەوەیەکی ئەمریکایی پرسیاری لە زانای بەناوبانگ شێخ مەحمودی شاڵ کردو پێی گوت: ئایینی مەسیحی لە ئایینی ئیسلام زیاتر چاوپۆشی تێدایە؟ ئەوە نییە دەڵێ کە یەکێك شاپلاغەیەکی لە رووومەتی راستت دا خێرا رومەتی چەپی بۆ ئامادە بکە؟ کەچی ئایینی ئیسلام یەکەمجار تۆڵەی داناوە ئەمجار لێوبردنو لێخۆشبوونی چەسپاندووە!

مامۆستا شێخ موحەممەد لە وەڵامدا فەرمووی: ئەوەی کە ئایینی ئیسلام بانگەوازی بۆ کردوە شتێکی سروشتییەو لەگەڵ واقیعدا دەگونجێ، بەڵکوو زیادەڕوی ناکەم ئەگەر بڵێم ئیسلام لەم بارەوە زۆر زیاتر گیانی لێوبردوویی تێدایە چونکە کاتێك مافی تۆڵەساندنەوەی دا بە زۆرلێکراو ئەوە راستەوخۆ ئارامییەکی دەروونی دەدا بە زۆرلێکراوەکەو ئەوەی بۆ ڕون دەکاتەوە کە هێزێکی باڵا هەیە پاڵپشتی حەق دەکا.

جا کاتێك ئەم راستییەی بۆ چەسپاندو تێی گەیاند کە دەتوانێ تۆڵە وەرگرێتەوە، ئەمجار داوای لێ کردوە کە سیلاحی لێبوردن بە کاربێنێ، گومانیشی تێدا نییە مرۆڤ کە لەگەڵ تواناادا بەخشینی بەکار هێنا بەخشینەکەی رەحمەتو پیاوەتی تێدایە، بەلام کە هەر لەسەرەتاوە داوای لێبوردنی لێ بکەینو مافی تۆڵەساندنی نەدەینێ (وەکوو لە ئایینی مەسیحیدا هەیە) ئەگەر لێخۆشبوونەکەش ئەنجام بدا بە نابەدڵیو لوتەلایی دەبێ، چونکە لێخۆشبوونی زەبوونییە نەك لێخۆشبوونی هێزو توانا.

لێخۆشبوون بەو گوێرەی ئیسلام دایناوە زۆر جار سەر دەکێشێ بۆ دۆستایەتیەکی بەهێز لە نێوان ناحەزاندا چونکە دەستدرێژیکەر کاتێك دەبینێ زۆر لێکراو دەسەڵاتی تۆڵەشی هەیەو عەفووی دەکا ئەم عەفوکردنە تەئسیرێکی نەفسی بەهێزی هەیەو کارێکی وای تێ دەکا دەیەوێ زۆر لێکراو رازی بکاو ئاساری دەستدرێژییەکەی لەدڵدا بشواتەوە..!!

## ڕاستگۆیی و دیاردەکانی (الصدق ومظاهره):

هیچ ڕەوشتێك نیە بتوانێ ئارامی بۆ کۆمەڵ دابین بکا وەکوو ئەو هێدیو ئارامییەی ڕاستگۆیی دەیخاتە ناو کۆمەڵەوە! لەبەر ئەوە ڕاستگۆیی دانراوە بە یەکێ لەو بناغە پتەوانەی کە بینای کۆمەڵی لەسەر دروست دەکرێو کراوە بە عینوانو دیاردەی پێشکەوتنی کۆمەڵانی ئادەمیزاد... هەر کاتێکیش ئەم ڕەوشتە لەناو کۆمەڵا نەماو پێشێل کرا گیانی هاوکاریو یارمەتیدانی یەکتریان لەناودا نامێنێ، بێ بڕواییان تێدا بڵاو دەبێتەوەو متمانە بە یەکتری ناکەن.

بێگومان ڕاستگۆیی پێویستییەکە لە پێویستییەکانی کۆمەڵ، دەشێ زۆر گرنگی پێ بدرێ! لە ماڵ لە قوتابخانە لەکارگەو دائیرەو بازاڕدا لە هەموو شوێنێك بە هەموو جۆرێك هەوڵی بڵاوبوونەوی بدرێ، خەڵکی پێ ئاشنا بکرێ چونکە خێرو بێری زۆری لێ پەیدا دەبێ، خاوەن ماف بە مافی خۆی دەگات مەردووم بە یەکتری متمانە پەیدا دەکەنو بڕوایان بە یەکتر پتەو دەبێ، بۆیە پەروەردگار بانگەوازی موسوڵمانانی کردوە کە هەردەم بەم ڕەوشتە جوانە خێر ئامێزە خۆیان بڕازێننەوە!!

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا -سورة الأحزاب/٧٠}.

ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هەیەو خۆتان بە خاوەن باوەڕ دەزانن تەقوای خودا بکەنو لەگەڵ ڕاستگۆیان دا بنو هەمیشە قسەی ڕاستو حەق ئامێز بکەن!!

پێغەمبەری مەزنو خۆشەویستیش لەسەر ڕێبازی قورئان بانگەوازی بۆ ڕاستگۆیی کردوەو فەرمویەتی:-

« عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ فَإِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَصْدُقُ وَيَتَحَرَّى الصِّدْقَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ صِدِّيقًا وَإِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ فَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَكْذِبُ وَيَتَحَرَّى الْكَذِبَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ كَذَّابًا. رواه مسلم ».

واتە: ئەی گرۆهی موسوڵمانان زۆر سوربن لەسەر ڕاستگۆییو هەمیشە بیکەن بە ڕەوشتی خۆتان چونکە ڕاستگۆیی سەر دەکێشێ بۆ چاکەکاری سەر

دەکێشێ بۆ چونە بەهەشت دەخیلتان بم خۆتان بپارێزن لە درۆ، چونکە درۆ سەردەکێشێ بۆ خراپەکاری، خراپەکاریش دەبێتە هۆی سوتاندن بە ئاگری دۆزەخ و چونە ناو جەهەننەم، ئادەمیزادیش کە فێری درۆزنی بوو هەر بەردەوام دەبێ لەسەر درۆکردن تا لەلای خودا بەدرۆزن دەنووسرێ...

## دەستپاکی و ئەمینی:

بێگومان جۆرێك لە جۆرەکانی راستگۆیی دەستپاکیی و ئەمینییە، بەڵکوو ئەمینی بە بەرزترین رەوشتی ئادەمیزاد دەژمێردرێ و پتەوترین کۆڵەکەیە بۆ دامەزراندنی کۆمەڵی رێك پێك و دەبێتە هۆی پەیدابوونی خێرو بێر بۆ ئادەمیزاد لەبەر ئەوە ئایینی ئیسلام ئەمینی و دەستپاکی بە رەوشتی موسوڵمانان داناوەو کردویەتی بە دیاردەی ئەوان ئەوەتا قورئان لە وەصفی ئەواندا دەفەرموێ:

{وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ - سورة المؤمنون – ٨}.

## راست وادەیی (صدق الوعد):

جۆرێکی تر لە جۆرەکانی راستی راست وادەییە کە ئەمیش یەکێکە لەو رەوشتە جوانانەی پێویستە مرۆڤ خۆی پێ برازێنێتەوە، چونکە ئەم رەوشتە بەرزە هۆیەکی سەرەکییە بۆ سەرکەوتوویی لە ژیاندا، بەڵکوو ئەمرۆ رەوشتی راستوادەیی بە دیاری ترین رەوشتی گەلانی پێشکەوتووی ئەمرۆ ئەژمێردرێ و زۆریش سوورن لەسەر ئیلتیزام پێوەکردنی.

قورئانی پیرۆز زۆر لە مێژە بانگەوازی موسوڵمانانی کردوە کە بەو رەوشتە جوانە خۆیان برازێننەوەو بیکەنە دیاردەی خۆیان ئەوەتا کە مەدح و لاوچاوکی پێغەمبەری خۆی ئیسماعیل باس دەکا دەفەرموێ:

{وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِسْمَاعِيلَ إِنَّهُ كَانَ صَادِقَ الْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا - سورة مريم – ٥٤}.

واتە: ئەی پێغەمبەر! سەرگوزەشتەی ئیسماعیل بۆ ئەو خەڵکە بگێڕەوە، ژینامەو کردارو رەفتاری جوانی بۆ ئەو مەردوومە شی بکەرەوە، با ئەوانیش بەو رەوشتانە رەفتار بکەن، بەراستی ئیسماعیل راستوادە بوو تەنانەت وادەی بەباوکی دا کە خۆڕاگر بێ بۆ سەبڕین و گیان لەدەستدانیش، زۆر بە جوانیش وەفای بەوادەی خۆی کرد، ئەو خۆی پێغەمبەرو رەوانەکراوی ئێمەبوو.

بەڵێ، راست وادەیی پێویستییەکە لە پێویستییەکانی کۆمەڵ، هۆیەکی گرینگە بۆ متمانە بەیەککردنیان. قورئانی پیرۆز ئەم لایەنەشی ئیهمال نەکردوەو هەموو کات مەردومی هەڵناوە بۆ ئیلتیزام پێوەکردنی بەڵکوو بانگەوازی کردوە بۆ چەسپاندنی هەموو رەوشتێکی جوانی وا کە کۆمەڵ بەرەو پێشەوە بەرێ!!

## دامرکاندنەوەی ئاژاوەو مەسلەتکردن لە نێوان خەڵک دا:

لە ئایینی ئیسلامدا باشی و راستاڵی هەر بریتیی نییە لەوە موسوڵمان لەژیانیدا راستاڵ بێ و بەس، پیاو چاك بی و زەرەر بە کەسانی دیکە نەگەیەنێ و هەر خەیکی رێك و پێکردنی خۆی بێ!! بەڵکوو مرۆڤی راستاڵ و باش و تەواو ئەو کەسەیە کە زیاج لەوە هەوڵ بدا ئیصلاحی نێوان خەڵکی تر بکاو ئاژەوەی کەسانی دیکە بکوژێنێتەوە!

بەڵێ مەسلەتکردن لە نێوان ئادەمیزاددا هەدەفێکی ئیسلامی پیرۆزە، چونکە دژایەتی لە نێوان دوو کەسدا سەر دەکێشێ بۆ دوژمنایەتی لە نێوان دۆست و خزمی هەردوو لایەنە دژ بەیەکەکانداو سەرەنجام کۆمەڵ بەش بەش دەبێ و مەردوومەکان گرۆ گرۆ دەوەستن هەریەکەیان دەیەوێ زەرەر بەوی تر بگەیەنێ، بەڵکوو جاری وا هەیە کار دەگاتە ئەو رادەیە شەڕو ئاژاوە روو بداو خوێنڕێژی پەیدا ببێ! مەسلەحەتکردن و رێکخستنەوەی نێوان خەڵك ڕەوشتێکی هەرە بەرزی ئینسانییە، لە دەرونێکەوە پەیدا دەبێ خۆ پەرست نەبێ و مرۆڤ دۆست بێ! ئایا چ شتێك هەیە وەکوو مەسلەحەتکردن خێرو سوود بە کۆمەڵ بگەیەنێ و کۆمەڵی ئادەمیزاد یەك بخاو بیانکاتە یەك پارچەی پتەو!! لەبەر ئەوەیە کە

پەروەردگار فەرمانی کردوە بە ئیصلاحکردنی نێوان موسوڵمانان کە برایەتی ئایینی یەکیان دەخاتەوە.

{إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ - سورة الحجرات – ١٠}.

واتە: موسوڵمانان هەموویان برای یەکترین هەرکاتێ ناخۆشی کەوتە نێوانیانەوە خێرا مەسڵەحەتیان لەناودا بکەنو مەهێڵن ناخۆشییەکە تەشەنە بکا.

لە شوێنێکی تردا قورئانی پیرۆز بانگەوازی کردوە بۆ مەسڵەحەتکردن لە نێوان دوو کۆمەڵی موسوڵمانداو دەفەرموێ:

{وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا-سورة الحجرات/٩}.

واتە: هەرکاتێ دوو کۆمەڵ، یا دوو لایەن، یان دوو بەرە، لە موسوڵمانان. چوون بە گژیەکتریداو بوو بە شەڕیان، ئێوە بەبێ درمنگ خێرا بکەونە نێوانیانو ناوبژییان بکەنو ئاشتیان بکەنەوە.

هەروەها بانگەوازی کردوە کە موصالەحە لە نێوان ژنو مێردیشا بکرێ، هەرکاتێ ناخۆشی کەوتە نێوانیانەوە ترسی دەست لێکبەردانی یەکترییان لێ پەیدا بوو:

{وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُواْ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَا إِن يُرِيدَا إِصْلاَحًا يُوَفِّقِ اللّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا-سورة النساء/٣٥}.

واتە: ئەگەر ترستان هەبوو کە ئاژاوەو ناخۆشی نێوان ژنو مێرد ئاکامی باش نابێو سەردەکێشێ بۆ دەست لێك بەردان ئەوە ئێوە خێرا پیاوێکی کارامەو عاقڵ لە خزمی پیاوەکەو پیاوێکی کاراماو هۆشمەند لە خزمی ژنەکە بکەن بە فەرمانڕەوا (حەکەم)و بیان نێرن بۆ رێکخستنەوەیان ئەگەر بیانەوێ رێك بکەونەوە خودا یارمەتییان دەداو سەرکەوتوویان دەکاو لە مەسڵەحەتەکەدا ناجح دەبن!!

لە شوێنێکی تردا پەروەردگار خێرو سوودی مەسڵەحەتکردنی نێوان دوو دژ بەیەك روون دەکاتەوەو دەفەرموێ:

{لاَّ خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلاَّ مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلاَحٍ بَيْنَ النَّاسِ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ ابْتَغَاء مَرْضَاتِ اللّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا - سورة النساء - ١١٤}.

واتە: زۆر لەو سرتەو قسەو گوفتارەی کە خەڵك دەیکەن بێ سوودو خێرو بێرن، چونکە دەبنە هۆی تاوانو گوناهی وەکوو غەیبەتکردنو فیتنەی پیلان گێڕانو چاڵ هەڵکەندن بۆ خەڵكو چەوساندنەوەی هەژارو نەدارا، مەگەر فەرموودەی ئەو کەسانە کە فەرمان دەکەن بە خێرکردنو بە چاکەکردنو تێدەکۆشن بۆ ئاشتکردنەوەی کۆمەڵانی خەڵك هەر کەسێك ئەم کردارە چالاکانە بکاو خەریکی ئەو گوفتارە باشانە بێ مەبەستیشی ڕەزامەندی خودا بێ بێگومان پەروەردگار پاداشتی گەورەی دەداتێ!

## هاریکاری و یارمەتیدانی یەکتری (التعاون):

ئاشکرایە کە بەشێك لە لایەنەکانی ژیانی گیانی بریتییە لە هاریکاری یەکتری لەسەر کاری چاکە بۆ ئەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی بخەنە سەر گەڕو بەرەو لوتکەی بەرز پاڵی پێوە نێن، ئەمەیش سەردەکێشێ بۆ خۆشگوزەرانی هەموانو ئەركو ئازاری تاكو تەراش سووك دەکا. مرۆڤەکانی ئەو کۆمەڵگایە هەست دەکەن بەهێزو بڕشتێکی وا کە کاری ئەستەمو قورسیان لا ئاسان ببێو چاو نەترس بن!

هەر بۆیەشە کە کۆمەڵانی پێشکەوتوو شارستانیەتی تازە هەستیان بە ئاکامو سوودی یارمەتیو هاریکاری یەکتری کردوە، زانیویانە چەند کاریگەرو بەکەڵکە ئەوەتا ئەم هەموو گرنگییەیان پێ داوە ئەو هەموو مەڵبەندو کۆمەڵە تەعاونیەیان پێك هێناون بە جۆرێك کە شارێك یان شارۆچکەیەك نییە خاڵی بێ لەو جۆرە کۆمەڵە تەعاونیە، ئەم دریادەیە خۆی لەخۆیدا باشترین بەڵگەیە لەسەر ئاکامو سوودی تەعاونو یارمەتیدانی یەکتریو پێویستی هەبوونی لە کۆمەڵدا بۆ خۆشبەختی تاكو کۆمەڵ.

بێگومــان قورئــانی پــیرۆز گرنگییــەکی زۆری داوە بــە بنــەمای هاریکــاریو بانگەوازی ڕاستەقینەی ڕاستەو خۆی بۆ کـردوە کۆمـەڵی ئـادەمیزادی هـەڵناوە بـۆ ئەنجامدانی... ئەوەتا بەم ئایەتە پیرۆزە – کە بـەرزترین مانـای رۆحـی تێدایـە – داوامان لێ دەکاو دەفەرموێ:

**{وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ} (٢) سورة المائدة.**

واتـە: بـبن بـە پـشتیوانو کۆمـەك بـۆ یـەکتری لەسـەر کردنـی کـاری چـاکەو رەچاوکردنی تـەقواکاری، بـەڵام لەسـەر تـاوانو خراپـەو ناهـەقیو دەسـت درێـژی یارمەتی یەکتری مەدەنو لەسەر کاری ناهەق هەرەوەز مەکەن!!

لەبەشـی یەکـەمی ئـەم ئایەتـەدا قورئـان فـەرمانی کـردوە بـە یارمەتیـدانی یەکتری لەسەر کاری چاکە (البر)و تـەقواکاری، وشـەی (الـبر)یـش لـە زمانـا چـەند مانایەك هەڵدەگرێ، وەکو:-

بەخشش – فەرمانبـەرداری – راسـتاڵی – راسـتگۆیی. کـەوابوو وشـەی (الـبر) وشـەیەکە کۆکـەرەوەی زۆر رەوشـتی بـەرزو خاوێنـە، تـەقواکاریش بریتییـە لـە ترسـان لـە خـوداو فەرمانبـەرداری، کـەوابوو یارمەتیـدانی یـەکتری لەسـەر چاکەو تەقواکاری، دەستگرتنی یەکتری دەگرێتـەوە لەسـەر هـەموو کردەوەیـەك کـە خێـر ئامێز بێو خۆشبەختی بهێنێ بـۆ کۆمـەڵ، جائـەم خێـرو بێـرە خۆشـبەختی ئـەو دونیا یا ئـەم دونیـا بگەیـەنێ وەکوو کۆمـەگی کـردن بـۆ درسـتکردنی قوتابخانـەو خەستەخانەو شتی تری ئاوەها.

لەبەشی دووەمی ئایەتەکەدا نەهی دەکا لە کردنـی تـاوانو دەسـتدرێژیکردن، وشـەی (الإثـم) لـە زمانـا بریتییـە لـە کردنـی هـەرکارێك کـە رەوا نـەبێ ئەمـەش هەموو کردەوەیەکی نابەجی دەگرێتەوە، وشەی (العدوان)یش بریتییە لە ستەمی نـاڕەواو زوڵمـی بەئاشـکراو نمایـان... کـەوابوو وشـەی (الإثـم)و (العـدوان) هـەموو

کردەومیـەکی خـراپ دەگرێتـەوە کـە سەردەکێـشێ بـۆ تێکـدانی کۆمـەڵو لـە گرێژەنەچوونی!!

کەوابوو بە تێفکرینێکی کەم ئەوەمان بۆ رون دەبێتەوە کە قورئانی پیرۆز هەر بەوەنـدە وازی نـەهێناوە کـە بانگەوازی کـردوە بـۆ یارمەتیـدانی یـەکتری لـە کاری چاكو تەقواکاریدا بەڵکوو ئادەمیزادیشی ترساندوە لەسەر یارمەتیدانی یـەکتری بـۆ خراپـەکاریو سەرپێـچیکردنی فـەرمانی خـوداو زەرەر گەیانـدن بەخەڵکی تر!!

کەوابوو تەعاونو یارمەتیدانی یـەکتری ئاکامەکەی خۆشبەختی ئادەمیزادی تێدایەو هەر کاتێ کۆمـەڵانی ئادەمیزاد پـەیڕەویان کـرد دەگەنـە مـرازی خۆیـانو پێشکەوتنو ئاسایشو ئاشتی دەکەوێتـە نـاو کۆمـەڵانی سـەر زەوییـەوە، بۆیـە قورئانی پیرۆز ئاوا بانگەوازی بۆ کردوە.!!

## خۆنەویستی (الإيثار):

بەشـێك لـەو ڕەوشـتە بەرزانـەی ئـادەمیزاد دەڕازێنێتـەوە ڕەوشـتی خۆنەویستییە واتـە بەرژەوەنـدی خـۆت لـە پێنـاوی بەرژەوەنـدی خەڵـکی تـردا لەدەست بدەی، مەصڵەحەتی خەڵـك پـێش مەصڵەحەتی خـۆت بخەی، بەڕاستی ئەمـە دروشمـی ئـەو دڵەگەورانەیـە کـە هەمیـشە کۆشـش دەکـەن بـۆ خزمـەتی ئادەمیزادو وەکوو مۆم لە پێناو خەڵکی تردا دەسوتێنو دەتوێنەوە!!

وە بە پێچەوانەی ئەوەوە ڕەوشتی خۆپەرستی هەیـە کـە ئادەمیزاد ناشیرین دەکاو نرخو ڕێزی لەناو کۆمەڵدا کـەم دەکاتـەوە! (سـنتهلیر) کاتێ کـە مەزهـەبو ڕێبـازی ئـەفلاتونی شـی کردۆتـەوە دەربـارەی ڕەوشـتی خۆپەرسـتی وتوویـەتی (گـەورەترین عونـصوری شـەڕ لـە ئـادەمیزاددا عـەیبو لەکەیەکـە هـەموو کـات لەگەڵیەتی، هەر لەو ڕۆژەی لەدایك دەبێ تا ئەو ڕۆژەی دەمرێ لێی جیا نابێتەوە، هەموو کەس بۆ خۆی بەڕەوای دەبینێو ناتوانێ خـۆی لێ ڕزگـار بکـا ئـەم ڕەوشـتە پێی دەگوترێ خۆپەرستی (الحب الذاتي).

بێگومان ئەم خۆپەرستییە تا ئەندازەیەك ڕەوایە بەڵكوو پێویستە، چونكە سروشت تێكەڵاوی گۆشتو ئێسقانی ئێمەی كردوە بەڵام هەركاتێ زیادڕەوی تێداكرا دەبێتە نەخۆشیەكی كوشندەی سامناكو هەموو گوناهەكانی تر هون دەكا. بەڵێ جاری وا هەیە ئادەمیزاد چاوپۆشی لە واجب دەكا، بەڵام هەركاتێ پێی وابوو كە پێویستە بەرژوەندی خۆی – بانارەواش بێ – پێش بەرژەوەندی خەڵكی تربخا، بێگومان توشی هەڵەدەبێ، حوكمی ناڕەوا دەدا حەقو چاكە ژێر پێ دەخا!! كەوابوو هەر مرۆڤێك بیەوێ ببێتە پیاوێكی گەورە نابێ خۆپەرست بێ، نابێ بەرژەوەندی خۆی زیاتر لەهی خەڵك مەبەست بێ، دەبێ هەرخێرو چاكەی خۆش بوێ جا بۆ خۆی بێ یان بۆ غەیری خۆی! ئەگینا بە هەزاران هەڵە دەكەوێتە سلووكو ڕەوشتییەوە كە خۆی بۆ لێ رزگار ناكرێن[1].

كەوابوو خۆنەویستی گەورەترین كاریگەری هەیە لە ڕواندنی داری بەبەری خۆشەویستی لە نێوان تاكەكانی كۆمەڵدا، چونكە هەموویان دەكاتە كۆمەڵێكی یەكگرتووی پتەوی وا یەكتریان خۆش بوێو یارمەتی یەكتری بدەن. بە پێچەوانەشەوە خۆپەرستی وادەكا خاوەنەكەی قێز لێكراو بێو كۆمەڵ لەخۆی نەگرێ، چونكە نایەوێ پێویستی سەرشانی خۆی لەكۆمەڵدا بەجی بێنێ!.. خوێنەری هێژا! ئەمە جگە لەو خۆشبەختییەی كە ڕەوشتی خۆنەویستی بۆ خاوەنەكەی دێنێ. شتێكیش كە ئەمڕۆ زانستی دەروونناسی دەری خستووە ئەوەیە كە ئادەمیزاد تاخۆی نەكا بە قوربانیو بەرژەوەندی خۆی نەكا بە قوربانی بەرژەوەندی خەڵكی تر خۆشبەختی وەدەست ناهێنێ!!... هەر لەبەر ئەوەیە پەروەردگار بانگەوازی ئادەمیزادی كردوە بۆ ڕەوشتی خۆنەویستیو مەدحی ئەو كەسانەی كردوە كە ئەم ڕەوشتە بەرزەیان تێدایەو فەرموویەتی:

{وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ - سورة الحشر -٩}.

---

[1] پێشەكی كتێبی (الأخلاق)، ئەرستۆ، وەرگێڕانی: لوتفی سید بەرگی یەكەم ل/٦٦.

دەربارەی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزە ئیمامی بوخاری‌و ئیمامی موسلیم لە هاورێی بەڕێزی پێغەمبەرەوە: (ئەبو هورەیرە) دەگێڕنەوە کە دەفەرموێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر و وتی: ئەی رەوانەکراوی خودا برسییەتی تەنگی پێ هەڵچنیوم، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) ناردی بۆ لای خێزانەکانی کە خواردەمەنییەکی بۆ بێنن بەلاَم هیچیان نەبوو، ئەمجار پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئایا پیاوێکی خێرخوا نییە ئەمشەو میوانداریی ئەم پیاوە برسییە بکا؟! ئەبو تەلحە وتی ئەی پێغەمبەری خودا من دەبمە خانەخوێی‌و دەیبەمەوە ماڵی خۆمان، کە بردیەوە بەژنەکەی خۆی گوت: ئافرەت رێزی میوانی پێغەمبەری خودا بگرن خێزانەکەی وتی‌پیاوەکە جا چیبکەم هیچمان نییە بیدەمێ جگە لە هەندێ خواردەمەنی نەبێ کە بۆ منداڵەکانم ئامادە کردوە، ئەبو تەلحە وتی: هەرکاتێ وەختی نانخواردنی شێوان هات منداڵەکان بخافڵێنە تا خەویان لێ دەکەوێ ئەمجارە وەرە چراکە بکوژێنەوە خواردەمەنییە بخەرە بەردەستی میوانەکەو ئێمە لەبەر خاتری میوانی پێغەمبەر بێ شێو سەردەنێینەوە. بەڵێ چۆنی گوت ئافرەتەکە وایکرد، کە بەیانی ئەبو تەلحە چو بۆ خزمەت پێغەمبەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو بەراستی پەروەردگار عەجایب ما لە هەڵوێستی ئەبو تەلحەو خێزانەکەی‌و ئەم ئایەتەش هاتەخوارەوە کە دەفەرموێ:

{وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ - سورة الحشر -٩}.

واتە: رەوشتێکی پەسەندی تریشیان هەیە، خێرخوان‌و سوودو مەنفەعەتی کەسانی تر وەپێش سوودی خۆیان دەخەن، گەرچی خۆشیان بەماڵ‌و حاڵ کەم دەست بن، بەلاَم بەدڵ‌و دەروون دەوڵەمەندن لەبەر ئەوە شتی وایش دەبەخشن کە خودی خۆیان پێویستییان پێی هەیە، دەستووری خودا وایە: ئەوەی دەرەقەتی بەخیلی‌و رژدی دەروونی خۆی بێ‌و زاڵ بێ بەسەر خۆپەرستیدا دەبێ بەسەر فرازی دونیاو قیامەت!!!

بەڵێ ئەم رووداوە بەڵگەیە لەسەر قووڵیو کاریگەری ئەو پەروەردەییەی کە ئیسلام لەدڵی پەیڕەوانی دا چاندۆیەتیو رۆشنایەکی ئاشکراشە بۆ ئەو کەسانەی کە داخوازیی گیان بەرزیو پیاوەتینو بۆ خێرو بێر کۆمەڵ هەوڵ دەدەن!!

## شیرینی گوتار، قسەی چاكو باش (الكلام الحسن):

ئەگەر بە وردی سەرنجێکی گیروگرفتەکانی نێو کۆمەڵ بدەین کەمێ بچیتە بناوانی ئەو موشکیلە خەتەرناکانەی تووشی کۆمەڵ دەبنو لەچوار چێوەی خێزانو کۆمەڵدا سەر هەڵدەدەن بۆت ئاشکرا دەبێ کە ماكو سەرچاوەی ئەو گیرو گرفتانە زۆر جار گوفتارێکی نابەجێیە کە پیاو – بەبێ قەصد – دەیکا بەلام قسەکە لەدڵی خەڵکا کاریگەر دەبێو دڵی بەرامبەرەکەت ئازار دەداو تۆوی ناحەزی دەڕوێنێ، بەبێ هودە ئاژاوە دەخاتەوە!!

قسەی چاكو باش بنەماو کانێکی گەڵێ گەورەی سەرەکییە بۆ بەدەست هێنانی سەرکەوتنو خۆشبەختی هەردوو جیهان، هۆیەکی فرە بەهێزە بۆ دروستکردنی کۆمەڵی پێشکەوتوو!!

بۆیە مامۆستایانی پەروەردەو پیاوانی خێرخواو کۆمەڵ خۆشەویست، هەموو کاتێ داوایان لە مەردووم کردوە کە بەشێوەیەکی جوانو هۆشمەندانە قسە لەگەڵ خەڵکیدا بکەن موراعاتی ئوسلووبی نەرمو نیان بکەن، چونکە هەڵبژاردنی قسەی جوانو نەرمونیان مرۆڤ لەلای کۆمەڵو هاوەڵانی خۆشەویست دەکاو لەناو کەسو کارو لەچوار چێوەی ئیشو کاری خۆیدا بەرزی دەکاتەوەو دۆستو برادەری لێ کۆدەبنەوەو یارمەتدەری زۆر دەبنو لەژیاندا سەر کەتوو دەبێ، بۆیە پەروەردگار ئادەمیزادی بانگەواز کردوە بۆ گوفتاری باشو دەمو لەفزی شیرین:

{وَقُل لِّعِبَادِي يَقُولُواْ الَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ - سورة الإسراء – ٥٣}.

ئەی پێغەمبەر! بەزمانێکی شیرین بەزبانی منەوە بە بەندەکانم بڵێ: کە دەمو گفتاریان شیرین بێو قسەی جوانو رەنگینو رەوابکەن چونکە شەیتان وا لە

پارێزدا لەناو بۆسەدا خۆی مەلاس داوە بۆ هەل دەگەرێ کە بەقسەیەکی رەق یا بەتوندو تیژییەك تۆوی دووبەرەکیو ناوەند تێکدان لە نێوانیانا بچێنێ.. لەم ئایەتە پیرۆزەدا یەزدان فەرمان بە موسوڵمانان دەکا کە لەگوفتارو گفتو گۆو توێژینەوەو قسەو باسیاندا قسەی جوانو وشەی شیرین هەڵبژێرنو ئاخاوتنی پێ بکەن، چونکە ئەگەر وانەکەن قسەی زەقو ناقۆڵا بەکاربێنن شەیتان دەکەوێتە ناویانەوەو شەرو نیزاعو دژایەتی دێتە کایەوە، لە شوێنێکی تردا پەروەردگار دەفەرموێ:

{وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْناً - سورة البقرة – ٨٣}.

واتە: قسەی باش بەخەڵك بڵێنو لە ئاخاوتنندا گوفتارتان شیرینو شەکەر ئامێز بێ.

لە شوێنێکی تردا پەروەردگار فەرمان دەکا بە دەنگ نزم کردنەوە، چونکە دەنگ نزمکردنەوە نیشانەی قسە باشیو گوفتار شیرینییە، تەنانەت قسەکردنی بەدەنگی بەرز شوبهاندووە بە زەڕینی گوێدرێژ، بەمەبەستی ئەوە ئادەمیزاد قێزی لە نەڕەنەڕو قیژەقیژو هەراو هۆریا ببێتەوە!! دەفەرموێ:

{وَاغْضُضْ مِن صَوْتِكَ إِنَّ أَنكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ-سورة لقمان/١٩}.

واتە: دەنگت نەوی بکەو لەسەرخۆ ئاخافتن ئەنجام بدە هەرگیز لەکاتی قسەکردنا دەنگ هەڵمەبڕە، چونکە دەنگ بەرزکردنەوەو نەڕەنەڕ لە زەڕە زەڕی گوێدرێژ دەچێ ناخۆشترین دەنگیش زەڕە زەڕی گوێدرێژە.

لە شوێنێکی تردا پەروەردگار بانگەوازی خەڵك دەکا بۆ روخۆشیو دڵنەرمی لەگەڵ ئادەمیزاددا چ بە گوفتار چ بە هەڵوێستو رەفتار، هەر وەکوو نەفرەت دەکا لە رووگرژیو دڵ رەقی، ئەوەتا بە پێغەمبەری خۆی حەزرەتی (محمد) دەفەرموێ:

{فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ - سورة آل عمران – ١٥٩}.

واتـە: بـەهۆی ئـەو رەحمـەت سـۆزەوە کـە خستومانەتە نێـو دڵـی تـۆوە ئـەی محمد! دەبینین تۆ بەهێدیو هێمنی هـەڵسو کـەوت لەگـەڵ هـاوەڵانو هۆزەکەتـدا دەکـەی! خۆئەگـەر تـۆ ڕوگـرژو مـۆنو دڵـڕەقو قـسە نـاخۆش بوویتایـە لەگـەڵ موسوڵمانانـدا، لێت دوور دەکەوتنەوەو لە دەورت دەتەکێنەوە.

ئەمـە رەهنوماییکردنـە بـۆ موسـوڵمانانو بۆیـان رون دەکاتـەوە کـە هەڵسو کـەوتی بـاشو قـسەو گوفتوگـۆی خـۆش پێویـستییەکی سـەرەکی پێغەمبـەرانو پێشەوایانی گەلو کۆمەڵە، پێویستە سەرانو گەورە پیاوان هەمیشە قسە خـۆشو دەم بەزەردەخەنەو کردار باش بن، تا بـەدڵ کۆمـەڵ خۆشـیان بـوێنو لـە دەوریـان کۆ ببنەوەو گوێ بۆ قسەو گوفتاریان بگرنو شوێنیان بکەون..!!

ئەمەیـە پـەروەردەو بۆچـوونو ئـادابی قورئـان دەربـارەی گـوزەرانو ژیـان بەسەربردنی ئادەمیزاد لـەناو خۆیانـاو لـە نێـوان پێشەواو شـوێن کەوتوانـدا، بـەو هیوایە خۆشەویستی لەناویاندا جێگیر بێو دڵسۆزی یەکتر بن!!

ئاشکراشە ئەم شێوە هەڵسو کەوتە پێویستییەکی سەرەکی هەموو کۆمەڵێکە کە بیەوێ بەخۆشیو بەختەوەری ژیان بەسەربەرێ..!

## هاونشینی چاکان (معاشرة الأخيار):

ئـەو شـتانەی مـرۆڤ دەرازێنێتـەوەو رەوشـتی ئینـسان جـوان دەکـا هاوڕێـەتی چاکانە، چونکە هـاوەڵی بـاش رۆڵێکـی گرینگـی هەیـە لەسـلووکی ئینـساندا، مـرۆڤ خۆی حەزی لە تەقلیدکردنو لاسایی کردنەوە هەیـە، جـا وەکـوو چـۆن ئـادەمیزاد لاسایی ئادەمیزادی دەورو بەری خۆی دەکاتەوە لەپۆشاکو خانوو بەرەو خواردنو خواردنەوەدا هەر بەو جۆرەش لە کـردارو گوفتـاردا لاسـاییان دەکاتـەوەو رەوشـتی ئەوان هەڵدەگرێ!

دەڵێن هۆشمەندێك بە کابرایەکی گـوت: پـێم بڵـێ: کـێ هاوڕێتـە منـیش پێـت دەڵێم: تۆ کێیتو چیت!!

بێگومان رەفاقەتی راستاڵو پیاوباشان رەوشتی جوان لە دەروونـدا دەرِوێنـێو پیاو هەڵدەنێ بۆ کرداری بەرز، بە پێچەوانەوە هاوەڵی کردنـی خراپـان، ئینسان رادەکێشی بۆ پێشێلکردنی رەوشتی بەرزو تاوان کردنو لە ئاکاما مرۆڤ دوور دەخاتەوە لە ئەنجامدانی کردەوەی بەرز!!

هاورِێی باش بەهرەیەکی زۆر گەورەو بەنرخەو باشترین نیعمەتی ئەم ژیانەیە، پشتو پەنای کاتی تەنگانەیەو رێ پیشاندەرێکی دڵسۆزو ئەمینە. زۆر لە گەورە پیاوانی مێژوو هەڵکەوتوانی جیهانو سەرکەتوانی ژیان هۆی سەرکەوتنو گەییشتن بە ئامانجیان دەگەرِێتەوە بۆ رەچاوکردنی هاورِێی باشو شانازی بەوە دەکەن کە توانیویانە سەرکەوتووبن لە هەڵبـژاردنی هاوەڵی باشدا توانیویشیانە پەیرِەوییان بکەنو بە ئامۆژگاریو نەصیحەتی ئەوان رەفتار بکەن!!

قورئانی پیرۆز بانگەوازیی خەڵکی کردوە بۆ ئەوە هاورِێی راستاڵو صالح بگرنو هاورِایی باشان بکەن!! ئەوەتا پەروەردگار فەرمان دەکا بە فروستادەی خۆی حەزرەتی (محمد)و دەفەرموێ:

{وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَن ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا - سورة الكهف — ٢٨}.

واتە: لەبەر رِەزای خودا بەردەوام بە لەسەر هاورِێەتیو هاونشینی ئەو هاوەڵە باشانەت کە هەمیشە تاعەتی خودای خۆیان کردوە بە پیشە، بە تایبەتی سەرلەبەیانیانو سەر لەئێواران، وە هەمیشە بۆ رەزای خودا دەم بەویردو یادو صەلاواتن. روتو رەجاڵی ئەوهاوەڵە فەقیرانەت مەکەرە تەرازوو سەنگو سووکی پێ بکەی چونکە لای خودا ئەوانە زۆر لە پیاو ماقولانی قورِەیشی لە خودا نەترسو سەرسەخت لەپێشترن هەرگیز چاو لەو فەقیرو هەژارانە لامەدەو رومەکەرە ئەو دەمارگیرە خۆبەزلزانانە کە خودایان لەیاد نییە بە تەواوی سەرگەردانو گومرِابوونو سەریان لێ شێواوە!!

لەم ئایەتەدا پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەری خۆی کردوە کە هاوڕێیەتی ئەو چاکانە بکا کە لەسەر رێبازی خودا دەڕۆن‌و پەیڕەی فەرمانەکانی دەکەن... ئەمجار لەسەر زمانی پێغەمبەریش فەرمانی بە هەموو موسوڵمانان کردوە کە هەمیشە مرۆڤی باش‌و راستاڵ بکەن بە هاوڕێی خۆیان، تا دەرزیان لێ وەرگرن‌و رەوشتی بەرزو پاك‌و خاوێنیان لێ فێر ببن!

هەرگیزاو هەرگیز لەبەر فەقیری‌و هەژاری – یان – ناشیرینی‌و مەنزەرو شێوەو ڕوخسار لێیان لوتەلا نەبن. ئەمجار پەروەردگار نەهی کردوە لەوە کە موسوڵمانان: هاوڕێیەتی پیاو خراپان بکەن‌و هەروا هاوڕێیەتی ئەوانە نەکەن کە غافڵن لە یادی خوداو شوێن هەواو هەوەسی خۆیان کەتوون‌و لە سنووری حەق‌و راست تێپەڕیون‌و زیادە ڕەوییان کردوە لە کرداریاندا: دووبارە پەروەردگار لەم بارەوە لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ:

{فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّى عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا -سورة النجم – ٢٩}.

واتە: ئەی پێغەمبەر! تۆ روو وەرگێڕەو پشت هەڵکە لەو کەسانەی پشتیان هەڵکردوە لە یادی ئێمەو مەبەستیان تەنیا ژیانی دونیایەو بەس...

لەشوێنێکی تردا پەروەردگار ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوەو پێمان دەفەرموێ: کەشیاوی موسوڵمان نییە خودا نەناس‌و تاوانبارانی خۆش بوێ، با ئەو کەسانە براو باوك‌و دایکی بن!!

{لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ-سورة المجادلة – ٢٢}.

واتە: نابینی‌و ناش بێ ببینی کۆمەڵێکی موسوڵمان‌و خاوەن بڕوا بە خوداو بەرۆژی قیامەت خودا نەناسانیان خۆش بوێ، با ئەو خودا نەناس‌و تاوانبارانە باوك‌و دایکیان بن یان خوشك‌و برایان بن یان سەر بەهۆزو عەشیرەتیان بن!!؟ پێغەمبەری مەزنیش لە فەرماییشتێکیا بە جوانترین شێوە نموونەی هاوڕێ‌و هاونشینی چاك‌و خراپی بۆ روونکردوینەوەو فەرموویەتی:

« مَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ وَالسَّوْءِ كَحَامِلِ الْمِسْكِ وَنَافِخِ الْكِيرِ ، فَحَامِلُ الْمِسْكِ إِمَّا أَنْ يُحْذِيَكَ ، وَإِمَّا أَنْ تَبْتَاعَ مِنْهُ ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحًا طَيِّبَةً ، وَنَافِخُ الْكِيرِ إِمَّا أَنْ يُحْرِقَ ثِيَابَكَ ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ رِيحًا خَبِيثَةً. رواه مسلم ».

واتە: هاوڕێو هاونشینی چاكو خراپ وەكوو عەتر فرۆشو ئاسنگەر وان:- مرۆڤ كە هاونشینی عەتر فرۆشێكی كرد یان بەشت دەدا یان لێی دەكڕی یان هەر هیچ نەبێ بۆنی خۆشت بۆ دێ.

كاتێكیش نزیك ئاسنگەر بكەوێتەوە یان بە پرشكی كورەكەی پۆشاكت دەسووتێو توشی نارەحەتی دەبێو زەرەرو زیانت لێ دەكەوێ یان كە هیچ نەبێ بۆنی ناخۆشت بۆدێ!!

خوێنەری بەڕێز ئەمە دابو نەریتو تەعلیماتی ئیسلامە دەربارەی هەڵبژاردنی هاوڕێی چاكو ڕاستاڵ تا هەموو كاتێ ڕەهنوماییت بكاو بۆ كارو باری باش هەڵتنێو لە ڕێگای خەتەرو سامناك بتپارێزێ.

## پرسكردنو سڵاوكردن (الاستئذان والتحية):

بەشێك لە ڕەوشتی گەلە پێشكەوتووەكانی ئەمڕۆ ئەوەیە كە پەیوەندی بازێكیان بە بازێكیانەوە لەسەر بناغەی ئادابی بەرزو دابو نەرێتی جوان دەبەسترێو لەسەر ئەو شێوە جوانە ڕەفتار بكەن.

ئایینی پیرۆزی (ئیسلام)یش كە هەموو پێویستییەكی جەستەییو رۆحی ئەنجام داوەو بۆ هەموو شتێك بەقەدەر پێویست حەقی خۆی دیاری كردوە، هەرگیز ئەوەشی لەبیر نەچووە كە دابو نەرێتێكی جوان دابنێ تا شوێنكەوتوانی لەسەری بڕۆنو پەیڕەوی بكەن!! جا دابو نەرێتێك كە ئیسلام دایهێناوەو فەرمانی پێ كردوین كە پەیڕەوی بكەین دابو نەریتی پرسكردنو سڵاوكردنی كاتی دیدەنیو بەیەك گەییشتنە، ئەم دابە (پرسو سڵاوە) ئەمڕۆ بە نیشانەی شارەستانیەتی دەژمێردرێ، دەبینین خەڵكی پێشكەوتوو زۆر سوورن لەسەر

ئیلتیزام پێوەکردن و جێبەجێکردنی چونیەتی دیدەنی و هەڵبژاردنی کات و داب و نەریتەکانی!!

دەی باشە خۆ ئایینی ئیسلام چەند سەدەیەکی دوورو درێژە زۆر بەجوانی و رێکو پێکی شێوەی دیدەنی و پرسکردن و سڵاوکردنی بۆ داناوین و هەڵی ناوین کە بەو پەڕی دڵسۆزییەوە پەیرەوی بکەین و فەرموویەتی:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ، فَإِن لَّمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّى يُؤْذَنَ لَكُمْ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ - سورة النـور - ٢٧-٢٨}.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا پەروەردگار فەرمانی بە موسوڵمانان کردوە کە بەبێ پرس و خواستن نەچنە ماڵی هیچ کەسێکەوە، کاتێك زانیت ئەو کەسەی دیدەنی دەکەی چونەکەتی پێ خۆشەو رێگا دەدا بچیە لای ئەوکاتە بچۆو سەڵاوو رێزت ئاراستەیان بکە، جا ئەگەر لەماڵ بوون و رێگەیان دای بچیتە ژوورێ ئەوە باشە، ئەگینا دەبێ - بەبێ دڵگرانی و عاجز بوون - بگەڕێیتەوەو دیەنییەکەت هەڵبگری بۆ کاتێکی گونجاوی تر... چونکە دیدەنی ئاوەهاو گەڕانەوە بەو جۆرە دڵ و دەروونی مرۆڤ پاك دەکاتەوە شك و گومان لە نێوان یەکتری دادەڕەوێنێتەوە!

جا لە کاتێکدا ئیسلام پرسکرن و سڵاوکردنی داناوە دەبینین لەولاشەوە وڵامدانەوەی سڵاویشی داناوەو خەڵکی هەڵناوە بۆ ئیلتیزام پێوەکردنی چونکە هیچ رەوشتێکی ناشیرین نیە بە ئەندازەی وەڵام نەدانەوەی سڵاو دژایەتی دروست بکاو ببێتە هۆی ناکۆکی! ئیسلام هەر بەوەندە نەوەستاوە کە فەرمانی کردوە بە موسوڵمانان کە جوابی سڵاو بدەنەوەو بەس! بەڵکوو داوای لە پەیڕەوکەرانی خۆی کردوە کە بەجوانترین شێوە وەڵامی سڵاوەکە بسێننەوە، ئەمەش ئەوپەڕی ئەخلاقبەرزی دەگەیەنێ و جوانترین ئادابێکە کە ئیسلام فێری شوێنکەوتوانی خۆی دەکا، خودا دەفەرموێ:

{وَإِذَا حُيِّيْتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا - سورة النساء - ٨٦}.

واتە: هەرکاتێ سڵاوو ڕۆژباشیان لێکردن ئێوەش دەس بەجێ بەشێوەیەك لەوە جوانتر وەڵامی سڵاوەکەیان بدەنەوە یان کە هەر هیچ نەبێ وەکوو خۆی جوابەکە بدەنەوە!!.

خوێنەری هێژا ئەمە ئادابی قورئانە کە هەرگیز نابینی لایەنێك لەولایەنانەی گەل پێش دەخاو ئەخلاق‌و ڕەوشت جوان دەکا پاش گوێی خستبن‌و ئیهمالی کردبن!!

## گەردنکەچی بۆ هەواو هەوەس (الانقیاد لهوی النفس):

مرۆڤ لەگۆڕەپانی ژیاندا زۆر جار گێژەڵۆکەو زریانی هەواو ئارەزوو بەسەریا دێن‌و تێدەپەڕن، لە بەرامبەر ئەم هەواو ئارەزووەدا مرۆڤ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی پێش دەخاو گوێ ناداتە ئەوە زەرەری بۆ خەڵکی تر هەیە یان نا؟ هەروەها گوێ ناداتە ئەوە کردەوەکەی باشە یان خراپە هەرمەبەستی تێرکردنی ئارەزۆی خۆیەتی‌و بەس!

گەورەترین نیشانەی موسوڵمانیەتی بەرەنگاریکردنی هەواو هەوەسی ئادەمیزادە، بەر پەرچدانەوەیەتی لە شوێنکەوتنی ئارەزووە مادییەکانی، نەوەکوو ئارەزۆی نەفسی سیستەمی ئارەزووە سروشتییەکانی مرۆڤ ناشیرین بکاو بیان ئالۆزێنێ... چونکە ئارەزۆی سروشتی مرۆڤ یاساو نیزامێکی تایبەتی هەیەو تەرتیب‌و ڕێکوپێکییەکی وای تێدایە پێویستی بە کێش‌و بەرامبەریەکی تایبەتی وا هەیە کە لەنگەری ئارەزووەکانی بگرێ‌و نەهێڵێ تەرازووەکە سەرەوخوار بکاو لارەسەنگ ببێ!! بەڵام (پەنا بە خودا) هەرکاتێ مرۆڤ بکەوێتە نێو داوی هەواو هەوەسەوە ئەم یاسا سروشتییەی لێ دەشێوێ‌و داوە دەزوەکانی رایەڵی لێ ئاڵۆز دەبن‌و هەموو هێزەکانی جەستەی – مادی‌و مەعنەوی – تەرخان دەکا بۆ وەدەست هێنانی ئامانجێکی تایبەتی نەفسی، دەیەوێ بەهەر مەرجێك بێ ئەو ئامانجە وەدەست بێنێ‌و نەفسی چڵێس‌و چاوچنۆکی تێر بکا، بەمەش لەنگەری ئارەزووەکانی‌و یاساو سیستەمە سروشتییەکەی لێ تێك دەچێ‌و داوە دەزوەکانی

ژیـانی لێ دەئـاڵۆزێن و جڵـەوو دەسـتەدووی رەورەوەکـەی لەدەسـت بـەردەبێ و لـە رێگای ژیانی سروشتی لادەداو هەواو ئارەزۆی ناشیاو جڵەوی لەدەست وەردەگـرن و بـەرەو هەڵـدێر رەهـای دەکـەن! بۆیـە دەبیـنین قورئـانی پـیرۆز وەسـفی هـەواو هەوەسـی کـردوە بـەوە کـە تێکـدەری یاسـاو نیزامـی سروشـتی ئـەم ژیانەیـە کـە پێویـستە جڵـەوی بەدەسـت حەقـەوەبێ هـەرگیز نەهێڵـدرێ ئـەم ژیانـە جڵـەو کێشەکەی هەواو ئارەزۆی بەتاڵ بێ. پەروەردگار دەفەرموێ:

{وَلَوِ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْوَاءهُمْ لَفَسَدَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْـأَرْضُ وَمَـن فِـيهِنَّ - سـورة المؤمـنون – ٧١}.

واتە: ئەگەر حەق و راستی شوێن هەواو هەوەسی ئەوان بکەوێ ئەرزو ئاسمان لە گرێژەنە دەچن و تێکدەرۆخێن و چییان تێدایە بە هیلاك دەچن!!.

ئاشکراشە گـەورەترین زەرەری هـەواو هـەوەس ئـەو زەرەرو ماڵوێرانیەیـە کـە بـەهۆی هـەواو ئـارەزۆی نـارەوای سـەران و کاربەدەسـتانی وڵاتـەوە تووشـی گـەل و کۆمەڵ دەبێ، ئەو کار بەدەستانە پێویستی سەرشانیانە کە عەداڵەت و دادپەروەری لە سەرانسەری وڵاتدا بچەسپێنن درەختی ئاشتی و خۆشی و ئـازادیی بـروێنن.. جا هەرکاتێ ئـەوان ئـەرکی سەرشـانی خۆیـان بـەجێ نـەهێناو شـوێن هـەواو ئـارەزوی نارەوا کـەوتن و دەوڵەمەنـدو خـاوەن دەسـەڵاتیان بەحـەق و ناحـەق خۆشەویـست و ستەم جەوریان لە هەژارو نەدارا کردو گوێیان نەدا بـە سـکاڵاو نوزانـەوەی کۆسـت کـەوتوان! بێگومـان فەسـاد لەوڵاتـدا پەیـدا دەبـێ و سەرچاوەی جۆگـای ژیـان لـێڵ دەبـێ و ئەوەنـدە نابـا کـە شـۆڕش هەڵدەگیرسـێ و وڵات توشـی وێرانـی و سـوتمانی سـامناك دەبـێ، کوشـتن و بـڕین و تـاڵان و بڕۆیـەکی زۆر دێتەکایـەوە!! ئەمـەش راستیەکەو نمایانە، زۆر جار مێژووی گەلان و وڵاتان بەخۆیانـەوە دیـوە، زوربـەیان لە دووتوێی لاپەڕەکانی مێژوودا تۆمارکراون!

قورئانی پیرۆز بۆئەوەی ئەمە فێری ئێمەمانان بکا، بانگەوازی خودا لە داوود پێغەمبەرمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ:

{يَا دَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُم بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّ الَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا نَسُوا يَوْمَ الْحِسَابِ - سورة ص – ٢٦}.

واتە: ئەی داوود! ئێمە تۆمان کردوە بە جێنشینی خۆمان لە سەرزەوی، کەوایە لە نێو خەڵکدا دادپەوەربەو بەحەقانی فەرمانڕەوایی بکەو شوێن هەواو هەوەس مەکەوە چونکە ئەگەر شوێن هەواو ئارەزۆ بکەوێ ئەو هەواو ئارەزووە لە رێبازی راستەقینەی خودا لات دەداو رێگای راستت لێ گوم دەبێ! ئەوانەی رێگای خودایان لێ گوم دەبێ ئازارێکی بەئێش دەدرێن لەسەر ئەوە کە لە دونیادا هەواو هەوەسیان کردۆتە پێشەوای خۆیانو رۆژی رەستاخێزیان لە بیرنەبووەو حیسابو کیتابی قیامەتیان لەبیر خۆیان بردۆتەوە!.

بەڵێ ئاشکراو نمایانە کە شوێنکەوتنی هەواو هەوەس ئێمە لادەدا لە شتە سەرکییەکانی ئەم ژیانەو حەقیقەتی ژیانی دونیامان لێ گوم دەکا... زاناو فەیلەسووفی چەرخی شانزەهەمو مامۆستای فەلسەفەی تازە (فەرەنسیس بیکون) دەڵێ: بۆ ئەوەی مرۆڤ بگاتە حەقیقەت پێویستە خۆمان لەچوار وەهمو خەیاڵ رزگار بکەین ئەو وەهمو خەیاڵانەی رێگای حەقیقەتمان لێ دەبەستن لە هەموشیان گرنگتر وەهمی شەهوەتو جینسە.

ئەم وەهمانە – بەهۆی تەقلیدو خوو پێوەگرتنەوە – هەڵەیان تێ دەکەوێ، تەنانەت زۆر جار وا رێ دەکەوێو رێ کەوتووە پیاو بەرەنگاری حەقو راستی بکا لە پێناوی بڕوایەکی هەڵەو رایەکی پووچی وا کە خووی پێوە گرتووەو بە گوێرەی رۆژگارو بیئەو دەوروبەر پێی ئاشنابووە. لەم روانگەیەوە دەبینین قورئانی پیرۆز – کاتێك موناقەشەی جولەکەکان دەکاو فەرمانیان پێ دەکا شوێن بەرنامەی پێغەمبەرو بکەونو پەیڕەوی قورئان بکەن – پێ لەسەر ئەوە دادەگرێو تەئکیدی ئەوە دەکا کە موسوڵمان نەبوونی ئەو جولەکانەو نەهاتنیان بۆ ژێر ئالای ئیسلام بەهۆی تەقلیدی کوێرانەو کۆنەپەرستیو شوێنکەوتنی هەواو هەوەسی ناڕەوایانە! ئەوەتا خودای مەزن دەفەرموێ:

{فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءهُمْ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ-سورة القصص/٥٠}.

واتــە: ئــەی پێغەمبــەر! ئەگــەر ئــەوان – واتــە جولەکــەکان – گــوێ بیــستی ئامۆژگارییەکانت نەبوونو بە پیر بانگەوازییەکەتەوە نەهاتن ئـەوە بزانـە ئەوانـە شـوێن هــەواو هەوەســی خۆیــان دەکــەونو ســەرگەردانن! جــا کــێ لــەو کەســە سەرگەردان ترە کە بەبێ ڕەهنومایی خودا شوێن ئـارەزۆو هەوەسـی خـۆی بکـەوێ جـەورو سـتەم لـەخۆیو کۆمـەڵی بکـا؟! بێگومـان پـەروەردگار هـەرگیز کۆمـەڵی جەورو ستەمکار هیدایەت نادا!

شتێکی ڕونو ئاشکراشە کە زوربەی هۆیەکانی شوێن هەواو هـەوەس کـەوتن لـەم ژیانی دونیایەدا دەگەڕێنەوە بۆ نەفس زەعیفـیو بیرتەسـکیو بـێ ورەیـی، شـەهوەتو ئارەزۆ عەقڵو هۆش لای مـرۆڤ ناهێڵـێ، هەسـتو بـیری ڕاسـتی لێ زەوت دەکاو وای لێ دەکـا کـە بـە هـەموو هێزێکییـەوە بـۆ هـەدەفێکی تایبـەتی نـاڕەوا هەوڵبـدا! چـونکە ئینسان کە شتێکی خۆشویست زۆر سەرنجی لێ دەداو بـیری لێ دەکاتـەوە، تەنانـەت بـیر هـەر لـەو دەکاتـەوە!! بۆیـە دەبیـنین کـە بۆچـوونی هـەواو هـەوەس ئاکامـەکانیان زۆر جیاوازن لـە بۆچـوونی ئاکـامی عـەقڵو هـۆش... لـەم ڕوانگەوەیـە کـە قورئـانی پـیرۆز وەسـفی ئاکـامی هـەواو هەوەسـی کـردوە بـەوە کـە سـەر لێتێکدەرەو ڕێگـای ڕاسـت لـە مرۆڤ چەواشە دەکات.

{وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَائِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِالْمُعْتَدِينَ - سورة الأنعام – ١١٩}.

واتە: زۆر لەو خەڵکە بەهۆی هەواو ئارەزۆوە بەنەزانی سەر لێ شێواو دەبـنو ڕێگای گومڕایی دەگرنە بەر!!

{بَلِ اتَّبَعَ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَهْوَاءهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ - سورة الروم – ٢٩}.

واتــە: بەڵــکوو ئــەوزاڵمو ســتەمکارانە – بەنــەزانی – شـوێن هـەواو هەوەسـی خۆیــان کــەوتوونو کوێرانــە ملیــان لێنــاوە!! جــا بــۆ چارەســەری ئــەم نەخۆشــییە، قورئـانی پـیرۆز باشـترین سەرمەشـقی دانـاوە بـۆ زاڵبـون بەسـەر هـەواو هەوەسـدا

ئەویش بریتییە لە روکردنە خودا بە تەواوی‌و خۆگرتنەوە لە موخالەفەی ئەمرو فەرمانی‌و پەیرەوی‌و گوێ پێدانی ئامۆژگارییەکانی.

{وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى-سورة النازعات/٤١}.

واتە: بەلآم کەسێك لەخودا بترسێ‌و نەفسی خۆی لە هەوەس بگێرێتەوە، بێگومان بەهەشتی بەرین جێگایەتی. ئەم لە خودا ترسانە بەو جۆرەو گرتنەوەی نەفس لە خراپەکاریی‌و رامکردنی بۆ ئەوەی رێگای حەق بەرنەدا – بە تایبەتی کە لە جەوێکی ئاینیدا ئەم کارانە ئەنجام بدرێن هەر لەبەر رەزامەندی خودا بن!! باشترین چارەن بۆ ئەوەی جڵەوی نەفس بگرێتەوەو کەمەندی بکا.

## خۆ بەزلزانین‌و لوتبەرزی (الکبریاء):

خۆ بەزلزانین رەوشتێکی نەشیاوو ناشیرینی کۆمەڵایەتییە، دوو بەرەکی‌و دوژمنایەتی لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵدا دەروێنێ‌و قەلآچۆی گیانی یامەرتی‌و خۆشەویستی ناویان دەکا!!

خۆ بەزلزانی وەنەبێ هەر قەلآچۆی خۆشەویستی نێوانمان بکاو بەس! بەڵکوو وامان لێ دەکا کە نەتوانین هەڵەکانی خۆمان هەڵگرینەوەو ئیصلاحی ئەدەبی خۆمان بکەین، چونکە خۆ بەزلزان (متکبر) عەیب‌و عاری خۆی نابینێ‌و وادەزانێ لە ژور پلەی کۆمەڵەوەیە، لە عاست هەموو رەخنەو ئامۆژگارییەك گوێچکەی خۆی دە ئاخنێ‌و تەنیا بۆ مەدح‌و سەناو پێداهەڵدان گوێی دەگرێ، چونکە کەسێك کە خود پەسندبێ‌و خۆ بەزل بزانێ هەرگیز ئامۆژگاری نابیسی‌و قسەی باش کاری تێ ناکا، بەمەش پەردەیەکی ئەستورو قایم دادەداتەوە لە نێوان خۆی‌و زاناو پیاو چاکاندا هیچ سوودێك لە زانست‌و ئامۆژگارییان نابینێ‌و لە زەلکاوی نەزانی‌و گومراییدا گیر دەخواو پەی بەرێگای راستی رزگاری نابا!!

بۆیە سوننەت‌و ویستی خودا وابووە کە هەم دەم دڵ‌و دەروونی خۆ بەزلزانان وا لێ بکا کە گوێ بۆ سروشی خودا رانەگرن‌و لە عاست ئامۆژگاری پێغەمبەراندا کەرو کوێر بن، چونکە ئەو خۆ بەزلزانانە خودا بۆ خۆی بە گومرای نوسیون‌و

سەریان لێ تێکچووەو شایانی غەزەبی پەروەردگار بوون، بەهۆی تەکەبوورو خۆ بەزلزانی خۆیانەوە:

**{سَأَصْرِفُ عَنْ آيَاتِيَ الَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي الأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَإِن يَرَوْاْ كُلَّ آيَةٍ لاَّ يُؤْمِنُواْ بِهَا وَإِن يَرَوْاْ سَبِيلَ الرُّشْدِ لاَ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلاً وَإِن يَرَوْاْ سَبِيلَ الْغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلاً - سورة الأعراف – ١٤٦}.**

واتە: ئەوانەی لەسەر زەوی بە ناحەق‌و ناڕەوا تەکەبوور دەکەن‌و خۆ بەزل دەزانن ناهێڵم لە قورئان تێ بگەن‌و دڵیان مۆر دەکەم‌و سەریان لێ تێکدەدەم. ئەو خۆ بەزلزانانە ئەگەر ئایەت‌و نیشانەی گەورەیی‌و خودایەتی ئێمە ببینن – با زۆریش ئاشکرابن – ئیمانی پێ ناهێنن، ئەگەر ڕێگەی ڕاست‌و دروستیان نیشان بدرێ پێیدا ناڕۆن‌و نایکەنە ڕێبازی خۆیان، کەچی ئەگەر ڕێگای گومڕایی‌و سەرلێ شێواوییان بەدی کرد، دەیکەنە ڕاڕەوی خۆیان‌و ملی لێ دەنێن.

قورئانی پیرۆزئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە خۆ بەزلزانەکان یاخی ترین گرۆه بوون بۆ بیستنی ئامۆژگاری پێغەمبەرەکان‌و بە پیرەوە چوونی پەیامەکەیان ئەوەتا هەڵوێستێ لە هەڵوێستەکانی قەومی صالح پێغەمبەرمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ:

**{قَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُواْ مِن قَوْمِهِ لِلَّذِينَ اسْتُضْعِفُواْ لِمَنْ آمَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَالِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِ قَالُواْ إِنَّا بِمَا أُرْسِلَ بِهِ مُؤْمِنُونَ، قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُواْ إِنَّا بِالَّذِيَ آمَنتُمْ بِهِ كَافِرُونَ - سورة الأعراف – ٧٥-٧٦}.**

واتە: خۆ بەزلزان‌و ملهوڕەکانی هۆزی صالح پێغەمبەر وتیان: بەو ژێردەستەو مسکێن‌و ستەمدیدانەی کە باوەڕیان بە صالح پێغەمبەر هێنابوو، ئایا ئێوە وا دەزانن کە ئەم صالح ناوە پێغەمبەرەو لەلایەن خوداوە نێردراوە؟! ئەوانیش لەوەڵامدا وتیان ئێمە نەك هەر ئەوەندە پێمان وایە ڕاست دەکاو بەس! بەڵکوو ئیمانیشمان پێی هێناوەو شوێنی کەوتووین! ئەمجار خۆ بەزلزان‌و ملهوڕەکان گوتیان: دەی پێغەمبەرێ کە ئێوە ئۆمەتی ئەو بن بەکەڵکی ئێمە نایەت‌و ئیمان بە پێغەمبەری وا ناهێنین!!..

ئەوەش سەرگوڕشتەی قەومی عادە کە لە عاست سروشی خودا تەکەبووریان کردو گوێچکەی خۆیان هاخنی تا بەسزای بەئێشی خۆیان گەیشتن:

{فَأَمَّا عَادٌ فَاسْتَكْبَرُوا فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَقَالُوا مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ، فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِي أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ الْخِزْيِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَخْزَى وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ-سورة فصلت- ١٥-١٦}.

واتە: هۆزی (عاد)یش بە ناحەق و ناڕەوا لەزەویدا تەکەبووریان کردو خۆیان بەزلزانی، وتیان کێ بێ لە ئێمە بەهێزتربێ و وەکوو ئێمە بەشان و شەوکەت و دەست و بازوو بێ؟! بەراستی ئەو قەومە نەزان و بیرتەسك بوون، ئایا نەیاندەزانی کە ئەو خودایەی ئەوانی دروست کردوە لەوان بەهێزترەو دەستی قودرەت و توانای لە ژوور ئەوانەوەیە؟! هیچ لەئەوە نەفکرین و بەرامبەر بە ئایاتی ئێمە سەرپێچییانکرد ئێمەیش لە سزای ئەوەدا لەچەند رۆژێکی شوومدا رەشەبایەکی سەختی ساردمان نارده سەریان و سزایەکی وامان دان لە جیهاندا پێی ریسوا تربوون، دیارە کە سزای ئەو دونیایان سەخترە، ئەوانە لە هەردوو جیهاندا بێ پشت و پەناو یارمەتیدەرن لەم دنیاش کەس ددانی خێریان پێدا نانێ و لەو دونیاش کەس شەفاعەتیان بۆ ناکا!.

لەشوێنێکی تردا دەبینین پەروەردگار هەڕەشەی توندو ترسناك لەخۆ بەزلزانەکان دەکاو دەفەرموێ:

{أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ - سورة الزمر- ٦٠}.

واتە: ئایا ئاگری دۆزەخ بەس نییە بۆ ئەوان کەببێتە بەندیخانەو خانوی مانەوەیان هەتا هەتایە بەهۆی خۆ بەزلزانی دونیایانەوە تێیدا بمێننەوە؟!

دەی باشە با ئێمە پرسیارێك بکەین و بڵێین: دەعیەزل و فیزنەکان بەچی دەنازن؟ ئایا بەهێزو بازوو تواناو جوانی و شۆخ و شەنگی دەنازن؟! بێگومان ئەم دیاردانە لە گۆڕاندان و رۆژ بەرۆژ لەزیادو کەمیدان و پاش ماوەیێك نامێنن هەر نەخۆشی و لەرزوتایەکی سووکەڵە جەستە تێك دەداو هەموو رۆژێ رۆژگار کاری خۆی

تێ دەکاو وردە وردە وای لێ دێ دوای چەند ساڵێك پیرو کەنەفت دەبێ!! خۆ ئەگەر بە ماڵو دارایی دەنازن با ئەوە بزانن کە مردنو بەڵاو موصیبەت جیاوازی نێوان دەوڵەمەندو هەژار ناکا، ئەبێ ڕۆژێك مرۆڤ ماڵو دارایی خۆی بۆ یەکێکی تر بەجێ بێڵێ! بۆیە دەبینین قورئانی پیرۆز ئامۆژگاری خەڵك دەکا کە هەرگیز لوتبەرزی نەنوێننو خۆ بەزل نەزانن:

{وَلاَ تَمْشِ فِي الأَرْضِ مَرَحًا إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ الأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ الْجِبَالَ طُولاً - سورة الإسراء – ٣٧}.

واتە: بەسەرزەویدا بەدەعیەو تەکەبوور مەڕۆ، وەکوو جەببارو خۆ بەزلزانان ڕەفتار مەکە، چونکە تۆ بەم ڕۆیشتنەت ناتوانی ئەرز کون بکەیو لەرزەی پێ بخەی، چەندێك لوت بەرزکەیتەوە ناتوانی بە ئەندازەی کێوێك بەرزی بنوێنی! لە شوێنێکی تردا پەروەردگار داوا لە ئادەمیزاد دەکا کە هەرگیز تەکەببور نەکاو خۆی بەزلنەزانێ!

{وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ - سورة لقمان – ١٨}.

واتە: هەرکاتێ ئاخاوتنت لەگەڵ خەڵکدا کرد بەفیزەوە ڕوو وەرمەگێڕەو بەرامبەرەکەت بەهیچ پوچ سەیر مەکە، کە بە سەرزەویدا دەڕۆی بە تەکەببورو فیزەوە مەڕۆ، چونکە پەروەردگار هەرگیز دەعیە زلو خۆ بەزلزانی خۆش ناوێن.

خوێنەری ئازیز! تەکەببور ئەو ڕەوشتە ناشیرینەیە کە پەروەردگار زەمی کردوەو بانگەوازی ئادەمیزادی کردوە کە خۆی لێ دوربخەنەوە، چونکە ئەم جۆرە ڕەوشتانە کۆمەڵ تێك دەدەنو بوغزو کینە لەناو دڵاندا دەچێنن! کەوابوو پێویستی سەرشانی مامۆستاو دوعاگۆو پیاوچاکانو پیاوانی پەروەردەیە کە دژی ڕەوشتی فیزنیو خۆبەزلزانین بوەستنو بەهەموو هێزو توانایەکیانەوە هەوڵی قەڵاچۆکردنی بدەن زیانەکانی بۆ کۆمەڵ ڕوون بکەنەوە، تا خەڵکی بتوانن لێی دوورە پەرێزبنو خۆی لێ بپارێزن، هەمیشە هەوڵ بدەن کۆمەڵ لەسەر بناغەی خۆشەویستی دابمەزرێنن.

## مەینۆشی قومارکردن (الخمر والقمار):

پەروەردگار دەبارەی تاوانی مەینۆشیو قومارکردن دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ[1] رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ، إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللّهِ وَعَنِ الصَّلاَةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ - سورة المائدة – ٩٠-٩١}.

واتە: ئەی خاوەن باوەڕان! ئەی موسوڵمانەکان! عەرەقو قومارو بەخت گرتنەوە بەشێکن لە کردارە پیسەکانی شەیتانو خۆتانیان لیٚ دوور بخەنەوە، بەڵکوو سەرفرازی دونیاو قیامەت بن. بزانن کە شەیتان دەیەوێ بە هۆی مەینۆشیو قورماکردنەوە ناخۆشیو دوژمنایەتی بخاتە ناوتانەوە، یادی خوداو نوێژتان لەبیر بەرێتەوە، لە ڕێگای خودا پەرستی لاتان بدا! ئایا ئێوە پاش ئەم روونکردنەوەیە دوای ئەم ئامۆژگارییە راستو رەوانە لەو کردەوە خراپانە واز دێنن!؟!.

لێرەدا پەروەردگار مەیو قوماری بەپیسو کرداری شەیتان حسێب کردوە. بە وشەی (رجس) ناوی بردوە (رجس)یش لە زمانی عەرەب دا ئەوپەڕی پیسیو

---

[1] الميسر: واتە: قومار (الانصاب): ئەو بەردە یان ئەو بتەیە کە عەرەبەکان کاتی خۆی قوربانیان لەلا سەر دەبڕین.

الأزلام: پارچە دارێکی باریکی سوکەڵەبووە لە وێنەی سەرەتیر (یا نصیب)یان پێ کردوە، بەو جۆرە سێ سەرەتیر (الأزلام)یان هێناوە لە وێنەی یەکتری: یەکەمیان، لەسەری نووسراوە (أفعل) بکە ئەوی تریان لەسەری نووسراوە (لا تفعل) مەکە، سێهەمیان، هیچی لەسەر نەنووسراوە هەرکاتێ ویستیان بەختی خۆیان تاقی بکەنەوە بۆ کارێکی گرینگ هاتوون هەرسێك جۆرە تیرەکەیان خستونەتە ناو توورەکەیەکەوەو ئەمجار دەستی بردۆتە ناو هەگبەکەوەو یەکێك لەو سەرە تیرانەی دەرهێناوە جا ئەگەر ئەوە بووبێ کە لێی نووسراوە (افعل) ئەوە یەکسەر کارەکەی ئەنجامداوە ئەگەر لێشی نووسرابێ (لا تفعل) ئەوە وازی لە کارەکە هێناوە ئەگەر ئەو تیرەش بووبێ کە هیچی لەسەر نەنووسراوە ئەوە چەند جارێکی تر تیرەکانی خستۆتە ناو هەگبەکەوەو تاوای بۆ ڕێکەوتووە کە دانەیەك لەو دو دانەیەی پێشەوەی بەدەستەوە هاتووە.

ناشیرینی دەگەیەنێ! خۆ پاراستنیشی لە مەینۆشیو لە قوماركردنی كردوە بەهۆی سەرفرازی ژیانی مرۆڤ، كەوابوو نزیك بوونەوە لێیان هۆی ماڵوێرانی ژیانی دونیاو قیامەتە! هەر بەمەشەوە نەوەستاوە بەڵكوو عەرەقو قوماری كردوە بە كۆڵەوەژو هەڵگیرسێنەری ئاگری دوژمنایەتیو رقو كینە، ئەوەش خراپترین روخێنەرو ماڵوێرانكەری ژیانی دوەنیایە. لەكۆتایی ئایەتەكەدا پەروەردگار عەرەقو قوماری داناوە بە گەورەترین كۆسپ لەبەردەم خودا پەرستیو نوێژكردندا.

## زەرەرو زیانی عەرەق:

زەرەرو زیانی مەینۆشی زۆرو زەبەندەو نازمێردێن، چونكە عەرەق خواردنەوە وا لە كابرای مەینۆش دەكا ویژدانی بمرێو حەیاو شەرمی بتكێ، هیچ شتێكیش نییە بە ئەندازەی ویژدان مردنو نەمانی حەیاو شەرم زەرەرو زیان بە كۆمەڵی ئادەمیزاد بگەیەنێ، چونكە ویژدان مردنو بێ حەیایی پاڵ بە عەرەق خۆرەوە دەنێ كە ئەخلاق فڕێ بداو چی كرداری نەشیاو هەیە بیكا، تەنانەت زۆر لە روداوی پێشێلكردنی ناموسو خیانەتی ژنو مێردایەتیو داوێنپیسی كە روودەدەن بەهۆی خواردنەوەی عەرەقەوە ڕوودەدەن، كە ئەمانەش دەبنە هۆی جودابوونەوەی ژنو مێردو روخانی خانووی خێزانو پەرتەوازەبوونی منداڵی وردو ساواو پەیدابوونی غەمو نارەحەتیو پەشیمانی بێ سوود!! (واقیع)یش دەری خستووە كە زۆر روداوی هەرچیو پەرچی كە سەر دەكێشن بۆ كردنی تاوانی گەورە، لە مەیخانەو شوێنی عەرەقخواردنەوەدا روو دەدان!!

كەسانێكیش هەن كە داكۆكی لە عەرەق خواردنەوە دەكەنو دەڵێن: ئازاری دەروونیو بەڵاو موسیبەتو تەنگو چەڵەمە ئەوەندە زۆرو زەبەندەنو پەرەیان ستاندوە پیاوی ناچار كردوە پەنا بۆ عەرەقخواردنەوە بەرێ!

لەوەڵامی ئەوانەدا دەڵێین تەنگو چەڵەمەی دنیایی ئێشو ئازاری دەروونی بە عەرەق خواردنەوە قەڵاچۆ ناكرێن، بەڵكوو بە بەهێزكردنی ئەخلاقو بە

پەروەردەکردنی خەڵکی لەسەر زەبتی نەفس (خۆزەوتکردن)و صەبرو ئارامی پێویستو دڵدانەوەی رۆحیی ئەنجام دەدریٚ!

هەرکاتێکیش ئادەمیزاد دڵی تەنگ بوو خێرا پەنا بۆ عەرەق خواردنەوەی بەریٚ بەو هیوایە ئازاری دەروونی خۆی سوك بكاو ویژدانی بمرێنیٚ، بێگومان لەجیاتی سوككردنی ئازارەكە ئازارێكی تر دەخاتە سەرشانی خۆیو ئەوەندەش نابا كە هەمان ئازاری پێشووی بۆی دەگەرێتەوە! ئیتر مرۆڤەكە وای لیٚ دیٚ زەعیفو زەبوون دەردەچیٚو توشی ئینهییاری عەصەبی دەبیٚ، یان هیچكەنەبیٚ دەبێتە مەینۆشێكی مودمینو خوی پێوە دەگریٚ، بەمەش رێگای (انتحار) خۆ كوژی دەگرێتە بەرو زۆری پیٚ ناچیٚ سلار دەبێتەوە، ئەو ماوەیەش كە بە حیساب زیندووە بە داهێزاویو لەشگرانی ژیان بەسەر دەباو هەمیشە لەش بە ئازارو ئەندێشناكە...!

لەلایەكی ترەوە مەینۆشی زەرەری كۆمەڵایەتی هەیە، لەم رووەوە كە عەرەقخواردنەوە دەبێتە هۆی پەیدابوونی دوژمنایەتی، دژایەتی لە نێوان دۆستو برادەردا، چونكە عەرەقخۆر سەرخۆش دەبیٚو عەقڵو هۆشی نامێنیٚ، فەرقی چاكو خراپ ناكا، ئەو كاتە قسەی ناشرینو نەشیاوی لەدەم دەردەچیٚ، كرداری خراپی لێوە روودەداو ئەزیەتو ئازاری خەڵك دەدا، هەر لە خۆوە تورە دەبیٚو بەبیٚ هۆ هەڵدەچیٚو دەبێتە هۆی شەرو هەراو ناخۆشی، هەروەها عەرەقخواردنەوە ئینسان لە یادی خودا دوور دەخاتەوە، چونكە – وەكوو وتراوە – سەرخۆش عەقڵو هۆشی نییە كەوابوو چۆن یادی خودا بكاتەوەو چۆن بەندایەتی بۆ خودا ئەنجام بدا، عیبادەتو خودا پەرستیش بەبیٚ عەقڵو هۆش ئەنجام نادرێن... هەر لەم روەوەیە كە ئایینی ئیسلام – بە پێچەوانەی هەموو ئایینە ئاسمانییەكان – هاتووە عەرەقی حەرام كردوەو حەدو سزای بۆ عەرەق خۆر داناوەو بە تاوانی گەورەی حسیب كردوە، یەكێكیش لە ئەركە گرینگەكانی ئایین ئەوەیە مرۆڤ بانگ بكا بۆ خودا پەرستی، دەی كە مرۆڤ سەرخۆش بوو چۆن عیبادەتی خودا بكا!؟ كەوابوو حەرامكردنی عەرەق لە ئایینی ئیسلامدا بە

یاسایەکی شاکاری ئەم ئایینە دەژمێردرێو بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەم ئایینە ئایینێکی ڕۆحییە بەرنامەو تەشریعاتی هەموو بۆ ئەوەیە نەفسو دەروون لە چڵکی ماددە پاك بکاتەوە!

## زەرەرو زیانی قومار:

یەکەم شتێك کە ئێمە لە زەرەری قومار بەدی دەکەین ئەو زەرەرە ماڵیەیە کە قومارکەری دۆڕاو دەیکا –جا هەر چەندە ئێمە– خوایاربێ – لە باسی ژیار (اقتصاد)ی ئیسلامیدا بە درێژی باسی ئەم لایەنە دەکەین بەڵام لێرەدا هەر ئاماژە بۆ ئەو زەرەرو زیانە دەکەین کە لە قورمارەوە پەیدا دەبن وەکوو دوژمنایەتی دژایەتی، یەکتری بوغزاندن. چونکە قازانجو سوودی قومارکەر لەسەر زەرەری دۆڕاوەکە پەیدا دەبێ، کە بە ئاشکرا ماڵی برای خۆی داگیر دەکاو بە بەرچاوی خۆیەوە گیرفانی هەڵدەتەکێنێ، خۆ تا مرۆڤ زیاتر خەسارەتمەند بێ زیاتر رقی لەو کەسە دەبێتەوە کە زەرەرەکەی بۆ هێناوەو ماڵەکەی لەچەند ساتێکدا لێ ستاندووە!؟

زۆر جار وا ڕێ دەکەوێ قورمارکەر خوو بە قورماکردنەوە دەگرێو وازی لێ ناهێنێ هەتا هەموو ماڵو دارایی خۆی لەدەست دەداو سەیتەرەی نامێنێ بەسەر خۆیداو لە ئاکاما خۆی دەکوژێ یان بەچاو بەرەو ژێریو سەرکۆنەکراوی دەژی!!

قومار یادی خودا لەبیر دەباتەوە، لە نوێژکردن لای دەدا، چونکە قورماکەر بە هەموو هۆشو بیرێکیەوە سەرنجی خۆی دەخاتە سەر ئەو یاریی قورمارەی کە زەرەرو قازانجەکەی لێ پەیدا دەبێ! تەنانەت وا تێیدا ڕۆدەچێ ئاگای لە هیچ نامێنێو جگە لە یارییەکە هیچی تری بەخەیاڵدا نایە، نوێژو یادی خودای هەر لەبیرا نایە. بەکورتی هیچ کردارێك نییە وەکوو قومار ئینسان لە فیکرو یادی خودا غافڵ بکا!

کەوابوو حەرامکردنی قومار باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئایینی ئیسلام ئایینێکە ڕۆحییەو هەر شتێك زەرەری بۆ ئادەمیزاد هەبێو یادی خودای لەبیر برێتەوە نەهی لێکردوە.

## درۆو دیاردەکانی (الكذب ومظاهره):

درۆو دەلەسە سەرچاوەی هەموو رەوشتێکی پەستو ناشرینن، بەهۆی درۆوە دیواری قەلای کۆمەڵ دەروخێ رەورەوەی کاروبار تێك دەچێ! درۆزن لە پێش چاوی کۆمەڵ بە سووك تەماشادەکرێو کەس باوەری پێ ناکاو سیقەیان پێی نامێنێ، زوربەی ئادەمیزاد لە ژیاندا خاوەن پیشەو بەرژەوەند (حرفة ومصلحة)ن ئەمانە پێش هەموو کەسێك ئاتاجی راستگۆییو سەرراستین، پێویستیان بە بتمانەی خەڵکی تر هەیە، درۆزنییان ئەم سیقەیەیان ناهێڵێ. بۆیە پەروەردگار ئەوەندە بە توندی دژی درۆزن دواوەو عەهدی کردوە کە هەرگیز درۆزن هیدایەت نەداو نەیخاتە سەر رێگای راست.

{إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ - سورة الزمر – ٣}.

هەروەکوو چۆن لە ئایەتێکی تردا هەڕەشەی توندی لە درۆزنان کردوەو بە سزای بەئێشی رۆژی رەستاخیز ترساندونیو فەرموویەتی:

{وَلاَ تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ الْكَذِبَ هَذَا حَلاَلٌ وَهَذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُواْ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ لاَ يُفْلِحُونَ، مَتَاعٌ قَلِيلٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ - سورة النحل – ١١٦-١١٧}.

واتە: نەچن هەر لە خۆتانەوە شت حەرامو حەڵاڵ بکەن هەروا بەهەوانتەو ئارەزۆ بەبێ بەڵگەو دەلیل بڵێن: ئەوە حەڵاڵەو ئەوە حەرامە بەمە درۆ بەدەم خوداوە هەڵدەبەستن بەبێ ئەوەی ئەو حەرامکردنو حەڵاڵکردنە لە خوداوەبێ، ئەمە کارێکی خراپە، چونکە دانانی شەرعو ئایینو پرۆگرام تەنها هی خودایەو کەسی تر مافی ئەوەی نیە ئەم شت حەڵاڵ بکا ئەو شت حەرام بکا.

ئەم کەسانەی درۆ بەدەم خوداوە هەڵدەبەستن، یاساو نیزامێك کەهی ئەو نییە پاڵ ئەوی دەدەن، هەرگیز ناگەنە مرازی خۆیان ئۆخەی لە ژیانی خۆیان ناکەن! ئەو پارەو پوولو جێگاو رێگایەی بەهۆی ئەم درۆو دەلەسەو فتوا بە ناحەقدانە دەستیان دەکەوێ شتێکی کەمو کورت ماوەیەو زۆر ناخایانێ لەناو دەچێو مایە پووچ دەبن لە قیامەتیشا سزای بەئێش لە ئامێزیان دەگرێ.

جا وەنــەبێ درۆ هــەموو کاتــێ حــەرام بــێ بەڵــکوو کــاتو ڕوداوی وا هەیــە درۆکردن لە راستگۆیی باشترەو سوودی بۆ ئـادەمیزاد زیـاترەو پێویـستە پیـاو درۆ بکاو راستییەکە نەڵێ: وەکوو درۆکردنی کاتی ڕێکخستنەوەی نێوان دوو کـەس کـە لێك عاجزن، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووویەتی:

« لَيْسَ الْكَذَّابُ الَّذِي يُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ ، فَيَنْمِي خَيْرًا ، أَوْ يَقُولُ خَيْرًا .

واتە: بەو کەسە ناڵێن درۆزن کە قسەی خێـر دروسـت دەکـاو دوو موسـوڵمانی پێ ئاشت دەکاتەوە.

## خیانەتکاری:

خییانـەتکاری خراپـترین جۆری درۆیـە کـە ئینـسان خـوی پـێ دەگـرێ، زەرەرو زیانی ئەو خیانەتەش راستەو خۆ دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵ، خیانـەتیش لـەناو هـەر گەلو هۆزێکدا بڵاو بووە ئەوە نیـشانەی ئەوەیـە کـە لـەناو دەچـێو وێـران دەبـێ، بۆیـە پـەروەردگار نـەهی کـردوە لـە موسـوڵمانان کـە هـەرگیز تـوخنی خییانـەت نەکەون خۆی لێ دوورە پەرێز بگرن، دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَخُونُواْ اللّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُواْ أَمَانَاتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ - سورة الأنفال – ٢٧}.

واتــە: ئــەی خــاوەن بــاوەڕان! نەکـەن خییانــەت لــەخوداو پێغەمبــەر بکــەنو ئەرکی سەرشانتان بەجێ نەهێنن خییانەت لە خودی خۆشـتان بکـەنو ئەمانـەتی خۆتان نەپارێزنو بە ئەنقەست سەرپێچی لە فەرمانی پەروەردگار بکەن!

لــە شــوێنێکی تــردا پــەروەردگار رایگەیانــدووە کــە خائینــانی خــۆش نــاوێنو دەیانبوغزێنێ دەفەرموێ:

{إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا - سورة النساء -١٠٧}.

کـەوابوو پێویـستی سەرشـانی ئەوانەیـە کـە هـەوڵ دەدەن بـۆ دروسـتکردنی کۆمــەڵی بەختــەوەر کــە هەرچــی هێــزو توانایــان هەیــە تــەرخانی بکــەن بــۆ

قەلاچۆکردنی ئەم رەوشتە ناشیرینە کە خیانەتو خیانەتکارییە، بەڵکوو بتوانن کۆمەڵ بگەیەننە ژیانی بەختەوەریو ئاشتی...

## بێ پەیمانی (خلف الوعد):

جۆرێکی تر لە درۆو چەوتی بەجێ نەهێنانی وەعدو پەیمانەو بێ بەڵێنییە... ئەم رەوشتە رەوشتێکی تا بڵێی ناشیرینو قێزلێکراوە نیشانەی ئەوەیە خاوەنەکەی بێ شەخصیەتو زەبوونەو هەرگیز خێرو بێری لێ چاوەڕوان ناکرێو لە هیچ شتێکدا متمانەی پێ ناکرێ، بێ پەیمانی خۆشەویستی لەناو کۆمەڵ ریشەکێش دەکاو زەرەرو زیانی زۆر بەتاكو کۆمەڵ دەگەیەنێ، زۆر کاتی بەنرخ بە فیڕۆ دەدا! لەبەر ئەوە پێغەمبەر پەیمان شکاندنو بێ بەڵێنی داناوە بە رەوشتی مونافیقو دووروەکانی کۆمەڵو دەفەرموێ:

«آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلاَثٌ إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ. رواه البخاري ومسلم .

واتە: نیشانەی ئادەمیزاد مونافیقو دووڕوو سێ شتە: کاتێ قسەی کرد درۆ بکا، ئەگەر وادەیدا بەشتێك وەعدەکەی بشکێنێو نەیباتە سەر، ئەگەر ئامانەتێکیان لا دانا خیانەتی تێدا بکا!

## شایەتی بەدرۆ (شهادة الزور):

شایەتی درۆ جۆرێکە لەو درۆیانەی ئاکامێکی خراپ بۆ کۆمەڵ بەدەست دێنێ، گیروگرفتی سامناك دەخاتە ناو کۆمەڵو دەبێتە هۆی لەناوچوونی گیانی بێتاوانانو فەوتاندنی ماڵو دارایی بە ناحەقو بڵاوبوونەوەی ئاژاوە لە وڵاتدا، بۆیە پەروەردگار تاوانی شایەتیدانی بەدرۆی بە هاوشانی هاوەڵ بۆ خودا پەیداکردن حسێب کردوە، بە خراپترین شەڕو تاوانی داناوەو فەرمانی پێکردووین کە خۆمانی لێ دوور بخەینەوەو فەرموویەتی:

{فَاجْتَنِبُوا الرِّجْسَ مِنَ الْأَوْثَانِ وَاجْتَنِبُوا قَوْلَ الزُّورِ - سورة الحج – ٣٠}.

واتە: خۆتان دوور بخەنەوە لە پیسییەك كە بت پەرستییەو هاوەڵ بۆ خودا پەیداكردنە هەروەها خۆتان بپارێزن لە قسەی درۆو شایەتی بەناهەق.

لە شوێنێكی تردا قورئان وەسفی پیاوچاكانی خۆی بەوە كردوە كە هەرگیز شایەدی بە درۆ نادەن.

{وَالَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ الزُّورَ - سورة الفرقان – ٧٢}.

## بوختانكردن بە پاكان (البهتان):

بوختانكردنیش بەشێكە لە دوورِوییی كە ئایینی ئیسلام حەرامی كردوە. مەبەست بە بوختان زوربەی كات بریتییە لە زڕاندنو لە كەداركردنی ناموسو سومعەی ئادەمیزادێك لە شەرەفو كردەوەیدا. بێگومان بوختان دەبێتە هۆی پەیدابوونی زۆر زەرەرو بەڵاو موسیبەت، زۆر بێتاوانو بێگوناه دەبنە قوربانی ئەم رەوشتەو زۆر خێزانو بنەماڵە سەریان لێ دەشێوێو توشی ناخۆشی دەبن، بۆیە پەروەردگار كۆمەڵی ئادەمیزادی ترساندووە لە بوختانكردنو فەرموویەتی:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَن تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ - سورة الحجرات – ٦}.

واتە: ئەی خاوەن باوەڕان ئیمانداران ئەگەر كابرایەكی فاسقو دووڕو هەواڵێكی بۆ هێنانو دەربارەی موسوڵمانێك خەبەرێكی پێدان كە دەبووە هۆی زڕاندنو لەكەداركردنی سومعەی ئەو موسوڵمانە، ئێوە دەسبەجێ قسەكەی لێ وەرمەگرنو بەراستی مەزانن، بەڵكوو بیخەنە بەرتیشكی لێكۆڵینەوە! نەوەكوو – خوانەخواستە– بە نەزانیو بە ناحەق كۆمەڵێك توشی كێشە بكەنو بیانخەنە ناو گیروگرفتی سامناكەوە دوایش كەرون دەبێتەوە ئەوانە بێتاوانو هەواڵ هێنەر لە گیرفانی خۆیدا ئەم پیلانەی رێك خستووە، ئێوە ژێوان ببنەوە بەڵام پەشیمانبوونەوە سوودی نەبێو تازە كار لەكار ترازابێ!!؟

## فیتنەیی‌و دووزمانی (النميمة):

بێگومـان فیتنـەیی‌و دووزمـانی جۆرێکە لەو درۆیانـەی کە نیشانەی ئـەوەن خاوەنەکەی ئادەمیزادێکی نەفس پەستەو دەروون نەخۆشە، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەو فیتنەیەو هەموو هیواو ئارەزۆیـەکی ئەوەیـە شەڕو ئاژاوە بکەوێتـە نـاو خەڵـکەوە، کێـشەو نیـزاع لەناویانـدا بـەرپا ببـێ، جـا پێویـستە بزانـدرێ کـە گەورەترین چەك بۆ بەرامبەری کردنی فیتنە برێتییـە لـە گوێ پێنـەدانی‌و گوێ بۆ رانەگرتنی، بەمە لووتی دەشکێ‌و شەرمەزار دەبێ، خودا دەفەرموێ:

{وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ، هَمَّازٍ مَّشَّاء بِنَمِيمٍ - سورة القلم –١٠-١١}.

واتـە: هـەرگیز بـە گـوێی ئەوانـە مەکـە کـە بەناحـەق‌و نـاڕەوا زۆر سـوێند دەخـۆن، پڕوپـووچ‌و خـوێڕین، بـە ناحـەق ئـاگری فیتنـەیی هەڵدەگیرسـێنن‌و ئەمبـەرو ئەوبـەری پـێ دەکـاو بـە دووزمـانی خـۆی دوژمنایـەتی دەخاتـە نێـوان موسوڵمانانەوە.

## خەڵــك بە کەمزانین‌و سووککردنی (أحتقار الغير):

قورئـانی پـیرۆز لـە بانگەوازییـەکانی دا هەمیـشە مەبەسـتی بینـاکردنی کۆمـەڵێکی خودانـاس‌و بەختـەوەر بـووە، ئاشکراشـە کـە ئیکرامگرتنـی خەڵـك‌و رێزلێنانیان هـەدەفێکی گرنگی قورئانـە، لـەم روەوە کـە رێزلێنـان‌و ئیکرامگرتنـی یـەکتری یەکیـەتی کۆمـەڵ دەپـارێزێ‌و خۆشەویـستی بـڵاو دەکاتـەوە هۆکـاری دوو بەرەکی‌و دوژمنایەتی قەڵاچۆ دەکا.

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَومٌ مِّن قَوْمٍ عَسَى أَن يَكُونُوا خَيْرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَاء مِّن نِّسَاء عَسَى أَن يَكُنَّ خَيْرًا مِّنْهُنَّ وَلَا تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ بِئْسَ الاِسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الْإِيمَانِ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ - سورة الحجرات – ١١}.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا پەروەردگار فەرمان بە موسوڵمانان دەکا کە رێز لە یەکتری بگرن، چاودێری سومعەو کەرامەتو هەستو شعووری یەکتری بکەن هیچ کامێکیان – پیاو یان ئافرەت – گاڵتە بە ئەوی تریان نەکەن بە چاوی سوك سەیری یەکتری نەکەن، نابێ نە بەدەست نە بە زوبان نە بەچاو بە هیچ جۆرێك لە پلەو پایەی ئەمو ئەو بێننە خوارێ، هەرگیز فەقیریو لیباس شڕیو شەلی، کوێریێو لاڵیو نەنگی تر نەبنە هۆی رێزکەمکردنەوە چونکە زۆر جار وادەبێ گاڵتەپێکراو لای خودا زۆر باشترە لە گاڵتەکەر، لە میزانی خوادا ئەم جۆرە کەم ئەندامییە نابنە هۆی رێز کەمکردنەوە، زیاد لەوەش گاڵتە پێکراو هەوڵ ئەدا تۆڵەی خۆی بکاتەوە چی عەیبو نەنگی گاڵتەکەر هەیە بیخاتە روو، خۆ ئەگەر عەیبو عاری بۆ نەدۆزێتەوە بۆی هەڵدەبەستێ، بەمەش ناخۆشیو دژایەتی دەکەوێتە ناوەوە زیاتر ئاگری دووبەرەکی هەڵدەگیرسێ، کەوابوو رێز لە یەکتری نەگرتنو گاڵتە بەیەکدی کردن دەبنە هۆی چاندنی تۆوی ناکۆکیو دوژمنایەتی، پەتی نێوانو پەیوەندی خۆشەویستی دەپچڕێنێ.. ئەمجار پەروەردگار نەهی کردوە لە موسوڵمانان – کەبەرەو روو بەناحەق – تانە لە یەکتری بدەن، چونکە ئەمەش دەبێتە هۆی پەیدابوونی دژایەتیو ناکۆکی... پەروەردگار لەم ئایەتەدا هەموو موسوڵمانانی بەیەك نەفس حسیب کردوونو فەرموویەتی: {وَلَا تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ} ئایەتەکە ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە هەرکاتێ موسوڵمان عەیبی لە برای موسوڵمانی گرت وەکوو ئەوە وایە عەیب لە خۆی بگرێ.

ئەمجار نەهی کردوە کە مرۆڤ بانگی برای موسوڵمانی بکا بە ناوێك کە پێی ناخۆش بێ جا ناوە ناشیرینەکە خۆی بگرێتەوە یان باوکی یان دایکی یان هەر کەسێك کە پەیوەندی بە بانگلێکراوەکە هەبێ!! چونکە ئەم جۆرە بانگهێشتنە رقو کینە دەخاتە دڵەوە، لە کۆتایی ئایەتەکەدا پەروەردگار بەیانی ئەوەی کردوە کە گاڵتە بە یەکدی کردنو بەناوی سوكو ناشرین بانگهێشتنی یەکتری.. هتد. دەبنە هۆی گوناهباریو دەرچوون لە تاعەتی خودا، کەوابوو شایانی شانی

موسوڵمان نییە – دوای ئەوەی نووری باوەڕ چووە دڵیەوە – وابکا بە فاسق و بێ دین ناوببرێ!! هەر کەسێکیش لەم گوناهانە نەگەڕێتەوەو ئەم کردارە ناشیرینانە ئەنجام بدا، ئەوە زۆرو ستەم لە خۆی دەکا.

## گومانی خراپ سیخوڕی و جاسوسیکردن و پاشملە باسکردن:

خودای مەزن و پەروەردگار دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِّنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ - سورة الحجرات – ١٢}.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا پەروەردگار داکۆکی کردوە لەوە کە موسوڵمانان گومانی خراپ بە موسوڵمانان بەرن چونکە ئەمە سەردەکێشێ بۆ بەسووك زانینیان و ڕێز لێ نەگرتنیان و زیان پێ گەیاندنیان، بۆیە پەروەردگار فەرمان بە موسوڵمانان دەکاو لەو هەڵوێستە دەیانترسێنێ کە دەفەرموێ: (إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ) واتە: بڕی لەگومان بردن بەخەڵك گوناهو تاوانە. پێویستە ئەوە بزانین کە شك و گومان کاتێك نەشیاوو ناڕەوایە کە گومان لێکراو لەو کەسانە بێ کە بە ئەمین و ڕاستاڵ ناسرابێ، ئەگینا ئەو کەسانەی کە خراپەکارن و کۆ لە هیچ کردەوەیەکی ناشیرین ناکەنەوە گومانکردن لێیان حرام نییە.

ئەمجار پەروەردگار نەهی کردوە لەوە موسوڵمان جاسووسی لەسەر یەکتری بکەن و لە نهێنی یەکتری بکۆڵنەوە، چونکە ئەوە دەست تێوەردانی کارو باری ناو خۆیی خەڵکەو خۆ هەڵپەساردنە بە شێتێکەوە کە پەیوەندی بە کاری ئەوانەوە نیە، سوودی لێ نابینن جگە لە ڕق و کینە بەروبوومێکی تری نابێ. بەڵام ئەو داموو دەزگایەی کە کاربەدەستان و میری دایدەنێن بۆ دابینکردنی ئەمن و ئاسایش و شوێن پێ هەڵگرتنی گێرەشوێن و شەلاتی و خراپەکاران و دزو جەردەکان ئەوە

شتێکی پیرۆزە بە مەرجێك كاری سەرەكی خۆیان وەكوو پێویست ئەنجام بدەن‌و بەپێی ئایینی ئیسلام كۆڵ هەڵگرن‌و پەیجووری بكەن‌و خەفێتی ئەنجام بدەن!!

لە كۆتایی ئایەتەكەدا یەزدانی مەزن نەهی لە موسوڵمانان كردوە كە هەرگیز غەیبەت (لە پاشەملە بەخراپە باسكردن)ی یەكتری نەكەن جا چ بە باسكردنی ئاشكراو بە راشكاوی‌و بێ پێچ‌و پەنابێ یان بەهیماو ئاماژەو بەمەعنابێ، دەربارەی ئایین‌و دین بێ، یان دەربارەی كارو باری دونیایی بێ، پەیوەندی بەرەوشت‌و ئەخلاقەوە بێ، یان بەجەستەو ئەندامەوە بێ، چونكە باسكردنی ئەمانەو لكەداركردنیان ئاگری دوژمنایەتی‌و فیتنەیی هەڵدەگیرسێنێ، تەنانەت ئایینی ئیسلام ئەوەندە قێزی لە غەیبەتكردنە غەیبەتكردنی بە خواردنی گۆشتی مردوو داناوە كە برای موسوڵمانی خۆی دەمی تێژەنێ‌و بیخوا! ئەوەتا دەفەرموێ:

{أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ}.

واتە: ئایا كێ لە ئێوە پێی خۆشە كە گۆشتی برای خۆی بە مردوویی بخوا دیارە هەریەكێ لە ئێوە ئەمەی پێ ناخۆشە كەوابێ غەیبەتكردنی برای موسوڵمانی خۆتان ئاوا پێ ناخۆش بێ.

بەڵام كەسێك كە بە ئاشكرا بێدینیی خۆی بخاتەڕوو، كرداری ناشرین ئەنجامبدا دروستە غەیبەتی بكرێ بەو هێوایەی كە قێز لە رفتارو كردارەكانی بكرێتەوە خەڵك شوێنی نەكەون.

ئەمجار ئایەتەكەی قورئان بەوە كۆتایی هاتووە كە بانگەوازی كردوە بە تەقواو تاعەتكردنی خودا چونكە پەروەردگار تۆبە وەردەگرێ لەو كەسانەی كە لەو كردەوە ناشیرینانە دوور دەكەونەوە.

## داوێنپیسی (الزنا):

داوێنپیسی رەوشتێكی پەست‌و ناشرینە، ئادەمیزاد بێبەش دەكا لە ئارامی دەروونی، ئەو ئارامی دەروونییەی كە كەسانی راستاڵ‌و دەروون پاك هەیانە،

بێگومــان داوێنپــاكی ئاشــتیو ئــارامی دەخاتــە نــاو كۆمەڵــەوە بــە پێــچەوانەوە داوێنپیــسی پەشــیمانی لــە دوایــە، فەلــەقو دڵــەراوكێ دەخاتــە نــاو دەروونــەوە، هەســتكردن بــە گونــاه پەیــدا دەكا ئــەو هەســتكردنەش دەروونــی ئینــسان توشــی چــەندەها زەرەرو زیــان دەكــاو مــرۆڤ تووشــی هەناســەی ســارد دەكــا. ئاشكراشــە داوێنپــیس رێگــای نامــە شــروعو نــاڕەوا دەگــرێو واز لــە ژنو مێردایــەتی شــەرعی دێنــێ، دەیەوێ لەسەر سفرەو خوانی خەڵكی تر لامێژی بكاو بەبێ مانــدو بــوونو ئارەق ڕشتنو ئەرك لەخۆگرتن خۆشییەكی كاتی وەرگــرێو ئــاژەڵ ئاسا رەفتــاری ســەرجێی ئــەنجام بــداو پــاڵ بداتــەوەو ئــەركی مــاڵو خێــزانو ژنو مێردایــەتی هەڵنەگرێ! لە كاتێكا ژنو مێردایەتی قانوونو یاسایەكی سروشتییەو بــەپێی ئــەو یاســایە مــرۆڤ ئــەركی بــەخێوكردنو قوربانیــدانی بــڕی لــەژیانی خــۆی بــۆ بەرژەوەندی برێ كەسی تر هەڵگرتووە، هەروەها لە ئاكامی پێكەوەنانی خێزانــی بەختیارو رێكو پێكدا منداڵی بەرەوشتو ئەخلاق جوان پــەروەردە دەبــن، لــە دوا رۆژدا دەبنە ئەندامی راستاڵو بەغیرەت دەربەستی سەرو مــاڵو نــامووس دەبــنو بەخێرو خۆشی گشتییەوە دێن، ئا ئەمەیە ئــەو لــەززەتو خۆشــییە گیانییــەی كــە ژنو مێردی شەرعی هەستی پێدەكەن، بە پێــچەوانەوە داوێنپیــسی وەكــوو لافــاوی قوڕاو رەوشــتی ئــەدەبیمان دادەپۆشــێ، چــرای رونــاكی ئــەخلاقمان دەكوژێنێتــەوە، دەبێتە هۆی خستنەوەی چەند زۆڵو حەرامزادەی وا كــە دەبنــە بــارگرانی بەســەر كۆمەڵەوەو گێرەشێوێنی ناو وڵات، هەموو كاتێك هەستو شعووریان بریندارەو بە رەشبینی سەیری ژیان دەكەن رقیان لەم ژیانە دەبێتەوە كە بــارودۆخێكی وای بــۆ نەگونجانــدوون كــە لــە باوەشــی بــاوكو دایكێكــی شــەرعی دا پــەروەردەبینو دوا رۆژێكی بەختەوەریان بۆ برەخسێنن!!

خێزانو ژنو مێردایەتی پەیوەندییەكی مرۆڤییە دەبێتــە هۆی كۆبوونــەوەی نێرو مێ لەسەر بناغەی خۆشەویستیو فیداكاریو لێبوردن لە پێناو بەرژەوەنــدی یەكتری دا، وەكوو قورئان ئاماژەی بۆ كردوەو فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾.

واتە: پەروەردگار خۆشەویستیو عەتفو سۆزی خستۆتە نێو دڵی ئێوەی ژنو مێردەوە... بە پێچەوانەوە زیناو داوێنپیسی بریتین لە پەیوەندییەکی کاتی ئاژەڵی نێوان ژنو پیاوو لە سنووری لەززەتو خۆشییەکی کورتو بەرژەوەندییەکی شەخصی دەرناچێ، سەرباری ئەوەش زوربەی کات دوژمنایەتیو ناخۆشیو نەخۆشی بەرپا دەکا. لەبەر ئەم هۆیانەو هۆی تریش ئایینی ئیسلام داوێنپیسی حەرام کردوە بەکاری شەرم ئاوەرو فاحیشەو رێبازی خراپی داناوەو داوای لە ئادەمیزاد کردوە کە خۆیانی لێ بپارێزنو لێی دوور بکەونەوەو فەرموویەتی:

{وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاء سَبِيلاً - سورة الإسراء – ٣٢}.

واتە: بەکەمو زۆر توخنی داوێنپیسی مەکەون چونکە لە کۆنو نوێدا لە هەموو ئایینێکدا دەدەنرێ بە کارێکی بێ شەرمانەو مایەی تەریقیو سەرشۆڕییە، هەر رێگەی نامەردی بووەو هەر رێگەی نامەدریش دەبێ.

یەکێکیش لە یاسا شاکارەکانی ئایینی ئیسلام ئەوەیە کە بۆ بەرگریکردن لە بڵاوبوونەی داوێنپیسی سزای توندی داناوە – سەد دار لێدان، بەردە بارانکردن تامردن – بۆ ئەوانەی خوانەخواستە ئەم کارە ناشیرینەیان لێ روودەدا چونکە لە کۆمەڵێکی ئاژەڵیدا رەوشتو ئەخلاق ئیحتیرامی نابێو مومکین نابێ تەتبیق بکرێ ئەگەر هێزێکی وانەبێ دەروونی نەخۆشو شەڕانەی لە خراپەکاری بگێڕێتەوە!! ئاشکراشە تەعالیمی ئەخلاقو رەوشت ئەگەر لە چوارچێوەی تیوری (نەظەری) رووت دەرنەچێ هەرگیز مەبەستی پێویست وەدەست ناهێنێ.

## هەڵچوونو رق هەڵسان (الغضب):

هەڵچونو توڕەبوونی نابەجێ رەوشتێکی ناشیرینی ناهەموارە، هەرکاتێ ئەم رەوشتە نابەجێیە لەناو دەروونیدا خۆی داکوتاو جێگیربوو ناشیرین ترین ئاکامی دەبێ لە ژیانی مرۆڤدا، زۆر کاریگەر دەبێ لە پچڕانو لێك هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندی نێوان کۆمەڵان. چونکە مرۆڤ کاتێ رقی هەڵدەستێو دەماری

بەرزدەبنەوە عەقڵو هۆشی نامێنێ دەبێتە دڕندەیەکی زیانە خرۆو نازانێ چی دەکا. ئەو پێی وایە بەم تورە بوونە بەرز دەبێتەوەو بەڕێزو بەنرخ دێتە پێش چاوی خەڵکی، بەڵام لە راستیدا بە ئەحمەقو نەزانو خوێڕی دێتە پێش چاویانو رێزو نرخی خۆی لەدەست دەداو مایەپووچ دەمێنێتەوە، ئاشکراشە کە رق هەڵسان بەسەرەتای تەجاوزو تەعەددا دەژمێردرێو لەسەرخۆییش بەڵگەی عاقڵیو هۆشمەندییە لەلایەکی ترەوە هەڵچوونو توڕەبوون — وەکوو زانست دەری خستووە — لە زۆرلاوە زیان بە تەندروستی ئینسان دەگەیەنێ.

لەبەر ئەو هۆیانەی سەرەوە ئاینی ئیسلام حەوسەڵەو لە سەرەخۆیو هێمنیو هێدێتی کردوە بە دروشمو رەوشتی موسوڵمانی لە خواترسی تەقوا کارو فەرموویەتی:

{وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ - سورة آل عمران — ١٣٤}.

موسوڵمانانی لە خواترس ئەوانەن کە رقو کینەی خۆیان دەخۆنەوەو لەکاتی تواناو دەسەڵاتدا چاو پۆشی لەوانە دەکەن کە خراپەیان لەگەڵدا کردوونو عەفوویان دەکەن، ئەمانە کردار چاکنو خوداش ئەم کردار باشانەی خۆش دەوێن، بە سەرنج دانێکی خێرایش لە ئایەتەکە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە قورئان هەربانگی موسوڵمانان ناکا کە رق بخۆنەوەو بەس بەڵکوو داوای ئەوەشیان لێدەکا کە چاوپۆشی لە تاوانبار بکەنو ئەو کەسەی بوومتە هۆی رەق هەڵسانە کە چاکەی لەگەڵدا بکرێو لەجیاتی خراپە بەچاکە پاداشی بدرێتەوە، ئەمەش ئەو پەڕی رەوشت بەرزی دەگەیەنێ.

مرۆڤ لەکاتی رق هەڵساندا حاکمێکی بێ ئینصافە لەو کاتەدا رێگای راست نازانێ چیەو لەکوێیە، بۆیە هەر حوکمێکی لەژێر تەئسیری رق هەڵساندا بیدا دوورە لە حەقو پوچو بەتاڵە هەر بۆیەشە ئاینی ئیسلام هەڵوێستی عەفوکردنی کاتی رق هەڵسانی کردوە بە نیشانەی رەوشتی بەرزی موسوڵمانانو فەرموویەتی:

{وَإِذَا مَا غَضِبُوا هُمْ يَغْفِرُونَ - سورة الشورى — ٣٧}.

واتـە: کاتـێ رقیـان هەڵدەسـتێ خێـرا رقو کینـەی خۆیـان دەخۆنـەوەو لـەو کەسەش خۆش دەبن کە بووەتە هۆی رق هەڵسانیان.

پێغەمبەری مەزنیش بەربەرەکانی نەفسو جڵەوگرتنی لەکاتی رق هەڵساندا کردۆتە نیشانەی پاڵەوانیەتیو ئازایەتیو فەرمەوویەتی:

«لَيْسَ الشَّدِيدُ بِالصُّرَعَةِ ، إِنَّمَا الشَّدِيدُ الَّذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الْغَضَبِ .

ئەو کەسە ئازانیە کە پاڵەوانی چاکەو کەس لەزۆرانبازیدا دەرەقەتی نایە، بەڵام پاڵەوان ئەو کەسەیە کە لەکاتی تووڕەییدا خۆی پێ دەگیرێو رقی خۆی دەخواتەوە، کەوابوو پێویستی سەرشانی هەموو ئەو مرۆڤانەیە کە ئاواتەخوازی رەوشتی بەرزو کۆمەڵێ رێکوپێکن کە خۆیان وارام بێنن کە خۆگر بنو دەروونی خۆیان زەوت بکەنو هەرگیز نەهێڵن شتێك عەقڵو هۆش شەنو کەوی نەکردبێ دەم بیدرکێنێ، هەتاکو بتوانن خۆیانو کۆمەڵیان لەچەندەها مەشاکیلو گێرەو کێشە بپارێزن.

## حەسوودیو بەخیلی (الحسد):

حەسوودی رەوشتێکی ناشیرینی نابەجایە توشی ئادەمیزاد دەبێو ژیانی لێ تاڵ دەکا، هەموو دەم دڵتەنگو بەئاخو ئۆفە... حەسوود بەو کەسە دەگوترێ: هیوای تەنگو چەڵەمەو ناخۆشی بۆ غەیری خۆی بخوازێ کە ئاواتەکەشی نەهاتەدی دڵتەنگو نارەحەت بێ، ئەو لە جیاتی ئەوەی خۆشی لەو خێرو بێرە ببینێ کە خودا پێی بەخشیوە کەچی دڵەنگ دەبێ بەو نازو نیعمەتەی کە دراوە بە غەیری خۆی!!

لە رۆژگاری ئێمەدا حەسوودی رۆڵێکی کاریگەر دەبینێو گرنگییەکی تایبەتی هەیە، دەبینی فەقیرو هەژار حەسوودی بەدەوڵەمەندو خودا پیداودەبەن، ژنان حەسوودی بە پیاوان دەبەنو ناشیرین حەسوودی بە جوان دەبا هەروا برێ کۆمەڵ برێ کۆمەڵی تریان خۆش ناوێو ئاواتەخوازی ناخۆشین بۆیان، سپڵەییو

بەدنمەکی رەوشو رەوشتی حەسوودە، خۆشی لەوەدا دەبینێ کە دوزمانی لە نێوان دوو کەسدا بکاو ناخۆشی بخاتە نێوانیانەوە...

هەر کەبینی یەکێك لە کاروباری خۆیدا سەرکەتووە، شەخصییەتی پەیدا کردوە، بە هەموو شێوەیەك دەیەوێ سومعەی بشکێنێو دڵی خەڵکی لێ کرمێ بکاو جێگای پێ لەق بکاو بۆ ئەوەی خۆی بچێتە شوێنەکەی یان وەکوو خۆی ئادەمیزادێکی فاشل دەرچێ، بەڵێ حەسوود مرۆڤێکە باوەڕی بەخۆی نەماوەو هەست دەکا بەوەی عاجزە لە ئەنجامدانی کارو باری خۆی، بۆیە قورئانی پیرۆز نەهی کردوە لە حەسوودیو دەفەرموێ:

{وَلاَ تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ اللّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبُواْ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبْنَ وَاسْأَلُواْ اللّهَ مِن فَضْلِهِ - سورة النساء -٣٢}.

پەروەردگار لەم ئایەتە پیرۆزەدا نەهی کردوە لەوە کە مرۆڤ تەمەنناو ئاواتەخوازی ئەوەبێ کە ئەو شتە باشانەی دراوە بە کەسانی دی بدرێ بەئەوو لەوان بسەندرێتەوە! ئەمجار ئەوەمان پێ رادەگەیەنێ کە هەموو دەسکەوتێکی مرۆڤ بەروبوومی کردەوەو کۆششی خۆیەتیو پێویستە موسوڵمانان ئیعتیماد بکەنە سەر کۆششی خۆیانو بۆ هەرشتێك مەبەستیان بێ پشت بەدەستو بازوو عەقڵو هۆشی خۆیان ببەستنو داوا لە خودا بکەن بەفەزڵو گەورەیی خۆی یارمەتییان بدا، لە شوێنێکی تردا پەروەردگار فەرمانی کردوە کە هەمیشە پەنا بگرین بە خودا لە شەڕو نەگبەتی حەسوودو ئەوانەی کە هەموو هیواو ئارەزۆیەکیان ئەوەیە خەڵکی نانبڕاو بنو تووشی بەڵاو موسیبەت بن:

{وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ - سورة الفلق – ٥}.

بەراستی حەسوود جێگەی دڵ پێ سووتانە لەبەر ئەو هەموو ئازارەی کە توشی دەبێ بەهۆی حەسوودییەکەیەوە، چەند جوانە کە ئێمە حەسوودی حەسوود کاران بە لێخۆشبوونو گوێ پێنەدانو لێ نەگرتنیان وڵام بدەینەوە! لەم رووەوە پەروەردگار دەفەرموێ:

{وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّن بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّاراً حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ فَاعْفُواْ وَاصْفَحُواْ حَتَّى يَأْتِيَ اللّهُ بِأَمْرِهِ - سورة البقرة -١٠٩}.

زوربەی خاوەن نامەكان – جولەكەو گاورەكان – دەیانەوێ ئێوە لە ئایین هەڵگێڕنەوە، لە ئایینی خۆتان ژێوانتان بكەنەوەو بتانكەنەوە بە كافر چونكە حەسوودیتان پێ دەبەنو بۆیان ئاشكرابووە ئێوە لەسەر راستین.

## چارەسەری حەسوودی:

چەند هۆیەك هەیە بۆ قوتار بوون لە مۆتەكەی حەسوودی، یەكێ لەو هۆیانە ئەوەیە كە ئادەمیزاد بە بەشو باری خۆی شكور بێو قەناعەتی پێ بكا، كاروباری خۆی لەژیاندا ئەنجامبداو هەرگیز لە خێرو خۆشیدا سەیری لەخۆی بەرەو ژوور ترنەكا، بەڵكوو هەر بڕوانێتە خوار خۆیەوە، هەتا فەزلو گەورەیی خودا بەسەرخۆیەوە ببینێ.

ئەوەتا پێغەمبەری خۆشەویست دەفەرموێ: « **إِذَا نَظَرَ أَحَدُكُمْ إِلَى مَنْ فُضِّلَ عَلَيْهِ فِى الْمَالِ وَالْخَلْقِ ، فَلْيَنْظُرْ إِلَى مَنْ هُوَ أَسْفَلَ مِنْهُ. رواه البخاري** .

واتە: هەركاتێ یەكێ لە ئێوە روانییە ژوور خۆیەوەو سەیری كەسێكی كرد كە لەخۆی خۆشبەخترە با حەسوودی پێ نەبا بەڵكوو تەماشای خوار خۆیەوە بكا، بڕوانێتە كەسێك كە لە خۆی هەژارترەو كەمتری خۆشبەختی هەیە...!

## (اللغو) قسە یان كاری بێهودە، دەمەوەری:

لە ئایینی ئیسلام هۆیەكی سەرەكی هەیە بۆ نەفس بەرزیو سەركەوتن لە ژیاندا، ئەو هۆیەش – وەكوو قورئانی پیرۆز بانگەوازی بۆ كردوە – واز هێنانە لە قسەی بێجاییو هەڵەوەڕی كردارو گوفتاری پڕو پوچو بێ هودەو هەرشتێك لەگەڵ پیاوەتیدا نەگونجێ... قورئانی پیرۆز ئەو شتانەی كە بەو جۆرەن بە

(لەغو) ناوی بردونو دوورکەوتنەوە لێیان بە نیشانەی موسوڵمانی چاكو سەرفراز حسێب کردوە.

{قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ، {الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ - سورة المؤمنون – ١-٣}.

واتە: بەراستی سەرفراز بوون ئەو موسوڵمانانەی کە لەناو نوێژدا ملکەچو سەرکزو دڵ لەلای خودان، هەروا ئەوانەی کە لە قسەی بێ هوودە روو وەردەگێڕنو بایەخی پێ نادەنو لێی لووتەلان. لە قورئانی پیرۆزدا جڵەوەگیری لە زۆر بلێیو قسەی بێ جاییکردن چەند جارێكو بە چەند شێوەیەك دووبارەو سێبارە بۆتەوە، بە چەند شێوازو رێبازی جوێ جوێو هەمەجۆر پەروەردگار ئادەمیزادی هەڵناوە بۆ دوورکەوتنەوە لە زۆرگوتن، ئەوەتا خودای مەزن لە پەسنو ستایشی بەندە خۆشەویستەکانیدا دەفەرموێ:

{وَإِذَا سَمِعُوا اللَّغْوَ أَعْرَضُوا عَنْهُ وَقَالُوا لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِي الْجَاهِلِينَ - سورة القصص -٥٥}.

واتە: بەندە راستاڵەکانی من، هەر کاتێ قسەیەکی بێهوودە بەرگوێیان بکەوێ، یەکسەر پشتی تێ دەکەنو خۆیانی لێ کەرِدەکەنو، ئەو کۆرِو کۆمەڵە بەجێ دەهێڵن، ئەگەر ئەو قسەیە بۆڵە بۆڵو جمێنو شتی وابوو وەڵامی نادەنەوەو دەڵێن: هەر کەسە کاری خۆی بۆ خۆیو باری خۆی، بۆ خۆی خوا حافیز ئێمەو ئێوەیان نەگوتووە ئێمە لەگەڵ نەزاناندا هەڵناکەینو دانوولەمان پێکەوە ناکوڵێ.. هەڵبەتە مەبەست لەم فرماییشتە ئەوە نییە کە موسوڵمانان ملکەچیو زەبوونیو نەکارەیی پیشان بدەن، نەرمو نیانیو چاوپۆشی کاتی خۆی هەیە، دەنا موسوڵمانان لەناو کۆمەڵدا دەبێ کاریگەریی خۆیان بنوێننو دەبێ تێکۆشەر بنو کۆڵنەدەر بنو چاو نەترس بنو هەموو کاتێ داکۆکی لە هەقو راستی بکەن.

(وەرگێڕ)

لە شوێنێکی تردا پەروەردگار دەربارەی رەوش‌و صیفەتی بەندە باشەکانی خۆی دەفەرموێ:

{وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَامًا - سورة الفرقان – ٧٢}.

هەر کاتێ قسەی ناشیرین‌و گوتەی بێ سوودیان بەر گوێ کەوت، یا تووشی کۆڕی چەنەبازو زۆر بلێکان بوون، یا لووتیان تەقی بە لووتی ناشاییستەیەکا، سەلاری خۆیان تێك نادەن‌و بەسەلاری گوزەر دەکەن!

ئاشکراشە هەر شتێك ببێتە هۆی بێئاگاییو گەمەو گاڵتەی پڕو پووچو نەفسی ئینسان پاڵفتەنەکات‌و هەستی بەرز نەکاتەوە بە لەغو حسێبەو رەوشتێکی ناشیرینەو پێویستە لێی دوورە پەرێز بین، چونکە یەکێك لە هۆیەکانی سەرکەوتنی گەل‌و پێشکەوتنی وڵات دوورکەتنەوەیە لە لەغوەو خۆ خەریك نەکردنە بەشتی پڕو پووچەوە لە هەمان کاتدا خوودانە کاری باش‌و بەسوود بۆ دین‌و دونیا!! بە پێچەوانەشەوە ئەو گەل‌و کۆمەڵانەی کە دواکەوتوون‌و بەدبەختن ئەوانەن کە خەڵکەکەیان بەزۆری خەریکی لەغوەکاری‌و کاری پڕو پووچن‌و کات لەشتی بێهوودەو بێ سووددا بەسەر دەبەن!

## چڵێسیو زۆر خۆری (الشراهة):

شتێکی رون‌و ئاشکرایە کە ئارەزووە مادییەکان‌و ئارەزووە گیانییەکانی ئیسان دوو تای تەرازووی بەرامبەرن! هەرکاتێ ئارەزووە گیانییەکان زەبوون بن، ئارەزووە مادییەکان بەهێز دەبن‌و لایەنی چڵێسی مرۆڤەکە زیاد دەبێ‌و تەرازووەکە لاسەنگ دەبێ.

ئاشکراشە کە زیادەڕەوی لە خواردندا سەردەکێشێ بۆ زۆر بوونی ئارەزۆی سەرجێیی‌و رەغبەتی سیکسی ئەمەش وا لە مرۆڤ دەکا کە وا بزانێ ژیان تەنها

بریتییە لە لەززەتی مادیو بەس! ئیتر صیفاتی رۆحی تێدا زەعیف دەبنو رەوشتی چاکە کاریو فیداکاریو خۆنەویستی تێدا نامێنێ، لە شوێنی ئەم رەوشتە بەرزانەدا دڵرەقیو خۆپەرستی سەرهەڵدەدەنو وا لە خاوەنەکەیان دەکەن کە ببێتە ئەندامێکی گەندو پڕو پووچو کەس سوودی لێ وەرنەگرێو بۆ خۆشی بە ئەندامێکی بە سوودی کۆمەڵ نەیەتە پێش چاو!

لەبەر ئەم هۆیانە قورئانی پیرۆز زۆر جار ئامۆژگاریەکانی ئاراستەی گرۆهی ئادەمیزاد کردوەو هەڕەشەی ئەوەی لێ کردون کە هەرگیز خۆیان شل نەکەن بۆ ئارەزۆی نەفسیو هەڵپە هەڵپی خواردن نەکەن، چونکە زیادەڕەوی لە خواردنو خواردنەوەدا ڕەوشتێکی ناشیرینو قێز لێکراوە خودا دەفەرموێ:

{وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ وَلاَ تُسْرِفُواْ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ-سورة الأعراف – ٣١}.

واتە: ئەی گرۆهی ئادەمیزاد بخۆنو بخۆنەوە لەو نیعمەتو بەروبوومەی خودا بۆی داناون بەلام هەرگیز زیادە ڕەوی لە خواردنو خواردنەوەدا مەکەن چونکە خودا مرۆڤی چڵێسی خۆشناوێ. لەلایەکی ترەوە چڵێسی دەبێتە هۆی کۆڵەوار بوونی زەینو نازیرەکی، وا دەکا ئینسانەکە وازبێنێ لە تەغزیەی عەقڵو گیان بەو زانستو عیلمانەی کە پێویستن.

بەکورتی: چڵێسی وا دەکا مرۆڤ تەنها بیر لە جۆری خواردەمەنیو خەریکبوون بە لەززەتی ژیانەوە بکاتەوەو بەس! ئەم حاڵەتەش لای دەدا لە پەروەردەکردنی نەفسو ناتوانێ دووری بخاتەوە لە عەیبو عارو وای لێ دەکا لە رەوشتی ئینسانی بشۆرێو ببێتە ئاژەڵێکی ئاسایی ئەو رەوشتەش کە ئاوابێ رەوشتێکی ئاژەڵی رووتەو قورئانی پیرۆز بەڕەوشتی کافرو خودا نەناسانی داناوەو دەفەرموێ:

{وَالَّذِينَ كَفَرُوا يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ الْأَنْعَامُ وَالنَّارُ مَثْوًى لَهُمْ - سورة محمد – ١٢}.

واتە: ناموسوڵمانو خوا نەناسەکان هەر خەریکی سەیرو سەفاو کەیفو رابواردنی خۆیانن و وەك ئاژەڵ سەریان ژندۆتە خواردون خواردنەوە وەك هیچ رەوشتێکی مرۆڤانەی پاکیان نەبێ ئاوا، ئەوانەی کە ئەمە حاڵیانە ئاگر جێگەیانەو خانەی حەوانەوەیانە..

ئەوەی کە گوترا ئامۆژگاری قورئانە دەربارەی میانەڕەوی لە خواردنو خواردنەوەدا بە مەبەستی بەخێوکردنی لایەنە گیانییەکە تا مرۆڤ بەو هۆیەوە بتوانێ خزمەتو راژەی مرۆڤایەتی بکا کە ئەویش ئەمانێکی گەورەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە.

## بەشی چواردەهەم:

# نوێژ لە ئیسلامدا (الصلاة في الإسلام)

لەم بەشەدا باسی ئەم شتانە دەکرێ:

**مەبەست لە نوێژ – حیکمەتی نوێژ – حیکمەتی دەستنوێژ – مەرجەکانی نوێژ – بڕێك لە کردارەکانی نوێژ – ئەو مانایانەی کە سوورەتی فاتیحە ئاماژەیان بۆ دەکا –**

حیکمەتی نوێژکردن بە گوێرەی قورئان بریتییە لەمانە:

**گۆڕینی کردەوەی خراپ بە چاکە، رواندنی رەوشتی ئازایەتیو بەخشندەیی، پەروەردەکردنی هۆشو زەین بۆ ئەوەی بە تەواوی روبکاتە خودا؛ بە قووەتکردنی نەفسی ئینسانی.**

نوێژ لە زاراوەی شەرعو لە زماندا بەمانا نزاو پاڕانەوەیە بۆ خێرو چاکە، نزاو پاڕانەوەیەك کە ئەنجام دەدرێ بە مەبەستی نزیکبوونەوە لە خودا، یان لێخۆشبوونی گوناه یان سوپاسگوزاری بۆ نازو نیعمەتێك یان لابردنی زوڵمو زۆری، یان جێبەجێکردنی بەندایەتی، هەروەکوو چۆن نوێژ بریتییە لە دەربڕینی پێداویستیو هەژاریی بەندە دووپات دەکاتەوەو داواکانی ڕوون دەکاتەوە، ئەنجام دانەکەشی بە پێویست گێڕدراوە تا بەندەکان رۆژانە زیاد لە چەند جارێ پەروەردگاری خۆیانیان بیر بکەوێتەوەو فەرمانەکانی جێبەجێ بکەنو یارمەتیدەریان بێ بۆ خۆڕاگری لە بەرامبەر ئەو ئێشو ئازارەی توشیان دەبێ لە ژیانی دونیایاندا، هەروەکوو چۆن مانایەك لە ماناکانی نوێژ بریتییە لە سوپاسو ستایشی خودا بەو جۆرەی کە شایانی ئەو بێو لاییقی ئەو بارەگایەبێ.

## مەبەست لە کردنی نوێژ (الغاية من الصلاة):

زاناو مامۆستای فەلسەفە لە دانیشگای پاریس مامۆستا (أجوست سباتييه) لە کتێبێکی بەناو (فەلسەفەو ئایین)دا دەڵێ: (ئێمە دەتوانین پێناسەیەکی کورتو پوخت بۆ ئایین دابڕێژینو بڵێین: ئایین بریتییە لە وەدی هێنانی پەیوەندییەکی تایبەتی ئاشکراو ویستراو کە پەیدا دەبێ لە ئاکامی ئێشو ئازارێك کە توشی

ئادەمیزاد دەبیّ‌و هەست بە زەبوونی خۆی دەکا لە بەرامبەر هێزو توانایەکی غەیبی کە ئەو گیانە زەبوونە پێی وایە خۆی ملکەچی ئەو هێزە بیّ ئەندازەیەو هەموو هەڵس‌و کەوتێکی بە ویستی ئەو ئەنجام دەدریّ! کەوابوو نوێژ بریتییە لە ئاکارو گفتاری ئایین ئاسا یان هەر بریتییە لە ئایینی راستەقینە لە هەموو شێوەیەکدا.. ئەمجار دێتە سەر ئەوە کە دەڵیّ: ئایین بۆ خۆی هیچ نییەو چ دەورێکی نابیّ ئەگەر لەکردارو گوفتاردا رەنگ نەداتەوەو والەدەروونی نەکا پەنابەریّ بەو سەرچاوەیەی کە ئایینەکەی لیّ پەیدابووە، کەوابوو ئەم کردارو گفتارو پەنا بردنە بەر ئەو هێزە خواییە بریتییە لە نوێژ، نوێژی بەراستی – نەك وتنەوەی چەند وشەیەك‌و دووبارە کردنەوەی چەند ڕستەیەکی تایبەتی – چونکە نوێژ بریتییە لەو هەڵس‌و کەوتەی کە نەفسی ئینسانی ئەنجامی دەدا بە مەبەستی ئەوەی خۆبخاتە ژێر سایەی هێزێکی غەیبی بە تواناو پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئەو هێزەدا ببەستیّ ئەو هێزە نادیارەی کە دەروونی ئادەمیزاد هەست بە هەبوونی دەکا، تەنانەت پێش ئەوەی ئەم دیاردەیە ناوێکی تایبەتیشی لیّ بنریّ، کەوابوو هەرکاتێك ئەم پەیوەندییە گیانییە لە نێوان دەروونی ئادەمیزادو پەروەردگارا نەبوو ئایین نییەو ئەو کردارو گفتارەش کە بەرواڵەت ئەنجام دەدرێن بەدین حسێب ناکرێن.

## حیکمەتی نوێژ (حكمة الصلاة):

ئاشکرایە کۆمەڵگای ئادەمیزاد پێویستی بە هێزێکی گیانی هەیە بۆ ئەوەی دەروونی تاکە تاکەکانی ئەو کۆمەڵە بەرەو بەرزی بەریّ‌و نەهێڵیّ پەیوەندیی نێوانیان لە پێداویستییە مادییەکان‌و بەرژەوەندییە کەسایەتییەکاندا کورت هەڵبیّ‌و سەربکێشیّ بۆ تێکچوونی ژیانی کۆمەڵایەتی! نوێژیش بۆ خۆی دیاردەیەکە هێزی گیانی بەکۆمەڵ دەبەخشیّ‌و رۆڵێکی گرنگی هەیە لە رێکخستنی نێوان کۆمەڵی ئادەمیزاددا!

لـەبارەی دەرونیـشەوە ئـادەمیزاد هـەرکاتێك گیـانی بـە پـەروەردگاری خـۆی پەیوەند نەکاو خۆی لەو ئاستانەدا نەبینێ، دیاردەی ڕەوشـتی ئـاژەڵی تێـدا دیـاری دەداو غەمو نارەحەتی دڵو دەروونی دادەگرنو ئاسۆی ژیانی لێ تێـك دەچـێو بـە هیچ شتێك قەناعەت ناکاو چاوی تێـر نابـێو بـڕی جاریش وادەزانـێ: کـە غـەمو نارەحەتییەکەی لەوەوە هاتووە کە بـە گـوێرەی پێویـست ئارەزووەکـانی جێبـەجێ نـەبوون ئـیتر کوێرانــە خـۆفڕی دەداتــە باوەشــی ئــارەزۆ بــازیو رووودەکاتــە خواردنەوەی عەرەقو بەئەو جۆرە شتانە کات بەسەردەبا... هەموو کاتێ پەستو نارەحـەتو سەرلێتێکچووەو هـەتا پـتری هـەبێ زیـاتر بـاری ژیـانی قـورس دەبـێو غـەمو پـەژارە دای دەگـرێو دونیـای رونـاکی لـێ دەبێتـە شـەوەزەنگ. ئـالێرەدا گرینگـی نوێـژ دەردەکـەوێو دەزانـدرێ چ ڕۆڵێکـی کاریگـەر دەبینـێ لـە ژیـانی ئادەمیزاددا.

چونکە نوێژ زەمینە خۆش دەکا بۆ مرۆڤ کە داوا لە پـەروەردگاری خـۆی بکـا بۆ هەر شتێك مەبەستی بێ هەتا بتوانێ دڕ بەغەمو پەژارەی نێـو دەروونـی بـداو ئاهێکی بێتەوە بەرێ. بەڵێ نوێژ عەقیدەو بیرو باوەڕ لە دڵو دەرووندا دەڕوێنێو ئـادەمیزاد فێـری فەرمانبــەرداری فـەرمانی خـودا دەکـاو بـاوەکوو بــە رواڵــەت ئەنجامدانی ئەو فەرمانانــە دژایـەتیان هـەبێ لەگـەڵ ویـستی تایبـەتی مرۆڤـدا، لـە لایەکی ترەوە نوێژ گیـانی گـەش بینـی لـەدڵو دەروونـدا بـڵاو دەکاتـەوە داوا دەکا ئادەمیزاد هەموو دەم داوای کۆمەکی لە خودا بکەن، ئاشکراشە هەر مرۆڤێك پشت بـە خـودا ببەسـتێ، رەشـبینیو نائومێـدی لـە دڵیـدا جێگایـان نابێتـەوە، هێزێکـی نەفسی وای لاپەیـدا دەبـێ کـە بتوانـێ بەرهەڵستی گـەورەترین خەتـەری سامناك بکـا، لێـرەدا ئــەوەمان بۆدەردەکــەوێ کــە پەیوەنــدیکردنی گیــانی ئینــسانی بــە پــەروەردگاری خۆیــەوە – تەنانــەت بــا چــەند ســاتێکیش بــێ لــە ڕۆژێکــا – پێویـستییەکی فـرە گرنگـە بـۆ مـرۆڤ ، هۆیەکـە بـۆ دڵ ئـارامی، بۆیـە پـەروەردگار نوێژی فەرزکردوە لەسەر موسوڵمانان فـەرمانی پـێ کـردوون کـە هـەرگیز لـەبیری نەکەن.

## نوێژ پێویستە (وجوب الصلاة):

قورئانی پیرۆز لە زوربەی ئایەتەکانیدا فەرمانی کردوە بە ئەنجامدانی نوێژو ئادەمیزادی هەڵناوە بۆ ئەوەی بەرێكو پێکی وەکوو پێویست ئەو فەرزە بەجێ بگەیەنن هەرگیز لەبیری نەکەن:

{فَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ إِنَّ الصَّلاَةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَّوْقُوتًا - سورة النساء - ١٠٣}.

واتە: ئەی کۆمەڵی موسوڵمان! نوێژ بەجێ بێنن، بێگومان نوێژ ئەرکێکی سەرشانتانەو کاتێکی دیاریکراوی هەیە لەو کاتانەدا بەرێکوپێکی ئەنجامی بدەن. ئەوەش بزانن نەکردنی نوێژ دەبێتە هۆی سزادانتان بە ئاگری دۆزەخ ئەوەتا کاتێك لە دۆزەخییەکان پرسیار دەکرێ‌و پێیان دەفەرموێ:

{مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ، قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ، وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ}.

چی ئێوەی ئاخنیوەتە ناوجەرگەی دۆزەخەوە؟ دەڵێن: نوێژ نەکەربووین، لە رفتاری جوانی نوێژکەران بەدووربووین، سەرەڕای ئەوەیش خێرنەکەر بووین‌و نان‌و ئاوی هەژارانمان نەدەدا. جا هەر چەندە قورئانی پیرۆز لە زۆر شوێنا باسی نوێژی کردوەو ئادەمیزادی هەڵناوە بۆ بەجێ هێنانی، بەڵام باسی چۆنیەتی کردنەکەی نەکردوە، بەڵکوو پێغەمبەری مەزن ئەم لایەنەی رونکردۆتەوەو بە هاوڕێیانی خۆی فەرمووە: (صلوا كما رايتموني أصلي) واتە: من چۆن کردارو گفتاری نوێژ بەجێ دێنم ئێوەش ئاوەها ئەنجامی بدەن.

خوێنەری هێژا ئێمەیش بە پێویستی دەزانین لێرە بەولاوە کردارو گوفتاری نوێژ لەگەڵ مانا رۆحییەکەیاندا دیاری بکەین. پێش ئەوەی بچینە ناو باسی نوێژ چەند مەرج‌و پێویستییەکی سەرەکی‌و پێشەکی هەن بۆ نوێژ پێویستە باسیان بکرێ یەکەم شتیش لەوانە دەستنوێژشتنە.

## چۆنییەتی دەستنوێژشتن (من حکم الوضوء):

قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ چۆنییەتی دەستنوێژ گرتن کردوەو دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَينِ - سورة المائدة – ٦}.

واتە: ئەی موسوڵمانینە! کاتێ ویستتان بچن بەلای نوێژەوە لە پێشەوە لەسەر ئەم شێوەیە دەسنوێژ بگرن:

دەمووچاوتان بشۆرن، ئەوجا هەردوو دەستتان هەتا ئانیشك بشۆرن، ئەوجا دەستی تەڕ بەسەرتانا بهێنن، ئەمجار هەردوو قاچتان تا هەردوو قولەپێ پاك بشۆرن.

ئەڵبەتە حیکمەتی دەستنوێژ گرتن خۆ ئامادەکردنە بۆ نوێژ چونکە ناوەڕۆکی نوێژو کاکڵەکەی بریتییە لەوە کە ئادەمیزاد وا هەست بکا کە روبەرووی پەروەردگار وەستاوەو سەری کڕنووشی بۆ دانەواندووە، جا بۆ ئەوە زەینی بۆ ئەم حاڵەتە ئامادەبێ، لە مشوورو خەمی ژیان رزگاری بێ‌و دڵی بەلایانەوە نەبێ‌و ئامادەبێ بۆ ئەو مقابەلە گیانییە پێش چوونە ناو نوێژەوە دەستنوێژ فەرز کراوە، چونکە شتێکی دەروونی‌و سروشتییە ئینسان هەرکاتێ سەرقاڵی بیرێك بوو، مێشکی بە شتێکەوە خەریك بوو ناتوانێ بیر لە شتی تر بکاتەوە! جا ئەگەر نائاسایی‌و گۆزو گومەت وازی لەو بیرە هێناو چووە سەر بیرو وردبوونەوەیەکی تر بێگومان زەین گواستنەوەکەی هەڵەشەیی پێوە دیار دەبێ‌و ناتوانێ وەکوو پێویست بیر لە مەسەلەی دووەم بکاتەوە.

هەر کاتێکیش ویسترا بە هێدی‌و لەسەرە خۆیی بیر لە شتێك بکاتەوە بێگومان پێویستی بەچەند کاتێك هەیە، چونکە کەسێك لە بیرو خەیاڵی بازرگانی‌و پیشەسازی دابێ‌و دوایی گۆزو گومت پێی بڵێن هەستە نوێژ بکە بە نارەحەتی دەتوانێ وەکوو پێویست نوێژەکە بەدڵ ئەنجام بدا.

ئالێرەدا حیکمەتی دەستنوێژ دەردەکەوێ چونکە دەستنوێژ گرتن – جگە لە پاك‌و خاوێنییەکەی – یارمەتیدەرێکی گرنگیشە بۆ گواستنەوەی زەین‌و هۆش‌و خەیاڵ لە کارێکەوە بۆ کارێکی تر.

## مەرجەکانی نوێژ (شروط الصلاة):

بۆ ئەوەی نوێـژ دروست بێ، پێویستە نوێژکەر بەدەنی پاكو خاوێن بێ، پۆشاکی پاك بێ، بەرماڵو شوێنی نوێژی پاك بێ! دیارە بەمەش موسوڵمان لەگەڵ پاكو خاوێنیدا رام دەبێو خۆی لە پیسیو پۆخڵی دوور دەخاتەوە. هەروەها پێویستە نوێژکەر شەرمگای (عورة) داپۆشراو بێ، شەرمگای پیاو نێوان ناوكو ئەژنۆیە شەرمگای ئافرەتیش هەموو بەدەنیەتی بێجگە لە دەستو دەمو چاوی.

هەروەها پێویستە لە نوێژدا روبکرێتە (کابە) بۆ ئەوەی رۆگەی موسوڵمانان یەکبێ. چونکە ئەگەر ریگە بدرایە موسوڵمانان لە نوێژدا هەر کەسە بۆ خۆی روبکاتە لایەك بشێوی پەیدا دەبوو، دەبووە مقۆمقۆو نەدەزاندا چ لایەك باشترەو نزیکترە لەخودا، لەبەر ئەوە حیکمەتی خودا وای داناوە کە هەموو موسوڵمانان کاتی نوێژکردن رووبکەنە ماڵی کابە چونکە یەکەم خانوێك کە لەسەر زەوی بۆ خودا پەرستی دروستکراوە (کابە)یە ئەوەش لە یادنەکەین کە مەبەست لە رۆتێکردنی (کابە) پەرستنی (کابە) خۆی نییە، بەڵکوو مەبەست پەرستنی خودایەو بەس هەر کەسێکیش مەبەستی بەڕوکردنە (کابە) زاتی خودا نەبێ ئەوە بە گوێرەی شەریعەت کافرە.

پێش ئەوەی ئادەمیزاد بچێتە ناو نوێژەوە ئەو گوفتارە تایبەتییەی کە بە (بانگ)و (قامەت) مەشهوورن دەیانڵێ.

## کردارو گفتارەکانی نوێژ (عرض لافعال الصلاة):

کە بانگ دراو قامەت کرا موسوڵمان نییەتی نوێژ کردن لە دڵیدا ئامادە دەکاو روەو قیبلە دوو دەستی تا ئاستی شانی بەرز دەکاتەوەو دەڵێ: {اللّـهِ اَكْبَـرُ} تا هەست بکا بەوە کە پەروەردگار لە هەموشتێك گەورەترە هیچ شتێ نییە لە ئاستی ئەو شت بێ.

ئەمجار دوو دەستی بەردەداتەوە یان دەستی راستی لەسەر دەستی چەپی دادەنێ ئیتر ئەم شێوەو ئاکارە والە نوێژکەر دەگەیەنێ کە پەیوەندی دڵ بە

خـوداوە پەیوەسـت بکـا، ئـەمجار نـزای سـەرەتای نوێـژ دەخوێنـێ کـە ئەمـە دەقەکەیەتی:

{إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ - سورة الأنعام – ٧٩}.

واتە: بە دڵێکی پاکو بێگەردەوە روو دەکەمە ئەو خودایـە کـە ئـەم ئاسمانو بوونەوەرەی بەدی هێناوە راستاڵو موسوڵمانمو لە کۆمـەڵی هاوبـەش پەیداکـەران نـیم، بێگومـان نوێـژو خـودا پەرسـتیم ژیـانو مـردنم هـەمووی بـۆ پـەروەردگارو بەدیهێنەری بونەوەرە، ئەو خودایە هیچ هاوبەشێکی نییەو بـێ شـەریکە مـن بـەم جۆرە فەرمانم بێکراوە بڕواشم وایە هەر ئەوە راستەو رێبازی رزگارییە وەمـن لـە کۆمەڵی موسوڵمانانم.

مەبەست لە خوێنـدنی ئـەم دوعایـە ئەوەیـە کـە لـە نـاخی دڵەوە هەست بـە گەورەیی خودا بکاو دەروونی ئامادە بکا بۆ راستاڵی لە کرداریدا.

ئـەمجار دوای خوێنـدنی دوعـای (الاسـتفتاح) دەسـت دەکـا بـە خوێنـدنی سوورەتی فاتیحە کە ئەمە دەقەکەیەتی:

{بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ - الْحَمْدُ للّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ، مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ، إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ، اهدِنَا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ، صِرَاطَ الَّذِينَ أَنعَمتَ عَلَيهِمْ غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ.... آمين}.

خوێنـدنی فاتیحـە لـە هـەموو رکاتـەکانی نوێـژدا پێویـستە چـونکە سـورەتی فاتیحـە زۆر مەبەسـتی قـوڵو گـەورەی لـە خۆگرتـووە، زۆر کاریگـەرە لـە راسـتاڵ کردنی تاکو کۆمەڵدا.. سورەتی فاتیحە گیانی نوێژە، نوێژ بێ خوێنـدنی سـورەتی (فاتیحە) جەستەی بێ گیانە، بۆیە لێرەدا بە پێویستی دەزانم کە بـڕی لـەو مانـاو مەبەستە بەرزانەی سورەتی (فاتیحە) لەخۆی گرتوون رونیان بکەمەوە.

## ئەو مانا بەرزانەی لە سورەتی فاتیحادا هەن:

١- هەست پێکردنو دانـان بە چاکەو ئیحسانی خودا لەگەڵ بەندەی خۆی:

ئەمەش لە رستەی {الْحَمْدُ للّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ} وەردەگیرێ، چونکە ڕستەی { الْحَمْدُ للّهِ } کە مانای (قەصر)و کورت هەڵێنان دەگەیەنێ واتە: هەرشتێك کە پێویست بێ سوپاسی خودای لەسەر بکرێو بە چاکە بژمێردرێو نازو نیعمەت بێ لە خوداوەیە. ڕستەی { رَبِّ الْعَالَمِينَ }یش ئەوە دەچەسپێنێ کە ئادەمیزاد هەمووی تاکە خێزانێکەو پەروەردگار بەخێویان دەکاو چاو دێریانە، بێگومان ئەم فیکرە بەرزە ئینسانییە کە قورئان دەری دەبڕێ باشترین پارێزەرو زرێیەکە کە مرۆڤ رزگار دەکا لە بیر تەسکی نیشتمانیو رەگەزیو رەنگ پێستی. پەروەردەکردنی پەروەردگار بۆ ئادەمیزاد دوو شێوە لەخۆ دەگرێ:

١- پەروەردەکردنی جەستە یان بەهۆی گەشەپێدانی لەشو لاریانو گەشەپێدانی بیرو هۆشیان.

٢- پەروەدەکردنی ئایینو باوەڕیان بەهۆی ناردنی پێغەمبەران کە ڕێگای راستاڵو باش پیشانی مەردووم بدەن.

رستەی { الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ }یش دوو صیفەتی تایبەتمەندی پەروەردگارن کە چاکەو بەزەیی بێپایانی خودا دەگەیەنن، ئەوە دەسەلمێنن کە پەیوەندی پەروەردگارو ئادەمیزاد بریتییە لە بەزەییو چاودێری خودا بۆ ئەوان. لەلایەکی ترەوە وادیارە کەسانێك هەبن لەمانای { رَبّ } جەبەروتو زەبرو زەنگ هەست دەکەن، بۆیە خودا دەیخاتە بەرچاوان کە خودایەکی بە بەزەییو خاوەن چاکەو ئیحسانە تا هەردەم ئادەمیزادەکان هەوڵ بدەن بە دڵنیاییەوە رەزامەندی پەروەردگاریان بەدەست بێنن، بەکورتی ئایینی ئیسلام لە هەموو نوێژێکا چەندجار لەدڵی موسوڵماندا نەمامی هیوا دەڕوێنێو بەرەحمیو میهرەبانیی خودا دەچەسپێنێ.

**٢- بەڵێنو هەڕەشە (الوعد والوعيد):**

پاش ئەوەی پەروەردگار صیفەتی رەحمەتی بێپایانی خۆی بۆ ئادەمیزاد رونکردەوە، ئەوەشی خستنەوە بیر کە {مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ}یشە واتە: ئەمری پێکردون

کە لە خۆیان بایی نەبن‌و بە هیوای رەحمەتی فراوانی پشت لە خودا هەڵنەکەن‌و سەرپێچی فەرمانەکانی نەکەن، چونکە ئەو لە رۆژی رەستاخیزدا بە ئارەزۆی خۆی حوکم دەکا چی بوێ‌و چۆنی بوێ ئاوا لە ملکی خۆیدا تەصەروف دەکا.

**٣- وادەو بەڵێن (الوعد):**

ئەمەش بریتییە لە فەراهەم هێنانی هەموو خێرو خۆشییەك کە کۆمەڵ پێی بەختیار دەبێ لە دونیاو قیامەتدا... پەروەردگار وادەی بە موسوڵمانانی راستاڵ‌و شوێنکەوتووی شەریعەتی خۆی داوە بەوە کە دەیانکاتە جێنشینی خۆی‌و لەژیانی دونیادا بەکار بەدەستی خۆی حیسابیان دەکا، لەو دوونیاش دەیانخاتە ناوبەهەشتی پان‌و بەرین‌و هەرگیز نەبڕاوە.

**٤- یەکتا پەرستی‌و خودا پەرستی (التوحید والعبادة).**

ئەم دوومانایە لەم ئایەتە پیرۆزەی سورەتی فاتیحە وەرگیراون کە دەفەرموێ: {إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ} واتە: پەروەردگارا ئێمە هەرتۆ دەپەرستین بەندایەتی کەسی تر ناکەین هەر لەتۆ داوای یارمەتی‌و سەرکەوتن دەکەین بۆ ئەنجامدانی تاعەت‌و عیبادەت، بەڵکوو بۆ هەموو ئیشو کارێکی دین‌و دونیامان، هەر پەنا بۆ بارەگای تۆ دێنین‌و هەر لەتۆ داواکارین کە خۆت کەریمی کارسازمان بی‌و کارمان بۆ بسازێنی‌و ئیش‌و فرمانمان رایی بفەرموی!!

ئەڵبەتە بە چەسپاندنی ئەم دوو هەڵوێستەو خوو پێوە گرتنیان دەتوانرێ قەلاچۆی هەموو بتپەرستی‌و هاوەڵ بۆ خودا پەیداکردنێ بکرێ، لە ئایینی ئیسلام دا دیاردەی وانابێ ببێ کە چەند کەسێك بە درۆ، بۆ خواردنیماڵی خەڵك بە بەلاش‌و حەلاش، خۆیان بکەن بە پیرو دەستگیرو بەچاوو راوی زۆر وا بکەن کە رەشەخەڵکەکە بە شێخی خاوەن کەشفو کەرامەتیان دابنێن‌و وابزانن کە ئەو دەسبڕانە غەیب زانن‌و ئاگاداری عەرش‌و فورشن، تەنانەت گەلێ جار دەگاتە ئەو رادەیە نەخوێندەوارو نەفامەکان لەجیاتی خودا هاواریان بۆ دەبەن‌و داوای کۆمەکی‌و هاتنەدی مرازیان لێ دەکەن، لەکاتی تەنگانەیشدا پەنایان بۆ

دەبەن جا ئەوانەی کە لەسەر ئەم بنیاتە پەنا دەبەن بۆ گۆڕی پیاوچاکێ بۆ شیفای نەخۆش، یا بۆ ئاسانکردنی کاری گران، یا بۆ دەستدان لە کاری خودا بێگومان ئەمانە ڕێگای ڕاستیان لێ ون بووەو لە ڕێبازی ڕاستی خودا لایان داوە، چونکە وەلیو شێخو پیرو مشایەخی نوورانی لە ئیسلامدا ئەو کەسانەن کە بێ ئەمری خودا نەکەن، عیبادەتی ساخ بۆ خودا دەکەن، مامۆستاییو ڕێنومایی خەڵك بۆ چاکە دەکەنو خۆشیان ڕاستو ڕاستاڵن.

ئەمانە لە حاڵی ژیانو مردندا مایەی ڕەحمەتن بۆ ئوممەت، لەژیانا چرای چاوو دڵمانن و لە گۆڕا – وەك گوڵ – یادگاری بەهاری قیامەتمانن!

**٥- ڕێبازی ڕاستی پەروەریو بەردەوامی (الإستقامة والثبات):**

ئەم دوو هەڵوێستە وەرگیراوی ئەم ئایەتەی فاتیحەیە کە دەفەرموێ: {**اهدِنَا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ**} واتە: پەروەردگارا! شارەزای ڕێگای ڕاستمان بکەو یارمەتیمان بدەو بمانگەیێنە بە ڕێبازی حەق لە زانستو لە گوتارو لە کردار بە جۆرێك کە خوارو خێچی لە بەرنامەی ژیانماندا نەبێ، جا ئێنسانی موسوڵمان کاتێك بەڵاو موسیبەت دەوری دەدەن، یان تووشی گیرو گرفتێکی دەروونی دەبێو دونیای روناکی لە پێش چاو تاریك دەبێ، پەلاماری نوێژکردن دەداو خۆ دەهاوێژێتە پەنا خودای خۆیو لە پەروەردگاری خۆی دەپاڕێتەوە، دەفەرموێ: {**اهدِنَا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ**} ئیتر دڵی دادەمرکێو بەرامبەر بەڵاو ناڕەحەتی هێزو توانا پەیدا دەکا.

**٦- پەیڕەوکردنو ئیقتیداکردن بەڕاستاڵانو نموونە صاڵحەکان:**

ئەمیش لەم فرمایشتەی پەروەردگار وەرگیراوە کە دەفەرموێ: {**صِرَاطَ الَّذِينَ أَنعَمتَ عَلَيهِمْ**} واتە: ئەی پەروەردگارا! بمانخەرە سەر ڕێبازی پیاو چاکانی خۆت، ئەوانەی بەهۆی بەرنامەی تۆوە سەرفرازی دونیاو قیامەت بوون کە بریتین لە پێغەمبەرانو ڕاستگۆیانو ڕاستاڵان، بێگومان ڕاستاڵیو پیاو باشی شتێکی ئەوەندە پیرۆزە هەموو مرۆڤێك پێویستی پێی هەیە پێویستە هەوڵ بدا بۆ گەشەپێدانیو پیاوە باشە ڕاستاڵەکان بکا بە پێشەواو سەمەشقی ژیانی خۆی.

**٧- دوورە پەرێزی لە ڕێگای گومڕایی (اجتناب سبيل الضلالة):**

دووره پـەرێزیی لـە گـومڕایی ڕەوشـتێکی بـەرزەو لـەم فـەرمووده خودایيـە وەرگيراوه كە دەفـەرموێ: {غَيرِ المَغضُوبِ عَلَـيهِمْ وَلاَ الـضَّالِّينَ} واتـە: غـەزەب لێ گيراوان ئەوانەی لە ڕێبازی حەق لايان داوەو رويـان لـە ڕێبـازی هەڵدێرو قـۆرتو پـێچ كـردوه پـەروەردگاريش قـاری لـێ گرتـوونو لـە ڕەحمـەتی خـۆی دووری خستونەوه. وشەی { الضَّالِّينَ } كـە بـەمان گومڕاكـان دێ ئەوانـە دەگرێتـەوه كـە لەبيرو باوەڕدا زۆر روچوونو زياد لە ئەنـدازه تێ هەڵچوون تا لەئاكاما گومڕابوون سەريان لێ شێواوه.

جاوەنەبێ ماناو فائيدەی سوورەتی (فاتيحه) بـەم چـەند خالآنـە كۆتـايی بـێ، بەڵكوو زۆر فائيـدەی تری لێ فەهم دەكرێو ئامـاژه بـۆ زۆر شـتی تـری تێدايـە بـۆ نموونە كە نوێژكار دەڵێ (نعبد، نستعين، إهدنا) بەشيوەی كۆو كۆمەڵ، ئەمە ئەوه دەگەيەنێ كـە پـەروەردگار بانگـەوازی كۆمـەڵی ئـادەميزادی كـردوه بـۆ يەكيـەتیو تەبايیو يارمەتيدانی يەكترێو هەرشتێك كە خێرو چاكەی كۆمەڵی تێدابێ.

كە دەفەرموێ: (اياك نعبد) ئەوه ئاماژەيە بۆ ئەوه كـە پێويـستە موسـوڵمانان هەموويان يەكدڵ روبكەنە يەك ئامانج ئەويش يەندايەتی كردنە بۆ خودا خۆیو بەس، بۆ ئەوەی پەيوەندی نێوان خۆمانو يەكگرتنمان بـە مەبەسـتی وەديهێنـانی ڕەزامەنـدی خودابـێ نـەك بـۆ بەرژەوەنـدی تايبـەتی شەخـصی يـان بـەديهێنانی ئارەزۆی تايبەتی كە دەبێتە هۆی لێك هەڵوەشاندنی كۆمەڵ.

لە رستەی (إياك نستعين)يشدا ئەوەمان بـۆ ئاشـكرا دەكـاو پێمـان دەفـەرموێ: كە پێويستە ئێمەی ئادەميزاد لە هەموو كـارو بـارێكی دونيـايیو قيامەتيـدا داوای كۆمەكیو يارمەتی لەو بكەين لە هەمان كاتيشدا خۆمان لەناو خۆماندا يارمەتیو هاريكاری يەكترێ بكەين لە هەموو كارێكيشدا پشتيوانمان خودابێ.

ڕستەی (إهدنا الصراط المستقيم)يش ئەوه دەگەيەنێ كە مرۆڤ هەميشە داوای دوزينەوەی ڕێبازی حەقو دروست لە خودا بكـاو لـە هـەمان كاتيـشدا موسـوڵمانان

خۆیان لەناو خۆیاندا ئامۆژگاری یەکتری بکەنو ڕێبازی ڕاستو ڕەوان بەیەکتری نیشان بدەن.

ئائەمە پوختەیەك بوو لەماناو سوودو بەهرەی (فاتیحە) کە موسوڵمان لە ڕۆژێکدا تەنها لە نیوژی فەرزدا حەڤدەجار دەیڵێتەوە کەوابوو فاتیحە سودێکی خوادییە شەوو ڕۆژ موسوڵمان دەیخوێننەوەو دەوری دەکەنەوەو ڕازو نیازو مەرازی خۆیانی تێدا بەپەنامەکی عەرزی بارەگای خودا دەکەن. ئەم سروده زۆر بەرزو پیرۆزترە لەو سرودە نەتەوەییانەی کە مانای تەعەصوبو بەخۆدا هەڵدانو بانگەوازی بۆ ناوچەگەرێتیو هەرێم پەرستی تێدابێ. ئەمە سرودێکی یەزدانییە برایەتیو خۆشەویستیو هاریکاری لەناو کۆمەڵدا بڵاو دەکاتەوە.

## کردارەکانی نوێژ (تتمة أفعال الصلاة):

دوای ئەوەی نوێژکار سورەتی فاتیحەی خوێندو جوان لەماناکەی وردبووە ئەمجار دەڵێ: (آمین) واتە: خودایە ئەم نزایانەم لێ قوبووڵ بکە، داواکاریەکانم جێبەجێ بکە. بێگومان پەیوەندی نوێژکەر لەگەڵ پەروەردگاری خۆیدا وەکوو پەیوەندی نەخۆش لەگەڵ نوشداردا وایە، هەروەکوو چۆن نەخۆش هانا دەباتە بەر نۆشدارو هیوای چاکبوونەوەی لێ دەکاو نۆشداریش پشکنینی تایبەتی خۆی ئەنجام دەداو دەرمانی پێویستی بۆ دەنوسێو ئامۆژگاری بەکارهێنانی بۆ دەکا هەر ئاواش نوێژکار هانا دەباتە بەر پەروەردگاری خۆی داوای شارەزاییکردن بە ڕێگەی ڕاستو گەیاندنی بەحەقو حەقیقەتی لێ دەکاو داوای لێ دەکا کە لە کردەوەی نەخۆشو بیرو بڕوای خراپو پڕو پووچ بیپارێزێ... هەرکەسێك جوان لە مانای قورئان تێفکرێ بە تایبەتی سەرنجی ورد لە سورەتی فاتیحە بدا وا هەست دەکا کە خوداوەند ڕاستەو خۆ پێی دەڵێ: ئەی بەندەکەم! دەرمانی دەردەکانت لە قورئاندا بدۆزەرەوە، چەند دەتوانی ڕۆژانە لێی بخوێنەرەوە، بێگومان قورئان شیفادەرە بۆ هەموو دەردێکت، هەر بۆیەشە نوێژکەر دوای خوێندنی سورەتی

فاتیحه چەند ئایەتێکی تری قورئان دەخوێنێ ئەمجار هەست دەکا بەوە کە چەند زەبوونو بێ وەجو زەعیفە چەند پێویستی بە پەروەردگار هەیەو چەند موحتاجی شیفای قورئانە، خاوەن دەسەڵات هەر خودایەو هەر ئەو هانای بۆ دەبرێو ئیتر کەساسیو زەلیلی خۆی بە چوونە روکوعو چەمینەوە دەر دەبڕێو زایەڵەی (الله أكبر) لێ دەداو هەردو بەری دەستی دەخاتە سەردوو ئەژنۆیو سێ جار دەڵێ (سبحان ربي العظيم وبحمده) ئەمجار لە روکوع راست دەبێتەوەو سوپاسو ستایشی خودا بەجێ دێنێ، لەسەر ئەوە کە هیدایەتی داوە بۆ بەندایەتیکردنو دەڵێ (سمع الله لمن حمده) هەرکەسێ سوپاسی خودا بکا بە نیازی پاداشتی باش خودا سوپاسو نیازەکەی قبووڵ دەکا. ئەمجار کە تێ دەفکرێ نازو نیعمەتی خودا زۆرنو لە ژمارە نایەنو ناتوانێ وەکوو پێویست شوکرانەژمێربێ، ئیتر بە ناچاری دەچێتە سوجدەو بەندایەتی خۆی گەورەیی خودا بە چوونە سوجدە بۆی ئەنجام دەدا، بانگی (الله أكبر) لێ دەداو ناوچەوانی دەخاتە سەرزەویو ئەو پەڕی بەندایەتیو زەلیلی خۆی بۆ پەروەردگار نیشان دەدا بە زوبانیش سێ جار دەڵێ: سبحان ربي الأعلى... واتە: خودای من لە هەموو کەسو هەموو شتێك گەورەترە. ئەمجار لە سوژدە سەر بەرز دەکاتەوەو دەڵێ: (الله أكبر) تاوێك دادەنیشێو تێیدا دەپاڕێتەوەو دەڵێ (رب اغفر وارحم) ئەمجار دەڵێ (الله أكبر) دەچێتەوە سوژدەی دووەم. پاشان دەڵێ (الله أكبر)و هەڵدەستێتەوە بۆ رکاتی دووەم: چی کردوە لە رکاتی یەکەمدا هەمووی دەکاتەوە بەس دوعای (استفتاح) نەبێ ئەو هەر لە رکاتی یەکەمدا سوننەتە.

ئەوەی کە سەرنج راکێشە ئەوەیە نوێژ وتنی رستەی (الله أكبر)ی زۆر تێدایە- لە سەرەتاوە – کاتی چەمینەوەو چونە کوع – کاتی چوونە سوژدە – کاتی هەستانەوە لە سوژدەی یەکەمو دووەم – ئەمەش بۆ ئەوەیە کە موسوڵمان رام بهێنرێ لەسەر نەفس بەرزیو رێز لە خۆگرتن تابەندایەتی هیچ کەسێك نەکاو تەنها بەندایەتی خودا بکا چونکە رستەی (الله أكبر) واتە: خودا لە هەموان گەورەترە جگە لەئەو کەس شایانی بەندایەتی بۆ کردن نییە. ئەمجار کە

نوێژکەر رکاتی دووەم بەجێ دێنێ‌و لە سوژدەی دووەم هەڵدەستێتەوە دادەنیشێ بە دانیشتنێکی تایبەتی‌و دەڵێ:

« التَّحِيَّاتُ الْمُبَارَكَاتُ الصَّلَوَاتُ الطَّيِّبَاتُ لِلَّهِ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، اللهم صل على سيدنا محمد وعلى آل سيدنا محمد ..... »

واتە:هەچی هۆی قەدرو رێزە چ بە گوفتار چ بە کردار، هەرچی نوێژو داخوازی‌و لالانەوەو پاڕانەوەو دوعاو نزایە، وە هەرچی سەرچاوەی پاکی‌و خاوێنییە ئەمانە هەموویان لە راستیدا هەر شایستەی خودای مەزنن! دوورد لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەری خودا لەگەڵ رەحمەت‌و بەرەکەتی خودا، درووود لەسەر ئێمەش‌و لەسەر هەموو بەندە باشەکانی خودا، شایەدی دەدەم کە هەر خودا خودایەو هیچ خودای تر نییە وەشایەتی دەدەم کە (محمد) هەم بەندەی خوداو هەم پێغەمبەری خودایە. ئەمجار یەزدان فەرمانی پێ کردوین کە درووودو سڵاو بنێرێن بۆ سەر گیانی پێغەمبەر بە مەبەستی یادکردنەوەو دەرخستنی رێزو فەزڵی بەسەر موسوڵمانانندا، لە هەمان کاتدا دان پیانان بە پێغەمبەرایەتی‌و راستی بەرنامەکەیدا، زیاد لەوەش سەلام کردن لە پێغەمبەر مانای پەیمان بەستن لەسەر مانەوەو بەردەوامبوون لەسەر ئایینی ئیسلام دەگەیەنێ.

دوای وتنی (اللهم صل على سيدنا محمد وعلى آل سيدنا محمد)، بڕێك لە دوعا مەشهوورەکان دەخوێنێ داوای چاکەی دونیاو قیامەت دەکاو ئەمجار کۆتایی بە نوێژ دێنێ‌و روو وەردەگێڕێ بۆ لای شانی راست‌و سڵاو لە کۆمەڵی فریشتەو موسوڵمانان دەکاو دەڵێ: (السلام عليكم ورحمة الله) ئەمجار روو بۆلای شانی چەپی وەردەگێڕێ‌و هەمان وشە دەڵێتەوە! ئەمجار سەر لەنوێ بەم گیانە ئاشتیخوازییەوە روو دەکاتە کارو باری دونیایی!

خوێنەری موسوڵمانی زێدە ئازیز! ئەمەیە مانای نوێژ لە ئایینی ئیسلامدا ئەمە ناوەرۆك‌و شێوەو شێوازیەتی، دەی باشە کەسێك بەم گیانە خودا پەرستییەوە

نوێژ بکا ئاوا لە ماناکەی حاڵی ببێ چۆن نوێـژ لـە گونـاهو تـاوان دووری ناخاتـەوە! چۆن نوێژ دەروونی لە دەغەزی نەخۆشی پاك ناکاتەوە؟ بەڵێ ئەمەش حیکمـەتێکی خوداییـە چـونکە زانیویـەتی کـە مـرۆڤ کاتێـك تێکـەڵاوی کاروبـاری دونیـایی دەبـێ ژەنگ دڵو دەروونی دەگرێو چڵکی ماددە صەفای رۆحی دادەپۆشێ، بۆیە فـەرمانی پێکردوە کە لە شەوو رۆژدا پێنج جار نوێـژ بکـا بـۆ ئـەوەی دڵـی لـە چڵـكو ژەنگـی دونیا تێکەڵبوونەوە بشواتەوە. بـە کـورتی نوێـژ وەکـوو دەرمـانێکی حـازر بەدەسـت وایە هەرکاتێ مەترسی هێرشی نەخۆشی دەروونی کرا خێرا هانای بۆ دەبرێ!!

## بڕێك لە حیکمەتەکانی نوێژ (بعض حکم الصلاة في القرآن):

### ١- وازهێنـان لە کرداری خراپ (تغيير الأعمال القبيحة):

بێگومــان نوێژگــەر کــە لــە شــەوو رۆژدا پێــنج جــار دەچــێتە حــوزوری پەروەردگاری خۆیو هەست دەکا بە ترسو لەرزی ئەو دیدارە روحیەی کە لەگەڵ خودای خۆی ئەنجامی دەدا، بێگومان ئەم دەستەو نـەزەرو لـە خزمـەت راوەسـتانە بڕوای بە پەروەردگاری خۆی بەهێز دەکاو بیرو ڕاو تێڕوانینی بـۆ عالـەم دەگـۆڕێ بە جۆرێك کە ئیمانو بڕوای دەبێتە هێزێکی کاریگەر لـە ژیانیـدا نـاهێڵی نەفسی نزیك هەواو ئارەزۆی حەرام ببێتەوەو دەکەوێتە سەر رێبازی راسـتەقینەی ژیـانی خۆشبەختی!

{وَأَقِمِ الصَّلَاةَ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ - سورة العنكبوت – ٤٥}.

ئەوەتا لەم ئایەتە پیرۆزەدا پـەروەردگار فـەرمان دەکـا بـە بـەجێهێنانی نوێـژ، بـەجێهێنانی هـەموو شـتێکی، ئـەنجام دانیـەتی بـە تـەواوی بـەجۆرێك کـە وەکـوو پێویست جێبەجێی بکا کەوابوو نوێژکردنی بەڕاستی بریتییە لە ڕوکردنە خوداو ترسان لێی بە شێوەیەك کە ببێتە بەربەستێکی کاریگەرو نـەهێڵی نوێژکەرەکـە لا بەلای تاوانو گوناح دا بکاتەوە. هەرکاتێکیش شێوازی نوێژ لەم مانایە خـاڵی بـوو، واتە نوێژ نوێژکەری لە گوناهو تاوان نەگێرایەوە لە راسـتیدا ئـەو نوێژکـەرە هـەر

بەڕواڵـەت بـڕێ کـردارو گفتـاری بۆشـی ئـەنجام داوەو لـە حەقیقـەت دا نوێـژی نەکردوە، بەڵکوو بە ڕواڵەت راوەستانو چەمینەوەو چوونە سوژدەو دانیـشتنێکی تایبەتی ئەنجام داوەو چەند ڕستەو وشیەکی قورئانیشی بـێ ئاگاو تـوتی ئاسایی گوتونـەوە پـەروەردگاریش راسـتەوخۆ هەڕەشـەی سـەختی لـەم جـۆرە کەسـانە کردوەو فەرموویەتی:

{فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ، الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ - سورة الماعون – ٤-٥}.

واتە: هاوار بۆ ئەو کەسانەی کە بـە رواڵـەت نوێـژ دەکەنو بـەڵام ئاگایـان لـە نوێژەکەیان نییەو دڵیان بەشتێکی ترەوە خەریکە.

**٢- ئاشتیو رسکانی رەوشتی ئازایەتیو سەخاوەت:**

ئادەمیزاد لە گۆڕاندایە ئەمڕۆ منداڵە سبەینێ گەنجەو دوسبەی پیرە، سەر لەبەیانی هەژارە، سەر لـەئێوارە دەوڵەمەنـدو پارەدارە. ئێـستا ساغەو تـاوێکی تـر دەردەدارە، جـا کـە توشـی خێـرو خۆشـی بـوو، دڵ خـۆش دەبـێو بەرچـاو تـەنگو بەخیل دەبێ، کە شەڕو بەڵایەکیش بەری دەرگای پێ گرت هاواری لێ هەڵدەسـتێو دەست دەکا بە دادو فیغان جا ئەگەر کابرا نوێژکەربێو خواپەرستی بە راسـت بـێ لەم حاڵانەدا پەنا بـۆ نوێـژکردن دەبـا بـە کردنـی نوێژەکـەی دڵو دەروونـی ئـارام دەگرێو لەسـەر خۆشەویـستیو خـۆ راگـری رام دەبـێو پـشتو پـەنای بـە خـودای کردگـاری خـۆی دەبەسـتێ، ئـەو خودایـەی بەدیهێنـەری ئـادەمیزادەو رزقو رۆژی دەریانــە، بەمــەش زیــاتر فــەزڵو گــەورەیی خــودای لا ئاشــکرا دەبــێو نــازو نیعمەتەکانی دێنـە بەرچـاو بـۆ ماڵبەخـشینو کـرداری بـاش دەسـت بـەکار دەبـێو چـنگ دەنێتـە مـاڵی خـۆیو لـە رێگـەی خـوداو سـودی گشتیدا چـی بـۆ بکـرێ لـە بەخشینی ماڵو سامانی درێغی ناکا، لەم بارەوە قورئان دەفەرموێ:

{إِنَّ الْإِنسَانَ خُلِقَ هَلُوعًا، وَإِذَا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعًا، إِلَّا الْمُصَلِّينَ}.

واتە: ئای لە ئادەمیزاد کە بێ ئوقرەو بێ هورەو چاوچنۆکو دەم بـە هـاوارە، نە لە شادیدا خۆی دەگرێو نە لە شیندا، کاتێ خـودا مـاڵو خێـرو داراییـی دەداتـێ دەسـت قوچـاوو خێـر نەکـەرە کاتـێ توشـی زەرەرو زیـانو ناخۆشـی دەبـێ دەم بـە هاوارو بۆڵەبۆڵکەرەو بەهاتو هاوار ئاسایش لەخۆی هەڵدەگرێ.

لە شوێنێکی تردا قورئان ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە نوێژ قورسایی بەلاو موسیبەت لە سەرشانی ئادەمیزاد سووك دەکاو دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اسْتَعِينُواْ بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ }.

واتە: ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان هەمیشە بۆ قەلاچۆکردنی باری قورسایی بەلاو موسیبەت پەنا بە نوێژکردن بەرن و رەوشتی صەبرو ئارام لە خۆتانا پەیدا بکەن چونکە نوێژ سیقەو پشت بەستن بە خودا بەهێز دەکا بە پەنابردنیش بۆ لای خوداو نزاو پاڕانەوە لێی، هەم خەموو پەژارەکەی لادەچێ و هەم قورسایی لەسەرشانی مرۆڤ سوك دەبێ.

**٣- گەشە پێکردنی مەلەکەی زەین ( تنمية ملكة حصر الذهن ):**

مرۆڤ کاتێك هانا بۆ نوێژکردن دەباو روی بەندایەتی دەکاتە خودای خۆی، چەند بیرو رایەکی جوێ جوێ لە مێشکیدا دێن و دەچن، ئەویش دەیەوێ هەموو بیرو خەیاڵ و خەتەرەی ناو دڵ و مێشکی دەرکا بۆ ئەوەی گەورەیی خوداو لەززەتی نزاو لێ پاڕانەوە لێی بخاتە شوێنی ئەو خەیاڵ و بیرو رایانە، دیارە ئەمەش پێویستی بە صەبرو خۆڕاگری و لەخودا ترسان هەیە هەرکاتێ ئینسان توانی ئەم رەوشتانە بۆ خۆی بەدەست بێنێ دەبێتە لە خوداترس بە گوێرەی فەرموودەی قورئانیش لە خودا ترسان لە نوێژدا دەبێتە هۆی سەرفیرازی دونیاو قیامەت:

{قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ، الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ-سورة المؤمنون/١-٢}.

وشەی (خاشعون) ئەوانە دەگرێتەوە کە گەردن کەچی فەرمانی خودان و لێشی دەترسن. ئیمامی رازی وشەی (الخشوع)ی لە نوێژدا بەم جۆرەماناکردوە فەرموویەتی: بریتییە لە کۆکردنەوەی بیرو هۆش و خەیاڵ لەسەر نوێژو وەدەرنانی هەموو خەیاڵێکی تر لەدڵدا، جا هەروەها کاتێ ترسان لە خودا بەم جۆرە بوو، دەبێتە هۆی گەشەکردنی مەلەکەی کورت هەڵهێنانی بیرو هۆش بۆ هەرکارێك کە بتەوێ ئەنجامی بدەی، پەیدابوونی ئەم مەلەکەیش رۆڵێکی گرینگی هەیە بۆ سەرکەوتنی مرۆڤ لە ژیانیدا، بۆیە پێویستی سەرشانمانە کە چۆنیەتی ئەم مەلەکەیەو گرینگی لە ژیانی ئینساندا بزانین. زانای بەناوبانگ و شارەزا لە دەروون

شوناسیدا مامۆستا (ولیم مولتون مارستن) لە گۆڤاری (ریدرز دایگوست)دا دەڵێ: توانای سەرکەوتن بۆ کورت هەڵهێنانی خەیاڵو خەتەرەو روتێکردنی زەین بۆ کارێکی تایبەتی لە هەموو بارێکی ژیاندا لەلای پیاوە گەورەکانو ناودارەکانی جیهان رەوشتێکی ئاساییە، لە هەر ساتو کاتێکدا پێشەواو سەرۆكو خاوەن بەهرە، ئەگەر ویستی زەینی خۆی کورت هەڵهێنێ بۆ کارێکی تایبەتی زۆر بە ئاسانی دەتوانێ تەرکیزی هێزە زەینییەکانی خۆی بکا بۆ ئەو کارەی کە دەیەوێ ئەنجامی بدا، لە کاتێکدا زوربەی ئێمەمانان ئەم هێزە تایبەتییەمان نیەو ناتوانین دڵەڕاوکێ لە خۆمان دەرکەین، هەرکە دەمانەوێ کارێکی تایبەتی ئەنجام بدەین جۆرەها راوو بۆچوونمان لا دروست دەبێو سەرمان لێ دەشێوێ.

ئەمجار دەڵێ: عەقڵی ئادەمیزاد ئامێرێکی گەلێك بەهێزو توانایە هەر کاتێك تەرکیزی پێ کرایە سەر شتێك ئەنجامی سەرسورهێنەری دەبێ.

ئەمجار مامۆستا (ولیم مولتون مارستن) دێتە سەر باسی چونیەتی بەدەستهێنانی ئەم رەوشتە گرینگەو دەڵێ: (ئەم هێزو توانایە کە زەینی پێ تەرکیز دەکرێ بە پەراوەپێکردنو تاقیکردنەوەو کەسب پەیدا دەبێ... ئەمەش پێویستی بە صەبرو خۆڕاگری هەیە چونکە تێپەڕێن لە قوناخی دڵەڕاوکێو راڕایی بۆ قوناغی کورت هەڵهێنانی زەین لەسەر کارێکی تایبەتی هەروا بە ئاسانی بەدەست نایە، بەڵکوو دەبێ کۆششو هەوڵو تەقەللایەکی زۆرو زەبەندەی بۆ بدرێ، هەر کاتێك تۆ توانیت عەقڵت بۆ کارێك بە کاربێنیو چەند جار عەقڵی خۆتت دەمەزەرد کردەوەو لەو کارەی کە دەتەوێ بیکەی بەکارت هێنا، بێگومان ئەو خەیاڵو بیرو رایانەی کە بوونە کۆسپ لەبەردەم عەزمەکەتدا جێگایان پێ لەق دەبیو ناتوانن بەرهەڵستی سوربونت لەسەر کارەکە بکەن، تا لە کۆتایی دا دەبینی زەینو بیرو هۆشت بە تەواوی تەرکیز کراون بۆ ئەو کارەی کە خۆت هەڵت بژاردووە.

بۆیە دەتوانین بڵێین نوێژ لە ئایینی ئیسلامدا رۆڵێکو دەورێکی کاریگەری هەیە بۆ پەروەردەکردنی مەلەکەی کورت هەڵهێنانی زەینی مرۆڤ. چونکە ئەو نوێژکەرەی کە بتوانێ بەدرێژایی نوێژەکەی فیکرو هۆشی خۆی کورت هەڵهێنێ

بۆ روکردنە خودا ئەمەش خۆی لە خۆیدا پێی دەوترێ (خشوع) واتە: لە خودا ترسان، بێگومان مەلەکەی یەکچاو کردنەوەی زەین (ملكة حصر الذهن)ی لەلا پەروەردە دەبێو بۆی دەبێتە باشترین یارمەتیدەر بۆ ئەنجامدانی کردارەکانی. ئەوەی کە ئەم بۆچوونەمان بەهێزدەکا، دووبارە وتەکەی (ولیم مولتون)ە کە دەڵێ: باشترین شت کە نەیەڵێ زەین پەرتەوەازە بێ ئەوەیە کە عەقڵو جیسم پێکەوە کاربکەن ئەویان هاوکاری ئەم بێو ئەمیان هاوکای ئەویان بێ) دەی نوێژ لە ئایینی ئیسلامدا بەعەقڵو جیسم ئەنجام دەدرێ هەردوکیان دەوریان هەیە لە ئەنجامدانی کارەکە.

**٤- بەهێزکردنی نەفسی ئینسانی (تقوية النفس الإنسانية):**

لێکۆڵینەوە دەرونزانیەکان ئەوەیان سەلماندووە کە نوێژو خودا پەرستی سودێکی زۆریان هەیە بۆ ورە بەرزیو دڵ قایمی... بۆ نموونە لەشاری نیۆرك رێکخراوی خستنەگەڕی بێ ئیشەکان (مصلحە تشغيل المعطلين) تاقیکردنەوەیەکی دەروونی بەسەر (١٥٣٢١) کەس لە ژنو پیاوی بێکارەدا ئەنجامدا لە ئاکامی تاقیکردنەوەکەدا هەرکەسە بۆ پیشەیەکی شیاو بەخۆی نێردرا بۆ ئەم کارە گرنگە، دکتور (هنری لنگ) کە پسپۆڕو زانای دەرونزانی بوو کرابوو بە پرسپێکراو (مستشار) داواشی لێکرابوو پیلانو نەخشەی تایبەتی دابنێ چاودێری لێکۆڵینەوەی سەرژمێریارە کورتکراوەکەی کە بۆ دەهەزار نەفس کرابوو بکا.

جا دکتۆر (هنری لنگ) دەڵێ: لەکاتی خەریکبوونم بەم کارە وردە وردە بۆم دەرکەوت کە بیرو باوەڕی ئایینی بەنیسبەت ژیانی ئادەمیزادەوە کاریگەرییەکی زۆری هەیەو رۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە دروستکردنی شەخصیەتی ئینساندا، چونکە بۆم رون بووەوە هەر کەسێك پەیرەوی ئاینێك بکاو هاموشۆی مزگەوتو دێرو کەلیسا بکا شەخصیەتی بەهێزترە لە کەسێك کە هیچ دینێکی نەبێ یان هیچ عیبادەتێك ئەنجام نەدا[1].

---

[1] لە کتێبی العودة إلى الايمان، دانراوی: د. هنری لنگ، وەرگێرانی مامۆستا پروە عکاسە وەرگیراوە.

ئـاینی ئیـسلام زۆر زوو هەسـتی بـەم راسـتییە کـردوە بانگـەوازی خەڵـکی کردوە بۆ نوێژکردنو بەردەوام بوون لەسەری، خودا دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا وَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ وَافْعَلُوا الْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ - سورة الحج – ٧٧}.

هـەر لەبـەر ئـەو هۆیـەی سـەروەیە کـە پـەروەردگار لـە هـەموو هەفتەیەکـدا جارێـك لەسـەر موسـوڵمانانی فـەرزکردوە کـە نوێـژی هـەینی بەجەماعـەت لـە مزگەوتـدا ئـەنجام بـدەن، ئەوەشـی راگەیانـدووە کـە کردنـی نوێـژی جومعـە لـە مەزگەوتدا خێرو بێرێکی زۆری هەیـە بـۆ نەفسی ئینـسانیو سـودێکی تـەواوی لێ وەردەگیرێ، دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِي لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ - سورة الجمعة – ٩}.

واتە: ئەی موسوڵمانەکان! هەرکاتێ بانگی نوێژی جومعە دراو بانگ کـران بـۆ نوێـژ، خێـرا بـەرەو پـیری بانگەکـە بـچنو واز لـە سـەوداو مامەڵـەو ئـیشو کـاری خۆتـان بێـننو روبکەنـە مزگـەوت بـۆ نوێـژکردن، ئـەوە بـۆ ئێـوە باشـترە! ئەگـەر بزانن.

## بەشی پازدەهەم:

# ڕۆژوو لە ئیسلامدا (الصیام في الإسلام)

**پوختەی ناوەڕۆکی ڕۆژوو – بڕێك حیكمەت و سوودی ڕۆژوو – زەحمەتی ڕۆژوو کەم دەکاتەوە.**

ڕۆژوو لە زاراوەی زمانی عەرەبیدا بریتییە لە وازهێنان لە شتێك، لە زاراوەی زانایانی شەرعدا بریتییە لەوازهێنان لە خواردن و خواردنەوەو سەرجێیی و جوتبوون لە کازیوەی بەیانییەوە هەتا ڕۆژ ئاوابوون بە مەبەستی ڕەزامەندی خودا!!

یەکەم بەڵگەی واجب بوونی ڕۆژوو ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ، أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُ وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ، شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُواْ الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ اللّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ - سورة البقرة – ١٨٣-١٨٥}.

پەروەردگار بەم ئایەتانە ڕۆژووی ڕەمەزانی لەسەر موسوڵمانان فەرز کردوە، چۆنیەتی ئەنجامدانیو ئەندازەو سوودو پاداشتەکانیشی ڕوون کردۆتەوە.. دەی با پێکەوە ساتێك بەوردی جارێکی تر بە ئایەتەکاندا بچینەوە بزانین چیمان بۆ دەردەکەوێ؟؟

سەرەتا کە خودای گەورە دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ...}.

ئەوەمان تێدەگەیەنێ کە فەرزکردنی ڕۆژوو یاسایەکی ئاسمانی تازەیە بۆ ئادەمیزاد بەڵکوو یاساو تەشریعێکی کۆنە بۆ کۆمەڵانی ئادەمیزادی پێش ئێمەش. واتە: لە یاساو بەرنامەی هەموو پێغەمبەرێکدا ڕۆژو هەبووە! ئاشکراشە

کـە ئەمـە قورسـایی ئـەرکی ڕۆژوو سـووك دەکـاو ڕێگـای پـەیڕەوی کـردنو جێبـەجێکردنی ئـاوەلا دەکـاو موسـوڵمانان هەست بـەوە ناکـەن کـە داوای شـتێکی تازەقـەڵلای نابـەجێیان لێ کـراوە، بۆیـە زۆر بـە دڵفراوانییـەوە وەری دەگـرنو فرمانەکە جێبەجێ دەکەن!!

ئەمجار پەروەردگار، دوا بەدوای ئەمە دەفەرموێ: {لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ} بەمـەیش مەبەستو کاکڵەو پوختەی ڕۆژوومان بـۆ ئاشـکرا دەکـاو ڕۆحو جەوهـەری ڕۆژوو لـە ئیسلامدا چییە پێمان دەفەرموێو داوامان لێ دەکا کە ئێمـە ڕۆژوو بکەینـە مـەتاڵو سەنگەرو خۆمانی تێدا حەشار دەینو بیکـەین بـە لەنگـەرو بـەرگرو بەربەست، تـا نـەهێڵێ بکەوینـە زلکـاوی کـاری نابـەجێوە، مـەیلو ئـارەزۆو هـەواو هـەوەسمان لەخراپەکاری بگەڕێنینەوە!! چونکە لە ڕاستی دا ڕۆژوو مەتاڵەو سـەنگەرە، ئینـسان دەپارێزێ لەوەی کە ببێتە ئاژەڵێکی گەدە پەرستو بەشەڕیعەتی بیشەلان (شـریعة الغـاب) کـار بکـا، کۆمـەڵیش دەپـارێزێ بـەوەی کـە تاکـەکانی وا پـەروەردە دەکـا کـە هـەموویان ڕاسـتاڵو سـوودبەخش بـن، وا هەسـت بکـەن کـە ئـادەمیزادنو لەگـەڵ ئادەمیزاددا کاری ئینسانی دەکـەن، نـەك بـە ئارەزوویـەکی ئاژەڵییـەوە کـاری ئـاژەڵی ئەنجام دەدەن، هەر لەم ڕووەوەیە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ:

«إِنَمَا الصَّوْمُ جُنَّةٌ، فَإِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ صَائِماً فَلاَ يَرْفُثْ وَلاَ يَجْهَلْ وَإِنِ امْرُؤٌ قَاتَلَهُ شَتَمَهُ فَلْيَقُلْ: إِنِّى صَائِمٌ، إِنِّى صَائِمٌ .

واتە: ڕۆژوو مەتاڵەو قەڵغانەو مەردوم لە خراپە دەگێڕێتەوە، هەریـەکێك لـە ئێوە کە بە ڕۆژوو بـوو بـا وتـەی ناشـیرینی لـەدەم دەرنەچێو کـاری بـێ عەقڵانـە نەکا. ئەگەر یەکێکیش شەڕی لەگەڵدا کرد یان جوێنی پێدا با بڵێ: من بـەرۆژووم من بەرۆژووم.

کە دەڵێن ڕۆژوو مەتاڵە، واتە: پـارێزەرەو ناهێڵـێ خاوەنەکـەی بکەوێتـە سـەر ڕێگای چەوتو چەوێڵ، واتە: دەبێ ئینـسان واهەسـت بکـا کـە ڕۆژووەکـەی ناهێڵـێ کاری ئـاژەڵی بکـاو لـە کرداری خـراپ دووری دەخاتـەوە! کـە دەڵـێ (مـن بابایـەکی

بەرۆژووم) ئەوە دەدا بە گوێچکەی بەرامبەرەکەیدا کە ئەم بەرگی بێوەیی مرۆڤایەتی بەراستی پۆشیوە، نەك گورگەو لە پێستی مەڕدا.

هەر کاتێکیش مرۆڤ خۆی لە شەڕی نەفسی خۆی پاراستو کۆمەڵیشی پاراست ئەوە گەییشتۆتە جێی ڕەزامەندی خوداو لەریزی تەقوا کاراندا دەژمێردرێ ئەمەش بە کورتی مانای ڕستەی (لعلكم تتقون)ە کە مانای وشەی (لعل) لێرەدا حازکردنو پەروەردەکردن دەگەیەنێ، ئاشکراشە پەروەردەکردنی دەروونو نەفسی ڕۆژووەوانان بەهۆی ڕۆژووەوە بۆتە تەقواکاریو لە خودا ترسان لەچەند ڕوێکەوە دەردەکەوێ لە هەموویان نمایانتر ئەوەیە کە کاری ڕۆژوو کارێکە پەیوەندی بەخودی ڕۆژوەوانەکەوە هەیە، جگە لەخودا کەسی ترنییە کە چاودێربێ بەسەریەوە.

جا ئەگەر ڕۆژووەوان بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی خودا وازی لە خواردنو خواردنەوە هێنا، وە ساخ لەبەر ڕەزای خودا نە بەدزیو نە بە ئاشکرا سنووری دیاریکراوی ڕۆژووی نەبەزاندو نەفسی خۆی رامکرد لە سەرخۆگریو وازی لەو خۆشیو ئارەزوانە هێناو باوەڕی وابوو پەروەردگاری موراقەبەی دەکاو ئاگاداری نهێنییەکانیەتیو تاماوەی مانگێك ئەم دیاردەیەی پێوە دیاربوو بێگومان لە دووربارەبوونەوەو سێ بارەبوونەوەی ئەم حاڵە، مەلەکەی لە خودا ترسانو حەیا لە خودا کردن هەست بە لێپرسراویکردن بەرامبەر خودای مەزن پەیدا دەبێو دەتوانێ زاڵ ببێ بەسەر هەواو ئارەزۆی نەفسانیدا، ئەم حاڵەتەیش وای لێ دەکا کە بگونجێ لەگەڵ هەموو کارێکی خێرو چاکەداو دوورە پەرێز بێ لە شەڕو کاری شەڕ ئامێز، ئیتر فێڵو تەڵەکە ناکاو زوڵمو زۆر بە ڕەوا نابینێ، حەقی کەس ناخواو هەوڵو کۆششی خراپەکاریو فەساد نادات، کارێکیش ناکات دژایەتیو دووبەرەکی بخاتە ناو موسوڵمانانەوە.

بەڵام تەنها وازهێنان لە خواردنو خواردنەوە – بەبێ هەستکردن بە موراقەبەی خودا – دەبێتە ڕێگا خۆشکەر بۆ گوناهکردنو ئەنجامدانی تاوانی گەورە، کەوابوو ڕۆژوی ئاوا ئەو ڕۆژووە نییە کە خودا فەرزی کردوە لەسەر

موسوڵمانان. جا لەم ڕوانگەوەیە کە بوخاری (خودای لێ ڕازی بێ) حەدیسێك دەگێڕێتەوە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ:

« مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ وَالْعَمَلَ بِهِ فَلَيْسَ لِلَّهِ حَاجَةٌ فِي أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ. رواه البخاري .

واتە: ئەو ڕۆژووەوانەی واز نەهێنێ لە قسەی ناڕەواو لەکاری ناڕەوا خودا کاری بەوەی ئەو نییە کە دەمی خۆی ببەستێو واز لە خواردنو خواردنەوە بهێنێ.

کەوابوو کاکڵەو پوختەی ڕۆژوو لە ئیسلامدا هەستکردنە بە موراقەبەی خوداو هەستکردنە بەوەی کە دەبی ڕۆژوو ساخ بۆ ڕەزای خودابێ. بەڵگەش بۆ ئەمە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرە کە دەفەرموێ:

« مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ. رواه البخاري ومسلم .

لەلایەکی ترەوە ڕۆژوو دەروونی ڕۆژووەوان ئامادە دەکا بۆ خودا پەرستی! لەم ڕووەوە کە ڕۆژوو هەواو هەوەسو هێزی ئارەزووبازی لاواز دەکاو شەهوەتیش – یا هەواو هەوەس – سەرچاوەو کانگای گشت گوناهو تاوانێکە. ئەوەتا پێغەمبەری مەزنمان دەفەرموێ:

« يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ .

واتە: ئەی دەستەی لاوان! هەرکەسەتان تەوانایی سەرجێیو ژنداریی هەیە با ژن بهێنێ، چونکە ئەوە چاوی تێر دەکاو داوێنی لە تاوان دەپارێزێ، ئەو کەسەیشی کە لە کێشیا نییە با بە ڕۆژوو بێ، چونکە ڕۆژوو دەیخەسێنێو ئارەزۆی نێرو مێیی لاواز دەکا.

## هەندێ پەندو بەهرەی ڕۆژوو (بعض حكم الصوم وفوائده):

سوودو حیکمەتی ڕۆژوو زۆرن، چ لە بارەی کۆمەڵو کۆمەلایەتییەوە چ لەبارەی تاکە کەسەوە، یەکێك لەو سوودانە بەزەیی هاتنەوەیە بە هەژاراندا،

چونکە ڕۆژووەوان کاتێ برسی دەبێ هەست بە ئازاری برسێتی دەکا، ئەم حاڵەتە هەلێ دەنێ بۆ ئەوەی بەزەیی بێتەوە بە هەژارو نەدارایاندا، چونکە ڕەحمو بەزەیی لە ئینساندا لە ئازارو نارەحەتییەوە سەر هەڵدەدا، ڕۆژوو خۆی لە خۆیدا ڕێبازێکی ئاساییە بۆ پەروەردەکردنی ڕەحم لەدڵو دەروونەدا، جا هەرکاتێ ڕەحمو بەزەیی هاتنەوە بە هەژاراندا لە دڵی دەوڵەمەنددا چەکەرەی کردو ڕووا، ئەوە لە ناخەوە هەستی بەرامبەر بە لێقەوماوان دەجووڵێو بەخششو خەڵاتی بەرفراوان دەبێ، لەبەر ئەمەیە زانایان دەفەرموون: پێغەمبەری مەزنمان لە هەموو کەس سەخی تر بووە، لە مانگی ڕەمەزانیشا، لە هەموو کاتێك زیاتر سەخی بووە... سوودێکی تری ڕۆژوو ئەوەیە کە بەکردەوە – نەك هەر بە قسە – یەکسانی دەخاتە نێوان دەوڵەمەندو هەژارانەوە، هەردوکیان وەکوو یەك لە بەیانیەوە تا ئێوارە لە برساندا سکی خۆیان هەڵدەگوشن. کەوابوو ڕۆژوو یاسایەکی ئاساییە زۆر ڕێکو پێکترە لە یاسا ئیشتراکییەکان، بەڵێ: ڕۆژوو هەژارییەکی زۆرەملێیەو ئایینی ئیسلام وەك یەك لەسەر هەموو موسوڵمانی داناوە تاکو هەموو کەسێك لە ناخەوە هەست بە ئازاری نەداری بکا، تا تێیان بگەیەنێ کە ئیشتراکییەتی ڕاستی کاتێ دێتەجێ کە هەموو کەس لە هەستو شعوردا چون یەك بن، نەك هەر مەلەی لە ئاوازێو هەستو ئارەزۆی جیاجیا لەیەك تەرایان بکا.

کاتێك ئیشتراکییەتو هاوسانی دێتە جێ کە ئەندامەکانی کۆمەڵ هەست بە ئێشو ئازاری ماددیو مەعنەوی یەکتری بکەن، نەك لەسەر بەرژەوەندی تایبەتی تووشی بگرەو بەردەو کێشەی کۆمەڵایەتی زۆر ببن.

بەهرەیەکی تری ڕۆژوو ئەوەیە کە دەسەڵاتی عادەتو خوو پێوە گرتن زەبوون دەکا، چونکە کەسانێکی وا هەن وا گەردنکەچی عادەتو خوو دەبن دەڵێی پێوەندکراون، بەرامبەر بەو عادەتە، هیچ هێزی گۆڕانیان نییە، بۆ نموونە بڕێ کەس هەن خۆیان وا پێوە گرتووە کە لە کاتێکی تایبەتیدا چایی بخۆنەوە یان بخۆن یان جگەرە بکێشن! ئەگەر لەو کاتە تۆزێك دواکەوت دونیایان لەپێش چاو

تاریک دەبێ و بە تەواوی هەڵس و کەوتیان دەگۆڕێ، جا ئەمانە ئەگەر لە ڕۆژوگارێکدا لەکاتی گرانیو قاتو قڕیدا یان لەکاتی جەنگو لێقەوماندا پێویستیاتی ئەوخوو عادەتانەیان بۆ دابین نەکرا ئەوە خێرا ورەیان دەڕۆخێ و لەپەلو پۆ دەکەونو دوژمن بەسەریان زاڵ دەبێ!

سودێکی تری ڕۆژوو: بەهێزکردنی ویستو ئیرادەیە چونکە ڕۆژوو ڕێبازێکی عەمەلییە بۆ بەرەنگاریکردنی هەواو هەوەس.

مامۆستای بەناو بانگی ئەڵمانی (جیهاردت) کتێبێکی داناوە دەربارەی بەهێزکردنی ویستو ئیرادە، ڕۆژووی کردوە بە بناغەو کۆڵەکەی ئەوکارەو بە قەناعەتەوە دەڵێ: ڕۆژوو هۆکارێکی کاریگەرە بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی ڕۆح بەسەر لەشدا. بەهۆی ڕۆژووەوە ئادەمیزاد دەتوانێ جڵەوی نەفسو ئارەزۆی خۆی بەدەستەوەبێ و نەبێتە ملکەچی ئارەزوە مادییەکانی. ئەمەی کە گوترا کەمێك بوو لە سوودی گەلێ زۆری ڕۆژوو.

بێگومان ڕۆژوو چارەسەرێکی سەرکەتووە بۆ زۆر نەخۆشی دەروونیو کۆمەڵایەتی جگە لە سوودی زۆرو زەبەندەی بۆ لەشو جەستە کە لە باسێکی تایبەتی ئەم کتێبەدا بەناوی (صحة الابدان في الإسلام)دا باسی دەکەین خودا یاربێ!

## ئیسلام بارسووکی نیشانەدا کە ڕۆژوو نەبێ بەمایەی زەحمەت:

بێگومان ڕێ دەکەوێ کە مرۆڤ لە مانگی ڕەمەزاندا نەخۆش بێ یان لەسەفەردا بێ بە جۆرێك کە نەتوانێ بەرۆژوو بێ بۆیە حیکمەتی پەروەردگار وایە کە قورسایی ڕۆژوو لەم کاتانەدا لەسەر ئەوانە لابەرێ و بەرۆژوو بوونەکەیان هەڵبگرێ بۆ دوای چاکبوونەوەیان بۆ دوای گەڕانەوە لە سەفەر: {فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ}. ئەمجار دەفەرموێ: {وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ}.

واتە: پێویستە لەسەر ئەو کەسانەی کە ساغن‌و لە شوێنی خۆیانـدان — بـەڵام لەبەر پیری، یـا دووگیـانی، یـا منـاڵ بەبـەری یـا لەبـەر نەخۆشـییەك کـە ئومێـدی چاکبوونەوەی لێ نەکرێ بەخەرجکردنی هەموو تەواناییێ نەبێ ناتوانن کـە ڕۆژوو بگـرن — (کـەفارەت) تۆڵـەی ئـەو ڕۆژووەیـان بـدەن بـۆ هـەر ڕۆژەی بـە ئەنـدازەی خواردەمەنی گەدایەك، گێڕانەوەی ڕۆژووەکەشیان لەسەر نییە![1].

ئــەمجار دوا بــەدوای ئــەوە دەفــەرموێ: (فمــن تطــوع خــیرا) کەســێك لــەو ئەندازەیــە زیــاتر خــواردن بــدا یــان زیــاد لــە لەهــەژارێك خــواردن بــدا، یــان ڕۆژووەکەشی بگرێ‌و خواردەمەنییەکەش بدا (فهو خیر له) ئەوە بـۆ ئـەو باشـترەو خێرو بیرەکەی هـەر بـۆ خـۆی دەگەڕێتـەوەو خـاوەن ڕۆژووەکـە پێـی بەهرەمەنـد دەبێ. ئەمجار دوای ئەوە دەفەرموێ:

{وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ}. هەرکاتێ زانیتان‌و حاڵی بوون کە بەهرەی ڕۆژوو چەند زۆرەو، ڕۆژوو چەند خێرو بێری هەیە ئـەو کاتـە بـەرۆژوو دەبن‌و ئەو خێرو بێرە لەکیس خۆتان نادەن.

{شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ - سورة البقرة - ١٨٥}.

پەروەردگار لەم بەشەی ئایەتەکەدا ئەنـدازەو زەمـانی ڕۆرژوومـان بـۆ دیـاری دەکا کە مانگی ڕەمەزانە، حیکمەتی ئەوەش کە ئەم مانگە تایبەتـە بـەو عیبادەتـە ئەوەیە کە لەم مانگەدا سەرتای سروش (وەحی) ئاسمـانی کـە قورئانـە هـاتووە بـۆ پێغەمبــەرو لــەم مانگــەدا لێــشاوی پیــت‌و بەرەکــەتی یــەزدانی بەســەر بــەرەی ئادەمیزاددا ڕژاوە...

---

[1] بـە گـوێرەی مەزهـەبی ئیمـام ئـەبو حەنیفـە ئەنـدازەی (فیدیـە) دووژەم نـانخواردنی مـام ناوەندییە یان بە ئەندازەی سەرفیترەی ڕۆژووی ڕەمەزانە.

{فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ}. هەر کەسێك لە ئێوە مانگی بینی – یا کەسێکی تر لە کۆمەڵی موسوڵمانان بینیو ئەم بڕوای بە بینینەکەی هەبوو – ئیتر پێویستە بەرۆژوو بن. لێرەدا مەبەست لە وشەی (الشهر) مانگی یەکشەوەیە (هیلال)ە چونکە لە زمانی عەرەبیدا لەجیاتی وشەی (هلال) وشەی (شهر) بەکار دەهێنرێ!!

پەیدابوونی مانگی ڕەمەزان بە دوو بەڵگە دەسەلمێندرێ:

١- بەدیتنی مانگی نوێ، ئەمەش کاتێك دەبێ کە ئاسمان سایەقەو ساف و بێ گەردبێ.

٢- ئەگەر هەورو هەڵا بوو نەتوانرا مانگ ببینرێ، پێویستە مانگی شەعبان (کۆڵە مانگ) بکەن بە سی ڕۆژی تەواو ئەمجار بەرۆژوو بن، چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی:

(صوموا لرؤيته وافطروا لرؤيته فإن غم عليكم فاكملوا عدة شعبان ثلاثين).

واتە: تا مانگی نوێ نەبینن نەبیکەن بە ڕەمەزان نە بیکەن بە جەژن، ئەگەر هەورو هەڵابوو، هەور بەری مانگی گرتبوو سی ڕۆژی تەواو دابنێن بۆ مانگی پێشوو، کە یان شەعبان یان شەشەڵانە جا ئەوجا بیکەن بە ڕەمەزان یان بە جەژن!! وەلێ نیشتەجێیانی وڵاتەکانی باکوور (القطب الشمالي) کە شەوو ڕۆژیان بەپێی کاتو وەرز دەگۆڕێ یا زۆر درێژە یا زۆر کورتە، بگرە لە بازەجێیەکی قوتبەکاندا ماوەی چەند مانگێك هەر شەوە یان هەر ڕۆژە ئەمانە بەپێی کاتو ساتی وڵاتە مامناوەندییەکان بە ڕۆژوو دەبن، وەك وڵاتی مەککەو مەدینە، گەرچی بازە کەسێکیش دەڵێن: دەشێ چاو لە نزیکترین وڵاتی مامناوەندی نزیکی خۆیان بکەنو بەپێی تەقویمی ئەو شوێنە ڕۆژوو بگرنو بەربانگ بکەنەوە.

## بەشی شانزەهەم:

# حەجکردن لە ئیسلامدا (الحج في الإسلام)

ئەم بەشە باسی ئەم شتانە دەکا:-

**داستانی درستکردنی کابە – پوختەی حەج لە روانگەی ئیسلامەوە – پۆشینی بەرگی ئیحرامو حیکمەتی ئەو جلە تایبەتیە – حیکمەتی سووڕانەوە بە دەوری کابەدا – حیکمەتی نەرمە ڕاکردنی نێوان صەفاو مەڕوە – حیکمەتی چوونە سەر کێوی عەرەفەو مانەوە لێی – شایەتیدانی بێگانەکان دەربارەی حەج.**

حەج لە زمانی عەرەبیدا بە مانا دیدەنی کردنی شتی مەزنە، لە شەرعی ئیسلامدا بەمانا دیدەنی کردنی خانەی خودایە، کە کابەی پیرۆزە لە شاری مەککە بە نیازی خودا پەرستی.

حەج یەکێکە لەو کارە ئایینیانەی کە پێش ئیسلام ئەنجام دراوە. لە کۆن زەمانەوە، لای هەموو گەلو هۆزو خاوەن ئایینێك هەیە، هەر گەلە بەجۆرێكو شێوازێك کردارو رەفتاری حەجی خۆی ئەنجام داوە عەرەبەکانیش پێش هاتنی ئیسلام حەجی کەعبەیان کردوە، ئەو خانووەی کە حەزرەتی ئیبراهیمو ئیسماعیل لە مەککە دروستیان کردبوو، کە ئایینی ئیسلام هات کردنی حەجی پەسەند کرد، بەلاّم نەیهێشت هەندێ لە کردارو گوفتارەکانی لەسەر شێوازی سەردەمی نەزانی ئەنجام بدرێ، چونکە بڕی لە عەرەبەکان کە دەچوون بۆ حەجکردن بە لەشی رووتی بە دەوری کابەدا دەسووڕانەوە، دەستیان دەخستە ناو دەستی یەکترەوەو فیکەیان لێ دەداو بڕی جاریش دیانکردە قریوەو قاو قریشكو فیکەکردنو چەپلە رێزان. قورئانی پیرۆز لە شێوەی دەربڕینی ئەم کارەیان دەفەرموێ:

{وَمَا كَانَ صَلاَتُهُمْ عِندَ الْبَيْتِ إِلاَّ مُكَاء وَتَصْدِيَةً - سورة الأنفال – ٣٥}.

واتە: ئەوە نوێژنەبوو کە ئەوان لەکن ماڵی خودا دەیانکرد؟ کە بریتی بوو لە فیکوو هوڕو چەپلە ڕێزانو بەس!! سەرەتای پەیدابوونی ئیسلامیش کە موسوڵمانەکان لەتەك پێغەمبەردا دەچوون بۆ کەعبە بۆ نوێژکردن ئەمان زیاتر

شولّیان لێ هەڵدەکێشاو هەراو هۆریایان لەناو مەسجیدولحەرامدا بەرپا دەکرد، تاکو پێغەمبەرو یارانی نەتوانن بەرێك‌و پێکی نوێژی خۆیان بکەن گوێیان لە یەکتری نەبێ‌و نەزانن چییان گوتووە..کاتێك موسوڵمانەکان بەهێز بوون‌و لە مەدینەوە لەشکریان هێنایە سەر کافرەکان‌و فەتحی مەککەیان کردو کابەیان کۆنترۆڵ کرد بە تەواوی کەعبەیان لەدیاردەی بتپەرستی‌و نەزانی پاك کردەوە.

## سەرگوزەشتەی دروستکردنی کابە:

کابە خۆی شوێنی سەرەکییە بۆ ئەنجامدانی ئەرك‌و کردارەکانی حەج، بۆیە بە پێویستی دەزانین کە برێك باسی سەرگوزەشتەی دروستکردنی بکەین.. بێگومان دروستکردنی ماڵی کابە (کعبە) دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی حەزرەتی ئیبراهیم (سلاوی خودای لێبێ) لەو رۆژگارەدا بتپەرستی بە تەواوی بڵاو بووەوە خەڵکی وازی لە خودا پەرستی هێنابوو روویان کردبووە بتپەرستی!!

ئیتر حەزرەتی ئیبراهیم نیشتمان‌و زێدی خۆی بەجێ هێشت‌و روی کردە وڵاتی حیجازو لە شوێنی شاری مەککەی ئێستا کە ئەو کاتە چۆڵەوانی بوو بارو بەرگەنەی خست، بۆ ئەوە خێزانێکی خودا پەرست پێکەوە بنێ!! جا کاتێك ئیسماعیلی کوڕی پێگەیشت‌و هێزو توانای پەیداکرد پەروەردگار فەرمانی بە ئیبراهیم کرد کە مزگەوتێك دروست بکا، بۆ ئەوەی ئادەمیزادان بۆ خودا پەرستی تێیدا کۆببنەوە، یادو سوپاس‌و ستایشی خودای تێدا ئەنجام بدەن. قورئانی پیرۆز بەروونی ئاماژەی بۆ ئەم رووداوە کردوە کە دەفەرموێ:

{وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ - سورة البقرة – ١٢}.

جا لەپاش ئەوەی حەزمتی ئیبراهیم‌و ئیسماعیل شێوەو شێوازی کەعبەیان تەواو کرد پەروەردگار فەرمانی پێ کردن کە لە هەموو پیسییەکی مادی‌و مەعنەوی بیپارێزن‌و بەپاك‌و خاوێنی رای بگرن‌و بیکەنە شوێنی یەکتاپەرستی وەك دەفەرموێ:

**{وَعَهِدْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ - سورة البقرة -١٢٥}.**

واتە: فەرمانمان دا بە ئیبراهیمو ئیسماعیلی کوڕی کە ئەم ماڵی منە دەرو ناوی پاك بکەنەوە لە هەر شتێ کە نەگونجێ لەگەڵ بەندەگیو موناجاتی خودادا، بۆ ئەو کەسانەی کە بەشێوەی ئایین هەڵدەسوڕێن بە دەوریدا یا لەناویا دەمێننەوە بۆ بەندەیی خودا یا نوێژی تێدا دەکەنو خواپەرستی تیا دەکەن.

کەوابوو کەعبە یەکەم خانوێکە کە بۆ خودا پەرستی دروستکراوە وەك دەفەرموێ:

**{إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ، فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَّقَامُ إِبْرَاهِيمَ وَمَن دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا - سورة آل عمران – ٩٦-٩٧}.**

لە راستیدا یەکەم هۆدەیێ کە دانرابێ لەسەر زەوی بۆ خودا پەرستی، ئەو خانووەیە کەوا لەشاری مەککەیە کە ماڵێکی خاوەن پیتو بەرەکەتو هۆی شارەزابوونو هیدایەتە بۆ هەموو کەسێ چەند بەڵگەو نیشانەیەکی گەورەی ئاشکرای تێدایە، وەك مەقامی ئیبراهیمو حەجەرولئەسوەد، هەر کەسێ بچێتە ناوی لە دۆزەخ رزگاری دەبێو لە جیهانیش دا ئاسوودە دەبێ!!!!

حەزرەتی ئیبراهیم لە دونیا دەرچوو حەزرەتی ئیسماعیل پاش ئەو لەسەر دابو نەریتی باوکیو بە گوێرەی فەرمانی پەروەردگار ئەو ماڵە پیرۆزەی پاراستو جگە لە خودا پەرستی رێگەی نەدا هیچ شتێکی تری تێدا ئەنجام بدرێ، ساڵانە خەڵکێکی زۆر دەهاتن بۆ حەجی ماڵی خودا بەرێكو پێکی ئەرکەکانی حەجیان ئەنجام دەدا، بەڵام کە رۆژگار درێژەی کێشاو سەردەمی ئەو دوو پێغەمبەرە مەزنە زۆری بەسەردا تێپەڕی، خەڵکی زۆر شتی نەشیاویان تێکەڵ بە کارو کرداری حەج کرد، هاوەڵ بۆ خودا قەراردانو بتپەرستیان دەست پێکرد، بۆیە پەروەردگار حەزرەتی (محمد)ی کردە پێغەمبەرو ناردی بۆ قەلاچۆکردنی کوفرو بتپەرستیو گێڕانەوەی خەڵکی بۆ یەکتاپەرستیو خودا بەحەق زانین،

خودا پەرستییەك کە حەزرەتی ئیبراهیم لە سەردەمی خۆیدا ئەنجامی دابوو پەیڕەوی کردبوو!!

{هُوَ اجْتَبَاكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمينَ مِن قَبْلُ - سورة الحج – ٧٨}،

واته: ئەی گرۆهی ئۆمەتی (محمد)! پەروەردگار خۆی ئێوەی هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی ببنە کۆمەڵی موسوڵمانانو هەڵگری ئالآی ئیسلام، ئەوەش بزانن کە خودا لە ئەرك و ئەنجامدانی پێویستییە ئایینییەکانی سەرشانتان هیچ شتێکی لە وزەبەدەری خۆتانی لێ داوا نەکردووە ئایینی بۆ ئاسان کردون وەکوو چۆن بۆ باوکی پێغەمبەران: حەزرەتی ئیبراهیمی ئاسان کردبوو، خودا خۆی ئێوەی ناو ناو موسوڵمان لەکتێبە ئاسمانییەکانی پێشوودا ئێوەی بە موسوڵمان ناوبردووە.. یان مەبەستی ئەوەیە کە حەزەتی ئیبراهیم کاتی خۆی ئێوەی ناوناوە موسوڵمان کە لە خودا پاڕاوەتەوەو فەرموویەتی:

{وَمِن ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَك - سورة البقرة – ١٢٨}.

## جەوهەری حەج لە ئایینی ئیسلامدا (روح الحج في الإسلام):

حەج لە ئایینی ئیسلامدا زۆر جیاوازی هەیە لەو حەجەی کە لە ئایینەکانی تردا هەیە! ئەوەتا لە ئایینەکانی تردا حەج بریتییە لە ماچکردنو لە ئامێزگرتنو بەدەوراهاتنی ئارامگەی پیاوچاکانو خۆ تێهەڵساوین لە پاشماوەو بیناو گڵگۆیان، دەی ئەم دیاردە گەلێك ناپەسەندە ئیسلام بەڕەوای نازانێ!

چاکترین حەج لەلای ئایینەکانی تر ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی بخاتە نارەحەتییەوەو لە ڕێگای حەجدا خۆی ماندو بکا، بەڵام لە ئایینی ئیسلامدا ئەم دیاردەیە ناپەسەندەوە نایەوێ ئادەمیزاد – با مەبەستی زێدە پاداشیش بێ – خۆی بخاتە نارەحەتییەوە!!

ئەوەتا دەگێڕنەوە جارێك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پیاوێکی پیری بینی قوربانییەکی پێبوو دوو کوری خۆی چوبوونە ژێر باڵیەوەو بەرەو مەککە دەرۆییشتن بۆ حەج پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پرسیاری لە حاڵو چۆنیەتی کابراکە کرد، عەرزیان کرد قوربان! ئەو پیرەمێردە لەسەرخۆی نەزر کردوە کە بە پێیان حەج بکاو سواری ولاغ نەبێ! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: با وا نەکا بێگومان خودا پێویستی بەوە نییە ئەم کابرایە ئەزیەتی جەستەی خۆی بدا!! سواری وشترێکی کەن با بە سواری رێگاکە ببڕێ.

بەڵێ لە ئایینی ئیسلامدا حەج وەسیلەو هۆیە بۆ بەدەستهێنانی بەهرەی گیانیو رەوشتی رۆشنبیریو کۆمەڵایەتیو ئابووری ئەوەتا ئەم ئایەتە پیرۆزە بە ئاشکرا ئاماژە بۆ ئەوە دەکاو دەفەرموێ:

{وَأَذِّن فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ، لِيَشْهَدُوا مَنَافِعَ لَهُمْ وَيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ فِي أَيَّامٍ مَّعْلُومَاتٍ عَلَى مَا رَزَقَهُم مِّن بَهِيمَةِ الْأَنْعَامِ فَكُلُوا مِنْهَا وَأَطْعِمُوا الْبَائِسَ الْفَقِيرَ - سورة الحج – ٢٧-٢٨}.

واتە: ئەی ئیبراهیم! بە خەڵك رابگەیەنە حەجی کابە بکەن بانگیان بکە بۆ حەجکردنو پێیان بڵێ: حەجکردن فەرمانی خودایەو ئەنجامی بدەن، ئیتر ساڵانە، لە هەموو لایەکی جیهانەوە خواناسان بە پیادەو بە سواری دێن بۆ زیارەتی ماڵی خودا، با ئامادەی رێو رەسمی بە جێهێنانی حەج ببنو سوود لەم کۆبوونەوە جیهانییە وەربگرن، لەو رۆژە دیاریکراوانەدا یادی خودا بکەن زیکری تایبەتی (لبیك اللهم لبیك..) بڵێنو بڵێنەوە، شوکرو سوپاسی خودا بکەن کە رزقو رۆژی داوە پێتان، ئەو ئاژەڵانەی بۆ گەردنکەچ کردون بە ئارەزۆی خۆتان دەیانکەنە کوشتیو سەریان دەبڕن، دەی ئێوە لە گۆشتی ئەو کوشتییانەی خۆتان بخۆنو بەشی هەژارو نەدارایانیشی لێ بدەن.. دەبا ئێمە سەرنجێکی ورد لە رستەی (لیشهدوا منافع لهم) بدەین دەبینین زانایانی ئیسلام وایان راڤە کردوە کە مەبەست لە سوود سوودی دونیاو قیامەتە، لایەنی ئایینیو جیهانی دەگرێتەوە،

چونکه له روانگەی قورئانەوه دین‌و دونیا وەك گیان‌و لاشه وابەستەی یەكترن‌و پەیوەندی بە هێزیان له نێواندایه، هیچیان بێ ئەوی تریان نابێ! چونکه ئەگەر ئایین هێزی باوەڕ بدا بەگیان ئەوه كاره دونیاییەكانیش هۆیەكی مانەوەو پێشكەوتن بە گیان دەبەخشن‌و دەبنە هۆی راگری ئەو جەستەیەی كە ئەو گیانەی هەڵگرتووه.

ئەگەر بشمانەوێ لە هەموو رووپەكەوه سەرژمێری بەروبوومەكانی حەج بكەین لێرەدا جێی نابێتەوه، بەهەرحاڵ حەج كۆبوونەوەیەكی گشتی‌و فیستیڤاڵی سەرتاسەری موسوڵمانانه بۆ یەكخستنی مەبەستە جۆراو جۆرەكانی خۆیان‌و رێنماییكردنی هەریەكێ لەوان بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەی پاك‌و خاوێن‌و شت لە یەكتری فێربوون‌و یەكتر ناسینی ناوخۆییان‌و بەهێزكردنی پەیوەندییە ستراتیجییەكانیان... جگە لەمەش لایەنێكی تری گرنگ هەیە ئەویش لایەنی ئابوورییه چونکه هەموو گەلێك لەو گەلە موسوڵمانانە پیشەسازی تایبەتی خۆیان هەیە بەرو بوومی تایبەتی خۆیان هەیەو لەلای گەلێكی تریان دەست ناكەوێ! جا بەهۆی ئەم كۆبوونەوە گشتییەوه دەتوانرێ سەوداو مامەڵەی گۆڕینەوەی ئەم شتانە ئەنجام بدرێ ئامادەبوونی خاوەنی ئەم كەل‌و پەل‌و پیشەیازییانە لە كۆبوونەوەیەكی ئاوەها گشتیدا زۆر لەو كۆسپ‌و لەمپەڕانە رادەماڵێ لەوانەیە ببنە بەرهەڵست‌و تەنگ‌و چەڵەمە بۆ ئەنجامدانی ئەو جۆره سەوداو مامەڵانە..

## حەجکردن لەسەرکێ پێویستە:

حەج پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێكی ژیری پێگەیشتوو باڵقی لەش ساغ، لە ماوەی ژیاندا یەك حەج فەرزه بە مەرجێك تێشووی سەفەرو كرێی گواستنەوەی رێگای هەبێ‌و ئەوەندەشی ماڵ‌و دارایی هەبێ ماڵ‌و منداڵی لەماوەی گەشتەكەی دا بەتێرو تەسەلی پێی بژین. ئەم ماڵ‌و داراییەش دەبێ ساغ هی خۆی بێ‌و مافی كەسێكی تری پێوه نەبێ قەرزی خەڵكی تێدا نەبێ‌و سوودو ریبای

تێدا نەبێ‌و زەکاتی لێ درابێ، سەرەڕای ئەمەش دەبێ ڕێگای مەککە لە چون‌و هاتنەوەدا ئەمین‌و ئامان بێ‌و ترس‌و بیمی تێدا نەبێ.

ئەرکان‌و پایەکانی حەج ئەم شتانەن:-

١- ئیحرام دابەستن لە میقاتەوە – کە بە (لبیك اللهم لبیك) بە دەنگی بەرز دەست پێ دەکاو بەرگی ئیحرام دەپۆشێ.

٢- هەڵسوڕان بەدەوری ماڵی کابەدا.

٣- هاتۆچۆی نێوان صەفاو مەروا.

٤- راوەستانی عەرەفە.

٥- تاشینی یان کورتکردنەوەی موی سەر.

٦- ریزکردنی ئەم کردارانە بەپێی ئەم ریزکردنەیان.

## ئیحرام دابەستن‌و پەندو حیکمەتەکەی:

لە سەردەمی نەزانیدا عەرەبەکان بۆ شوێنلەوەڕی ئاژەڵەکانیان پاکژو پاوانیان دادەنا واتە هەر کەسە بڕێك لەوەڕگای بۆ خۆی دادەبڕی‌و سنووری بۆ دادەناو هۆزەکانی تر نەیاندەتوانی لەو سنوورە تێپەڕن‌و ئەو لەمپەرە بشکێنن. دەست ڕۆیشتو ئەو کەسانە بوون کە روبەری زۆر بۆ خۆیان داگیر بکەن!!

کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هات هەموو پاوانێکی بەتاڵ کردەوەو بڕیاریدا، پاوان بەس پاوانی خودایە، هەر خودا مافی ئەوەی هەیە شت قورغ‌و قەدەغە بکا، جا لەم سۆنگەیەوە ئەوەتا پەروەردگار بۆ (کابە) سنووری قەدەغەکراوی داناوە، فەرمانی کردوە: کەس ئەو سنوورە نەشکێنێ‌و نەچێتە ناو ئەو رەزەوە مەگەر پۆشاك‌و شێوەو شێوازێکی تایبەتی هەبێ، بەرێوو رەسمی تایبەتی بچێتە ناوی.

هەر کاتێ مرۆڤ ئیحرامی بەست‌و ویستی بچێتە ناو ئەو روبەرە قەدەغەکراوەی ماڵی خودا، نابێ هیچ دیاردەیەکی رابواردن‌و رازانەوەی پێوەبێ، هیچ بۆنێکی خۆش لە خۆنادا، هیچ پۆشاکێکی دووراو لەبەرناکا! پێڵاوو قۆندەرە

ناکاتــە پێــی، دەبــێ جووتــە ســۆڵێکی ســاکاری بــێ نمــوود بەســەر پێــوە بکــا، هەنگوستیلەو ئەڵقەی رازانەوە لەدەست ناکا سەرو ریش و سمێڵ ناتاشێ، نینۆك ناك، لەگشت خۆشییەکی جەستەیی – با زۆر کەمیش بێ – پارێز دەکا!

دوورکەوتنەوە لەم شتانەو قەدەغە بوونی لەوەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ کە مەبەست لە حەج نزیك بوونەوەیە لە خوداو گەییشتن بەو پاداشە گەورەیەیە کە خــودا بــۆ میوانــانی خــۆی دایناوە، ئەمــەش بــە دوورخــستنەوەی نــەفس لــە ئارەزووەکانی ئەنجام دەدرێ، بە جڵەو گرتنەوەی هەواو هەوەس دێتە کایەوە!

دەبێ موسوڵمان لەو شوێنەو لەو کاتانەدا کە ئیحرامی بەستووە واز لە هەموو خۆشیو لەززەتێك بێنێ جگە لە زەروورییاتی زۆر پێویست بۆ ژیان!!!

هەر لە حیکمەتی ئیحرامە بەو جۆرەو شێوەو شێوازە کە نەفس ڕام بێنێ لەسەر دوورکەوتنەوە لە خۆشی ژیانو زاڵ بوون بە سەر ماددەدا، هەروەها شــکاندنی دابو نــەریتی مــرۆڤ دەربــارەی لــەش پــەروەری... بێگومــان ئــەم حاڵەتەیــەش ریازەیــەکی تایبەتییــەو مــرۆڤ دەخاتــە سەرجەمــسەری سروشــتی یەکــەمجاری خــۆی. هــەمووشمان هەست بــەوە دەکــەین کــە ئێمــە لــەو کاتانــەی دەگەڕێینــەوە بــۆ ســەر سروشــتی خۆمانــەی بنــەرەتیمان لــە خۆشــییەکی گیــانیو دڵێکی خۆشدا ژیان بەسەر دەبەین!!

پەندو حیکمەتێکی تری ئەم کردارانە ئەوەیە: رامکردنی دەروونە لەسەر زەحمەتو ئەرك کێشان.

بێگومان ئەو نیزامو یاسایەی کەشافە کە (بادن باوڵ) دایهێنا ئاکامو نەتیجەیەکی زۆر باشی هەبوو بۆ پەروەردەکردنی منداڵو گەنجەکان لەسەر خۆراگریی بەرامبەر ناخۆشیو ماندویی بەجۆرێك وای لێ هاتووە ئێستا زۆربەی گەلان ئەو گرنگییە بەلایەنی کەشافە دەدەن!! دەی بە مافی رەوای خۆمانی دەزانین کە بڵێین ریازەی ئیحرام زۆر کاریگەرترە لە ریازەی کەشافە، چونکە نارەحەتیو کردارەکانی ئیحرام بەستن قورس ترەو درێژخایەنتریشە، سەرباری

ئەوەش ئەو ماوەی کە مرۆڤ لە ئیحرامدایە لە کەش‌و هەاویەکی ئایینی دا دەژی ئەمەش کاریگەری بۆ سەر نەفس‌و دەروون زۆر ترەو سوودو فائیدەشی زیاترە!! جگە لەمانەش ئەو دیمەنە گشتییەی کە حاجییەکانی تێدا دەبینرێن: هەموویان یەك پۆشاك‌و جلیان پۆشیوە: دەوڵەمەندو فەقیرو شاوو گەدا جیاوازییان لە نێواندا نییە مانای یەکسانی‌و بەندایەتییەکی تەواو دەبەخشێ! ئایینی ئیسلامیش ئەم لایەنەی زۆر مەبەستە:

## ئیحرام‌و ئاشتی (الإحرام والسلام):

حاجی کە ئیحرام دەبەستێ‌و دەگاتە شاری مەککەو چاوی بە ماڵی خودا دەکەوێ: ئەم پاڕانەوەیە دەخوێنێ:

« اللّٰهُمَّ أَنْتَ السَّلاَمُ وَمِنْكَ السَّلاَمُ فَحَيِّنَا رَبَّنَا بِالسَّلاَمِ ، اللّٰهُمَّ زِدْ هَذَا الْبَيْتَ تَشْرِيفًا وَتَعْظِيمًا وَتَكْرِيمَا وَمَهَابَةً وَزِدْ مَنْ حَجَّهُ أَوِ اعْتَمَرَهُ تَكْرِيمًا وَتَشْرِيفًا .

خودایە! تۆ خۆت سەرچاوەی ئاشتیت، ئاشتی هەر لەتۆوە بە هەموو لایەکدا پەخش دەبێتەوە! دەی خودایە! لە ئاشتی خۆت بێ بەشمان مەکە، لەماوەی ژیانا بە خۆشی‌و ئاشتی بمانژێنە، خودایە! ئەم خانەی خۆتە پتر ڕێزی بگرەو زیاتر شکۆمەندی بفەرموو! هەر کەسێکیش دێ بۆ زیارەتی بە مەبەستی حەج یان عومرە، یان هەردووکیان تۆ زیاتر ڕێزداری بکەو شەرەف‌و شکۆمەندی پێ ببەخشە!!!

خوێندنی ئەم دوعایە لەم شوێنەدا ئەوە دەگەیەنێ کە یەکێك لە مەبەستەکانی ئیسلام لە حەجدا چاندنی تۆوی ئاشتیخوازییە لە دەروونـدا، هەڵکیشانی ڕەگی ڕەقەبەری‌و دژایەتی نێوان ئادەمیزادە، ڕەهنومایکردنی خەڵکانە بۆ ئەوەی کە بە برایەتی‌و یەکیەتی ژیان بەسەر بەرن‌و هەڵس‌و کەوت بکەن، بەڵگە لەسەر ئەم بۆچوونەشمان ئەم ئایەتەی قورئانە کە دەفەرموێ:

{الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَاتٌ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ الْحَجَّ فَلاَ رَفَثَ وَلاَ فُسُوقَ وَلاَ جِدَالَ فِي الْحَجِّ وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ يَعْلَمْهُ اللّهُ - سورة البقرة – ١٩٧}.

ئەوەتا لەم ئایەتەدا پەروەردگار بەئەرکی سەرشانی حاجی داناوە کە هەمووکاتێ بە تایبەتی لە ماوەی ئیحرامدا – لە سەرەخۆو ئاشتیخوازو روح سوک بێ، لەگەڵ کەس کێشەو بەرەنەکا، خۆشەویستی بپارێزێ لە قسەی بێ ماناو ناشیرین، دوور بکەوێتەوە لە جنێودانو تاوانکردن دوورە پەرێزبێ، لە فەرمانی خودا دەرنەچێو کارێکی تاوانکاریی ئەنجام نەدا، واز لە دەمەدەمێو بەرهەڵستکاری بێنێ.

هەر لە ڕوانگەی ئەوەوە کە ئیسلام دەیەوێ تۆوی ئاشتیخوازی لە دەروونەدا بچێنێ: ئەوەتا لە ماوەی ئیحرام بەستندا راوکردنی ئاژەڵو نێچیرکردنی – بە هەموو جۆرەکانیەوە – لەسەر موسوڵمانان حەرام کردوە... خودا دەفەرموێ:

{أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وَطَعَامُهُ مَتَاعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِيَ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ - سورة المائدة – ٩٦}.

بێگومان بانگەوازی کردنی ئیسلام لەحەجدا بۆ ئاشتی، لە فراوانترین مانادا ئەوە دەگەیەنێ، کە ئایینی ئیسلام دەیەوێ لە رێگەی خودا پەرستییەوە ئەم رەوشتە لە دەروونی شوێنکەوتووەکانی بروێنێ.

## گەردنکەچی بۆ خودا:

حاجی کە ئیحرامی بەستو ئەوجلە تایبەتیەی لەبەرکرد، ئیتر هەرتاوەنا تاوێك – بە تایبەتی لە دیمەنگا نوێکاندا بە دەنگێکی بەرز ئەم سروودە دەڵێتو دەڵێتەوە:

« لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ .

واتە: پەروەردگارا! هەمیشە کەمەری بەندەگیم بۆ جێ بەجێکردنی فەرمانی تۆ بەستووە، تۆ بێچوونو بێ هاوەڵی، سوپاسو ستایش هەر بۆتۆیە، بەخششو

نازو نیعمەتو بەهرەو دارایی‌و پاشایی‌و خاوەنی هەر لە خۆت دێ‌و هەر لەخۆت جوانە، بێچونی‌و بێ هاوەڵی تۆ لەکن دانای زانا ئاشکراو نمایانە..

بێگومان ئەم وشانە لە جیاتی سروودی جەنگاوەرانە لە مەیدانی شەڕداو گیانفیداییان دەخاتە نێو دەروونەوە گیانی خۆبەختکردنیان تێدا بەهێز دەکا. مەبەستیش لە گوتنەوەی ئەم وشانە ئەوەیە کە ئینسان جڵەوی خۆی بۆ خودا شل بکا هەرچی لوتبەرزییەکی هەیەتی تێکی بشکێنێ بۆ ئەوە ژیانێکی کامەرانی بەویستی شەرعی خودا بەرێتە سەرو مرۆڤێکی ئێسك سووك‌و بێ وەی‌و رەوشت بەرزو ئاشتیخواز بێ‌و لە سنووری شەرعی خودا تێنەپەڕێ.

## حیکمەتی سووڕانە بەدەوری ماڵی کابەدا:

حاجی حەوتجار بەدەوری ماڵی کابەدا دەسووڕێتەوە لەو گۆشەوە کە بەردەرەشەی لێیە دەست پێ دەکات، ئەم سوڕانەوە وەکوو سڵاو کردنێك وایە لەو بینایەی کە یەکەم خانووی خودا پەرستییە. بەردەڕەشە (حجر الأسود) بەردێکی رەشە وا لە گۆشەیەکی دیواری کابەدا، تاقەبەردێکە لە کابە کە لە سەردەمی ئیبراهیم خۆیەوە هەتا ئێستا ماوەو بووە بە بەردی بنچینەی کابە، وەکوو بەردەنیشانێکی ئەو سەردەمە دێرینەیە ماوەتەوە.

عەرەبەکان بە درێژایی مێژووی رابردویان چەندجار بینای کابەیان هەڵوەشاندۆتەوە دروستیان کردۆتەوەو ئەم بەردە پیرۆزەیان پاراستووە، لە لایەکی ترەوە سوڕانەوەی حاجییان بە دەروی کابەدا دەق دەشوبهێتە سوڕانەوەی فریشتەکان بە دەوری عەرشدا، ئەمەش خۆی لە خۆیدا پەیوەندییەکی گیانی لە نێوان ئادەمیزادو فریشتەدا دروست دەکا، وا لە مرۆڤ دەکا کە هەست بە گیان پیرۆزییەکی هەرە بالا بکا. جگە لەوەش موسوڵمانان لە هەرچوارلای جیهانەوە رۆژانە پێنج جار زیاتر لەکاتی نوێژکردنیاندا روو دەکەنە لای (کابە) کەوابوو پێویستە کە دەچن بۆ حەج بەدەوری ئەم ماڵەدا بسووڕێنەوەو سڵاو لەو شوێنە بکەن کە باوکی پێغەمبەران حەزرەتی ئیبراهیم بۆ خودا پەرستی دروستی کردوە.

حیکمـەتی نەرمـەڕاکردن لـە نێـوان سـەفاو مـەروە، کردارێکـە لـە کردارەکـانی حـەج، لـەپێش هـاتنی ئیـسلامدا بـووە، جـۆرە ڕۆیـشتنێکە لـە بـەینی ڕۆییـشتنی ئاسـاییو هەڕاکردندایـە کـە ئیـسلام هـات هێـشتییەوە هـەتا ببـێ بـە یادگـارێکی مێژوویی بۆ داستانەکەی بیری زمزمو هاجەرە خاتوون، کە کاتێ دایکی حـەزرەتی ئیسماعیل: هاجەرە خـانم، خێزانـی حـەزرەتی ئیـبراهیم پێویـستی بـەئاو بـوو بـۆ ئیـسماعیلی کـوڕیو تینوایـەتی تینـی بـۆ هێنـان هاجـەرە خـانم لـە نێـوان گـردی صەفاو گردی مەڕوەدا چەند جار ئەمسەرو سـەری کـردوە بەشـوێن ئـاودا گـەڕا تـا دواییـی پـەروەردگار ئـاوی زمزمـی لـەو شـوێنەی ئێـستادا بـۆ هەڵقوڵانـدنو لێیـان خـواردەوە. جـا دوایـی عەرەبـەکان لـەم شـوێنەدا ئـەم شـێوە خواپەرسـتییەیان کوێرنەکردەوەو لەکاتی حەجکردنیاندا ئەنجامیان دەدا، بەڵام لەسەر هـەر گردێـك بتێکیـان دانـابوو، یـەکیان (ئەسـاف) بـوو ئـەویتریان (نائیلـە) بـوو... کـە ئـایینی پیرۆزی ئیسلام هات بتەکانی شکاندنو نەرمەڕاکردنەکـەی هێـشتەوە چونکە ئـەو شـێوە ڕاکردنـە لەگـەڵ ڕێبـازی ئیـسلامدا گونجـاو بـوو، لەمەشـقو خـۆڕامکردنی سەربازی دەچێ!!

لە ئەنجامدانی هاتوچۆی نێوان سەفاو مـەروەدا ڕەمـزی پـەناگرتن بـە خـوداو لابردنـی بـەڵا دێتـە یـادو خـۆی دەنوێنـێ، چـونکە لـەو شـوێنەدابوو کـە خـودای میهرەبان دەرگای رەحمەتی لە هاجەرەو ئیسماعیلی کوڕی کردەوەو ئـاوی زمزمـی بۆ هەڵقوڵاندن دوای ئەوەی کە نزیك بوو لە تینوانا بخنکێن.

## حیکمەتی ڕاوەستانو مانەوە لە کێوی عەرەفە:

مانەوەی حاجییەکان لە ڕۆژی (٩)ی مانگی قوربانىا لە کێوی عەرەفە رەکنو پایەی هەرە گرنگی حەجی حاجییانە، بەبێ ئەنجامدانی ئـەم روکنـە حـەج تـەواو نابێ، خەسڵەتو سوودی ئەم مانەوەیە زۆرن:-

یەکەم: کۆبوونەوەیەکی ساڵانەو نومایشێکی گرنگی موسوڵمانانی سەر ڕوی زەوییە، ساڵانە سەدان هەزار کەس لە هەموو لایەکی دونیاوە لەو سەرو دەمەدا لەو پارچە ئەرزەدا کۆ دەبنەوە. (پاکستانی – میصری – عیراقی – سووری – ئەردەنی – ئەندونیسی – تورکی – لونانی – لیبیایی - مەغریبی - جەزائیری – تونسی – ئیرانی – کوردستانی) باقی وەفدەکانی تری هەموو عاڵەم، هەموویان لەو پارچە زەوییەدا رادەوەستن، لەخودا دەپاڕێنەوە، دوعاو تەلیلە دەکەن، داوای رەحمەتی بۆ پایانو لێخۆشبوونی لێ دەکەن، ئەم دیمەنە شیرینە بە تەواوی یەکسانی نێوان ئادەمیزادی تێدا رەنگ دەداتەوە، دەتوانین بڵێین: سوسیالیستی بەراستی ئەوەیە!!!

دووەم: حیکمەتی راوەستانو مانەوە لە کێوی عەرەفە کەسایەتی تازە بەمرۆڤ دەبەخشێتو سەر لەنوێ ئینسانەکە دروست دەکاتەوە، لەرابردوی خراپەکاری جیای دەکاتەوە، پەیمانێکی تازەی لەگەڵ خوادا پێ دەبەستێتەوەو وای لێ دەکا ژیانێکی پاکو خاوێنو کامەران دەست پێ بکا. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: (من حج لله فلم يرفث ولم يفسق رجع كيوم ولدته أمه. رواه البخاري). کەسێك لەبەر رەزامەندی خودا حەجی کردو دوایی بەگفتارو بەکردار وازی لە خراپەکاری هێنا لە گوناه پاك دەبێتەوە وەکوو ئەو رۆژەی کە لەدایك بووە.

## شایەتیەکی زانایەکی بیانی دەربارەی حەج (شهادة في الحج):

کۆتایی ئەم بەشەمان بە شایەتیەکی دکتۆر (فێلیب حەتتی) دەهێنین کە لە کتێبی (تأريخ العرب)دا دەربارەی حەجکردنی موسوڵمانان نوسیوەیەتی دەڵێ: (تا ئێستا لە بەرنامەی هیچ ئایینێکدا یاسایەکی وەکوو حەج دانەهاتووە، تا ئەمڕۆ بە یاساو نیزامێکی بێ وێنە دەژمێردرێ! هیچ جۆرە خودا پەرستییەك ئاوەها نابێتە هۆی بەیەك گەیاندنو ناساندنی موسوڵمانان لەناو خۆیاندا... بەهۆی حەجەوە جۆرەها کۆمەڵو توێژی موسوڵمانان یەکتری دەناسنو دەبنە برادەرو

ناسیاو! بەڵكوو بەهۆی حەجەوە هەموو موسوڵمانێك لە ژیانیدا دەتوانێ ببێتە گەشتیارو بۆ جارێکیش بێ گەشتو گوزار بکاو کۆبوونەوە لەگەڵ برایانی موسوڵمانی دوور وڵات ئەنجام بداو راو بۆچوونی خۆی بەوان بگەیەنێو راوو بۆچوونی خەڵکی دیش وەربگرێ.

هەر بەهۆی حەجەوە زنجیو بەربەریو صینیو روسیو فارسو تورکو عەرەبو کورد... هتد فەقیر بێ یان دەوڵەمەند گەدا بن یان پاشا دەتوانن یەکتری ببینن‌و پەیوەندی لەگەڵ یەکتردا پەیدا بکەن‌و راوو بۆچوونی خۆیان لەگەڵ یەکدی بگۆڕنەوە.

بێگومان ئایینی ئیسلام سەرکەوتنێکی گرنگی بەدەست هێناوە دەربارەی قەلاچۆکردنی بانگەشەی نێوان توێژو نەژادو ڕەنگو ڕەچەڵەك جیاوازیی خستنەوە چونکە ئایینی ئیسلام هەرگیز داننانێ بە جیاوازی لە نێوان رۆڵەکانیداو پێی وایە ئەو جۆرە دیاردانە نابنە هۆی جیاوازی، تەنها شتێ کە لە ئیسلامدا دەبێ بەهۆی جیاوازی جیایی بیرو باوەڕە بە خوداو بە پێغەمبەری خودا!!

ئاشکراشە کە کۆبوونەوەی موسوڵمانان لەکاتی حەجدا خزمەتێکی گەورەی لەم بارەوە پێشکەش کردوە...

## بەشی حەڤدەیەم:

# زانست لە ئیسلامدا (العلم في الإسلام)

**کێشەی نێوان زانستو ئاین لە ئەوروپادا – پلەی زانست لە ئیسلامدا – ئیسلام ئایینی بەڵگەو ئەزموونە – ئیسلام ئایینی یەقینو بڕوایە نەك هی شكو گومان – ئایینی ئیسلام دژی لاسایی کردنەوەیە – ئایینی ئیسلام بانگەوازی بۆ ئەوە دەکا کە لە هەموو شتێکدا هەڵبژاردە پەسەند بکرێ – عەقڵو هۆش لە ئیسلامدا – یاساکانی بوونەوەر ناگۆڕێن – دیاردەکانی بوونەوەر ئەزموونی مرۆڤ تێیدا – ئەو عیلمو زانیاریەی ئیسلام پەسەندی دەکاو بانگەوازی بۆ دەکا – شایەتی بڕێك لە زانا رۆژئاواییەکان دەربارەی شارەستانیەتی ئیسلام ...!!**

خوێنەری هێژا! ئاشکرایە لە سەدەی رابوردوداو پێشتریش بوختانێکی گەورە بە ئیسلام لەناو ئەوروپاییەکاندا بڵاو بووەوە کە بریتی بوو لەوەی کە ئایینی ئیسلام قەڵاچۆی ئازادی بیرو باوەڕ دەکاو هەموو هەوڵو کۆششو جوڵەیەکی زانستیانە لە ناو دەبا، دژایەتی زانستو فەلسەفە دەکا. (أرنست ریتان) کە زانایەکی فەرەنسییەو بەناوبانگترین هەڵگری ئاڵای ناپیرۆزی ئەم بوختانە دەژمێردرێو لە کتێبەکەی بەناوی (الإسلام والعلم)دا ئەم راوو بۆچوونو بوختانانەی خۆی بڵاو کردۆتەوە!!

ئێمەیش بە پشتیوانی خودا لەم بەشەدا لەم بارەوە لێکۆڵینەوە ئەنجام دەدەینو ئەم لایەنە روون دەکەینەوە. لەژێر رۆشنایی فەرموودەکانی قورئانو شایەتیدانی مێژوو ئەوە دەچەسپێنین کە ئەوەی لەم بارەوە گوتراوە دەربارەی ئیسلامو دژایەتیکردنی بۆ زانستو زانیاری، بوختانێکی فرە گەورەیەو دوژمنایەتیکردنی راستیو حەقیقەتەو چەواشەکردنی مێژووشە...

## کێشەی نێوان زانستو ئایین لە ئەوروپادا:

بێگومان ئەوانەی دژایەتی عیلمو زانستیان کردوە لە ئەوروپادا کۆمەڵێك بوون هەڵگری بیرو باوەڕی ئایینەکانی تربوون – نەك ئیسلام – ئەوەتا

مێژوونووسان هەموویان ئەوەیان دووپات کردۆتەوە کە زانا بوونەوەر شوناسەکان تووشی چەرمەسەری و دەردی سەرییەکی تەواو بوون لە لایەن پیاوە ئایینییەکانی ئەوروپاوە، بەدرێژایی سەدەکانی ناوەڕاست پیاوە ئایینیەکانی ئەو وڵاتە دوژمنکاری زاناکانیان دەکرد، تەنانەت چەند دادگایەکی تایبەتییەیان دانا بۆ دادگاییکردنی پیاوانی زانستخوازو خاوەن بیرو ئەزمون. هەر زانست و زانیارێکیان دابهێنایەو لەگەڵ بیرو رای کەنشتە نەگونجایە بە تاوانی گەورەیان دادەناو کابرای خاوەن بیرو بۆچوونیان راکێشی دادگا دەکردو داوایان لێ دەکرد پەشیمان ببێتەوەو تۆبە بکا، پەیمانیان لێ وەردەگرت کەجارێکی تر ئەو هەڵەیە نەکاتەوە ئەگەر جارێکی تر ئەو کارەی ئەنجام بدایەو رای خۆی دەرببڕیایە یەکسەر دەگیراو دەکەوتە ژێر ئازارو ئەشکنجەو بەزیندویی دەیانخستە ناو ئاگرەوە، یان لە شاخێکی بەرزەوە فڕێیان دەدایە خوارەوە!!! ئاوا بەو جۆرە بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست زۆر لە زاناو خاوەن بیرو ئەزموون داهێنەرو لێهاتوویان لەناو بردو سەرنگونیان کردن!!؟

ئەم کارو ڕەفتارە نامرۆڤایەتییانە بەردەوام بوون و درێژەیان کێشا هەتا وای لێهات دەسەڵاتی پیاوە ئایینییەکان زەعیف بوو بەهۆی پەیدابوونی دووبەرەکی نێوان خۆیانەوەو سەرهەڵدانی رێبازی پرۆتستانتی و قبووڵکردنی ئەم رێبازە لەلایەن زوربەی خەڵکەوە[1] جا ئەم بزوتنەوە ئایینییە هەر بەمەبەستی راکێشانی جەماوەر بەلای خۆیدا بە تەواوی سەربەستی بە خەڵك داو رێگای دان کە عەقڵ و هۆش و بیری خۆیان بخەنە کارو زانستانە بیربکەنەوەو رفتار بکەن.

لە ئاکاما عیلم و زانست سەرکەوت، بەڵام ئەو ئێش و ئازارەی کە لەلایەن پیاوە ئایینییەکانەوە تووشی خەڵك بوبوو وای کرد کە ئەو زانسخوازانە نەك

---

[1] پرۆتستانت: بزوتنەوەیەکی ئایینیە بەوکەسانە دەگوترێ: کە سەر بە کەنیسەی کاسولیکی رومانی و رۆژهەڵاتین و بیرو رای سەربەستیان هەیە لە بواری ئایینی و کاری دونیاییدا هەموو سەربەستییەك دەدا بە رێڕەوەکانی. سەرەتا لە ئەڵمانیاو وڵاتە ئەسکندنافیەکان و سکوتلەندەو سویسراو ئەمەریکای باکووردا بڵاو بۆتەوە.

هەر بیر لە تۆڵەکردنەوە بکەنەوە لە پیاوە ئایینییەکانو بەس، بەڵکوو دژی ئایینیش بوەستنو بە هەموو جۆرێك بەرهەڵستکاری بکەن. ئەوەبوو هاتن هەندێ کتێبو نووسراویان نووسی بە مەبەستی بەڵگە هێنانەوە لەسەر پڕو پووچی بنەماو چۆنیەتی ئایین بەگشتیو پێیان وابوو کە ئەرکانو پایەکانی ئایینی بریتین لە خەیاڵ پلاوی ئادەمیزادە کۆنەپەرستەکان...! هەرکاتێکیش هەلیان بۆ بڕەخسایەو رێگایان بوایە پیرۆزیی ئاینیان پێشێل دەکردو لە رێزیان دەهێنایە خوارێ، هەتا کار بەو ئەنجامە گەیشت کە خەڵکەکە لە هەموو ئایینێك یاخی بىنو نەفرەتی لێ بکەن!! بیدینیو خودا نەناسی لەناو هەموو توێژو کۆمەڵێکدا بلاو بووەوە، تاوای لێهات دینداریيان بەلاوە نیشانەی نەزانیو گیلی بوو!!

جا بۆ ئەوەی خوێنەر ئاشنا بکەین بە نموونەیەك لەو شێوانەی کە لە ژێر پەردەی ئازادیی بیرەوە هێرشیان دەکردە سەر ئایین، دەقی ئەو نووسراوەی ئینسیکلۆبیدیای لاروسی سەدەی نۆزدەهەم کە لەژێر سەرەباسی وشەی (دین) نووسیویە دەگوێزینەوە بۆ ئێرە، ئەوەتا کە باسی پیاوە ئایینییەکان دەکا دەڵێ: ئەگەر بڵێین: چێژی مرۆڤایەتی ئەوە لە مرۆڤ دەخوازێ کە بڕوای بە شتێ هەبێ کە هۆش بیگرێ، یەکسەر دەڵێن: نا، نا، وانیە. کەچی بۆ خۆیان هەوڵی ئەوەیانە هۆشو بیری ئادەمیزادەکان پێخوست بکەن، ئەو بیرو هۆشەی کە مافی جیاکردنەوەی لایەنی شەڕو خێری وەپاڵ خۆی داوەو مافی ئەوەی هەیە کە عەدالەتو ستەم جیابکاتەوە، بە رادەیەکی وا ئەم هەوڵە دەدەن تا دەتوانن عەقڵو هۆش سەرلێشێواو بکەنو چاوی بینایی دڵو دەروون کوێربکەن، تا وا سەر لە هۆش دەشێوێ شتی نەشیاوی بەلاوە ئاسایی بێ، تەنانەت رەش بەسپیو سپی بە رەش بزانێ، رەوشتی باش بە خراپو خووی بەد بە باش دابنێ!! هەتا لەم حاڵەتەیشدا ئەوان هەرواز ناهێننو دیسان ئایین دەکەن بە کوتەکی دەستیانو بەتۆپزی لە خەڵکەکە داوا دەکەن: دەبێ ملکەچی فەرمانی ئایین بێ! ئەگەر لێیان بپرسی: گەردنکەچی کێ بین؟! ئایا پەیرەوی فەرمانی عەقڵو هۆشمان

بکەین یان هی یاسای سروشتیمان!! یان هی هەستی دەرونیمان؟ ئایا پەیڕەوی یاسا بە کەڵکەکانی ئادەمیزاد بکەین؟ دەڵێن: نەء، بەڵکوو تۆ کوێرانە پەیڕەوی یاساو فەرمانەکانی ئایین بکە.

## پلەی زانستو زانیاری لە ئیسلامدا (منزلة العلم في الإسلام):

ئایینی ئیسلام پێشکەوتنو پێشکەوتنخوازی بۆ پەیڕەوکەرانی خۆی بە پێویست زانیوەو گرنگییەکی تایبەتی بە زانستو زانیاری داوە، چونکە لە روانگەی ئەم ئایینەوە هیچ شتێك بە ئەندازەی عیلمو زانست کەسیەتی بۆ ئادەمیزاد پەیدا ناکا، هیچ کارو پیشەیەك بە ئەندازەی زانست رێز بۆ مرۆڤ دەستەبەر ناکا.

{قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُوا الْأَلْبَابِ - سورة الزمر – ٩}.

واتە ئەی پێغەمبەری ئیسلام! بە زمانێکی پاراو بانگەواز هەڵبدە: کە هەرگیزاو هەرگیز دەستەی زانستو دەستەی نەزان وەك یەك نین، زانا قەت هاوشانی نەزان نییە، ئەو کەسەیش بەباشی لە شت تێدەگا کە خاوەنی بیرو هۆشەو بە سەرنجو وردبوونەوە دەگاتە ئەنجامی کار..

بڕوانە لەم ئایەتە قورئانییەدا چ رێزو نرخێك بۆ زانینو زانست دانراوە! ئەوەتا راستەو خۆ پەروەردگار ئەهلی عیلمو زانستی لە هی تر جیاکردۆتەوەو رێزی تایبەتی بۆ داناون، ئەمجار هەموو عەقڵو هۆشێکی کورت هەڵیناوە لە زانایانداو دەفەرموێ: بەس ئەوانە دەتوانن لەشت حاڵی بنو تێبگەن!!

ئەمجار لە ئایەتێکی تردا ئەوەی ئاشکرا کردوە کە زانایان لەلای خودا پلەو پایەی تایبەتییان هەیە.

{يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ - سورة المجادلة – ١١}.

خودا بۆ خۆی پایەو پلەی دەستەو کۆمەڵەی ئایینو دەستەو کۆمەڵەی زانست بەچەند قات بڵند دەکاتەوە.

نــەك هــەر ئــەوە بەڵــكوو پــەروەردگار لــە ئایــەتێكی تــردا شــایەتی زانایــان‌و عالمــانی لــەدوای شــایەتی خــۆی‌و فریــشتەكانی تۆمــار كــردوەو ڕێزێكــی تایبــەتی بۆشایەتی زانایان داناوە.

{كَذَلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ - سورة الروم – ٥٩}.

لە شوێنێكی تردا قورئان ئەوە دەچەسپێنێ كە زانـست‌و زانیـاری دەریایـەكی بێ بنەو كەس نییە بتوانێ پەی بە هەمووی بەرێ دەفەرموێ:

{وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ}.

واتە: هەرزانایەك بگرێ لەویش زاناتر هەیە. بەمەش دوونیشانە دەپێكێ:

یەكەمیان: ئەوەیە كە زاناكان لە خۆیان بایی نەبن‌و لوتبەرز نەبن.

دووەمیان: هەوڵ بدەن زیاتر زانیاری بەدەست بێنن هەموو دەم ئامادەبن بۆ گوێگرتن‌و قبووڵكردنی رەخنەی رەخنەسازان.

لەهــەمان كاتیــشدا قورئــان داوا لــە موســوڵمانان دەكـا كــە هــەوڵی فێربــوونی عــیلم‌و زانــست بــدەن تــا ڕێگــای راســت‌و دروســت بدۆزنــەوە لــە هــەموو كــردارو گوفتارێكدا نیشانە بپێكن..

ئایینی ئیسلام هەر بەوەنـدەش وازی نـەهێناوە دەربـارەی بانگەوازیكردن بـۆ عیلم‌و زانست، بەڵكوو چەند ئەصڵ‌و بنەمایەكی داناوە كە ڕێگەی هۆش سـستی بیر تەسكی‌و كۆنەپەرستی نەدەن، ئەو ئەصڵ‌و بنەمایانەش ئەمانەن:-

١- ئایینی ئیسلام ئایینی بەڵگەو بورهانە: (الإسلام دين الحجة والبرهان).

زانست هیچ شتێك بە راست نازانێ هەتا بەڵگەی متمانـەداری بـڕوا پێكـراوی لەسەر نەبێ!! قورئانی پیرۆزیش هەروافرمانمان پێ دەكاو داوا لـە مـرۆڤ دەكـا كـە هیچ شتێك بێ بەڵگە بەراست نەزانێ.

{وَقَالُواْ لَن يَدْخُلَ الْجَنَّةَ إِلاَّ مَن كَانَ هُوداً أَوْ نَصَارَى تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ قُلْ هَاتُواْ بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ - سورة البقرة – ١١١}.

ئــەوەتا كاتــێ جولەكــەكان دەیــانگوت هــەر كەســێ جوولەكــە نــەبێ ناچــێتە بەهەشــتەوە، نەصــرانییەكان دەیــانگوت هــەر كەســێ لەســەر ئــایینی عیــسا نــەبێ

ناچێتە بەهەشتەوە، پەروەردگار فەرمووی: ئەوە ئاواتی بێ سەروبەری ئەوانە، بەقسەی ئەوان نابێ، ئەی پێغەمبەر! بڵێ: ئەگەر ئەو داوایەتان راستە! دە بەڵگەی ئاشکراتان بهێنن و داواکەتان بچەسپێنن!.

لە ئایەتێکی تردا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە پەروەردگار رازی نییە ئادەمیزاد بێ بەڵگەو دەلیل بڕوا بە هیچ شتێك بکا، ئەوانەی کوێرانە لاسایی خەڵك دەکەنەوەو هاوبەش بۆ خودا دادەنێن لەسەر ئەو لاسایی کردنەوە کوێرانەیە سزا دەدرێن و بەرپرسیارن.

**{وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِندَ رَبِّهِ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ - سورة المؤمنون – ١١٧}.**

واتە: هەر کەسێ هاوبەش بۆ خودا دابنێ و وەك خودا ئەویش بپەرستێ، دیارە کە شتی وا داوایەکی پووچی بی سەرو بەرەو هیچ بەڵگەیەکی روونای لەسەر نییە، هەر کەسێ شتی وا بکا بێگومان بەپرسیارەو حیسابی لای خودایەو سزای دەداو هەرگیز بێ بڕوایان سەرکەوتوو نابن..

لە ئایەتێکی تردا دەبینین پەروەردگار داوای دەستەوسانکەر لە هاوبەش پەیداکەرەکان دەکا کە بەڵگە بەرپا بکەن لەسەر داوای خۆیان کە گوایە خودای تر لەگەڵ خودادا هەیە قورئان دەفەرموێ:

**{أَمَّن يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاء وَالْأَرْضِ أَإِلَهٌ مَّعَ اللَّهِ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ - سورة النمل – ٦٤}.**

واتە: ئایا کەسێکی تر هەیە جگە لە خودا خۆی کە لە سەرەتاوە لە نەبوون ئەم بوونەوەرەی دروست کردبێ؟ لەپاشا بیفەوتێنێ و جارێکی تر سەر لەنوێ وەك هەوەڵجار دروستی بکاتەوە؟ یا کەسێکی تر هەیە بێجگە لە خودا کەمایەی رزق رۆزیتان لە ئاسمان و زەوی دا بۆ بسازێنێ، ئایا باوەڕدەکەن کە خوایەکی تر هەبێ ببێ بە هاوبەشی خودا؟بڵێ: ئەگەر راست دەکەن بەڵگەی رۆشنتان کوا لەسەر ئەم داوایەتان، ئادەی بیهێنن. پوختەی مانای ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ:

کە هەموو داوایەك پێویستە بەڵگەی لەسەربێ‌و خاوەن داواکە بتوانێ راوو بۆچوونی خۆی بە دەلیل بچەسپێنێ: ئەگینا قسەکەی لێ وەرناگیرێ‌و داواکەی رەت دەکرێتەوە!!

## ئیسلام ئاینی یەقینە نەك گومان (الإسلام دين اليقين لا الظن):

عیلم‌و زانست هەرگیز رازی نییە بەوە شتێك یەقین‌و راست نەبێ بەراست دابنرێ یان شتێك لەپلەی گوماندابێ تۆ پلەی یەقینی بۆ دەستنیشان بکەی! چونکە داب‌و نەریتی عیلم ئەوەیە: هەر راوو بۆچوونێك چەندە بەڵگەی بەهێزی لەسەر بێ ئەوەندە لە حەقیقەت نزیك دەبێتەوە!! هەرکاتێ بەڵگەکە سەد دەر سەد راست‌و دروست بوو مەسەلەکە سەلمێندراوەو حەقە، وا نەبوو قەزیەکە گومانەو پلەی تایبەتی خۆی هەیە. ئەم جوداکردنەوە زانستییەی نێوان پلەی بڕواو گومان ڕاستەو خۆ لەگەڵ بۆچوونەکانی قورئان هاوتەرازوو دەێتەوە، ئەوەتا بەڕاشکاوی فەرمانمان پێ دەکا کە خۆمان لەشك‌و گومان دوور بخەینەوە چونکە پەیڕەویکردنی شك‌و گومان بیرو باوەڕی زۆر کەسی تێك داوەو ڕێگای راستی لەزۆر خەڵك ون کردوە:

{وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِي الأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ اللّهِ إِن يَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلاَّ يَخْرُصُونَ - سورة الأنعام – ١١٦}.

واتە: ئەگەر تۆ پەیڕەوی راوو بۆچوونی زوربەی ئەو خەڵکەی سەرزەوی بکەی، لە ڕێگەی راستی پەروەردگار لات دەدەن‌و سەرت لێ تێك دەدەن، چونکە زوربەیان شوێن شك‌و گومان کەوتوون‌و وردبین نین‌و زانستانە رفتار ناکەن. یا دەفەرموێ:

{وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلاَّ ظَنًّا إَنَّ الظَّنَّ لاَ يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا - سورة يونس -٣٦}.

مانای ئەم ئایەتە ئەوەیە کە زوربەی ئادەمیزاد لەبیرو باوەڕیاندا شوێن شك‌و گومان دەکەون‌و شك‌و گومانیش پشت بە بەڵگەو بورهان نابەستێ‌و سەرەنجام خاوەنەکەی تووشی گومان‌و خەیاڵ دەکا، ئاکامی راست‌و دروستی نابێ‌و بیرو باوەڕی ساغی لێ بە ئاکام نایە؟!

لە ئایەتێکی تردا قورئان فەرمان دەکا بەوە کە پشت بە زانستو یەقین ببەستینو سەرزەنشتی ئەوانە دەکا کە شوێن وەهمو خەیاڵ دەکەون:

{بَلِ اتَّبَعَ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَهْوَاءهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ - سورة الروم – ٢٩}.

واتە: ئەوانەی کە زوڵمو زۆریان کردوە بە پیشەی هەمیشەیی خۆیان، بە نەزانی، بەبێ زانستی پێویست شوێن هەواو هەوەسی خۆیان کەوتوون.

لە شوێنێکی دیکەدا دەبینن قورئانی پیرۆز سەرزەنشتی دەهرییەکان دەکا، ئەوانەی کە هەموو شتێك دەدەنە پاڵ رۆژگارو شوێن گومان کەتوونو هیچ یەقینو بڕوایەکی راستیان نییە:

{وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ وَمَا لَهُم بِذَلِكَ مِنْ عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ - سورة الجاثية – ٢٤}.

لە ئایەتێکی تردا پەروەردگار فەرمان دەکا بە موسوڵمانان کە لە هەموو شتێکدا شوێن بەڵگەو دەلیلی راست بکەونو لەسەر بناغەی زانستیانە بیرو رای خۆیان دامەزرێنن:

{وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً - سورة الإسراء – ٣٦}.

واتە: شوێن شتێ مەکەوە کە زانستییەکی رەساو تەواوت لە بارەیەوە نییە، چونکە مرۆڤ لە رۆژی رەستاخیزدا بەرپرسیارە لەوەی بەگوێ دەیبیستێ یا بەچاو دەیبینێ، یا بەدڵ وەری دەگرێ لەو شتە خەیاڵیانەی کە سەردەکێشن بۆ پەیدابوونی بیرو باوەڕی پڕو پووچ. کەوابوو حیکمەتو فەلسەفەی قورئان بە گوێرەی دەقی ئەم ئایەتانە بناخەکەی زانستیەکی چەسپاوە، نەك گومانو بۆچوونێکی روت، کە دیاردەیەکی ئاشکرای تیوورە فەلسەفییەکانی پێش هاتنی ئیسلامە: بەتایبەتی فەلسەفەی یۆنانو ئیگریك. ئەم شێوە بیرو بۆچوونە بیرکردنەوەیەکی تازەیەو شتێکی حیکمەت ئامێزەو لەسەدەی نۆزدەهەمدا چووە نێو قاڵبی فەلسەفەی چەسپاوەوە کە پێی دەگوترێ: (الفلسفة الوضعية) تازەترین فەلسەفەیەو کاریگەرترینیشە!

ئادەمیزادیش: تەواو ماندوبووە لەو فەلسەفە گوماناویانەی کە بەدرێژایی مێژوو هەموو چینێکی تازە فەلسەفەی چینەکەی پێش خۆ هەڵوەشاندۆتەوە، جگە لەمەش دەبینین زۆر لەم بۆچوونە گوماناویانە شتی خەیاڵی لەسەر بنیات نراوەو بومتە هۆی پەیدابوونی کێشەو نیزاعێکی کوشندە. کەواتە فەلسەفەی وەضعی کە بەڵگەو دەلیلی هەست پێکراوی هەبێ هیچ کاتو زەمانێك گۆڕانی بەسەردا نایەو هەموو کاتێ بە زانیاری ڕاستەقینە دەژمێردرێو جێی خۆی دەکاتەوە، حیکمەتی قورئانیش هەر لەسەر ئەو جۆرە بەڵگانە دامەزراوە.

## ئایینی ئیسلام دژی لاساییکردنەوەی کوێرانەیە (الإسلام عدو التقلید):

هەموو کاتێك دژی لاساییکردنەوەی کوێرانەیەو هەرگیز بەوە رازی نابێ کە تۆ بێ بەڵگەو دەلیل قەناعەت بەشتێك بکەیو شوێنی بکەوێ. ئەوەش لەیاد نەکەین: زانیاری کۆن لە زانیاری تازە جودایە چونکە زانیاری کۆنو زاناکانی پێشوو بە تایبەتی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە ئەوروپا زۆر جار قسەی زانایەکی بەناوبانگو راوو بۆچوونیان کردۆتە تەرازوی راستی یان ناڕاستی مەسەلەیەك، بۆ نموونە هەرچ تێورو بۆچونێکیان لە ئەرستۆ وەرگرتبێ پێیان وابوە کە ئەمە چەسپاوەو سەد دەرسەد راستەو شكو گومانی تێدا نییە!! ئیتر بەبێ ئەوە بڕواننە خودی راوو بۆچوونەکەی ئەرستۆ یان خۆماندو بکەنو هەوڵ بدەن، بەڵگەو دەلیلەکانی بدۆزنەوە! ئاشکراشە کە هەرچ زانیارییەك دژی لاسایی کردنەوەی کوێرانەبێ راستەوخۆ لەگەڵ قورئاندا یەك دەگرنەوە ئەوەتا قورئان بێ پەروا هێرش دەباتە سەر ئەوانەی کە کوێرانە لاسایی باوكو باپیرو رابووردوی خۆیان دەکەنەوە، لە تێفکرینو ئەزمونکاریو بەڵگەو دەلیلەوە ئیشەکانیان سەرچاوە هەڵناگرن:

{وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَى مَا أَنزَلَ اللّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ قَالُواْ حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءنَا أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ شَيْئًا وَلاَ يَهْتَدُونَ - سورة المائدة – ١٠٤}.

له ئایەتێکی تردا زۆر بەتوندی سەرزەنشتی ئەوانە دەکا کە کوێرانە شوێن دابو نەریتی رابوردوانیان دەکەون:

{وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللّهُ قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءنَا أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ شَيْئاً وَلاَ يَهْتَدُونَ، وَمَثَلُ الَّذِينَ كَفَرُواْ كَمَثَلِ الَّذِي يَنْعِقُ بِمَا لاَ يَسْمَعُ إِلاَّ دُعَاء وَنِدَاء صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ - سورة البقرة – ١٧٠-١٧١}.

ئەم دەقە قورئانییە بە روونی ئەوە دەگەیەنێ کە لاسایی کردنەوە بەبێ بەکارهێنانی عەقڵو هۆشو وردبوونەوە کاروپیشەی خواناسان نییەو نەزانو نەفام کاری وا دەکەن، مرۆڤیش بە موسوڵمانی تەواو دانانرێ هەتا لە ئیسلام تێنەگاو بڕوای تێکەڵ بە زانستی پێ نەبێ، واتە موسوڵمانیەتەکە لاسایی کردنەوە نەبێ!!

دوای ئەوە دەقە قورئانییەکە هاتووە هەڵسو کەوتی کافرو خوانەسان ئەوانەی کە بانگیان دەکەنو بۆ خوداپەرستیو یەکتاپەرستی، ئەوانەیش بە قسەیان ناکەنو نایەنە سە ڕێبازی راست شوبهاندویەتی بەهەڵسو کەوتی ئاژەڵو شوانەکانی کە شوانەکە دەیەوێت ئاژەڵەکان بەلایەکدا بەرێ دەنگیان لێ دەکاو ئەوانیش هەر دەنگەکە دەبیستنو مانای تێ ناگەن! کەواتە ئەو خوانەناسە لاسایی کەرەوانە گوێچکەیان شتی حەقو راست نابیستێو زوانیان لاڵەو ناتوانن وەڵامی بانگەوازیکەران بدەنەوەو چاویشیان کوێرەو بەڵگەی راستو دروستی حەقو حەقڕەوان نابینن‌و نابیسن!!!

لە ئایەتێکی تردا قورئانی پیرۆز هەموو گەلو نەتەوەیەك دەترسێنێ لە شوێنکەوتنی کوێرانەیان! هەرگیز رازی نییە ئادەمیزاد کوێرانە شوێن لێپرسراوو سەرەك هۆزو پیاوە ئایینیەکان بکەوێ. بەئاشکرا ئەوەی رونکردۆتەوە: کە هەرکاتێ پێشەواو کاربەدەست لەسەر بیرو باوەڕی بەتاڵ بوونو خەڵکی کوێرانە شوێنیان کەوتبوون رۆژی ڕەستاخیز هەردولا (پێشەواو شوێن کەوتو) دەخرێنە نێو سزای دۆزەخەوە، خودا دەفەرموێ:

{إِذْ تَبَرَّأَ الَّذِينَ اتُّبِعُواْ مِنَ الَّذِينَ اتَّبَعُواْ وَرَأَوُاْ الْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ الأَسْبَابُ - سورة البقرة – ١٦٦}.

ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەوە دەگەیەنێ کە رۆژی قیامەت پێشەواکان یەخەی خۆیان لە شوێنکەتووەکانیان دادەرنو دەڵێن: ئێوە گرۆی ئێمە نین ئەوانیش پێیان دەڵێن: ئێوە ئێمەتان تووشی ئەم چارەنووسە سامناکە کردوە، ئیتر لەم کاتەدا بینینی جۆری سزاو هاڵاوی دۆزەخ لێکیان دەپچڕێنێو هەر هەموویان رەوانەی سزا دەکرێن!!

خوێنەری هێژا: ئەمەیە تەعالیمی ئیسلامو ئامۆژگارییەکانی کە دەیەوێ دیاردەی لاساییکردنەوەی کوێرانە بنەبڕ بکاتو لە رگو ریشاڵەوە هەڵتەکێنێ لە هەمان کات دا خەڵك هەڵدەنێ بۆ لێکۆڵینەوەو توێژینەوەو عەقڵ بەکارهێنان!

## ئایینی ئیسلام داوا دەکا کە کار بەچاکت بکرێ:

قورئانی پیرۆز لەگەڵ ئەوەدا کە نەهی کرد لە لاسای کردنەوەی باوكو باپیرانو شوێن کەوتنی کوێرانەی سەرۆكو پێشەوایانو سەرکۆنەی ئەو لاساییکەرانەوەی کرد کە بەبێ بەڵگە پەیڕەوی فەرمانی گەورەکانی خۆیان دەکەن (نەهی)یشی کردوە کە بەبێ بەڵگە بۆچوونێك پەسەندبکەی وازی لێ نەهێنی! ئەویش بەوە کە بانگەوازی خەڵکی دەکا کە هەمیشە هەوڵ بدەن هەڵبژاردە پەسەند بکەنو پەیڕەوی رێبازی باشتر بکەن، تا چاکتر هەبێ واز لە چاك بهێنن چونکە زوربەی ئادەمیزاد کە لە سەرەتاوە رایەك وەردەگرن یان بۆچونێك دەخوێننەوەو لە دڵیاندا جێگای دەبێتەوە ئیتر دەرگای دڵی خۆیان دادەخەنو هیچ راوو بۆچوونێکی تر – با لە هی خۆشیان باشتربێ – وەرناگرن، بەم جۆرە لەسەر گومرایی دەمێننەوەو لێی لانادەن!! کەوابوو پیادەکردنی رێبازی هەڵبژاردەو چاکتر توێژینەوەو لێ وردبوونەوە لە بەرنامەو پرۆگرام دیاردەیەکی تازەیەو رادەی بە پەرۆشبوونی ئادەمیزاد دەردەخا لە ئاستی حەقیقەتدا، ئەم تیۆرەش بە تەواوی لەلای توێژەرەوەکانی سەدەی نۆزدەهەم سەری هەڵداو

موفەککیرەکانی ئەو چەرخە پەیڕەوییانکرد: ئەوان هەستیان بەوە کرد کە حەقیقەتە موتلەقەکان مولکی تیۆرو فەلسەفەیەکی تایبەتی نین. بەلکوو پێویستی سەرشانی ئادەمیزادە کە لە هەموولایەکەوە کاکلە هەلالە بکەن و لە هەموو فەلسەفەو بۆچونێکدا باشترەکەی وەربگرن و پەیڕەوی بکەن، چونکە شێوەو ڕێگایەکی تایبەتی مومکین نییە کە هەموو شتە باشترەکان بە خۆوەبگرێ!! دەی ئەم تیۆرە زانستییە حیکمەت ئامێزە پێش چواردە سەدە قورئانی پیرۆز بانگەوازی بۆ کردوە، ئادەمیزادی هەلناوە بۆ پەیڕەویکردنی و دەفەرموێ:

{الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ أُوْلَئِكَ الَّذِينَ هَدَاهُمُ اللَّهُ وَأُوْلَئِكَ هُمْ أُوْلُوا الْأَلْبَابِ - سورة الزمر – ١٨}

ئەوەتا لەم ئایەتە پیرۆزەدا پەروەردگار فەرمانی بە موسولمانان کردوە کە گوێ بۆ هەموو قسەیەك بگرن و هەموو راوو بۆچونێك ئەم دیوو ئەو دیو بکەن و وردبینانە سەیری هەموو تیۆرو فەلسەفەیەك بکەن، هیچ راوو بۆچوونێکیش کوێرانە رەت نەکەنەوە، بەلکوو دەبێ لەژێر رۆشنایی توێژینەوەو تێگەیشتنەوە هەلبژادەکان وەربگرن و بیانکەنە ڕێبازی ژیانی خۆیان، پەروەردگار لەم ئایەتەدا ئەوانەی بە بەندەراستالەکانی خۆی حسێب کردوون و بەشارەزاو ڕێڕەوی ڕێبازی خۆی داناون، بەخاوەن عەقلو هۆشی تەواو چاوکراوەو دل رۆشنای لە قەلەم داون... ئابەو جۆرە دەبینین ئایینی ئیسلام بەرنامەیەکی بۆ موسولمانان داناوە تا ئێستا هیچ تیورو مەدرەسەیەکی فەلسەفی پەی پێ نەبردوە!!؟!

## عەقلو ئاوەز لە ئیسلامدا (العقل في الإسلام):

زانستی راست ئەوەیە ئادەمیزاد لە هەموو شتێکدا عەقل بە کاربێنێ بیکاتە چاوساغ و براگەورە، مەبەستیش لە عەقل ئەو ئاوەزەیە کە هەموو مەرجەکانی تێگەیشتنی تێدا کۆبووبێتەوە بە جۆرێك کە شایانی ئەوەبێ هەرشتێکی پێ سپێردراو بۆی رانواندرا تێی بگاو شی بکاتەوە!!

خودای مەزن لە قورئاندا فەرمان دەکا بە بەکارهێنانی عەقڵ و لۆمەی ئەوانە دەکا کە بەکاری ناهێنن! هەر بۆ ئەم مەبەستەش قورئان نزیکەی پەنجا جار ناوی عەقڵ و ئاوەزی – بەکردار یان بە ناو- هێناوە زیاد لە (دە) جاریش بە وشەی (أولو الالباب) و جارێکیش بە وشەی (أولى النهى) ناوی عەقڵی هێناوە هەمیشەش پێی لەسەر ئەوە داگرتووە، کە عەقڵ و ئاوەز نیعمەت و بەخششێکی فرەمەزنەو پێویستە لە هەموو شتێکدا بەکاری بێنین، راوو بۆچوونەکانی وەگرین و بیکەینە مەشخەڵ و چرای رێگای ژینمان، بۆیە دەبینین زۆر جار کۆتایی ئایەتەکانی بە وشەی عەقڵ مۆر دەکا:

{فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ – ولقد بينا الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ - أَفَلَا يَعْقِلُونَ}.

لەلایەکی ترەوە دەبینین قورئان ڕەخنە دەگرێ لەو کەسانەی بەکارهێنانی عەقڵ پاش گوێ دەخەن، بە ئوسلوبێکی کاریگەری لۆمەئامێز هێرشیان دەکاتە سەری و دەفەرموێ:

{إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِندَ اللَّهِ الصُّمُّ الْبُكْمُ الَّذِينَ لاَ يَعْقِلُونَ-سورة الأنفال/٢٢}.

واتە: خراپترین زیندەوەرێك لای خودا کە بەسەر زەویدا دەڕوا کەسانێکن کە خۆیان کەڕو لاڵ کردوە، سوود لە ئالاتی بیستن و زمانیان نابینن و عەقڵیان بە چاکەو خراپەی خۆیان ناشکێ و ئاژەڵ ئاسا دەژین و دەچن. هەر لەم بوارەدا لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ:

{أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا - سورة الفرقان – ٤٤}.

واتە: ئەی پێغەمبەر! تۆ پێت وایە زوربەی ئەو خەڵکە گوێچکەی بیستن و عەقڵ و هۆشی تێفکرینیان هەیە؟! وا مەزانە، ئەوانە وەهانین! بەڵکوو وەکوو ئاژەڵ وانە، تەنانەت لە ئاژەڵیش بێ هۆشترن، چونکە ئاژەڵ خودای خۆی دەناسێ، رێگای لەوەڕگاو هاتنەوە بۆ مۆڵگەی خۆی دەزانێ و گەردنکەچی خاوەنەکەیەتی،

بەلأم ئەمانە سەرڕەقو لەخۆڕازینو خوانەناسو بێ بڕوان، لە شوێنێکی تردا پەروەردگار بەکارنەهێنانی عەقڵو هۆشی بە تاوانێکی گەورە حسێب کردوە، لە قیامەت دا سزای تایبەتی بۆ داناوەو دەفەرموێ:

{وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ-سورة الملك/١٠}.

واتە: کافرەکان لە قیامەت دا دەڵێن: ئەگەر ئێمە لە جیهاندا گوێ بیستی فەرمانەکانی پەروەردگار بوینایەو عەقڵو هۆشمان ببوایە بەکارمان بێنایە ئێستا بۆچی تووشی ئەم رۆژە رەشە دەبوین! بۆ فڕێ دەدراینە ناو دۆزەخەوەو ئەم سزا سەختە دەدراین؟!

بێگومان هەر بەکەمێ بیرکردنەوە بۆمان دەردەکەوێ ئەم گرنگیپێدانەی ئیسلام بەعەقڵ کارێکی تایبەتییە بەم ئایینەو لە هیچ ئایینێکی تردا بەم جۆرە گرنگی بە عەقڵو هۆش نەدراوە...!

## بوونەوەر یاساو دەستووری نەگۆڕی خۆی هەیە:

پوختەی زانست ئەوەیە کە گۆڕانکاریی بەسەر حەقائیقی سروشتی دا نایە، هەر شتێك لە سەردەمێکا بە بەڵگەی قەتعی دەرکەوت کەراستەو گومانی لێ ناکرێ ئەوە هەموو کاتێ راستەو حەقە! ئەم بناخە علمییە بنەمایەکی قورئانییەو قورئان بە ئاشکرا ئاماژەی بۆ کردووە دەفەرموێ:

{فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ الْأَوَّلِينَ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَبْدِيلًا وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَحْوِيلًا - سورة فاطر ٤٣}.

واتە: ئایا ئەمانە چاوەڕێی چی دەکەن جگە لەوەی کە ئەمانیش بە دەستووری کافرە پێشینەکان لەناو بچن، چونکە یاسایەکی نەگۆڕی خودایی یە: دەستوورە سروشتییەکانی خودا، دابو نەریتو رێبازە ئاساییەکانی خودا قەتقەت ناگۆڕێنو تێك ناچن! کەس نییە بتوانێ کاریان تێ بکاو لە رێرەوی خۆیان لایان بدا!! لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ: {لا تبديل لخلق الله} ئەم ئایەتانە ئەوەمان بۆ روون دەکەنەوە کە رێو رەسمی خودا گۆڕانکاری بەسەردا نایە، سروشتیش خودا

چۆنی بۆ داناوەو یاساکەی چۆنە بەبێ دواکەوتن تا ئەوماوەی بۆی دانراوە کاری خۆی ئەنجام دەدا!

## تاقیکردنەوەو وردبوونەوە (التجارب والمشاهدات):

رێبازی زانستی چ لە بواری زانیاری سروشتییەکاندا بێت یان لە بواری ژیانداری و کۆمەلایەتی و ئاسمان شووناسیدا بێ، سەرەتا بە سەلمێنراوە موتڵەقەکان یان یاسا فەلسەفییەکان یان رایەکی تایبەتی دەست پێ ناکا: هەروەها پشت بەو حوکمانە نابەستێ کە لە تێفکرنێکی تایبەتی لە دەروون یان رای مونەوەرێکی خاوەن عەقڵ و هۆشی تەواو بناوان هەڵبەستێ، بەڵکوو هەموو کاتێ پشت بە تاقیکردنەوەو توێژینەوە دەبەستێ: تاقیکردنەوەیەك کە چاوو گوێچکەی تێدا بەکار بهێنرێ وێڕای بەکارهێنانی ئامێری وردبین و دووربینی وەکوو میکرۆسکۆب کە بە یەکەمیان شتی ورد دەبنیرێ وەکوو میکرۆب و بەدووەمیان شتی دوور وەکوو لاشەکانی فەزا (الاجرام السماوية) کە لەبەر دووری بەچاوی ئاسایی نابیندرێن. کەوابوو تاقیکردنەوەو سەرنجدان تاکە رێبازێکە کە زانستی سروشتی پیڕەوی دەکا بۆ گەییشتن بە (مقدمات)ی ڕاست و رەوان، ئەگەر ئەم (مقدمات)ە نەبوونایە زانیارییە سروشتییەکان بەو جۆرە پەرەیان نەدەستاندو بڕی لە نێهنییەکانی بوونەوەر ئاشکرا نەدەبوون و هەروا بەونی دەمانەوە.

جێگەی سەرنج و تێفکرینە کە تاقیکردنەوەو توێژینەوە کە بناخەی عیلم و زانستن، لە هەمان کاتدا بناخەیەکی قورئانیشن!! ئەو ئایەتانەی کە فەرمان دەکەن بە لێکۆڵینەوەو تاقیکردنەوەو بەکارهێنانی چاوو گوێچکەو عەقڵ و هۆش زۆر زۆرن بۆ نموونە ئەوەتا دەفەرموێ:

**{قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ - سورة العنكبوت – ٢٠}.**

واتە: ئەی پێغەمبەر! بەو خەڵکە بڵێ: کە بڕوایان بە زیندوبونەوە نییە پێیان بڵێ: گەشت و گوزار بەسەر زەویدا بکەن و بەچاوێکی ورد بینانە بڕوانن و عەقڵ و هۆشی خۆیان بخەنە کارو سەیر بکەن پەروەردگار چۆن بونەوەری

هێناوەتە گۆڕەپانی بونەوە، هەرشتێك لە رەنگێكو بەجووڕێك پەیڕەوی یاسای ژیان دەكا!! یان دەفەرموێ:

**{أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَـكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ- سورة الحج -٤٦}.**

لەم ئایەتە پیرۆزەدا پەروەردگار گرۆهی ئادەمیزاد هەڵدەنێ — بە تایبەتی ئەوانەی بێ بڕوان — كە گەشتو گوزار بكەن، بەكونو قوژبنی زەویدا بگەڕێنو بڕواننە شوێنەواری ئەو گەلو هۆزانەی كە لەناو چون، پەندو عیبرەتیان لێ وەرگرنو عەقڵو هۆشی دەرك كردنیان هەبێو هەست بەشت بكەن یان كوێچكەیان قسە بیسێو پەندو ئامۆژگاری كاریان تێ بكا، بێگومان ئەو خوانەناسانە گوێچكەو چاویان — ئامێری بیستنو دیتنیان — ساغو سەلیمە ئامۆژگاری پێغەمبەركەیان دەبیستنو لێی حاڵی دەبن، بەڵكوو خەلەلەكە لە عەقڵو هۆشیاندایە عەقڵو ئاوەزیان دەست بەكارنییە، چاوی سەریان كوێرنیەو بینایە بەڵام چاوی دڵیان كوێرەو نابینایە[1].

بۆیە دەڵێین: جاری وا هەیە دڵ ژەنگ دەیگرێو هیچ شتێك دەرك ناكا هەرچەندە لە بارەی مادییەوە هیچ نەخۆشی پێوە دیارنیە، ئەمەش نهێنییە كە لە نهێنییەكانی بسكۆلۆجیا ئەویش ئەوەیە كە دڵ تووشی نەوعە كوێرییەك دەبێ لە حاست چاوی سەردا وەكوو عاسمانو رێسمان وایە چونكە كوێر بوونی چاوی دڵ وا لە ئادەمیزاد دەكا هەستی جیاكردنەوەی چاكەو خراپەی لا نەمێنێ!!

هەر لەم رووەوەیە كە پەروەردگار لایەنی تێگەیشتنو زانینی لە دڵی بێ بڕوایاندا داپۆشیوەو پەردەی رەشی بەسەردا هێناوەو دەفەرموێ:

**{لَهُمْ قُلُوبٌ لاَّ يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لاَّ يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لاَّ يَسْمَعُونَ بِهَا أُوْلَـئِكَ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ - سورة الأعراف – ١٧٩}.**

---

[1] مەبەست لە وشەی (قلوب) كە كۆی (قلب)ەو بەمانا دڵەو لە ئایەتەكەدا هاتووە مانا لۆغەوییەكەی مەبست نییە، بەڵكوو لێرەدا (قلوب) بە مانا (عقول)ە شوێنو ئامێری هەستو دەرك كردنە!!

ئاشكراشە زانینو فێربوون بەهۆی ئامێری بیستنو دیتن (كە گوێچكەو چاو) بە پشتیوانی عەقڵ ئەنجام دەدرێن، دەبێ عەقڵ مامۆستاو رابەریان بێ!! كەوابوو ئەگەر منالێك لە شوێنێكدا حەبس بكەینو لە كۆمەڵ دایبڕینو تەنها خواردنو خواردنەوەی پێویستی بۆ دابین بكرێ، دەبینین ئەم مندالە هەر چەند لە بارەی جەستەوە گەورە ببێ بەلام لە بارەی هۆشەوە هەر بەمندالی دەمێنێتەوەو گەشە ناكا.

ئەم بۆچوونە راوو بۆچوونی زانایانی پەروەردەیە، قورئانی پیرۆزیش هەمان ئاماژەی كردوە كە دەفەرموێ:

**{وَاللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّن بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لاَ تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ الْسَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ - سورة النحل – ٧٨}.**

ئەم ئایەتە بە ئاشكرا ئەوە دەگەیەنێ كە هەرزانیارییەكی ئادەمیزاد دەستی دەكەوێ لە ژیانیدا هەمووی بەهۆی بەكارهێنانی چاوو كوێچكەو عەقڵەوە بەدەستی دێنێ!!

## ئەو زانستو زانیاریەی كە ئیسلام داوای دەكا:

ئایینی ئیسلام ئادەمیزاد بانگ دەكا بۆ سەر رێگەی زانستو زانیاری، هەمیشە ئەو خەڵكە هەڵدەنێ بۆ فێربوونو زانست پەروەری! دەی با بزانین ئەو زانیارییەی ئیسلام داوای دەكا زانستی ئایینییە – وەكوو هەندێك وا دەڵێن -؟! نەخەیر! مەبەست لە زانیاری لە روانگەی ئیسلامەوە هەموو زانیاریەكە كە تاریكی نەزانی برەوێنێتەوە، ئیتر ئەو زانستە كارو باری ئیسلام یان جیهانی چارەسەر بكا یان هەردوولا، جیاوازی نییە؟! بە كورتی زانستە سروشتییەكانو زانستییە دەروونزانییەكان زانستی مێژوو زەوی ناسی كۆمەڵناسی ... هتد هەموویان لەو جۆرە زانیارییانەن كە قورئانی پیرۆز بانگەوازی بۆ كردونو ویستوویەتی لە تەك زانستییە ئادەمیزاییەكاندا گەشە بكەنو لێكۆڵینەوەیان تێدا بكرێ.

بەڵێ پەروەردگار موسوڵمانانی هەڵناوە بۆ فێربوونی هەموو عیلمو زانیارییەك تا لەبەر ڕۆشنایی ئەم زانستانەدا باشتر گەورەیی خودایان بۆ ئاشکرابێ‌و چاکتر بزانن: کە خوداوەند دەسەلاتو توانای زۆرە، وێڕای ئەم حیکمەتو مەبەستە چەند مەبەستی تریش هەن لە فێربوونی ئەو زانیاریانە ئەویش ئەو سودەمادییانەن کە لە بەکارهێنانی ئەو عیلمانەدا بەدەست دێن‌و ڕێگای ژیان ئاسان دەکەن‌و دەسەلاتو توانا بەمرۆڤ دەبەخشن بۆ زاڵبوون بەسەر سورشت دا!!.

## بانگەوازی ئیسلام بۆ فێربوونی زانستە سروشتییەکان:

ئەو ئایەتە قورئانییانەی بانگەواز دەکەن بۆ فێربوونی زانستی سروشتی زۆرن‌و لەزۆر شوێنی قورئاندا بەرچاو دەکەون، یەکێك لەو ئایەتانە ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ:

**{وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِينَ - سورة الروم – ٢٢}.**

واتە: بەشێك لە نیشانەکانی دەسەلاتو بەتوانایی خودا دروستکردنی ئاسمان‌و زەوییە، جیاوازی شێوەی گفتو گۆو زمان‌و ڕەنگو روخسارتانە! بێگومان لەم چوونیەتەدا زۆر بەڵگە هەن لەسەر خودایەتی خوداو هەر کەسێك زاناو دانابێ هەست بەم حەقیقەتە دەکا.. یان دەفەرموێ:

**{أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ، وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَٰلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ - سورة فاطر – ٢٧-٢٨}.**

لە نیگاو ڕێڕەوی ئەم ئایەتانەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە مەبەست لە (العلماء) لێرەدا ئەو زانا باوەڕدارانەن کە شارەزای رازو نهێنییەکانی بوونەوەرن‌و زانان بەو رازو نیهێنییانەی کە پەروەردگار لە دوو تویێ تویێژەکانی ئەم گۆی

زەوییەدا دایناون، ئاشکراشە ئەو شتانەی ئەم ئایەتانە باسیان لێوە دەکەن دەق ئەو شتانەیە کە زانستی سروشتی باسیان لێ دەکا، چونکە دەزانین کە عیلمی تەبیعی – زانستی سروشت – باسی شتەکەونییەکانو سروشتییە تایبەتییەکانو پەندو پەیوەندی نێوان ئەو شتانە دەکا!! هەروەها جار جارەیش باسی چۆنیەتیو حەقیقەتو جەوهەری شتگەلەکەیش دەکا، واتە: لەو نهێنییانە دەکۆڵێتەوە کە سپێردراون بە ناخی ئەم شتگەلە، کە نیشانەی هەبوونی خوداو دەسەڵاتی بێ سنووری خودا رادەگەیەنن! بۆ نموونە لەم ئایەتەی سورەتی (فاطر)دا بەهۆی زانستی سروشت (علم الطبيعة)وە نەبێ ناتوانین هۆو نهێنی هاتنە خوارەوەی باران لەئاسمانەوە بۆ زەوی بزانین! هەروەها بەهۆی زانستی کیمیاگەرییەوە نەبێ نازانین باران لەچی پێك دێو شتە تایبەت مەندییەکانی چینو چی نین...!! خۆ ئەگەر بەهۆی رووەکزانی (علم النبات)ەوە نەبێ نازانین رواندنو بەرگرتن چۆن ئەنجام دەدرێ!! ئەگەر زانیاری چینەکانی زەوی (علم طبقات الأرض – جیۆلۆجی) نەبێ نازانین کێو چییەو چینەکانی زەوی چینو سپیو رەشو سوری چنو چۆن پێك هاتوون! ئەگەر زانیاری رەچەڵەكو نژادی ئادەمیزادو ئاژەڵ (علم أصل الشعوب والحيوان) نەبێ هەرگیز پەی بە چۆنیەتی جیاوازی رەچەڵەکی ئادەمیزادو ئاژەڵ نابەینو نازانین جیاوازی نێوانیان چییەو چی نییە! ئەمجار بڕوانە کۆتایی ئایەتەکە کە دەفەرموێ:

{إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ}.

چۆن ئەوە دەچەسپێنێ کە خودا ناسینو لە خودا ترسانی تەواو هەر زاناکان بەباشی پەیڕەوی دەکەن، ئەوزانایانەی لێکۆڵینەوە لە شتەکەونییەکاندا دەکەن بە وردی لە نیشانەکانی خودایەتی خودا دەڕوانن و سەرنجی دەدەنێ، ئەوانە بە تەواوی ملکەچی پەروەردگار دەبن، چونکە زاناکان – ئەگەر موسوڵمان بن – زانیارییەکەیان بەنهێنییەکانی سروشت هەڵیان دەنێ بۆ لە خودا ترسانو خواپەرستی بەڕاستی!!

## ژیانداری ژینناسی = ژین شوناسی (علم الحياة = البيولوجيا):

لەم بوارەشدا دەبینین قورئانی پیرۆز سەرنجی ئادەمیزاد رادەکێشێ بۆ ئەوەی بیر لە چۆنیەتی خۆی بکاتەوە، چۆن لە منداڵدانی دایکیدا خولقاوەو چۆن قۆناغەکانی ئەو ماوەیەی بڕیوە؟ چی گۆڕانکارییەکی بەسەردا هاتووە!

{فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ، خُلِقَ مِن مَّاء دَافِقٍ، يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ - سورة الطارق – ٥-٧}.

واتە: دەی مرۆڤ سەرنجی دروستبوونی خۆی بدا، کە لەچی دروست کراوە! بناغەی بوونی دەگەڕێتەوە بۆ سەر تنۆکێ ئاوی هەڵقوڵیو، کە بەشێکی لە بڕبڕەی پشتی پیاوەوە دێتە خوارەوە ئەو بەشەکەی تری لە قەفەزەی سنگی ئافرەتەوە دەردەچێ!!

ئاشکرایە کە ئەم ئایەتە داوای ئەوە دەکا ئادەمیزاد بیر لە بناخەی دورستبوونی خۆی بکاتەوە، بەهۆی بیرکردنەوە لە بناخەی دروستبوونی خۆی، ئینسان زانستی ژیانداری لەلا گەڵاڵە دەبێ، هەر بەهۆی هەوڵدانو لێکۆڵینەوە لەم رووەوە زۆر شتی سەر سوڕهێنەرمان بۆ دەردەکەوێ – بەنموونە – وەکوو گەشەکردنی گیاندارە سپۆرییەکان (الجرثومة الإنسانية) ئەو گۆڕانکارییەی بەسەری دادێ لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر، کە ئەم حاڵەتە ئەمرۆ پێی دەگوترێ ژیانداری (البيولۆجيا).

## دەروونزانیی = بەخۆدا چوونەوە (علم النفس):

لەم بارەوە ئەوەی لە قورئاندا هاتووە زۆرە، یەکێ لەو شوێنانە ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە دەفەرموێ:

{وَفِي أَنفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ - سورة الذاريات ٢١}.

واتە: بۆچی بیر لە چۆنیەتی خودی خۆتان ناکەنەوەو بەخۆتاندا ناچنەوە، ئاشکراشە کە بیرکردنەوە لەخۆت، تێفکرینی ئادەمیزاد لەخودی خۆی هەموو بوارەکانی زانستی دەروونزانی دەگرێتەوە؟!

## زانستی مێژوو کۆمەڵناسی (علم التأريخ والإجتماع):

ئاینی ئیسلام وە نەبێ هەر بە ئەوەندە وازی هێنابێ کە موسوڵمانان هەڵبنێ کە بیر لەو کائیناتە بکەنەوە کە لەبەردەمیانایەو بەس!! بەڵکوو داوای لێ کردوونو هەڵیناون کە توێژینەوە بکەن لەو گەلو هۆزو گرۆهانەی کە رابردونو نەماون! داوای لێکردوون کە لێکۆڵینەوە بکەن دەربارەیان، بزانن هێزو توانایان، پیشەسازیو شارەستانییان، خانوو بەرەو باڵەخانەیان چۆن بووە! کاتێکیش لە فەرمانی خودا دەرچوون چییان بەسەرهاتو چۆن تەفرو تونا کران! ئەوەتا لەم بارەوە پەروەردگار دەفەرموێ:

**{أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا الْأَرْضَ وَعَمَرُوهَا أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَاءتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ-سورة الروم/٩}**

واتە: ئایا ئەو خوانەناسانە بەسەر زەویدا گەشتو گوزاریان نەکردوە؟ بێگومان کردویانەو دیویانە سەرەنجامی ئەو کافرانەی پێشوو چی بووەو چییان لێ هاتووە! باش دەزانن پەروەردگار – بەهۆی بێ بڕواییانو بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرەکانیان – هەموویانی لەناو بردووەو تەفرو تونای کردوون، ئەمە لە کاتێکا کە ئەوان زۆر لە کافرەکانی مەککەو ئەو خوانەناسانەی کە شوێن ئەوان دەکەون بەهێزتربووون، باشتر زەوییان ئاوەدان کردۆتەوەو کێڵگەو فەلاحەتیان تێدا ئەنجام داوە، بیناو باڵەخانەیان تێدا بنیات نابوو! کەچی کە پێغەمبەرەکانیان پەیامیان بۆ هێنانو داوای بڕواهێنانیان بە خودا لێکردن، سەرپێچییان کردو فەرمانبەردار نەبوون ئیتر... لەتۆڵەی ئەوە خودا لەناوی بردنو توشی سزای بەئێشی کردن!! بێگومان پەروەردگار زوڵمو ستەمی لێ نەکردنو بەبێ تاوان سزای نەدان بەڵکوو بۆ خۆیان زوڵمیان لە خۆیان کردو ئیمانیان نەهێناو پێغەمبەرەکانیان بەدرۆخستەوە بۆیە شیاوی ئەو سزا سامناکەبوون!

دەی باشە ئایینێك ئەمە پەیڕەوو پرۆگرامی بێ، گەلێك ئەم ئایەتو تەعلیماتەی بۆ هاتبێ چۆن دەگونجێ رۆڵەكانی گەشتو گوزاری زانست ئامێز پاش گوێ بخەن؟! چۆن دەبێ بیر لە هۆكاری دروستبوونی كۆمەڵو پتەو بوونی پەیوەنـدی نێوانیانو پەرتەوازە بوونیانو پێشكەوتنو دواكەوتنیانو ئاوەدانبوونەوەو وێرانبوونی وڵاتی خۆیانو خەڵكی دیكەش نەكەنەوە؟ ئاشكراشە لێكۆڵینەوەو بیركردنەوە لەم بوارانەدا رێك بریتییە لە زانستی مێژوو كۆمەڵناسی بە هەموو لقو پۆپەكانیانەوە.

## شایەتیدانی برێ لە زانا خۆرئاواییەكان دەربارەی شارەستانیەتی ئیسلام:

مێژوو ئەوەی چەسپاندووە مێژوونووسە خۆرئاواییەكانیش كەواهی ئەوەنو سەلماندویانە كە موسوڵمانانی پێشوو دوای ئەوەی بەناوجیهاندا بڵاو بوونەوەو بانگەزای ئیسلامییان بە خەڵكی راگەیاندو وڵاتیان كۆنترۆڵ كرد! چی زانیاریو پیشەسازییەكی لەو گەلو هۆزانەیان بەدی كردبێ فێری بوونو لێكۆڵینەوەیان تێدا كردووەو هەوڵیان داوە فێری بنو بزانن چۆنەو چۆن نییە! بەڵێ زانستخوازییان وای لێكردوون كە هەمیشە هەوڵ بدەن دەقە نووسراوەكانی ئەو گەلانە لە سەرچاوەكانیانەوە فێرببنو توێژینەوەیان تێدا بكرێ، هەربۆیەشە كە موسوڵمانان هەرگیز لەو شوێنانەی رزگاریان كردونو ئەو وڵاتانەی كەوتوونە ژێر دەستیان نەیان هێشتووە كەلەپوورو نووسراوی ئەو شوێنانە بفەوتێ، بەو پەڕی دڵسۆزییەوە ژیاری نەتەوەكانی كەوتوونە ژێر ركێفیانەوە پاراستووە، نەهاتوون وەكوو داگیركەر كتێبو پەڕاوی زانست ئامێز بسووتێنو بیناو باڵەخانەی هونەركاری بڕوخێنن! بەڵكوو كە نووسراوێكی زانستییان چنگ كەوتووە پسپۆڕیان بۆ دۆزیوەتەوە بەكرێیان گرتووە كە بۆیان وەرگێڕێتە سە زمانی عەرەبیو پارەو پوولی باشیشیان داوەتە ئەو كەسانەی كە بەڕێكو پێكی ئەم كارەیان ئەنجام داوە! دوای وەرگێڕان كەوتوونە توێژینەوەو لێكۆڵینەوەی ئەو دەقە وەرگێڕدراوانەو كارپێكردنیان لەناو كۆمەڵگای ئیسلامیداو پەرەپێدانی ئەم زانستخوازییە تاوای لێ هاتووە موسوڵمانان بوون بە جێگری یۆنانو رۆمان لە

زانست و زانیاریداو خوێندنگاو دانشگای زانستییان دروست کردون و کتێب و نووسراوی زۆریان نووسیوەو کتێبخانەیان بنیات ناون و کتێبیان تێدا هەڵچنیون و لە هەموو لایەکی جیهانەوە زانستخوازان و قوتابیان رویان لە شارو پایتەختی وڵاتانی ئیسلامی کردوەو سوودیان لەومەڵبەندە رۆشنبیریانە وەگرتووە، ئیتر میرو فرمانڕەواو زانایانی ئیسلام بە مەشەوە نەوەستاون بەڵکوو هەمیشە لە هەوڵ و تەقەڵلا دابوون بۆ برەوپێدانی زانیاری و زۆر لایەنی زانیاری هەمەچەشنەی وەکوو پزیشکی و کیمیاگەری و سروشت ناسی و بیرکاری...هتد یان هێنایەکایەوەو کتێب و نامیلکەیان تێدا نووسیون، شورشێکی رۆشنبیری کەم وێنەیان بەپارکرد!! بە جۆرێك کە دوژمن پێش دۆست – ئەم راستییەی سەلماندووە کەسیش ناتوانێ ژێرلێوانی بحا... ئەمەش شایەتیدانی برێ لەو زانا خۆرئاوای و ئەوروپاییانەیە کە بە ئاشکرا رۆڵی موسوڵمانان لەبواری عیلم و زانستدا دەردەخەن و لە نووسراوو وتارەکانیاندا ئاماژەیان بۆ کردوە:

مامۆستا (دریبر) مامۆستای زانکۆی نیۆرك لە کتێبەکەیدا کە بەناوی (المنازعة بين العلم والدين) کێشەی نێوان زانست و ديندا دەڵێ: خەریکبوونی موسوڵمانان بەزانستییە سروشتییەکانەوە دەگەڕێتەوە بۆ رۆژگاری دەست بەسەرگراتنی ئەسکەندەرییە لەلایەن موسوڵمانەکانەوە ساڵی (٦٣٨ ز).

واتە: دوای لە دونیا دەرچوونی حەزرەتی موحەممەد (درووری خودای لەسەربێ) بە شەش ساڵ. دوای ئەوە دوو سەدە تێنەپەڕی کە توانییان زوربەی زانستە یۆنانییەکان تاوو توو بکەن و رۆڵی خۆیان بنوێنن!

کاتێکیش فەرمانڕەوایی کەوتە دەست مەئموونی عەباسی ساڵی (٨١٣ ز). بەغدابوو بە بەپایتەختێکی گەورەی عیلم و زانست، چونکە خەلیفە مەئموون زۆر گرنگی بەزانیاریی داو نووسراوو کتێبی زۆری کۆکردەوەو زانایانی لەخۆی نزیك کردەوەو رێزو نرخی بێ پایانی بۆ دانان.

ئیتر دوای ئەوەی (دریبر) شوێن دەستی موسوڵمانان لە بواری زانیاری سرۆشتدا دەردەخا دەڵێ: ئەگەر بێتو بمانەوێ هەموو بوارێکی ئەم جەم و جوڵە زانستییە

بنووسین قەبارەی ئەم نووسراوە لە خۆی ناگریو لێرەدا جێگای نابێتەوە چونکە ئەوان – واتە موسوڵمانەکان – بەراستی گەشەیان بە عیلمو زانست کردوەو زانستو زانیاری تریشیان داهێناوە کە لەوەپێش ئاسەواریشی نەبووەوە!

لە شوێنێکی تردا دەڵێ: زانکۆ ئیسلامییەکان هەموو کاتێ دەرگایان ئاوەڵابووە بۆ خوێندکارە ئەوروپاییەکان ئەوانەی زێدی خۆیان بەجێ هێشتووە چۆن بۆ خوێندنو فێربوون! تەنانەت پاشاکانی ئەوروپا دەچوونە وڵاتە ئیسلامییەکانو لە خەستەخانەکانی ئەواندا چارەسەری نەخۆشییەکانیان دەکرا.

پرۆفیسۆری بەناوبانگ (سدیو) لە کتێبەکەیدا کە ناوی (تأريخ العرب)ە دەڵێ: (موسوڵمانەکان لەسەدەکانی ناوەڕاستدا هەر خۆیان شۆڕەسواری گۆڕەپانی زانستو فەلسەفەو هونەر بوون لەهەر شوێنێك باروبارگەنەیان خستبێو دەستیان گەیشتبێ عیلمو زانستیان تێدا بڵاو کردۆتەوە هەر لەوانیشەوە زانست گەیشتە ئەوروپاو تێیدا بڵاوبۆتەوە کەوابوو موسوڵمانان بوون بەهۆی بڵاوبوونەوەی عیلمو زانستو پێشکەوتنی.

مامۆستای کۆمەڵناسی: دکتۆر جۆستاف لۆبون لە کتێبەکەی دا (حضارة العرب – شارستانیەتی عەرەب) دەڵێ: (فەرمانڕەوایی خۆرهەلات کەوتۆتە ژێر رکێفی زۆرگەڵو نەتەوەی وەکوو فارسو ئیغریقو رۆمەکان...هتد. جا هەرچەندە شوێندەستی ئەم نەتەوانە لە بارەی رامیارییەوە دیاربووە کەچی کاریگەری شارستانییەتیان زۆر لاواز بووە، ئەو پێشکەوتنە ژیاریو شارستانییەتەی کە ئیغریقو فارسو رۆمەکان نەیانتوانی دەستەبەری بکەن موسوڵمانەکان زۆر بەزوویی وەدەستیان هێنا، لە هەموو ئەو وڵاتانەی کە ئاڵای ئیسلامی تێدا شەکاوەتەوەو کاریگەرییان هەبووە زانستو زانیاریی تێیان دا گەشەی کردووە، ئەوەی لە میسردا ئەنجامیان دا لە وڵاتی فارسو رۆمیشدا ئەنجامیان داوە، تەنانەت لە وڵاتی (هیندو چین)یشدا کە هەر بەرێبواریو بۆمەبەستی کاری بازرگانی رێیان تێ کەوتووە، کەچی شوێن دەستیان دیارەو رۆڵی گرنگیان لە بواری شارستانیەتی ئەو وڵاتانەدا بینیوە، بە کورتی هیچ

گەل‌و نەتەوەیەك لە مێژوودا بە ئەندازەی موسوڵمانەکان ڕۆڵی شارەستانیەتی نەبینیوە، هەموو گەل‌و نەتەوە جیرانەکانیان سەردەمێك پابەندی باری شارەستانی موسوڵمانەکان بوون. ئاشکراشە کە کاریگەری موسوڵمانان هەر لەبارەی ئایین‌و زوبان‌و هونەرەوە نەبووە بەڵکوو دەورێکی گرنگیان هەبووە لە بواری ڕۆشنبیری زانستیدا، چونکە هەر ئەمانە بوون کە زانیاری‌و زانستیان گواستەوە بۆ وڵاتی هیندو چین‌و ئەوزانیارییەی لە وڵاتانەدا باو بوو بنەماکەی هیندی‌و چینی نەبوو، لەوەش زیاتر دەتوانین بڵێین کە موسوڵمانەکان چۆن شوێندەستیان لە ڕۆژ هەڵات‌و ئەفەریقادا هەبووە هەر بەو جۆرەش لە روبەری وڵاتانی ئەورووپادا ڕۆڵی خۆیان بینیوە بە جۆرێك دەتوانین بە راشکاوی بڵێین ئەورووپا قەرزداری شارستانیەتی موسوڵمانانە).

کاتێکیش دەتوانین ئەوە بڵێین کە بەوردی سەرنجێك لە باری ئەو سەردەمەی ئەورووپا بدەین‌و بەراودێکیان لە نێواندا بکەین، دەبینین ئەوکاتەی کە ژیارو شارستانیەتی موسوڵمانەکان لە ئەندەلووسدا گەیشتبووە لوتکەو تیشکی زانست‌و زانیاری تێدا بڵاو ببوەوە، ئالەو کاتەدا شوێنە گشتییەکانی ڕۆشنبیری ڕۆژئاوا چەند فەرمانڕەوایەکی دەرەبەگی سەر ڕەقی تێدا دەحەوایەوە کە شانازییان بە نەخوێندەواری دەکرد.

هەروا ڕۆژگارێکی دورو درێژ تێپەڕی‌و هێشتا ئەورووپا هەستی بە نەزانی‌و ماڵوێرانی خۆی نەکردبوو! نەیدەزانی تام‌و چێژی عیلم‌و زانست چییەو چی نییە! ئەوە نەبێ کە لە سەدەی یازدەو دوانزەی زایینیدا تۆزێك تیشکی زانیاری وێکەوت‌و شیرینی‌و خۆشی زانستیان چەشکەکرد، کاتێکیش چەند مرۆڤێکی لەخۆ بردویان تێدا هەڵکەت‌و بەپەرۆشەوە ویستیان هەوری ڕەشی نەزانی بڕەوێننەوەو پەردەی نەزانی لادەن‌و روناکی زانست بەدی بکەن یەکسەر بەرەو وڵاتی موسوڵمانان کەوتنە ڕێ‌و هاتن لەم مەڵبەندانەدا فێری عیلم‌و زانست بن‌و قەڵاچۆی جەهل‌و نەزانی بکەن!!

مامۆستا (لیبری) دەڵێ: ئەگەر موسوڵمانەکان نەبوونایەو نەهاتنایە سەر شانۆی مێژوو پیشەسازی‌و پێشکەوتنی ئەورووپا چەند سەدەیەکی تریش دوا دەکەوت!

ئاشکراشــە کــە زانــستە عەربییــە وەرگێڕدراوەکــان بــۆ مــاوەی شــەش ســەدە سەرچاوەی خوێندنی خوێندنگاو دانیشگاکانی ئـەوروپا بـووە، تەنانـەت دەتـوانین بڵێین: کـە کاردانـەوەی موسـوڵمانەکان لـەبرێ زانیاریـدا – بەنموونـە لـە زانـستی پزیشکیدا تا ئێستاش بەردەوامەو ڕۆڵی خۆی دەبینێ! ئەی ئەوە نییـە کتێبـەکانی (ابن سینا) لە کۆتایی سەدەی نۆزەدا لە (مونبیلییە) راڤە کران‌و شەرحیان لەسەر نووسرا!!.

خوێنەری هێژا ئەوەی گوتراو باسکرا قسەی ئێمـە نییـە بەڵـکوو قسەی زانـا دەروونناسـە ئەوروپییەکانـەو دان پێـدانانی ئەوانـە کـە هـەرگیز نـاتوانین گومـانی ئەوەیان لێ بکەین کە زیادەڕەوی دەکەن‌و قسە هەڵبەستن! چونکە لەم کارەدا هـیچ شانازییەکیان لێ وەگیر ناکەوێ، نە بـۆ خـودی خۆیـان‌و نـە بـۆ گـەل‌و هۆزەکانیـان. ئێمـەش کاتێـك ئەمـە دەنووسـین‌و بـڵاوی دەکەینــەوە مەبەسـتمان ئەوەیـە کـە بەڵگەبێنینەوە لەسەر ئەوەی کە لە ئیسلامدا گیانێك هەیە هێزو وزەیـەك هەیـە، تـاك‌و کۆمـەڵ بـەرەو پـێش دەبـا! کـە ئـەم دیاردەیـە لـە هـیچ یاسایەکی دانـراوی ئادەمیزادا بەرچاو ناکەوێ‌و نابینرێ ئەمەش گەورەترین بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی کە ئیسلام نیگایەکی خوداییەو سروشتێکی رەببانییە دەستکردی ئادەمیزاد نییە.

## بەشی هەژدەهەم:

# چاوپۆشیو لێبوردن لە ئیسلامدا (التسامح في الإسلام)

**ناکۆکی نێوان پەیڕەوانی ئایینەکان – جیاوازی ئادەمیزاد لە پەیڕەوکردنی ئایینەکاندا، سونەتو یاسای پەروەردگار – ئازادیی بیرو باوەڕ – ئەو هۆیانەی کە ناهێڵن ئافرەتی موسوڵمان شو بە ناموسوڵمان بکا – قەلاچۆکردنی دەمارگیری ((التعصب) - مامەڵەکردنی موسوڵمانان لەگەڵ ناموسوڵماناندا – شایەتیدانی بڕێ لە زانا ئەوروپییەکان دەربارەی چاوپۆشیو لێبوردن لە ئایینی ئیسلامدا.**

## ناکۆکی نێوان پەیڕەوانی ئایینەکان (الصراع بين اتباع الأديان):

ئەگەر لاپەڕەکانی مێژوو هەڵبدەینەوەو بەچەرخەکانی مێژوودا بچینەوە دەبینین کۆمەڵی ئادەمیزاد – بەهۆی جیاوازییان لە بیرو باوەڕدا – هەرگیز چەشەی ئاشتییان نەکردوە، هیچ کۆمەڵێك مانعی نەبووە کە هێرش بکاتە سەر کۆمەڵێکی تر کە لەبیرو باوەڕدا لێك جیاوازبن، زۆرجاریش وابووە، روداوی سامناكو قەلاچۆکردنی بە کۆمەڵ لەسەر ئەم هەڵوێست یان ئەو هەڵوێست روی داوە بە جۆرێك کە روی مێژوویان رەشکردوە، مێژوو شەرمەزارە بەرامبەر ئەو روداوانە!! بێگومان هۆی رودانی ئەم کارەساتانەش ئەو تەعلیماتو ئامۆژگارییانەبوون کە لێپرسراوە ئایینیەکان لەناو دەستو پێوەندو پەیڕەوکارانی خۆیاندا بلاویان دەکردەوە دژی رکەبەرەکانی خۆیانو پەیڕەوکارانی ئایینەکانی تر.

(جون سیمون) کە لێکۆڵەرەوەیەکی ئەوروپییە لە کتێبێکی دا کە ناوی (حریە الاعتقاد)ە دەڵێ: رقو کینەی نێوان ئادەمیزاد – بەهۆی بیروباوەڕەوە – تا نزیکەی کۆتایی سەدەی هەژدەهەم لە پەرەسەندندابوو هەر رۆژە لە جێگایەکەوە کلپەی دەکرد، ئەمجار دەڵێ: پەیدابوونی ئازادیی بیرو باوەڕ شتێکی تازەیەو زۆر کۆن نییە! مێژووی جیهانیش هەمووی بریتییە لەمێژووی دژایەتی نێوان ئایینەکانو قەلاچۆکردنی پەیڕەوکارانی ئەو ئایینانە بۆ یەکتری، کەوابوو دەغەزو کینەی ئایینی (الحقد الدینی) کە لە ئازادی کۆنترە دەگەڕێتەوە بۆ کۆنترین مێژوو، ئەمجار

دوای ئەوەی کە شوێندەستی دەمار گیریی ئایینی لە جیهاندا دەست نیشان دەکاو هەر لەچەرخەکۆنەکانەوە تا چەرخەکانی ناوەڕاست دەڵێ: - لە کۆتاییدا گیانی فەلسەفەیی و توێژینەوە گەیشتە ئەوە کە ئازادیی ئایین و بیرو باوەڕ دابێنێ: لە بڕواری (٤/ی ئابی/١٧٨٩ی ز)دا ئازادیی ئایینی سەلمێنراو بانگەوازی بۆ کرا! بەڵام تا ساڵی/ ١٧٩١، ئەم یاسا پیرۆزە پەیڕەوی نەکرا، هەر لەم ساڵەدا بوو جولەکە لە چنگ زوڵم و ستەم رزگاری بوو، فیکرەی ئازادیی گەشەی کردو خەڵکی پەیڕەوییان کرد. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا شۆڕشی فەرەنسا کە لە ساڵی (١٧٨٩) بوو هەر نەیتوانی ئازادیی بیرو باوەڕ بە تەواوی بچەسپێنێ.

بێگومان وتەی (جۆن سیمون) کە دەڵێ: ئازادیی ئایینی تا کۆتایی سەدەی هەژدەهەم دابین نەکراوە راوو بۆچوونێکی هەڵەیە، لەگەڵ واقیعدا یەك ناگرنەوە! بەڵکوو دەتوانین بڵێین دابینکردنی ئازادی بیرو باوەڕ هەزارو چوار سەد ساڵ پێش ئێستا لە سەردەمی موسوڵمانان بەرقەراربووە، ئیسلام بانگەوازی بۆ کردوە، مێژووی روداوەکانی ئیسلام باشترین بەڵگەی ئەم راستییەن! ئێرەش جێگای ئەوە ناکاتەوە کە بڕێك دەقی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەرو روداوی مێژوویی موسوڵمانانی رۆژگاری زێڕینیان و شایەتی بڕێك لە زانا ئەورووپییەکان بخزێنینە ناو ئێرەوە!!

جیاوازی کۆمەڵانی ئادەمیزاد لە بیرو باوەڕدا یاسایەکی خوداییە، زۆر جار ئەو پرسیارە دێتە پێشەوەو دەگوترێ: چۆن ئایینی ئیسلام توانی بوغزو کینە لە دڵی پەیڕەوکارانی خۆی دەرهاوێژێ؟

لەوەڵامدا دەگوترێ: ئایینی ئیسلام گەیشتە ئەو پلەیەو توانی ئەوکارە ئەنجام بدا بە شێوەیەك کە تا ئەم نزیکانە کەس پەی پێ نەبردوە، واتە تا ئەوکاتەی کە زانا دەرونناسەکان هەستیان بە نهێنییەکانی نەفس نەکردو رونیان نەکردەوە کە نەفسی ئادەمیزاد هەریەکە بۆچونێکی تایبەتی هەیەو شتێکی بەلاوە باشە، مانای ئەم ئایەتەی قورئان باش نەدەزانراو خەڵکی لێی حاڵی نەدەبوو کە دەفەرموێ:

{وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلاَ يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ، إِلاَّ مَن رَّحِمَ رَبُّكَ وَلِذَلِكَ خَلَقَهُمْ - سورة هود – ١١٨ – ١١٩}.

واتە ئەگەر خودا بیویستایە هەموو ئادەمیزادی دەخستنە سەر یەك ڕێگای تایبەتیو هەموویانی لەسەریەك ئایین كۆ دەكردەوەو دەیكردن بە گەلو نەتەوەیەكی یەك هەڵوێستو یەك ئایین: كە ئەویش ئایینی ئیسلامە! بەڵام ئەوەتا ئیرادەو ویستی خوداوانە بووە، ئادەمیزاد جیاوازییان هەیە لە بیرو باوەڕدا هەندێكیان لەسەر ڕێگای حەقو ڕاستینو هەندێكیا لەسەر ڕێگای چەوتو چەوێڵن! پەروەردگار وای دروستكردون، ویستویەتی ئاوابن!

لە شوێنێكی تردا پەروەردگار ڕو بەڕوی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ:

{وَمَا أَكْثَرُ النَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ - سورة يوسف – ١٠٣}.

واتە: ئەی موحەممەد! ئەی پێغەمبەری دڵسۆز بۆ پەخشی ئایینی خودا! گەرچی تۆ زۆر بە پەرۆشی ئەو خەڵكەیتو دەتەوێ موسوڵمان ببن، بەڵام زوربەی ئەو خەڵكە نابن بە موسوڵمان!! هەر لەسەر گومڕایی خۆیان دەمێننەوە... جا لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئایەتانەدا موسوڵمانانی خواناسو ڕاستەقینە ئەوەیان زانیوە كە ئەركی سەرشانیانە كە لەگەڵ گرۆهە نا موسوڵمانەكاندا هێدیو هێمن بنو بوغزو كینەیان دەربارە نەنوێننو نەیانچەوسێننەوە چونكە ئەم بیرو باوەڕ جوداییە ئیرادەی خودایەو سوننەتی خۆیەتی لە كەوندا.

## ئازادیی لەبیرو باوڕەدا = سەربەستی ئایینی (الحرية الدينية):

وەكوو دەبینرێ – لەوەپێشیش وابووە – زوربەی لێپرسراوە ئایینیەكان فەرمان دەكەن بە پەیڕەوكارانی خۆیان كە هەموو چەكێك بەكاربێنن بۆ ئەوەی خەڵكی وا لێ بكەن بێنە سەر بیرو باوەڕیان، تەنانەت ئەگەر لەم ڕێگەدا دەیان هەزار كەس لە ناوبچێوماڵوێران بێ بەلایانەوە شتێكی ئاساییە!

کەچی ئێمە کە لە بەرنامەی ئایینی ئیسلام ورده دەبینەوەو سەیری قورئانی پیرۆز دەکەین نابینین لە هیچ شوێنێکدا ئیسلام داوا لە موسوڵمانان بکا کە بەزۆر خەڵکی موسوڵمان بکەن‌و وازیان پێ لە ئایینی خۆیان بێنن‌و دەستیان پێ لە بیرو باوەڕی خۆیان هەڵبگرن! ئەوەتا راستەوخۆ قورئان دەفەرموێ:

{لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ - سورة البقرة – ٢٥٦}.

واتە: ئایین بە زۆرەملێ نابێ، بە زۆر نابێ، لەگەڵ ئەوەشدا رێبازی هەق‌و ناهەق وەدەرکەوتوون خۆشبەخت رێگەی راست دەگرێ‌و نەگبەتیش رێگەی چەوت! کەواتە هیچ کەس بۆی نییە بە زۆرە ملێ یەکێکی تر بخاتە سەر رێبازێ کە خۆی دەیەوێ، هەر کەسە با بۆ خۆی بیربکاتەوە چ بیرو باوەڕێکی پێ خۆشە با پەیڕەوی بکا. لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ:

{وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لآمَنَ مَن فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ - سورة يونس – ٩٩}.

واتە: ئەگەر خودا لە ئەزەلدا ویست‌و خواستی لەسەر ئەوە بوایە کە هەموو کەسێ موسوڵمان ببێ، ئەوا هەموویان وەك یەك موسوڵمان دەبوون‌و کەس کافر نەدەبوو، دەی کە حاڵەکە وایەو خواستی خودا وایە هەندێ موسوڵمان بن‌و هەندێ نا موسوڵمان بن: ئیتر تۆ چۆن بەزۆر دەتەوێ ئەو خەڵکە هەموو ببن بە موسوڵمان!؟

لە مێژووی ئیسلامیشدا دەبینین موسوڵمانانی راستەقینە بە گوێرەی ئامۆژگاری ئەم ئایەتە پەیڕەوییان لەگەڵ باوەڕدارانی ئایینەکانی تردا کردوە، هەرگیز زەختیان لەکەس نەکردوە: بۆ موسوڵمان بوون، هەروڵاتێکیان فەتح کردبێ رێگەیان داوە دانیشتوانی ئەو وڵاتە لەسەر ئایینی خۆیان بمێننەوە بە مەرجێك سەرانە بدەن، هەر کەسێك سەرانەی دابێ هێشتۆیانە لەسەر بیرو باوەڕی خۆی بەردەوام بێ‌و پارێزگاریشیان کردوە، نەیان هێشتووە کەس دەستدرێژی بکاتە سەر باوەڕیان‌و کەنیشتەو پەرستگاو داب‌و نەریتی ئایینیان

بەرێزەوە سەیرکراوە، باشترین بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەو وەعدو پەیمانانەیە کە حەزرەتی عومەر (رەزای خوای لێبێ) بۆ دانیشتوانی شاری قودسی چەسپاندو بۆی مۆر کردن! ئەوەتا بە گوێرەی مێژووی باوەڕ پێکراو ئەمن‌و ئاسایش‌و ئازادی دا بە خۆیان ماڵ‌و منداڵیان‌و کەنیشتەو کەلیساو صەومیعەو نەخۆش‌و ساغ‌و باقی گرۆهەکانیان بپارێزن، واتە کەنیشتەی خۆیان بۆ خۆیان لێیان داگیر نەکرێ نەڕۆخێنرێ لە روبەرو بەرزی‌و نزمی زیادو کەم نەکرێتەوە، دەست لە شوێن‌و جێگای صەلیبیان نەدرێ، دەست بۆ ماڵ دارییان نەبرێ، بە زۆر وازیان پێ لە ئایینی خۆیان نەهێندرێ، کەسیان زەرەرمەند نەکرێن نابێ جولەکەیەکیشیان لە ئیلیادا لەگەڵ نیشتەجێ بکرێ. ئەم سەربەستییە کە لەژێر سایەی ئیسلامدا بۆ نا موسوڵمانان دەستەبەر دەکرێ بۆ موسوڵمانەکان خۆیان دەستەبەر ناکرێ! بۆ نموونە ئایینی ئیسلام مەی یاساغ کردوە هەر موسوڵمانێك بیخواتەوە سزا دەدرێ، کەچی بۆ نا موسوڵمانەکان رێگای داوە.. خواردنی گۆشتی بەرازی لە موسوڵمانان حەرام کردوە بۆ نا موسوڵمانان روخسەتی خواردنی داوە بە مەرجێك ئایینی خۆیان مەنعی نەکردبێ!! تەنانەت ئایینی ئیسلام بە مەبەستی پاراستنی ئازادی نا موسوڵمانەکان زیادەڕەوی گەیشتۆتە پلەیەك ئەگەر موسوڵمانێك گۆزە مەی یان شوشە مەی نا موسوڵمانێکی (زمی) رژاند یان بەرازێکی ئەو کابرایەی کوشت پێویستی سەرشانی ئەو موسوڵمانەیە کە قەرەبووی ئەو خەسارەتە بۆ کابرای (ذمی) پڕ بکاتەوەو بۆی ببژێرێ! هەر لە ئاکام‌و بەرو بوومی ئەو سەربەستییە ئایینیەیە ئایینی ئیسلام داب‌و نەریتی موناقەشەو دان‌و سانی نێوان موسوڵمانان‌و جولەکەو گاورەکانی دەستنیشان کردوەو فەرمانی بە موسوڵمانان کردوە کە لەکاتی موناقەشەو وتو وێژدا گوفتارو رەفتاری جوان بەکار بێنن‌و عەقڵ‌و مەنطیق بکەنە پێوەرو هەموو کاتێ مەبەست دەرخستنی ڕاستی بێ.

{وَلَا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ وَقُولُوا آمَنَّا بِالَّذِي أُنزِلَ إِلَيْنَا وَأُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمْ وَاحِدٌ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ - سورة العنكبوت - ٤٦}.

یان دەفەرموێ:

{ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم-سورة النحل- ١٢٥}.

لە شوێنێکی تردا پەروەردگار بە دوو ئایەت نەخشەی چۆنیەتی هەڵس و کەوتی موسوڵمانان لەگەڵ ناموسوڵمانانندا دیاری دەکاو دەفەرموێ:

{لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ، إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ - سورة الممتحنة -٨-٩}.

ئەوەتا لەم دوو ئایەتەدا یەزدان فەرمان بە موسوڵمانان دەکا کە موعامەلەو هەڵس و کەوتیان لەگەڵ ئەوانەی بیرو باوەڕیان جودایە عەدالەت ئامێز بێ و دادپەروەری تێدا بێ، نەك هەر ئەوەندە بەڵکوو موسوڵمانانی بەوە راسپاردە کردوە کە چاکە لەگەڵ یەکتری بکەن، ئاشکراشە چاکە کردن لە دادپەروەری زیاتر مرۆڤ دۆستی تێدایە چونکە لە رووی خۆشەویستی و سۆزەوە پەیدا دەبێ و لەکانی خێرەوە هەڵدەقوڵێ بەڵام ئەوانەی کە موسوڵمانانیان چەوساندۆتەوەو لە خاك و زێدی خۆیان دەریان کردون هەرگیز نابێ چاکەیان لەگەڵدا بکری! چونکە ئەوانە زاڵم و ستەمکارن زاڵم و ستەمکاریش دەبێ سزا بدرێن، ئەمەش خۆی لەخۆیدا دادپەروەرییە... لەلایەکی ترەوە دەبینین ئاینی ئیسلام هەمیشە دەیەوێ ئاشتی و نێوان رێکی ناو کۆمەڵ بەرپا ببێ تای تەرازووی قورسی ببێ، ئەوەتا قورئان دەفەرموێ:

{عَسَى اللَّهُ أَن يَجْعَلَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ الَّذِينَ عَادَيْتُم مِّنْهُم مَّوَدَّةً وَاللَّهُ قَدِيرٌ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ - سورة الممتحنة – ٧}.

بەڵگەیەکی تر کە ڕەفتار جوانی موسوڵمانان لەگەڵ نا موسوڵمانان دەچەسپێنێ ئەو بە یەك چاو تەماشاکردنەی قورئانە دەربارەی باوك و دایکی ناموسوڵمان لەبارەی چاکە کردن لە گەڵیاندا ئەوەتا دەفەرموێ:

{وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ، وَإِن جَاهَدَاكَ عَلى أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا - سورة لقمان – ١٤-١٥}.

واتە: ئامۆژگاری ئادەمیزادمان کردوە دەربارەی باوكو دایكی كە بۆیان چاك بێو گەردنكەچی فەرمانیان بێ، بە تایبەتی دایكی كە ئەوماوە دیاریكراوە بە پێستی سك هەڵیگرتووە، ئەمجار ماوەیی بەلێبوردوویی بەخێوی كردوە، بۆیە ئامۆژگاری ئینسانمان كردوە بەوە كە سوپاسی پەروەردگاری خۆی بكاو سەری بەندایەتی بۆ بخاتە سەر زەوی، ئەمجار رێزی باوكو دایكی خۆی بگرێو لە گەڵیان چاك بێ، دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزاد! ئاگاداربە هەر بۆ لای خودای خۆت دەگەڕێیەوە ئەگەر ئامۆژگاییەكانی جێبەجێ نەكەی سزا دەدرێی، خۆ ئەگەر دایكو باوكت هەوڵیان لەگەڵ دای كە هاوەڵ بۆ خودا بەڕەوا بزانیتو كەسێك بكەی بە شەریكی خودا كە هیچ زانیارییەكت دەربارەی نییەو خودایەتی لێ ناوەشێتەوە – جگە لە خوداش بزانە كەس حەقی خودایەتی نییە – ئەوكاتە بە قسەیان مەكەو فەرمانەكەیان پاش گوێ بخە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا رفتارت لەگەڵیاندا باش بێو چاكەیان لەگەڵدا بكە. هەر لەروانگەی گیانی چاوپۆشیو لێ بوردەیی لە ئیسلامدا دەبینین دروستە بۆ موسوڵمان كە خواردەمەنی ئەهلی كیتاب (جولەكەو گاور)و گۆشتی ئاژەڵی سەربڕاویان بخۆن هەر وەكوو بۆیان دروستە ژنیان لێ بخوازن.

{وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ - سورة المائدة – ٥}.

ئاشكراشە نانی یەكتری خواردنو زاواو خەزورایەتی خۆشەویستی دەخاتە نێوانەوە.

لەلایەكی ترەوە ئەو ناموسوڵمانانەی لەناو موسوڵماناندا دەژین پێیان دەفەرموێ: ئەهلی (ذمة)، وشەی (ذمة) واتە: عەهدو پەیمانی خودا، پێغەمبەریش دەفەرموێ:

(من آذى ذميا فأنا خصمه ومن كنت خصمه خصمته يوم القيامة)

واتە: کەسێك ئەزیەتی (ذمی)یەك بدا من دوژمنکاری دەکەم کەسێکیش من دوژمنکاری بکەم ڕۆژی ڕەستاخیزیش دەوژمنایەتی دەکەم!

## ئەو هۆکارانەی کە دەبنە لەمپەڕی نەهێشتنی شووکردنی ئافرەتی موسوڵمان بە ناموسوڵمان:

یەکێك لە لێکۆڵەرەوە ئەمریکییەکان پرسیاری لە مامۆستا شێخ موحەممەدی شاڵ کردو وتی: ئەگەر راستە ئایینی ئیسلام چاوپۆشیو لێبوردویی تێدایە؟! ئەدی بۆچی ڕێگا نادا ئافرەتی موسوڵمان شوو بکا بە پیاوی ناموسوڵمان؟ لەوەڵامدا فەرمووی: بێگومان ژیانی ژنو مێردایەتی ژیانێکە هاوبەشیو هاریکارییە لە نێوان ژنو مێردا لە هەموو رویەکەوە، ئەم ژیانەهاوبەشییە دانامەزرێو رێك ناخرێو رێكو پێك نابێ ئەگەر لەسەر بناخەی خۆشەویستی نێوان ژنو مێردەکەو رێزگرتنی هەریەکەیان بۆ ئەوی تریان سەرچاوە هەڵنەگرێ! لایەنێکیش لەو لایانانەی کە ئیسلام گرنگی پێداوە لایەنی ئایینیە.

جا لە کاتێکدا کە ئیسلام رێگەی داوە پیاوی موسوڵمان ئافرەتی جولەکە یان مەسیحی بخوازێو بیکاتە هاوسەری خۆی هەموو مافێکی ئەو ژنە ناموسوڵمانەشی پاراستووە، چی بۆ ژنی موسوڵمان هەیە بۆ ژنی نا موسوڵمانیشی رەچاو کردوە، تەنیا لە مەوزوعی میراتدا نەبێ کە نە پیاوەکە میرات لە هاوسەرە ناموسوڵمانەکەی دەبا نە ژنە ناموسوڵمانەکەش میرات لە پیاوە موسوڵمانەکە دەگرێ! تەنانەت لەم حوکمەشدا دادپەروەرانە رفتاری کردوە چونکە هەردووکیانی لە میراتی یەکتری بێ بەش کردوە؟! بە پێچەوانەی ئایینی جولەکەوە کە لە شەرعی ئەوانەدا ئەگەر جولەکەیەك ژنێکی نا جوولەکەی مارە کرد ئەگەر ژنەکە مرد پیاوەکە میراتی لێ دەگرێ، بەڵام ئەگەر پیاوەکە مرد ژنەکەی میراتی لێ ناگرێ!؟

هــەروەکوو چــۆن ئیــسلام داوایکــردوە لــە پیــاوی موســوڵمان ئەگــەر ژنــی ناموسوڵمانی هێنـا رێـزی بگـرێو رێـزی ئایینەکەشـی بگـرێ، رێگـای بـدا بـچێ بـۆ کەنیشتەو عیبادەتگای تایبەتی خۆیو رێگەو رەسمی ئایینی خۆی جێ بەجێ بکا!!

ئەمەش شتێکی سەیر نییە لە ئایینی ئیسلامدا چونکە هـەر کەسـێك بـڕوای بە ئیـسلام ببـێ بـڕوای بەراسـتو دورسـتی حـەزرەتی عیساو ئایینەکەشـی هەیـە، هەروەکوو چۆن بڕواشی بە حەزرەتی موساو ئایینەکەی هەیـە! ئـیتر لـەم رووەوە تـرسو بیمێـك لەسـەر ژیـانی ژنو مێردایـەتی هەسـت پـێ نـاکرێو زەرەرو زیـان بەدی ناکرێ.

بـەڵام ئەگـەر ئـافرەتی موسـوڵمان شـوو بکـا بـە کابرایـەکی مەسـیحی یـان جوولەکـە بێگومـان ژیـانی ژنو مێردایـەتی ئاسـاییو خۆشـبەختی رەچـاو نـاکرێ چونکە ئەو ئافرەتە شوی بە کەشێك کردوە دژایەتی دەکاو باوەڕی بـە ئایینەکـەی نییە، ئەو تێـڕوانینو لێبوردنـەی لای مێـردی موسـوڵمان دەربـارەی هاوسـەری کـە ناموسـوڵمان بـێ هەیـەتی مێـردی نـا موسـوڵمان دەربـارەی هاوسـەری موسـوڵمان نیەتی، کابرای نا موسوڵمان لە روانگەی ئەوەوە سەیری ئـایینی ژنەکـەی دەکـا کـە راستی تێدا نیەو بەتاڵە، ئـەم تێڕوانینەشـی دەبێتـە هـۆی ئـەوە کـە مێردەکـە بـە چاوی سووك سەیری خێزانی بکاو گاڵتە بە ئایینی بکا! دەی کـەوابێ چـۆن ژیـانی هاوسـەری راوەسـتاو دەبـێو چـۆن لـە تـەك ئـەم دژایەتیکردنـەدا خـانووی ژنو مێردایەتی بینا دەکرێ؟ چۆن دەتوانن خێزانی بەختەوەر پێکەوە بنین؟!

## قەڵاچۆکردنی دەمارگیری (محاربة التعصب):

ئایینی ئیسلام ئەو شكو گومانانەی قەڵاچۆکردوە کە عەقڵو هەستی هەموو پەیڕەوکارانی ئایینەکانی تری داپۆشیوەو بوونە هۆی پەیدابوونی دەمارگیرییـەکی خـراپو نـاڕەوای وەهـا کـە لافـی ئـەومیان لێـداوە کـە هـەر خۆیـان گـەلو هـۆزی هەڵبـژێراوی خـودانو بەهەشـت تایبـەتی ئەوانـەو کەسـی تـر مـافی چـوونە نـاو بەهەشتی نییە:

{وَقَالَتِ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى نَحْنُ أَبْنَاء اللّهِ وَأَحِبَّاؤُهُ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ يَغْفِرُ لِمَن يَشَاء وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاء وَلِلّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ - سورة المائدة – ١٨}.

واتە: جولەکەو فەلەکان دەیانگوت: ئێمە کوڕی خوداین‌و خۆشی دەوێین‌و رێزمان لێ دەگرێ. ئەی رەهبەر پێیان بڵێ: ئەگەر راست دەکەن ئەدی بۆچی لەسەر گوناه سزاتان دەدا؟! چونکە ئەگەر ئێوە کوڕی خودابن! دیارە کوڕ لە توخمی باوکیەتی شتێکی لێ رونادا کە بۆ باوکی نەشیاو بێ، خۆ ئەگەر خۆشەویستی خودابن‌و خودا خۆشی بوێن خۆشەویست سزا نادرێ!! دەی ئێوە بە ئیعترافی خۆتان لەسەر تاوان سزا دەدرێن، کەوابوو ئێوە گرۆهێکن لەو کۆمەڵە ئادەمیزادە لە هەندێکتان خۆش دەبێ‌و هەندێکتان سزا دەدا، دەسەلاتی تەواوی هەموو بوونەوەر: ئاسمان‌و زەوی هەربەدەست ئەوەو گەڕانەوەی هەموو شتێکیش هەر بۆ لای خۆیەتی. لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ:

{وَقَالُواْ لَن يَدْخُلَ الْجَنَّةَ إِلاَّ مَن كَانَ هُوداً أَوْ نَصَارَى تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ قُلْ هَاتُواْ بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ، بَلَى مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُ أَجْرُهُ عِندَ رَبِّهِ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ - سورة البقرة – ١١١-١١٢}.

واتە: دەیانگوت: کەسێك جوو یان گاور نەبێ ناچێتە بەهەشتەوە! ئەوە شتێکە هیواو ئارەزۆی خۆیانەو وادەزانن ئەوان چییان پێ خۆشبێ خودا وادەکا! ئەی رەهبەر! پێیان بڵێ ئەگەر راست دەکەن دە بەڵگەتان بێنن!!

دیارە بەڵگەشیان دەست ناکەوێ! ئەمجار پێیان بڵێ: کەسێك دەچێتە بەهەشتەوە گەردنکەچی فەرمانی خودابێ، لە خوداپەرستیدا راستاڵ بێ‌و کردەوەی چاك بکا ئەوە پاداشی لای خودای خۆیەتی‌و هیچ ترس‌و بیمێکی سزادانیان نیەو رۆژی رەستاخیز خەفەتبار نابن!! لەلایەکی ترەوە قورئان ئیعلانی ئەوەی کردوە کە ئادەمیزاد – بەبێ لەبەرچاوگرتنی رەنگ‌و رەوخسارو زمان – هەموویان رێزی تایبەتییان هەیە، ئەوەتا دەفەرموێ:

{وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً - سورة الإسراء – ٧٠}.

کەوابوو بە گوێرەی ئەم ئایەتە هیچ گەلو هۆزێك نییە – لەبەر خاتری ئەوەی لەو رەچەڵەکەیە یان لەو هۆزەیە – هەڵبژێراوی خودابێ! واتە: ئەو وتەیەی جولەکە دەڵێن: ئێمە (شعب الله المختار)ین قسەیەکی پڕو پووچەو بنەمایەکی نییە، بەڵکوو ئادەمیزاد لە بنەڕەتا هەمووی رێزی هەیەو هەتا لە رێگەی سروشتی خۆی لانەدا ئەو رێزەی لێ نا سەندرێتەوە!

## هەڵس و کەوتی موسوڵمانان لەگەڵ ناموسوڵمانان:

پێغەمبەری خۆشەویستمان (دروودی خودای لەسەربێ) لەم بارەوە باشترین رێچکەی بۆ کێشاوین و سەرمەشقی بۆ داداوین بۆیە دەتوانین رەفتاری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەگەڵ خاوەن ئایینەکانی تردا بکەین بە سەرمەشق و پەیڕەوی بکەین، ئەوەتا دەگێڕنەوە دەڵێن: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئامادەی کۆڕو داوەتیان بووە نان و خواردەمەنی لە ماڵیاندا خواردووە، ئامادەی بەرێکردنی تەرمی مردویان بووە، دیدەنی نەخۆشیانی کردوە هاموشۆی ماڵیانی کردوەو رێزی لێ گرتوون! تەنانەت کاتێ وەفدی فەلەکانی نەجران هاتن بۆ لای عەباکەی خۆی بۆ داخستن و داوای لێکردن لە سەری دابنیشن..

هەروەها مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە کە چەند جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پارەو پوولی لێ قەرز کردوون و کەل و پەلی بە بارمتە لا داناون، تەنانەت کاتێ لە دونیا دەرچوو (زرێ)کەی بارمتە بوو لای چەند جوولەکەیەکی مەدینە لەبری قەرزێ کە دابویانێ، دوایی موسوڵمانان قەرزەکەیان بۆ دایەوەو (زری)گەی پێغەمبەریان وەرگرتەوە!! جاوەنەبێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەمەی بۆیە کردبێ موسوڵمانان پارەیان نەبووبێ بیدەنێ! نەخەیر ئەو کاتە موسوڵمان پیاوی دەوڵەمەندیان زۆر بووەو ئامادەش بوون سەرو ماڵیان قوربانی پێغەمبەر بکەن

بەڵكوو ئەو كە ئەم كارانەی دەكرد مەبەستی رێنمویی موسوڵمانان بوو، مەبەست فێركردنو ئامۆژگارییان بوو..!

بێگومان دوای لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەریش موسوڵمانان ئەو رێبازەیان پەیڕەو كردو هەڵسو كەوتی ئەویان كرد بە سەرمەشقو لەگەڵ خاوەن دینەكانی تردا زۆر بە نەرمو نیانیو خۆشەویستی جوڵاونەوە، لە زۆر شوێنو جێگادا موسوڵمانو فەلەو جولەكە جیرانی یەكتریی بوون هامۆشۆی یەكتریان كردوە لە خۆشیو ناخۆشیدا هاو دەنگو هاوەڵی یەكتری بوون، تەنها لە مزگەوتو كەنیشتەدا لێك جودابوونەوە. دەگێڕنەوە كە پیاوێكی عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس مەڕێكی سەربڕی، حەزرەتی عەبدوڵڵا پێی گوت: كوڕم! ئاگات لە دراوسێ جووەكەمان بێ، چەند جارێك عەبدوڵڵا ئەم ئامۆژگارییەی ئاراستەی پیاوەكە كردوە تاوای لێهات پیاوەكە گوتی فەرمانت بە جێیە پێویست ناكا ئەوەندە دوبارەی بكەیەوە! عەبدوڵڵا فەرمووی: پێغەمبەر (د.خ) ئەوەندە ئامۆژگاری كردین دەربارەی دراوسێ هەتا خەیاڵمان بۆ ئەوە چوو كە دراوسێ میرات لە دراوسێ بگرێ!! دەی بە گوێرەی ئەم دەقە عەبدوڵڵای كوڕی عەباس دراوسێی كابرایەكی جوولەكە بووە، زۆر گرنگی داوە بەوەی كە دیاری بۆ بنێرێ وەكوو جیرانەكانی تری رێزی لێ بگرێ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ كە ئایینی ئیسلام جوداوازی لە نێوان موسوڵمانو نا موسوڵماندا دەربارەی هەڵسو كەوتی ئاسایی نێوان كۆمەڵگا ناكا..! روداوێكی مێژویی تر كە ئەندازەی هەست بە بەرپرسیاری جێ نشینەكانی پێغەمبەرمان بەرامبەر بە ئازادی ئایینی بۆ دەردەخا: ئەو هەڵوێستە ژیرانەی ئیمامی عومەرە (خوای لێ رازی بێ) كە لە كاتێكا لە قودس بوو چوبووە ناو كەنیشتەی قییامە (كنيسة القيامة)[1] كاتی نوێژ هات، حەزرەتی

[1] كەنیسەی قییامە كەنیسەیەكە لە شاری قودس بەسەر ئارامگای حەزرەتی عیساوە بنیات نراوە دەڵێین شوێنی ئەم كەنیسەیە قدیسە هیلانە دۆزیوتیەوەو دیاری كردوە، جا هەر چەندە

عومەر لەناو کەنیشتەکە نوێژی نەکرد نەبادا دوایی موسوڵمانان ئەو کەنیشتەیە داگیر بکەن‌و بیکەنە مزگەوت‌و بەمەش زوڵم‌و ستەم لە مەسیحییەکان بکەن‌و شعووریان بریندار بکەن.

هەروەکوو دەگێڕنەوە کە حەزرەتی عومەر چووە ناو قودسەوەو پەیمانی لەگەڵ دانیشتوانەکانیدا بەست پەیکەرێکی بەدی کرد کە لەژێر گڵ دابوو دوایی بۆی دەرکەوت کە ئەوپەیکەرە هی جولەکەیەکەو کاتی خۆی رۆمەکان ژێر خاکیان کردوە، ئیتر ئیمامی عومەر بەچاکی کەواکەی دەستی کرد بە پاککردنەوەو سڕینەوەی پەیکەرەکە هاوەڵەکانیشی چاویان لە ئەو کردو زۆری پێ نەچوو بە تەواوی مەعالیمی پەیکەرەکەیان بەدیار خستەوە!

لەلایەکی ترەوە مێژووی موسوڵمانان ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە شەریعەتی ئیسلام رێگادەدا بە نا موسوڵمانان کە مافی خۆیان لە ماقوڵترین‌و بەرزترین فەردی موسوڵمان وەربگرنەوە، ئەوەتا مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە کە جوولەکەیەك شکاتی لای ئیمامی عومەر لە حەزرەتی عەلی کرد (خوای لێ ڕازی بێ) کە ئیمامی عەلی‌و کابرای جوولەکە حازر بوون لەبەردەم حەزمتی عومەردا ئیمامی عەلی نەچووە شوێنی تایبەت بە تاوانبار کراوان بۆیە حەزرەتی عومەر رویکردە عەلی‌و فەرمووی: باوکی (حسن) هەستە بڕۆ تەنیشت کابرای شکات لێکەرت راوستە بە تەنیشت یەکەوە بەرامبەرم بوەستن ئیمامی عەلی خێرا فەرمانی حەزرەتی عومەری بەجێهێنا، بەڵام دیاردەی ناڕازی‌و پێ ناخۆشبوونی لە روخساری دیارکەوت کە مەحکەمەکە تەواو بوو حەزرەتی عومەر روی کردە ئیمامی عەلی‌و پێی گوت: بۆچی کە پێم گوتی باوکی حەسەن پچۆرە تەنیشت کابرای شکات لێکەرت رووت گرژ بوو پێت ناخۆش بوو بچیە تەنیشت کابرای جولەکەوە؟؟ حەزرەتی عەلی وتی نەخەیر! قوربان ئەوەم پێ ناخۆش بوو کە تۆ

ئەم کەنیشتەیە لەژێرچاو دێری ئەو مەسیحییانەدایە کە سەر بە رێبازی (الارثوردکس)ن بەڵام هەموو کۆمەڵ‌و تایفە مەسیحیەکانی تر بەشیان لەم کەنیشتەیەدا هەیە.

بەیەکسانی سەیرت نەکردین‌و بەمنت گوت: باوکی حەسەن.. مەبەستی ئەوە بوو وشەی باوکی حەسەن کونیەو ڕێز دەگەیەنێ.

جارێکی تر لە سەردەمی حەزرەتی عورمەدا کوڕێکی عەمری کوڕی عاص لە میسر لە گەنجێکی قیبتی دا گەنجە قیبتییەکە سوێندی خوارد وتی دەبێ لای خەلیفەی موسوڵمانان – حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب – شکاتت لێ بکەم! کوڕەکەی عەمر پێی گوت: منەتت نەبێ شکاتیش بکەی هیچ کارم تێ ناکا من کوڕی گەورە پیاوانم کوڕی عەمری کوڕی عاصم! ڕۆژان هاتن‌و ڕۆییشتن کاتی حەج هات خەلیفە عومەر لەگەڵ کۆمەڵێك لە یارانیدا سەرگەرمی ئەنجامدانی کارو باری حەج بوون، عەمری کوڕی عاص‌و کوڕەکەشی لەگەڵ دا بوون، کابرای قیبتی هات‌و چووە لای عومەرو ڕوداوەکەی بۆ گێڕایەوەو وتی: قوربان! ئەم کوڕە بەناحەق لێی دام‌و وتیشی من کوڕی عەمری کوڕی عاصم‌و کەس ناتوانێ دەست بەردەستم بێنێ! حەزرەتی عومەر ڕوی کردە عەمری کوڕی عاص‌و پێی گوت: ئەم ئادەمیزادانە کە بە ئازادی لە دایکبوون ئێوە چۆن دەیانکەن بە کۆیلەو زوڵم‌و ستەمیان لێ دەکەن! ئەمجار ڕوی کردە کابرای قیبتی‌و قەمچییەکەی خۆی دایەو پێی گوت: هەستە چۆنی لێ داوی تۆش ئاوا لە کوڕی گەورە پیاوان بدەرەوە!!؟

بەڵێ بەم شێوە موسوڵمانان پەروەردەبوون ڕێبازی ڕاستەقینەی ئیسلامییان گرتبوو، ئایین هەموو هەستی داگرتبوون بەموو لێیان لانەدەدا، لە مێژوودا شتێکی وایان لێوەباس نەکراوە کە لەگەڵ نا موسوڵمانان دا دەربارەی ئازادی ئایینی شایانی ڕەخنەلێ گرتن بێ! بەڵکوو مێژوو پڕیەتی لە باسی جوامێری‌و چاکەو لێبوردویی موسوڵمانان لەگەڵ هەموو ئەوانەی کە لەبیرو باوەڕدا لەگەڵیان نەبوون.

کاتێکیش زانست‌و زانیاری لەناویان بڵاو بووەوە نووسەرو لێکۆڵەرەوەیان تێدا هەڵکەوتن‌و کتێب‌و نووسراویان لەسەر یەك هەڵچنین‌و کتێبخانەیان پێك

هێنان، خۆیان لەخۆ نەگۆڕا هەر لەسەر یاسا ئاساییەکەمانەوە، بەڵکوو زیاتر رێزی زانا ئایینییەکانی تریان گرتووە بەخشش و دیاری زیاتریان داونێ، هەر کەسێ بیەوێ لەم بارەوە زیاتر ئاگاداربێ دەتوانێ سەیری کتێبی چەند بەرگی (الاغاني) هی ئەبولفەرەجی ئەصفەهانی بکا.

زانا موسوڵمانەکانی پێشوو (الفقهاء الأولون) لە هیچ بوارێکدا مافی ئەو نا موسوڵمانانەی کە لەناو وڵاتی ئیسلامدا دەژین و پێیان دەگوترێ ئەهلی ذیممە فەرامۆش نەکردوە، بەڵکوو لە کتێبەکانیاندا پێیان لەسەر ئەوە داگرتووە کە رەفتارمان لەگەڵیاندا باش بێ پارێزگارییان بکەین. شێخی قەرافی[1] کە یەکێکە لە زانا شەرع زانەکانی ئیسلام لە کتێبی بەناوبانگی خۆی (الفروق) دەفەرموێ: پەیمان (ذمە) پەیمان بەستن لەگەڵ ناموسوڵماناندا چەند مافێکی ئەوان دەخاتە سەرشانی ئێمەی موسوڵمان چونکە ئەوان بەهۆی ئەم پەیمانەوە دەبنە دراوسێی راستە قینەمان و دەکەونە ژێر چاوەدێری ئێمەو بە ناوی خوداو پێغەمبەرو ئایینی ئیسلام پاراستنیان دەکەوێتە ئەستۆمان. هەر کەسێك دەستدرێژییان بکاتە سەر تەنانەت بابە قسەیەکی ناخۆش یان پاشملە باسکردنیان بێ ئەوە عەهدو پەیمانی خۆی لەگەڵ خوداو پێغەمبەرو ئایینی ئیسلامدا شکاندووە.

مامۆستای پایە بەرزی ئیسلام و شەرعزانی کەم وێنە (ابن حزم الاندلسي) لە کتێبی (مراتب الاجماع)دا دەڵێ: ئەگەر هات و کۆمەڵێك ناموسوڵمان ببوونە ئەهلی (ذمة)و لەناو وڵاتی ئێمەدا ژیانیان بەسەربرد کۆمەڵێك ناموسوڵمان و کافر هاتنە سەریان و دەیانویست دەستدرێژییان بکەنە سەر پێویستە لەسەر موسوڵمانان پارێزگارییان لێ بکەن لە پێناو سەلامەتی ئەواندا دەبێ خۆیان بکەن بە قوربانی، چونکە رێگەدان بەوەی کافرە شەڕەنگێزەکان دەستیان بیانگاتێ و تووشی نارەحەتیان بکەن دەبێتە کەمتەرخەمی لە پەیمانی خودادا!

---

[1] ئەحمەدی کوڕی ئیدریسی کوڕی عبدولرحمن (٦٢٦ – ٦٨٤ ك = ١٢٢٨ – ١٢٨٥م).

## بەشی نۆزدەهەم:

# یاساو فەرمانڕەوایی لە ئیسلامدا (نظام الحكم في الإسلام)

**دانەری یاساو فرمان هەر خودایە – حكوومەتی ئیسلامی تیوقراطی نییە – شورا – یەكسانی – داد پەروەری – فەرمانكردن بە چاكەو نەهی كردن لە خراپە – شەریعەتی ئیسلامی – برێ لەو پایانەی كە شەریعەتی ئیسلامی لەسەر بنیات نراوە – شەریعەتی ئیسلام دادی هەموو كۆمەڵێكی ئادەمیزاد دەداو كەمو كوڕی تێدا نییە – خەلافەت و فەرمانڕەوایی.**

ئاشكرایە هەر خوێنەرێك لەو حوكمە شەرعییانەی قورئانی پیرۆز ورد ببێتەوە، بە دیقەت سەیری یاسای حوكمكردن‌و یاسای تۆڵەو سزاو پاداش، یاسای مامەڵەی دارایی، شێوەی رامیاری ناوخۆو دەرەكی بكا بۆی دەردەكەوێ كە قورئانی پیرۆز تەنها قانوونە سەرەكییەكانی ئەم شتانەو شتەكانی تری دەستنیشان كردوە لق‌و پۆپ لێكردنەوەی حوكمە جیاجیاكان‌و رۆچون‌و قوڵبونەوە بە دوا ئەحكامی جوزئیدا – بە تایبەتی ئەو حوكمانەی كە كۆمەڵانی ئادەمیزاد بە گوێرەی كات‌و سات‌و شوێن، راوو بۆچوونیان دەربارەیان جیاواز دەبێ! لێیان بێ دەنگ بووە، بەڵكوو هەر قاعیدە سەرەكی‌و بناخە گشتییەكانی بەكورتی هێناوە ئەو قاعیدانەی هێناوە كە بە گوێرەی كات‌و شوێن جیاوازییان تێ ناكەوێ! بۆ نموونە لە یاسای حومكردندا قورئانی پیرۆز شێوازێكی تایبەتی بۆ چونیەتی حكومەتی ئیسلامی دانەناوە، شێوەی چۆنیەتی ئیدارەو ریكخستنی هێڵە گشتییەكانی دیاریكردووە كە یاساكەی لەسەر دەنەخشێنێ!!

هۆیەكەشی ئەوەیە كە بەرژەوەندی كۆمەڵانی ئادەمیزاد بە گوێرەی دەورو كات‌و شوێن دەگۆڕێن، زۆر یاسا بۆ ئەمڕۆ باشە بۆ سبەینێ كەڵكی نییە، بۆ سەردەمێك سود بەخشەو دادپەروەری تێدایە بەڵام بۆ سەردەمێكی تر بێ كەڵك‌و زەرەر ئامێزە، بۆ بەرژەوەندی ئەم كۆمەڵە باشە بەڵام بۆ ئەو كۆمەڵە بێ كەڵكە!! جا ئەگەر بێتوو پەروەردگار بهاتایە لە قورئاندا حوكمی هەموو شتێكی ورد بكردایەتەوە موسوڵمانان دەكەوتنە تەنگ‌و چەڵەمەوە، لەبەر ئەوە حیكمەتی پەروەردگار وای هێناوە كە قورئانی پیرۆز تەنیا حوكمە سەرەكییەكان دیاری بكا، مەبدەئە گشتییەكان دەستنیشان بكا ئەو حوكم‌و مەبدەئانە رونبكاتەوە كە بە

گـوێرەی کـاتو شـوێن نـاگۆڕێن! دەستنیـشانکردنی لـقو پـۆپی ئـەو حـوکمەو مەبدەئانــەی واز لێ هێنــاوە بــۆ ئــەوەی هــەموو گــەلو هۆزێــك بــە گــوێرەی بەرژەوەندی گشتیو تایبەتی خۆی حوکمو شێوەی ڕەفتارکردنی لەو جوزئییانـەدا بە کاربێنێ بە مەرجێك کە لەگەڵ گیانی یاسا گشتییەکەدا بەنەشاز دەرنەچێو لە چوار چێوەی حوکمە سەرەکییەکەی قورئاندا هاتۆ چۆ بکا!

## هەر خودا دانەری حوکمو یاسایە (واضع الحكم هو الله):

بێگومان یەکەم بناغەیەك کە یاسای ئیـسلامی لەسـەر بنیـات نـراوە ئەوەیـە: کە دانەری حوکمو یاسا هەر خودایەو بەس! هیچ ئادەمیزادێك مافی ئەوەی نییـە کــە یاسـایەك دابهێنــێ دژی یاســای خودابــێو لەگــەڵ گیـانی یاسـا خوداییەکـە نەگونجێ!!

بـەڵام ئـەو قەزییـەو روداوانـەی کـە دەقێکـی شـەرعی دەربارەیـان نـەهاتووە، قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێ) باسـیان لێـوە نـەکردوە ئـەوە یاسـا دانان بۆ ئـەوجۆرە شـتانە — بـە فـەرمانی شـەریعەت خـۆی: حەواڵەی تێفکـرینو بۆچونی زانایانی ئایینو فەرمانڕەوایان کراوە ئەوانەی شیاوی یاسا دانـانو حـوکم دەرهێنـانو ئـەهلی ئیجتیهـادن دەتـوانن چارەسـەری ئـەو جـۆرە شـتانە بکـەن بـە مەرجێك لە چوار چێوەی گیانە قورئانییەکەدا بێ!

بەڵگە لەسەر ئەوەی یاسـا دانـان هـەر هـی خودایـەو کەسـی تـر مـافی ئـەوەی نییە حوکم دابنێ ئەم فەموودەیەی قورئانە کە دەفەرموێ:

{إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ - سورة يوسف — ٤٠}.

واتــە: مــافی یاســادانان تــەنها بــۆ خودایــەو کەســی تــر ئــەو مافــەی نییــە، پــەروەردگار فــەرمانی پێکــردوون کــە هــەر عیبــادەتی ئــەو بکــەنو گــوێ رایــەڵی حوکمو یاسای کەسی تر نەبن.. لە شوێنێکی تردا بە پێغەمبەر دەفەرموێ:

{إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَـا أَرَاكَ اللّـهُ - سـورة النساء — ١٠٥}.

واتە: ئەی پێغەمبەر! ئێمە قورئانمان بەسروش بۆ ناردووی – هیچ گومانی تێدا نییە – بۆ ئەوە حوکمڕانی نێوان گرۆهانی ئادەمیزاد بکەی بەو شێوەی کە خودا نیشانی داویو فێری کردوی.

لە ئایەتێکی تردا پەروەردگار داوا لە موسوڵمانان دەکا کە شوێن شەریعەتەکەی بکەونو هەرشتێك کە دژایەتی شەریعەتی خودا بکا وازی لێ بهێننو دەست بەرداری بن. ئەوەتا دەفەرموێ:

{اتَّبِعُواْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ وَلاَ تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِ أَوْلِيَاء قَلِيلاً مَّا تَذَكَّرُونَ - سورة الأعراف – ٣}.

لەم سێ ئایەتەی سورەتی مائیدەدا پەروەردگار زۆر زەقو ئاشکرا دەرچون لە چوار چێوەی دەقە شەرعییەکانی کردوە بە هۆکاری تاوانێکی گەورەو گوێ پێنەدانی بە تاوانی کوفرو زوڵمو فیسق حسێب کردوە ئەوەتا دەفەرموێ:

{وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ -سورة المائدة–٤٤}.

{وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ -سورة المائدة–٤٥}.

{وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ - سورة المائدة–٤٧}

لە ئایەتێکی تردا پەروەردگار سوێند بە زاتی خۆی دەخواو دەفەرموێ: ئێوە موسوڵمان نینو بە موسوڵمان حسێب ناکرێن هەتا واتان لێ نەیە کە حاڵەتێکی وایان تێدا پەیدا ببێ ئەگەر نیزاعو کێشەیان تێکەوت خێرا پەنا بۆ پێغەمبەر بەرنو ئەو بکەن بە دادوەرو چی بۆ دانان هەموو لایەکیان پێی رازی بنو دڵیان پێی ئاو بخواتەوە دەفەرموێ:

{فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا - سورة النساء – ٦٥}.

هەر موسوڵمانێك خۆ بە موسوڵمان بزانێو جگە لە حوکمو قانوونی خودا حوکمی تر هەڵبژێرێو بەلایەوە باش بێ ئەوە موسوڵمانێکی سەر لێ تێکچووەو گومڕایە:

{وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا - سورة الأحزاب – ٣٦}.

له تایبەتمەندی مافی حوکمدانانو یاسادانان (تشریع) بە خوداو بەس، دوو ئاکامی گرنگ سەرهەڵدەدەن.

ئاکامی یەکەم: جێگیربوونی یاسا شەرعییەکانو بەردەوام بوونیانو کارپێکردنیان فەرمانڕەوا بگۆڕێ یان نەگۆڕێ ئەو یاسایانە ثابتنو کارپێکراون. بەڵام لەیاسا دانراوەکانی مەردوم خۆی دا وەها نییە چونکە ئەو یاسادانەرانە کە یاسا دادەنێن بەرژەوەندی بیرو رای خۆیان بەرچاو دەگرنو خزمەتکردنی ئەو رێکخراوو کۆمەڵانەی خۆیانیان مەبەستە، پاراستنی ئەو مەبادیئە کاتیانەی خۆیان بەلاوە گرنگە، بەرژوەندی کۆمەڵانی ترو چینی داهاتوویان بەلاوە مەبەست نییە، کەوابوو هەر چینە بەپێی بەرژەوەندی خۆی یاسا دادەنێو قانوون دەگۆڕێ ئەم دیاردەیەش دەبێتە هۆی ئەوە کە خەڵك سیقەی بەو جۆرە قانوونانە نەمێنێو رێزیشی لێ نەگرن.

ئاکامی دووەم: رێزگرتنی یاسا شەرعییەکانو هەبوونی سیقە پێیان لەو رووەوە کە دەستکردی گردگارنو لە سەرچاوەیەکەوە هەڵقوڵاون کە بەسەر هەموو شتێکدا ئاگادارەو بەرژەوەندی هەموو کەسێکی لە هەموو کاتو زەمانێکدا لە بەرچاو گرتووە، ئەم بڕوایە بۆ خۆی دەبێتە هۆی ئەوە کە رێز لەو جۆرە یاسایە بگیرێ، چونکە پەیڕەوکردنو رێڕەویکردنی ئەو یاسایانە بە خودا پەرستی حسێب دەکرێو بەپێچەوانەوە لادان لەو رێبازە بە سەرپێچیکردنی خودا دەژمێردرێو دەبێتە هۆی سزای دونیاو قیامەت.. قورئانی پیرۆز لەچەند شوێنێکدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە، هەموو شەریعەتو یاسایەکیش لە جیهاندا بەهاورێزی بەئەندازەی کاریگەری لە دەروونی شوێنکەوتووانیدا پێوانە دەکرێ! چەند خەڵك سیقەیان بەو یاسایانە بێو رێزیان لێ بگرن ئەوەندە ئەو شەریعەتە پلەی تەقدیسی زیاد دەبێ.

## حکوومەتی ئیسلامی حکوومەتێکی تیوقراطی نییە[1]:

ئاشکرایە حوکوومەتی ئیسلامی بە گوێرەی شەرعی خودا کارەکانی بەڕێوە دەبا، بەرنامەی ئیسلام کە قورئانی پیرۆزە پەیڕەو دەکا! کەوابوو ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە حکومەتی ئیسلامی لەسەر بنەمایەکی تیوقراطی دامەزرابێ، واتە: حکوومەتێکی ئایینی بێ، چی دەکا ویستی خودایەو لەجێی خۆی دایەتێ! دیارە ئەم فیکرەیە فیکرەیەکی دوور لە بەرنامەی ئیسلامەو شەریعەتی ئیسلام شتی وای تێدا نییە! ئەم حکوومەتە دینییە کە لەسەر بنەمایەکی ئاوەھا دروست بێ، فرمانڕەوا بە ئارەزۆی خۆی قانوون‌و یاسا داتاشێ لەو فیکرە ئایینییە کۆنانەوە سەرچاوە ھەڵدەگرێ کە پیاوە ئایینییەکان‌و فرمانڕەواکان ئیددیعای ئەوەیان دەکرد کە دەسەڵاتیان لە خوداوە پێدراوەو ھەرچی دیکەن ویست‌و ئیرادەی زاتی بێچوونە.

بەڵام حکوومەتی ئیسلامی بریتییە لەو شەریعەت‌و یاساو قانوونەی کە قورئان ھێناویەتی، کە ھەرگیز چەوساندنەوەی تێدا نیەو فەرمانڕەوایی‌و دەسەڵاتی تێدا تایبەت نییە بە کۆمەڵێك‌و بڕێکیش لێی مەحروم بن، بەڵکوو ئەرکی سەرشانی گەلە ھەموویان تێکڕا تەنفیزی بڕگەکانی بکەن‌و ھەموو کەس بەرامبەر ئەو یاسا ئاسمانییە یەکسانەو کەس لە کەس زیاتر نییە مەگەر بە زێدە

---

[1] تیوقراطی: بە ھەموو رێبازێك دەگوترێ کە سوڵتەی سیاسی بگەڕێنێتەوە بۆ سەر بناغەیەکی ئایینی یان غەیبی... تیوقراطی بەسێ شێوە دەخرێتە ڕو:

أ) کە فرمانڕەوا پێی وابێ بۆ خۆی لە توخمی خودایەو لەو تەبیعەت‌و سروشتە کەوتۆتەوە! ئەم تیوورە لە سەردەمە شارستانییە کۆنەکانی ھیندو میصرو چیندا بەربلاوبووە.

ب) ئەو تیوورەی کە دەڵێ: خودا راستەو خۆ خۆی حاکم ھەڵدەبژێرێ.

ج) ئەو تیۆرەی کە دەڵێ: خودا ڕاستەوخۆ فەرمانڕەوا ھەڵدەبژێرێ‌و واتە پەروەردگار روداوو کۆمەڵ وا رام دەکا کە بنەماڵەیەکی تایبەت مافی ئەوەیان ھەبێ فەرمانڕەوایان تێدا ھەڵبکەوێ.

خودا پەرستی! چونکە لە ڕوانگەی قورئانـەوە ئـادەمیزاد لەسـەرزەوی جینێـشینی خودایەو ئەرکی ئاوەدانکردنەوەی زەوی خراوەتە ئەستۆی:

{وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً-سورة البقرة -٣٠}.

هەروەکوو چۆن لە روانگەی قورئانەوە گەلو جەماوەر سەرچاوەی دەسەڵاتو فەرمانڕەواییـە، هـەموو کاتـێ بـەر پرسـیارە بەرامبـەر تـەنفیزکردنی بەرنامـەی قورئان: بۆیە پەروەردگار روو دەکاتـە موسـوڵمانان بـەتێکڕاو فـەرمانیان پـێ دەکا کە حوکمەکانی قورئان تەنفیز بکەن:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى-سورة البقرة/١٧٨}.

یان دەفەرموێ: {وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا ...الخ}ز

پیاوو ئـافرەت ئەگـەر دزییـان کـرد دەسـتیان بـبڕن! دیـارە ئـەم دەسـت بڕینـە چەند مەرجێکی هەیە ئەگەر ئەو مەرجانـە نەیەنـەجێ دەسـتی دز نـابڕدرێ! جا لە کاتێکدا ئەنـدامانی گـەل هـەموویان نـاتوانن ئـەو ئەرکـەی سەرشـانیان ئـەنجام بـدەن، پـەروەردگار فـەرمانی پێکـردوون کـە کەسـانی وا هەڵبـژێرن بتـوانن ئـەو ئەرکە ئەنجام بدەن، پێویستیشە ئـەو هەڵبژاردنـە بەشـێوەی رەزامەنـدیو ئـازادی بێ، فرتو فێڵو تەزویری تێدا بـەکار نـەهێنرێ، ئـەمجار ئـەو کەسـانەی کـە گـەل هـەڵیان دەبـژێرێ بـۆ بـەڕێوەبردنی وڵاتو سـەرۆکایەتی گـەل، دەبـێ ملکەچـی رەقابەی گەل بنو هەڵسو کەوتیان بـۆ بەرژەوەنـدی ئـەوان بـێ، لـە هـەمان کاتـدا ئەرکی سەرشـانی (گـەل)یـشە کـە فەرمانبـەرداری ئـەو سـەرۆکایەتییە بـن چـونکە ناوی ئەوانەی ناوە (أولو الامر)و فەرمانی پێکردوین گەرندکەچی فەرمانیان بین.

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَـإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً - سورة النساء – ٥٩}.

لـەم ئایەتـە پـیرۆزەدا پـەروەردگار فـەرمانی کـردوە بـەوەی ئـادەمیزادانی موسوڵمان گەردنکەچی فەرمانەکانی بنو قورئان بکەن بەڕابەرو بەرنامە، چونکە

قورئان هەموو ئەمرو نەهییەکی یەزدانی لەخۆ گرتووەو سەرچاوەی یەکەمە بۆ تەشریع. لەهەر روداوێکدا ئەو باسی کردبێ دەقەکەی تەنفیز بکرێ هەتا لەمدا رێنومایییمان دەست بکەوێ پەنا بۆ شتی تر نابەین.

ئەمجار فەرمانی کردوە کە گوێ بیسی فەرمانەکانی پێغەمبەر بین چونکە ئەو حەدیسانەی پێغەمبەر حوکمە شەرعییەکانو مەبەستەکانی قورئانمان بۆ رون دەکەنەوە، ئەو مەبەستو حوکمانەی کە لە قورئاندا باسکراون... کەوابوو فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) - کە بەراستی لەوەوە گێڕدرابێتەوە —پلەی دووەمی سەرچاوەی شەریعەتن.

ئەمجار پەروەردگار رێنومایی کردوین بۆ سەرچاوەی سێیەمو فەرمانی پێ کردوین! وەکوو چۆن پەیڕەوی قورئانو حەدیس دەکەین بەو جۆرەیش پەیڕەوی ئەم سەرچاوە سێیەمە بکەین کە ئەویش بە گوێکردنی کۆمەڵی ریش سپیو زاناو لێپرسراوو عاقڵمەندانن کە بە عەرەبی پێیان دەگوترێ: (أهل الحل والعقد) ئەوانەی کە تاکەکانی کۆمەڵ دەچنە لایانو پرسو رایان پێ دەکەن، راوو بۆچونی ئەو کۆمەڵە بەراوو بۆچونی گەل دەژمێردێ.

مامۆستا شێخ (محمد عبده) لە راڤەی (أولي الامر منكم)دا دەفەرموێ: مەبەست بە (أولو الامر) کۆمەڵی کاربەدستانی موسوڵمانن کە بریتین لە فەرمانڕەوایانو کاربەدەستانو زانایانو سەرلەشکرو سەرەك خێڵو دادەوەرانو لێپرسراوانی باڵای وڵات، ئەوانەی کەپرسو رایان پێ دەکرێ لە کارو باری وادا کە بەرژەوەندیی گشتی تێدابێ!! جا ئەم زانایانە هەر کاتێ دەربارەی شتێك رای خۆیان دا، دەبێ جەماوەر بە قسەیان بکاو ملکەچی فەرمانەکەیان بن بە مەرجێك ئەوان موسوڵمانو خودا پەسەند بنو لە کۆمەڵی خۆمان بنو فەرمانەکەیان پێچەوانەی فەرمانی خوداو فەرموودەکانی پێغەمبەر نەبێ، هەروەها بە مەرجێك ئازادو سەربەست بن لە لێکۆڵینەوەو یەکدی گرتنو دەربڕینی رایەکەیاندا، هەروەها دەبێ ئەوکارەی ئیجماعی لەسەر دەکەن شتێك بێ جێگای تێفکرینو لێکۆڵینەوە بێ، کارێك بێ بەرژەوەندی گشتی تێدا رەچاو

بکرێ، شتێك نەبێ دەربارەی عەقیدەو عیبادەت، چونکە ئەوشتانەی پەیوەندییان بە عەقیدەو عیبادەتەوە هەبێ (ئیجماع) یان تێدا بەکار ناهێنرێ.

ئەو زاتانەی کە ئیجماع دەکەن وەکوو ئەنجوومەنێکی بالای گەل وان دڵسۆزی گەل‌و نیشتمانن هەموو دەم بەرژەوەندی گەل پێش چاو دەگرن، رامیاری گەل‌و وڵات لەکاتی ئاشتی‌و شەڕدا رانومایی دەکەن! لەبەر ئەوە هەر کاتێ ئەمانە لەسەر کارێك رایان یەك کەوت پێویستە جەماوەر گەرندکەچی فەرمانەکەیان بن‌و کار بەدەست‌و فەرمانڕەواش جێبەجێی بکەن. ئەگەر سەرپێچی کرد لە کار دەخرێ.

کۆبوونەوەی ئەو زاتانەی – کە قورئان بە (أولی الأمر) ئاماژەی بۆ کردوون لە شەرعدا پێی دەگوترێ: (ئیجماع) ئەمەش سەرچاوەی سێیەمە بۆ شەریعەتی ئیسلام‌و هەر کاتێ بۆ رووداوێك دەقێکی قورئان یان حەدیث نەبوو پەنای بۆ دەبرێ!

هەر کاتێکیش کێشە کەوتە نێوان ئەو زاتانەی کە (ئیجماع) یان لێ پێك دێ پەروەردگار رێگایەکی راست‌و رەوانی بۆ داناون بۆ ئەوەی کۆتایی بە کێشەکەیان بێنن ئەوەیش بە گەڕانەوەیان بۆ یاسا گشتییەکانی ئایین‌و تێفکرین‌و دۆزینەوەی هۆکارەکان‌و تاوو توێکردنی ئەم رووداوە بە روداوێکی ترو پێك گرتنیان بەیەکتری‌و وەرگرتنی حوکمی پێویست دەربارەی لەم بارەوە قورئان دەفەرموێ:

{فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ - سورة النساء – ٥٩}.

رانواندنی کێشە بۆ سەریاسا گشتییەکانی ئایین پێك گرتنی کارەکان بە یەکترو لەلایەن کۆمەڵێك لە لێزان‌و شەرعزان‌و سیاسەتمەدارو پیاو ماقوڵ‌و زانایان، ئەمەش پێی دەگوترێ: (القیاس) ئەمەش کراوەتە سەرچاوەی چوارەم بۆ تەشریع، ئەمەش لە کاروبارێکدا دەبێ کە یاسای چۆنیەتی پەیوەندی تاکەکانی کۆمەڵ بەیەکترەوە دیاری دەکا، بەڵام دەربارەی چۆنیەتی ئەنجامدانی کارە خودا پەرستییەکانی وەکوو نوێژو رۆژوو حەجکردن‌و زەکات دان ئەوە هەموو موجتەهدێك رای وەردەگێرێ‌و هەر موسوڵمانێك دەتوانێ شوێن ئەو موجتەهیدە بکەوێ کە متمانەی بەزانیارییەکەی هەیە.

بەگوێکردنو پەیڕەوکردنی خاوەن دەسەڵات (أولو الأمر) نابێ لە سنووری فەرمانی خوداو پێغەمبەر دەچێ هەر کەسێك بە گوێرەی فەرموودەی قورئانو حەدیسی پێغەمبەر فەرمانی کرد بەگوێکردنی پێویستە کەسێکیش بە پێچەوانەی قورئانو حەدیث فەرمانی کرد بە گوێی ناکرێو قسەی نابیسرێ!! لەم ڕووەمیە کە پێغەمبەر دەفەرموێ: (لا طاعة لأحد في معصية الله انما الطاعة في المعروف).

واتە: بەگوێی هیچ کەس ناکرێ لەسەرپێچیکردنی فەرمانی خودادا، تەنیا لە چوارچێوەی خودا پەرستیو چاکەکاری بە گوێی فەرمانڕەوا دەکرێ.

خوێنەری هێژا لێرە بەولاوە بڕێ لەو کڵو پایانەی کە دەوڵەتی ئیسلامی لەسەر بنیات دەنرێ دەخەینە ڕوو یەکە یەکە شییان دەکەینەوە.

## شوڕا (الشورى):

١- ڕاوێژو شوڕا (الشورى):

خوێنەری هێژا! لەوەپێش وتمان: پەروەردگار بەگوێکردنو گوێڕایەڵی کاربەدەستو لێپرسراوانی بە پێویست داناوە، هەرشتێك ئەم زاتانە پێی ڕازی بونو بەلایانەوە پەسەند بوو بەرژەوەندی کۆمەڵو وڵاتی تێدابوو دەبێ بەقسەیان بکرێ، پەروەردگار بۆ ئەو لێپرسراوو شەرعزانو کاربەدەستانە یاساو نیزامێکی ڕاستو دروستی بۆ داناون بۆ ئەوەی نەکەونە هەڵەوەو وڵات بەرەو هەڵدێرو وێران بوون نەبەن! ئەو یاساو نیزامەش قانوونی (ڕاوێژ) شوڕایەو ڕاوەرگرتنو توێژینەوەو تێفکرینە، ئەمەش ئەمڕۆ بووتە بناغەو پایەیەکی پتەوی سیستەمو نیزامی دیموکراتی!

ڕاوێژو پرسو ڕا یاسایەکە لە یاساکانی شەریعەتی ئیسلامی! هەر لەبەر گرنگیو پیرۆزییە کە لە قورئاندا سوورەتێك ناونراوە سوورەتی (شوڕا) لەو سوورەتەدا پەروەردگار مەدحی ئەو موسوڵمانانە دەکا کە بە مەشۆرەتو ڕاوێژ کاروباری خۆیان ئەنجام دەدەنو دەفەرموێ:

{وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ - سورة الشورى -٣٧}.

ئەوەتا پەروەردگار راوێژو مەشۆرەتکردنی کردۆتە هاوشانی نوێژ کردنو زەکات دان بۆ ئەوەی لە موسوڵمانانی بگەیەنێ کە راوێژکردنو راوەرگرتن لە نێوان کاربەدەستانی موسوڵمانان دا کارێکی گەلێك گرنگو پیرۆزەو بناغەی ئایینی ئیسلامە... ملهوڕیو دیکتاتۆری هەرگیز کاری موسوڵمانان نییە، نابێ ئەمخووە ناشیرینەیان تێدابێ.

لە شوێنێکی تردا روبەری پێغەمبەر دەفەرموێ:

{فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ - سورة آل عمران -١٥٩}.

لێرەدا خودای گەورە فەرمان بە پێغەمبەر دەکا کە لە کاروباری گشتیدا مەشۆرەت بەیارانی بکاو راوو بۆچونیان وەربگرێ. مێژووش بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پێش ئەوەی بچێ بۆ غەزای (ئوحود) راوێژی بە موسوڵمانان کردو ئەوانیش رایان وادا کە بۆ شەڕکردن لەگەڵ دوژمندا بچنە دەری شار، جا هەر چەندە پێغەمبەر بۆ خۆی رای وابوو کە لەشار دەرنەچنو لەمەدینەدا بمێننەوەو بەرگری لە خۆیان بکەن، بەڵام هاتە سەرەڕای هاوەڵانیو ئاکامی راوێژکردنەکەی وەرگرتو بەرەو کێوی ئوحود کەوتنە رێ، ئەوەبوو شەڕی ئوحود لە نێوان موسوڵمانانو کافرەکانی قوڕەیش دا بەرپا بوو، بە تێشکانی موسوڵمانەکان کۆتایی هات... کەچی لەگەڵ ئەوەشدا پەروەردگار بە پێغەمبەر دەفەرموێ:

{ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ }.

واتە: ئەی پێغەمبەر! ئاگاداربە ئاکامی راوێژکردنەکەت تۆ وا لێ نەکا کە واز لە راوێژکردن بهێنی، بەڵکوو هەموو کات لەسەر راوێژکردن بەردەوام بەو فەرامۆشی مەکە! ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە پەروەردگار دەیەوێ کە موسوڵمانان راوێژکردنو پرسو را بکەنە بناغەی سیاسەتی خۆیانو ئاکامی راوێژکردن چی بوو بە دڵێکی فراوانەوە وەری بگرنو کەس ملهوڕیو دیکتاتۆری تێدا بەکار نەهێنێ.

جا لە کاتێکدا راوێژکردن لەسەر پێغەمبەر پێویست بووبێ کە نموونەی زیرەکیو عاقڵمەندی بووە، نیگای پەروەردگاری بۆ هاتووە دیارە راوێژکردن لەسەر ئادەمیزادی تر پێویستترە، تەنانەت برێ لە زانایانی ئیسلام پێیان وایە کە پێغەمبەر پێویستی بە راوێژ نەبووە، خۆ ئەگەر یەزدان نەیویستایە راوێژ بکاتە بنەمایەکی سەرەکی بەرێوەچوونی کاروباری موسوڵمانان فەرمانی بە پێغەمبەر نەدەکرد کە راوێژ بکا! شتێکی سەلمێندراوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە زۆر لەو شتانەی کە قورئان باسی لێوە نەکردوە راوێژی لەگەڵ هاوەڵانیدا کردوەو ئاکامی راوێژکردنەکە چۆن بووە پەیڕەوی کردوەو جێبەجێی کردوە!

ئەو راوێژکردنەی کە ئیسلام بە پێویستی داناوە ئەوە ناگەیەنێ کە هەموو کەسێك شیاوی ئەوە بێ راوێژی لەگەڵ بکرێ، یان راوێژکردن بۆ زوربەی جەماوەر بێ، چونکە قورئان لە چەند ئایەتدا ئەوە دەچەسپێنێ کە رادروستیو لێزانی زانیاری سیفەتی زوربەی جەماوەر نییە بە گشتی، بەڵکوو ئەو سیفەتانە هی چەند کەسێکی کەمی ناو کۆمەڵن، واتە: ئەندامانی ئەنجوومەنی راوێژ چەند زاتێکی تایبەتی ناو کۆمەڵن...

{وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِي الأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ اللّهِ إِن يَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلاَّ يَخْرُصُونَ - سورة الأنعام – ١١٦}.

ئەی پێغەمبەر! ئەگەر تۆ بە گوێی زوربەی دانیشتوانی سەرزەوی بکەی لە رێگەی راستی خودا لات دەدەنو توشی هەڵدێرت دەکەن! ئەوانە شوێن شكو گومان دەگەونو بە گۆترەو هەوانتە قسە دەکەنو رادەردەبڕن. یان دەفەرموێ:

{أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا - سورة الفرقان – ٤٤}.

بۆتۆ پێت وایە کە زوربەی ئەو خەڵکە راستی دەبیسنو هۆشو تێگەیشتنیان هەیە؟! ئەوانە وەکوو ئاژەڵ تێنەگەیشتونو بەڵکوو سەر لێ شێواو تریشن.

جا کە بەگوێکردنی زورینەی نەزانو تێنەگەیشتو رێگای راست لە ئادەمیزاد هون بکا، دیارە ئەو زۆرینەیە شیاوی ئەوە نین ئەندامی ئەنجوومەنی راوێژ بن.

بەڵكوو راوێژ پلەیەكی بەرزی كۆمەڵایەتییە دەدرێتە ئەوانەی كە لێزانو خاوەن ئەزمونو عەقڵو زانستو هۆشن. ئەوەتا خودا دەفەرموێ:

**{وَإِذَا جَاءهُمْ أَمْرٌ مِّنَ الأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُواْ بِهِ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُوْلِي الأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنبِطُونَهُ مِنْهُمْ - سورة النساء -٨٣}.**

واتە: كە رووداوێك یان هەواڵێكی سەركەوتنی موسوڵمانان یان تێشكانیان دەهات كۆمەڵێك لە موسوڵمانی ساویلكەو كورت بین خێرا بەبێ سێو دوو بڵاویان دەكردەوە ئەمەش زەرەری لە بەرژوەندیو ستراتیجیەتی موسوڵمانان دەدا، خۆئەگەر ئەو نەفامانە وازیان بێنایەو لێ بگەڕانایە پێغەمبەرو لێپرسراوانو كار بەدەستان ئەم كارەیان ئەنجام بدایە ئەوە ئەوان دەیانزانی كام هەواڵە شیاوی بڵاوكردنەوەیە بڵاویان دەكردەوە ئەوی بەكاری بڵاوكردنەوەش نەهاتایە بڵاویان نەدەكردەوە.

كەوایە ئەوانەی شارەزای كاروبارنو لێزانو خاوەن ئەزمونن شیاوی پرس پێكردنو راوێژن نەك ئەوانەی كە نەزانو بی ئەزمونن:

**{هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ - سورة الزمر -٩}.**

خوێنەری هێژا! پەروەردگار راوێژكردنی بەكارێكی پێویست داناوە بۆ موسوڵمانان، بەڵام چۆنیەتی راوێژكردنەكەی رون نەكردۆتەوە، چونكە قوڵبوونەوە لە یاساو چۆنیەتی راوێژ كردنەكە بە گوێرەی رۆژگارو گۆڕانی كۆمەڵو شوێنو جێگا دەگۆرێ، كەوابوو دادپەروەری ئەوەیە كە خودی راوێژكردن بە پێویست دابنرێ بەڵام چۆنیەتیەكەی بدرێتە دەست خەڵكەكەو هەر گەلو نەتەوەیەك بە گوێرەی رۆژگاری خۆیو رەچاوكردنی بەرژەوەندی گشتی بەكاری بهێنێ.

## یەكسانی (المساواة):

نەتەوەكانی جیهان هەر لە رۆژگاری پێش هاتنی ئیسلامەوە تاكۆتایی سەدەی هەژدەهەمینی زایینی كە شۆڕشی بەناوبانگی فەرەنسای تێدا بەرپابوو

جیاوازییەکی زۆریان دەخستە ناوچینەکانی کۆمەڵەوە لە (ئینسیکلۆبیدیای لاروس)دا هاتووە دەڵێ: لە ساڵی (١٧٨٩ ز) جیاوازیو چینایەتییەکی زۆر لە وەرگرتنی وەزیفە گشتییەکاندا بەرچاو دەکەوتو هیچ رەقابەو سانسۆرێکیش لە گۆڕی نەبوو! ئیتر وەزیرەکانی لویسی شانزەهەم زۆر هەوڵو کۆششیان دا کە کارو باری وڵات رێك بخەنو قەڵاچۆی چینایەتی بکەنو ویستو ئاواتی گەلەکەیان دەستەبەر بکەن بەڵام سەرکەوتوو نەبوونو توشی بەرەنگارییەکی سەر سەختانەی پیاوە ئایینییەکانو دەرەبەگەکان بون، ئیتر جەماوەر ناچار بوو بیر لە رێگا چارەیەکی تر بکەنەوە ئەویش بەرپا کردنی شوڕشێکی بنەڕەتییە کە کۆمەڵێك لێپرسراوی یاسا خوازو دڵسۆز دابنێ لە شوێنی ئەو کۆمەڵەی کە ملهوڕیو دەرە بەگایەتیو بەهۆی یاسای چینایەتی ئەو کورسییانەیان داگیرکردون.

شتێکی ئاشکراشە کە شۆڕشی فەرەنسا گەلێك گۆڕانکاری ئیصلاح ئامێزی هێنایە کایەوە، هەر ئەم شۆڕشەش بۆ گەلو نەتەوەکانی ئەوروپای لەخەو بێدارکردنەوەو ئەوەندەی نەخایاند هەموو ئەو نەتەوانە دژی کاربەدەستو لێپرسراوانیان شۆڕشیان پەرپا کردو داوایان لێ کردن کە چاو لە حکوومەتی فەرەنسا بکەن مافی ئازادی بدەن بە گەلەکانیان برێ لە ئایینەکان یاسای چینایەتییان بەلاوە رەوایە وەکوو ئایینی (بەراهیمە) کە کۆمەڵ دەکاتە چواربەشو چینی هەر ژوروشیان چینی بەراهیمەکان یان کاهینەکانن، چینی خواروشیان مسکێنو کەچەڵو گرۆێکانن، بۆ ئەوەی ستەمی ئەم یاسایە بزانین دەتوانین بگەڕێنەوە بۆ یاسا دانەرێکی ئەم ئایینە کە (Monou) یە، دەڵێ: بەرهەمی دەبێ رێزی لێ بگیرێ بەهۆی بنەچەو بنەماڵەیەوە، هەروەها بەرهەمی دەتوانێ – هەرکاتێ ویستی – ماڵو سامانی ئەو مسکێنو رەشو روتانەی کۆمەڵ داگیربکا، چونکە کۆیلە خۆی ماڵو دارایی هی گەورەکەیەتی، هەموو یەکێ لەم چینە بەش خوراوە نەگبەتە نابێ خەریکی ئایین یان خوێندنو زانست بێ ئەگەر

شتی وای کرد سزای بەئێشی دەدریٰ بەم جۆرە کە قورقوشمی تواوە دەکرێتە گوێچکەیەوە یان زمانی دەبڕدریٰ یان ئەندامێکی گرنگی دەبڕدریٰ.

جولەکەکانیش پێیان وابوو خۆیان بە تەنیا کوری خودانو خۆشەویستن لە تەشریعاتو یاساکانیاندا جوداوازییان خستۆتە نێوان خۆیانو ئەوانەی جولەکەنین، سودو فائیزیان لەناو خۆیاندا قەدەغە کردبوو، بەلاّم ئەگەر خۆیان لەگەلّ کەسانی تردا کرینو فرۆشتنی ریبا ئامێزیان بکردایە قازانجەکە بۆ خۆیان بیٰ ئەوە بە رەوایان زانیوە (گەلیٰ ئەلّمانی نازی)یش پێش جەنگی یەکەمی جیهانی ئەو پەڕی زیادە رەوییان لە رەگەز پەرستیدا بەرپا کرد، گەلیان دابەشکرد بۆ چەند چینو توێژێكو گەلی (ئاری)یان لە هەرە خانەی بەرز دا داناوە، نەتەوە دیموکراتییەکان کە لافی ئەوە لیٰ دەدەن کە جیهانی ئادەمیزاد قەرزدارییانەو گوایە بنەمای یەکسانی ئەوان دایان هێناوە! کەچی تا ئێستاش لە قانوونو سیاسەتو رامیارییاندا بە پێچەوانەی ئەو شیعارە هەلّسو کەوت دەکەن، ئەوەتا لە برێ هەرێمی ئەمەریکاو بڕی شوێنی ئەفەریقا رەش پێستەکان کەمترین مافیان نادرێتیٰو وەکوو ئادەمیزاد سەیر ناکرێن.

ئەگەر بەوردی سەیری ئەو شەرعو یاسایانە بکەین کە ئیسلام دایناوە بۆ پیادەکردنی یەکسانی دەبینین کە هیچ شەریعەتێکی ئاسمانی یان دانراوی ئادەمیزاد نەگەییشتۆتە ئەو ئاستەی کە ئیسلام پێی کەیشتووە! ئەوەتا ئیسلام یەکسانی هەموو ئادەمیزادانی لەبەرامبەر قانووندا چەسپاندووە، هەروەها یەکسانی هەموو مرۆڤێکی لە مافەگشتییە رامیارییەکانو شتی تریشدا راگەیاندووە، ئەوەی چەسپاندووە کە هیچ زێدەرێزێك نییە بۆ عەرەبێك بەسەر ناعەرەبێکدا هەروا زێدەرێزی سپی پێست بەسەر رەش پێستدا نییە، ساماندار زێدەرێزی بەسەر هەژاردا نییە، پیاو ماقوولّو هەتیو مچەیەك لەبەرامبەر یاسادا چون یەکن! ئابەم یاسا مرۆڤ دۆستانەی ئیسلام توانی قەلاّچۆی یاسای چینایەتی

بکا، شێوازی جوداوازی لە نێوان چینەکاندا دەربارەی مافو ئەرك (الحقوق والواجبات) یەکسان بکا، خودا دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ - سورة الحجرات - ١٣}.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا پەروەردگار هەموو ئادەمیزاد بانگ دەکا بۆ بەرپاکردنی یەکسانی! قورئان بانگی هۆزێك یان نەتەوەیەك ناکا بەڵکوو بانگی هەموو ئادەمیزاد دەکا کە نەوەی (ئادەمو حەوا)نو پێیان دەڵێ ئێمە ئێوەمان لە نێرمێیەك دروست کردوە، جا کە باوکی هەموویان (ئادەم)بێو دایکیان (حەوا)بێ، کەوابێ هیچ کەسێك بۆی نییە لە بارەی نژادەوە لافی زێدەرێزی لێبدا! ئەمجار ئەو خەڵکە کە بە جیهاندا بڵاو بونەوەو بەهۆی لێك دور کەوتنەوەیان زمانو رەنگیان لێك جواداوازە ئەمە نابێتە هۆی ئەوە کە لە برایەتی یەکتری بشۆرێن، دژایەتی یەکتری بکەن. بەڵکوو ئەم جوداوازی زمانو رەنگو شێوەیە دەبێ ببێتە هۆی یەکتر ناسینو دروستکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان. {وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا} یەکتر ناسین دەبێتە هۆی وەگری بونو خۆشەویستیو هاریکاری یەکترکردن بۆلابردنی ئەو کۆسپانەی کە دێنە سەر رێگای ژیان.

ئالێرەدا دەروونی ئادەمیزاد هەست بە بەرزی ئەم ئایینە دەکا، بە جۆرێك کە ئەم هەستە پاڵ بە هەموو کەسێکەوە دەنێ بۆ وەرگرتنی، بەبێ سێو دوو - ئەگەر دەغدەغەی رەگەز پەرستی کوێرانە نەبێ! هەموو گەلێك خۆی بەشایانی رابەری ئادەمیزاد دەزانێو هەموو کەسێك خۆی بەلاوە باشترە لە کەسانی دیکە. ئالێرەدا بەشەکەی تری ئایەتەکە خۆی دەنوێنێ کە دەفەرموێ: { إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ } واتە: هیچ زێدە رێزو پیرۆزییەك بۆ ئادەمیزادان نییە ئیللا بە گوێرەی کردەوەکانیان نەبێ، هەرکەسە بە ئەندازەی خودا پەرستیو ئەو خزمەتو کۆششانەی کە پێشکەش بە گەلو نیشتمانی دەکا رێزی دەدرێتێ!

پێغەمبەری مەزنیش لە بانگەوازی کردنی بۆ یەکسانی لە دوا وتاریدا دەفەرموێ: (ئەی بەرەی ئادەم! ئێوە هەمووتان یەك خوداتان هەیە لەیەك باوك کەوتوونەوە، هەمووتان لە ئادەمن‌و ئادەمیش لەگڵ دروست کراوە بەرێزترتان لای یەزدان ئەو کەسەیە کە خودا پەرستی زیاتربێ، هیچ عەرەبێك زێدە رێزی بەسەرە عەرەبێك‌و هیچ نا عەرەبێك زیدەرێزی بەسەر عەرەبێكدا نییە، هەروا هیچ سور پێستێك زێدە رێزی بەسەر سپی پێستێكدا نییە، هیچ سپی پێستێك زێدەرێزی بەسەر سوورپێستێكدا نییە، مەگەر بە خودا پەرستی!! ئائەمەیە بناغەی یەکسانی کە لەژێر سایەی ئیسلامدا پێش چواردە سەدە لەناوگەلی عەرەبدا لەدایك بوو ئەو گەلە عەرەبەی کە لە هەموو نەتەوەیەك زیاتر شانازییان بە نەژاد دەکرد لە سەرەتای بانگەوازی ئیسلامیدا سەرانی قورەیش رەخنەیان لەو یەکسانی خوازییەی پێغەمبەر گرت کە ئەنجامی دەدا! پێیان گوت ئەی موحەممەد! ئێمە چۆن بێزمان دێ لەگەڵتا دانیشین‌و کۆببینەوە تۆ لەگەڵ بیلالی حەبەشی‌و سەلمانی فارسی‌و صوهەیبی رۆمی‌و عەممارو ئەو جۆرە کەسانە دادەنیشی، تۆ ئەوانە دەرکەو لە خۆتیان دوور خەرەوە ئەمجار ئێمە ئامادەی کۆڕو کۆبوونەوەکانت دەبین‌و گوێ بۆ قسەکانت دەگرین، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بەقسەی نەکردن ئەمجار گوتیان دەی باشە رۆژێك بۆ ئێمە دابنێ‌و رۆژێکیش بۆ ئەوان، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) نزیك بوو راکە یان پەسەند بکاو بەقسەیان بکا، بەڵام ئەم نیگایەی بۆ هات کە دەفەرموێ:

{وَلاَ تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَيْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ الظَّالِمِينَ، وَكَذَلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولواْ أَهَؤُلاء مَنَّ اللّهُ عَلَيْهِم مِّن بَيْنِنَا أَلَيْسَ اللّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ - سورة الأنعام – ٥٢-٥٣}. ئیتر پێشنیارەکەیانی رەتکردەوە!

رۆژێك ئەبو زەڕی غەففاری‌و کۆیلەیەکی زنجی رەش پێست لە خزمەت پێغەمبەر دەنگیان لێك بەرز بووەو ئەبو زەڕ رقی هەڵساو بە کۆیلەکەی گوت: (یا ابن السوداء!) توانجی تێگرت. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) رقی هەڵساو فەرمووی:

{ طف الصاع طف الصاع! ليس لابن البيضاء على ابن السوداء فضل إلا بالتقوى أو بعمل صالح}.

جامەكە پڕبوو، جامەكە پڕبوو، زیادەڕۆییو ناماقوڵتكرد: هیچ سپی پێستێك زێدەرێزی فەزڵی نیە بەسەر هیچ رەش پێستێكدا مەگەر بەتەقوا یان بەكردەوەی باش.

ئیتر ئەبو زەڕ روومەتی خۆی لەسەر زەوی داناو بە كۆیلە رەش پێستەكەی گوت: وەرە قاچت بخەرە سەر روومەتم لەسزای ئەو قسە ناشیرینەی پێم گوتی. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەرگیز جیاوازی نەدەخستە نێوان سپی پێستو رەش پێست یان نێوان ئادەمیزادی ئازادو ئادەمیزادی كۆنەكۆیلە (موالی)، لە بارەی مافو مامەڵەكردندا بە یەك چاو سەیری دەكردن، ئەوەتا بیلالی حەبەشی كردە لێپرسراوی شاری مەدینە لەگەڵ هەبوونو ئامادەبوونی ئەو هەموو گەورەهاوەڵانەی پێغەمبەر كە ئەوكاتە لە مەدینە بوون، (بیلال)یش لە بناغەدا كۆیلەیەكو بوو حەزرەتی ئەبو بەكر كڕی بوویو ئازادی كردبوو، هەروەها پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بازانی فارسی كردە والی یەمەن كە بازان مرد ئەمجار كوڕەكەی كردە جێ نشینی.

ئەم رەوشت بەرزییەی كە لە ئیسلامدا هەیە كاتێك باشتر دەردەكەوێ ئەگەر بەرامبەری بكرێ بەو هەڵسو كەوتەی كە ئێستا لە پێشكەوتووترین وڵات ئەنجام دەدرێ كە هەرگیزاو هەرگیز ئەو هەڵسو كەوتە لەگەڵ رێزی ئادەمیزادا ناگونجێ.

جا كە زانستو پێشكەوتن لەو وڵاتە پێشكەتووانەدا نەیانتوانی ئادەمیزاد بگەیەننە ئەو ئاستەی كە ئیسلام چەسپاندویەتیو هەوڵی ئەوەی داوە كە موسوڵمانان پەیڕەوی بكەن بە تایبەتی لەكاتو شوێنێكدا كە زانستو فەلسەفە چ دیاردەیەكیان نەبووەو زۆربەی دانیشتوان نەخوێندەواربوون، دەی باشە هەر ئەمە كە زانستو فەلسەفە چ دیاردەیەكیان نەبووە، لەو هەرێمەی كە ئیسلامی تێدا بڵاو بووەوە بۆ خۆی بەڵگەیەكی بەهێز نییە كە ئەم ئایینە لە خواوە

هـاتووە؟! چـونکە خـاوەن عـەقڵو هـۆش هەرچـۆنێك بـیر بکاتـەوە ناتوانـێ بـە خەیاڵیش لەم ئایینە باشترو ڕێكو پێکتر بهێنێ.

## دادپەروەری (العدالة):

نەتەوەکانی سەرزەوی پێش هاتنی ئیسلام مانـای دادپـەروەریو ستەمکارییان زانیـوە، بـەڵام سـنوورەکانی هەریـەك لـەو دوو لایەنـەیان نـەزانیوە، ئەگـەر سـەیری مێژووی گەلی یۆنانی بکەین. دەبینین جیاوازییان خستۆتە نێوان ئەوانەی ناچنەوە سەر ئەو نژادە. هەرچی مافو ڕێزێکی نیشتمانی هەیـە بـۆ یۆنانییـەکان دەسـتەبەر کرابوو، مافی ئەوەیان دابوویە کە نەتـەوەکانی تـر بچەوسێننەوە گـەلی (ڕۆمـا)یـش هەمان شێوەو دابو نەریتی هەبوو، بڕێکیش زیاتـر زیادەڕەوی تێـدادەکرد، هـەر بـە ئەوەنـدە نەوەستان بنەماڵەو دەرەبەگ هەموو مـافێکی چەوسـاندنەوەو ئاغایـەتییان درابوویە، خۆیان بکوژو ببڕ بـوونو لێپرسـراوو کاربەدەسـتو چەوسـێنەرەوە بـوون، جەختیان لە چینەکانی تریش دەکرد کە گەردنکەچو گوێ ڕایەڵ بنو نقە نەکەن.

دائیرەتولـەعاریفی لاروس کـە باسـی یاسـای کۆمەڵـگای ڕۆمـانی دەکـا دەڵـێ: (پاپاکـانی ڕۆمـان چـۆن بـون؟! لەولامـدا دەڵـێ: زەبـرو زەنـگو دەرەبەگایـەتیو دیکتـاتۆریو زۆرداری کرابوونـە یاسـاو کاریـان پـێ دەکـرد، زێـدە ڕێـزو گـەورەییو لێهاتوویی ڕۆمانەکان – کە ئازایەتیو زۆرزانیو پێش بینیو یاسا ناسیو دڵسۆزی بۆ کۆمەڵ بریتی بوو لە ڕەوشتی ڕێگرو جـەردەو چـەتەو دزو شـەقاوە. نیـشتمان پەروەریشیان بە پۆشاکی ستەمگەریو دڕندە ئاسایی داپۆشیبو، هەر کەسێکیان لـە عاست خۆیەوە پولەکیو ماددە پەرستو دژ بە بێگانە بوو!

هیچ سۆزو عاتیفەیەك لە دەروونیانـدا نـەبوو، ڕەحـمو بـەزەیی مرۆڤایـەتییان تێدا بەدی نـەدەکرا، کـەوابوو مانـای دادپـەروەری نەلـەلای یۆنانییـەکانو نـە لـەلای ڕۆمانییـەکان تـەواو نـەبوو، بەڵـکوو لـە سـەدەی نۆزدەهەمـدا مانـای دادپـەروەریی تەواوبوو، ئەم دواکەوتنـەی بـەرپا بـوونی دادپـەروەری ئەوەنـدە درێـژەی نەدەکێـشا ئەگـەر لەبـەر ئـەوە نەبوایـە کـە هەنـدێ زانـستی کۆمەڵایـەتی تـا ئـەم دواییانـە

دەستەبەر نەبوون... بەرزترین ئاستێك كە گەلە پێشكەوتووەكان پێی گەیشتونو زانیاری كۆمەڵایەتی بەمەرجی داناوە بەرپابوونی دادپەروەرییە، بەجۆرێك كە هەر گەلێك قانوون دادەنێ دەبێ پەرژوەندی هەموو مرۆڤ لەبەر چاو بگرێ، تا ئێستا بە شایەتی زانیاری كۆمەڵایەتی (علم الإجتماع) هیچ گەلێك نەگەییشتۆتە ئەم ئاستە!

دەی با بزانین ئاخۆ مانای دادپەروەری لەلای نەتەوە موسوڵمانەكان گەییشتۆتە ئاستی پێویست؟ ئایا قورئان ئەم لایەنە رون دەكاتەوە؟!، جا ئەگەر لە قورئاندا ئەمانە دەست كەوت – دەستیشمان دەكەوێ – ئەوەمان بۆ دەردەكەوێ كە ئەم ئایینە سەرچاوەكەی لە خوداوەیە.

## دادپەروەری لە قورئاندا (العدالة):

لە رەوشتە بەرزەكانی ئیسلامە كە داوا لە شوێنكەوتوانی دەكا كە دادوەری لەناو ئادەمیزادا بڵاو بكەنەوە داری عەدالەت بروێننو گەشەداری بكەن بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە هیچ ئیعتبارێكی وا كە نەهێڵێ دەسەڵاتی عەدالەت بگاتە شوێنی خۆی، خودا دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاء لِلّهِ وَلَوْ عَلَى أَنفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقَيرًا فَاللّهُ أَوْلَى بِهِمَا فَلاَ تَتَّبِعُواْ الْهَوَى أَن تَعْدِلُواْ وَإِن تَلْوُواْ أَوْ تُعْرِضُواْ فَإِنَّ اللّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا - سورة النساء – ١٣٥}.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا پەروەردگار فەرمانی بە موسوڵمانان كردوە، كە ئەو پەڕی هەوڵو تێكۆشان بخەنە گەڕ بۆ بەرپابوونی عەدالەت، هەر كەسە لە عاست خۆیەوە ببێتە شایەتی بەرپاكردنی دادوەریو لەبەر خاتری خودا نەك لەبەر مەبەستی دونیایی – لە هەموو كونو قوژبنێكدا چاودێری ئەنجامدانی عەدالەت بكا. نابێ لەكاتی شایەتیدان – جگە لە بەرپابوونی عەدالەت هیچ مەبەستێكی تر هەبێ تەنانەت ئەگەر شایەتیدانەكەی لەدژی خۆی یان باوكو دایكی یان خزمو كەسو كاریشی بێ، ئەگەر شایەتی لەسەردراو دەوڵەمەندو دەست ڕۆییشتوو بوو

ئومێدی پاداشی لێ دەکرا یان هەژارو بێ نەوابوو جێگای بەزەیی پیاهاتنەوە بوو نابێ شایەتی بگۆڕێ، روداو چۆن بووە دەبێ ئاوا ئەدای بکا، چونکە خودا لە هەموو کەس زیاتر بەرژەوەندی هەموو لایەك دەزانێو ئەگەر بەرژەوەندی تێدا نەبوایە ئاوا خودا جەختی تێدا نەدەکرد، کەواتە ئەرکی سەرشانی ئێوەی موسوڵمانە کە پابەندی فەرمانی خودابنو چۆنتان شایەتی لایە ئاوا شایەتی بدەنو ئەم لاو ئەو لای تێدا نەکەن..

ئەمجار پەروەردگار فەرمانی بە موسوڵمانان کردوە کە شوێن هەواو هەوەس نەکەونو لاڕێ نەڕۆن، ئەمجار خودا موسوڵمانانی ترساندووە لەوە کە شایەدی بگۆڕنو هەڵیبگێڕنەوە، یان بیشارنەوە، چونکە خودا ئاگاداری هەموو شتێکە سزاو پاداشیان بە گوێرەی کردەوەکانیان دەداتەوە. قورئان بە ئەمەندەشەوە نەوەستاوە بەڵکوو فەرمانی بە موسوڵمانان کرد کە پەیڕەوی دادپەروەری لەگەڵ دوژمنیشدا بکەن! ئەوەتا خودا دەفەرموێ:

{وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى - سورة المائدة – ٨}.

واتە: با ڕق لێبونتان لە هۆزێكو دوژمنایەتی کردنتان بۆیان ئێوە هەڵنەنێ کە دادپەوەرییان لەگەڵدا نەکەن چونکە دادپەروەری تەنانەت لەگەڵ دوژمنیشا خودا پەرستیو تەقوایە. لە قورئانی پیرۆزدا چەند جارێك فەرمان بە پەیڕەوی کردنی دادپەوەری کراوەو لە شانو شکۆی بەرزکردۆتەوە، وەکوو خودا دەفەرموێ:

{وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ - سورة النساء – ٥٨}.

واتە: هەرکاتێ فەرمانڕەواییتان لەنێو خەڵکدا کرد دادپەوەرانە حوکم بکەن. تەنانەت پەروەردگار فەرمانی بە موسوڵمانان کردوە کە لە قسەکردنیشا دادپەروەربن راستو رەوان قسەکە بڵێنو لەبەرخاتری خزمایەتی قسە هەڵنەگێڕنەوە.

{وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُواْ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى - سورة الأنعام – ١٥٢}.

لە شوێنێکی تردا قورئان هۆی سەرەکی ناردنی پێغەمبەران ئاشکرا دەکاو ئەوە رون دەکاتەوە کە ئەرکی سەرەکی ئەو پێغەمبەرانە چەسپاندنی دادپەروەری بووە:

{وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ - سورة هود -٢٥}.

ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەوە ئاشکرا دەکا کە پەروەردگار مەبەستی سەرەکی لە ناردنی پێغەمبەران بۆ سەر ئادەمیزاد چەسپاندنی دادوەری بووە لە ناویاندا، ئەویش ئەو یاسایەیە کە بریتییە لەو بەرنامەو پرۆگرامەی کە خودا بۆی ناردن‌و هەموو شتێك بە تەرازوی حەق‌و راستی دەکێشێ‌و یاسای ژیانی مرۆڤایەتی پڕ لە دادپەروەرییە، چونکە بەرنامەی خودایە، بەرنامەی خوداش یاسا سنوورداری دەکاو تەرازووی عەدالەت فەرمانڕەوایی دەکا، هەر کە تەرازووەکە تێك بچێ یاساکانیش لەناو دەچن‌و دەبێتە پشێوی‌و فەوزا.

ئا ئەمانەیە مەبدەئە پیرۆزەکانی قورئان بۆ چەسپاندنی دادوەریی لەسەر زەوی‌و ئاوا بەرنامەی ژیان رێك دەخا.

ئەوەی کە بۆمان دەردەکەوێ لە مانای ئەم مەبدەئە پیرۆزانەو پوختەی ماناکانیان ئەوەیە کە ئەم قورئانە وتەی ئادەمی نییەو کەلامی پەروەردگارە بۆ ئەوەی ببێتە پرۆگرامی ئادەمیزادو بیانخاتە ناو ژیانی کامەرانی‌و ئاشتی‌و سەربەستییەوە.

## بانگەوازی بۆ ڕێزگرتن لە ئاوەدانی‌و شارستانیەت:

پێش هاتنی ئیسلام چەند گەل نەتەوەیەك هەبوون کە کلیلی دەسەڵات‌و فەرمانڕەواییان بۆ دەستەبەر بووە، ئەوەندەی پێ نەچووە داب‌و نەریتی کۆمەڵگای خۆیان پاڵی پێوەناون بۆ ئەوەی بەناو وڵاتدا بڵاو ببنەوەو بۆ هەر چوار دەوری خۆیان باڵیان هاویشتووەو ویستویانە سنوری فەرمانڕەوایی خۆیان بەر فراوان

بکەن‌و ماڵ‌و دارایی کۆ بکەنەوە، ئەو ڕێبازەی بۆ ئەم مەبەستانەیان پەیڕەوییان دەکرد هێزی زۆرە ملیّ‌و چەك‌و عەسکەرتاری بوو نەك بنەمای دادوەری‌و عەدالەت، ئەوەبوو هەر وڵاتێکیان داگیر بکردایەو هەر شارو شاروچکەیەکیان بکەوتایە ژێر دەست چی دیاردەی ئاوەدانی‌و شارەستانی لەو شارەدا هەبوایە تارو ماریان دەکردو لە بێخیان هەڵدەکەندو ماڵ‌و داراییان تالآن دەکردو دانیشتوانیان دەکردنە ژێر دەستەو کۆیلەو کەسانێکیان دەکردنە لێپرسراوو کاربەدەست کە خاوەن زەبرو زەنگ‌و زۆرو ستەم بن‌و بەزەییان پێدا نەیەنەوە!

ئەمەیە داب‌و نەریتی داگیرکەران‌و هەڵس‌و کەوتیان لەگەڵ ژێر دەستەکانیاندا، بەراستی وتە بەنرخەکەی مەلیکە سەبەء خاتو بەلقیس تابلۆیەکی پڕاوپڕی ئەم ڕووداوانەن، ناوبراو کاتێك نامەکەی حەزرەتی سولەیمانی بۆچوو ئەم وتە بەنرخەی وت کە قورئانی پیرۆز باسی دەکاو دەفەرمویّ:

{قَالَتْ إِنَّ الْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوا أَعِزَّةَ أَهْلِهَا أَذِلَّةً وَكَذَلِكَ يَفْعَلُونَ - سورة النمل – ٣٤}.

واتە: پاشاو داگیرکەران کە دەچنە شارێکەوەو وڵاتێك داگیر دەکەن چی دیاردەی ژیارو شارەستانیەت هەیە تارومارى دەکەن، پیاوماقوڵ‌و ڕێزدارانی ئەو ناوچەیە دەکەنە ژێر دەستەو چەوساوە. بەڵگە هێنانەوە لەسەر ئەم دیاردەیە لە مێژوودا زۆرو زەبەندەیە، مێژوو پڕە لە کارەسات‌و زوڵم‌و ستەمی شەرم ئاوەر کە لە هەموو زەمانێکداو لەناو زوربەی نەتەوەکانی سەرزەویدا رویداوە! با زۆر دوور نەڕۆین ئەوە جەنگی یەکەم‌و دووەمی جیهانییە، ئەو شەڕو شۆڕانەی کە لێرەو لەویّ لە نێوان ئەم‌و ئەودا رویاندا، بڕوانە وڵاتە – بەناو پێشکەوتووەکان چۆن سنوری هەموو داب‌و نەریتێکیان شکاندو چەکە کوشندەکانی خۆیانیان لە گۆڕەپانی شەڕەوە گواستەوە بۆ لێدان‌و بۆردومانکردنی خان‌و بەرەی فەقیرو هەژارو بێ چەك‌و بێ لایەن دانیشتوانی شارو شارۆچکەو دێهاتەکان‌و منداڵ‌و

پیرەژن‌و پیرە مێردیان خستە ژێر دارو پەردەی خانووی روخاوو سوتاوەوە، تەنانەت چەکی کیمیایی‌و بایەلۆجی‌و هەموو جۆرە چەکێکی کۆکوژیان لە دانیشتوانی هەژاری بێ دیفاعدا تاقی کردەوە!! سەیرکە چۆن فڕۆکەی مەرگ ئاوەرو وڵات خاپوورکەریان دەناردنە سەر خەڵکی بێ دیفاع‌و وڵاتی دوور لە گۆڕەپانی شەڕ، لە هەموو کون‌و قوژبنێك مەرگیان دەباراند، وڵاتیان خاپوور دەکرد. پێش هەڵگیرسانی ئەم شەڕانە بە خەیاڵی کەسدا نەدەهات کە گەلە پێشکەوتووەکان رق‌و کینەیان بگاتە ئەو ئاستە کە بەبێ لێ سلەمینەوە ئاوا بیر لە قەلاچۆی گیان‌و ماڵ‌و ژیارو شارستانی یەکتری بکەنەوە!!

بەڵام کە سەیری ئایینی ئیسلام دەکەین دەبینین هەمیشە ئادەمیزادانی ترساندووە لە ئاکامی لەگرێژەنە چوونی سیستەمی ژیان‌و ژیاری خەڵکی، پەروەردگار بەچەند شێوەو شێواز فەرمانی کردوە بە لە بێخ دەرهێنانی رەگ‌و ریشەی ئەم رەوشتە ناشیرینە لە دڵ‌و دەروونی پەیڕەوکارانی خۆی دا، هاتووە لە شوێن ئەو رەوشتە شوومە مرۆڤ کوژەدا مرۆڤایەتیەکی وای رواندووە کە هیچ ئیعتبارێکی دوژمنکارانەی بەسەردا زاڵ نەبێ.

قورئانی پیرۆز فەسادو ئاژاوەی بەلاوە تاوانێکی کۆمەڵایەتیەو لەزۆر ئایەتدا موسوڵمانانی لە سەرەنجامی ئەو تاوانە هۆشیاو کردۆتەوە.

پەروەردگار بەمەبەستی سەر کۆنەکردنی ئاژاوەگێڕان دەفەرموێ:

**{وَمِنَ النَّاسِ مَن يُعْجِبُكَ قَوْلُهُ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيُشْهِدُ اللّهَ عَلَى مَا فِي قَلْبِهِ وَهُوَ أَلَدُّ الْخِصَامِ، وَإِذَا تَوَلَّى سَعَى فِي الأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيِهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ وَاللّهُ لاَ يُحِبُّ الفَسَادَ، وَإِذَا قِيلَ لَهُ اتَّقِ اللّهَ أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالإِثْمِ فَحَسْبُهُ جَهَنَّمُ وَلَبِئْسَ الْمِهَادُ - سورة البقرة ٢٠٤-٢٠٦}.**

واتە: هەندێ ئادەمیزاد هەن بەقسە هیچیان نەهێشتۆتەوە، کە گوێ لە گفت‌و گۆی دەگری سەرت لێ سوور دەمێنێ، چونکە وا خۆی پیشان دەدا کە یارمەتدەری حەق‌و راستییەو حەزی لە ئاشتی‌و کامەرانیەو دەیەوێ کۆمەڵگاکەی بەختەوەر

بژین، جار جارەش بۆ ئەوەی پێی باوەڕ بکرێ سوێند بە خودا دەخوا لەسەر ئەوە چی بەدەم دەیڵێ: بەدڵیش هەر هەمان رای هەیە.

بەڵام لە راستیدا ئەو خوانەناسە لە هەموو کەس زیاتر دوژمنی گەلو کۆمەڵە، هەر لەگەڵ لێپرسراویەکی پێ سپێردراو دەسەڵاتی درایە هیچ هەوڵو کۆشش بۆ ئاشتیو ئارامی نادا، بەڵکوو هەر خەریکی تێکدانی وڵاتو کۆمەڵگایە، هەر خەریکی چاندنی تۆوی دووبەرکیو قەڵاچۆکردنی کشتوکاڵو بەرو بومو وەچەو نەوەیە، بێگومان خوداش فەسادو ئاژاوەو تێکدانی سیستەمی ژیانی پێ ناخۆشە!! جا ئەگەر یەکێك بەرپەرچی ئەم زلحۆرتە لە خۆڕازیو لە خۆڕادیوە بداتەوەو فەرمانی بێ بکا بە چاکەو نەی لێ بکا لە خراپە خێرا رقی هەڵدەستێو هەڵدەچێو بەلایەوە گرانو لەنگییە یەکێك پێی بڵێ: وا بکە یان وامەکە! چونکە پێی وایە ئەو زۆر لەوە بەرزترە یەکێك زاتی بێنێ ئامۆژگاری بکا، هێندە لوتبەرزو لەخۆڕادیوە نایەوێ کەس دەست بەردەستی بێنێ، ئەم گێرەشێوێنە دوا خانووی ئاگری دۆزەخەو سزای کردەوەکانی خۆی وەردەگرێت.

پەروەردگار لێپرسراوانی موسوڵمانی ترساندوە لەوە کە لە گەل نەتەوەکانی تردا دادوەرانە نەجووڵێنەوە بە زۆرەملێ لە گەڵیاندا هەڵسو کەوت نەکەن، ژیارو ماڵو خانو بەرەیان لێ تێك نەدەن، چونکە ئەو جۆرە کارانە دەبنە هۆی ئەوەی کە موسوڵمانان لە ئیشو کاریاندا سەرکەوتوو نەبنو بەمەرامو ئامانجی خۆیان نەگەن.

ئەوانەی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەیان لە مێژووی گەلاندا کردوە ئەوەیان لا رون بووەتەوە کە هۆی لەناوچونی دامو دەزگای فەرمانڕەوایانو وەرگەڕانی تەختو بەختیان، بەد رەفتاریان بووە لە گەل ژێر دەستەکانیاندا!! ئەوەتا پەروەردگار ئەم بنەما راستییەی لەم ئایەتەدا دەرخستووە کە دەفەرموێ:

{وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ - سورة الأنبياء – ١٠٥}.

واتــە: لــەپاش تــەورات لــە پــەڕاوی زەبــووردا ئــەوەمان چەســپاندووە کــە فەرمانڕەوایی سەر زەوی دەدریٚ بە بەنـدە راسـتاڵەکانی خۆمـان ئەوانـەی بـەکاری هــەموو کاروبــارێکی بــاش دێــنو ئەگــەر لێپرســراوییان درایــە دەســت دادوەرانــە هەڵسو کەوت دەکەن. بەراستی شتێکی سـەیرو سـەمەرەیە کـە بڕێـك ئـادەمیزاد هـەبن گومانیـان لـەم رووداوە هـەبێ یـان ئـەم راسـتییانەیان بـۆ ڕون نەبوبێتـەوە، ئەی ئەوە نییە خودا لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ:

{أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ - سورة ص – ٢٨}.

لــەو شــتانەی کــە پــەروەردگار زۆر بەتونــدی هەڕەشــەی لــێ کــردووەو موسوڵمانانی لێ ترساندووە، تێکدانی کاروبـاری دامـەزراوی راسـتاڵی خەڵـکە کـە دەفەرموێ:

{وَلاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاَحِهَا وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا إِنَّ رَحْمَتَ اللّهِ قَرِيبٌ مِّنَ الْمُحْسِنِينَ - سورة الأعراف – ٥٦}.

واتــە: فەسـادو پـشێوی لەسـەر زەوی بـەرپا مەکـەن دوای ئـەوەی کـە ئاشـتیو ئازادیو کامەرانی باڵی پیرۆزی خۆی بەسەر زەویـدا کێشاوە، هـاوار بکەنـە خـوداو بەترسو تەماعەوە لێی بپاڕێنەوە، بێگومان رەحمەتی خودا لە چاکەکاران نزیکە. هـەر بـۆ زێـدە تەئکیـد لەسـەر خراپـی ئـاژاوەگێڕانو فیتنەنانـەوە خـودای مـەزن سـەرفرازیو زگـاربوونی پەیوەسـت کـردوە بـە پابەنـدبوونی ئادەمیزادەکـان بـەم فەرمانە خوداییە کە دەفەرموێ:

{تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ - سورة القصص – ٨٣}.

واتە: ئـەو خـانووە خـۆشو ژیانـە بەختـەوەرییـە دەدەیـن بـەو مرۆڤانـەی کە ئــاژاوەگێڕ نــینو نایانــەوێ بەملــهوڕیو زۆرداری بــاڵا دەســن بــنو خەڵــکی بچەوسێننەوە، ئاکامی سەربەرزانە بۆ تەقوا کارانەو هەر ئەوان سەرکەوتوون.

بێگومـان پـەروەردگار زانیویـەتی کـە موسـوڵمانان دەسـەڵاتی فـەرمانڕەواییان دەست دەکەوێو زەوی دەکەوێتە ژێر دەستی ئەوانو فەرمووی:

**{وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ - سورة النـــور – ٥٥}.**

پەیمانەو خودا داویەتی بەو موسوڵمانانەی کردەوەی باشیان کـردوە پـەیمانی ئەوەی داونێ کە دەیانکاتە جێنشینو خەلیفەی خۆی لەسـەر زەوی، وەکوو چۆن لەوەپێش خواناسانی کردوە بە جێگرو فەرمانڕەوای سەر زەوی!

لـە شـوێنێکی تـردا پـەروەردگار بـە تایبـەتی روی کردۆتـە موسـوڵمانو فەرموویەتی:

**{فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ-سورة محمد-٢٢}**

واتە: ئەی موسوڵمانان! ئایا لە ئێوە چاوەڕوان دەکرێ (کـە خـاوەنی ئـایینێکی جیهـانین) ئایـا چـاوەڕان دەکـرێ ئێـوە پـشێویو فەسـاد بڵاوبکەنـەوە، پەیوەنـدی خزمایەتی ببچڕێننو دووبەرکیو ئاژاوە بخەنە ناو گرۆهی ئادەمیزادەوە!؟

ئـەمجار پـەروەردگار هەڕەشـەی تونـدی ئاڕاسـتەی ئەوانـە کـرد کـە جورئـەت دەکەنو ئەم تاوانانە ئەنجام دەدەن، لەکۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ:

**{أُوْلَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَى أَبْصَارَهُمْ - سورة محمد – ٢٣}.**

واتـە: ئەوانـەی ئـەم تاوانـە ئـەنجام دەدەن خـودا نـەفرەتی لێ کـردون کـوێرو کەڕی کردون راستی نابیننو حەق نابیستن!

جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە باشـترین بەڵـگە لەسـەر ئـەوە کە ئـەم قورئانـە سەرچاوەکەی لـە خوداوەیـە، ئـەم راسـپێرێو ئامۆژگایانەیـە کـە بانگەوازی بـۆ ئـەوە دەکـەن کـە رێـزی شارەسـتانیەتو ئـاوەدانی بگـرنو پـشێویو فەسـاد لەسـەر زەوی بـەرپا نەکـەن. ئەمـە لـە کاتێکـدا کـە ئـەم ئامۆژگارییانـە لـە نیوەدوورگەی عەرەبیدا بڵاو دەبونەوەو ئەو وڵاتە دیاردەی شارەستانی تێدا بـەدی نـەدەکراو عەرەبـەکان ئـەوەیان لـەیاد نـەمابوو کـە لـە رۆژگـاری دێرینـدا خـاوەنی شارەسـتانیو نـەخشو نیگـاری بیناسـازی بـوون، ئامۆژگـاری زۆرو زەبەنـدە لـەم

بــارەوە ئامــاژە بــۆ ئەوەیــە کــە موســوڵمانان لــەوەپاش تێکــەڵاوی چــەند گــەل نەتەوەیەکی خاوەن ژیـارو شارەسـتانی دەبـن. بـەڵێ: ئەوەنـدەی پـێ نەچوو زۆری نەبرد کە فوتوحاتی ئیسلامی بەهەر چوارلادا پەلی هاویشتو بڵاو بووەوە!

لـەپاش لـە دونیـا دەرچوونی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) لـە مـاوەی سـەدەیەکدا دەســەڵاتی ســوپای ئیــسلام گەییــشتە چــوارییەکی وشــکانی زەوی، موســوڵمانان بــە قەسرو باڵەخانەو دیاردەی شارەسـتانی ئـەو گـەل نەتەوانـە ئاشـنابوون، چـەندەها کەنیـشتەو ئاتەشـگەدەو دێـرو هورمزدانیـان چـاو پـێ کـەوت، هـەموویان وەکـوو خۆیـان هێـشتنەوەو هیـچیان نەڕوخانـدنو زەرەرو زیانـان پـێ نەگەیانـدن، ئەمـە بەڵـگەیە لەسـەر ئـەوە کـە ئیـسلام ئـایینێکی گـشتی جیهانییـەو بـۆ هـەمووکاتو شوێنو گەلو نەتەوەیەك گونجاوە.

## فەرمانکردن بەچاکەو نەیکردن لە خراپە:

ئایینی ئیسلام لەوکاتەدا کە بنەمای ڕاوێـژو شـوڕای دانـاوەو داوای کـردوە کـە پەیڕەو بکـرێ، لـە هـەمان کاتیـشدا بـەواجبی دانـاوە کـە هەمیـشە لـەناو دەوڵـەتی ئیسلامیدا کۆمەڵێك هەبن لە ئەهلی (حیلو عەقد)و پیـاو مـاقوڵو لێهـاتوو زانـا نوێنەرایەتی گەل بکەنو چاودێری ڕامیاریو شێوەی فەرمانڕەواییان بکەن... ئـەم کۆمەڵە ئەو کۆمەڵەن کە پەروەردگار دەفەرموێ:

{وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ - سورة آل عمران١٠٤}.

ئەم کۆمەڵە ئەرکی سەرشانیان ئەوەیـە کـە چـاودێری فـەرمانڕەوایان بکـەنو ببنە سەرچاوەی تەشـریعو قانوونیـان، بانگـەوازی خەڵـك بکـەن بـۆ چاکەکردنو (نـەهی)یـان لێبکـەن لـە خراپـەکردنو ئامۆژگـاری خەڵـك بکـەن بـۆ پـەیڕەوی چاکەکاریو دوورکەوتنەوە لە خراپەکردن. چاوە نەبێ فەرمان بەچاکەو نـەی لـە خراپــە هــەر ئــەرکی سەرشــانی ئــەو کۆمەڵەتایبەتــە بــێ، بــەڵکوو هــەموو موسوڵمانێكو هەرەیەکە لەئاست خۆیەوە بەرپرسیارە کە فەرمان بە چاکەو نـەی لە خراپە بکا. ئەوەتا دەفەرموێ:

{وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ - سورة التوبة – ٧١}.

لەم ئایەتەدا پەروەردگار بەڵێنی بە موسوڵمانان داوە ئەو موسوڵمانانەی ئەرکی فەرمان بە چاکەو نەیکردن لە خراپە ئەنجام دەدەن بەڵێنی داونێ کە چاوەدێرییان بکاو یارمەتییان بدا!

لە شوێنێکی تردا پەروەردگار فەرمان بە چاکە رون دەکاتەوەو دەفەرموێ:

{وَالْعَصْرِ، إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ، إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ}.

لەم سورەتە پیرۆزەدا پەروەردگار خەسارەتمەندیی هەموو گرۆی ئادەمیزادی راگەیاندووە، ئەمجار کۆمەڵێك موسوڵمانی لەم سەرگەردانیو خەسارەتمەنییە جیا کردۆتەوە ئەو کۆمەڵەش ئەوانەی کە ئامۆژگاری یەکتری دەکەن بۆ راستاڵیو بە ئارامیو بانگەزای یەکتری دەکەن بۆ چاکەکردنو دوورکەوتنەوە لە خراپەکاری!

قورئانی پیرۆز سەر گورشتەی نەتەوەی (ئیسرائیل)مان بۆ دەگێڕێتەوە کاتێك کە فەرمان بە چاکەو نەیکردن لەخراپەیان تێدا نەما دەفەرموێ:

{لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى لِسَانِ دَاوُودَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ذَلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ، كَانُواْ لاَ يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ - سورة المائدة – ٧٨-٧٩}.

لێرەدا بە ئاشکرا پەروەردگار نەفرەتو دووربون لە رەحمەتی خۆی بۆ ئەو کۆمەڵەی نەوەی ئیسرائیل چەسپاندووە نەفرەتیش خۆی لە خۆیدا سزایەکی هەرە کوشندەو بە ئێشە، چونکە نەفرەت بریتییە لە دەرکردنو دورخستنەوەی نەفرەت لێکراوە کە لە سۆزو رەحمەتی خوداو بێ بەشبوونی لە یارمەتیو چاودێری پەروەردگار! ئاشکراشە هەر نەتەوەیەك گەیشتە ئەو ئاستە خودا نەفرەتی لێ بکا ئەوە نەتەوەیەکی ماڵ وێرانو نەگبەتو سەر لێشێواوە، هەر لە ئایەتەکەدا پەروەردگار هۆی ئەم نەفرینەی ئاشکرا کردوە کەئەویش سەرپێچی

کردنی فەرمانی خوداو سنوور بەزاندن‌و نەهی نەکردنە لەخراپە، ئەمجار کردەوەکەیانی بە خراپترین کردەوە لەقەڵەم داوەو دەفەرمویٚ: (لیس ما كانوا يفعلون) پێغەمبەری مەزنیش لەم بارەوە ئامۆژگاری زۆرەو دەفەرمویٚ: (الدين النصيحة: فسأله صحابة لمن؟؟ قال: لله ولرسوله ولأئمة المسلمين وعامتهم) واتە: ئایین بریتییە لە ئامۆژگاریکردن، هاوەڵێك وتی: قوربان! ئامۆژگاری بۆکێ؟! فەرمووی: بۆ خوا بۆ پێغەمبەری خودا بۆ فەرمانڕەوایانی موسوڵمانان‌و گشت موسوڵمانان. یان دەفەرمویٚ: (من رئى منكم منكرا فليغيره بيده فان لم يستطع فبلسانه فان لم يستطع فبقلبه وذلك أضعف الإيمان).

ئابەم بنەماو مەبدەئانە ئایینی ئیسلام هەوڵی داوە بۆ پێکەوەنانی رای گشتی‌و جەماوەری بەرەو ئامانجێکی پیرۆزو بەرز بە جۆرێك کە رەگ‌و ریشەی فەسادو ئاژاوە لە بێخ دەربێنی‌و نەهێڵێ: لە هیچ شوێنێك سەرهەڵدا. ئاشکراشە کە هیچ شتێك بە قەدەر ئەوە خەتەرناك نییە بۆ گەل‌و نەتەوە کە برێك لە تاکەکانی کۆمەڵ بە ئاشکرا سنوور بەزێنی بکەن‌و سنووری پاوانی ئایین‌و دەوڵەت‌و مافی گشتی ببەزێنن‌و کەسیش ئەرکی بەرپەرچدانەوەی نەخاتە سەرشانی خۆی بەرهەڵستی ئەو کارە ناوڕەوایە نەکا.

## شەریعەتی ئیسلامی (التشريع الإسلامي):

تا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لە ژیاندا بوو موسوڵمانان لە هەموو کاروبارێکی ئایینیدا پرس‌و رایان پێ دەکردو پەیڕەوی فەرموودەکانیان دەکرد، هەر کێشەو نیزاعێك ببوایەو روداوێك بهاتایە پێش تەشریفی حەلی دەکردو رای شەرعی تێدا دەردەبڕی‌و کۆتایی بە کێشەکە دەهێنا، بە کورتی لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا بنەماکانی شەریعەت داکوتران‌و بناغەی شەریعەت دامەزرا..

کاتێك پێغەمبەر لە دونیا دەرچو هاوەڵان هەموویان شیاوی ئەوە نەبوون کە فتوابدەن‌و کێشەو نیزاع حەل بکەن، بەڵکوو برێك لە هاوەڵان – بەهۆی ئەوەی کە زۆر لەگەڵ پێغەمبەردا ژیابوون زۆرجار بە ئاگاداری ئەوان پێغەمبەر (درودی خودای

(سەرچاوە) حەلی کێشەو نیزاعی کردبوو – زیاتر لە ناوەڕۆك و روحی شەریعەت حالّی بوو بوون و کارامایییان لە حەلکردنی مەسائیل و ڕووبەڕووبوونەوەی رووداودا پەیداکردبوو، لێزانییان لە دوشتدا گەییشتبووە ئاستێکی بالاّ:

یەکەم: تێگەیشتن لە دەقە قورئانییەکان و فەرموودەکانی پێغەمبەر دەرهێنانی ئەو حوکمەی کە لێیان – وەردەگیرێ و ئاماژەی بۆ دەکەن!

دووەم: دەرهێنانی حوکمی شەرعی بەهۆی لێکۆلێنەوەو لێ وردبوونەوەو کۆشش و ئیجتیهادەوە ئەمەش لەو مەسەلانەدا کە لە دوای لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەر ڕووبەڕوی موسولّمانان دەبوونەوەو لە قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەردا ئاماژەیان پێ نەکرابوو رون نەکرابوونەوە.

هاوەلاّنی پێغەمبەر ئەم دەسەلاّتە تەشریعییەیان لە ڕێی دەسەلاّتی جێ نشینەوە یان بەهۆی هەلّبژاردنیان لە جەماوەرەوە نەدراوەتێ! بەلّکوو بەهۆی زیادەمانەوەیان لە خزمەت پێغەمبەرداو گوێ گرتنیان لە قورئان خوێندنی پێغەمبەرو رونکردنەوەی مەبەستە قورئانییەکان و فەرمودەکانی خودی پێغەمبەر خۆی و ئاگادارییان بەسەر چەندەها حوکمکردنی پێغەمبەر بۆ رووداوە جیاجیاکان و هەروا بەهۆی لێهاتویی و زانایی و تێگەیشتوییان و هەروەها بەهۆی دەستەبەربوونی ئەم (ممیزاتە) بۆیان سولّتەی تەشریعییان دراوەتە دەست و موسولّمانان کردویانن بە فتوادەری خۆیان گوێ بیسی فەرمانەکانیان بوون و بەناو جیهانی ئیسلامدا بلاّو بوونەوە بۆ ئەنجامدانی ئەو حوکمە شەرعییانەو بەجێهێنانی ئەم واجبە خوداییە. ئەوەبوو لە هەموو ولاّتێکی ئیسلامیدا کۆمەلّێك لەم هاوەلاّنەی پێغەمبەر هەبوون، لێپرسراوان و کۆمەلّی موسولّمانان پرس و ڕایان پێ دەکردن، لە کاروباری ئایینی دا دەچونە لایان و داوای حوکمی شەرعییان لێ دەکردن فتوایان لێ وەردەگرتن لە هەموو شارو ولاّتێکی ئیسلامدا کۆمەلّێك موسولّمان لە دەوری ئەم زانایانە کۆبوونەوەو قورئانیان لێ وەردەگرتن و چۆنیەتی دەرهێنانی حوکمی شەرعییان لێ فێر دەبوون و فتوایان بۆ موسولّمانان دەدا.

## نووسینەوەی شەریعەت (تدوين التشريع):

سەدەی یەکەمی کۆچی تێپەڕبوو هێشتا دەوڵەتی ئیسلامی – جگە لە قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەر – هیچ قانوونو یاسایەکی تری نەبوو، ئەهلی فتوا لە هاوەڵانی پێغەمبەرو چینی دوا ئەوان ئەگەر دەقێکی ئەم دوو سەرچاوەیان دەست بکەوتایە پەیڕەوییان دەکردو شوێنی دەکەوتن، ئەگینا تێفکرینو بیرو بۆچوونی خۆیان دەخستە گەڕو لە ئاکام دا بە قەناعەتی خۆیان فتوایان دەدا، ئەم فتوایە یان بڵێین ئاکامی ئەم ئیجتهادو تێکۆشانە نەدەنووسرایەوەو نەدەکرا بە قانوون یاسا، ئەگەر سەرچاوەکەی لە قورئانو حەدیسەوە هەڵنەقولایە! بەڵام دوایی کە سوپای رزگاری ئیسلام بەزوربەی وڵاتان دا بڵاو بووەوە فتوادەرانو شەرعزانان بە وڵاتاندا بڵاو بوونەوەو لێك دووركەوتنەوە، ترسی ئەوە پەیدا بوو کە حوکمە شەرعییەکان پچڕ پچڕ ببنو پشێویو فەوزا بکەوێتە ناو تەشریعەوە! ئەمەش موسوڵمانانی هەڵنا بۆ ئەنجامدانی دوو شت:

**یەکەم:** نووسینەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەری مەزن.

**دووەم:** لێکۆڵینەوەی (مجتهد)ەکان چۆنیەتی توێژینەوەو ئاکامی ئیجتهادەکەیانیان نووسیەوە، چۆنیەتی وەرگرتنی حوکمو ئەو بنەماو یاسایانەی پەیڕەویان دەکرد چەسپاندیان! هەرەیەکە لەم زاتانە- ئەبو حەنیفەو مالیكو شافیعیو ئەحمەدی کوڕی حەنبەلو زەیدی کوڕی عەلیو جەعفەری صادیق .. هتد – هەر لەوکاتەوە شەرعزانانی ئیسلام لە هەموو روداوو مەسئەلەیەکدا سەیری دەقەکانی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەرو ئاکامی ئیجتهادی موجتەهیدەکانیان دەکرد، ئەمەش هیچ زیانێکی تێدا نییە چونکە گەڕانەوە بۆ ئاکامی ئیجتهادی موجتەهیدەکان لە تێگەییشتنیان لە قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە هەڵقولاوە.

## بڕێك لە بنەماكانی تەشریعی ئیسلامی:

هەر كەسێك لێكۆڵینەوە لەو حوكمە شەرعییانەدا بكا كە قورئان لەخۆی گرتوون – هەر لە عەقائیدو خوا پەرستییەوە تا باسی مامەڵەو سزاو پاداش‌و چۆنیەتی ژن‌و ژنخوازی، بۆی دەردەكەوێ كە حیكمەت لە تەشریعی قورئان‌و حەدیث بریتییە لە دەستەبەركردنی بەرژوەندی گشتی بۆ ئادەمیزادو پەیرەوكردنی دادوەری لە نێوانیاندا هەر لەبەر ئەوەیە خودا كە وەسفی قورئان دەكا دەفەرموێ:

{إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يِهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ - سورة الإسراء – ٩}.

واتە: ئەم قورئانە خەڵك شارەزایی دەكا بۆ ڕێبازێك كە لە هەموو ڕێبازەكان راسترو پیرۆزترە.. لە وەسفی بەرنامەكەی پێغەمبەریش دا دەفەرموێ:

{يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلاَلَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ - سورة الأعراف – ١٥٧}.

واتە: فەرمانیان پێ دەكا بە چاكەو (نەهی)یان لێ دەكا لە خراپە، شتی پاك‌و خاوێنیان بۆ حەڵاڵ دەكاو پیسییان لێ قەدەغە دەكا، كۆت‌و زنجیرو داب‌و نەریتی نەزانییان لەكۆڵ دەكاتەوەو ڕێگای ژیانیان بۆ ئاسان دەكا. بێگومان زانایانی شەرعزان هەستیان بەم راستییە كردوە لە نووسینەكانیاندا ئاماژەیان بۆ كردوە، ئەوەتا ئیمامی شاتبی لە كتێبی بەناوبانگی (الموافقات) دا، دەفەرموێ: (حوكمە شەرعییەكان، بۆ بەرژەوەندیی ئادەمیزاد ڕێكخراون، لە هەر شوێنێك‌و هەر كارێكدا بەرژەوەندیی موسوڵمانان هەبێ ئەوە شەرعی خودایە).

ئیمامی ئیبنولقەییمی جەوزی لە كتێبێكی دا بەناوی (الطرق الحكيمة)دا دەفەرموێ: (پەروەردگار پێغەمبەرانی رەوانەكردوە پەڕاوی بۆ ناردون بۆ ئەوەی ئادەمیزادەكان دادوەرانە هەڵس‌و كەوت بكەن پابەندی ئەو عەداڵەتە بن كە لەنگەری ئەرزو ئاسمانی ڕاگرتووە، لەهەر شوێنێك نیشانەكانی دادپەروەری دیاربوو روناكایی بەدەركەوت ئەوە شەرعی خودایەو ئایینی خودایە.

لەبەر رۆشنایی ئەم راستیيانەی لە پێشەوە گوتران دەبینین زانایانی شەرعی ئیسلامی هەموو بنەما تەشریعییە گشتییەکانیان لە قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە هەڵهێنجاوە، ئەم بنەما تەشریعییانە وەکوو دەستوورێکی هەمیشەیی وان، شەرعزان (فقیە) دەتوانێ بەشی خۆی لێ وەربگرێ! هەر بنەمایەك لەم بنەمایانەی کە لەمەدوا باسیان لێوە دەکەین دەبینی هەریەکەیان بەهۆیەکەوە پەیوەستە کە بەرژەوەندی ئادەمیزادی لەخۆ گرتووەو زەمینەی چەسپاندنی دادوەری خۆش دەکاو بەکەڵکی هەموکاتو شوێنێك دێن.

## ئەو بنەما تایبەتیانەی کە زیان دووردەخەنەوە:

هەندێ لەو بنەما شەرعییانەی کە تایبەتن بە دوورخستنەوەی زیان لە ئادەمیزاد لەم فەرموودەی پێغەمبەر کە دەفەرموێ: (لا ضرر ولا ضرار) وەرگیراون ئەمانەن:

١- الضرر يزال شرعا: زیان قەلاچۆدەکرێ. واتە: نابێ کارێك بکەین زیان لەخەڵك بدەین، ئەگەر کرا زیاد لێ کەوتوو مافی ئەوەی هەیە داوای مافی خۆی بکا، کەوابوو جیران یان شەریك دەتوانێ بەگوێرەی بنەمای (شفعة)ماڵی فرۆشراوی شەریکی خۆی یان هاوسێی هەڵبگرێتەوە، هەر کەسێك ماڵی کەسێکی فەوتاند دەبێ بیبژێرێت، خۆپاراستن لە نەخۆشی پێویستە.

٢- الضرر لا يزال بالضرر: واتە: زیان بەزیان لاناچێ، ئەمەش ئەوە دەچەسپێنێ کە نابێ مرۆڤ بۆ ئەوەی زەوی خۆی نوغرۆ نەبێ زەوی خەڵکی تر نوغرۆ بکا لافاو لەسەر موڵکی خۆی لابدا بیخاتە سەر زەوی خەڵك. یان بۆی نییە بۆ ئەوەی ماڵو سامانی خۆی بپارێزێ ماڵو دارایی خەڵکی تر بفەوتێنێ.

٣- يتحمل الضرر الخاص لدفع الضرر العام: زیانی تایبەتی لە ئەستۆ دەگیرێ بۆ نەهێشتنو دوور خستنەوەی زیانی گشتی، ئەمەش ئەوە دەچەسپێنێ کە بکوژ دەکوژرێتەوە بۆ دەستەبەروبونی ئاسایشی گشتی، دیوارێك کەورگی دابێو نزیك

بێ بڕۆخێو کەوتبێتە سەر ڕێگای گشتی دەڕوخێنرێ نەبادا لە نکاوێك بڕوخێ خەڵکی ژێر بکەوێ.

٤- يرتكب أخف الضررين لاتقاء أشدهما: سوکترین زیان لە ئەستۆ دەگیرێ بۆ خۆپاراستن لە زیانی گەورە، ئەمەش ئەوە دەچەسپێنێ کە قازی دەتوانێ ژنی کابرایەك تەڵاق بدا هەر کاتێك زانی کە ژنەکە توشی زەرەر بێ کە لەژێر نیکاحی پیاوەکەیدا بمێنێتەوە یان پیاوەکە نەتوانێ ژیانی دەسبەر بکا.

٥- دفع المضار مقدم على جلب المنافع: دوورخستنەوەی زیان پێش سود وەدەست خستنە، لەمەوە ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێ کە خاوەن ماڵ مەنع دەکرێ لە دەسەڵاتداری ماڵی خۆی هەرکاتێ زانرا کە تەصروفەکەی زیان بەخەڵکی تر دەگەیەنێ.

## بنەما تایبەتیەکان بۆ لەمپەڕ دانان لەبەردەم پشێوی و فەسادا:

یەکێك لەو بنەمایانەی تایبەتە بە لەمپەڕدانان لەبەردەم پشێوی و فەسادا کە زانایان ئاماژەیان بۆ کردوە ئەم ئایەتە قورئانییە کە دەفەرموێ:

{وَلاَ تَسُبُّواْ الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللّهِ فَيَسُبُّواْ اللّهَ عَدْوًا بِغَيْرِ عِلْمٍ - سورة الأنعام – ١٠٨}.

لەم ئایەتەدا پەروەردگار جنێودانی بە خودا درۆزنەکانی کافرەکان حەرام کردوە – لەگەڵ ئەوەشا ئەو جۆرە جنێوە سوکایەتی کردنە بەو خودا درۆزنانە – بەڵام چونکە ئەو جنێودانە دەبێتە بیانو بۆ ئەوەی کافرەکانیش جنێو بە خودا بدەن، ئایینی ئیسلام حەرامی کردوە.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەربارەی لەمپەڕنان لە بەردەم بڵاو کردنەوەی فەسادا دەفەرموێ: (ومن حام حول الحمى يوشك أن يقع فيه الا أن حمى الله محارمه).

واتە: کەسێك مەڕو ماڵاتەکانی لە دەوری پاوان بلەوەڕێنێ نزیکە مەڕەکانی بچنە ناو پاوانەکەوە، ئاگاداربن پاوانی خودا ئەو شتانەیە کە حەرامی کردوون.

ئابەم جۆرە زانایانی موسوڵمان ئەم بنەمایانەیان وەرگرتوون و لەژێر رۆشنایی ئەواندا تەشریعییان داناوەو نووسیوەتەوە، بۆ نموونە فەرموویانە: (ما لا یتم الواجب إلا به فهو واجب) هەر شتێك بێ ئەو واجب تەواو نەبێ واجبە. یان دەفەرموێ: (ما ضر کثیره حرم قلیله) هەر شتێك زۆرەکەی زیانبەخش بێ کەمەکەی حەرامە. زانای بەناو بانگ ئیبنو لقەییم ئەلجەوزی لە بەرگی سێیەمی (أعلام الموقعین)دا ئەم بنەمایانەی شی کردونەوەو (٩٩) نەوەدو نۆ نموونەی هێناوەتەوە لەو شتانەی کە شەریعەت فەرمانی پێکردوە یان نەی لێ کردوە، بڕێك لەو نموونانە ئەوەیە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) مەنعی کردوە کە پیاوێك دوو ژن بێنێ ئەو دوو ئافرەتە پوورو خوشکەزا یان پورو برازای یەکتری بن... فەرموویەتی ئەگەر وابکەن صیلەی رەحمیان دەپچڕێنن، تەنانەت ئەگەر ئافرەتەکان رازیش بن هەر دروست نییە چونکە ئەو رفتارە دەبێتە بیانوو بۆ لێك پچڕانی خزمایەتی، هەروەها شەریعەت شایەتی دوژمنی لەسەر دوژمنی خۆی مەنع کردوە بۆ ئەوەی نەتوانێ لە رێگای شایەتیدانەوە مەبەستی دوژمنکاری خۆی ئەنجام بدا! هەروەها پێغەمبەر مەنعی کردوە کە پیاو شەوانە لای ئافرەتێکی نامەحرەم بمێنێتەوە چونکە ئەومانەوە دەبێتە هۆو رێگە خۆشکەر بۆ زینا.

هەروەکوو چۆن پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) مەنعی کردوە کە پیاو خوازبێنی بەسەر خوازبێنیدا بکا، یان سەودا بەسەر سەودای خەڵکدا بکا، چونکە ئەم جۆرە رفتارانە دەبنە هۆکار بۆ دژایەتیو دوژمنکاری لە نێوانیاندا.

## بنەما تایبەتییەکانی لابردنی ئەرك (المبادیء الخاصة برفع الحرج)

زانایانی ئیسلام ئەو بنەمایانەیان لەم ئایەتانە وەرگرتووە:

{لیس عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ - سورة الحج - ٧٨}.

پەروەردگار هیچ ئەرکێکی قورسی نەخستۆتە سەر شانتان. یان دەفەرموێ:

{يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ - سورة البقرة - ١٨٥}.

پــەروەردگار دەیــەوێ ئــەرکی سەرشــانتان ئاســان ئــامێز بــێو قورســایی‌و نارەحەتی نەخاتە سەرشانتان. یان دەفەرموێ:

{لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا - سورة البقرة – ٢٨٦}.

پەروەردگار لە هیچ کەسێك زیاد لەتوانای خۆی داوای لێ‌ناکا.

ئەو بنەمایانەی کە زانایان لەم ئایەتە وەریان گرتووە ئەمانەن:-

١- المشقة تجلب التيسير: نارەحـەتی ئاسان خـوازە، ئەمـە ئـەوە دەچەسـپێنێ‌و دەگەیەنێ کە شەریعەت ڕێگەی داوە ڕۆژووەوان کە سەفەری کرد یان نـەخۆش بـوو بە ڕۆژوو نەبێ. هەروەکوو چۆن ڕێگەی داوە لە سەفەردا نوێـژ کـورت بکرێتـەوەو کۆبکرێنەوە! ئەرکی حەجکردنیشی لە نەخۆش‌و نەدار دا لابردووە.

٢- الحـرج مرفـوع شـرعاً: واتـە: حـەرەج‌و ئـەرك دەبـێ لابـبرێن. ئەمـە ئـەوە دەچەسپێنێ کـە بەتـەنها شـایەتی ئـافرەت وەربگـیرێ لەوشـتانەدا کـە نـاکرێ پیـاو بیان بینێ وەکوو ئەو شتە تایبەتیانەی کەپەیوەندییان بەئافرەتەوە هەیە.

٣- الحاجـات تنـزل منزلـة الـضرورات في إباحـة المحظـورات: واتـە: پێداویـستی وەکوو زەروری وایە حـەرام حـەلاڵ دەکـا. لـەم بنەمایـەوە زۆر لەسـەوداو مامەڵـەو شــێوەی کومپانیــاو هــەڵس‌و کــەوتی بازرگانــەکان‌و پێداویــستی جــۆری بازرگانییەکەیان سنووردار دەکرێن‌و ڕێگەیان پێ دەدرێ، هەروەها کاتێك بەڵـگەی ڕاست‌و دورستمان دەست کەوت کە جۆرێك لـەو سـەودایانە یـان هـەڵس‌و کـەوتێك تیاندا پێویستەو جەختی لەسەرەو ئادەمیزاد پێویستی پێیـەتی ئەگـەر نەیکەن‌و لێیـان حـەرام بکـرێ توشـی ئـەرك‌و ئـورکێکی نـاخۆش دەبـن، ئـەوە ڕێگـەیان پـێ دەدرێ بە ئەندازەی ئەوە کە حەرەجەکەیان لەسەر لاچێ سنووربەزێنی بکەن!

## بنەمای ئەوە کە پێویستی حەرام حەلاڵ دەکا:

زانایانی ئیسلام ئەم بنەمایەیان لەم ئایەتە دەرهێناوە کە دەفەرموێ:

{فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ - سورة البقرة – ١٧٣}.

واتە: کەسێك ناچار بوو بە ئەندازەی پێویستی خۆی دەستی بۆ حەرام برد ئەوە گوناهی لەسەر نییە، ئەمجار پەروەردگار لە ئایەتێکی تردا باسی ئەوانە دەکا کە زۆریان لێ دەکرێ، سەرزارەکیو بە ناچاری کوفر دەکەن بەلاّم دڵیان پڕ لە نووری ئیمانە:

{إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ - سورة النحل – ١٠٦}.

هەر لەم بنەمایەوەیە کە بۆ زۆرلێکراو دروستە کە سەرزارەکی وشەی کوفر ئامێز بڵێو دڵی پڕبێ لە نووری ئیمان، هەروەها دروستە لەکاتی پێداویستیو ناچاریدا گۆشتی مردارەوەبوو بخورێو عەرەقو بیرە بخورێتەوە، هەروەها حەلاّڵە لەکاتی برسییایەتیو پێداویستیو ناچاریدا ماڵی خەڵك بخوی بە ئەندازەی ئەوەی کە برسییایەتییەکەی نەمێنێ!! بەڵێ شەریعەتی ئیسلام لەسەر ئەم جۆرە بنەمایانە ئەحکامەکانی دامەزراون!!

## ئەو بنەمایانەی کە تایبەتن بە پاكو خاوێنی بناغەی هەموو شتێك، هەموو شتێك لەسەرتاو بناغەدا حەلاڵو پاكو خاوێنە

زانایانی ئیسلام ئەم بنەمایەیان لەم ئایەتەوە وەرگرتووە کە دەفەرموێ:

{هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً - سورة البقرة – ٢٩}.

واتە: پەروەردگار خودایەکی وایە هەرچی لە زەویدا هەیە بۆ سودو قازانجی ئێوەی دروست کردوە... یان ئەم فەرموودەی پێغەمبەر کە دەفەرموێ: (كل مولود يولد على الفطرة) واتە: هەموو منداڵێك بەبێ خەوشی لەدایك دەبێ، ئەمجار زانایان چەند مەبدەئێکیان لەم دەقانەوە هەڵساندووە کە ئەمانەن.

١- هەموو شتێك لە بناغەدا حەلاڵو پاكو خاوێنە.

٢- ئەصڵ لە مرۆڤدا بێ تاوانیو پاكییەتییە تا بەڵگەی تاوانباریی پەیدا دەبێ.

ئەوەی گوترا: بڕێك بوو لەو بنەمایانەی کە تەشریعی ئیسلام ی لەسەری دامەزراوەو هیچ خاوەن ویژدانێك گومانی لەوەدا نییە کە بنەماکان دادوەرانەنو دژایەتی لەگەڵ بنەمای هیچ شەریعەتێکی تری عادلانەدا ناکا.

**شەریعەتی ئیسلامی بۆ هەموو شتێك دەبێ‌و بۆ هەموو كۆمەڵـگایەك گونجاوە:**

هەرگیزاو هەرگیز قانوون‌و یاسای ئیسلامی لەبەرامبەر هیچ رووداوێكدا دۆش دانـەماوەو نەبۆتـە لەمپـەڕ لەبـەردەم بەرژەوەنـدی گـشتی‌و دادوەریـدا. بەڵـكوو دەبینین بەرژەوەندی جۆی جوێی هەموو كۆمـەڵ‌و كەسـێكی پاراسـتووە، بێگومـان دەوڵەتی ئیسلامی لە چاخە زێڕینەكانی دا روبەرەكانی لـە رۆژهەڵاتـەوە هـەروەها لـە چـینەوە تاكێوەكـانی ئیـسپانیا، لـە رۆژئاوایـەوە داگـیری كردبـوو. (دەریـای سپی)یـش بـوو بـووە دەریایـەكی ئیسلامی، ئـاڵای ئیـسلامی بەسـەر مەملەكـەت‌و فەرمانڕەواكانیـدا دەشـەكایەوە، ئـەم وڵاتانـە چـەندەها گـەل‌و نەتـەوەی وەكـوو عـەرەب‌و فـارس‌و تـورك‌و كـوردو رۆم‌و هـۆزو خێڵـی جـوێ جوێیـان تێـدابوون‌و جۆرەها داب‌و نەریت‌و ئایین‌و بەرژەوەندی‌و بیرو بۆچونیان لەناودا بوو، دەوڵەتی ئیسلامی بە قانوون‌و یاسای خۆی كاروباری ئەم گەل‌و نەتەوانـەی هەڵدەسـوڕاندو فـەرمانڕەوایی دەكـردن، هـەرگیز نەبیـستراوە لـە مێـژوودا كـە موسـوڵمانان لـەو چاخانەدا لەبەرامبـەر رووداوەكانـدا دۆش دابمێـنن‌و دەسـتەو ئـەژنۆ دابنیـشن. یـان یاسـا لـەقانوونی وڵاتـانی تـر وەربگـرن، بەڵـكوو هـەركاتێ خـودا ی پـەروەردگار یارمەتی موسوڵمانانی دابێ‌و وڵاتێكیـان رزگـار كردبـێ زانایـانی ئیـسلام بەهـەوڵ‌و كۆششی تایبەتییان‌و بەتێفكرین لە قورئان‌و حەدیث یاسـای پێویـست‌و گونجاویـان بـۆ ئـەو وڵاتانــە دۆزیوەتــەوە، هـەرگیز قـانوون‌و شـەرعی ئیـسلامی لەبــەردەم رووداوەكانـدا دەستەوەسـتان نـەبووە، لـە هـیچ بارێكـدا پـەكی نەكـەوتووەو هـیچ بەرژەوەندییەكی پاش گوێ نەخستووە، مافی هەموو كوڕو كۆمـەڵێكی پاراسـتووە، بەرژەوەندی موسوڵمان‌و جولەكەو فەلەو ئاییـنەكانی تـری دادپەروەرانـە بەرچـاو گرتـووە، هـەموو ئـەم ئاییـنانـەو گروپانـە لـەژێر سـایەی عەداڵـەتی ئیـسلامدا لـە ژیانێكی بەختەوەریدا ژیاون‌و كاروباری خۆیانیان ئەنجام داوە.

بەڵێ: تەشریعاتی ئیسلامی كە ئەو كاتە بـاڵا دەسـت بـوو تـەتبیق دەكـرا، زۆر پێشكەتوو تر بوو، لەم قانوونە مەدەنییەی ئێـستا لـە هـەموو رویەكـەوە، بنـەمای عەداڵـەت‌و مـرۆڤ دۆسـتی لـە ئـامێز گرتبـوو هەرچـی كۆمەڵـگای پێـشكەوتوو

پێویستی پێیەتی ئەو دابینی کردبوو، بێگومان زانایانی قانوون ئەوانەی کە خۆیان موسوڵمان نین، نەیان توانیوە ئەم راستییە بشارنەوە، بەڵکوو ئەم راستیەیان لە نووسراوەکانی خۆیاندا چەسپاندووە، ئەمەش بڕێ لە شایەتی ئەوزانا خۆر ئاواییانەیە وا لەمەدوا دەیانخەینەڕوو:

زانای بەناو بانگ (ساتنیلا) دەڵێ: بێگومان لە فیقهی ئیسلامی دا ئەوەندە بنەمای تەشریعی مەدەنی هەیە کە بەشی هەموو رووداوێکی موسوڵمانان بکا، بەڵکوو دەتوانین بڵێین: بەشی هەموو ئادەمیزاد دەکا.

(دکتور محمد صادق فەهمی میسری) نامەی دکتۆراکەی لە باسی (الاثبات)دا نوسیووو بەشی هەرە گرنگی نامەکەی دەربارەی ئەو مەسئەلانەبوو کە زانایانی شەریعەتی ئیسلامی بڕیاریان لەسەر دابوون و چەسپاندبویانن. کاتێك لیژنەی موناقەشە – کە هەموویان فەرەنسی بوون – لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا کردوو نامەکەیان پەسەندکرد مامۆستاکەی کە ناوی (لیفی أولمان) مامۆستایەکی بەناو بانگ بوو دەڵێ: بێگومان کتێبی دکتۆر شایانی ئەوەیە کە بخرێتە ریزی کتێبە زانستییە قانوونییەکانی سەردەم، لەمەوە دەتوانرێ بگوترێ: پێویستە شەریعەتی ئیسلامی بکرێتە سەرچاوەیەکی زیندو بۆ قانوونی تازە.

(هوکنج) کە توێژەرەوەیەکی ئەمەریکایی و مامۆستای فەلسەفەیە لە دانشگای هارفەرد لە کتێبێکیدا کە ناوی (روح السیاسة العالمیة)یەو ساڵی (١٩٣٢) چاپ کراوە باسێکی دوورو درێژی دەربارەی رۆشنبیری ئیسلامی نووسیوە دوای ئەوەی کە بەدرێژی دەربارەی بناغەی فیقهی ئیسلامی و چوار مەزهەبەکان دواوە دەڵێ: (ئەو رێبازەی کە دەوڵەتە ئیسلامییەکان بۆ پێشکەوتن پەیڕەویان دەکرد جیاواز بوو لەو رێبازەی کە وڵاتە خۆر ئاواییەکان گرتبوویانە بەرو پێیان وابوو ئایین مافی ئەوەی نییە کە هیچ هەڵوێستێکی دەربارەی ژیانی رۆژانەی ئادەمیزاد هەبێ و نابێ هیچ بۆچونێکی دەربارەی قانوون و یاسا ئاسمانیەکان هەبێ؟! بەڵکوو موسوڵمانانەکان پێیان وابوو دەبێ مرۆڤ سەرچاوەی پێشکەوتن و گەشەکردن لە ئاییندا بدۆزێتەوە!!

جاری وا هەیە هەندێ کەس پرسیار دەکەن‌و دەڵێن: ئایا یاسای ئیسلام لێی چاوەڕوان دەکرێ کە بیری تازەی تێدا گەشە بکاو ئەحکامی پێشکەوتوو سەربەخۆی وا دەربکا کە ژیانی سەردەم داخوازییەتی؟! بۆ وەڵامی ئەم مەسئەلە دەڵێین: یاسای ئیسلام هەموو ئامادە باشییەکی بۆ گەشەکردنی ناوخۆی تێدایە، نەك هەر ئەوەندە بەڵکوو یاسای ئیسلام لەبارەی ئامادەباشی بۆ پێشکەوتن‌و گەشەکردن زۆر لە یاساکانی تر گونجاوترە، کێشەکە لەوەدا نییە کە یاسای ئیسلام هاوکاریی پێشکەوتن‌و گەشەکردنی تێدایە یان نا؟ بەڵکوو هەڵەکە لەوەدایە کە هەلی بەکارهێنانی بۆ نەرەخساوە، بەڵکوو من پێم وایە شەریعەتی ئیسلامی هەموو بنەمایەکی گەشەکردن‌و پێشکەوتنی لە خۆگرتووە.

دکتۆر (ئەنریکو ئەنسایا توحین) دەڵێ: شەریعەتی ئیسلامی شان بەشانی رووداوو پێویستییە ئاشکراکانی مرۆڤ دەڕواو هەنگاو دەنێ. بەڵێ ئیسلام دەتوانێ گەشە بکاو پێشکەوێ بەبێ ئەوەی کە لاوازی بەخۆیەوە ببینێ‌و رۆژگار بتوانێ روناکایی بکوژێنێتەوە، بەڵکوو بەدرێژایی رۆژگار دەتوانێ ئیحتیفاظ بە هەموو هێزو پێزێ بکاو بەزیندوویی‌و گونجاوی روبەڕوی رووداوەکان ببێتەوە...

خوێنەری هێژا! ئیسلام ئەو ئایینەیە کە دامەزراوترو رێك‌و پێکترین شەریعەتی پێشکەشی ئادەمیزاد کردوە، شەریعەتەکەی لە زۆر رووەوە لە قانوونە ئەوروپاییەکان باشترو پێشکەوتووترو گونجاوترە.

ساڵی (١٩٣٢) گونگری دەوڵەتان کە لە (لاهای) بەسترا‌و دەربارەی بەرامبەریکردن‌و پێك گرتنی یاساکانی جیهان توێژینەوەی ئەنجامدا ئەوەی چەسپاند کە شەریعەتی ئیسلامی سەرچاوەیەکی قانوونی بەرامبەر کراو (القانون المقارن)ە ئیتر بەم جۆرە سەرچاوەکانی قانوون بوون بە چوار:- {قانوونەکانی فەرەنسا – قانوونەکانی ئەڵمانیا – قانوونەکانی ئینگلیزی – شەریعەتی ئیسلامی}.

ئەمەی گوترا: بڕێ شایەتیدانی زانایانی قانوون بوو دەربارەی شەریعەتی ئیسلامی، لەبەر درێژی کورتمان، هەر کەسێ بیەوێ لەم بارەوە زیاتر توێژینەوە

بکا سەرچاوە زۆرو زەبەنـدەن. نەتـەوە موسـوڵمانەکان هـیچ زیانێکیـان پـێ ناگـا ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی حوکم بەبنـەمای ئـەم شـەریعەتە بکـەن، بـە تایبـەتی دوای ئەوەی تاقیکراوەتـەوەو بەڵـگە لەسـەر گونجاوی‌و لـەباری بـۆ هـەموو گـەل‌و نەتەوەو کات‌و شوێنێك دەستەبەر بووە، چۆن وانیە؟! ئیسلام شەریعەتی خودایە:

{وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ - سورة المائدة – ٥٠}.

بۆیە ئـەرکی سەرشانی هـەموو حکومـەتێکی ئیسلامییە کە هەریەکەیان لـە عاسـت خۆیـەوە دەزگایـەکی زانـستی لـە باشـترین زانـا ئایینیـەکان‌و یاسـا نـاس‌و ئابوری ناس‌و کارگێڕان پێك بێنن ئەرکی سەرشانیان ئەوەبێ بە گوێرەی قورئان‌و فـەرموودەکانی پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەربێ) یاسـا بـۆ وڵاتەکـەیان دابنـێن، هـەروەها بگەڕێنەوە بۆ راوو بۆچونی موجتەهیدەکان لەو شتانەدا کە لەگەڵ بەرژەوەنـدی گەلـدا دەگـونجێن، هەرشـتێکیش لـەو روداوانـەی کـە روو بـەرووی گـەل‌و نەتـەوە دەبنەوە ئەگەر دەقێکی قورئان یان حەدیث دەربارەیان نەبوو بۆ چارەسەرکردنی، ئــەوە بــە تــەرازوی بەرژەوەنــدی گــشتی دەکێـشرێ، سـەیر دەکـرێ ئـاخۆ تـاچ ئەندازەیەك سودو قازانج بۆ کۆمەڵ‌و تاك دەستەبەر دەکا.

## جێنشین (الخلافة):

جێنـشین لــە ئــایینی ئیـسلامدا بــەمانا پێـشەوایەتییە واتــە: (الامامــە)و فەرمانڕەوایەتی موسوڵمانانە واتە: لێپرسـراویەتی گشتی لـەکارو بـاری دونیـایی‌و قیامەتیدا لە شوێنی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) جا ئەو کەسەی بەم کارانە هەڵدەسـێ پێی دەڵێن: خەلیفـەو پێشەوا: نـاوبردنی بـە پێـشەوا شـوبهاندنیەتی بـە ئیمـامی نوێـژ لـەوەدا شـوێن کـەوتنی پێویـستە، نـاوبردنی بـە خەلیفـە لەبـەر ئەوەیـە کـە جێنشینی پێغەمبەرە لە شوێنی ئەو کارو باری موسوڵمانان هەڵدەسوڕێنێ.

خەلافـەت: هەڵـسوڕاندنی کاروبـاری کۆمەڵـە بـە گـوێرەی داخـوازی شـەرع‌و دابینکردنی بەرژەوەنـدی هـەردوو دونیـایـان، چونکە چونیەتی کـارو بـاری دونیـا پەیوەنــدە بــە چــۆنیەتی بەرژەوەنــدی قیامــەت، وەکــوو دەڵــێن دونیـا کێڵــگە

(مەزرەعە)ی قیامەتە: بەڵکوو لە ڕاستی دا خەلافەت جێگریکردنی خاوەن شەرعە بۆ پاراستنی ئایینو رامیاری دونیا.

## کێ مافی ئەوەی هەیە خەلیفە دابنێو لێی بخا:

موسوڵمانانو پەیڕەوکارانی پەروەردگار (ئەهلی سوننەتو جەماعەت) پێیان وایە کە دانانی جێنشین (خەلیفە) فەرزی کیفایەیەو ئەوانەی داوایان لێ دەکری خەلیفە دابنێن (ئەهلی حیلو عەقدن) واتە پیاو ماقوڵانو گەورە لێپرسراوانو شەرعزانو ئەوانەی شارەزاییان لە بەرژوەندیو رامیاریو دادوەریو کارگێڕیدا هەیە.

ئەم سەرکردایەتیە بڵندە کە خەلافەتە لە حوکوومەتی ئیسلامیدا هەرە پلەی بەرەژووری دەسەڵاتە، چونکە خەلیفە دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی لە نوێنەرانی گەلەوە دەدرێتێ کە برێتین لە ئەهلی حیلو عەقد، مانەوەشی لەو لێپرسراویەتیەدا پابەندە بە بەردەوام بوونی سیقەی ئەو نوێنەرانە بەو جێشینەو دڵسۆزی خۆی بۆ دابینکردنو پاراستنی بەرژەوەندی موسوڵمانان.

هەر بۆیە زانایانی ئیسلام ئەوەیان چەسپاندووە کە گەل دەتوانێ – هەر کاتێك بە پێویست زانراو هۆکاری لە کارخستنی پەیدابوو – خەلیفە لە کاربخا! جا ئەگەر لادانی خەلیفە سەربکێشێ بۆ بەرپابوونی فیتنەو ئاشوبو پشێوی ئەوە تێبینی ئەوە دەکرێ ئاخۆ کام لایە لە هێشتنەوەی خەلیفە یان لەکار خستنی کەمتر زیان بە کۆمەڵگای موسوڵمانان دەگەیەنێ ئەولایەنە هەڵدەبژێردرێ.

لێپرسراویەتی خەلافەت لە هەموو لێپرسراویەك جیاوازە چونکە لێپرسراویی خەلافەت – وەکوو وتمان – لێپرسراویەکی گشتی ئایینیو دنیاییە.

## ئەو مەرجانەی پێویستن بۆ خەلیفایەتی :

زانایانی ئیسلام چەند مەرجێکیان بەرچاو گرتووە بۆ ئەو کەسەی دەبێتە جێنشین (خەلیفە). لێرەدا ئەو مەرجانەی کە ئەبولحەسەنی ماوەردی لە کتێبی

(الأحكام السلطانية)دا فەرموویەتی دەیانخەینە روو کە دەفەرموێ: کەسایەتی ئەوانەی کە دەگرێن بە جێنشین پێویستە حەوت مەرجیان تێدابێ:

یەکەمیان: دەبێ مەرجەکانی دادوەری تێدابن.

دووەم: دەبێ زانایی بگاتە پلەی ئەوەی بتوانێ لەکاتی روداودا ئیجتیهادی پێویست بکا.

سێیەم: هەستەکانی – بیستن و دیتن –و قسەکردنی ساغ و سەلامەت بن تا بتوانێ کارەکانی ئەنجام بدا.

چوارەم: ساغ و سەلامەتی ئەندامەکانی وەکوو دەست و قاچی تا بتوانێ وەکوو پێویست پەلاماری روداو بدا.

پێنجەم: زیرەك و راپەسەندبێ بە جۆرێك بتوانێ کاروباری رامیاری کۆمەڵگاکەیی و بەرژەوەندییان بە لێهاتوویی ئەنجام بدا.

شەشەم: ئازایەتی و لێبوردوویی و بەهانا چوونی لێقەوماوان. بەجۆرێك بێ کە بتوانێ پارێزگاری وڵاتی موسوڵمانان بکاو دژی دوژمنان بجەنگێ.

حەوتەم: بنەچە. دەبێ جێنشین لە نەوەی قورەیش بێ. چونکە فەرموودەی پێغەمبەری لەسەرەو ئیجماعی موسوڵمانانیشی لەسەر بەرپا بووە.

ئەم مەرجی حەوتەمەی کە ماوەردی چەسپاندوویەتی جێگای سەرنجەو زانایانی موسوڵمان کێشەیان تێیدا هەیە. بناغەی کێشەکەش لەوەوە هەڵدەستێ کە راستی حەدیسەکە نەچەسپاوەو لەگەڵ ئەو ئایەت و حەدیسانەی کە دەربارەی پوچەڵکردنەوەی بنەچە هاتوون دژایەتی هەیەو لەگەڵ ئەو دەقانەی کە لۆمەی ئەو کەسانە دەکا کە بانگەوازی بۆ رەگەز پەرستی دەکەن ناگونجێ!!.

ئەگەر قورەیشییایەتی بۆ بون بەجێنشین مەرج بووبێ لە سەرەتای بڵاو بوونەوەی ئایینی ئیسلام و سەروبەندی لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەر (درروودی خودای لەسەربێ)، ئەوە هۆیەکەی ئەوەیە کە ئەو کاتە هۆزی قورەیش پشت و هێزێکی باشیان هەبووە کە جێنشین پشتیان پێ ببەستێ بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان و ئەنجامدانی لێپرسراویەتی بەکاریان بێنێ! کەوابوو ئەوە مەرجێکی سەردەمی و

کاتییە ئەوە دەگەیەنێ کە جێنشین بێ لە هۆزێکی خاوەن پشتو قەوەت بێ بۆ ئەوەی بەهۆی هێزی هۆزەکەیەوە بتوانێ لێپرسراویەکەی ئەنجام بدا کەوابوو مەرجی قورەیشییایەتی مەرجێکی هەمیشەیی نییە.

## جیاوازی نێوان جێنشینیو پاپایی :

زۆر لە نووسەرە ئەوروپاییەکەن مەسەلەی جێنشینییان هێناوەتە ناو نووسینەکانیانەوەو شوبهاندەویانە بە پاپاییەتیەوە. بەلام لە راستیدا جێنشینی زۆر لە پاپاییەتی جیاوازە، بە جۆرێك کە ئەم دوانە لە هیچ شتێکدا یەك ناگرنەوە!!

چونکە (پاپا) کەڕادیلەکان هەڵی دەبژێرن کە رادیلەییش بۆ خۆی پاش پلەی پاپایی بەرزتین پلەی کاهینیەتییە. بەلام جێنشین (خەلیفە) مرۆڤێکی ئاساییەو ئەهلی حیللو عەقد هەڵیدەبژێرنو هەرکاتێکیش بەپێی قورئانو حەدیث نەجولایەوە، نوێنەرانی گەل دەتوانن لە کاری بخەن چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: (لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق) لەهەر شتێکدا سەرپێچیکردنی خودای تێدابوو بەقسەی کەس ناکرێ.

دەی پاپا هەڵوەشاندنەوەو چەسپاندن، لێخۆشبوونو بێ بەشکردن بە دەست خۆیەتی! بەلام جێنشین هیچ شتێکی لەم جورە شتانە بە دەست نییە، لە ئایینی مەسیحیدا راڤەکردنی کتێبی موقەدەس تایبەتە بە پاپاوە، بەلام لە ئیسلامدا جێنشین هیچ زێدە تێگەییشتنێکی لە قورئان نییە، بەڵکوو ئەوو قوتابیەکی تر لە تێگەییشتن لە قورئان چون یەکن! ئەگەر زێدەییەك هەبێ لە رووی هۆشمەندیو کارڕاستیو را دروستییەوە دەبێ.

## چی لەسەر جێنشین پێویستە بیکا بەرامبەر گەلەکەی؟

ئەرکی سەرشانی جێنشین بلاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلامە، چەسپاندنی تەرازوی دادوەرییە، پاراستنی ئایینە لەوەی کە دەست درێژی بکرێتە سەر. یان

دابو نەریتی پڕو پوچی تێدا پەیدا بکرێ. هەروەها راوێژکردنە لەگەڵ ئەهلی راوێژ لەو شتانە کە دەقێکی قورئان یان حەدیسی تێدا نەبێ. جێنشین بەر پرسیارە لە هەموو کردەوەیەکی کە ئەنجامی دەدا. هەموو یەکێك دەتوانێ یەخەی جێنشین بگرێو لەو شتەی کە پێی وایە خەلیفە هەڵەی تێدا کردوە. ئەهلی حیلو عەقدیش بۆیان هەیە لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکەنو بەرەو روی کردارەکانی خۆیی بکەنەوە!! پێغەمبەر دەفەرموێ: (الامام راع وهو مسؤول عن رعيته) جێنشین چاودێرەو بەرپرسیارە لە بەرامبەر گەلەکەیداو لێپرسینەوەی لەسەرە، (پەروەردگار)یش دەفەرموێ:

**{إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ - سورة النساء – ٥٨}.**

ئەمانەت: بریتییە لەهەر شتێك کە پێویست بێ پارێزگاری بکرێو بدرێتە خاوەنی خوی، کەوابوو کورسیو مەنصەبە گشتییەکان ئەمانەتن لە ئەستۆی جێنشیندا پێویستە بیداتە پیاوی کارامایی خۆی. ماڵو سامانی حکوومەت لە ئەستۆی ئەودایە، دەبێ لە شوێنی خۆیدا سەرفی بکا، ئەرکو مافی کۆمەڵو گروپەکان مافێکە لە ئەستۆی جێنشیندایە، دەبێ زەمینەی گونجاویان بۆ بڕەخسێنێ تا هەر کەسە ئەرکو مافی خۆی ئەنجام دا، ئەو (عەدلە)ی کە لە ئایەتەکەداهاتووە بریتییە لە فەرمانڕەواییکردن بە گوێرەی قورئانو هەرکەسە بەزوترین کاتو ئاسانترین شێوە حەقو مافی خۆی بدرێتێ!!

## یەکەم جێنشین لە ئیسلامدا چۆن هەڵبژێردرا:

حەزرەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لە دونیا دەرچوو، هیچ جێنشینێکی بۆ خۆی دانەنا،ماڵئاوایی لە موسوڵمانان کردو بەجێی هێشتن بەو شێوەیە تا بۆ خۆیان کاروباری خۆیان بەگوێرەی ئایەتەکانی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەر بەڕێوەبرن؟ تەنانەت لەناو گەورە گەورەی هاوەڵانیدا کەسێکی دیاری نەکرد بۆ جێنشینی!

مردنی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) چاوەڕوان نەکراو بوو لەلای هاوەڵانو کارەساتێکی ناگەهانو خورپە پەیداکەربوو بۆ موسوڵمانان، تەنانەت تا ماوەیەك تاساندنیو خەریك بوو بڕێك لە هاوەڵان ئایینەکەشیان لەدەست بدەن، ئەوەتا عومەری کوری خەتاب جۆرە تێکچونێك روی تێکرد کە چوو لە مەزگەوت پێغەمبەری بە مردویی بینی دەستی کرد بە هەراو هۆریا دەیگوت: پێغەمبەر نەمردووە چووە بۆ خزمەت خودا وەکوو چۆن موسا چوبو بۆ خزمەت خوداو دوای چل شەو هاتەوە ناوگەلەکەی. بە خودا پێغەمبەری خوداش دێتەوە، دەستو قاچی ئەوانە دەبڕێتەوە کە وادەزانن مردووە! تەنانەت دەگێڕنەوە کە عومەر شمشێری گرت بە دەستەوەو وتی خەڵکینە! زمانی خۆتان بگرن دەربارەی پێغەمبەر، پێغەمبەر نەمردووە، بە خودا ببیسم هەرکەسێ بڵێ مردووە بەم شمشێرە لەتەوقی سەری دەدەم.

عوسمان لاڵو پاڵ کەوتبوو دەمی گۆی نەدەکرد، عەلی دانیشتبوو جوڵەی لێ بڕابوو! ئالەم کاتە پڕ داخو ناسۆرەدا لەم ساتە تەنگانەیەدا حەزرەتی ئەبو بەکر هەستاو چووە سەر دوانگەو وتارێکی داو فەرمووی: خەڵکینە!

ئەو کەسەی موحەممەدی دەپەرست ئەوە موحەممەد مرد! هەر کەسێکیش پەروەردگاری دەپەرست ئەوە بێگومان پەروەردگار زیندووە نامرێ! ئەمجار ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

{وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىَ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللّهُ الشَّاكِرِينَ - سورة آل عمران – ١٤٤}.

ئیتر دوای خوێندنەوەی ئەم وتارە لەلایەن ئەبو بەکرەوە هاوەڵان وەئاگا هاتنەوەو تەرمی پیرۆزی پێغەمبەریان لە حوجرەکەی خۆی بەداپۆشراوی بەجێ هێشتو بەپێویستیان زانی پێش ئەوەی تەرمەکەی ئەسپەردەی خاك بکەن جێنشین بۆ خۆیان دیاری بکەن بۆ ئەوەی جڵەوی ئیشو کار بگرێتە دەستو کارو باری موسوڵمانان بەرێوەبەرێ، ئەوەبوو کۆبوونەوەیەکیان کردو لەناو

خۆیاندا راوێژو پرسو راگۆڕینەوەیان ئەنجامدا دوای سەعاتێك وتو وێژو راوێژ بەتێکڕای دەنگ حەزرەتی ئەبو بەکریان کردە جێنشینو دەنگیان پێداو بەیعەتیان پێکرد، کە بەیعەتەکە تەواو بوو حەزرەتی ئەبو بەکر چووە سەر مینبەرو وتارێکی خوێندەوەو تێیایدا فەرمووی: (ئەی خەڵکینە! من کرام بە فەرمانڕەواو جێنشین بەسەر ئێوەوە چاکترین کەسێکی ئێوەش نیم! جا ئەگەر ئیشی باشم کردنو راستو دروست رۆیشتم یارمەتیم بدەن، ئەگەر لاریێ رۆییشتم راستم بکەنەوە، راستگۆیی ئەمانەتە، درۆزنی خیانەتە، بێ وەچو لاواز لە ئێوە بەهێزو دەسەڵاتە هەتا مافی خۆی بۆ دەستێنمەوە، بەهێزو دەسەڵاتتان بەلای منەوە بێ وەچو بێهێزە تامافی لێ دەستێنم! با کەس لە ئێوە پشتی لە جیهاد ساردنەبێتەوە، چونکە هەر گەلو نەتەوەیەك واز لە جیهاد بێنێ خودا زەلیلو ژێر دەستەیان دەکا.. پەیڕەوی فەرمانم بکەن بە مەرجێك من بۆ خۆم پایەندی فەرمانی خوداو پێغەمبەربم، ئەگەر سەرپێچی فەرمانی خودامکرد ئێوە هیچم بە قسە مەکەن. فەرموون خەڵکینە! رەحمەتی خوداتان لێبێ با نوێژەکەمان بکەینو نوێژەکەمان نەفەوتێ..).

هەر کەسێك سەرنجی ئەو وتارەی حەزرەتی ئەبو بەکر بدا — کە یەکەم جارە دوای وەفاتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەنگی دەسەڵاتدارێکی ئاوا بەرگوێی موسوڵمانان بکەوێ — دەبینێ بنەمای دیموکراتی بە ئاشکرا خۆی دەنوێنێو هیچ کەمو کوڕیەکی تێدا بەدی ناکرێ!

دەی کوا نەتەوە پێشینەکان — بە تایبەتی عەرەبەکان — لەو سەردەمەدا زانیویانە دیموکراتی چیەو؟ چی نییە؟!

بەڵێ حەزرەتی ئەبو بەکر بەو شێوەیەو لە ئاکامی راوێژو کۆبونەوەی سەرانی هاوەڵانو وەرگرتنی دەسەڵاتی فەرمانڕەواییو بوونی بە خەلیفەی موسوڵمانان، ئەمجار بەیعەتکردنی موسوڵمانان بۆ ئەو زاتە باشترین بەڵگەیە لە سەر ئەوە کە دەسەڵاتی سەرەکی بۆ گەلە! دیارینەکردنی پێغەمبەریش بۆ جێنشین پشتیوانی ئەو راستییە دەکا.

لە فەرموودەکەی حەزرەتی ئەبو بەکردا کە دەفەرموێ: (ئەگەر ئیشی باشم کردن یارمەتیم بدەنو ئەگەر لار رۆییشتم راستم بکەنەوە، ئاماژەیە بۆ ئەوە کە گەل مافی ئەوەی هەیە چاو دێری حکوومەت بکاو پشتیوانی کاری چاکەی بکاو کاری خواری بۆراست بکاتەوە!

لە فەرموودەکەیدا کە دەفەرموێ: (پەیڕەوی فەرمانەکانم بکەن بەمەرجێ خۆم پابەندی فەرمانی خوداو پێغەمبەر بم، ئەگەر سەرپێچی فەرمانی خودام کرد هیچ شتێکم بەقسە مەکەن).

ئەم بانگەوازییە هیچ پێچو پەنای تێدا نییە کە حکوومەتی ئیسلامی خاوەن دەستوورو یاسایەکی چەسپاوە کە لە قورئانو حەدیسەکانی پێغەمبەردا رەنگ دەدەنەوە!! بێگومان ئەبو بەکر بە شایەتی ئەو هەموو هاوەڵانەی پێغەمبەر خۆی پابەند کرد بەوە کە بە گوێرەی ئەو دوو سەرچاوەیە رەفتار بکا! تەنانەت ئەوەشی راگەیاند کە گەل مافی ئەوەی هەیە هەرکاتێ فەرمانڕەوا لەو رێبازە لای داو پەیڕەوی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودای نەکرد، لە جێنشینی بخەنو متمانەی دەسەڵاتداریەتی لێ وەربگرنەوەو فنیشی بکەن؟!!

بەڵێ ئەم پابەندبوونانە (الالتزامات)انە کۆڵەکەو پایەی دیموکراتی راستینو دیموکراتی راستەقینە هەر لە ئیسلامدایەو بەس.

خوێنەری هێژا ئەمەی گوتراو نوسرا نموونەیەکی دیموکراتی خەلیفەی یەکەم بوو، ئەگەر ترسی درێژە پێدان نەبوایە زۆر نموونەی ترمان لە هەڵسو کەوتی حەزرەتی ئەبو بەکرو جێنشینەکانی دوا ئەو دەهێنایەوە.. بەڵام وەکوو دەڵێن: مشتێك نموونەی خەروارێکە.

## بەشی بیستەم:

# ئابووریی لەئیسلامدا (الإقتصاد في الإسلام)

**ئابووریی سەرمایەداریی – ئابووریی شۆسیالیستی – ئیسلام موڵکداریی فەردیی بەڕەوا دەبینێ**

هەوڵدان بۆ سوککردنی سەرمایەداریی‌و بەرگری لە هەڵچوونی بەم ڕێگە چارانە:

**(زەکات – یاسای میرات – راسپێری (الوصية) – بەشی هەژارو نەدارەکان لە تالان‌و دەسکەوت – بە حەرام دانانی کەڵەکەکردنی ماڵ – پاراستنی سامانی گەل‌و تاك بەم ڕێگە چارانە – دەستگرتنی گێل‌و قەدەغەکردنی مامەڵە لێی – تاقیکردنەوەی هەتیوو پێش ئەوەی ماڵەکەی بدرێتە دەست – نووسینی پسووڵەو قەواڵە – نامەی کڕین‌و فرۆشتن‌و بارمتە – حەرامکردنی سودو فایز – حەرامکردنی بردنی ماڵی خەڵك بە ناڕەوا – حەرامکردنی قومار – حەرامکردنی تەرازوبازیی – دەستبڵاویی کارێکی خراپە – چاکەکردن لەگەڵ هەژارو نەدارایاندا.**

ئاشکرایە کە کێشەی ئابووریی لەهەرە پێشەوەی کێشەکانی جیهانە، چونکە مەسئەلەیەکی سامناکەو ئەمڕۆ هەموو جیهانی گرتۆتەوە، ژیارو حەزارەتی ماددە ئامێزی خۆر ئاواش بەدەستێك پەیوەندییە نێو دەوڵەتییەکان دەشێوێنێ‌و بە دەستەکەی تری کێشەو بەرە دەخاتە نێو چینەکانی کۆمەڵەوە.

یاسای ئابووریی خۆر ئاواییەکان نەیتوانی چارەسەری کێشە ئابوورییەکان بکا، بەڵکووو چەند تەنگ‌و چەڵەمەیەکیشی بەرپاکرد لەم ڕووەوە کە نەیتوانی پێویستیەکانی ڕوداوە تازەکان پڕ بکاتەوە.

ئەوەتا کێشە لە نێوان سەرمایەدارو چینی کرێکاردا بەردەوامە ڕۆژ بەرۆژیش لە پەرەسەندندایە، هەتا کێشەی ئابووریی چارەسەرێکی تەواوی نەکرێ ئاشتی لە جیهاندا بەرپا نابێ، وا دیارە لەم بارو دۆخەدا سەرچاوەی ئاشتی‌و کلیلی بەدیهێنانی بەدەست ئیسلامە!!

چونکە هەریاسای ئابووریی ئیسلام سەنگ‌و تەرازو دەکا لە نێوان سەرمایەدارو کرێکارداو چارەسەری باشی لا هەیە، هەر بە بەگەڕخستنی ئەو

یاسایە یان بڵێین بە بەگەڕ خستنەوەی ئەو یاسایە ئاشتی باڵی خۆشبەختی بەسەر زەویدا دەکێشێ!!

یاسای ئیسلام چەند تایبەتمەندییەکی هەیە لە یاساکانی تردا دەستمان ناکەوێ، وەکووو لەمەدوا روونی دەکەینەوە. جا پێش ئەوەی دیاردە تایبەتمەندییەکانی ئیسلام باس بکەین پێویستە بەسەر پێێیکەوە چاوێك بە یاسای سەرمایەداریی‌و سوسیالیستی دا بگێڕین.

## ئابووریی سەرمایەداریی (الإقتصاد الراسمالي):

ئابووریی سەرمایەداریی رێگە دەدا بە مرۆڤ کەچی پێخۆشە لە کاری بازرگانی‌و پیشەسازی‌و پێداویستییەکانیان بە ئارەزۆی خۆی بە سەربەستی ئەنجامیان بدا، چ بەرهەمێکی بوێ چەند دەتوانێ‌و چۆن دەتوانێ بەرهەمی بێنێ بەهەرشتێك بیەوێ مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا کا، بە هەموو سەربەستییەك بتوانێ ویست‌و ئارەزوەکانی بەجێ بهێنێ!! بەکورتی ئابووریی سەرمایەداریی لەناوەوەو لە دەرەوە، دەرگای لەسەر پشتەو هیچ شتێك نیە سنووری بۆ دابنێ‌و جڵەوی سەرکەشی بگرێتەوە. لەسەر ئەم بۆچوون‌و داب‌و نەریتە ئابوریی سەرمایەداریی رەنگرێژ کراوەو بنچ بەست بووە..! زانایانی سەرمایەداریی دەڵێن: بۆ ئەوەی ژیانی ئابووریی بەشێوەیەکی راست‌و رەوان بڕوا، پێویستە لەسەر ئەم سێ کۆڵەکانە دابمەزرێ:

١- بەرژەوەندیی کەسایەتی وەکوو ئامانج‌و مەبەست: چونکە سروشتی مرۆڤ وایە ئەگەر بەرژەوەندییەکی تایبەتی خۆی پاڵی پێوە نەنێ بۆ کردنی کارێك کارەکە ناکا!.

٢- پێشبڕکێ‌و بەربەرەکانی وەکوو هۆکارێك، چونکە ئادەمیزاد زیاتر هەڵس‌و کەوتی بەپێی سۆزی دەروونە، نەك بەپێی ژیری‌و هۆش، کەوابوو پێویستە مرۆڤ مونافسی هەبێ تا هەڵی بنێ بۆ ئەرککێشان‌و ئازاری ئیشکردن.

٣- سەربەستی لـە کارەکـەی دا وەکـوو مـەرجێك، چـونکە نـەبوونی ئـازادیی گیـانی پێشبڕکێ لـە مـرۆڤ دا دەکـوژێو چالاکی شـلەپەتە دەکـاو سوودی تایبـەتی شەخصی دەستەبەر ناکا، بێگومان واز هێنان لە مرۆڤ لە بـارو دۆخێکی ئـابووریی ئاوەها ئازادو سەربەستدا بە تایبەتی کە زوربەی کارەکان لە جیاتی ئـەوەی مـرۆڤ بەدەست بیانکا بە ئامێر ئەنجام دەدرێن – کۆمەڵێك تەنگو چەڵەمەی ئـابووریی سامناکی بەدیهێناوە وەکوو:

أ) زۆری کەلو پەلو هەرزانی.

ب) کارگـە داخـستنو ئـیش راوەسـتانو وازهێنـانی کرێکـاران لـەئیش، دیـارە ئەمەش بەروالەت سەردەکێشێ بۆ ئەوەی کە کرێکاران نەتوانن پێداویستی خۆیان لە خواردەمەنیو پۆشاك دەستەبەر بکەن! کە ئەمەش بوو بەهۆی هەڵـگیرساندنی شۆڕشـی ئـەو کرێکـارە چـارە رەشـانەو وێرانکردنـی کارگـەو ئـاگر تێبـەردانیانو وێرانکردنی ماڵو سامانی سەرمایەدارەکان، چـونکە ئـەو کرێکارانـە پێیـان وابـووە ئەم سەرمایەدارانە کانگەی چارەڕەشی ئەوانن.

## ئابوری سوشیالیستی (الإقتصاد الإشتراكي):

لـەم بـارو دۆخـە ناهـەموارەدا قوتابخانەیـەکی تـر سـەری هەڵـداو بەروالـەت لایـەنگری کرێکـار بـوون، هێرشـیان کـردە سـەر یاسـای سـەرمایەدارییو پۆخڵاواتەکانی ئەم یاسایەیان خستە روو، برێ لەو ڕەخنانـەی ئاڕاسـتەیان دەکـرد دەیانگوت:

بناغـەی بەرژەوەنـدیی شەخـصی لـە ئـابووریی دا سەردەکێـشێ بـۆ کەڵەکـە بـوونی دەوڵەتو سامان لەلای چەند کەسێكو گەردنکەچی زوربەی جەماوەر بۆیان!

هـەروەکوو چـۆن سـەرمایەداریی جگـە لـە چارەڕەشـیو سـتەمکاریی لـەناو کۆمەڵدا چی تر بلاو ناکاتەوە، زیـاد لـەوەش پاڵەپەستۆی پێشبڕکێی ئـازاد لەبـەر هەمهێنانـدا دەبێتـە بـەفیڕۆدانی هێـزی بەرهـەم هێنـانو نـابووت بـوونی بازرگانەکان، لەلایەکی ترەوە یەکێك لـە عەیبـەکانی پێشبڕکێی ئـازاد ئەوەیـە: کـە

هـەموو ئـەو خەڵـکەی هاوبەشـی پێـشبڕکێیەکە دەکـا کەرەسـتەو ئامێرەکانیـان بەرامبەر نـابن، هـەروەها ئـازادیی لـە ئـابووریی دا جگـە لـە ئـاژاوەو گێـرەو کێشە چیتر بەدی ناهێنێ، چونکە ئەم ئابوورییـە وا دەکـا مـرۆڤ ئـازاد بـێ چی بەرهـەم دێنـێو چـۆنی بەرهـەم دێنـێو چـەند بەرهـەم دێنـێ کـەیفی خۆیـەتی. ئەمـەش دەبێتە هۆی دروسـتبوونی کێشەی ئـابووریی! جـا لەبـەر ئـەو هۆیانـە لایـەنگرانی کرێکارەکان بانگەوازییان کـردوە بـۆ بـەرپابوونی ئـابووریی شوسیالیـستیو لەسـەر ئەم سێ بنەمایانە دایان مەزراندووە:

یەکەم: پوچەڵـکردنەوەی مڵـکداریی تایبـەتی فـراوان لـە زەویو سـەرمایەداو سـپاردنی بـە حکوومـەت بـۆ بەرژەوەنـدیی گـشتی، واتـە هاووڵاتیـان ئـیش بـۆ حکوومەت دەکەنو حکوومەتیش کرێیان دەداتێ بە یەکسانیو بە گوێرەی بـەهای ئەو ئیشەی کە ئەنجامی دەدەن!

دووەم: دابەشکردنی بەروبوومی کارگەکان بەسـەر هاووڵاتیانـدا هـەر کەسـەی بە ئەندازەی پێداویستی خۆی!!

سـێیەم: دانـانی بەرنامەیـەکی رێـكو پێـك بـۆ بەرهـەم هێنـان بـە گـوێرەی پێداویستی کۆمەڵ لە بارەی چۆنیەتو چەندیەتەوە! گوایـە دەڵێن: بـەم شـێوەیە جیـاوازیی لـەناو خەڵـکدا نامێنـێو چـینایەتی کۆمەڵایـەتی قەڵاچـۆ دەکـرێو یەکسانی بەرپا دەبـێ، گیرو گرفتـی ئـابوورییو هـۆی رقو کینـە نامێنـێ، بەڵـکوو برایەتیو هاریکاریو ئاشتی بەرپا دەبێ.

## ئیسلام موڵـکداریی تاکە کەسی بەرەوا دەبینێ!:

یاسای ئابووریی ئیـسلامی یاسـایەکی گونجـاوو لـەبارە، دەتـوانین بڵێین: لـەناو ئابوورییەکانی سەردەمدا وێنـەی نیـە، چی بـاشو پەسـەندە لـە یاسـای ئـابووریی سەرمایەداریی دا لەخۆی گرتووە لایەنە خراپەکانیشی پاشگوێ خستووە، هەروەها چی باشە لە یاسای ئـابووریی شوسیالیـستی پەسـەندی کـردوەو تێیدایـەتی لایەنـە خراپەکانیشی دوور خستۆتەوە.

یەکەم: شتێك کە لە یاسای ئـابووریی ئیـسلامی دا بەرچاو دەکـەوێ ئەوەیـە: کــە رێــزی موڵــکداریی دەگــرێ، جیــاوازیی هەیــە لەگــەڵ یاســای ئــابووریی سەرمایەداری دا.

دووەم: شت ئەوەیـە کـە ئیـسلام دژی کەڵەکـەبوونی سـەرمایەیەو هـەوڵ دەدا سـامان لـەلای چـەند کەسـێك کۆنەبێتـەوە، بەڵـکوو هـەموو کاتـێ هـەوڵ دەدا ســەرمایەداریی مامناوەنــدیو پــچکۆلە دروســت بکــا... وا ئێمــە لەمــەدوا بۆچوونەکانی ئیسلام لەم بارەوە شی دەکەینەوە!

## پێشگرتن لە هەڵچوونی سەرمایەداریی:

زەکات: ئیسلام هەوڵ دەدات سەرمایەداریی هەڵنەچێو سەرکەش نەبێ، بـەوە کە لەسەر سەرمایەدارەکانی فەرز کردوە کە بەشێك لە ماڵی خۆیان تەرخان بکەن بۆ چینی فەقیرو هەژار، ئەم بەشە پێی دەگوترێ زەکات، ئـەم زەکاتـە یەکێکـە لـە پایەکانی ئیسلامو وەکوو زەریبەو باجێکی حوکوومی وایە پێویستە وەربگیرێ!

زەکات پێویستە دەربکرێ لە هەرشتێك کە ئینسان موڵکایەتی دەکا، جا ئـەو شتە پارەبێ یـان شـتوومەکی بازرگـانی بـێ یـان کـشتوکاڵ بـێ، بەمـەرجێك کـە لـە پێویـستیاتی خـۆی زیـاد بـێو کـاتی دیـاریکراویی هاتبـێو بگاتــە ڕادەی زەکـات. ئەندازەی زەکات لە مـاڵی بازگـانیو زێـڕو زیـودا لەسـەدا دوو نیـوە، لەبـەرۆبوومی کشتوکاڵیدا لەسەدا دەیە، ئەگەر بێ ئەرك ئاو بدرێ، زەکات کە کۆکرایـەوە دابـەش دەکرێ بەسەر ئەمانەدا: گەداو هـەژارو قـەرزدارو رێبـواری نـەدارای بـێ دەرەتـانو کارگوزاری سەر زەکاتەکەو نۆ موسوڵمانو ئەو بەندەیەی پێویستی بـە مـاڵ هەیـە بۆ ئازادبوونیو خەباتگێڕانو تێکۆشەرانی رێگەی خودا.

## یاسای میرات گرتن (قانون التوریث):

ئیسلام کە یاسای میراتی داناوە، بۆیە دایناوە کە سەرمایەداریی قەڵاچـۆ بکـاو نـەهێڵێ دەوڵـەتو سـامان بکەوێتـە دەسـت چـەند کەسـێكو ئـەوان هەڵبهاوسێنو

خەڵـکی تـریش بـە هـەژاری ژیـان بەسـەر بـەرن! هـەروەها بـۆ ئـەوەی یاسـای چێنایەتی لەناو بەرێ‌و قەلاچۆی بکا!

یاسای میرات لە ئیسلامدا هۆکارێکی گرنگە بۆ دابەشکردنی دەوڵەت‌و سامان بەسـەر زوربـەی وەچـەو لق‌و پـۆپی مردووەکـەدا! هـەموو کوڕو کـچی مردووەکـە مافی خۆیانە هەریەکەیان بە گوێرەی خۆی بەشی خۆی وەربگرێ! بە پێـچەوانەی یاسای ئینگلیزی کەتێیدا سامانی باوك دەدرێ بە کوڕی گەورە! بەمەش وای لێـدێ سامانەکە بکەوێتە دەست یەك کەس لە خێزانەکەدا.

میرات لە ئیسلامدا بـۆ ئـەوە دانـراوە نیعمـەت‌و خۆشـبەختی بـێ بـۆ میراتگـر نەك نیقمەت‌و بەڵابێ، هەر لەبەر ئەمەشە کە میراتگر بەرپرسیار نیە لـە قـەرزی مردووەکە ئەگەر زیاد لە میرات بێ — واتە ئەگەر کابرایەك مرد قـەرزداربوو ئـەو ماڵ‌و سامانەی لێی بەجێ مابوو بەشی قەرزەکانی نەدەکرد داوا لە میراتگر ناکرێ کە ئەو قەرزەی دەمێنێتەوە بیداتەوە.. پیویستە ئەوە بزانـرێ کـە مـیرات لـێگیراو ناتوانێ میراتگر مەحروم بکا چونکە میرات یاسایەکی سەپێنراوە بـەپێی فـەرمانی شەرع نەك لەسەر خواستی میرات لێگیراو!

یاسای ئیسلام میراتگری کردون بە دوو بەش:

یەکەم: چینی وەچەو بنەچەو ژن‌و مێرد.

دووەم: چینی دەوروپشت وەك براو خوشك.

هەموو ئەوانەی لە چـینی یەکەمـدان راسـتەو خـۆ میراتگـرن، بـەڵام ئەوانـەی چینی دووەم کاتێك میرات دەگرن کە چینی یەکەم وجودیان نـەبێ یـان زوربـەیان نەبن. هەر یەکێ لـەو دوو چینـە چینێکی تـری لێ دەکەوێتـەوە نـەوەو کوڕو کـچ کوڕو کچی لە شوێن باوك‌و دایکیان میرات دەگرن. مام‌و پورو منداڵی براو خوشـك لەشـوێن خوشك‌و بـرا مـیرات دەگـرن، ئـا بـەم شـێوەیە ئیـسلام دوای مردنـی هـەر موسوڵمانێك سامانەکەی دابەش دەکا بەسەر میرات گراندا.

دکتۆر جۆستاف لۆبونی فەرەنسی لە کتێبی (حضارة العرب)دا دەڵێ: بنـەمای یاسـای مـیرات کـە قورئـان چەسـپاندویەتی زۆر دادوەری‌و ویـژدانی تیدایـە..

شەریعەتی ئیسلام لە میراتدا مافێکی بە ژنان داوە لە یاساکانی لای ئێمەدا وێنـەی نابینین کەچی وا گومان دەبرێ ئیسلام مافی ئافرەتی پێشێل کردوە.

ئەو ئایەتە قورئانییانەی کە باسی میراتیان شی کردۆتەوە ئەم ئایەتانەن:

**{يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ.....}.**

**{يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ فَإِن كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ وَإِن كَانُواْ إِخْوَةً رِّجَالاً وَنِسَاء فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّواْ وَاللّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ - سورة النساء/١٧٦}.**

واتە: خودای گەورە ڕاتان دەسپێرێو فەرمانتان پێ دەکا کە بەپێی ئـەم یاسا رەسایە: میرات بەش بکەن بەسەر منـاڵو وەچـەو نەتـەوەی خۆتـان، لـە بـۆ کـوڕێ دوو ئەوەندەی بەشی کچێ هەیە، وە ئەگەر وەچەکان هەر کچی روت بوونو زیاتر بوون لە دوو کچ ئەوە دوو سێیەك دەبەن، ئەگەر نەوەی مردووەکە یەك کـچ بـوو ئەوە نیوەی میراتەکە دەبا، وە بۆ هەریەکێ لە باوكو دایکـی مردووەکـە شەشـیەك هەیە لە میراتی مردوەکە ئەگەر نەوەی کەلەپوورگری هەبێ.

بەڵام ئەگەر مردوەکـە وەچـەی میراتگـری نـەبوو هـەر بـاوكو دایکـی هـەبوو، هاوسەریشی نەبوو، ئەوە دایکەکە سێیەك دەبـا وە پاشمـاوەی ماڵەکـە هـەمووی بـۆ باوکەکەیە، وەلێ ئەگەر مردووەکـە چـەند بـراو خوشـکێکی هـەبوو ئـەوە دایکەکـە شەش یەك دەبا... ئەو بەشو پشکەی بۆتـان دیـاریکراوە لـەپاش جێبـەجێ (اجـرا ء)کردنی راسپێری مردووەکـە وە لـەپاش دانـەوەی ئـەو قـەرزەی لەسـەریەتی وەری دەگـرن خـودا خـۆی دانایـەو زۆر بـاش دەزانـێ: کـەکێ لـە بـاوكو دایـكو منـاڵو بنەچەو وەچە بۆ ئێوە باشـترنو بەسـودترن. وە ئێـوە ئـەوە نـازانن! کەواتـە بـەو بەشە ڕازی بن کە خودای داناو زانا بۆی دیاریکردون، وە بۆ ئێوە هەیە نیوەی ئەو ماڵەی کە هاوسەرەکانتان لەپاش مردن بـەجێی دەهێڵن، ئەمـە ئەگـەر نەتـەوەیان نـەبێ. بـەڵام ئەگـەر نەتـەوەی میراتگـری هـەبێ ئـەوە بـۆ ئێـوەی مێـرد هەیـە

چواریەکی ئـەوەی ئـەوان بـەجێیان هێـشتووە، ئـەم بەشـەیش وەردەگـرن لـەپاش بەجێهێنانی وەصییەتی شەرعییان ئەگەر وەصـییەتیان کردبـوو هـەروەها لـەپاش دانەوەی قەرزەکان ئەگەر قەرزداربووا

وە بۆ ژنەکانیش – یەك بن یا زیاتر – لە هەریـەکێ لـەم دوو حاڵەدا نیـوەی بەشی ئێومیان هەیە، کە دەکاتە چواریەك لە حاڵەتی یەکەمـدا، وە هەشـتیەك لـە حاڵـەتی دووەمـدا، ئـەویش لـەپاش جـێ بـەجێ کردنـی راسـپێری‌و دانـەوەی قەرزەکانیان؟!. ئەگەر کەسێ مـرد – پیاوبـێ یـاژن – وەچـەو بنەچـەی نـەبوو وە میراتبەرەکەی تەنیا برایەکی دایکی یان خوشکێکی دایکی بـوو ئـەوە بـۆ هەریـەکێ لەو براو خوشکەش شەشیەك هەیـە، ئەگـەر ئـەو بـراو خوشـکە دایکییانـە زیـاتر بوون لە یەکێ ئەوە هەموویان هاوبەشن لە سێیەکی کەلەپوورەکـەدا، پـەروەردگار دەیـەوێ ئێـوە رێگـای راسـتی ژیانتـان لێ تێـك نەچـێ، بێگومـان خـودا بـە هـەموو شتێك زاناو دانایە.

دەی ئەگەر تۆ لەدانایی ئیسلام تـێ بفکـرێ دەربـارەی رێزگرتنـی موڵـکداریی تاکە کەس‌و بەوردی سەرنج بدەی لەو یاسا گشتییانەی کە دایناون بۆ میرات، بۆت روون دەبێتەوە کە یاسای میراتگرتن باشترین هەڵنەرە کە ساماندارا‌ن هەڵدەنێ بـۆ دەوڵەمەندی‌و بەرهەم بەدیهێنان‌و خەریکبوون بەکارو کاسبی‌و ماڵ زۆرکردنـەوە، زیاد لەمەش ماڵ‌و سامانەکە دەپارێزێ لەوەی کە دەستبلاوی تێـدا بـەکار بهێنـرێ چونکە مرۆڤ ئەگەر لێی رون بێت کە ئەو ماڵ‌و سامانەی کۆی دەکاتـەوە تەمـەن‌و گیـانی تێـدا خـەرج دەکـا دوایـی دەدرێ بەحکوومـەت، راسـتەوخۆ کـوڕو کـچ‌و خزمەکانی سوودی لێ نابینن هەرگیز خۆماندو ناکا بۆ دەوڵەمەندی!! هـەر لەبـەر ئـەم هۆیـە بـوو کـە روسـیا کاتـێ موڵـکداری تاکەکەسـییان هەڵوەشـاندەوەو مەنعیانکرد پاش ماوەیەکی کەم بۆیان دەرکەوت کە یاساکەیان نەگونجاوەو پـلان‌و نەخشەکانیان سەرکەوتوو نین، بۆیان دەرکەوت کە دانیشتوان هەر ئەوەندە هەوڵ دەدەن کە پێویستیاتی زۆر پێویستیان دابین بکەن‌و ئیتر پـاڵی لێ دەدەنـەوەو هـیچ

داهێنـانو مانـدو بونێـك بەخـەرج نـادەن چونكە مـادام هـەموو مرۆڤێـك لەسـەر كردارەكانی پاداشی دەدرێتـەوە بەئەوەنـدە كـە پێویـستییەكانی بەیەكسانی دابـین دەكرێ دیارە خەڵكی هـەوڵ دەدەن كـاری سووكو ئاسان لـە ئەسـتۆ گـرنو ئیـشی قورس لە ئەستۆ نەگرن... هەر بۆیە روسەكان ئەم یاسایەیان راسـتەو پاسـتەكردو ساڵی (١٩٣٦ی ز) یاسـای ئـەوەیان چەسـپاند كـە موڵـكداریی بـچوك بـەڕەوا ببیـنن، ئەو قاعیـدە مەشـهوورەی خۆیـان كـە دەڵێ: (مـن كـل حـسب حاجتـه) واتـە: هـەر كەسێ بەپێی تەواناى ئەركی لە سەرەو بەپێی پێداویستی خـۆی بەشـی بـۆ هەیـە، گۆڕیان بەڵام (من كل حسب قدرته ولكل حسب ما يؤديه من عمل ومن لا عمل له ليس له الحق في أن يأكل) هەر كەسێ بەپێی تواناى خۆی ئەركی لەسەر، وە بەپێی ئەو رەنجەی دەیدا بەشی بۆ هەیە وەلێ ئەوەی كارناكا نان ناخوا.

## وەسیەتو سنوورەكانی (الوصية وحدودها):

لە ئایینی ئیسلام دا هۆكـارێكی تـری زینـدو هەیـە بـۆ كەمكردنـەوەی لایەنـە خراپەكانی سەرمایەداریی ئەویش وەسییەتكردنە، بێگومـان هـەموو موسـوڵمانێك بۆی هەیە كە پێش مردنی بەشێكی ماڵی خۆی بكا بە وەسییەت، بۆ ئەوەی كە لـە ڕێگـای یارمەتیـدانی هـەژاران‌و پـڕۆژەی خێرخـوازیی بـۆ سـوودی گـشتیدا خـەرج بكـرێ... قورئـانی پـیرۆز وەسـییەتی لـە پلەیـەكی بـەرزدا دانـاوە، ئەنجامـدانی بـەكارێكی پێویـستی وەكـوو دانـەوەی قـەرز لـە قەڵـەم داوە، واتـە: چـۆن قـەرز دەدرێتەوە بەخاوەن قەرز پـێش دابەشـكردنی مـیرات – هـەر ئـاواش وەسـییەت – پێش دابەشكردنی میرات جێبـەجێ دەكـرێ، هـەر بۆیەشـە كە لـە كۆتـایی ئایـەتی میرات دا دەفەرموێ: {مِّن بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ} یان كە دەفەرموێ: {مِن بَعْـدِ وَصِـيَّةٍ يُوصِـينَ بِهَـا أَوْ دَيْـنٍ}. بـەس ئەوەنـدە هەیـە ئیـسلام بـەرفراوانی بەوەسییەت نەداوە، ڕێگەی نەداوە هەموو كەسێك بۆ هەموو كەسێكو لـە هـەموو شـتێكدا وەسـیەتكردن بـەڕەوا بزانـێ! بەڵـكوو وەسـییەتكردنی بـۆ میراتگـر مـەنع

کردوە تا ئەو میراتگرە دووجار بەشی بەرنەکەویٚ، بەشێك لە میراتو بەشێك لە وەسییەت — هەروەکوو چۆن ئیسلام مەنعی ئەوەشی کردوە کە وەسییەتکردن لە سێیەکی ماڵ دەربچیٚ...! وەسییەتکردن تا سێیەکی ماڵ دروستە، بۆ ئەوەی بەتەواوی دووبەش لەسیٚ بەش بۆ میراتگران بمێنێتەوە! ئەمە لە کاتێکدایە کە بریٚ لەیاسا سەردەمەکانی شارەستانی ئەمڕۆمان بەرەوای دەزانن کە وەسیەت بکریٚ بۆ هەر کەسێكو هەرشتێك بەهەموو ماڵ جا وەسییەت بۆکراوەکە میراتگر بیٚ یان بێگانە مرۆڤ بیٚ یان ئاژەڵ؟! بەپێچەوانەی یاسای شەریعەتی ئیسلامی کە داوا دەکا میراتەکە بەشبەش بکریٚو بە فراوانی بدریٚ بە خزمو کەسو کاری مردووەکە، هەرگیز لە ئیسلامدا ڕێگا نەدراوە بە خاوەن سامان کە زیاد لە سێیەك بکا بەوەسییەت! ئەمەش بۆ ئەوەی تەرازووی ئابووریی رابگیریٚ.

## بەشی هەژاران لە تالاٚنو دەستکەوتی جەنگ:

قورئانی پیرۆز بە مەبەستی جڵەوگیری لە سەرکەشیو هەڵچوونی سەرمایەداریی، کە باسی دابەشکردنی دەستکەوتی جەنگ دەکا، بەش بۆ سەر لەشکرو جەنگاوەرەکان دادەنیٚ، بۆ بێنەوایانو دەستە وەسانو هەتیوو ڕێبوارانیش دادەنیٚ، هەر چەندە ئەم چینانە جگە لە شەڕکەرەکان هیچیان هاوبەشی شەڕیشیان نەکردبیٚ! ئەوەتا دەفەرمویٚ:

**{وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ - سورة الأنفال — ٤١}.**

واتە: ئەی موسوڵمانەکان! بزانن ئەو تالانەی کە لە شەڕی کافران دا دەستتان دەکەویٚ ئاوا دابەش دەکریٚ: دەکریٚ بە پێنج بەشەوە چواربەشی بۆ شەڕکەرەکان پێنج یەکەکەی تری بۆ خوداو بۆ پێغەمبەری خوداو خزمانی پێغەمبەرو هەتیوانو هەژارانو ڕێبوارانە! مەبەست لە بەشی خودا ئەوەیە کە خەرجکریٚ لەو پرۆژانەدا کە بەرژەوەندی ئاینیان تێدایە:_ وەکوو بانگەوازیکردن بۆ ئیسلامو دروستکردنی مزگەوتو قوتابخانەی ئاینی.

ئاشکراشە هەتیوو هەژارو ڕێبوار کە قورئان باسی کردوون‌و خستونیە ریزی ئەوانەی کە مافی ئەوەیان هەیە لە دەسکەوتی جەنگ بەشی خۆیان وەربگرن – دیارە کۆمەڵێکی بێنەواو پەککەوتەن‌و نەیانتوانیوە هاوبەشی جیهاد بکەن، کەچی لەگەڵ ئەوەشا پەروەردگار بە ڕەوای نەبینیوە بێ بەش بن! بەڵکوو لەگەڵ ئەو شەڕکەرانەی کە گیانی خۆیان خستۆتە خەتەرەوەو مردن هەموو کاتێ بەرەوڕوویان بۆتەوە – بەشی بۆ دیاریکردوون! بۆیە دابەشکردنی پێنج یەکی دەسکەوتی شەڕ تایبەتە بە پێغەمبەر خۆیەوە تا دابەشی بکا بەسەر ئەو چینانەی لە ئایەتەکەدا باس کراون، چوار بەشەکانی تری تالانەکە دابەش دەکرێ بەسەر پیاوانی سوپادا هەر کەسە بەگوێرەی هەوڵ‌و کۆششی خۆی، ئەمە کاتێك وایە ئەگەر ئەو ماڵ‌و سامانە تالانییە بەشەڕ دەستیان بکەوێ، بەلام ئەگەر ئەو غەنیمەتەیان بەبێ شەڕ دەست بکەوێ کە بەعەرەبی بەم نەوعە دەگوترێ: (فیی‌ء) ئەوە قورئانی پیرۆز نەك هەر پێنج یەك بەڵکووو هەمووی کردوە بە مافی ئەو بێنەوایانە، وەکوو دەفەرموێ:

{مَّا أَفَاء اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاء مِنكُمْ - سورة الحشر -٧}.

واتە: ئەو دەستکەوتە مالییەی کە بەبێ ئارەق‌و شەڕو شۆڕ لە کافران بە تالانی گرتتان لە خەڵکی گوندەکانی دەورو بەری مەدینە ئاوا دابەش دەکرێ: بەشێکی بۆ پێغەمبەرە دەیکا بە ئازوقەو مەسرەفی خێزانی، بەشێکی بۆ خزمانی پێغەمبەرە، بەشێکی بۆ هەتیوان‌و هەژاران‌و ڕێبوارانە تاوەکوو ماڵ‌و سامان بەسەر هەموو چینەکاندا پەخش بێتەوە نەبادا هەمووی لە دەستی تاقمێکی سەرمایەداردا کۆببێتەوەو لەناو خۆیاندا وەکوو تۆپ دەستاو دەستی پێ بکەن‌و بەشی کەسی تری لێ نەدەن!.

## کەڵەکەکردنی پارەو پوڵو زێڕو زێو حەرامە (تحريم كنز الاموال):

ئایینی ئیسلام کەڵەکەکردنی پارەو زێڕو زیوی یاساغ کردوە، چونکە مامەڵەو گۆڕینـەوەی کـەل‌و پـەلی بازرگـانی رادەوەسـتێ، بەمـەش پێویـستییەکانی کۆمـەڵ دابین ناکرێن‌و سەچاوەی ئـابووریی‌و بەرهـەمهێنان – وەکوو پێویـست کەڵـکی لێ وەرنـاگیرێ؟ سـەروەت‌و سـامانی وڵات گەشـە ناکـات. لەبـەر هـەموو ئـەم هۆیانـە ئایینی ئیسلام کەڵەکەکردنی پارەو پوولی حەرام کردوەو هەڕەشەی لەوانە کـردوە کە زێڕو زیو بەنارەوا کەڵەکە دەکەن بـەوە کـە ئـەو ماڵە لـە رۆژی دواییـدا لێیـان دەبێتە تۆقی ئاگرو لـەش‌و لاریـان دەسـووتێنی‌و گۆشـت‌و ئێـسقانیان دەتوێنێتـەوە خودا دەفەرموێ:

{وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ، يَوْمَ يُحْمَى عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَى بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَذَا مَا كَنَزْتُمْ لأَنفُسِكُمْ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ - سورة التوبة – ٣٤-٣٥}.

واتە: موژدەی سزایەکی بەسوێ بدە بەوانەی کـە زێـڕو زیـو کەڵەکـە دەکـەن‌و لـە رێگـەی خـودادا خـەرجی ناکـەن، رۆژێ دێ کـە ئـەو گەنجـەیان لـەناو ئـاگری دۆزەخـا سـور سـور دەکرێتـەوە، تـا دەبـێ بـە یـەك پارچـە ئـاگر، ئـەوجا تـەوێڵ‌و تەنیشت‌و پـشتیانی پـێ داخ دەکـرێ، وە فریـشتەی سـزا بـە تـەوس‌و تەلفیـسییەوە لاقرتێیان پێ دەکەن‌و پێیان دەڵێن: ئەمە زێڕو زیوو گەنجەکەی خۆتانـەو خۆتـان کۆتان کردۆتەوە بۆ گیانی خۆتان، کەواتـە بـچێژن لـە بـەری رەنجەشـانی خۆتـان!! ئایەتەکە ماڵ کۆکردنەوەی رەوا حەرام ناکا بەڵام کەڵەکە کردنەکەی بە نارەوا کە زەکات‌و مافی خودای لێ نەدرێ ئەمە بە حەرام دادەنێ.

جا کە خاوەن پارەو پوول‌و سامان بزانێ کە پێویـستە هـەموو سـاڵێك زەکـاتی ئەو ماڵە بدا، ترسی لێ پەیدا دەبێ کە زەکات ماڵەکەی قەلاچۆ بکـات، لەبـەر ئـەوە هەوڵ دەدات ماڵەکەی بخاتە گەڕ تا زەکات ماڵەکەی کەم نەکاتەوە!

جا ئەگەر بزانین سامانی گەل لە سامانی هەموو تاکەکانی کۆمەڵ پێك دێ، ئەوە بۆمان ئاشکرا دەبێ کە پێویستە لەسەر دەوڵەمەندان ماڵو دارایی خۆیان بخەنە گەڕ نەك لە صندوقو قاسەدا سەفتەی بکەن! ئاشکراشە بەگەڕ خستنەکەی بەرژەوەندی گشتییە، خۆ ئەگەر دەوڵەمەندەکان لەسەر سەفتەکردنی پارەو پوول سوور بوونو نەیاندەخستە گەڕ ئەوە بۆ حکوومەتی ئیسلامی هەیە ماڵەکانیان لە دەست دەربێنێو بیخاتە گەڕو بەرعۆدەی دەسمایە (رأس المال) کان ببێو بەناوی خاوەنەکانیانەوە تۆمار بکرێ ئەگەر قازانجی کرد بەشێك لە قازانجەکەیان بدرێتێ، ئەگەر زەرەریشی کرد حکوومەت خۆی لێی بەرپرسیار بێ! ئەمە کاتێك دەبێ بەرژەوەندی گشتی وڵات پێویستیو داخوازی ئەمە بکات!!

ئا بەم جۆرە دەبینین مەبەستی ئیسلام ئەوەیە کە یاسای موڵکداریی پچووك پچووك دروست بکا، تا ئەفرادی کۆمەڵ لەسەرکەشی هەڵچوونی سەرمایەداریی گەورە بپارێزێو چینە هەژارەکانی کۆمەڵ باربوو بکا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین کە ئەم موڵکدارییە پچکۆلانەی ئیسلام رەوای بینیوە بە گوێرەی یاساو نیزامێکە کە پابەندی رەوشتو ئەخلاقەو بەرژەوەندی گشتی تێدایەو مەبەستێکی مرۆڤایەتی ئاشکرای لەپشتەوەیە! ئەمەشمان لەم خاڵانەی داهاتوودا بۆ روون دەبێتەوە.

## پاراستنی ماڵو سامانی حکوومەتو هاووڵاتیان

### حیجر دانان لەسەر دەستبڵاوان (الحجر علی السفهاء):

خودا دەفەرموێ: {وَلاَ تُؤْتُواْ السُّفَهَاء أَمْوَالَكُمُ الَّتِي جَعَلَ اللّهُ لَكُمْ قِيَاماً وَارْزُقُوهُمْ فِيهَا وَاكْسُوهُمْ وَقُولُواْ لَهُمْ قَوْلاً مَّعْرُوفًا -سورة النساء – ٥}.

واتە: ماڵ – کە خودا کردوویەتی بەمایەی بەڕێوەچوونی گوزەرانتان مەیدەنە دەست نەفامە دەستبڵاوەکانتان، خۆتان لە ماڵەکانی خۆیان مەسرەفیان

بۆ بکەن‌و خۆراك‌و پۆشاکیان پێ بدەن، قسەی خۆشـیان بـۆ بکـەن‌و بـەڵێنیان پـێ بدەن کە هەر کاتێ هۆشیاربوونەوە ماڵەکەیان پێ دەدرێتەوە.

دەستبڵاو ئەو کەسەیە کە ماڵی خۆی لەجێی شیاوی خۆی دا سـەرف ناکـا جا ئایا لەبەر بەدڕەوشتی بێ یـا لەبـەر بـێ عـەقڵی‌و نـەفامی بێ، یـا لەبـەر بۆچونی هەڵەبێ. ئایەتەکە مەنعی موسوڵمانانی کردوە لەوەی جڵەوی دەسـتبڵاوان بـەڕەڵڵا بکـەن، مـاڵ‌و سـامانی خۆیـان بـەفیڕۆ بـدەن‌و لەشـتی نەشـیاودا سـەرفی بکـەن، ئایەتەکە دوو ئاماژەی ئاشکرای تێدایـە، داوا لـە موسـوڵمانان دەکـا کـە پارێزگـاری ماڵ‌و سامانی دەستبڵاوان بکەن‌و نەهێڵن بە نەفامی خۆیان هەڵس‌و کەوت بکەن.

ئامـاژەی یەکـەم: ئەوەیـە کـە خـودا دەفـەرموێ: (امـوالکم - مـاڵی خۆتـان) نەیگوت: (اموالهم - ماڵی دست بڵاوەکان) تا سەرنجی موسوڵمان بۆ ئـەوە رابکێشێ کە ماڵ‌و سامانی دەستبڵاوان موڵکی گەلەو پێویستە پارێزگاری بکرێ‌و لـە چـنگی دەستبڵاو زگار بکرێ‌و سوودی لێ وەربگیرێ، چونکە ئەگەر واز لە کابرای دەسـتبڵاو بهێنرێ‌و ئەویش ماڵەکەی بە فیڕۆ بدات هەژار دەکـەوێ‌و دەبێتـە خەتـەر بەسـەر کۆمەڵـەوەو بەسـەر مـاڵ‌و سـامانی تریـشەوە، هاریکـاری کۆمەڵایـەتی وامـان لێ دەخوازێ کە ماڵ‌و سامانی دەستبڵاو بە مـاڵی موسـوڵمانان بـزانین‌و پارێزگـاری لێ بکەین!؟!

ئاماژەی دووەم: ئەوەیە کە خودا دەفەرموێ: {الَّتِي جَعَلَ اللَّهُ لَـكمْ قِيَاماً}.

واتـە: ئـەو مـاڵ‌و سـامانەی کـە پـەروەردگار ئـابووریی‌و بەرژەوەنـدیی ئێـوەی لەسـەر بەنـدکردوەو کۆڵەکـەی ژیـانی ئابوورییتانـە، ئەگـەر بـێڵن دەسـتبڵاو بـە ئارەزۆی خۆی ماڵ بەفیڕۆ بـدات، بێگومـان دەبێتـە هۆی لەدەسـت دانـی کۆڵەکـەی ژیانی ئابووریتان.

دەستبڵاو ئەگەر هات‌و ماڵ‌و سامانی خۆی بەفیڕۆ بدا وەکوو ئەوە وایـە مـاڵی گـەلی بـەفیڕۆ دابـێ‌و ژیـانی خـۆی‌و کۆمـەڵی خـستبێتە خەتـەری هەژارییـەوە، بـە تایبەتی کە ئەو ماڵە بکەوێتە دەست بێگانەوەو ئەوان سوودی لێ وەربگـرن وەکـوو لەم رۆژگارانەدا بەئاشکرا دەبیندرێ. ئەو دەسـتبڵاوانە سـەفەردەکەن بـۆ دەرەوەی

وڵات ماڵو سامانی خۆیان لەیاری قورمارو ئاهەنگو خواردنـەوەدا بـەفیڕۆ دەدەنو لەولاوە بەگیرفانی بەتاڵەوە دەگەڕێنەوە! بۆیـە پێویـستە ئـیشو کـاری ئـەو جـۆرە کەسانە بخرێتـە بـەردەم لێپرسـراوانی موسـوڵمانو دەسـت بەسـەر بکـرێنو مـاڵو داراییـان بدرێتــە دەســت بازرگـانی دەسـتپاك تـا بخرێتــە ئیـشەوەو لـە قـازانجو بەرهـەمی ئـەو ماڵـە بەشـی پێویـستیان بـدرێتێ!! سـەیر ئەوەیـە زوربـەی زۆری موسولمانانی ئەمڕۆ بە پێچەوانەی ئەم تەعلیماتـە دەجووڵێنـەوە! بۆیـە سـێیەکی سامانی گەل لەناو دەچێ بەهۆی دەستبلاوە نەفامەکانیانەوەو کەسیش چاودێری ناکا!

## هەتیو تا باڵغ نەبێ ماڵەکەی نادرێتە دەست:

هـەر بەمەبەسـتی پارێزگـاریی لـە سـەرو مـاڵو بـەفیڕۆ نەچـوونی لـە رێگـای نەگونجاودا ئیسلام فەرمانی کردوە بـەوە کـە پێویـستە پـێش ئـەوەی هـەتیو مـاڵی بدرێتە دەست بەتاقی بکرێتەوە، خودا دەفەرموێ:

{وَابْتَلُواْ الْيَتَامَى حَتَّىَ إِذَا بَلَغُواْ النِّكَاحَ فَإِنْ آنَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَادْفَعُواْ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ وَلاَ تَأْكُلُوهَا إِسْرَافًا وَبِدَارًا أَن يَكْبَرُواْ وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ فَإِذَا دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ فَأَشْهِدُواْ عَلَيْهِمْ وَكَفَى بِاللّـهِ حَسِيبًا - سورة النساء – ٦}.

واتە: ئەی سەرپەرشتیارو لێپرسراوی هەتیوان! ئەو هەتیوانەی لەژێر رکێفی ئێوەدان پێش باڵغ بوونیان بەتاقییان بکەنەوە برێ کارو باری کڕینو فرۆشـتنیان بخەنە ئەستۆو لەنزیکەوە چاودێرییان بکـەنو بـزانن ئـیشو کاریـان چۆنە؟ جا ئەگەر دوای باڵغ بونیان زیرەکیو ژیریتـان تێـدا بیـنین، ئـەوە بەشایەتو بەڵـگە ماڵەکـەیان بدەنـەوە، بـا بـۆ خۆیـان سـەروکاری مـاڵی خۆیـان بکـەن! خـۆ ئەگـەر ژیریتان تێدا بەدی نەکردن ماڵەکەیان مەدەنەوە!

ئـەمجار پـەروەردگار نـەهی کـردوە کـە سەرپەشـتیاری هـەتیوان مـاڵی ئـەو هەتیوانـە بـەفیڕۆ بـدەن لـەم رووەوە ئـەوانیش نابـێ دەسـتبلاوی تێـدا بکەنو بـۆ

خۆیانی خەرج بکەن، بۆ ئەوەی دوایی نەیاندەنەوە، ئەمجار خودا دەفەرموێ: ئـەو سەرپەرشتیارانە ئەگەر دەوڵەمەند بوونو پێویستیان بە مـاڵی هـەتیوەکان نـەبوو با دەست پاك بن تێیداو لەجیاتی سەرپەرشتی کردنەکە هیچ هەڵنـەگرنو ماندو بونەکەیان مرۆڤایەتیو پیاوەتی بێ!

ئەگەر سەرپەرشتیکاران هـەژاربوونو پێویـستیان بـەکرێی سەرپەرشـتیکردن هـەبوو، ئـەوە بۆیـان هەیـە ئەنـدازەی مانـدو بـوونی خۆیـانو بـەگوێرەی دابو نەریتی ئەو وڵاتە حەقی خۆیان لە ماڵی هەتیوان هەڵبگرن!.

دوای ئەوە پەروەردگار داوای لە سەرپەرشتیکاران کردوە کە کاتێ ماڵەکان بـە هــەتیوەکان دەســپێرنەوە شـایەدییان لێ بگــرنو بەشـایەدو ئیـسپات (بەڵــگە) بیاندەنەوە تا کێشەو نیزاع بەرپا نەبێ!

## نووسینی سەنەدو قەباڵەنامەی ماڵو دارایی (كتاب العقود المالية):

بێگومان چەرخی تازەو سەردەم سوودو قـازانجی نووسـینی سـەنەدو قەباڵـەی مـاڵو سـامانی دەرخـستووە، بـۆ ئـەوەی هـەردو لای سـەوداو مامەڵـە، یـان خـزمو کەسو کاریان یان هەر کەسێك کـە لـە داهـاتوودا پەیوەنـدی بـەو موڵـكو ماڵـەوە هەبێ بزانن راستییەکە چۆنەو چۆن نییە، چونکە لەوانەیـە چۆنیەتی مامەڵەکـە دوای ماوەیەك لە بیربچێتەوە! شایەتەکان بمرنو ئەمەش سەربکێشێ بۆ خواردنی ماڵی یەکتری بە ناڕەواو بە بەتاڵ، جا بـۆ ئـەوەی لـە داهـاتوودا نەکەوینـە کێـشەی ناڕەواوە، قورئانی پیرۆز فەرمانی پێ کردوین کە بەڵگەو قەباڵەی قەرزو قۆڵە لـە نێـو خۆمانــدا بنووســینو دوو پیــاو یــان پیاوێــكو دوو ژن بکـەین بـە شـایەدو نەهێڵین کەس مـاڵی کـەس بـەخۆڕایی بخوا، هـەر لـەم روانگەیەشـەوە دەڕوانرێتـە هـەموو سـەنەدو قەباڵەنامەیـەکی مـاڵی چونکە هـیچ کامێکیـان لـە گرنگـی دا لـە قەرزو قۆڵە کەمترنین! بەڵکوو برێ مامەڵە هەیـە زۆر لـە قـەرز گـرینگترە وەکوو کڕینو فرۆشتنی زەویو زارو رەهنو سـەنەدی کـارکردنو شـتی تـری ئـاوا گـرنگ، خودا دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى فَاكْتُبُوهُ وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ وَلاَ يَأْبَ كَاتِبٌ أَنْ يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ اللّهُ.... - سورة البقرة – ٢٨٢-٢٨٣}.

واتــە: ئـەی موسـوڵمانان! هـەرکاتێ لەگـەڵ یـەکتردا قـەرزو قۆڵـەتان کـرد، کاتێکتان دیاریکردو ئەندازەی شتەکانو پارەکەو ماوەکە بنووسـن بـا نووسـەرێکی دادوەر بینووسێو چۆن پێویستە ئاوا بینووسێ.

لەم ئایەتەدا حەوت خاڵی سەرەکیمان دەربارەی نووسینی سەنەدو قەواڵە بـۆ دەردەکەوێ:

١- نووسـینی قـەرز تامێژوویـەکی دیـاریکراو، ئـەم تیـۆرە لـە لایـەن قـانوونی فەرەنـسییەوە لـە کۆتـایی سـەدەی هەژدەهەمـەوە خرایـە رو لـەم ڕووەوە کـە لـە ناوەڕۆکی قانوونەکەدا ئەوە چەسپێنرا کە هەر قەرزێك لە ئەندازەیـەکی تایبـەتی تێپـەڕ بکـات دەبـێ بنووسـرێ! یاسـاکانی ئـەوروپاش هـەر لـە قـانوونی فەرەنـسی وەرگیراوە.

٢- دەبێ نووسەری قەواڵە پیاوێکی دادوەربێو لایـەنگری لایـەکیان نـەکاو لـەو بارەوە ئاگاداری شـەرع بـێ، ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێ کـە پێویـستە لـەناو گـەل دا پسپۆڕ هەبنو ئەرکی ئەم نووسینو چەسپاندنە بخەنە ئەستۆی خۆیان.

٣- ئــەو کەســەی نــاوەڕۆکی وەســیقە (بڕوانامــە) کــە بــۆ نووســەرەکە دەخوێنێتەوە دەبێ کابرای قەرزداربێ تاوەکوو خاوەن قەرز کاتی پێویست بیکاتـە بەڵـگە بەسـەر قەرزدارەکـەوە! جـا ئەگـەر قـەرزدار نـەیتوانی وەکـوو پێویـست قـسەکان بـۆ نووسـەرەکە دەربـبڕێ دەبـێ وەلیو سەرپەرشـتیاری قەرزدارەکـە ئـەم ئەرکە ئەنجام بدا بۆ ئەوەی مافی پارێزاوبێو زەرەرمەند نەبێ.

٤- دوای تـەواوبوونی نووسـینی قەباڵەکە پێویـستە بـەلانی کەمـەوە دوشـایەد ئاگـاداری بـنو مـۆری بکـەن، دەبـێ پیـاوی دادوەربـنو رەوشـتی بەشـایەد بونیـان تێدابێ، ئەگەر دوو پیاو چنگ نەکـەوتن دەبـێ پیاوێـكو دوو ژن بـن...! قورئـانی پیرۆز حیکمەتی ئەوەشـی ئاشـکرا کـردوە کـە لـەجیاتی پیاوێـك دوو ژن دادەنـرێن

چـونکە ئـافرەت زۆر تـر لـە پیـاو تووشـی هەڵـەو لەبیرچـوونەوە دەبـێ‌و کـەمتر تێکەڵاوی سەوداو مامەڵە دەبێ!

٥- قورئانی پیرۆز قەرزی بازرگانی جیاکردۆتەوەو نووسینی سەنەدو قەباڵەی بـۆ مــەرج نــەگرتووە چـونکە سـەفقەی بازرگـانی کـارێکی رۆژانەیـەو زۆر جـار روودەدا، لەوانەیـە لـە رۆژێکـدا چـەند جـار روویـدا، هـەڵناگرێ هـەموو جـارێ نووسەرو شایەد حازر بکـرێن‌و قەباڵە بنووسـرێ، چونکە هـەل لـە دەسـت کڕیـار دەردەچـێ‌و فرۆشـیاریش تووشـی زیـان دەبـێ. ئـەمڕۆش یاسـا جیهانییـەکان ئـەم بۆچوونەی قورئانیان پەسەند کردوە.

٦- قورئـانی پـیرۆز بابـەتێکی تریـشی داهێنـاوە بـۆ پاراسـتنی مـافی کڕیـارو فرۆشـیار ئـەویش بارمتەیـە (رەهـن)ە جـا هـەر کاتێـك کڕیـارو فرۆشـیار لەسـەر سەفەر بوون، نووسەرو شایەدیان دەست نەکەوت، بارمتـە دەبێتـە جـێ نیـشینیان! ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە یاسای بارمتە هەر بۆ ئەو حاڵەتەیـە بـەکار دەهێنـرێ، چـونکە لـە حـەدیثـی صـەحیحدا هەیـە کـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) لـە مەدینـە (زرێ)یەکەی لـەلای کابرایـەکی جـوو بارمتـە کـرد، موسـوڵمانانیش لەسـەفەرو لـە ماڵەوە بارمتـەیان لای یـەکتری دانـاوە، نووسـەر بووبـێ یـان نـەبووبێ... ئایەتەکـە تەنها ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە کە لەکاتی سەفەردا ئەگەر نووسەرو شـایەد نـەبوون بارمتە جێگەیان دەگرێتەوە.

٧- قورئانی پیرۆز ئەوەی راگەیاندووە: ئەگەر کەسێك بـانگ کـرا بـۆ شـایەدی پێویستە بەپیر بانگەوازەکەوە بچێ‌و ئامادەبـێ چونکە نەچوون سەردەکێشێ بـۆ پێـشێلکردنی مـافی خەڵـك مامەڵـە شـێواندن‌و سـستی تێـداکردن، بەرژەوەنـدیی گشتی ئەوە دەخوازێ کە مافی خەڵکی بپارێزێ‌و مامەڵەکردنیش ئاسان بکـرێ ئـا بــەو جــۆرە دەبیــنین رێــك‌و پێککردنــی کــاری بازرگــانی‌و پارێزگــاریی مــافی موسـوڵمانان یەکێکـە لـەو یاسایانەی کـە ئیـسلام پـێش چـواردە سـەدە دایهێنـاوەو چەسپاندویەتی! ئەوەی ئـەمڕۆ لـە تـاپۆو دادگاکانـدا بـۆ چەسـپاندنی مڵـکایەتی‌و ماف ئەنجام دەدرێ زۆر لە شێوەی کارو باری رەهن دەچێ.

## سوود خواردن حەرامە (سود حەرامكردن) (تحريم الربا):

ئیسلام سوود خـواردنی حـەرامكردوە، چونكە سـوود هەسـتی خۆشەویـستیو بەزەیی لەمرۆڤدا دەكوژێ، سوودخۆر هیچ كۆ لە رەتكردنەوەی قەرزدار ناكاتـەوە، هەر هەوڵی زۆركردنی سەفتە پارەكانی خۆیەتی.

لەكاتێكـدا مـاڵ لـە روانگـەی ئیـسلامەوە ئەمانـەتو سـپاردەیە لەدەسـتی خاوەنەكەی داو كابرای كراو بە خاوەنی مووچە خۆرەو بەرپرسیارە كە بـەكاری بێنێ بۆ سوودو قازانجی گشتی – بۆی نیە كە هەل بەدەست بێنێو كاتێك فەقیرو هەژار پێویستیان پێ بوو پارەیان بداتێو زیاد لەمافی خۆی وەربگرێتەوە لێیان!!

هەژارو بێنەوایان لـە حكوومـەتی ئیـسلامیدا پێویـستە قـەرزیان بـەبێ سوود بدرێتێو (قرض الحسنة) یان لەگەڵ دا بكرێ، چونكە ئەمـە خۆشەویـستی لـەناو دڵی موسوڵماناندا بڵاو دەكاتەوەو روحی هاریكاری لە نێـوان هـەژارو دەوڵەمەنـددا دروسـت دەكـا بـە پێـچەوانەوە سـوود وەگـرتن دوژمنایـەتیو كینـەو رق بـڵاو دەكاتەوە!

ئایینی ئیسلام سوود وەرگرتنو سوود خواردنی بە تاوانێكی ئابووریی دانـاوە، چونكە پێچەوانەی ئەو دەستوراتو یاسا پیرۆزانەیـە كـە خەڵـكی هـەڵ دەنـین بـۆ هاریكـاریو یارمەتیـدانی كەسـێك كـە پێویـستی بـەو یارمەتییـە هەیـە، خـودا دەفەرموێ:

{يَمْحَقُ اللّهُ الْرِّبَا وَيُرْبِي الصَّدَقَاتِ}.

واتە: خودا ماڵی سوود تێكـەڵ بـوو دەپووكێنێتـەوەو مـاڵی زەكـات لێـدەركراو زیاددەكاو خێرو خۆشـی تـێ دەخـا. لـە ئایـەتێكی تـردا پـەروەردگار بـە مەبەسـتی ترساندنی موسوڵمانان لە سوود خواردن دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ، فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُؤُوسُ أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ، وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ وَأَن تَصَدَّقُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ - سورة البقرة – ٣٧٨-٢٨٠}.

ئەم ئایەتە بێ پێچو پەنا سوودی حـەرام کـردوە دەفـەرموێ: ئـەی بـڕواداران لەخودا بترسنو واز لە سوود وەرگرتن بێنن! ئەگـەر واز نـەهێنن بـزانن ئێوە لـە دژی خـودا کەوتوونـە جەنگـەوەو چـونە ناوسـەنگەری دژ بـە پێغەمبـەری خـودا چـونکە سەرپێـچی فـەرمانی ئـەوانتان کـردوە، جـا ئەگـەر تۆبـەتان کـردو فەرمانبەردار بوون ئەوە دەتوانن سەرمایەی خۆتان وەرگرنەوەو واز لـە سوودەکە بێنن! ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە خاوەن قەرز تەنها مافی ئەوەی هەیە ئەوپارەی کە بە سوود داویـەتی دەسمایەکە وەربگرێتـەوەو بـەس، دوایـی دەفـەرموێ: { وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ. الآية}. لەمەشدا داوا لە خاوەن قـەرز دەکا کـە مۆڵـەتی قـەرزداری هەژار بداو لەسەری بەسروکەت بێ تا دەیبێ بیداتەوە، بەڵکوو زیاد لەوەش داوای لـە خـاوەن قـەرزکردوە کـە هـەرکاتێ قـەرزدار نـەبوو بـوو هـەر لێـی خـۆش بـێو گەردنی ئازاد بکا.. هەر دەربارەی سوودو زیانەکانی قورئان دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ الرِّبَا أَضْعَافًا مُّضَاعَفَةً وَاتَّقُواْ اللّـهَ لَعَلَّـكُمْ تُفْلِحُونَ، وَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ، وَأَطِيعُواْ اللّهَ وَالرَّسُولَ لَعَلَّـكُمْ تُرْحَمُونَ - سورة آل عمران – ١٣٠-١٣٢}.

ئـەم ئایەتانـەش ئـەوە دەگەیـەنن کـە سـوود حەرامـە زوڵـمو ستەمی تێدایـە چونکە (ریبا) سوود سەر بۆ ئەوە دەکێـشێ کـە خـاوەن قـەرز دوچـەندانەو چـەند چەندانە پارەکەی لەقەرزدار وەرگرێتـەوە، زوربـەی ئەوانـەی کـە قـەرز بـە سـوود وەردەگـرن قـازانجێکی کـەمیان سـەری کێـشاوە بـۆ فـەوتانی ئـەو موڵـکو ماڵـەی هـەیانبووە! ئاشکراشـە کـەمێك لـە سـوودو ریبـا بـە درێـژایی رۆژگـار زیـاد دەبـێو کاتێـك قـەرزدار بـەخۆی دەزانـێ قـەرزو سـوودەکە بەتـەواوی مـاڵو سـامانی داگرتووەو ناتوانێ بیداتەوە، ئەمەش سەردەکێشێ بۆ خراپترین تەنگو چەڵەمەو ناکۆکیو نەخۆشی کۆمەڵایـەتی! بۆیـە پـەروەردگار هەڕەشـەی سـزای سـەختی لـە سوود خۆران کردوە تا خۆیانی لێ بپارێزن.

ئەو سوودو فایزەی قورئـان حـەرامی کـردوە فـایزی قـەرزە واتـە: دواخـستنی دانەوەی قەرزە لە بەرامبەر زیادبوونی قەرزەکە...

ئیمامی جەصصاص لە کتێبی (أحكام القرآن)دا دەفەرموێ: ریباو فایزێـك کـە عەرەب لە سەردەمی هاتنە خوارەوەی قورئاندا پێی ئاشنا بوونو باوبوون، پارە – زێڕو زیو – بە قەرزدان بوو، تا ماوەیەك بە زیادەیەك کـە هـەردوکیان پێـی رازی بوون! ئـەم شـێوە سـوودو فـایزە بـاوبوو لای عەرەبـەکان! ئـەمجار دەڵـێ: ئاشـکرایە سوودو فایزی سەردەمی پێش ئیسلام پارە بە قـەرزدان بـوو تـا کـاتێکی دیـاریکراو بە زیادەیـەکی دیـاریکراو لـە جیـاتی دواکـەوتنی قەرزەکـە، ئـیتر پـەروەردگار ئـەم شێوە مامەڵەی پووچ کردەوەو حەرامی کرد. ئەمجار فەرمووی: {وَإِنْ تُبْتُمْ فَلَـكُمْ رُؤُوسُ أَمْـوَالِكُمْ}. ئەگـەر تۆبـە بکـەن بۆتـان هەیـە دەسمایەکـەتان وەربگرنـەوە. لەوەپێشیش فەرموویبووی {وَذَرُواْ مَـا بَقِـيَ مِـنَ الرِّبَـا}. واز لـەو سـوودو قازانجـە بهێنن کەوەرتـان نەگرتووە.

ئیبنو لقەییم دەفەرموێ: ئەم قەرزە بە قازانجە (ربا النسیئة) پێی دەگـوترێ (ربا الجلي) واتە: سوودو قازانجی ئاشکرا. ئەم شێوە مامەڵە لە سەردەمی نەزانیـدا بـاو بـووە، بـەم شـێوە قـەرزدار قەرزدانەوەکـەی دوا دەخـستو خـاوەن قـەرزیش ئەنـدازەی قەرزەکـەی زیـاد دەکـرد ئـیتر هـەتا ئـەو زیـاتر قـەرز دانەوەکـەی دوا بخستایە ئەویش پارەکەی زیاد دەکرد، تا سەد دەبوو بە هەزاو زیاتریش!

شێوەیەکی تریش لە سوودو فایز هەیە، پێی دەگوترێ: (ربـا الفـضل) سـوودی زیــادە، ئەمــەش فــەرموودەکانی پێغەمبــەر (درودی خـودی لەسـەربێ) شــیان کردۆتــەوەو حوکمەکەیان دیاری کـردوە، بـەم جۆرە دوو کـەس شـتەکانیان لەیـەك نـەوع بـن‌و بەیەکیان بگۆڕنەوە حازر بە حازر بەڵام یەکێکیان زیادەیەك وەربگرێ! جا لەبـەر ئەوەی ئەم شێوە مامەڵەیە کەم رێ دەکەوێ‌و لـەم رۆژگـارەدا، یـان هـەرناکرێ یـان بەکەمی دەکرێ لەبەر ئەوە درێژەی پێ نادەین.

## بڕێ زەرەرو زیانی سوودو فایز (بعض مضار الربا):

ئـا ئەوەیـە ئـەو سـوودو فـایزەی ئـیسلام حـەرامی کـردوە، ئـەو ریبایـەی کـە دژایەتی‌و دوژمنایەتی دەنێتەوە لە نێوان چینەکانی کۆمەڵداو گیـانی هاریکاریـان

تێـدا دەکـوژێ! هـەروەکوو چـۆن ئیـسلام دەیـەوێ لـە ڕێگـای حرامکردنیـەوە لەخۆبایی بوونی سەرمایەداران پوچ بکاتەوەو نەهێڵێ لەسەر حیسابی کۆمـەڵانی زەحمەتکێش سەرمایەدار هەڵبهاوسێ هەروەها بۆ ئەوەی یەکسانی لە نێو کۆمـەڵ دەستەبەر بکاتو کۆمەڵێکی بەرهەمهێنـەر بێنێتـە کایەوە. چونکە سـەرمایەداریی سـوودخۆر لـەجیاتی ئـەوەی کـارێکی سـودبەخش ئـەنجام بـدا لەسـەر حیسابی ماندوبوونی خەڵکی هەڵدەهاوسێو دەوڵەمەند دەبێ!

قورئانی پیرۆز ڕێزو نرخی داوە بەئیشکردنو تانەی لە مامەڵەی سوودو فایز ئامێزداوەو فەرموویەتی:

{ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُواْ إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا وَأَحَلَّ اللّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا - سورة البقرة – ٢٧٥}.

جا لـە کاتێکـدا کـاری بازرگـانی مانـدوبوونی دەوێو پێویـستی بـە پـسپۆڕیو لێهاتوویی هەیـەو دەبـێ دڵ قـایمو بـەورەبێ، یاسـای سـوودو بڵاوبوونـەوەی فـایز دەبێتە هـۆی پەیـدابوونی چینێکی بـێ ڕەحمـی خۆویـستو تەمـەڵ. هـیچ کارێـك ئەنجام نادەنو بێ ماندوبوون ماڵو سـامانیان هەڵدەهاوسـێو بـە ئـارەزوی خۆیـان فەقیرو هەژار دەچەوسێننەوە!

لەلایەکی ترەوە سوودو فایز وا لە خەڵکی دەکا کە زیاد لەتوانای خۆیان پتر لـە بـەرەی خۆیـان قـاچ ڕابکێـشنو سـەودای وا بکـەن کـە نـەتوانن خـۆ بـۆ ئاکامەکـەی ڕابگرن، بازرگان لەجیاتی ئەوەی کە بازرگانی بەو پارەو پوولـەی کـە هەیـەتی بکـاو خۆ لە مامەڵەیەك بهاوێ بتوانێ ئەگەر تووشی بەڵایەك بوو خۆ ڕزگار بکـاو قـەرزو قۆڵە بداتەوە!! هەڵدەستێ بە سوودو فایز پارە وەردەگرێ بۆ ئەوەی بازرگانییەکانی فـراوان بکـا، جـاری وا هەیـە قـازانج دەکـا! بـەڵام کاتێـك کـەلو پەلـەکانی شـکانی بەسەردا دێو هەرزان دەبێ یـان کـەلو پەلـەکانی تووشـی بەڵایـەك دەبـن ئـیتر ئـەو قەرزو سودو فایزەی کـە خـستۆیەتیە ئەسـتۆی خـۆی بـۆی هەڵناسـووڕێو لـە ئاکامـا مایە پوچ دەبێو تێدەشکێ! لەلایـەکی تـرەوە سـوود دەبێتـە هـۆی پەیـدابوونی دڵـە ڕاوکێو قەلەقی نەفسی هەمیشەیی بۆ سووددەرو سوود خۆر!

سوودو فایز هۆکارێکی گرنگە بۆ داگیرکردنی وڵات لەلایەن داگیرکەرانەوەو هەڵبوونی بای شووم تێیدا! شتێکی سەلمێنراوە کە شەڕو هێرشی ئابووریی کە لەسەر بنەمای بازگانی فایز ئامێز ئەنجام درابێ رێ خۆشکەرەیەکی کاریگەر بووە بۆ داگیرکردنی وڵات لەلایەن سوپای داگیرکەرەوە کە زوربەی وڵاتە خۆرهەڵاتییەکانی گرتەوە! ئەو حکوومەتە خۆرهەڵاتییانە بێگانەی سوودخۆر کردەوە، چەند ساڵێکی پێ نەچوو سامانی وڵات لەدەست هاووڵاتیان دەرچوو کەوتە دەست ئەو بێگانانەوە! کاتێك حکوومەتەکان بە ئاگاهاتنەوەو ویستیان بەرگری لە خۆیانو سامانی وڵات بکەنو نەهێڵن ئەو چاو چنۆکانە وڵات تاڵان بکەن، ئیتر ئەو بێگانە سەرمایەدارانە هانایان بۆ حکوومەتەکانی خۆیان بردو داوای یارمەتیدانیان لێکردن ئەوانیش بەناوی پاراستنی بەرژەوەندی هاووڵاتییان دەستیان خستە ناو وڵاتەوەو دەستیان بەسەر شوێنە ئابوورییەگرنگەکانی وڵاتدا گرت!؟

بۆیە پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: نەفرەت لەو کەسەی سوود دەخواو ئەوەی سوود دەداو ئەوەی سەنەدو قەباڵەکە دەنووسێو ئەوەی دەبێتە شایەدو ئاگاداری مامەڵەکە دەبێ! ئەمجار فەرمووی: هەموویان لە تاوانەکەدا چونیەكو هاوبەشن.

بڕێ جار هەندێ کەس رەخنە دەگرنو دەڵێن ئێمە لە رۆژگارێکداین موسوڵمانان حکوومەتی ئیسلامیان نییەو یاسای ئیسلام کاری پێ ناکرێو موسوڵمانان ناتوانن بێ یارمەتیدانو بەکارهێنانی یاسای ئەو بێگانانە بژین.. ئەوەی کە ئەمڕۆ سەیتەرەو دەسەڵاتی بەسەر جیهاندا هەیە چەند حکوومەتێکی سەرمایەدارن دەستیان خستۆتە بینەقاقای خەڵکییەوەو هەموو گەلو نەتەوەکان بوون بەژێر دەستەی ئەوان، بە ناچاری پارەو کەلو پەلیان بە قەرزی سوود ئامێز لێ وەردەگرن، هیچ چاریان نییە، دەی هەڵوێستی ئیسلام لێرەدا چییە؟! بڕێك لە زانایانی ئیسلام لەبەر ناچاری رێگەیان داوەو بەڵگەشیان فەرموودەی قورئانە کە دەڵێ: {فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ}.

واتە: کەسێك ناعیلاج بوو بەقەدەر پێویست دەتوانێ پێویستیاتی زەروریی خـۆی لـەماڵی حـەرام جێبـەجێ بکـا بەمـەرجێك تـەجاوەزو زیـادەڕەوی نـەکا لەحاڵەتی ئاوادا گوناهبار نابێ!

ئەو حاڵەتە زەرورییەتانەی زانایانی ئیسلام کردویانن بەهۆکاری حەلاڵبوونی حـەرام هـەروا بەهەوانتـەو بەقسەی تاکە کـەس نابـێ بەڵـکوو زانایـانی ئیـسلامو پـسپۆڕانی کۆمەڵناسـیو شـارەزایانی کاروبـاری مـالیو پیـشەسازیو بازرگـانی ئـەو حاڵەتانە دەسنیشان دەکەن.

## ئەو هۆیانەی ریباو سوود قەڵاچۆ دەکەن؟(وسائل للقضاء علی الربا):

ئاشکرایە کـە قـەرزدان بـە موحتاجـانو دەسـتگرتنو یارمەتیـدانیان بەچاکە هۆکـارێکی گـرنگن بـۆ بـەرگری لـە بڵاوبوونـەوەی سـوودو فـایز، لایـەنێکیش کـە زەکاتی تێدا سەرف دەکرێ قەرزدانەوەی قەرزدارانە، ئەو قەرزدارانەی پارەیان بـۆ رەهـاکردنی کـاری چـاکە قـەرز کـردوە زیـادە رەویـشیان نـەکردوەو ناشـتوانن قەرزەکان بدەنەوە، هەروەها ئەو داماوو بێ نەوایانەی کە کەس قەرزیان پێ ناداو پێویستیان بە پارەیە بەشێك لە زەکاتیان پێ دەدرێ بـۆ ئـەوە پێداویـستی خۆیـان دابین بکـەن! بـەڵام کەسـێك پـارەی قـەرزکردبێ بـۆ زەرورییـەتێکی زۆر پێویـست، وەکـوو ئـەوە پـارەی قـەرزکردبێ بـۆ بـژیوی خـاوو خێزانـیو دابینکردنـی پێداویستییەکانیانو بەقەرزی ئاسایی پارەکەی دەست نەکەوتبێو ناچار بوبێ بـە سوودو فایز وەری بگرێ! ئەوە کابرای قەرزوەرگر گوناهبار نابـێ، بەڵـکوو کـابرای کە قەرزەکـەی داوەتـێ ئـەوە گوناهبـار دەبـێ، هـەر کەسـێکیش لەوڵاتـدا تـەنفیزی فرمانی شەرع نەکا کوناهی ئەو سوود خواردنەی دەگاتێ! چونکە زەکـات بەشـێکی بۆ قەرزدانەوەی قەرزدارانە، ئەگەر بـەرێكو پێکـی ئـەنجام بـدرێ نـەدارا نامێنـێ. یـەکێکیش لەمەبدەئـە ئیـسلامییەکان هـەڵنانی موسـوڵمانانە بـۆ هاریکـاریکردنی یەکتری لە پێناوی خێرو خۆشی تاكو کۆمەڵدا: {وَتَعَاوَنُواْ عَلَـى الْـبرِّ وَالتَّقْـوَى}. ئەمـەش هـەموو هاریکارییـەك دەگرێتـەوە – هاریکـاری کـشتوکاڵی، هاریکـاری

پیـشەسازی، هاریکـاری کۆمەلآیـەتی .. هتـد – ئـەم کۆمەڵـە هاریکاریانـەی مـیری یارمـەتییان دەدا لـقو پـۆپی خۆیـان لەشـارو لادێکانـدا دادەمـەزرێنن یارمـەتی کشتیارو بازرگانو پیشەوەران دەدەنو سوودو فایزیـشیان ناخەنـە سـەر، هـەر ئـەم کۆمەڵە هاریکاریانە دەتوانن بەرو بوومی کشتیارو پیـشەسازو بازرگانـەکان بخەنـە بازاڕەوەو قازانجێکی حەڵاڵو زوڵاڵ دەستەبەر بکەن هەموو لایەك قازانجی لێ بکا!

## قەرزکردن بەفایز بۆ خەرجکردنو بەرهەم هێنان:

زانـای بـەناوبانگ (شـارڵ جیـد) دەڵـێ: حـەرامکردنی سـوود لـە چـاخەکانی پێـشوودا شـتێکی ڕەواو بـەجێ بـوو حەڵاڵکردنیـشی لـەم ڕۆژگـارەدا شـتێکی زەرورییەو ڕەوایە، چونکە قـەرز وەرگـرتن لـەکۆن دا بـۆ خـەرجکردن بـووە بـەڵام ئـەمڕۆ بـۆ کاسـپی پێکـردنو بەرهـەم هێنانـە. بەقـسەی ئـەم پـسپۆڕە ئابوورییـە ئەورووپییە قەرزکردن بەسوودو فایز بۆ خەرجکردنو خـواردن کـارێکی خراپـەو پێویستە حەرام بکرێ! بەڵام ئایا پارە قەرزکردن بە زیادە لەم ڕۆژگارەدا هەمووی بۆ بەرهەم هێنان بەکار دەهێنرێ؟!

بێگومان بەشێکی بۆ خەرجکردنو خواردنی پێداویـستی بـەکاردێ، خۆئەگـەر بیسەلمێنین کە قەرزکردنی بەزیادە بۆ بەرهەمهێنان سوودی هەیـە، ئـەمجار واشـی دابنـێین کـە حکوومـەتێك لـە حکوومەتـەکانی جیهـان ڕیبـای بـۆ بەرهـەم هێنـان حەڵاڵکرد، قەرزکردنی بەزیادەو سوود بـۆ خـواردنو خـەرجکردن حـەرام کـرد – وەکوو شارل جیـد دەڵێ دیـسان ئـەم یاسایە کەڵـکی تـەتبیقکردنی نییـە، چونکە پێش قەرزکردنەکە قەرز وەرگر نازانێ کە سەد دەر سەد ئەو پارەیە هـەمووی بـۆ بەرهەمهێنان بەکار دێنێو بۆ خواردنو خەرجکردن بەکاری ناهێنێ؟!

ئاشکراشە لێرەدا دەرگـای حیلـە شـەرعو فـێڵو فەنـدەڵ زۆرو زەبەنـدەن هـەر لەبـەر ئەمـە ئیـسلام سـوودی حـەرامکردوە چ بـۆ خـواردنو خـەرجی بـێ چ بـۆ بەرهەمو مامەڵە پێوەکردن بێ، چونکە ئەگەر پـارە قەرزکردنەکـە بـۆ (استهلاك)

خـەرجکردن بـێ، ئـەوە بـۆ پێداویـستی زەروورییـاتی کـابرای قـەرز وەرگـرە، دەی کـەوابێ دروسـت نییـە زیـاد لـەو پـارەی وەری گرتـووە لێـی داوا بکرێتـەوە، هـەر ئەوەنـدەی لەسـەرە کاتـێ بـووی قەرزەکـە بداتـەوە، ئەگـەر پـارە قەرزکردنەکـەی بۆمامەڵەو کارو کاسبی بێ ئەوە لە راسـتی دا ئـەو کۆشـش‌و ماندووبوونـەی قـەرز وەرگر دەبێتە هۆی قازانج‌و زیـاد بـوونی ماڵەکـە، نـەك ماڵەکـە بـۆ خـۆی، چـونکە ماڵ بۆ خۆی بێ کۆشش‌و مامەڵە پێوەکردن زیاد ناکا!

لێـرەدا ئەوانـەی کـە بەلایانـەوە ریبـا دروسـتە دەڵێن: ئـەو قازانجـەی کـابرای قەرزوەرگر بە دەستی دێنـێ بـەهۆی پـارەی کـابرای خـاوەن قـەرزو کۆشـشی قـەرز وەرگـرەوە دێتـە دی دەی بۆچـی بـۆ کۆشـشی کـابرای قـەرزوەرگر قـازانج بـە رەوا ببینین بەڵام بۆ دەستمایەکە کە رۆڵێکی گرنگی هەیە لە قازانجەکەداو هی کابرای خـاوەن قـەرزە هـیچ قـازانج دانـەنێین؟! بـە تایبـەتی کـە ئـەمیش هاوبەشـی ئـەو بەرهەمەیە؟!

بـۆ وەڵامـی ئـەم بۆچوونە دەڵێین هـەر بـە قـەرزکردنی پارەکـەو وەرگرتنـی، دەستمایەو کۆشش هەردوکیان دەبنە هی کابرای قەرزوەرگرو کابرای خاوەن قەرز پەیوەندییـەکی بـەو ماڵـەوە نامێنـێ، بەڵـکوو قـەرزوەرگر خـۆی بەرپرسـیارە لـە قازانج‌و زەرەردا، تەنانەت ئەگەر ماڵەکە فەوتا خـۆی بـە تـەنیا لێـی بەرپرسـیارە، خاوەند قەرز پەیوەندی پێوە نییە، جا ئەگەر بڵێین: خاوەن قەرز دەبـێ بەشـێکی قـازانجی ماڵەکـەی بـدرێتێ پێویـستە لـە زەرەریـشا بیکـەین بـە شـەریك چـونکە هـەموو مافێـك لـە بەرامبـەر ئەرکێکدایـە (کـل حـق مقابـل واجـب) هـەرکاتێکیش ئەوەمان بەرەوا زانی کە خاوەن دەستمایە بکەین بە هاوبەش لـە قـازانج‌و زەرەردا ئەوە باسەکەمان لە ریباو سوودەوە دەگۆڕێ دەبێتـە کومپانیـای هاوبـەش لـە نێـوان سـەرمایەدارو کـابرای کۆشـشکاردا ئەمـەش ئیـسلام بـەڕەوای دەبینـێ‌و هـیچ خراپیەکی تێدا نیە!

## قازانج و سوودی سندوقی زیادکردن و پەزمەندە:

حوکمی وەرگرتنی قازانج و سوود لە سندوقی زیادکردن یان لە بانکەکانی پارە، لە ئیسلامدا بزانین چۆنەو چۆن نییە چونکە ئەمە موشکیلەیەکی سەردەمەو هەموو جیهانی گرتۆتەوە!!

لێرەدا بە پێویستی دادەزانین کە دەقی ئەو راوو بۆچوونەی کە لە لیژنەی فتوای مامۆستاکانی ئەزهەر دەرچووە راگوێزی ئێرەی بکەین. پوختەی فتواکەیان دەڵێ: (وەرگرتنی سوودو قازانج لەو پارەو پوولەی کە لە سندووقی تەوفیردا دانراوە یان لە یەکێ لە بانکەکاندا دانراوە – حەرامە چونکە ریبایەو سوودی حەرامە ئەمەش بە گوێرەی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرو رای گشتی زانایانی ئایینی).

بەڵام بەرێز مامۆستا شێخ مەحمود شەلتووت، (شێخی جامع الأزهر) رایەکی تری هەیە، دەربارەی سوودو قازانجی سندوقی تەوفیر، بۆچوونێکی تایبەتی خۆی هەیەو دەفەرموێ: (برێ زانایانی ئیسلام دەربارەی حەڵاڵ و حەرام دەفەرموون: ئەم قازانجە حەرامە چونکە ئەمە یان سوودو فائیدەیە بۆ پارە دانراوەکە، یان قازانجێکە قەرزەکە کێشی کردوە، ئەوەی کە ئێمە لێرەدا دەیبینین و لەگەڵ ئەحکامی شەرعی گونجاوەو قاعیدەی فیقهی راست و دروست دەیگرێتەوە ئەوەیە کە ئەم پارە قازانجە حەڵاڵەو هیچ حەرامییەکی تێدا نییە! چونکە ئەو پارەیەی دانراوە قەرزی خاوەن پارە نییە لەسەر سندوقی تەوفیر، قەرزێکیش نییە کە سندوقی تەوفیر لە خاوەن پارەکەی قەرزکردبێ بەڵکوو خاوەن پارە بە ئیختیاری خۆی پارەکەی داناوە لەو فرمانگەیەدا بۆ بەرژەوەندی سندوقەکەو داوای کردوە پارەکەی لێ قبووڵ بکەن، دەشزانێ کە ئەو پارەیە دەخرێتە مامەڵەی بازرگانییەوەو بە دەگمەن نەبێ زەرەر ناکا، دیارە کابرای خاوەن پارە بەم پارە دانانە:

یەکەم: مەبەستی ئەوەیە ماڵەکەی بپارێزێ و نەهێڵێ بدزرێ و بفەوتێ، خۆشی رام بێنێ لەسەر زیادکردن و ئابووری.

دووەم: مەبەستیـشی ئەوەیـە کـە بەرژەوەنـدی سـندوقەکە بـەردەوام بـێو دەستمایەکەی زیاد کاو دەرگای مامەڵەکردنی زۆر ببن‌و قـازانجی زۆر بکـا کرێکـارو موچەخۆرو هاووڵاتیان سوودی لێ وەربگرن‌و حکوومەتیش قازانج بکا، جا ئەگـەر فەرمانگەکـە: (صـندوق التـوفیر) بەشـێکی لـەو قازانجە بڕیـەوە بـۆ پـارە دانـراوە کارپێکراوەکـەو دای بـە کـابرای خـاوەن پـارە بێگومـان ئـەم مامەڵەیـە، قـازانجێکی هاریکـاری گـشتییەو هـیچ شـوبهەو تـاوانی تێـدا نـابینرێ‌و کەسـی تێـدا نەچەوساوەتەوە، بەڵکوو تەشجیع‌و هەڵنانی تێدایە بـۆ زیـادکردن‌و هاریکـاری کـە شەرعی ئیسلام پەسەندیان دەکاو بەلایەوە کارێکی باشە.

## ماڵ خواردنی خەڵـکی بەناحەق حەرامە:

خودا دەفەرموێ: {وَلاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَـكم بَيْنَكُم بِالْبَاطِلِ وَتُدْلُواْ بِهَا إِلَى الْحُكَّامِ لِتَأْكُلُواْ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَالِ النَّاسِ بِالإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ - سورة البقرة – ١٨٨}.

پـەروەردگار ئـەم خیتـاب‌و فرمانـەی ڕووبـەڕوی هـەموو موسـوڵمانانەو مانـای ئایەتەکە بەم جۆرەیە: با هیچ کەس لە ئێوە مـاڵی هـیچ کـەس بـەناڕەواو ناحـەق نەخوا، ماڵخۆرەکە تاکێکە لەو گەلەو هەر تاوانێـك بکـرێ لـەناو گەلەکـەدا هـەموو تاکێـك بەشـێکی بەردەکـەوێ! هـەر بۆیەشـە پـەروەردگار وشـەی (أمـوالکم)ی بەکارهێناوە تا ئاماژە بێ بـۆ یەکیـەتی ڕیزەکـانی گەل‌و هاریکـاریی ناویـان، مـاڵ‌و موڵکی هەندێکیان ماڵ‌و موڵکی هەموانە، چونکە مـاڵ‌و دارایـی ڕەگـی حەیاتـەو شادەماری گەلـە، کەوایـە پێویـستە لەسـەر هـەموان کـە دەسـت بخەنـە نـاو دەسـتی یـەکترەوە بـۆ پاراسـتنی‌و پارێزگـاریکردنی... مانـای فـەرموودەی خـودا کـە دەفەرموێ: { وَتُدْلُواْ بِهَا إِلَى الْحُكَّامِ}. واتە: بەرتیل مەبەن بـۆ کـار بەدەسـتان‌و فێری ماڵخواردنی بە ناحەقیان مەکەن {لِتَأْكُلُواْ فَرِيقًا مِّنْ أَمْـوَالِ النَّـاسِ بِـالإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ}. داوای کۆمەکیکردنی لێپرسراوان بکەن بۆ ئـەوە بـڕێ کـەس مـاڵی بـڕێ کـەس بـە ناحـەق بخـۆن، دەسـتکەوتنی سـامان بـەم جـۆرە حەرامـەو تاوانـە،

چونکە حـوکمی حـاکم هـیچ لـە واقیـع نـاگۆڕێو حـەرام حـەڵاڵ ناکـاو حـەڵاڵیش حەرام ناکا!

قورئانی پیرۆز لە کاتێکدا خـواردنی مـاڵی خەڵـکی بەگشتی حـەرام کـردووە، بەم ئایەتە نەهی لێکردووە دەبینین لە شوێنی تردا حەرامی یەکە بـەهێزتر دەکـاو زیاتر داوای پاراستن لەو ماڵ خواردنە دەکاو هەڕەشەی تونـدتر ئاراسـتەی ئەوانـە دەکا کە ئەو کارە ئەنجام دەدەن! یەکێ لەو شوێنانە:

١- خواردنی ماڵی هەتیوانە بە ناحەقو نارەوا، ئـەوەتا پـەروەردگار هەڕەشـەی توندی لەو کەسانە کردوە کە ماڵی هەتیوان دەخۆنو دەفەرموێ:

{إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا - سورة النساء – ١٠}.

واتـە: بێگومـان ئەوانـەی مـاڵی هـەتیوان – بـە ناحـەق – دەخـۆن بـا بـزانن ئەوانە ئاگر دەخۆنو تاوانێکی گـەورە ئـەنجام دەدەن، ڕۆژی قیامـەتیش دەخرێنـە ناو دۆزەخەوە.

٢- قورئـانی پـیرۆز گلـەییو ڕەخنـەی خـۆی ئاڕاسـتەی ئـەو پیـاوە ئایینیانـە کردوە کە – بە ناحەق – ماڵی خەڵکی دەخۆن دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ الأَحْبَارِ وَالرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَالَ النَّـاسِ بِالْبَاطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللّهِ وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّهِ - سورة التوبة ٣٤}.

ئەم ئایەتە بەراشکاوی هەڕەشـەی تونـد لـەو مـالمو قەشـەو – کۆلکـە مـەلا – یانە کردوە کە بە ناحەق ماڵی خەڵکی وەردەگرنو دەیخۆن!

٣- ئەو شتومەكو پارەو پولەی کە خەڵکی پێشکەشی ئەو کەسەی دەکـەن کـە پێیان وایـە عابیـدەو شـێخەو لای خـودا ئیـشیان بـۆ جێبـەجێ دەکـا ئـەو بـەناو – عابیـدو شـێخە –ش خـۆی وا پیـشان دەدا کـەوا لـە خـودا نزیکـەو دوعـای گیرایـەو ڕەشـە خەڵـکەکە لـە خـشتە دەبـاو نووشـتەو دووعایـان بـە پـارە بـۆ دەکـا (دیـارە

مەبەست نووشتەو دوعای ناڕەوایە) ئەمەش کارێکی خراپەو ئیسلام نەی لێ کردوە، ماڵخواردنی خەڵکییە بە ناڕەوا.

٤- ئەو پارەو پوولەی کە زێوانو مجەوری ئارامگای پیاو چاکان وەری دەگرن لەو ڕەشە خەڵکەی کە هەدیەو فۆتۆی خۆیان بۆ ئەو شوێنانە دەبەنو هیچ لەمانای یەکتا پەرستی نازانن، ئەوەش بە خواردنی ماڵی خەڵکی بە ناحەق دەژمێردرێو ئیسلام حەرامی کردوە!

## قومارکردن حەرامە (تحریم القمار):

پەروەردگار لە قورئاندا قوماری ناو ناوە (مَیْسر) ئەم جۆرە قومارە کە پێی دەگوترێ: (مَیْسِر) لای عەرەبەکان باو بووە هەر شتێك گرەوی تێدابێو مامەڵەیەك بێ سەد دەر سەد قازانج بێ یان سەد دەر سەد زەرەر بێ پێی دەوترێ: مەیسر = قومار کەوابوو بلیتی (یانصیب)و گرەویی پێشبڕکێی ئەسپ لە (رایسیس) حوکمی قوماری هەیەو حەرامە. خودا دەفەرموێ:

{إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ - سورة المائدة – ٩٠}.

واتە: بێگومان عەرەقخواردنەوەو قومارکردنو بتپەرستی، پشك هاویشتن بە تیر، کاری پیسو خراپنو کرداری شەیتانەنو خۆتانی لێ بپارێزن تا لە سزای خودا رزگارتان بێ.

قومار قورماکەران لە رێبازی راستی ژیان لادەداو فێری تەمبەڵیو تەوەزەلییان دەکا، وایان لێ دەکا چاوەڕوانی ئەوە بنو رزقو رۆژییان لە رێگای خەیاڵپلاوەوە بۆبێ، عەقڵیان کول دەبێو بەهرەو ئەزموونیان نامێنێ!

وایان لێ دەکا واز لە کارو کاسبی بە سوودی وەکوو کشتیاریو بازرگانیو پیشەسازی بێننو ساتو رۆژگاری درێژیان بەکاری بێ سوود بەسەر بەرن. قومار روخێنەرەو ماڵوێرانکەرە، چەندەها جار خانەوادەی دەوڵەمەندی لەچەند چرکەیەکدا کردۆتە هەژارو مایە پوچ، زۆر خێزان بە دەوڵەمەندیو خۆشبەختی

پەروەردە بوون کەچی لە ناکاوێك سەرەك خێزان (رب الأسرة) شەوێك لـە شـەوان بـە قورمـاکردن هـەموو ئـەو سـامانو داراییـەی لەدەسـت داوەو لـەژیانی دەوڵەمەندییەوە بووەتە هەژارێکی بێ نـەوای وەها کـە نـەتوانێ نـەمریو نـەژی خێزانەکەی بەخێو بکا، لەبەر ئەم هۆیانە ئایینی ئیسلام قوماری حـەرام کـردوەو داوای کردوە خەڵکی خۆی لێ بپارێزن.

## تەرازوبازی حەرامە (تحريم التلاعب بالمكاييل والاوزان):

یـەکێك لـەو یاسـایانەی ئیـسلام داینـاوە بـۆ پارێزگـاریی سـامانو دارایـی موسوڵمانانو دانیشتوانی وڵاتیان رێکخستنو دیاریکردنی تەرازوو ئامێری کێشانو پێوانـە!! ئیـسلام هەمیـشە شـوێنکەوتوانی مـەنع کـردوە لـەوە کـە مـافی خەڵـکی پێشێل بکەنو کەلو پەلی یەکتری بـەهیچو پـوچ سـەیر بکـرێو بـەهای خـۆی پـێ نەدرێ! خودا دەفەرموێ:

{وَأَقِيمُوا الْوَزْنَ بِالْقِسْطِ وَلَا تُخْسِرُوا الْمِيزَانَ - سورة الرحمن – ٩}.

واتە: ئـامێری کێـشانو پێـوان رێـك بخـەنو تـەرازوبازیی مەکـەن، ئـەمجار لـە ئایەتێکی تردا قورئان تەرازوبازانێ ترساندووە بە کوشندەترین سزای دوا رۆژ کـە دەفەرموێ:

{وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ، الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُواْ عَلَى النَّـاسِ يَسْتَوْفُونَ، وَإِذَا كَـالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ، أَلَا يَظُنُّ أُولَئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ، لِيَوْمٍ عَظِيمٍ، يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ - سورة المطففين – ١-٦}.

واتە: هاوارو سزای بە ئێش بۆ (موطفیفین) ئەوانەی کاتـێ کـەلو پـەل دەکـڕن مـافی خۆیـان وەردەگـرنو بەگـەزی تـەواوو ربـەی گـەورەو تـەرازوی راسـت کێـشانو پێوانەکە ئـەنجام دەدەن، بـەڵام ئەگـەر شـتو مـەك بـە خەڵـکی بفرۆشن دزی تێـدا دەکەنو تەرازوبازی دەکەن!؟؟ ئایا ئەوانە نازانن لـە رۆژی قیامەتـدا – کـە رۆژێکـی سامناکە – زینـدو دەکرێنەوە لەو رۆژەدا کە هەموو ئادەمیزادان زینـدو دەکرێنـەوەو لەبەر دەم پەروەردگاردا رادەوەستن!! لەمانای ئـەم ئایەتـەوە بۆمـان دەردەکـەوێ کـە

پێویستە حکوومەتی ئیسلامی کۆمەڵێك دەستنیشان بکا چاو دێری تـەرازوو کیلۆو ربـەو قـسناغو گـەزو مـەتری دوکانـداران‌و بازرگانـان‌و چەرچییان بکـەن‌و نـەهێڵن دزی‌و تەرازوبازی بکەن.

## دەستبلاوی کاریکی خراپە (ذم الاسراف):

ئـایینی ئیـسلام ئـایینێکی مامناوەنـدی خـوازە، بـۆ هـەموو شـتێك ئەنـدازەو یاسـای دانـاوەو چارەسـەری هـەموو نەخۆشـییەکی کـردوە، ئـەوەتا بـە مەبەسـتی پارێزگاری ماڵ‌و سامانی گرۆهانی موسوڵمانان — قورئانی پـیرۆز نـەهی کـردوە لـە دەستبلاوی‌و ماڵ بەفیڕودان‌و خەرجکردنی لە شوێنی نەشیاوی خۆیـدا... چـونکە دەستبلاوی لە کۆتاییدا خاوەنەکەی مایەپوچ‌و هەژار دەکا! بۆیە دەبینین قورئـانی پـیرۆز دەسـتبلاوانی شـوبهاندووە بـەو شـەیاتین‌و نـەفرەت لێکراوانـەی کـە رێگـای راست لە کۆمەڵانی موسوڵمانان گوم دەکەن، فەساد لەسەر زەوی بلاو دەکەنەوە!

{وَلاَ تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ، إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُواْ إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ وَكَانَ الـشَّيْطَانُ لِرَبِّـهِ كَفُورًا - سورة الإسراء — ٢٦-٢٧}.

ئاشـکرایە دەسـتبلاوەکان بـەو دەسـتبلاوییەیان یاسـای ژیـانی خۆیـان تێـك دەدەن‌و سپڵەیی دەکەن بەرامبەر ئەو نازو نیعمەتەی خودا پێـی داون، لـە جیـاتی ئـەوەی پارێزگـاری ماڵەکـە بکـەن‌و لەشـوێنی خۆیـدا سـەرفی بکـەن دەچـن ئـاوا بەفیڕۆی دەدەن.

لــە ئایــەتێکی تــردا پــەروەردگار وەســفی ســەرئەنجامی دەســتبلاوانی کــردوە دەفەرموێ:

{وَلاَ تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَـةً إِلَـى عُنُقِـكَ وَلاَ تَبْـسُطْهَا كُـلَّ الْبَـسْطِ فَتَقْعُـدَ مَلُومًـا مَّحْسُورًا - سورة الإسراء — ٢٩}.

واتە: هەمیشە لەماڵ سەرفکردندا مام ناوەندی‌و میانەڕەوبە! وامەکە دەسـتت بقوچـێنی‌و هیـچت لێ هەڵنـەوەرێ ئەوەنـدە دەسـتبلاویش مەبـە کـە بەتـەواوی هەرچی هەتە بلاوی بکەیەوەو دەست بە قرپ بێ، چونکە ئەگـەر دەسـت قوچـاوو

رژد بێ، خەڵکی لۆمەت دەکەن، ئەگەر دەستبلاویش بی، دوایی ئاهی حەسرەت هەڵدەکێشی ،خەفەت دەخوای بۆ ئەو ماڵو سامانەی کەوا بەهەوانتە بەفیڕۆت داوە.

## چاکەکردن لەگەڵ چینی هەژار (البر بالطبقات الفقيرة):

قورئانی پیرۆز هەمیشە بانگەوازی بۆ ئەوە کردوە کە فەرقو جیاوازی لە نێوان کۆمەڵانی موسوڵمانانا قەڵاچۆ بکا، لە زۆر ئایەتدا قورئان خەڵکی هەڵناوە بۆ بەخشین لە ڕێگای خوداداو بۆ بەرژەوەندی چینی هەژاران، بۆیە قورئان ساماندارانی هەڵناوە بۆ ماڵ بەخشینو مزگێنی داوە بەوانەی کە بەخشندەن بە پاداشی باشو جەزای زۆرو زەبەندە لە ڕۆژی ڕەستا خێزدا.

## بەخشین لەڕێگەی خودادا (الانفاق في سبيل الله):

بەخشین لە ڕێگەی خودادا هەموو بەخشینو خەرجکردنێك دەگرێتەوە کە بۆ بەرزکردنەوەی ئالای ئیسلامو بەرگریکردن لێیو بلاوبوونەوەی بەرنامەی خودا بەناو خەڵكو چەسپاندنی حوکمی خودا لەسەر زەویو هەر شتێکی تر کە ببێتە هۆی ڕەزامەندیی خودا وەکوو ئەو شتانەی کە سوودو قازانجیان هەیەو بۆ بەرژەوەندی گشتی بەکاردێن... بۆ نموونە قەڵاچۆکردنی نەخوێندەواریو بلاوکردنەوەی زانیاریو یارمەتیدانی بێ نەوایانو پێشخستنی پیشەسازیو هەر شتێکی تر کە لە هەموو ڕویەکەوە ئاستی موسوڵمانان بەرز دەکاتەوە، ئەو ئایەتە قورئانییانەی بانگەوازی موسوڵمانان دەکەن بۆ ماڵ بەخشین لە ڕێگەی خودادا زۆرن یەکێ لەو ئایەتانە ئەم فەرموودەیەی پەروەردگارە کە دەفەرموێ:

{مَّثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنبُلَةٍ مِّئَةُ حَبَّةٍ وَاللّهُ يُضَاعِفُ لِمَن يَشَاءُ وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ، الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ ثُمَّ لاَ يُتْبِعُونَ مَا أَنفَقُواُ مَنًّا وَلاَ أَذًى لَّهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ - سورة البقرة – ٢٦١ – ٢٦٢}.

لـەم ئایەتـە پیرۆزانـەدا پـەروەردگار پێمـان ڕادەگەیـەنێ: کـە هـەر شـتێك ببەخشین لە ڕێگەی خوادا پاداشەکەیمان بۆ دوچەندانەو دە چەندانە دەکاتـەوە، هەر ئەو ماڵە بەخشراوە سوودی دونیـاو قیامـەتی لێ دەبینـین! بـەڵام پـەروەردگار بۆ ئەم پاداشە زۆرو چاکە ئـەوەی بەمـەرج گرتـووە کە بەخـشینەکە منـەتی تێـدا نەبێو چاکەکەی بەچاوی کابرای چاکە لەگەڵ کراودا نەداتـەوەو منـەتی بەسـەردا نەکاو ئەزییەتی نەدا:

منەت: ئەوەیە چاکە کەر چاکەکەی بەچاوی چاکە لەگـەڵ کـراودا بداتـەوەو خۆی بەسەرەوە بادا.

ئەزییەت: ئەوەیە چاکەکەر چاکەکەی لای خەڵکی تر باس بکاو لای کەسانی تـر خۆی هەڵکێشیو بڵێ ئەوەو ئەوەم بۆ فلانکەس کردوەو ئەوەندەم یارمەتی داوە.

قورئـانی پـیرۆز وەصـفی مـاڵ بەخـشینی لـە ڕێگـەی خـودادا کـردوە بـەوە کـە بازرگانیەکی بەسودەو ڕۆژی قیامەت خاوەنەکەی لێی بەهرەوەر دەبێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى تِجَارَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ، {تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ - سورة الصف – ١٠-١١}.

واتە: ئەی کۆمەڵی ئیمانداران! ئەرێ دەتانەوێ ڕێنومایيتان بکەم بۆ مامەڵەو بازرگانییەك کە بتانپارێزێ لـە سـزای بەئێـشی دۆزەخ؟! ئـەویش ئەوەیـە بڕواتـان بەخودا هەبێ، پێتـان وابـێ (محمـد) پێغەمبـەری ئـەوە، ئـەمجار کۆشـش بکـەن لـە ڕێگای خودادا بە ماڵو بەگیان. بێگومان ئەوە باشە بۆ ئێوە ئەگەر زانابن؟!

## ماڵ بەخشین بەسەر موحتاجاندا (الانفاق علی ذوي الحاجة):

ماڵ بەخشین بەسەر موحتاجاندا لە ڕیزی ماڵ بەخشین لە ڕێگـەی خوادایـە، بـەڵام قورئـانی پـیرۆز بـڕی چـینی کۆمـەڵی مستنیـشانکردوون کـە ئـەوان زیـاتر پێویستیان بە چاکە لەگەڵ کردنو دڵنەوایی هەیە.

بەشێك لە کرداری باش چاکە کردنـە لەگـەڵ ئـەو موحتاجانـەی ئـەم ئایەتـە باسی کردون کە دەفەرموێ:

{وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّآئِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ - سورة البقرة – ١٧}.

واتە: موسوڵمان ئەوەیە! ماڵی باشی خۆشەویستی ببەخشێ بـەخزمو کـەس‌و کـاری هـەژاری‌و بەهـەتیوان‌و هـەژاران‌و رێبـواران‌و سواڵـکەران‌و هـەروەها بـۆ رزگاریکردنی کۆیلەکانیش.

لە ئایەتێکی تردا پەروەردگار وەصفی پیاوچاکانی ئاوا کردوە کە دەفەرموێ:

{وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا، إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا - سورة الإنسان – ٨-٩}.

واتە: ئەو موسوڵمانە راستاڵانە خواردنی ئامـادەکراو بۆخۆیـان – هەرچـەندە خۆشیان ئارەزۆیان لێیەتی – دەبەخشن بە هـەژارو هـەتیوو پێشیان دەڵێن: هـەر لەبەر خاتری خودا ئێمە ئەم خواردنەتان پێشکەش دەکـەین چاوەڕوانی پاداش‌و سوپاسی ئێوە نین.

لە ئایەتێکی تردا پەروەردگار لـێ توڕەبوون‌و رەق جوڵانەوە لەگەڵ هەتیواندا هەروا خواردن نەدان بە هەژاران‌و نائومێدکردنیانی داناوە بە رەوشتی کـافرو بـێ بڕوایان‌و دەفەرموێ:

{أَرَأَيْتَ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّينِ، فَذَلِكَ الَّذِي يَدُعُّ الْيَتِيمَ، وَلَا يَحُضُّ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ} سورة الماعون – ١-٣}.

واتە: دەزانی کێ بێ بڕوایەو ئیسلامی بەلاوە ناڕاستەو بەدرۆی دەزانێ؟ ئەوە کەسێکە کـە رێـز لـە هـەتیو نـاگرێ‌و تـرۆی دەکـاو بـە تونـدو تیـژی لـە گەڵیـدا دەجوڵێتەوە، لە هەمان کاتدا سوور نییە لەسە نانبدەیی‌و یارمەتیـدانی هـەژاران‌و خەڵکیش هەڵنانێ بۆ ئەو رەوشتە جوانە!!

رۆژی رەستاخیزیش کە پرسیار لەبێ بڕوایان دەکرێ‌و پێیان دەڵێن: {مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ، قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ، وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ}. چی بوو بەهۆی ئەوەی ئێوە بکەونە ناو دزەخەوە لە وەڵامدا دەڵێن: ئێمە لە دونیا نوێژکەر نەبووین‌و گوێمان بەو عیبادەتە نەداوەو هەرگیز خواردەمەنیشمان بە هەژارو برسییان نەبەخشیوە.

## بەخشینی ماڵی باش‌و خۆشەویست (الانفاق من الطيبات):

خودای پەروەردگار دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ الأَرْضِ وَلاَ تَيَمَّمُواْ الْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِآخِذِيهِ إِلاَّ أَن تُغْمِضُواْ فِيهِ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ - سورة البقرة – ٢٦٧}.

ئەم ئایەتە پیرۆزە دەربارەی زەکات هاتۆتە خواریٚ چونکە هەندێ لە موسوڵمانەکان کە بەروبوومی خورمایان دەچنی خورما خراپەکانیان جیا دەکردەوەو لەلایەکەوە کۆمەڵیان دەکرد جا کە زەکات وەرگر دەهاتن لەو خورما خراپانەیان دەدانێ. ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێ مەنعی ئەم کارەی لێ کردن.. مانای ئایەتەکەش ئەوەیە کە دەفەرموێ: ئەی بڕواداران کە زەکاتتان دا لە جۆری باشی ماڵەکەتان زەکات بدەن مەچن جۆرە خراپەکان جیابکەنەوەو بیدەن بە زەکات!؟ ئەمجار پەروەردگار لۆمەی کردن‌و پێی فەرموون: ئێوە چۆن شتی وا دەکەن، دەچن بەرو بوومە خراپەکان دەکەن بە زەکات‌و باشەکانیش بۆ خۆتان وەلا دەنێن؟! خۆ بۆ خۆتان بەو جۆرە بەرو بوومە رازی نین، ئەگەر بتاندرێتێ وەری ناگرن، مەگەر چاو بقوچێنن‌و قیروسیای لێ بکەن!

هەر لەمانای ئەم ئایەتەدا ئایەتێکی تر هەیە دەفەرموێ: {لَن تَنَالُواْ الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فَإِنَّ اللّهَ بِهِ عَلِيمٌ - سورة آل عمران – ٩٢}.

واتە: ئەی برواداران! بزانن کـە ئێـوە چاکە بەدەسـت نـاهێنن‌و دەسـتتان لێـی گیرنابـێ هـەتا لـە مـاڵی چـاك‌و بـاش‌و خۆشەویـستتان نەبەخـشن! هەرشـتێکیش ببەخشن چاك بێ یان خـراپ خـودا ئاگاداریـەتی‌و دەزانـێ چۆنەو چـەندەو بـە چ مەبەستێك بەخشراوە..

## ماڵ‌و سامان هەمووی موڵـکی خودایە (المال ملك لله):

قورئانی پیرۆز سەرنجی ئـادەمیزادی راکێـشاوە بـۆ لای ئـەم راسـتییە کـە مـاڵ‌و سامانی سەرزەوی هەمووی موڵکی خودایەو مرۆڤ تێیدا سەر پەرشتیارەو وەکیلـی یەزدانە، کەوابوو ناشێ ئادەمیزاد سەرپێـچی فـەرمانی خـودا بکاو بـەرێك‌و پێکـی سەرو بەری نەکا! ئـەرکی سەرشـانی ئـەنجام نـەدا. سـەیری ئـەم چـەند ئایەتانـەی خوارەوە بکـە کـە بەشـێوەیەکی مـەنتیقی ریزکـراون ئـەو راسـتییە دەچەسـپێنن‌و خاوەن موڵکییەتی خودا دەسەلێنن.

{وَلِلّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاللّهُ عَلَىَ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ - سورة آل عمران – ١٨٩}.

واتە: موڵکداریەتی ئاسمان‌و زەوی‌و چییان تێدایە هەمووی هی خودایـە. یـان کە دەفەرموێ:

{هَلْ مِنْ خَالِقٍ غَيْرُ اللَّهِ يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاء وَالْأَرْضِ - سورة فاطر – ٣}.

واتە: خودا رزق‌و رۆژیدەری هەموو ئادەمیزادەو جگە لە ئەو کێ لە ئاسمـان‌و زەوی رزق‌و رۆژیتان دەداتێ؟! یان دەفەرموێ:

{وَأَنفِقُوا مِمَّا جَعَلَـكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ - سورة الحديد – ٧}.

ئەو ماڵ‌و سامانەی هەتانە ئێوە تێیدا جێگرو خەلیفەن لێی ببەخشن‌و رژدی تێدا مەکەن، یان دەفەرموێ:

{وَأَنفِقُوا مِن مَّا رَزَقْنَاكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَـوْتُ فَيَقُـولَ رَبِّ لَوْلَـا أَخَّرْتَنِي إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ الصَّالِحِينَ - سورة المنافقون – ١٠}.

واتە: ئەی موسوڵمانان! ببەخـشن لـەو مـاڵو دارایـیـەی کـە ئێمـە پێمـان داون، پێش ئەوەی مردن یەخەتان بگرێ ئـەمجار پەشێمان ببنـەوەو بڵێن خودایـە! بـۆ تاماوەیەکی تر مۆڵەتم نادەی تا خێرو خێرات بکەمو زەکات بـدەمو کـرداری چـاك بکەمو بچمە ریزی راستاڵانەوەو ببمە خودا پەرستی راست.. یان دەفەرموێ:

{وَآتُوهُم مِّن مَّالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ - سورة النـور – ٣٣}.

واتە: لەو ماڵو دارایییەی کە هی خودایەو داویەتی بە ئێوە بەشی ئەو فەقیرو هەژارانەی لێ بدەن. بۆیە ئەرکی سەرشانی کۆمەڵی ئادەمیزادە کە بە رێكو پێکی فەرمانی یەزدان ئەنجام بدەنو هیچ خاوە خاوی لێ نەکەن. هـەرکاتێك فـەرمانیان پێکرا کە کەمێك لەو ماڵو دارایییەی لەژێر دەستیاندایە بەشی فـەقیرو هـەژاری لێ بدەنو کەمتەرخەمی لێ نەکەن.

## چاکەکردن لەگەڵ ئادەمیزادان قەرزەو خودا دایداتەوە:

قورئـانی پـیرۆز هەمیـشە خەڵـکی هـەڵناوە بـۆ چاکە لەگەڵ یەکدیکردن بـە ئوسـلوبێکی زۆر جـوانو پـاراوو رەوان هـانی مـەردومی داوە بـۆ چـاکە لەگـەڵ یەکدیکردنو دەفەرموێ:

{مَّن ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَاعِفَهُ لَهُ أَضْعَافًا كَثِيرَةً وَاللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْسُطُ - سورة البقرة – ٢٤٥}.

واتە: ئەوە کێیە ئەو کەسەی قەرز بدا بەخودا، بـەبێ سوودو قـازانج دەستی لێقەوماوان بگرێو یارمەتی هەژاران بدا؟ پەروەردگاریش پاداشی بۆ دوچـەندانەو چەند چەندانە بکاتەوە ئاشکراشە دەوڵەمەندیو هەژاری بەویستی خودایەو هـەر ئەو دەبەخشێو دەیگرێتەوە.

سەیر بکە پەروەردگار بە چ شێوەو تەعبیرێکی نـەرمو نیـان ئـەو مەبەسـتەی گەیانـدوە؟ چۆن چاکەکردنی لەگەڵ ئادەمیزادا بـە قـەرزدان بـەخودا شـوبهاندووە! چـونکە لـە ڕاسـتی دا قەرزەکـە کابرایـەکی موحتـاج وەری گرتـووەو خـودا بـێ ئیحتیاجە لە هەموو بونەوەرو مڵـکایەتی ئـەرزو ئاسمانو چییان تێدایـە هـەموو

هەر ئی ئەوە. بـەڵام پـەروەردگار ئـەم تـەعبیرەی ئـاوا هێنـاوەو بـەم شـێوە نەرمـە قـەرزدانی بـە فـەقیران بـە قـەرزدان بـەخۆی حـسێب كـردوە، بـۆ ئـەوەی ئـەوە بگەیـەنێ كـە كەسـێك دوای ئـەم پەیامـەش رژدو چـروك بـێو هیـچی لەدەسـت هەڵنەوەرێو برِێ لە ماڵەكەی نەدا بە قەرز بەو خودایەی كە ئەو ماڵو سامانەی داوەتـێ مانـای وایـە مرۆڤێكـی بـێ قیمـەتو خوێرِییـە.. دەوڵەمەنـدیو هـەژاریش بەدەسـت خودایـە ئەگـەر بیـەوێ هـەژار دەوڵەمەنـد دەكـاو دەوڵەمەنـدیش هـەژار دەخا.

## لەئیسلامدا سەچاوەی بژێوی هەژاران زۆرە (مورد للفقراء لا حد له)

ئاییـنی ئیسلام سەرچاوەی بژێوی جۆراو جۆری بۆ هەژارو بێ نـەوایان دانـاوە كـە لـە رێگـای ئـەو كەفارەتانـەوە ئـەنجام دەدرێ كـە بـۆ سـرِینەوەی تاوانێـك یـان پرِكردنەوەی واجبێك یان پارسەنگدانەوەو كەمو كورِی تاعەتێك دانـراوە.. وەكوو ئەوە پیاوێك سوێند دەخوا كە فڵان كار ئەنجام بدا یان نەیكا دوایی واز لـەو كـارە دێنێ، لەم حاڵەتەدا دەبێ كەفارتی ئەو سوێندەی بدا كە بریتییە لـە خـواردن دان بە دە كەسی هەژار، خوادرنێكی مامناوەندی لەجۆری ئەو خواردنەی كە بـۆ خـۆی دەیخوا، یان بەرگـو پۆشاكی (١٠)دە كەس بكا یان كۆیلەیێ ئازاد بكا...!

حاڵـەتێكی تـر وەكـوو ئـەوە كـابرا نـەتوانێ رەمـەزان بـەرۆژو بـێ جـا لـە بەرنەخۆشی بێ یان لەبەر پیری بێ یان هەر هۆیەكی تر!! لـەم حاڵـەتـەدا بـەرۆژو نابـێو لـەجیاتی هـەر رۆژێـك هـەژارێك نـان دەدا.. حـاجی لـە كـرداری حەجـدا مـەرجێك لـە مەرجـەكانی حـەج بـەجێ ناهێنـێ دەبـێ كوشـتییەك سـەربرِێ گۆشـتەكەی بەسـەر هەژارانـدا دابـەش بكـا.. رۆژی جـەژنی رەمـەزان دێ پێویـستە هەموو موسوڵمانێك زەكاتی سەر فیترە بدا بە هەژران، هـەروەكوو چۆن پێویـستە لەسەر موسوڵمانانی دەوڵەمەند لە جـەژنی قوربانـدا قوربـانی بكـەنو گۆشـتەكەی بدەن بە هەژاران.. یان موسوڵمانێك فۆتۆ (نذر)ێك دەكا ئیسلام لەسەری پێویـست

کردوه کە ئەو نەزرە بە تـەواوی جێبـەجێ بکـاو چی لـە خۆگرتـووە دابەشـی بکـا بەسەر هەژاراندا..

حاڵـەتێکی تـر هەیـە، ئـەویش ئەوەیـە کـابرا ناتوانـێ خـۆ بـە خێـو بکـاو پێداویستی ژیانی بۆ ئـەنجام نـادرێ لێـرەدا ئـایینی ئیـسلام بـەواجبی گێـڕاوەو بـە ئەرکی سەرشانی خـزم و کـەس و کـاری دەوڵەمەنـدی دانـاوە کـە نەفەقـەی بکێـشن: کوڕ نەفەقەی باوکی دەکێشێ و بـاوك نـەفەقـەی کـوڕو منـداڵی لەسـەرە، نەفەقـەی خوشـك لەسـەر برایـەو هـی ژن لەسـەر مێـردە هـەروا بـەو جۆرەی کـە لـە کتێبـە شەعییەکاندا رون کراوەتەوە.

لەلایەکی ترەوە ئیسلام یاسای (وەقف)یشی داناوە تا بەرو بوومی ئەو موڵك و ماڵـە وەقفـە سـەرف بکـرێ لـە رێگـای خێـرو چـاکەی گـشتی دا. ئەمـەی گـوتراو خوێندتەوە برێك بوو لە یاسای ئابووریی ئیسلام کە مەبەستی سەرەکی تێدا لێـك نزیـك کردنـەوەی چـینەکانی کۆمەڵـەو قەلاچـۆکردنی هەژارییـە. خـۆ ئەگـەر بمانـەوێ بـە دورو درێـژی ئـەو دەقـە قورئـانی و حەدیـسانە رون بکەینـەوە کـە دەربارەی ئابووریی هاتوون لێرەدا جێگای نابێتەوەو پێویستی بە چەند بـەرگێکی قەوارە گەورە هەیە! بەڵام ئێمـە ویـستمان ئاماژەیـەکی سـەرپێیی بکـەین بـۆ بـڕێ بنەمای سەرەکی قورئان لەم بارەوە کە هەموویان ئەوە دەگەیەنن کـە ئـەم یاسـایە یاسایەکی ئیلاهییەو سەرچاوەیەکی گەلێ بەرزو مەزنەو بـەکاری هـەموو شـوێنێك دێ و بۆ هەموو کاتێك باشە.

# بەشی بیستو یەکەم:

## زەکات لە ئیسلام دا (الزكاة في الإسلام)

**زەریبە لای گەلو فەرمانڕەواکانی پێش ئیسلام – مانای زەکات – ڕەنگدانەوەی هەژرای لە کۆمەڵدا – پلەی زەکات – زەکات بە زۆر دەسێنرێ – جۆرەکانی زەکات – مەرجەکانی زەکات – زەکاتی زێڕو زیو – زەکاتی ماڵی بازرگانی – زەکاتی بەرووبوومی کشتوکاڵ – زەکاتی ئاژەڵ کە بە دەمی خۆی بلەوەڕێ – زەکاتی کانو گەنجینە – ئەوانەی زەکاتیان پێ دەشێ مافی خۆیانە زەکات وەگرن.**

### زەریبەو باج لای گەلو فەرمانڕەواکانی پێش ئیسلام:

حکوومەتەکانی پێش ئیسلام زەریبەو مڵکانەیان دەخستە سەر هەژارانو سامانداره مام ناوەندەییەکان! پاشاو فەرمانڕەواو پیاوە ئایینییەکانو دەرە بەگو ئەوانەی کە پەیوەندییان بە مانەوە هەبوو هیچ ئەرکێکی (مالی)یان نەدەخرایە سەرو لە هەموو زەریبەو مڵکانەیەك عەفو دەکرانو هەمیشە لەناو نازو نیعمەتدا خۆیان دلستەوە، چینە هەژارەکانیش بە ژیانێکی کولە مەرگی دەژیانو کۆیلەی فەرمانڕەواو دەوڵەمەندەکانیان بوون. لەبەر ئەوە مرۆڤی ئاسایی لە ڕۆژگاری کۆندا پێی وانەبوو کە حکوومەت نوێنەری ئەوەو بۆ بەرژەوەندی گشتی ئەو کار دەکا! بەڵکوو بەپێچەوانەوە هەموو کاتێ داموو دەزگاکانی حکوومەتی بە دوژمنی خۆی دەزانیو گەیشتبووە ئەو قەناعەتە کە ئەو حکوومەتە تەنها مەبەستی چەوساندنەوەی چینی هەژارەو خەریکی خوێنمژینی هاووڵاتیانە بەبێ ئەوەی کە سودێکیان پێ بگەیەنێ، لەبەر ئەوە خەڵکی باجیان بە بارێکی گرانی وەها دەزانی کەتا بۆیان بکرایە بە پێویستیان دەزانی خۆیانی لێ دەرباز بکەن.

بێگومان گەلو نەتەوەکانی پێش ئیسلام هیچ گرنگییەکیان نەدەدا بە ماڵو دارایی حکوومەت، مەبەستیان نەبوو چەندی واریدات هەیەو چەندی خەرجی هەیە، چونکە پێیان وابوو هیچ بەرژەوەندییەکی ئەوانی تێدا نیەو هەمووی تایبەتە بە مەلیكو وەزیرو کاربەدەستانی حکوومەتەوە، حکوومەتەکانیش لەلایەن خۆیانەوە تەنیا گرنگیان بە دەوڵەمەندبوونی خەزینەی خۆیان دەداو،

هەموو کارێکی رەواو نارەوایان بەکاردێنا بۆ پڕکردنی خەزینەی پاشا! نەك وەکوو ئەم حکوومەتە تازانەی سەردەم کە ئەندازەیەك دادپەروەییان بەکار هێناوە بۆ رێك و پێککردنی زەریبەو بەرکاهێنانی حاصلاتەکەی لە بەرژەوەندی گشتی ولاتداو دابەشکردنی بەسەر چینە موحتاجەکانی ولاتداو پەرەپێدانی ئەو پرۆژانەی کە بەختەوەری دانیشتوانی تێدایە... جا کە ئیسلام هات هەموو ئەو یاساو داب و نەریتە کۆنانەی زەریبەی هەڵگێڕایەوە، یارمەتییەکی سامانی لەسەر دەوڵەمەندەکان دانا بۆ بەرژەوەندی هەژاران و ناوی لێنا: (زەکات) یاساو قانوونێکیشی بۆ کۆکردنەوەو سەرفکردنی داناوە پڕە لە دادپەروەری و عەدالەت بە جۆرێك کە وێنەی لەهیچ قوتابخانەو رێبازێکی سەردەمدا نابیندرێ!

## مانای زەکات:

زەکات و صەدەقە هەردوکیان یەك مانایان هەیە. زەکات لە زماندا بە مانا پاککردنەوەیە، پەروەردگار صەدەقەی فەرزو پێویستی ناوناوە: زەکات – پاککەرەوە – چونکە دڵ و دەرون لە رژدی و چروکی پاك دەکاتەوە، خودا دەفەرموێ: {خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا}.

واتە: ئەی پێغەمبەر لە ماڵ و دارایی ساماندارانی زەکات دەرکەو لێیان بستێنە بۆ ئەوەی دڵ و دەرونیان لە نەخۆشی چروکی پاك بکەیتەوەو گەش و نماش بکەوێتە ناو ماڵ و داراییانەوە، پەروەردگار کە دەفەرموێ: زەکات موسوڵمانان پاك دەکاتەوە – کە لە ئایەتەکەدا بە راناوی (هم) ئاماژەی بۆ کردوە – دیارە وشەی موسوڵمانان هەموویان بەتاك و کۆمەڵەوە دەگرێتەوە. ئاشکراشە زەکات لەگەڵ ئەوەدا کە دڵ و دەروونی تاکەکانی کۆمەڵ لە چڵکی بەخیلی و چروکی و رژدی و نەفس نزمی و دڵڕەقی و خۆپەرستی و تەماعکاری پاك دەکاتەوە هەروەها موسوڵمانانیش دەپارێزێ لەوە کە بە ناحەق ماڵی یەکتری بخۆن و نەخۆشی کۆمەڵایەتی: وەکوو دژایەتی و فیتنەیی و شەڕو هەرا لەناویاندا بکەوێتەوە!.

## کاردانەوەی هەژاری لە کۆمەڵگادا (تأثير الفقر في المجتمع):

شتێکی سەلمێنراوەو ئاشکرایە کە هەژاران چینی هەرە خواروی کۆمەڵگانو هەژاری کوشندەترین دەردی کۆمەڵە. چونکە فەقیریی وا لە مرۆڤ دەکا هەموو جۆرە کارێك لە پێناو بژێودا ئەنجام بدا، سك ئەگەر برسی بوو خاوەنەکەی هەڵدەنێ بۆ ئەنجامدانی هەموو جۆرە تاوانێكو بەلاشییەوە رەوایە... چونکە بۆ درێژەپێدانی ژیانە!

ئەو کۆمەڵگایانەی هەژارییان تێدا بڵاو دەبێتەوە لە هەموو رویەکەوە توندڕەوی تێدا پەیدا دەبێو هەموو کردارێکی وەحشییانەو ئاژەڵ ئاسای بەلاوە حەڵاڵەو هەموو جۆرە درندەییەك بەکار دێنێ بۆ گەیشتن بە ئارەزووەکانی، بێگومان ئەوروپا لەم روەوە خراپترین ئەنجامی هەژاری چێشت... هەموو کردارێکی دژە شارستانی تێدا رودا، سەرەتا خۆ پێشاندانی هێمنانە دەستی پێکرد، تا سەری کێشا بە شۆڕشو کوشتنو بڕینو قەڵاچۆکردنی هەموو شتێكو تەڕو پووشی پێکەوە سووتا!!

## پلەی زەکات (منزلة الزكاة):

خودای پەروەردگار لە زۆر شوێنی قورئاندا فەرمانی کردوە بە زەکاتدان، لەهەر شوێنکدا باسی نوێژکرابێ یەکسەر زەکاتیشی لەگەڵدا باس کراوە، کە قورئان داوای کردنی نوێژی کردوە داوای زەکاتدانیشی کردوە، چونکە نوێژو زەکات دوو کۆڵەکەی پتەون بۆ باڵەخانەی ئیسلامو ئیسلامیان لەسەر بنیات نراوە! یەکێك لەو شوێنانە: ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ:

{فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ - سورة الحج – ٧٨}.

هەروەکوو چۆن لەئایەتێکی تردا جەختی لەسەر ئەوەکردوە کە موسوڵمان نابێتە برای موسوڵمانانو لەریزی ئەوان نائژمێردرێ تا نوێژ نەکاو زەکات نەدا، وەکوو دەفەرموێ:

{فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَنُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ - سورة التوبة – ١١}.

واتە: ئەوانە ئەگەر تۆبەیان كردو نوێژیان بەجێ هێناو زەكاتیان دا ئەوە دەبنە برای ئایینیتان!

لەلایەكی ترەوە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) زەكات نەدەرانی ترساندوە بە گرانیو فەقیریو هەژاریو ژیان تاڵی كە دەفەرموێ: (وما منع قوم الزكاة الا منعوا القطر من السماء ولو لا البهائم لم يمطروا). واتە: هەر گەل نەتەوەیەك زەكاتیان لە ماڵی خۆیان دەرنەكردبێ زەكات نەدانیان بەلاوە شتێكی ئاسایی بووبێ ئیللا بارانیان لێ بڕاوەو ئاسمان بارانی بۆ نەبارانەدون، خۆ ئەگەر لەبەر خاتری ئاژەڵو گیانلەبەرانی تر نەبوایە ئاوی خواردنەوەشیان بۆ نەدەباری.

## زەكاتدان زۆرە ملێیە بەزۆر دەستێندرێ (الزكاة أجبارية):

ئایینی ئیسلام زەكاتدانی نەخستۆتە بەر ئارەزووی خاوەن ماڵ، ئەگەر ویستی بیداو ئەگەر نەویست نەیدا! بەڵكوو زەكاتی بە شتێكی زۆرە ملێ داناوە، چونكە زەكات حەقی فەقیرە لەو ماڵەی كە خودا داویەتی بە دەوڵەمەند، خودا دەفەرموێ:

{وَالَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَّعْلُومٌ، لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ} سورة المعارج – ٢٤-٢٥.

واتە: ئەو موسوڵمانانەی كە لەماڵو داراییان دا ئەندازەیەكی دیاریكراو هەیە مافی هەژارانو سواڵكەرانە.. كەوابوو ئەركی سەرشانی كاربەدەستی موسوڵمانانە كە زەكات لە دەوڵەمەندان وەربگرێو ئەمجار بەسەر هەژارەكاندا دابەشی بكاتەوە. بۆیە پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەربێ) زەكاتی كۆ دەكردەوەو فەرمانی بەكار بەدەستانی خۆی دەكرد كە لە هەموو شوێنێك زەكات لە دەوڵەمەندەكان وەربگرنو بەسەر هەژاراندا دابەشی بكەنەوە! لەدوای وەفاتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) حەزرەتی ئەبو بەكری صدیق كرا بە فەرمانڕەوای موسوڵمانان، بڕێ لە

عەرەبەکان زەکاتیان نەداو بە ئاشکرا بەرهەڵستی زەکات دانیان کرد، بە خەیاڵی خۆیان حەزرەتی ئەبو بەکر دەستەوەستان رادەوەستیّ‌و شەڕیان لەگەڵ ناکا! بەڵام حەزرەتی ئەبو بەکر پیاو ماقوڵانی هاوڕێیانی پێغەمبەری کۆکردەوە لەم بارەوە مەشۆرەتی پێکردن دوایی هەموویان رایان هاتە سەر ئەوە کە شەڕ لەگەڵ ئەو زەکات نەدەرانە بکریّ بۆ ئەم مەبەستە هێزیان پێك هێناو هێرشیان کردە سەر سەرپێچی کاران‌و بەتوندی لێیان دان‌و زاڵ بوون بەسەریانداو هەڵگەڕاوە (مرتد)ەکانیان هێنایەوە ژێر رکێفی تەعلیمات‌و یاسای قورئان.

بەڕاستی ئەم شەڕە شەڕێکی ناوخۆیی بوو، بۆ بەرژەوەندی چینی هەژار بوو! لە هەموو ئەو شەڕە ناو خۆییانەی ئەوروپا پیرۆزتر بوو کە بۆ بەرژەوەندی چینی هەژار بەرپا بوون!! چونکە لە ئەوروپا ئەوانەی کە شۆڕشیانکرد چینی هەژار بوون لەتاو برسێتی شەڕیان کرد، بەڵام ئەوانەی لەسەردەمی حەزرەتی ئەبو بەکردا شەڕیان لەگەڵ زەکات نەدەراندا کرد پیاوماقوڵ‌و ساماندراران‌و ریش سپی صەحابە بوون سەرۆکەکەشیان خەلیفەی ئیسلام خۆی بوو! ئەو ئەبوو بەکرە بوو کە لەم بارەوە فەرمووی: (والله لو منعوني عقال بعير يؤدونه إلى رسول الله لقاتلتهم عليه أو أهلك دونه). واتە: سوێند بە خودا ئەگەر ئەشکێکی تاقە وشترێکم نەدەنیّ‌و لەوەپێش دابێتیان بە پێغەمبەری خودا شەڕی لەسەر دەکەم جا یا لێیان دەستێنم یان لە پێناویا دەکوژرێم. لەمەوە بۆمان دەردەکەویّ کە زەکات ئیختیاری نییە، هەرگیز نابیّ وەها سەیری بکریّ بەڵکوو زەکات زەریبەیەکی زۆرە ملێیە حکوومەتی ئیسلامی بە زۆر وەری دەگریّ‌و ئەمجار بەسەر چینی هەژاردا دابەشی دەکاتەوە، تەنانەت ئەم کارە تایبەتە بە خەلیفەی موسوڵمانانەوە خۆی یان کەسێك کە ئەو دەستنیشانی دەکا زەکات وەرگریّ‌و دابەشی دەکا، چونکە خودا بە پێغەمبەر دەفەرمویّ:

{خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً}. لەسەر ئەم بنەمایە زانایانی ئیسلام رایان وایە: کە زەکات لەلایەن زەکاتدەرەوە دابەش ناکریّ، بەڵکوو دەبیّ تەسلیم بەخەزینەی حکوومەتی بکاو ئەمجار حکوومەت دابەشی بکاتەوە، چونکە ئەگەر کابرای

زەکاتدەر خۆی تەوزیعی بکا زەلیلیو چاو بەرەژێرییەك بۆ زەکات وەرگرەکان دێتە کایەوە، بەڵام ئەگەر لێپرسراوی حکوومەت دابەشی بکا ئەو جۆرە چاو بەرەژێییە بەدی ناکرێو منەتو کەشخەی زەکات دەری تێدا نابێ بەڵکوو کابرای هەژار وەکوو موچەیەكو مافێکی خۆی وەری دەگرێ، تەنانەت زانایانی ئیسلام دەفەرمون هەر کەسێك بمرێو زەکاتی لەسەر بێ نابێ میراتەکەی دابەش بکرێ تا زەکاتی لێ دەردەکرێ، هەروەکوو چۆن ئەگەر قەرزی خەڵکی لەسەر بێ تا قەرزەکە نەدرێتەوە میراتەکە تەوزیع ناکرێ.

## جۆرەکانی زەکات (أنواع الزكاة):

ئەو شتانەی زەکاتیان تێدایە بە گوێرەی شەرع پێنج شتن:

یەکەم: زێرو زیوە.

دووەم: کەلو پەلی بازرگانییە.

سێیەم: بەروبوومی کشتوکاڵیو میوەی خورماو ترێیە.

چوارەم: ئەو ئاژەڵەماڵییانەیە کە بە دەمی خۆیان دەلەوەڕێن.

پێنجەم: کانو گەنجینەیە.

جگە لەم پێنج شتانە هیچ ماڵو سامانێکی تر زەکاتی لێ ناکەوێ کەوابوو خانوو بەرە بۆ حەوانەوەو نیشتەجێبوون تێیدا، جلو بەرگی تایبەتی، کەلو پەلی ماڵ، وڵاغی سواری، سەیارەی تایبەتی چەكو سیلاحی تایبەت، خشڵو زێڕو زیوی ئافرەت، شتی دەگمەنو ناوازە، ئامێری وەستاییو پیشەسازیو کشتوکاڵیو کتێبو دەفتەری زانستیو فێربوون زەکاتییان لێ نادرێ بە مەرجێك نەکرێن بە ماڵی بازرگانی، هەرشتێك لەوانە بازرگانی پێوە کرا دەبێ زەکاتی لێ بدا.

مەعدەنی بەنرخو بەها – جگە لە زێڕو زیو – وەکوو یاقوتو گەوهەر ئەڵماسو ئەو جۆرە کانانە، زانایانی شەرع پێیان وایە زەکاتیان تێدا نییە، بەڵام لە راستی دا دەبوایە زەکاتیان تێدابێ!! بۆیە پێمان وایە، هەرکاتێ ئەو مەعدەنانە قیمەتیان گەییشتە ئەندازەی زەکات تێدابوون دەبێ زەکاتیان لێ دەرکرێ.

## مەرجەکانی زەکات (شروط الزكاة):

ئەو مەرجانەی کە پێویستە کۆببنەوە لەو ماڵو سامانەی زەکاتی لێ دەردەکرێ چوار مەرجی سەرەکین:

یەکەم: دەبێ سامانو داراییەکە موڵکی تەواوی کابرابێ، واتە: دەبێ ماڵەکە لەژێر دەستی خاوەن ماڵدا بێو نابێ مافی کەسی تری پێوەبێو دەبێ بتوانێ بەویستو ئارەزوێ خۆی تەصەروفی تێدا بکا، بەروبوومی ماڵەکەش بۆ خاوەنەکەی بێو بۆ ئەو بگەڕێتەوە.. کەوابێ ماڵی وەقفکراو زەکاتی تێدا نییە، قەرزو قۆڵەیەك کە لەسەر قەرزداربێو هیوای وەرگرتنەوەی نەبێ، هەروەها ئەو ماڵو موڵکەی خاوەنەکەی نەتوانێ بە ئارەزۆی خۆی تەصەروفی تێدا بکا وەکوو ماڵی (رەهن) بارمتە دانراو، هەروەها ماڵێك کە خرابێتە ژێر چاودێریو خاوەنەکەی نەتوانێ نزیکی بکەوێتەوە، هەروەها ماڵو سامانێك کە کێشەو نیزاعی لەسەربێو بەلایەکدا ساغ نەبووبێتەوە.

دووەم: دەبێ ماڵەکە بگاتە ئەندازەی زەکات لێکەوتن (نصاب). واتە: ئەو ئەندازەیەی کە لە شەرعدا بۆ زەکات لێکەوتن دانراوە، کەواتە موڵكو دارایی کەم زەکاتی لێ ناکەوێ، هەر جۆرێك لەو جۆرە ماڵانە نەگاتە ئەندازەی زەکات لێکەوتن (نصاب) زەکاتی تێدا نییە، چونکە زەکات لە زێدەماڵ دەکەوێ خودا دەفەرموێ:

{وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ}.

واتە: ئەی پێغەمبەر! پرسیارت لێ دەکەن چی بدەن بە زەکاتو بیبەخشن؟ تۆش پێیان بڵێ: ئەوەی کە زیاد لە پێویستی خۆیانە.

سێیەم: دەبێ ساڵێکی تەواو (١٢) مانگ بەسەر ئەوماڵەدا تێپەڕببێو ئەوسامانە لە هەموو ساڵەکەدا موڵکی کابرا بووبێ، کەوابوو ئەگەر کەسێك دوای کەمتر لە تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر ماڵەکەدا ئەو ماڵەی لە موڵکایەتی دەرچو زەکاتی لێ ناکەوێ، چونکە تێپەڕبوونی ساڵ بەسەر ماڵەکەدا مەرجێکی سەرەکییە

بۆ زەکات واجب بوون جگە لە بەروبوومی کشتوکاڵو گەنجو خەزینـەی دۆزراوەی ژێر زەوی، ئەمانە تێپەڕبوونی ساڵیان تێدا مەرج نییە!

چوارەم: دەبێ ماڵەکە زیاد لـە پێویـستییە زەرورییـەکانی خاوەنەکـەی بـێ، دەبـێ زیاد لـەو قەرزانـە بـێ کـە لەسـەریەتی، کەوابوو موڵـكو سامانو دارایـیەك کـە هـەر بەشی بژێوی خاوەنەکەیو ئەو کەسانەی نەفەقەیان لەسەریەتی بکا، یـان بەشـی ئـەو قەرزانە بکا کە لەسەریەتی، زەکاتی تێدا نییە.

زەکـات سـاڵی جارێـك وەردەگـیرێ چـونکە زیـادکردنو گەشـەکردنی بـە تێپەڕبوونی ساڵ نـەبێ بەدیارناکـەوێ بـەڵام ئـەم حوکمـە بـەروبوومی کشتوکاڵی ناگرێتەوە ئەم جۆرەیان هەرکاتێ هاتە بەرهەم زەکاتی لێ دەردەکرێ.

هەرکاتێ ماڵو دارایی هەتیوو منـداڵو دەسـتبەڵاو گەییـشتە ئەنـدازەی زەکـات لێکەوتن دەبێ سەرپەرشتیارەکەیان زەکاتیان بـۆ دەرکـا، پێویـستە ئـەوەش بـزانین لە زەکاتدا جیاوازی نێوان نێرو مێو ئازادو بەندکراو نییە.

لە حکوومەتی ئیسلامیدا ماڵو دارایی زەکـات تێکـەڵاوی بودجـەی حکوومـەت ناکرێ بەڵکوو دەبێ ئیدارەیەکی جیاوازی سەر بەخۆی بۆ دابنرێو ئەو ئیدارەیـە سەر پەرشتی وەرگرتنو خەرجکردنی بکا، جا ئەگەر دەوڵەتەکە فراوان بوو ئـەوە فەرمانڕەوای هەرێمـەکان خۆیـان ئـەرکی کۆکردنـەوەو دابەشـکردنی زەکاتەکـە لـە ئەستۆ دەگرن.

## زەکاتی زێڕو زیو (زكاة الذهب والفضة):

زێڕو زیو سکە لێ دراوبن یان قاڵبو پارچە پارچە بن زەکاتیان لێ دەدرێ، بـە مـەرجێك سـاڵێك (١٢) مانگییـان بەسـەردا تێپـەڕێ لای خاوەنەکـەیان. ئەنـدازەی زەکاتی زێڕو زێو چواریەکی دەیەکە واتە لە چل مـسقاڵ یـەك مـسقاڵو لـە بیـست مـسقاڵ نیـو مـسقاڵو لەسـەد مـسقاڵ دوو مـسقاڵو نیـو زەکـات وەردەگـیرێ! ئـەو ئەندازەیەی زەکاتی زێڕی پێ واجب دەبـێو خاوەنەکـەی پـێ دەبێتـە زەکـات دەر،

بیست مسقالْ یان دە دیناری زێڕە، ئەو ئەندازەیە زەکاتی زیوی پێ واجب دەبێ‌و خاوەنەکەی دەبێتە زەکات دەر زیو دووسەد دیرهەمی زیوە.

ماموّستا (عبدالوهاب خلاف) لە گۆڤاری (لواء الإسلام)ی سالّی (١٩٥٠)دا دەفەرموێ: بەم پێیە دەبێ قیمەتی مالی بیست دینارە زێڕەکە لەکاتی ئەم ئەندازە دانانەدا بەقەدەر قیمەتی دوسەد دیرهەمەکە بووبێ حوکمە شەرعییەکان ئەوە دەگەیەنن... بۆیە خوێنی مرۆڤی بە هەڵە کوژراویان بە هەزار دیناری زێڕ یان دە هەزار دیرهەمی زیو داناوە. ئەمە مانای وایە دینارێکی زێڕ قیمەتی دە دیرهەمی زیوی هەیەو بیست دیناری زێڕ قیمەتی دو سەد دیرهەمی هەیە.

بەلاّم هەموو کاتێ ئەم بەرامبەرییە وەکوو خۆی نامێنێتەوە، بەڵکوو بە گوێرەی یاسای (عرض وطلب) بەرامبەرییەکەیان خوارو ژوور دەکا، هەر وەکوو چۆن بە گوێرەی شوێن‌و ولاّت نرخەکەیان بەرزو نزمی دەکا. ئەمجار دەڵێ: بە بۆچوونی من دانانی ئەندازەی زەکات لێکەوتن (نصاب) کاتی خۆی، ئەو کاتەی ئەم تەشریعە دانراوە قیمەتی زیوەکە لە بەرامبەر ئاڵتونەکەدا بە بەرچاو گیراوە، کەوابێ دەبێ هەر ئاڵتون = زێڕ بە ئەصڵ‌و بنەمای نرخ دابنرێ‌و ئەندازەی مالّی زەکات لێکەوتۆو بیست دیناری زێڕە یان قیمەتی ئەوە لە زیوی سکە لێدراو یان پارچە.

ئەو سکەو پارانەی کە زێڕو زیو نین: وەکوو پارەی نیکڵ‌و ئاسن‌و وەرشاوو شتی تریش ئەگەر ئەندازەکەیان گەیشتە حەدی زەکات، زەکاتیان لێ دەدرێ، پارەی کاغەزو بەشە کومپانیا بە گوێرەی نرخیان زەکاتیان لێ دەدرێ. خوێنەری هێژا ئەوی گوترا: حوکمی شەرعی زەکات لێ دەرکردنی پارەو پوولە بە هەموو جۆرەکانییەوە بەمەرجێك لە ژێر دەستی خاوەنەکەی دابێ یان لە بانقابێ، یا بە ئەمانەت دانرابێ هەروەها ئەگەر مالّ‌و سامانەکە رەصیدێکی بازرگانی بوو یان مالێکی پەزمەندەکراو بێ یان چەکی تەئمین بێ. زەکاتی تێدایە.

## زەکاتی کەلو پەلی بازرگانی (زكاة عروض التجارة):

زەکات لەکەلو پەلی بازرگانی دا واجبە بەڵام واجیبیەتیەکەی لەخودی کەلو پەلەکەدا نییە بەڵکوو لەنرخەکەی دایە، بۆیە دەبێ بەزێڕ بەراورد بکرێو بزانرێ نرخەکەی بەئاڵتون چەند دەگرێتەوە، مەرجیش نییە ساڵێك بەسەر ئەو کەلو پەلانەدا تێپەڕبووبێ بەڵکوو ئەگەر بەسەر قیمەتەکەیدا تێپەڕبووبێ بەسە! جا ئەگەر ئەو پارەیە هەزاران جۆر کەلو پەلی پێ کڕابێ هیچ لەمەزوعەکە ناگۆڕێ، ئەوەی پێویستەو مەرجە، ئەوەیە دەبێ بەهای ئەو کەلو پەلانە لە سەرەتای ساڵو کۆتایی ساڵدا بگاتە ئەندازەی زەکات لێدەرکردن، جا کەمبوونو زیادبوونی لە ماوەی ساڵەکەدا هیچ لە مەزووعەکە ناگۆڕێ.

زەکاتی ماڵی بازرگانی لە دەستمایەو قازانج وەر دەگیرێو کەلو پەلە بازرگانییەکان بە گوێرەی نرخی تازە حیساب دەکرێن.

## زەکاتی بەروبوومی کشتوکاڵی (زكاة المحصولات الزراعية):

ئەندازەی زکاتی بەروبوومی کشتوکاڵی دەیەکە... واتە لەسەد بەش دە بەشە ئەمەش ئەگەر بە باراناو پێگەییشتو ئاو درا، ئەگەر بە ئامێرو ناعوور ئاو دەدرا ئەوە لەسەدا پێنجی زەکات لێ دەکەوێ... ئەگەر زەوییەکە هەندێکی بە بارانو هەندێکی بە ئامێر ئاودەدرا کام لایان زۆرتربێ ئەو ئیعتیبار دەکرێ، ئەگەر زەوییەکە ڕێك نیوەی بە بارانو نیوەی بە ئامێر ئاودەدرا ئەوە نیوەی دەیەكو نیوەشی پێنج یەکە.

زەکاتی کشتوکاڵ: هەر بەروبومێك کە لە زەوی دەربێ زەکاتی لێ دەدرێ، جا بەروبوومەکە بخورێ یان هی خواردن نەبێ، ئەگەر ساڵی زیاد لە جارێك زەوییەکە بەرو بووم بێنێ هەموو جارێك دەبێ زەکاتی لێ بدا!!

ماموستا شێخ (محمد أبو زهرة) – کە یەکێکە لە زاناکانی ئەزهەر – دەفەرموێ: ئەو خانوو ئوتێلانە کە بە مەبەستی بەکرێدانو سوود لێ وەرگرتن

دروست دەکرێن، ئەوە دەبێ زەکاتیان لێ بدرێ... وەکوو کشتوکاڵ، لەم بارەوە دەفەرموێ: (ئەوەی لای زانایانی شەرع باوەو رایان لەسەریەتی ئەوەیە: کە خانوو بەرە زەکاتی تێدا نییە... چونکە خانوو بەرە لەسەردەمی کۆن دا بۆ بەکرێدان بەکار نەهاتووە، بەڵکوو هەر کەسە خانووی بە ئەندازەی پێداویستی خۆی دروست کردوە، کەوابوو ئەم رایەیان بۆ ئەو سەردەمەیە رایەکی راستو دروست بووە. بەڵام لەسەردەمی ئێستا شارستانیەت پێشکەوتووە خانوو بەرەو قەسرو باڵەخانەی زۆر دروستکراون واریداتی زۆرو زەبەندەیان هەیە... کەوایە شتێکی راستو رەوایە کە زەکاتیان لێ بدرێ، وەکوو زەویو زاری کشتوکاڵی! چونکە هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان دەوڵەمەندێك کە ئوتێلو باڵەخانەی هەبێ ساڵانەو مانگانە واریداتی لێ دەست بکەوێ لەگەڵ دەوڵەمەندێك کە واریداتی لە زەویو زارەوە بۆ بێ، ئەگەر زەکاتی ئەویان فەرز بکەین زەکاتی ئەمیان فەرز نەکەین زوڵمو ستەمە!

هەر واریداتێکی لەکرێی ئوتێلو باڵەخانەو خانوو بەرەی دوستکراو بۆ کرێ دەست بکەوێ زەکاتی لێ دەدرێ هەرکاتێکیش واریداتیان نەما لەو ماوەدا کە واریداتیان نابێ زەکاتیان لێ دەرناکرێ! زەکاتەکەشیان بە گوێرەی واریداتەکەیان دەدرێ ئەگەر کرێکەیان مانگانە بوو ئەوە هەموو مانگێك زەکاتیان لێ دەردەکرێ، ئەگەر ساڵانە بوو ساڵانە زەکاتیان لێ دەدرێ، ئەندازەی زەکاتیشیان نیوەی دەیەکە!!

مامۆستا شێخ (محمد أبو زهرة) ئامێرو مەکینەو کارگەو ئوتوموبیل قیاس دەکاتە سەر زەویو زاری کشتوکاڵیو ساڵانە واریداتی ئەو کارگەو مەکینانە دەخەملێندرێو زەکاتی لێ دەردەکرێ!

## زەکاتی ئەو ئاژەڵەماڵییانەی بەدەمی خۆیان دەلەوەڕێن:

مەبەست بەو ئاژەڵە ماڵییانەی کە بە دەمی خۆیان دەلەوەڕێنو بەعەرەبی پێیان دەگوترێ (السوائم) ئەو ئاژەڵانەیە کە زوربەی ساڵ لە لەوەڕگای گشتیدا

دەلەوەڕیّو ئالیكو خۆراكی ناكەویّتە سەر خاوەنەكەی بەلاّم وشترو گاوو مانگاو مەڕو بزن كە خاوەنەكەیان ئالیكو لەوەڕیان دەداتیّو پێیانەوە ماندو دەبێ، ئەوە زەكاتیان تێدا نییە چونكە ئیسلام ئەركی ئالیكدانو زەكات لێ دەركردن لە كاتێكدا كۆ ناكاتەوە، جا بۆ هەر یەكێ لەو ئاژەلاّنە كە بەدەمی خۆیان دەلەوەڕێن ئەندازەیەكی دیاریكراو هەیە تا نەگاتە ئەو ئەندازەیە زەكاتیان تێدا نییە. حوشتر تا نەگەنە پێنج سەر زەكاتیان تێدا نییە، مەڕو بزن تا نەگەنە چل سەر زەكاتیان تێدا نییە! گاوو مانگا تا نەگەنە سی سەر زەكاتیان تێدا نییە. لە پێنج وشتردا مەڕێك دەدرێ بە زەكات... لەچل سەربزنو مەڕدا مەڕێك زەكاتە، لەسی سەر گاوو مانگادا گۆلكەلّەیەك دەدرێ بە زەكات دەبێ ئەم گولەكە ساڵێكی تەواو كردبێو پێی نابێتە ساڵی دووەمەوە. وشەی (ابل) هەموو جۆرەكانی وشتر دەگرێتەوە، وشەی (غنم)یش مەڕو بزن دەگرێتەوە وشەی (البقر)یش گاوو مانگاو گامێش دەگرێتەوە جگە لەمانە هیچ گیانلەبەرێكی تری مالّی زەكاتی لێ دەرناكرێ، ئەسپو هێسترو گوێدرێژ زەكاتیان تێدا نییە. دەگونجێ لێرەدا حیكمەت ئەمەبێ كە هەر وشترو رەشە ولاّغو مەروز بزن بە بێچوو بەشیر واریداتیان هەیە. زاناكانی شەرع كە فەرموویانە زەكات لە ئەسپو هێسترو گوێدرێژدا نییە هۆیەكەی ئەوەیە ئەمانە رادەگیرێن بۆ پێویستی، ئەسپ بۆ سواریو هێسترو گوێدرێژ بۆ بار بردنو شتی تر، بەلاّم ئەمانەش كە بۆ تیجارەتو واریدات راگیران زەكاتیان لێ دەكەوێ.

## زەكاتی كانو گەنجینە (زكاة المعادن والكنوز):

ئەوەی كە لەژێر زەویدایە لەكانو كانزا وەكوو نەوتو شتی ئاوا ئەوەی موڵكی (بیت المال)ەو ماڵی تێكڕای موسوڵمانانە، بەلاّم ئەو گەنجو خەزینەی كە دەدۆزرێتەوەو هی سەردەمی پێش ئیسلامە ئەوە پینجیەكی بۆ خەزینەی حكوومەتە، ئەوی تری بۆ ئەو كەسەیە كە دۆزیویەتەوە. ئەو گەنجو خەزینەی

کە هی سەردەمی پاش هاتنی ئیسلامەو لەژێر زەویدا بدۆزرێتەوە، ئەوە موڵکی حکوومەتەو، ئەگەر خاوەنەکەشی بزانرێ کێیە ئەوە دەدرێتەوە بە خاوەنەکەی، بۆیەش ئەو گەنجو خەزێنانە دەدرێنە بەیتول مال چونکە بەماڵی زاییعە دەژمێردرێو ماڵی زاییعەش هی حکوومەتە. هەر وەکوو چۆن ئەگەر کەسێك مردو هیچ میراتگری نەبوو ئەوە میراتەکەی هی بەیتول مالەو بەسەر ئەوانەدا دابەش دەکرێ کە زەکاتیان پێ دەشێ بەڵام ئەو شتانەی کە لەدەریادا دەردەهێنرێن وەکوو عەنبەرو لوئلوءو مرواریو ماسی.. هتد ئەوە پێنجیەکی لێ وەردەگیرێ، ئەمە رای ئەوانەیە کە پرۆژەی یاسای زەکاتیان لە میصردا رێك خستو دەڵێن (ئەوەی کە لە جەماوەری زانایانی شەرعەوە پێمان گەیشتووە ئەوەیە کە گوایە لە ماسی دا زەکات نییە بەڵام ئەمە حوکمێکە تایبەت بووە بە رۆژگاری خۆیانەوەو ئەو کاتە دەست رۆیشتویی بەسەر دەریاکاندا وەکوو ئێستا نەبووە، ئەوانەی کە ئەو کاتە راوە ماسییان کردوە تەنها بۆ بژێوی رۆژانەی خۆیان کردویانە، وەکوو ئێستا یاسای راوکردن رێك نەخراوەو پێویستی بە رێك خستنیش نەبووە، خۆ ئەگەر ئەوزانا شەعزانانە لەم رۆژگارەدا بژیابان هەمان بۆچونی ئێمەیان دەبوو! کەوابوو جیاوازیی بۆچونی ئێمەو ئەوان جیاوازیی رۆژگارو سەردەمە نەك جیاوازیی بەڵگەو دەلیلە.

گەنجینەی سەردەمی نەزانی، ئەوشتانەی کە قیمەتی ئەسەریو فۆلکلۆری هەیە ئەوە دەبێتە موڵکی دەوڵەتو سوودی عیلمی تێدایە چونکە ئاسار لە هەموو وڵاتێکدا لای هەموو گەلێك موڵکی حکوومەتە لەبەر قیمەتی مێژوویی.

## ئەوانەی زەکاتیان پێ دەشێ (مستحقو الزكاة):

ئایینی ئیسلام کاروباری زەکاتی لە هەموو رویەکەوە دیاری کردوە، ئەوانەی زەکاتیان پێ دەشێ دەست نیشان کراون، ئایەتی قورئانی دەربارەیان هاتۆتە

خواریّو هیچ ئەملاو ئەولای تیّدا ناکریّو کەس ناتوانیّ گۆڕانکاری تیّدا بکا خودا دەفەرمویّ:

**{إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاء وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ - سورة التوبة -٦٠}.**

ئەمە دەقە قورئانییەکەیە کە ئەو چینانە دیاری دەکا کە زەکاتیان پیّ دەشیّ وەکوو لێرە بەولاوە یەکە یەکە باسیان دەکەین:

یەکەم: هەژارەکان، ئەوانەی کە ئەوەندەیان ماڵو دارایی نییە بگاتە ئەندازەی زەکات لێکەوتن، واتە: ماڵێکی کەمیان هەیەو بەشی پێویستی ئاساییان ناکا، هەندێکیش دەڵێن: هەژار ئەو کەسەیە کە بژێوی شەوو رۆژی نەبیّ.

دووەم: نەبووەکان (مساکین) دەربارەی وشەی (مسکین) و (سائل) چەند رایەك هەیە: بڕێك دەڵێن (مسکین) ئەوەیە لە هەژار فەقیرو نەبووتر بیّ، واتە: مسکین ئەو کەسەیە کە هەر هیچی نەبیّ. لە عەکرەمەی مەولای عەبدوڵلای کوڕی عەبباس گێڕدراوەتەوە: فەرموویەتی وشەی (فەقیر) ناوە بۆ نەدارانی موسوڵمانان وشەی (مسکین) ناوە بۆ نەدارانی ئەهلی کیتاب.

ئەوەی کە پاڵپشتی ئەم رایە دەکا ئەوەیە کە: حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب وشەی (مسکین)ی بەزەعیفو بیّ نەوای ئەهلی کیتاب تەفسیر کردوە، دەڵێن: رۆژێك عومەر (رەزای خودای لیبێ) کابرایەکی زیممی کوێری بینی لە دەروازەی شاری مەدینە فڕی درابوو! حەزرەتی عومەر لێی نزیك بووەوە پێی فەرموو ئەوە چیتە؟ وتی: (**استكروني في هذه الجزية**).

ئەوەتا چاوم کزبووە، کوێر بومو ئەمجار فڕێیان داومو کەسیشم نییە دالّدایەکم بدا، حەزەتی عومەر فەرمووی: بەخوا ویژدانیان لە گەڵدا بەکار نەهێناوی! ئەمجار موچەی بۆ بڕیەوەو فەرمووی: ئەمە لەوانەیە کە پەروەردگار دەرباەیان فەرموویەتی:

{إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاء وَالْمَسَاكِينِ - سورة التوبة – ٦٠}.

ئەوانــە بـێ وەچو کـەم ئەنـدامو پەککەوتـەکانی ئـەهلی کیتـابن، یـان ئـەو نەخۆشانەیانن کە چاکبوونەوەیان چاوەڕوان ناکرێ. جا بـە گوێرەی ئـەم ڕوداوە زەکات دەدرێ بەنـەدارایانی ئـەهلی (ذمـة) ئەوانـەی کـارو کاسبییان پـێ نـاکرێ.. کەچی زوربـەی زانـا شـەرعزانەکان پێیـان وایـە: کـە زەکـات جگـە لـە موسـوڵمانان بەکەسی تر نادرێ!!

سێیەم: ئەوانـەی بـە زەکاتـەوە خـەریکن، واتـە: ئەوانـەی کـۆی دەکەنـەوەو دابەشی دەکەنەوە بەسەر زەکات پێدراوەکاندا، ئەمانـەش بەشـی خۆیـان دەدرێتـێ، چونکە ئەمانە موچە خۆرنو بە ئەنـدازەی کارەکـەیانو پێداویـستیان دەوڵەمەنـد بن یان هەژار مافی خۆیان لەماڵی زەکات وەردەگرن.

چـوارەم: تـازە موسـوڵمانو دڵ دانەمـەزراو (المؤلفـة قلـوبهم)ن ئـەم تاقمـە زەکاتیـان پـێ دەدرێ تـا بـیرو بـاوەڕی ئیـسلامی لەدڵیانـدا بـچەسپێ، یـان کـەسو کاریـان دڵیـان بـە ئیـسلام خۆشـبێو دڵنـەواییان دەکـرێ.. مامۆسـتای پایـە بـەرزو خوالێخۆشـبوو (ئـەبو یـەعلا) لـە کتێبـی (الاحکـام الـسلطانیە)دا دەڵـێ (المؤلفـة القلـوب) چـوار چـینن: بەشـێکیان دڵنـەوایی دەکـرێنو زەکاتیـان پـێ دەدرێ تـا خراپەیان بۆ موسوڵمانان نـەبێ. بەشێکیان دڵنـەوایی دەکـرێن بـۆ ئـەوەی ئـایینی ئیـسلامیان لـەلا شـیرین بـێ، بەشـێکیان دڵنـەوایی دەکـرێن تـا هـۆزو عەشـیرەتیان موسوڵمان بێ، دورستە، بۆ هەریەکێ لەمانە لە بەشی (المؤلفة قلوبهم) موسـوڵمان بـێ یـان کـافر زەکـاتی بـدرێتێ... زەکات پێدانی ئەمانـە بـۆ مەبەسـتی دیفـاع لـە ئیـسلامو بانگـەوازی کردنــە بـۆی، کـەوابوو زەکـات دان بەوانــە وەکـوو پــارە خەرجکردنـە بـۆ پـرو پاگەنـدە (الدعایـة) بۆیـە دەبـێ ئـەمرۆ بەشـێك لـە پارەی زەکات دابندرێ بۆ بانگەوازیکردن بۆ ئیسلام.

پێنجەم: بۆ ئازادکردنی کۆیلەکان. دابو نەریتی عەرەبەکان وابوو کە خـاوەن کۆیلە پارەیەکی دیاریکراوی دادەنا بۆ کۆیلە ئەگەر ئەوپارەیەی بدایە ئازاد دەبوو!

بۆیە پەروەردگار فەرمانی کردوە بە حکوومەتی ئیسلامی کە یارمەتی ئەو کۆیلانە بداو لەپارەی زەکات بەشێکیان بۆ تەرخان بکا تا لە کۆیلایەتی رزگا ببن، شایانی باسە ئەمڕۆ لە جیهاندا بە ئاشکرا کۆیلە نەماوە!!

لێرەدا دەمانەوێ ئەوە بڵێین کە دەوڵەتی ئیسلامی یەکەم یاساو یەکەم فەرمانڕەواو یەکەم حکوومەتە کە دژایەتی کۆیلەیەتی کردوە پێشبینی ئەوەی کردوە کە بڕێك لە بودجەی ساڵانەی تەرخان بکرێ بۆ کۆیلە ئازادکردن، تا ئێشتاش مێژوو یاسایەکی رامیاری یان فەلسەفی تۆمار نەکردوە کە لەم بارەوە پێش ئیسلام کەوتبێ!

شەشەم: قەرزدارەکان، ئەوانەی قەرزاریی یەخەی پێ گرتوونو نیانە بیدەنەوە، ئەمانەش سێ جۆرن:

أ) هەندێك پارە قەرز دەکا بۆ رابواردنو لەکاری ناڕەوادا پارەکە خەرج دەکا ئەم جۆرە قەرزاردارانە بەڕای زوربەی زانا شەرعزانەکان زەکاتیان پێ نادرێ بۆ دانەوەی قەرزەکانی سەریان مەگەر تۆبە بکاو ببێتە راستاڵو خودا پەرستو پیاوی باش.

ب) کەسێك پارە قەرزبکا بۆ بەرژەوەندیی خۆیو بازرگانی پێوە بکاو لە کارەکەشی دا لێهاتوویی خۆی چەسپاندبێ بەڵام بەڵای ناگەهان، تەرازوی ئابووریی وڵات بشێوێنێو کابرا ژێر قەرز بکەوێ، ئەوماڵو داراییەی کە هەیەتی بەشی قەرزەکانی نەکا، ئیتر کابرا چەندی توانی قەرز دەداتەوە، چی لەسەر مایەوە زەکاتی دەدرێتێ تا قەرزەکانی لێ بداتەوە.

ج) کەسێك کەوتبێتە ژێر باری قەرزەوە بۆ بەرژەوەندییەکی گشتی نەك بۆ بەرژەوەندی خۆی، وەکوو ئەوە کەسێك پارە قەرز بکا بۆ خوێن بەستنو صوڵحکردن، ئەوە زانایان هەموو لەسەر ئەوەن کە لە زەکات قەرزەکەی بۆ دەدرێتەوە، تەنانەت ئەگەر ساماندداریش بێ هەر قەرزەکانی بۆ دەدرێتەوە، ئەمەش بە مەبەستی تەشجیعو هەڵنانی خەڵکییە بۆ پیاوەتی کردن!

شایانی باسە کە ئایینی ئیسلام وا دەکا کە قەرزی وەرگیراو بە مەبەستی رەواو پیاوەتیو ناعیلاجی لە مالی (بیت المال) بدرێتەوەو بەشێك لەمالی زەکات بۆ ئەوە تەرخان بکرێ، بەمەش ئایینی ئیسلام پێش یاساکانی جیهان کەوتووە بە تایبەتی یاساو شەریعەتە هاوچەرخەکان. دەبێ ئەوەش بزانین کە قانوونی رۆمانی لە برێ کاتدا بە رەوای بینیوە کە خاوەن قەرز قەرزدار بکاتە کۆیلەو لەجیاتی قەرزەکەی ببێتە بەندەی؟! کەچی ئیسلام فەرمان بەوە دەکا ئەگەر قەرزار نەیبوو حوکمەت قەرزەکەی بداتەوە، لە ئەمەشدا هەلْنانی خەلْکی تێدایە بۆ پیاوەتیو دەستی یەکگرتن، چونکە خاوەن مالْ ئەگەر بزانێ کە ئەو قەرزەی دەیدا بە لێقەوماوێكو یارمەتی برایەکی پێ دەدا ئەگەر قەرزدارەکە نەیتوانی بیداتەوە حکوومەت بەرعۆدەیەو بۆی دەداتەوەو مالەکەی نافەوتێ، قەرز دەدا بەوانەی پێویستیانەو پیاوەتیان لەگەلْ دەکا:

کەوابوو دەتوانین بلێین دروستو ڕەوایە کە لە مالی زەکات پارە قەرز بکرێ بۆ کاری پیاوەتیو بەرژوەندی گشتی، چونکە ئەگەر رەوابێ قەرزی لێ بدرێتەوە قەرزلێکردنی رەواترە.

حەوتەم: رێبوار – مەبەست رێبوارێکە پارەی نەبێ پێی بگاتەوە ولاتی خۆی: بەلام ئەگەر کابرای رێبوار دەولەمەندبوو ئەوە لە (بیت المال) پارەی بە قەرز دەدرێتێ کە گەیشتەوە مالی خۆیو لای کەسو کاری دەبێ پارەکە بگێڕێتەوە بۆ خەزینەی حکوومەت.

هەشتەم: لە رێگەی خودادا، مەبەست بەمە خەرجکردنی پارەی زەکاتە بەسەر شەڕکەرانی موسولمان پارێزەرانی سنووردا، هەر شتێکیش پەیوەندی بە لەشکری ئیسلامەوە هەبێ بەمەرجێك ئەم جەیشە لە پێناوی ئیسلامدا شەڕو بەرگری بکا!

برێك لە زانایانی ئیسلام پێیان وایە کە هەر شتێك لایەنی بەرژەوەندیی ئیسلامو موسولمانانی تێدابێ دەتوانێ لەم بەشە زەکاتە زەکاتی پێ بدرێ. ئیمامی

فەخری رازی لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێ: بزانن وشەی (في سبيل الله) ئەوە ناگەیەنێ کە ئەم بەشە زەکاتە هەر تایبەتە بە شەڕکەرانەوە، بۆیە ئیمامی (قەففال) لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەفەرموێ: هەندێ زانای شەرعزان (فقهاء) فەرموویانە دروستە زەکات بدرێ بە هەموو کارێکی خێر ئامێز، وەکوو کفنو دەفنکردنی مردووانو دروستکردنی قەڵاو سەنگەر، دروستکردنی مزگەوتو قوتابخانە، چونکە وشەی (في سبيل الله) هەموو ئەوانە دەگرێتەوە! هەروەها ئەم وشەیە هەموو ئەو قوتابخانەو کۆڕو کۆمەڵانە دەگرێتەوە کە کادیری ئیسلام پێ دەگەیەننو پێداویستیان لەماڵی زەکات بۆ دابین دەکرێ، بەمەبەستی جوان بەدەرخستنی ئیسلامو گەیاندنیو بڵاوکردنەوەی ئەحکامەکانیو بەرپەرچدانەوەی دوژمنانی، هەروەها نووسینو چاپکردنی کتێبو رۆژنامەو گۆڤاری تایبەت بە بانگەوازیی ئیسلامییەوە.. هەروەها دروستە زەکات بدرێ بەفرمانگەو فێرگەی خێرخواز چونکە ئەم فرمانگەو فێرگانە بۆ بەرژەوەندیی چینی هەژاران بنیات نراون.

## ئایا پێویستە زەکاتدەر بەشی هەموو ئەو زەکات پێشیاوانە بدا؟

زوربەی زانایانی ئیسلام – جگە لە ئیمامی شافیعی – پێیان وایە کە پێویست ناکا زەکاتدەر زەکاتەکەی بدا بە هەموو چینە زەکات پێ شیاوەکان، بەڵکوو ئەگەر بیدا بەهەر لایەکیان زەکاتەکەی لەکۆڵ دەکەوێ، بەڵام پێویستە گرنگی بدرێ بەوەی کە زۆر پێویستە زەکاتی بدرێتێ!

## زەکات هاریکاری کردنێکی کۆمەڵایەتییە(الزكاة ضمان إجتماعي):

خوێنەری هێژا! دەمانەوێ کۆتایی باسەکەمان بەوە بێنین کە بڵێین: ئێمە دەتوانین بە راشکاوییەوە ئەوە بسەلمێنین کە حکوومەتە بەناو ئیسلامییەکان ئەگەر بەگوێرەی شەریعەتی ئیسلام زەکاتیان کۆبکردایەوە دەیانتوانی بەمەلایین

پـاره گـردبكەنـەوەو پێداویـستی چینـه هـەژارەكانی كۆمـەڵ دابـین بكـەن، زەكـات شوێنی ئەو زەریبەو باجو مڵكانه دەگرێتەوە كە دەوڵەتە ئەوروپییـەكان لـەم دوو سەدەی دواییەدا چەسپاندیانو هاتن زەریبەیان لەسەر سەرمایەداران داناو ناویـان لێنـا زەریبـەی هاوكـاری كۆمەڵایـەتی (ضـريبة الـضمان الاجتمـاعي) زەریبـەی تریشیان لەسەر خاوەن واریداتی زۆر دانا، لـەبرێ وڵاتو شـوێنو كاتـا گەیـشتۆتە ٩٠٪ - لەسـەدا نـەوت — خـۆ ئەگـەر ئـەم هەوڵانـە نەبوونایـە ئـاگری رقو كینـەی چـینە هـەژارەكان دانەدەمركایـەوە! لـە ئەمـەوە بۆمـان دەردەكـەوێ كـە زەكـات یاسـایەكی كۆمەڵایەتییـە مەبەسـتی راگرتنـی لەنگـەری نێـوان چـینەكانی گەلـەو بەرژەوەنـدی گشتی گەرەكـە. بـەڵێ ئـایینی ئیـسلام یەكـەم ئـایینو یاسـایەكە كـە دەست پێشكەری دانانی ئەم یاسایەی كردوە.

## بەشی بیستو دووەم:

# ژنو خێزان لە ئیسلامدا (المرأة والاسرة في الإسلام)

**ئافرەت لەلای نەتەوە دێرینەکان – ئیسلام بەشێوەیەکی گشتی ئافرەتی لە چەوساندنەوە رزگار کرد – ژنو مێردایەتی لە نیگای قورئانەوە – بنەمای ژنو مێردایەتی لە ئیسلامدا – یەکسانی ئافرەتو پیاو لە ژیانی خێزانیدا – خۆدا پۆشینی ئافرەت (الحجاب) – پیاو دەتوانێ زیاد لە ژنێك بێنێ – ژن تەلاقدان – عیدة – مافی ئافرەت.**

شتێکی ئاشکرایە کە هیچ کاتێك بە ئەندازەی ئێستا باسو لێکۆڵینەوە دەربارەی ئافرەت ئەنجام نەدراوە، ئەمەش شتێکی سروشتیو ئاسایی یە چونکە ئەمڕۆ ئافرەت شتێك نییە بکرێتە ئامێری کات بەسەربردن یان وەکوو کەلو پەل کڕینو فرۆشتنی تێدا ئەنجام بدرێ، یان هاووڵاتی یەك بێ هیچ مافو ڕێزێکی نەبێ، بەڵکوو ئەمڕۆ ئافرەت بوەتە بناغەی خێزانی مرۆڤایەتی!!

شتێکی ئاشکراو شیاویشە کە ئەمڕۆ خاوەن بیرو ڕۆشنبیران گرنگی بە ئافرەت بدەن بیخەنە بەر باسو لێکۆڵینەوەی خۆیان بە تایبەتی کە ئافرەت گەلێ کۆسپی لەپێش خۆی راماڵیونو تا ئەندازەیەکی زۆر بوونی خۆی چەسپاندوەو راپەڕینێکی کۆمەڵایەتی گەورەی ئەنجام داوە، کەوابوو نووسەری خاوەن بیرو ئەزمون پێویستە بزانێ کام یاساو شەریعەت زیاتر گرنگی بە ئافرەت داوەو کێ زیاتر مافی بۆ دیاریکردوە! ئەمجار بزانێ ئایا ئیسلام ئافرەتی ئازاد کردو مافی پاراستو ڕێزی لێ گرت، یان بەندایەتیو کۆیلایەتیو چەوساندنەوەی بۆ دیاری کرد!! پێش ئەوەش کە دەست بکەین بە درێژەپێدانیو شیکردنەوەی ئازادیی ئافرەت لە ئیسلامدا، وا باشە بە خێرایی چاوێك بگێڕین بە مێژووداو بزانین ئافرەت چ پلەیەکی کۆمەڵایەتی هەبووە لەلای گەلو نەتەوەکانی پێش ئیسلام، تا بۆمان رون بێتەوە ئافرەت لە ئیسلامدا چ ڕێزێکی دراوەتێو چ پلەیەکی کۆمەڵایەتی هەیە.

## ئافرەت لەلای نەتەوە دێرینەکان (المرأة عند الأمم القديمة):

ئەثینی یەکان – کە لە سەردەمی خۆیاندا لە هەموو نەتەوەکانی تر شارەستانی تر بوون – ئافرەتیان بە کەل‌و پەلێکی بێ بایەخ حسێب دەکردو وەکوو شتو مەك لە بازاڕدا دەیانفرۆشتن، پێیان وابوو ئافرەت زادەی شەیتانەو پیس‌و قێزلێکراوە، هەموو شتێکیان لێ قەدەغە کردبوون تەنها ڕێگایان دەدانێ کە منداڵ بەخێو بکەن‌و کارو باری ناوماڵ جێبەجێ بکەن!!

لە یاسا کۆنەکانی هیندییەکانیشدا هاتووە کە تاعون‌و مردن‌و دۆزەخ، زەهرو ماری ژەهراوی‌و ئاگر لە ئافرەت باشتر.. خۆ تەورات‌و ئایینی جولەکان لە یاسای هیندییەکان دەربارەی ئافرەت بەرەحم تر نەبوو!! ئەوەتا لە سفری (الجامعة)دا هاتووە دەڵێ: لەناو دڵی خۆمدا بیرم کردەوە بۆ ئەوەی بزانم‌و زانیاری بەدەست بێنم‌و بەشوێن دانایی‌و عەقڵ‌و ئاوەزدا بسووڕێمەوە، بۆ ئەوەی بزانم شەڕ نەزانییەو کەودەنی‌و حەماقەتەو شێتییە، بەڵام من گەیشتمە ئەو قەناعەتە کە ژن لە مردن تاڵترە، ئەو ئافرەتەی کە بۆ خۆی تۆڕەو دڵی چەقڵ‌و دەستی زنجیرو پێوەندە.. لەناو هەزارا پیاوێکی باش دەبینێ، بەڵام ژنی باش هەر نییە!!

لە ڕۆماش کۆڕو کۆمەڵێکی گەورەو فراوان بەستراو باس‌و لێکۆڵینەوەیان دەربارەی ئافرەت ئەنجام داو لە کۆتایی دا هاتنە سەر ئەوە کە ئافرەت نەفسی نییەو بێ گیان‌و کیانە! لەبەر ئەوە ڕۆژی قیامەت زیندوناکرێتەوە، هەروەها ئافرەت پیسەو نابێ هەرگیز گۆشت بخوا، نابێ پێبکەنێ، نابێ قسەبکا. پێویستە کاتی خۆی بە نوێژو خودا پەرستی‌و خزمەتکردنەوە بەسەر بەرێ، هەر بۆ ئەوەی نەهێڵن قسە کا بە قفڵێکی ئاسن دەمیان دادەخستن، تەنانەت ئافرەت چ لە خێزانی خانەدان یان خێزانی نارەسەن بووبێ لە ماڵەوە یان لە ڕێگاوبان دەبینرا دەمی قفڵ درابوو!! ئەمە جگە لەو سزا جیسمییانەی کە تووشی ئافرەت دەبوو لەم ڕووەوە کە ئافرەت هۆکاری گومڕابوونەو ئامێری شەیتانە بۆ لە خشتە بردنی دڵ‌و دەروونی ئادەمیزادان.

سالی (٥٨٦ی ز) لە بڕێ هەرێمی فەرەنسادا کۆڕو کۆبوونەوە بەستران بۆ لێکۆڵینەوە دەربارەی ئافرەت، ئایا ئادەمیزادە یان ئادەمیزاد نییە؟ کۆتایی باسەکەشیان بەوەهێنا کە بڕیاریاندا ئافرەت ئادەمیزادە بەڵام بۆ خزمەتی پیاو دروستکراوە.

لە ئینگلتەرەشدا مەلیك هەنری هەشتەم فەرمانێکی دەرکرد بەڕەسمی تەماشاکردنو خوێندنەوەی ئینجیلی لە ئافرەتان قەدەغەکرد، لەلایەکی ترەوە تاسالی (١٨٥٠ی ز) بەگوێرەی قانوونی ئینگلیزی ئافرەت بەهاووڵاتی نەدەژمێردرا، مافی کەسایەتی خۆیشی پێ نەدەدرا، تەنانەت مافی ئەوەشی نەبوو کە خاوەنی پۆشاکی خۆیشی بێ، ئەو ماڵو داراییەی کە بە ئارەقی ناو چاوان پەیدای دەکرد نەیدەتوانی بە ئارەزۆی خۆی سەرفی بکا!!

لە وەڵاتی عەرەبیشدا پێش هاتنی ئیسلام ئافرەت لەزۆر ڕووەوە بەچاوی سووك سەیری دەکراو دەچەوسێنرایەوە وەکوو لەمەدوا شی دەکەینەوە.

## ئیسلام بەشێوەیەکی گشتی ئافرەتی ئازادکردوە:

ئەوکاتەی ئیسلام هات جیهان بەگشتی بەوشێوەبوو کە باسکرا، ئافرەت بەو جۆرە هەڵسو کەوتی لەگەڵ دەکرا، ئیتر ئیسلام هەڵسا بە ئازادکردنی ئافرەتو لابردنی زوڵمو ستەم لەسەریو گێڕانەوەی مافە زەوتکراوەکان بۆیو ڕێز لێگرتنو بەرزکردنەوەی پلەی کۆمەڵایەتی بە ئەندازەیەك کە تا ئێستا پێشکەوتووترین یاساو قانوون ئەو مافەی نەداوەتێ!! بەڵێ لەو کاتەدا کە ئافرەت لای نەتەوە ئەورووپییەکان بە ئاژەڵ حسێب دەکرا، یان دەیانگوت ئافرەت شەیتانی نەفرەت لێکراوەو لەجۆری ئادەمیزاد نییە! لەو کاتەدا ئیسلام هات ئەوەی درکاند کە ئافرەت یەکێکە لەو دوو عونصورەی کە ژیان بەوانەوە بەندەو نیوەی کۆمەڵەو ئەگەر ئەو نەبێ ئینسانیش نابێ، نەك هەر ئەوەندە بەڵکوو پەروەردگار ئەمەی کردوە بە نیعمەتو منەت بەسەر ئادەمیزادەوە بەگشتی وەکوو دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء - سورة النساء – ١}.

واتە: ئەی نەوەی ئادەم! خۆتان لە سزای سەختی پەروەردگارتان بپارێزن، بەتەواوەتی بەندایەتی بکەن بۆ ئەو خودایەی ئێوەی لەیەك گیان دروستکردوە (مەبەستی حەزرەتی ئادەمە) خێزانی ئادەمیش (کە دایە حەوایە) هەر لەو گیانە دروستی کردوە، ئەمجار لەم ژنو مێردە ژن پیاوی زۆری خستۆتەوە.

بەڵێ لە کاتێکدا بڕێ کەس پێیان وابوو کە ئافرەت نابێ ئایینی هەبێو نەیان دەهێشت تەوارات و ئینجیل بخوێنێتەوە! — ئیسلام هات ئەوەی سەلماند کە ئافرەت وەکوو پیاو پاداشی کردەوەی چاکی خۆی وەردەگرێو لەدونیاو قیامەتدا بەرپرسیاری کارو کرداری چاکەو خراپەی خۆیەتی! خودا دەفەرموێ:

{وَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتَ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَـئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلاَ يُظْلَمُونَ نَقِيرًا - سورة النساء – ١٢٤}.

واتە: هەر کەسێك کرداری چاك بکاو راستاڵ بێ — پیاو بێ یان ئافرەت بێ — بە مەرجێك بڕواداربێو ئیمانی هەبێ دەچنە بەهەشتەوەو هیچ لە پاداشی کردارو گفتاریان کەم ناکرێتەوە... هەروەکوو چۆن ئیسلام فەرمانی بە ئافرەت کردوە کە شان بەشانی پیاو ئەرکی عەقیدەو ئیمان لە ئەستۆ بگرێو رەوشتی جوانو باش رەچاو بکا، دەفەرموێ:

{إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا - سورة الأحزاب – ٣٥}.

ئاشکرایە بەرپرسیاریی ئافرەت بەرپرسیارییەکی سەر بەخۆیەو کەسایەتی خۆی هەیە، ئەگەر ئافرەت بۆ خۆی راستاڵو خودا پەرست بێ، مێردی خراپ بێ، خراپی مێردەکەی زیانی بۆ ئەو نابێ، هەوەکوو چۆن ئەگەر ئافرەت بۆ خۆی کافرو چارەڕەش بێ، خودا پەرستیو پیاوچاکی مێردەکەی، پاساوی بۆ نادەنەوە!

{ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا امْرَأَةَ نُوحٍ وَامْرَأَةَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَقِيلَ ادْخُلَا النَّارَ مَعَ الدَّاخِلِينَ، وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ آمَنُوا امْرَأَةَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ابْنِ لِي عِندَكَ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِ وَنَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ - سورة التحريم – ١٠-١١}.

هەروەکوو چۆن ئیسلام یەکسانی راگەیاندووە لە نێوان ژنو پیاودا دەربارەی مافی بەیعەتکردنو عەهدو پەیمان بەستن: ئەوەتا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) چۆن عەهدو پەیانی لە گەڵ پیاواندا بەستو گوێڕادێری فەرمانی خودا بوو هەر بەهەمان شێوەش لە ئافەتاندا عەهدو پەیمانی بەست، خودا دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ - سورة الممتحنة – ١٢}.

دەی لە کاتێکدا ئێمە دەبینین کە برێ گەلو نەتەوە بەچاوی سووک سەیری ئافرەتیان دەکردو لەپلەی کۆمەڵایەتییان کەم دەکردەوە، بە شیاوی ئەوەیان نەدەزانی کە هاوبەشی پیاو بکا لە چالاکی کۆمەڵایەتیدا، ئیسلام هات ئەوەی بۆ چەسپاند کە وەکوو پیاو ئەویش بەرپرسیارەو ئەرکی کۆمەڵایەتی لەئەستۆ دەگرێ! خودا دەفەرموێ:

{وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ - سورة التوبة – ٧١}.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا پەروەردگار سەر پەرشتیاریو هاریکاری پیاوانو ئافرەتانی موسوڵمانی بۆ یەکتری چەسپاندووەو، مافی ئەوەی داوە کە ژنانیش وەکوو پیاوان ببنە لێپرسراوی سەر پەرشتیارو داوایان لێ دەکا یارمەتی پیاوان دەن لە کاروباری چاکەدا. هەروەها ئەوەی بۆ ئافرەتان چەسپاندووە کە ئەرکی

فەرمانکردن بە چاکە نەیی کردن لە خراپە لە ئەستۆ بگرن و تا دەتوانن کرداری چاک و باش ئەنجام بدەن و خزمەتی گەل و نیشتمان بکەن! ئەمەش باشترین بەڵگەیە کە ئایینی ئیسلام مافی ئەوەی داوە بە ئافرەت بەشداریی نیشاتی کۆمەڵایەتی بکا!

## ئیسلام ئافرەتی ئازادکرد (تحرير الإسلام للمرأة):

لەسەردەمی نەزانیدا هەندێ لە عەرەبەکان کچیان زیندە بەچاڵ دەکرد! ئیسلام هات ئەو دیاردە دزێوەی قەدەغەکردو بەتاوانێکی گەورەی دانا بەمەش مافی ژیانی بۆ ئافرەت گێڕایەوەو کەسایەتی بۆ سەلماند. خودا بۆ خۆی دەفەرموێ:

{وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالأُنثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ، يَتَوَارَى مِنَ الْقَوْمِ مِن سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ أَيُمْسِكُهُ عَلَى هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ أَلاَ سَاء مَا يَحْكُمُونَ - سورة النحل – ٥٨-٥٩}.

واتە: کاتێك یەکێك لەو عەرەبانە هەواڵی ئەوەی دەدرێتێ کە کچی بووە ڕەنگی ڕەش هەڵدەگەڕاو غەم و پەژارە دای دەگرت و پیشی دەخواردەوە، تابۆیشی بکرایە خۆی لە خەڵکی دەشاردەوە، بەلایەوە شەرم بوو کە خەڵك بزانێ کچی بووە، خوا خوای بوو کەس نەیبینێ و کەس نەبینێ! ئەمجار دەکەوتە بیرکردنەوەو لەدڵی خۆیدا لێکی دەدایەوەو ئایا ئەم کچە (کە بەلایەوە نەنگە) بیهێڵێتەوەو قبووڵی ئەم سوکایەتیە بکا؟ یان زیندە بەچاڵی بکاو بەمنداڵی لەناوی بەرێ و ئەم عەیبە لە کۆڵ خۆی بکاتەوە، بەڕاستی ئەو کافرانە حوکمێکی ناڕەوا دەدەن کە دەڵێن! خودا کچی هەیەو فریشتە کچی خودان، واتە کچ (کە بەلایانەوە نەنگییە) پاڵ خودای دەدەن و کوڕیش پاڵ خۆیان دەدەن.

لە ئایەتێکی تردا پەروەردگار داوا لە ئادەمیزاد دەکاو فەرمانیان پێ دەکا کە منداڵەکانیان لە ترسی هەژاری نەکوژن و زیندە بەچاڵیان نەکەن! پێیان

دەفەرموێ: رزق رۆژی ئێوەش و ئەوانیش بەدەست خودایەو کوشتنی ئەو منداڵە بێ دەسەڵاتانە تاوانێکی گەلێك گەورەیەو تا زووە وازی لێ بهێنن. دەفەرموێ:
{وَلاَ تَقْتُلُواْ أَوْلادَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلاقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُم إنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْءًا كَبِيرًا - سورة الإسراء – ٣١}.

لەسەردەمی نەزانیدا دابو نەریتی عەرەبەکان وابوو کە میرات نەدرێ بە ئافرەتو بەمنداڵی پچوکی مردووەکە، تەنها ئەو پیاوانە میراتیان دەگرت کە بەرەنگاری دوژمنیان دەکردو بۆ شەڕ دەچوون!! کە ئیسلام هات میرات وەرگرتنی ئافرەتی سەلماندو مافی رەوای خۆی بۆ دیاری کرد... بەشەمیراتی خۆی – چ کچ بێ یان خوشك بێ یان دایك بێ – هتد – بۆ چەسپاند.
خودا دەفەرموێ: {لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا - سورة النساء – ٧}.

عەرەبەکان دابو نەریتێکی تریان هەبوو ئەویش ئەوەبوو کە یەکێك بمردایەو ژنی لەپاش بەجێ بمایە یەکێ لە میراتگرەکان پیشدەستی دەکردو دەهات کراسەکەی بەسەر ژنی مردووەکەدا دەداو دەیگوت: وەکوو چۆن ماڵەکەی هی خۆمە خێزانەکەشی هی خۆمە، ئیتر ئەم کابرایە دەبووە خاوەنی ئەم ژنە ئەگەر بیویستایە لەخۆی مارە دەکردو مارەییەکەی بۆ خۆی وەردەگرت، یان شوکردنەوەی لێ قەدەغە دەکرد بۆ ئەوەی ئافرەتەکە بەماڵو دارایی خۆی رزگار بکا، یان بۆ ئەوەی ئافرەتەکە بمرێو میراتەکەی بەرێ!! کە ئیسلام هات ئەم عادەتە دزێوەشی قەدەغەکرد.

خودا دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ النِّسَاء كَرْهًا وَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ - سورة النساء – ١٩}.

واتە: ئەی برواداران! رەوا نییە بۆ ئێوە کە بەزۆر ژن بە میرات بگرن، ئەگەر ویستیان شوو بکەنەوە بەرگرییان لێ مەکەن بۆ ئەوەی مارەییو ماڵو دارایی خۆیانتان بدەنێ! یان بۆ ئەوەی ئەگەرمردن میراتەکەیان بگرن.

عەرەبەکان عادەتێکی دزێوی تریان هەبوو ئەوەبوو هەندێکیان زۆریان لە کچەکانیان دەکرد کە داوێن پیسی بکەن، گەوادخانەیان بۆ دادەنان تا پارەیان بۆ پەیدا بکەن، ئیسلام ئەمەی لێ قەدەغە کردن و فەرمووی:

{وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاء إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا - سورة النور – ٣٣}.

هەندێکی تر لە عەرەبەکان ئەگەر باوك بمردایە کوڕەکەی زڕدایکەکەی خۆی بەمیرات دەگرت و وەکوو کەل و پەلی مردووەکە دەبوو بە ماڵی و ژنی باوکی خۆی دەکردە ژنی خۆی و تێی بەردەبوو! ئایینی ئیسلام ئەم عادەتە دزێوەی قەدەغە کردو بنەبڕی کرد قورئان دەفەرموێ:

{وَلاَ تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ آبَاؤُكُم مِّنَ النِّسَاء إِلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَمَقْتًا وَسَاء سَبِيلاً - سورة النساء – ٢٢}.

هەروەها چۆن ئیسلام چەند جۆرە ژن مارەکردنێکی ناڕەوای تری قەدەغەکرد کە بڕێ لەو جۆرە ژن مارەکردنانە تا ئێستاش لای بڕێ گەل و نەتەوەی دواکەوتوو باوەو ماوە.

## ژن مارەکردن لە نیگای قورئانەوە (نظرة القرآن إلى الزواج):

پێناسەی ژن و مێردایەتی چییە؟! ئایا مامەڵەیەکی بازگانییە لەنێوان دوو کەسی هاوبەشی ژیان؟ ئایا ژن و مێردایەتی وەسیلەو هۆیە بۆ دابینکردنی ئارەزۆی تایبەتی ژن و مێردو ئیستراحەتکردن لەو هەوەسە شەیتانییە؟! هەموو ئەو شتانە کۆمەڵگاو بیرو باوەڕی جۆراو جۆر – پێش هاتنی قورئان – لێکۆڵینەوەو توێژینەوەیان دەربارەی ئەنجام داوە.

بەڵام ژن و مێردایەتی لە قورئان دا بریتییە لە بەیەك گەیشتنی دوو ئادەمیزاد بەشێوەیەکی رێك و پێك و شیاو چ لە روانگەی کۆمەڵەوە چ لە روانگەی تاکە تاکەی مرۆڤەوە. ژن و مێردایەتی پێویستییەکی کۆمەڵایەتییە بۆ درێژەدان بەژیان و مانەوەی جۆری ئادەمیزاد، لە روانگەی تاکیشەوە ئارامییەکی نەفسانییە،

هۆی رەحمەتو خۆشەویستییە لەنێوان ژنو پیاودا، بۆیە خیتابی قورئان دەربارەی ژنو مێردایەتی روو بەرووی تاکەکانی کۆمەڵ وتراوە بۆ ئەوەی پێداویستییەکانی ئاسان بکرێ... خودا دەفەرموێ:

{وَأَنكِحُوا الْأَيَامَى مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ إِن يَكُونُوا فُقَرَاء يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ - سورة النــور – ٣٢}.

ئەم ئایەتە روو بەرِوی سەرپەرشتیارو لێپرسراوی کورِو کچ ئاراستەکراوەو، هەموو موسوڵمانانیش دەگرێتەوە – داوای ئەوەی لێ کردون کە کچی عازەبو کورِی جەحێڵ لێك مارە ببرِن، هەرگیز هەژاری کورِەکە نەبێتە لەمپەرِو بەرگری بۆ سەرنەگرتنی ئەم کارە مرۆڤایەتییە، چونکە خودا بەرعۆدەی دەوڵەمەند بونیان دەبێ! خۆ ئەگەر کەسێك هەژارو نەبوو بوو، ئەوە قورئان فەرمانی پێ دەکا کە خۆ بگرێو داوێنپاك بێ تا خودا دەوڵەمەندی دەکاو ئەوەندەی دارایی دەداتێ کە بتوانێ ژن بێنێ، دەفەرموێ:

{وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّى يُغْنِيَهُمْ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ - سورة النــور – ٣٣}.

واتە ئەو پیاوانەی هەژارنو پارەو ماڵی ژن هینانیان نییە با خۆیان بگرن تا خودا دەوڵەمەندیان دەکا.

ژنو مێردایەتی لە ئیسلامدا عەهدو پەیمانە لە نێوان ژنو مێرددا خودا دەفەرموێ:

{وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَاقًا غَلِيظًا - سورة النساء – ٢١}.

ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ کە ئافرەتان پەیمانیان لە پیاوان وەرگرتووە، ئەو پەیمانەش پەیمانی ژنو مێردایەتییە، پەیمانی بەیەکەوە ژیانە، پەیمانە لە نێوان پیاوو ژندا کە هەریەکەیان بەرامبەر ئەوی تریان بەرپرساربێو ئەرکی سەرشانی خۆی بەرامبەر هاوسەرەکەی ئەنجام بدا! دیارە تەعبیری (میثاقا غلیظا) نرخو

بـەهای خـۆی هەیـە، مانـای خۆشەویـستیو رەحـمو بـەزەیی دەگەیـەنێ، ئـەوە دەگەیەنێ کە عەقدی ژنو مێردایـەتی سەودای مامەڵەو کـڕینو فرۆشـتن نییـە، بەڵـکوو عەقـدێکی موقەدەسـەو پـیرۆزو موبارەکـە، دەبـێ رێـزی لێ بگـیرێ!! پەیوەنـدی نێوان ژنو مێـرد پەیوەندییـەکی تایبـەتیو ئارامگرتنـە، دڵو دەروون دادەسەکێنێو شەتڵی خۆشەویستی دەڕوێنێو نەمامی رەحمو بەزەیی ئـاو دەدا... خودا دەفەرموێ:

{وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ - سورة الروم – ٢١}.

ئـەم ئایەتـە ژنو مێـرد ئاگـادار دەکاتـەوە کـە گـەورەترین بەڵـگە لەسـەر بـەتوانایی پـەروەردگارو نیـشانەی کـەرەمو بـەزەیی ئەوەیـە کـە ژنـی بـۆ پیـاو دروسـتکردوە لەیـەك گـەراو جیـنس تـا پێکـەوە ئـارام بگـرنو دڵو دەرونیـان دابسەکنێو دامرکێو ببنە دوو ئەندامی هاریکاری یەکتریو بتـوانن زەوی ئـاوەدان بکەنەوە. وشـەی (لتسکنوا) لـە ئایەتەکـەدا تـەعبیرێکی هێنـدە بـەرزەو شـیاوە بـۆ ئەوەی ببێتە ئاوێنەی باڵانوما بۆ ئەو حەزو خۆشەویستییە پیرۆزەی کـە لـەنێوان ژنو مێرددا دروست دەبێ، هەسـتی خۆشەویـستی پاکیـان دەگەیـەنێ. کـە هـەموو دڵەڕاوکێو قەلەقی دڵو دەروون رادەماڵێو ئـارامی دەخاتـە دڵەوە.. هـەروەها لـە رەحمەتی خودایە کە خۆشەویستیو سۆزو بەزەیی خـستۆتە نێـوان ژنو مێـردەوە بـــە جۆرێـــك کـــە رۆژ بـــەرۆژ زیـــاد دەکـــاو لەزیادبووندایـــە. بەپێـــچەوانەی خۆشەویستییەکە کە لەسەر بنەمای ئارەزۆ بازی دروست بێ.

هەر لەمانای ئەم پەیوەندییە بەتینەیە کە قورئان دەفەرموێ:

{هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ - سورة البقرة – ١٨٧}.

ئەوەتا ئەم ئایەتە پیرۆزە هەر یەکێکی لەژنو مێرد شوبهاندووە بە پۆشـاكو پارێزەر بۆئەوەی تریان، چونکە هەریەکێ لە ژنو مێرد پێداویـستی ئـەوی تریـان دابین دەکا، هەریەکەیان پێویستی بە ئەوی تریان هەیە، وەکوو چۆن پێویـستیان

بە پۆشاك هەیە!! هەر یەكێ لە ژن‌و مێرد بۆ هاوسەرەكەی پارێزەرە، شەرەف‌و ناموسی دەپارێزێ راحەت‌و تەندروستی بۆ دابین دەكا، كاتێكیش ئەم ئارامی‌و دڵنەواییە دێتە كایەوە كە ژن‌و مێرد لە ئەخلاق‌و رەوشتدا لێك بچن‌و ئایین‌و بیرو بۆچونیان یەك بێ، بۆیە پەروەردگار دەفەرموێ:

**{الْخَبِيثَاتُ لِلْخَبِيثِينَ وَالْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَاتِ وَالطَّيِّبَاتُ لِلطَّيِّبِينَ وَالطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَاتِ - سورة النـور – ٢٦}.**

بەشی یەكەم لە ئایەتەكە مانای ئەوەیە كە ژنی بێ ئابڕوو ناچیزە شایانی پیاوی شەلاتی‌و سەرسەرییە، پیاوی بەڕێزو سەلار هەرگیز خۆی لە ژنێكی چەتیوە خەسار ناكاو رازی نابێ ئافرەتێكی داوێن پیس ببێتە خێزانی، هەروەها پیاوی خوێڕی‌و هەتیوەو شەلاتی هەر شیاوی ئەوەن كە ژنی چەتیوەو بێ ئابڕو ببنە هاوسەریان! جا كە هەموو خاوەن رێزو دوێنپاك‌و سەلارێك رازی نەبوو ببێتە هاوسەرو هاوڕێی بێ ئەخلاق‌و بی ئابڕوو چەتیوەو هەتیومچە ئەوە دیارە هەریەكەیان هاوسەرێكی داوێنپاك‌و بەرێزو بەئەخلاقی بەنسیب دەبێ، ئافرەتی بەشەرەف دەبێتە هاوسەری پیاوی بەشەرەف. پیاوی ئەخلاق جوان دەبێتە مێردی ئافرەتی رەوشت بەرز، ئەمەش راستەوخۆ ئایەتەكە ئاماژەی بۆ دەكا، كە دەفەرموێ:

**{وَالطَّيِّبَاتُ لِلطَّيِّبِينَ وَالطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَاتِ}.**

ئارامی بەردەوام‌و پێكەوە هەڵكردن كاتێك دێتەجێ كە ژن‌و مێرد لە رەوشتدا هاوشان بن ئەمەش بەهۆی پەروەردەی راستی ئایینییەوە دەستەبەر دەبێ! بۆیە پێغەمبەری مەزنمان دەفەرموێ:

**(تنكح المرأة لاربع: لمالها ولحسبها ولجمالها ولدينها فاظفر بذات الدين تربت يدات) – رواه البخاري ومسلم.**

واتە: چوار هۆكاری سەرەكی هەن كە پیاو داخوازی ئافرەتێك دەكا: یان لەبەر دەوڵەمەندی، یان لەبەر خاتری جێگەو رێگەو پلەی خێزانی، یان لەبەر جوانی‌و شۆخی، یان لەبەر دینداری، جا تابۆت دەكرێ هەوڵ بدە ئافرەتی دیندار

هەڵبـژێرە سـەرکەوتوو دەبـیٚ!! ئـەم چـوار هۆکـارە گـرنگترین ئـەو هۆکارانـەن کـە خەڵکی لەکاتی ژن خواستندا رەچاوی دەکەن، هەموو هۆیـەکانیش لای پێغەمبـەر پەسەندن، بەڵام چونکە لایەنی دینی لای خەڵك خراوەتـە پلـەی ئـەخیرەوە بۆیـە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) خوازبێنیکەری هـەڵناوە کـە رەوشـتی دیـن بکاتـە تـەرازوو بەسەر هەموو لایەنەکانی تردا پارسەنگی بداتیٚ؟! مەبەسـتیش لـە دینـداری ئـەوە نییە کە ئەو ئافرەتە نوێژوو رۆژوی هەبیو ئیتر بەسە با رەوشت ناشیرینیش بیٚ! بەڵکوو مەبەست ئەوەیە کە ئایین رەوشتو کردارو گوفتـاری مـشتو ماڵـکردبیٚو هەموو شتێکی بە تەرازووی ئایین کێشراوبیٚ.

ئاشکراشە کە هەڵبژاردنی ئافرەت بۆ هاوسەریەتی ئەو ئافرەتانـە دەگرێتـەوە کە ئایینی ئیسلام خوازبێنی کردنو ماەکردنیانی بەڕەوا بینیوە نەك ئەوانـەی کـە دەبنە مەحرەم... خودا دەفەرمویٚ:

**{حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالاَتُكُمْ وَبَنَاتُ الأَخِ وَبَنَاتُ الأُخْتِ وَأُمَّهَاتُكُمُ اللاَّتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُم مِّنَ الرَّضَاعَةِ وَأُمَّهَاتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَائِبُكُمُ اللاَّتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ اللاَّتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُواْ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلاَئِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلاَبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُواْ بَيْنَ الأُخْتَيْنِ إَلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّ اللّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا - سورة النساء — ٢٣}.**

واتە: حەرامە لەسەرتان دایكو كچو خوشكی خۆتـان مـارە بكـەن بـۆ خۆتـان هەروەها پـور — خوشـكی دایـكو خوشـكی بـاوك — كـچی بـراو كـچی خوشـك ئـەو دایكانـەی شـیریان پێـداون، خوشـكی شـیری، خەسـو، كـچی بێوەژنێـك كـە مارەتـان كردبـیٚ، ئەگـەر مـارە نـەكرابیٚ قـەیناكا، هـەروەها ژنـی كـوڕو كـوڕەزا، هـەروەها حەرامە دوو خوشك بەیەكەوە لەژێر نیكاحی پیاوێكدا بن... مەگـەر ئەوانـەی كـە پێش هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتـە مـارەكرابن، بێگومـان خـودا لێخـشبوونی زۆرەو زۆر بە بەزەییو بەڕەحمە.

**بناغەی ژن‌و مێردایەتی لە ئیسلامدا (أصول الزواج في الإسلام):**

ژن مارەبڕین لە ئیسلامدا عەقدو پەیمانێکە وەکوو عەقدو پەیمانەکانی ترو هیچ پێویست ناکا پیاوی ئایینی حازری ببیٚ‌و مەرج نییە بەحەفلەی ئایینی ئەنجام بدریٚ، وەکوو لە ئایینەکانی تردا ئەنجام دەدریٚ... ئایینی ئیسلام پێی وایە ژن مارەکردن پەیمان‌و بەیەکدی رازی بوونە لەسەر بنەمای لێک گەییشتن‌و تێک گەییشتنی ژن‌و پیاو لە یەکتری.

مەرجی دامەزرانی مارەکردن (نیکاح)یش ئیجاب‌و قبوولە، واتە: یەکێکیان بەوی تریان بڵیٚ: خۆم کرد بەهاوسەری تۆ ئەوی تریشیان بڵیٚ قبوولم کرد.

هەروا مەرجە دوو شایەت ئامادەی ئەم مارەکردنە ببن. بۆیە ئەگەر کچ‌و کوڕێک یەکتریان بەدڵ بوو بەیەکدی رازی بوون لەلای دوو شایەتی عادڵ‌و رێک‌و پێک رەزامەندی خۆیان بە یەکتریی دەربڕیٚ. کچەکە بە کوڕەکەی وت: خۆم لیٚ مارەکردی‌و کوڕەکەش بڵیٚ وا قبوولم کردی، هیچ مانعێکی شەرعیش نەبوو لە مارەکردنەکەو لای قازی یان بریکاری قازی یان موچە خۆرێکی تایبەت عەقدەکە بنووسن‌و دوو شایەت ئاگاداری عەقدەکە بن، لەرووی ئایینییەوە مارەکردنەکە دامەزراوەو راست‌و دروستە[1].

بەڵام عەقدی نیکاح لە ئیسلامدا لەگەڵ یاسا دانراوەکانی جیهاندا جیاوازە، چونکە یاسا دانراوەکان (القوانين الوضعية) هەموویان عەقدی ژن مارەکردن لە هەموو صیفەتێکی ئایینی دادەڕنیٚ، کەچی شەریعەتی ئیسلام ژن مارەکردن بە مەسەلەیەکی ئایینی دادەنیٚ‌و لەم رووەوە کە بنەماکانی ژن‌و مێردایەتی لە ئایینەوە وەردەگریٚ، ئایین خەڵکی هەڵدەنیٚ بۆ ئەنجامدانی! لەم مانایەدا پێغەمبەری مەزن دەفەرمویٚ:

---

[1] - ئەمە رای ئەبو حەنیفەیە.

« يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ . (رواه مسلم والبخاري).

واتە: ئەی کۆمەڵی گەنجەکان! هەر کامێکتان کەرەسەو پێویستیاتی ژن هێنانی هەیە با ژن بێنێ چونکە ژن هێنان لەچاو بازیو نەزەر دەتان پارێزێ عەورەتیشتان دەپارێزێ، ئەگەر نەدارا بوونو پێویستیاتی ژن هێنانتان نەبوو بەرۆژوو بن چونکە رۆژو ئارەزۆتان دادەمرکێنێ!!

دەربارەی ژن مارەکردن چەند حوکمێك هەیە پێویستە ئاماژەی بۆ بکرێ، یەکێ لەوانە ئەوەیە کە دروست نییە ئافرەتی موسوڵمان شوو بکا بە پیاوی نا موسوڵمان، هەروەها نابێ پیاوی موسوڵمان ژنێك بێنێ کە هاوەڵ بۆ خودا دابنێو لەسەر ئایینێك بێ نامەی ئاسمانی نەبێ، هەروەها مەسەلەی شیرخواردن ئەگەر منداڵێك شیری ئافرەتێکی خوارد وەچەو بنەچەی ئەو ئافرەتەی لێ حەرام دەبێ، هەروەها خۆشکی ئافرەتەکەو پوری، بەکورتی هەرچی بە نەسەب حەرام ببێ بەشیر خواردنیش حەرام دەبێ! کەچی ئەم شتانە لە قانوونی وضعیدا هیچ ئیعتیبارێکیان پێ نییە.

## خوازبێنی (الخطبة):

خوازبێنی پێش مارەکردن دەکرێ:_ خوازبێنی بریتییە لەوە کە پیاوێك داوای ئافرەتێکی دیاریکراو بکا بۆ مارەکردنو بوون بە هاوسەری یەکتری. واتە: پیشنیارێك بدا بە کەسو کاری ئافرەتەکەو وتووێژیان لەگەڵدا بکا دەربارەی دەستگرتنو بوون بەهاوسەری ئافرەتەکەو داخوازی ماڵی ئافرەتو داخوازی ماڵی کوڕەکە دەربارەی هەڵسو کەوتی ئافرەتەکەو ئەو جۆرە شتانە کە بەروالەت ئەنجام دەدرێ.

لە ئایینی ئیسلامدا وا باشە کوڕو کچ بە تەواوی زیاد لە جارێك یەکتر ببینن تاوەکوو دڵیان یەکتری بگرێو خۆشەویستی بکەوێتە نێوانیانەوە. دواى

گواستنەوەو بوون بە هاوسەری یەکتری پەشێمان نەبنەوە. موغەیرەی کوڕی شوعبە دەڵێ: من ئافرەتێکم خواست پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پێی فەرمووم: جوان سەیری بکەو بزانە ئاخۆ بەدڵتە، چونکە ئەو سەیرکردنەی پێش خواستن و مارەکردن دەبێتە هۆی ئەوەی کە لە نێوانتاندا خۆشەویستی بەردەوام بێ!

هەروەها پێویستە باوك و کەس و کاری کچەکە - ئەگەر بالغ بێ) - ڕەزامەندی کچەکە وەربگرن و بەبێ پێخۆشبوونی خۆی بەشووی نەدەن. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: **(الثيب أحق بنفسها من وليها والبكر تستأمر واذنها السكوت)** واتە: بێوەژن خۆی خاوەنی خۆیەتی و دەتوانێ خۆ لە پیاو مارەبکا، کچیش داوای ڕەزامەندی لێ دەکرێ، بێدەنگیشی نیشانەی ڕەزامەندییەتی!!

خوازبێنیکەرو خوازبێنیکراو (الخاطب والمخطوبة) دەتوانن بەشیمان بینەوەو واز لە کارەکانیان بێنن، جا ئەگەر خوازبێنی کەر ژێوان بوەوە، لە خوازبێنیەکەی یان ئافرەتەکە ژێوان بوەوە ئەوە دیاری و خشڵ ئەگەر مابوون دەگێڕدرێنەوە بۆ خاوەنەکەی، ئەگەر نەمابوون نرخەکەیان حسێب دەکرێ، بەڵام ئەودیارییانەی بۆ مانەوە نابن وەکوو شتی خواردن و خواردنەوە ئەوە ناگێڕدرێتەوە.

لە ڕۆژانی خوازبێنی کردندا - پێش مارەکردن - نابێ کوڕو کچ پێکەوە کۆببوونەوە بکەن، چونکە کوڕو کچەکە بۆ یەکتر بێگانەن لەیەکتریی حەرامن لەم ڕووەوە کە خوازبێنی بەڵێنە بۆ مارەکردن نەك مارەکردنە.

## هاوکوفی و هاوشانی (الكفاءة):

ئەگەر پیاوێك خوازبێنی ئافرەتێکی کرد دەبێ پیاوەکە هاوشانی کچەکەبێ، هاوشانی لەبنەمادا مانای یەکسانی دەبەخشێ، جا هاوشانی لەبنەماڵەو داراییدا دەبێ، ڕێزداری عیلم و زانیاری لە ژوور ڕێزداری خێزاندایە، هاوشانی لەماڵ و داراییدا ئەوەیە کە پیاوەکە بتوانێ مارەیی بداو نەفەقەی خێزانەکەشی دابین

بکا، دەوڵەمەندی لە هاوشانیدا مەرج نییە کەس‌و کاری ئافرەت ئەگەر هەستیان کرد ئافرەتەکە شوو دەکا بە پیاوێك هاوشانی ئەوان نییە دەتوانن داوای هەڵوەشانەوەی مارەبڕینەکە بکەن.

## مارەیی (المهر):

ئایینی ئیسلام لەسەر پیاوی پێویست کردوە کە لەکاتی مارەکردندا مارەیی پێشکەشی ئافرەتەکە بکا، خودای گەورەو مەزن مارەیی ناو ناوە (صدقة) واتە: واتە: بەخشش‌و پیاوەتی‌و دیاری... دەفەرموێ:

**{وَآتُواْ النَّسَاء صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَيْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيئًا مَّرِيئًا - سورة النساء – ٤}.**

عەرەبەکان پێش ئیسلام پێیان وابوو ئافرەت مافی ئەوەی نییە کە ببێتە خاوەنی مارەیی خۆی، کەسی ئافرەتەکە بۆ خۆی مارەییەکەی وەردەگرت‌و هیچی لێ نەدەدا بە ئافرەتەکە، ئەگەر شتێکیشی لێ بدایە ئەوە مێردەکەی بەبێ پرس‌و رای ژنەکە لێی خەرج دەکرد!

کە ئیسلام هات قەڵا چۆی ئەم داب‌و نەرێتەی کردو فەرمانێ کرد کە ئافرەت دەبێ مارەیی خۆیان وەربگرن. ئایەتەکەش دووپاتی ئەوەی کردەوە، تەنانەت مارەییەکەی ناوەناوە (نحلة) واتە: بەخشینێکی بەدڵ‌و پێخۆشبوونەوە بڕواشی وابێ کە ئەو مارەییە مافی رەوای خۆیەتی، نابێ کەس‌و کاری ئافرەتەکە یان مێردەکەی بەبێ رەزامەندی خۆی هیچ دەستکاریەکی بکەن! بەمەش قورئانی پیرۆز مافی مڵکداریەتی راست‌و راستاڵی بە ئافرەت داوەو ئەوەی بۆ چەسپاندوە کە مێردەکەی هیچ دەسەڵاتێکی لەم بارەوە بەسەر ژنەکەدا نییە! کەچی بڕێ لە دوژمنانی ئیسلام‌و ئافرەتی موسوڵمان دەربارەی هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر مارەیی وابیر دەکەنەوە کە یاسای مارەیی جۆرێکە لە کڕین‌و فرۆشتنی ئافرەت‌و رێزی ئافرەت دادەبەزێنێ، لە ئەوە حاڵی نەبوون کە حیکمەتی ئەوە کە مارەیی لەسەر پیاوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە پیاو بەرپرسیارە بۆ دابینکردنی

پێویستیاتی لانەی ژن‌و مێردایەتی، ئەم بەرپرسیارییەشی لەبەر ئەوەیە کە پیاو بالاّ دەستەو پیاو شیاوترە بۆ تێکۆشان‌و دابینکردنی پێویستیاتی ژیان: ئافرەتی خۆرئاوا – بە گوێرەی داب‌و نەریتی خۆیان – پێویستە لەسەریان کە خانوو ناومالّی ژن‌و مێردایەتی دابین بکەن، بەمەش دەلێن (دوطة) دەی ئەمە کە ئافرەت ئەرکی دروستکردنی ناومالّ لەئەستۆ بگرێ کارێکە پێچەوانەی سروشتەو هەلّگێرانەوەی یاسای طەبیعەتە.

لەلایەکی ترەوە ئایینی ئیسلام ئەندازەی مارەیی دەستنیشان نەکردوەو بەگوێرەی توانای دارایی پیاوەکە زیادو کەم دەکا، یان بەگوێرەی رێککەوتن‌و رازی بوونی کچ‌و کوڕەکە دەخەملێندرێ! تەنانەت دەگێڕنەوە کە پیاوێکی هەژار هاتە لای پێغەمبەرو کڕوزایەوەو وتی: من توانای ئەو مارەییەم نییە کە ئێستا داوا دەکرێ‌و بومتە باوا! پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جا هەولّ بدە بەئەنگوستیلەیەکی ئاسن ئافرەتەکە رازی بکەو ئەنگوستیلەیەکی ئاسن بکە بە مارەیی.

لەلایەکی ترەوە مەرج نییە کاتی مارەکردنەکە هەموو مارەییەکە تەسلیم بکرێ، بەلّکوو دەتوانێ هەمووی قەرز بێ یان نیوەی حازرو نیوەی قەرز بێ، یان بەوەجبات بیداتێ بەو گوێرەی کە کچ‌و کوڕەکە لەسەری پێك دێن! تەنانەت هەردوای مارەکردنەکە ژنەکە دەتوانێ گەردنی پیاوەکە ئازاد کا لە هەمووی یان لەنیوەی یان لە هەندێکی خۆش ببێ، چونکە مارەیی مافی شەخصی ئافرەتەکە خۆیەتی، دەتوانێ بە ئارەزۆی خۆی تەصەروفی تێدا بکا، جا گەردنی ئازاد بکا یان پێی ببەخشێ! بەلاّم ئەوداب‌و نەرێتەی ئێستا لای هەندێ موسولّمان باوە کە مارەیی زۆرو زەبەندەو خەیالّی داوا دەکەن بۆ کچەکانیان بە جۆرێك کە زۆری مارەیی بووەتە هۆی ئەوەی زۆر لە گەنجەکانمان واز لە ژن هێنان بێنن‌و نەتوانن بچنە ژێر باری، ئەمە هەلّوێستێکە پێچەوانەی بۆچونی قورئانی پیرۆزە کە دەفەرموێ:

{إِن يَكُونُوا فُقَرَاء يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ - سورة النــور}.

واتە: ئەگەر خوازبێنی کەران هەژار بوون خودا دەوڵەمەندیان دەکا.

پێغەمبەری مەزنیش دەفەرموێ: **(اذا جاءكم من ترضون دينه وخلقه فزوجوه الا تفعلوا تكن فتنة في الأرض وفساد كبير)** ئەوەتا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بەس باسی ڕەوشتی جوانو ئایینی کردوەو باسی ماڵو دارایی نەکردوە، ئاگاداریشمان دەکاتەوە کە ئەگەر ئێمە پەیڕەوی ئەم فرمایشتە نەکەین فیتنەو ئاشووب بەرپا دەبێو فەسادو بێ ئەخلاقی لەسەر زەوی بڵاو دەبێتەوە!! ئەوەتا ئەمڕۆ بەچاوی خۆمان دەیبینین کە گەنجەکانمان لە حەرامو بێ شەرعیدا ڕوچونو سەریان لێ شێواوە، چونکە ناتوانن ئەرکی دابو نەرێتی کۆمەڵگایەکی ناموسوڵمان جێ بەجێ بکەن!

## یەکسانی ئافرەتو پیاو لە ژیانی ژنو مێردایەتی دا:

ماڵو خێزان تاکە تاکەی کۆمەڵگای مرۆڤایەتین، خۆشبەختیو کامەرانیو مرۆڤایەتیش بەستراوە بە خۆشبەختی خێزانەوە، کە ژیانی خێزانەکان بەختەوەر بوو دیارە ژیانی کۆمەڵگاکەش کامەران دەبێ، بەکورتی ئەمنو ئاسایشی خێزان بەڵگەیە لەسەر ئارامی کۆمەڵگاو پێشکەوتنی.

جا لە کاتێکدا خێزان پێك دێ لە ژنو پیاوو ئەم دوانە کۆڵەکەی گرنگی ڕاگرتنو پێکهێنانی خێزانن، دیارە ڕاگرتنو گەشەکردنی خێزانیش بەستراوە بە ئەندازەی لێك گەیشتنیانو پەیوەندییان بە یەکترەوەو ڕێزگرتنیان بە یەکتریو ئەندازەی ئارامیو خۆشبەختی هەریەکەیان.

بێگومان ڕۆژگارێکی دورو درێژ ڕابورد تاکۆمەڵگا زانی پلەی شیاوی ئافرەت کامەیەو چۆن پێویستە ڕێزی لێ بگیرێ! مێژووش ئەوەی چەسپاندووە کە ژن مارەکردن لای زوربەی گەلانو نەتەوەکانی پێش هاتنی ئیسلام جۆرێك بووە لە کۆیلایەتیو بەندایەتی، پیاوان ئافرەتیان بەژێر دەستەو کۆیلەی خۆیان حسێب کردوە! بەڵام ئیسلام یەکسانی خستە نێوان ژنو پیاوەوە بۆ هەریەکەیان مافو

ئەرکی تایبەتی خۆیانی بۆ دەستنیشان کردن، مافی سەروکاری خێزانیشی بەپیاو سپاردو فەرمووی:

{وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكُيمٌ - سورة البقرة ٢٢٨}.

ئەم ئایەتەپیرۆزە بەم کورتبڕییە (الایجاز) چەند مانای قوڵی لەخۆ گرتووە، کە تەفصیلو شیکردنەوەی بەرگێکی فەوارە گەورەی پێویستە، ئەم ئایەتە قاعیدەو یاسایەکی کوللیەو ئەوە دەگەیەنێ ئافرەت لە هەموو مافو حقوقێکدا لەگەڵ پیاودا یەکسانە، بەڵی ئەم ئایەتە تەرازۆیەکی راستو رێکە، مامەڵەکردنی پیاو لەگەڵ خێزانیدا دەکێشێو لە هەموو کارو بارێکدا هەڵوێستی پیاوو ژن بەرامبەر بەیەك هەڵدەسەنگێنێ!

ئەگەر پیاو ویستی خێزانی کارێکی بۆ ئەنجام بدا دەبێ ئەوە بزانێ ئەویش لەبەرامبەر کارەکەی ئەودا بە ئەندازەی خۆی پێویستە کارو باری ئەو ئەنجام بدا، هیچ عەدالەتو دادپەروەریش نییە کە چینی پیاو چینی ژنان بچەوسێنێتەوە، وەکوو کۆیلە سەیری بکاو لەکارو باری خۆی بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاری بێنێ، بە تایبەتی دوای عەقدی مارەکردنو گواستنەوەی ئافرەتو دامەزرانی ژیانی ژنو مێردایەتیو بەیەك گەیشتنیان کە بەبێ رێزگرتن لە یەکتری سوود لەژنو مێردایەتی یەکتر وەرناگرنو ئستیراحەتی لێ ناکەن!.

ئایەتەکە ئیستسنای یەك شتی کردوە: کە فەرموویەتی (وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ) واتە: پیاوان پلەیەکی زێدەیان بەسەر ژنانەوە هەیە ئەمجار لە ئایەتێکی تردا ئەو پلەیەی شی کردۆتەوە، کە دەفەرموێ:

{الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء بِمَا فَضَّلَ اللّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ - سورة النساء - ١٠٤}.

واتە: پیاوان سەرپەرشتیاری ئافرەتانن بەهۆی ئەوەی کە پیاو زێدە هێزو تاقەتو توانای هەیە، هەروەها بەهۆی ئەوەی کە پیاو لەماڵی خۆیان نەفەقەو بژێوی ئافرەتان دابین دەکەن.

مافی سەرپەرشتیاری لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە پیاو بەسروشتو لەشو لاریەوە زێدە توانایەکی تێدایە، هەروەها لەوەوە کە پیاو ئەرکی بەخێوکردنی ماڵو منداڵی بە ئەستۆوەیە هەروەها برێ ئەرکی کۆمەڵو دەورو بەری خۆی لە ئەستۆدایە.

پیاو لە ئافرەت بە تواناترە بۆ هەوڵو تێکۆشانی ژیان، توانای زیهنیو جیسمیشی زیاترە، چونکە ئافرەت –بەسروشت– برێ کات ناتوانێ هەوڵو تێکۆشانی ژیان وەکوو پیاو ئەنجامدا بەتایبەتی لەکاتی سك پڕ بوونو شیر بەمنداڵ داندا. پیاو بەرپرسیارە لە دابینکردنی بژێوی ئافرەتو دابینکردنی خانوو بەرە بۆ ژن تا بتوانێ منداڵ بەخێو بکا، کاروباری ناوماڵ ئەنجام بدا، زیاد لەوەش ئافرەت هەموو مانگێ حەفتەیێ یان زیاتر دەکەوێتە حاڵەتی تێکچوونی وەزعی تایبەتی خۆی، لەلایەکی ترەوە ژیانی ژنو مێردایەتی ژیانێکی کۆمەڵایەتییە، چونکە هەموو کۆمەڵێك –کەم بن یان زۆر– کێشەو نیزاعیان تێدەکەوێ، بەرژەوەندییەکانیان جێبەجێ ناکرێن ئەگەر لێپرسراوێكو سەرۆکێکیان نەبێ! بۆیە پێویستە لێپرسراو هەبێ کاتی پێویست بگەڕێنەوە بۆ لایو ناکۆکیو نیزاعیان بۆ حەل بکا، ئەگەر وانەبێ رشتەی یەکیەتی نێوان کۆمەڵ دەپسێو نیزام تێك دەچێو کەس بەقسەی کەس ناکا. شتێکی ئاشکراشە بۆ ئەم لێپرسراویە پیاو لێهاتووترو زاناترو بەتواناترە، جێبەجێکردنی ئەرکی سەرۆکایەتی – چ بە ماڵ چ بەهێزو توانابێ – بۆ ئەم خۆشتر هەڵدەسووڕێ..

## هەڵسو کەوت لەگەڵ ژناندا (معاملة الزوجات):

ئاشکرایە کە شەریعەتی ئیسلامی پیاوان هەڵدەنێ بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ژناندا بە مامەڵەکردنێکی باشو گونجاو! قورئان دەفەرموێ:

{وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا - سورة النساء – ١٩}.

واتــە: لەگــەڵ ئافرەتــان مامەڵــەی چــاکە بکــەن‌و بۆیــان بــاش بــن، ئەگــەر بەدڵیشتان نەبوون هەر بۆیان باش بن ئومێد وایە ئەوەی کە ئێوە بەدڵتان نییــەو رقتان لێیەتی خودای گەورە خێــرو بێرێکی باشی تێدا کۆبکاتــەوە! لــە ئایــەتێکی تردا هاتووە دەفەرموێ:

{فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ - سورة البقرة – ٢٣١}.

واتە: ئەگەر ژنەکانتان بەدڵ نەبوون زوڵم‌و ستەمیان لێ مەکەن، جا یــان لای خۆتان بیانهێڵنەوەو لەگەڵیانــد بــاش بــن! یــان تــەڵاقیان بــدەن‌و زۆرو ســتەمیان لێ مەکەن!

پێویستە پیاو تــا بــۆی دەکــرێ بــە باشــی مــاڵ‌و منــداڵی خــۆی بــەخێو بکــا نــە دەستبڵاوبێ لەگەڵیان دا نەدەست قوچاوییان لەگەڵدا بکا. خودا دەفەرموێ:

{لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَا آتَاهَا - سورة الطلاق – ٧}.

واتە: دەوڵەمەندو خاوەن سامان بە ئەندازەی سامانداریەتی خــۆی مەســرەفی خاوو خێزانــی خۆی بکێــشێ! کەسێکیش هــەژاربوو بــا بەقــەدەر بــەرەی خــۆی پــێ رابکێشێ‌و لەوەی کە هەیەتی مەسرەفی خێزانی بکــا، پــەروەردگار هــەر کەســە بــە ئەنــدازەی توانــای خــۆی ئــەرکی دەخاتــە ســەرو هــەرگیز زیــاد لــەتوانای خــۆی بەرپرسیاری ناکا.

ئەگەر ژن تۆراو فەرمانبەرداری مێردی نەبوو، دەشێ پیاو بەجۆرەها هەڵس‌و کەوت‌و ئوسلوب هەڵەی ژنەکەی راست بکاتەوە وەکوو ئەم ئایەتە ڕونی کردۆتــەوە کە دەفەرموێ:

{وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً - سورة النساء – ٣٤}.

ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەوە دەچەسپێنێ کــە ئەگــەر پیــاو هەســتی کــرد خێزانەکــەی سەرپێچی فەرمانی دەکاو پەیڕەوی مافی ژن‌و مێردایەتی ناکاو شانازی بەسەردا دەکا!

پێویستە ئامۆژگاری بکاو هەڵەکانی بخاتە بەرچاوو شارەزای ڕێگای ڕاستو دروستی بکا - دیارە ئامۆژگارییەکە بەپێی بارو دۆخو ئاستی ڕۆشنبیری ژنو پیاوو داناییان دەگۆڕێ - جا ئەگەر ئامۆژگاری کەڵکی نەبوو ئەوە دەتوانێ جێگا جودایی لەگەڵدا بکاو لەگەڵیدا نەنوێ؟ یان لەگەڵیدا بخەوێ بەڵام پشتی تێ بکاو، ئەمەش وەکوو سزایەکی نەفسی وایەو زۆر کاریگەرە لەدڵی ئافرەت، ئەگینا مەبەست ئەوە نییە کە چەند ڕۆژێك خۆیان بگرنەوە لە لەززەتی جیسمی! چونکە ئافرەت دەزانێ: کە لەبەرابەر پیاودا زەعیفەو ناتوانێ بەرەنگاری بکا، بەڵام تابزانێ کە مەکرو دەلالی لەدڵی مێردەکەی دا کاریگەرەو دەتوانێ قەرەبووی زەعیفی خۆی بکاتەوە پێی لێ هەڵدەبڕێو شوڵی لێ هەڵدەکێشێ! بەڵام کە هەستی کرد نازونوزو مەکرو دەلالی کاریگەر نییە تەنانەت کە خۆشی لە پیاو نزیك کردەوە پیاوەکە موبالاتی پێ نەکرد، ئەوە لە ناخەوە هەست بە زەبوونی خۆیو هێزو توانای پیاوەکە دەکا ئیتر شتی تر ڕەچاو ناکا جگە لەفەرمانبەرداریو هاتنەوە سەرڕێی ڕاست، ئەم سزایە بۆ پوچەڵکردنەوەی سەرپێچی کردنو ناچیزەبوونی ئافرەتەکەیە هیچ شتێکیش سەرپێچی کەر لەسەرپێی کردن ناگێڕێتەوە وەکوو ئەوەی کە سەرپێچی کەر هەست بە زەبوونی خۆی بکا.

ئایەتەکە باسی لێدانی ئافرەتیش دەکا، واتە کاتێك ئامۆژگاریو لەگەڵ نەنووستن کاریگەر نەبوو، پیاوەکە دەتوانێ بەلێدانێکی کەم ئێش ژنەکەی تەمبێ بکا! بەڵام ئەمە مانای وا نییە کە لێدان لە هەموو حاڵەتێکدا بۆ هەموو ژنێك دەگونجێ، ئەوە تا پێغەمبەری مەزنمان - کە خۆی لە هەموو کەس زیاتر فەرمانبەر دارو گەردنکەچی فەرمانەکانی قورئانە - لێدانی ئافرەت بە باش نازانێو بە عەیبەو نەنگی دادەنێو دەفەرموێ:

**{أما يستحى أحدكم أن يضرب أمرأته كما يضرب العبد يضربها أول النهار ثم يجامعها آخره)**

واتە: ئایا شەرم ناکا یەکێ لە ئێوە کە لەژنەکەی بدا وەکوو چۆن لەکۆیلە دەدا، ئایا شەرم ناکاو حەیا نایگرێ بەیانی لەژنەکەی دەداو شەویش لەگەڵی دروست دەبێ!.. لەلایەکی ترەوە لە پێغەمبەر نەبینراوەو نەبیستراوەو نەگێڕدراوەتەوە کە لە خێزانی خۆی دابێ.

ئەو لێدانەش کە ئایەتەکە باسی دەکا مەرجە دەبێ لێدانێکی سووك بێ‌و ئازاری پێ نەگا! بۆ حاڵەتی تایبەتی‌و زەروری بێ! بەڵێ کاتێك لێدان دروستە کە پیاوەکە هیچ چاری نەمێنێ‌و جگە لە لێدان رێگا چارەی تر نەبێ مەگەر تەڵاق، دیارە لێدانەکە لە تەڵاق دانەکە باشترە، چونکە لێدان زەرەر بە ژنەکە دەگەیەنێ بەڵام تەڵاقەدان زەرەرەکەی بۆ منداڵ‌و کەس‌و کاری ئافرەتەکەشە! بۆیەش لێدان دروستە چونکە برێ ئافرەت بە لێدان نەبێ زەوت ناکرێن‌و داناسەکێن!!

## پۆشاك (الحجاب):

زۆر لە نوسەرە ئەورووپییەکان مەسەلەی پۆشاکیان کردۆتە بنێشتە خۆشەی بنی ددانیان‌و لەم روانگەوە تانە لە ئیسلام دەدەن. بەڵام کە بەچاوێکی ورد بینییەوە سەیری مەوزوعەکە دەکەین دەبینین: قورئان لای لە چارەسەرکردنی بەشتێك لێ کردۆتەوە کە رەوشت‌و ناموس دەپارێزێ!

چونکە ئارەزۆو مەیلی شەهوەتی جینسی خەتەرناکترە لە زۆر زەرەری تری کە لەخۆرئاوادا یاساو قانوونی بۆ دادەنرێ‌و دەیانەوێ قەڵاچۆ بکرێن بەوەی کە لەبرێ کاتدا ئەندازەیەك دادەنرێ بۆ ئازادی‌و سنوردار دەکرێ.

ئەو دەقە قورئانییانەی کە باسی پۆشاکیان کردوە ئەمانەن:

**{قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ، وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ**

بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُوْلِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَاء وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ - سورة النور - ٣٠-٣١}.

لەم دوو ئایەتە پیرۆزەدا پەروەردگار فەرمانی بە ژن و پیاوی موسوڵمان کردوە کە لەعاست یەکتریدا چاو داخەن و بەشەهوەتەوە سەیری یەکتری نەکەن. مەبەست لەچاو داخستن ئەوەیە کە بەویستی شەهوەت و ئارەزۆ چاو بەرەڵڵا نەکرێ و بۆ ژنی بێگانە بڕوانێ! ئەگینا مەبەست ئەوە نییە مرۆڤ سەری نەوی بکا چاو لە زەوی بچەقێنێ و نەپیاو سەیری ئافرەت بکا نە ئافرەت تەماشای پیاو بکا! هەرگیز ئەمە مەبەستی ئایەتەکە نییە، چونکە ئەمە ناکرێ ناگونجێ و لەتوانادا نییە، هەر لەبەر ئەوە پەروەردگار کە فەرمانی بەچاو داخستن کردوە فەرموویەتی (یغضوا من أبصارهم) وشەی (من) لە زمانی عەرەبیدا مانای بڕێك = هەندێك دەگەیەنێ چونکە (من) بۆ تەبعیضە کەوابوو مەبەست ئەوەیە کە ژنێکی بێگانەتان بینی چاوی تێ مەبڕن، بەڵکوو چاوتان داخەن و بەشەهوەتەوە درێژە بە سەیرکردنەکە مەدەن!

مەبەست بەرستەی (ذلك أزکی لهم) لە ئایەتەکەدا ئەوەیە کە وشەی (أزکی) بەمانا گەشەکردن و زیادکردنە کەوابوو ماناکەی وارەها دەکرێ: چاو داخستن لەسەیرکردنی ژنی بێگانە بەشەهوەتەوە مەواهیبی مرۆڤ بەهێز دەکاو هێزو نیشاتی مێشك و هەستەکان بەرەوکاری بەسوود دەباو دەستکەوتی باش و بەنرخ بۆ گەل و نیشتمانی لەداهاتودا بەدەست دێنێ! شتێکی ئاشکراشە ئەو کەسانەی –چ ژن چ پیاو– کە چاو بازو سەیرکەرن و چاوی خۆیان لە سەیرکردن ناگرنەوە لەزۆر کاری گرنگ و بە سوود بێ بەش دەبن و دەکەونە گێژاوی واوە کە پەشێمانی لەدوایە.

مانای (إلا ما ظهر منها) ئەوەیە کە دروستە ئافرەت دەم و چاوو دوو دەستی تامەچەك بەدەرەوە بن و بۆی هەیە ئەم دوو ئەندامەی لەلای پیاوی بێگانە روت بن بەمەرجێك دڵنیا بێ کە دەرخستنی ئەم دوو ئەندامە نابنە فیتنەیی بەڵام

قژی سەر بەهیچ جۆرێك دروست نییە بە دەرەوە بن، ئەمە رای زوربەی زانایانی ئیسلامە.

مەزهەبو رێبازی ئیمام ئەبو حەنیفەو رای پەسەندی شافیعیو رای فتوا پێدراوی ئیمام مالیك ئەوەیە کە دروستە بۆ ئافرەت لە رێبازو قوتابخانەی فرمانگەو شوێنی تردا دەمو چاوو هەر دوو دەستی تا مەچەك لەلای پیاوی بێگانە بە دەرخا!! هەڵگرانی ئەم رایە پێیان وایە کە مەبەست بەم بەشەی ئایەتەکە کە دەفەرموێ:

{وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا}.

ئەوەیە کە نابێ ئافرەت جگە لەو ئەندامانەی – کە بەعادەت بە دەرەوەن – ئەندامی تری بەدەربخا. ئەو ئەندامانەی بە عادەت بەدەرەوەن (دەمو چاوو دوو دەستە) هەر ئەم زانا پایەبەرزانە فەرموویانە کاتێك ئەمە دروستە کە لەفیتنەیی ئەمین بێ تەنانەت ئەگەر هاتو دەرخستنی دەمو چاو دەبووە هۆی فیتنەو سەرنجی مرۆڤی سەرسەری رادەکێشا دەبێ دایانپۆشێ!!

لیژنەی فتوای مامۆستایانی زانکۆی (الازهر) لە گۆڤاری (الازهر)دا دەڵێ: لەژێر رۆشنایی ئەم دوو قاعیدە گەورەیەی فیقهی ئیسلامی:

یەکەمیان: (یسر الدین وسماحته) – ئاسانی ئایینو لێبوردوویی.

دووەمیان: (سد ذرائع الفساد) = بەربەستکردنی هۆکاری فەساد. پێمان وایە ئەو رایە پەسەندە کە دەڵێ: دەمو چاوو دوو دەستی ئافرەت تا مەچەك عەورەت نین... هیچ خراپییەکی تێدانیە ئەگەر لای پیاوی بێگانە دەریان بخا بۆ ئەوەی تووشی هەڵوێستی نالەبارو نەگونجاو نەبێ، لەمامەڵەی گشتیو تایبەتی خۆی دا هەندێك سەربەست بێ! بەڵام ئەگەر لە فیتنەو شەڕ ترسا دەبێ هەموو جیسمی داپۆشێ تا بەرگری لە بڵاوبوونەوەی فەساد بکات.

لەهەمان کاتدا لیژنە رای وایە کە بەدەرخستنی دەمو چاوو دوو دەست بە میکیاجکراوی حەرامەو شەریعەتی ئیسلام دژی وەستاوە، بە دەرخستنی دەمو چاوو دەست کاتێ دروستە کە لەسەر شێوەی سروشتی خۆیان بن. هەر بەناوی

لیژنەشەوە داواکارین لە موسوڵمانان (مەبەستیشمان خۆشبەختیانە) کە بە ئەدەب و ڕەوشتی ئیسلامی خۆیان ئارایش بدەن و هەوڵ بدەن کچ و ئافرەتیان بە گوێرەی ئەخلاقی ئیسلامی پەروەردە بکەن و تێیان بگەیەنن کە سەرپێچیکردنی ئەم ئەدەبە دەبێتە هۆی ڕق هەڵسانی خوداو نارەزامەندی لێیان! ئەمە جگە لەوەی ئەخلاق و ڕەوشتی خێزان تێك دەداو کیپانی کۆمەڵ دەڕوخێنێ! پوختەی ئەوەی باسکرا ئەوەیە قورئان نەهی کردوە کە ئافرەت خۆی بڕازێنێتەوەو دەربچێ بۆ ناو پیاوانی بێگانەو بە ئارەزۆی خۆی کێی بوێ قسەی لەگەڵ بکاو هاوڕێیەتی لەگەڵدا بگرێ!!

بەڵام بۆی هەیە لەگەڵ خێزان و کەس و کاری خۆیدا سەر لە ماڵی جیران و خزم و کەس و کاری خۆی بدا لە دانیشتن و کۆمەڵی خێزانیدا ئەگەر پیاوی بێگانەشی تێدابێ قەیناکا بەمەرجێك لە فیتنەیی و شەڕ ئەمین بێ. ئومێدەوارین موسوڵمانان حیکمەتی ئەوە بزانن کە قورئان ئاوا بەو جۆرە نەهی لە بەرەڵڵایی ئافرەت کردوەو دژی وەستاوە چ مەبەستێکی بەرز و پیرۆزی هەبووە!

بێگومان خەتەری شەهوەتی جینسی شتێکە پێویستە ئایین چاری سەرەکی بۆ بدۆزێتەوە، ئاشکراشە قورئان باشترین چارەسەری بۆ دۆزیوەتەوە.

## دروستە پیاوێك زیاد لە ژنێك بێنێ (اباحة تعدد الزجات):

زۆر لە نووسەرە خۆر ئاواییەکان و رۆژ هەڵاتناس و کۆمەڵناسەکان دەربارەی فرە ژن هێنان باس و لێکۆڵینەوەیان نوسیوەو هێرشی ناڕەوایان کردۆتە سەر ئیسلام و پێیان وایە کە زیاد لەیەك ژن هێنان داب و نەرێتێکی نالەبارو نەشیاوە، ئامۆژگاری لە موسوڵمانان دەکەن کە واز لەو عادەتە بێنن و قەڵاچۆی بکەن، تەنانەت برێك نووسەر پێشکەوتنی موسوڵمانی پەیوەست کردوە بە وازهێنان لەم عادەتە.

لەراستیدا فرەژنی (تعدد الزجات) ئیسلام داینەهێناوە، بەڵکوو فرەژنی یاسایەك بووە، زوربەی ئایینە ئاسمانییەکان و یاسا دانراوەکانی ئادەمیزاد ڕێگەیان

پێ داوە! عەرەبەکانیش پێش هاتنی ئیسلام لەهەموو گەلو نەتەوەیەك زیاتر پابەندی یاسای فرە ژنی بوون کە ئیسلام هات ویستی میانەڕەوی لە مەوزوعەکەدا بکا سنوورێکی بۆ فرەژنی داناو فەرمانی کرد کەس لێی تێپەڕ نەکا، چەند مەرجێکیشی دانا بۆ ئەوانەی کە دەیانەوێ زیاد لە یەك ژن بهێنن! جا ئەگەر ئەم مەرجانە هاتنە دی زەرەرو زیانی فرەژنی نامێنێ! وەکوو لەمەودوا رونی دەکەینەوە.

## جاری وا هەیە فرەژنی لەبەرژەوەندی ئافرەتە:

ئایینی ئیسلام فرەژنی بەرەوا داناوە، نەك فەرزی کردوە، دیارە جیاوازی هەیە لەنێوان ئەوەدا شتێك بە دروستو رەوا بزانی لەگەڵ ئەوەی بەزۆر فەرزی بکەی‌و بیسەپێنی.. ئەمەش جۆرێکە لەو بۆچوونە هەڵانەی نووسەرە خۆر ئاواییەکان لێی دەدوێن. کاتێك تۆ نووسراوەکانیان دەخوێنێتەوە یان گوێ بۆ قسەکانیان رادەگرێ، وا هەست دەکەی کە ئیسلام لەسەر هەموو موسوڵمانێکی فەرزکردوە کە زیاد لە ژنێك بهێنێ‌و هەرگیز رازی نییە کە پیاو بە تاقە ژنێك قەناعەت بکاو تا لەژیاندایە خۆ بەتاکە ژنێکەوە هەڵەو گیر بکا! لەراستیدا ئەمە بۆچونێکی هەڵەیەو ئیسلام فرەژنی فەرز نەکردوە بەڵکوو رێگای پێ داوە! دیارە جیاوازی نێوان ئەم دوو هەڵوێستەش بەئەندازەی جیاوازی ئاسمان‌و رێسمانە.

ئیسلام رێگای داوە کە پیاو زیاد لە ژنێك بهێنێ‌و لەیەك کاتدا زیاد لەژنێکی ببێ، چونکە ئیسلام دەیەوێ کۆمەڵگایەکی نموونەو ناوازەو راستاڵانە بەدی بێنێ! دەیەوێ موجتەمەعێك دروست بکا پیاوە بیر تیژو وردبینەکانی جیهان تێی بگەن. چونکە دەزانێ بڕێ پیاو هەن ئارەزۆیان زۆرەو دەسەڵاتی نەفس‌و ئارەزۆبازی خۆیان نییەو هیچ شتێك نییە ئەوان بگێڕێتەوە لە دابینکردنی ئارەزۆکانیان، بۆیە بۆ ئەو جۆرە پیاوانە رێگای داوە زیاد لە ژنێك بهێنن، نەك هەر لەبەر خاتری بەرژەوەندی پیاوەکە، بەڵکوو بۆ ئەوەی ئافرەتیش لەشەڕو فیتنەی ئەو جۆرە کەسانە رزگار بکا!! بەڵێ وێنەی ئەو جۆرە پیاوە شەهوەت سوارانە لە کۆمەڵگای خۆر ئاوادا کە فرەژنی تێدا یاساغەو بەتاقە ژنێك داناکەون

ناچار دەبن ئافرەتێکی تر یان زیاتر بەدۆست بگرن و لەگەڵیان رابوێرن! جا ئەو ژنانەی کە دەبن بە دۆستو یارو خۆشەویست بە شێوەیەکی ناشەرعی دەبنە چینێکی چەوساوەو خۆ فرۆش و خۆ لە بەرکەرو بازرگانیکەر بەلەش و لاری خۆیان، بێبەش لەهەموو مافێکی ژن و مێردایەتی!

لەراستیدا ئەوانە ژن و خێزانی نایاساییین و ستەم لێکراوو چارە رەشن. بێگومان ئەو زەرەرو زیانەی لەم رووەوە تووشی ئافرەت دەبێ لە ئەندازەو پلەیەکی دیاریکراودا ناوەستێ چونکە ئەم ئافرەتە کە دەبێتە دۆستی پیاوەکەو لەگەڵیدا رادەبوێرێ هیچ پەیمان و عەقدێکی دادگاییان لە نێواندا نییەو هەر کاتێ پیاوەکە ویستی ئافرەتەکە تڕۆ دەکاو وازی لێ دێنێ و بێ ئەوەی مافی ئەوەی هەبێ ئەگەر منداڵی لێ بوو بوو نیسبەتی بۆ لای ئەو بداو بڵێ ئەوە باوکیەتی و لەئاکاما نەفەقەو بژیوی لێ بستێنێ.

خوێنەری هێژا! غایەو مەبەستی ئیسلام لە فەرمژنیدا پاراستنی ئافرەتە بۆ ئەوەی نەکەوێتە حاڵەتی چارەڕەشی ئاوەهاوە هیچ مافێکی خۆی نەدرێتێ و زەمانەتی کۆمەڵایەتی نەبێ و دەربکرێ و بچێتە خانەی ئافرەتانی بێ رەوشت و سەڵیتەوە.

بەڵێ ئیسلام دەیەوێ لە هەموو حاڵ و کاروبارێك دا واهەڵس و کەوت لەگەڵ ئافرەت بکرێ کە خێزانێکی شەرعی و یاساییەو مافی دیاریکراوی خۆی هەیە، دەی باشە کام رێگایە بۆ ئافرەت باشترە؟ کام یاساو شەریعەت باشتر مافی دەپارێزێ و رێزی لێ دەگرێ؟ ئایا ببێتە ژنی دووەمی پیاوێکی بەتواناو نەفەقەی خۆی و منداڵی لێ بستێنێ و ئەگەر پیاوەکە مرد میراتی لێ بگرێ و منداڵەکانیش میراتی بگرن و بێباوك نەبن؟! یان ببێتە ئافرەتێکی لەش و لار فرۆش و هەر کاتێ پیاوەکە لێی تێر بوو بەرەڵلای بکاو هیچ مافێکی نەدرێتێ و میراتی نەگرێ و منداڵیشی زۆڵ و بێ باوك بن و میراتی نەگرن خۆی و منداڵی ببنە کۆڵباری کۆمەڵگاو تووشی چارەڕەشی ببن!!

## بەڵگەی زانستی بۆ ڕەوایی فرەژنی:

بەڵگەی زانستی لەسەر ڕەوایی فرەژنی زۆرن، بڕێکیان دەگەڕێنەوە بۆ هۆکارە تایبەتمەندییەکانی سروشتو بڕێکشیان دەگەڕێنەوە بۆ پێویستییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی. هۆکارە تایبەتمەندییەکانی سروشت بەڵگەی ئەوەن کە فرە ژنی یەکێکە لەو دیاردانەی جاری وا هەیە سروشت خۆی فەرزی دەکا، چونکە هەموو کاتێ ژمارەی ژنان لەهی پیاوان زۆرترە!! ئەوەتا لەسەر ژمێرکردنی سالآنەو غەیری سالآنەدا دەرکەوتووە کە لای هەموو گەلو نەتەوەیەك ژمارەی ئافرەت لە ژمارەی پیاو زیاترە، ئەمە لەکاتی ئاساییو ئاسایشدا وەهایە، بێگومان لەکاتی شەڕدا ڕێژەی ژنان زیاد دەکاو پیاوان کەمتر دەبنەوە.

ژمارەی ئافرەتان لە زوربەی وڵاتە خۆر ئاواییەکان کە شەڕی تێدا هەڵگیرساوە زۆر زۆرترە لە ژمارەی پیاوان، هەموو کاتێکیش ئەو شەڕە وێرانکاریانە بوونەتە بەشێك لە ژیانی دانیشتوانو ڕۆژ بە ڕۆژ وا دەکا کە ئەو ڕێژە زیادبوونەی ژنانو کەم بوونەوەی پیاوان لە بڕەو دابێ، ئێستا چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم ژمارە زۆرەی ئافرەتان بووەتە پرسیارێك وەڵامەکەی ڕۆشنبیرو بیرتیژەکانی ئەوروپای خستۆتە مقۆمقۆوە، تا ئێستا چارەسەری بنبڕکەریان بۆ نەدۆزراوەتەوە، هەموو کاتێکیش سروشتی ئادەمیزاد هاوار دەکاو داوای دابینکردنی پێویستییەکانی دەکا، ئەگەر لە کاتێکی موناسبدا حەللێکی بۆ نەدۆزرێتەوە بێگومان زیاتر شەڕو فەسادی بێ ئەخلاقیو داوێنپیسی بلآو دەبێتەوە، زیاتر ئەو دیاردە ناشیرینەی کە بووەتە پەڵەیەکی ڕەش بە نێو چاوانی ئافرەتی خور ئاواوە پەرە دەستێنێ!!

ئەو هۆکارانەی کە پێویستیاتی ژیانی کۆمەڵایەتی دەیچەسپێنێ ئەوەیە جاری وا هەیە ژن تووشی نەخۆشییەکی موزمین دەبێ، یان نەزۆك دەبێ یان ئافەتێکی تووش دێ هەموو موغرەیاتی هەستیو دەروونی لێ دادەڕنێ، یان پیاوەکە وا هەست دەکا کە تاقە ژنێك ئەو تێرناکاو لە گوناهو داوێن پیسی

ناپارێزێ، یان پیاوەکە زۆر بە زەوقەو ژنەکە نەفس مردووە یان وادەبێ ماوەی کەوتنە نێو عادەی مانگانەی ئافرەتەکە زۆرەو ئاسایی نییە یان..هتد.

جا ئەگەر ئیسلام ڕێگا نەدا پیاو لەم کاتانەدا زیاد لەژنێك بێنێ ئەوە لەوانەیە پیاوەکە کاری نەشیاوو لادینی لێ رووبداو داوێنپیسی رەچاو بکا، یان ناچار بێ ئەم ژنە تەلاق بداو ژنێکی تر بێنێ ئاشکراشە تەلاقدان زیاتر زەرەر بە ئافرەت دەگەیەنێ لەوەی کە ژنێکی بەسەر بێ!

## حوکمەکانی ئیسلام دەربارەی فرەژنی:

لەوە پێش باسمانکرد کە فرە ژنی لەناو عەرەبەکاندا پێش ئیسلام باوبوو لێرەدا بەس ئەوەندە زیاد دەکەین کە بڵێین: زۆر لەو عەرەبانەی موسوڵمان بوو بوون زیاد لە ئافرەتێکیان لەژێر نیکاحدا بوو تەنانەت هی وایان هەبوو موسوڵمان بوو بوو دە ژنی هەبوون..! کە ئیسلام هات ئەم یاسایەی بەتاڵ نەکردەوە بەڵکوو تەعدیلی کردو ڕێکی خست، دوای ئەوەی فرەژنی بەبێ سنوور ڕێگای پێ درابوو، ئیسلام هات سنوورێکی بۆ دانا، لەبارەی چەندییەتو چۆنییەتەوە ئەحکامی بۆ دانا. لەبارەی چەندییەتەوە سنووری بۆ دانا بەوە کە ئەوپەڕی تا چوارژنی ڕێگەدا پیاو بیان هێنێو نابێ لەکاتێکدا پیاوێك زیاد لە چوا ژنی لەژێر نیکاحدا بێ. لەبارەی چۆنیەتیشەوە سنووری بۆ دانا بەوە کە چەند مەرجێکی داناوە، هەتاکو برێ لەو مەرجانە نەیەنە دی رەوانیە ژنی تر بێنێ، دەبێ دڵنیا بێ کە زوڵمو ستەم لە ژنە کۆنەکەی ناکا دادپەروەرانە رەفتاریان لەگەڵ دەکا. قورئان دەفەرموێ:

{فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُواْ فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَلِكَ أَدْنَى أَلاَّ تَعُولُواْ - سورة النساء - ٣}.

واتە: لەو ژنانەی بۆتان حەڵاڵن مارە بکەن ئەوەندەی دەتانەوێ لە یەکێکەوە تا چوار لەوە زیادی مەکەن ئەگەر ترسان کە بە عەدالەت نەجوڵێنەوە لەکاتی مارەکردنی زیاد لە ژنێك ئەوە قەناعەت بە یەك ئافرەت بکەنو ژنی تر مارە

مەکەن، یا هەر ژن مەهێنن و ئیکتفا بە کەنیزەکەکانی مڵکی خۆتان بکەن، ئەم یاسایە باشترە بۆ ئەوەی زیادە ڕەوی نەکەن و لە سنوور لانەدەن و نەفەقەو حەق و حقوق بدەن بە ئەوانەی بژێویان لە ئەستۆی ئێوە دایە!

ئایەتە قورئانییەکە ئەمین بوونی لە زوڵم بە مەرجی سەرەکی داناوە بۆ مارەکردنی زیاد لە ژنێك، زوڵمەکەشی بەهیچ شتێکەوە موقەیەد نەکردوە کەوابوو ئەگەر ترسی هەبوو زوڵم لە خێزانەکەی بکا یان لە خزمەکانی یان لەخۆی بکا هەروەها ئەگەر ترسی هەبوو لە نەفەقەو بژێوو سوکناو پێکەوە ژیانیشدا زوڵمی لێ بکا یان لە بابەتی ژن و مێردایەتیدا زوڵمی لێ بکا ئەوە دەبێتە هۆی ئەوە کە زیاد لە ژنێك بۆی ڕەوا نەبێت.

ئەوەش لەیاد نەکەین کە ئایەتەکە هەر چەند فرەژنی ڕەوا بینیوە ئەوەشی رونکردۆتەوە کە هەرکەسێ ترسی زوڵمی بوو – نەك یەقین – نابێ ژنی تر بەسەر خێزانی بێنێ، لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە دەقە قورئانییەکە بازنەی فرە ژنی زۆر تەنگ کردۆتەوە لەم ڕووەوە کە تەنها هەبوونی ترس لە زوڵمکردنی کردوە بە بەهانەی ڕەوا نەبوونی ژن هێنانی تر! دەی با هەرکەسێك ئیسلام تاوانبار دەکاو بەهیچ و خۆڕایی تانەی لێ دەدا با سەری خۆی لەبەرد بدا!.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خۆی و برێ لە هاوەڵانی زیاد لە ژنێکیان هەبووەو بەو پەڕی عەدالەت و پاراستنی سنوورەکانی خودا هەڵس و کەوتیان لەگەڵدا کردون و گوێڕایەڵی وەسیەت و ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەریان کردوە کە فەرموویەتی:

« مَنْ كَانَتْ لَهُ امْرَأَتَانِ يَمِيلُ لإِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَجُرُّ أَحَدَ شِقَّيْهِ سَاقِطاً أَوْ مَائِلاً .

واتە: کەسێك دوو ژنی هەبن و زیاتر مەیلی لای یەکێکیان بکا ڕۆژی قیامەت دێ بۆ دەشتی مەحشەر لایەکی خوارو خێچە؟!!

خوێنەری هێژا دەبێ ئەوەش بزانین کە ئەو عەدالەتەی ئیسلام داوای دەکا عەدالەتی ڕواڵەتییە نەك خۆشەویستی دڵ، چونکە خۆشەویستیی دڵ کەس

ناتوانێ دەسەڵاتی بەسەردا هەبێ، تەنانەت پێغەمبەریش نەیتوانیوە لە خۆشەویستی دڵ و دەروونیدا بە یەکسانی سەیری خێزانەکانی بکا!! لە عائیشەوە گێردراوەتەوە فەرموویەتی: پێغەمبەر بە عەداڵەت لای خێزانەکانی دەخەوت و دەیفەرموو! خودایە! ئەمە کە بەیەکسانی هەڵس و کەوت لەگەڵ خێزانەکانمدا دەکەم توانای خۆمەو ئەمەندە دەتوانم ئیتر لۆمەم مەکە لە شتێکدا کە دەسەڵاتی تۆیەو من تێیدا بێ دەسەڵاتم.. دیارە پێغەمبەر مەبەستی خۆشەویستی دڵ و دەروون بووە، هەر ئەم خۆشەویستییەی دڵیشە کە قورئان دەفەرمویێ:

**{وَلَن تَسْتَطِيعُواْ أَن تَعْدِلُواْ بَيْنَ النِّسَاء وَلَوْ حَرَصْتُمْ فَلاَ تَمِيلُواْ كُلَّ الْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَالْمُعَلَّقَةِ - سورة النساء - ١٢٩}.**

واتە: ئێوە ناتوانن لەنگەری دادپەروەری بەتەواوی رابگرن لە نێوان ژنەکانتانا، با مەبەستیشتان بێ، کەوابێ وامەکەن هەرچی خۆشەویستیتان هەیە تەرخانی بکەن بۆ ژنێکتان ئەوی تریشتان بەرەڵڵا بکەن، نە بەژن حیساب بکرێ و نە تەڵاق دراویش بێ!؟ ئا ئەمەیە حوکم و تەشریعی ئیسلام دەربارەی فرەژنی، وە موسوڵمانان لە رۆژگاری زێرینیان و سەردەمی سەعادەتیان دا ئاوا بەو شێوەو لەژێر رۆشنایی ئامۆژگاریەکانی خوداو پێغەمبەر دا رەفتاریان لەگەڵ خاوو خێزانی خۆیاندا کردوە، بەڵام بەداخەوە لەم رۆژگارەدا ئەو گیانە ئیسلامییە نەماوە، بەهۆی ئەوەوە کە زوربەی نەتەوە موسوڵمانەکان نەزانی و دوور بوون لە ئیسلام و کارنەکردن بە حوکم و یاساکانی ئەو ئایینە بوەتە داب و نەریتیان و نیزامی فرە ژنی لێیان بوەتە موشکیلەیەکی سەرەکی و چەندەها فەسادو گێرەو کێشەی لە خێزان و ماڵ و منداڵدا هێناوەتە دی.

هەر لەبەر ئەوە مامۆستا (محمد عبده) رای وایە: کە نیظامی فرە ژنی پەیوەندبکرێ بە دوو مەرجەوە عەداڵەت و هەبوونی توانا لەسەر دابینکردنی بژێو، هەر ئەم رایەی مامۆستا (محمد عبده) بوو کە لێپرسراوانی میصری هۆشیارکردەوە بۆ ئەوەی یاسایەك دابنێن بە گوێرەی تواناو بەرێ و رەسمی قورئان و لەچوارچێوەی شەریعەتی ئیسلامدا چارەیەکی گونجاو بۆ فرە ژنی

بدۆزنەوە، هیچ شتێکی واش لە قورئاندا نییە کە بەرگری بکاو نەهێڵێ لێپرسراوانی موسوڵمان ڕێبازێکی ئاواهی بگرن‌و چارەسەری کێشەی خۆیانی تێدا بکەن!

ئەوە ئەو ڕێبازەیە کە ئیسلام قەصدی کردوە بەوە کە فرە ژنی بە ڕەوا زانیوە، تا بتوانێ سەیتەرە بکا بەسەر هەر شتێکدا کە سەر دەکێشێ بۆ فەوزاو سەرکەشی ئارەزۆی ئاژەڵێ. چونکە ئیسلام نیظامێکی گشتی‌و عالەمییە، بۆ خۆر ئاواو خۆرهەڵات‌و هەموو شوێنێکی ئەم جیهانە بۆ دانیشتوانی ناوچەی ساردو گەرم‌و مام ناوەندییە بۆیە دەبێ یاساکانی فراوان‌و گشتی بن‌و بۆ هەموو کەس بگونجێ‌و بەکاری هەموو کاتێك بێ.

## تەڵاق‌و حوکمەکانی (الطلاق واحكامه):

تەڵاق لە شەریعەتی ئیسلامدا بریتییە لە لابردنی قەیدی نیکاح، - ئێستا یا لەمەدوا — بەم جۆرە بە عیبارەتێکی صەریح‌و ئاشکراو ڕاستەوخۆ قەیدەکە لابەرێ، وەکوو ئەوە پیاو بەژنەکەی بڵێ: (أنت طالق) تۆ تەڵاق دراوی، تۆم تەڵاق داوە، تۆ تەڵاقت بکەوێ — یان بەکینایەو درکە پێی بڵێ: تۆ لەمن حەرامی، تۆ ژنی من نیت.. هتد. یان لەسەر داخوازی ئافرەتەکە قازی پێی بڵێ‌و بەم ڕستانەی پێشوو — صەریح یان درکە — ئافرەتەکە لەژێر نیکاحی پیاوەکە ڕزگار بکا!

حیکمەت لە تەڵاق ئەوەیە: یەکەم لەلای ئەو شەریعەت‌و یاسایانەی لەبەر ناعیلاجی بەڕەوای دەزانن‌و مەبەستیان ئەوەیە وەچەو نەوە بکەونەوەو بنەبڕ نەبن، چونکە وا دەبێ ئافرەت نەزۆك دەبێ‌و منداڵی نابێ پیاوەکەش هەژارو نەدارایەو ناتوانێ ژنێکی تر بێنێ، لە هەمان کاتیشدا حەزی لە منداڵەو پێی خۆشە وەجاخ کوێر نەبێ، منداڵێکی هەبێ کە پیر بوو یارمەتی بداو کە مردیش ناوەکەی نەکوژێنرێتەوە. ئەمە بۆ کەسێك کە بڕوای بە شەریعەتێك بێ فرە ژنی تێدا دروست بێ!!

یەکێکی تر لە حیکمەتی تەلاق لابردنی زەحمەتو نارەحەتییە لەسەر ژنو مێرد، چونکە وا دەبێ یەکێکیان رەوشتێکی ناشیرینی تێدایەو بەدڵی ئەوی تریان نییە، یان تەبیعەتو بۆچونیان جیاوازەو دڵیان لێك هەڵ دەنگوێو خۆشەویستییان لەنێواندا نامێنێ، ئاشکراشە کە خێزان لەسەر خۆشەویستی کۆنەبووەوەو رێزی رای یەکتریی تێدا نەگیرا لێك هەڵدەوەشێو کامەرانی تێدا نامێنێ!

هەر بۆیەشە دەبینین زوربەی وڵاتە خۆرئاواییەکانو وڵاتە یەکگرتووەکان ناچار بوون شتێك دابنێن لەوەپێش پێی نارازی بوونو بەتاوانیان دادەنا بۆ ئیسلام، ئەوە بوو یاسای (الزواج المدني) ژن مارەکردنی شارەستانیانەیان داهێنا کە یاسای تەلاقیشی تێدایەو کردیان بە یاسایەکی بەردەوامو نەگوڕدراو لە قانوونی شەخصی وڵاتانداو کردنیان بە ئەصڵو بنەمایەك لە شێوەی شارەستانیو پێشکەوتنیان هەر چەندە لەگەڵ راوو بۆچوونی ئایینییان یەك ناگرێتەوە.. لەلایەکی ترەوە تەلاق شتێکی تازە داهاتوو نیەو ئیسلام دایهێنابێ. بەڵکوو یاسایەکی کۆنەو پێش ئیسلام کاری پێکراوە. پیاو بە ئارەزۆی خۆی تەصەروفی تێدا دەکردو ژن مافی ئەوەی نەبوو بەهیچ نەوعێك داوای تەلاق بکا، بەو حاڵە مایەوە تا سەردەمی دەوڵەتی رۆمان کەوای لێهات ژن تەلاقدان بە تەواوی پەرەی سەندو بڵاو بۆوە هەر بەم شێوەیە قانوونو یاسای عیبری کۆنو ئەسینییەکان دانرانو رەفتاریان پێکرا، پاشان کە ئایینی موسەوی – جولەکە – هات کەمێك لە بەرژەوەندی ئافرەت بوو بەڵام ئەویش ژن تەلاقدانی بەڕەوا بینی بەم سێ مەرجانە.

١- زیناکردن.

٢- نەزۆکی.

٣ لەکەداریی سەروسیماو شێوەو شێواز.

بەڵام ئایینی مەسیحی رای پەسەندو جەماوەر زۆری لە نێو پیاوانی کەنیشتە ئەوە بوو – تەنانەت لە حاڵەتی زیناکردنیش دا – تەلاقدان حەرامو یاساغ بوو،

ئەگەر ئافرەتێك زینای بکردایە پیاوەکە بۆی هەبو کەلێی دوور بکەوێتەوە هەر کاتێکیش ژنەکە تۆبەی بکردایەو پەشیمان بوایەوە دەیتوانی بیباتەوە بۆ لای خۆیو رێك بکەونەوە؟! هەروەکوو چۆن پیاوەکە بۆی نەبوو کە ژنێکی تر بێنێ، واتە: زیناکردنی ژن دەبووە هۆی ئەوە کە ژنو پیاو هەر بە رواڵەت لێك دوور بکەونەوە، ئەمە بە مەرجێك پیاوەکە داوای بکردایە!؟ بەلاّم ئەگەر پیاوەکە زینای بکردایە هیچ باس نەبوو.

لێك دوور کەوتنەوەی ژنو مێرد پەیوەندی نێوانیانی نەدەپچڕاند، بەس دەبووە هۆی ئەوە کە ژنو مێرد واجباتی ژنو مێردایەتی خۆیان ئەنجام نەدەن، لەگەڵ ئەوەشا سەرپەرشتیاریی پیاو بەسەر ژنەوە هەر بەردەوام بوو!!

لێك دوورکەوتنەوەی ژنو مێرد کە پیاوانی کەنیشتە یاساکەیان دانابوو، لەگەڵ تەلاقدا هیچ جیاوازییەکی نەبوو جگە لەوە کە بەناو عەقدی نیکاحەکە پایەدار دەبوو بەلاّم لەراستیدا پەیمانو نیکاحەکە پوچەڵ دەبوەوە چونکە ژنو مێردەکە لێك دووردەکەوتنەوە. لە نێوان ژنو مێردەکەدا – جگە لە دووشت هیچی تر نەدەمایەوە:

یەکەمیان: مانەوەی نەفەقەو بژێو لەسەر پیاوەکە.

دووەمیان: داوێنپاکیو پارێزگاری شەرمگای خۆیان، سەرەڕای ئەوەش پیاوەکە نەیدەتوانی ژنێکی تر بێنێ! کەوابوو وەکوو (المسيو بلانيول) دەڵێ: ژنو پیاوەکە بەزۆرەملێ خۆیان دەکرد بە عازەبو بەبێ هیوا ژیانیان بەسەر دەبرد!

ئەمجار هەر ئەم پیاوە قانوونییە فەرەنسییە دەڵێ: بێگومان زوربەی کات ئەوەی کە دەبووە هۆی ئەوە کە مانەوەی ژیانی ژنو مێردایەتییان تێك بداو لانەی خێزانییان بڕوخێنێ زیناکردنی یەکێکیان یان هەردووکیان بوو.

دەی باشە وێ دەچێ ئەگەر ژنو مێرد لەسەر تاوانێکی ئاوا لێك دورخرانەوە واز لەو کردارە بێنن؟! یان دەبوو ژنێکی بەرەڵاکراوو واز لێهێنراو چ پلەو پایەیەکی کۆمەڵایەتی بمێنێ؟!؟ یان دەبێ چ پەلەو پایەیەك بۆ ئەو پیاوە بمێنێتەوە کە ژنەکەی ئاوا یاری بە شەرەفو ناموسی بکا؟! ناوی ئەو پیاوەو

منداڵەکانی هەڵدەگرێ، لە هەموو شوێنێك ژنەکە بەناو پاڵ دەدرێتە پیاوەکەو نەفەقەشی لێ دەستێنێ‌و هەموو کاتێکیش لەوانەیە فەضیحەیەکی تری بێ ڕەوشتی لێ ڕوو بدا.

ئەمجار دەڵێ: لێك جیاکردنەوەی ژن‌و مێرد وەکوو لای ئەو ئایینانە باوبووە، دەدرێك لانابا دەردێکی تر دێنێ!! چونکە هەرگیز شێوەو شێوازێك نییە کە ژن‌و مێردێك یەکتریان ناخۆش بوێ‌و بتوانن بەرێك‌و پێکی پێکەوە ژیان بەسەر بەرن، بەڵکوو ڕوداوی وایان لێ ڕوو دەدا کە ژن‌و مێردەکە لە ژیان نائومێد بن!! تەنانەت ژن‌و مێرد دوای لێك دورکەتنەوە زیاتر ڕێگایان بۆ دەکرێتەوە کە خراپەکاریی تر ئەنجام بدەن!

## پوختەی تەڵاق لە ڕوانگەی ئیسلامەوە (روح الطلاق في الإسلام):

ئاینی ئیسلام تەڵاقی بەلاوە ڕوایە، هەرچەندە دژیشی وەستاوەو بەلایەوە کارێکی خراپەو نەفرەتی لێ کردوە. لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی:

«أَبْغَضُ الحلال عند اللَّهِ الطَّلاَقِ . رواه ابن ماجه. واتە:

دزێوترین حەڵاڵ بەلای پەروەردگارەوە تەڵاقە.

جا کە ئیسلام ڕێگای تەڵاقی داوە، مانای وانیە کە مێردی موسوڵمان بۆی هەیە بەبێ قەیدو شەرت بە ئارەزۆی خۆی ژنەکەی تەڵاق بدا... چونکە ئەمە دەبێتە هۆی ناشیرینکردنی یاسای تەڵاق لە ئیسلام دا. قورئانی پیرۆز چەند هۆکارێك باس دەکا کە دەبنە هۆی ئەوەی تەڵاق پێویست بێ، بەڵام نایان ژمێری‌و لەچەند ڕووداوێکی تایبەتیدا کۆیان ناکاتەوە، نەتەوە خۆر ئاواییەکانی کە تەڵاقیان بەلاوە ڕەوایە نایانتوانیوە لەسەر هۆکارەکانی ڕێك بکەون، دەی دەبێ چۆن لە ئایینێکی گشتی فراوانی وەکوو ئیسلام کە بۆ هەموو چەرخەکان‌و نەتەوە جیاجیاکانی سەرزەوی هاتووە دەتوانرێ هەروا بە ئاسانی هۆکارەکانی

تەلاق رون بکاتەوە؟! بەتایبەتی حاڵو زەمانو هەلوێستو هۆکارەکان بەگوێرەی شوێنو سروشتی ئادەمیزاد دەگۆڕێن!!

یەکێك لە هۆکارەکانی تەلاق کە لە قورئاندا باس کراوە ئەوەیە کە ژنو مێرد بیانەوێ لێك جیاببنەوەو ژیانی ژنو مێردایەتی کۆتایی پێ بێنن! قورئان مەبەستی ئەوە نییە کە هەموو ناکۆکییەك سەربکێشێ بە تەلاقو بەو ڕوداوە کۆتایی پێ بێ. بەڵکوو ئەوەی کە قورئان ئاماژەی بۆ کردوە ئەو ناکۆکییەیە کە محاڵە ئەو ژنو مێردە بەو حاڵەوە بەیەکەوە هەڵکەن.

خوای گەورە ئەم ناکۆکییەی بە (شقاق) ناو بردووە، مانای (شقاق)یش واتە: لێکترازانو بوون بە دووپارچەی وا کە یەکدی گرتنەوەیان چاوەڕوان نەکرێ! قورئان دەفەرموێ:

{وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُواْ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَا إِن يُرِيدَا إِصْلاَحًا يُوَفِّقِ اللّهُ بَيْنَهُمَا - سورة النساء – ٣٥}.

لەم ئایەتەدا قورئان یەکسانی خستووە لە نێوان پیاوو ژندا وشەی (شقاق بينهما) ئەوە دەگەیەنێ کە هەریەکێ لە ژنو مێرد بۆی هەیە داوای هەڵوەشاندنەوەی عەقدو پەیمانی ژنو مێردایەتی بکا، بەمەرجێ هۆکارەکانی ڕەوا بوونی تەلاق بێنەجێ، وەکوو ئەوەی یەکێکیان بەهیچ جۆرێك نەتوانێ لەگەڵ ئەوی تریان هەڵبکا، یان هەردوکیان لێك دوڕدۆم بنو هیچیان بەهیچیان رازی نەبن!

ئەمجار لەحاڵەتی دروستبونی ناکۆکیشدا دروست نییە یەکسەر بە تەلاق پەیوەندی نێوان ژنو مێرد بپچڕێ بەڵکوو دەبێ جارێ هەوڵ بدرێ ئاشت بکرێنەوە، عاقڵ مەندێك لە خزمی پیاوەکەو عاقڵ مەندێك لە خزمی ژنەکە دیاری بکرێن بۆ لێکۆڵینەوەو ڕێکخستنەوە، بۆ ئەوەی ژنو مێردەکە لەم ماوەیەدا بیرێك لە خۆیانو منداڵو داهاتویان بکەنەوە هەریەکەیان بەهەڵوێستی خۆی دا بچێتەوەو هەڵەکانی خۆی راست بکاتەوە.

{فَابْعَثُواْ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَا إِن يُرِيدَا إِصْلاَحًا يُوَفِّقِ اللّهُ بَيْنَهُمَا}.

ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە پێویستە ئەو دوو حەکەمە (عاقڵ مەندە) چی لە توانایاندایە کۆشش بکەنو هەوڵ بدەن رێکیان بخەنەوە، ناسکیو جوانی ئوسلوبەکەی قورئان لەوەدایە کە باسیی جیابوونەوەی نەکردوە، بەڵکوو هەر ئەوەندەی درکاندووە کە دەفەرموێ: ئەو دوو حەکەمە ئەگەر دەماغ بسوتێننو بیانەوێ ژنو مێردەکە رێك بخەنەوەو نیازپاك بن خواش یارمەتیدەریان دەبێو کاریان بۆ دەسازێنێ.

کەوابوو کاتێك پەنا بۆ تەلاق دەبرێو دەبێتە چارەساز کە ناکۆکی نێوان ژنو مێردەکە زۆر چەواشە بووبێ تەفرەقەو دڕدۆمییەکەیان گەییشتبێتە ئەوپەڕی، ئەوکاتە پەنا بۆ تەلاق دەبرێو بەچارەسەر دەژمێردرێ... دەی بابزانین مافی تەلاق هی قازیو حاکمە یان مافی هەر یەکێ لە ژنو مێردە بە جیا جیا یان مافی هەردوکیانە بەگشتی!؟

## تەلاق مافی پیاوەو حەقی مێردە (الطلاق من حق الزوج):

ئایینی ئیسلام دەسەڵاتی تەلاقی حستۆتە دەست مێردو نەیخستۆتە دەست قازی، مەگەر ژنەکە خۆی لە قازی داوا بکاو بڵێ تەلاقم بۆ وەربگرە. لێرەدا ئەگەر بگوترێ: باشترین رێگا ئەوەیە کاتێ ژنو مێرد لە مەسەلەی تەلاقدا یەك نەبوون دەسەڵاتی تەلاقەکە بدرێتە دەست قازیو هیچیان نەتوانن تەصەروفی تێدا بکەن، چونکە قازی دادوەرێکی بێ لایەنەو لێپرسراوانە هەڵسو کەوت دەکا. لەلایەکی ترەوە دەگوترێ: ئەو عەقدو پەیمانەی حقوقو واجبات بخاتە سەرشانی ژنو مێرد ویستو ئیرادەی یەکێکیان پوچەڵی ناکاتەوە... هەروەها ئەگەر دەسەڵاتی تەلاق بخەینە بەردەست یەکێکیان ئەوە ئەو عەقدە پیرۆزە بەرق هەڵسانێکی کاتی لێك هەڵدەوەشێتەوەو تەلاقدانەکە رودەدا کاتێکیش رویدا بەشێمانی لەدوایە بەڵام سوودی نابێ!

لە راستیدا ئەم بۆچوونە تا ئەندازەیەك بەدڵدا دەچێو وێ چووەو بڕێکیش لە قانوونو یاسا دانراوەکانی جیهان کاری پێدەکەن!! بەڵام کە ئێمە

لەمەوزوعەکــە وردەبێنــەوە، بۆچــوونەکە بەشــیاو نــازانین، چــونکە ویــستو بۆچــونو شــتەنهێنییەکانی دڵو دەروون دەبــێ بــە بەڵــگەی مــادیو زاهــیری بچەسپێن، چونکە قازی بەهەوانتە حوکم ناکا بەڵکوو بە بەڵگەو دەلیلو شایەت کار دەکا، زیاد لەوەش قازی لە قەزاوەتدا سەیر دەکا چی حەقەو چی ناحەقە بۆ ئەوەی حەق بچەسپێنێو زوڵمو ستەم قەلاچۆ بکا. دەی خۆشەویستی مەسەلەی ژیانی ژنو مێردایەتی مەسەلەی ستەمکارو ستە لێکراو نییە، بەڵکوو مەسەلەی ئەوەیە ئایا ئەم ژیانی ژنو مێردایەتییە دەگونجێ؟ ئاخۆ خۆشەویستی تێدا بەرقەرار دەبێو لانەی خێزانییان ناشێوێ؟! یان کار لەکار ترازاوەو هەڵکردنیان ناگونجێ.. بۆ نموونە ئەگەر پیاو پێشنیارێکی دایە دادگاو داوای کرد ژنەکەی تەلاق بدا بە بیانووی ئەوە کە رقی لێ هەڵساوەو خۆشەویستی ئەوی لەدڵدا نەماوەو گوریسی خۆشەویستی نێوانیان بچڕاوە، ئیدیعای ئەوەشی کرد کە زۆر هەوڵی داوە خێزانەکەی بخاتە سەر رێگای راستو رامی بکاو وای لێبکا بتوانێ لەگەڵیدا بگونجێ... بەڵام سەرکەوتوو نەبووە ئایا لەم کاتەدا قازی ژنەکەی تەلاق دەدا یان نا؟ بێگومان لەم حاڵەدا تەلاق کارێکی پێویستەو دەبێ ئەنجام بدرێ، دەی باشە لێرەدا چ جیاوازییەك هەیە تەلاقەکە قازی بیدایان پیاوەکە بۆخۆی تەلاقەکە بقەومێنێ! جا کە هۆکاری تەلاق خۆشەویستیو ناخۆشەویستی نەبێ، بەڵکوو قەزییە یەکی ئەخلاقی بێ یان شتێکی پزیشکیو کۆمەلایەتی بێ، ئایا لە بەرژەوەندی ژنو مێردەکەیە یان لە بەرژەوەندی کۆمەڵگاو خزمو کەسو کاریانە کە نهێنی ئەو خێزانانە – کە خۆیان نایانەوێ بلاوبێتەوە – بچێتە ناو تۆمارگاو (سجلاتی) دادگاو تۆمار بکرێ؟! بێگومان نا!!

## مافی ئافرەت لە تەلاقدا (حق المراة في الطلاق):

لەشــەریعەتی ئیــسلامدا ئــافرەت دەســەلاتی تــەلاقی نــەدراوەتێ مەگــەر بــە سۆنگەی قازییــەوە بیــدرێتێ؟! حیکمەتەکەشــی ئەوەیــە ئــافرەت هەســتو سۆزی زۆرەو زۆر زوو عاتیفە کاری تێ دەکا، سۆزو عاتیفەش کە سەیتەرەی کرد بەسەر

ئادەمیزادا – بە تایبەتی لە کاری گرنگو خەتەرناکا – زەرەر بەدی دێنێ نەك قازانج! ئاشکراشە تەلاق گرنگترین کارێکە کە دەبێ زۆر ئیحتیاتاتی بۆ بکرێ. سەرنجی ئەوەش دراوە ئەو ژنانەی مافی تەلاقیان دراوەتێو دەسەلاتی خستنی تەلاقیان هەبوە، زۆر جار لە جێگای خۆیدا ئەم مافەیان بەکار نەهێناوەو لەسەر شتێکی بەسیتو هیچو پووچ تەلاقیان پێدا کێشاوە!! بەپێچەوانەوە پیاو لەم بارەوە زر بە حەوسەڵەو بارقوڵو خۆگرە، هەموو کاتێ بیر لەو مەسرەفو پارەو پوولە دەکاتەوە کە بۆ پێکهێنانی خێزان سەرفی کردوە ئەو مارەییو ئیلتیزاماتەی کە بەرعودەی بووە، هەروەها لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی منداڵەکانیو ئەو ئیلتیزاماتەی کە تەلاقدان دەیخاتە سەرشانی پیاوەکە، هەموو ئەم شتانە وا لە پیاو دەکا کە بیر لە بەرژەوەندی خۆیو ماڵو منداڵی بکاتەوە، بەهەڵوێستی خۆیدا بچێتەوە پێش ئەوەی لەگژ کارێکی وا رابچێ! تا نەزانێ لێك جیابونەوە کە پەسەندەو ئەنجام نەدانی ناگونجێ هەرگیز پێی هەڵناسێو شانی بەرنادا، جا کە ئێمە تەلاق بدەینە دەست ئافرەت بێگومان زوڵمو ستەمێکی زۆرمان لەپیاو کردوەو ئەو هەموو مەسرەفو خەرجییەی بۆ مارەییو ماڵ پێکەوە نانو گواستنەوەو ئەوجۆرە شتانەی بۆ ژنەکەی خەرجکردوە بەفێڕۆ دەڕوا، کەوابوو دەسەلاتی تەلاق نادرێ بەژن مەگەر بەسۆنگەی قازیو دادگاوە بیدرێتێ، ئەمیش بە مەرجێ مێردەکە رازی بێو ژنەکەش باربووی زەرەرەکەی بداتەوەو هەموو مەسرەفو خەرجییەکە یان هەندێکی ببژێرێ – واتە ئەو خەسارەتەی کە بەهۆی خەرجییەکەوە تووشی پیاوەکە بووە – ئەم شێوە تەلاقە پێی دەگوترێ (خولع).

دەگێڕنەوە کە خێزانی سابیتی کوڕی قەیس هاتە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا سابیتی کوڕی قەیس لە رەوشتو ئاییندا هیچ عەیبی لێ ناگرم، بەڵام بەدەست خۆم نییە خوێنی ساردەو خۆشم ناوێو ناچێتە دڵمەوە! پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئایا ئەو باخەی کە پێی داویو کردوویەتی بە مارەیی تۆ دەیدەیەوە؟! ئافرەتەکە وتی: بەڵێ، دەیدەمەوە...

ئەمجار پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بانگی سابیتی کردو فەرمووی باخەکە وەربگرەو تەلاقێکی بدە.

لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵدەدا ئەویش ئەوەیە: ئەگەر پیاوەکە نەیەوێ ژنەکە تەلاق بدا، ئایا ئافرەتەکە دەتوانێ داوا لە دادگا بکا تەلاقەکە بخا؟! بەتایبەتی کە هۆی رەواو شەرعی بەدەستەوەبێ؟ بۆ وەلامی ئەم پرسیارە دەڵێین: ئیسلام رێگای بە ئافرەت داوە کە داوای تەلاق لە مێردەکەی بکا لە کاتێکدا پیاوەکە نەتوانێ بژێوی ژنەکە دابین بکا، ئەمە راوو بۆچوونی ئیمام مالیكو هاورێیانیەتی، بەڵگەشیان ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرە کە دەفەرموێ: (إمرأتك ممن تعول تقول أطعمني والا فارقني).

هۆیەکی تر لەو هۆیانەی کە دەبنە رێخۆشکەرە بۆ ئافرەت کە داوای تەلاق بکا هەبوونی نەخۆشیو عەیبێکی هەمیشەیی بێ دەرمانە کە تووشی پیاوەکە بووبێ، نەخۆشیو عەیبەکە وابێ لە وانەبێ لابچێ بەلام درەنگ وەکوو شێتیو گولیو بەڵەکی.

هەروەها دروستە بۆ ژن داوای تەلاق بکا کاتێ مێردەکەی ساڵێك یان زیاتر هون بوو — بەپێی رای پەسەندی رێبازی ئیمام مالیك — ئەگەر دەزاندرا پیاوەکە لە کوێیەو نامەی دەگەییشتێ ئەوە نامەی بۆ دەنووسرێو پێی رادەگەیەندرێ یان دەبێ بێتەوە بۆ لای خێزانەکەی یان خێزانەکەی بەرێ بۆ لای خۆی، یان ژنەکەی تەلاق بدا یان ژنەکەی تەلاق دەدرێ، جا ئەگەر سەرپێچی کرد ماوەیەکی بۆ دیاری دەکرێ، کە ماوەکە تێپەڕبوو، قازی دەسەلاتی خۆی بە کاردێنێو ژنەکە تەلاق دەدا! ئەگەر شوێنی پیاوەکە نەدەزانرا، یان نامەی نەدەگەییشتێ ئەوە قازی دوای ساڵەکە یەکسەر تەلاقی دەدا چونکە ژنەکە تووشی زەرەری بێ مێردی دەبێ. بەلام ئەگەر ژنەکە بەو حاڵە رازی بوو نەیدەویست عەقدی نیکاحەکەی تێك بچێ ئەوە نیکاحەکەی وەکوو خۆی دەمێنێتەوە!

## چەند بەربەستێکی تەڵاق (حوافز تمنع وقوع الطلاق):

وتمـان ئـاییني ئیـسلام تـەڵاقی خـستۆتە ژێـر دەسـەڵاتی پیـاوەوەو ئـەم دەسەڵاتەی نەداوە بە غـەیری مێـردو کـەس بـۆی نییـە ئـەم مافـەی لێ زەوت بکـا، تەنانـەت (قاضـي)یـش لەسـەر داواکردنـی ئافرەتەکـە نـەبێ مـافی ئـەوەی نییـە عەقدی نیکاح بپچڕێنێ! بەڵام لەگەڵ ئـەوەدا کـە ئـەم دەسـەڵاتی تەڵاقدانـەی داوە بـە پیـاو ئامۆژگاریـشی کـردوە کـە لەگـەڵ خێزانیـدا هێـدیو هـێمن بـێ، ئەگـەر هەڵەیەکی لـە ژنەکـەی بینـی سـەرفی نـەزەری لێ بکاو بەصـەبرو تەحـەموول بـێ لەگەڵیـدا، نەچـێ هـەروا بەهەوانتـەو لەسـەر هەڵەیـەکی بـچوك خێـرا تـەڵاقێکی پێداکێشێ! خودای مەزن دەفەرموێ:

**{وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا - سورة النساء – ١٩}.**

لەلایەکی ترەوە ئاییني ئیسلام مەنعی ئەوەی کردوە کە پیـاو خێزانـی خـۆی لەکاتی بێنوێژیدا تەڵاق بدا چونکە حەزو ئـارەزۆی ژنو مێردایـەتی لـەو کاتانـەدا لاواز دەبـێ، دەگێڕدرێتـەوە کـە عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەر خێزانـی خـۆی لـەکاتی بێنوێژی دا تەڵاق دابوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هێشتا لە ژیانـدا مـابوو حـەزرەتی عومەر کەزانی چووە لای پێغەمبەرو باسی ئەم تەڵاقدانەی عەبـدوڵڵای کـوڕی بـۆ گێڕایەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فـەرمووی ئـەی عومـەر! بـە عەبـدوڵڵای کـوڕت بڵێ: بـا خێزانەکـەی بخاتـەوە ژێـر نیکـاحی خـۆیو لێـی راوەسـتێ تـا خۆدەشـوا، ئـەمجار دەکەوێتـەوە بێنوێژیـەوە، ئـەنجار پـاك دەبێتـەوە، دوایـی ئەگـەر ویـستی بادرێژە بە ژیانی ژنو مێردایەتی بداو لەگـەڵیا هـەڵبکا، ئەگـەر نـا بـا تـەڵاقی بـدا پێش ئەوەی کە سەرجێیی لەگەڵدا بکا، ئەوە ئەو عیدەو ماوەیەیە کە پەروەردگار فـەرمانی پـێ کـردوین ئـافرەتی تێـدا تـەڵاق بـدرێ. (ئـەم فەرموودیـە بوخـاریو موسلیم گێڕاویانەتەوە).

حیکمەتیش لەمەدا ئەوەیە کە ئافرەت تەڵاقدان لەکاتی پاکیـدا تەڵاقدانیـەتی لە کاتێکی پێویستدا لە کاتێکدا کە نـەفسو ئـارەزۆی دەیـەوێ ژنـی هـەبێ جا کـە

لەم کاتەشـدا کـابرا هـەر سـوور بـوو لەسـەر تەڵاقـدانی ئـەوە ئـەوە دەگەیـەنیَ کـە ناتوانیَ لەگەڵیـدا هـەڵبکاو خۆشەویـستی یـەکتریان نـەماوە! بەربەرسـتێکی تـر بـۆ رونەدانی تەڵاق شایەدی گرتنە خودا دەفەرمویَ:

{وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ - سورة الطلاق – ٢}.

ئاشکراشە کە ئامادەبوونی دوو شایەت بۆ خـستنی تەڵاقەکـە وا لـە پیـاو دەکـا بیرێك بکاتەوەو برێك بەخۆیدا بچێتەوە، تەنانەت زانـا شـیعەکان پێیـان وایـە کـە شایەت گرتن بۆ تەڵاقدان مەرجێکی سەرەکییەو بـێ ئـەو مەرجـە تـەڵاق ناکـەویَ، هەروەکوو چۆن شایەدی مەرجە بۆ دامەزرانی نیکاح، بێ حازر بـوونی شـایەدەکان نیکاحەکە دانامەزریَ! ئەمەش ئەوەیە قورئانی پیرۆزە ئاماژەی بۆکردووە.

جا هـەرکاتێ ژنو مێـرد بـە ویـستو ئـیرادەی خۆیـان ویـستیان پـەیمانی ژنو مێردایـەتی خۆیـان هەڵوەشـێنن ئـەوە دەتـوانن ویـستی خۆیـان بێننـەدیو کـەس ناتوانـێ بەربەسـتیان بکـا، زوربـەی قـانوونو یاسـای خـۆر ئاواییـەکانیش ئـەمڕۆ لەسەری دەڕۆن.

## جۆرەکانی تەڵاق (اقسام الطلاق):

تەڵاق سێ جۆرە:

یەکەم: ریجعی.

دووەم: تەڵاقی بائین (بینونة صغری) لێك دابڕانی کاتی.

سێیەم: تەڵاقی بائین (بینونة کبری) لێك دابڕانی گەورە.

١- تـەڵاقی ریجعـی ئـەو جـۆرە تەڵاقەیـە کـە دروسـتە بـۆ مێـرد خێزانەکـەی بگێڕێتەوە بۆ ژێر نیکاحی خۆی بەبێ مارەییو مارەکردنێکی تـازە، واتـە: تـەڵاقی ریجعی عەقدو پەیمانی ژنو مێردایەتی بە تەواوی لێك هەڵناوەشێنێ، بەڵکوو بـۆ مێردەکەی دروستە کە خێزانەکەی بخاتەوە ژێر نیکاحی خۆی هەرکاتێ ئارەزووی کرد بە مەرجێ ئافرەتەکە عیدەی مابێ، عیدەش بریتییـە لـە ماوەیـەکی زەمـەنی بۆ ئەوەی بزاندریَ کە ئاخۆ ئاساری ژنو مێردایەتی ماوە یان نا؟! جا کـە تـەڵاقو

لێك ترازان له نێوان ژن‌و مێردا روویدا، هەر بەوە لێك دابڕانەکەیان ناچەسپێ بەڵکوو دەبێ ئافرەتەکە چاوەڕوان بێ‌و شوو نەکاتەوە تا ئەو ماوە زەمەنییە تێپەڕ دەبێ کە پێی دەگوترێ: عیدەو لەمەدوا جۆرەکانی ماوەکەی روون دەکەینەوە.

تەڵاقی ریجعی شتێك نییە ئیسلام دایهێنابێ بەڵکوو پێش هاتنی ئیسلامیش لەناو عەرەبەکاندا تەڵاقی ریجعی هەبوە، بەڵام بە شێوەیەکی ستەمکارانە کاریان پێکردوە، لەو رۆژگارانەدا تەڵاق نەئەندازەی هەبوو نە ژمارە، بەڵکوو ئافرەت کرابوو بە ئامێری رابواردنی پیاو، هیچ رێزو نرخێکی بۆ دانەدەنرا! پیاو دەیتوانی بە ئارەزۆی خۆی بەهۆی تەڵاقەوە زەرەرو زیان بە ژن بگەیەنێ‌و نەهێڵێ لەززەت‌و خۆشی لەژیان ببینێ!!

کاتێ ئیسلام هات ئەندازەو سنوورێکی بۆ تەڵاق دانا، رێگای بە مێرددا کە تەنها دووجار بتوانێ ژنەکەی تەڵاق بداو ریجعەی بکاتەوە، قورئان دەفەرموێ:

{الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ - سورة البقرة – ٢٢٩}.

مەبەست بە وشەی (الطلاق) لە ئایەتەکەدا تەڵاقی ریجعییە ئەو تەڵاقەی پیاو دەتوانێ دوای گواستنەوە بیخاتە سەر ژنەکەی بەمەرجێك لەوە پێش هیچ تەڵاقی تری نەدابێ، یان یەك تەڵاقی دابێ، جا ئەم جۆرە تەڵاقە پەیوەندی ژن‌و مێرد ناپچڕێنێ‌و پیاو دەتوانێ پێش تەواو بوونی عیدە موعاشەرەی ژن‌و مێردایەتی لەگەڵ دا بکا ئەم موعاشەرەیەش حوکمی تەڵاقەکە پوچەڵ دەکاتەوە. تەنانەت پێش تەواو بوونی عیددە ئەگەر یەکێکیان مرد ئەوی تریان میراتی لێ دەگرێ، بژیوو نەفەقەی ژنەکەش لەماوەی عیددەدا لەسەر پیاوەکەیە، مارەیی قەرز (المهر المؤجل) تا عیددە تەواو نەبێ وەختی نایە.

جا لە ماوەی عیددەدا پیاو دەتوانێ – بەکردار یان بەگفتار – ژنەکەی بخاتەوە ژێر نیکاحی خۆیەوە! خودای مەزن دەفەرموێ:

{وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَلِكَ إِنْ أَرَادُواْ إِصْلاَحًا - سورة البقرة – ٢٢٨}.

جا ئەگەر عیددە بەسەر چوو، پیاوەکە ژنەکەی ریجعە نەکردەوە تەلاقەکە دەکەوێو ناتوانێ ریجعەی بکاتەوە، بەڵکوو دەبێ سەر لەنوێ ئافرەتەکە شوبکاتەوە پیاوێکی تر مارەی بکا، دوایی لەگەڵ ئەو – لەبەر هەرهۆیەك بێ – لێك جیاببنەوەو عیددەی بڕوا، کە لەویش عییدەی رۆیی ئەمجار دەتوانێ شوبکاتەوە بە مێردە کۆنەکەی! قورئانی پیرۆز کە دەفەرموێ: (الطلاق مرتان) واتە: تەلاق دووجارە! نەیفەرموو: (طلقتان) ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە کە پێویستە تەلاق جار لەدەوای جار بێ نەك هەر ئەوەندە بڵێ: (دوو تەلاقی بکەوێ)! تەنانەت ئەگەر بڵێ: دوو تەلاقی بکەوێ یان سێ تەلاقی بکەوێ بە گوێرەی دەقی ئایەتەکە هەریەك تەلاقی دەکەوێ[٢]، کەوابوو هەموو تەلاقێك لە جاری یەکەمدا یان دووەم جاردا پراوەو تاقیکردنەوەیە بۆ لێك دابڕانێکی کاتیو فرسەت پێدانە بۆ ئەوەی عەلاقەتی ژنو مێردایەتی بگێڕنەوە بۆ رۆڵی ئاسایی خۆی.

## تەلاقی بائین (بینونة صغرى):

ئەم جۆرە تەلاقە بریتییە لەوەی کە پەیمانو عەقدی ژنو مێردایەتی دەسبەجێ لادەباو مافی ژنو مێردایەتی پیاو بەسەر ژنەوە ناهێڵێ، جا ئەگەر پیاوەکە ویستی ژیانی ژنو مێردایەتی لەگەڵ ژنەکەیدا دەس پێبکاتەوە دەبێ سەر لەنوێ مارەی بکاتەوەو مارەیی تری بداتێ! ئەمە بەمەرجێك وا دەبێ کە سێ تەلاقەی تەواو نەکردبێ! ئەم جۆرە تەلاقە بائینە لەچوار حاڵەتدا هەڵدەکەوێ.

یەکەم: تەلاقدان پێش گواستنەوە، بەمەش نیوەی مارەیی دەکەوێو عیددەشی لەسەر نییە.

دووەم: تەلاقدان لەسەر ماڵ پاش گواستنەوە ئەمەش بەو جۆرەیە کە ژن ئەو مارەییەی کە وەری گرتووە هەمووی یان هەندێکی یان ماڵێکی تر بدا بە

[٢] – ئەم رایە رای هاوەڵانی پێغەمبەرو تابیعینو زانایانی شەرعی سەر بە رێبازی ئیمام (ابن تیمیه) و (ابن القیم الجوزیه)یە.

مێردەکەی بۆ خاتری تەڵاقی بدا، یان گەردنی لە نەفەقەو بژێوی کاتی عیددە ئازادبکا، یان لە مارەیی دواخراوی ئازادی بکا، لەم حاڵەدا پێویستە ژنەکە عیددە بکێشێ.

سێیەم تەڵاقدان بەهۆی بوونی عەیبێکەوە یان بەهۆی بەندکردن، یان بەهۆی زەرەرمەندبوون بەهۆی بێ سەرو شوێن چونی مێردەکەیی و دوور کەوتنەوە! ئەم جۆرە تەڵاقە پێویست دەکا قازی فەرمانی پێ بکاو بەرەوای ببینێ، ئەم جۆرە تەڵاقە پێویستی بە عیددە هەیەو دەبێ ژنەکەی عیددە بکێشێ، ئەگەر قازی بەڕەوای بینی مارەییشی دەکەوێ.

چوارەم: ئەگەر لە تەڵاقی ریجعیدا عیددەی تێپەڕبوو. ئا لەم کاتەدا مارەیی دواخراو (المهر المؤجل)ی دەچەسپێ و دەکەوێتە سەر پیاوەکە.

تەڵاقی بائین مارەیی دواخراوی پێ دەچەسپێ و دەکەوێتە ئەستۆی مێردو دەبێ بە کۆ یان پارچە پاچە بیدا بە ژنەکەی، ئیتر میرات لێك ناگرن، مەگەر بزاندرێ کە پیاوەکە بۆیە تەڵاقی داوە تا میراتی لێ نەگرێ! بەم جۆرە کە پیاوەکە لە نەخۆشی مردنیدا ژنەکەی تەڵاق بداو ژنەکەش رازی نەبێ ئالەم حاڵەتەدا ژنەکە میراتی لێ دەگرێ بە مەرجێ مردنی پیاوەکە لە ماوەی عیددەی ژنەکەیدا روبدا.

## تەڵاقی یەکجارەکی (الطلاق البائن بینونة کبری):

ئەم جۆرە تەڵاقە بریتییە لەوەی تەڵاقدەر سێ تەڵاقەی ژنەکەی بدا بەم شێوە تەڵاقە هەموو پەیوەندییەکی نێوان پیاوو ژنەکە دەپچڕێ و لێك جیادەبنەوە، نابێ جارێکی تر مارەی بکاتەوە، مەگەر ژنەکە عیددەی بڕواو شوو بکاتەوە بە پیاوێکی ترو بیگوازێتەوە ئەویش تەڵاقی بداو عیددەی بڕوا ئەمجار مێردی یەکەم بۆی هەیە جارێکی تر سەرلەنوێ مارەی بکاتەوەو مارەیی تری بداتێ، ئەمە بەمەرجێك مارەکردنی لە مێردی دووەمی بە مەبەستی مارە بەجاشی نەبێ، بەڵکوو بۆژن و مێردایەتی ئاسایی بێ و بێگوازێتەوەو ئەمجار -

لەبەر هەر هۆیەك بێ – تەڵاقی بداتو عیددەی بڕوات ئیتر ئەوكاتە حەڵاڵە بۆ مێردی یەكەم كە مارەی بكاتەوە بەڵگەش لەسەر ئەم بۆچوونە فەرموودەی خودایە كە دەفەرموێ:

{فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَن يَتَرَاجَعَا إِن ظَنَّا أَن يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ - سورة البقرة – ٢٣٠}.

پێویستە ئەوە بزانرێ: كە مارەكردنی دووەم ئەگەر مەبەست حەڵاڵ كردنی بێ بۆ مێردی یەكەمی بەتاڵەو پێی دەگوترێ مارە بەجاشو مارە بەجاشیش نەفرەتی لێكراوە.

مەبەستو حیكمەت لەم تەڵاقە ئەوەیە كە ئیسلام مافی داوە بەژنو مێرد بۆ ئەوەی كە پەیوەندی ژنو مێردایەتی دابەستنەوە دوای تەڵاقی یەكەمو لە ماوەی عیددەدا یان دوای بەسەرچوونی عیددە!. هەروەكوو چۆن دوای تەڵاقی دوهەمیش ئەم مافەی پێداون، بەڵام دوای تەڵاقی سێهەم، ئەم مافەی نەداونێ، چونكە مێرد كە جاری یەكەم ژنەكەی تەڵاقداو دوایی ریجعەی كرەوە، جاری دووەم دوبارە كارەكەی قەومانـدەوەو تـەڵاقی دایـەوەو ریجعەی كـردەوە دەبـێ ئـەم پیـاوە لـە سەربارێك جێگیر ببێ یان بڕیار بدا تا سەر ژنو مێردایەتیان بەرقەراربێ یان لێك جودا بوونەوە هەڵبـژێرێ! جا وەكوو چۆن پیاوەكە دەتوانێ ژنەكە ریجعە بكاتەوەو سەرلەنوێ مارەی بكاتەوە دوای ئەوەی كە شودەكاتەوە بە پیاوێكی تـرو لەبـەر هۆیـەك – جگە لـەهۆی مـارە بەجاشی – ئـەویش تـەڵاقی دەداو عیـددەی دەڕوا... ئـیتر دەتـوانن سـەرلەنوێ ژیـانی ژنو مێردایـەتی دەسـت پـێ بكەنـەوە، چونكە هـەردووكیان دەرس وەردەگـرنو دەزانـن بەرژەوەنـدییان لەچیدایە، دوای ئـەوەی كـە ژنەكـەی شـووی دووەمـی كـردو بـیری لـە رابـوردووی خـۆی كـردەوە پیاوەكەش هەمان بیرو بۆچوونی لا دروست دەبێو ئـەویش چاوێك بەهەڵوێستی خۆیدا دەگێڕێتەوە.

بەراستی ئەو نووسینە کە (السیرمویر) لە کتێبەکەیدا بەناوی (ژیانی موحەممەد) (درۆودی خودای لەسەربێ) نووسیویەتی خۆ گێلکردنێکی ئاشکرایەو لە عاقڵ مەندەوە دوورە، ناوبراو هاتووە رەخنەی لەم حوکمو تەڵاق و یاسایەی ئیسلام گرتووە، ئاگای لەوە نەبووە کە شوکردنەوەی ژنەکە بە پیاوێکی تر پێش ئەوەی بتوانێ بگەڕێتەوە بۆ لای مێردی یەکەمی خۆی لە خۆیدا گەورەترین لەمپەرو بەربەستە بۆ ژن تەڵاق نەدان بە تایبەتی لەناو گەلو هۆزێکی وەکوو عەرەب کە بە خاوەن غیرەتو کەللەرەق بەناو بانگ بوون! بەڵێ گەورەترین لەمپەڕ بۆ جڵەو گیریی لەتەڵاقدان ئەم یاسایەیە، بۆیە قورئانی پیرۆز بەو جڵەوە پتەوە لغاوی کردوە بۆ ئەوەی نەهێڵێ دیاردەی ژن تەڵاقدان پەرە بستێنێ بە تایبەتی لەناو گەلو نەتەوەیەکدا کە بەخاوەن شەرەفو عیززەت بەناوبانگ بوون.

## گۆشەگیری لەڕێ و ڕەسمی ژن و مێردایەتی (العدة):

پچڕان و لێک دابڕانی ژنو مێرد هەروا کارێکی ئاسایی نییە بۆیە چەند کۆسپێك دێنە رێگای بۆ ئەوەی تا دەتوانرێ ئەو پەیوەندییە پیرۆزە نەپچڕێ، تەنانەت پاش بەرپابوونی کێشەو هەرا لە نێوان ژنو مێرددا پێویستە هەر هەوڵی ئەوە بدرێ کێشەکە سەر نەکێشێ بۆ لێك جودا بوونەوەو تەڵاقدان.. بۆیە دەبینین دوای هەموو تەڵاقێك ماوەیەکی چاوەڕوانی هەیە پێی دەگوترێ (عیددە)، قورئانی پیرۆز دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ - سورة الطلاق – ١}.

واتە: ئەی بڕواداران! هەر کاتێ ژنێکی موسوڵمانتان مارە کردو دوایی تەڵاقتان دان پێش ئەوەی کە بەدەستیان بگرنو بچنە لایان ئەوە عیددەی ئێوەیان لەسەر نییە کەواتە مافی خۆیان بدەنیو بەجوانی دەسبەرداریان ببن.

ئەو ماوەی چاوەڕوانییە هەمووکاتێ وەکوو یەك نییە بەڵکوو جوداوازی هەیە بەگوێرەی چۆنییەتی حاڵی ژنەکە وەکوو لەمەدوا بە درێژی باسی لێوە دەکەین.

یەکەم: عیددەی ئافرەتی دووگیان (حامل) بە مندال بوونیەتی هەرکاتێ منداڵەکەی لێ بووە وە عیددەکەی تەواو دەبێ.

{وَأُوْلَاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ - سورة الطلاق – ٤}.

دووەم: ئافرەتی مێرد مردوو – کە دوو گیان نەبێ – عیددەکەی چوار مانگ و دە رۆژە.

{وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا - سورة البقرة – ٢٣٤}.

سێیەم: عیددەی ئافرەتی تەڵاقدراو – کەسکی نەبێ – ئەم جۆرە ژنانە دەکرێن بە دوو بەش.

أ) ئافرەتی سەرو عوزر شۆر ئەم جۆرە ئافرەتانە عیددەکەیان سێ پاکییە کە نزیکەی سێ مانگ دەکا واتە سێ جار بکەوێتە حەیزەوە پاکیش ببێتەوە.

{وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ وَلاَ يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ اللّهُ فِي أَرْحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ - سورة البقرة – ٢٢٨}.

ب) عیددەی ئافرەتی لە عوزر وەستاوە: ئەوانەی تەمەنیان گەورەیەلە عوزر شتن دەوەستێنەوە ئەم جۆرە ئافرەتانە عیددەکەیان سێ مانگە.

{وَاللَّائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِن نِّسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ - سورة الطلاق – ٤}.

ئەو ئافرەتانەی کە باڵق بون بەڵام سەرو عوزریان نەشتووە ئەوە هەر حوکمی ئافرەتی لەعوزر وەستاوەیان هەیە.

شایانی باسە کە ئافرەتی تەڵاق دراوی نەگواستراوە هیچ عیددەیەکی لەسەر نییە پەروەردگار دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا - سورة الأحزاب – ٤٩}.

واتــە: ئـەی بـڕواداران! هـەر کاتـێ ژنێکـی موسـوڵمانتان مـارە کـردو دوایـی تـەڵاقتان دان پـێش ئـەوەی کـە بەدەسـتیان بگـرنو بـچنە لایـان، ئـەوە عیـددەی ئێوەیان لەسەر نییە... کەواتە مافی خۆیان بدەنێو بەجوانی دەسبەرداریان ببن.. جا کاتێ ژن تەڵاقدرا لەماوەی عیددەکەی لە جێگەی دانیشتنی خۆی دەمێنێتـەوە پیاوەکە بژێوی‌و نەفەقەی بۆ دابین دەکاو ناشتوانێ لەماڵەکە دەری بکا مەگـەر ئافرەتەکە خراپەو شتی ناشیرینی لێ روبدا خودا دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِن بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ - سـورة الطلاق – ١}.

ئەم ئایەتە مەبەستێکی رونو ئاشکرای لێ بەدیار دەکەوێ ئەویش بریتییە لە درێـژە پێـدانی مـاوە لەبـەردەم ژنو پیاوەکـەدا بـۆ رێـك کەوتنـەوەو دەسـت پێکردنەوەی پەیوەندی نێوانیانو قەڵاچۆکردنی نـاکۆکی نێوانیـان چونکە ئەگـەر کـەمێك خۆشەویـستی نێوانیـان مابـێو هیـوای یـەك کەوتنـەوەو ئاشـتبوونەوە لـە نێوانیاندا مابێ لە ماوەی عیددەکەدا بەدەر دەکەوێو دەبێتـە هۆکارو وەسیلە بـۆ گەڕانەوەی پەیوەندی‌و خۆشەویستی نێوانیان.

عیددە چەند حوکمێکی هەیە گرنگەکانیان ئەمانەن:

١- نابێ لەماوەی عیددەدا ئافرەت خوازبێنی بکرێ.

٢- پێویستە ئافرەت لەماوەی عیددەدا لەماڵی خۆی بمێنێتەوەو لێی دەرنەچێ مەگەر لەبەر ناچاریەکی یەکجار پێویست بێ. ئەمـە کاتێك وایـە کـە عیددەکـەی بەهۆی تەڵاقەوە بێ، چونکە لـەم حاڵـەدا بـژێوو نەفەقـەی لەسـەر مێردەکەیـەتی

خۆجوانکردنو خۆڕازاندنەوەی لێ یاساغ ناکرێ چونکە ئیسلام دەیەوێ ئەم ژنو مێردە سەر لەنوێ ژیانی ئاسایی خۆیان دەست پێبکەنەوە.

بەڵام ئەگەر عیددەکەی بەهۆی مردنی مێردەکەیەوە بوو ئەوە نابێ لە ماڵەوە دەربچێ مەگەر لەبەر ناچارییەکی زۆر زۆرو خۆڕازاندنەوەو خۆ جوانکردنیشی لێ یاساغە.

حیکمەتو هۆیەکانی عیددە دانان زۆرن، یەکێ لەوانە ئەوەیە کە ئیسلام سوورە لەسەر نەپچڕانی پەیوەندی ژن مێردایەتی... جا کە تەڵاق هاتە کایەوە ماوەی عیددە ماوەیەکی گونجاوە بۆ ئەوەی ژنو مێردەکە بیرێك لە رابوردوو داهاتووی خۆیان بکەنەوەو ئەگەر بگونجێ نەهێڵن ئەو پەیوەندییە بپچڕێو رێك بکەونەوە... حیکمەتێکی تر ئەوەیە کە لە ماوەی عیددەکەدا دەردەکەوێ ئاخۆ ئەو ژنە سکی هەیە یان نا؟ ئەمەش دەبێتە هۆیەکی سەرەکی بۆ تێکەڵ نەبوونی نەوەو هەموو منداڵێك پاڵ دەدرێتەوە پال باوکی شەرعی خۆی. حیکمەتێکی تر ئەوەیە کە دەبێ ئافرەتەکە تازێباریو رەشپۆشی بۆ مێردەکەی ئەنجام بدا، چونکە لە دەستدانی مێردەکەی خەسارەتێکی گەورەیە بۆ ژنەکە جا بۆ بەجێ هێنانی ئەمەكو وەفا بەرامبەر بە مێردەکەی دەبێ فەترەیەك تێپەڕ بێ بەسەر لەدونیا دەرچوونی مێردەکەیدا ئەمجار شوو بکاتەوە.

## مافی کەسایەتی ئافرەت لە ئیسلامدا:

ئەوەی گرنگو سەرنج راکێشە ئەوەیە کە شەریعەتی ئیسلام پێش هەموو قانوونو یاسایەك کەوتووە لەوەدا کە وەکوو پیاو مافی بە ئافرەت داوە، چی بۆ پیاو رەوای دەبینێ بۆ ئافرەتیشی رەوا دەبینێ، ئەوەتا شەریعەتی ئیسلامی یەکسانی لە نێوان نێرو مێدا چەسپاندووە.

مافی ئەوەی بە ئافرەت داوە کە وەکوو پیاو دەربارەی سەرپەرشتیکردنی ماڵو داراییو مۆرکردنی پەیمانو قەباڵەو سەنەدی ماڵو داراییو شتی تریش

هەڵوێست بنوێنێ‌و مامەڵە بکا. هەرکاتێ ئافرەت وەختی شووی هات‌و عاقڵ‌و دانا بوو، بۆی هەیە کە سەروکاری ماڵ‌و دارایی خۆی بکا، سەربەخۆ دەتوانێ – بەکردارو گوفتار – کارەکانی خۆی ئەنجام بدا سەوداو مامەڵە بکاو سەنەدو وەکالەتنامە مۆر بکا، کڕین‌و فرۆشتن‌و بەکرێدان‌و هاوبەشیکارو قەرزو بارمتەو بەخشین‌و وەسیەتنامە جێبەجی بکاو رەهایان بکا، دەشتوانێ وەکیل بگرێ‌و بشبێتە وەکیل، مێردو باوك‌و براو کەس‌و کاری ناتوانن دەست بێننە بەردەستی!!

ئا ئەمەیە شەخصیەتی ئافرەتی موسوڵمان‌و ئەوە چواردە سەدە زیاترە ئیسلام بەو جۆرە کەسایەتی بۆ چەسپاندوەو رێزی لێ گرتووە! دەی ئەمجار لەتەك ئەمەدا ئاورێك لە حاڵ‌و وەزعی ئافرەتی خۆر ئاوایی بدەرەوە بزانە تا چ ئەندازەیەك مافی پێشێلکراوە؟! ئەوەتا دەبینین لە زوربەی وڵاتی ئەوروپادا هەرکاتێ ئافرەت شووی کرد سامان‌و مڵکایەتیەکەی دەکەوێتە ژێر دەستی مێردەکەی‌و خاوەنیەتەکەی نامێنێ!! بۆ نموونە لە ئینگلتەرە هەرکاتێ ئافرەت شووی کرد ئافرەت‌و پیاوەکە بە قانوون‌و یاسای ئەو وڵاتە دەبنە یەك شەخص‌و ژنەکە ناتوانێ بەرعوٚدەی بەڵێن‌و پەیمان ببێ.

دوای ساڵی (١٨٨٢ی ز) قانوونێکی تر لەو وڵاتە هاتە کایەوە کە رێگای دا بەژنی مێردار کە ببنە خاوەن مڵکایەتی‌و مافی ئەوەشیان پێدرا کە بە ئەندازەی مڵکایەتی خۆیان بەرعودەی کارو باری ماڵی ببن!!.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قانوون لێ نەگەڕاوە کە مێرد بەرپرسیاری تەصەروفاتی ژنەکەی نەبێ! بەڵکوو داواکار دەتوانێ داوا لەسەر ئافرەتەکە تەسجیل بکاو داوای لێ بکا یان مێردەکەشی بخاتە پاڵی داوایان لەسەر قەید بکا ئەگەر ئافرەتەکە نەبوو بوو، ئەوە داواکارەکە دەتوانێ داوا لەسەر مێردەکە تەسجیل بکا لەم رووەوە کە بەگوێرەی قانوون مێردەکە بەرپرسیارە لە بەرامبەر هەڵس‌و کەوتی ژنەکەدا.. لە وڵاتی فەرەنساش رۆژنامەی فەرەنسی یاسایی لە

(٢)ی فیبرایەر ساڵی (١٩٣٨)دا قانوونێکی بڵاو کردەوە تێیدا هاتووە دەڵێ: ئافرەتی مێردار ناتوانێ بەبێ وەرگرتنی رەزامەندی دادوەر ئەم کارانە ئەنجام بدا.

١- ئیمزاکردنی چەکی پارە.

٢- حیسابکردنەوە لە بانقەکانی فەرەنسادا (واتە حیسابی جاری).

٣- هیچ سەنەدو عەقدو کمپیالەیەکی دارایی ئیمزا نەکا.

٤- ناتوانێ بەبێ رەزامەندی وەرگرتنی قازیی راستەوخۆ میرات بگرێ.

دوای ئەوەی ئەمە رونکرایەوە دەتوانین بڵێین ئەگەر رێگە پێدانی ئافرەت بۆ هەڵسوڕاندنی کاروباری دارایی خۆی بە ئازادیو دیموکراتی ئافرەت بژمێردرێو بە دیاردەیەکی گەشەداری چەرخی بیستەم حلێب بکرێ ئەوا دەبێ ئافرەتی موسوڵمان شانازی بەو ئازادیو سەربەستییەوە بکا کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە سەدەی حەوتەمی زایینیەوە بۆی چەسپاندووەو بانگەوازی بۆ کردوە!

جا ئەگەر ئاینی ئیسلام یەکسانی خستۆتە نێوان ژنو پیاوەوە لەوەدا کە مافی خۆیانە بە ئارەزوی خۆیان تەصەروف لەماڵی تایبەتی خۆیاندا بکەن، ئەوا دەربارەی میراتگرتن هەڵوێستێکی تری وەرگرتووە کە هاتووە بەشی نێرینەی دوو چەندانەی بەشی مێینە داناوە، ئەمەش لەبەر حیکمەتێکی دادپەروەرانەی کۆمەڵایەتی، چونکە بەرپرسیاری پیاو لەلایەنی ماددەو ژیانەوە گەلێ زۆرترە لەبەرپرسیاری ئافرەت، چونکە ئاینی ئیسلام ئەرکی دابینکردنی بژێوی خاوو خێزانو پێداویستیاتی خستۆتە سەرشانی پیاوو لەم بارەوە هیچ ئەرکێکی نەخستۆتە سەرشانی ئافرەت... تەنانەت ژێواری خودی خۆیشی لەسەر خۆی نییە، بەڵکوو پێش شووکردنی دەکەوێتە سەرشانی کەسو کاریو دواشووکردنیشی دەکەوێتە سەرشانی مێردەکەی! نەك هەر ئەوە بەڵکوو ئەگەر ژنەکە دەوڵەمەندیش بێ هەر بژێوو ژێداری لەسەر خۆی نییە چونکە ئەگەر کەسو کاری نەبوو مێردیشی نەبوو ژێواری دەکەوێتە سەرشانی (بیت المال)و نەفەقەی منداڵەکانیشی دەکەوێتە سەر باوکیانو خزمی باوکیان.

جا لەبەر ئەمە شەریعەتی ئیسلام کە شەریعەتێکی دادپەروەرانەیە، بۆ نێرینە دوو چەندانەی مێینەی داناوە، تا لەنگەری دادپەروەریی لە نێوانیاندا رابگرێ، چونکە پیاو کە ئەم هەموو ئەرکەی لەسەرشانە بە تەنیا، ئەگەر لە میراتدا دوو چەندانەی بۆ دانەنرێ مەغدوور دەبێ.

## شایەدییەك دەربارەی ئافرەتی موسوڵمان:

کۆتایی ئەم باسەمان بەشایەدیەکی دکتور جۆستاف لۆبۆن دەهێنین کە دەربارەی ئافرەتی موسوڵمان دەڵێ:

ئەگەر بمانەوێ بزانین تا چ ئەندازەیەك قورئان رۆڵی گرنگی لە چۆنیەتی ئافرەت رزگاکردندا بینیوە پێویستە ئاوڕێك لە رابوردووی ئافرەت بدەینەوەو بزانین لە چەرخە زێڕینە گەشەدارەکانی مێژووی موسوڵماناندا ئافرەت چۆن رفتاری لەگەڵدا کراوە؟! چۆن کاروباری خۆی ئەنجام داوەو ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ هێناوە؟! مێژوو نووسان دەڵێن: ئافرەتی موسوڵمان لەو سەردەمە شکۆدارانەدا پلەو پایەی تایبەتی خۆیان هەبووە، بەجۆرێك ئەو مافەی کە ئێستا ئافرەتی خۆر ئاوایی تازە بەدەستی هێناوە ئەوان هەیان بووە! بەڵکوو پزیشکی موسوڵمانەکانی ئەندەلوس بوو کە روناکی خستە ئەوروپاوە، دابو نەریتی جوانو عادەتی پەسەندو رەوشتی بەرزیان لەو موسوڵمانانە وەرگرت.

لەمەو پێش ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد: کە ئەوروپاییەکان لە موسوڵمانەکانەوە یاساو دەستوورەکانی سوارچاکی فێربوون کە دەبن بە مایەی پیاوەتیو رێزگرتن لەژن. بێگومان ئیسلام – نەك ئایینی مەسیحی – ئافرەتی لە کۆیلایەتیو چەوساندنەوە رزگار کردو سەربەستی دایەو پلەو پایەی شیاوی خۆی پێ بەخشی!!

تۆ ئەگەر سەیری مێژووو سەرگوزەشتەی دەرەبەگە گاورەکانی چاخەکانی ناوەڕاست بکەی دەبینی ئەوان هیچ رێزێکیان لە ئافرەت نەناوە! ئەگەر لاپەڕەکانی مێژووی ئەو رۆژگارانە هەڵبدەیتەوە دەزانی کە دەرەبەگە گاورەکانی

ئـەو رۆژگـارە چـەند دڵـڕەق و بـێ بـەزەیی بـوون لەگـەڵ ئافرەتـدا. هـەتا لـە موسوڵمانەکانەوە فێری بڕێ رەوشتی جوان و پیاوەتی بوون! بـەڵام هێنـدەی پـێ نەچوو کە شارەستانیەتی موسوڵمانەکان لەدەست عەرەبەکان دەرهێنـدراو کەوتـە دەست تورکەکان و چەند گەل و هۆزێکی تر... ئیتر بەهۆی ئەوانـەوە نـرخ و پایـەی ئافرەت دابەزی و هاتـە کزی و سـەر لـەنوێ دەسـکرایەوە بـە چەوساندنەوەیان! لـە شـوێنێکی تـری ئـەم کتێبـەدا ئـەوە روون دەکەینـەوە: کـە هـەر چـەندە ئـافرەتی موسوڵمان ئێستا حاڵی وایە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا حاڵیان لە حاڵی ئـافرەتی خۆرئاوایی باشترە!!؟!

ئەوەی کە وترا ئەوە دەچەسپێنی کە ئەو زوڵم و ستەمەی کە موسوڵمانان لە ژنانی دەکەن بە پێچەوانەی فەرمانەکانی قورئـانی پـیرۆزە، بۆیـە لێـرەدا جارێکی تـر ئـەوە دووپـات دەکەینـەوە کـە ئـایینی ئیـسلام پلـەو پایـەی ئـافرەتی بەرزکردۆتەوەو هەمیشە هەوڵی داوە مافی خۆی بدرێتێ، ئێمـەیش یەکـەم دەنـگ نین کە لەم بارەوە بەرز بووبێتـەوە، بەڵـکوو پـێش ئێمـە چەند رۆشـنبیرو زانـای وەکوو کوسان دوبرسفال و مسیو بارتلمی سان هیلر ئەم دەنگەیان بەرز کردۆتەوەو ئەم رایەیان دەربڕیوە.

## بەشی بیستو سێیەم:

# یاسای جەنگ لە ئیسلامدا (نظام الحرب في الإسلام)

**جەنگ ناچارییەکی کۆمەڵایەتییە – تێروانینی یەهودییەکانو مەسیحییەکان لەشەڕو هەرا – بانگەوازیکردنی ئیسلام بۆ ئاشتی – شەڕ بە مەبەستی بەرگریکردن لەگیان – شەڕکردن لە ڕێگای خودادا – بەرامبەریکردن لە نێوان شەریعەتی ئیسلامو قانوونی دەوڵەتان لە بارەی شەڕەوە – خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگ – چەند ئامۆژگارییەکی گشتی لەکاتی شەڕدا – هێزی مەعنەوی – سەرانە – پەنا هێندە – عەهدو پەیمان – شایەدی برێ لە زانایانی خۆرئاوا دەربارەی فتوحاتی ئیسلامی.**

شەڕ: کێشەو بەرەو ململانێکی چەکدارییە لە نێوان دوو لایەن یان زیاتر بەرپا دەبێ، لایەکیان بەرزەمەندی خۆی دەستی پێ دەکاو لایەکەی تر بە ناچاری وەڵام دەداتەوەو بەبێ ویستی خۆی بەسەریا دەسەپێ... شەڕ هۆکارێکە فەرمانڕەواکان دەیکەن بە ئامێری دابینکردنی ئارەزوە سیاسییەکانیان یان ئارەزوە ئابورییەکانیانو خواستە ناوچەییەکانی خۆیانی پێ مسۆگەر دەکەن.

## شەڕ ناچارییەکی کۆمەڵایەتییە (الحرب ضرورة إجتماعية):

بێگومان شەڕو هەرا ناچارییەکی کۆمەڵایەتییە کۆمەڵانی ئادەمیزاد پەنای بۆ دەبەن بە مەبەستی حەلکردنی گیرەو کێشەی کۆمەڵایەتییان... کاتێك کە بە ئاشتی حەل ناکرێ، تەنانەت گەلێ جار کۆمەڵانی ئادەمیزاد سەرەڕای مەبەستە مادییەکانیان مەبەستی ڕۆشنبیریو وێژەییشیان هەیە لەبەر پاکردنی کۆشتارو جەنگدا، چونکە ئەگەر شەڕو هەراو ململانێو بەربەرەکانی نەبوایە ئادەمیزاد نەیدەتوانی پێشکەوتنی شارستانیو زانیاریی بەدەست بێنێ!!

هێگل کە یەکێکە لە ڕابەرانی بیری شوسیالیستی، پێی وایە کە گۆڕانکاریو پێشکەوتن لە هیچ گۆڕەپانێکدا بەبێ ململانێو بەربەرەکانی هێزە دژبەیەکەکان وە دەست نایێ.

مــارکس و ئینجلیــزیش دوای هێگــل هــەر ئــەم بۆچــوونەیان هــەبووە ئــەم فەلسەفەیان پەسەند کردوە.

شـایانی باسـە کـە قورئـانی پـیرۆز پـێش چوارده سـەده بـۆ چەسـپاندنی ئـەم راستییە دەست پێشخەری کردوە کە دەفەرموێ:

**{وَلَوْلاَ دَفْعُ اللّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ الأَرْضُ وَلَـكِنَّ اللّهَ ذُو فَـضْلٍ عَلَى الْعَالَمِينَ - سورة البقرة – ٢٥١}.**

واتە: خواستی خودا وایە کە ئەو خەڵـکە بـەرگری لـە خۆیـان بکـەن، لـەکاتی ناتەبایی خۆیاندا، دەنا سەر رووی زەوی تێك دەچوو.

ئایینی ئیسلام کە شەڕی چەسپاندووە لەبەر ئەوەی پێی وایە شەڕ هۆکارە بۆ حەلکردنی برێ گیرو گرفتی کۆمەڵایەتی، لەکاتێکدا کـە هێـزە ملهوڕو سەرپێـچی کـەران دەبنــە کۆسـپ و تەگـەرە لەبــەردەم بانگـەوازی حــەق و راسـتیدا. ئــەوەتا ئێستاش دەبینین وڵاتە خـۆر ئاواییـەکان دوای ئـەو هـەموو پێـشکەوتنی زانیـاری و شارەستانییەتە لە چەرخی بیستەمدا بـۆ حـەلکردنی گـیرو گرفتـی جـۆێ جۆێـیان پەنا دەبەنە بەر شەڕو جەنگ! دەی کەوابێ چۆن دەگونجێ و چـۆن عـەقڵ دەیـبڕێ کە ئیسلام پێش چواردە سەدە شەڕ نەکاو بەرەوای نەزانێ؟!

بەتایبـەتی کـە ئیـسلام هـاتووە بـۆ ئـەوەی گۆڕانکاریـەکی گـشتی لـە بـارەی ئایینی و کۆمەڵایەتیەوە بەرپا بکاو رەوڕەوەی ژیانی ئادەمیزاد سەر لەبەر بگـۆڕێ، بەم بۆچوونەش رای ناحـەزانی ئیـسلام پوچـەڵ دەکەینـەوە کـە کوێرانـە ئیـسلام تاوانبار دەکەن بەشـەڕخوازو دەڵێن ئـایینێکی شـەڕانییەو بـەزەبری شمـشێر بـڵاو کراوەتەوە؟! ئا ئەم تانەو تەشەرەیە دوژمنانی ئیسلام کردویانە بەوەسیلەو ئـامێر بۆ ناشـیرین کردنـی؟! ئـەوەتا (ماکدۆناڵد) لـە (دائـرة المعـارف الإسـلامیة)دا دەڵێ: (بێگومــان بڵاوکردنــەوەی ئیــسلام بــەزەبری شمــشێرو تــیرو کــەوان ئــەرکێکی سەرشانی هەموو موسوڵمانێك بووە). بۆیە ئێمـەش لێـرەدا هـاتین لـەم باسـەماندا ئەم تۆمەتە پڕو پووچ و بەتاڵەمان رەتکردەوە.

## لێڕوانینی ئایینی یەهودیو مەسیحی بۆ شەڕو هەرا

ئەگەر ئێمە بەمێژوودا بچینەوەو سەیری بەرنامەو چۆنییەتی ئایینە کۆنەکانی پێش ئیسلام بکەین، دەبینین کە ئایینی یەهودی شەڕی بەسەر پەیڕەوکارانی خۆیدا سەپاندووە، بە ئەرکی سەرشانی ئەوانی داناوەو هەبوونی خۆیو کونترۆڵکردنی دەورو بەرو داگیرکردنی وڵاتانو پەلهاویشتن بۆ ئەوەی گەلانی تر بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە لە شەڕدا دۆزیوەتەوە، هەموو بەرنامەو پڕۆگرامی لەسەر کوشتنو بڕینو قەڵاچۆکردنی دانیشتوانی وڵاتە داگیرکراوەکان بنیات نراوە. ئەوەتا لەنامەی پێنجەمی زەبووردا هاتووە دەڵێ: (هەر کاتێ خودای تۆ ئەتۆی بردە ناو وڵاتێ هەتا ببێ بە مڵکی تۆ کە خۆشی لەپێش تۆوە گەلێ میللەتی قەڵاچۆ کردوە! تۆ شەڕیان لەگەڵ بکە!! بیانکوژەو ئاسەواریان ببڕێنەوە، هەرگیز پەیمانیان لەگەڵدا مەبەستەو بەزەییت پێیاندا نەیەتەوە دڵنەرمیان لەگەڵدا بەکار مەهێنە!!

دوای ئەمە ئایینی مەسیحی هات سەر لەبەر هەموو جۆرە شەڕو هەرایەکی حەرام کرد، ئەوەتا بە گوێرەی ئینجیلی (مەتێ) حەزرەتی مەسیح فەرموویەتی: (ئەمن پێتان دەڵێم: هەرگیز بەرهەڵستیی شەڕ بەشەڕ مەکەنو خراپە بەخراپە وەڵام مەدەنەوە، بەڵکوو ئەگەر کەسێ شەقازللەیەکی لە روومەتی راستتدا، تۆ خێرا لای چەپیشی تێ بکە!).

ئەوانەی کە دەڵێن: شەڕ هەموو کاتێك بەهیچ جۆرێك حەڵاڵ نییەو نابێ بکرێ بەڵگەیەکی تریان فەرموودەکەی حەزرەتی مەسیحە کە بەقدیس بطرسی دەفەرموێ کە دەڵێ: (شمشێرەکەت بخەرە ناو کالانەکەیەوە چونکە هەموو ئەوانەی کە دەست دەدەنە شمشێر، خۆشیان بەشمشێر لەناو دەچن.

جا لەسەر ئەم بنەمایە ئایینی مەسیحی شەڕ حەرام دەکا، بێگومان زۆر لە پیاوانی مەسیحی ژیانی خۆیان لەرێگای ئاشتی دا بەسەر بردووەو زۆر هەوڵو کۆششیان داوە بۆ بڵاوکردنەوەی فکرەی ناڕەوایی شەڕو زیانەکانی تەنانەت

بڕێکیان پێیان وابووە عەسکەری کردن و چەك و تەقەمەنی دروستکردنیش حەرامەو کارێکی خراپە!

بریّ زانای تری مەسیحی هەوڵی زۆریان داوە بۆ ئەوەی ڕێگایەك بدۆزنەوە تا بتوانن لە نێوانی دەقەکانی ئینجیل و پێداویستییەکانی دەوڵەت و فەرمانڕەواییدا پێکەوە گونجانێ بسازێنن. لە ئاکاما گەیشتنە ئەوە کە شەڕیانکرد بەدوو بەشەوە: شەڕی ڕەواو شەڕی ناڕەوا، زۆرباش لێکۆڵینەوەیان لەم بارەوە ئەنجام دا، لە کۆتایی دا هاتنە سەر ئەوە کە پێناسەی شەڕی ڕەوایان بەوە کرد کە فەرمانڕەوا بانگی بۆ هەڵداو شەڕەکە خۆی لەخۆیدا دادپەروەری تێدابێ و ئەو کەسەی بانگەوازی بۆ دەکا نیازپاك بێ و ڕاستگۆبێ و نیازی لەو شەڕە تەماعکاری و دڕەندەیی نەبێ!

بێگومان لە چەرخی چوارەمی زایینی دا مەسیحییەکان کە دەوڵەتیان بۆ دروست بوو، بەسەر کردەیی (قسطنطين)ی ڕۆمانی ناچار بوون کە ریشەی بتپەرستی لە وڵاتی ڕۆمادا هەڵکێشن و زۆر بە توندی چەکی ئاگرو ئاسنشیان بەکار هێنا!! دەی باشە چۆن ئەمڕۆ ئەوانەی تانە لە ئیسلام دەدەن، دەیانەوێ ئیسلام شەڕ حەرام بکا لەکاتێکدا کە ئایینەکانی پێش خۆی کە ناچار بوون و هۆکاری ئاسایش کاریگەر نەبووە پەنایان بردۆتە بەر شەڕو بەگوێرەی پێویست بەکاریان هێناوە..!

یان دەیانەوێ کە ئیسلام شەڕ حەرام بکا، بەڵام هەرکاتێ پەیڕەوەکانی بەناچاری شەڕیان بوو بەتوشەوە شەڕ حەلاڵ بکەن و گوێ بەفەرمانەکەی ئیسلام نەدەن، وەك ئەمە لە ناو خاوەن ئایینەکانی تردا بووە بە باو! بێگومان یاسای ئیسلام زۆر لەوە بەرزترە کە شتێك دابهێنێ لەگەڵ عەقڵدا نەگونجێ.

## بانگەوازیی ئیسلام بۆ ئاشتی (دعوة الإسلام إلى السلم):

یاساناسانی جیهان چەند بنەماو دەستورێکیان داناوە بۆ بەرپرسیاری هەر دەوڵەتێك بەرامبەر دەوڵەتێکی تر لەکاتی ئاشتی و شەڕدا، یەکەم شتێك کە ئەو

زانایانە چەسپاندوویانە لەو رووەوە ئەوەیە پەیوەندی نێوان ئەو حکوومەت و فەرمانڕەوایانە لەسەر بناغەی ئاشتی دابمەزرێنرێ تاوەکوو بتوانرێ ئاڵ و گۆڕی سودو قازانج لەگەڵ یەکتردا بکەن، لە هەموو رویەکەوە هاریکاری یەکتر بکەن بۆ گەیاندنی کۆمەڵانی ئادەمیزاد بە کەماڵ و کامەرانی، هەموویان بڕیاری ئەوەیاندا کە نابێ بهێڵدرێ ئەم پەیوەندییە ئاشتییە بپچڕێندرێ، مەگەر لەبەر ناچاری و نەبوونی ڕێگاچارەی تر ئەوکاتە پەنا بۆ شەڕو ململانێ دەبرێ!

دەی ئایینی ئیسلام پێش چواردە سەدە بانگەوازیی بۆ ئەم فیکرەیە کردوە بەکردەوەش پەیڕەوی کردوە، ئەوەتا پەیوەندی نێوانی موسوڵمانان و نێوانی ناموسوڵمانانی لەسەر بناغەی ئاشتی و ئاسایش دامەزراندووە، هەرگیز ڕێگەی نەداوەو نادا ئادەمیزادێك بکوژرێ لەبەر ئەوەی بڕوای بە ئایینی ئیسلام نییە، قەت ڕێگە نادا موسوڵمانان ناحەزانی خۆیان قەلاچۆ بکەن لەبەر ئەوەی لەبیرو باوەڕدا جیاوازن! بەڵکوو فەرمانی کردوە بە موسوڵمانان کە لەگەڵ ناحەزانی خۆیاندا هەمیشە هەڵس و کەوتی جوان بنوێنن، سەوداو مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن و سودو قازانج لەیەکتری وەربگرن، ئەمەش بە ئاشکرا لەمانای ئەم ئایەتە پیرۆزەدا دەردەکەوێ کە دەفەرموێ:

{لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ، إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ - سورة الممتحنة – ٨-٩}.

واتە: پەروەردگار لاری لەوە نییە کە چاکە لەگەڵ ئەو غەیرە دینانەدا بکەن، کە نە لەسەر ئایین جون بەگژتاناو نە لەناو ماڵ و حاڵ و وڵاتی خۆتان دەریان کردوون، چونکە خودا دادپەروەری و میانەکاری خۆش دەوێ، بەڵام لاری لەوەیە کە بۆ ئەوانە باش بن کە لەسەر ئایین شەڕتان لەگەڵ دەکەن و لەماڵ و حاڵی خۆتان دەربەدەرتان دەکەن و پشتی ئەوانە دەگرن کە پەرتەوازەتان دەکەن یان بچن ئەمانە بکەن بە ئاغاو سەروەری خۆتان و کارو باری خۆتانیان پێ بسپێرن،

دەی هەرکەسێ ئەم جۆرە دوژمنانە بکا بە گەورەی خۆی بەراستی ستەمکارو ناهەقیکار خۆیەتی... یان دەفەرموێ:

{فَإِنِ اعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَاتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْاْ إِلَيْكُمُ السَّلَمَ فَمَا جَعَلَ اللّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلاً - سورة النساء – ٩٠}.

واتە: ئەگەر شەڕیان پێ نەفرۆشتن و لاشەڕبون و حەزیان لە ئاشتی و ئاسایش بوو لەگەڵ ئێوەدا، ئەوە لەم حاڵەدا خودا ڕێگە بە ئێوە نادا کە بەناهەق شەڕیان پێ بفرۆشن و گەڕیان پێ بکەن.

بەڵێ ئیسلام سوورە لەسەر چەسپاندنی ئاشتی و ئاسایش لەناو کۆمەڵانی ئادەمیزادا ئەوەتا قورئان دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ ادْخُلُواْ فِي السِّلْمِ كَآفَّةً وَلاَ تَتَّبِعُواْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ - سورة البقرة – ٢٠٨}.

واتە: ئەی موسوڵمانان! ئێوە ئیمانەکەتان فرمانتان پێ دەکا کە بچنە ژێر ئالای ئاشتییەوە! دەی هەمووتان بە گشتی بچنە نێو ئاشتییەوە دەستدرێژی مەکەنە سەرکەسێ کە دەستدرێژی نەکردۆتە سەرتان و شەڕی تێ نەئاڵاندون... هەندێکی تر لەو ئایەتانەی کە ئادەمیزاد هەڵدەنین بۆ ئاشتیخوازی ئەم ئایەتایە کە دەفەرموێ:

{وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ - سورة الأنفال – ٦١}.

واتە: ئەی پێغەمبەر! ئەگەر تۆو هاوڕێکانت توشی شەڕێك هاتن و دوژمن مەیلی ئاشتی و لاشەڕی هەبوو ویستی صوڵح و ڕێککەوتن ئەنجام بدا، ئێوەش ئەو هەڵوێستەیان لێ قبووڵ بکەن و بەرەو پیری ئاشتی بچن، چونکە ئیسلام ئایینی ئاشتییە.. بەڵێ ئەم ئایەتە دەرگای ئاشتی دەخاتە سەرپشت و داوا دەکا هەموو موسوڵمانان لەو دەرگاوە بچنە ژوورەوە! چونکە ئەم هەڵوێستە لەگەڵ سروشتی ژیاندا گونجاوە و هۆکارێکە بۆ لابردنی دیاردەی شەڕو هەرا.ئەوەی سەرنج ڕاکێشە ئەوەیە کە ئیسلام ئەوەندە سوورە لەسەر ئاشتی کە لە هیچ ئایین و ڕێبازێکی

تردا وێنەی نابیندرێ ئەوەتا (سەلام) کە دەق بەمەعنا ئاشتییە کراوە بە کلیلی چاك و چۆنی نێو موسوڵمانان و رۆژانە موسوڵمانان لەناو خۆیانداو لەگەڵ خەڵکانی تریشدا بۆ رۆژ باشی مەلایین جار دەڵێن (السلام علیکم: لە سێبەری ئاشتی دابن).

## ئەو حاڵەتانەی کە ئیسلام تێیاندا شەڕ بەڕەوا دەبینێ:

شەڕ بە مەبەستی بەرگری کردن لەگیان (القتال للدفاع عن النفس):

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) چەند ساڵ لەمەککەدا مایەوە خەریکی بانگەوازیکردنی ئیسلامی بوو بەبێ ئەوەی شەڕ لەگەڵ کەس بکا، هەر چەندە قورەیشییەکان ئازاریان دەدا ئەو خۆی دەگرت و ئارام و خۆگری زیاتر دەبوو، ئەو ماوەیەی لە مەککەدابوو ماوەیەکیش لە مەدینە ئەوپەڕی ئێش و ئازاری لە عەرەبکانی مەککەو جولەکەکانی مەدینەوە پێ گەییشت زۆر جار هاوڕێکانی دەهاتنە خزمەتی بەلێدراوی و سەرشکاوی و برینداری، رازو گلەیی و سکاڵای حاڵی خۆیان دەکرد داوایان لە پێغەمبەر دەکرد رێگایان بدا تۆڵەی خۆیان بستێننەوەو بەرگری لەگیانی خۆیان بکەن؟! پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پێی دەفەرموون صەبرو ئارام بگرن، چونکە تا ئێستا فەرمانی شەڕکردنم پێ نەدراوە، تەنانەت بڕێ لە هاوڕێکانی بەسزاو ئەندێشەی کافرەکان گیانیان لەدەست داوە، یەکێ لەو شەهیدانە سومەییەی دایکی عەممارو مێردەکەی یاسر بوون کە خێڵی موغەیرە لەسەر موسوڵمان بونیان سزایان دان بۆ ئەوەی لە ئیسلام هەڵگەڕێنەوە، بەڵام ئەوان پەشیمان نەبوونەوە، تا لەژێر ئازاردا شەهید بوون و گیانیان بە بەهەشتی بەرین شادبوو.

پاشان روداوەکان پەرەیان سەندوە بێ بڕوایان زۆر شێوەو شێوازی سزا دانیان بەکار هێنا تاگەییشتە ئەوە کافرەکان بڕیاری شەهیدکردنی پێغەمبەریاندا، کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەم پیلانەیانی زانی بڕیاری کۆچکردنی خۆی و یارانی بۆ مەیدنەدا ئەو مەدینەیەی کە دانیشتوانی بەو پەڕی رێزەوە پیشوازییان لێکردو

پەیمانی ئیسلامییان لەگەڵدا بەست و بەسەرو ماڵ داکۆکییان لێکرد. کافرەکان هەر بە ئەوەندە نەوەستان کە هەوڵی لەناوبردنی پێغەمبەریاندا بەڵکوو هەموو هەوڵ و کۆششێکی خۆیانیان خستە گەڕ بۆ کۆکردنەوەو گەلە کۆمەکیکردنی هۆزو خێڵە عەرەبەکان دژی بانگەوازی کردنەکەی و هەوڵدان بۆ قەڵاچۆکردنی.

ئیتر لە بەرامبەر ئەم هەموو دژایەتییکردنەدا هیچ ڕێگایەك نەمایەوە جگە لەوە کە ڕێگەی پێغەمبەر درا بە شەڕکردن لەگەڵ کافرەکاندا.ئێمە کاتێك ئەو ئایەتە قورئانییانەی کە پەروەردگار فەرمانی شەڕکردنی تێدا بە پێغەمبەر داوە دەخوێنینەوەو لێیان ورد دەبینەوە، دەبینین کە ئایەتەکان ئەوە دەسەلمێنن کە شەڕ وەسیلەیەو ڕێگاچارەیە بۆ قەڵاچۆکردنی دەست درێژیکردن و زوڵم و ستەم، ئەوەش دەسەلمێنین کە سروشتی ئادەمیزاد وایە زۆر جار بەرەو دووبەرەکی و کێشەو ناکۆکی دەڕوا هەر کەسە گەرەکییەتی مافی یەکێ تر پێشێل بکاو دەستدرێژی بکاتە سەر بێ دەسەڵاتان. ئەوەتا بەرون و ئاشکرایی قورئان ئاماژە بۆ ئەمە دەکاو دەفەرموێ:

{أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ، الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّا أَن يَقُولُوا رَبُّنَا اللَّهُ وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللَّهِ كَثِيرًا وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ - سورة الحج – ٣٩-٤٠}.

ئەم دوو ئایەتە بەبێ پەروا ئەوە دەگەیەنن کە پەروەردگار ڕێگەی شەڕکردنی بە موسوڵمانان داوە هۆی ئەم ڕێگە بێدانەشی ڕونکردۆتەوە بەوە کە موسوڵمانان زوڵم و ستەمیان لێکراوەو دەستدرێژییان کراوەتە سەرو بەناڕەوا لەماڵ و حاڵی خۆیان وەدەرنراون و زێدو نیشتمانی خۆیان پێ بەجێ هێڵراوە، ئەمجار ئەوە رون دەکاتەوە کە پەروەردگار بۆیە لە هەموو چەرخ و سەردەمێکا یاسای شەڕکردن و بەرگری لەگیانی بۆ خودا پەرستان بەڕوا داناوە، ئەگەر ئەم یاسایەی دانەنایەو بەرگری لە بیرو باوەڕو گیان و ماڵ ڕەوا نەبوایە لەسەردەمی هەموو پێغەمبەرێکا پەرستگاکان و شوێنەکانی خودا پەرستی خابوور دەکران،

دێرو کەنیشەو جێگە نوێژی جولەکەو مزگەوتەکانی موسوڵمانان دەڕوخێنرا!!
ئەمجار قورئانی پیرۆز دوا بە دوای ئەو دو ئایەتەی پێشوو ئەم ئایەتەی فەرموو:

{الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ - سورة الحج – ٤١}.

کە ئەوە دەگەیەنێ: مەبەست لە سەرکەوتنی موسوڵمانان فراوانکردنی دەسەڵاتومالْو سامانو وڵات نییە وەکوو دەوڵەتە ئیستیعمارییەکان دەیکەن، مەبەست ئەوە نییە دەست بگرن بەسەر سەرچاوەی بەربوومدا یان بۆ ئەوە دەسەڵاتیان بەسەر وەڵاتێکا بشکێو فیزو دەعیە لێ بدەن! بەڵکوو موسوڵمانان ئەگەر سەربکەونو دەسەڵات پەیدا بکەن نوێژ دەکەنو روو لە پەروەردگار دەکەنو سەری نوازشیو بەندەگی بۆ نەوی دەکەن دڵو دەروونی خۆیان بە بەندایەتیکردنی خۆیان بۆ خودا پاك دەکەنەوە، زەکاتی ماڵیان دەردەکەنو لەو ماڵو سامانەی هەیانە بەشی بێ نەواو هەژارو لێقەوماوانی لێ دەدەنو باری کۆمەڵایەتی ئەوان راست دەکەنەوە، فەرمان بە چاکە دەکەنو خێرو خۆشیو حەقو راستی لەناو کۆمەڵدا بڵاو دەکەنەوە، نەهی لە خراپە دەکەنو دژی شەڕو فەساد دەجەنگنو زوڵمو ستەم ریشەکێش دەکەن.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کە شەڕی لەگەڵ بێ بڕوایان دەکرد بۆیە شەڕی دەکرد تا بەربەرچی دەستدرێژیکردنی ئەو خوانەناسانە بداتەوە، لەلایەن خوداوە فەرمانی شەڕکردنی پێکراوە:

{وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ، وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأَخْرِجُوهُم مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ وَالْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ الْقَتْلِ وَلاَ تُقَاتِلُوهُمْ عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ حَتَّى يُقَاتِلُوكُمْ فِيهِ فَإِن قَاتَلُوكُمْ فَاقْتُلُوهُمْ كَذَلِكَ جَزَاء الْكَافِرِينَ، فَإِنِ انتَهَوْاْ فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ، وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلّهِ فَإِنِ انتَهَواْ فَلاَ عُدْوَانَ إِلاَّ عَلَى الظَّالِمِينَ - سورة البقرة – ١٩٠-١٩٣}.

ئەم ئایەتە پیرۆزانە فەرمان بە موسوڵمانان دەکەن کە لەرێگەی خودادا شەڕ لەگەڵ ئەوانەدا بکەن کە شەڕیان پێ دەفرۆشن. فەرمانیان پێ دەکەن کە لەهەر شوێنێك فرسەتیان لێ هێنان لێیان بدەنو تەفرو تونایان بکەنو لێکیان بلاو بکەن، وەکوو چۆن لەوە پێش کافرەکان ئەوانیان پەرتەوازە کردوە، داوایان لێ دەکا لەکاتی تۆڵەسەندنەوەدا زیادە ڕەوی نەکەن چونکە پەروەردگار دەستدرێژیکەرانی خۆش ناوێن.

ئەمجار ئایەتەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە دەرکردنی موسوڵمانەکان لە خانوو بەرەی خۆیان ترساندنیانو ئازارو ئەشکەنجە دانیان بەمەبەستی ئەوەی لە ئایینەکەیان هەڵیانگێڕنەوە زۆر گوناهترە لە کوشتن. چونکە بەلا لەوە گەورەتر نییە بۆ ئادەمیزاد کە لەسەر بیرو باوەڕ سزابدرێو بچەوسێندرێتەوە، کەوابوو ئەرکی سەرشانی موسوڵمانانە کە شەڕ لەگەڵ ئەو ئاژاوەگێڕانەدا بکەن! ئەمجار ئایەتەکان موسوڵمانان لەوە قەدەغە دەکەن کە لەلای شوێنە پیرۆزەکاندا شەڕ لەگەڵ کافرەکان بکەن! بەلام ئەگەر دوژمن ئەتکی بە شوێنە پیرۆزەکان کردو شەڕیان تیایاندا هەڵگیرساند ئەوکاتە موسوڵمانان بۆیان هەیە بەرپەرچی دوژمن بدەنەوە... دوای ئەوە ئایەتەکان بەوە کۆتاییان دێ کە مەبەستی شەڕو بەربەرەکانییەکە ڕون دەکەنەوە کە بریتییە لەوە بەندەگی هەر بۆ خودا بکرێو چەوتی لە ئاییندا بەرپا نەبێ ئادەمیزاد هەموویان سەربەستی بیرو باوەڕ بەدەست بێننو کەس نەتوانێ بیانچەوسێنێتەوە.

## شەڕکردن لەرێگای خودادا (القتال في سبيل الله):

کۆمەڵی موسوڵمانانان بەپرسیارن کە دادوەری لەسەر زەویدا بچەسپێنن... ئەمەش پێویست دەکا کە موسوڵمانان بەگیانو ماڵ کۆشش بکەنو بەرامبەر زوڵمو ستەم بوەستنو لەهەر شوێنێك دیاردەی زۆر داری بەدیار کەوت ریشەکێشی بکەن، نابێ مەبەستیشیان لەو کۆششو هەوڵدانە داگیرکردنی زەویو زارو کانو بەروبووم بێ، یان بۆ ئەوەی بێ کە خەڵکی بخەنە ژێر دەستی

خۆیانەوەو بیانچەوسێننەوە، بەڵکوو دەبێ هەوڵ و کۆششەکەیان بۆ چەسپاندنی وشەی (الله) بێ بۆ ئەوەی دەنگی (لا اله الا الله) بەرز بێتەوە، فەرمانی خودا پەیڕەوی بکرێ و قورئان یاساو قانوون بێ بەمەش دەگوترێ کۆششکردن لە ڕێگەی خودادا شەڕکردن لە پێناو ئایینی خوادا، قورئان دەفەرمووێ:

{وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ - سورة البقرة – ٢٤٤}.

یان دەفەرمووێ:

{وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ - سورة الحج – ٧٨}.

ئاشکراشە ڕێگەی خودا ڕێگەی حەق و ڕاستییە، هەموو شەڕێکی کە دەکرێ، بەمەرجێ بۆ خاتری ئایین بێ و داکۆکی کردن بێ لە ئایین، ئەوە بە ڕێگەی خودا دەژمێردرێ، هەموو شەڕێك کە بۆ قەڵاچۆکردنی زوڵم و زۆرداری بێ یان بۆ یارمەتی بێنەوایان بێ و مەبەست سەرخستنی حەق و ڕاستی بێ بەسەر ناحەقدا، ئەوە شەڕکردنە لە ڕێگەی خوادا، هەر ڕێگەیەك مرۆڤ بگەیەنێتە حەق و ڕاستی و وای لێبکا داکۆکی لە حەق بکا ئەوە کۆششکردنە لە ڕێگەی خودادا.

قورئانی پیرۆز لەزۆر ئایەتەکانیدا موسوڵمانان هەڵدەنێ بۆ شەڕکردن لە ڕێگەی خوداداو داوایان لێ دەکا کە هەوڵ و کۆششی خۆیان تەنها لەبەر خودا بێ و هیچ مەبەستێکی دنیایی تێدا نەبێ، بڕوانە مانای ئەم ئایەتانەی کە لە مەدینە بۆ پێغەمبەر هاتوون چۆن مەبەستەکانی جیهاد ڕون دەکەنەوە:

{فَلْيُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يَشْرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا بِالآخِرَةِ وَمَن يُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللّهِ فَيُقْتَلْ أَو يَغْلِبْ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا، وَمَا لَكُمْ لاَ تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاء وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا - سورة النساء – ٧٤-٧٥}.

ئەوەتا لەم دوو ئایەتەدا ئاماژەیەکی جوان هەیە کە مەبەستی شەڕ لە ئیسلامدا بۆ ئەوە نییە کە دەسەڵات بە سەروڵاتاندا پەیدابکرێ و کۆمەڵانی خەڵك بکرێتە ژێر دەستەو بچەوسێندرێنەوە، بەڵکوو شەڕ لە ڕوانگەی

ئیسلامەوە بۆ چەسپاندنی ئایینی خودایە لەسەر زەوی، بۆ بەرژەوەندی فەقیرو هەژارانە کە کافرەکان دەیانچەوسێننەوە، مەبەست لە شەڕەکانی پێغەمبەرو هاوەڵانی دژی بێ بڕوایان رزگارکردنی ئەو موسوڵمانە فەقیرانەی مەککە بوو کە بێ بڕواکان، چەرمەسەرییان دەدان و جۆرەها سزاو ئەشکەنجەیان دەدان تا نەهێڵن کۆچ بکەن و لە ئیسلام هەڵیان بگێڕنەوە، بۆیە پەروەردگار پێیان دەفەرموێ: ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! ئەو هەژارو فەقیرانەی لە مەککەدا ماون هانایان بۆ خودا هێناوە، پێویستە ئێوە بەهانایانەوە بچن و یارمەتییان بدەن زوڵم و ستەمیان لەسەر لابەرن.. ئەمجار دوای ئەو دوو ئایەتە دەفەرموێ:

{الَّذِينَ آمَنُواْ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَالَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ فَقَاتِلُواْ أَوْلِيَاء الشَّيْطَانِ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفًا - سورة النساء – ٧٦}.

وشەی (الطاغوت) بەکەسێك دەگوترێ کە لەسنوور دەرچێ و زیادە رەوی بکا، هەر شتێك لە ئەندازەی خۆی دەربچێ سەرپێچی فەرمانی خودا بکا، بە طوغیان حسێب دەکرێ!! کە ئادەمیزادیش سنووری بەزاندو زیادەڕەوی کردو خۆی بەزلزانی و هەوڵی فەساد بلاوکردنەوەی دا لەسەر زەوی و خەڵکی بەکۆیلەو بەندەو ژێردەستە سەیرکردو مافی پێشێلکردن و لەبەروبوومی زەوی بێ بەشیکردن، ئەوە شەڕکردنە لە پێناوی طاغوتداو هەڵوێستێکە خودا نەفرینی لێ کردووەو بەردوشمی بێ بڕوایانی داناوە. بەڵام شەڕو کۆشش لە رێگەی خوادا مەبەستەکەی ئەوەیە کە یاسای خودایی ئالای بەسەر جیهاندا بشەکێتەوە، بەبێ ئەوەی ئەو کۆششکارانە هیچ مەبەستێکی تایەبەتی دونیایی خۆیان هەبێ، یان بیانەوێ دەسەلاتی جیهان بەدەستەوە بگرن و فیزو لوتبەرزی بنوێنن! خودا دەفەرموێ:

{تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ - سورة القصص – ٨٣}.

واتە: ئەو خانەی دوا ڕۆژە بە خۆیو نازو بەهرەی ناویەوە خەلاَتی تایبەتی ئێمەیە تەرخانمان کردوە بۆ ئەو خودا پێداوانەی کە نایانەوێ لەولاَتدا لوتبەرزیو سەرکەشی روبدا، سەرەنجامی باش هەمیشە خەلاَتی لە خواترسانە.. دەگێڕنەوە دەڵێن جارێك عەرەبێکی دەشتەکی بە پێغەمبەری گوت (درودی خودای لەسەربێ): پیاوی وا هەیە بۆ تالاَن شەڕ دەکا، هەیە بۆ ناوو شۆرەت شەڕدەکا، هەیشە شەڕ دەکا تا جێگە دەستی دیاربێو پێی بڵێن: ئازایە، ئەمانە کامەیان لە رێگەی خودادایە؟! پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەوەلاَمی دا فەرمووی: (هەر کەسێ شەڕ بکا بۆ ئەوەی شەریعەتی خودا سەربکەوێ، ئەوە لە رێگەی خودادا شەڕ دەکا).

بەکورتی موسوڵمانان دەبێ هەمووکات لە تێکۆشاندا بنو خەریکی هەوڵو کۆشش بن مەبەستیشیان چەسپاندنی شەریعەتی خودا بێ: کە سیستەمێکی هەقەو لەگەڵ شروشتی راستو دروستی ئادەمیزاد دەگونجێو بەختەوەریو سەرفرازی بۆ مرۆڤ لە ئامێز گرتووە.

کۆمەڵی موسوڵمانانیش بەرپرسیارن بۆ لابردنی زوڵمو ستەم لەسەر تاكو کۆمەڵ لە هەموو جیهاندا بەبێ ئەوەی جۆری رەنگو زمانو ڕەچەڵەكو ئایینیان بە بەرچاو بگیرێ؟! خودا بە کۆمەڵی موسوڵمانان دەفەرموێ:

{وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيداً- سورة البقرة – ١٤٣}.

واتە: ئێوەمان کردوە بە میللەتێکی میانکاری دادپەروەر، تا ببن بە شایەت لەسەرچاکیو خراپی ئەو خەڵکە، وە پێغەمبەریش ببێ بەشایەت لەسەر کرداری باشو خراپی ئێوە، هەتا بتوانن چارەسەری لاریو خواری ئەو خەڵکە بکەن.

لەم ئەرکە پیرۆزەشدا هیچ زێدەرێژیك بۆ هۆزێك بەسەر هۆزێکی تردا نییە، یان بڵێین: نزمی گەلو نەتەوەیەکی تێدا نابیندرێ، هەرگیز نابێ نەتەوەیەك خۆی بە هەڵبژاردەو بێ خەوش بزانێو خەڵکی تر بەکەم رێزو هیچو پوچ دابنێ، چونکە ئەرکی ئیسلامیو پەیڕەوکردنی فەرمانەکانیو ملکەچکردن بۆ یاسای خوداییو هەوڵدان بۆ بلاَوبوونەوەو چەسپاندنیان لەسەر زەوی

تایبەتمەندی هیچ نەتەوەیەك نیەو بۆ نەتەوەیەكی تر نەبێو لێی یاساغ بێ!!
بەڵكوو پەروەردگار ئەركی جیهادی ئیسلامیو خۆبەختكردنی لەپێناو ئاییندا كردوە بە دروشمو نیشانەی ئەوانەی بڕوایان بە بنەماو یاساكانی ئیسلام هەیە، بەبێ ئەوەی نژادو رەنگو زمانو وڵاتو زێد دەورێكیان لەم ریزەدا هەبێ!!
ئایەتەكانی قورئان ئاشكران لەوەدا كە ئیسلام ئایینێكی گشتییە بۆ هەموو ئادەمیزادو تایبەتمەندی كەس نییە خودا بە پێغەمبەر دەفەرموێ:

**{قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ يُحْيِـي وَيُمِيتُ فَآمِنُواْ بِاللّهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَكَلِمَاتِهِ وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ - سورة الأعراف – ١٥٨}.**

واتە: بفەرموو: ئەی مەردوم! من پێغەمبەری خودام خودا رەوانەی كردووم بۆ سەر هەمووتان وەك یەك... دیارە كە خودا خاوەنی ئاسمانەكانو زەوییە، هەر خۆی خودایەو بەس، ژیانو مردن بەدەست خۆیەتی، تازووە باوەڕ بە خوداو بە پێغەمبەری خودا بكەن، كە نیشانەی ئەم پێغەمبەرەی وایە: باوەڕێكی ساغی تەواو دامەزاوی بە خودا هەیە، پێغەمبەرێكی نەخوێندەوارە، پەیڕەوی شەریعەتێكی بێ گەردی خودایی دەكا، دەی تازووە پەیڕەوی ئەم زاتە بكەن تارێگەی هەق بگرن.

هەر بۆیەشە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) نوێنەری خۆی بەنامەی تایبەتییەوە ناردوە بۆلای پادشاو سەرۆكەكانی ئەو وڵاتانەی كە دراوسێی دورگەی عەرەب بوون، تەنانەت هێشتا ناوخودی مەككەو مەدینە پاك نەكرابووەوە كە نامەی پێغەمبەر نێردرا بۆلای كیسرای شای ئێران، قەیسەری پادشای رۆم.. هتد. ئەم نامانە بانگەوازیكردن بوون بۆ ئیسلام، بەڵام ئەوانە بانگەوازییەكەیان رەت كردەوەو بەپیر بانگەوازییەكەوە نەهاتن.. هەیانبوو نوێنەرەكەی پێغەمبەری شەهید كرد، هەیانبوو نامەكەی پێغەمبەری دڕاندو هەڕەشەی توندیشی لە پێغەمبەركرد، ئیتر موسوڵمانەكان ناچار بوون كە شەڕ لەگەڵ ئەو ملهوڕانەدا بكەن بە تایبەتی كە

بۆیان دەرکەوت کە ئەو خوا نەناسانە سەفیرو نوێنەری پێغەمبەریان شەهیدکردوو سوکایەتیان پێکردن‌و بەسیاسەتی زوڵم‌و ستەمکاری وەڵامیان دانەوە.

جا کە موسوڵمانەکان خۆیان ئامادەکرد بۆ شەڕکردن لەگەڵ فارس‌و ڕۆمدا کە ئەوکاتە زوربەی جیهان لەژێر دەسەڵاتی ئەم دوو ملهوڕانەدا بوو، لە ماوەیەکی کەمدا توانییان ئەم دوو دەوڵەتە ملهوڕە ستەمکارە بڕوخێنن‌و ئیسلام لەناو وڵاتانیاندا بڵاو بکەنەوە!! لەڕاستی دا ئەم دوو دەوڵەتە داهێزابوون‌و مۆرانەو خۆرکەیان تێ کەوتبوو چونکە چەند جار لەگەڵ یەکتردا کەوتبوونە شەڕو جەنگی کاولکارییەوە، بەتەواوی یەکتریان هیلاك کردبوو، لەبارەی رامیاری‌و کۆمەڵایەتیشەوە بەتەواوی تێك شکابوون، چونکە لەگەڵ هاووڵاتی خۆیاندا سیاسەتی کوتەکیان بەکار دەهێناو زوڵم‌و ستەمیان لێ دەکردن‌و باج‌و سەرانەی زۆریان دەخستنە سەرو، تا بیانتوانییایە دەیانچەوساندنەوە بەمەش گیانی نیشتمانپەروەری‌و خۆشەویستی بۆ پاشاو گوێڕایەڵی بۆ فەرمانڕەواکانیان تێدا مردبوو، لەلایەکی ترەوە دانیشتوان بیرو باوەڕی جیاوازو هەمە جۆرو پڕو پوچیان هەبوو، ئایینی زەردەشتی کە فارس‌و کورد بە میرات بۆیان بەجێ مابوو گۆڕانکاری تێدا کرابوو، تا وای لێهاتبوو ببوە ئاگرپەرستی‌و چەند داب‌و نەریتێکی ئەفسووناوی‌و پڕ لە زوڵم‌و ستەم، بەجۆرێك کە رەشە خەڵکەکە لەناخەوە رقیان لێ بوو، بەنهێنی دژی بوون، دیاردەیەکی ئایینی پێوە نەمابوو!! ئەو کێشەو بێنەو بەرەی کە لە فەلسەفەی یونانەوە بۆیان بەجێ مابوو ئەوەندەی تر ئایینەکەی شێواندبوو تاوای لێهاتبوو هەردوو ئایینی مەجووسی‌و مەسیحی بوبوونە چەندەها تاقم‌و کۆمەڵ‌و ڕێبازی جیاو دژ بە یەکتر، هەریەکەیان ئەوی تری دەچەوساندەوە، هەر تاقم‌و کۆمەڵێك دەیویست ئەوی تر قەلاچۆ بکا!

ئەم هۆیانە زۆر کاریگەر بوون بۆ سەرکەوتنی موسوڵمانەکان بەسەر هەردو ئیمپراتۆڕی فارس‌و ڕۆم دا! تەنانەت سوپای ئیسلام لە هیچ شوێنێك بەرەوروی بەرگری میللی نەدەبووەوە، زوربەی خەڵکەکە بەبێ شەڕ هاتنە ژێر ئاڵای

ئیسلامەوە، بە ماوەیەکی کەم گزنگی خۆری ئیسلام بەناو ئیمپراتۆری فارسو رۆمدا بڵاو بووەوە.

## بەرامبەریەکی نێوان ئیسلامو قانوونی دەولی دەربارەی شەڕو جەنگ:

ئاشکرایە ئیسلام شەڕی بەڕەوا زانیوەو دەزانێ، بەڵام بەرەحمەتو بەزەییو مرۆڤایەتی شورای کردوە، یاسایەکی دادوەرانەی بۆ داناوە... کە تا ئێستاش شارەستانیەتی چەرخی بیستەم پەی پێ نەبردوە تەنانەت لێشی نزیك نەبۆتەوە!! بێگومان ئیسلام چەند یاسایەکی بۆ شەڕ داناوەو پەیڕەویکردنی ئەو یاسایانەی بە پێویستییەکی سەرەکی داناوە، بۆ ئەوەی تا بکرێ شەڕو زیانی شەڕی پێ کەم بکرێتەوەو مافی مرۆڤی تێدا پێشێل نەکرێ، بەمەش ئەو پەڕی رەحمو بەزەیی بۆ مرۆڤ رەچاو کردوە.

ئەم یاسایانەی ئیسلام لە زۆر شوێندا لەگەڵ قانوونو یاسا جیهانییەکانی ئەمڕۆ یەك دەگرنەوە، بەڵام ئەم یاسا ئیسلامییانە جیاوازییەکی بنەڕەتییان لەگەڵ یاسا نێو دەوڵەتییەکاندا هەیە، ئەویش ئەوەیە یاسای ئیسلامی یاسایەکی ئایینیەو بڕوای موسوڵمانان پێی دەبێ بە مایەی چەسپاندنی، بەڵام یاسا نێو دەوڵەتییەکان هێزێکی تایبەتی مەعنەوی وایان لەگەڵ نییە کە ببێ بەهۆی چەسپاندنیان، مەگەر بەزۆری کوتەك، تەنانەت بڕی رۆشنبیرو زانا پێیان وایە: کە ناونانی ئەو یاسایانە بە یاسای دەولی لەجێی خۆیدا نیەو بەچاو لێپۆشین نەبێ ناتوانی ناوی لێبنێی (قانوونی دەولی) چونکە قانوون کاتێك قانوونە: کە هێزێك هەبێ هێزی چەسپاندنی پێ بداو وابکا حکوومەتەکان گەردنکەچی بڕگەکانی بن... دەی خۆ هێزێك بتوانێ حکوومەتەکان گەردنکەچی ئەو قانوونە بکا نییە! بەڵام ئەحکامی ئیسلامی دەربارەی شەڕ هەرچەندە حوکمەکان هەموویان دادوەریو بەزەییان تێدایە بیروباوەڕی موسوڵمانانیش پارمەتیدەرێکی باشن بۆ جێبەجێ کردنیان. جا لەسەر ئەم بنەمایە ئەحکامی ئیسلامی دەربارەی شەڕ دانراونو پەیڕەوییان لێ دەکرێ. وەکوو لەمەدوا رونی دەکەینەوە.

- یاسا نێودەوڵەتییەکان ئەوەیان چەسپاندوە: کە پێویستە ئەو حکوومەتەی ناچار دەبێ: کە جاڕی شەڕ بدا لە دژی دەوڵەتێکی تر، دەبێ لەپێشدا ئاگاداری دەوڵەتەکەی تر بکاتەوەو کاتی شەڕ دەستپێکردنی بۆ دیاری بکاو هەڕەشە لە حکوومەتەکانی تریش بکا بۆ ئەوەی بێ لایەنی خۆیان دەرببڕن، مەبەستیش لەم ئاگادارییە خۆ پاراستنە لەبێ ویژدانیو ئاشوب گێڕێ.

لە شەریعەتی ئیسلامیشدا هاتووە دەڵێ پێویستە لەسەر موسوڵمانان پێش ئەوەی دەست بکەن بەشەڕ لەگەڵ بێ بڕوایان بانگەوازی ئیسلامییان پێ رابگەیەننو داوایان لێ بکەن موسوڵمان بن.

بێگومان مێژوو چەسپاندویەتی: کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەگەڵ هیچ هۆزو نەتەوەیەکدا شەڕی نەکردوە هەتا لەپێشدا بانگی نەکردبن بۆ ئیسلام بوون، هەرکاتێکیش لەشکرێکی بناردایە بۆ شەڕ فەرمانی بەسەر لەشکرەکە دەکرد کە بەو جۆرە هەڵسو کەوت بکا! ئیمامی موسلیم لەصەحیحەکەی دا ریوایەتی کردوە دەفەرمووێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بە برێ لە سەرکردەکانی خۆی فەرموو: کاتێ توشی دوژمنی خۆت بووی لە هاوبەشپەیداکەران لەپێشدا داوای یەکێ لەم سێ شتەیان لێ بکە، هەرکامێکیان پەسەندکرد تویش پەسەندی بکە: یا ئیسلام بون، یان سەرانە، یان شەڕکردن. سەرانەش باجو خەرجێکی سامانییە نیشانەی ئەوەیە: کە سەرانەدەرەکە گەردنکەچی دەسەلاتی موسوڵمانانە. وەکوو لەوە دوا باسی دەکەینو شی دەکەینەوە.

- قانوونی دەولی ئەوەی چەسپاندوە کە ئەو خەڵکەی ناچنە ریزی سوپاوەو خەریکی کارو باری خۆیانن بەشەڕکەر حسێب ناکرێنو نابێ زەرەرو زیانیان پێ بگا، چونکە پێناسەی (محارب): شەڕکەر تایبەتە بەسەربازو چەك بەدەستو جەنگاوەر! دەی خۆ شەریعەتی ئیسلامیش بە ئاشکرا ئەمەی چەسپاندووە، ئەوەتا قورئان دەفەرموێ:

{وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ - سورة البقرة – ١٩٠}.

واتە: شەڕ لەگەڵ ئەوانەدا بکەن کە شەڕتان لەگەڵ دەکەنو زیادە رەوی مەکەن، سنوورو یاسا مەشکێننو تەعەدا مەکەن. دەی خۆ تەعەداکردن ئەوەیە

کەشەڕ لەگەڵ کەسانێك بکرێ کە شەڕکەرنین، وەکوو کوڕو کچو ژنی دوژمن یان نەخۆش و پیرو پیاوە ئاینییەکانیان...هتد.

ڕەباحی کوڕی ڕەبیعە دەڵێ: لە غەزایەکدا لەگەڵ پێغەمبەر بووم، لە شوێنێکدا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) خۆی و هاوەڵانی لاشەی ئافرەتێکی کوژراویان چاو پێکەوت، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هەڵوێستەیەکی کردو فەرمووی: نەدەبوو ئەم ئافرەتە بکوژرێ! ئەمجار ڕوی کردە هاوەڵانی و بەصەحابەیەکی فەرموو خێرا بگەرە خالیدی کوڕی وەلیدو پێی بڵێ: نابێ منداڵ و ڕەنجبەرو ئافرەت بکوژرێن[٢].

لەوکاتەش دا کەسوپاسی موسوڵمانان خۆی ئامادە دەکرد بۆ غەزای (مۆتە) پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموون: بەهیچ جۆرێك ئافرەت مەکوژن، منداڵی بێ دەسەڵات و پیری پەککەوتە مەکوژن، باخ و دارخورماو میوەی تر مەسوتێنن. درەخت و نەمام هەڵمەکێشن و خانوو بەرە مەڕوخێنن.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هەرکاتێ سوپایەکی ڕەوانەی بەرەی شەڕ دەکرد پێی دەفەرموون دانیشتوانی دێرو خەڵوەخانەکان مەکوژن.

- قانوونی دەولی مەنعی کردوە کە لەشەڕدا بریندار بکوژرێ، دیلەکانی سزا بدرێن، یان بکوژرێن، هەروەها یاساغی کردوە کە قونبوولەو بۆمی کۆکوژو ڕوخێنەر بەکار بهێندرێن، هەروەها یاساغی کردوە کە جۆگەو جۆربارو بیرو کانیاو زەهراوی بکرێن، هەروەکووو چۆن ڕێز گرتنی لاشەی کوژراوانی شەڕی بەپێویست داناوەو ئەتککردنی ئەو لاشانەی بەحەرام داناوە! دەی ئایینی ئیسلامیش ئەم شتانەی هەموو حەرام کردوە! ئەوە مێژوو شایەتە کەپێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هەر کاتێ صەحابەیەکی دەکردە سەرلەشکر یان لێپرسراوی کۆمەڵێك صەحابە ئامۆژگاری سەرکردەو هاوەڵەکانی دەکرد کە لەخودا بترسن و بەپێی فەرمانی خودا ڕەفتار بکەن، ئەمجار پێی دەفەرموون: بەناوی خودا لەپێناو ئایینی خودادا غەزا بکەن، شەڕ لەگەڵ ئەوانەدا بکەن کە خودا نەناسن،

---

[٢]- ئیمامی موسلیم ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە.

گـزیو دزی لـه تـالانی مەکـەنو ناهـەقیو بـێ پـەیمانی مەکـەن، کـوژراو ئـەتك مەکەنو لووتو گوێی کەس مەبڕنو منداڵی ساوا مەکوژن[4]! تەنانەت لە ئیسلامدا ئەگـەر دوژمـن سوکایەتیش بەشـەهیدانی موسـوڵمانان بکـا وا چاکە تۆڵـەی ئـەو سوکایەتی پێکردنـە بـەو شێوەیە نەکرێتـەوە... واتـە ئەگـەر دوژمـن (کافرەکـان) دەمو لـوتی شـەهیدێکیان بـڕی چـاك وایــە موســوڵمانان نەچـن دەمو لـووتی کوژراوێکیان ببڕنەوە، چونکە کە لە غەزای ئوحووددا بێ بڕواکان سوکایەتییان بە حـەزرەتی هـەمزە کـردو جـەرگیان دەرهێنـا، هـەروەها هـەتکی چـەند شـەهیدێکی تریان کرد پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) سوێندی خـوارد فـەرمووی: ئەگـەر خـودا زاڵـم بکـا بەسـەریانو فرسـەت لـەو خوانەناسـانە بێـنم دەبـێ دووچـەندانە هـەتکیان بکەمەوەو سوکایەتیان پێ بکەم!! بەڵام پەروەردگار ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوارەوە کە دەفەرموێ:

{وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُواْ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّابِرينَ، وَاصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلاَّ بِاللّهِ - سورة النحل – ١٢٦-١٢٧}.

واتە: ئەگەر تۆڵە دەستێنن بەقەد ئەو تۆڵەیـەبێ کـە لـەئێوە سـەندراوە، وەڵێ ئەگەر بە ئارامو بەمۆڵەت بن ئـەوە گـەڵێ باشـترە، ئـەی موحەممـەد صـەبر بگـرە: صەبری تۆ بەراستی بۆ خودایەو بەتەوفیقی خودایە.

حـەزرەتی ئـەبو بـەکر یەکـەم جێنـشینی موسـوڵمانان – کـە لەشـکرەکەی ئوسامەی بـەڕێ کـرد ئامۆژگـاریی کـردنو فـەرمووی: ناپـاکیو گزیکـاری مەکـەن، دەستپییـسی لـە تاڵانـدا مەکـەن، بـێ پـەیمانی مەکـەنو پـەیمان مەشـکێننو لاشـە ئەتك مەکەنو منـاڵی بـچووك مـەکوژنو پـیرو کەفتـەکار مـەکوژنو ژن مـەکوژنو دارخورمـا مـەبڕن دارو درەختـی بـەری دامەپاچـنو مـەڕو مـاڵاتو گـاوو مانگـا مەکوژنەوە مەگەر بۆ خواردنی خۆتان.

---

[4] ئیمامی موسلیم ئەم حەدیسەی گێڕاوەتەوە. تاج/ج ٣٦٥/٤.

- قانوونی دەولی چەند دەستووریکی هەیە بۆمامەلەکردن لەگەڵ دیلدا بە گویرەی ئەو یاسایە نابێ دیلەکان بکوژرێن یان بریندار بکرێن یاخۆ سووکایەتییان پێ بکرێو هەڵسو کەوتی ناشیرینیان لەگەڵدا بکرێ، کاتێ خۆیان بەدەستەوەدا یان دەست بەسەرکرانو ئازادییان لێ سەندرایەوە دەبێ مامەڵەی مرۆڤانەیان لەگەڵ بکرێ!!؟ دەی شەریعەتی ئیسلامیش زۆر بە روونیو بە ئاشکرایی موسوڵمانانی هەڵناوە کە، بەشێوەیەکی گشتی رێزی دیل بگرن، تەنانەت رێزگرتنی دیلو چاکە لەگەڵکردنی بەنیشانەی ئیماندار دانا وە، خودای مەزن مەدحی ئەو موسوڵمانانەی کردوە کە چاکە لەگەڵ دیلدا دەکەن کە دەفەرموێ:

{وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا، إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا - سورة الإنسان – ٨-٩}.

واتە: خۆاك لەبەر رەزای خودا دەبەخشن بە هەژارو هەتیوو دیل، بە زوبانی حاڵ پێیان دەڵێن: مەبەستمان لەم خۆراك بەخشینە رەزای خودایەو بەس، چاوەڕوانی پاداشو سوپاسی ئێوە نین.

پێغەمبەری مەزنیش (درووودی خودای لەسەربێ) هەمیشە ئامۆژگاری هاوەڵەکانی دەکرد کە بەشێوەیەکی جوان لەگەڵ دیلدا بجوڵێنەوە، فەرموویەتی: (أحسنوا أسراهم) واتە: بەجوانی رەفتار لەگەڵ دیلی دوژمن دا بکەن لەکاتی دیلیدا. لەلایەکی ترەوە ئیسلام فەرمانڕەوای موسوڵمانانی خاتر خۆ کردوە کە بە ئارەزۆی خۆیو بۆ بەرژەوەندی گشتی ئیسلام دیلەکان بەپارە یان بێ پارە رەها بکرێن.

{فَإِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّى إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً - سورة محمد – ٤}.

واتە: هەرکاتێ لەرێزی شەڕدا روو بەڕووی بێ بڕوایان بوونەوە، دەستیان لێ مەپارێزن، لەملیان بدەن، تا بە تەواوی تێکیان دەشکێننو کوشتارێکی زۆریان لێ دەکەنو هێزی شەڕکەریان لەناو دەبەن، ئەوجا بکەونە دیلکردنیان بەشەتەکی توند پەل بەستیان بکەن دوایی بەپیاوەتی بەرەڵایان بکەن یان بەسەرانەو بارمتە بەریان بدەن.

## خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگ (الإستعداد للحرب):

هەندێك لە دیاردە جوانەکانی شەریعەتی ئیسلامی ئەوەیە: کە شەریعەتێکی عەمەلییە، روبەڕوی گیرو گرفتەکانی ژیان دەبێتەوە بە حەللێکی عەمەلی... هەرکاتێ ئامۆژگاریو نەصیحەت کاریگەر نەبوو، دوژمنانی ئیسلام بەهاوسایی‌و تەبایی لەگەڵ موسوڵمانان دا رازی نەبوون ژیانیان بەرنە سەر، دەستبەرداری عەهدی پەیمانی نێوان خۆیان‌و موسوڵمانان بوون‌و ویژدانیان بەکار نەهێناو پەیرەوی سەربەستی‌و بیرو باوەڕی ئازادیان نەکرد، ئەوە بێگومان شەڕ دەبێتە رێگە چارەیەکی ناچاری‌و موسوڵمانان ناچار دەبن پەنای بۆ بەرن، بۆیە ئیسلام فەرمانی بە موسوڵمانان کردوە کە هەمیشە خۆیان ئامادە بکەن‌و تفاقی شەڕو جەنگ پەزمەندە بکەن‌و هەموو پێداویستییەکی بۆ دابین بکەن... خودا دەفەرموێ:

{وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدْوَّ اللّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لاَ تَعْلَمُونَهُمُ اللّهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فِي سَبِيلِ اللّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لاَ تُظْلَمُونَ - سورة الأنفال – ٦٠}.

پەروەردگار لەم ئایەتەدا فەرمانی بە موسوڵمانان کردوە کە خۆ ئامادە بکەن بۆ بەگژداچوونەوەی دوژمنان‌و هەمیشە هەوڵی ئەوە بدەن کە پێداویستی جەنگ بۆ جەنگاوەرانی موسوڵمانان دابین بکەن، هەرچی تواناو دەسەڵاتێکیان هەیە بیخەنە گەڕ بۆ بەهێزکردنی خۆیان‌و تەیارکردنی لەشکرو سوپایان... تا دوژمنی خوداو خۆیانی پێ بترسێنن... ئەمەش تایبەتی سەردەمێك‌و کۆمەڵێك نییە، بەڵکوو فەرمانەکەی خودا فەرمانێکی گشتییەو هەموو ئەوشتانە دەگرێتەوە کە شان‌و شەوکەتیان زیاد دەکاو بەهێزیان دەکا بۆ شەڕکردن، هەروا هەموو ئامێرو هۆکارێکی وەکوو قەڵاو سەنگەرو چەکی زەمینی‌و دەریایی‌و ئاسمانی دەگرێتەوە. هەموو کارگەو فێرگەی دروستکردن‌و فێرکردنی چەك‌و جۆرەکانی دەگرێتەوە.. مەعنای (ومن رباط الخيل) لەم ئایەتەدا ئەوەیە کە ماین‌و ئەسپ‌و وڵاخی بەرزە

بۆ شەڕ پەروەردە بکرێن‌و مەشقیان پێ بکرێ. جا پەروەردگار کە فەرمانی بەوە کردوە، چونکە ئەو سەردەمە ئەسپ‌و ولاخە بەرزە ولاغی سواری بوون بۆ شەڕ بەکارهێنراون، جا ئەگەر رۆژگار گۆڕاو پیشەسازیی پێشکەوت لەجیاتی ئەسپ کەشتی‌و تانگ‌و زرێپۆش‌و فڕۆکەو موشەك بەکارهاتن، پێویستە لەسەر موسوڵمانان کە بەگوێرەی توانا لەم جۆرە پێداویستیانە بۆ جەنگاوەرانی خۆیان دابین بکەن‌و خۆیان تەیارکەن... مەبەستیش لە دابینکردنی ئەم پێداویستیانە ترساندنی دوژمنانە بۆئەوەی بیر لەوە نەکەوە پەلاماری موسوڵمانان بدەن‌و بەرژەوەندییان بخەنە مەترسییەوە، بۆ ئەوەی موسوڵمانان لەزێدو نیشتمانی خۆیاندا بەئاسایش ژیان بەسەر بەرن... ئەمەش لە زاراوەی رامیاری ئەمڕۆدا پێی دەگوتر: (السلم المسلح) ئاشتی پڕچەك، کە ئیسلام زۆر پێش ئەوەی دانیشتوانی خۆر ئاوا پێی بزانن‌و پەی پێ بەرن لەسەر موسوڵمانانی فەرزکردوە. ئەوەش مانای بەشێك لە ئایەتەکەیە کە دەفەرموێ: (ترهبون بە عدو الله وعدوکم) لە کۆتایی ئایەتەکەشدا دەبینین قورئان موسوڵمانان هەڵدەنێ بۆ خەرجکردنی ماڵ‌و دارایی بۆ ئامادەکردنی هێزی سەربازی، چونکە بەبێ سەرفکردنی ماڵ‌و دارایی، ئەم مەبەستە نایەتەدی: ﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فِي سَبِيلِ اللّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لاَ تُظْلَمُونَ﴾. هەر شتێك خەرج بکەن لە پێناوی ئایینی خوادا پاداشتان دەدرێتەوە هیچ چاکەیەکتان هون ناکرێ.

قورئانی پیرۆز لە ئایەتێکی تردا ماڵ سەرفکردنی لە پێناو ئایینی خوادا بەهۆکاری تێشکان‌و فەوتان داناوە دەفەرموێ:

﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ - سورة البقرة — ١٩٥﴾.

واتە: ئەی موسوڵمانان ماڵ لە پێناوی سەربەرزی دینی خوادا بەخت بکەن، دەنا ئەگەر وانەکەن ئەوا بەدەستی خۆتان خۆتان دەخەنە ناو فەوتان‌و سەرتیاچوونەوە... چونکە شتێکی سروشتییە هەرکاتێ ئێوە کەمتەرخەمیتان

کردو برێك لەماڵو دارایی خۆتان خەرجکرد بۆ بەرگریو بەرەنگار بوونەوەی دوژمنان، ئێوە گیانی بەرگریکردنتان تێدا دەمرێو دوژمن تەماعتان تێ دەکاو قەلاچۆتان دەکا.

## ئامۆژگارییە گشتییەکانی کاتی جەنگ (وصايا عامة أثناء الحرب):

کاتی هەڵگیرسانی شەڕو هەرا لایەنێکی گرنگی بەرنامەو دەستوورنامەکانی ئیسلام بە دەردەکەوێ، کە بە ئاشکراو بێ پەروا داوای لەپەیڕەوانی خۆی کردوە کە پەیڕەوی کەنو بە ئەرکی سەرشانی خۆیانی بزانن. ئەو لایەنە گرنگە کۆڵەکەی سەرکەوتنو پیرۆزی بەدەست هێنانە بەم دوو ئایەتە پەروەردگار چۆنیەتی هەڵسو کەوتی پێویستی موسوڵمانانی شیکردۆتەوە کە دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُواْ وَاذْكُرُواْ اللّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلَحُونَ، وَأَطِيعُواْ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَلاَ تَنَازَعُواْ فَتَفْشَلُواْ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَاصْبِرُواْ إِنَّ اللّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ - سورة الأنفال – ٤٥-٤٦}.

ئەم دوو ایەتە پێنج ئامۆژگاری گرنگیان لەخۆ گرتون.

١- خۆراگریو گۆڕەپان بەرنەدان لەکاتی بەرامبەریو شەڕو پێکدادانداو هەڵنەهاتنو پشتنەکردنە دوژمن. یاساو پرۆگرامی جەنگەکانی سەردەم وادانراون کە هەر سەربازێك لە هێڵی بەرەی شەڕ هەڵبێ کوشتنی بەرەوا دادەنرێو لەکاتی هەڵاتنندا دەکوژرێ، ئەگەر ئەو کاتەش نەکرا بکوژرێ هەرکاتێ بەردەست کەوت بە گوێرەی یاسا ئیعدام دەکرێ! ئەمەش بۆ ئەوەیە نەوەکوو سەربازەکانی تریش چاوی لێ بکەنو ئەوانیش هەڵاتن هەڵبژێرنو ترس بکەوێتە نێوان ریزەکانی شەڕکەرانەوەو توشی شکستی ببن!

٢- یادکردنو ناوهێنانی خودا لەکاتی شەڕدا، چونکە یادکردنی خوداو ناوهێنانی زۆر کاریگەرەو هۆکارێکی گرنگە بۆ سەرکەوتن. لەم رووەوە ئیمانو بیرو باوەڕ هێزێکی مەعنەوی دەداتە جەنگاوەرو پاڵپشتی هۆکارە مادییەکان دەکاو چەکێکی کاریگەری ترە.

٣- گوێڕایەڵی، گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پەروەردگار، ئەوەش پەیڕەوکردنی ئەو ئامۆژگارییانەی کە خودا فەرمانی پێکردون و گەشەو ژیانەوە دەخاتە نێو کۆمەڵی موسوڵمانانەوە، هەروا گوێڕایەڵی بۆ پێغەمبەر لەو شتانەدا کە فەرمانیان پێ دەکا دەربارەی جەنگ. بێگومان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تا خۆی لە ژیان دابوو لە زوربەی ئەو جەنگانەدا کە موسوڵمانان دژی بێ بڕواکان کردویانن خۆی سەرپەرشتیار بووەو سەر لەشکرو لێپرسراوی یەکەم بووە، دوای لە دونیا دەرچونیشی فەرمانی کردوە کە موسوڵمانان گوێڕایەڵی جێنشین و فەرمانڕەوایانی موسوڵمانان بن و بێ فەرمانیان نەکەن، قورئانی پیرۆزیش دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ - سورة النساء}.

بەگوێکردنی سەر لەشکرو جێبەجێکردنی ئامۆژگارییەکانی هۆکارێکی گرنگە بۆ سەرکەوتن.

٤- کێشە دروست نەکردن چونکە کێشەو دووبەرەکی لەکاتی جەنگدا سەر دەکێشێ بۆ تێشکان و نوچدان و سەرکەوتنی دوژمن بەسەریاندا.

٥- سەبرو خۆڕاگریی لەسەر ئازارو برسییەتی و نارەحەتی و ئەو ترس و لەرزەی کە توشیان دەبێ لە دوژمنەوە، چونکە ئاشکرایە کە خودا هەمیشە یارمەتدەرو پاڵپشتی خۆڕاگرانە، خۆڕاگری و پشوو درێژی و بەربەرەکانیکردنی دوژمن گەورەترین هۆی سەرکەوتنە، یەکێکیش لەو ئامۆژگاریانەی کە لە فەرمودەکانی پێغەمبەردا هەیە، ئەم فەرموودەیە کە دەفەرموێ: (الحرب خدعة) واتە: جەنگ تەفرەدانەو بەهەڵەبردنی دوژمنە! لەم فەرموودەدا هەڵنانی موسوڵمانانی تێدایە کە لەشەڕدا زۆر وریابن و وردبینانە سەیری هەڵس و کەوتی دوژمنان بکرێ و لەهەمانکاتدا تا بۆیان دەکرێ دوژمن بەهەڵە بەرن و فێڵی لێ بکەن، ئەمڕۆش ئەم تیۆرو بۆچوونەی پێغەمبەر جۆرێکە لە هونەری جەنگ و لەکۆلێژە سەربازییەکاندا لێکۆڵینەوەی تێدا دەکرێ و بەوانە دەگوترێتەوەو دەخوێندرێ و بەسەر چاوەیەکی سەرەکیش دادەندرێ بۆ دەستەبەرکردنی سەرکەوتن.

## هێزی مەعنەویو کاریگەری لەجەنگدا (القوة المعنوية في القتال):

موسـوڵمانان لەجەنگـدا دوو جـۆرە چـەکیان هەیـە، چـەکی مـاددیو چـەکی مەعنەوی... لێرەدا دەمانەوێ بزانین چەکی مەعنەوی چیەو کاریگەری چۆنە؟!

چەکی مەعنـەوی: بـەو بـڕواو ورەیـە دەگـوترێ کـە لـەدڵ دا خـۆی داکوتـاوەو لەسـینەدا چەسـپاوە، ئـەویش بریتییـە لـەو بـیرو بـاوەڕەی کـە جـەنگاوەران بـە خودایان هەیە خۆیان بەبەندەی ئەو دەزانن‌و واهەست دەکەن کەلـەپێناو ئـایینی ئەودا خۆیان بەخت دەکەن ئەمەش لەسەر چەند بنەمایەك بنچ بەست دەبێ:

١- خودا لەگەڵ موسوڵمانانەو بـەهێزی فریـشتەو دەسـەڵاتی بـێ پایـانی خـۆی کۆمـەکیان پـێ دەکـاو تـرس‌و لـەرز دەخاتـە دڵـی دوژمنانـەوەو هێـزی شـەڕو بەرەنگاریو خۆراگرییان تێدا دەمرێنێ!

خودا دەفەرموێ: {إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلآئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُواْ الَّذِينَ آمَنُواْ سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُواْ الرَّعْبَ } سورة الأنفال/(١٢).

واتـە: پـەروەردگار نیگـای کـرد بـۆ فریـشتەکان، کـەمن خۆشـم لەگـەڵ ئێـوەم، ئـادەی بەپـشتیوانی مـن سوپای موسـوڵمانان دابمـەزرێنن، وا خۆشـم تـرس‌و لـەرز دەخەمە ناو دڵی سوپای کافرانەوە هەتا ورەیان بڕووخێ.

دەی دەبـێ ورەو هێـزی ئـەو جەنگاوەرانـە چـۆن بـێ‌و چـەند بـێ کاتـێ کەدەبیسێ‌و دەزانێ کەخودای گەورەی لەگەڵ دایەو بەفریشتە کۆمـەکی پـێ دەکـا، ئەمجار ئەوەش دەبیستێ کە کۆمەڵی خاوەن بڕواو ئیماندار باکەمیش بن زۆر جار بەسەر کۆمەڵی زۆرو لەشکری بەهێزدا زاڵ دەبن: {قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلاَقُـو اللّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِـإِذْنِ اللّـهِ وَاللّـهُ مَـعَ الـصَّابِرِينَ} سـورة البقرة/(٢٤٩). یان ئەم ئایەتە دەفـەرموێ: {إِن يَكُـن مِّـنكُمْ عِـشْرُونَ صَـابِرُونَ يَغْلِبُـواْ مِئَتَـيْنِ وَإِن يَكُـن مِّـنكُم مِّئَـةٌ يَغْلِبُـواْ أَلْفًـا مِّـنَ الَّـذِينَ كَفَـرُواْ } سـورة الأنفال/(٦٥). بەڵێ ئەو بیست کەسەی زاڵ دەبن بەسـەر دوو سـەد کـەس دا یـان ئەو سەد کەسەی کەبەسەر هەزار کەس دا زاڵ دەبن ئەوە ئەو کۆمەڵە کەمـەن کـە بەسەر کۆمـەڵی زۆردا زاڵ دەبـن چونکە خـاوەنی چـەکی مەعنـەوین کـە ئـەویش

چەکی ئیمان‌و باوەڕە، کە هەموو کەم‌و کوڕییەکیان بۆ قەرەبوو دەکاتەوەو وایان لێدەکا کە بەسەر دوژمنیان دا زاڵ ببن!!

٢- یەکێکی تر ئەوەیە کە پەروەردگار دەرگای هێواو ئومێدی لەبەردەم جەنگاوەراندا کردۆتەوە بەوە کە موژدەی پاداشی گەورەی پێ داون، بەتەمای پاشە ڕۆژی خۆشی‌و بەختەوەری کردون، وەکوو لەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ:

{فَالَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخْرِجُواْ مِن دِيَارِهِمْ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَاتَلُواْ وَقُتِلُواْ لأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ ثَوَابًا مِّن عِندِ اللّهِ وَاللّهُ عِندَهُ حُسْنُ الثَّوَابِ - سورة آل عمران – ١٩٥}.

یەکێکی تر ئەوەیە کە پەروەردگار موسوڵمانانی هەڵناوە بۆ ئەوەی کە لەرێگەی ئەودا غەزا بکەن. شەڕکردن‌و خۆبەختکردنی لەلا خۆشەویست کردون بەوە کە پەیمانی پێداون کە پاشەڕۆژ هەر بۆ ئەوانە، چ شەهید ببن یان بمێنن، بەختەوەری هەر بۆ ئەوانە چونکە ئەگەر سەرکەون‌و شەهید نەبن ئەوە دەبنە خاوەنی دەسەڵاتی سەر زەوی

{وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ - سورة النــور – ٥٥}.

خۆ ئەگەر شەهید بکرێن ئەوە بەهەشتی بەرین جێگایانە:

{وَلَئِن قُتِلْتُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَوْ مُتُّمْ لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ اللّهِ وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ - سورة آل عمران – ١٥٧}.

ئەمجار دەبینین قورئانی پیرۆز شێوەو شێوازێکی تر دەگرێ‌و بەتەعبیرێکی تر دەروونی بڕواداران زاخاو دەداتەوەو هێدیەتی‌و ئارامی دەخاتە ناو دوو توێی دڵیانەوەو لە دڵەڕاوکێ دوریان دەخاتەوە، هیوای ژیانی دوا ڕۆژیان پێ دەبەخشێ‌و ئەوەیان پێ دەسەلێنێ کە ئەم شەهیدبوونە مردنی یەکجاری نیەو کۆتایی ژیانی هەتایی نییە، بەڵکوو ئەو شەهیدانە مردنەکەیان بریتییە لە گواستنەوەیەکی

تایبەتی و دەچنە ژێر سایەی رەحمەتی بێ پایانی خوداو بەزیندویی لەو پەڕی خۆشیدا ژیانی ئەو دونیایان بەسەر دەبەن:

{وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ - سورة آل عمران – ١٤٩}.

بێگومان ئوسلووبی قورئان لەم بارەوە بەچەند شێوەو شێواز رازاوەتەوە، بۆ ئەوەی موسوڵمانان هەڵنێ بۆ کۆشش و فیداکاری و خۆبەختکردن وەکوو ئەوە کە دەفەرموێ:

{إِنَّ اللّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنجِيلِ وَالْقُرْآنِ وَمَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ مِنَ اللّهِ فَاسْتَبْشِرُواْ بِبَيْعِكُمُ الَّذِي بَايَعْتُم بِهِ وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ - سورة التوبة – ١١١}.

ئەوەتا لەم ئایەتەدا پەروەردگار کۆشش و خۆ بەختکردنی لەدڵی بڕواداران دا شیرین کردوەو، بە مامەڵەو سەوداو گۆڕینەوەی حسێب کردوە، بەڵام لێرەدا کڕین و فرۆشتنی نێوان بەندەو پەروەردگارە!! نەك مامەڵەو سەودای نێوان خاڵە باپیزو حاجی سەردارە! لێرەدا خودا خۆی کڕیارەو بەندە فرۆشیارە! دەی کێ لەخودا زیاتر پابەندی بەڵێن و پەیمانە؟؟ کێ لەخودا راستگۆترە لە بەڵێن و گوفتارا؟؟ لێرەدا خودا بەهەشتی بەرینی پڕ لەخۆشی کردوە بە بەهای گیانی شەهیدان و جەنگاوەران هەر کاتێ ئەوان بەدڵسۆزی و لێبوردویی گیانی خۆیان بەخشی، شایانی پاداشی خۆیانن کە بەهەشتی بەرینەو خودا خۆی بەڵێنی پێداون... جا کە لێرەدا پەروەردگار موسوڵمانانی هەڵناوە بۆ خۆبەختکردن لەپێناو ئایینی ئیسلامداو بەتەمای پاداشی رۆژی دوایی کردون، جیهادو کۆششی لەلا خۆشەویست کردون، دەبینین لە شوێنی تردا هەڕەشە لەوانە دەکا کە پاڵ دەدەنەوەو جیهاد ناکەن، لەوە دەیانترسێنێ کە بە ژیانی دونیاوە خەریك بن و

قیامەتیان لەبیربچێتەوە، بۆیان رون دەکاتەوە کە رێزو گرنگی ژیانی قیامەت هەرگیز نەبڕاوەیەو ژیانی دونیای بێ بایەخ بەرامبەری ناکا. خودا دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ انفِرُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ اثَّاقَلْتُمْ إِلَى الأَرْضِ أَرَضِيتُم بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا مِنَ الآخِرَةِ فَمَا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ قَلِيلٌ - سورة التوبة – ٣٨}.

ئەی ئیمانداران! ئەوە چیتانە کە پێتان دەگوترێ راپەڕن و رابن بڕۆن بۆ غەزاو جیهاد لە رێگای خودادا خۆتان دەدزنەوەو بیانووی جۆراو جۆر دەهێننەوە؟! ئایا ئێوە خۆتان هەڵەوگیری ژیانی دونیاکردوە؟ ژیانی قیامەتتان لەبیرخۆ بردۆتەوە؟! بزانن کە ژیانی جیهان لەبەرامبەر ژیانی قیامەتدا شتێکی زۆر کەم و کەم بایەخە.

ئەمجار پەروەردگار لەم شێوە هەڕەشەیە دەگوێزێتەوە بۆ جۆرێکی ترو دەفەرموێ:

{إِلاَّ تَنفِرُواْ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلاَ تَضُرُّوهُ شَيْئًا وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ - سورة التوبة – ٣٩}.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا پەروەردگار هەڕەشە لە موسوڵمانان دەکا بەوە کە ئەگەر لەشکرانی بکەن و خۆ لە جیهان بدزنەوە، توشی سزای سەختیان دەکا، سزای ژێردەستەیی، کۆیلایەتییان بەسەردا دەسەپێنێ دەسەڵات و فەرمانڕەواییان لێ دەستێنێتەوەو دەیدا بەگەل و نەتەوەیەکی تر.

جا لەبەر ئەوەی کە شەڕ خۆی لەخۆیدا دڵگیرنیەو دەروونی ئادەمیزاد پێی ناخۆشە پەروەردگار لەئایەتێکی تردا پێیان دەفەرموێ: کە هەرچەندە شەڕ بۆ خۆی کارێکی دزێوەو دەروونی مرۆڤ پێی ناخۆشە، بەڵام دەسکەلاو هۆیە بۆ کاری پیرۆزو خۆشەویست کە بەرزکردنەوەی دروشمی ئیسلامە، زۆر جاریش وا دەبێ ئێوە شتێکیان پێ ناخۆشە کەچی بونەکەی دەبێتە خێرو خۆشی، جاری واش هەیە شتێکتان پێ خۆشە کەچی بوونەکەی دەبێتە هۆی ناخۆشی و شووم، خودا بۆ خۆی دەزانێ چی باشەو چی خراپە، ئێوە نازانن.

{كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَى أَن تُحِبُّواْ شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَاللّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ - سورة البقرة - ٢١٦}.

## سەرانە (الجزية):

دەوڵەتی ئیسلامی پێش ئەوەی ئیعلانی جەنگ لەگەڵ حكوومەتێكی تردا بكا، دەبێ خاتر خۆی بكا لە نێوان سێ شتدا - ئیسلام بوون، سەرانەدان، شەڕكردن - مەبەست لەسەرانە ئەوەیە: كە ئەو دەوڵەتە بكەوێتە ژێر پاراستنی موسوڵمانانەوەو خۆیان سەرپەرشتیاریان بكەن تا شەڕو شوومیان دڵنیابن، هەروەها بۆ ئەوەی بانگەوازیی ئیسلامی بە ئازادیی ئەنجام بدرێو بانگەوازییەكە بگاتە هەموو چینو كۆمەڵێك، بێ زۆرە ملێو جەخت، ئایین بڵاوبێتەوە بانگەوازیكەرانی موسوڵمان بەراشكاویو ئەمینی كاری خۆیان ئەنجام بدەنو كەس نەتوانێ دەستدرێژییان بكاتە سەر.

سەرچاوەو بنەمای ئەم (سەرانە)یە لە شەریعەتی ئیسلامدا. ئەم ئایەتەیە كە دەفەرموێ:

{قَاتِلُواْ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَلاَ يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللّهُ وَرَسُولُهُ وَلاَ يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُواْ الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ - سورة التوبة - ٢٩}.

واتە: ئەی گەلی موسوڵمان! لەگەڵ ئەوخاوەن نامانەدا بجەنگن كە ئیمانی تەواوی ساخیان نەبەخودا هەیە نە بەرۆژی دوایی، هەروەها ئەو شتەی كە خوداو پێغەمبەری خودا حەرامی كردوە، ئەوان بەحەرامی نازانن، بە ئایینی راستو دروست رفتار ناكەن، بەردەوام جەنگیان لەگەڵ بكەن هەتا بەداماویو كەساسی بەدەستی خۆیان سەرانەتان دەدەنێ.

سەرانە: خەرجو باجێکی تاکە کەسییە، ئیسلام لەسەر ئەو ناموسوڵمانانە داینـاوە کـە لـەژێر چـاودێریو پارێزگـاریی دەوڵـەتی ئیـسلامدا دەژیـنو مـافی هاوولاتیان بۆ هەیە. واتە: دەوڵەتی ئیسلام وەك لە موسوڵمانان زەکات وەردەگـریَ لـە ناموسـوڵمانانیش سـەرانە وەردەگـریَ، بـەو مەبەسـتە کـە هـەموو کەسـێك لـە دانیشتوانی ناو حکوومەتی ئیسلامی (موسوڵمان بێ یـان کـافر) بـەگوێرەی توانـای دارایی خۆی ئەرکی بەرژەوەندی گشتی بکەوێتە سەر شان!

بـەڵێ پێویـستە سـەرانە لـەو نـا موسـوڵمانانە بـسێنریَ چـونکە مـافی دانیـشتوانیان هەیـەو سـوود لـەو مافـە وەردەگـرنو دەوڵـەتی ئیـسلامی وەکـوو موسوڵمانان دەیانپـارێزیَ، هـەر کەسێکیـشیان لیَ موسـوڵمان بـوو سـەرانەی لەسـەر لادەچیَو دەبیَ زەکات بدا!

ئـاییـنی ئیـسلام لێرەشـدا پێویـستی مرۆڤایـەتیو بـەزەیی لـە بیرنـەکردوە، لەهەندیَ کات دا سەرانە لەهەژارو بیَ توانای ناموسوڵمانان وەرناگریَ! بەڵکوو کـە پێویست بوو لە بـەیتولمال موچـەیان بـۆ تـەرخان دەکـاو بـەخێویان دەکـا.. ئـەوەتا خالیدی کوڕی وەلید لەو نامەیەدا بۆ دانیشتوانی حیرەی نارد دەڵیَ: هـەر کەسـێك پـیرو کەنـەفت بـوو نەیـدەتوانی ئـیش بکـا یـان دەوڵەمەنـدبوو هـەژار کـەوت هـاو دینـەکانی خـۆی یارمـەتییان نـەدەدا، سـەرانەی لەسـەر هـەڵبگرنو بـژێوی خـۆیو مـاڵو منـداڵی لـە بـەیتولمال دابـین بکـەن بـە مـەرجێك لـە سـنووری حکوومـەتی ئیسلامی دا دابنیشیَ.

ئیمام ئەبو یوسف لە کتێبـی (الخـراج)دا دەفـەرمویَ: سـەرانە دانـانریَ لەسـەر ژنو منـداڵو هـەژارێك خەڵـك خێـری پـیَ بکـا هـەروەها لەسـەر پـیرو کەنـەفتو کوێریش داناندریَ[1].

---

[1] - کتێبی (الخراج) ل/٦٩.

هەروەها لە شوێنێکی تردا ئەبو یوسف دەفەرموێ: سەرانە لە هەژارێك وەرناگیرێ کە خێری پێبکرێ، هەروەها لە کوێرێك ناستێنرێ کە ئیش و کاری نەبێ (ذمی)یەکیش کە خێری پێ بکرێ سەرانەی لەسەر نییە، کەنەفت و پەککەوتەش سەرانەیان لەسەر نییەو نابێ لێیان وەرگیرێ، پیرو کەفتەکارو کوێرو رەبەنەکانی ناو کەنیشتە ئەگەر دەوڵەمەند بوون و داراییان هەبوو سەرانەیان لێ وەردەگیرێ ئەگەر هەژارو بێ دەست بوون لێیان ناستێنرێ[٢].

دەربارەی دیاریکردنی ئەندازەی سەرانە ئیمامی ئەبو حەنیفە دەفەرموێ: ئەندازەی سەرانە لەسەر هەژار ساڵی (١٢) درەمە، لە سەر دەوڵەمەندی مام ناوەندیی ساڵی (٢٤) درەمە، لەسەر دەوڵەمەندی تەواو (٤٨) درەمە هەرکاتێ ئەو ناموسوڵمانانە سەرانەیان دا پێویستە گیان وماڵیان بپارێزرێ، بەرگرییان لێ بگرێ و سەربەستی و ئازادییان لە ئایینی خۆیاندا بدرێتێ و وەکوو موسوڵمانان مامەڵەی یەکسانییان لەگەڵ دەکرێ و پێیان دەگوترێ: ئەهلی زیممە. واتە: پەیماندار ئەم هەموو مافەیان هەیە بەگوێرەی پەیمانی خوداو پێغەمبەر، ئاوا بەو جۆرە فەرمان رەوایانی موسوڵمانان هەڵس و کەوتییان لەگەڵ ئەهلی (زیممە) کردوە، بڕوانە ئەو پەیماننامەیەی کە خالیدی کوڕی وەلید لەگەڵ دانیشتوانی دیمشقی کرد کە دەفەرموێ: ئەمە ئەو پەیماننامەیەیە کە خالیدی کوڕی وەلید داوێتی بە خەڵکی دیمەشق لەوکاتەدا کە رۆیشتە ناوی، پەیمانی داونەتێ کە لەسەرو ماڵی خۆیان دڵنیابن، کەنیشتەکانیان پارێزراو شورای شارەکەیان نەروخێنرێ و کەس لەناو خانوو بەرەیاندا نیشتەجێ نەکرێ، لەسەر ئەمە پەیکمانی خوداو بەڵێنی پێغەمبەرەکەی و گفتی جێنشینیان و موسوڵمانانیان پێ دەدرێ، بە چاکە نەبێ کەس هەقی نییە بەسەریانەوە بەمەرجێ سەرانەی خۆیان بدەن.

---

[٢] کتێبی (الخراج) – ل/٦٤.

سەرانە پاداشێکی کەمەو بێ ئەرکە ناموسوڵمانان دەیدەن بە دەوڵەتی ئیسلام لە جیاتی پارێزگاریکردن لێیان‌و یارمەتیدانی ئەو سەربازو لەشکرەیە کە ناهێڵن دوژمن دەستدرێژییان بۆ بکاو وەکوو موسوڵمانان دەیانپارێزن.

بەڵێ موسوڵمانان‌و فەرمانڕەوایانی موسوڵمانان ئەم راستییەیان باش زانیوە، باشترین بەڵگەش ئەوەیە کە ئەبو عوبەیدە – سەر لەشکری موسوڵمانەکان – کاتێك لەگەڵ دانیشتوانی شامدا پەیمانی بەست‌و سەرانەی لەسەر دانان‌و لێی وەرگرتن هەواڵی پێگەیی کە رۆمەکان لەشکریان کۆ کردۆتەوە خەیاڵی هێرشکردنیان هەیە، موسوڵمانەکان کەوتنە مەترسییەوە، ئالەم کاتەدا ئەبو عوبەیدە نامەی نووسی بۆ والی‌و لێپرسراوانی ئەو شارو گوندانەی کە پەیمانیان لەگەڵدا مۆرکرابوو، بۆی نووسین کە هەر سەرانەو خەرجییەکی وەریان گرتووە لە ناموسوڵمانەکان بیاندەنەوە، پێشیان بڵێین بۆیە ئێمە سەرانەو خەرجییەکەتان بۆ ڕەت دەکەینەوە چونکە هەواڵمان پێ گەیشتووە کە دوژمنانمان لەشکرێکی زۆریان کۆ کردۆتەوەو خەیاڵیان هەیە هێرش بکەنە سەرمان، ئێوەش پەیمانتان لە ئێمە وەرگرتووە کە پارێزگاری ماڵ‌و گیانتان بکەین، ئێستاش ئێمە ناتوانین ئەو ئەرکە جێبەجێ بکەین بۆیە ئەوەی لێمان وەرگرتوون دەتاندەینەوە، وە هەرکاتێ خودا سەری خستین ئێمە لەسەر وەعدو پەیمانی خۆمانین جا کاتێك ئەمەیان پێ گوتن‌و ماڵ‌و سامانەکەیان دانەوە وتیان دەی خودا ئێوە بۆ ئێمە بگێڕێتەوە وە بەسەر ئەواندا زاڵتان بکا!! شتێکی بەڵگە نەویستە کە سەرانە شتێکی رەمزییە بایەخێکی ئەوتۆی مادی نییە.

زانای بەناوبانگ (دریبر) لە کتێبەکەیدا کە ناوی (کێشەی نێوان زانست‌و ئایین)ی لێناوە، دەڵێ: موسوڵمانەکان ئەندازەیەکی زۆر کەمیان لە ناموسوڵمانە ژێر دەستەکانی خۆیان وەردەگرت تەنانەت زۆر کەمتر بوو لەوەی کە حکوومەتە نیشتمانییەکانی خۆیان لێیان دەستاندن.

مۆننسکیۆی یاسازان لە کتێبەکەیدا کە ناوی (پوختەی یاساکان)ە لەباسی سەرانەو زەریبە حکومەتییەکاندا دەڵێ: ئەم حەمکە خەرج‌و باج‌و سەرانەیەی کە

دەوڵەتـەكان دایـان نـابوون لەسـەر دانیـشتووەكان هۆیـەكی سـەرەكی بـوون بـۆ داگیركردنی موسوڵمانەكانو زاڵ بوونیان بەسەر زوربەی دراوسێكانیان دا، چونكە دانیـشتوان لـە جیـاتی ئـەوەی ئـەو هـەموو زەریبـەو سـەرانەو مڵـكانە بـدەن بـە حكوومەتەكانیانو چاوی برسی دەرەبەگەكان تێر بكەن، پێیـان خۆشـبوو بكەونـە ژێر دەستی موسوڵمانەكانو سەرانەیەكی كەم بدەنو بۆ خۆیان ئاسوودە دانیشن!!

## دڵنیاكراوان (المستأمنون):

یەكێك لەو یاسایانەی كە ئاسانكاریو دڵگەورەیی ئیـسلام دەگەیـەنێ ئەوەیـە: كە لەكاتی جەنگدا رێگەی بەتاكو كۆمەڵ داوە لە خەڵكی ئەو دەوڵەتەی كەوا بـە حاڵەتی جەنگدا پەیوەندی بە موسوڵمانانەوە بكەنو بێنە ناویانەوەو لەوەڵاتیاندا دابنیشنو قانوونێك هەبێ پارێزگارییان بكا ئەم قانوونە لە شـەریعەتی ئیسلامدا پێی دەگوترێ: دڵنیاكردن = ئەماندان.

ئـاینی ئیـسلام یارێزگـاری كردنـی ئـەم دڵنیاكراوانـەی بـە ئـەركی سەرشـانی موسوڵمانان داناوەو پاراستنی گیانو مـاڵو سـامانیانی بـەكارێكی سـەرەكی حـسێب كـردوە، بەڵـكوو هەنـدێ ئیمتیـازاتو پلـەو پایـەی داونـێ كـە بـەخودی موسـوڵمانەكانی نـەداوە، لـە بـرێ ئـەركیش عـەفوكراون كـە بـۆ موسـوڵمانەكان عـەفوكردنی تێـدا نییـە، مەبەسـت لـەم ئەمانـەی كـە ئیـسلام داینـاوە ئەوەیـە كـە فرسەتێك بۆ ئەو ئایین جیاوازانە برەخسێنێ هەتا بتوانن لـە جەوهـەری ئیـسلام بكۆڵنـەوەو لـە نزیكـەوە بـیرو بۆچـونەكانی ئیـسلام تێبگـەن! ئاشكراشـە كـە لـەم رێگەوە ئیسلام لە زۆر شوێندا بڵاو بۆتـەوە، ئـەم یاسایە هۆیـەكی گـرنگ بـوو بـۆ بڵاوكردنـەوەی بانگـەوازی ئیـسلامی، سەرچـاوەی ئـەم یاسـایە ئـەو ئایەتەیـە كـە دەفەرموێ:

{وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلاَمَ اللّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَّ يَعْلَمُونَ - سورة التوبة – ٦}.

واتە: ئەگەر یەکێك لە هاوبەش پەیداکەران داوای لەتۆ کرد ئەی پێغەمبەری خودا، کە ئەمانی بدەرێ بۆ ئەوەی لەناو ئێوەدا بمێنێتەوەو لەپەنای ئیسلامدا بێ، ئەوە پەنای بدەو ئەمانی بدەیێ، تا بەهۆی ئەوەوە لە ئیسلام حاڵی ببێو بەگوێی خۆی فەرمایشتی قورئان ببیستێو لە نزیکەوە لە کرۆکی ئیسلام تێبگا، چونکە ئەمە هەلێکی زێڕینە بۆ بانگەوازیو گوێ گرتن جا ئەگەر کابرا بە قەناعەتەوە ئیمانی هێناو لەناخەوە بیرو باوەڕی گۆڕا ئەوە باشە ئەگینا دەبێ بیگەیەنیەوە ئەو شوێنەی کە خۆی پێی خۆشەو دڵنیایە لە گیانو ماڵی خۆیو کابرا ئازاد دەبێ لەبیرو باوەڕدا!

بێگومان ئیسلام لەم بارەوە زۆر کراوەیە، ڕێگا دەدا کە هەر موسوڵمانێ لەخۆی رادەبینێ پەنای یەکێك یان کۆمەڵێك خەڵك بدا، پەیمانی پاراستنی گیانو ماڵیان پێبدا پەنادانو پەیمانەکەی پیرۆزەو ڕێزی لێ گیراوە، پێویستە فەرمانڕەوای موسوڵمانان ڕێزی لێبگرێ، چونکە پێغەمبەر دەفەرموێ: (ذمة المسلمين واحدة يسعى بها أدناهم).

واتە: پەیمانی موسوڵمانان یەکە، هەرە خوارووەکەیان دەتوانێ پەیمان بدا بە هەرکەس خۆی دەیەوێ، هەرە خوارووەکەیان دەتوانێ پەیمان بدا بە هەر کەس خۆی دەیەوێ. هەروەها پەنادانو پەیماندانی ژنیشی لا پەسەندە، ئەگەر ئافرەتێك پەنای دا بەیەکێك یان بە کۆمەڵێك ئەوە پەنادانەکەی پیرۆزەو ڕێزی لێ دەگیرێ. چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بە ئومو هانی فەرمووی: (قد أجرنا من أجرت يا أم هاني!)

واتە: ئەی ئوموهانی هەر کەسێك تۆ پەنای بدەی ئێمەش پەنای دەدەین.

ئاشکراشە کە ئایینی ئیسلام ئەوەی بە مەرج داناوە کە دەبێ بەرژەوەندیی موسوڵمانان لەم یاسایەدا بەرچاو بگیرێ، دەبێ دڵنیابن لەوەی کە پەنا دراوان هێزو توانایەکی وایان نییە کە مەترسییان لێ بکرێو بە مەبەستی جاسووسیو پیلان گێڕان نەهاتوون، پێشەواو فەرمانڕەوای موسوڵمانان مافی ئەوەیان هەیە کە هەر ئەمانێك بزانن دژی بەرژەوەندیی موسوڵمانانە پوچەڵی بکەنەوە.

## پەیماننامە لە ئیسلامدا (العهود في الإسلام):

هەر لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ وادەو پەیمان رۆڵێکی گرنگی هەبووە بۆ رێککەوتنامەو چارەسەکردنی کێشەو گیرو گرفتو تەنگو چەڵەمە بەشێوەیەکی ئاشتیو هێمنی، ئەمەش کاتێك بنج بەست دەبێ کە لە نێوان هەردوولا بتمانە هەبێ، هەرکاتێك ئەم بتمانەیە نەما گرنگترین کۆڵەکەی ئاشتی دەرۆخێ.

ئایینی ئیسلام زۆر گرنگی داوە بە پەیمانو وادە، بەهەموو جۆرێك رێزی لێ گرتووە، هەموو زەمانەتێکی بۆ دابینکردوە بە شێوەیەك کە موسوڵمانان، لە زوور بەرژەوەندیو ئارەزۆو سۆزی خۆیانەوە دایانناو، تەنانەت لە شەریعەتی ئیسلامدا پێویست ناکا ئەگەر کێشەو دووبەرەکی لەبەر بەرژەوەندییەك کەوتە نێوان موسوڵمانانو دوژمنانیانەوە کە سەرپشکیان بکەن لە نێوان ئیسلام بوونو سەرانە دانو شەڕکردن دا، ئەم خاترخۆیە لە نێوانی ئەم سێ حاڵەتەدا هەموو کاتێك پێویست بە داسەپاندنی نییە، بەڵکووو موسوڵمانان دەتوانن بەپێی بەرژەوەندی خۆیان رێکەوتننامەی ئاشتی لەگەڵ دوژمنی خۆیاندا مۆربکەن، یەکێ لەو سێ مەرجەشی تێدا نەبێ! هەرکاتێکیش ئێمە لاپەڕەکانی مێژوو هەڵبدەینەوەو سەیری ئەو پەیماننامەو رێککەوتننامانە بکەین کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) مۆری کردون دەبینین مەبەستێکی سەرەکی هەبووە ئەویش، رێگە خۆشکردن بووە بۆ بانگەوازی ئیسلامیو بڵاوکردنەوەی بەشێوەیەکی ئاشتی، لەبەر ئەوە قورئانی پیرۆز لەزۆر ئایەتدا موسوڵمانانی هەڵناوە کە پابەندی پەیمانەکانی خۆیان بن:

{وَأَوْفُواْ بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْؤُولاً - سورة الإسراء – ٣٤}.

واتە: ئەی موسوڵمانان پابەندی پەیمان بن، بێگومان پەیمان لێپرسینەوەی لەسەرە، لە ئایەتێکی تردا پەروەردگار پابەندبوونی بە پەیمانەوە بەرەوشتی موسوڵمانانی راستگۆ داناوەو دەفەرموێ:

{وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ - سورة المؤمنون – ٨}.

لە شوێنێکی تردا قورئانی پیرۆز پەشیمان بوونەوەو لەپەیمان بەدەرچوون لە تەوەرەی مرۆڤایەتی حسێب دەکاو دەفەرموێ:

{إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِندَ اللّهِ الَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ، الَّذِينَ عَاهَدتَّ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهْدَهُمْ فِي كُلِّ مَرَّةٍ وَهُمْ لاَ يَتَّقُونَ-سورة الأنفال/٥٥-٥٦}.

واتە: بەدترین جانەوەر لەلای خودا ئەو بێ باوەڕانەن کە هەمیشە دوورن لە ئیمانو تەقواکاری، بە تەواوەتی هەستی ئادەمیزادییان مردووە، هەرکاتێ پەیمانیان لەگەڵ بکەی نایبەنەسەرو زوو بەزوو هەڵی دەوەشێننەوە.

شتێکی بەڵگەنەویستە کە ئیسلام لەپاڵ ئەو پەیماننامەو رێککەوتننامانەدا مەبەستی داگیرکردنی وڵاتان نەبووەو نابێ، هەرگیزاو هەرگیز پەیماننامەی نەکردۆتە هۆی تەفرەدانی گەلانو فێڵ لێکردنیان، نەهاتوە چینێك بکاتە دەرەبەگو چینێکیش بکاتە چەوساوە! بەڵکوو مەبەستی چەسپاندنی ئاشتیو ئارامیو ئازادیو سەربەستییە.. پەروەردگار دەفەرموێ:

{وَأَوْفُواْ بِعَهْدِ اللّهِ إِذَا عَاهَدتُّمْ وَلاَ تَنقُضُواْ الأَيْمَانَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ اللّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلاً إِنَّ اللّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ، وَلاَ تَكُونُواْ كَالَّتِي نَقَضَتْ غَزْلَهَا مِن بَعْدِ قُوَّةٍ أَنكَاثًا تَتَّخِذُونَ أَيْمَانَكُمْ دَخَلاً بَيْنَكُمْ أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِيَ أَرْبَى مِنْ أُمَّةٍ إِنَّمَا يَبْلُوكُمُ اللّهُ بِهِ وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ - سورة النحل – ٩١-٩٢}.

واتە: ئەی موسوڵمانان! پەیمانو وادەی خۆتان هەڵمەوەشێننەوە، لەقسەی خۆتان پاشگەز مەبنەوە، نەچن وەکوو ئەو ئافرەتە بێ عەقڵە بکەن ریسی خۆتان بکەنەوە بە خوری کە دوای رستنو بادانی ریسەکەی خاو دەکردەوەو دەیکردەوە بە خوری.. هەرگیز نابێ پەیمانو بەڵێنتان لەسەر فێڵو تەڵەکە دابمەزرێنن بۆ ئەوە چینێك لە چینێك بەهێزتر بێ، لایەك ماڵو کەسی زۆرتربێ!!

قورئانی پیرۆز فەرمانی کردوە بە وەفاو ئەمەكو پابەندبوون بە پەیمان! تەنانەت ئەگەر ئەو پابەندبوونە سەربکێشێ بۆ لەبیرکردنو پاشگوێ خستنی ئەو موسوڵمانەی کە لە وڵاتی نائیسلام دا دەژینو دانیشتوی ئەو وڵاتەن کە لەگەڵ موسوڵمان دا پەیمانیان هەیە. هەرچەندە قورئان بەیەك چاو سەیری هەموو

موسوڵمانان دەکا، لەهەر رەگەزو نەتەوەیەك بن، یان هەر رەنگ و زمانێکیان هەبێ و لەهەر جێگایەك دانیشتبن و بەیەك گەل و نەتەوەیان دادەنێ، هەر دەستدرێژییەك بکرێتە سەر هەر موسوڵمانێك بە دەستدرێژیکردنە سەر هەموو موسوڵمانێك دادەنرێ، خودا دەفەرموێ:

{إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَاهَدُواْ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَالَّذِينَ آوَواْ وَّنَصَرُواْ أُوْلَـئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ وَالَّذِينَ آمَنُواْ وَلَمْ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلاَيَتِهِم مِّن شَيْءٍ حَتَّى يُهَاجِرُواْ وَإِنِ اسْتَنصَرُوكُمْ فِي الدِّينِ فَعَلَيْكُمُ النَّصْرُ إِلاَّ عَلَى قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ - سورة الأنفال – ٧٢}.

هەرکاتێك پەیمان لەگەڵ بەستراوان پابەندی پەیمانەکەی خۆیان نەبوون ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام نەدا ئەوە موسوڵمانان بۆیان هەیە شەڕیان لەگەڵدا بکەن:

{وَإِن نَّكَثُواْ أَيْمَانَهُم مِّن بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُواْ فِي دِينِكُمْ فَقَاتِلُواْ أَئِمَّةَ الْكُفْرِ إِنَّهُمْ لاَ أَيْمَانَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَنتَهُونَ - سورة التوبة – ١٢}.

هەروەها هەرکاتێ موسوڵمانان هەستیان بەوە کرد کە دوژمنەکانیان فێڵیان لێ دەکەن و دیاردەی خیانەتیان لێ دەرکەوت بۆیان هەیە پەیمانەکەیان هەڵوەشێننەوە، بەڵام دەبێ پێیان رابگەیەنن و پێیان بڵێین کە پەیمانەکەمان هەڵوەشاندۆتەوە. پەروەردگار دەفەرموێ:

{وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَانبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاء إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الخَائِنِينَ - سورة الأنفال -٥٨}.

واتە: هەرکاتێ ترسان لە هۆزێك لەو هۆزانەی کە پەیمانتان لەگەڵدا بەستوون کە خیانەتتان لەگەڵ بکەن، دیاردەی خیانەتەکەشیان بەدیارکەوت ئەوە ئێوە بە راشکاوی و بە ئاشکرا پێیان بڵێن: کە پەیمانکەتان هەڵوەشاندۆتەوەو پابەندی نین، بەبێ ئەوەی ئەمەیان پێ رابگەیەنن هەڵمەکوتنە سەریان و شەڕیان لەگەڵ مەکەن چونکە ئەمە خیانەتەو خوداش خیانەتکارانی خۆش ناوێن.

## شایەتیدانی بڕێ لە زانایانی خۆرئاوا دەربارەی فەتحی ئیسلامی:

لێرەدا دەمانەوێ کە بڕی وتەو شایەتی مێژوونووس و نووسەران راگوێزی ئێرە بکەین کە هیچ پەیوەندێکیان بە ئیسلامەوە نییە، بەڵکوو ئەوانە زاناو کۆمەڵناسن و هەموو رووداوێك هەڵدەسەنگێنن بەقەدەر خۆی و پایەخۆی دەدەنێ هەموو شتێك لە پلەی خۆیدا دای دەنێن.

دوکتور جۆستاف لۆبۆن لە کتێبەکەیدا (حضارة العرب) دەڵێ: کاتێك ئێمە باسی شەڕی رزگاری خوازی ئیسلامی (الفتوحات الإسلامية) دەکەین، هۆی سەرکەوتنی موسوڵمانەکان شی دەکەینەوە، بۆمان ئاشکرا دەبێ کە هێزی ماددی هۆکارێکی سەرەکی نەبووە لە بڵاوبوونەوەی بەرنامەی قورئاندا. عەرەبە موسوڵمانەکان بەشێوەیەکی مرۆڤانە لەگەڵ دانیشتوانی وڵاتە گیراوەکاندا جوڵاونەوە، ئەوپەڕی سەربەستی و ئازادییان پێ داون، ئەو کەسەی ویستبێتی لەسەر ئایینی خۆی بمێنێتەوە ئازادو سەربەست بووە، جا کە فەلەو جولەکەو پەیڕەوکارانی ئایینەکانی تر لێرەو لەوێ بەویستی خۆیان وازیان لە ئایینی خۆیان دەهێناو موسوڵمان دەبوون، ئەوە لەبەر ئەوە بووە کە ئەو پەڕی دادەوەری و رەوشت جوانییان لە موسوڵمانەکان بینیوە کە لە پەیڕەوکارانی ئایینەکانی تردا نەیان بینیوە.

لە شوێنێکی تردا دەڵێ: دەگونجا عەرەبە موسوڵمانەکان بەو سەرکەوتنە گەورانە لە خۆیان بایی ببن و زوڵم و زۆرییەکی کە زۆرتر سوپای سەرکەوتوو ئەنجامی دەدا بیانکردایەو مامەڵەی ناڕەوایان لەگەڵ دانیشتوانی ئەو وڵاتانەی دەیانگرتن بکردایەو بە زۆرە ملێ ئەو ئایینە کە خەباتیان لە پێناویا دەکرد، بە سەریان دا بسەپاندنایە!

جا ئەگەر رفتاریان ئاوابوایە هەموو ئەو گەلانەی کە هێشتا نەکەوتوونە ژێر دەستی موسوڵمانەکان گەلە کۆمەکیان لێ دەکردن و ئەو حاڵەتەی کە بەسەر صەلیبەکان هات کاتی داگیرکردنی سوریا بەسەر موسوڵمانەکان دەهات!! بەڵام

خولەفا موسوڵمانەکانی پێشوو ئەوانەی کە ئەو پەڕی لێهاتوویی و ژیرییان بەکار هێناو وێنەیان لەناو بانگەوازیکەرانی ئایینەکانی تردا نەبووەو نابێ، ئەوەیان دەزانی و هەستیان بەوە کردبوو کە ئایین و بیروڕا بەزۆرە ملێ ناچەسپێ، کاتێ وەڵاتێکیان دەگرت مامەڵەی مرۆڤایەتی دادوەرییان لەگەڵ دانیشتواندا دەکرد. لێیان دەگەڕان بەسەربەستی بۆ خۆیان بیرو باوەڕو ئایینی خۆیان پەیڕەو بکەن و تەنها ئەندازە سەرانەیەکی کەمیان لەسەر دادەنان! ئەویش لەپای پارێزگاری کردنیان و پارێزگاری ئاسایشی نێو خۆیان. ئەوەی کە دەبێ بگوترێ ئەوەیە کە تا ئێستا هیچ گەل و نەتەوەیەك سوپای دونیاگری وا بەرەحم و بەزەییان نەبینیوە، هیچ سەرکەوتووێکی جەنگ بە ئەندازەی ئەو موسوڵمانانە لێبوردوو مرۆڤ دۆست نەبوون!!

ڕەحم و بەزەیی ئەو دونیاگرە موسوڵمانانەو لێبوردن و مامەڵەکردن و هەڵس و کەوتی مرۆڤانەیان هۆی سەرەکی بوون بۆ فراوانبوونی جیهانی ئیسلامی و موسوڵمانبوونی زوربەی ئەو گەلانەی کە دەکەوتنە ژێر دەسەڵاتیان... هەرزو ئایینیان لەدڵا جێگیر دەبوو، فێری زمان و یاسایان دەبوون، تەنانەت دوای نەمانی دەسەڵاتی عەرەبەکانیش لەسەر شانۆی فەرمانڕەوایی ئەو سۆزە ئایینیە لەدڵی نەتەوەکاندا وا جێگربووبوو کە هیچ هێرش و پەلاماردانێکی سوپایی و فیکری، نەیتوانی کاریان تێ بکات هەر چەندە مێژوو نووسان دان بەم ڕاستییەدا نانێن!

هەر بۆ نموونە سەیری میسر بکە کە موسوڵمانە عەرەبەکان گرتیان گۆڕانکارییەکی تەواو لەناو هاووڵاتیانی میسردا پەیدابوو، ئیسلام بەتەواوی بەسەر دڵ و دەروونی دانیشتواندا زاڵ بوو کە پێش ئیسلام نە فارس و نە ڕۆمان نەئیغریقییەکان نەیانتوانی لەرزەیەك بە ژیارو شارستانی فیرعەونییەکان بکەن!!.

لە شوێنێکی تردا دەڵێ: بێگومان بڕێ لەزاناو ڕۆشنبیرانی ئەوروپا ئەوانەی کە خاوەنی هەست و وێژدانی مرۆڤایەتین دانیان بە لێبوردویی و سینگ فراوانی موسوڵمانەکان داناوە.

روبرتسون لە کتێبەکەیدا (تأريخ شارلكن) دەڵێ: هەر موسوڵمانەکان بوون کە توانیان غەزاکاری و چاوپۆشی بەیەکەوە کۆبکەنەوە هەر وڵاتێکیان گرتبێ رێگایان داوە دانیشتوانی ئەو وڵاتانە لەسەر ئایینی خۆیان بمێننەوە، رێ و رەسمی ئایینی خۆیان ئەنجام بدەن.

مێشود لە کتێبەکەیدا (تأريخ الحروب الصليبية) دەڵێ: بێگومان ئەو ئیسلامەی کە فەرمانی کردوە بە جیهادو موسامەحەکردن لەگەڵ رێڕەوانی ئایینەکانی تردا هەر ئەویش بوو کە بطریك و راهبەکانی لەباج و سەرانە عەفوکردوە! بەتایبەتیش کوشتن و ئازادارنی راهیبەکان و دێرنشینەکانی حەرام کردوە چونکە بۆ خودا پەرستی لێبڕاون.

حەزرەتی عومەر (خودای لێ رازی بێ) ئەوکاتەی شاری قودسی رزگار کرد بەهیچ جۆرێك خراپەکاری لەگەڵ فەلەکاندا نەکرد، کەچی خاچپەرستەکان کاتێ قودسیان گرتەوە موسوڵمانەکانیان سەربڕین، جولەکەکانیش کاتێ چوونە قودسەوە موسوڵمانەکانیان سوتاندن!!

کۆنت هەنری دی کاستری: لە کتێبەکەیدا (الاسلام خواطر وسوانح)دا دەڵێ: دوای ئەوەی عەرەبکان موسوڵمان بوون و ئیمانیان بە قورئان هێناو دڵیان بە نووری ئیسلام روناك بووەوە، بە شێوەو شێوازێکی تایبەتییەوە هاتنە پێشەوەو شێوازی ژیانیان و مامەڵەکردنیان لەگەڵ مرۆڤانی سەرزەویدا ئاشتی و سەربەستی بوو، ئەمجار پەیتا پەیتا ئایەتەکانی قورئان دەهاتنە خوارێ و فەرمانی پێ دەکردن کە هەمیشە چاکەکارو خۆش گفتار بن، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) رینومایی بۆ هاوەڵانی هەر چەسپاندنی خودا پەرستی و مامەڵەکردنی مرۆڤانە بوو لەگەڵ ئەوانەی دەکەوتنە ژێر دەسەڵاتی موسوڵمانانەوە، دوای لە دونیا دەرچونیشی جێ نشینەکانی هەمان هەڵوێستیان وەرگرت و لەو رێبازە پیرۆزە لایان نەداو بۆ ئەم هەڵوێستە پیرۆزە تێکۆشاون.

روبرتسون دەڵێ: پەیڕەوکارانی (محمد) جۆرە مرۆڤێك بوون هەر ئەوان توانیان کە ئایین‌و بیرو باوەڕکەشیان بڵاو بکەنەوەو چاکەو پیاوەتیش لەگەڵ ئەو گەلانەدا بکەن کە دەکەوتنە ژێر دەستیان، چونکە هەر لەگەڵ وڵاتەکە دەگیرا زۆری پێ نەدەچوو قورئان دەچووە دڵیانەوەو لەناخەوە موسوڵمان دەبوون! ئەوەتا ئەو کاتەی کە موسوڵمانەکان هێرشیان کردە سەروڵاتی شام‌و وەکوو بروسکە تا بەشی باکووری ئەفەریقا هەر لە دەریای سوورەوە تا موحیتی ئەتلانتی رایان مالی‌و هیچ دیاردەیەکی بەرهەڵستکارییان نەهێشتەوە چ کوشتارێکی ئەوتۆشیان نەکرد.

هۆیەکی تریش هەیە بۆ بڵاو بوونەوەی ئیسلام‌و ملکەچکردنی نەتەوەکان بۆ دەسەڵاتی ئیسلام لە کیشوەری ئاسیاو ئەفەریقادا ئەویش زوڵم‌و زۆری رۆمانەکان بوو... بێگومان ستەمکاریی فەرمانڕەوایانی (قسطنطین) گەیشتبووە ئەوپەڕی سنوورو وای لێ هاتبوو مرۆڤ کوشتن‌و ئاژەڵ کوشتن یەکسان بوو بوو!! جا کە ئیسلام هات‌و بەو هەڵوێستە مرۆڤانەوە بڵاو بوەوە، خەڵك باوەشی بۆ گرتەوە، لە ترسی زەربەو سەرانەو ماڵ داگیرکردنی ئەو فەرمانڕەوایانە رویان کردە ئیسلام‌و موسوڵمان بوون! زیاد لەوەش ئەوکاتە ئاینی ئیسلام کاربەدەستی تایبەتی نەبوون بۆ بانگەوازی کردن‌و فێرکردنی بەرنامەو پڕۆگرامەکانی، وەکوو لە ئایینی مەسیحیدا بەدی دەکرێ، خۆئەگەر ئەو جۆرە کەسانەی ببوونایە دیارە هۆی بڵاوبوونەوەی ئیسلام باشتر بۆمان روون دەبوەوە، ئەوەتا دەڵێن: شارلمان هەموو کاتێ کە دەچوو بۆ شەڕو وڵاتگرتن کۆمەڵێکی کەشیش‌و راهیب‌و بانگەوازیکەری لەگەڵ خۆدەخستن بۆ ئەوەی کە دوا بەدوای گرتنی وڵاتان دەست بکەن بە ئامۆژگاری‌و دڵی دانیشتوان داگیربکەن، کەچی ئێمە لە مێژوودا نابینین ئەوکاتە موسوڵمانان کۆڕێکی بانگەوازی کەریان هەبووبێ، کۆمەڵێ مەلاو ئامۆژگاریکەر لەپاش لەشکرو سوپاوە بووبێ ئامۆژگاری خەڵکیان کردبێ! هەرگیزاو هەرگیز کەسیان بە زۆر موسوڵمان نەکردوە، نە بەشمشێر نە بە هەڕەشە، بەڵکوو ئایین چۆتە دڵیانەوە لە رووی خوو ڕەوشتی جوانی

جەنگاوەرەکانەوە، بەهۆی کاریگەری قورئانەوە کە راستەوخۆ کاری لەدڵیان دەکردو کەمەندکێشی دەکردن.

بەڵێ زۆر مێژوونووس پێیان وایە کە بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە نێو مەسیحییەکانی سەر بەکەنیشتەی خۆرهەڵاتی دەگەرێتەوە بۆ ئەو هەستی نارەزامەندییەی کە هەیانبوو بەرامبەر ئەو هەموو هەڵەو سەر لێشێواوییەی کە گیانی هێلینستی هێنابوویە ناو لاهووتی مەسیحییەوە... هەروەها بۆ ئەو خێرو خۆشیو سەربەستییەی کە لەژێر ئاڵای ئیسلامدا دەستیان کەوت، هەروەها ئەو توانایەی کە ئیسلام بەکاری هێنا بۆ رزگارکردنیان لەو گەرداوی ئاژاوەی کە تێیدا بوونو رەورەوەی ژیانیانی تووشی شەپڵە کردبوو!!

ناوچەی خۆرهەڵاتیش کە ناسرابوو بەوە کە بیروڕای بێ پێچو پەنای بەلاوە پەسەندبوو، دانیشتوانی حەزیان لە ساکاریو حەقو راستی بوو، رۆشنبیریی هێلینی لە رووی ئایینییەوە بۆیان ببوە کۆسپێکی گەورەو کۆڵێکی قورس بوو بە کۆڵیانەوە، ئەم گیانی هێلینستییە تەعلیماتو یاسا ئایینییەکانی مەسیح — کە خۆیان لە خۆیاندا تا بڵێی ساکارو بەرزبوون — کردبوونیە بیرو باوەرێکی خوارو خێچو پڕ لە گومانو هەڵەو نارێكو پێکی!! ئەم حاڵەتە هەستێکی نائومێدیو رەشبینی لەناو دانیشتواندا پەیداکردبوو بناخەی ئایینە راستییەکەی هەڵتەکاندبوو، جا کاتێ خۆری ئایینی ئیسلام لە ئاسۆی بیابانی عەرەبستانەوە هەڵهات، بەرنامەیەکی پیرۆزی خۆشو ئاسانی هێنایەکایەوە، ئیتر ئایینی مەسیحی کە شەقو شڕ بوو بوو، رەشبینیو نائومێدی باڵی رەشی بەسەر باری ژیانی پەیڕەوانی دا هێنابوو، ئیتر ئەو ئایینە شەقو پەقە نەیتوانی بەرەنگاری ئایینی تازە بکا، ئەوەبوو لە ماوەیەکی کەمو کورتدا ئیسلام هەموو شكو گومانێکی لە وڵاتدا لابردو بەڵگەو بەرنامەی خۆی خستە بەردەم گەلانی جیهانو راستیو دروستی خۆی چەسپاند، ئیتر ئەو کاتە خۆر هەڵاتی مەسیحی بەویستی خۆی خۆی خستە باوەشی بەرنامەی ئیسلامەوە!!

خاوەنی کتێبی (العالم الإسلامي الجدید) دەڵێ: هەرگیز موسوڵمانەکان ئەوەیان مەبەست نەبووە کە لەئاکامی گرتنی وڵاتانداو سەرکەوتنی یەك لەدوایەکیاندا ماڵو دارایییان دەست کەوێ، بەڵکوو ئەوان بە گیانێکی مرۆڤانە هەڵسو کەوتیان لەگەڵ خەڵکیدا کردوە، زاناو زانیارییان خۆش ویستووە، ڕێزی کەلەپوری ژیارو شارستانیەتی گەلانیان گرتووە، تەنانەت ئەوەندەی پێ نەچوو بەهۆی ژنو ژنخوازییەوە خزمایەتی کەوتە نێوان ئەوانو ئەو گەلانەی کە کەوتنە ژێر دەستیان، دڵو دەروونیان لەسەر برایەتی ئایینی یەکیان گرتو بوون بە نەتەوەیەکی پتەوی یەك ئامانجو یەك هەڵوێست کە توانیان ژیارو شارستانیەکی تر بخەنەڕو کە ئەویش ژیارو شارەستانیەتی ئیسلامییە کە لەسەر بناغەی ژیاری یۆنانو ڕۆم دروست بوو بەڵام مۆرکی ئیسلامی پێوەنرا!.

ئەمەی گوترا بڕی قسەو باسی مێژوو نووسانو نووسەرو لێکۆڵەوەرانی فتوحاتی ئیسلامی بوو، بەراستی ئەوە مێژوویەك بوو کە وێنەی نییە لە مێژووی ئایینیو کۆمەڵایەتی هیچ گەلو نەتەوەیەکی تری سەرزەوی دا ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە قورئان زۆر کاریگەربووە لە ژیانی کۆمەڵانی ئادەمیزاددا بە جۆرێکی وا کە هیچ پەڕاوێکی ئاسمانی تر ئەو کاریگەریەی نەبووە، ئەوەش بەڵگەیەکی ترە کە قورئان نیگای خودایە!.

## بەشی بیستو چوارەم:

## سزاو تۆڵە لە ئیسلامدا (العقوبات في الإسلام)

**چۆنیەتی ئاسایش پێش ئیسلام (تاوانو سزا – سزای کوشتنی بەئەنقەست – سزای کوشتنی بەهەڵە – سزای دەستدرێژیکردن بۆ سەر ئەندامانی لەش – سزای ڕێگریو چەتەیی – سزای بوختان – شەڕەنەفرین (لیعان) – سزای زینا – سزای نێربازی – سزای دزی سزای یاخی بوون لە فەرمانڕەوا – سزای بادەنۆشی – سزای وەرگەڕان لە ئایین – تەمێکردن (التعزیر) – چەند ئامۆژگاریەکی گشتی بۆ پاراستنی ئاسایش – یەکسانی لە سزاداندا – سزای ئیسلام هەمووی پڕە لە دادوەری).**

### چۆنیەتی ئەمنو ئاسایش پێش هاتنی پێغەمبەر (د.خ):

ئەو کاتەی حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەربێت) کرا بە پێغەمبەر سەردەمێکی زۆر چەواشەبوو، ڕۆژگارێکی زۆر تاریکو نائارامی بوو، لە هەموو ڕوویەکەوە هەوری ڕەشی شووماویی باڵی بەسەر وڵاتدا کێشابوو، ڕەگەز پەرستیو نەزانی خۆی داکوتابوو، گەورەترین کاری ناشایستە ئەنجام دەدرا، فڕاندنو کوشتنو دەستدرێژی کارێکی ئاسایی ڕۆژانەی خەڵك بوو، ئەم هۆز هێرشی دەکردە سەر ئەو هۆزو تاڵانو بڕۆی دەکردو دەستدرێژی دەکردە سەر نامووسوماڵو گیانیان، هەق هی هێزی ناهەق بوو، دەستدار دەیبردو بێ دەست تەماشای دەکرد. بێهێز حەق خوراوو ماف پێشێل کراوبوو، چۆنیەتێکی ئاوا دیاردەیەکی بەدیاری ناو دورگەی عەرەب بوو، دیارە ئەو گەلو نەتەوانەی لە دەورو پشتی ئەو ناوچەیە بوون، حاڵیان لە حاڵی دانیشتوانی ناو دوورگەی عەرەب باشتر نەبوو، بەڵام ویستی خودای گەورەو بەدیهێنەری ئادەمیزاد وابوو کە ئەم گەلانە لە نەخۆشی نەزانیپەرستی ڕزگار بکا، قورئانی بە نیگا بۆ حەزرەتی موحەممەد نارد کە هەموو خۆشبەختیو بەختەوەرییەکی کۆمەڵو تاکی تێدابوو! دەی با پێکەوە چاوێك بە شەریعەتی ئیسلامدا بگێڕین، بزانین چۆن هەوڵی داوە بۆ دابینکردنی ئەمنو ئاسایش، چۆن سیستەمێکی یاسایی داناوە بۆ قەڵاچۆکردنی تاوانو تاوانکاران!

شتێکی ئاشکراشە کە تاوان رەنگدانەوەیەکی پڕاو پڕی دەروونی تاوانبارەکەیەو سزادانی دەبێتە هۆی دەرمانکردنی ئەو نەخۆشییە دەروونیەو پاراستنی کۆمەڵگایە لە خراپەکاری ئەو تاوانبارە.

## تاوانو سزا (الجريمة والعقوبة):

تاوان لە زاراوەی شەرعی ئیسلامدا بریتییە لەو شتە یاساخکراوانەی کە خودا بەیەکێ لەم دووە هەرەشەی لە کردنیان کردوە: بەسزا یا بەتەمێکردن، شتە یاساخکراوەکان یا کردنی کارێکی ناڕەوایە یا نەکردنی کارێکی رەوایە، شەریعەتی ئیسلامی لە پێناسەکردنی تاواندا لەگەڵ یاسا دانراوەکانی سەردەم، یەك دەگرێتەوە چونکە تاوان لە زاراوەی یاساکانی سەردەمدا یەکارێك دەگوترێ کە یاساکردنی یا نەکردنی ئەوی قەدەغە کردبێ، یا نەکردنەکەی بەپێویست بزانێ، جاکردنی کار یا نەکردنی بە تاوان حسێب ناکرێ ئەگەر لەئیسلام دا سزای بۆ دانەنرابێ.

## هۆی حەرامکردنی کردارو گوفتارو سزا بۆ دانان لەسەری:

ئەو کارانەی کردنیان یا نەکردنیان بە تاوان دادەنرێ، بریتین لەو کردەوانەی کە کردنیان یا نەکردنیان زیان بە سیستەمی کۆمەڵ دەگەیەنێ، زیان لە بیرو باوەڕی کۆمەڵ دەدا، یان ژیانی هاووڵاتیان دەخاتە مەترسییەوە، یان زیان لەماڵو ناموسیان دەدا، یان هەستو شعووریان بریندار دەکا، یان بەهەرشتێکی تری وا کە پێویستە کۆمەڵی لێ پارێزگاری بکرێ!

بێگومان سزا بۆیە دانراوە، تاوەکوو خەڵك لە تاوان بگێڕێتەوە... چونکە نەهیکردن لەکردنی کردەوەیەك یان فرمانکردن بەکردنی، نابێتە لەمپەڕو لغاو بۆ مەنعکردنی ئادەمیزاد لەکردنی کارێك... هەر وەکوو چۆن نابێتە هاندەرێکی

کاریگەر بۆ کردنی کارێك. سزا بۆیە دانراوە یاسا بچەسپێنێ، خۆ ئەگەر سزاو پاداش نەبن فەرمانکردنو نەهی کردن بەبێ هودە دەژمێردرێن!!

شەریعەتی ئیسلامی لەگەڵ قانوونی دانراوی ئەوروپادا یەك دەگرنەوە لەوەدا کە مەبەست لە دانانی سزا پاراستنی بەرژەوەندی کۆمەڵەو پارێزگاری یاساو دابو نەریتیەتی، هەروەها دابینکردنی هۆکاری مانەوەی خودی کۆمەڵەکەیە، بۆیە پەروەردگار لە بارەی تۆڵەوە دەفەرموێ:

{وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَاْ أُولِيْ الأَلْبَابِ لَعَلَكُمْ تَتَّقُونَ - سورة البقرة – ١٧٩}.

واتە: بۆ ئێوە لە تۆڵەستاندنەدا ژیان هەیە ئەی خاوەن فام ژیرەکان، بەڵکوو ئێوە خۆتان لەتاوانی کوشتن بپارێزن.

## دەستنیشانکردنی تاوانو سزاکە بەبێ (نەص) ناکرێ:

ئەم قاعیدە بەرزە یەکێکە لەو یاساو بەرنامەیەی کە ئیسلام پێش چواردە سەدە هێناویەتیو کاری پێکردوە، لە کاتێکا قانوونە دانراوەکانی ئەوروپا لە کۆتایی چەرخی هەژدەهەمدا ئەم قاعیدەی هێنایە ناو قانوونی خۆیەوە: کاتێك کە تەشریعی فەرەنسی دوای شۆڕشی فەرەنسا بۆیەکەمجار ساڵی (١٧٨٩ز) جاڕی مافی مرۆڤی دا، ئەمجار ئەو قاعیدەیە لە تەشریعی فەرەنسییەوە گوازرایەوە بۆ قانوونە دانراوەکانی تر، حیکمەتیش لە چەسپاندنی ئەم قاعیدەیە ئەوەیە کە هاووڵاتیان زانابن بەو تاوانانەی کە سزای لەسەر دەدرێو جۆری سزاکەش دیاری کراو بێ، تاوەکوو ئەو سزایە ببێتە لەمپەڕو لغاو نەهێڵێ کەسێك تاوان ئەنجام بدا، هەروەکوو چۆن ئەم مەبدەئە دەبێتە لەمپەڕێکیش بۆ ئەوەی نەهێڵێ دادگاو کاربەدەستەکان لارێو چەوتی بکەن لە دادگایی کردنیاندا، چونکە ناگونجێ کە سزای کەسێك بدرێ بە سزایەکی وا کە یەکێکی تر وا سزا نەدرێ! هەروەها ناگونجێ سزا دوای تاوان دابندرێ!

شەریعەتی ئیسلامی کە ئەم یاسایەی داهێناوە، تەنها سزای تاوانە گەورەکانی دیاری کردوە، ئەو تاوانانەی کە ئەمنو ئاسایش تێك دەدەنو کۆمەڵ تووشی خراپبوون دەکەن. لە قورئانی پیرۆزدا بە شەش جۆر دانراون:

یەکەم: کوشتنی ئادەمیزاد بە ناڕەوا.

دووەم: ڕێگریو چەتەیی.

سێیەم: بوختان:

چوارەم: داوێن پیسی.

پێنجەم: دزی.

شەشەم: یاخیبوون لە دەوڵەتی ئیسلام.. چەند سزایەکی تر هەن پێغەمبەر (درووی خودای لەسەربێ) دیاری کردوون ئەوانیش سزای بادەنوشیو هەڵگەڕانەوە لە ئایین، جگە لەمانە تاوانی تر سزاکەیان دیاری نەکراوە بەڵکوو ئەندازەو شێوەکەی حەواڵەی لێپرسراوو پیاو ماقوڵو زانایان کراوە، بە بیرو بۆچوونی خۆیان چۆنیەتی تاوانو حاڵی تاوانبار شی دەکەنەوەو چی بگونجێو چۆن بگونجێ لەگەڵ دابو نەرێتی گەلو کۆمەڵگا دیایی دەکەن، جا بائێستا لەمەدوا سزای هەریەکێك لەو تاوانانە دیاری بکەین.

## سزای کوشتنی بەئەنقەست (عقوبة القتل العمد):

بێگومان تاوانی کوشتنی بەئەنقەست سامناکترین تاوانەو کوشندەترین کارێکە کە دەبێتە تێکدەری ئەمنو ئاسایش، لەبەر ئەوە سزاکەی لە هەموو یاساو یاسانامەیەکدا سەختترین سزایەو زۆرجار دەق بریتییە لە کوشتنەوەو لەناوبردنی بکوژەکە، هەر لەو ڕۆژەوە کە ئادەمیزاد هاتۆتە سەرزەویو ئەم تاوانە سەری هەڵداوە هەموو ئایینەکان یەك لە دوایەك بەکارێکی ناشرینو نامرۆڤانەیان داناوە.

ئێمە ئەگەر سەیری قانوونی ڕۆمانی کۆن بکەین، دەبینین: ئەگەر بکوژ پلەی کۆمەڵایەتی بەرزبێو لەپیاو ماقوڵانبێ، فەرمان بەکوشتنەوەی نادا، بەڵکوو لە

زێدو نیشتمانی خۆی دووری دەخاتەوە! ئەگەر بکوژەکە پلەی کۆمەڵایەتی مام ناوەندی بوو، ئەوە سزاکەی مل پەڕاندنیەتی، ئەگەر پلەی کۆمەڵایەتی نزم بوو، سزاکەی هەڵواسینە: واتە: لەسێدارە دەدرێ! دوایی ئەم یاسایەیشی گۆڕی بەوە کە تاوانبار بخرێتە بەردەم جانەوەرو دڕندە بۆ ئەوەی لێکی هەڵبدڕێ، دوایی ئەم قانونەش گۆڕدرا بە لەسێدارەدان.. عەرەبەکانیش پێش ئیسلام لەم بارەوە یاساو دابونەریتی خۆیان هەبوو، یەکێ لەو یاسایانە کوشتنەوەی بکوژبوو، بەڵام زۆر زیادە ڕەوییان تێدا دەکرد، لەجێبەجێکردنی ئەم یاسایەدا، نەیاندەویست دادپەروەرانە بجووڵێنەوە، زۆر جار هەوڵیان دەدا لەجیاتی ئەوەی بکوژ بکوژنەوە کابرایەکی بێ تاوان بکوژنەوە، یان زۆر جار لەجیاتی کوژراوێك چەند کەسیان لەهۆزی بکوژ دەکوشتەوە، یان زۆرجار وادەبوو ئەگەر ئاژەڵێکیان بەدەستی یەکێك لەناو بچوایە ئادەمیزادیان لەبری ئاژەڵەکە دەکوشتەوە، لەگەڵ ڕووداوی بریندارکردنو خوێنی ئەندام دا هەمان هەڵوێستیان هەبوو... زۆرجار ئەم هەڵوێستانەیان ئەم زیادەڕەویو سنوور پەڕاندنەیان سەری کێشاوە بۆ هەڵگیرسانی شەڕو پێکدادانو جاری وا بووە چەند هۆزو عەشیرەتی تێدا بنەبڕکراوە، چەندان بنەماڵەو خانەوادەی تێداماڵوێران کراوە.

هەتا ئایینی ئیسلام هات ئەو شەریعەتو یاسا عادلانەی لەگەڵ خۆیدا هێناو بەو شێوە سزای تاوانی کوشتنی دیاری کردو فەرمووی:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأُنثَى بِالأُنثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاء إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ذَلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ، وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَاْ أُولِيْ الأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ - سورة البقرة – ١٧٨ – ١٧٩}.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا پەروەردگار ڕوو دەکاتە موسوڵمانانو پێیان دەفەرموێ: ئەی موسوڵمانان! تۆڵەتان لەسەر نووسراوە، کەسێك کەسێکی کوشت دەبێ بکوژرێتەوە... ئەمجار دەفەرموێ: مرۆڤی ئازاد لە تۆڵەی مرۆڤی ئازاددا

دەکوژرێتەوە، کۆیلە لە تۆڵەی کویلەدا دەکوژرێتەوە، مێینە لە تۆڵەی مێینەدا دەکوژرێتەوە ، ئیتر بەم یاسایە ئەو دابونەریتە نالەبارەی کە لە دورگەی عەرەبدا باوبووە قەڵاچۆکرد، وا باوبوو هەرکاتێ یەکێك لە بنەماڵەیەکی هەژار بوایەو یەکێکی لە دەست بکوژرایە کە لە بنەماڵەیەکی خانەدان بوایە بنەماڵەی لێکوژراو ڕازی نەدەبوو هەتا چەند کەسێکیان لەگەڵ بکوژەکەدا نەکوشتایەوە!

ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە ئیسلام تۆڵەی کوشتنی پێویست نەکردوە، بەڵکوو کەس و کاری کوژراوی سەرپشك کردوە دەتوانن پێداگرن لەسەر کوشتنەوەی بکوژ، دەشتوانن لێی خۆش ببن و خوێنی لێ وەرگرن، جا ئەو کاتە کە خاوەن کوژراوەکە لایەنی لێخۆشبوون هەڵدەبژێرێ قورئان بکوژ بەبرای کەس و کاری کوژراو دادەنێ! بۆ ئەوەی ئەوە بچەسپێنێ کە موسوڵمانان هەموویان برای ئایینی یەکترین و سۆزیان بۆ یەکتری بجولێ و بەزەییان بەیەکتردا بێتەوە، لێبوردن و لێخشبوونیان بۆ یەکتریی هەبێ! کەسێك مافی لێبوردنی هەیە کە مافی داواکردنی تۆڵەکردنەوەی هەبێ، بێگومان پەروەردگار ئەم مافەی داوە بەکەس وکاری نزیکی کوژراوەکە: وەکوو باوك و براو کوڕو ئامۆزا...هتد.

ئەمانەی دەتوانن داوای کوشتنەوەی بکوژ بکەن ئەگەر داوایان کرد دەبێ فەرمانڕەوای موسوڵمانان ڕێزی داواکەیان بگرێ، چونکە ئەگەر حاکم گوێی پێ نەدان و تۆڵەی بۆ نەساندنەوە، دەشێ خزم و کەس و کاری کوژراوەکە ڕێگای تر بگرن و بۆ خۆیان تۆڵە وەربگرنەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی دوژمنایەتی و دوژمنکاریی نێوان بنەماڵەی بکوژو کوژراو کە ئەمە دیاردەیەکە ئەمڕۆ بەزەقی دەبیندرێ، بە تایبەتی لەلای ئەو گەل و هۆزانەی تایفەگەرییان لە نێواندا باوەو بە عەشایەری ژیان بەسەر دەبەن.

جا ئەگەر لێبوردن و لێخشبوونەکە لەلایەن کەس و کاری کوژراوەکە سەری هەڵدا، ئەوکاتە بکوژ لەگیانی خۆی ئەمین دەبێ و ئاژاوەکەش کۆتایی پێدێ، بەتایبەتی ئەگەر هۆی لێبوردنەکە پاڕانەوەو داخوازی بکوژو خزمەکانی بوو!

جاری وا دەبێ یەکێك دەکوژرێ بەڵام کوشتنەوەی بکوژ زیان بەخش دەبێ وەکوو ئەوەی کابرایەك برای خۆی لەدەست بکوژرێ، یان خزمێکی نزیکی بکوژرێ، واش ڕێبکەوێ ئەم بکوژە بەخێوکەرو ئیشکەری ئەو بنەماڵەیە بێ، ئالەم کاتەدا نەکوشتنەوەی بکوژ باشترە لە کوشتنەوەی.

ئەگەر کەسو کاری بکوژ سوور بوون لەسەر کوشتنەوەی بکوژ فەرمانڕەوا (حاکم) ناتوانێ بەدەسەڵاتی خۆی عەفوی بکاو داواکاریی کەسو کاری کوژراو جێبەجی نەکا؟! هەروەها (حاکم) ناتوانێ عەفوی نەکا، ئەگەر کەسو کاری کوژراو ویستیان عەفووی بکەن، مەگەر بەرەڵلاکردنی بکوژ ببێتە هۆی تێکدانی ئەمنو ئاسایش، ئەوکاتە (حاکم) خۆی سەرپشکە چ شتێك بەگونجاو بزانێ بۆ تەمبێکردنو گێڕانەوەی لە تاوان ئەنجامی دەدا، پێویستیشە ماوەیەك بیخاتە ژێر چاوەدێرییەوەو دڵنیابێ لەوە کە سلوكو ڕەوشتی باش بووە.

لەکاتێکدا کەسو کاری کوژراو لایەنی عەفوویان گرتو لە بکوژ خۆش بوونو نەیانکوشتەوە پێویستە تاوانبار خوێنی کوژراوەکە بدا بەکەسو کارەکەی. بۆیە پەروەردگار دەفەرموێ:

{فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاء إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ}.

ئەمە ئامۆژگاری پەروەردگارە بۆ کەسو کاری کوژراو کە عەفوکردنو لێخشبوونەکەیان پیاوانە بێ، خوێنەکە زۆر گران نەکەنو لەئەندازەی خۆی تێنەپەڕێنن، پێی لەسەر دانەگرنو مۆڵەتی بدەن تا پەیدای دەکا، پێویستە بکوژیش خوێنەکە بە پیاوانە تەسلیم بکاو فێڵو فوت نەخاتە کارو دڵی کەسو کاری کوژراو ڕازی بکا چی کەوتەسەرو بۆی دانرا پیاوانە جێبەجێی بکا!

ئەمجار قورئان دەفەرموێ: {ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ}.

مانای ئەوەیە کە دانانی ئەم یاسا پیرۆزە جێگای سوپاسو منەتنانی پەروەردگارە بەسەر بەندەکانیەوە کە بەم یاسایە ڕێگای لێخشبوونی بۆ داناونو کەسو کاری کوژراو دەتوانن لەجیاتی ئەوەی بکوژ بکوژنەوە – ئەگەر ویستیان – خوێن وەربگرن، ئەمەش هەم بارسووکییە بۆ بکوژو هەم سوودی مادیشی تێدایە

بۆ کەس و کاری کوژراو، ئەمجار پەروەردگار کۆتایی ئایەتەکە بەوە دەهێنێ کە هەڕەشە لەکەس و کاری کوژراو دەکا، بەوە کە دوای لێبوردن و لێخشبوون نەچن شەیتان بچێتە کەللەیانەوەو ئەو برا موسوڵمانانەی خۆیان – کە لێی خۆشبوون – بکوژنەوە؟! دەفەرموێ:

{فَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيم}. کەسێك دوای لێبوردن وخوێن وەگرتن بچێ بکوژ بکوژێتەوە ئەوە سزای توند دەدرێ:

لە دونیادا تۆڵەی کوشتنەوەی لەسەرەو دەکوژرێتەوە لەو دونیاش نارەزامەندی خودای لێیە. ئەمە پوختەی شیکردنەوەی ئایەتی (قیصاص) تۆڵەبوو کە سزای تاوانی کوشتنی بەئەنقەستی دیاری کرد لە ژیانی دونیادا.

## سزای قیامەت:

دیارە قورئانی پیرۆز هەر بەوەندە کە بکوژ سزای دونیایی درا کۆتایی بە مەوزوعەکە ناهێنێ بەڵکوو هەڕەشەی لە بکوژ کردوە کە لەو دونیادا سزای دۆزەخی بۆ دانراوەو هەتا هەتایە لەو سزا بە ئێشەدا دەمێنێتەوە، خودا دەفەرموێ:

{وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا - سورة النساء – ٩٣}.

واتە: هەر کەسێك بەناڕەوا موسوڵمانێك بەئەنقەست بکوژێ، ئەوە سزای دۆزەخەو هەتا هەتایە لەو سزایەدا دەمێنێتەوە غەزەب و نەفرینی خوداشی لەسەرەو سزای گەورەی بۆ ئامادەکردوە.

دیارە قورئان هەموو کوشتنێکی بەئەنقەستی مەنع کردوە جا چ خۆ کوشتنبی یان خەڵك کوشتن بێ:

{وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا، يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا - سورة الفرقان – ٦٨-٦٩}.

کەسێك ناکوژن کە خودا کوشتنی قەدەغە کردوە، داوێنپیسی ناکەن، کەسێك ئەم تاوانە گەورانە ئەنجام بدا ئەوە لە قیامەتدا بەسزای سەختی خۆی دەگاو سزای بۆ چەند چەندانە دەکرێتەوەو لەو ئێش‌و ئازارە سەختەدا بەریسوایی هەتا هەتایی دەمێنێتەوە.

پێغەمبەری مەزنیش لە فەرموودەیەکیا دەفەرموێ: ١٧٢٤٢-

**« إذَا الْتَقَى الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفِهِمَا فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِى النَّارِ، فَقِيل: هَذَا الْقَاتِلُ فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ؟ قَالَ: إنَّهُ كَانَ حَرِيصًا عَلَى قَتْلِ صَاحِبِهِ .**

واتە: هەرکاتێ دوو موسوڵمان بە شمشێرەوە بەرەنگاری یەکتری بوون‌و یەکێکیان یەکێکیانی کوشت، ئەوە بکوژو کوژراو هەردوو دەچنە ناو دزەخەوە، گوترا: بکوژەکە تاوانبارە جێگەی خۆیەتی بچێتە دزەخ ئەی کوژراوەکە بۆچی؟! پێغەمبەر فەرمووی: چونکە ئەویش لەدڵەوە سوربووە لەسەر کوشتنی هاوڕێکەی خۆی!

## سزای کوشتنی بەهەڵە (عقوبة القتل الخطأ):

قورئانی پیرۆز چۆنیەتی کوشتنی بەهەڵەو سزاکەی لەم ئایەتەدا رون دەکاتەوە کە دەفەرموێ:

**{وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلاَّ خَطَئًا وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَئًا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ إِلاَّ أَن يَصَّدَّقُواْ. سورة النساء/٩٢}.**

واتە: شایانی موسوڵمان نییە لە موسوڵمان ناوەشێتەوە کە موسوڵمان بکوژێ مەگەر بەهەڵە، دەی ئەگەر کەسێ بەهەڵە موسوڵمانێ بکوژێ، وەکوو ئەوە گوللەو تیرو شتی وا لەدەستی دەربچێ یا تەقە لەشتێ بکاو موسوڵمانێ بەربکەوێ، ئەوکاتە پێویستە بکوژ بەندەیەك ئازاد بکاو خوێنیشی بەکەس‌و کاری کوژاوەکە بدا کە سەد وشتری تەمەن جیاجیان.. یان بەهاکەیان بە پارە بەپێی نرخی رۆژ بقەبڵێندرێ. ئەگەر کەس‌و کاری کوژراوەکە بکوژیان عەفو کرد لێی خۆش بوون ئەوە خوێنەکەی لەسەر لادەچێ.

## سزای بریندارکردنو فەروتاندنی ئەندامانی لەش:

بێگومان کەسێك دەستدرێژی بکاتە سەر کەسێك دەستی یان قاچی یان چاوی یان گوێچکەی.. بفەوتێنێ یا زیانیان پێ بگەیەنێ ئەوە شەریعەتی ئیسلام سزای تایبەتی خۆی بۆ داناوە سزاکەش ئەوەیە دەستدرێژیکەر چی کردوە وای لێ دەکرێتەوە. قورئان دەفەرموێ:

{وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالأَنفَ بِالأَنفِ وَالأُذُنَ بِالأُذُنِ وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ - سورة المائدة – ٤٥}.

واتە: لە تەوراتدا وامان یاسا بۆ جوولەکەکان داناوە کە نەفس بەنەفس دەکوژرێتەوە چاو لە جیاتی چاو دەردەهێندرێ، لوت لەجیاتی لوتو گوێچکە لەجیاتی گوێچکە دەبڕدرێتەوە، ددان لەجیاتی ددان دەردەهێندرێو تۆڵەی برینیش برینێکە وەك خۆی. ئەم بەرامبەری کردنەو تۆڵەستاندنەوە کاتێك ئەنجام دەدرێ کە ئەندامی تاوان لێکراوو تاوانبار وەك یەك بن، کەوابوو کەسێك چاوی کوێری کابرایەکی دەرهێنا لەجیاتی ئەو چاوە کوێرە چاوێکی ساغی ئەو دەرناهێندرێ! بەڵکوو دەبێ خوێنی بدا ئەمەش ئەو پەڕی دادوەری تێدایە، چونکە ئەو کەسەی دەستدرێژی دەکاتە سەر ئەندامی ئادەمیزادێك سزاکەی ئەوەیە کە ئەندامێکی ئاوهای بەوشێوە مامەڵەی لەگەڵ بکرێ نەك لەجیاتی چاوێکی کوێر چاوێکی ساغ دەربهێندرێ یان لەباتی دەستێکی گۆچو شلەپەتە دەستێکی ساغ ببڕدرێ! قورئانیش دەفەرموێ:

{وَجَزَاء سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا - سورة الشورى – ٤٠}.

سزای خراپە خراپەیەکی بەئەندازەی خۆیەتی. هەروەکوو چۆن تاوان لێکراو دەتوانێ واز لە تۆڵەستاندن بێنێو تاوانبار عەفو بکا، وەکوو قورئان دەفەرموێ:

{فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ - سورة الشورى – ٤٠}.

هەرکاتێکیش تاوان لێکراو وازی لە مافی خۆی هێنا – کە تۆڵەستاندنە – دەتوانێ خوێن وەرگرێ، ئەندازەو چۆنیەتی ئەو خوێنە زانایانی ئیسلام لە

کتێبەکانی شەرعدا رونیان کردۆتەوە قانوونە دەستکردەکانی سەردەم تۆڵەساندنەوەیان بەلاوە رەوایە بەڵام تەنها بۆ تاوانی کوشتن تۆڵەستاندنەوە بە ئەندازەی تاوان پەیڕەو دەکەن کەسێك کەسێك بکوژێ سزای کوشتنەوەی بەسەردا دەدرێ بەڵام لەجیاتی بریندارکردنو ئەندام فەوتاندن تۆڵەساندنەوە بەڕەوا نازانن بەڵکووو سزای بریندارىو فەوتاندنی ئەندامو زیان پێگەیاندنیان بە حەبس یان خوێندان داناوە، ئەوەش ئاشکرایە کە شەریعەتی ئیسلام کە یەکسانی خستۆتە نێوان کوشتنو بریندار کردنەوە بۆچوونەکەی سروشتییەو مەنتیقییە: بەڵام قانوونە دەستکردەکان کە هاتوون بەوشێوە بۆمەوزوعەکە چون خۆیان لەمەنتیقو سروشتی شتەکان دوور خستۆتەوە، چونکە تاوانی کوشتنو تاوانی بریندارکردن لەیەك سەچاوە هەڵدەقوڵین. زۆر جار وادەبێ لێدانو بریندارکردن دەبنە پێشەکی کوشتن. جا مادام تاوانی کوشتنو تاوانی بریندارکردن یەك جۆربن پێویستە سزاکەشیان یەك بێ! واتە: تاوانبار چی کردوە وای لێ بکرێتەوە.

## سزای رێگری (عقوبة قطع الطرق):

چەتەو رێگر بریتین لەو کۆمەڵە چەکدارانەی کە لە رێگەوباندا خۆیان حەشار دەدەنو فرسەت لە رێبوارو کاروان دەبینن‌و روتیان دەکەنەوە، یان دەیانکوژن یان هەردوو تاوان ئەنجام دەدەن ئەم جۆرە تاوانبارانە ئەوانەن کە قورئان باسی کردوونو دەفەرموێ:

{إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُواْ أَوْ يُصَلَّبُواْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلافٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ، إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُواْ عَلَيْهِمْ فَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ - سورة المائدة – ٣٣-٣٤}.

واتە: سزای ئەوانەی دژایەتی خوداو پێغەمبەری خودا دەکەنو هەوڵ دەدەن ئاژاوەو پشێوی لەسەر زەویدا بڵاو بکەنەوە سزاکەیان ئەوەیە: ئەگەر بەناحەق کەسێکیان کوشتبوو بکوژرێنەوە، ئەگەر هەم کەسێکیان کوشتبوو هەمماڵیان لە

کەسێك ستاندبوو بکوژرێنەوەو بەدارا هەڵواسرێن ئەگەر هەر ڕوتیان دەکردنەوە دەستو قاچیان ببڕدرێنەوە، بەڵام ئەگەر خەڵکیان نەدەکوشتو راوو روتیشیان نەدەکرد بەس خەڵکیان دەتۆقاند لە زێدی خۆیان شاربەدەر دەکرێن. ئەم سزایانە بۆ ئەو چەتەو ڕێگرانە ریسوا کردنە بۆیانو لە قیامەتیشا سزای سەخت دەدرێن ئەگەر ئەوچەتانە پێش ئەوەی دەسەڵاتتان بەسەردا بشکێو تۆبە بکەنو واز لەو تاوانانە بێنن. بزانن خودا لێخۆشبوو بە بەزەییە. بەکورتی حوکمی شەرع دەربارەی ئەمانە بەم جۆرەیە:

١- ئیعدام کردنیان ئەگەر ئاشکرابوو کە خەڵکیان کوشتووە.

٢- هەڵواسینو کوشتن ئەگەر دەرکەوت کە خەڵکیان کوشتووەوماڵیشیان ستاندوە هەر چەندە دەربارەی هەڵواسین زانایانی شەرع بۆچوونی جیاجیایان هەیە.

٣-دەست قاچ بڕینیان بەراستو چەپ ئەگەر هەر ماڵیان ستاندبوو خوێنیان نەڕشتبوو!

٤- دورخستنەوەو شاربەدەرکردنیان ئەگەر هەر خەڵکیان ترساند بوو. بڕێ لە زانایانی شەرع ئەم دورخستنەوەیان بە بەندکردن (حەبس) لێك داوەتەوە. کە دەفەرموێ:

{إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُواْ...}.

مەبەست ئەوەیە کە ئەو ڕێگرو چەتانە ئەگەر پێش ئەوەی موسوڵمانان دەسەڵاتیان بەسەردا بشکێن – تۆبە بکەن بگەڕێنەوە بۆ ناو کەمەڵچی موسوڵمانان ئەوانە سزادانیان لەسەر لادەچێ بەڵام مافی خەڵکیان بەسەروە دەمێنێ، واتە: ئەگەر ماڵی یەکێکیان بردبوو ڕێبوارێکیان روتکردبوو دەبێ فەرمانڕەوا داوایان لێ بکاو لێیان بستێنێتەوە، ئەگەر خەڵکیان کوشتبوو دەکوژرێنەوە یان عەفوو دەکرێنو خوێنیان لێ دەستێندرێ!

## سزای بوختان (عقوبة القذف):

بوختان ئەوەیە کە بەناڕەوا یەکێك تاوانبار بکرێ بەوەی کە زینای کردوە وەکوو ئەوە راستەوخۆ بەیەکێك بڵێی: تۆ زینات کردوە یان ناراستەو خۆ وەکوو

ئـەوە بـە یـەکێك بڵێـی تـۆ کـوڕی باوکـت نـی! کەسـێك ئـەم جـۆرە بوختانـەی لێ بیستراو بەڵگەی چەسپاندنی نـەبوو، بـە بوختانەکـەر حـسێب دەکـرێو تاوانبـارە، دەبـێ سـزا بـدرێ سزاکەشـی ئەوەیـە هەشـتا داری لـێ دەدرێ. بـەڵام ئەگـەر چوارشـایەتی هێنـانو شـایەتیاندا کـە بەچـاوی خۆیـان دیویانـە فڵانکـەس لەگـەڵ فـڵان ژنـدا زینـای دەکـرد، ئـەوە نابێتـە بوختانکـەرو سـزای لەسـەر نییـە. جـا بوختانکەر پیاو بێ یا ئافرەت بێ بوختـان پێکـراو ژن بـێ یـا پیـاو بـی حوکمەکـە یەکسانە.

بنەمای ئەم حوکمەش ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ:

{وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ - سورة النــور – ٤}.

ئایەتەکە ئاماژەی بۆ مەرجێکی گرنگ کردوە ئـەویش ئەوەیـە دەبـێ بوختـان پێکراو (موحصەن) بێ واتە: موسوڵمانو باڵغو عـاقڵو ئـازادو داوەێـن پـاك بـێ... لەوە پێش تاوانی زیناکردنی لەسەر نەچەسپا بێ، ئەگەر لـەوەپێش ئـەم تاوانـەی پێوە گوترابێو لەسەری ثابیـت بووبـێ، ئـەوە داری حـەد لـە بوختانکـەر نـادرێ... ئایەتەکە بوختان پێکراوی تایبـەت کـردوە بـە ئافرەتانـەوەو وشـەی (المحصنات)ی بەکار هێناوە، چونکە زەرەری زینا زیاد لەوە کە ژنەکـە بـەدناو دەکـا سـووكو بـێ حورمەتیش دەخاتە سەر شانی کەسو کاریو چاو بـەرەو ژێریـان دەکا! بـەڵام بـۆ پیـاو وا نییـە... لەلایـەکی تـرەوە ئایەتەکـە بوختانکـەری تایبـەت کـردوە بـە پیاوانەوەو فەرموویـەتی: (والـذین یرمـون...) چونکە ئافرەتـان شـەرمو حـەیایان زۆر ترەو دەگمەن نەبێ بوختان بەپیاو ناکەن؟!

فـەرموودەکانی پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەربێ) ئـەوەیان رونکردۆتـەوە کـە لـە مـەوزوعی بوختانـدا جیـاوازی لـەنێوان ژنو پیـاودا نییـە، هـەروەها ئەوەشـی رونکردۆتەوە کە چەند مەرجێك هەیە دەبێ بەرچاو بگیرێـن بـۆ جێبـەجێکردنی داری حـەد وەکـوو عـاقڵیو ئـازادیو .. هتـد. بـەو شـێوەیەی کـە لـە کتێبـەکانی شـەرعدا شیکراوەتەوە، هـەر کـاتێکیش بوختانکـەر داری حـەدی لێـدرا سـزایەکی

تریشی لێ دەبێتـە سـەربار کـە ئـەویش بتمانـە پێنەکردنـە پێـی چونکە لـەوە دوا شایەدی لێ وەرناگیرێ خودا دەفەرموێ:

{وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا}.

واتە: هەرگیز لەپاش بوختانکردنیان شایەدییان لێ وەرمەگرن.

## شەڕە نەفرین (اللعان):

ئاشکرایە کە شەریعەتی ئیسلام مافی مێردی پاش گوێ نەخستووە، هەر کاتێك پیاو هەستی کرد کە ژنە هاوسەرەکەی بـەدرەفتارەو داوێـن پیـسی دەکا، چارەیەکی گونجاوی بۆ دیاری کردوە کە بتوانـێ رقو خـەشمی دەربـڕێو عـەیبو عـار لـەخۆی دوور بخاتەوە، چونکە وەکوو گوترا ئەگەر بێگانەیەك بوختانی بە ئافرەتێکی داوێن پاك کرد یان بوختـانی بـۆ پیـاوێکی بەئـەخلاق هەڵبەسـتو نـەیتوانی چوارشـاریەد ئامادە بکاو داواکەی خۆی بچەسپێنێ ئەوە داری حەدی لێ دەدرێ، بەڵام ئەگەر پیـاو ئیدیعای ئەوەی کرد کە ژنەکەی زینای کردوە ئەوە شەریعەت داوای شـایەتی لێ ناکـا چونکە هیچ بەرژەوەندییەك لەوەدا نییە کـە مێـرد ژنـی خـۆی بـەو شـێوە تاوانبـار بکا... ئەگەر شتێکی لێ نەدیبێ، بڕواناکرێ هـەروا بـە هەوانتـە کـابرا نـاوو نـاتۆرەی ئاوا دواژنی خۆی بخا، چونکە ئەوە عەیبو عارێکە دەلکێ بەشانی منداڵەکانییـەوە، خۆ ئەگەر منداڵیشی لێ نەبوون ئەوە سوکایەتی بۆ خۆی تێدایـەو سـەری خـۆی پـێ شـۆڕ دەبـێ، لەبـەر ئـەوە شـەریعەتی ئیـسلام لـەم حاڵەتـەدا یاسـای شـەڕە نـەفرین (لعـان)ی دانـاوە بـۆ ژنو مێردەکـە (لعـانیش ئەوەیـە مێـرد لای قـازی بڵـێ خـودا شـایەدەو ئاگـادرە مـن راسـتگۆم لـەوەدا کـە دەیڵـێم: ئـەم ئافرەتـەی خێـزانم داوێـن پیسەو زینای کردوە، دەبێ چوارجار پیاوەکە ئەم رستەیە دووبارە بکاتـەوە، ئـەمجار جاری پێنجەم بڵێ نەفرینی خـودای لێبـێ ئەگـەر درۆ بکـا! ئـەمجار نۆرەدێتـە سـەر ئافرەتەکە ئەویش چوارجار دەڵێ: خودا شایەدەو ئاگادارە ئەو مێردەی راسـت ناکـاو بوختانی پێ دەکا ئەمجار جاری پێنجەم دەڵێ: خودا قینو قارم لێبگرێ ئەگـەر ئـەم بوختانەی ئەم مێردەی من راست بێ.

بەمە ئافرەتەکە لە سزادانی شەرعی رزگاری دەبێ، بەڵام یەکسەر پەیوەندی ژن و مێردایەتیان دەپچڕێ و بۆ هەتا هەتایە لە یەکتر حەرام دەبن، منداڵەکەش دەکرێ بەهی ژنەکەو پیاوەکە بە باوکی حسێب ناکرێ بنەمای ئەم حوکمەو شەرعە ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێ:

{وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَاء إِلَّا أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ، وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ وَيَدْرَأُ، عَنْهَا الْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ، وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِن كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ - سورة النــور -٦-٩}.

## سزای زیناکردن (عقوبة الزنا):

شەریعەتی ئیسلام جیاوازی خستووە لە نێوان زیناکەری موحصەن و ناموحصەندا واتە: پیاو ئەگەر ژنی نەهێنابێ و ئافرەت ئەگەر شووی نەکردبێ ئەگەر زینایان لەسەر چەسپا سزاکەیان ئەوەیە کە یەکی سەد داریان لێ دەدرێ! خودا دەفەرموێ:

{الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ - سورة النــور – ٢}.

واتە: ئافرەتی زیناکارو پیاوی زیناکار کە زینایان لەسەر ئیسپات بوو، یەکێ سەد داری حەدیان لێ بدەن، نەکەن بەزەییتان پێیاندا بێتەوەو بەهۆی ئەوەوە گوێڕایەڵی ئایینی خودا نەبن و فەرمانەکەی بشکێنن، ئەگەر ئێوە بە تەواوی باوەڕتان بە خوداو بە رۆژی دوایی هەیە دەبێ ئەم فەرمانە جێبەجێ بکەن، باکۆمەڵێکیش لە موسوڵمانان بەدیار سزاکەیانەوەبن لەکاتی ئەنجامدانیدا، هەتا ببن بە پەندو شەرمەزار ببن و ئێش بەدڵ و لەشیان بگا.

بەڵام ئافرەت کە شووی کردبێ یان پیاو ژنی هێنابێ ئەگەر زینایان کرد سزاکەیان ئەوەیە بەردەباران بکرێن تا دەمرن چونکە پێغەمبەر دەفەرموێ:

**«لاَ یَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ إلاّ بِإحْدَى ثَلاَثٍ: کفر بعد إیمان وزنا بعد احصان وقتل نفس بغیر حق .**

واتە: رشتنی خوێنی موسوڵمان بەیەکێ لەم سێ شتە رەوا دەبێ:

یەکەم: بە کافربوونی پاش موسوڵمانەتی.

دووەم: بەزیناکردنی ژنی مێردکردوو یان پیاوی ژندار.

سێیەم: بەکوشتنی کەسێ بە ناڕەوا.

لە راستی دا زوربەی ئەنجامدانی سزای زینا پەیوەستە بە دان پیانانی زیناکەر خۆیەوە، چونکە ئەگەر زیناکەر دان بە تاوانەکەیدا نەنێ گەلێ زەحمەتە کە بە بەڵگەی تەنها تاوانەکەی لەسەری بچەسپێ، چونکە بەڵگەکە کە بریتییە لە چوار شایەتی عادڵ کە روداوەکە بەچاوی خۆیان ببینن، شتی وا گەلێ ئەستەمە، ئەگەر ئەستەمیش نەبێ لە ئەستەم نزیکە! سەرەڕای ئەوەیش ئەگەر یەکێکیان شادیەکەی جیاواز بوو یان نکوولی کرد لە شایەتیدانەکەی ئەوە سێیەکانی تر بە بوختانکەر حسێب دەکرێنو سزای بوختان دەدرێن. حیکمەتیش لەم هەموو پەیجوریو لێکۆڵینەوەیە لەبارەی چەسپاندنی ئەم تاوانەوە ئەوەیە نەبادا خەڵکی بەخوتو خۆڕایی بە ناهەق تاوانی داوێنپیسی بدەنە پاڵ مەردوومی بێئاگا! هەر کەسێکیش لەو حاڵەتانە ورد ببێتەوە کە لەسەردەمی پێغەمبەردا بەردەبارانی زیناکەری تێدا کراوە، بۆی روون دەبێتەوە کە ئەنجامدانی (حەد) بەپێڵێنانی زیناکەر خۆی بووە نەك بەشایەتیدانی چوار شایەد، تەنانەت ئەوەی کە لە خزمەت پێغەمبەریشدا ئیعتیرافی بەو تاوانە دەکرد، پێغەمبەر جۆرەها پرسیاری لێ دەکرد تابەتەواوی پێڵێنانەکەی بۆرون ببێتەوە بە ئومێدی ئەوەی کە لە ئیعتیرافەکەی دا کە لێنێك بدۆزێتەوەو ببێتە شوبهەو حەددەکەی لەسەر لابچێ، ئەوەتا کە یەکێك دەهاتە خزمەتی پێغەمبەرو دانی بەوەدا دەنا کە زینای کردوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) یەکسەر ئیعترافەکەی لێ وەرنەدەگرت، بەڵکوو پێی دەفەرموو: دەگونجێ دەستت بۆ بردبێ ماچت

کردبێ... هتد. بەکورتی ئەم سزایە ئەنجام نادرێ مەگەر دەرحەق ئەو کەسەی کە دەیەوێ خۆی لەو تاوانە پاك بکاتەوە.

## سزای نێربازی (عقوبة اللواط):

نێربازی تاوانێکی دژ بەرەوشتی وەهایە هەرگیز شیاوی گەلو کۆمەڵی ئادەمیزاد نییەو دەستدرێژیەکی ئاشکرایە بۆ سەر مرۆڤایەتی لەبەر ئەوە پەروەردگار بە (فاحیشة) ناوی بردوەو وەکوو زینا بە کارێکی نارەواو خراپی حسێب کردوە، ئەوەتا دەربارەی هۆزی لوط کە ئەم تاوانە بێ رەوشتییەیان تێدا بلاو بوەوە دەفەرموێ:

**{وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ الْعَالَمِينَ - سورة العنكبوت – ٢٨}.**

واتە: سەرگورشتەی (لوط)یان بۆ بگێرەرەوە کە رەوانەکراوی خودا بوو بۆلای هۆزەکەی، پێی گوتن ئێوە دیاردەی (نێربازی)یتان تێدا بلاوبۆتەوە کە بەدرەوشتییەکی شەرم ئاوەری شەرمەزارکەرە لە پێش ئێوەدا کەسێ لە جیهانیان زاتی نەکردوە کە خووی وا بەد دابهێنێ!

ئەمجار قورئانی پیرۆز لە ئایەتێکی تردا ئەوەمان بۆ دەگێرێتەوە کە خودا لەسەر ئەو کردارە خراپەیان سزای سەختی دانو لەناوی بردن.

**{إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَى أَهْلِ هَذِهِ الْقَرْيَةِ رِجْزًا مِّنَ السَّمَاءِ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ - سورة العنكبوت – ٣٤}.**

سزای هەتیوبازی لەشەریعەتی ئیسلامدا بە گوێرەی بۆچوونو رای برێ زانایان دەق وەکوو سزای زیناکردن وەهایە، برێکیش دەڵێن: فەرمانرەوا بە گوێرەی بەرژەوەندی گشتی جۆری سزاکەی دیاری دەکا بەشێوەیەك کە خەڵکی لەو کارە ناشیرینە دوور بخاتەوە برێکیش دەڵێن هەردوکیان دەکوژرێن؟!

## سزای دزی (عقوبة السرقة):

سزای دزی کردن، قورئانی پیرۆز بەم شێوە روونی کردۆتەوە کە دەفەرموێ:
{وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا جَزَاء بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ - سورة المائدة – ٣٨}.

واتە: پیاوی دزو ئافرەتی دز ئەگەر دزییانکرد هەرمیەکەیان دەستی راستییان ببڕن لە سزای ئەو تاوانەی ئەنجامیان داوە. پێویستە ئەوە بزانین کە ئەو دزییەی سزای دەسبڕینی لەسەرە دەبێ چەند مەرجێکی تێدا بێتەجێ.

یەکەم: دەبێ ئەو کەسەی دزی دەکا عاقڵو بالغ بێ، کەوابوو شێت ئەگەر دزی کرد سزای لەسەر نییە، منداڵ ئەگەر دزی کرد دەستی نابڕدرێ بەڵکوو سەرپەشتیارەکەی دەبێ دزراوەکە ببژێرێو منداڵەکەش تەمبێ بکا!!

دووەم: دەبێ ئەو ماڵەی کە دەیدزێ هیچ مافو حەقێکی خۆی تێدا نەبێ، کەوابوو ئەگەر کەسێك ماڵێکی دزیو خۆی شەریکبوو لەماڵەکەدا ئەوە کردارەکەی بەدزیکردن حسێب ناکرێ بەڵکوو دەست پیسیو ناپاکییە.

سێیەم: دەبێ کابرای دز ماڵە دزراوەکە لە شوێنی هەڵگرتنی وێنەی خۆی (حرز المثل) بدزێ کەوابوو ماڵی هونبوو یان میوە بەدارەوە ئەگەر باخەکە پەرژینی نەبێ یان ئاژەڵێك شوانی نەبێ ئەگەر دزران دزەکە دەستی نابڕدرێ بەڵکوو تەمبێ دەکرێ.

چوارەم: دەبێ بەهای ماڵە دزراوەکە لەروبعە دینارێکی زێڕ کەمتر نەبێ چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: (نقطع اليد في ربع دينار فأكثر) حیکمەتیش لەدیاریکردنی ئەم ئەندازەیەدا ئەوەیە کە شەریعەتی ئیسلام شتێکی داناوە بەهۆی دەسبڕین کە بەهایەکی دیاری هەبێ کەمتر لە روبعێکیش ناکرێتە هۆی دەسبڕین لەبەر کەمی، بەڵکوو هەرکاتێ ماڵە دزراوەکە لەروبعێك کەمتر بوو، سزاکەی لێدانە یان بەنکردنە هەروەها کەسێك دیواری کون کرد یان خۆی هەڵدایە سەر دیوار بەمەبەستی دزیو شتێك بوو بە مانیعو دزییەکەی بۆ نەکرا ئەوە دەسبڕینی لەسەر نییە بەڵکوو بەسزای تر تەمبێ دەکرێ.

پێنجەم: نابێ دزییەکەی لەبەر ناچاریو پێویستییەکی زۆر پێویست بێ، وەکوو برسیایەتی زۆر. لەم حاڵەشدا سزای دزی لە دسبڕینەوە دەبێتە سزایەکی سوکتر چونکە ئیمامی عومەر ساڵێ گرانی بوو سزای دەسبڕینی لەسەر دز هەڵگرت.

## سزای شەڕەنگیزیو فیتنە جۆیی (عقوبة البغي):

ئایینی ئیسلام هەمیشە بانگەوازی بۆ ئاشتی کردووەو شەریعەتو یاساو نیظامێکی دادوەرانەی هێناوە بۆ ئەوەی ئاشتی ناوخۆیی بپارێزێ، قورئان دەفەرموێ:

{وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِن فَاءتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ - سورة الحجرات – ٩}.

واتە: ئەگەر دوو کۆمەڵ لە موسوڵمانان شەڕیان بوو، ئێوە ناوبژییان بکەنو صوڵحیان بکەنو داوایان لێ بکەن گەردنکەچی حوکمی خودابنو رازی بن بەو حوکمەی بەسەریاندا دەدرێ، جا ئەگەر کۆمەڵێکیان رازی نەبوونو شەڕیان نەوەستاند لایەکیشیان رازی بوونو گەردنکەچی حوکمی خوداو پێغەمبەری خودا بوون، ئەوە ئێوە شەڕ لەگەڵ سەرپێچیکەراندا بکەن تا دەگەڕێنەوە بۆ ژێر حوکمی خودا، ئەگەر دوای شەڕکردنی ئێوە لەگەڵیاندا ملکەچ بوونو شەڕیان وەستاند ئەمجار صوڵحیان لەنێواندا بکەن، دادوەرانە رفتار بکەن بێگومان پەروەردگار دادوەرانی خۆش دەوێن.

## سزای بادەنۆشی (عقوبة شرب الخمر):

بەگوێرەی ئایینی ئیسلام هەر کەسێك عەرەقی خواردەوە چل داری حەددی لێ دەدرێ، ئیمامی موسلیم (خودای لێ رازی بێ) دەگێڕێتەوە لە ئیمامی ئەنەسەوە (رەزای خودای لێبێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەر کەسێ عەرەقی بخواردایەوە، چل دار یان چل نەعلو سۆڵی لێ دەدا!.

**ئیمامی عەلی دەفەرموێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **سزای عەرەقخواردنەوەی چل دار دانابوو حەزرەتی ئەبو بەکریش هەر چل داری لێ دەدا، ئیمامی عومەر هەشتاداری دەوەشاند، هەمووشیان سونەتن و پەیڕەویکردنی پێغەمبەر بوو** (دروودی خودای لەسەربێ)**: ئیمامی عەلی دەفەرموێ ئەمەی کە عومەر کردی پێم خۆشترە... جا بەپێی ئەم ریوایەتە حاکم دەتوانێ سزاکە لە چل دار زیاتر بکاو بیگەیەنێتە هەشتا دار، بەمەبەستی تەمبێکردن، سزای عەرەقخواردنەوە کاتێك ئەنجام دەدرێ کە دوو شایەدی عادل شایەدی بدەن کە فلانکەس عەرەقی خواردۆتەوە، یان کابرا بۆ خۆی بڵێ: عەرەقم خواردۆتەوە، خواردنەوەکەش لەبەر ناچاری نەبێ وەکوو خۆدەرمانکردن، یان کابرا پارووی لە قوڕگ بگیرێ و بۆ قوتاربوون عەرەق بخواتەوە.**

## سزای هەڵگەڕانەوە لە ئایین (عقوبة الارتداد عن الدين):

**دەربارەی هەڵگەڕانەوە لە ئایین پێغەمبەر دەفەرموێ: (من بدل دينه فاقتلوه) هەر کەسێك لە ئایینی ئیسلام هەڵگەڕایەوە بیکوژن. حیکمەتی ئەمەش ئەمەیە کە ئیسلام ڕێگە نادا بە هەوەسبازەکان هەرکەسە بە ئارەزۆ گاڵتە بە ئایین بکا، ئەمڕۆ لەبەر مەبەستێك موسوڵمان بێ و سبەینێ لەبەر مەبەستێکی تر پەشیمان ببێتەوە، بەڵکوو ئەو جۆرە کارانەی بەسەر لێشێوانی ئاییندارانو گاڵتەکردن بەدین حسێب کردوە، هەر بۆیەشە قورئانی پیرۆز لە ئایین هەڵگەڕانەوەی بەگومڕاترین کار حسێب کردوە، خودا دەفەرموێ:**

**{إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ آمَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ازْدَادُواْ كُفْرًا لَّمْ يَكُنِ اللّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلاَ لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلاً - سورة النساء - ١٣٧}.**

**واتە: بێگومان ئەوانەی موسوڵمان دەبن و دوایی پەشیمان دەبنەوەو دیسانەوە کافر دەبنەوەو سەرەنجام سەر دەکەنە کوفرو ڕۆژ بەڕۆژ پتر کافر دەبن، کەسانی وا گومڕاو سەر لێشێواو هەرگیز خودا لێیان خۆش نابێ و ڕێگەی هەقیان پێ ڕەوا نابینێ.**

**تەمبێکردن (التعزیر):**

تەمبێکردن جۆرە سزایەکە (حاکم) دادوەر خۆی دیاری دەکا بەو شێوەیەی کە بەرژەوەندی گشتی تێدا بێ لەمپەرێکیش بێ بۆ ئەوەی تاوانباران لەو تاوانە بگێڕێتەوە، هەر کەسێك تاوانێك بکا کە جۆری سزاکەی لە قورئانو حەدیسدا دیاری نەکرابێ، یان تاوانێك کە جۆری سزاکەی دیاری کرابێ بەلام مەرجی جێبەجێکردنی سزاکەی تێدا نەیەتەجێ ئەوکاتە حاکم دەتوانێ کە تەمبێی بکا بە سزایەك کە بەگونجاوی بزانێو نەهێڵێ جارێکی تر دەست بداتەوە ئەو کارە نارەوایە...

زانای لێهاتوو تێکۆشەری موسوڵمان مامۆستا (ابن تیمیە) لە نووسراوێکی دا کە ناوی (الحسبە)یە دەفەرموێ: (هەندێ سزا ئەندازەکەیان دیاری نەکراوە پێیان دەگوترێ تەعزیر) تەمبێکردن، ئەندازەی ئەم سزایانە بە گوێرەی بچوكو گەورەیی تاوانەکە دەگۆڕدرێ، بە گوێرەی کەمو زۆری تاوانەکە زیادو کەم دەکا، تەمبێکردن چەند جۆری هەیە، هەیە بە لێتۆڕەبونو قسە پێگوتن دەبێ، هی واهەیە بە بەندکردن دەبێ، هەیە بە دەرکردنو دوورخستنەوە لە وەڵات ئەنجام دەدرێ، هەیە بەلێدان ئەنجام دەدرێ، تەمبێ کردن بە جەریمەکردنی ماڵیش دەبێ، ئیمامی مالێك لە چەند شوێنی تایبەتیدا فتوای پێ داوە... ئەو تاوانانەی کە تەمبێکردنی تێدا دەبێ وەکوو شایەتیدانی بە درۆ وەکوو ئەوەی موسوڵمانێك غەش لە موسوڵمانێك بکا یان بە هەڵەی بەرێو فێڵی لێ بکا، یان تەرازووبازیی بکا... هتد تەمبێکردن جۆرەکانی زۆرن بۆیە حاکم مەودایەکی فراوانی لەبەردەم دایە کێی بوێو چۆنی بوێ تەمبێکردن ئەنجام دەدا بەرمەجێك مەبەستی رێكو پێککردنی کۆمەڵگابێو ئیصلاحکردنی تاوانبارانو خراپەکارانی مەبەستبێو پێشگیری لە خراپەکانیان بکا، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە شەریعەتی ئیسلام زۆر وردبینانە بۆ رووداوەکان دەچێو نیگای خودایە بۆ ئادەمیزاد، چونکە هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە حاڵو چۆنیەتی ئادەمیزاد بەگوێرەی رووداوو رۆژ دەگۆڕێن! ئەو سزایەی بۆ کۆمەڵێكو سەدەمێك گونجاوە بۆ کۆمەڵێکی ترو

سەردەمێکی تر کە دابو نەریتیان جیاوازبێ ناگونجێن ئەمڕۆش سزای ماوە بۆ دیاری نەکراو، بەعونسورێکی بنەڕەتی دەژمێردرێ بۆ دابینکردنی ئەمنو ئاسایشو بەتازەترین ڕێگا چارە دادەنرێ بۆ چارەسەرکردنی تاوان لەسەر بناغەو پلانێکی زانستیانە کە بەپێی کۆمەڵناسیو دەروونزانی دا بڕێژرێ.

## ئامۆژگارییە گشتییەکان بەمەبەستی پارێزگاری ئاسایش:

لە قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەردا چەند ئامۆژگارییەکی گشتی هەن، پەیوەندییان بە پاراستنی ئەمنو ئاسایشەوە هەیە یەکێ لەو ئامۆژگارییانە ئەو فەرمانەی قورئانە کە داوا دەکا کەس شایەتی نەشارێتەوەو راستو دورست شایەدیەکی کەلایەتی ئەدای بکا، چونکە زوربەی تاوان ساخبوونەوەی بەشایەت ئەنجام دەدرێ... ئەوەتا قورئان دەفەرموێ:

{وَلاَ تَكْتُمُواْ الشَّهَادَةَ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ - سورة البقرة – ٢٨٣}.

واتە: کاتی پێویست شایەدیەکی کەلاتانە بەرێكو پێکی ئەدای بکەنو مەیشارنەوە، هەر کەسێ شایەدی بشارێتەوە، راستی ژێر لێو بخا، ئەوە گوناهبارە، خودا ئاگاداری کردەوەکانتانە. لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: (وأقيموا الشهادة لله) بەڵێ لە شەریعەتی ئیسلامدا شایەدی بە درۆ بە تاوانی گەورە دەژمێردرێو هاوشانی هاوەڵ بۆ خودا پەیداکردنە، عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) رژێك نوێژی بەیانی کرد کە لە نوێژەکە بووەوە هەستایە سەرپێو فەرمووی:

شایەدی بەدرو وەکوو شەریك بۆ خودا پەیداکردن وایە، ئەمجار ئەم ئایەتەی قورئانی خوێندەوە کە دەفەرموێ:

{فَاجْتَنِبُوا الرِّجْسَ مِنَ الْأَوْثَانِ وَاجْتَنِبُوا قَوْلَ الزُّورِ، حُنَفَاء لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِ - سورة الحج – ٣٠-٣١}.

واتـە: ئـەی کۆمـەڵی ئـادەمیزاد خۆتـان لـەبت بپـارێزن کـە شـتێکی چـەپەڵو پیسن هـەروا خۆتـان بـە دوور بگـرن لـە قـسەی درۆو دەلەسـەو شـایەدی ناهـەقی، موسـوڵمانێکی سـاخی روو لـەخوداو دادپـەروەر بـنو لـە بتپـەرستیو بتپـەرستان بەدوور بن.

بە پـشتیوانی خـودا لێـرە بـەولاوە هەنـدێ لـەو ئامۆژگاریانـەی کـە دەربـارەی پاراستنی ئەمنو ئاسایش ئاراستەی موسوڵمانان کـراونو پەیوەنـدییان هەیـە بـەو جۆرە سزایانەوە کە باسمان کـردن راگـوێز دەکـەین. یـەکێ لـەو ئامۆژگاریانـە ئـەم فەرموودە پیرۆزەی پێغەمبەرە کە دەفەرموێ:

« لَوْ يُعْطَى النَّاسُ بِدَعْوَاهُمْ لاَدَّعَى رِجَالٌ أَمْوَالَ قَوْمٍ وَدِمَاءَهُمْ وَلَـكِنَّ الْبَيِّنَةَ عَلَى الْمُدَّعِي وَالْيَمِينَ عَلَى مَنْ أَنْكَرَ .

واتە: ئەگەر وابێ هەر کەسێ داوایـێ بکاو بـەبێ بەڵـگەو نیـشان بـۆی بـچێتە سـەر وای لێـدێ دەبـێ بەپاشـا گـەردانی، زۆر کـەس بـەناڕەوا داوای سـەرو مـاڵی خەڵـکی دەکـەن، بـەڵام شـتی وا نابـێ، لەبـەر ئـەوە بەڵـگەی چەسـپاندن لەسـەر داواکەرەو سوێندیش لەسەر ئەو کەسەیە کە ناچێتە ژێر داواکەی.

یان دەفەرموێ: « كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ دَمُهُ وَمَالُهُ وَعِرْضُهُ .

واتە: هەموو موسوڵمان لە هەموو موسـوڵمانێ حەرامـە، بـە تایبـەتی خـوێنو ماڵو نامووسی، یان دەفـەرموێ: «كَل أَحَدُ أحق بَمَالَـهُ مِـنْ وَلَـدِهِ وَوَالِـدِهِ وَالنَّـاسِ أَجْمَعِينَ .

واتە: هەموو کەسێ خۆی لەبەرترە بـە مـاڵی خـۆی لـە منـاڵو بـاوكو دایـكو هەموو کەسێکی تر، یان دەفەرموێ: (لا ضرر ولا ضرار).

واتە: نەزیانـدان نە وەڵامی زیان بە زیان، یان دەفەرموێ: «وُضِـعَ عَـنْ أُمَّتِـى الْخَطَأُ وَالنِّسْيَانُ وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ .

واتـە: هـەر کەسـێ لـە ئومـەتی مـن بەهەڵـە یـان بـەهۆی لەبیرچوونەوە یـان بەجەختو زۆرە ملێ تاوانێکیان ئەنجامدا گوناهیان ناگاتێو مەعفوون.

## یەکسانی لە سزاداندا (المساواة في العقوبة):

ئـەوەی شـەریعەتی ئیـسلام لـە شـەریعەتەکانی تـر جیـا دەکاتـەوە یەکـسانی کردنیـەتی لـە چـەندیو چـۆنی سـزادان... ئـەم دیاردەیـە دادوەریـی ئیـسلامی دەچەسپێنێ!

بەپێچەوانەی ئەو یاسا چینایەتیەی کە پێش ئیسلام لای رۆمانـەکان بـاوبوو، قانوونی رۆمان دەڵێ: هەر کەسێك بێوەژنێکی مەرد یا گەورە کچێ لـەرێ دەربکـاو ئیـشی خراپـی لەگـەڵ بکـا ئـەوە سـزاکەی بـەم جۆرەیـە ئەگـەر ئـەو کەسـە لـە بنەماڵەیەکی خانەدان بوو، نیوەی ماڵەکـەی داگیر دەکرێ، ئەگەر لەبنەماڵـەیکی هەتیومـچە بـوو سـزاکەی ئەوەیـە داری حـەددی لێ بـدرێو شـار بـەدەریش بکـرێ. بـەڵام ئـایینی ئیـسلام ئـەو فـەرقو جیاوازییـەی نێـوان چینەکانی قەڵاچۆ کـردو یەکسانی لە جێبەجێکردنی سزادا چەسپاند!

بەڵـگەشمان ئـەو حەدیـسە پیرۆزەیـە کـە حـەزرەتی عائیـشە دەیگێڕێتـەوە، دەفەرموێ:

« أَنَّ قُرَيْشًا أَهَمَّهُمْ شَأْنُ الْمَخْزُومِيَّةِ الَّتِى سَرَقَتْ فَقَالُوا: مَنْ يُكَلِّمُ فِيهَا رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-. ثُمَّ قَالُوا: مَنْ يَجْتَرِئُ إِلاَّ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ حِبُّ رَسُولِ اللَّهِ فَكَلَّمَهُ أُسَامَةُ فَقَالَ يَا أُسَامَةُ أَتَشْفَعُ فِى حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ؟ ثُمَّ قَامَ فَاخْتَطَبَ فَقَالَ: إِنَّمَا هَلَكَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ وَايْمُ اللَّهِ لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا »[١].

حەزرەتی عائیشە دەگێڕێتـەوە دەفـەرموێ: قـورەیش دەربـارەی ئـەو ئافرەتـە مەخزومییەی کە دزی کردبوو کەوتنـە مقۆمـۆو ویـستیان وا بکـەن، ئـەو ئافرەتـە لەسـزای دزییەکـەی، رزگـار ببـێ! وتیـان: کـێ هەیـە لـەم بـارەوە بتوانـێ لەگـەڵ پێغەمبـەردا قـسە بکـا؟! دوایـی وتیـان: جگـە لـە ئوسـامە- کـە خۆشەویـستی پێغەمبـەرە – کـێ هەیـە ئـەم کـارە ئـەنجام بـدا!؟ ئـەوەبوو ئوسـامە عـەرزی

---

[١] ئیمامی بوخاریو موسلیم ئەم حەدیسەیان ریوایەت کردوە.

پێغەمبەری کرد، پێغەمبەر لە وەڵامیا فەرمووی: ئەی ئوسامە! ئەوە دەربارەی حەدێك لە حەددەکانی خودا شەفاعەت دەکەی‌و دەتەوێ (حەد)ی خودا جێبەجێ نەکرێ!؟ ئەمجار تەشریفی هەستایە حەواو وتەیەکی خوێندەوەو فەرمووی: ئەوەی کە بوو بەهۆی لەناوبردنی نەتەوەکانی پێش ئێوە ئەوەبوو ئەگەر خانەدان‌و پیاو ماقوڵێکیان دزی بکردایە عەفوویان دەکردو سزایان نەدەدا بەڵام ئەگەر کەسێکی زەبوون‌و چینی هەژاریان دزی بکردایە حەدیان لێدەدا! سوێندم بەخودا ئەگەر فاتیمەی کچم دزی بکا دەستی دەبڕم‌و عەفووی ناکەم!

ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە ئەوەیە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) سوێندی خوارد کە لە جێبەجێکردنی قانوونی خوادا رانەوەستێ‌و شەریعەتی خودا بەسەر هەموو کەسدا وەك یەك تەتبیق دەکا، تەنانەت ئەگەر بەسەر کچی خۆشی دابێ، ئەمەش حەقێکەو نابێ کەس لامجوومی‌و نکوولی لێ بکا چونکە ئەگەر قانوون بەسەر بەهێزو بێهێزدا وەکوو یەك جێبەجێ نەکرێ، دەبێتە هاندەر بۆ ئەوەی بەهێز مافی بێهێز پێشێل بکاو دەستدرێژی بکاتە سەری‌و لە سزادانیش ئەمین بێ بەمەش ئاژاوە دەکەوێتە ناو کۆمەڵەوەو کۆڵەکەی ئاوەدانی‌و شارەستانی دەچەمێتەوە!

## سزا لە ئیسلامدا دادپەروەرانەیە (عقوبات الإسلام عادلة):

کۆتایی ئەم باسەمان دەهێنین بە پوچەڵکردنەوەی ئەو شك‌و گومانانەی دەخرێنە سەر ئەو سزایانەی ئیسلام بۆ تاوانەکان دایناون.

ئەو شك‌و گومانانەی کە ناحەزانی ئیسلام پێیان وایە بێویژدانییەو دەڵێن: لەگەڵ روحی شارەستانییەتدا ناگونجێ، رەخنە لەوە دەگرن کە بۆچی ئافرەت ئەگەر شووی کرد دوایی زینا بکا بەردەباران دەکرێ تا گیان دەدا، ئەگەر شووی نەکردبوو سەد داری حەددی لێ دەدرێ! دەڵێن شتێکی ناڕەوایە کە دز دەستی ببڕدرێ!؟ دەڵێن: بۆ دەبێ کەسێك عەرەق بخواتەوە چل داری (جەڵدی) لێ بدرێ!؟!

جا بۆ پوچەڵکردنەوەی ئەو شوبهانە دەڵێین: هەموو شەریعەت و قانوون و یاساو نیظامێك – ئاسمانی بێ یان دانراوی مرۆڤ بێ – پاراستنی ئەم پێنج شتەیان مەبەستە: گیان – عەقڵ – سامان – وەچەو نەوە – ناموس.

زیادەڕەوی تێیانداو دەستدرێژیکردن تێیاندا سەردەکێشێ بۆ کێشەو نیزاع و خوێن ڕشتن و نەمانی ئەمن و ئاسایش و بڵاوبوونەوەی ئاژاوەو پشێوی، بەڵام، قانوونە دەستکردەکان لەم ڕێبازە ڕاستە لایان داوەو نەیانتوانی بەم ئەرکە پیرۆزانەی خۆیان هەڵسن و بۆیان نەکرا ڕەگ و ڕیشەی فەساد دەربێنن، ئەوەتا زینایان حەرام نەکردوە مەگەر لەچەند حاڵەتێکدا نەبێ، زینایان بەلاوە ڕەوایە ئەگەر ئافرەتەکە ڕازی بوو گوایە بەمە سەربەستی شەخصی دەپارێزن دەڵێن: مرۆڤ سەربەستە بە ئارەزۆی خۆی چی بوێ با بیکا! دەی ئاکامی ئەم بۆچوون و ڕێگەدانە ناڕەوایە بوەتە هۆی زۆربوونی منداڵی ناشەرعی و بڵاو بوونەوەی نەخۆشیە نهێنییەکان، کە وەك شێرپەنجە جەستەی ئادەمیزاد دادەوەشێنێ، ترسی ئەوەی لێ دەکرێ کە ئادەمیزاد بنەبڕ بکا، لەلایەکی ترەوە بەرەوا بینینی زینا وا لەگەنج دەکا کە بیر لە ژنهێنان نەکاتەوە...؟

جارێ بەڵگە هێنانەوەیان بەسەربەستی شەخصی بەڵگەیەکی بێهێزەو ڕەت دەکرێتەوە، چونکە دەستوورێکی سەلمێنراوە کە مرۆڤ سەربەستی تەواوی هەیە مەگەر لە کارێکا کە ئەو کارە زەرەری بۆ خۆی یان بۆ کەسانی تر هەبێ، هەرکاتێ ئەم زیانانەی لێ چاوەڕوانکرا، ئەوە سەربەستی نییە، دەی بەپێی تاقیکردنەوەو ئەوەی کەوا لەبەرچاوە زیناکردن زیانی بۆ زیناکەر هەیە چ لە بارەی تەندروستییەوەو چ لەبارەی ڕەوشت و ئەدەبەوە، جگە لەوەش زەرەری بۆ بنەماڵەکانیشیان هەیەو ئەوانیش سەریان پێی شۆڕ دەبێ، بگرە تاوانێکە وەکوو کوشتن وایەو دەستدرێژییەکە چاو پۆشی لێ ناکرێ، بۆیە زۆر جار غیرەتی شەرەف و ناموس وا دەکا کە زیناکەر بکوژرێ، بۆیە لەناو موسوڵماناندا بەم هۆیەوە کوشتن زۆرە! هەروەها قانوونە دەستکردەکان عەرەقخواردنەوەشیان بەم بەڵگەیە واتە: سەربەستی شەخصی – بەلاوە ڕەوایە، هیچ بەتاوانی نازانن ئەوەیان لەبیر خۆیان بردۆتەوە کە عەرقخواردنەوە – بەشایەدی پزیشك و

زانیاری تەندروستی – زیانی بۆ لەش هەیەو زەرەری پێ دەگەیەنێ، ئەمە بێجگە لە ماڵو سامان بەفیڕۆدانو دەستدرێژی کردنە سەر عەقڵو ئاوەزو تێکدانی رەوشتی رێكو پێکی مرۆڤ بە جۆرێك ئەگەر ژێرانە سەیری بکەین عەرەقخوادنەوە تاوانێکی گەورەیەو زۆرجار سەردەکێشێ بۆ ئاژاوەو گێرەشێوێنی گەورە!! تەنانەت جاری وا هەیە سەرخۆش هاوەڵو کوڕو کچو خێزانی خۆی دەکوژێ، جاری وا هەیە ژنی خۆی تەلاق دەداو ماڵی خۆی وێران دەکا! دەی باشە لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ئایا سزای قانوونی – کە حەبسو پارە لێ ستاندنە – بەگونجاو دادەنرێ؟! بێگومان ئەو سزایانە نابنە لەمپەرو مرۆڤ لەو تاوانە ناگێڕێتەوە! مەگەر سزایەکی بەدەنی ئازار بەلەش بگەیەنێ بتوانێ مرۆڤ لەو تاوانە بگێڕێتەوە ئەویش داری جەڵدەیە.

بێگومان سزای بوختانکردنیش کە هەشتا جەڵدەیە، سزایەکی عادڵانەیە چونکە بوختان دەستدرێژیکردنە بۆ سەر ناموسو رێزی خەڵکی کە یاساو نیظام پارێزگاری لێ دەکا، چونکە بوختانکردن بە ئافرەتی داوێنپاكو رەوشت بەرز دوژمنایەتیو دژایەتی لە نێوان خێزانو بنەماڵەکاندا دەخاتەوەو دەبێتە هۆی بوغزو کینەو دژایەتی بۆ یەکتریی، زۆر جاریش سەردەکێشێ بۆ کوشتنو بڕین، ئەمەش تاوانێکە پێویستە سزایەکی وای بۆ دانرێ کە خەڵکی بگێڕێتەوە، خەڵکی هەروا بەهەوانتە جڵەو بۆ زوبانی خۆیان شل نەکەنو ئافرەتی داوێنپاکی رەوشت بەرز لەکەدار بکەن شەڕو ئاژاوە بخەنەوە.

شەریعەتی ئیسلامی کە سزای دەستبڕینی داناوە بۆ دز سزایەکی زۆر عادڵانەو رەوایە، چونکە دز بەنهێنی ماڵەکە دەدزێو دەستدرێژی دەکاتە سەر خاوەن ماڵو غافڵ گیری دەکا، دەستدرێژییەکی تر سنووکانە ئەنجام دەدا بەڵکوو زۆر جار دز مرۆڤ دەکوژێ بۆ ئەوەی بتوانێ دزییەکەی بەتەواوی بکا خۆی لە سزای دزییەکەی قوتار بکاو تەنانەت کوێرانە مرۆڤ کوژی دەکا!؟ دەی بابزانین: ئاخۆ بەندکردن (کە قانوونە دەستکردەکان دایان ناوە) بۆ سزادانی دزیکەر توانیویەتی تاوانباران لە دزی بگێڕێتەوە؟! ئایا چ رۆڵێکی هەیە لە دەروونی ئەوانەی کە بەتاوانی دزی هەڵدەستن؟ ئایا بەندکردن (حبس) ئەمنو ئاسایش دەستەبەر دەکا؟!

بێگومان نەء! ئەوەتا ئێمە دەبینین رۆژ بەرۆژ تاوانی دزیکردن زیاد دەکا، کەم ناکا بۆ؟ چونکە سزاکە سزای بنەبڕکردن نییە، سزایەك نییە خەڵکی بترسێنێ! هەر بۆیەشە دەبینین دزو قاچاخچییەکانی ئەمڕۆ – کە لێپرسراوانمان پێیان وایە دەستبڕین لەگەڵ گیانی شارستانیدا ناگونجێ – خۆ سازدەدەنو کۆمەڵ بۆ خۆیان دروست دەکەن گروپی چەکدار پێکەوە دەنێن، هەر دەڵێی حکوومەتی ناو حکوومەتن وەکوو لە وڵاتە یەکگرتووەکانو شوێنەکانی تردا بەدی دەکرێ، دڵنیاشین ئەگەر سزای دزی دەستبڕین بوایە تاوانباران دەترسانو لەتاوانی دزیکردن دوور دەکەوتنەوە بەندیخانەکانمان چۆڵو هۆڵ دەبوون، فەرمانگە ئاسایشییەکانمان دەکەوتنە ئیستراحەتەوە، دادوەرو دادگاکانمان لەم فەرمبالغیو لێکۆڵینەوە بێ هودانە رزگاریان دەبوو! ئەگەر شەریعەتی ئیسلام دەست بەکار بوایەو کاری پێبکرایەو بە گوێرەی یاساکانی ئەو دزەکان سزایان بدرایە ریشەی ئەم تاوانە لە بێخ دەردەهێنراو ئاسەواری نەدەما! بۆ نموونە سەیری وڵاتی سعودییە بکەینو بەراوردییەکی ژیرانەی ئێستاو رابوردووی بکەین بۆمان دەردەکەوێ: کە هەر ئەو وڵاتەو ئەو کۆمەڵگایە لە رابوردودا ئەمنو ئاسایشی تێدا نەمابوو کەس لەماڵو ناموسو گیانی خۆی ئەمین نەبوو، کەچی کە ئەم فەرمانڕەوایانەی بنەماڵەی (آل سعود) هاتنە سەرتەختو یاسای دەست بڕینیان خستەکارو چەند کەسێك دەستی بڕدرا، ئیتر ئەم تاوانە زۆر کەم بووەوەو خەڵکی وازیان لێهێنا!

لە ئەمەوە بۆمان ئاشکرا دەبێ کە ئەو سزایانەی ئیسلام دایهێناون تا بڵێی کاریگەرو گونجاونو بۆ بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵنو خۆشبەختی تاكو کۆمەڵیانو لەخۆگرتووەو هەموو کاتێ بەکاری کارپێکردن دێنو چۆن پێشی چوارده سەدە کارپێکردنیان گونجاو بووە، ئەمڕۆش ئاوا بەکاردێنو شیاوی تەتبیقن! لەمەوە بۆمان رون دەبێتەوە کە ئیسلام زۆر بە داناییو کاراماییو لێزانی سزاکانی داناوە، گەواهی ئەوەن کە ئەو یاسا رێكو پێکانە نیگایەکی خوداییینو بۆ پێغەمبەری ئیسلامو هاتووتە خوارێو بەڵگەی راستگۆیی پێغەمبەرن (دروودی خودای لەسەربێ).

## بەشی بیستو پێنجەم:

# تەندورستی لە ئیسلام دا

ئەمە باسێکە چەند موعجیزەیەکی پزیشکی لەخۆ گرتووە کە زانست ئەمڕۆ نهێنییەکانی دەرخستوون.

* باسی پاکو خاوێنی کە بریتییە لە: سوودی دەستنوێژ – سوودی خۆشتنو حەمامکردن – ددان شتنو پاکردنەوەیان – نینۆککردن موو کورت کردنەوە – خۆپاکردنەوە لە پیسی.

* خواردنو خواردنەوە کە برتین لەمانە: مردارەوەبوو حەرامە – زەرەرو زیانی گۆشتی ئاژەڵی درندە – زەرەرو زیانی خوێن خواردنەوە – زەرەرو زیانی خواردنی گۆشتی بەراز – زیانی عەرەقخواردنەوە – چڵێسی خراپە – سوودی رۆژو – هەنگوێن دەرمانو شیفائاوەرە.

* تەندروستی گشتی بریتییە لە: دەرمانکرن – قورمتینە (الحجر الصحی) – دورکەوتنەوە لە ئافرەتی بێنوێژ – زیانی داوێنپیسی – بڕیاردانی گڵاوی سەگ – وەرزش – سوودی نوێژ – خۆماندوکردنو زۆر لەخۆکردن خراپە.

## گرنگیپێدانی ئیسلام بە تەندروستی!:

ئایینی ئیسلام یاساو بەرنامەیەکی بێ وێنەی بۆ تەندروستی داناوە، بۆ ئەوەی مرۆڤ لە نەخۆشیو پەتاو ئازارەکان بپارێزێو کۆمەڵێکی ساغی پتەوی لەشساغ دروستبکا، چونکە لە ئیسلامدا پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لە نێوان گیانو لەشداو پێویستە هەردوکیان گرنگیان پێ بدرێ، چونکە مرۆڤی نەخۆش ناتوانێ وەکوو پێویست سوود لە ژیان ببینێو ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام بدا. مرۆڤی نەخۆش ئیرادەی زەعیفەو ئەندامی شپرێوەو بیرو بۆچونی چەواشەیەو میزاجو تەبیاتی توندو تیژەو لەختو خۆڕایی هەڵدەچێ. کۆمەڵگای ئادەمیزاد – وەکوو پێویست – سوودی لێ نابینێ، ئەو سوودو قازانجەی موسوڵمانان لە لەشساغو بەهێزو تەندورستانیان دەست دەکەوێ هەرگیز لەبێ وەجو نەخۆشانیان وەگیرناکەوێ. بۆیە قورئانی پیرۆز مەدحی لەشساغو بەهێزانی کردوە بەمەرجێك

دەرونپاكو بەرەوشت بن، ئەوەتا قورئان لەسەر زوبانی كچەكەی حەزرەتی شوعەیب دەربارەی حەزرەتی موسا دەفەرموێ:

{يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ-سورة القصص/٢٦}.

لێرەدا كچی حەزرەتی شوعەیب (درودی خودای لەسەربێ) بینیو زانی كە موسا بەهێزەو توانی بە ئاسانی بەردی سەر بیرەكە لابەرێو ئاو بۆ مەڕەكانیان هەڵبێنجێ، لە هەمانكاتدا بە چاوێكی برسییانە سەیری كچەكانی نەكرد، بۆیە كچەكە كە هاتەوە بە باوكی گوت بابەگیان ئەم پیاوە بەكرێ بگرە، چونكە هەم بەهێزو توانایە هەم بەئەخلاقو ڕەوشتو داوێنپاكە! لە ئایەتێكی تردا قورئان ئەوە دەچەسپێنێ كە بەهێزو تواناییو ڕێكوپێك ئەندامی سیفەتێكی پیرۆزەو لە ڕێزی مرۆڤ زیاد دەكا خودا دەربارەی طالوت – كە كرا بە پادشای نەوەی ئیسرائیلو ئەوانیش رەخنەیان گرت – دەفەرموێ:

{إِنَّ اللّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ وَاللّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَن يَشَاء وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ - سورة البقرة – ٢٤٧}.

لێرەدا روی خیتاب لەگەڵ نەوەی ئیسرائیلەو پەروەردگار ئەوەیان بۆ رون دەكاتەوە كە هۆی هەڵبژاردنی طالوتو بۆ پادشایی ئەوانو ڕێز لێگرتنی لەبەر دوو هۆیە:

یەكەم: زاناییو لێزانی لە كارو باری فەرمانڕەوایی داو لێهاتوویی بۆ بەڕێوەبردنی ئیدارەی وڵات.

دووەم: باڵا بڵندیو ڕێكو پێك ئەندامیو لەشساغییە، چونكە وەكوو باوە دەڵێن عەقڵو هۆشی ساغ لەناو لەشو لاری ساغدایە. فەرموودەكانی پێغەمبەریش لەم بارەوە ئاماژەیان بۆ ئەوە كردوە كە موسوڵمانی بەهێزو توانا زێدە ڕێزی هەیە، پێغەمبەر دەفەرموێ:

« الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ وَفِى كُلٍّ خَيْرٌ . رواه مسلم .

واتــە: موســوڵمانی بــەهێزو توانــا باشــترو خۆشەویــستترە لــەلای خــودا لــە موسوڵمانی بێ وەچو زەبونو هەردوکیشیان باشن. هەر کەسێکیش لەو تەشریعاتە ئیسلامییانە ورد بێتــەوە کــە دەربــارەی تەنــدروســتی هــاتوون، ئــەوەی بــۆ ئاشــکرا دەبێ: کە ئیسلام زۆر ئوسوڵو یاسای بۆ موسوڵمانان دانــاون کــە ئــەمڕۆ زانیــاریی پزیــشکی تــازە بــە قاعیدەیــەکی ســەرەکیو پیــشکەوتوویان دادەنــێ، بــۆ پێــشگیریی کردن لەزۆر نەخۆشی پێش پەیدابوونیان یان سوککردنی کاریگەرییەکەی ئەگەر پەیدابوو!

بێگومان ئیسلام زۆر گرنگی داوە بە یاسای خۆپاراستن (التشریعات الوقائیة) ئــەمجار گرنگــی داوە بــە تەشــریعاتی چارەســەرکردن کــە دەبنــە هــۆی ســوککردنی ئێشو ئازاری لاشە، وەکوو لێرەو بەولاوە رونی دەکەینەوە.

## یاساو تەشریعاتی خۆپاراستن (التشریعات الوقائیة):

باشترین چارەسەرکردنی نەخۆشی ئەوەیە کە خۆی لێ بپارێزیو نــەهێڵێ ســەر هەڵبداو تەشەنە بکاو بڵاو ببێتەوە، زانستی پزیشکیش هەروا دەڵێ: واتــە خۆپاراســتن باشترە لە چارەســەرکردن، بۆیــە دەبیــنین زانیــاری خۆپاراســتن لــە نەخۆشــی لەوەڵاتــە پێشکەوتووەکاندا لەگەشەکردندایەو دەبینین داموو دەزگاکانی ئــەو وڵاتانــە بــە هــەموو شــێوەیەك لێبڕاوە بــۆ بڵاوکردنــەوەی ئــەو زانیارانــە، تەنانــەت لــە قوتابخانەکانــدا بــە شــێوەیەکی فــراوانو پێویــست بــڵاو دەکرێتــەوە، ئــەوەشمان لــەبیر نەچــێ تەشــریعاتی خۆپاراستن لە ئیسلامدا دەکرێت بەچوار بەشــی ســەرەکییەوە هــەر بەشــێکیش چــەند لقو پۆپی لێ دەبنەوە:

یەکەم: خاوێنی.

دووەم: خواردنو خواردنەوە.

سێیەم: تەندروستی گشتی.

چوارەم: وەرزش.

## پاكو خاوێنی (النظافة):

ئـایینی ئیـسلام گرنگییـەكی زۆری بـەپاك خـاوێنی داوە تەنانـەت پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرموویـەتی: (النظافـة مـن الإیمـان) پـاكو خـاوێنی بەشـێكە لـە ئیمانـداریو لـەبیرو بـاوەڕەوە هەڵـدەقوڵێ: جـا بـۆ ئـەوەی رونـی بكەینـەوە: كـە ئیسلام چەند سوورە لەسەر پاكو خاوێنی چەند خاڵێك دەخەینەڕو:

## سوودو قازانجی دەستنوێژ (فائدة الوضوء):

ئـاییـنی پـیرۆزی ئیـسلام پـێش ئـەوە موسـوڵمان دەسـت بكـا بـە نوێـژ دەستنوێژگرتنی لەسەر پێویست كردوە وەكوو لە قورئاندا دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَينِ - سورة المائدة – ٦}.

واتە: ئـەی كۆمـەڵی موسـوڵمانان! هـەركاتێ خۆتـان ئامـادەكرد بـۆ نوێـژكردن پێش ئەوەی دەست بكەن بەنوێژ دەستو دەمو چاوتان بشۆن، ئەمجار دەستتان تـا ئەنیـشك بـشۆنو دەسـتی تـەڕ بەسـەرتانا بێـننو قاچـتان تـا قولـەپێ بـشۆرن. پێغەمبــەریش (درودی خودای لەسەربێ) لــە فەرموودەكانیــدا زیــاد لــە پێداویــستییەكانی دەسـتنوێژ چـەند شـتێكی تـری زیـادكردوە وەكـوو ئـاو لـەدەم وەردانو ئـاو لـەلوت وەردانو دەسـتی تـەڕ پێـداهێنانی گوێـچكەو دەسـت رێ خـستنی ئـەو ئەندامانـەی ئـاوی دەسـتوێژیان بەسـەردا دەڕوا ئـەمجار بەشـانەكردنی بەنجـەی دەسـتو قـاچو شتنی هەموو ئەندامێك سێ جار سێ جار.

جا ئەگەر لە شەوو رۆژێكدا پێنـج جار نوێژ پێویستەو فەرزەو لەكاتی هەموو نوێژێكیـشدا هـەبوونی دەسـتنوێژ پێویـست بـێ، ئـەوە بۆمـان ئاشـكرا دەبـێ كـە موسـوڵمان رۆژانـە دەبـێ پێـنج جـار یـان كـەمتر، بـەلانی كەمـەوە دووجـار دەبـێ دەستنوێژ بشوا ئەمـەش دەبێتـە هـۆی پاراستنی چـاو لـە چاوهێـشە چونكە دەمو چاو رۆژی چەندجار بەئاوی پاك دەشۆرێن، هەروەها ئاو لـەلووت راكـردن دەبێتـە

هۆی پاراستنی لە هەڵامەتو نەشلە، هەروەها ششتنی دەمو چاوو گوێچکەو دەستو مەچەك كە ئەمانە زۆر بەدەردەكەونو عادەتەن نەخۆشی پێستو ئیلتیهابات بە زۆری لەو ئەندامانەوە سەر هەڵدەدا كە زۆرتر بەدەرەوەن! دەی ششتنی ئەم ئەندامانە رۆژانە چەند جارێك باشترین رێگا چارەیە بۆ پاراستنیان لەم نەخۆشییانە. لەم دواییانەشدا زانیاریی دەری خست كە زۆر جرثوومەو نەخۆشی لە پێستەوە دەچێتە ناو لەشی مرۆڤەوە!! ئاشكراشە ششتنی رۆژانە چەند جارێك پارێزگارییەكی ئاسانو كاریگەرە، چونكە توێی سەرەوەی پێستی مرۆڤ ناهێڵێ هیچ جرثوومەیەك بچێتە ناو لەشی مرۆڤەوە مەگەر زۆر لەو شوێنە بمێنێتەوە!! ئەو میكروبانەی كە لەدەمەوە دەچێتە ناو لەشی مرۆڤەوە زوربەی بەهۆی پیسبوونی دەستو پەنجەوەیە، جا ئەگەر دەست رۆژی چەند جارێك بەئاوی پاك بشۆرێن دیارە باشترین پارێزگارییە.

## سوودی حەمامكردنو لەش شوشتن (فائدة الاستحمام):

ئایینی ئیسلام شوشتنی هەموو لەشی پیاوو ئافرەتی بە پێویست داناوە بە تایبەتی دوای بەیەك گەییشتنیانو دروستبوونیان، یان ئیحتیلام بوونیان وەكوو قورئان دەفەرموێ:

{وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُواْ - سورة المائدة – ٦}.

ئەگەر لەشتان گران (پیس) بوو خۆتان بشۆنو لەشتان پاك بكەنەوە.. ئەمە كردەویەكی بەسوودە چ بۆ پیاوو چ بۆ ژن، زانستی تازەش ئەوەی چەسپاندووە كە جەستەی ئادەمیزاد پاش ئەنجامدانی عەمەلییەی جنسی (سیكس) گەڵێ هێزو گەشەی دەفەوتێو تەواو ماندو دەبێ، هیچ شتێك نییە بتوانێ ئەو هێزو توانایەی بۆ قەرەبوو بكاتەوە وەكوو خۆشتن بە ئاوی پاك بۆی پەیدا دەكاتەوە! هەر لەبەر ئەوەیە ئەگەر لەش پیس بەشێكی لەجەستەی خۆی نەشت غوسڵەكەی دروست نییە:

## خاوێن راگرتنی دەمو ددان (تنظیف الاسنان):

ئایینی ئیسلام هەمیشە خەڵکی هەڵدەنێ بۆ پاککردنەوەی دەمو ددانو پاك راگرتنیان بە سیواك یان بە شتی تر! پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر بارگرانی نەبوایە لەسەر گەلو ئومەتم فەرمانم پێ دەکردن کە پێش هەموو نوێژێك سیواك بکەن... سیواك چڵە دارێکە لە داری ئێراك پڕژی باریکی هەن بۆ پاککردنەوەی ددان بەکار دەهێنرێو بۆنێکی خۆش بۆ دەمو ددان پەیدا دەکا!

ئەگەر لە نیگای پزیشکییەوە سەیری ئەم دارە بکەین دەبینین بەگوێرەی زانیاری کیمیا – ئەم دارە پێك هاتووە لە پڕژی سیلیۆزو چەورایىو راتنجی عەتریو سوێری مەعدەنی تێدایە، کە هەرە گرنگیان کلۆرۆری سۆدیۆمە کە ئەویش خوێی چێشتە، هەروەها کلۆریدی بوتاسیومو مادەی جیڕی شتی تریشی تێدایە!

سیواك فڵچەیەکی سروشتییە، خوێی مەعدەنی تێدایەو مادەی عەتریشی تێدایە کە بۆ پاککردنەوەو خاوێن راگرتنی دەم ددان سوودی هەیە بۆیە دەبینین پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەربێ)و هاوەڵەکانی هەزارو چوار سەد ساڵ پێش ئەمرۆ ئەو دارە پڕژاوییە – کە داری ئێراکەو فڵچەیەکی سروشتییە بۆ پاککردنەوەی دەمو ددان – بە کاریان هێناوە کەچی دانیشتوانی خۆرئاواو وڵاتە پێشکەوتووەکان بۆ یەکەمجار ساڵی ١٨٠٠ی ز فڵچەیان بەکار هێناوە. بەو فڵچە نایلۆنە دەستیان کردوە بە پاککردنەوەی دەمو ددانیان! ئاشکراشە هەرکاتێ مرۆڤ دەمو ددانی پاش گوێ بخا ددانەکانی کرمۆڵ دەبنو زەردو ناشیرین هەڵدەگەڕێنو ژارهەڵدەدەنو لەش هەڵی دەمژێو نەخۆشی زۆری لێوە پەیدا دەبێ!

بەکارهێنانی فڵچەی دەمو ددان شتن مەبەستەکەی فەرمودەکەی پێغەمبەر دەگەیەنێ کە ئەویش پاكو خاوێنی دەمو ددانە.

## نینۆككردن و تاشین و كورتكردنەوەی موو (قص الاظافر والشعر):

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی بە موسوڵمانان كردوە كە تادەتوانن گرنگی بە جەستەی خۆیان بدەن، زێدەمووی لاشەیان بتاشن یا كورتی بكەنەوەو نینۆكیان بكەن، لە فەرموودەیەكیدا دەفەرموێ: پێنج شت نیشانەی باوەڕو پاك رەوشتین و پەیڕەوكردنی پێغەمبەرانە: تاشینی مووی بەر، خەتەنەكردن، كورتكردنەوەی موی سمێڵ، هەڵكەندنی مووی بن هەنگڵ و نینۆك كردن.

## خۆپاككردنەوە لە پیس و پۆخەڵی (التطهر من النجاسة):

ئایینی ئیسلام وشەی پیسی (النجاسة)ی داناوە بۆ هەموو پیسییەك كە گەرای نەخۆشی تێدابێ، یان دەبێ بەهۆی گواستنەوەی نەخۆشی و تاعوون.

لە هەمان كاتدا فەرمانی كردوە بەخۆ پاككردنەوە لێی، ئەوەشی چەسپاندووە كە خوێن و كێم و مێزو پیسایی كە لە جەستە دێنە دەرێ پیسن و دەبێ خۆیان لێ پاك بكرێتەوە، لاشەی ئاژەڵی تۆپیوو مردارەوە بوو، هەروا چیقنەو پیسایی ئاژەڵ بە هەموو جۆرەكانیەوە بە پیسیان دادەنێ و پێویستە خۆیان لێ بپارێزرێ، هەر بۆیەشە ئایینی ئیسلام نەك هەر لەش و ئەندام بەڵكوو فەرمانی كردوە پۆشاكیش پاك و خاوێن بێ و بەپاكی رابگیرێ، بەتایبەتی لەكاتی نوێژدا. قورئان دەفەرموێ:

{وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ - سورة المدثر – ٤}.

واتە: جل و بەرگی خۆت خاوێن راگرە.

یەكێك لەو سوننەتانەی كە ئیسلام بۆ پاك و خاوێنی داناوە خۆپاككردنەوەیە بە ئاوی پاك، ئەو ئاوە پاكەی كە خودی پیسییەكە لادەبا، ئەگەر ئاو نەبوو بەرد بەكار دەهێنرێ، یان كاغەزو مقەبا یان شتی تری لەو جۆرە، هەر لە سوننەت و رێڕەوی ئیسلامە كە فەرمانی كردوە دەستی چەپ بەكار بهێندرێ بۆ خۆ پاككردنەوە لە میزو پیسایی و بەكار هێنانی دەستی راست بۆ شایەتمان و نان خواردن. پێغەمبەر لەم بارەوە دەفەرموێ:

« إِذَا شَرِبَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَتَنَفَّسْ فِى الإِنَاءِ ، وَإِذَا أَتَى الْخَلاَءَ فَلاَ يَمَسَّ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ ، وَلاَ يَتَمَسَّحْ بِيَمِينِهِ »[1].

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە ئاوی خواردەوە با لەناو جامەئاوەکەدا هەناسە نەداتەوە، ئەگەر چو بۆ سەر پێشاو با دەستی راستی نەهێنێ بەوانێکەیدا. هەروەها پێغەمبەر لە فەرموودەیەکی تریدا فەرمانی کردوە بەوە هەر کەسێك لەخەو هەڵسا با هەردوو دەستی بشوا.

« إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ فَلاَ يُدْخِلْ يَدَهُ فِى الإِنَاءِ حَتَّى يَغْسِلَهَا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لاَ يَدْرِى أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ »[2].

هەر لە ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەربارەی پاكو خاوێنی کە دەفەرموێ:

« لاَ يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِى الْمَاءِ الدَّائِمِ الَّذِى لاَ يَجْرِى ، ثُمَّ يَغْتَسِلُ فِيهِ » .

لەم حەدیسە پیرۆزەدا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) راستەوخۆ هەوڵی قەڵاچۆکردنی نەخۆشی بلهارزیاو نەخۆشییەکانی تری داوە، چونکە ئاوی راوەستاو ئەگەر یەکێك میزی تێکرد - بەتایبەتی ئەگەر میزکەرەکە نەخۆشی هەبوو - زوو نەخۆشییەکە بڵاو دەبێتەوە جگە لەوە نەخۆشی تریش دەخاتەوە، زیاد لەوەش بۆگەن بڵاو دەکاتەوە! فەرمودەکەی پێغەمبەر کە دەفەرموێ: (ئاوی راوەستاو) حیکمەتێکی تری تێدایە ئەویش ئەوەیە کە ئاوی رەوانو رۆیندە کەمتر نەخۆشی بڵاو دەکاتەوە...

## خواردنو خواردنەوە (المأكل والمشرب):

شتێکی ئاشکرایە کە لەشی مرۆڤ بۆ ئەوەی ئەرکی شەرشانی خۆی لەژیاندا ئەنجام بدا پێویستی بە خۆراك هەیە، بۆیە دەبینین ئیسلام فەرمان بە

---

[1] ئیمامی بوخاری ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە.

[2] ئیمامی بوخاریو موسلیم ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە.

موسوڵمانان دەكا كە لەرزقو رۆزی پاكو خاوێن كە خودا پێی بەخشیون بخۆنو بخۆنەوە هەرگیز شتی پیس نزیك خواردنو خواردنەوەیان نەخەن.

پەروەردگار دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَاشْكُرُواْ لِلّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ، إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللّهِ - سورة البقرة – ١٧٢ -١٧٣}.

واتە: ئەی موسوڵمانان بخۆنو بخۆنەوە لەو خۆاركو بژێوەپاكەی كە ئێمە كردومانە بەرزقو رۆزی ئێوە شوكرو سوپاسی خودا بكەن، ئەگەر ئێوە راست دەكەن ئەو دەپەرستن.. ئەوەی لەسەر ئێوە حەرامە مردارەبوو خوێنو گۆشتی بەرازەو گۆشتی ئەو كوشتییەی بۆ غەیری خودا سەردەبڕدرێو لەكاتی سەربڕیندا ناوی خودای لەسەر نایە!! ئەم ئایەتە بەروونی ئەوە دەگەیەنێ كە مردارەوەبوو خوێنو گۆشتی بەراز خواردنیان حەرامە، دەی با هەندێك لەم بارەوە درێژە بە باسەكان بدەین.

## زیانی خواردنی گۆشتی مردارەوەبوو جۆرەكانی:

مردارەوە بوو ئەو ئاژەڵەیە كە بەبێ سەربڕین بە مردنێكی تەبیعی یان بەكارەساتێك مردار ببێتەوە، دیارە بێ هۆ مردارنابێتەوە، جا ئەگەر مرداربوونەوەكە، بەهۆی نەخۆشی بوو، ئەوە گومانی تێدا نیە كە لە لەشی ئەو ئاژەڵەدا هەندێ مادەی نا ئاسایيو ژەهراوی ماوەتەوەو خواردنی گوشتەكەی زیان بە مرۆڤ دەگەیەنێ، تەنانەت ئەگەر بە ئاگر تەعقیمیش بكرێ بنە بڕ نابێو هەندێ لەو مادە نائاساییانە دەمێنێتەوە! لاشەی مردارەوە بوو لەم حاڵەدا وەكوو خۆراكی ترشاو وایە كە گۆڕابێ چەندێك بتەوێ بەهۆی گەرمییەوە میكرۆبەكانی لێ هەڵاوێری، بەشی ئەوەندەی تێدا دەمێنێتەوە كە زیانبەخش بێ، تەنانەت زۆر جار خواردنی ئەو جۆرە گۆشتە سەردەكێشێ بۆ مردنو تووشی نەخۆشی سامناك بوون. ئەگەر مردارەوە بوو مرد نەكەی بەهۆی پیرییەوە بوو ئەوە زیانی وەكوو

زیانی مدارەوە بوو وایە: چونکە پیری واتە لەناوچوونی یەك لەدوا یەکی ئەنسیجەکانی جەستە، دیارە داهیزانو لەناوچوونی هەر ئەنسیجەیەك بەبێ هۆ نابێ، جا هۆیەکە زەعیفیو زەبوونی سروشتی بێ، یان نەخۆشییەکی لە سەرەخۆی درێژخایەنی سستکوژ بێ، کە بێگومان تامو رەنگی گوشتەکە دەگۆڕێو پلەی شیاوو گونجاو بۆ بژێوی کەم دەکاتەوە، بۆ هەزم بوون نابێ یان باش نییە.

لەوانەیە یەکێك بڵێ: کاکە گیان! ئەوەتا رۆژانە لەوڵاتە کوێستانەکانو خۆر ئاوادا ئەو هەموو گۆشتە مردارەوە بووە دەخورێ، هەروەها خوێنو گۆشتی ئاژەڵی سەرنەبڕاو، ئاژەڵی گۆشت نەخوراو دەخورێو چ زیانیشیان پێ ناگاو نەخۆشیش ناکەون! بۆ وەڵامی ئەوە دەگوترێ زیانی خۆراکی ترشاوو گۆڕاو لە وڵاتی کوێستانو ساردا کەمترە بەڵام بۆ وڵاتی گەرمەسیر زیانی زۆرەو خەتەرە! دەی خۆ ئایینی ئیسلام ئایینێکی جیهانییەو بۆ هەموو جیهان هاتووە کە وڵاتی گەرمەسیریش دەگرێتەوە کە خۆراکی تێدا توشی گۆڕان دەبێو زوو خواردەمەنی تێدا تێك دەچێ!

کەوابوو گومان لەوەدانییە کە گۆشتی حەیوانی سەربڕاوی ساغو بێ دەرد بژێوێکی باشەو هیچ زیانێکی تێدا نییە بە پێچەوانەی ئاژەڵی مردارەوە بوو کە خوێنەکەی لێ نەچۆڕاوەو پاك نەبۆتەوە ئەو پەڕی زیانی تێدا هەیە!.

## جۆرەکانی مردارەوە بوو (أنواع الميتة):

ئەو ئاژەڵەی بەکارەساتێك لەناو دەچێو مردار دەبێتەوە ئیسلام گۆشتەکەی حەرامکردوە، قورئان دەفەرموێ:

**{حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالْدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ-سورة المائدة – ٣}.**

١- **المنخنقة**: بەو ئاژەڵە دەگوترێ کە بە خنکان مرداربێتەوە، دیارە خنکان دەبێتە هۆی ئەوەی گۆشتی خنکاوەکە بەزوویی بۆگەن بکا، هەروەکوو چۆن

لەڕوی پزیشکییەوە گۆشتی خنکاوەکە بەکاری خواردن نایە چونکە ڕەنگی گۆشتەکە دەگۆڕێو ڕەش دەبێو بۆنی ناخۆش دەبێو جیڕ دەبێتەوە.

٢- **الموقوذة**: بەو ئاژەڵە دەگوترێ کە ئەوەندەی لێ دەدرێ کەپێی مرداربێتەوە یان نزیك مردارەوەبوون دەبێ، ئەمجار وازی لێ دێنن تا مردار دەبێتەوە بەهۆی لێدانەکەوە.

٣- **المتردية**: بەو ئاژەڵە دەوترێ کە لە بەرزاییەکەوە بکەوێتە خوارێ بەهۆی کەوتنە خوارەوە مرداربێتەوە.

٤- **النطيحة**: ئەو ئاژەڵەیە کە بەهۆی شەڕکردنو شەڕە قۆچەوە لەگەڵ ئاژەڵێکی تردا مردار ببێتەوە، چونکە زوربەی کات وادەبێ بەهۆی شەڕە قۆچو لێکدانەوە هەردوکیان یان یەکیان مردار دەبێتەوە.

گۆشتی ئەو ئاژەڵانەی کە بەهۆی کارەساتو ئەو جۆرە شتانەوە مردار دەبنەوە بەکاری خواردن نایەن. وەکوو پزیشكو زانیاری تەندروستی چەسپاندویانە لەبەر ئەوە گۆشتەکە ڕەش هەڵدەگەڕێو لنج دەبێو بۆگەن دەکا، خۆ ئەگەر میکروبو بەکتریا بگاتە ئەو شوێنەی کە برینداربووە یان ئازاری پێ گەییشتووە یان برینەکە تووشی (گانگرینا) بوان بوو ئەوە خواردنەکەی زیاتر خەتەرناك دەبێ.

## زیانی خواردنی پاشماوەی ئاژەڵی دڕندە:

ئایینی ئیسلام خواردنی پاشماوەی هەموو دڕندەیەکی حەرامکردوە! دڕندە بەگیانلەبەری خاوەن کەڵبەو چنگ دەگوترێ: کە هێرش دەباتە سەر گیانلەبەرانی ترو یەکێك یا زیاتر کە لە پارچەدەکاو گۆشتەکەی دەخوا، جا بۆ پارێزگاری ئاژەڵ لەم جۆرە دڕندانە شوان ڕادەگیرێ! کاتی وا هەیە ئەو شوانە فریا دەکەوێ، ناهێڵێ کە لەپارچەی بکا، یان وا ڕێ دەکەوێ دەیخنکێنێ یان دەیکوژێ، ئەمجار شوان فریا دەکەوێ، یان وا دەبێ کاتێ شوان پێ دەزانێو فریادەکەوێ، کەمێکی ماوەتەوە، یان کەمێکی لێ خوراوە، لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا گۆشتی ئەو

ئاژەڵە درندە لێدراوە ناخورێ‌و نابێ بخورێ، بەمەرجێك بە لێدانەكە گیانی دەرچووبێ، چونكە ئەگەر خنكا بوو ئەوە حوكمی خنكاوی تری هەیە ئەگەر مردارەوە بوونەكەی بەهۆی بریندار كردنەوە بوو ئەوە دوبارە دروست نییە چونكە بە زۆری ئەو درندانە لا كەتۆپیو دەخۆن كە بەرواڵەت نەخۆشی هەڵدەگرن، یان وادەبێ بەكتریاكە لەدەمی درندەكەدا دەبێ. لەبەر ئەم هۆیانە ئایینی ئیسلام خواردنی پاشماوەی گیانلەبەری درندەی حەرامكردوە.

## زیانەكانی خواردنی گۆشتی درندەو باڵندەی راوكەر:

هەروەها ئایینی ئیسلام خوادرنی گۆشتی هەموو باڵندەیەكی چنگدارو ئاژەڵی كەڵبەدارو چنگداری حەرامكردوە، چونكە ئەو جۆرە گیانلەبەرانە ماسولكەی لەشیان توندەو رەنگی گۆشتیان ناشیرینەو بۆنیشیان بۆگەن‌و ناخۆشە... پێغەمبەری ئیسلام (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ:

**(حرم عليكم كل ذي مخلب من الطير، وكل ذي ناب من السباع)**

واتە: بۆ ئێوە حەرامە خواردنی گۆشتی هەموو باڵندەیەكی چنگدارو درەندەیەكی خاوەن كەڵبە.

گۆشتی ئەم گیانلەبەرانە بۆ مەعیدەی ئادەمیزاد گونجاو نییە، چونكە ئەمانە بۆ خۆیان نێچیر دەگرن‌و خۆیان ماندو دەكەن بەم هۆیەوە ماسولكەكانیان پتەو دەبن‌و مەعیدەی ئادەمیزاد ناتوانێ هەزمی بكا.

## زیانی خوێن خواردنەوە (أضرار تناول الدم):

ئایینی ئیسلام خوێنخواردنەوەی حەرامكردوە، چونكە خوێن گونجاوترین شتێكە كە بەكتریای تێدا دروست دەبێ، یان گەشەی تێدا بكا، زیاد لەوەش خوێن خانەی ژەهراوی لەخۆ دەگرێ‌و پێویستە خۆی لێ بپارێزرێ، جگە لەوەش بەشێك لەو ماددەی میزی لێ پەیدا دەبێ لەخۆی دەگرێ! خۆ ئەگەر بێتو خوێنەكە هی ئاژەڵێكی نەخۆش بێ ئەوەهەردەبێتە گەورەترین كارەسات‌و زۆر زیانبەخش

دەبێ، لەلایەکی ترەوە هەرگیز خوێن بەخۆراكو بژێو داناندرێ، ئەو بەشەی کە پێی دەگوترێ زولاڵ کە دەڵێی زیچکاوی روونە خراپترین بەشیەتی.

## زیانی خواردنی گۆشتی بەراز (أضرار أكل لحم الخنزير):

هەروەها ئایینی ئیسلام خواردنی گۆشتی بەرازی حەرامکردوەو موسوڵمانانی لەشەڕی توشبوون بەکرمی بەراز پاراستووە. (بیتیو دیکسونن) دەڵێ: گیرۆدەبوون بەکرمی بەراز لەچەند ولاتێکدا بومتە بەڵایەکی گشتی بە تایبەتی لە فەرەنساو ئەڵمانیاو ئیتالیاو بەریتانیا. کەچی ئەم نەخۆشییە لەولاتە خۆر هەڵاتییەکاندا زۆر دەگمەنە، چونکە ئایینی دانیشتوەکانیان گۆشتی بەرازی حەرامکردوە، لەلایەکی ترەوە گۆشتی بەراز نەخۆشی ترێخینا بۆ ئادەمیزاد رادەگوازێ کە نەخۆشییەکی سامناکە. کیفایەتە کە ئێمە دەربارەی ئەم نەخۆشییە هەندێ راستی بخەینە روو!

یەکەم: هیچ پزیشکێکی پسپۆڕ ناتوانێ ددان بەوەدابنێ: کە هەر بەرازێ بگرێ ئەم کرمانەی تێدا نین، مەگەر بەزەرەبین هەموو پارچەیەکی ماسولکەکانی ئەو بەرازە تەماشا بکا، دیارە ئەمەش کارێکی ئەستەمەو لە تواناداا نییە خۆ ئەگەر بشکرێ گۆشتەکەی ئەدم دەبێ.

دووەم: هەرکرمە مێیینەیەك لەم کرمانە (١٥٠٠) هەزارو پێنج سەد وردە گەرا لەناو ریخۆڵەی ئەو کەسەی کە تووشی ئەو کرمە بووبێ دەخاتەوە ئیتر ملیۆنەها گەرای کرمە مێیینە بەهۆی دەورەی خوێنەوە بەنێو جەستەدا بلاو دەکاتەوە، ئەم گەرایانە لەناو ماسولکەکاندا کۆ دەبنەوەو سەر دەکێشی بۆ پەیدابوونی ئازارو هەڵهاوسانی ماموسکەکان... نەسیجی ماسولکەکان بادەکەنو توند دەبن لووی ئەستور لەناو ماسولکەکاندا پەیدا دەبێ.

سێیەم: تا ئێستا چارەسەری ئەم نەخۆشییە نەدۆزراوەتەوە هەر لەبەر چەند هۆیەکی هونەری دەرمانیش ناکرێ! زیاد لەوەش گۆشتی بەراز چەند بەکتریای بۆگەنو باراتیفود راگوێزی ناو لەشی مرۆڤ دەکا کە دەبێتە هۆی ژەهراوی بوونی

لاشەی مرۆڤو دروستبوونی ئیلتیهاباتی کوشندە لە جیهازی هەزمیدا کە جاری وا هەیە بەماوەیەکی کورت مرۆڤ دەکوژێ.

## زیانی عەرەقخوادنەوە (أضرار تعاطي الخمور):

ئایینی ئیسلام بە مەبەستی پارێزگاری مرۆڤ لە زۆر ئازارو زیان عەرەق خواردنەوەی حەرامکردوە. قورئان دەفەرموێ:

**{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ - سورة المائدة -٩٠}.**

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی:

**« كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ ».**

واتە: هەموو شتێك کە ئادەمیزاد سەرخۆش بکا بە عەرەق دەژمێردرێو هەموو عەرەقێکیش حەرامە. لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ:

**« لَعَنَ اللَّهُ الْخَمْرَ وَشَارِبَهَا وَسَاقِيَهَا وَبَائِعَهَا وَمُبْتَاعَهَا وَعَاصِرَهَا وَمُعْتَصِرَهَا وَحَامِلَهَا وَالْمَحْمُولَةَ إِلَيْهِ ».**

واتە: خودا نەفرەتی کردوە لەو کەسەی دەیخواتەوە لەو کەسەی دەیگێڕێ لەوەی دەیفرۆشێ ئەوەی دەیکڕێ ئەوەی دەیگوشێ ئەوەی بۆی دەگوشرێ ئەوەی هەڵیدەگرێ ئەوەی بۆی هەڵدەگرن. لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: **(اجتنبوا الْخَمْرَ فإنه مِفْتَاحُ كُلِّ شَرٍّ)**. خۆ لەعەرەق بپارێزن چونکە عەرەق کلیلی هەموو شەڕێکە.. مادده سەرخۆشکەرە ڕێژەیەکی کەمی بۆ لەشی مرۆڤ پێویستە بۆ هەزمکردنی ماددەی شەکرو سوودێکی تەندروستی هەیە. بەڵام وادیارە ئەم سوودە کاتێك دەبێ کە ئەم ڕێژەیە بەکەمی بخورێتەوە کە لەو ڕێژە زیادی کرد زیان دەبەخشێ بە تایبەت ئەگەر کەسێ بەردەوام بێ لەسەر خواردنەوەی ئیلتیهاباتی کوشندەو درێژخایەن لە ئەعصابو گورچیلەدا دروست دەکا، دەمارەکانی خوێن توند دەکاو جەرگ ڕەقەڵە دەکاو دڵ زەبوون دەکا!

وێ دەچێ یەکێك پرسیار بکاو بڵێ: کەوایە بۆچی رێژەیەکی کەم نەخورێتەوە؟! لەوەڵامدا دەڵێین: (کحول) لە هەموو مادەیەکی تر جیاوازە تەنانەت ئەگەر کەمیش بخورێتەوە زەعیفیو زەبوونی لە ویستو ئیرادەی مرۆڤدا پەیدا دەکاو ئینفیعالاتی دەروونی دروست دەکا ئەمەش بۆ خۆی خەتەرێکی سامناکە چونکە ئەو مرۆڤە دوای خواردنەوەی ئەو مادەیە دەبێتە مرۆڤێکی تر: مرۆڤە ئاساییەکەی جاران نامێنێ، ویستو ئیرادەی دەگۆڕێ، جا هەر چەندە بزانێ کە عەرەق خواردنەوە بە زۆری خراپە لەحاڵەتی ئاساییدا خۆی پێ داگیرناکرێ، کە کەمێکی لێ خواردەوەو کاری تێکرد تازە ناتوانێ دان بەخۆیدا بگرێو ملی پێوە دەنێ تا مر دەبێو دەبێتە بەندەی ئەڵقە لەگوێی مەیو بادەنۆشی.

بێگومان هەر کاتێ (١٠) دەگرام ماددەی (کحول) گەییشتە ناو خوێنی مرۆڤ کاریگەری خۆی پەیدا دەکا، هەموو پیاڵەیەك لە ویسکی یان کۆنیاك ئەم ئەندازەیەی تێدایە، جاری وا هەیە ئینسان سەرخۆش نابێ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خواردنەوەکە کار دەکاتە سەر حاڵەتی جیسمیو عەقڵی مرۆڤەکەو لەسەر حاڵەتی سروشتی خۆی نامێنێ؟ جا ئەگەر لەم کاتەدا پزیشك بێنێ ئەو مەینۆشە فەحص بکا بۆی دەردەکەوێ کە ئەندازەی هەستو هۆشی بەتەواوی گۆڕاوە، بۆ نموونە ئەگەر بێتو ئەو مەینۆشە لەسەر ئامێری چاپکردن بنووسێ، زیاد لە عادەت هەڵە دەکا! ئەگەر ترومبێل لێخوڕی بە تەواوی یاسای هاتوو چۆ زەبت ناکا، بە گوێرەی سەرژمێرییەك کە کراوە دەرکەوتووە ١٣٪ لە کارەساتی تورمبێلەکان لە رێگەوباندا هۆیەکەی مەینۆشیو سەرخۆشی بووە.

بەگوێرەی زانیاری پزیشکی هەموو قوومە عەرەقێك پاڵە پەستۆی خوێن زیاد دەکا، ئەم پاڵە پەستۆ بەرزکردنەوەیە بەتەنیا زیانی نییە، یان زیانێکی کەمی هەیە. بەڵام کاتێك زیانی گەورەی هەیە کە مرۆڤەکە بۆ خۆی زەختی خوێنی هەبێ، جا ئەگەر کەمێك زیاد بخواتەوە بە تەواوی زەختەکە بەرز دەکاتەوە بە رێژەیەك کە دەمارەکانی مێشکی بتەقنو توشی شلەپەتێ ببێو

نزیکە بیکوژێ! چونکە ئاشکرایە ئەوانەی کە زەختیان بەرزە پێویستە لە ژیانی رۆژانەیاندا زۆر لەسەر خۆبنو هەڵنەچن، چونکە هەموو هەڵچوونو زەخت بەرزبوونەوەیەك نزیکە ببێتەوە هۆی تەقینی بۆری خوێن! دەی خۆ سەرخۆش ناتوانێ زەبتی هەستو ئارەزۆی خۆی بکاو بۆی ناکرێ ئارامیو هێدێتی بۆ خۆی دەستەبەر بکا!

عەرەق بۆ کەسێك کە فێرنەبێو پێوەی رانەهاتبێ تووشی رشانەوەو دڵتێکەڵهاتنی دەکا! ئەگەر زۆریش بخواتەوە تووشی هەوکردنی گەدە دەبێو دەسگای هەزری تێك دەدا. برێك پزیشك پێیان وایە عەرەق هەر چەندە کەمیش بێ هەر زیانی هەیەو زەرەر بە ترشەڵۆکی ناو قەناتی جیهازی هەزری دەگەیەنێ، لەکاتێك دا ئەم ترشەڵۆکە زۆر پێویستە بۆ رێكوپێکی هەزم.

عەرەقخواردنەوە کارتێکردنی خراپی هەیە بۆ سەر وەچەو نەوە، زۆر بینراوەو دەبینرێ منداڵی سەرخۆشو عەرەقخۆرەکان نەخۆشو لاوازو بێ عەقڵن حەزیان لە تاوانکردنو شەڕو نەگبەتییە. لەلایەکی تریشەوە هەر کەسێ سەیری کتێبە پزیشکییەکان بکاو راپۆرتە پزیشکییەکان سەیر بکا سەری سووڕ دەمێنێ، چونکە دەبینێ زوربەی هۆیەکانی نەخۆشییە سامناکەکان دەگەڕێتەوە بۆ عەرەقخوادنەوە. هەروەها زانیاری تازە دەری خستووە کە هەرگیز مەی نابێتە دەرمانی هیچ نەخۆشییەكو چارەسەری هیچ دەردێکی پێ ناکرێ، وە فیکرەی چارەسەرکردن بە عەرەق فیکرەیەکی هەڵەبووە، دەشزانین کە ئیسلام زۆر لەوەپێش ئەوەی چەسپاندوە، ئەوەتا (طارق جعفی)یەوە دەگێڕنەوە کە داوای لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کرد رێگەی بدا عەرەق دروست بکا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەهی لیکردو فەرمووی: مەیکە، وتی: قوربان! من بۆ دەرمان دروستی دەکەم، پێغەمبەر فەرمووی: عەرەق دەرمان نییە بەڵکوو دەردە..

بێگومان برێك رۆشنبیرو نووسەرانی خۆرئاوا مەدحی تەشریعی ئیسلامیان کردوە دەربارەی قەلاچۆکردنی دیاردەی عەرەق خواردنەوە.

بتنام لە کتێبەکەیدا (أصول الشرائع) دەڵێ: خواردنەوەی خۆشاوی جۆ (بیرە) لە ناوچە باکورییەکاندا مرۆڤ بێ عەقڵ دەکا! لەناوچە باشورییەکانیشدا وەکوو شێتی لێ دەکا! ئایینی (محمد) هەموو عەرەقێکی یاساخ کردوە ئەمەش یەکێکە لە دیاردە جوانەکانی!

## نەهیکردن لە چڵێسی (النهيُ عن الشراهة):

ئایینی ئیسلام بنەمایەکی گشتی داناوە بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشییەکانی جیهانی هەزمیو فەرمانی بە موسوڵمانان کردوە کە پابەندی ئەو یاسایانە بن... لە قورئاندا دەفەرموێ:

{وكُلُواْ وَاشْرَبُواْ وَلاَ تُسْرِفُواْ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ-سورة الأعراف – ٣١}.

واتە: بخۆنو بخۆنەوە بەڵام زیادەڕەوی مەکەن، بێگومان خودا زیادەڕەو کارانی خۆش ناوێن: ئەم چەند وشە کەمەیە یاسایەکی تەندورستین... هەر کەسێك پەیڕەوییان بکا، لەشساغی بۆ خۆی دەستەبەر دەکاو نەخۆشی لە جەستەی خۆی دوور دەخاتەوە، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرموودەیەکی پڕ مانای لەم بارەوە هەیە کە دەفەرموێ:

« مَا مَلأَ آدَمِيٌّ وِعَاءً شَرًّا مِنْ بَطْنٍ بِحَسْبِ ابْنِ آدَمَ أُكُلاَتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ فَإِنْ كَانَ لاَ مَحَالَةَ فَثُلُثٌ لِطَعَامِهِ وَثُلُثٌ لِشَرَابِهِ وَثُلُثٌ لِنَفَسِهِ .

واتە: ئادەمیزاد هیچ زەرفێك پڕناکا خراپتر بێ لە پڕکردنی ورگی، بەسە بۆ ئادەمیزاد چەند پارویەك کە پشتی رابگرن، ئەمجار فەرمان بە ئادەمیزاد دەکا کە مەعیدەی خۆی بکا بەسێ بەشەوە بەشێکی بۆ خۆراكو بەشێکی بۆ خواردنەوەو بەشێکی بە بۆشی بهێڵێتەوە بۆ هەناسەدان.

ئادەمیزاد کە زۆری خوارد توانای هەزمی نامێنێو ئینتەلا دەکا، دوور نییە کە گەدەی بکشێو گەورە ببێ ئەوکاتە ئارەزۆی خواردنی کەم دەبێ، ئەگەر خواردنیشی خوارد بۆی هەزم ناکرێ، جاری وا دەبێ بەم هۆیەوە تووشی

رشانەوەو سك چوونو گیرانو سەرئێشە دەبێ، زیادە رەوی لە خواردندا دەبێتە هۆی قەڵەویو نەخۆشییەکانی دڵو زەخت بەزبوونەوەو نەخۆشی گورچیلەو نەخۆشی شەکرە..

## سودەکانی رۆژوو (فوائد الصيام):

هەر بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشییە جۆراو جۆرەکان، ئایینی ئیسلام رۆژووی داناوەو لەسەر موسوڵمانانی فەرز کردوە کە بەرۆژوو بن، ئەمرۆش رۆژوو بە باشترین چارەسەر دەزاندرێ بۆ ئەم نەخۆشیانە:

١- پشێویو هەوکردنی درێژخایەنی ریخۆڵەکان کە هاوکات بن لەگەڵ هەڵترشانی مادە زولالیەکانو مادە نەشەویەکان. هەر کەسێ تووشی ئەم جۆرە نەخۆشیانە بوو، رۆژو گرتن باشترین رێگا چارەیەتی بە تایبەتی کە لە نێوان دوو ژەمخواردنەکەدا ئاو نەخواتەوەو ماوەی نێوان دوو ژەمەکە درێژخایەن بێ، وەکوو لە رۆژووی رەمەزاندا ئەنجام دەدرێ.

٢- قەڵەویو کێش زیادبونێك کە بەهۆی زۆر خواردنو نەجووڵانی زۆرەوە دورست بووبێ. دیارە رۆژوو گرتن بۆ ئەم نەخۆشییە باشترین چارەسەرە بەمەرجێك کاتی بەربانگ زۆر نەخواو پارشێوانیش بەس ئاو بخواتەوە.

٣- زیادبوونی رێژەی زەختی خوێی. (الضغط الذاتي) دیارە ئەم نەخۆشییە زیاد دەکاو تەشەنە دەکا بەخۆش رابواردنو هەڵچوونو داچوونی دەروونی لەم حاڵەدا بە رۆژوو بوونی مانگی رەمەزان بۆی دەبێتە بەرەکەتو پیرۆزی بە تایبەتی ئەگەر وەزنی ئەو مرۆڤە زیاتر بێ لەوەزنی سروشتی هاوچەشنەکانی خۆی.

٤- نەخۆشی شەکرە (شەکرەمیز) ئەم نەخۆشییە وەکوو نەخۆشی زەخت بەرزبوونەوە بڵاوەو زۆرە، لە سەرەتاوە پێش ئەوەی باش دیاری بدا مرۆڤەکەوەزنی زیاد دەبێ، چونکە بەلاوازبوون شەکرە دادەبەزێ، دوای پێنج

سەعات تێپەڕبون لە نانخوادن شەکر لەخوێنـدا دادەبـەزێ بـۆ کـەمتر دوای تێپـەڕ بوونی (دە) سەعات ڕێژەی شەکرەکە دێتە خوار ئەنـدازەی سروشـتی خـۆی، بـەڵێ تا ئێستا کە کۆتایی چەرخی بیستەمە ڕۆژو گرتن لەگەڵ بەرچاو گرتنـی هەنـدێ تێبینی لە جۆری خۆراكو چەندییەتی دا، باشترین چارەسەری ئـەم نەخۆشـییەیە تەنانەت دوای پەیدابوونی (ئەنـسولین)یـش، بـە تایبـەتی ئەگـەر مرۆڤەکـە کێـشی پتر لە کێشی سروشتی خۆی بێ. دیارە پێش دروستکردنو دۆزێنـەوەی ئەنـسۆلین جگە لە ڕۆژوگرتن هیچ چارەسەرێکی تر بۆ ئەم نەخۆشییە نەبوە.

٥- هەوکردنی گورچیلەی کوشندەو درێژخایەنو ئاوسێنەر (تورم).

٦- نەخۆشییەکانی دڵو دڵ پەنمین.

٧- ئیلتیهابـاتی جوموژگـە (مفاصـل) کـە درێژخایـەن بـێ بـە تایبـەتی کـە مرۆڤەکە قەڵەو بێ، وەکوو بەزۆری لای ئافرەتان دوای تەمەنی چال ساڵی ڕودەدا.

وێ دەچێ یەکێك پرسیار بکاو بڵێ: دەیسەلێنم کە ڕۆژوو بۆ ئەم نەخۆشیانە سوود بەخشە بەڵام ئەمە پێویستی بە ڕێنمایی پزیشك هەیەو دەبێ بۆ هەریـەکێ لەم نەخۆشیانە پزیشکی تایبەتی ڕێنمایی نەخۆشەکە بکا، دەی خۆ ڕۆژوو لەسـەر لەشساغان فـەرزکراوە! لـە وەڵامـدا دەڵێین: ڕاستـە، بـەڵام سـوودی ڕۆژو گـرتن بـۆ لەشـساغان پاراسـتنی سـاغاکەیە لـەم جـۆرە نەخۆشـییانەی کـە باسمـان کـردن، ئاشکراشە ئەم جۆرە نەخۆشیانە هەموویان وردە وردە پەیدا دەبنو لەنکاو دیـاری نـادەنو نـاتوانرێ بزانـی سـەرەتای ئـەم نەخۆشـیانە کەیـە. بـەگوێرەی پزیـشكو تەندروسـتی چەسـپاوە کـە خۆپاراسـتن زۆر کاریگـەرە پـێش بەدیارکـەوتنی دیاردەکـانی ئـەم جـۆرە نەخۆشـیانە بـەگوێرەی سـەرژمێری ڕاسـتو دروسـت دەرکەوتووە کە زێدە قەڵەوی هاوکاتـە لەگـەڵ ئامادەباشـی بـۆ نەخۆشـی شـەکرەو بەزبوونـەوەی هاوکاتـە لەگـەڵ ئامادەباشـی بـۆ نەخۆشـی شـەکرەو بەرزبوونـەوەی تەوژمی خوێنو هەوکردنی درێژخایەنی جمگەکان، بەڵام هەتا قەڵەوی کەمتر بـێ ئامادەباشی بۆ ئەم نەخۆشیانە کەم دەبێتەوە.

## هەنگوێن دەرمانی دەردانە (العسل فیه شفاء للناس):

قورئانی پیرۆز بە روونو ئاشکرایی سوودو قازانجی هەنگوێن دەچەسپێنێو دەفەرموێ:

{وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ، ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلاً يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاء لِلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ - سورة النحل – ٦٨ -٦٩}.

لێرەدا قورئان ئەوە دەچەسپێنێ کە ئەو هەنگوێنە لەناو سکی هەنگ دێتە دەرێ دەرمانی گەلێ دەردی ئادەمیزادە، ئەمەش موعجیزەیەکە لە موعجیزە زانستییەکانی قورئان، ئێستا زانیاریی پزیشکی تازە ئەمەی سەلماندووە.

ئەگەر ئێمە تێڕوانینێکی کیمیاوییانەی ئەو مادانە بکەین کە هەنگوێنیان لێ پێك دێ، دەبینین هەنگوێن ٢٥- ٤٠٪ ماددەی کلۆکۆزی تێدایە، ئەو کلۆکۆزەی لە هەنگویندایە ماددەیەکە کە پزیشكو دەرمانساز بۆ زوربەی نەخۆشییەکان بەکاری دەهێنن. هەتا زانیاریی پزیشکی پێش کەوێ بەکار هێنانی کلۆکۆز لە زیادبوندایە. لەرێگەی دەمەوەو بەشێوەی دەرزی لێدان لەژێر پێستەوە، لە دەمارەوە دەرخوادی ئادەمیزاد دەدرێ. بەو بۆنەوە بەهێزکەرو موقەوییە یان خۆراکە. هەروەها بەکار دەهێنرێ دژی هەر زەهراو بوونێك کە بەهۆی نەخۆشی چەند ئەندامێك لە جەستەدا پەیدا بووبێ وەکوو ژەهراوی بوونی مێز کە بەهۆی نەخۆشی جەرگو پشێوی گەدەو ریخۆڵەوە پەیدا بووبێ هەروەها بەکار دەهێنرێ دژی ژەهراوی بوون بەهۆی لەرزو تاوە وەکوو نەخۆشی تێفۆئیدو ئیلتیهاباتی ریخۆڵەو نەخۆشی سەحایی مێشكو سورێژەو زەبوونی دڵو زەبحەی سینگ (الذبحة الصدریه) هەموو ئەم نەخۆشیانە کلۆکۆز دەرمانی سەرەکییانەو بەرەو شیفاو چاکبوونەوە دیانیا.

هەنگوێن کاریگەرییەکی هێدی کردنەوەی هەیە تفی ناودەم زیاد دەکا بۆ قورگ هێشانو کۆکەی وشك باشترین دەرمانە، هەر لەبەر ئەوەیە دەرمانسازەکان

ماددەی کلۆکۆز تێکەڵ بە زۆر دەرمان دەکەن وەکوو دەرمانی غەرغەرەو نەرمکەرەوەیە بۆ کاتی قەبزیو گیران چارەسازە، هەموو بەیانێ یەك کەوچکێك هەنگوێن بخۆی سوودی تەواوی تێدایەو خواردەمەنی ناو گەدە شل دەکاتەوەو قەبزی ناهێڵێ.

## تەندروستی گشتی (الصحة العامة):

تیورێکی زانستی چەسپاوە دەڵێ: خۆپاراستن لە دەرمانکردن چاکترە (الوقاية خير من العلاج) ئایینی ئیسلامیش ئەم تیۆرەی سەلماندوە لە یاساو شەریعەتی خۆیدا بانگەوازی بۆ کردوە، بەم جۆرەی کە باسی دەکەین.

١- بانگەوازیکردن بۆ دەرمانکردن (الدعوة إلى التداوي) ئایینی ئیسلام بەئاشکرا خەڵکی هەڵناوە بۆ چارەسەرکردنو تیمارکردن، چونکە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: (لكل داء دواء فإذا أصاب دواء الداء برئ باذن الله — عز وجل) هەموو دەردێك دەرمانی خۆی هەیە جا ئەگەر نەخۆش ئەو دەرمانەی دەیخوا دەرمانی دەردەکە بوو بەویستی خودا چاك دەبێتەوە.

لەلایەکی ترەوە ئیسلام بەتوندی دژی نوشتەی ناشەرعیو فاڵگرتنەوەو خەیاڵ پڵاوو بەری دەست خوێندەوەو کتێب گرتنەوەو تەلەسم بازیو ئەو جۆرە کارانەی کە کاهینو مالەو رەبەنەکان لەسەر دەمی نەزانیدا دەیانکرد.. هەموو ئەوانەی کە گەلێ نەخۆشییان دەدایە پاڵ ئاڵەو شەوەو جندۆکەو دێوو درنج بەگێلو کەمهۆش لەقەڵەم داوە.. لەهەمان کاتدا رێگەی داوە ئادەمیزاد هەوڵ بدەن هۆی نەخۆشییەکان بدۆزنەوەو چارەسەریان دیاری بکەن.

## قومرتێنە (الحجر الصحي):

ئایینی ئیسلام یەکەم ئایینو رێبازێکە کە یاسای قورمتێنەی داناوە، پێش زانیاریی پزیشکیو یاساکانی خۆرئاوا بە چەند چەرخێك دەست پێشکەری کردوە. لەم بارەوە پێغەمبەر فەرموویەتی:

« إِذَا سَمِعْتُمْ بِالطَّاعُونِ بِأَرْضٍ فَلاَ تَدْخُلُوهَا ، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا فَلاَ تَخْرُجُوا مِنْهَا »[1].

واتە: ئەگەر بیستان لەناوچەیەك تاعونو پەتا کەوتۆتەوە ئێوە تێی مەچن، ئەگەر تاعونەکە لەو ناوچەیە پەیدابوو کە ئێوەی لێبوون لێی دەرمەچن!

خۆ ئەگەر ئەوروپا لە ناوەڕاستی چەرخی چواردەهەمی زایینیدا کە تاعوونی تێدا کەوتەوە عەقڵی بەم یاسایە بشکایەو کاری پێ بکردایە، ئەو هەموو خەسارەتە گیانییەی پێ نەدەگەیشتو ئەو هەموو ئادەمیزادەی تێدا نەدەمرد، بێگومان ژمارەی ئەو ئادەمیزادانەی بە پەتاکە گیانیان لەدەستدا گەییشتە (٢٥) بیستو پێنج ملیۆن مرۆڤ. هۆی سەرەکی بڵاوبوونەوەی ئەم نەخۆشییە ئەوەبوو تەتەرەکان ساڵی (١٣٤٦ز)نەخۆشییەکەیان بردە باشووری روسیا ئیتر لەوێوە تاعوونەکە دەستی کرد بە بڵاوبوونەوە هەتا ساڵی (١٣٧٠ – ١٣٧٤ز). زوربەی ئەوروپای داگیرکرد، جا لەوکاتەدا کە تاعوونەکە زوربەی ئەوروپای گرتبووەوە، وڵاتی میلانۆو بەندقییە گەلێ یاسای بەرگرتن لە تاعوونی دانا ئەوجا کۆماری راجواسا یاساکانی پوختەکردنو سەربازگەو خەستەخانەی لە دووری شارەکان کردەوە، بۆ ئەوەی ئەوانەی دێنو گومانیان لێ دەکرێ نەچنە ناو شارەکانەوەو لەو سەربازگەو خەستەخانانەدا بمێننەوە.

لە سەرەتا (٣٠) رۆژ دەیانهێشتنەوە، دوایی کردیانە چل رۆژ، بەم جۆرە نەیانهێشت تاعوونەکە لەناویاندا بڵاوبێتەوە. تەنانەت ئایینی ئیسلام فورمتینەی بۆ نەخۆشی ئاژەڵیش داناوە، هەرکاتێك جەڵەبێك ئاژەڵ نەخۆشییان تێکەوت نابێ لەگەڵ هی ساغ تێکەڵاو بکرێن بۆ ئەوەی ساغەکانیش تووشی نەخۆشییەکە نەبن.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی (لا یورد ممرض على مصح) واتە: حوشتری نەخۆش نابرێتە لای حوشتری ساغ تاوەکوو دەردی نەخۆشەکە نەچێ بۆ

[1] رواه أصحاب السنن.

ساغەکە. هەروەها بۆ مەبەستی خۆپاراستن لە نەخۆشیو بڵابوونەوەی بەناو ئادەمیزادا، پێغەمبەر دەفەرموێ: (فر من المجذوم فِرارَك مِن الأسد) لەبەر گول راکەو هەڵێ وەکوو چۆن لەبەر شێر هەڵدێی.

## خێرایی کردن لە ناشتنی مردوو (التعجيل بدفن الموتى):

یەکێك لە مەبەستەکانی پارێز لە ئیسلام دا هەڵنانی موسوڵمانانە بۆ خێرا ناشتنی مردوو، هەرکاتێ ئادەمیزاد گیانی دەرچوو دەبێ خێرا رێو رەسمی ناشتنو بەخاك سپاردنی مردووەکە ئەنجام بدرێ، چونکە مردوو زوو بۆ گەن دەکاو ترسی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی تاعونو نەخۆشی تری لێوە دەکرێ.

## دوورە پەرێز لە ئافرەت لەکاتی بێنوێژی دا (اعتزال الحائض):

کارێك لەو کارانەی ئیسلام حەرامی کردوە بە مەبەستی پارێزگاری لە نەخۆشی، چوونە لای ژنە لەکاتی بێنوێژی دا!! قورئان دەفەرموێ:

**{وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاء فِي الْمَحِيضِ وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىَ يَطْهُرْنَ - سورة البقرة – ٢٢٢}.**

وتراوە: دەردراوەکان (إفرازات)ی جەستە دوو جۆرن، جۆرێکیان بۆ لەش سوودی هەیە، وەك ئەو دەردراوانەی کە پارمەتی هەرەسو هەزم دەدەن یا پارمەتی دەزگای زاوزێ دەدەن، یا وەك ئەو دەردراوانەی کە لەناوەوە دەزگاکانی لەشو شانەکانیو ئەندامەکانی تر رێك دەخەن، ئەم چەشنە پێی دەگوترێ: (Secretion) ئەمەیش زۆر پێویستە بۆ ژیانو زیانی تێدا نییە.

بەشەکەی تر بە پێچەوانەوەیەو مانەوەی لە لەشدا سوودی نییە. پێویستە بەزوویی لە لەش دەربکرێ، ئەو مادانەش پێك هاتوون لە مادەی ژەهراوی، مانەوەیان لە لەشدا زیانی پێ دەگەیەنێ... وەکوو میزو پیسایيو عەرەقۆ خوێنی بێنوێژی ئەمەش پێی دەگوترێ (Excretion) ئایەتەکە چوونەلای ئافرەتی

بێنوێـژی حـەرامکردوە، ئەمـەش موعجیزەیـەکی زانـستییە بـۆ ئیـسلام، چـونکە ئیسلام ئادەمیزادی فێرکردوە پێش ئەوەی شتێك لـەم جـۆرە ئیفرازاتانـە بزانـێ‌و بزانێ کە خوێنی بێنوێـژی ژەهرێکی لەشـەو سوودی بـۆ جـسیم نییـە تـا زوو لـە لەش دەرچێ درەنگە.

بەشی دووەمی ئایەتەکە دەفەرموێ: (فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاء فِي الْمَحِيضِ) واتـە: لەکاتی بێنوێژی ژناندا لە چوونەلایان کەناربگرن، ئەوەتا بۆچوونی پزیـشکی دەق لەگەڵ مەبەستی بەرزی ئەم ئایەتەدا یەك دەگرنەوە، چونکە تەندروسـتی ئـەوەی مەنع کردوە کە پیاو تێکەڵاوی لەگەڵ ژنـی حـەیزداردا بکا، چونکە شتی وا زیـان بە پیاوەکـەش‌و بـە ژنەکـەش دەگەیـەنێ، ئـەم خوێنـە بڕسـکاوە پیـسە، میکـروب‌و بەکتریایەکی زۆر لەخۆ دەگرێ، زۆر ناخایەنێ کە پیاو تووشی هـەوکردنی جـۆراو جـۆر دەکـا، لەلایـەکی تریـشەوە لـەکاتی بێنوێژیـدا پـەردەکانی نـاوەوەی ئـافرەت دەسووتێنەوەو ناسك دەبنەوە، دوور نییە کە بەهۆی جوڵانـەوە پـەردەکان بـدڕێن، سەرەنجام بەهۆی میکرۆبەکانی ناو مناڵدانەوە نەخۆشی تەشەنە دەکا بۆ شوێنانی تـریش، ئەمـەیش ئەوەنـدەی تـر زیـان بـە تەنـدروستی ژن دەگەیـەنێ، سـەرەڕای ئەمەیش جووتبوون لەگەڵ ئافرەت بەری دەرچوونی خوێنەکە دەگرێ‌و خوێنەکە لـە نـاوەوە ئـەوق دەکاتـەوە، ئەمـەیش سەردەکێـشێ بـۆ بـشێوی دەروونـی‌و دەمـار گرژییەکی تەواو بۆ هەردوولا دەخولقێنێ!.

خوێنەری خۆشەویست سەیر بکە زانیاری پزیشکی چۆن هـەنگاو بـە هـەنگاو شوێن قورئان دەکەوێ‌و دەیکاتە ڕەهنومای خۆی!!

## زیانەکانی داوێنپیسی (أضرار الزنا):

ئـاینی ئیـسلام هــەر بــە مەبەسـتی پارێزگـاری مـرۆڤ لــە نەخۆشـییە جینسییەکان زینای حەرامکردوە، قورئان دەفەرموێ:

{وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاء سَبِيلاً - سورة الإسراء – ٣٢}.

واتە: بەهیچ جۆرێك نزیکی داوێنپیسی مەکەونەوە، لە راستیدا داوێنپیسی تاوانێکی ئابڕو بەرەیەو ئەو پەڕی بێ رەوشتییەو رێگەیەکی ئێجگار خراپو ناپەسەندە.

جا وەنەبێ ئیسلام زینای هەر لەبەر ئەوە حەرامکردبێ کە تاوانێکی کۆمەڵایەتییەو بەس بەڵکوو بەشێکی زۆری هۆی حەرام بوونەکەی دەگەڕێتەوە بۆ قەڵاچۆکردنو بەرگریکردن لە نەخۆشی جەستەییو دەروونیو رەوشتی.. هتد.

بێگومان یەکێ لە دیاردەو نەخۆشییەکانی کە بەهۆی زیناوە تووشی مرۆڤ دەبێ، نەخۆشی ئاتەشەکە (زەهری) کە پێشی دەگوترێ سفلیس تووشی هەموو جیسم دەبێو هەموو ئەندامەکانی جەستە دادەوەشێنێ، وەك کۆئەندامی دەماریو لەمفاویو هەرسیو زاووزێیی وەهەروەها تووشی ئێسكو جمگەو هەموو لووەکانی لەشیش دەبێ، لووەکان بۆریە داربن، یا بێ بۆریەبن.

هەروەها تووشی پێستو چاوو گوێیش دەبێ، تووشبوونەکەشی تا بڵێی مەترسیدارو سامناکە!! لەلایەکی ترەوە زینا دەبێتە هۆی پەیدابوونی نەخۆشی تر وەك قورحەی خاوو قورحەی خۆرەكو خۆرۆشو ئالۆشی شەرمگاو قەڵەشتبوونی کۆئەندامی زاوزێ (هەروەها داوێنپیسی دەبێتە هۆی توشبوونو بڵاوبوونەوەی بەرفراوانی سامناکی کوشندەی ئایدز. کە بە خەتەرترین دەرد دادەنرێن. بگرە لە شێرپەنجەیش خەتەرترە!

هەرکەسێ بیەوێ بە وردی لەزەرەرو زیانی ئەم نەخۆشیانە بزانێ با بگەڕێتەوە بۆ کتێبە تایبەتەکان، ئیتر ئەوکاتە دەزانێ تا چ ئەندازەیەك ئیسلام گرنگی بە لەشپەروەری داوە.

هەروەها زینا دەبێتە هۆی پەیدابوونی نەخۆشی سووزەنەك کە ئەمڕۆ بە تەواوی جیهانی خستۆتە ژێر مەترسییەوە، ئەم نەخۆشییە میکرۆبێکی پچوکەو بەزەرەبینی پێشکەوتوو نەبێ هەستی پێ ناکرێ، هەرکاتێ پیاوێك ئەم

نەخۆشییەی لەگەڵ بیو زینا لەگەڵ ئافرەتێك بكا یەكسەر ئەم نەخۆشییە دەگوازرێتەوە بۆ ناو لەشی ئافرەتەكە، هەروا بە پێچەوانەش!

## گڵاوی سەگ چەسپاوە (تقرير نجاسة الكلب):

یاسایەكی تر لە یاساكانی ئیسلام بۆ پارێزگاری لەش و لار بەگڵاو دانانی سەگە... پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی:

**« إِذَا وَلَغَ الْكَلْبُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ فَلْيُرِقْهُ ثُمَّ لْيَغْسِلْهُ سَبْعَ مِرَاتٍ احداهن بالتراب .**

واتە: ئەگەر سەگ دەمی خستە ناو قاپ و قاچاغی یەكێك لە ئێوە خێرا چی لەناو قاپەكەدایە بیرێژن، ئەمجار حەوتجار قاپەكە بشۆن جارێكیان بە قوڕاو بێ. مانای ئەم فەرموودەیە ئەوەیە كە نابێ ئادەمیزاد نان و ئاو بخواتەوە لە قاپێكدا كە سەگ دەمی تێ خستبێ و بەدەم و قەپۆزی پیسی كردبێ و نەخۆشی و بەكتریای تێدا بەجی هێشتبێ! ئەمەش موعجیزەیەكی زانیارییە بۆ ئیسلام و زۆر پێش زانیاری (طب) دەست پێشكەری كردوە، وا تازە بە تازە زانیاری تەندروستی چەسپاندوویەتی كە سەگ زۆر نەخۆشی راگوێز دەكا بۆ ناو لەشی ئادەمیزاد..

لە گۆڤاری (كۆسموس)ی ئەڵمانیدا (د. جەراد فتشر) لەژێر ناوونیشانی (ئەو نەخۆشییە سامناكانەی كە بەهۆی راگرتنی سەگ و لێ نزیكبوونەوەیان پەیدا دەبن) باسێكی بلاوكردەوە دەڵێ: (پێ لێ هەڵبڕینی كۆمەڵ لەم دواییەدا بۆ زیادە رەوی لە راگرتنی سەگدا بەو شێوە بەرفراوانییە سەر دەكێشێ بۆ كەوتنەوەی زۆر نەخۆشی سامناك بە تایبەتی كە لە راگرتنەكەدا یاری لەگەڵدا بكرێ و وابكرێ سەگەكە بە تەواوی تێكەڵ ژیانی خێزان ببێ، گاڵتەو گەپی لەگەڵدا بكرێ و ماچ بكرێ و مرۆڤەكان بلێسێتەوەو لەسەر سفرەو خوان نان و ئاو لەگەڵ خێزاندا بخوا، هەموو ئەمانە: كە زەوقی ساغ و سەلیم دژیەتی و لەگەڵ داب و نەریتی مرۆڤایەتی گونجاو نییەو پێچەوانەی یاسای تەندروستییە – دەبنە هۆی سەرەكی بۆ نەخۆشی وا كە تەندروستی ئادەمیزادو ژیانی دەخاتە خەتەرێكی سامناكەوە

ئەمەش شتێك نییە هەروا بە سادەیی سەیری بکرێ، پێویستە چارەسەرێکی کاریگەری بۆ بدۆزرێتەوە، چونکە سەگ کرمی شریتی تێدایە[1] دەگوازرێتەوە بۆ ئادەمیزادو تووشی چەندان نەخۆشی سامناکی دەکاو گیانی دەخاتە مەترسییەوە.

بەگوێرەی زانیاریش دەرکەوتووە کە هەموو جۆرە سەگێك پچووك و گەورە هەموویان ئەم جۆرە کرمەیان تێدایە.

لەناوچەی فریزلەندە لە هۆڵەندا کە سەگ بەکار دێنن بۆ راکشانی گالیسکە، دەرکەوتووە لە هەموو سەد سەگێکدا داونزەیان ئەم نەخۆشییەیان تێدایە! لەناوچەی ئیسلەندەشدا لە هەموو (٤٣) کەسێك یەکێك تووشی ئەم نەخۆشییە بووە، دەریش کەوتووە ئەم رێژەیە لە ئوستڕالیادا زۆرتر هەیەو لە هەموو (٣٩) کەسێکدا لە دانیشتوانی ئەو وڵاتە یەکێك تووشی ئەو نەخۆشییە بووە! ئەوەش چەسپاوە کە راگرتن و بەخێوکردنی سەگ لەو وڵاتانە بەو شێوەیە بووەتە هۆی بڵاوبوونەوی نەخۆشی لەوڵاتانی تریشدا. ئەمجار دەڵێ: ئەوەی پێویستە لەسەر ئادەمیزاد کە بەهیچ جۆرێك گاڵتەو گەپ لەگەڵ سەگدا نەکا، منداڵ وا فێربکرێن کە خۆیان بپارێزن و لەسەگ دووربکەنەوەو نەهێڵدرێ دەست و مەچەکیان بلێسنەوە، بەهیچ شێوەیەك نەهێڵدرێ سەگ لە شوێنی یاریکردنی منداڵ و جێگای حەوانەوەیاندا هەبێ، نابێ رێگا بدرێ سەگ لەو قاپ و قاچاخانەدا شت بخوا کە بۆ شت تێداخواردنی ئادەمیزادە، بەهیچ جۆرێك نەهێڵدرێ سەگ بچێتە حانووت و چیشتخانەو هەر شوێنێك کە پەیوەندی بە خواردن و خواردنەوەی مرۆڤەوە هەبێ.

## وەرزش (**الرياضة**):

ئایینی ئیسلام گرنگییەکی تەواوی بە وەرزش داوە کە نوێژ جۆرە ورزشێکە.

---

[1] ئەم جۆرە کرمە ناوە عیلمییەکەی *Taenia fchinacoccus*.

## سوودەکانی نوێژ بۆ لەش (فوائد الصلاة):

نوێژ خۆی لەخۆیدا وەرزشێکی ئایینییە، هەموو موسولمانێك هەموو رۆژی وەك موچە بۆی براوەتەوەو لەسەریەتی کە ئەم ئەرکە پێنج جار ئەنجام بدا. ئەمەش دەبێتە هۆی بەهێزکردنی جەستەو نەش‌و نما دەخاتە نێو ریخۆڵەوە، وەرزشێکی باش‌و لەبارە بۆ لەش‌و جمگەو ماسولکەکانی.

دەی ئەگەر ئێمە سەرنجی جم‌و جوولی ناو نوێژ بدەین دەبینین لەجم‌و جولی وەرزشی سوێدی دەچێ، ئەوەندە هەیە تەمەنی وەرزشی سوێدی ناگاتە سەد ساڵ‌و تازە داهاتووە، بە پێچەوانەی یاسای نوێژ کە هەزارو چوار سەدو ئەوەندە ساڵ بەر لە ئێستا داهێنراوەو بەبێ گۆڕان‌و دەسکاری ئەنجام دەدرێ.

خۆ ئەگەر بەرابەرییەك لە نێوان جم‌و جولی نیوژکردن‌و یاسای لنجی سوێدی دابکەین دەبینین جم‌و جولی نوێژ زۆر گونجاو ترو لەبارترە بۆ هەموو تەمەن‌و جینسێك. نوێژ بەوتنی (الله أکبر)و دەست بەرزکردنەوەو بەجم‌و جوڵ خستنە ماسولکەی دووشان بەرەو حەوا دەست پی دەکا، ئەم شێوەیەش جۆرێکە لەو تەمرین‌و پراوانە کە لە یاسای وەزشی سوێدیدا ئەنجام دەدرێ، گوایە ئەم جۆرە جم‌و جوڵە سینگ دەکاتەوە. دوای (الله أکبر)کردن‌و خوێندنی سوورەتی فاتیحە ئەمجار نوێژکەر دادێتەوەو دەچێتە روکوع هەردوو دەستی لەسە دوو ئەژنۆی دادەنێ‌و ماوەیێك ئارام دەگرێ، جەستە لەم شێوە جم‌و جوڵەو ئارام گرتنە چەند سودێکی پێ دەکا، جموژگەی رانی دەجووڵێنێ، بڕبڕەی پشتی راست دەکاتەوە بە دەستیشی هێز دەخاتە سەر ئەژنۆکانی بەمەش باسکی بەهێز دەبن هەردو کارەکە – توندکرنی بڕبڕەی پشت‌و هێز خستنە سەر ئەژنۆ بۆ دواوە – زۆر پێویستن بۆ جیسم‌و سوود بەخشن، بێگومان یاسای وەرزشی سەردەم چاولێکەری ئەم شێوە جم‌و جوڵەیان کردوەو لاسایی دەکەنەوە، بەڵام هیچ کامێك لەم یاسایانە نەیانتوانیوە وا بکەن دوجۆر حەرەکە بەیەکەوە ئەنجام بدەن، بەڵام لە نوێژدا ئەم دوو جوڵەیە هەیە ئەمەش گەواهی ئەوەیە کە جم‌و جوڵەکانی ناو

نوێژ دانا کارییان تێدایە. چوونە سوجدەش چەند جم‌و جوڵێکی تێدایە کە سوود بەخشە بۆ هەموو ئەندامامی لەش چۆماندنەوەی هەردو ئەژنۆ سود بەخشە بۆ ئەوەی نەهێڵێ جموژگەی ئەژنۆ گرژبن. چۆماندنەوەی هەردوو قۆڵ‌و دانانی ناوچەوان لەسەر زەوی بەسودترین جم‌و جوڵە بۆ هەڵگلۆفتنی گەدەو جیهازی هەزمکردن‌و بەرگریکردن لە گیران‌و قەبزبوون، بەتایبەتی جم‌و جوڵی سوجدە سوودی بۆ ئافرەتان هەیە چونکە لەم حاڵەدا منداڵدانی لە شوێنی سروشتی خۆیدا رادەگرێ‌و ناهێڵێ چرچ‌و چۆڵی تێدا پەیدا ببێ[1].

لەلایەکی ترەوە سوژدە بردن یارمەتدەری ئەوەیە کە نەهێڵێ: گەدە دابەزێ! پزیشکەکانی سەردەم وای بۆ دەچن کە باشترین چارەسەر بۆ دانەبەزینی گەدە سوژدە بردنە. هەندێکی تر لە حیکمەتی ئیسلام کە بە پێویستی داناوە هەموو ماسولکەو جموژگەی بەدەن لە نوێژدا مافی خۆی بدرێتێ! لەبەر ئەوەیە پێغەمبەر دەفەرموێ: (أسوأ الناس الذي يسرق من صلاته).

خراپترین کەس ئەو کەسەیە کە لە نوێژەکەی دەدزرێتەوەو بە تەواوی‌و رێك‌و پێکی نایکا، مەبەست لەم دزیکردنە ئەوەیە کە نوێژکەرەکە راوەستان‌و روکوع‌و سوژدەو دانیشتنی ناو نوێژ بە نیوەچڵی ئەنجام بدا ئاشکراشە کە هەر وەکوو چۆن تەواوکردنی ئەم جم‌و جوڵانە پێویستە دەبێ بە دڵسۆزی‌و لێبوردۆیی ئەنجامیان بداو خوشووعی دڵی تێدا بێ. بۆیە قورئانی پیرۆز زەممی ئەوانەی کردوە کە بە تەمبەڵی‌و بارگرانی بۆ نوێژ رادەسێن‌و دەفەرموێ:

{وَإِذَا قَامُواْ إِلَى الصَّلاَةِ قَامُواْ كُسَالَى - سورة النساء - ١٤٢}.

واتە: دوو رووەکان کە بەرواڵەت موسوڵمانن‌و بەدڵ ناموسوڵمانن، هەرکاتێ دەچن بەلای نوێژەوە بە تەمبەڵی بۆی دەچن! گومانیش لەوەدا نییە کە باشترین

---

[1] مامۆستا ئەحمەد موحەممەد مەرزوق – پسپۆڕ – لە پەروەردەکردنی لەشدا لە زانکۆکانی اسکتلەندەو ئەڵمنیاو سوید – مجلة لواء الإسلام -.

وەرزشی رۆژانە ئەو وەرزشەیە کە بەردەوام بێ‌و پێی ماندو نەبێ، وەرزشێکی وابێ کە زوربەی ماسولکەو جموزگەکان بخاتە کارو لە هەموو شوێنێك بکرێ‌و دابەش بکرێ بەسەر کاتەکانی شەوو رۆژدا: پێش خۆرهەڵاتن دوالادانی خۆر لە نیوەی ئاسمان، پێش خۆرئاوا بوون‌و پێش نوستن، ئەمە لەگەڵ گرنگیدان بە پاك‌و خاوێنی پۆشاك‌و لەش کە هەموو ئەمانەی گوتران لە نوێژدا دەستەبەر دەبن.

## جڵەوگیری لە خۆشەکەتکردن (النهي عن الإجهاد):

ئایینی ئیسلام بە پێویستی داناوە کە لەش‌و لار مافی خۆی لەوەرزش بدرێتی‌و ماوەی بدرێتێ لەو وەرزشە زیاد بکا، بەڵام بەمەرجێك ئەوەندە خۆ ماندونەکا کە لە رادەی وەرزشی راستەقینە بچێتە دەرەوە جەستە پتر لە توانای خۆی جەختی لێ بکرێ، قورئان دەفەرموێ:

{لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا - سورة البقرة – ٢٨٦}.

واتە: پەروەردگار ئەرك ناخاتە سەر هیچ کەسێك کە زیاد لە توانای خۆی بێ. جا نوێژ لەگەڵ ئەوەدا کە وەرزشێکی جەستەییە، لە هەمان کاتدا خودا پەرستیشە، دەبێ ساغ‌و نەخۆش ئەنجامی بدا، ئاشکراشە کە نەخۆش ناتوانێ هەموو جم‌و جوڵەکانی پێویست بۆ نوێژ جێبەجێ بکا، لەبەر ئەوە پەروەردگار بۆ نەخۆش بارسووکییەکی تەواوی داناوە.

ئەوەتا بەپێی ئەم فەرموودەیەی کە ئیمامی بوخاری گێڕاویەتییەوە.

عیمرانی کوڕی حوصەین (خودی لێ رازی بێ) فەرمووی: نەخۆشی مەیاسیریم هەبوو، لە بارەی چۆنیەتی نوێژکردنی نەخۆشەوە لە پێغەمبەرم پرسی، فەرمووی: نوێژ بەراوەستانەوە بکە، ئەگەر نەتتوانی بەدانیشتنەوە ئەگەر نەتتوانی بە راکشانەوە نوێژەکان بکە. هەروەکوو چۆن ئیسلام رێگەی داوە بۆ نەخۆش‌و رێبوار کە لە رەمەزاندا رۆژوو نەگرن:

{فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ}

هەروەكوو چۆن كەسێك پێداویستی رێگای حەجی نەبێ حەجی لەسەر نییە، یان كەسێك نەخۆش بێ چۆن بۆ غەزاو جەنگی بێ بڕوایانی لەسەر نییە:

{لَيْسَ عَلَى الْأَعْمَى حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْمَرِيضِ حَرَجٌ }

خوێنەری هێژا! وەكوو دەبینی ئایینی ئیسلام سوودو قازانجی گیانیو بەدەنی تێكەڵاو دەكا تا ئادەمیزاد والێبكا خۆشبەختی گیانیو جەستەیی دەست بكەوێ.

ئەمڕۆش بەهێزكردنی لەشو جەستە پێویستە بۆ بەهێزبوونی هۆشو بیر، تەنانەت گوتراوە: هۆشی ساغ وا لەناو لەشی ساغا... كەواتە ئادەمیزاد لە ئیسلامدا هۆی چالاكی بۆ مسۆگەر دەبێ، بۆ ئەوەی كە لەشو هۆشی هەردوو پێكەوە گەشە بكەن، ئەمەیش بەڵگەی ئەوەیە كە ئیسلام ئارەزووە رەواكانی مرۆڤ جێبەجێ دەكا، هەروەكوو چۆن ئەو موعجیزە عیلمیو پزیشكیيانەی كە لەناو ئایەتەكانی قورئانو فەرمودەكانی پێغەمبەردا دەبینرێن، كە هەتا ئەم نزیكانەیش زانستی پزیشكی پەی پێیان نەبردبوو، بەڕاستی ئەمانە بەهێزترین بەڵگەن لەسەر راستیی پێغەمبەرێتی موحەممەدو دروستی پەیامەكەی.

## بەشی بیستو شەشەم:

# مەسیحیەت لە قورئاندا

**بڕوای مەسیح خودا بەیەك ناسین بووە – بانگەوازیی حەزرەتی مەسیح بۆ گرنگیدان بە ژیانی رۆحی – حەزرەتی مەریەم لەڕوانگەی قورئانەوە – مژدەی جوبرائیل بۆ مەریەم – سکپڕیی مەریەم بە عیساو لەدایکبوونی عیسا – پەیامی عیسا – موعجیزەکانی عیسا – دوژمنایەتی جولەکە بۆ عیسا – کۆتایی هاتنی ژیانی عیسا.**

## خودا بەیەکناسین بڕوای حەزرەتی عیسابوو:

ئەگەر سەیری ئەو ئایەتانەی قورئان بکەین کە باسی مەسیحو ئایینی مەسیح دەکا، دەبینین قورئان رێك ئەوە دەچەسپێنێ کە بیرو باوەڕی حەزرەتی مەسیح یەکتاپەرستی تەواو بووە، یەکتاپەرستی، بە هەموو جۆرێك، یەکتا پەرستی لەخودا پەرستی دا، کەس شایانی پەرستن نییە جگە لە پەروەردگار، یەکتاپەرستی لە دوستکردنو بەدیهێناندا، بەگوێرەی بیرو باوەڕی مەسیح بەدیهێنەری زەویو ئاسمانو هەموو بونەوەر پەروەردگارەو کەسی تر نییە، یەکتاپەرستی لەزاتو سیفاتدا، بەبڕوای مەسیح زاتی خودا لە ماددەی جوێ جوێ پێك نەهاتووە (زاتی ئەو مورەکەب نییە) سیفاتو رەوشتی لە سیفاتو رەوشتی هیچ کەس ناچن! زاتی پەروەردگار بێ مندالو باوكو دایکە، لە کەس نەبووە کەسی لێ نابێ، خودا دەفەرموێ:

**{يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لاَ تَغْلُواْ فِي دِينِكُمْ وَلاَ تَقُولُواْ عَلَى اللّهِ إِلاَّ الْحَقِّ إِنَّمَا الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ اللّهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ فَآمِنُواْ بِاللّهِ وَرُسُلِهِ وَلاَ تَقُولُواْ ثَلاَثَةٌ انتَهُواْ خَيْرًا لَّكُمْ إِنَّمَا اللّهُ إِلَـهٌ وَاحِدٌ سُبْحَانَهُ أَن يَكُونَ لَهُ وَلَدٌ لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَات وَمَا فِي الأَرْضِ وَكَفَى بِاللّهِ وَكِيلاً-سورة النساء-١٧١}.**

واتە: ئەی خاوەن نامەکان! لە کاروباری ئایینی خۆتاندا پێ لێ هەڵمەبڕن، شتێ کە شایانی شانی پێغەمبەر نەبێ دەرهەقی مەیڵێن، زاتێ کە نازناوی مەسیحەو ناوی عیسایەو کوڕی مەریەمە ئەم زاتە پێغەمبەری خودایەو بەفەرموودەی ئەو کە وشەی (کن)ە لە رەحەمی مەریەمدا بەبێ باب هاتووتە

وجوود نەك بە شێوەی ئاسایی. کەوایە بڕواتان بە خوداو پێغەمبەرەکانی هەبێو خودا بەیەك بناسنو مەڵێن سێ خودا هەن. خودا یەکەو نابێ بە دوو کوڕو کچیشی نییەو نابێو پاكو خاوێنە لە هەموو خەوشێك، هەرچی لە ئاسمانو زەویدا هەیە هی ئەوە.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ:

{لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ مِنَ اللّهِ شَيْئًا إِنْ أَرَادَ أَن يُهْلِكَ الْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ وَمَن فِي الأَرْضِ جَمِيعًا - سورة المائدة – ١٧}.

واتە: بەراستی کافری بەڕاستی ئەوانەن کە دەڵێن: خودا عیسای مەسیحی کوڕی مەریەمە، دەی پێیان بڵێ: باشە ئەگەر خودا ویستی عیسای مەسیحی کوڕی مەریەمو مەریەمی دایکی لەناو بەرێ کەسێ هەیە کە دەسەڵاتی ئەوەی هەبێ کە نەهێڵێ خودا لەناویان ببات؟ خەیر کەس نییە، ئەوانیش وەك سەرجەمی خەڵکی سەرزەوی خودا هەرکاتێ مەیل بکا لەناویان دەباتو کەس نییە بەرگری لەمکارە بکا. لە شوێنێکی تردا دەفەرموێ:

{وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَدًا، لَقَدْ جِئْتُمْ شَيْئًا إِدًّا، تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ الْأَرْضُ وَتَخِرُّ الْجِبَالُ هَدًّا، وَمَا يَنبَغِي لِلرَّحْمَنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا - سورة مريم – ٨٨-٨٩}.

دەڵێن: خودا بۆ خۆی منداڵی پەسەنکردوەو عیسای بەفرزەندی خۆی حسێب کردوە، بەراستی بەم بۆچوونەتانو وتنی ئەم قسانە تاوانێکی گەوە ئەنجام دەدەن، نزیکە ئاسمانەکان شەقار شەقار ببنو زەوی شەق ببێو کێوەکان هەرەس بێننو بڕوخێن بەسەر یەکا، بەهۆی ئەوەوە کە دەڵێن: خودای میهرەبان منداڵی بۆ خۆی دروست کردوە، کەشتی وا ناپەسەند شایستەی شانی خودای میهرەبان نییە.. خوێنەری هێژا هەموو ئەم دەقانە (ئایەتانە) ئەوە دەچەسپێنن کە عیسا ئادەمیزادێکەو خودا هەڵی بژاردوەو کردوویەتی بە پێغەمبەرو بانگەوازیکەر بۆ ڕێگای ڕاستی!

بێگومان پەروەردگار نامەیەکی بۆ حەزرەتی عیسا ناردوە بەناوی ئینجیل پشتیوانو تەواوکەری تەورات بوو، مژدەی ئەوەی تێدا بوو کە لە ئاخر زەمانا پێغەمبەرێك دێ ناوی ئەحمەدە (محمد)ە دەبێتە رێ نیشاندەری موسوڵمانان رزگارکەری مرۆڤ:

**{وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ فَلَمَّا جَاءهُم بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا هَذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ - سورة الصف – ٦}.**

ئەوکاتەی عیسای کوڕی مەریەم بە نەوەی ئیسرائیلی گوت: گەلۆ! من رەوانە کراوی پەروەردگارم بۆلای ئێوە، ئایینو شەریعەتی پێش خۆم کە یاسای تەوراتە بەلامەوە راستەو مزگێنیێ هاتنی پێغەمبەرێکتان دەدەمێو ناوی ئەحمەدە.

## بانگەوازیکردنی مەسیح بۆ گرنگیدان بە پەروەردەکردنی گیان:

مێژوونووسان هەموویان ئەوەیان دووبارە کردۆتەوە کە حەزرەتی مەسیح بانگەوازی یەکەی بۆ گرنگی دان بەژیانی ئەو دنیاو وازهێنان لەم دونیایە بووە، هەمیشە بانگی خەڵکی کردوە کە ئەوەندە کۆڵ بە دنیاوە هەڵنەگرنو زیاد لە پێویست خۆی پێوە خەریك نەکەن، ئیمانیان بەخودا بەهێز بکەنو گرنگی بدەن بە ژیانی قیامەتو وابزانن ئەو ژیانە مەبەستی سەرەکی ئادەمیزادەو ژیانی دونیا بۆ ئەوەیە کە لە پێناو بەرژەوەندی ئەو ژیانەدا بەسەر ببرێ.. ئێستا پرسیارێك دێتە پێشەوە پرسیارەکەش ئەوەیە: بۆچی بانگەزاییەکەی حەزرەتی مەسیح هەر هەوڵی گرنگیدانی بە لایەنی گیانی داوەو ویستوویەتی خەڵکی واز لە دونیا بێنن؟!

بۆ وەڵامی ئەوە دەڵێین: هۆیەکەی ئەوەبووە: ئەو جولەکانەی حەزرەتی مەسیح ئەم مژدەیەی پێ داونو ئەو ئایینەی بۆ هێناون لایەنی مادەیان بەسەردا زاڵبووە، زوربەیان مادە پەرست بوونو وایان دەزانی کەژیانی دونیا خۆی لەخۆی دا مەبەستەو هۆکاری ئادەمیزاد نییە بۆ ژیانی قیامەت. تەنانەت برێکیان پێیان

وابوو کە ئەو سزایەی خودا هەڕەشەی پێ لە تاوانباران کردوە، یان ئەو پاداشەی کە مژدەی پی داوە بەخودا پەرستان کاتەکەی لە جیهاندایە نەك لە قیامەت... (ڕێنان) کە فەیلەسوفێکی فەرەنسییە لە کتێبەکەیدا - کە ناوی ژینامەی مەسیح)ە دەربارەی ئەو ڕقو کینەیەی کە لە دەروونی جولەکەکاندا بەرامبەر خەڵکی ڕەگی داکوتابوو، دەڵێ: ئەگەر نەتەوەی ئیسرائیل ئاگاداری ئەو تەعلیماتانەی یونانیەکان بونایە کە ناوەڕۆکەکەیان ئەوە دەگەیەنن: کە مرۆڤ بریتییە لە دوو توخمی سەربەخۆ: یەکێکیان گیانە ئەوی تریان لاشەیە، جا ئەگەر لە دنیادا گیان ئازار بچێژێ لە قیامەتدا لە ژیانی دووەمدا دەحەسێتەوە، ئەگەر ئەمەیان بزانیایە لە گەڵ لەو سزاو ئێش و ئازارە دەروونیانە رزگاریان دەبوو، کە بەهۆی چەوسانەوەو ژێر دەستییەوە تووشیان دەبوو، وەکی تریش ئەوان خۆیان بە چاکتر دەزانی لە لایەنی ڕۆشنبیری و ئایین و کلتورەوە لەو گەلانەی کە دەیان چەوساندنەوە!! جا چونکە بڕوای دوا ڕۆژیشیان نەبوو ئەوەندەی تر بەم چەوساندنەوە دڵتەنگ دەبوون.

ئەمجار (رینان) دەڵێ: جولەکەکان وەکوو یونانییەکان بڕوایان بەوە نەبوو کە ئادەمیزاد لاشەو گیانەو لەم دوو عونسورە سەرەکییە پێك هاتووە! بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەو بۆچوونەیە کە لە تەوراتی بەردەستیاندا هەیە کە ڕاڤەی نەفسیان بەخوێن لێك داوەتەوە لە تەوراتەکەیاندا هاتووە دەڵێ:

**(لا تأكلوا دم جسم ما، لأن نفس كل جسد دمه).**

واتە: خوێنی هیچ لاشەیێ مەخۆن چونکە ڕەوانی هەموو لاشەیێ خوێنەکەیەتی. کەوابوو جولەکەکان نەیانزانیوەو بڕوایان وانەبووە کە گیان شتێکە جوداوازە لەگەڵ لاشەدا. بۆیە کە مەسیح هات موژدەی ژیانی دوا ڕۆژی دانیو ئەوەی بۆ رونکردنەوە کە ژیانی دوارۆژ مەبەستی سەرەکییە بۆ ئەم جیهانەو گیانی ئادەمیزادی شتێکی هەرگیز کۆتایی نەهاتووە. لەلایەکی ترەوە نەتەوەی ئیسرائیل خاوەنی سیستەمێکی یاسایی شارەستانی دوورو درێژی ڕێك و

پێك بوون، لە بارەی سەوداو مامەڵەو کارو باریانەوە.. جا کە وابوو کەسایەتی حەزرەتی مەسیح خۆی بناغەی مەسیحییەتەو ئەرکی سەرشانمانە — وەکوو چۆن لە قورئاندا هاتووە — ئاوا شی بکەینەوە.

سەرەتا دەست بکەین بە چیرۆکی لەدایکبوونی حەزرەتی مەریەمە تا لەبەر رۆشنایی ئەم چیرۆکەدا هەموو ئەو کونو کەلەبەرانەی کە پەیوەندییان بە ژیانی مەسیحەوە هەیە لەگەڵ ئەو بیروباوەڕەی هێناویەتی شی بکەینەوە.

## حەزرەتی مەریەم لە قورئاندا (مريم في القرآن):

عیمرانی باوکی مەریەم پیاوێکی ناودارو زانایەکی گەورەی ناو زانایانی نەتەوەی ئیسرائیل بوو، خێزانەکەی نەزۆك بوو، منداڵی نەدەبوو، پەنای بردە بەر خودای میهرەبانو لێی پاڕایەوە کە منداڵێکی بداتێ، لە سەرشانی خۆشی نەزر کرد ئەگەر خودا کوڕێکی بداتێ ئەو کوڕە بکاتە خێرو بیکاتە مەجەوری (بيت المقدس)! پەروەردگار دوعاکەی گیرا کرد، دایکی مەریەم هەستی بە هەبوونی منداڵێك کرد لەناو منداڵدانیدا دەجوڵایەوە، کاتێ سکەکەی دانا منداڵەکە کچ بوو کچیش بەپێی عادەت بەکەڵکی مجەوری نایە، دوایی ناوی نا (مەریەم)و لەخودا پاڕایەوە کە چاو دێری بکاو لە بەڵاو ناخۆشی دونیا بیپارێزێ، پەروەردگار نزاکەی قبوڵ کردو نەزرەکەشی لێ وەگرتو پێی رازی بوو. وا دیارە عیمران کۆچی دوایی کردوە مەریەمە هێشتا پچکۆڵە بووە، پێویستی بەوە بووە کە کەسێك سەرپەرشتی بکاو پێداویستی بۆ دابین بکا، لەبەر ئەوە دایکی مەریەم مەریەمی کچی بردە لای مالمو لێپرسراوانی (بيت المقدس) ئەوانیش مقۆمقۆیان تێکەوت ئاخۆ کامەیان ببێتە سەر پەرشتیاری مەریەم... دوایی لەناو خۆیاندا تیروپشکیان کرد، سەرپەرشتیی مەریەم بەر زەکەریا کەوت کە مێردی پووری بوو، ئیتر زەکەریا مەریەمی وەرگرتو لەسەر عیبادەتێکی ساخ پەروەدەی کرد تا شتێکی سەیری لێ بینی، هەر رۆژێ کە زەکەریا دەچوو بۆلای مەریەم بۆ

خەڵوەخانەکەی رزق و رۆژییەکی سەیری لەلا دەدی، کە ئەوبۆی نەهێنابوو، تەنانەت ئەو جۆرە خواردنە لەو کاتەدا لەلای کەس دەست نەدەکەوت، کە لێی دەپرسی: مەریەم! ئەم خواردەمەنییەت لەکوێ بوو؟ لەوەڵامدا دەیگوت: لەلای خوداوە بۆم دێ. ئەم چیرۆکە قورئان ئاوای دەگێڕێتەوە:

**{إِذْ قَالَتِ امْرَأَةُ عِمْرَانَ رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّي إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ، فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنثَى وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالأُنثَى وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وِإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقاً قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ اللّهِ إنَّ اللّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ - سورة آل عمران – ٣٥ – ٣٧}.**

ئەمە پوختەی ئەو روداوو دیاردانەن کە پەیوەندییان بەسك پڕبوونی مەریەم و لەدایکبوونی عیساو پەروەردەبوونییەوە هەیە، هەر لەوکاتەوە کە لەسکی دایکیدا بووە تا ئەوکاتەی بووە بە ئافرەتێکی تەواو لە سێبەری خودا پەرستیدا پەروەردەبووە، بێگومان ئەم شێوە پەروەردەبوونە رێخۆشکەربووە بۆ کارێکی گەورە کە خودا بۆی داناوەو زێدە لە هەموو ئافرەتی جیهان ئەوی بۆ دیاریکراوە، هەر بۆیەشە فریشتە راستەو خۆ پێی گوت: ئەی مەریەم! خودا تۆی هەڵبژاردووەو لە هەموو خەوشێك پاکی کردویتەوە، زێدەرێزی داویتێ بەسەر هەموو ژنانی جیهاندا:

**{وَإِذْ قَالَتِ الْمَلاَئِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَى نِسَاءِ الْعَالَمِينَ، يَا مَرْيَمُ اقْنُتِي لِرَبِّكِ وَاسْجُدِي وَارْكَعِي مَعَ الرَّاكِعِينَ - سورة آل عمران – ٤٢ – ٤٣}.**

بێگومان ئەم هەڵبژاردنە ویستێکی خودایی بوو، بۆ ئەوەی مریەم ببێتە دایکێك بۆ منداڵێك کە بێ باوك دروست بێ، هۆکاری سروشتی تێدا نەیەتە جێ، بۆ ئەوەی مریەم بۆخۆی ببێتە نیشانەیەکی گەورەی پەروەردگار! دەم بەستی

هەموو تاوانبارو گوماندارو زماندرێژێك بكا چونكە ژیانی مەریەم پێش ئەوەی عیسای بكەوێتە سكەوە دوای لەدایكبوونیشی بەجۆرێكی وا بوو كە بەهیچ جۆرێ گومانی لێ نەكرێ.

## مزگێنی جوبرائیل بۆ حەزرەتی مەریەم(بشری من جبرائل إلی مریم):

كاتێك مریەم گەورە بوو، بوو بە ئافرەتێكی تەواو لە كاتێكدا كە لەكەسوكاری گۆشەگیربوو دیمەنێكی زۆر سامناكی بینی، لێی ترسا، لاوێكی شێوە شیرینی چاو پێكەوت خەریكبوو لێی نزیك دەبووەوە زۆر لێی ترسا پێی وابوو پەلاماری دەدات پەنای گرت بە خوداو ویستی لەخۆی دوور بخاتەوە، چەند جارێك ناوی خودای لێ هێناو ترسی خودای یاد خستەوە ئیتر حەزرەتی جوبرائیل خۆی لێ ئاشكراكردو وتی: من فریشتەم، خودا ناردوومی كوڕێكی پاك سروشتی باشت پێ ببەخشم، ئیتر بە تەواوی سەری سوڕما، بەلایەوە شتێكی سەیر بوو كە بەبێ ئەوەی مێردی هەبێو شووی كردبێ مندالی ببێ، زیاد لەوەش بۆ خۆی خۆی دەناسێ كە ئافرەتێكی داوێنپاكەو هەرگیز داوێنپیسی لێ روونەداوە!.

ئیتر جوبرائیل ئەوەی خستە یاد كە خودا دەسەلاتی بەسەر هەموو شتێكدا هەیە، هیچ شتێك لەدەستی دەرناچێ، ئەوەشی پێ راگەیاند كە ئەو كوڕەی خودا دەیداتێ نیشانەیەكە لە نیشانەكانی خوداو دەسەلاتداریێتی! ئەوەتا قورئان ئاوا چیرۆكەكەی دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ:

{وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مَرْيَمَ إِذِ انتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًّا، فَاتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَابًا فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا، قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَن مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيًّا، قَالَ إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَامًا زَكِيًّا، قَالَتْ أَنَّى يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا، قَالَ كَذَلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَلِنَجْعَلَهُ آيَةً لِلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِّنَّا وَكَانَ أَمْرًا مَّقْضِيًّا - سورة مريم – ١٦-٢١}.

ئەمجا حەزرەتی جوبرائیل هەواڵی ئەوەشی پێدا کە کوڕەکەی ناودێر دەکا بەمەسیحو عیسای کوڕی مەریەمی پێ دەگوترێ، لە دونیاو قیامەت ڕێزدارو پیاو ماقوڵ دەبێو زۆر خۆشەویستو نزیکی بارەگای خودا دەبێ، ئەم کوڕە هەر لە نێو لانکەدا بەمنداڵی زمانی دەپرژێو قسەی وا دەکا مەگەر هەر پیاوی کامڵ بتوانێ قسەی وا بکا، خودا دەیکاتە پێغەمبەری خۆیو فێری کیتابی دەکاو دانایی فێر دەکاو ئەحکامی تەوراتو شەریعەتی ئەو کتێبەی فێر دەکاو کتێبی ئاسمانی تری بە ناوی (ئینجیل) بۆ دەنێرێ، تا بەزانایی‌و دانایی ببێتە رێ نیشاندەری خەڵکی.

{وَإِذْ قَالَتِ الْمَلاَئِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَى نِسَاء الْعَالَمِينَ، وَيُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلاً وَمِنَ الصَّالِحِينَ، قَالَتْ رَبِّ أَنَّى يَكُونُ لِي وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ قَالَ كَذَلِكِ اللّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَاء إِذَا قَضَى أَمْراً فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ، وَيُعَلِّمُهُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَالتَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ}سورة آل عمران ٤٥-٤٨.

## سك پڕبوونی مەریەم بە عیساو لەدایکبوونی عیسا:

حەزرەتی مەریەم هەر لەگەڵ جوبرائیل فوی رەحمەتی بە یەخەیدا کرد یەکسەر بەقودرەتی خودا سکی بوو، بێگومان ئەم سکپڕبوونە شتێکی نائاسایی‌و سەرسوڕهێنەر بەلام بۆ دەسەلاتی خودا شتێکی ئاساییە، چونکە خودا ویستی کە دەسەڵاتی بێ پایانی خۆی لەم رێگەوە پیشانی ئادەمیزاد بداو بزانن خودا چی بۆی دەیکا:

{إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِندَ اللّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ ثِمَّ قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ - سورة آل عمران – ٥٩}.

بێگومان داستانی دروستبوونی عیسا لەلای خودا وەك داستانی دروستبوونی ئادەم وایە، راستە کە دروستبوونی عیسا بەبێ باوك شتێکی سەیرە بەلام لەوسەیرتر ئادەمە، کە خودا لە خاك دروستی کردوە بەبێ باوكو دایك، هەر ئەوەندەبوو بە قوڕەکەی فەرموو ببە بە ئادەمو ئەویش دەرحاڵ بوو بە ئادەم.

حەزرەتی مەریەم دوای ئەوەی سکی پڕبوو بە عیسا دەستە وەستان دانیشتو بیری لەو قسانە دەکردەوە کە لە جوبرائیلی بیستبوو، گومانیش لەوەدا نییە کە مەریەم ئەو قسەو قەسەلۆکانەی دەهێنایە پێش چاوی کە لەوەبەدوا خەڵکی پێی دەڵێنو بوختانی پێ دەکەنو دەڵێن: ئەم کچە هێشتا شووی نەکردوە چۆن بەبێ ئەوەی مێردی ببێ سکی پڕ بوو، منداڵی بوو، ئەم بیرو بیرۆکانەی بە مێشکی خۆیدا دەهێنانو ترسو لەرزێکی چووە دڵەوە قەلەقو دڵەراوکێ روی تێکرد حەزی لە تەنیایی دەکردو گۆشەگیری پێ خۆشبوو، بۆیە لە خەڵکی دوور کەوتەوەو خۆی لەپێش چاوی خەڵك ونکردو دەترسا کە باسی سك پڕبوونەکەی بگاتە دەم خەڵکیو بە خراپی ناوی بەرن.

کاتێك مەریەم کەوتە نۆمانگو نۆ رۆژەی خۆیەوەو ژانگرتی ئازاری ژانەکان پاڵی پێوەنا پەنا بۆ لقەدار خورماکان بەرێو خۆیان لەناو حەشار بداو دەستیان پێوە بگرێ ئالەو کاتەدا دەیزانی چەند قسەو قسەلۆکی بۆ هەڵدەبەستن، بۆیە ئاواتە خوازی ئەوەبوو کە پێش ئەوکاتە بمردایە یان شتێکی هیچو پوچ بوایەو کەس بێزی نەهاتایە ناوی بێنێ، لەوکاتە ناسکەدا لەو تەنگانەو نارەحەتیەدا حەزرەتی جوبرائیل هات دڵنەوایی کردو فەرمانی پێکرد کە لقەدار خورمایەك راوەشێنێ خورمای تەڕو تازەی بۆ بەردەبنەوەو لێیان بخوا، برینی ناوسکی سارێژ دەبن، لەو جۆگە ئاوەش بخواتەوە کە بەبن دارەکاندا دەڕوا دڵو دەروونی ئارام دەگرێو دڵەڕاوکێی نامێنێ.

ئەمجار جوبرائیل ئەوەشی فێرکرد کە هەرکاتێ کەسێك لێی پرسی یان سەرکۆنەی کرد یان وتی ئەمەت لەکوێ بوو؟! هیچ وەڵامییان نەداتەوە، بەڵکوو ئاماژەیان بۆ بکا کە زمانی بەرۆژووە، قسەکردنی لەخۆی حەرامکردوە، ئەمە پوختەی ئەو چیرۆکەیە کە قورئان دەیگێڕێتەوە دەفەرموێ:

**{فَحَمَلَتْهُ فَانتَبَذَتْ بِهِ مَكَانًا قَصِيًّا، فَأَجَاءَهَا الْمَخَاضُ إِلَى جِذْعِ النَّخْلَةِ قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا، فَنَادَاهَا مِن تَحْتِهَا أَلَّا تَحْزَنِي قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا، وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا، فَكُلِي**

**وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيًّا - سورة مريم - ٢٢-٢٦}.**

کاتێك حەزرەتی مەریەم منداڵەکەی لێ بووەوە هەڵی گرتەوەو گرتیە باوەشیو هاتەوە بۆ ناو خزمو کەسو کارو نەتەوەکەی، هەموو سەریان سوڕماو سەرسام بوون ئەوەی مەریەمی دەناسیو شارەزای خودا پەرستیو داوێنپاکی بوو ئەوانەی نەیاندەناسی هەروەکوو یەك سەرسام بوون، چونکە مەریەم کارێکی سەر سوڕهێنەری هێنایە کایەوە! چونکە ئەو کچ بوو هێشتا شووی نەکردبوو! دیارە منداڵبوونی بەبێ ئەوەی شووی کردبێ جێگای ئەوەبوو گومانی خراپی لێ بکەن، چونکە لەکاتی پەیدابوونی شتی سەرسوڕهێنەری کتوپڕی وادا زۆرجار عەقڵو تێبینی کارناکا بە تایبەت کە بەڵگەی تاوانبارکردن بەدەستەوە بێو نیشانەکەشی شتێکی مادی بێ، جێگای گومانی تێدا نەمێنێ؟!.

حەزرەتی مەریەم لەبەرامبەر ئەو هەموو تۆمەتو زریانو رەشەبایەدا هەر ئەوەندەی لەدەست هات کە گوێڕایەڵی ئامۆژگارییەکەی حەزرەتی جوبرائیل بکا، بێدەنگی بکاتە کاری خۆیو هەرکەسێ پرسیاری لێبکردایە ئاماژەی بۆ لای کوڕەکەی بۆ دەکردنو دەیگوت قسە لەگەڵ ئەودا بکەن، ئەوانیش بەوە رقیان هەڵدەستاو پێیان وابوو گاڵتەیان پێ دەکا، چونکە لەوە پێش نەیان دیبوو کە منداڵ لەلانکەدا قسە بکاو گفتو گۆی لەگەڵدا بکرێ!! بەڵام حەزرەتی عیسا (درودی خودای لەسەربێ) وەڵامی عاقڵانەو ژیرانەی دەدانەوە، داوێنپاکی دایکی دەچەسپاند، ئەمجار هەواڵی ئەوەشی پێدان کە بۆ خۆی دەبێتە خودا پێداوو دەچێتە ریزی ئەوانەی کە پەروەردگار پەڕاوی بۆ ناردوونو دەیکاتە پێغەمبەری خۆیو پیرۆزی دەخاتە کارەکانییەوەو پەروەردگار ئامۆژگاری کردوە بە ئەنجامدانی نوێژو زەکاتدان تا لە ژیاندابێ، هەموو کات لەگەڵ دایکیدا چاکەکار دەبێو گوێڕایەڵی فەرمانو ئامۆژگارییەکانی دەبێو لوتبەرزی ناکاو خۆی بەزل نازانێ. دەیگوت: سڵاوی خودا لەسەرمبێ رۆژی لەدایکبوونمو رۆژی مردنمو رۆژی زیندووبونەوەشم. ئەمەی گوترا: پوختەی مانای ئەم ئایەتانەیە کە دەفەرموێ:

{فَأَتَتْ بِهِ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُ قَالُوا يَا مَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْئًا فَرِيًّا، يَا أُخْتَ هَارُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا، فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ قَالُوا كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي الْمَهْدِ صَبِيًّا، قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا، وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَانِي بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيًّا، وَبَرًّا بِوَالِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا، وَالسَّلَامُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا - سورة مريم – ٢٧-٣٣}.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە هۆی چی بووە عیسا بەبێ باوك خودا خولقاندی؟! بێگومان دەبێ حیکمەتێکی تێدابێو خودا بۆ خۆی ئەو حیکمەتە بزانێ، ئەوەتا لە قورئاندا ئاوا ئاماژەی بۆ دەکا دەفەرموێ:

{قَالَ كَذَلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَلِنَجْعَلَهُ آيَةً لِلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِّنَّا وَكَانَ أَمْرًا مَّقْضِيًّا - سورة مريم – ٢١}.

بۆ ئەوەی بیکەین بە بەڵگە لەسەر گەورەییو بەدەسەڵاتی خۆمان، هەم رەحمەتو بەزەیی ئێمەش بێ بۆ ئادەمیزاد.

هەرکاتێکیش لەو نیشانانەو بەڵگانە وردبینەوە کە بوونە هۆی ئەوەی عیسا بەبێ باوك لەدایك بێ، بەڵگەیەکی گەورەی رووداوێکی سەر سوڕهێنەرمان دێتە بەرچاو، کارە گرنگەکەش ئەوەیە کە لەدایکبوونی عیسا بەبێ باوك دەسەڵاتو توانای فراوانی خودا دەگەیەنێو ئەوە روون دەکاتەوە کە هەر خۆی کەریمی کارسازەو هیچ شتێك نییەو هیچ کەس ناتوانێ رێگەی کارێکی لێ بگرێ، هیچ کاتێکیش پابەندی یاسای هۆکارو کارلێکراو (الاسباب والمسببات) نابێو چۆنی بوێ ئاوا دەیرەخسێنێو لە هەموو کارێکی دا ئازادە.

## عیسا پێغەمبەرو رەوانەکراوی خودایە (عیسى رسول الله):

نەتەوەی ئیسرائیل لەرێگای راستی ئایین لایانداو لە سنوور تێپەڕینو کەوتنە ناوزلکاوی هەواو ئارەزۆبازیو زیادەرەوییان لە خۆش رابواردندا کردو هەڵوەدای

کۆکردنەوەی ماڵو دارایی بوون... لە حەڵاڵو حەرام سڵیان نەکردەوە، لەبەر ئەوە پەروەردگار زۆر هۆکاری خۆش رابواردنی لێ یاساغکردن، قورئان دەفەرموێ:

{فَبِظُلْمٍ مِّنَ الَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ اللّهِ كَثِيرًا ، وَأَخْذِهِمُ الرِّبَا وَقَدْ نُهُواْ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا - سورة النساء – ١٦٠ – ١٦١}.

بەهۆی زوڵمو زۆری جولەکەکان خۆیان، زۆر هۆکاری خۆشرابواردنمان لێ قەدەغەکردن، کە لەوەپێش بۆیان رەوابوو، هەروەها بەهۆی گومڕاکردنی خەڵكو لادانیان لە رێگای خوداو سوود خواردنو مادەپەرستی زیاد لە ئەندازەیان (کەلێیان قەدەغەکرابوو) خواردنی ماڵی خەڵك بەناڕەواو بێهۆ ئەو یاسایانەمان بەسەردا سەپاندن، بۆ رۆژی دواییش سزای بەئێشمان بۆ ئامادە کردوون. جا لەبەر ئەو هەموو سەرپێچی کردنەی نەتەوەی ئیسرائیل حیکمەتو ویستی خودا وابوو کە حەزرەتی عیسا بکاتە پێغەمبەرو فێری تەوراتو ئینجیلی بکاو بینێرێتە ناویانو بانگەوازی خوداپەرستی لەناویاندا هەڵدا! خودا بۆ خۆی دەفەرموێ:

{وَيُعَلِّمُهُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَالتَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ، وَرَسُولاً إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ - سورة آل عمران – ٤٨ – ٤٩}.

پەروەردگار عیسای رەوانەی ناو نەتەوەی ئیسرائیل کرد ئەویش بەگوێرەی فەرمانی خودا بانگەوازی ئایینی بڵاوکردەوە، داوای کرد شوێنی بکەون، هەمیشە هەوڵی ئەوەی داوە کە جولەکەکان لەو گومڕاییە بگێڕێتەوە، حەرامو حەڵاڵیان بۆ ڕون بکاتەوەو کێشەو نیزاعیان بۆ یەکالا بکاتەوە، بڕێ لەو شتانەی کە لێیان قەدەغەکرابوو بۆیان حەڵاڵ بکا.

{وَلَمَّا جَاء عِيسَى بِالْبَيِّنَاتِ قَالَ قَدْ جِئْتُكُم بِالْحِكْمَةِ وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعْضَ الَّذِي تَخْتَلِفُونَ فِيهِ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ، إِنَّ اللَّهَ هُوَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ هَذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ - سورة الزخرف – ٦٣ -٦٤}.

کاتێ عیسا بە بەڵگەو دەلیلەوە هاتە لای نەتەوەی ئیسرائیل، وتی: من هاتوومە ناوتان بە بەڵگەو حیکمەتەوە بۆ ئەوەی هەندێ کێشەو نیزاعی تێی کەوتوون بۆتانی ڕون بکەمەوە، ئێوە تەقوای خودا بکەن‌و گوێڕایەڵی ئامۆژگایەکانی من بن، بێگومان پەروەردگار خودای من‌و ئێوەیشە! دەی وەکوو من دەیپەرستم ئێوەش بیپەرستن، ئەمە ڕێگای ڕاست‌و دروستە.

## موعجیزەکانی عیسا (د.خ) (معجزات عیسى (عليه السلام)):

کە حەزرەتی عیسا بانگەوازی خۆی بلاوکردەوە، پیاوە ئاییەنییەکانی جولەکە هەستیان بەخەتەرێکی گەورەکرد، ئەوەتا حەزرەتی عیسا ڕەخنەیان لێ دەگرێ‌و لەوخۆ بەدونیا هەڵەو گیربوونەیان ناڕازییەو لۆمەیان دەکا لەسەر ئەوە کە لە ئارەزۆبازیدا ژیان بەسەر دەبەن‌و، ئەوەندە بە پەرۆشن بۆ خۆش ڕابواردن، نهێنییەکان ئاشکرا دەکاو عەیب‌و عاریان لەناو خەڵکدا بلاو دەکاتەوە، لەبەر ئەوەماڵەکانیان هەموو یەکیان گرت‌و بڕیاریاندا دژی بوەستن‌و بەدرۆی بخەنەوە، داوایان لێکرد موعجیزەیەك پیشان بدا کە بەڵگەبێ لەسەر پێغەمبەرایەتییەکەی، پەروەردگار چەند موعجیزەیەکی گەورەی پێ بەخشی! ئەم چیرۆکەش قورئان ئاوا بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ:

{أَنِّي قَدْ جِئْتُكُم بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ أَنِّي أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِ اللّهِ وَأُبْرِئُ الأكْمَهَ والأَبْرَصَ وَأُحْيِي الْمَوْتَى بِإِذْنِ اللّهِ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ، وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ وَجِئْتُكُم بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَاتَّقُواْ اللّهَ وَأَطِيعُونِ-سورة آل عمران/٤٩-٥٠}

واتە: ئەی نەتەوەی ئیسرائیل ئەمن پێغەمبەری خودام‌و لەلایەن پەروەردگارەوە موعجیزەم هێناوە ئەمن لە قوڕ شکڵێك دروست دەکەم وەکوو شکڵی باڵندە دوایی فووی پێدا دەکەم دەبێتە باڵندەی ڕاستی‌و بەفەرمانی خودا دەفڕێ، کوێری مادەرزاد چاك دەکەمەوە، بەڵەك چاك دەکەمەوە بەناوی خوداو

بەپشتیوانی ئەو مردو زیندو دەکەمەوە، دەزانم‌و هەواڵتان دەدەمێ چی دەخۆن چی هەڵدەگرن بۆ دوا رۆژتان لەماڵدا پەزمەندەی دەکەن بێگومان لەوەدا نیشانەی راستی پێغەمبەریەتی من دەردەکەوێ، ئەگەر ئێوە بڕواتان هەبێ... من یاساو شەریعەتی پێش خۆم کە تەوراتە پشتگیری لێ دەکەم‌و پەیڕەوی دەکەم، هەروەها بۆ ئەوەی بڕێ لەو شتانەی کە لێتان قەدەغەکراوە بۆتان حەڵاڵ بکەمەوە، من لەلایەن خوداوە نیشانەی پێغەمبەرایەتی خۆم پێیە، تەقوای خودا بکەن‌و گوێڕایەڵی ئامۆژگارییەکانی من بن... بێگومان پەروەردگار خودای من‌و ئێوەیە، عیبادەتی ئەو زاتە بکەن، ئەمە رێگای راست‌و دروستە.

قورئانی پیرۆز ئاوا موعجیزەیەکی تری حەزرەتی عیسامان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ:

{إِذْ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ السَّمَاء قَالَ اتَّقُواْ اللّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ، قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا أَنزِلْ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ السَّمَاء تَكُونُ لَنَا عِيداً لِّأَوَّلِنَا وَآخِرِنَا وَآيَةً مِّنكَ وَارْزُقْنَا وَأَنتَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ، قَالَ اللّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ فَمَن يَكْفُرْ بَعْدُ مِنكُمْ فَإِنِّي أُعَذِّبُهُ عَذَابًا لاَّ أُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِّنَ الْعَالَمِينَ-سورة المائدة – ١١٢ – ١١٥}.

کاتێ کە هاوڕێکانی حەزرەتی عیسا وتیان: ئەی عیسای کوڕی مەریەم! ئایا خودای تۆ دەتوانێ لە ئاسمانەوە سفرەو خوانمان بۆ بنێرێتە خوارێ؟! عیسا پێی گوتن: تەقوای خودا بکەن واز لەو جۆرە پرسیارانە بێنن، چونکە کەسێك بڕوادری تەواو بێ ئەو جۆرە پرسیارانە ناکا؟! وتیان دەمانەوێ خواردنمان بۆ بنێرێتە خوارێ لێی تێربخۆین‌و دڵیشمان ئارام بگرێ‌و دڵنیابین کە تۆ رەوانەکراوی پەروەردگاری بەتەواوی دڵنیابین کە تۆ راستگۆی لە پێغەمبەرایەتییەکەتدا، ئێمە دەبینە شایەد لەسەر موعجیزەکەو بۆ ئەوانەی کە لێرە حازرنین، ئەمجار حەزرەتی عیسا وتی: پەروەردگارا! سفرەو خوانێکمان لە ئاسمانەوە بۆ بنێرە خوارەوە، بۆ ئەوەی ئێمەیش ئەو رۆژەی کە سفرەوخوانمان بۆ دێتە خوارێ بیکەین بەجەژن بۆ خۆمان‌و بۆ ئەوانەی دوا ئێمەیش دێن،

بێگومان تۆ باشترین ڕزق و رۆژی دەری!! بەڵام هەر کەسێ دوای ئەوە کافربوو یان بەکافری مایەوە سزایەکی دەدەم کەسم لەبونەوەردا بەو جۆرە سزانەدابێ.

## حیکمەتو مەبەست لە موعجیزەکانی حەزرەتی عیسا:

خوێنەری ئازیز! ئەوەی گوترا برێك بوو لە موعجیزەکانی حەزرەتی عیسا ئێستا وێ دەچێ کە تۆی خوێنەر بڵێی بۆچی موعجیزەکانی ئەم پێغەمبەرە لەم شێوەو جۆرەبوون؟! بۆ وەڵامی ئەوە دەڵێین: موعجیزە بە گوێرەی ئامادەمیزادانی ئەو کۆمەڵەی پێغەمبەرەکەی بۆ رەوانە دەکرێ دەنێردرێ، خەڵکی ئەو رۆژگارەش بڕوایان بەگیان نەبوو هەموو شتێکیان بەمادده دەزانی، جا کە حەزرەتی عیسا هات موعجیزەیەکی نواند بەڵگەو دەلیل بوو لەسەر راستی بانگەوازییەکەی، ئەوەی چەسپاند کە گیان هەیەو شتێکی سەرەکییە لە ژیاندا ئەوەتا: ئەوە شکلێ باڵندەیەکە لە قوڕ دروستکراوە گیانی بە بەردا دەکرێ زیندو دەبێتو لەشەقەی باڵی دەدا، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە شتێك هەیە غەیری لاشەیەو ماددە نییە، کاتێك بە بەرلاشەدا کرا لاشەکەی زیندو کردەوە، مردویەکە داپۆشراوەو ئامادەکراوە بۆ ناشتن کە مەسیح بانگی لێکرد زیندو دەبێتەوەو وەڵامی بانگەکەی دەداتەوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە گیان جیاوازە لە لاشەو بەو بانگکردنە گیانی تێکەوتەوەو روحی بەبەردا کرایەوە، بەڵێ ئابەو جۆرە موعجیزەکانی عیسا بە گوێرەی بانگەوازییەکەی تایبەتمەند بوون بەو بانگەوازییەی کە بۆ بەخێوکردنی گیانو بڕوا بەزیندوبوونەوە تەرخان کرابوو بۆ ئەوەی بیسەلێنێ کە ژیانێکی تر هەیە لەو دونیا چاکەکار پاداشی چاکەکەیو خراپەکار سزای خراپەکەی دەدرێتەوە.

## دژایەتیکردنی جولەکە بۆ حەزرەتی عیسا (د.خ):

حەزرەتی عیسا بۆ چەسپاندنی بانگەوازییەکەی ئەو موعجیزانەی نواندن، بێگومان موعجیزەکانیشی هەموو سەرکوتکەرو زوبان لاڵکەرو چەسپێنەر بوونو

سەرپێچیکەرو ملهوڕانی بۆڕدان، دەبوایە ئەم موعجیزانە بەس بونایە بۆ گوێڕایەڵی و بڕواهێنانیان بە حەزرەتی عیسا! بەڵام ئەو جولەکانە کە عیسایان بۆ رەوانە کرابوو هەموو دڵرەق و ملهوڕبوون، پێیان نەنگی بوو شوێنی کەون و بڕوای پێ بهێنن.

لەبەر ئەوە دەستیان کرد بەدژایەتیکردنی حەزرەتی عیساو نەیاندەهێشت، خەڵك بچێتە سەر ئایینەکەو بڕوا بە عیسا بێنن، جۆرەها پیلان و فێڵ و تەڵەکەو پڕو پاگەندەیان دژی حەزرەتی عیسا نەخشەکێشاو بڵاوکردەوە، کاتێك هەستیان کرد ئەم هەوڵانەیان سوودبەخش نەبوون نەیانتوانی بەرهەڵستکاری بکەن، لە هەمان کات دا دەیان بینی کەهەژارو نەداراو بێ نەوا شوێنی دەکەوتن و بەپیر بانگەوازییەکەیەوە دەچوون و لە دەوری کۆ دەبوونەوەو بڕوایان بە قسەکانی دەکرد، ئا لەم کاتەدا جولەکەکان باری پلانەکەیان گۆڕی و لەلای فەرمانڕەواو پاشاکانی رۆمان دوزمانیان دژی عیساکردو ئەوەیان خستە دڵی قەیصەرو پاشاکانی رۆمانەوە کە پەرەپێدانی بانگەوازییەکەی عیساو فراوان بوونی دەبێتە هۆی لەناوچوونی دەسەڵاتیان و روخانی دام و دەزگاکانیان! تا لە ئاکاما توانیان وا بکەن قەیصەر فەرمان دەرکا بە گرتنی عیساو لەسێدارەدانی و لەناوبردنی! بەڵام ئەوەی لەلای بەندە خەیاڵە لای خودا بەتاڵە، ئەوەتا دەبینین قورئان ئەوە دەچەسپێنێ کە پەروەردگار نەیهێشت ئەو خوانەناسانە بە ئاکامی خۆیان بگەن، نەیانتوانی عیسا دەستگیربکەن! بەڵکوو خودا رزگاری کرد لە دەستیان.

{وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَـكِن شُبِّهَ لَهُمْ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلاَّ اتِّبَاعَ الظَّنِّ - سورة النساء - ١٥٧}.

واتە: جولەکە ئیدیعای ئەوە دەکەن دەڵێن: ئێمە عیسای کوڕی (مەریەم)مان کوشتووە راست ناکەن! ئەوان عیسایانا نەکوشتووە - وەکوو ئیدیعادەکەن - لە سێدارەشیان نەداوە - وەکوو گومان دەبەن و لەناوخەڵکدا بڵاویان کردۆتەوە - بەڵکوو ئەوان سەریان لێ تێکچوو، کابرایەکی تریان هەڵواسی وایانزانی عیسایە،

بێگومان ئەوانەی دەربارەی عیسا کێشەیان لێ پەیدا بووە لە خاوەن کتێبەکان – جولەکەکان – گومانێکی زۆریان دەربارەی لە سێدارەدانی عیسا لاپەیدا بوو، چونکە زانیارییەکی تەواویان لەم بارەوە دەست نەکەوتووە جگە لە گومانو بۆچوونی هەڵەو ناڕاست هیچی تریان بەدەستەوە نییە.

ئەمەش شتێکی سەیر نییە کە کەسێکی تر لە عیسا بچێو ئەو کار بەدەستانە وابزانن ئەوە عیسایە، چونکە لە روانگەی لێکۆڵینەوە کەسایەتییەکانی پزیشکی زانیاری زۆر رووداوی وا بینراونو دەبینرێن کە زۆرکەش لەیەکتر دەچێ، زۆر جار کار بەدەستان دەکەونە هەڵەوە لەوەدا کە یەکێك لەجیاتی یەکێکی تر سزا دەدەن. دەی باشە ئەگەر مەسیح لەسێدارە نەدرابێ ئەی چی لێهات؟ وەڵامی ئەم پرسیاە قورئان دەیداتەوە کە دەفەرموێ:

{وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا، بَل رَّفَعَهُ اللّهُ إِلَيْهِ وَكَانَ اللّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا - سورة النساء – ١٥٧ – ١٥٨}.

نەخێر، ئەو جولەکانە عیسایان بۆ نەکوژراو بەیەقینی نەیانکوشت بەڵکوو پەروەردگار بەرزی کردەوە بۆ لای خۆی... لە ئایەتێکی تردا پەروەردگار دەفەرموێ:

{إِذْ قَالَ اللّهُ يَا عِيسَى إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ - سورة آل عمران – ٥٥}.

واتە: پەروەردگار بەعیسای فەرموو: ئەی عیسا! من بەگوێرەی تەمەنی خۆت دەتمرێنمو ناهێڵم کەس دەستدرێژی بکاتە سەرتو بتکوژێ، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە حەزرەتی مەسیح لە دوژمنەکانی پارێزراوبوو نەیانتوانیوە زەفەری پێ بەن. کە دەفەرموێ: (ورافعك الي) زوربەی زۆری راڤەکەرانی قورئان پێیان وایە کە پەروەردگار عیسای بەلاشەو گیانەوە بەرز کردۆتەوە بۆ لای خۆی!! برێکی تریشیان دەڵێن: عیسا لەسەر زەوی ژیاوە تا ئەو رۆژەی تەمەنی تەواو بووە ئەمجار خودا مراندوویەتی وەکوو چۆن پێغەمبەرەکانی تری مراندوون،

مەبەست لە وشەی (**رافعك**)ش ئەوەیە کە دوای لەدونیا دەرچوونی پلەو نیشانەی بەرزکراوەتەوە، وەکوو چۆن پەروەردگار لەبارەی حەزرەتی ئیدریسەوە دەفەرموێ:

**{وَرَفَعْنَاهُ مَكَانًا عَلِيًّا - سورة مريم – ٥٧}.**

واتە: پلەو پایەمان بەرزکردەوە بۆ شوێنێکی بەرز! جا لەسەر بۆچونی ئەو کۆمەڵە راڤەکەرانەی قورئان کە دەڵێن: عیسا لەسەر زەوی ژیاوە تا رۆژی مردنی.

پرسیارێك دێتە پێشەوە دەڵێین: دوای ئەورووداوەی کە هەڵمەتیان بردە سەر عیساو بە خەیاڵی خۆیان عیسایان لەسێدارەدا لەراستی دا واش نەبوو، ئەی عیسا بۆ کوێ چوو؟! چی بەسەرهات! لەوەڵامدا دەڵێین: خودا لەبەر حیکمەتێك چۆنییەتی دوا ئەو روداوەی لەسەر چەواشەکردوین‌و بۆی رون نەکردوینەوە، چۆنیەتیەکەی حەواڵەی عیلمی خودا دەکەین‌و لێی بێدەنگ دەبین...!!

ئەمە چوختەی ژینامەو بەسەرهات‌و روداوی ژیانی مەسیح بوو، قورئان ئەوەندەی لێ باس کردوە لە رۆژی لەدایکبوونییەوە تا رۆژی مردنی. بێگومان عیسا کوڕی خودا نییە وەکوو فەلەکان دەڵێن: بەڵکوو پێغەمبەرێکە لە پێغەمبەرەکانی خودا، نیردراوە بۆ رێنومایی نەتەوەی ئیسرائیل. کۆتایی سەرگورشتەی عیسا بەوگفت‌و گۆیەی نێوان پەروەردگارو عیسا دەهێنین کە لە رۆژی قیامەتدا رودەداو قورئان بۆمانی باس دەکاو دەفەرموێ:

**{وَإِذْ قَالَ اللّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنتَ قُلتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَهَيْنِ مِن دُونِ اللّهِ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ إِن كُنتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلاَ أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ، مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلاَّ مَا أَمَرْتَنِي بِهِ أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ وَأَنتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ،{إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ - سورة المائدة – ١١٦-١١٨}.**

واتە: ئەی موحەممەد! یادی ئەو رۆژە بکەرەوە کە پەروەردگار عیسا دەخاتە بەر پرسیارو پێی دەفەرموێ: ئەی عیسای کوڕی مەریەم! ئایا تۆ بەخەڵکت گوتووە کە منو دایکم بەخودا بزانن، جگە لە خودا ئێمە بپەرستن؟! عیسا دەڵێ: پاکو بێ خەوشی بۆ تۆیە پەروەردگار! من شیاوی ئەوە نیم شتێك بڵێم کە ناحەق بێ، خۆ ئەگەر شتی وام وتبێ ئەوە خۆت ئاگاداری، ئەوەی لە دەروونی مندا هەیە تۆ ئاگاداری بەسەریدا بەڵام ئەوەی لای تۆیە من پەی پێ نابەم. بێگومان زاتی بێچوونی تۆ نهێنی زانە، تۆ خۆت ئاگاداری من ئەوەی فەرمانت پێ نەکردبم پێم نەگووتوون. من پێم گوتوون کە عیبادەتی پەروەردگار بکەن کە خودای منو خودای ئێوەشە، تا لە ناویاندا بووم ئاگاداریان بووم ئەمە کردارو گوفتاری من بووە. کاتێك کە مراندتم خۆت چاودێریان بووی! خۆت بەسەر هەموو شتێکدا ئاگاداری، ئەگەر سزایان بدەی بێگومان ئەوانە بەندەی بێ دەسەڵاتی خۆتن، ئەگەر لێیان خۆش ببێ بێگومان تۆ بە توانای و لەکارو فرمانا دانای.

بێگومان چیرۆکی مەسیح بەو جۆرەی قورئان دەیگێڕێتەوە، هەموو ئیدیعای ناحەزان پوچەڵ دەکاتەوە، دڵی گوماناویو رارایانیش دەگاتە ئەو قاناعەتە کە ئەوەی حەزرەتی (محمد) لە پەروەردگارەوە دەیگێڕێتەوە، راستو دروستە چونکە ئەگەر لەخوداوە نەبێ حەزرەتی (محمد) ئەم هەواڵە غەیبییانەی لەکوێوە دەربارەی مەسیحییەت زانی.

دکتور (بیشر فارس) لە کتێبەکەی (الشرف عند العرب قبل الإسلام)دا پرسیار دەکا دەڵێ: ئایا ئیسلام دەستکردی ئایینی جولەکەو مەسیحییە؟! هەر بۆ خۆی وەڵام دەداتەوە دەڵێ: نەخەیر! لەلایەکی ترەوە دەڵێ مێژوو ئەوەی چەسپاندووە کە لەسەردەمی پێغەمبەردا نە تەوراتو نە ئینجیل وەرنەگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی، دیارە حەزرەتی (محمد) هیچی لێ نەزانیوە، هەندێ کەس لەوانەی بڕوایان بە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی (محمد) نییە دەڵێن: گوایە حەزرەتی (محمد) ئەم جۆرە چیرۆکانەی لە مامۆستاکانیەوە

وەرگرتووە، بۆ رەتکردنەوەی قسەی ئەو جۆرە کەسانە دەڵێین: ئەو مامۆستایانە یان بتپەرست بوون یان جوولەکە یان مەسحیی یان موبتەدیعە بوون. ئاشکرایە موبتەدیعە ناتوانێ ناوەرۆکی ئینجیلو ئەو یاساو پرۆگرامەی تێیدایە فێری حەزرەتی (محمد) بکا! چۆن وێ دەچێ موبتەدیعە بێ تاكو تەنهایی خوداو پێغەمبەرایەتی عیسا فێری (محمد) بکا؟ جولەکە هەرگیز ناچن سەر گروشتەی مەسیحو دایکیو چەسپاندنی گەورەییو پاکییان فێری حەزرەتی (محمد) بکەن... یان (تەثلیث) سێ خودایو هەڵواسینی مەسیح رەت بکاتەوە!! خۆ ئەگەر بگوترێ (محمد) بۆ خۆی موبتەدیعە بووە دەبوایە ئەم رایە لەناو خەڵکا مەشهوور بێ یان پەیوەندییەکی پتەوی بە پێغەمبەرەوە هەبێو وای لێبکا کە فێری ئەو رێبازە بێ ئەمەش لە مێژوودا نەسەلمێنراوە!

هەرکەسێ لە ئایەتەکانی قورئان – ئەو دەقانەی چیرۆکی مەسیح دەگێڕنەوە تی بفکرێ بۆی ئاشکرا دەبێ چ مانایەکی بەرزو بەلاغەتو فەصاحەتێکی سەر سوڕهێنەری تێدایە، بە جۆرێك کە بڕوا ناکرێ ئەم جۆرە ئاخاوتنە لەبیرو عەقڵی ئادەمیزادەوە دەربێ، یان لە کەسێکەوە ببیسترێ بە درۆ ئیدیعای پێغەمبەرایەتی بکا، بەڵکوو یەکسەر شایەدی ئەوە دەدا کە ئەم کەلامە لە لایەن خوداوە بۆ حەزرەتی (محمد) نێردراوە تا بڕێ راستی کە لە خەڵکی هون بوون بۆیان بگێڕێتەوە.

## بەشی بیستو حەوتەم:

# بەڵگەی عەقڵی لەسەر راستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد (د.خ)

**ژینامەی پێغەمبەر پێش پێغەمبەرایەتی – ئەو رێکخستنو چاکەخوازییەی لەناو نەتەوەکەیدا ئەنجامی دا – هەوانتەبازی ئەوانەی ئینکاری پێغەمبەرایەتی ( محمد ) دەکەن – بەرنامەی حەزرەتی ( محمد ) سەرچاوەکەی نیگای خوداییە – نەخوێندەواری پێغەمبەر – ئیددیعای پێغەمبەرایەتی – راستیو حەقویستی لە هەڵسو کەوتی پێغەمبەردا – رەنگدانەوەی هەڵسو کەوتی پێغەمبەر بۆ سەر رەوشتی هاوەڵەکانی – یارمەتیو پشتیوانی خودا بۆ پێغەمبەر – ئەنجامدانی نامەی پێغەمبەران.**

## ژینامەی پێغەمبەر پێش پێغەمبەرایەتی (سیرة الرسول قبل النبوة)

پێغەمبەرایەتی هیچ پێغەمبەرێك وەكوو پێغەمبەرایەتی حەزرەتی (محمد) بە بەڵگەی عەقڵیو بنبڕ نەچەسپاوە، هیچ پێغەمبەرێك ئاوا بەڵگەی عەقڵی پاڵپشتی راستی پێغەمبەرایەتییەکەی ناکا؟! دەی با ئێستا راستەوخۆ لە ژینامەی پیرۆزیەوە چەند بەڵگەیەکی عەقڵی لەم بارەوە بخەینەڕو.

بێگومان شتێکی سەلمێنراوە کە حەزرەتی (محمد) (درودی خودای لەسەربێ) بە نەخوێندەواری لەناو هۆزێکی نەخوێندەوار دا پێگەیشتووە، لەژیانیا پەراوێکی نەخوێندۆتەوە، دێڕە شیعرێکی نەنووسیوە، وتارێکی نەخوێندۆتەوە، سەرۆکایەتی هۆزێکی نەکردوە، مالیو کۆڵەوەنانی نەکردوە، هیچ شتێکی لە یاساو شەریعەتی نەتەوەکانی پێش خۆی نەخوێندۆتەوەو نەزانیوە، ئەگەر شتێکی لەمانە هەبوایە هاوەڵانیو ئەوانەی کە هەموو هەڵسو کەوتێکیان تۆمارکردوە، چییان زانیوەو بیستووە، دەربارەی ژیانی –پێش پێغەمبەرایەتیو دوا پێغەمبەرایەتی– هەموویان گێڕاوەتەوەو نوسیوەتەوە، شتێکیان لەم بارەوە دەگێڕایەوەو بڵاو دەکردەوە، یان دوژمنو ناحەزانی لەم بارەوە بەمەبەستی ئینکاریکردنی پێغەمبەرایەتییەکەی شتێکیان دەگێڕایەوە، بەڵام هیچ شتێ لەم

شتانەی لێوە نەقڵ نەکراوە، هەتا تەمەنی گەیشتۆتە چل ساڵی ئاوا بەو شێوە ژیانی بەسەر بردووە. شتێکی ئاشکراو سەلمێنراوە کە هەر کەسێك هەڵکەوتوو ناوازە بێ دیاردەی ئەو هەڵکەوتوویەی لە سەردەمی گەنجیدا لێ بەدەر دەکەوێ! دەی خۆ حەزرەتی (محمد) تا تەمەنی گەیشتە چل ساڵ هیچ دیاردەیەکی ئەو هەڵکەوتوویەی لێ دەرنەکەوتووە، بەڵکوو ئەوەی لە حەزرەتی (محمد)ەوە – پێش پێغەمبەرایەتی – بیستراوەو بینراوە، بریتی بووە لە دەستپاکی‌و ئەمانەت‌و گۆشەگیری کە هەرگیز هاوبەشی نەتەوەکەی نەکردوە بۆ بتپەرستی‌و سەرخۆشی‌و رابواردنی نابەجێ، ئەمجار کە تەمەنی گەییشتە چل ساڵ‌و نیگای بۆ هات‌و کرا بە پێغەمبەر دەستی بە بانگەوازی کردو باڵپشتی بانگەوازییەکەی بە قورئان کرد، کە هەواڵی نهێنی‌و غەیبی رابوردوو داهاتووی لەخۆ گرتووە، باسی چۆنیەتی ویستی خودا دەربارەی ئایینی‌و شارەستانی‌و ژیان بەسەر بردن دەکا، لایەنی بیرو باوەڕ بە خوداو بەڵگەهێنانەوەی عەقلی‌و زانستی لەسەر هەبوونی‌و راستی ئەو بیرو باوەڕە! ئەمە جگە لەوەی کە ئەو قوئانە راسترین یاسای ئەخلاق‌و نەفس بەرزیی لەخۆ گرتووە، هەروەکوو چۆن شێوەو چۆنییەتی تاعەت‌و خوداپەرستی سودبەخشی بۆ گیان‌و لاشە تێدایە، راسترین یاساو شەریعەتی رامیاری ئیسلامی لەخۆ گرتووە وەکوو لەم کتێبەدا شیمان کردەوە.

## ئەو ڕێکخستن‌و چاکەخوازییەی کە پێغەمبەر لەناو نەتەوەکەیدا ئەنجامیدا:

بێگومان حەزرەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەربێ) لە ماوەیەکی کەمدا توانی چەند گۆڕانکارییەکی گەورەو سەرسوڕهێنەر لەناو گێتی دا پەیدا بکا، کە ئەم گۆڕانکاری‌و رووداوانە بە رواڵەت پێویستیان بە ماوەیەکی زۆرو کۆششێکی بێ ئەندازە هەیە. ئەم گۆڕانکارییانەش بریتی بوون لە:

١- یەکخستنی نەتەوەی عەرەبو کردنیان بە نەتەوەیەکی یەکپارچە کە لەوە پێش بریتی بوو لە چەند تیرەو هۆزێکی جیا جیاو هیچ شتێك نەیدەتوانی یەکیان بخاو ئاوا لەسەر یەك ڕێبازو پرۆگرام کۆیان بکاتەوە.

٢- قەڵاچۆکردنی بتپەرستی لەناو عەرەبەکان کە لە دێرزەمانەوە بە میراتو کەلەپوور بۆیان مابووەوە، ئەمجار جێگیرکردنی ئاینێکی ئاسمانی لە شوێنی ئەو بتپەرستییە، ئاینێکی وەها کە ئادەمیزاد لە پلەی هەرە ژووروی مرۆڤایەتی دادەنێ.

٣- گۆڕینو ئیصلاحکردنی کۆمەڵگای عەرەب لە بارەی ڕەوشتی کۆمەڵایەتییەوە کە ئەو کۆمەڵگایەی ڕزگار کرد لە نەزانی نەزانان لە پێشێلکردنی مافی بێ نەوایانو لە ڕۆچونو زیادەڕەوی لە خۆش ڕابواردنو ئارەزوبازیو چەسپاندنی دادوەریی کۆمەڵایەتی بەبێ جیاوازی لە نێوان زەبونو بەهێزدا دەی کردارێك لەم کردارانە بەسە بۆ ئەوەی کە خاوەنەکەی ئەوپەڕی پلەی ڕێزو مرۆڤایەتی بدرێتێو ناوی نەمر بکا لەناو گەورە پیاوانی مێژوودا! دەی تۆ چی دەڵێی: ئەگەر بزانی ئەم کردەوانە هەموویانو زۆری تریش لەسەر دەستی تاکە پیاوێكو لە ماوەیەکی کورتدا دەستەبەر کراون، ئەو زاتەش حەزرەتی (محمد)ە (درودی خودای لەسەربێ) چونکە نیگای خودایی پاڵپشتی بووەو سەرچاوەی بەرنامەکەی لەوەحییێکی ئاسمانی بووە. ئەم گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییە گرنگانە پێویستیان بە هۆکارو تەعلیلی مەقبوولی وا هەیە کە دڵ ئارامی پێ بگرێ، لەم بارەوە تەنها ئیحتیمالو ئەگەر هەیەو بەس.

١- بڕوا بەوە بکەین کە حەزرەتی موحەممەد (درودی خودای لەسەربێ) پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خودا بووە، لەلایەن خوداوە یارمەتی دراوە، ئەمەش قورئان بەئاشکرا ئاماژەی بۆ کردوە عەقڵیش پاڵپشتی دەکا.

٢- یان بڵێین: حەزرەتی موحەممەد پێغەمبەر نەبووە ئەم پلەو پایەو رامیاری زیرەکییەی بە بلیمەتی خۆی دەستکەوتووە.

## ئەو ئەگەرو فەرەزییاتیانەی دەخرێنە رو لەلایەن ئەوانەی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد رەت دەکەنەوە

ئەگەر یەکێك ئەگەری دووەمی بەلاوە پەسەندبوو، باسەکەی لەگەڵ موناقەشەو تاوو توێ دەکەین‌و دەڵێن: لە ئاکامی بۆچوونەکەی تۆ کۆمەڵێك ئەگەرو پرسیار سەر هەڵدەدەن.

أ) ئەم ئایینەی لە راهیبێکی مەسیحی یان مالێکی جولەکە وەرگرتووە.

ب) موحەممەد خوێندن‌و نووسینی زانیوەو ئایینەکەی لەیەکێك لە ئایینەکانی پێش خۆی وەگرتووە.

ج) موحەممەد ئیددیعای پێغەمبەرایەتی بەدرۆو دەلەسە کردوە!

د) ئەو رەوشتانەی خۆی پێ رازاندبونەوە، ئەو تاعەت‌و خوداپەرستییەی هەموو ریاو چاو بەست بووەو توانیویەتی بە درێژایی ژیانی پەرە بەم چاو بەستییە بدا.

ه) توانیویەتی ئەم درۆو رییاو چاو بەستییە لە هەموو کەس بشارێتەوە.

و) لەگەڵ ئەو هەموو رەوشتانەی باسمان کردن واش خودا یارمەتی داوە.

ز) پێغەمبەر ئیددیعای پێغەمبەرایەتی کردوە، پەیامی هەموو پێغەمبەرەکانی بەو پەڕی کەماڵ‌و تەواوی هێناوە!!.

دەی با ئێستا ئەم ئەگەرو فەرزەیاتانە یەکە یەکە شی بکەینەوە.

### پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد (سەرچاوەکەی نیگای خودایە):

ئەگەری یەکەم کە بریتییە لەوەی کە حەزرەتی موحەممەد (درودی خودای لەسەربێ) ئایینەکەی لە راهیبێك یان مالێك وەگرتبێ، ئەوە ئەگەرو فەرەزییەکە لە هەموو رویەکەوە واقیعی مێژوویی هەڵی دەوەشێنێتەوە یەکێك لەو شوبهانەی کە بڕێ نیازناپاك دەیانخەنە ڕوو دەربارەی راستی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد ئەوەیە دەڵێن: ئەو قورئان لەلای بوحەیرای راهیب فێربووە کە لە دانیشتوانی شاری بوصرای شام بووە، دەڵێن: ئەم بوحەیرایە کابرایەکی نەسطوری‌و

شوێنکەوتووی ئاریوس بووە لە یەکتاپەرستیدا، ئەم رایە سەریرترین و بوختان و عەجیبترین بۆچونێکە بۆ چەواشەکردنی راستییەکان.

جا بۆ ڕەتکردنەوەی ئەم ئیددیعایە بەتاڵە دەڵێین: کتێبەکانی مێژوو ژینامەی پێغەمبەر، ئەوەیان چەسپاندوە کە موحەممەد کاتێ لەگەڵ ئەبو تالیبی مامی دا چوو بۆ شام تەمەنی نۆ ساڵ یان دوانزە ساڵ بووە، ئەم راهیبە حەزرەتی موحەممەدی بینی لەگەڵ مامیدا لە هەمان کاتدا بینی هەورێك سێبەری لێ دەکرد ئیتر بوحەیرا بە ئەبو تالیبی گوت کە ئەم کوڕە دوا رۆژێکی پرشنگداری دەبێ! ئەمجار وتی ئاگات لێبێ جولەکە فرسەتی لێ نەهێنن، دەی هیچ سەرچاوەیەك لەمانەو هی تریش باسی ئەوە ناکەن کە موحەممەد شتێکی لەو بوحەیرایە دەربارەی باوەڕو ئایین بیستبێ.

جارێکی تر حەزرەتی موحەممەد سەفەری وەڵاتی شامی لەگەڵ مەیسەرەدا کردوە مەیسەرە بەندەو خزمەتکاری خەدیجەبووە، پێغەمبەر ئەوکاتە تەمەنی (٢٥) ساڵ بووە، مەبەستی سەفەرەکەشی بازرگانی بووە، دەی لەو سەفەرەشیدا پێغەمبەر لە کاروانەکەو لە مەیسەرە جودا نەبووتەوە تا بەتەنها بچێتە لای راهیبێك فێری شت بێ، تەنانەت ئەوەندەش لە شاری بوصرا نەماونەوە، بەڵکوو شتو مەکیان فرۆشتووەو کەلو پەلی پێویستی خۆیان کڕیوەو زوو گەڕاونەوە.

ئەمە پوختەی ئەو هەواڵو چیرۆکە مێژووییەیە کە دەربارەی پەیوەندی حەزرەتی موحەممەد بە بوحەیرای راهیبەوە تۆمار کراوە، کە بە هیچ جۆرێك پەیوەندییەکی فیکری بەدی ناکرێ لە نێوان بوحەیراو حەزرەتدا؟!

دەی با ئەم توێژینەوە بخەینە لاوەو لەلایەکی ترەوە سەیری قەضییەکە بکەینو لێی وردبینەوە دەبینین ئیددیعای ئەو نیازناپاکانە هیچ بەڵگەیەکی عەقڵی بڕوا پێکراو پاڵپشتی ناکا، بەڵکوو چەند حەقیقەتێکی دژ بەو بۆچوونەی ئەوان خۆیان دەنوێننو سەر هەڵدەدەن.

یەکەم: ئەگەر موحەممەد بڕێ زانیاری لە بوحەیرای راهیب یان یەکێکی تر وەربگرتایە دەبوایە شوێنکەوتوانی پێغەمبەر ئەمەیان بدرکاندایە، چونکە

ئاشکرایە هاوەڵانی پێغەمبەر هیچ کردارو گوفتارێکیان کە لێ بیستبێ فەراموش نەکردوە بەڵکوو هەموو شتێکی پەیوەند بەو زاتەوە لە کتێبەکانی مێژوو سیرەتدا تۆمارکراوە، لە بەڕاوەکانی حەدیسدا بەڕیوایاتی جیا جیا گێڕدراوەتەوە.

دووەم: ئەگەر ئەوەی ئەو نیاز ناپاکانە ئیددیعای دەکەن ڕاست بوایە خوانەناس و کافرەکان دەیان کردە بەڵگەو کاتی خۆی بەرەنگاری پێغەمبەریان پێ دەکرد، دەیانگوت: ئەوەی موحەممەد ئیددیعای دەکاو دەڵێ: نیگای خودام بۆ هاتووە بریتییە لەو زانیارییەی کە لەشام لای مەسیحیو جولەکەکان فێربووە.

تاکە شوبهەیەك کە دوژمنان لەم ڕووەوە پشتی پێ دەبەستن ئەوەیە گوایە لەگەڵ بوحەیرادا کۆبونەوەی کردوە ئەم بوحەیرایە تەوراتی زانیوەو بەزبانی خۆیان خوێندویەتیەوە.

قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ ئەمە دەکاو قسەکەشیان رەت دەکاتەوەو دەفەرموێ:

{وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِّسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ - سورة النحل - ١٠٣}.

واتە: ئێمە دەزانین و ئاگامان لێیە ئەوانە دەڵێن: ئادەمیزاد (محمد) فێری ئەم قورئانە دەکا، دەی باشە خۆ زمانی ئەوانەی کە ئەم فێرکردنەی دەدەنە پاڵ زمانێکی دیکەیەو لۆغەتێکی عەجەمییە، ئەم قورئانەش بە زوبانێکی عەرەبی ڕەوان و ئاشکرایە....

سێیەم: قورئان زانست و زانیاری پیاوە ئایینییەکانی مەسیحی و جولەکەی سەردەمی پێغەمبەرو پێش ئەو سەردەمەو دوای ئەو چەرخەی لەخۆ گرتووە، چەند ئەحکام و تەشریعات و یاسایەکی وای لەخۆ گرتووە کە بەهیچ جۆرێك بڕواناکرێ کە ئەم کەلامەی لە بوحەیرا یان یەکێکی تر وەرگرتبێ، بەڵکووو زۆر جاران قورئان ڕوداوە مێژوویی و ئایینییەکان بەپێچەوانەی تەرات و ئینجیلەوە دەگێڕێتەوە، کە ناوداران بە عەهدی دێرین و عەهدی نوێ.

**چوارەم:** قورئانی پیرۆز ئایەتەکانی بەگوێرەی روداوو پێویستی کات نازڵ کراوە، نازڵبوونەکەشی لەماوەی بیستو سێ ساڵدا بووە. حەزرەتی موحەممەد قورئانی بەیەکجار نەهێناوە، واتە: وەکوو ئەو کتێبانە نییە کە نووسەرێك ماوەیەك بە دانانو نووسینیەوە خەریك بێو ئەمجار پاکنووسی بکاو بیخاتە بەردەستی خوێنەران. ئەمەش خۆی لەخۆیدا ئەوە دەگەیەنێ کە قورئان نە لە کەس وەرگیراوەو نە دانراوی موحەممەد خۆیەتی بەڵکوو نیگای خوداوەو پەروەردگار بەنیگا بۆ پێغەمبەری ناردووە.

**پێنجەم:** بوحەیرای راهیب دانیشتوی شام بووە، موحەممەد دانیشتووی مەککە بووە، خۆ فێربوونو فێرکردن بە دانیشتنێك یان چەند دانیشتنێك ئەنجام نادرێ بەڵکوو پێویستی بەوە هەیە قوتابی لە خزمەت مامۆستادا ماوەیەکی زۆر چۆك داداو گوێی بۆ رابگرێ، جا خۆ ئەگەر شتێك لەم بابەتانە روی بدایە لەناو عەرەبەکاندا دەنگی دەدایەوە، عەرەبەکان – خۆیان – ئەوەیان بڵاو دەکردەوە کە موحەممەد لەفڵان کەس فێری ئەم قورئانە بووە، ئەمەش شتێکە مێژو باسی نەکردوە.

**شەشەم:** بوحەیرای راهیب یەکێك نەبووە لە خۆشخوانو زمانپاراوی عەرەب، موحەممەدیش بۆ خۆی پێش پێغەمبەرایەتییەکەی بەخۆشخوانو زمانپاراو ناوبانگی دەرنەکردوە، دەی کەوابوو سەرچاوەی بەلاغەتی ئەم قورئانە لەکوێوە هاتووە؟ موحەممەد چۆن توانی ئەم کەلامە رەوانە بێنێ؟ کە هەموو بەلاغەتو رەوانبێژی عەرەبەکانی بۆڕداوە، ئەو رەوانبێژیو بەلاغەتەی کە قورئان تەحەددای هەموو عەرەبەکانی پێ کردوە، نەیانتوانی بەرامبەری بکەن بەجۆرێك کە ناچار دەبێ بگوترێ: ئەوە نیگای خودایە.

**حەوتەم:** ئەگەر بوحەیرای راهیب ئەو پلە پەرزەی لە زانیاریو رەوانبێژیو بەلاغەتدا هەموویێ بۆچی لەسەردەمی خۆیدا ئەم بلیمەتیەی خۆی دەرنەخستووەو خۆی پێ نەکردوە بەسەرۆكو پیاوماقوڵی نەتەوەکەی؟ ئەو کە بلیمەتێکی ئاوابێ چۆن رازی دەبێ کە مسکێنو ژێردەستەی خەڵکی تربێ؟! یان

بۆچی پاش ئەوەی کە موحەممەد دەستی بە بانگەوازی کردو پێغەمبەرایەتی خۆی چەسپاندو سەرکەوتنی بەدەست هێنا بۆچی بوحەیرا نقەیەکی لێ نەهاتو نەیگوت: بابە ئەوە قوتابی منەو فێرم کردوە، ئەوە بلیمەتیو هونەری منە؟!

## نەخوێندەواریی پێغەمبەر (أمية الرسول):

ئەگەری دووەم ئەگەر بگوترێ: پێغەمبەر خوێندەوارو نووسەربووە ئەمە ئەگەرێکە هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی پاڵپشتی ناکا، بێگومان ئەوە چەسپاوە کە پێغەمبەر نەخوێندەوار بووە، نەخوێندنەوەی زانیوە نە نووسینی زانیوە، هەرگیز نەبیندراوە کە موحەممەد نە پێش پێغەمبەرایەتیو نە پاش پێغەمبەرایەتی – لە ماڵو لە دەرەوەی ماڵ قەڵەمو کاغەز بەکار بهێنێ بۆ نووسینو دانانی کتێبێ!! نەخوێندەواری پێغەمبەر نیشانەیەك بووە لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی، چونکە لەگەڵ ئەو نەخوێندەوارییەدا ئەو کتێبە بەنرخەی هێنا کە قورئانە کە هیچ کەس نەیتوانیوەو ناتوانێ سورەتێکی سێ ئایەتی لە وێنەی بێنێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەردەوام ئەم قورئانەی بۆ دەخوێندنەوە، هیچ جارێك پیتێك یان وشەیەکی لێ نەدەپەڕاند! شتێکی ئاشکراشە کە مرۆڤی ڕەوانبێژو ڕەوانو بەلیغ ئەگەر وتارێکی سەرپێی خوێندەوەو جارێکی تر دووبارەی کردەوە ناتوانێ با بشتوانێ زوربەی وتارەکەی بە هەمان ناوەڕۆك دووبارە بکاتەوە. بێگومان قورئان بۆ خۆی صیفەتی نەخوێندەواری بۆ پێغەمبەر بەبانگ هەڵداوە، ئەوەتا پەروەردگار بە ئاشکراو ڕاستەوخۆ بە بەرچاوی ئەو هەموو خەڵکەوە بە دۆستو دوژمنیانەوە – بە پێغەمبەر دەفەرموێ:

{وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذًا لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ - سورة العنكبوت – ٤٨}.

واتە: ئەی موحەممەد! تۆ پێش ئەم قورئانە هیچ کتێبێکت نەخوێندۆتەوە، بەدەستی ڕاستیشت هیچ نووسینێکت نەنووسیوە، خۆ ئەگەر خوێندنو نووسینت بزانیبایە ئەوە ئەو خودا نەناسانە دەکەوتنە شكو گومانەوەو دەیانگوت: ئەمە دانراوی خۆتەو نیگای خودایی نییە..! لە قورئاندا ئایەتێکی تر هەیە تەئکیدی نەخوێندەواری پێغەمبەر دەکاتەوەو دەفەرموێ:

**{الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ-سورة الأعراف – ١٥٧}.**

واتە: ئەوانە شوێن پێغەمبەرو ڕەوانە کراوێکی نەخوێندەواری ئەوتۆ کەوتوون کەوەصفو سەنای لە تەوراتو ئینجیل دا نووسراوە – فەرمانیان پێ دەکا بە چاکەو نەهییان لێ دەکا لە خراپە – دەی عەرەبەکان ئەم دوو ئایەتەی کە نەخوێندەواریی موحەممەد ڕادەگەیەنن. چەند جار بیستووەو زوربەشیان دژی پێغەمبەربوون دوژمنایەتییان دەکرد، جا ئەگەر بێتو بیانزانیبایە کە پێغەمبەر خوێندنو نووسین دەزانێ بێگومان لێیاندەکرد بە هەڵاو باشترین بەڵگە بوو بۆ ئەوەی بە درۆی بخەنەوە، بەهێزترین بەڵگە دەبوو بۆ بەدرۆخستنەوەی. ئەمجار با بڵێین: قەیناکا سەلماندمان کە پێغەمبەر خوێندنەوەو نووسینی زانیوە! بێگومان فێربوون بە دانیشتنێكو دوو دانیشتن دەستە بەرنابێو بەدزییەوە ناکرێ، بەڵکوو فێربوون پێویستی بەوە هەیە قوتابی لای مامۆستا بمێنێتەوەو ماوەیەکی دورو درێژ لە خزمەتیا چۆك داداو لای بخوێنێ. جا ئەگەر وابوایە ئەوە بێگومان لەناو عەرەبەکاندا بڵاو دەبووەوە کە پێغەمبەر زانیاری لە فلانو فلانەوە فێربووە.

ئەو زانستو زانیاریانەی لە قورئاندا هەن زۆرو زەبەندەن، هەروا بە ئاسانی پیاو فێریان نابێو دەبێ مامۆستاش بڕۆفیسۆرو بلیمەت بێ، جا ئەگەر لەناو عەرەبەکاندا پیاوێکی ئاوەها هەبووبێ لە زانیاریو زانستدا گەییشتبێتە ئەو پلەیە دەبوو بناسرایەو پەنجەی بۆ درێژ بکرایەو پێغەمبەریش ناچار دەبوو لە

هەموو هاوەڵەکانی زیاتر ڕێزی لێ بگرێ پێش هەموانی بخستایەو دەبوو ڕۆژێکیش لە ڕۆژان پێغەمبەر ئەوەی بدرکاندایە بۆ هەندێ کەس!!

دەی هیچ شتێك لەم بارەوە ڕوینەداوە، لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە نەخوێندەواری پێغەمبەر نیشانەیەکی پتەو بووە لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتییەکەیو هیچ شكو گومانێك لەئەمەدا نییە.

## ئیددیعای پێغەمبەرایەتی:

ئەگەری سێیەم: کە ئەویش بریتییە لەوەی حەزرەتی موحەممەد بەدرۆ لافی پێغەمبەرایەتی لێ دابێ، ئەمەش ئەگەرێکە هەر زوو پوچەڵ دەبێتەوەو ناتوانێ خۆ لە بەرامبەر ڕەخنەی زانستی بگرێ، چونکە پێغەمبەرایەتی کارێکی ئاسان نییەو کەس ناتوانێ — بە هەوانتە ئیددیعای بکاو لە خۆوە هەڵی بەستێ! مەگەر پیاوێکی دڵڕەقو تەماعکارو دەروون نەخۆشو لەخودا نەترس بتوانێ درۆی ئاوا هەڵبەستێ! کەسێکیش بتوانێ ئەم ئیددیعایە ئاوا بکا دەبێ زنجیرەی ژیانی هەموو تاوانو پلانو گونەهکاری بێ لە هەموو ڕویەکەوە لە هەموو خێرو بیرێك دوور بیت، دەی باشە با لە مێژوو بپرسین ئاخۆ موحەممەد لە پەروەردەبونو ژیانی دا لەم جۆرە کەسانە بوو؟! ئایا مێژوو گەواهی ئەوەی بۆ نادا کە لەپێش پێغەمبەرایەتیدا چەند ڕەوشت جوانو لەسەرەخۆو دەست پاكو داوێنپاك بووە، تەنانەت پێیان گوتووە: (محمد الأمين) بەم نازناوە بانگیان کردوە، هەرگیزاو هەرگیز تاوانێك یان ڕەوشتێکی ناشیرینی لێوە نەگێڕدراوەتەوە؟! دەی باشە کەسێك سەرەتای ژیانی بە خاوێنیو ڕەوشت جوانی هێنابێ چۆن دوای ئەوەی کە تەمەنی گەییشتە چل ساڵی دەگۆڕێو ڕەوشتی هەموو بە پێچەوانەوە دەبێ، ئایا سوننەتی بوونەوەر هەمووی گۆڕدرا؟!

ئەمجار ئەوانەی هاوچەرخی بوونو گفتوگۆیان لێ بیستووەو ئاگایان لە هەڵسو کەوتی بووە، گەییشتوونەتە ئەو قەناعەتەی کە موحەممەد ڕاستگۆیەو

نیگای لەخەودا بۆ هاتووە، بۆ نموونە برێ لە عەرەبەکان کە موسوڵمان بوون تێی فکریوون و سەیری هەڵس و کەوتیان کرد، وتیان سوێند بە خودا ئەمە روخساری پیاوی دروزن نییە. هەروەها خاتوو خەدیجەی خێزانی دەیزانی کە چەند راستگۆو چەند دەستپاکەو چەند ئەمین و داوێنپاکە، بۆیە کاتێ نیگای بۆ هات و بۆی گێڕایەوەو پێی گوت: خەدیجە! بەراستی ئەو رووداوە، من دیومە ئەوەندە سامناك بوو لەخۆم دەترسێم! خێرا خەدیجە وەڵامی دایەوە وتی: نەء مەترسە سوێند بەخودا هیچ کاتێ خودا تۆ ریسوا ناکا تووشی خراپەت ناکا، تۆ صیلەی رەحەم بەجێ دێنی، لەقسەدا راستگۆی و لەپێناو بەرژەوەندی ئادەمیزاددا تێ دەکۆشێ و نارەحەتی دەچێژێ، میوانداری هەژارو بێ نەوایان دەکەی یامەتی نەبوان دەدەی دڵنەوایی کۆستکەوتووان دەکەی[1].

هەروەها ئەوەی کە هیرقەل — پاشای رۆم — بە ئەبو سوفیان و هاوەڵەکانی گوت — دیارە هیرقەل ئەوکاتە کافربوو — پێی گوتن: ئایا ئێوە پێش ئەوەی موحەممەد ئەم ئیدیعایە بکا بە درۆزنتان دەزانی؟ وتیان نەخەیر ئێمە هەرگیز درۆمان لێ نەبینیوە! ئەمجار هیرقەل پێی وتن: دەی کەسێك درۆ لەگەڵ ئادەمیزاد نەکا بە ناوی خوداشەوە درۆ هەڵنابەستێ!

## ریاو دووڕویی لەهەڵس و کەوتی پێغەمبەردا نەبووە:

ئەگەری چوارەم ئەوەیە بڵێین: موحەممەد لەو رەشت و هەڵس و کەوتەیدا درۆی کردوە بەو ڕەوشتە — بەرواڵەت جوانانە — رەوشتی سامناکی تری داپۆشیوە! بێگومان ئەم بۆچوونە زۆر لە ئەگەری دووەم لاوازتر دەبێ لە بەرامبەر رەخنەی زانستیدا، چونکە دووڕوویی بەکار ناهێندرێ مەگەر بۆ گەییشتن بە مەبەستێکی تایبەتی، جا هەر کاتێ — درەنگ یان زوو — ئەو مەبەستە بەدی هات دووڕوییەکە دەپووچێتەوەو پەردە لەسەر بۆخەڵاواتەکە

---

[1] صەحیحی بوخاری بەشی نیگا (وحی).

هەڵدەماڵدرێ‌و ڕاستییەکە دەردەکەوێ، چونکە دەروونی ریاکاری دوورو بەرواڵەت دەرۆنێکی نەرم‌و پەستە، هەر کە زانی لە کارەکەیدا سەرکەوتووە خێرا حەقیقەتی خۆی دەردەخاو خۆی کەشف دەکا!! جا ئەگەر مەبەستەکەی لەم ریاکاری‌و دوو روویيە ماددی بوایە دەبو کە سەرکەوت لەو ماددە پەرستییە سوودی وەربگرتایە! خۆ ئاشکرایەو مێژوو شایەدە کە موحەممەد بەهەژاری ژیانی بەسەر بردووە بە هەژاریش کۆچی دوایی کردوە، هیچ شتێکی دونیا پەرستی بۆ خۆی لانەدا، خۆی بە ماددە هەڵەو گێرنەکرد: هەرچەندە دەیتوانی بە ئارەزۆی خۆی پێداویستییەکانی خۆش رابواردن بۆ خۆی دەستەبەر بکا.

هەرگیزاو هەرگیز لەسەر راخراوی دێباج دانەنیشتووە: پۆشاکی ئاوریشمی لەبەرنەکردوە، زێڕو زیوی لەخۆ نەداوە هەنگوستیلەی زێڕی لە پەنجە نەکردوە، خانوو بەرەی سادەترین خان‌و بەرەی ئەو رۆژگارە بووە، جل‌و بەرگیشی جل‌و بەرگێکی سادەو بەسیت بووە، لەو جل‌و لیباسە بووە کە مرۆڤی مام ناوەندی لەبەری کردوە ئەگەر مەبەستی پلەو پایەی دونیایی بوایە دەبوایە لە رۆییشتندا پێش هاوەڵانی بکەوتایەو فەرمانی بکردایە هەرکاتێ رەت بوایە هاوەڵانی سەری بۆ نەوی بکەن‌و سوژدەی بۆ بەرن! دەی خۆ مێژوو شایەدە کە پێغەمبەر هەرکاتێ هاتبێتە کۆڕی یارانەوە لەکوێ بەتاڵ بووبێ‌و جێگای هەبووبێ یەکسەر دانیشتووە، هەرکاتێ بەرێگادا رۆییشتبێ لەناو هاوەڵانی دا بووە.

دەگێڕنەوە: رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هات بۆ ناویارانی، خۆی بە عاسایێ دەگرت، یارانی زۆر بەرێزەوە لە بەری هەڵسان: فەرمووی:چاو لە بەڕانییەکان مەکەن کە دەچن لە بەر پاشاکانیان هەڵدەستن: ئێوە لەبەر من هەڵمەسن، خۆ من پادشا نیم من پێغەمبەرم، جگە لەوە پێغەمبەر پێی ناخۆش وو کە خەڵك مەدحی بکاو لە بەرامبەریا پێیدا هەڵبڵێ، لێی دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: بە تان‌و پۆی مندا هەڵمەدەن وەك نەصرانییەکان بە تانو پۆی عیسای کوڕی مەریەمیان هەڵداوەو کردوویانە بە کوڕی خودا، شتی وا لەمن دوورە من بەندەی خودام، کەواتە پێم بڵێن: بەندەی خودا پێغەمبەری خودا.

ئەگــەر مەبەســتی لــەو ریــایی و دووروییــە بەدەســتهێنانی دەســەڵات و فەرمانڕەوایی بوایە بێگومان پێغەمبەر ئەوەنـدە لـەناو هاوەڵانیـدا ڕێـزو پلـەو پایەی پەیداکردبوو هەرچی بیگوتایە بۆیـان دەکـرد! چی مـسکێن و کۆیلـەکان بـۆ پاشاکانی رۆم و فارسیان دەکرد ئەمان بـەزیادەوە بـۆ پێغەمبـەریان دەکـرد، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر لەسەرەتاوە چۆن بوو هیچ لە رەوشتی خۆی نـەگۆڕی: جـۆری خـواردن و شـێوەی جـل و بـەرگ و داب و حەشـەمی تێکنـەدا، پاسـەوان و سـکرتێری لـە دەوری خـۆی کۆنـەکردەوە، هـیچ کاتـێ رای خـۆی فـەرز نـەکردوە، عەرەبێکی دەشتەکی دەهات بـۆلای چاکی کەواکەی ڕادەتەکانـدو بـە تونـدی و بـێ عاقڵانە قسەی لەگـەڵ دەکـرد بـە جۆرێـك کـە هاوەڵەکانی پێیـان نـاخۆش بـووەو ویـستوویانە دەری بکـەن و دووری بخەنــەوە بــەڵام پێغەمبــەر دەیفــەرموو: وازی لێبێـنن. دەگێڕنــەوە رۆژی فــەتحی مەککــە کابرایــەك هــات بــۆ لای لــە بەرسـامی پێغەمبەر لەشـی دەلـەرزی! پێغەمبـەر پێـی فـەرموو: لەسـەرخۆبەو مەترسـێ مـن پادشا نیم من کوڕی ژنێکی قورەیشی ساویلکەم: لەتکە گۆشتێ بە تـاوێری گـەرمی هاوین دەبرژاندو دەیخوارد...!!

ئەوەتا ئەبو وەلیـد – عوقبـەی کـوڕی رەبیعـی عەبـشەمی – سـەرۆك و بـاوەڕ پێکراوی هۆزەکەی بوو بە گەورە گـەورەکانی قوڕەیـشی گـوت: - کـە کۆبونـەوە بـۆ لێـدوان دەربــارەی موحەممــەد – ئــەی گــروی قــوڕەیش! بــۆ نەچــم بــۆ لای موحەممــەدو تــۆزێ لەگــەڵیا بـدوێم و چەندشـتێکی بخەمـە پـێش چـاو تــەماع بنێمەبەری بەڵکوو هەندێکیان وەرگرێ و بیدەینێ و وازمان لێ بێنـێ: وتیـان باشـە ئەی باوکی وەلید! بچۆ لەگەڵی بـدوێ و چـی دەوێ بیـدەرێ: عوقبـە چـوو بـۆلای و پێی گوت: کوڕی برام! تۆ خۆت دەزانی لەناو ئێمەدا پایەو جیگای بەرزی شەرەفی تیرەو هۆزی نەژادی گەورەت هەیە جا ئەگەر مەبەستت بەم کارەی هێناوتە مـاڵ و سـامانە، ئێمـە ئەوەنـدەت دەدەینـێ ئەونـدەت مـاڵ و سـامان بـۆ کۆدەکەینـەوە کـە ببیتـە یەکـەم دەوڵەمەنـدو سـەرمایەدار لەناومانـدا! ئەگـەر گـەورەیی و شـەرەفت دەوێ دەتکەین بە گەورەی خۆمان و بـەبێ تـۆ قامـك ناکـەین بـە ئـاودا! ئەگـەر بـۆ

پاشایی دەگەرێیت دەتکەین بە پاشای خۆمانو بۆت مۆر دەکەین! ئەگەر ئەوەی دێتە سەرت جنۆکەیەو ناتوانی لەخۆتی دوور خەیەوە پزیشکت بۆ دێنینو هەموو سامانی خۆمانت لە پێناودا بەخت دەکەین تا رزگارت دەبێ لە چنگی!

ئەمجار پێغەمبەر فەرمووی: باوکی وەلید لێ بوویتەوە؟ وتی: بەڵێ: فەرمووی: دەگوێم لێ بگرە تا پێت بڵێم: ئینجا دەستی کرد بە خوێندنی سەرەتای سورەتی (فصلت).

{بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ}

{حم تَنزِيلٌ مِّنَ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ} هەتا گەیشتە ئەوە کە دەفەرموێ: {فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِّثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ....}.

دەگێڕنەوە دەڵێن: لێرەدا عوتبە هەموو گیانی کەوتە لەرزینو هەڵساو گەڕایەوە... هتد.

نووسەرێکی ئەمەریکی کە ناوی (واشنجتۆن أرفنج)ە دەربارەی کەسایەتی پێغەمبەر دەڵێ: ئایا پێغەمبەر ساماندار بوو؟ نەء بەڵکوو هەژاربوو، بەڵام کە خەدیجەی مارەکرد بڕێ دەوڵەمەند بوو، کۆششی کرد بۆ ئەوەی ماڵو سامان پێکەوەبنێو گەشە بە ماڵو سامانەکەی بکات. ئەمجار نووسەری ناوبراو دەڵێ: ئایا پێغەمبەر پیاوێکی دەرکەوتوو بوو؟! بەڵێ پیاوێکی ناسراو بوو لە وەڵاتی خۆیدا، بێگومان پیاوێکی ناسراو بوو لە وڵاتی خۆیدا، بێگومان پیاوێکی زیرەكو ئەمین بوو، ئایا دەست ڕۆیشتوو بوو؟ بەڵێ موحەممەد لە خێزانێك بوو کە بنەماڵەکەی کارو باری کەعبەیان بەدەستەوە بوو، بۆیە پلەی کۆمەڵایەتیو ڕەوشتە بەرزەکانی وایان لێ کردبوو جێ متمانەی خەڵکی بوو، بەڵام کە موحەممەد بانگەوازی ئیسلامی هەڵدا لەگەڵ خزمو کەسو کاری خۆیدا تووشی ڕقەبەریو بەرامبەری بوو دژایەتی کەوتە نێوان موحەممەدو هۆزەکەیەوە!! بێگومان روخاندنی بتەکان مانای ئەوەبوو کە دەسەڵاتی قوڕەیشییەکان بەسەر

کەعبەدا نەمێنێ، ئەو سودو قازانجەی دەستیان دەکەوت لە هۆی هاتنی حاجیەکان بۆ مەککە لە دەستیان بچێ؟!

پێغەمبەر لەپێناو بڵاوکردنەوەی ئیسلامدا زۆر ناخۆشیو نارەحەتی چەشت گەلێك قوربانیدا، زۆر کەس لە عەرەبەکان گومانیان لە راستگۆیی ئەودا هەبوو

چەند ساڵێك هەوڵو تێکۆشانی کرد سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێنا، تەنانەت لەکاتی بانگەوازی کردندا توشی جۆرەها چەوسانەوەو بێ رێزیو دەستدرێژی کردن بوو! بەڵکوو ناچار بوو زێدو نیشتمانی خۆی بەجێ بێڵێو پەنا بۆ شوێنی تر بەرێ. تەمەنی گەییشتە چل ساڵ نیگای ئاسمانی بۆ هات، ئیتر ساڵ دوای ساڵ لەپێناو ئیسلامدا زیاتر توشی کێشمە کێشم بوو، قورەیشییەکان زۆر ئازاریاندا، کاتێك هیجرەتی فەرموو لە مەککە دەرچوو (١٣) سێزدە ساڵ بەسەر پێغەمبەرایەتیەکەی دا تێپەڕ بوو، ئیتر لە بازگانێکی دەوڵەمەندەوە بوو بەکۆچەرییەکی نەبوو، کاتێکیش گەییشتە مەدینە بیری لەوە نەکردەوە ئەو هێزە عەسکەرییە پێکەوە بنێ کە پێکیەوەنا، بەڵکوو سەرەتا بیری لەوە کردەوە مزگەوتێك دروست بکا بتوانێ نوێژی تێدا بکا، بانگەوازی خۆی تێدا بڵاو بکاتەوە، هەموو ئارەزۆو هێواو ئاواتی ئەوەبوو ئیسلام لە کەشێکی هێدیو هێمنیدا بڵاو بکاتەوە، ئەمجار دەڵێ: پێغەمبەر لە هەموو هەڵسو کەوتێکیدا خۆ نەویست بوو (نوکرانی زاتی هەبوو) بە بەزەیی بوو هەرگیز بیری لە دەوڵەمەندی نەدەکردەوە، بەرژەوەندی ماددی خۆی نەدەویست قوربانی بە ماددەدا لە پێناو روحانیەتدا[1].

دوای ئەو هەموو رونکردنەوانە دەتوانین بڵێین: کە ژینامەی پێغەمبەر دوورە لە چاوو ڕاوو چاو بەست، بەڵکوو تۆمارێکی راستو دروستە، پڕە لە نموونەی رەوشتی بەرزو تابلۆی فیداکاری کە بەڵگەن لەسەر راستی

---

[1] سەیری کتێبی (حیاء محمد) بکە دانراوی واشتنجتۆن ئرفنج وەرگێڕانی دکتور عەلی حوسنی خەربوتلی – ٢١٦.

پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرو هەر کەسێ تۆزێ ویژدانی هەبێو حەق پەرستبێ دان بەم حەقیقەتەدا دەنێ!!

## ڕەنگدانەوەی ڕفتاری بەرزی پێغەمبەر لە هاوەڵانیدا:

ئەگەری پێنجەمك برێتییە لەوە کە بگوترێ موحەممەد توانیویەتی ڕیابازیو دوو ڕوییەکەی خۆی لە نزیکترین هاوەڵانی خۆی بشارێتەوە، ئەمەش ئەگەرێکە لە بەرامبەر ڕەخنەی زانستدا زۆر لە ئەگەرەکانی دیکە لاوازترە، چونکە مێژوو ئەوەمان بۆ ڕوندەکاتەوە کە هەموو خاوەن بیرو باوەڕێك چەند هاوەڵێکی هاوبیری هەن، کەسێك ئیدیعای بیرو باوەڕێك بەڕیابازیو دوروویی بکا دەبێ چەند کەسێك هەبن لە تەکیا یارمەتی بدەن بۆ گەییشتن بەو ئاواتانەو سودو قازانجەی دەستیان دەکەوێ بەشی بکەنو هەر کەسە بەشی خۆی هەڵبگرێ: دەی خۆمێژوو گەواهی ئەوە دەدا کە نزیکترین هاوەڵانی کە ئەبو بەکرو عومەرو عوسمانو عەلی بوون دواکۆچی خۆی یەك لە دوایەك بوونە جێنشینو هەمووشیان وەکوو پێغەمبەر دونیا نەویستو خۆ بەختکەربون لە ڕێگەی خوادا، هیچ کاتێك بەفەرمانڕەواییو دەسەڵاتداری لە خۆبایی نەبوون، ژیانی خۆیان نەگۆڕێ، بەڵکوو خۆیان بەخزمەتکاری گەل دەزانیو پۆشاکیان لەهی خەڵکەکە شڕ تربوو، خواردنو خۆراکیان لەوان کەمتربوو، شەوانە بە نوێژو خودا پەرستی ڕۆژیان دەکردەوە، ئەمە هاوەڵانی ئەوەش خێزانەکانی هەموویان نموونەی ڕەوشت بەرزیو دونیا نەویستی بوون، ئەو پەڕی خۆنەویستو خوداپەرست بوون، هەموویان تاکۆتایی ژیانیان بەو جۆرە بوونو، لەسەر ئەوحاڵە دونیایان بەجێ هێشتووە دەی کە ئەمە ژینامەی پڕشنگداری پێغەمبەر بێ ئیتر ڕیابازی لەکۆێدا هەیە، کامسەروەریو ڕەوشت بەرزییەك دەگاتە ئەم تۆمارە دەرەخشانە کە سەرمەشقی گشت خوویەکی شیرینە.

ئاشکراشــە کــە هــاوەڵو خێزانــەکانی پێغەمبــەر هــەموویان ئاگــاداری نهێنییەکانی پێغەمبەر بوون، ئەگەر تۆزقاڵێك گومانیان هەبوایە لە راستگۆیی ئەودا شوێنی نەدەکەوتن.

## پشتیوانیکردنی خودا لە پێغەمبەر (تأیید الله للرسول):

ئەگەری شەشەم: بریتییە لەوە کە بگوترێ: لەگەڵ ئەوەیشدا کە پێغەمبەر ریابازو دووڕوبوو خودا یارمەتی داوە!!

ئەمەشـیان ئەگەرێکـە لـە هـەموو ئەگـەرەکانی دی لاوازتـرەو بـێ بـنچو بناخەترە؟! چونکە کەی شتی وا هەیە کە خودا پشتیوانی ریابازانو بوختانکاران بکاو زاڵیان بکا بەسەر بیرو هۆشی خەڵکا؟! بەتایبەتی ئەو دووڕوو درۆزنانە ئیددیعای پێغەمبەرایەتی بکەن بەراستی ئەمە لە هەموو روداوێك خەتەرترە.

ئـەم گوتەیـەی (تۆمـاس کاریـل) گـەلێ راسـتە کـە لـە کتێبـی (الابطـال = پاڵەوانـەکان)ی خۆیـدا دەڵـێ: بێگومـان گـەورەترین شـەرمەزارییە بـۆ مرۆڤـە رۆشنبیرو شارەستانی لەم چەرخەدا کە گوێ رابگرێ بۆ قسەو قسەلۆکی ئەوانەی کە دەڵێن ئایینی ئیسلام درۆیەو موحەممەد تەفرەدەرو هەلاتبازبووە. بەراستی کاتی ئەوە هاتووە کە جەنگی قەلاچۆکردنی ئەم جۆرە قسە پڕو پووچانە بەرپابکەینو رەتیان بکەینەوە، چونکە بەرنامەی ئەو پێغەمبەرە تا ئێستاش چرایەکی پرشنگدارە ئەوە (١٤) سەدەیە بەردەوام هەموو کاتێ ئادەمیزادانەی کە وەکوو ئێمە خودا دروستی کردون!! ئایا یەکێك لە ئێوە گومان دەبا کە ئەم پەیامو بەرنامەیەی ئەم ملیون ملیونە خەڵکە بە درێژایی ئەو مێژووە بڕوایان پێ بووەو لەسەری مردوون درۆو دەست هەڵبەست چاوبەست بووبێ؟! بێگومان من هەرگیز بڕوام بەم بۆچوونە نییەو قەت رای واپەسند ناکەم! ئەگەر درۆو فێڵو ساختە ئەوەندە لای ئادەمیزاد رەواجی هەبێو ئاوا لای کۆمەلانی ئادەمیزاد وەربگیرێ بەلای منەوە ئەو ئادەمیزادانە هەموویان گێلو شێتنو ژیانیش

هەمووی هیچو پوچو بێ نرخو گومڕاییەو دەبوایە ئادەمیزاد دروست نەکرێ!!؟!
ئەمجار دوای ئەمە دەڵێ:

ئەرێ برایینە! ئایا قەت دیوتانە پیاوێکی درۆزن بتوانێ ئاینێك بێنێتەکایەوەو بلاوی بکاتەوە؟! بەراستی ئەمە سەیرە؟! چونکە بێگومان پیاوی درۆزن ناتوانێ خانوێك لە خشت دروست بکا، ئەو وەستایە ئەگەر ئاگاداری لە سروشتی تایبەتی خشتو گەچ قوڕدا نەبێو نەزانێ چۆن چۆن لێکیان دەدا بێگومان ئەوەی دروستی دەکا گردۆلکەیەکە لە کەرەستەو خشتو خۆڵ. بەڵێ ئەم ئایینە ئەگەر لەسەر درۆو دەلەسە هەڵبچندرایە شایانی ئەوە نەدەبوو کە (١٤) سەدە خۆ بگرێو بچێتە دڵو دەروونی ملیۆنەها ملیۆن ئادەمیزادەوە، دەبوو هەرزوو بڕوخایەو شوێنەواری نەمایە؟؟

## موحەممەد بەرنامەی پێغەمبەران دەچەسپێنێ:

ئەگەری کۆتایی ئەوەیە کە بگوترێ: محمد — گەرچی داواکەی لافو گەزاف بووە — بەلام بەرنامەیەکی چاکی داناوە، دەق لە چەشنی ئەو یاسانامە باشانەیە کە پێغەمبەران دایان مەزراندووە، ئەوەتا فەرمانی کردوە بە چاکەو نەهی کردوە لە خراپەو فەرمانی بەخودا پەرستی کردوە! ئەمەشیان ئەگەرێکە لە بەرامبەر رەخنەدا خۆناگرێ چونکە ئەمەش پێچەوانەی دەستوری بوونەوەرە، چونکە چۆن تەصەوور دەکرێ بگوترێ موحەممەد درۆ هەڵبەستەو لێشی چاوەڕوان بکرێ شەریعەتێکی وابێنێتە کایەوە، شەریعەتێك تا ئێستا لە باشیدا نموونەی نەبیستراوەو نەبیندراوە، ئاینێك کە بنەمای هەموو عەدالەتو هەموو پێویستییەکی پێشکەوتنی شارەستانیو مرۆڤایەتی لەخۆ گرتبێ!! بەڵێ ئەوەتا دکتور جۆستاف لوبون لە کتێبەکەیدا (حضارة العرب) دەڵێ: بنچو بناوانی رەوشتەکان لە قورئاندا گەلێ بڵندو پەسەندە، دەق لەچەشنی ئەوەی کە لە گشت کتێبە ئایینییەکانی بێشیندا هەبووە لەئەمیشدا ئاوایە.

ئـەمجار دەڵـێ: ئـەوەی شـك‌و گومـانی تێـدا نییـە كـە موحەممـەد لـەوڵاتی عەرەبدا دەستكەوتێكی بەدەست هێناوە كە ئاكامی وا لە هیچ كاتی لـە ئایینـەكانی پێش ئیسلامدا بەدی نـاكرێ لەبـەر ئـەوە نـاتونین فـەضل‌و پیـاوەتی موحەممـەد بەسەر عەرەبەكاندا سنوور دار بكەین چونكە چی بۆ بلێین هێشتا هەر كەمە.

لە شوێنێكی تردا دەڵێ: ئەگەر كرداری نایاب پێوەری گەورە پیاوان بێ، دەبـێ (محمد) لە هەرە گەورە پیاوە ناسراوەكانی مێژوو بێ.

بـەڵێ: وا هەنـدێ لـە زانـا خۆرئاواییـەكان بـەخۆدا چـونەوەو – هەرچـەندە دەمـارگیری ئـایینی كـوێری كـردون‌و مێـژوو نووسـانیان ددان بـە گـەورەیی ئـەو مرۆڤـەدا نـانین – بـەڵام وا ناچـار بـوون كـە ئیعـتیراف بـە فـەضل‌و گـەورەیی پێغەمبەر بكەن‌و ویژدان بەكار بێنن. زانای بەناوبانـگ (بارتلی سنت هیلر) دەڵـێ: بێگومـــان موحەممـــەد بلیمـــەتترین‌و زیـــرەكترین‌و بـــەدینترین‌و گـــەورەترین‌و دڵنەرمترین عەرەبی سەردەمی خۆی بووە، بێگومان گەییشتە پلـەی هـەرە بـەرزی دەسەڵاتداری‌و سەر كردایەتی بەهۆی زێـدە لێهـاتوویی خـۆی بـە سـەرعەرەبەكانی تـردا!! ئاشكراشـە ئایینەكـەی بـوو بـە نیعمـەتێكی گـەورە بـۆ هـەموو ئـەو گـەل‌و نەتەوانەی ئەو ئایینەیان قبووڵ كردوە.

ئەمـەی گـوترا كورتەیـەك بـوو لـەو راوو بۆچـوونانەی ویـستمان بەسـەر پێیەكەوە پوچەڵیان بكەینەوە، ئەو راوو بۆچوونە هەڵانـەی رەواجیـان پـێ دراوە لـە لایـەن ئەوانـەوە كـە ئینكـاری پێغەمبەرایـەتی موحەممـەدیان كـردوە. وەكـوو زانیتـان وا بەقـەدەر توانـا پلـەی زانیـاری‌و بلیمـەتی‌و واقیعـی حـاڵی حـەزرەتمان پێشكەشكردن بە جۆرێك كە هیچ كۆسپێك نـەماوە لەبەردەمماندا بـۆ ئـەوەی پـڕ بـەدەم هـاوار بكـەین كـە ئـەو زاتـە پێغەمبـەری خودایـەو رەوانـەكراوی زاتـی پەروەردگارە.

## بەشی بیستو هەشتەم:

# فەرموودەکانی پێغەمبەر - یا رێبازی پێغەمبەرایەتی - سەرچاوەی دووەمی شەریعەتی ئیسلامن

**پلەی فەرموودەکانی پێغەمبەر لە ئیسلامدا - بۆچی لەسەردەمی حەزرەتدا فەموودەکانی نەنووسرانەوە؟! - هەوڵدان بۆ فیت خستنە ناو فەرموودەکانی حەزرەتی موحەممەد - بەکارهێنانی شێوازی زانستییانە بۆ پاکژیکردن حەدیپ - سەند (رشتە)ی حەدیپ و جۆرەکانی - پلەی حەدیپو ئەندازەی راستی - رەخنە لە دەقی حەدیپەکان - بەناوبانگترین کتێبی بروا پێکراوی حەدیپ - را نماییکردنی حەدیپ بۆ ئەحکامە شەرعییەکان - حدیپ هەندێکی دەبێتە تەشریعو هەندێکیشی نابێتە تەشریع.**

## مانای حەدیث:

حەدیث برێتییە لە قسەکردنو هەواڵدان جا ئایینی بێ یان ئایینی نەبێ! دوایی مانایەکی تایبەتی وەرگرت کە بریتییە: لە فەرموودەی پێغەمبەر یان کردەوەی پێغەمبەر یان رازی بوونی پێغەمبەر بە کردارێك یان گوفتارێك کە بینیبیەتی یان بیستبیەتی رەزامەندی خۆی پیشاندابێ، یان موسوڵمانێك بۆی گیرابێتەوە.

## پلەی حەدیث لە ئیسلامدا (منزلة الحديث في الإسلام):

موسوڵمانان رایان لەسەر ئەوەیە کە حەدیث هەرکاتێ دەرکەوتو چەسپا کە قسەی پێغەمبەرەو فەرموودەی ئەوە، دەبێتە بەڵگەی ئایینیو بناخەی حوکمی شەرعیو پێویستە پەیڕەوی ناوەڕکی بکرێو بکرێتە سەرچاوەی شەریعەتو یاسای ژیان. قورئانی پیرۆز لە زۆر شوێندا ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە کە حەدیثی پێغەمبەر سەرچاوەی شەریعەتەو دەبێ بکرێتە بەرنامەی ژیان.. ئەوەتا دەفەرموێ:

{وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا - سورة الحشر – ٧}.

ئەوەی پێغەمبەر بەخشی بە ئێوەو پێی گوتن گورج وەری بگرن، ئەوەیشی نەیی لێکردن وازی لێ بێنن.. لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ:

{قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ، قُلْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَالرَّسُولَ فإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الْكَافِرِينَ - سورة آل عمران – ٣١- ٣٢}.

واتە: ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە خوداتان خۆش دەوێ، شوێن من بکەونو بەگوێرەی ئامۆژگاریی من رفتار بکەن خودایش ئێوەی خۆش دەوێ لە تاوانەکانتان خۆش دەبێ، پەروەردگار لێخۆشبوو بە بەزەییە، پێیان بڵێ: گوێڕایەڵی فەرمانی خوداو پێغەمبەربن، جا ئەگەر بە گوێیان کردی باشە خۆ ئەگەر پشتیان هەڵکرد، ئەوە مانای وایە کافرنو خودایش گرۆهی کافری خۆش ناوێن. لە ئایەتێکی تردا روبەڕوی پێغەمبەر خۆی حەزرەتی موحەممەد دەفەرموێ:

{وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ- سورة النحل – ٤٤}.

واتە: ئێمە ئەم قورئانەمان بۆ تۆ ناردووە کە گەنجینەی تۆماری یادگارە جوانەکانە، هەتا تۆیش بە رەفتارو بە کردارو بە گوتار ئەم یاسانامە جوانە بۆ ئەو خەڵکە رون بکەیتەوە. حەدیثی پێغەمبەر سەرچاوەی دووهەمە لە سەرچاوەی حوکمە شەرعییەکان جا چ حوکمی عەمەلی بن یان هی بیرو باوەڕ، پلەی حەدیث لە دوای پلەی قورئانە. حەدیث گرنگییەکی گەورەی هەیە دەربارەی تێگەیشتن لە مانای قورئانی پیرۆزو دەرخستنی ئەو حوکمانەی لەناو دەقەکانی دا پێچراونەوەو یاسا گشتییەکانی لەخۆیان گرتووە، رانومایی کردنی راڤەکەرانی قورئان بۆ زۆر مانای وا ئەگەر بەهۆی فەرمودەکانی پێغەمبەرەوە نەبوایە ماناکانیان نەدەزاندران، بێگومان ژمارەی ئایەتەکانی قورئان نزیکەی شەش هەزار ئایەتە دووسەد ئایەت پەیوەندییان بە حوکمە شەرعییەکانەوە

هەیە، بەڵام ژمارەی ئەو حەدیثانەی حوکمی شەرعییان لەخۆ گرتووە دەگاتە نزیکەی چوار هەزار حەدیث.

حەدیث حوکمە شەرعییەکانی قورئان بەیان دەکا، حوکمە موجمەلەکان شی دەکاتەوە، ئەو ئایەتانەی ماناکەیان موشکیلەو نازانرێ ماناکەیان رون دەکاتەوە، حوکمێك گشتی بێ، تایبەتمەند (تخصیص)ی دەکا، حوکمی رەها (مطلق)، سنووردار (تقیید)ی دەکا.. بۆ نموونە قورئان پاك، خاوێنی بەمەرج داناوە بۆ دەستکردن بە نوێژ، ئەمە حوکمێکی موجمەلە، حەدیثی پێغەمبەر ئەم حوکمە موجمەلەی شی کردۆتەوە، شێوەی پاكو خاوێنی بەئاو یان بە تەیەمموم کردن رونکردۆتەوە. قورئان نوێژکردنی فەرز کردوە بەڵام کاتو ژمارەی نوێژەکانو رکاتو چۆنیەتی کردنی روکوعو سوجدەو تەحییاتی باس نەکردوە ئەمەش حوکمێکی موجمەلە حەدیثی پێغەمبەر هەموو ئەم شتانەی بە گوفتارو کردار رون کردۆتەوە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پێش نوێژی بۆ موسوڵمانان دەکردو دەیفەرموو من چۆن نوێژ دەکەم لەبەرچاوی ئێوە ئێوەش ئاوا نوێژ بکەن.

قورئانی پیرۆز لە زۆر ئایەتدا باسی زەکاتی کردوە بەڵام بە درێژی باسی زەکاتو ئەندازەی زەکاتی نەکردوە حەدیثی پێغەمبەر هاتووە ئەم مانا موجمەلەی شی کردۆتەوە، بە دوورو درێژی ئەوشتانەی زەکاتی لێ دەکەوێو ئەندازەی زەکات لە هەرمیەکێ لەو شتانەداو چۆن بدرێو چۆن وەربگیرێ باس کردوە!

بەم نموونانە کۆتایی بەم باسە دێنینو چیدی درێژەی پێ نادەین! هەروەها پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) زۆر روداوی تووش دەهاتن، گەلێك پرسیاری ئاراستە دەکران، زۆر لە بارەی شەڕو ئاشتییەوە، لە بارەی کڕینو فرۆشتنەوە روداو دەهاتنە پێشەوە، بۆ هەندێکیان حوکمی قورئان هەبوو ئایەت دەهاتە خوارێ بۆ هەندێکیشیان نەبوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەربارەی ئەوشتانە فەرموودەی دەفەرموون، ئامۆژگاری دەکردو حوکمی بەیان دەکرد، لەم رووەوە بۆ ئەم جۆرە

کارو روداوانـه حـەدیـث تاکـه سەرچـاوەیەو زانایـانی شـەرع پـشتیان پـێ بەسـتووە لەبەر ئەم هۆیانە گرنگی پێدان بە حەدیث پێویست بوو.

## بۆچی لەسەردەمی پێغەمبەردا حەدیث تۆمار نەکرا؟

لەسەردەمی پێغەمبەردا حەدیث نەنوسرایەوە، وەکـوو نووسـینەوەی قورئـان، ئـەوەتا دەبیـنین، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) چـەند نووسـەرێکی دیـاری کردبـوو بـۆ نووسینەوەی قورئان، هەر کە ئایەتەکە دەهاتە خوارێ فـەرمانی بـە نووسـینەوەی دەکرد بەڵام نووسەری دانەنابوو بـۆ نووسـینەوەی حـەدیـث، بەڵـکوو حـەدیثـی وا هەیە نەهی دەکا لە نووسینەوەی حەدیث، حیکمەتی نەنووسـینەوەکەش بـۆ ئـەوە دەگەڕێتەوە کە ترسی ئەوە هەبوو حەدیثو قورئان تێکەڵاوبن!

دوای کۆچکردنی پێغەمبەرو دونیا بەجێ هێشتنی پەڕاوێکی نووسراوەو ڕێـکو پێـک کـراو کـە قورئانــە لەبــەر دەســت موســوڵمانان دا هــەبوو، حــەدیثــەکـانی پێغەمبــەریش لــە ســنگی خەڵــکدا پــارێزرابوونو موســوڵمانان دەمــاو دەم دەیانگێڕایەوە! جا ئەگەر روداوێک روی بدایـەو حوکمەکـەی لـە قورئانـدا نەبوایـەو برێ هاوەڵانی پێغەمبەر بیانزانیایە کە هەمان روداو سەدەمی پێغەمبەر روی داوەو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەجۆرێک هـەڵسو کـەوتی لەگەڵـدا کـردوە ئـەو حـەدیثـەی دەگێڕایەوە، هەروەها هاوەڵان بیرەوەری خۆیان لەگـەڵ پێغەمبـەردا دەگێڕایـەوە کـە چۆن فلان ڕۆژ ئامۆژگاری کـردون، لـە فـلان غـەزادا چی فـەرمووەو لـە فـلان ڕۆژدا دەربارەی فلان شت چی گوتووە.

## هەوڵدان بۆ شێواندنی حەدیث (محاولة الدس على الحديث):

هـەر بـەهۆی نەنووسـینەوەی حـەدیـث لـە پـەڕاوێکی تایبەتیـدا لەسـەردەمی حەزرەتدا یان سەردەمێکی نزیـک بـەو سـەدەمەو پـشت بەسـتنیان بـە بـیرەوەریو

(ذاكــرة)و زۆرىو بــەرفراوانى ئــەو هــەموو فــەرموودەو روداوانــەى پێغەمبــەر بينيــونىو هەڵوێــستى بەرامبــەريان نوانــدووە لــە مــاوەى پێغەمبەرايەتييەكــەدا، هەندێ هەلپەرستو نەفس نزم هاتن لە خۆيانەوە قسەو قسەلۆكيان هەڵبەستنو وتيان ئەمانە قسەى پێغەمبــەرنو حــەديثن؟! واش دەردەكــەوێ كــە ئــەم حاڵەتــە سەردەمى پێغەمبەريش بووبێ! بۆيە دەفەرموێ: (من كذب علي متعمدا فليتبوأ مقعده من النار).

واتە: كەسێك درۆ بە زوبان منــەوە بكا بــا جێگــاى خــۆى لــە دۆزەخــدا خــۆش بكا؟! جا لە كاتێكدا لە سەردەمى پێغەمبەر خۆيدا درۆيان بەدەمەوە هەڵبەستبێ، ديارە دواى وەفاتى خۆى حەديث هەڵبەستن بەدەميەوە زۆر ئاسانترە!

ئەمجار كە فتووحاتى ئيسلامى ئــەنجام دراو ژمارەيــەكى زۆر لــە نەتــەوەكانى فارسو رۆمو بەربەرو ميصرىو سورى.. هتد موسوڵمان بوونو هاتنە ژێر سايەى ئيسلامەوە، لەوانە هى وا هەبوو موسوڵمان بونەكەيان هەر بە زوبــان بــوو، ئيمــان نەچوبووە ناو دڵيانەوە، ئيتر حەديث هەڵبەستنو درۆكــردن بــەدەم پێغەمبــەرەوە پەرەى سەندو زۆر بوو! ئەم حەديثە دانراوو هەڵبەســتراوانە هــەموويان گــومراهى بوون، سەرى لە موسوڵمانان دەشێواند هەموويان باسى چونيەتى خــوداو لێچونى لەشتى تــرو گۆڕينى حوكمە شــەرعييەكان بــوو! هــەر ئــەم بەڵــگەيە بەســە لەســەر زۆرى حەديثــى دەســت هەڵبەســت، ئــەو حەمكــە حــەديثــەى كــە باســى راڤــەكردنى قورئان دەكەن... دەڵێن: ئەحمەدى كوڕى حەنبەل لە بارەيەوە فەرموويەتى: هيــچ كامێ لەمانە بەلاى منەوە نەگەيونەتە پلەى حەديثى صحيح.

ئيمامى بوخارى لە صــەحيحى بوخاريــدا كــە كــۆى كردۆتــەوەو حــەديثــەكانى گەيشتونە حەوت هەزار حەديثو نزيكەى سێ هەزار حــەديثــى دوبــارەن، دەڵــێن: ئيمام ئەم حەوت هەزارە حەديثەى لەناو شەشصەد هەزار حەديثــدا هەڵبــژاردووە كە لەو سەردەمەدا بەسەر دەمو زوبانى خەڵكەوە بوون. ئاشكراشە كە ئەوەى بوو بە هاندەرى حەديث هەڵبەستەكان بۆ حەديث هەڵبەستن چەندشتێك بوو.

یەکەم: کێشەی رامیاری، کێشەی نێوان حەزرەتی عەلی و موعاوییەو کێشەی نێوان عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرو عەبدولمەلیك، ئەمجار کێشەی نێوان ئەمەوی و عەباسی، هەموو ئەمانە بوونە هۆی سەرەکی بۆ حەدیث دانان هەرکەسە تاقمێکی خۆش دەویست و کۆمەڵە حەدیسێکی لە مەدح و سەنایاندا هەڵدەبەست و زێدە رێزی دەدانێ، هەر بەم جۆرەش ئەو حەدیث هەڵبەستانە هاتن چەند حەدیثیان بۆ رێز لێنان لە نەتەوەی عەرەب و هۆزەکانی و پێدا هەڵدانیاندا دانان، ئەم هۆزانەش لەناو خۆیاندا کێشەو نیزاعیان هەبوو لەسەر خەلافەت و فەرمانڕەوایی و شانازی کردن بە خۆیان، باشترین رێگایەك کە پێیدا بگەنە ئامانجی خۆیان حەدیث هەڵبەستن بوو، هەر کەسە بە ئارەزۆی خۆی و بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی بە گوێرەی بەرژەوەندی حەدیثی هەڵدەبەستن درۆی سەریەك دەنان، هەروەها حەدیثیان دادەنان بۆ شاروشارۆچکەو دەڤەرو وڵات. بە جۆرێك شارێکی گەورە نییە چەند حەدیسێکی لە فەضل و رێزیدا دانەنرابن.

دووەم: کێشەی بیرو باوەڕ دەربارەی زاتی پەروەردگار (علم الکلام) کێشەی نێوان زانایانی شەرع، بۆ نموونە زانایانی عیلمی کەلام دەربارەی قەزاو قەدەر جەبرو ئیختیار کێشەیان هەیەو هەریەکەیان رایەکی هەیە، دەیەوێ رایەکەی خۆی دەرکەوێ، لەبەر ئەوە رێگایان بە خوداوە کە پاڵپشتی رێبازو مەزهەبەکەی خۆیان بکەن بۆ ئەم مەبەستەش چەند حەدیسێکی هەڵبەستراویان هێناوەتەوەو دایاناوە! لەهەموو باسێکی فیقهیدا حەدیسێك پاڵپشتی ئەم مەزهەب و رێبازە دەکاو حەدیسێکی تر پاڵپشکی رێبازەکەی تر دەکا.

سێیەم: هەبوونی هەندێك لەو بەناو مەلاو خوێندەوارانەی کە خزمەتچی دەرباری خەلیفەو پادشایان بوون، ئەمانە بەگوێرەی ویستی ئەو خەلیفەو لێپرسراوانە حەدیثیان هەڵبەستوون و خەڵکیان بۆ هەڵخەڵاتاندون.

چوارەم: سافیلکەیی بڕێ لە زانایانی ئیسلام لە باسی ئەخلاق و رەوشت و ترساندن و دڵخۆشکردن (الترهیب والترغیب)و ئەو جۆرە شتانەی کە نابنە هۆی

حەڵاڵکردنی شتێکی حەرام یان حەرامکردنی حەڵاڵ ڕێگەیان بەخۆ داوە لەم جۆرە باسانەدا حەدیث هەڵبەستن، ئیتر هاتوون کتێبەکانی حەدیثیان پڕ کردوە لە باسی گەورەیی هەندێ کەس و هۆزو شوێن هەروەها گەورەیی هەندێ لە سوورەتەکانی قورئان و ئایەتەکانی قورئان، وەکوو ئەو حەدیثانەی کە لە ئەبو عیصمەی نوحی کوڕی ئەبو مەریەم گێڕدراونەوە، دەڵێن: چەندەها حەدیثی بەدرۆ هەڵبەستوون دەربارەی گەورەیی قورئان و سورەتەکانی. دەڵێ: هەرکەسێك سورەتێك بخوێنێتەوە ئەوەندەو ئەوەندەی خێر دەگاتێ، بە زۆری ئەم جۆرە حەدیثانە لە کۆتایی سورەتەکاندا لە تەفسیری بەیضاوی و تەفسیری خازندا بەدی دەکرێن و نووسراون، هەروەها نموونەی ئەم جۆرە حەدیثانە لە کتێبەکانی ئەخلاق و صوفیگەری و کتێبەکانی تەرغیب و تەرهیبدا ئەوەندە زۆرن ناژمێردێن!!

## پشت بەستن بەشێوازی زانستی بۆ پاڵفتەکردنی حەدیث:

ئەم بێ سەرو بەری و کەس لە کەسییە دەربارەی حەدیثەکانی پێغەمبەر کۆمەڵێك زانای لێهاتوو ڕاستگۆی ئیسلامی هۆشیار کردەوەو هەڵینان کە لێ ببڕێن بۆ پاڵفتەکردنی حەدیث لەو درۆو دەلەسانەو هەڵاواردنی چاك لە خراپ، بۆ ئەم مەبەستەش چەند ڕێبازێکی زانستیانەیان گرتە بەر، کە ناگۆنجێ لەگەڵ پەیڕەوکردنی ئەو جۆرەڕێبازو یاسایانەدا گاڵتە بازاڕی و حەدیث دروستکردن ئەنجام بدرێ!.

دکتور ئەسەد روستەم[1] لە پێشەکی کتێبەکەی دا (مصلح التأريخ) زاراوەکانی مێژوو دەڵێ: (ئەو قەواعیدو یاسایانەی زانایانی زانستی حەدیث پێش ئەو هەموو سەدەو چەرخانەی رابوردو دایانناون بە مەبەستی گەیشتن بە ڕاستی لە حەدیثدا چوونە بنج و بناوانی حەدیثەکان لە هەموو رویەکەوە! لە ناوەڕۆکدا لەگەڵ ئەو

---

[1] یەکێك بووە لە پسپۆڕانی مێژوو لە دانشکای ئەمریکی لە بێروت.

یاساو نیزامانەدا دەگونجیٚو یەك دەگرنەوە کە زانا ئەوروپییەکان دایان ناونو ناویان لیٚ ناون زانستی مثودولوجی[٢].

خۆ ئەگەر مێژوو زانەکانی ئەوروپا لە چەرخەکانی ناوەڕاستو تازەدا کتێبو دانراوی زانایانی زانستی حەدیث (علماء الحدیث) یان بدیبایە ئەوەندە لە دانانی زانستی مثودولوجی دوانەدەکەوتن، هەتا چەرخی هەژدەهەم ئەم زانستییەیان لیٚ هۆن نەدەبوو! بە کورتی دەتوانین بە زانا خۆر ئاواییەکان بڵێین: ئەو زانستییەی کە ئێوە شانازی پێوە دەکەنو پێتان وایە تێیدا پێشڕەون، ئەوە لە وەڵاتی ئێمە زۆر زوو سەری هەڵدادوەو لەسەر دەستی زانایانی حەدیث گەشەی کردوە.

یەکێك لەو رێبازە زانستییانەی کە زانایانی حەدیث پەیڕەوییان کردوە ئەوەبوو ئەو کەسانەی کە لەناو رشتەی گێڕانەوەی حەدیثەکەدا ناویان دەهات، یەك بەیەك دەگەڕان بەدوای زانینی ناوو باسو خواسیاندا، جا ئەو کەسانەی کە بڕبڕەی فەرموودەکەیان بەڕیز لە یەکترەوە دەگێڕایەوە دەبوو ناوی یەکتریان دیاری بکردایە، بەمەیش دەگوتریٚ: (الاسناد = رشتە) یان (السند) واتە: بەڵگە لەسەر راستی گێڕانەوەکە!

هەر کەسێك حەدیسێکی بگێڕایەوە دەبوایە بڵیٚ: من لە فلاٚن کەسم بیستووە یان فلاٚن کەس بۆی گێڕامەوە ئەویش لەفلاٚن کەسەوە ئەویش لە فلاٚن کەسەوە.. هتد. بەم جۆرە زنجیرەی حەدیث گێڕەوەکان دەڕوا تا دەگاتە سەرچاوەی یەکەم، ئەمە بۆ هەموو حەدیسێك ئەمەیان کردوە، جا بۆ ئەوەی زنجیرەی حەدیث گێڕەوەکان ببشکنن ئەو پەڕی هیلاکیو خۆماندوو کردنیان تەحەممول کردوە بۆ

---

[٢] مثودۆلوجی: واتە: زاراوە تاریخییەکان - ئەو زانستییەی کە لەسەر چوونە بنجو بناوانی رووداوەکان هەڵدەستیٚ بۆ بشکینو دەرخستنی راستییە رووداوە مێژووییەکانو رەخنە گرتن لەو شێوە ئاکارەی کە لە کۆندا مێژووی پیٚ نەقڵ کراوە بۆ ئێمە.

ئەوەی بزانن کێ لەو حەدیث گێڕەوانە لەکەدارو درۆزنو گێژو بێ سەلیقە بووە، ئەمەش پێویستی بە زانینی ژینامەی حەدیث گێڕەوەکانو لێکۆڵینەوەی رەوشتیان، جیاکردنەوەی پلەی هۆشو سەلیقەو زانیاریو بەدینیان هەیە، هەر لەبەر ئەمە زانستی ژینامە (علم التراجم)یان بەدی هێناوە کە پێی دەڵێن: زانستی زەدەکاریو راستکاری (علم الجرح والتعدیل) بۆ لێکۆڵینەوە لە حاڵو چۆنیەتی حەدیث گێڕەوەکانو زانینی شوێنو کاتی ژیانیان، کامەیان لەگەڵ کامەیان ناسیاوی هەبووە هاوچەرخ بوونو بگونجێ کە یەکتریان بینیبێ!

هەروەکوو چۆن بە وردی لە حەدیث گێڕەوەکەیان کۆڵیوەتەوە ئاخۆ راستگۆیە یان درۆزنە، تا چ ئەندازەیێك وردو ئەمینو زمانپاكو راستیخوازبوون لە گێڕانەوەی حەدیثەکەدا تا حوکم بکەن بەوەی ئاخۆ کامەیان دڵنیایە لە گێڕانەوەکەی دا، بۆیە حەدیثیان لە حەدیث گێڕەوە (الراوي) وەرنەدەگرت هەتا بۆیان رون نەبوبایەوە کە پلەیەکی بەرزی هەیە لە راستگۆییو بەدینیو ژینامە پاکیدا! هەروەکوو چۆن بە کەمترین گومانو شوبهە لە ژینامەی شەخصی حەدیث گێڕەوەکە حەدیثەکەیان بە لاواز (ضعیف) دادەنا! خۆ ئەگەر گومانیان پەیدا بکردایە لە راستگۆیی حەدیث گێڕەوەکەو بیانزانیایە کە لە شتێکا درۆ دەکا یەکسەر حەدیثەکەیان رەت دەکردەوەو بە هەڵبەستراوو (مەوضوع)یان حسێب دەکرد. با لەوە پێشیش لە گێڕانەوەی حەدیثدا درۆی لێ نەبیسترابێ.

لەم رووەوە ئیمامی مالیکی کوڕی ئەنەس کۆچکردوی ساڵی (١٧٩ ه) دەفەرموێ: عیلم — واتە: حەدیث — لە چوارکەس وەرناگیرێ!

یەکەم: گێلو بێ عەقڵ.

دووەم: کەسێك هیواو هەوەسێکی ببێ خەڵك بانگ بکا بۆ دابینکردنی ئەو هیواو ئاواتەی خۆی.

سێیەم: درۆزنێك درۆ لە قسەی ئاسایی دا بکا با لە گێڕانەوەی حەدیثی پێغەمبەردا راستگۆیی خۆی چەسپاندبێ.

چوارەم: پیرو کەنەفتێك – هەرچەندە بەدین بێ‌و فەزڵ‌و تەقوای هەبێ بەڵام نەزانێ چ دەگێڕێتەوە، لەبەر پیری ئاگای لەبەرو دوای قسەکانی خۆی نەبێ.

هەروەها زانایانی حەدیث لە ئەندازەی زیرەکی‌و زەین ساغی هەموو حەدیث گێڕەوەیەك سەرنجیان داوە، بڕێ گێڕاوەیان بەرامبەری بە بڕێکی تری کردوە ئەگەر هەڵەی زۆریان تێدا بەدی کردبێ یان هەستیان کردبێ کە زەین‌و حیفظی تەواو نییە حەدیثەکانی ئەو کەسەیان بە لاواز (ضعیف) داناوە – با لەککە لەکەسایەتی‌و راستگۆییدا نەبێ: بەڵام هەر لەترسی ئەوەی نەبادا زەینی خیانەتی لێ کردبێ حەدیثەکەیان بە زەغیف‌و پوچەڵ داناوە. لەلایەکی ترەوە زانایانی حەدیث داوایان لە حەدیث گێڕەوە کردوە کە حەدیثەکە بەدەقی بگێڕێتەوە، هیچ وشەو رستەی لێ نەگۆڕێ! لەم بارەوە دکتور ئەسەد رەستەم دەڵێ: ئەمە رێزداریەکی زانستییە لە رێزداریەکانی زانایانی حەدیث، ئەوانە یەکەم کەسن کە داوای دەستپاکی‌و زمانپاکی‌و راستییان کردوە لە گێڕانەوەی حەدیثداو گەڕان‌و پشکنین‌و بۆ دۆزینەوەی دەقە ئەصڵییەکەیان بە ئەرکێکی پیرۆزو پێویست زانیوە، تەنانەت هەندێ لەو زانایانە بەلایانەوە وابووە کە ئەگەر هەڵەیەك یان زمانخوارییەك لە دەقەکەدا هەبوو نابێ راست بکرێتەوە بەڵکوو وتوویانە: دەبێ لە پەراوێزا ئاماژەی بۆ بکرێ.

خوێنەری هێژا ئەمەی گوترا ئەو جۆرە یاساو بەرنامەیەیە کە زانایانی حەدیث لە چەرخە سەرەتاییەکانی کۆچیدا پێی گەیشتوون‌و کاریان پێ کردوە! وا ئەمڕۆ مێژوونووسانی هاوچەرخ پەیڕەوی هەمان رێباز دەکەن.

ئابەو جۆرە زانایانی زانستی حەدیث یاساو قاعیدەی زانستییان داناوە بۆ وەرگرتن‌و پەسەندکردنی حەدیث بە جۆرێك کە تاکو ئەمڕۆش ئەو یاسایانە راسترین قاعیدەن بۆ چەسپاندنی روداوی مێژوویی‌و پلەی هەرە بەرزی زانستی‌و وردەکارییان تێدا رەنگ دەداتەوە.. ئەمجار ئەو زانایانەی دووایی هاتوون هەرچی حەدیسێکیان دیوە کۆیان کردۆتەوەو تۆماریان کردوە، زۆر جاریش هێزو پێزی

حەدیثەکە: راستە، درۆیە، صەحیحە، زەعیفە – ئاشکرایان کردوە، هی واشیان هەبووە هەر حەدیثی صەحیحی لە کتێبەکەی دا تۆمار کردوە: وەکوو بوخاری‌و موسلیم، هەندێکیشیان حەدیثی درۆو هەڵبەستراویان لە کتێبەکانیاندا تۆمار کردوە بۆ ئەوەی خەڵکی بیانزانیێ‌و خۆیانیان لێ دوور بخەنەوەو کاریان پێ نەکەن، هەروەها هەرچی پێیان گەییشتووە لەناوی حەدیث گێرەوەکان بنەچەو رەچەڵەك‌و چۆنیەتی ژیانیان تۆمار کراوە تا لێکۆڵەرەوەکان کەرەستەی باشیان لابێ، هەرکاتێ ویستیان لە راستی‌و دروستی حەدیثەکان بکۆڵنەوە، لەم بارەوە کتێبی گەورەو بەرفراوانیان داناوە، سەدان بەڵکوو هەزاران جڵدی قەبارە گەورەیان نووسیونەوە بە جۆرێك کە لای هیچ گەل‌و نەتەوەیەك کەمێك لەو کەلەپوورە نابیندرێ!

## سەنەدی حەدیث‌و جۆرەکانی:

زانایان فەرموودەکانی پێغەمبەریان بە گوێرەی سەنەدەکان دابەشکردوە بۆ ئەم بەشانە.

یەکەم: حەدیثی موتەواتەر: ئەو حەدیثەیە کە کۆمەڵێك لە ئادەمیزادان بیگێرنەوە بە جۆرێك کە نەگونجێ‌و عەقڵ بۆی نەچێ کە لەسەر درۆیێك هاتبن، ئەوانیش لە کۆمەڵێکی وەك خۆیان بیستبێ ئەوانیش هەروا تا دەگاتە سەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ).

حەدیثی موتەواتەر دەبێتە دوو بەش:

**بەشی یەکەم:** ئەوەیە بە لەفظو مەعناوە تا دەگاتە سەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کۆمەڵ لە کۆمەڵی بیستبێ ئەم جۆرە زۆر کەمە.

**بەشی دووەم:** ئەوەیە ماناکەی موتەواتەر بێ، باوەکوو وشەکانی گۆڕانکاری تێدا کرابێ.. وەکوو ئەو حەدیثانەی کە ژمارەی نوێژو رکاتی نوێژەکان دیاری دەکەن. شایانی باسە زانایان زۆر کتێبیان لە بارەی حەدیثی مەوتەواتەردا داناوە

دواترینیان زاناو حەدیث زانی گەورە (محمد جعفر الكتابی)یە کە کتێبێکی داناوە ناوی ناوە (نظم المتناثر في الحديث المتواتر) کە پێنج سەد حەدیثی لەخۆ گرتووە.
دووەم: حەدیثی مەشهوور: بەو حەدیثە دەگوترێ کەسێ موسوڵمانی دادپەروەر یان زیاتر بیگێڕنەوە بە (لەفظ و مەعناوە) ئەم جۆرە حەدیثە زۆر زۆرە.
سێیەم: حەدیثی عەزیز: ئەوەیە دوو موسوڵمان بیگێڕنەوە.
چوارەم: حەدیثی ئاحاد: ئەوەیە یەك کەس بیگێڕێتەوە.

## پلەکانی فەرمودەی پێغەمبەر (د.خ):

زانایان حەدیثیان لەبارەی راستیو زەعیفییەوە کردۆتە سێ بەش:

**بەشی یەکەم:** حەدیثی صەحیح: بەو حەدیثە دەگوترێ کە هەڵەی تێدا نەبێ لە ئیسنادیشیا عیلەلو ناڕێكو پێکی نەبێ، موسوڵمانێکی عادڵو بڕوا پێکراو لە یەکێکی وەکوو خۆیەوە ئەویش لە یەکێکی وەکوو خۆیەوە تا دەگاتە کۆتایی گێردرابێتەوە.

**بەشی دووەم:** حەدیثی حەسەن: بەو حەدیثە دەگوترێ کە لە ئیسنادەکەیدا راویەکی گومان لێکراو بە درۆزنی تێدا نەبێ، بەڵام لە راوییەکانیدا کەسێکی تێدابێ کە رەخنەی لەسەر بێ جا رەخنەکە دەربارەی زەینساغی (حفظ) یان وریایی (ضبط) بێ! هەر بەو شێوە راوییەکانی تریشی بە درۆزن حسێب نەکرابن، بە جۆرێك کە رەخنەگری حەدیث لەبەر وا گومان بەرێ کە ئەو حەدیثە بنەمایەکی دیاری هەبێ.

سێیەم: حەدیثی زەعیف: بەو حەدیثە دەگوترێ: کە گومانی لێ بکرێ بەوە کە لەمەتنی حەدیثەکەدا یان یەکێ لە زنجیرەی ئیسنادەکەیدا کەسێکی وا هەبێ بڕوا بەگێڕانەوەکەی نەکرێ، یان گومانی لێ بکرێ بە جۆرە بێدینی (بیدعەت)ێك. بەڵام ئەو حەدیثەی کە بە درۆ حسێب دەکرێ بە حەدیثی (موضوع) هەڵبەستراو دادەنرێ.

## ڕەخنەگرتن لە دەقی حەدیث (نقد نص الأحاديث):

زانایانی زانستی حەدیث ڕەخنەکانیان هەر دەربارەی سەنەدو وردبوونەوە لە ڕاستیو دروستی سەنەدەکە نەبووە، بەڵکوو دەقی حەدیثەکانیشیان خستۆتە بەر ئاوێنەی ڕەخنەو چەند قاعیدەو یاسایەکیان داناوە بۆ ڕەخنەگرتن لە حەدیث کە هیچ نرخو هێزێکی لەم یاساو قاعیدە سەردەمانەی کە ئەمڕۆ بۆ نەقدییان داناوە کەمتر نییە. بێگومان (شاه عبد العز) ئەم یاساو قاعیدانەی کورت کردۆتەوە لە کتێبی (العجالة النافعة)دا تۆماری کردون لەوێدا ئەو حەدیثانەی کە وەرناگیرێنو ڕەت دەکرێنەوە دەست نیشان کراون ئەویش ئەمانەن:

١- هەرکاتێ حەدیثەکە لەگەڵ ڕووداوێکی مێژوویی چەسپاودا یەك نەگرێتەوە.

٢- ئەگەر حەدیث گێڕەوەکە بێدین بوو حەدیثەکەشی تانەی لەیەکێ لە صەحابە دەدا، یان حەدیث گێڕەوەکە لە کۆمەڵەی لەڕی دەرچون (الخوارج) بێو حەدیثەکەشی تانە لە خانەوادەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بدا، هەر کاتێ حەدیثەکە بە سەنەدێکی بێ لایەن پاڵپشت کرا حەدیثەکە دەبێتە مەقبوول.

٣- هەرکاتێ حەدیثەکە یەك کەس گێڕابوویەوەو ناوەڕۆکی بریتی بوو لە فەرمانێك کە هەموو موسوڵمانێك پەیڕەوی بکا! چونکە کارێکی وا گرنگ نابێ هەرەیەك کەس بیستبیەتی!

٤- ئەگەر ڕواڵەتی حەدیثەکە خۆی ئەوەی دەگەیاند کە درۆبێ!

٥- هەرکاتێ ناوەڕۆکی حەدیثەکە لەگەڵ عەقڵو هۆشی ساغو تەعلیماتە ئیسلامییەکاندا ڕێك نەکەونو یەك نەگرنەوە.

٦- هەر کاتێ حەدیثە گێڕادروەکە یەك کەس بیگێڕێتەوەو حەدیثەکە دەربارەی روداوێك بێ — ئەگەر ڕاست بێ — دەبوایە زوربەی خەڵك بیزانیایەو زۆر کەس بیگێڕایەوە.

٧- هەرکاتێ ناوەڕۆکی حەدیثەکە ئەوەندە پڕو پووچو بێ کەڵك بێ لەگەڵ گەورەییو پلەو پایەی پێغەمبەردا نەگونجێ! یان وشەکانی ئەوەندە ناڕەوانو خوارو خێچ بن لەگەڵ ڕەوانبێژیو خۆشخوانی پێغەمبەردا نەگونجێ.

٨- هەرکاتێ حەدیثەکە سزایەکی گەورە دابنێ بۆ تاوانێکی بچکۆلە! یان پاداشتێکی گەورە دابنێ بۆ چاکەیەکی بچکۆلە.

٩-هەرکاتێ حەدیثەکە باسی پێغەمبەرەکانی پێشوو بکاو بڵێ ئەوان پاداشی چاکەی خەڵك دەدەنەوە.

١٠- هەرکاتێ حەدیث گێڕەوەکە بۆ خۆی دان بەوەدا بنێ کە درۆی کردوە.

## ئەو سەردەم و رۆژگارەی حەدیثی تێدا نووسرایەوە:

سەردەمی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) و سەردەمی جینشینەکانی و بەشێکی سەردەمی ئەمەوییەکانیش تێپەڕی، هێشتا حەدیث هەر دەماو دەم دەگێڕدرایەوەو نە نووسرابووەوە، کاتێ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بوو بە جێنشین ئەم خەلیفە خواناسە بەڕێزە، فەرمانی بە لێپرسراوی مەدینەکرد کە حەدیث کۆبکاتەوە، ئیمامی بوخاری لە کتێبەکەیدا (صحيح البخاري) لە بەشی – العلم –دا دەفەرموێ: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نامەی نووسی بۆ ئەبو بەکری کوڕی حەزم و پێی فەرموو: تەماشاکە چی فەرموودەی پێغەمبەر هەیە گشتی بنووسەوە، تا نەفەوتێ، چونکە من مەترسی ئەوەم هەیە کە بەرە بەرە ئەم زانستە کوێر بێتەوەو زاناکانیشی بەرودوا نەمێنن، جا ئەگەر زانیمان کە خەلافەتی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لە ساڵی (٩٩)ی کۆچییەوە دەست پێ دەکاو ساڵی (١٠١)ی کۆچی کۆتایی پێ دێ، ئەوە دەگەینە ئەو ئاکامە کە سەرەتای نووسینەوەی حەدیث ساڵی (١٠٠)ی کۆچی بووە. جا وەنەبێ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز هەر بەو نامە نووسینەی کە بۆ لێپرسراوی مەدینەی نووسی وازی هێنابێ بەڵکوو مێژوو ئەوەی بۆ چەسپاندوین کە نامەی بۆ هەر چوار دەوری خۆی و بۆ هەموو وڵاتێکی موسوڵمان نشین نووسی و داوای لێکردن کە حەدیث بنووسنەوەو کۆی بکەنەوە.

## بەناو بانگترینی کتێبە بڕواپێکراوەکانی حەدیث:

وەکوو زانیمان لە سەرەتای سەدەی دووەمی کۆچییەوە دەست کرا بە حەدیث نووسینەوە، بەناو بانگترین کتێب کە حەدیثی تێدا کۆکرابێتەوە لە سەدەی دووەمی کۆچی دا کتێبی (الموطأ)ی ئیمام مالیکە کە ساڵی (١٧٩)ی کۆچی لە دونیا دەرچووە! ئەمجار لەوەدوا نووسینەوەی حەدیث زۆر گرینگی پێدرا، لە ناوەڕاستی ئەو سەدەیەدا زۆر کەس خۆی بۆ تەرخان کرد، بەڵام نووسینەوەی حەدیث‌و گرنگی پێدانی وەکوو زانیاریەکی سەربەخۆو بەشبەش‌و ڕێکخراو تا سەدەی سێیەم دەستی پێ نەکرد!

کتێبی حەدیث زۆرن گەورەترو بەناوبانگترو صەحیح ترو بڕوا پێکراوتر بەلای زاناکانەوە ئەم کتێبانەن.

١- صەحیحی بوخاری هی (موحەممەدی کوڕی ئیسماعیل بوخاری) کۆچکردوی ساڵی (٢٥٦) کۆچییە.

٢- صەحیح موسلیم: هی (موسلیمی کوڕی حەجاج) کۆچکردوی ساڵی (٢٦١)ی کۆچییە.

٣- سونەنی ئەبو داوود هی (ئەبو داود) کۆچکردوی ساڵی (٢٧٥)ی کۆچییە.

٤- سونەنی تیرمذی هی (ترمیذی) کۆچکردوی ساڵی (٢٧٣)ی کۆچییە.

٥- سونەنی ئیبنو ماجە هی (ئیبنو ماجە) کۆچکردوی ساڵی (٢٧٣) کۆچییە.

٦- سونەنی نەسائی هی (نەسائی) کۆچکردوی ساڵی (٣٠٣)ی کۆچییە.

کتێبی صەحیحی بوخاری‌و صەحیحی موسلیم لەناو موسوڵمانانەدا ڕێزو پایەیەکی گەورەیان دەست هێناوەو پێیان دەگوترێ: (الصحیحین).

ئەو دوو کتێبە ئەو حەدیثانەیان لە دوو توێدا نووسراوە کە زانایان لەسەر ڕاستییان ڕێك کەوتوون‌و بەلایانەوە صەحیحن. بەڵام چوار کتێبەکانی تر جگە لە حەدیثی صەحیح حەدیثی (حسن)یشیان تێدایە، هەروەکوو چۆن خاوەنی ئەم

کتێبانە هەرکاتێ ویستویانە حەدیسێك هەڵسەنگێنن سەرنجی زاناو خوێنەریان بۆ بەهێزیو بێ هێزی پایەی ئەو حەدیثە راکێشاوە!!

## بەشەکانی حەدیثی صەحیح (اقسام الحدیث الصحیح):

زوربەی زۆری زانایان حەدیثی صەحیحیان بە گوێرەی ئەو صیفەتانەی کە دەبنە هۆی صیحەتی حەدیث، حەدیثەکانیان دابەشکردوەو کردویانن بە حەوت بەش، هەر بەشەیان لەبەشی دواخۆی پایەی بەرزترە:

١- ئەو حەدیثەی بوخاریو موسلیم لە (صەحیحین)دا دایان نابێ بەم بەشە دەگوترێ (المتفق علیه) پەسەندی ئەممەت.

٢- ئەو حەدیثەی بوخاری – بەبێ موسلیم – تەخریجی کردبێ.

٣- ئەو حەدیثەی موسلیم – بەبێ بوخاری – تەخریجی کردبێ.

٤- ئەو حەدیثەی بەپێی مەرجی بوخاریو موسلیم بێ، بەڵام خۆیان تەخریجیان نەکردبێ.

٥- ئەو حەدیثەی بەپێی مەرجی بوخاری بێ.

٦- ئەو حەدیثەی بەپێی مەجی موسلیم بێ.

٧- ئەو حەدیثەی کە یەکێ لە زانایانی بڕوا پێکراوی حەدیث بەساغی دانابێ.

## پشت بەستن بە حەدیثی صەحیحو حەسەن بۆ وەرگرتنی حوکمی شەرعی:

ئاشکرایە کە موجتەهیدو شەرعزانو زانایانی ئیسلام حوکمی شەرعی لە حەدیثی صەحیحو حەسەن وەردەگرن هیچ کاتێ پەنا بۆ حەدیثی زەعیف نابەن چونکە حەدیثی زەعیف حوکمی لێ وەرناگیرێ! بەڵام هەندێ لە زانایان رێگەیان داوە کە لە کرداری چاکەدا کار بەم جۆرە حەدیثە بکرێ وەکوو ئەو حەدیثە زەعیفانەی کە خەڵك هەڵدەنێن بۆ رەوشت جوانیو چاکەکردن! وەکوو ئیمامی غەزالی لە کتێبی (احیاء علوم الدین)دا کردویەتی. شایانی باسە کە ئەوەش بڵێین:

حەدیثی زەعیف هەموویان یەك پلەیان نییە حەدیثی زەعیفی وا هەیە تا پلەی (موضوع = هەڵبەستراو) دادەبەزێ! بڕێ حەدیثی زەعیفی وا هەیە لەگەڵ ناوەڕۆکی قورئان ڕێك ناکەوێ، زۆر حەدیثی زەعیف هەن لە باسکردنی حەقیقەتی ڕووداوو نهێنییەکانی بونەوەردا دژ بە قورئان دەوەستێن! بۆیە پێویستە دووربینی بکرێ، بەڵکوو واچاکە کاری پێ نەکرێ.

## حەدیثی هەڵبەستراو حوکمی شەرعی لێ وەرناگیرێ:

بەڵێ حەدیثی هەڵبەستراو حوکمی شەرعی لێ وەرناگیرێ! بەڵکوو گێڕانەوەشی حەرامە مەگەر بۆ ئەوە بیگێڕینەوە کە ئاگاداری موسوڵمانان بکەینەوە کە ئەو حەدیثە مەضوعو دەست هەڵبەستە.

نوسەرانی ئینسکلۆبیدیای ئیسلامی دەڵێن: (هەرچەندە موسوڵمانان کاتی خۆی نەفرینیان لەو کەسە دەکرد کە حەدیثی هەڵبەستراو – بە مەبەستی خراپ – بەناو خەڵکدا بڵاو بکاتەوە بەڵام چەند ئیعتیبارێك هەیە لە بڕێ کات دا تۆزێك ئەم ڕایە نرم دەکاتەوە، بە تایبەتی ئەگەر حەدیثە هەڵبەستراوەکە بڕێ ئامۆژگاریو تەعلیماتی ڕەوشتی لەخۆ گرتبێ، بێگومان ئەم قسەیە لەگەڵ حەقیقەتدا ڕێك ناکەوێو بوختانو درۆ هەڵبەستنە بە زوبان عیلمی حەدیثەوە. ئاشکراشە زانایانی ئیسلام لەزۆر کۆنەوە ئەم شوبهەو گومانانەیان پوچەڵ کردۆتەوە. ئەوەتا لە کتێبی ئیبنو صەلاحی شەهرەزووری ناسراو بە (علوم الحدیث) لاپەڕە (١٠٠)دا دەڵێ: ئەوانەی حەدیث هەڵدەبەستن چەند جۆرێکن لە هەموانیان زیانبەخشتر کۆمەڵێکن خۆیان بە دونیا نەویستو سوفینیزم حسێب کردوە، لە خۆیانەوە حەدیثیان هەڵبەستوون بەو هیوایە خێریان بگاتێو پێیان وابووە ئەو حەدیثە هەڵبەسراوانەیان لێ وەردەگیرێو خەڵکی فریویان دەخۆنو پێیان بڕوا دەکەن!! تا کۆمەڵێك زاناو لێهاتووی زانستی حەدیث لێیان ڕاپەڕینو پەردەیان لەسەر هەڵدانەوەو قەلاچۆی ئەو بیرە پرو بوچەیان کرد!!

## حەدیث هەیە دەبێتە سەرچاوەی حوکمی شەرعی، حەدیثیش هەیە نابێتە سەرچاوەی حوکمی شەرعی (السنة تكون تشريعا وغير تشريع)

پێویستە تێبینی ئەوە بکرێ کە هەر حەدیسێك لە پێغەمبەرەوە هاتبێ‌و لە کتێبەکانی حەدیثدا تۆمار کرابێ – جا حەدیثەکە قسەبێ یان کردەوە بێ یان بێ دەنگی‌و رازی بوون بێ – دابەش دەکرێن بە چەند بەشێکەوە:

یەکەم: هی وا هەیە دەربارەی شتێك هاتووە کە پێویستییەکی ئادەمیزادییە وەکوو خواردن‌و خواردنەوەو نووسین‌و رۆییشتن‌و دیدەنی کردن‌و ناوبژیکردن‌و رێکخستنەوەی دوو کەسی دژ بەیەك‌و بەگوێرەی داب‌و نەریتی کۆمەلایەتی‌و بێنەو بەرەی کڕین‌و فرۆشتن.

دووەم: هی وا هەیە بە گوێرەی تاقیکردنەوەی شەخصی‌و تایبەتی‌و کۆمەلایەتی هاتووە وەکوو ئەو حەدیثانەی دەربارەی کارو باری کشتوکاڵ‌و تەندروستی هاتوون.

سێیەم: هی وا هەیە بەگوێرەی نەخشەو پلانی ئادەمیزاد بەگوێرەی هەل‌و مەرجی تایبەتی هاتووە، وەکوو ئەو حەدیثانەی دەربارەی دابەشکردنی سوپا لەشەڕ گەداو رێکخستنی ریزەکانی سوپاو ئەو جۆرەشتانە کە بەهۆی بارو زوروفی کاتی‌و لێهاتووی تایبەتی، پێغەمبەر هەڵس‌و کەوتی تێدا کردون!

ئەم سی جۆرە حەدیثە نابنە سەرچاوەی تەشریع‌و بە بکەو مەکەی شاریع حسێب ناکرێن بەڵکوو ئەوە کارێکی ئادەمیزادین‌و هەڵس‌و کەوتی پێغەمبەر تێیاندا نابنە تەشریع‌و سەرچاوەی تەشریع.

## حەدیث دەبێتە سەرچاوەی حوکمی شەرعی گشتی‌و تایبەتی:

ئەو حەدیثانەی کە دەبنە سەرچاوەی تەشریع چەند بەشێکن:

١- هەر حەدیسێك لە پێغەمبەرەوە هاتبێ لەسەر شێوەی پێ راگەیاندن بەو سیفەتە کە پێغەمبەرە بە خەڵکی راگەیاندبێ، وەکوو ئەوەی ئایەتێکی موجمەلی

قورئـان رونبكاتـەوە، يـان حـوكمێكی گـشتی تايبەتمەنـدی بكـا، حـوكمێكی رەهـا (مطلق) سنووردار بكا، يان لايەنی عيبادەتێك شی بكاتەوە، يان شتێك بـە حـەلاڵ دانیَ يان حەرامی بكا، يان دەربارەی بیرو باوەڕو رەوشت يان شتێك كە پەيوەنـدی هەبێ بە يـەكێك لـەو شتانەی باسمان كـردن، ئـەم جۆرە شـتانە هـەموو كـات بـە تەشـريع دادەنـرێن‌و تـا رۆژی قيامـەتيش ئـەم تەشـريعە بەردەوامـە. جـا ئەگـەر فەرمانەكـەی پێغەمبـەر دەربـارەی ئـەم جـۆرە شـتانە بكـەبوو واتـە: ئـەمربوو، پێويستە هـەموو موسـوڵمانێك لـە عاسـت خۆيـەوە بيكـا، ئەگـەر مەكـە بـوو واتـە: نەهی بوو پێويستە هەموو موسوڵمانێك خۆی لیَ بپارێزیَ‌و توخنی نەكەویَ.

٢- ئەو حەديثانـەی كـە لـە پێغەمبـەرەوە هـاتوون بـەو سيفەتەی كـە پێـشەواو سـەرۆك‌و گـەورەی موسـوڵمانانە وەكـوو سـوپا نـاردن بـۆ شـەڕ لەگـەڵ دوژمنانـداو خەرجكردنی ماڵ‌و دارايی بەيتولمال لـە شوێنی پێويـستدا، يـان كۆكردنـەوەی مـاڵ‌و دارايـی بــەيتولمال لــە سەرچــاوەكانييەوە، هــەروەها تــەعينكردنی قــازی‌و فــەرمانڕەوايانی هــەرێم‌و ناوچــەكان‌و پەيمانبەســتن‌و ئــەم جۆرەشــتانەی كــە پەيوەنـدييان هەيـە بـەكارو بـاری ئيمامـەت‌و پێـشەوايی‌و نەخـشەو پلانـدانان بـۆ بەرژەوەندی گشتی موسـوڵمانان – حـوكمی ئەمانـە هيـچيان نابنـە تەشـريعی عـام‌و گشتی‌و نابیَ هـەر كەسـە لـە عاسـت خۆيـەوە هەڵكوتێتـە سـەری! مەگـەر بـەئيزنی خەليفەو پێشەوابیَ! كەس بۆی نييە ئـەوە بكاتـە بەڵـگە كـە پێغەمبـەر كرديـەتی ئەويش لە خۆيەوە پڕی بداتیَ‌و بيكا.

٣- ئەو حەديثانەی كە لە پێغەمبەرەوە هاتوون دەربـارەی قـەزاوەت‌و دادگـايی كردن، چونكە حەزرەت وەكوو پێغەمبـەر بـووەو حـوكمی شـەرعی راگەيانـدوە لـە هەمانكاتدا سەرۆكی گشتيی موسـوڵمانان بـووەو كـارو بـاری رێكخستون‌و راميـاری راپەڕاندون‌و لە كێشەو ناكۆكی ناو موسوڵماناندا قازی شەرعی بووە.

حوكمی ئەم جۆرە حەديثانەش ناتوانریَ بكریَ بە شەريعەتی گشتی، كەوابوو كەسێك حەقێكی لەسەر كەسێك بوو ئەويش ملی نەدەداو ئينكاری دەكـرد كـابرای

خاوەن حەق ناتوانێ بە زۆر حەقی خۆی لێ بستێنێ مەگەر لە ڕێگای دادگاوە؟ چونکە لە سەردەمی پێغەمبەردا بەو شێوە حەق وەرگیراوە.

سوپاس بۆ خودای تاک‌و تەنیا کە یارمەتیدام بۆ وەرگێڕانی ئەم بەڕاوە پیرۆزە کە ڕۆژی (١٩٩٤/٥/٢٥) بەرامبەر بە (١٥) ذیلحیجەی ساڵی (١٤١٤)ی کۆچی لە ڕەشنووسینی بوومەوە.

شایانی باسەکەبەندە لەمانگی ئابی ساڵی (١٩٨٨)ی زانییەوە خەریکی وەرگێڕانی ئەم پەڕاوە پیرۆزەیەو زۆر بەشێنەیی‌و لەسەرەخۆ ئیشم تێداکردوە، بەس بەش ڕەشنووسەکەیم داوەتە بەڕێز ماۆستا نووری فارس حەمە خان بۆ ئەوەی چاوی پێدا بگێرێ‌و سەرنجی خۆییم پێ بڵێ: خوا حەقە مامۆستا درێغی نەکردوە زۆر دڵسۆزانە پێیدا چۆتەوەو گەلێك ڕستەی بۆ گۆڕیوم، زۆر هەڵەی بۆ ڕاست کردومەوە ئەگەر ڕاست نەکرانایەوە نەنگی پێوە دیاردەبوو! خودا پاداشی ماندووبوونەکەی بداتەوەو وێنەی زۆربن‌و پایەداربێ.

هیوادارم خوێنەرانیش بە چاوێکی ڕەخنەیی بنیاتنەرەوە بیخوێننەوە بە سەرنج‌و بۆچوونی خۆیان منەتبارم بکەن‌و هەڵەم بۆ هەڵگرنەوە.

مامۆستا نووری فارس لە کۆتایی ڕەشنووسەکەدا بەم چەند دێڕە سەرنجی خۆی بەرامبەر بەکتێبەکە دەربڕیوەو دەڵێ:

سوپاس بۆ خودا لە سەرەتای ئەم کتێبەوە هەتا ئێرە بەوردی سەرنجی خۆمم لەبارەی وەرگێڕاوەکەیەوە دەربڕی، گەرچی ئەم کتێبە مەشهوورەو بە ناوبانگە، بەڵام لە گەلێ شوێندا پتر لە پێویست لایەنگیری نوێخوازی دەکا، لە گەلێ شوێندا لاسکاییەکی ڕووتی نووسەرە میشسرییە تازەکانە. لەگەڵ ئەمەدا تا ئەو کاتەی کتێبێکی ڕێك‌و پێك تر ڕوحی دینی ئیسلامەمان بۆ ڕون دەکاتەوە، ئەم کتێبە جوانترین هەنگاوە لەم کاتەدا. لە خودا داواکارین مامۆستا محمود لە پاکنووسەکەیدا پتر سەر کەوتووبێ.

نوری فارس - ١٩٩٤/١٠/١٣

# پێڕستی سەرەباسەکان
# (فهرس المواضيع)

| لاپەڕە | سەرەباسەکان |
|---|---|
| ٤٤ | خوازەو خواستن لە قورئاندا |
| ٤٧ | کورتبڕی لە قورئاندا |
| ٤٩ | کورتبڕی قورئان لە باسکردنی تۆفانی نوح دا |
| ٥٢ | پەندو ئامۆژگاری لە قورئاندا |
| ٥٤ | دووبارە کردنەوەی مانا لە قورئاندا |
| ٥٦ | برێ لایەنی ئیعجازو سەر ئاسای قورئان |
| ٥٦ | رەوانی قورئان لەهەموو شوێنێکا |
| ٥٨ | فرە ڕەوانبێژی قورئان |
| ٥٩ | ساغی قورئان لە دژایەتیو هەڵە |
| ٦٠ | زۆریو قوڵی مانای قورئان |
| ٦١ | لەخۆ گرتنی قورئان بۆ هەواڵی غەیبی |
| ٦٤ | چیرۆك لە قورئاندا |
| ٦٦ | جەوهەری قورئانو زیندوویی قورئان |
| | **بەشی سێهەم: موعجیزاتە زانستییەکانی قورئان** |
| ٧٠ | یەك پارچەیی بونەوەرو نهێنی ژیان |
| ٧٣ | دروستبوونی بونەوەر |
| ٧٥ | لێك کشانەوەو فراوان بوونی کەون |
| ٧٦ | هاتوچۆو هەڵسوڕانی مانگو رۆژو زەوی |
| ٧٧ | هەبوونی زیندەوەر لە ئاسمانەکان |
| ٧٩ | کەم بوونی ئۆکسجین لە بەرزایید |
| ٨٠ | کەرتبوونی گەردیلە |
| ٨١ | لەهەموو شتێکی بونەوەردا نێرو مێ هەیە |
| ٨٢ | موتوربە کردنی هەور |
| ٨٤ | جوڵانەوەی زەویو فشەڵ بونەوەی |
| ٨٤ | هاوکێشەیی عونصورەکانی بونەوەر |
| ٨٦ | شەپۆلی ناوەوەی ئاوو سەر رووەکەی |

| سەرەباسەکان | لاپەڕە |
|---|---|

